# دوایین ڕۆژ و دوا وێستگەکان و کۆتایی جیهان

نووسینی

محمد حسان

وەرگێڕانی

عبدالمجید عبدالحمید

نارین




ناوی کتێب بەعربـــــــی: أحداث النهاية ونهاية العالم

نوسینـــــــــــی: محمد حسان

ناوی کتێب بە کــوردی: دواین ڕووداوەکان و کۆتایی جیهان

وەرگێڕانــــــــی: عبدالمجيد عبدالحميد

نەخشەسازی نــــاوەوە: شنۆ حمدامین

نۆرە و ساڵی چـــاپ: یەکەم/ ١٤٣٠ک ـ ٢٠٠٩ز

ژمارەی سپـــــاردن: (١٢٤٠) ساڵی (٢٠٠٩)ی پێدراوە.



کتێبخانەی نارین
هەولێر - چوارڕیانی شێخ مەحمودی حەفید
E-mail: nareen_1@yahoo.com
بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی
تەلەفۆن: 07504064610 / (0964) 66 2511982

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

الحمد لله وكفى والصلاة والسلام على نبيه المصطفى وصحبه المجتبى

أما بعد...

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار کە دروستی کردووین لە نەبوونەوە و رزق و رۆزی داوین و ڕێنموویی کردووین و هۆش و بیر و عەقڵی پێ بەخشیوین بۆ ئەوەی بە هۆیانەوە گەورەیی و مەزنی ئەومان بۆ دەرکەوێت، کارە جوانەکانی بەڵگەی دانایی و زانایی و جوانکاری ئەوە، سوپاس بۆ هەموو ئەو نیعمەتانەی کە لە ژماردن نایەن، کەچی زۆربەی مرۆڤە یاخی بووەکان پێی نازانن، لە گەورەترین و مەزنترین و شکۆمەندترین ئەو نیعمەتانە نیعمەتی ئیسلامە... ئەو بەرنامەیەی کە مرۆڤەکانی لە تاریکی و شەوەزەنگەوە دەرکرد بۆ ڕووناکی... بە هاتنی خۆری رۆژێکی نوێ هەڵات و بانگی کردنەوەی لاپەرەیەکی نوێی لە مێژووی دوور و درێژی مرۆڤایەتی دا، چیتر قەرزاران بە هۆی قەرزەکانیانەوە مۆری کۆیلایەتییان پیا نەدەنرا .

سوپاسی دەکەین بۆ هەموو ئەو نیعمەتانە... سوپاسێك شایستەی مەزنی و گەورەیی ئەو بێت... سوپاسی دەکەین بە قەد گەورەیی عەرشەکەی خۆی... بە قەد گەورەیی و مەزنی و جوانی زاتی خۆی و بە قەد فراوانی رەحمەت و میهرەبانی خۆی... شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نییە شایەنی پەرستن بێت تەنها(الله) نەبێت تەنها و بێ هاوەڵە...

سەڵات و سەلام لەسەر پێغەمبەری نازدارﷺ کە (محمدی کوڕی عبدالله) یە... شایەتی دەدەم کە نێردراوی پەروەردگارە و ئەم پەیامەی لە لایەن پەروەردگارەوە بۆ هێناوین و بەو پەڕی جوانی و دانایی و بە بێ کەم و کووڕی ئەوپەیامەی گەیاند و لەو پێناوەدا ئازار و ئەشکەنجەی زۆری چەشت و شەونخوونی زۆری کرد، کەچی ئەو هەرگیز وازی نەدەهێناو، بەڵکو سوورتر و دامەزراو تر بوو بۆ گەیاندنی ئەم پەیامەو تام و چێژی لەو ماندوو بوونە وەردەگرت، ئەو پێغەمبەرەی ﷺ کە

ڕەحمەتێك بووە بۆ هەموو جیهان و خۆشەویستی پەروەردگارە... بەسە بۆ ئەو کاتێ خوای گەورە گلەیی لێ دەکات پێی دەڵێت:﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ﴾[1] التوبة: ٤٣. تەماشاکەن خوای پەروەردگار لە گەڵ بەندە خۆشەویستەکەیدا بەچی شێوە و شێوازێك قسە دەکات! ؟

برا خۆشەویستەکانم... خوشکە بە حورمەتەکانم...

خۆم بە ئاسوودە دەزانم کە لەم چەند وشانەدا لە خزمەتتاندا بم و جێگای بەختیارییە بۆ من ئەگەر توانیبێتم بە جوانی ئەم کتێبەم لە زمانی عەرەبییەوە وەرگێڕابێتە سەر زمانی شیرینی کوردی بۆ ئەوەی خوێنەرانی کورد ئەو مروارییە بە نرخەیان لە دەست دەرنەچێت و شوێن پێی باووباپیرانی خۆیان بزر نەکەن، ئەم میللەتە کە سەدان کەڵە پیاوی تێدا هەڵکەوتووە و توانیویانە خزمەتی ئەم ئایینە بکەن کە تا ئێستا بوونەتە پێشەنگ و جێی شانازی نەوەکانیان، لە سەرووەی هەموویانەوە صلاح الدین الایوبی و ابن المستوفی و ئامەدی و دینەوەری و ابن خەلەکان و ابن صلاح الشهرزوری و دەیان زانا و دانای تر.

جا لەم پێشەکییەدا حەز دەکەم دووخاڵ بخەمە ڕوو...

١ ـ ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا زنجیرە باسێك بوو کە ڕێزدار(محمد حەسان) لە ڕێگای کەناڵی ئاسمانی(الناس) بە بیست و نۆ ئەڵقە پێشکەشی کرد لە ژێر ناونیشانی (أحداث النهاية ونهاية العالم)، لەگەڵ چەند برایەکدا(خوا پاداشتی چاکەیان بداتەوە) بە باشمان زانی ئەم کتێبە وەرگێڕینە سەر زمانی کوردی جا ئەوانیش ئەو ئەرکەیان بە من سپارد، بۆیە منیش سوپاسی متمانەکەیان دەکەم .

٢ ـ لە تەفسیر کردنی ئایەتەکاندا پشتم بە تەفسیری (ڕامان)بەستووە لە دانانی ڕێزدار (ئەحمەد کاکە مەحمود) خوا لە تاوانەکانی ئێمە و ئەویش خۆش بێت، بۆیە تەفسیر کردنی هەموو ئایەتەکان لەو تەفسیرەوە وەرگیراوە، خوا پاداشتی هەموو لایەك بداتەوە.

---

١ ـ واتە: خوا لێت خۆش بێت بۆچی– بێ تاقیکردنەوە– مۆڵەتت بە دوورووەکاندا نەیەن بۆ غەزاکەی تەبوك؟)).

هەروەها داواتان لێ دەکەم لە ڕەخنە و ئامۆژگاری و پێشنیارەکانتان بێ بەشم مەکەن، لە هەر کەم و کورِییەك ئاگادارم بکەنەوە چ زمانەوانی یان بابەتی بێت، خوای گەورە پاداشتی هەموو لایەك بداتەوە.

داوا لە خوا دەکەم، کە (دڵسۆزی و ئیخلاص)مان پێ ببەخشێت و هەموو کارو کردەوەکانمان لێ وەرگرێت لە ریا بە دوورمان بکاتەوە و لە تاوانەکانمان خۆش بێت، ئێوەیش لە دوعای خەیر بێ بەشم مەکەن، بەڵکو خوای پەروەگار دوعای کەسێکتان وەربگرێت!

**عبدالمجید عبدالحمید**
kfree_١٩٧٥@yahoo.com

## بە ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على خير المرسلين محمداً وعلى آله وصحبه أجمعين....

أما بعد:....

لە کۆن ونوێدا زۆرێك لە زانایان دەرکەوتوون و هەر یەکە لە بوارێکدا توانیویەتی خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بکات و خۆیان بکەنە پردێك بۆ ئەوەی خەڵکی لە ڕێگایانەوە بەرەو بەهەشت بپەڕنەوە، لە نموونەی ئەو زانا بەرێزانە ڕێزدار (شێخ محمد حەسان)ە کە لەم کتێبەدا لە خزمەتی وشە جوانەکانیدا دەبین.

بە ڕاستی ئەو زانایە توانیویەتی لە ماوەیەکی کەمدا خۆی بە هەموو جیهانی ئیسلامی بناسێنێت، ئێستا زۆربەی موسڵمانان بە هەموو ئاست و توێژەکانیانەوە تامەزرۆی وتارە شیرینەکانی ئەون، چ لە ڕێگای کتێبەکانییەوە بێت یان لە ڕێگای کەناڵە ئاسمانییەکانەوە، بۆیە حەزمکرد لەم پێشەکییەدا کەمێك لەسەرژیانی ئەم بەرێزە بدوێم.

ناوی تەواوی ئەم بەرێزە (محمدی کوڕی ابراهیم ی کوڕی ابراهیم ی کوڕی حەسان)ەو بە(محمدحەسان) ناسراوە لە گوندی (دموە) سەر بە پارێزگای (الدقهلية)ی وڵاتی میسر لە بەرواری (١٩٦٢/٤/٨) لە خێزانێکی دینداری سادە لە دایك بووە.

هەر لە منداڵییەوە باپیری (کە باوکی دایکی دەکات) بە خێوکردنی ئەم منداڵەی گرتە ئەستۆی خۆی، ئەو باپیرەی کە هەموو قورئانی پیرۆزی بەجوانی لەبەر بووەو شارەزاییەکی تەواوی لە فیقهی شافعیدا هەبوو، هەر لە سەرەتای ژیانییەوە باپیری درکی بە زیرەکی و لێهاتووی ئەم منداڵە کرد و هەستی کرد کە دەتوانێ قورئانی پیرۆز لە بەر بکات بۆیە لە تەمەنی چوار ساڵییەوە (شێخ محمدحەسان) پەیوەندی بە حوجرەی گوندەکەیانەوە دەکات و بەردەوام هاتوو چۆی ئەوێ دەکات تاکو لە تەمەنی هەشت ساڵیدا و لەسەر دەستی مامۆستا بەرێزەکەی (شێخ مصباح محمدعوض) هەموو قورئانی پیرۆز لە بەر دەکات .

پاشان چەند کتێبێك لەسەرزمانی عەرەبی و عەقیدەی ئیسلامی و فیقهی شافعی لە بەر دەکات وەکو کتێبی (متن أبي شجاع) لە فیقهی شافعیدا. وە باپیری پاشان هەوڵی لە گەڵدا بۆ لەبەرکردنی کتێبی (رياض الصالحين) ئەویش لە تەمەنی دوازدە ساڵیدا لەبەریکرد و پاشان (الأجرومية) لەبەردەکات، ئینجا لەسەر دەستی شێخەکەی (مصباح محمد) کتێبی (التحفة السنية) لەبەردەکات و هەر لە منداڵییەوە حەزی لە خوێندنەوەی زمانی عەرەبی و شیعر بووە.

پاشان لە مزگەوتی گەورەی گوندەکەیان دەست بە وانە وتنەوە دەکات و هەردوو کتێبی (فقه السنة) و (رياض الصالحين) راڤە دەکات کەچی هێشتا تەمەنی تەنها سیازدە ساڵە.

لە لایەن باپیرییەوە داوای لێ دەکرێت کە وتاری هەینی بخوێنێتەوە، ئەویش یەکەم وتاری خۆی لە گوندی (میت مجاهد) دەخوێنێتەوە لە تەنیشت گوندەکەی خۆیانەوە دەبێت (گوندی دموە) لە کاتێکدا تەمەنی سیازدە ساڵە، جا لەو وتارەدا کە وتارێکی زۆر بەنرخ و بەبەها بوو باسی مردنی کرد و کاریگەری زۆری لەسەر نوێژەران هەبوو وە هەموویان پێی سەرسام بوو بوون، بۆیە شێخی مزگەوتەکە داوای لێ دەکات کە بۆ هەفتەی ئاینده دیسان خۆی ئامادە بکات و وتاری هەینییان بۆ بخوێنێتەوە، جا لێرەدا بە سەرهاتێکی خۆش هەیە لە کاتی چوونی بۆ ئەو گوندە، شێخ محمد حەسان خۆی باسی دەکات و دەڵێت: ((کاتێ لەسەر داواکاری باپیرم ڕۆیشتم بۆ گوندی (میت مجاهد) بە مەبەستی خوێندنەوەی وتاری هەینی لەوێ شێخێکی بە تەمەنی لێبوو کە هاوەڵی باپیرم بوو, منیش خۆم پێی ناساند و ئەویش زۆر بە گەرمی بە خێرهاتنی لێکردم و ڕێزی لێگرتم، بەڵام کاتێ پێم گوت بە مەبەستی خوێندنەوەی وتاری هەینی هاتووم زۆر پەست بوو ئەمجار جوێنی پێدام و لە مزگەوت دەریکردم و منیش زۆر دڵتەنگ بووم لەبەر ئەو ڕەفتارە، چونکە من زۆر حەزم دەکرد ئەگەر بۆ جارێکیش بوایە وتارم بخوێندایەتەوە، لەو گوندە برادەرێکم هەبوو، ڕۆیشتم بۆ ماڵی ئەوان و ئەو شەوە تاکو بەیانی لەوێ مامەوە، خۆش بەختانە ئەو ڕۆژە کابرایەکی خەڵکی گوندەکە کۆچی دوایی کرد و خەڵکی گوندەکە

هەموو دەرچوون بۆ بە خاك سپاردنی وە ئەمەیشە هەلێکی زێڕین بوو بۆ من بۆ ئەوەی وتاری تێدا بخوێنمەوە منیش وتارێکم خوێندەوە و کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لەسەرخەڵکەکە،بۆیە شێخەکە بانگی کردم (ئەوەی کە دوێنی جوێنی پێدام و لە مزگەوت دەریکردم)، کە ئەو ڕۆژە وتاری هەینی لە مزگەوتەکە بخوێنمەوە، بەکورتی ئەو ڕۆژە وتارێکی زۆر کاریگەرم بۆ خوێندنەوە، پاشان شێخەکە بانگی کردم و داوای لێ کردم ئیتر هەموو ڕۆژێکی هەینی بڕۆم بۆ ئەوێ بە مەبەستی خوێندنەوەی وتاری هەینی)).

بۆیە ئەوە یەکەم ئەزموون بوو بۆ شێخ لە گەڵ وتاردا.

چیتر لەو ڕۆژەوە تاکو ئەمڕۆ شێخ محمد حەسان مینبەری جێ نەهێشتووە و هەردەم وتار دەڵێتەوە مەگەر بە هۆی نەخۆشی یان سەفەر وتار و مینبەری جێ هێشتبێت، ئەمجار پەیوەندی دەکات بە قوتابخانە یاساییەکانەوە و بەردەوام دەبێت لە سەری تاکو گەیشتە قۆناغی زانکۆ و لەوێ لە بەشی ڕاگەیاندن (اعلام) لە زانکۆی (القاهره) توانی بە پلەی زۆر باشە(جید جدا) بڕوانامەی بەکالۆریوس بە دەست بهێنێ،وە لەو بەشەدا (بەشی ڕاگەیاندن) سوودی زۆر وەرگرت لە چەند بابەتێك کە یارمەتی دەری بوو بۆ مەبەستی بانگەواز بۆ دینی خوا، بە تایبەتی هەندێ وانە لەوانە: وانەی(تحلیل المضمون) و (کیفیة مخاطبة الجماهیر) .

لەو کاتانەدا شێخ بەردەوام بوو لە خوێندنی بابەتە شەرعییەکان لەسەردەستی مامۆستایانی ئەزهەر بە تایبەتی لە هەردوو بابەتی فیقهی ئیسلامی و تەفسیر، هەرگیز شێخ وازی لەوتاری هەینی و وانەوتنەوە نەهێناو وانەیەکی هەفتانەی هەبوو لە گوندی زانکۆ.

لە یەکەم پشووی هاوینی ساڵی خوێندنی لە زانکۆ و کە هێشتا تەمەنی هەژدە ساڵە شێخ محمد حەسان سەفەر دەکات بۆوڵاتی ئوردن بۆلای فەرموودناسی شام و مجددی ئەم سەدەیە و شێخی ئەهلی سوننە و دوژمنی بیدعە و بیدعەچییەکانی (شێخ أبو عبدالرحمن محمد ناصر الدین الالبانی) خوا لە تاوانەکانی ئێمە و ئەویش خۆش بێت، لە چەند وانە و دەرسێکی کەمی شێخ (الالبانی)دا ئامادە دەبێت و لەو

ماوەیەدا وەکو پێشەوا و وتار خوێنی یەکێك لە مزگەوتەکانی نزیك شاری (السحاب) دەمێنێتەوە.

پاش زانکۆ شێخ پەیوەندی دەکاتە پەیمانگای دیراساتی ئیسلامی یەوە لە قاهیرە بە مەبەستی بە دەست هێنانی خوێندنی بالاّ لە دیراساتی ئیسلامیدا، بەلاّم قەدەری خوای گەورە وا دەبێت کە ئەو خوێندنە تەواو نەکات بە هۆی ماوەی پەیوەندی کردنی بە خزمەتی سەربازییەوە و ئەویش پەیوەندی دەکات بە سوپاوە، لەویّ لە ناو سوپادا واز لە وانە وتنەوە ناهێنیّ و دەست بە وتار خوێندن و وانە وتنەوە دەکات.

لە پاش ماوەی خزمەتی سەربازی لە شاری (السویس) دەمێنێتەوە و لە مزگەوتەکانی ئەو شارەدا دەست بە وتار خوێندن و وانە وتنەوە دەکات و خەڵکی شاری سویس خۆشیان دەوێت و لە دەوری کۆ دەبنەوە و ناوبانگ دەردەکات.

پاشان سەفەر دەکات بۆ وڵاتی سعودیە و لەویّ و لە مزگەوتی (الراجحی)لە (الریاض)بۆ ماوەی زیاتر لە شەش ساڵ وەکو وتارخوێن و پێشەوا دەمێنێتەوە و لەسەردەستی ڕێزدار شێخ (أبو صالح سلیمان الراجحی)فێری حیکمەت و دانایی دەبێت.

پاشان شێخ محمد حەسان دەڕوات بۆ لای زانای پایەبەرزی ئەم سەردەمە شێخ عبدالعزیز بن باز رحمه الله ، لەو زانایەوە زانست و زانیاری وەردەگرێت، ئەو زانایە کە بە پێشەوای ئەهلی سوننە و زانای سەردەمی خۆی دێتە ژماردن، چەند ساڵێك لە بەر دەستیدا دەبێت و چەند کتێبێك لەو زانایەوە دەخوێنێت و گوێبیستی دەبێت لەوانە راڤە کردنی (فتح الباري)و (النونیة)و (الطحاویة)و (الواسطیة)و چەند کتێبێکی تر لە فیقهی ئیسلامی و (أصول) دا.

پاشان کتێبی (الطحاویة) لەبەر دەستی شێخ (عبدالله بن جبرین) وە چەند کتێبێکی تر لای ئەوزانایە دەخوێنێت لەبوارەکانی فیقهی ئیسلامی و أصول و تەفسیرو عەقیدە.

ئەمجار لای زانای پایەبەرز (شێخ عبدالقادر شیبە الحمد) راڤە کردنی کتێبی (بلوغ المرام) دەخوێنێت.

لە پاش ئەو هەموو ماندوو بوونـە لـە لايـەن شـێخ (سـليمان الراجحـى) داواى لـێ دەكرێت كە بچێت بۆ مزگەوتەكـەى خـۆى لـە (القـصيم)، لـە كردنـەوەى يـەكێك لـە پرۆژەكاندا و بە ئامـادە بـوونى گـەورە زانايـان لـە وڵاتـى سـعوديە شـێخ (سـليمان) داواى لـێ دەكـات، كـە لـە پـێش ئـەو هـەموو زانايـەدا وتارێـك بڵێتـەوە، لـە پـاش تەواوبوونى وتارەكە شێخ (عبدالله بن منيـع) هەڵدەسـتێ و لەسـەرداواى ئـەو هـەموو زانا بەرز و بەرێزانە بڕوانامەى (دكتۆراه) پێشكەش بە شێخ محمد حەسان دەكات.

ئـەو ماوەيـە كـە شـێخ محمـد حەسـان لـە (القـصيم) دەبێـت هاتووچـۆى زانـاى پايەبەرز و فەقيهى ئەم سـەردەمە شـێخ (محمـد بـن صـالح العثـيمين) دەكـات و لـە ئەوەوە زانيارييەكى زۆر وەردەگرێت

ئەمجار بـە پـشتگيرى و تەزكيـەى شـێخ (محمـد بـن صـالح العثـيمين) داواى لـێ دەكرێت لە زانكۆى (الامام محمـد بـن سـعود الاسـلاميه) لقـى (القـصيم) لـە هـەردوو كۆلێژى (الشريعه)و (أصول الدين) وانەى (الحديث) و (مناهج المحدثين) و (تخريج) و (طرق الحديث) بڵێتەوە.

شێخ محمد حەسان خاوەنى دەيـان كتێـب و سـەدان كاسـێتە لـە هـەموو بـوار و لقەكانى زانست و زانياريدا، تەنها بە نوسينى كتێب و خوێندنەوەى وتار و دەرس و وانـە نەوەسـتاوە بـەڵكو هـەوڵ و چـالاكى ئـەو پيـاوە زۆربـەى وڵاتـانى جيهـانى گرتووەتـەوە، زۆربـەى وڵاتـانى جيهـان گـەڕاوە بـە مەبەسـتى بانگـەواز بـۆ ئـايينى پـيرۆزى ئيـسلام و بەشـدارى لـە دەيـان كـۆنگرەى جياجيـا كـردووە لـە وڵاتـانى (ئەمريكاو كەنەدا و ئەڵمانيا و مەجەر و قەتەر و كوەيت و ئيمارات..هتد) لە يـەكێك لەوگەشتانەيدا و لە شارى نيويۆرك ى وڵاتـى ئـەمريكا و لـە يـەكێ لـە كۆنگرە نێـو دەوڵەتييەكاندا بەشدارى دەكات و هـەر كـە شـێخ محمـد حەسـان وتارەكـەى تـەواو دەكات (حەفتا و پێنج) كەس موسڵمان بوونى خۆيان ئاشـكرا دەكـەن و دێنـە سـەر ئايينى پيرۆزى ئيسلام، جگـە لـەوە لـە دەيـان كـۆنگرەى تـر بەشـدارى كـردوو كـە پەيوەست بووە بە ئيسلام و موسڵمانانەوە.

ئێستا بۆ نزيكەى دە ساڵە شێخ خـۆى يـەكلا كردووەتـەوە بـۆ بانگـەواز و وانـە وتنەوەو مامۆستاى عەقيدە و سيرە و(منهاج المحدثين) و (تخريج أحاديث) و (شـرح

حديث جبريل)ە لە پەیمانگای پێگەیاندنی بانگەوازکاران لە المنصوره و هەروەها سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێری (مجمع أهل السنة) یە، وانەیەکی هەفتانەی هەیە لە مزگەوتی (مجمع التوحيد) لە گوندی (دموه) لە منصوره.

**مامۆستاکانی:**

ئەم ڕێزدارە لە چەند زانایەکەوە زانست و زانیاری وەرگرتووە لە سەرووی هەموویانەوە:

١ـ شێخ عبدالعزيز بن باز.

٢ـ شێخ محمد بن صالح بن العثيمين.

٣ـ شێخ عبدالله بن جبرين.

٤ـ شێخ عبدالقادر شيبه الحمد

**نوسینەکانی:**

١. حقيقة التوحيد.
٢. خواطر على طريق الدعوة.
٣. قواعد المجتمع المسلم .
٤. خطب الشيخ محمد حسان (١٢ مجلد).
٥. خطب الشيخ محمد حسان (٤ مجلد).
٦. ماذا قدمت لدين الله؟.
٧. نهاية العالم متى وكيف.
٨. الحصاد الحلو والحصاد المر.
٩. اجتنبوا السبع الموبقات.
١٠. سلسلة الدار الآخرة (٣ مجلد).
١١. تبرج الحجاب.
١٢. الطريق الى القدس.
١٣. الإيمان بالقضاء والقدر.

١٤. الثبات حتى الممات.
١٥. أئمة الهدى و مصابيح الدجى.
١٦. جبريل يسأل والنبي يجيب (٣ مجلد).
١٧. مسائل مهمة بين المنهجية والحركية.
١٨. الحقوق الإسلامية.
١٩. أحكام الجنائز.
٢٠. أحداث النهاية ونهاية العالم.
٢١. أمراض الأمة.
٢٢. الفتنة بين الصحابة.
٢٣. دروس من سورة النور.
٢٤. صفات المنافقين.
٢٥. دروس في التربية .
٢٦. قبس من السنة.
٢٧. السيرة بين الحاضر والماضي.
٢٨. شرح الأصول الثلاثة.

جگە لەوە سەدان دەرس و وانە و زنجیرە باسی هەیە زۆربەی ئەو دەرسانە لە چەند سایتێکی سەر تۆڕی ئەنتەرنێت دەست دەکەوێت لەوانە:

١ـ لە باسی تەفسیردا نەوەت و پێنج کاسیتی هەیە کە تیایدا تەفسیری سورەتی (مریم و الحجرات و النور و ق و الفاتحە) دەکات. وە چەند کاسێتێکی تر لە تەفسیردا .

٢ـ لە باسی عەقیدە و بیروباوەڕدا (سەد و بیست) کاسێتی هەیە کە تیایدا ڕاڤەکردنی کتێبی (حقيقة التوحيد و معارج القبول و عقيدة الواسطية) دەکات.

٣ـ لە باسی فەرموودەدا (نەوەت و پێنج) کاسێتی هەیە لە ڕاڤەکردنی فەرموودەکانی (صحيح البخاري) دا و زیاتر لە (دوو سەد و پەنجا) کاسێتی هەیە کە

ڕاڤەکردنی فەرموودەی (جبریل) دەکات و (دە) کاسێتی هەیە لە باسی(أحکام الجنائز)دا

٤ـ لە باسی سیرە و مێژوودا زیاتر لە (پەنجا) کاسێتی هەیە.

٥ـ لە باسی بانگەواز بۆ دینی خوای پەروەردگار زیاتر لە (بیست) کاسێتی هەیە.

٦ـ لە باسی ئاداب و رەوشتدا زیاتر لە سەد کاسێتی هەیە کە ڕاڤەکردنی کتێبی (مدارج السالکین) ی (ابن القیم) دەکات و زیاتر لە (چل) کاسێتی هەیە باسی مافەکان کە پێویستە بزانرێن دەکات و دەیان کاسێتی تر لەو بابەتەدا .

جگە لەمانە خاوەنی سەدان کاسێتی ترە لە بابەتە جیاجاکاندا لە باسی بەهەشت و دۆزەخ و رۆژی دوایی و ئازارە کۆن و نوێیەکانی موسڵمانان و کێشەکانیان و هەوڵدان بۆ چارەسەر کردنی . وە لە کۆتاییدا با ئەوەمان لە بیر نەچێت کە شێخ محمد حەسان خاوەنی دەنگێکی زۆر خۆشە و خەتمەیەکی تەواوی هەیە و هەموو قورئانی پیرۆزی بەو دەنگە خۆشە خوێندووەتەوە.

بۆ زیاتر ئاشنا بوون لەگەڵ محمد حەسان و وتار و کتێبەکانیدا سەردانی ئەو سایەتەی تایبەت بە خۆی بکە: www.mohamedhassan.org

داوا لە خوای بالآدەست و کارزان دەکەم من و ئێوە و شێخ محمد حەسان و پێغەمبەری نازدارﷺ و هەموو پیاوچاکان لە بەهەشتی بەریندا کۆ بکاتەوە و بەرەکەت بخاتە کات و تەمەنی شێخەوە و حەق و ڕاستی لەسەرزمانی جێگر بکات و ئێمەش لە فیتنە دوور بکاتەوە.

**وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمین**

**کۆکردنەوە و ئامادەکردنی**

**عبدالمجید عبدالحمید**

## بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادى له وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

فإن أصدق الحديث كتاب الله، وخير الهدى هدى محمد ﷺ ، وشر الأمور محدثاتها وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة فى النار .

قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ آل عمران: ١٠٢.[١]

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ النساء: ١.[٢]

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ الأحزاب:٧٠-٧١.[٣]

---

١ـ واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕ! دەبێ هەرچۆنێ پێویستە، ئاوا لە سنوورەکانی خوا پارێز بکەن.. ، هەمیشە گوێڕایەڵ بن، هەرگیز سەرپێچی نەکەن، هەردەم خواتان لە یاد بێت، هیچ کات لە بیری نەکەن، سوپاسگوزار بن، سپڵە مەبن، دەبێ هەتا گیانمان لە بەردابێ، لە خوا بترسین و بەر فەرمانی ئەو بین، بۆیە دەفەرموێ: وە دەبێ هەر بە موسڵمانێتی بمرن، واتە: هەتا زیندوون توند دەست بە ئیسلامەکەتانەوە بگرن و دەستی لێ بەر مەدەن، هەتا ڕۆژێ کە مردن با بە دینەوە بچنەوە لای خوا.

٢ـ واتە: ئەی خەڵکینە! لەو پەروەردگارەتان پەرواتان بێ و بترسن کە ئەو ئێوەی لە تاکە کەسێك ئادەم ﷺ دروست کرد، وە هەر لەو تاکە کەسەش هاوسەرکەشی (حەوا) دروست کرد، وە لەو دووانەیش پیاوانێکی زۆر و ئافرەتانێکی زۆری بە دونیادا بڵاو کردەوە لە گەڵ جیاوازی ڕەنگ و زمان و لێهاتوویی و لێوەشاوەییان، وە لەو خوایە بترسن کە بە ناوی ئەو یەکتری سوێند دەدەن و لە یەکتر بەو داوا ئەکەن، بۆ نمونە ئەڵێن: لە بەر خوا ئەو کارەم بۆ بکە، ئەو شتەم بدەرێ، وە هەروا خۆشتان لە مافی خزمایەتی بپارێزن و پشت لە یەکتر نەکەن و هاوکاری یەك بن و لەکاتی بوون و نەبوون بە دەم یەکەوە بن، بێ گومان خوا بەوردی و هەمیشەیی ئاگادار و چاودێرە بە سەرتانەوە، دەزانێ ئەرکی سەر شانتان ئەنجام دەدەن یان نا.

٣ـ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر لە خوا بترسن، و قسەی ڕاست و ڕێك و پێك بکەن(٧٠) ئەوسا خوا کارەکانتان بۆ ڕاست دێنێ و هیدایەتتان دەکا بۆ ئەنجامدانی کاری چاك و گوناهەکانیشتان بۆ دەپۆشێ و هەر

أما بعد:

هەروەكو ئاشكرايە لەم ساڵانەی دواییدا قسە و باسێكی زۆر دەكرێت دەربارەی (دوایین ڕووداوەكان)و داستان و جەنگ و نیشانە بچووك و گەورەكان كە لە پێش ڕۆژی دواییدا ڕوو دەدەن، ئەم قسە و باسە دەربارەی ئەم بابەتە سامناكە تەنها زانایان و بانگخوازانی موسڵمانانی نەگردووەتەوە، بەڵكو زۆربەی سەركردە و پێشەوا و زانایان و ڕۆشنبیران و نوسەرانی جگە لە موسڵمانانی خەریك كردووە، ئەوەی جێگای سەرنج و تێڕامانێكی قووڵە، كە ئەوەی ئەوان دەینووسن و باسی لە بارەوە دەكەن لە بواری خستنە ڕووی بیرۆكەیەك یان ڕۆشنبیرییەكی هۆشمەندانەی سارد نییە، بەڵكو زادە و هەڵقوڵاوی بیروباوەڕێكی ڕوون و ئاشكرایە.

إبن القیم دەفەرموێت[1]: ((هەرسێ ئوممەتەكە چاوەڕوانن لە دوا سەردەمدا چاوەڕوانكراوێك دەرچێت، چونكە ئەوان لە هەموو میللەتێكدا بەڵێنیان پێ دراوە، موسڵمانان چاوەڕوانی دابەزینی(المسیح)عیسای كوڕی مەریەم عليه السلام دەكەن لە ئاسمانەوە، بۆشكاندنی خاچ و كوشتنی بەراز و كوشتنی دوژمنەكانی لە جولەكە و ئەوانەی كە دەیپەرستن لە گاورەكان، چاوەڕوانی دەرچوونی (المهدی) دەكەن كە لە ئەهلی بەیتی پێغەمبەرایەتییە و زەوی پڕ دەكات لە دادپەروەری پاش ئەوەی پڕ بوو بوو لە ستەم و زۆرداری)).

ئەوەتا یەكەم سەرۆك وەزیرانی دەوڵەتی جوولەكە بە ناوی (بن جوریون) دەڵێت[2]: ((بوون و زیندوویی زایۆنی(صەهیونیەت) لە دوو سەرچاوەوە كۆمەك دەكرێت: سەرچاوەیەكی قووڵی سۆزداری بەردەوام، ئەمەیشە سەربەخۆیە لە هەموو كات و شوێنێكدا و ئەمەیشە زۆر دێرینە بە قەد دێرینی خودی گەلی جوولەكە و ئەم سەرچاوەیشە بەڵێنێكی خوداوەندە و هیوایەكە بۆ گەڕانەوە، ئەم بەڵێنەش دەگەڕێتەوە بۆ چیرۆكی یەكەم جوولەكە كە ئاسمان بە ئەوی ڕاگەیاند:

---

كەسێك گوێڕایەڵی فەرمانی خوا و پەیامبەری ئەو بكات ئەوە بێ گومان سەركەوتنێكی گەورەی بە دەست هێناوە.(٧١)

١ـ إغاثة اللهفان (٢/٤٦٢) طبعة المكتب الاسلامي.

٢ـ الخلفية التوراتية (ص ٤٢).

((لە پاش خۆت هەموو زەوی و زاری (بەنی کنعان) دەدەم بە تۆ و نەوەکەت و ببێتە موڵکێکی بەردەوامی نەمری تۆ)) ئەم بەڵێنە بە میراتگیری گەلی جوولەکە بۆ زەوی دەزانن، وا دەبینن ئەمە بەشێکە لە پەیماننامەیەکی بەردەوام لە گەڵ خوداوەندی خۆیاندا پەیمانیان بەستووە بە جێ بە جێ کردن و هێنانە دی ئەو بەڵێنە . وە باوەڕ بە دەرکەوتنی (المسیح) بە مەبەستی گەڕاندنەوەی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی بووەتە سەرچاوەیەکی بنەڕەتی لە ئاینی جوولەکەدا، هەر تاکێك لە نوێژەکانی ڕۆژانەیدا بە پاڕانەوە و ملکەچ کردنەوە دووبارەی دەکاتەوە و دەڵێت: باوەڕم هەیە باوەڕێکی ڕەها بە هاتنی (المسیح)، بەردەوام هەموو ڕۆژێك لە چاوەڕوانی ئەودام هەرچەندە دوایش بکەوێت)) جا جوولەکە باوەڕی وایە کە(المسیح)ی چاوەڕوانکراو لە(بەنی ئیسرائیل)ە و ئەوانیش دەبنە سەرباز و پشتیوانی و هەموو جیهان فەرمانڕەوایی دەکات لە ئورشەلیمەوە(القدس).

گاورەکان باوەڕیان بە گەڕانەوەی(المسیح) هەیە کە دادەبەزێتە سەر زەوی بە مەبەستی کوشتنی جوولەکە و موسڵمانان و هەرکەسێ شوێنی ئەوان نەکەوتووە لە جەنگێکی جیاکەرەوەدا کە بە(هر مجدون)، یان(سهل مجیدون) ناوی دەبەن کە ئەویش دەشتێکە لە زەوی (فلسطین)، باوەڕیان وایە ئەم جەنگە یەکلایی کەرەوە لەسەر ئەو زەوییە دەبێت.

ئافرەتە نوسەرێکی ئەمریکی بە ناوی(جریس هالسل) دەڵێت: ((باوەڕیان وایە کە جەنگی (هر مجدون) جەنگێکی ناوکی یە(نەوەوییە) و هیچ دالّدەیەکی نییە بە پێی پلانێکی خوداوەند، زۆربەی ئینجیلییەکان ئەوانەی باوەڕیان بە چارەسازی (التَدبُّرِيَّة) هەیە دەستیان گرتووە بە ڕەفتارێکەوە لە گەڵ ئیسرائیلدا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەم بۆچوونە دەیانبات بۆ دانپێدانی خۆیان بە ڕوودانی جەنگێکی سوتێنەر کە دڕندەترو بەربڵاوترە لە هەر کوشتارێك کە بە بیر و هۆشی ادولف هتلری تاوانکاردا هاتبێت)).

بەڵکو (أوترال لوبرتس) خاوەنی کتێبی (دراما نهایة الزمن)و (هول لندسی) خاوەنی کتێبی (نهایة الكرة الأرضية العظيمة) وا دەبینن کە کۆتایی یەکی ناسۆری

هەژێنەر نزیكە لە جیهانەوە بە هۆی ئەو جەنگەوە كە بە جەنگی (هر مجدون) ناوی دەبەن، تا رادەیەك یەكێكیان بە شێوەیەك دەریبڕیوە و دەڵێت: ((هیچ پێویست ناكات بە بیركردنەوە لە قەرزە دەرەكییەكانی ئەمەریكا یان بەرز بوونەوەی باج یان ئایندەی نەوەكانی داهاتوو، مەسەلەكە تەنها چەند ساڵێكە و هەموو شتێك لە جیهاندا لە بنەچەوە دەگۆڕدرێت)).

ئەمەش نوسەرێكی (أصولی) ئەمریكی ترە بەناوی (لاری جونز) دەڵێت: (ئەو كەسەی باوەڕی بە بیردۆزەی (هرمجدون) هەیە ئەوە كەسێكی (أصولی)یەو كتێبی پیرۆز دەخوێنێتەوە هەروەكو چۆن فەرهەنگێك دەخوێنێتەوە بۆ ئەوەی پێشبینی ئاینده بكات... ئەمجار دەڵێت: گاورە نوێیە راستڕەوەكان باوەڕیان وایە كە كتێبی پیرۆز پێشبینی گەڕانەوەی بێگومانی (المسیح) بۆ جارێكی تر دەكات پاش ماوەیەك لە جەنگی ناوكی(نەوەوی) جیهانی یان كارەساتێكی سروشتی و هەرەس هێنانێكی ئابووری و پاشاگەردانییەكی كۆمەڵایەتی، ئەوان باوەڕیان وایە كە ئەم رووداوانە دەبێت روودەن پێش گەڕانەوەی دووەم،... ئەمجار دەڵێت: لە كۆتایی ئەم قەیرانەدا ئەو گاورە تازە لەدایك بووانە سەر لە نوێ دەگەڕێنەوە لە گەڵ (المسیح)دا وەكو سەركردەیەكی سەربازی سەركەوتوو بۆ ئەنجامدانی جەنگی(الهر مجدون) بۆ ویرانكردنی دوژمنانی خودا، ماوەیەك بە بەختەوەری لە گەڵیدا دەمێننەوە و هەر ئەوەیە كە (المسیح) بۆ ماوەی هەزار ساڵ فەرمانرەوایی سەر زەوی دەكات)).

هەروەها (جریس هالسل) كە ئافرەتە نوسەرێكی ئەمریكی یە لە كتێبی (النبوءة والسیاسة)دا دەڵێت: (مێژووی مرۆڤایەتی بە جەنگێك یان بە كارەساتێكی ناوكی (نەوەوی) تەواو دەبێت كە پێی دەڵێن ((أر مجدون Armageddon)) وە ئەم جەنگەیش دەبێتە رێخۆشكەرێك بۆ گەڕانەوەی (المسیح) كە فەرمانڕەوایی دەكات (لە پاش گەڕانەوەی) بە سەر هەموو زیندوو و مردووەكاندا وەكو یەك).

بەڵكو هەشتا هەزار قەشەی ئینجیلی پروتستانتی ئەم بیروباوەڕەیان هەیە وە ئەم بیروباوەڕەی خۆیان و پەیامەكەیان لە ڕێگای سەدان ویستگەی رادیۆ و تەلەفزیونەوە بڵاو دەكەنەوە.

له به ناوبانگترین ئەوانه قەشەیەکی ئەمریکی بە ناوی (جیمی سواجارت) کە دەڵێت: ((خۆزگەم دەخواست بڵێم: ئێمە ئاشتی دەستەبەر دەکەین بەڵام باوەڕم وایە کە (هرمجدون) بەڕێوەیە... ئەو بەڕێوەیە... وە لێشاوی ئەو ڕووداوە لە دۆڵی (مجیدو) دەبێت... ئەو بەڕێوەیە... ئەوان دەتوانن ئیمزا لەسەر ڕێککەوتنامەی ئاشتی بکەن کە دەیانەوێت... بەڵام ئەو ئیمزایانە هەرگیز هیچ شتێك جێ بەجێ ناکات... من پلان داناریژم بۆ چوونە ناو دۆزەخێکی داهاتووەوە... خوداوەند خۆی لە ئاسمانەوە دادەبەزێت... ئەی خوداوەند من بەختەوەرم لەو پێناوەدا... ئەو بەڕێوەیە دووبارە... من هەرگیز گوێ نادەم بەوەی کە لە ئەنجامی (هرمجدون) دا دروست دەبێت لە دڵەڕاوکێ و کیشە و گرفت، چونکە ئەوە ئارامی دەبەخشێتە گیانم)).

لە یەکێ لە وتەکانی سەرۆکی ئەمریکی (رونالد ریگان) کە ڕۆژنامەی (Jerusalem post) لە بەرواری ١٩٨٣/١٠/٢٨ بڵاوی کردووەتەوە لە گەڵ بەڕێوەبەری جێبەجێکردنی لوبی زایۆنی (صەهیونی) (الإیباك)، ریگان گوتی: ((کاتێ دەڕوانمە پێشبینیە کۆنەکانتان لە (العهد القدیم) دا و دەڕوانمە پەیوندییە پێشبینی کراوەکە دەربارەی جەنگی (الأرماجدون) خۆم دەبینمەوە ڕووبەڕووی پرسیارێك دەبمەوە، ئاخۆ ئێمە ئەو نەوەین کە ئەو ڕووداوە ببینین؟ نازانم ئەگەر لەم دواییەدا تێبینی کام لەم پێشبینیانەم کردبێ بەڵام باوەڕم پێیکە بێ گومان ئەوە دەگونجێ و جووتە لە گەڵ ئەم سەردەمەی تیایدا دەژین)).

قسە و باسێکی زۆر هەیە (نامەوێ لەوە زیاتر درێژەی پێ بدەم) هەمووی دووپاتی دەکەنەوە کە کارەکە تەنها وشە یان ئەندێشە و بیر نییە بەڵکو بیروباوەڕێکی دامەزراوە لە ناخ و دڵی ئەو میللەتەدا.

حەز دەکەم لێرەدا دووپاتی بکەمەوە کەوا ئێمەیش باوەڕمان هەیە باوەڕێکی بتەو کە وشەی (هر مجدون) لە گوفتاری پێغەمبەری ڕاستگۆ وە نییە ﷺ کەسێکی ژیر ناتوانێت چ جا زانایەك بڕیار بدات و، یەکلایی بکاتەوە، کە ئەوە ئەو داستانە گەورەیە کەوا پێغەمبەری ڕاستگۆ و باوەڕپێکراو ﷺ باسی کردووە، ئەو کەسەی کە

هیچ قسەیەك لە خۆ وە ناكات، لە فەرموودەیەكی دروستدا(صحیح) دا كە ئیمامی (مسلم) ریوایەتی كردووە لە فەرموودەی (ابی هریرە) ەوە دەفەرمویت: راستگۆی باوەرپێكراو ﷺ فەرموویەتی: ((لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَنْزِلَ الرُّومُ بالأعْماقِ أوْ بَدابِقِ ))، واتە: قیامەت هەڵناسێت تاكو ڕۆمەكان كۆ نەبنەوە دژی موسڵمان لە (أعماق) یان لە (دابق))) . كەوابوو (رۆمەكان) كێن؟ رۆمەكان (بەنی الاصفر)ن كە درێژبوونەوەیان لەم سەردەمەدا ئەوروپی و ئەمریكییەكانن. (الأعماق) لە كوێیە؟ الأعماق: ناوەراستی وڵاتی شامە .

هەر بە قەستی گەڕامەوە بۆ فەرهەنگە زمانەوانییە كۆنەكان بۆ ئەوەی لە مانای ئەو دوو وشەیە بگەم كە پێغەمبەری خواﷺ باسی كردووە ئەوانیش (الأعماق و دابق)ە، لە كۆتاییدا و لەو فەرهەنگە زمانەوانیەدا بۆم دەركەوت كە (الأعماق): جێگایەكە نزیكی (دابق) لە نێوان حلب (سوریا) و أنطاكیا (توركیا)[1]. صەلات و سەلام لەسەر ئەو كەسەی كە لە خۆ وە قسە ناكات كە دەفەرمویت:((لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَنْزِلَ الرُّومُ بالأعْماقِ أوْ بَدابِقِ ))، واتە: قیامەت هەڵناسێت تاكو ڕۆمەكان كۆ نەبنەوە لە دژی موسڵمان لە (الأعماق) یان لە (دابق)،)) دووبارە فەرموی: (( فَيَخْرُجُ إلَيْهِمْ جَيْشٌ مِنَ المَدِينَةِ مِنْ خِيَارِ أهْلِ الأرْضِ يَوْمَئِذٍ، فَإذَا تَصَافُّوا للقتال))، واتە: سوپایەك لە مەدینەوە دەردەچیّ بۆ سەر رۆمەكان، كە ئەو سوپایە لە باشترین و هەڵبژێردراوترینی ئەهلی سەر زەوی یە لەو كاتەدا،جا كە بەرامبەر رۆمەكان وەستان بە مەبەستی كوشتار...)) واتە: هەردوو لەشكرەكە ئامادەی جەنگ و تێكەڵ بوون و شەڕ بوون، بۆ بەرپاكردنی جەنگێكی یەكلایی كەرەوەی جیاكەرەوە ((قَالَتِ الرُّومُ: خَلُّوا بَيْنَنَا وَبَيْنَ الَّذِينَ سَبَوْا[2] مِنَّا نُقَاتِلْهُمْ ))، واتە: رۆمەكان

---

١ـ راجع ((معجم البلدان)) (٣٠٨، ٤٥٤٠)،وقد قال النووي (رحمه الله) في ((شرح مسلم)) (٩ / ٢٤٨، ٢٤٩): ((الأعماق، بفتح الهمزة، وبالعين المهملة، و دابق، بكسر الباء الموحدة وفتحها، والكسر هو الصحيح المشهور، ولم يذكر الجمهور غيره.. وهو اسم موضع معروف و (الأعماق و دابق) موضعان بالشام بقرب حلب)).

٢ـ قال النووي (رحمه الله) في ((شرحه لمسلم)) (٩ / ٢٤٩): ((سبوا: على وجهين: فتح السين والباء، وضمهما، قال القاضي في ((المشارق)): ((الضم رواية الأكثرين. قال: وهو الصواب))، قلت: كلاهما صواب، لأنهم سبوا أولاً ثم سبوا الكفار)) انتهى المراد.

دەڵێن: ئەی سوپا ئێوە ڕێگامان بۆ چۆڵ بکەن و وازمان لێ بهێنن تا بچینە سەر ئەو موسڵمانانەی کە لە ئێمەیان بە دیل گرتووە (سبوا منا) بۆ ئەوەی بجەنگین دژیان.

ئەمە مانای چییە؟

الحافظ (إبن كثير) –رحمه الله– دەڵێت[1]: ((ئەم وشە پێغەمبەرایەتییەوە بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی زۆربەی ئەهلی ڕۆمەکان – واتە: لە ئەورووپی و ئەمریکییەکان بە زمانی ئەم سەردەمە– ملکەچی خوای گەورە و باڵا دەست دەبن لە دوا سەردەمدا)) وە باوەڕ دەهێنن بە محمدﷺ و دێنە پاڵ ڕیزی موسڵمانان، شان بە شان موسڵمانان دەجەنگن چونکە ئەوان بوونە بەشێك لەوان . کەوابوو بیرکەرەوە –ئەی موسڵمان– تاکو داروخان دزە نەکاتە دڵتەوە و سەرت بڵند بکەرەوە با لە گەڵ ئەستێرەی جەوزادا دەست لەملان بکات چونکە نۆرەی داهاتوو بۆ دینی محمدەﷺ بە پشتیوانی خوای باڵا دەست.[2]

---

١ـ في ((النهاية في الفتن)) (١ / ٥٦)

٢ـ حەزم دەکرد بە درێژی روونم بکردایەتەوە کە سەرکەوتن و سەرخستن بۆ دینی خوا چۆن دەبێت؟ سوپاس بۆ خوا کە یارمەتی داین بۆ باسکردنی ((دواین ڕووداوەکان)) بۆ ئەوەی بۆ بەڕێزتان ئەو شتانە باس بکەین کەوا زۆربەی برا و خوشکانمان بیری لێ دەکەنەوە لە گەڵ ئەم واقیعە تاڵەدا کە پڕە لە خوێن ڕشتن و جەستەی پارچەکراوی موسڵمانان لەسەر ڕووی زەویدا، بەڵکو ئەم هێرشەی دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە لایەن زلهێزەکانی جگە لە موسڵمانانەوە کەوا ئێستا دەم درێژی دەکەنە سەر ئیسلام و پێغەمبەری خواﷺ!! بۆیە زۆربەی ئەو برا و خوشکانەمان پرسیار دەکەن و دەڵێن: چۆن خوای گەورە دەسەڵات دەداتە ئەم دینە و سەری دەخات و کەی سەری دەخات؟ وە دەزانم هەمووان دڵیان دەسوتێ و دەیانەوێ مژدەکانی سەرکەوتن بە چاوی خۆیان ببینن، وە دەیانەوێ بە گوێی خۆیان هەواڵەکانی سەرکەوتن و عیززەت ببیسن، بەڵام خوای گەورە هەرگیز پەلە ناکات لە بەر پەلەی کەسێك، وە هیچ کەسێك نییە لە خوای گەوەر بە غیرەت تر بێت بۆ دینەکەی، وە هیچ کەسێك لەو بە غیرەت تر نییە بۆ سەرخستنی حەق، وە هیچ کەسێك لەو بە بەزەیی تر نییە بەو موسڵمانە لاوازانەی کە ڕۆژانە دەکوژرێن و خوێنیان دەڕژێت و جەستەیان پارچە پارچە دەکرێت. ((الله أرحم بعباده من رحمة الأم بولدها)) برا و خوشکانم ئەگەر حیکمەت و دانایی لای ئێمە دیار نەبێت ئەوا هەرگیز لە خوای گەورە بزر نابێت، ئەگینا چۆن حیکمەت دەدەیە پاڵ خۆت لە کاتی بەخشیندا یان لە کاتی دەست گرتنەوەت، بەڵکو لە هەر کارێك کە دەیکەیت و کەچی نەفی حیکمەت دەکەیت لەو کەسەی کە حیکمەتی بەخشیوەتە هەموو حەکیمەکانی سەر زەوی؟ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُؤْتِي ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ البقرة: ٢٦٩.

((قَالَتِ الرُّومُ: )) واته: ڕۆمەکان به موسڵمانانیان گوت: (( خَلُّوا بَيْنَنَا وَبَيْنَ الَّذِينَ سَبَوْا مِنَّا نُقَاتِلْهُمْ )) واته: ئەوانەمان بۆ دەرکەن که له ڕۆمن له سەرتادا . پاشان خوای گەورە سنگیانی فراوان کردووەتەوە بۆ وەرگرتنی ئیسلام و ئەمجار پەیوەندییان کردووە به ریزی موسڵمانانەوە به فەزڵی خوای پەروەردگار (( فَيَقُولُ الْمُسْلِمُونَ: لاَ وَ الله ! لاَ نُخَلِّي بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ إِخْوانِنَا فَيُقَاتِلُونَهُمْ ))، واته: موسڵمانەکانیش دەڵێن: نەخێر سوێند به خوا ڕێگاتان بۆ چۆڵ ناکەین بۆ سەر برا موسڵمانەکانمان، ئەمجار جەنگ دەست پێ دەکات)) کوشتار دەست پێدەکات، سەرنجی ئەم باسکردنه ورد و جوانه بدە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێت: ((فَيَنْهَزِمُ ثُلُثٌ لاَ يَتُوبُ الله عَلَيْهِمْ أَبَداً))، واته: سێیەکی سوپای موسڵمانان پاشه کشه دەکات و را دەکات، که هەرگیز خوای گەورە لەوان تەوبه وەرناگرێت))، واته: خوای گەورە تەوبه ناخاته دڵیانەوە! ولا حول ولا قوة إلا بالله، یەکەم سێیەکی لەشکری موسڵمانان پاشه کشه دەکات و رادەکات! بۆ؟ له کاتێکدا ئەوانه له ریزی لەشکردان و (شمشێر) یان چەکەکانیان هەڵگرتووە– ئەمه پێویستی به باسکردنێکی دوور و درێژه پشت به خوا ڕوونی دەکەمەوە–.

له ڕیوایەتێکی تردا که له(صحيح مسلم) هاتووە[1] (له پاشان باسی دەکەم إنشاء الله) سێیەکی ئەم لەشکرە بەرانبەر ئەم فیتنەیه هەڵگەڕانەوە و پاشگەز بوونەوە و وازیان له دینەکەیان هێناوە به گشتی.

داوا له خوا دەکەین ئێمه و ئێوە دامەزراو بکات لەسەر حەق و ڕاستی و ئیسلام تاکو دەگەینه خوای پەروەردگارمان هەر خۆی پشت و پەنامانه.

بۆیه ئاگادارت دەکەمەوە –براکەم– خۆزگه به ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن مەخوازە یان سنگی خۆت بکەیتەوە بۆ فیتنه و بڵێیت: من لەوە گەورەترم توشی بەلایەك ببم به فیتنەیەك کاریگەری لەسەر دڵم هەبێت، یان لەسەر دینەکەم! نەخێر! !. ڕەحمەتی خوا له(مطرف ی کوڕی عبدالله) بێت که فەرموویەتی[2]: ((لأَنْ

---

١ ـ (برقم: ٢٨٩٩)

٢ ـ أخرجه أحمد في ((الزهد)) (٢٩٤)، ووكيع (٢٠١)، وهناد (٢٥٤)، – في الزهدبسندٍ صحيح.

أُعَافَى فَأَشْكُرُ خَيْرٌ مِنْ أَنْ أُبْتَلَى فَأَصْبِر)) واتە: خوای گەورە لەشساغیم پێ ببەخشێ و سوپاسگوزاری بم پێم باشترە لەوەی توشی بەلایەك ببم و ئارام بگرم)) چونکە تۆ نازانیت لە کاتی بەلا و ڕووبەڕووبونەوەی دوژمندا ئایا ئارام دەگری یان پاشگەز دەبیتەوە؟.

بۆیە پێغەمبەری ڕاستگۆﷺ دەڵێت: ((لا تَتَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ))،[1] واتە: خۆزگە بە ڕووبەڕووبونەوەی دوژمن مەخوازن))، بەلام ئەگەر خوای گەورە قەدەری وابوو بە یەك بگەن لە گەڵ دوژمندا ئەوا دامەزراو بن. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُواْ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾الأنفال: ٤٥، ((واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! کاتێ لە گەڵ دەستەیەك لە دوژمنان بە یەك دەگەن لە جەنگدا بەرامبەریان مەحکەم و دامەزراو بن و هەرگیز هەڵ نەیەن وە یادی خوا زۆر بکەن، بەڵکو سەرفەراز بن و سەرکەون)).

لەو دوا جەنگە یەکلایی کەرەوەدا سێیەکی لەشکری ئیسلامی دەشکێن و شکست دەهێنن . بەلام دووەم سێیەك ئەوا پێغەمبەری ڕاستگۆﷺ دەفەرموێت: (( وَيُقْتَلُ ثُلُثُهُمْ، أَفْضَلُ الشُّهَدَاءِ عِنْدَ الله))، واتە: سێیەکیان دەکوژرێن کە باشترین شەهیدن لە لای خوا)).

ئەی خودایە!! وریابە براکەم... شەهیدبوونیش پوختەو پاڵفتەی هەیە... ئەوەی بە شەهیدی دەمرێت ئەوە هەڵبژاردە و دەستنیشانکراوە، چونکە مەرج نییە ئەوەی لە گۆرەپانی جەنگدا بکەوێت ئەوا دەبێتە شەهید، ڕەنگە کەسێك لە گۆرەپاندا بکوژرێت کەچی ئەو کەسێکی ئەهلی ئاگر بێت!! چی دەڵێیت؟!

من پێت دەڵێم: ڕەنگە کەسێك لە گۆڕەپاندا بکوژرێت کەچی لای خودا بە ئەهلی ئاگر بژمێردرێت چونکە هەموو کردەوەکان پەیوەستن بە نیەت و نیاز و مەبەستەوە

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب الجهاد والسير، باب لا تتمنوا لقاء العدو (٣٠٢٤، ٣٠٢٦)، ومسلم، كتاب الجهاد، باب كراهية تمني لقاء العدو (١٧٤١، ١٧٤٢).

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ البينـة: ٥، ((واتە: لە هەمان کاتا لە (تەورات و ئینجیل) دا فرمانیان پێ نەدرابوو بەوە نەبێ کە بە تەواوی هەموو خوا بپەرستن و سەر بۆ ئەو دانەوێنن و ئاینی خالیس هەر بۆ ئەو دابنێن)) .

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی[1]: ((إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللهِ وَرَسُولِهِ، فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللهِ وَرَسُولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا أَوِ امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ ))، واتـە: کـردەوە و پەرستشەکان تەنها بە نیەتەوە دەبن وە هەموو کەسێکیش تـەنها ئـەوەی بـۆ هەیـە کـە نیـەتی لـێ هێنـاوە، هـەر کەسـێ مەبەسـتی لـە کۆچـکردنەکەی بـۆ خـوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ بوو ئەوا کۆچکردنەکەی بۆ خوا و پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ وە هەر کەسێ مەبەستی لە کۆچکردنەکەی بۆ شتێکی دونیایی بـوو بـە دەسـتی بهێنێ یـان ئافرەتێك کە مارەی بکات ئەوا کۆچکردنەکەی بۆ ئەوەیە کە کۆچی بۆی کردووە)).

بەڵێ... ئەوەی دەیـەوێت لـەم دونیایـەدا دەسـتی دەکـەوێت... دەیـەوێ ببێتـە پاڵەوان.. دەیەوێ ببێتە کەسێکی دلێر و ئازا... دەیەوێ ببێتە کەسێکی جـوامێر... دەیەوێ دەزگاکانی ڕاگەیاندن ئاماژەی بـۆ بکـەن... دەیـەوێ لێـرە و لـەوێ وێنـەی بگرن!! ئەمە ئەوەیە کە ئەو دەیەوێ ... هەمووی لە دەنیادا بە دەستی هێنا بەڵام لە ڕۆژی دواییدا هیچ پشکێکی لە لایەن خوداوەنـدی بـاڵا دەسـتەوە نییـە هـەروەکو چۆن لە هەردوو کتێبی (الـصحيح)[2] دا هـاتووە لـە فەرموودەیـەکی (سـهل ی کـوڕی سعد الساعدی) کە دەفەرموێت: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ الْتَقَى هُوَ وَالْمُشْرِكُونَ فَاقْتَتَلُوا فَلَمَّا مَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَى عَسْكَرِهِ وَمَالَ الآخَرُونَ إِلَى عَسْكَرِهِمْ، وَفِي أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ رَجُلٌ لاَ يَدَعُ لَهُمْ شَاذَّةً وَلاَ فَاذَّةً إِلاَّ اتَّبَعَهَا يَضْرِبُهَا بِسَيْفِهِ فَقَالَ: مَا أَجْزَأَ مِنَّا الْيَوْمَ أَحَدٌ كَمَا أَجْزَأَ فُلاَنٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ((أَمَا إِنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ)) . فَقَالَ رَجُلٌ

١ـ أخرجه البخاري، كتاب الأيمان والنذور،باب النية في الإيمان (٦٦٨٩)، و مسلم، كتاب الإمارة (١٩٠٧) عن عمر.

٢ـ أخرجه البخاري كتاب الجهاد والسير، باب لا يقول: فلان شهيد (٢٨٩٨) ومسلم، كتاب الإيمان، باب غلظ تحريم قتل الإنسان نفسه (١١٢) عن سهل.

منَ الْقَوْمِ: أَنَا صَاحِبُهُ، قَالَ: فَخَرَجَ مَعَهُ كُلَّمَا وَقَفَ وَقَفَ مَعَهُ، وَ إِذَا أَسْرَعَ أَسْرَعَ مَعَهُ، قَالَ: فَجُرِحَ الرَّجُلُ جُرْحاً شَدِيداً، فَاسْتَعْجَلَ الْمَوْتَ، فَوَضَعَ نَصْلَ سَيْفِهِ بِالأَرْضِ، وَذُبَابَهُ بَيْنَ ثَدْيَيْهِ ثُمَّ تَحَامَلَ عَلَى سَيْفِهِ فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَخَرَجَ الرَّجُلُ إِلَى رَسُولِ اللهِﷺ فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ الله، قَالَ: (وَمَا ذَاكَ ؟) . قَالَ: الرَّجُلُ الَّذِي ذَكَرْتَ آنفاً أَنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَأَعْظَمَ النَّاسُ ذَلِكَ . فَقُلْتُ: أَنَا لَكُمْ بِهِ، فَخَرَجْتُ فِي طَلَبِهِ ثُمَّ جُرِحَ جُرْحاً شَدِيداً، فَاسْتَعْجَلَ الْمَوْتَ، فَوَضَعَ نَصْلَ سَيْفِهِ فِي الأَرْضِ، وَذُبَابَهُ بَيْنَ ثَدْيَيْهِ، ثُمَّ تَحَامَلَ عَلَيْهِ فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِﷺ عِنْدَ ذَلِكَ: ((إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الْجَنَّةِ فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ وَ هُوَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، وَ إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ وَ هُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ ))، واتە: پێغەمبەری خواﷺ ڕووبەڕووی بێ باوەڕان بووەوە و دەستیان بە کوشتار کرد،پاشان پێغەمبەری خواﷺ لایدا و ڕۆیشت بۆ بنکە سەربازییەکەی خۆی و ئەوانیش لایاندا و ڕۆیشتن بۆ بنکە سەربازییەکەی خۆیان، کابرایەك هەبوو لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ هیچ کەسێکی دەگمەن و بێ وێنەی جێنەدەهێشت ئیللا شوێنی دەکەوت و بە شمشێر لێی دەدا... فەرمووی: هیچ کەسێك لە ئێمە ئەمڕۆ وەکو پاداشتی (فلان)ی دەسنەکەوتووە، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((ئەو لە ئەهلی ئاگرە)) کابرایەك لە خەڵکەکە لە دڵی خۆیدا فەرمووی: من هاوەڵی ئەوم . دەڵێ: دەرچووم لە گەڵیدا هەر کاتێك ئەو ڕابوەستایە ئەوا منیش ڕادەوەستا وە ئەگەر پەلەی بکردایە ئەوا منیش پەلەم دەکرد... فەرمووی: کابرا بە برینێکی سەخت بریندار بوو... بۆیە پەلەی کرد بۆ ئەوەی زوو بمرێت... جا سەری شمشێرەکەی لە زەوی نا و نووکەکەی خستە سەر سنگی خۆی ئەمجار خۆی دا بە سەر شمشێرەکەدا و خۆی کوشت، پاشان کابرا ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ و فەرمووی: أشهد أنك رسول الله... فەرمووی: چی بووە؟ فەرمووی: ئەو کابرایەی لە پێشدا باست کرد کەوا لە ئەهلی ئاگرە... و خەڵکی ئەو قسەیان بە گەورە زانی، من گوتم: دەبێ شوێنی بکەوم و بە شوێنیدا دەرچووم ئەمجار بە سەختی بریندار بوو،پەلەی کرد بۆ مردن و سەری شمشێرەکەی لە زەوی نا و نووکەکەی خستە سەر سنگی و ئەمجار خۆی دا بە سەریدا و خۆی کوشت، پێغەمبەری خواﷺ لەو کاتەدا فەرمووی: ((کەسی وا هەیە کردەوەی ئەهلی

بەهەشت ئەنجام دەدات بە بۆچوونی خەڵکی کەچی ئەو لە ئەهلی ئاگرە وە کەسی وا هەیە کردەوەی ئەهلی ئاگر ئەنجام دەدات بە بۆچوونی خەڵکی کەچی ئەو لە ئەهلی بەهەشتە)).

ئەوەتا ئەم پیاوە شمشێری هەڵگرتووە و لە گەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ و لە ریزی یەکتاپەرستان دەجەنگێ و لە گەڵ ئەوەیشدا پێغەمبەری راستگۆ ﷺ ئەو کەسەی کە لە خۆ وە هیچ قسەیەك ناکات حوکمی دەدا بە سەردا بە حوکمێکی ترسناك .... ئەی خودایە کۆتامان بە چاکە بگێڕی ...

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێت: ((إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالخَوَاتِيمِ))[1] واتە: هەموو کردار و رەفتارەکان بە پێی دواییینیانە)) ڕەنگە کەسێك لە گۆڕەپاندا بکوژرێت و لە ئەهلی ئاگر بێت هەروەکو باسمان کرد. لە گەڵمدا بگەڕێوە بۆ ریوایەتی فەرموودەکە: (( فَيَنْهَزِمُ ثُلُثٌ لا يَتُوبُ الله عَلَيْهِمْ أَبداً، وَيُقْتَلُ ثُلُثُهُمْ أَفْضَلُ الشُّهَدَاءِ عِنْدَ الله ))، واتە: سێیەکی سوپای موسڵمانان پاشە کشە دەکات و را دەکات هەرگیز خوای گەورە لەوان تەوبە وەرناگرێت، سێیەکیان دەکوژرێن باشترین شەهیدن لە لای خوا)) ئەی ئاخۆ سێیەم سێیەکیان چییان بە سەر دێت؟ وەڵامەکە لە فەرموودەکەی پێغەمبەری خوادایە ﷺ: ((وَيَفْتَتِحُ الثُّلُثُ)) واتە: (ئەو سێیەکەکە سەردەکەون و رزگار دەکەن) . واتە: ئەو سێیەکەی کە ماوەتەوە . هەروەکو باسمان کرد سێیەکی لەشکری ئیسلامی هەڵگەڕانەوە و سێیەکی دووەمیان کوژران و ئەوەی ماوەتەوە سێیەم و دوایین سێیەکن ئەمجار پێغەمبەری خوافەرمویەتی ﷺ: ((لاَ يُفْتَنُونَ أَبَداً))، واتە: ((هەرگیز توشی فیتنە نابن)). هیچ فیتنەیەك نییە کە کار لەم کۆمەڵە هەڵبژێردراوە بەرێزە بکات... ئەمە ئەو کۆمەڵەیە کە زۆر پاککراونەتەوە و دراونە لە بێژنگ، ئەوانە پوختەی پوختەکانن.

ڕیوایەتی دووەم، کە بەڵێنم پێدان لە ((صحيح مسلم))[2] هاتووە لە (يسير ی کوڕی جابر) ەوە دەڵێت: ((هَاجَتْ رِيحٌ حَمْرَاءُ بِالْكُوفَةِ)) واتە: ((بایەکی سوور لە

---

١ـ أخرجه البخاري: كتاب القدر، باب العمل بالخواتيم (٦٦٠٦).

٢ـ أخرجه مسلم، كتاب الفتن و أشراط الساعة، باب إقبال الروم في كثرة القتل عند خروج الدجال (٢٨٩٩).

کوفه هەڵچوو(هەڵیکرد))) ئایا به بیرتدا دێت کاتێ بایەکی به زەبر ئاسمان و دەور و بەرت پڕ بکات له تۆزێکی سوور؟! ئەوە ترسێکه و دڵەکان له بن دەردەهێنێ... تەنها کاتێ که (با) یەکه هەڵدەچێت... تەماشای ئەو خۆڵه زەردە دەکەین که دەیبینین و خەریکه به هۆیەوه هیچ شتێك نەبینین و دڵەکان خەریکن له بن دەردەچن؟ له کاتێکدا (با) سەربازێکه له سەربازەکانی خوای گەورەی باڵادەست، ئەوەش بزانه خوای گەورە چەندەها میللەتی بە(با) له ناو بردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ ۝٦ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَانِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى الْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَى كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ۝٧ فَهَلْ تَرَى لَهُمْ مِنْ بَاقِيَةٍ﴾ الحاقة: ٨، واته: هەرچی (گەلی) عادیش بوو – که خوا پەیامبەرێکی بۆ ناردبوون– به (با) و گەردەلوولێکی ساردی سەختی هەرەبەهێز له نێو چوون(٦) حەوت شەو و هەشت ڕۆژ لەسەر یەك: خوا زاڵی کرد به سەریاندا، جا ئەگەر لەوێ بوایەیت ئەو گەلەت دەدی لەو شەوان و ڕۆژانەدا به مردوویی کەوتوون وەکو کۆتەرەی پواوی دارەخورما(٧) جا ئایا دەبینی کەسیان مابێتەوە ..؟(٨))) کەوابوو (با) ئایەتێکه له ئایەتەکانی خوای گەورە بۆیه ئەگەر کاتێ پێغەمبەری خواﷺ (با) یەکی ببینایه ئەوا زۆر لێی دەترسا, له هەردوو کتێبی (الصحیح)[١] دا هاتووه له دایکی ئیماندارانەوە (عائیشه) فەرموویەتی: ((كَانَ النبيّﷺ إِذَا رَأَى غَيْماً أَوْ رِيحاً عُرِفَ فِي وَجْهِهِ . قَالَتْ: يَا رَسُولَ الله، إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوُا الْغَيْمَ فَرِحُوا رَجَاءَ أَنْ يَكُونَ فِيهِ الْمَطَرُ وَأَرَاكَ إِذَا رَأَيْتَهُ عُرِفَ فِي وَجْهِكَ الْكَرَاهِيَةُ؟ فَقَالَ: ((يَا عَائِشَةُ مَا يُؤْمِنِّي أَنْ يَكُونَ فِيهِ عَذَابٌ؟ عُذِّبَ قَوْمٌ بِالرِّيحِ، وَقَدْ رَأَى قَوْمٌ الْعَذَابَ، فَقَالُوا: ﴿هَذَا عَارِضٌ مُمْطِرُنَا﴾ الأحقاف: ٢٤، واته: پێغەمبەری خواﷺ ئەگەر هەورێك یاخود (با) یەکی ببینایه ئەوا به سیما و ڕوویدا دەزانرا، عائیشه فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب التفسير باب قوله: (({فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَذَا عَارِضٌ مُمْطِرُنَا بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ} الأحقاف: ٢٤)). (٣٢٠٦) و (٤٨٢٩)، ومسلم، كتاب صلاة الأستسقاء، باب التعوذ عند رؤية الريح و الغيم والفرح بالمطر (٨٩٩ / ١٦).

ئەگەر خەڵکی هەورێك ببینن ئەوا خۆشحاڵ دەبن بە ئاوات و تکای ئەوەی بارانی تیادا بێت کەچی من دەتبینم ئەگەر تۆ هەورێك ببینی ئەوا بە سیما و ڕووتدا بێ زارییەك دەردەکەوێت؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئەی عائیشە کێ دڵنیام دەکاتەوە کە ئەو هەورە سزای تیادا نییە؟ میللەتێك بە(با) سزا دران کەچی پێش وەخت سزاکەیان بینیبوو و گوتوویان: ((هَذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا)) واتە: وتیان: ئەمە هەورێکە بارانمان بۆ دەبارێنێ)).

تا ئەو ڕادەیە باوك و دایك و گیانم بە فیدای بێتﷺ دەزانن ئەوە کێیە؟ ئەو ئەو کەسەیە کە خوای گەورە لە هەموو گوناهەکانی رابوردوو و ئایندەیشی خۆش بووە!

(یسیر ی کوڕی جابر) دەڵێت: ((هَاجَتْ رِيحٌ حَمْرَاءُ بِالْكُوفَةِ، فَجَاءَ رَجُلٌ لَيْسَ لَهُ هِجِّيرِي))، واتە: بایەکی سوور لە کوفەوە هەڵچوو(هەڵیکرد) کابرایەکی دەنگ بەرز هات))، واتە: کابرایەکی دەنگ بەرز بوو، لە بەر کاردانەوەی ڕووداوێك لە قسەکانی تێنەدەگەیشتی، لە بەر دڵەڕاوکێ و ترسەوە... کابرایەك ئەم دیمەنەی بینیوە، هاتووەو دەگەڕێت بە دوای هاوەڵێکدا لە پێشەوای هاوەڵان و بۆیە (عبداللە ی کوڕی مەسعود) ی بینی، ئەو هۆشمەندە زانایەی بینی، هات بۆ ئەوەی پرسیاری لێ بکات: ((يَا عَبْدَاللهِ بْنَ مَسْعُودٍ! جَاءَتِ السَّاعَةُ، قَالَ: فَقَعَدَ وَكَانَ مُتَّكِئاً))، واتە: ئەی (عبداللە ی کوڕی مەسعود) قیامەت هات، فەرمووی: بۆیە (عبداللە) ڕاست بووەوە و دانیشت لە کاتێکدا ڕاکشابوو)). بۆیە دەبێ لە کاتی فیتنەدا بگەڕێینەوە بۆ لای زانایان، چونکە ئەوان ڕێنیشاندەرن بەرەو حەق و ڕاستی، چونکە ئەوانە دەڵێن: (خوای گەورە فەرمووی و پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی...)، بۆیە (إبن مسعود) ئاگاداری کردەوە کە هێشتا کاتی هاتنی قیامەت ماوە، (ابن مسعود) فەرمووی: ((إِنَّ السَّاعَةَ لا تَقُومُ حَتَّى لاَ يُقْسَمَ مِيرَاثٌ، وَلا يُفْرَحَ بِغَنِيمَةٍ، ثُمَّ قَالَ بِيَدِهِ هَكَذَا _ وَنَحَّاهَا نَحْوَ الشَّامِ _ فَقَالَ: عَدُوٌّ يَجْمَعُونَ لأَهْلِ الإِسْلاَمِ، وَيَجْمَعُ لَهُمْ أَهْلُ الإِسْلامِ))، واتە: قیامەت ڕوو نادات تاکو ئەو کات و سەردەمەی میراتی تیادا دابەش ناکرێت و بە دەستکەوت (غەنیمە) دڵخۆش نابن ئەمجار بە دەستەکانی ئیشارەتی بۆ شام

کردووە فەرمووی: دوژمنێك کۆدەبنەوە لە دژی ئەهلی ئیسلام وە ئەهلی ئیسلامیش کۆ دەبنەوە بۆیان)).

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَلَا يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَاعُوا۟﴾ البقرة: ٢١٧، ((واتە: بێ گومانبن هەمیشە ئەو بێ باوەڕانە جەنگتان لە گەڵ دەکەن و هەرگیز کۆتایی ناهێنن و دەست هەڵناگرن " تا ئەگەر بۆیان بگونجێ" لە ئاینتان وەردەگێڕن)) خوای گەورە نەیفەرموو (تاکو لە زەوییەکەتان دەرتان بکەن)) وە خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ﴾ البقرة: ١٢٠، ((واتە: هەرگیز ئەم جوولەکە و فەلانە لە تۆخۆشیان نایە (ئەی موحەممەدﷺ هەتا پەیڕەوی لە ئاینی و بەرنامەیان دەکەیت، واتە: هەتا نەچیتە سەر دینی ئەوان هەرگیز بە تەمای ڕەزامەندی ئەوان مەبە و، باوەڕیش ناهێنن، لە پیلان و ئاژاوەگێڕی و فەساد و خراپەکاری کۆتا ناکەن)). وە هەروەها خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّوا۟ مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ ٱلْبَغْضَآءُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ وَمَا تُخْفِى صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ ۚ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ﴾ آل عمـران:١١٨، ((واتـە: ئـەی ئەوانـەی باوەڕتان هێناوە! بە دەر لە خۆتان، کەسێك مەگرنە دۆست و مەیکەنە جێی ڕاز و نیازی خۆتان و، نهێنییەکانی خۆتانیان لا بدرکێنن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((خوا هەر پێغەمبەرێکی ناردبێ، یان هەر خەلیفەیەکی دانابێ، دوو هاوڕازی بۆ داناوە: هاوڕازێکیان فەرمانی چاکەی پێ دەکا و هانی دەدا لە سەری، ئەویکەشیان کاری خراپەی خستووەتە بەردەمی و هانیداوە لە سەری، ئیتر مەگەر خوا مرۆڤ بپارێزێ))(فتح الباری)، لە کار تێکردنتان و زیان پێگەیاندنتان دریغی ناکەن و کۆڵ نادەن، پییان خۆشەو ئاواتیانە ئێوە هەر لە دەرد و ئازاردا بن جگە لەوەش کە بە ئاشکرا دژایەتیتان دەکەن، هێشتا ئەو ڕق و قینەش لە دڵیاندا دەیشارنەوە فرەتر و گەورەترە لەوەی، کە بە زاریاندا دێ، دڵیان پڕە لە پیلان و فڕوفێڵ بەرامبەرتان، ئێمە نیشانە و بەڵگەی زۆرمان بۆ ڕۆشن کردەوە هەتا بەو ئایەتانە دۆست و دوژمن لێك بکەنەوە، ئەگەر ئێوە تێ بفکرێن و دەرکی ڕاستییەکان بکەن، ئەزانن کێ بگرنە

دۆست و هاوڕاز، بەڵێ زۆر گرنگە موسڵمانان دۆست و نەیاری خۆیان بناسن، زۆریش پێویستە کار و باری خۆیان نەخەنە بەر دەس دوژمنانی دینی خوا، زۆریش مەبەستە نەکرێنە هاوڕاز و کار و باری نهێنی و ئاشکرای موسڵمانان بزانن)).

ئەمە ئەو قورئانەیە، کە لە بەر دەستماندایە ئەی یەکتاپەرستان ...(ابن مسعود) فەرمووی: ((عَدُوٌّ يَجْمَعُونَ لأَهْلِ الإِسْلاَمِ وَيَجْمَعُ لَهُمْ أَهْلُ الإِسْلاَمِ، قُلْتُ: الرُّومَ تَعْنِي؟ قَالَ: نَعَمْ))، واتە: دوژمنێك کۆدەبنەوە لە دژی ئەهلی ئیسلام ، ئەهلی ئیسلامیش کۆ دەبنەوە بۆیان، گوتم: مەبەستت ڕۆمەکانە؟ فەرمووی: بەڵێ)) ئەمجار تەماشای ئەم داستانە بکە و بزانە چۆن دەبێت؟ فەرمووی: ((وَتَكُونُ عِنْدَ ذَاكُمُ الْقِتَالِ رَدَّةٌ شَدِيدَةٌ)) واتە: لەو جەنگەدا هەڵگەڕانەوەیەکی توند روو دەدات)).

ئەمەش یەکەمین سێیەکە هەروەکو لە ریوایەتەکەدا هاتبوو وە لە پێشدا باسمان کرد... هەڵگەڕانەوە و لە دین دەرچوون فەرمووی: ((فَيَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ لاَ تَرْجِعُ إِلاَّ غَالِبَةً))، واتە: موسڵمانان کۆمەڵێك پاڵەوانی ڕاستگۆی دڵسۆز پێش دەخەن بۆ ئەوەی ببنە پێشەنگیان لەم جەنگەدا، بۆ ئەوەی ببنە پێشەنگی ئەم لەشکرە ئیسلامییە، ئەوانەیش مەرج لەسەر خۆیان دادەنێن و پەیمان بە خوای خۆیان دەدەن کە نابێت بگەڕێنەوە ناو ریزی لەشکری موسڵمانان تاوەکو یەکێك لەو دوو ئامانجە دەستەبەر نەکەن: یان سەرکەوتن، یان شەهید بوون ((فَيَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ لاَ تَرْجِعُ إِلاَّ غَالِبَةً فَيَقْتَتِلُونَ حَتَّى يَحْجُزَ بَيْنَهُمُ اللَّيْلُ، فَيَفِيءُ هَؤُلاَءِ وَ هَؤُلاَءِ كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ))، واتە: موسڵمانان و جگە لە موسڵمانان دەگەڕێنەوە، لەم ڕۆژەدا سەرکەوتن نە بۆ موسڵمانان و نە بۆ دوژمنانی موسڵمانان دەستەبەر نابێت: ((وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ))، واتە: ئەوانەی کە پەیمانیان بە پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکان دابوو لەسەر سەرکەوتن یان شەهید بوون هەموو لە ناو دەچن)) فەرمووی: ((فَإِذَا كَانَ الْيَوْمُ الثَّانِي)) تەماشای ڕۆژانی جەنگەکە بکە چۆن پێغەمبەری خواﷺ ڕۆژەکانی بە جوانی دیاری کردووە فەرمووی: ((فَإِذَا كَانَ الْيَوْمُ الثَّانِي: فَيَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ لاَ تَرْجِعُ إِلاَّ غَالِبَةً فَيَقْتَتِلُونَ حَتَّى يَحْجُزَ بَيْنَهُمُ اللَّيْلُ، فَيَفِيءُ هَؤُلاَءِ وَ هَؤُلاَءِ كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ فَإِذَا كَانَ الْيَوْمُ الثَّالِثُ: فَيَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ، لاَ تَرْجِعُ إِلاَّ غَالِبَةً، فَيَقْتَتِلُونَ حَتَّى يَحْجُزَ

بَيْنَهُمُ اللَّيْلُ، فَيَفِيءُ هَؤُلَاءِ وَ هَؤُلَاءِ كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ ))، واتە: ئەگەر ڕۆژی دووەم هات: موسڵمانان كۆمەڵێكی تر پاڵەوانی ڕاستگۆی دڵسۆز پێش دەخەن، ئەوانەیش مەرج لەسەر خۆیان دادەنێن و پەیمان بە خوای خۆیان دەدەن، كە نابێت بگەڕێنەوە ناو ریزی لەشكری موسڵمانان تاوەكو یەكێك لەو دوو ئامانجە دەستەبەر نەكەن: یان سەركەوتن، یان شەهید بوون، دیسان جەنگێكی سەخت ڕوودەدات تاوەكو تاریكایی شەو لێكیان جیا دەكاتەوە، شەڕ دەوەستێ بە بێ سەركەوتنی هیچ لایەك ، ئەو كۆمەڵە فیداكارانە هەموویان لە ناو دەچن، ئەگەر ڕۆژی سێیەم هات كۆمەڵە فیداكارێكی تر هەڵدەبژێرن، كە تا مردن نەگەڕێنەوە بە سەركەوتوویی نەبێت ئەوانیش دەجەنگن تاوەكو دیسان شەو كۆتایی بە جەنگ دەهێنێت و هەردوولا دەگەڕێنەوە بنكەكانیان بە بێ سەركەوتن بۆ هیچ لایەك وە دوای جەنگانێكی تر ئەم كۆمەڵە فیداكارەش لە ناو دەچن))، سێ ڕۆژ ئەو جەنگە بەردەوام دەبێت هیچ كۆمەڵێك لەو دوو كۆمەڵە سەرناكەوێت و، هەموو ئەو ژمارە پاڵەوانەی، كە موسڵمانان پێشیان دەخەن تا بینە پێشەنگی ئەم لەشكرە ئیسلامی یە لە ناو دەچن.

دەڵێت: ((فَإِذَا كَانَ اليَوْمُ الرَّابِعِ: نَهَدَ[1] إِلَيْهِمْ بَقِيَّةُ أَهْلِ الإِسْلَامِ فَيَجْعَلُ الله الدَّبْرَةَ عَلَيْهِمْ — وفي لفظٍ[2]: ((فَيَجْعَلُ الله الدَّائِرَةَ عَلَيْهِمْ )) -أي: على أعداء المسلمين - فَيَقْتُلُونَ مَقْتَلَةً لَمْ يُرَ مِثْلُهَا )) ئەمجار فەرمووی: ((حَتَّى إِنَّ الطَّائِرَ لَيَمُرُّ بِجَنَبَاتِهِمْ، فَمَا يُخَلِّفُهُمْ حَتَّى يَخِرَّ مَيْتاً )) واتە: ئەگەر ڕۆژی چوارەمی جەنگ هات باقی موسڵمانان بۆ ڕۆمەكان ڕاست دەبنەوە و بە گژیاندا دەچنەوە و بەربەرەكانیان دەكەن وە خوای گەورە مردن و بنەبڕ كران لەسەر ڕۆمەكان دادەنێت كوشتارێكی وایان لێ دەكرێ كە وێنەی نەبینراوە، یان نابینرێت بە شێوەیەكی وا كە باڵندە بە سەر لاشەكانیاندا بڕوات ناتوانێت لێیان تێپەڕكات و دەمرێت)) لە بەر زۆری كوژراوەكان لە گۆڕەپانی

---

١ـ أي: نهض و تقدم.

٢ـ عند ابن أبي شيبة (٧/ ٤٩١)، والحاكم (٤ / ٥٢٣). قال النووي (رحمه الله) في ((شرحه لمسلم)) (١٨ / ٢٤، ٢٥): ((رواه بعض رواة مسلم: ((الدائرة)) بالألف، وبعدها همزة، وهو بمعنى الديرة، وقال الأزهري: الدائرة هم الدولة تدور على الأعداء وقيل: هي الحادثة)).

جەنگەکەدا و لە بەر زۆری بۆنی پیسی گۆشتی گەنیو و بۆن و بەرام، هەموو دەگۆڕدرێت خەریکە وای لێ دێت هەر کە باڵندەیەك بە ئاسمانەوە تێپەڕێ دەکەوێتە خوارەوە و دەمرێت. ((فَيَتَعَادُّ بَنُو الأب كَانُوا مائَةً، فَلاَ يَجِدُونَهُ بَقِي مِنْهُمْ إِلاَّ الرَّجُلُ الْوَاحِدُ . يقول: فَبِأَيِّ غَنِيمَةٍ يُفْرَحُ؟ أَوْ أَيُّ مِيرَاثٍ يُقَاسَمُ؟ فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ سَمِعُوا بِبَأْسٍ، هُوَ أَكبَرُ مِنْ ذَلِكَ فَجَاءَهُمُ الصَّرِيخُ))، واتە: ئەو کاتە ئەوەی باوکێك کە کاتی خۆی سەد کەس بوون ئێستا سەرژمێری خۆیان دەکەنەوە سەیر دەکەن تەنها یەك پیاویان ماوە! جا لەبەر ئەوە بە چ دەستکەوتێك (غەنیمەتێك) دڵ خۆش دەبێت؟ چ میراتێك دابەش بکرێت؟ لە کاتێکدا کە ئەوان دەستکەوت (غەنیمەت) دابەش دەکەن لە ناو خۆیاندا کێشەیەکی تر دەبیسن کە ئەوە لەوی تر گەورەترە، بانگەوازکارێك دێت و بانگ دەکات)) ئەوەتا کابرایەك هاوار دەکات، چی دەڵێت؟

دەڵێت: فیتنەیەکی گەورەتر لەوەی کە لە پێشدا تیایدا بوون ڕوویداوە، ئایا فیتنە لەوە گەورەتر هەیە؟ بەڵێ... (لە پاشان بە درێژی باسی دەکەین إنشاء الله) هاوار دەکات و دەڵێت: ((إِنَّ الدَّجَّالَ قَدْ خَلَفَهُمْ فِي ذَرَارِيِّهِمْ فَيَرْفُضُونَ مَا فِي أَيْدِيهِمْ))، واتە: مەسیحی دەججال لە دواوە چووەتە سەر کەس و کار و ئەهلەکانتان ئەوانیش ئەو دەستکەوتەی (غەنیمەتەی) لە دەستیاندا بوو فڕێی دەدەن)) واتە: لە دەستکەوتەکان چونکە هیچ پێویستیان پێی نییە ((وَيُقْبِلُونَ، فَيَبْعَثُونَ عَشَرَةَ فَوَارِسَ طَلِيعَةً))واتە: دەردەچن، موسڵمانان لە پێش خۆیانەوە (دە) سوار دەنێرن))، بۆ لێکۆڵینەوەی کارەکە، بۆ دڵنیا بوون لەبوونی دەججال، باش تێڕوانەو بزانە ڕاستگۆی باوەڕپێکراوﷺ چی دەفەرموێت: ((إني لأعرف أسماءهم وأسماء آبائهم وألوان خيولهم هم خير فوارس على ظهر الأرض يومئذ أو من خير فوارس على ظهر الأرض يومئذ)) واتە: ((من دەزانم ناوی خۆشیان و باوکەکانیشیان چی یە، ڕەنگی وڵاخەکانیشیان دەزانم، ئەو دە سوارە باشترین و چاکترین سواری سەر زەوین لەو کاتەدا)).

منیش دەڵێم: ڕەنگە باس کردنی ئەم چەکە زیاتر لە مانا و مەبەستێکی هەبێت، تەنها خوای گەورە لە مەبەستی پێغەمبەرەکەیﷺ دەزانێ، ڕەنگە پێغەمبەری

خواﷻ بە (چەك) دەربڕیوە مەبەستی چەکی سەردەمی خۆی بێت! ئەمە یەکێکە لە بۆچوونەکان، دەڵێن: ڕەنگە ئەم هەموو چەکە لە کار بکەوێت،! چۆن ئەوە ڕوودەدات؟ هەروەکو دەزانن ئەم چەکانە و زۆربەی ئەوەی لەم بوونەوەردا هەیە بە کۆمپیوتەر کار دەکات! ڕەنگە بە بیرتاندا بێت کاتێك جۆرێك لە جۆرەکانی ڤایرۆس توشی جۆرێك ئامێر بوو کە پێی دەڵێن ئامێری (بیجر) لە یەکێ لە ویلایەتەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا... بۆیە لەم ویلایەتەدا هەموو ئامێرەکان بە گشتی لە کار کەوتن کاتێ کە کۆمپیوتەرەکەی سەرۆك توشی ڤایرۆسێك لەو ڤایرۆسانە بوو! بەڵام من دەڵێم: خوای گەورە ئەم بوونەوەرە بۆ مەبەستی خۆی ئامادە دەکات وە بۆ ئەوەی کە خۆی فەرمانی پێداوە و چارەنووسی دیاری کردووە و ڕێکی خستووە، چونکە ئەم بوونەوەرە هیچ کەسێك لە خەڵکی فەرمانڕەوایی تیادا ناکات، ئەم بوونەوەرە هیچ هێزێك لە هێزەکان فەرمانڕەوایی تیادا ناکات وە هیچ وڵاتێك لە وڵاتەکان بەڵکو هەموو ئەم بوونەوەرە خوای پەروەردگار بەڕێوەی دەبات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِي ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ بِيَدِكَ ٱلْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ آل عمران: ٢٦ ، ((واتە: بڵێ: خوایە! ئەی خاوەن هێز و دەسەڵات ! هەرکەسێك خۆت بتەوێ دەسەڵات و موڵکی پێ ئەدەی، هەرکەسیش خۆت بتەوێ دەسەڵات و حکومەتی لە دەستێنی(دەسەڵاتداری بێ سنوور و بێ مەودا هەر ئەتۆی) هەر کەسیش خۆت بتەوێ باڵادەست و ڕێزداری ئەکەی و، هەر کەسیش خۆت بتەوێ زەلیل و سووکی ئەکەی، گشت خێر و چاکەیەك هەر بە دەستی خۆتە بە ڕاستی تۆ بە سەر هەموو شتێکدا بە توانا و دەسەڵات داری)).

کەواتە فەرمان تەنها فەرمانی ئەوە و موڵکیش تەنها موڵکی ئەوە و بەڕێوەبردنیش تەنها بەڕێوەبەردنی ئەوە، ئەویش توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە ﴿إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾ یس: ٨٢، ((واتە: بەڕاستی هەرکاتێ ویستی شتێ بەدی بهێنی هەر ئەوەیە کە پێی بفەرمێ ببە! ئەویش دەست بە جێ دەبێت)) پێغەمبەرری خواﷺ دەربارەی ئەو داستانانە قسە

دەکات و دەربارەی ئەو نیشانانە لە گەڵ ئەوەیشدا هیچ هۆشمەندێك لەسەر رووی زەویدا ناتوانێت وێرای ئەوەیش هیچ زانایەك ناتوانێ کاتێکی دیاری کراو و ئاشکرا بۆ کۆتایی جیهان دابنێت، یان بۆ رۆژی دوایی چونکە ئەمە بەشێکە لەو شتە نادیارانە کە تایبەتمەندی خوای گەورەی میهرەبانە وە هیچ فریشتەیەکی نزیککراو یان پێغەمبەرێکی نێردراو نازانێت هەرچەندە ئەو کەسە پێغەمبەری سەروەرمان بێت ﷺ.

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ﴾ الأنعام: ٥٩، ((واتە: کلیلی گشت گەنجینەکانی پەنهانی (غەیب)، تەنها لای خوایەو، تەنها هەر ئەویش پێیان دەزانێت و تەواوی کارە نادیارەکانیش لای ئەو ئاشکراو دیارن)).

خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێت: ﴿يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِ ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ ۚ﴾ الأحزاب:٦٣، ((واتە: بێ باوەڕەکان پرسیاری هاتنی رۆژی قیامەتت لێ ئەکەن !پێیان بڵێ: ئەی پێغەمبەر! هەر خوا خۆی زانیاری و ئاگاداری تەواوی هەیە بە رۆژی قیامەت کە کەی دێت،جا تۆ چووزانیت لە قیامەت؟ لەوانەیە کاتی هاتنیشی زۆر نزیك بێت!)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا ﴿٤٥﴾ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا﴾ النازعات:٤٢ـ ٤٦، ((واتە: لە بابەت رۆژی قیامەتەوە: لێت دەپرسن کە چ کاتێ روو ئەدا؟ (٤٢).جا تۆ چیتە لە باسکردنی ئەو رۆژە؟ واتە: تۆ هیچی لێ نازانیت، ئیتر ئەوانە بۆ ئەوەندە تەنگاوت دەکەن...؟(٤٣) سەرەنجام و کۆتایی دونیا تەنها لای پەروەردگارتە، واتە: هەر خواوەندت کاتەکەی دەزانێ(٤٤) ئەرکی تۆ تەنها بێدار کردنەوەو ترساندنی ئەوانەیە لەو رۆژە دەترسن و خۆیانی بۆ ئامادە دەکەن ئیتر دیاریکردنی کاتەکەی بە تۆ نەسپێردراوە، جا کەوابوو تۆ کارەکەی خۆت ئەنجام بدە وخۆت بە شتێکەوە سەر گەرم مەکە کاری تۆ نەبێت.(٤٥)ئەو رۆژە کە ئەوانە قیامەت دەبینن، وا ئەزانن لە دونیادا تەنها ئێوارەیەك یا

چێشتەنگاوێك ماونەتەوە، واتە: لە بەر درێژی و سەختی و گرانی ئەو ڕۆژەیە، ماوەی ژیانی دونیایان بەلاوە زۆر کەم دەبێ! !(٤٦))).

لە(صحیح مسلم)یش[1] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (عمر ی کوڕی خەتتاب) ەوە کە: جبریل پرسیار لە پێغەمبەری شکۆمەندﷺ کردووە: متى الساعة؟ واتە: قیامەت کەی ڕوودەدات)). پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرمووی: ((: ما المسئول عنها بأعلم من السائل))واتە: منی پرسیارلێکراو لە تۆی پرسیارکەر زاناتر نیم)).

ئەگەر دەستپاك و باوەر پێکراوی ئەهلی زەوی و دەستپاکی ئەهلی ئاسمان نەزانن دەربارەی کاتی هاتنی قیامەت بۆیە نابێت هیچ کەسێکی ژیر بڕیار بدات کە قیامەت لە ساڵی فلاندا یان لە مانگی فلاندا ڕوودەدات!! چەند جارێك موسڵمانانم ئاگادار کردووەتەوە و گوتوومە: ئەمە جۆرێکە لە هەڵەشەیی(مجازفە) وە نەزانینێکی ڕوون و ئاشکرایە و لاوازییە لە دیندا، خوای گەورە و بێ هاوتا کاتی هاتنی قیامەتی ئاشکرا نەکردووە لای هیچ دروستکراوێکی خۆی، بەڵکو لای فریشتە نزیکەکانیش، هەر خوای گەورە خۆی پێغەمبەری خواو خۆشەویستی هەڵبژێردراوی خۆیﷺ ئاگادار کردووەتەوە دەربارەی نیشانەکان هەروەکو لە (صحیح البخاری)[2] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (ابن عمر) کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی ((مفاتح الغيب خمس لا يعلمهن إلا الله)) واتە: کلیەکانی پەنهانی (غەیب) پێنج دانەن هیچ کەسێك زانیاری دەربارەیان نییە تەنها خوا نەبێت)) ئەمجار ئەو ئایەتەی خوای گەورەی خوێندەوە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴾ لقمان: ٣٤. ((واتە: ئینجا خوا باسی پێنج شت ئەکات کە تەنها هەر خۆی ئەیان زانێ:١/ (إن الله...) بە ڕاستی زانیاریی هاتنی ڕۆژی قیامەت هەر لای خوایە،

---

١ـأخرجه مسلم، كتاب الإيمان حديث رقم (٨).

٢ـ خرجه البخاري كتاب التوحيد، باب قول الله تعالى: ﴿عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا﴾ الجن: ٢٦ )(٧٣٧٩)، وأنظر رقم (٤٦٢٧).

جگە لەو کەسێکی تر نازانێ قیامەت کەی دێت. ٢/ (وینزل...) تەنها ئەویش باران ئەبارێنێ لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا، کەسێکی تر ناتوانێ باران ببارێنێ . ٣/ ویعلم ...) ئەویش ئەزانێ چی لە منداڵدانەکاندایە، واتە: هەر لەو کاتەوە کە هێشتا ئاوە، خوا خۆی دەزانێ چییە: کوڕە یان کچ، بەختیار و سەرفرازە، یان لاسار و بەدبەختە، بەژن و باڵای کورتە، یا... هتد. ٤/(وما...) هیچ کەسێك – نە چاکەکار و نەخراپەکار – سەد لە سەد نازانێت سبەینێ چی دەکا لە چاك و لە خراپ . ٥/(وما ...) هیچ کەسیش نازانێ لەسەر کام زەوی ئەمرێ، واتە: کام جێگا دەبێتە گۆڕ و ئارامگای، هەرچەندە لەوانەیە هەوڵیش درابێ بۆ زانینی ئەمە! چونکە هەر خوایە زاناو بە ئاگایە بە تەواوی ڕووداوەکان و گشت نهێنی و ئاشکرایەکیشی لا یەکسانە)).

کەوابوو خوای گەورە تەنها خۆی کاتی هاتنی قیامەت دەزانێت.

دەڵێم: لە گەڵ ئەوەشدا خوای گەورە پێغەمبەرەکەیﷺ لە نیشانەکانی ئاگادار کردووەتەوە، خوای گەورە لە حەقی پێغەمبەرەکەیداﷺ فەرموویەتی: ﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ﴾ الجـــن: ٢٧، ((واتە: ئەو زاتە زانای نادیار و غەیبە،غەیبی خۆی بۆ هیچ کەسێك دەرناخاو ئاشکرا ناکا.(٢٦)

مەگەر بۆ پەیامبەرێك کە خۆی لێی ڕازی بێت، ئەو کاتە ئاگاداری هەندێ لە نهێنییەکانی خۆی دەکات، کەوابوو غەیب زانین، تایبەتە تەنها بەزاتی پەروەردگارمانەوە (جل جلاله) ئیتر هیچ کەسێك پەی پێ نابات، مەگەر کەسێکی خاوەن خووی جوان و شیرین و ڕاساڵ و ملکەچ بۆ فەرمانەکانی خوا لە پەیامبەران، وەك (عیسا) کوڕی (مەریەم) ئەوەبوو ئوممەت و گەلەکەی خۆی بە گەلێ شت – کە ئەوان نەیان ئەزانی – ئاگادار کرد: (و أنبئكم بما تأكلون وما تدخرون في بيوتكم)(٢٧))).

دەفەرموێت ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ

ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴾ النجم: ١ـ ٤، واتـه: سـوێند بـەو ئەسـتێرەیە كـه بـه خێرایـی ئـاوا دەبێـت، یـا لـه شـوێنی خـۆی دەترازێـت و بـەر دەبێتـەوە كـاتی نزیكبوونەوەی قیامەت (١) هاوەڵەكەی ئێوە موحەممەدﷺ لە ڕێی هەق لای نـەداوە و بـاوەڕی پووچیـشی نـەبووە (٢) وە قـسەو گوفتـاری (پێغەمبـەر) لـه ڕووی هەواوهەوەسەوە نییە، جا كەسێ ئاوابێ چۆن ڕێگە ون ئەكات؟!(٣) ئەو قورئانـەی كە ئەو دەیڵێت، جگە لەوەی كە بە وەحی بۆی دەنێرێ هیچی تر نییە، واتـه: ئـەم قورئانە هەر لە لایەن خواوەیە(٤))) .

دەفــەرموێت: ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَىْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ ﴾ البقـرة: ٢٥٥، واتــه: ((هیچ كەسیش ناتوانێ بە پلەی زانینی خـوادا بگـا، مەگـەر خـوا خـۆی بیـەوێ، كـە لەسەر زمانی پەیامبەران شتێكیان بۆ ڕوون بكاتەوە و ئاگاداریان بكا)) .

لـه(مـسند أحمـد) و (سـنن أبـی داود) و (مـستدرك الحـاكم) دا بـه سـەنەدێكی (صحیح)[١] هاتووە لە فەرموودەیەكی(عبدالله ی كوڕی عمرو) كە فەرموویەتی: ((كنت أكتب كل شئ أسمعه من رسول الله أرید حفظـه فنهـتني قـريش و قـالوا: أتكتـب كـل شئ تسمعه و رسول الله بشر يتكلم في الغضب والرضـا؟ قـال: فأمـسكت عـن الكتابـة فذكرت ذلك لرسول اللهﷺ فأومأ بأصبعه إلى فيه،فقال:" أكتب فوالذي نفسي بيده ما يخرج منه إلا الحق))واته: هـەموو شـتێك كـه لـه پێغەمبـەری خـوداوەﷺ دەمبیـست دەمنوسیەوە بۆ ئەوەی لە بەری بكەم و ڕەوانـی بكـەم كەچـی قـورەیش نـەهی لـێ كـردم و وتیـان: ئایـا هـەموو شـتێك دەنوسـیتەوە كـه دەیبیـسیت، لـه كاتێكـدا پێغەمبەری خـواﷺ مرۆڤـه و قـسه دەكـات لـه كـاتی پەسـتی و ئاساییدا؟ دەڵێـت: منیش وازم لە نوسینەوەی فەرموودەكان هێنا و بۆ پێغەمبـەری خـوامﷺ گێڕایـەوە ئەویش بە پەنجەی ئیشارەتی بۆ دەمی خۆی كـرد و فـەرمووی: بنووسـه... سـوێند بەو كەسەی گیانی مـنی بـه دەسـته لـەم دەمـەوە جگـه لـه حـەق هیـچی تـری لـێ دەرناچێت)).

---

١ـ أخرجه أحمد (٢/١٦٢) و أبو داود، كتاب العلم، باب في كتـاب العلـم (٣٦٤٦) والحـاكم (١ / ١٠٥، ١٠٦) و صححه بمجموع طرقه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٠٢٦).

لە هەردوو کتێبی (الصحیح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (حذیفة)ەوە:((لقد خطبنا النبي ﷺ خطبة ما ترك فيها شيئا إلى قيام الساعة إلا ذكره علمه من علمه وجهله من جهله )) واتە: پێغەمبەری خواﷺ وتارێکی بۆ خوێندینەوە هیچ شتێکی تیادا بە جێنەهێشت تاکو هاتنی قیامەت ئیللا باسی بۆ کردین، ئەوەی زانی زانی ئەوەیشە نەیزانی ئەوا نەیزانی)).

لە (صحیح مسلم)[2] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (ابي زيد عمرو کوڕی أخطب) کە دەفەرموێت: ((صلى بنا رسول اللهﷺ الفجر، و صعد المنبر. فخطبنا حتى حضرت الظهر، فنزل فصلى ثم صعد المنبر، فخطبنا حتى حضرت العصر، ثم نزل فصلى،ثم صعد المنبر فخطبنا حتى غربت الشمس، فأخبرنا بما كان وبما هو كائن فأعلمنا أحفظنا)) واتە: پێغەمبەری خواﷺ نوێژی بەیانی پێ کردین و ئەمجار چووە سەر مینبەر و وتاری بۆ خوێندینەوە تاکو نیوەڕۆ هات ئەمجار دابەزی نوێژی کرد و دیسان چووە سەر مینبەر و وتاری بۆ خوێندینەوە تاکو نوێژی عەسر ئەمجار دابەزی و نوێژی عەسری بۆ کردین دیسان چووە سەر مینبەر و وتاری بۆ خوێندینەوە تاکو ڕۆژ ئاوا بوو... ئەوەی کە ڕۆیداوە و ئەوەی کە ڕوودەدات باسی بۆ کردین زاناترینمان ئەو کەسە بوو کە زیاتری لە بەر کردبوو)).

لە (صحیح البخاري)[3] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (عوف ی کوڕی مالك)ەوە کە دەفەرموێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((اعدد ستاً بين يدي الساعة)) واتە: شەش نیشانە بژمێرە لە پێش هاتنی قیامەت)). لەپاشان باسی دەکەین (إنشاء الله).

کەواتە خوای گەورە پێغەمبەرکەیﷺخۆی ئاگادار کردووەتەوە و هەواڵی بە ئەو داوە لە هەموو ئەو نیشانانەی کە لە پێش هاتنی قیامەت ڕوو دەدەن لەم بوونەوەرەدا.

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب القدر، باب وكان أمر الله قدراً مقدوراً (٦٦٠٤) و هذا لفظه، ومسلم، كتاب الفتن و أشراط الساعة، باب إخبار النبيﷺ فيما يكون إلى قيام الساعة (٢٨٩١).

٢ـ أخرجه مسلم، كتاب الفتن و أشراط الساعة، باب إخبار النبيﷺ فيما يكون إلى قيام الساعة (٢٨٩٢).

٣ـ أخرجه البخاري، كتاب الجزية والموادعة، باب ما يحذر من الغدر (٣١٧٦).

زانایان نیشانەکانیان کردووەتە دوو بەشەوە:

نیشانە بچووکەکان و نیشانە گەورەکان لە پاشان باسی هەموو ئەوانە بە درێژی دەکەم ـ إنشاء الله ـ .

ئەوەی کە ئێستا تیایدا دەژین و ئەوەی کە بە چاوەکانمان دەیبینین و ئەوەی بە گوێیەکانمان دەیبیسین خۆشەویستمان و پێغەمبەرﷺ لە پێش چواردە سەدە بە ئێمەی ڕاگەیاندووە و خوای گەورە ڕاستی فەرمووە کاتێك دەفەرموێت: ﴿مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ الحشر: ٧، واتە: هەرچی پەیامبەرﷺ پێی دان وەری بگرن، واتە: بەچی فەرمانی پێ کردن بیکەن چ لەم دەستکەوتەدا و، چ لە هەر شتێکی تردا جێبەجێی بکەن و، ڕێی لە هەر شتێ لێ گرتن، ئێوەش دەستی لێ هەڵگرن، خۆتان لەخەشم و غەزەبی خوا بپارێزن بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و وازهێنان لە قەدەغەکراوەکانی بە ڕاستی خوا سەخت تۆڵەیە قین و ڕقی لە هەر کەسێك گرت ڕزگاری نابی)).

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ﴾النجم: ١ـ ٥، واتـە: سوێند بەو ئەستێرەیە کە بە خێرایی ئاوا دەبێت، یا لـە شـوێنی خـۆی دەترازێـت و بەر دەبێتەوە کاتی نزیکبوونەوەی قیامەت (١) هاوەڵەکەی ئێوە (موحەممـەد)ﷺ لـە ڕێـی هـەق لای نـەداوە و بـاوەڕی پووچیـشی نـەبووە (٢) وە قـسەو گوفتـاری (پێغەمبـەر) لـە ڕووی هەواوهەوەسـەوە نییـە، جـا کەسـێ ئـاوابێ چـۆن ڕێگـە ون ئەکات؟! (٣) ئـەو قورئانـەی کـە ئـەو دەیڵێـت، جگـە لـەوەی کـە بـە وەحـی بـۆی دەنێردرێ هیچی تر نییە، واتە: ئەم قورئانە هەر لە لایەن خواوەیە(٤) خاوەن هێز و بە زەبر (جوبریل) ی فریشتەیە، قورئانی فێرکردووە، بـەڵێ زۆر بـە هێـزە، دەسـت پاکـە، زمـان پاکـە، دەسا ئـیتر ئێـوە چـۆن ئـەڵێن قورئـان ئەندیـشە و خورافـەی پێشووەکانە؟!! (٥))) .

كەواتە هەر شتێك پەیوەندی بە ئاینـەوە هـەبێت لـە (وەحـی) سرووشـی خـوای گەورەوەیە و پێغەمبەری خوا ﷺ لەخۆ وە دەربـارەی قـسە ناكـات، خـوای گـەورە دەفەرموێت: ﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا﴾ الجن: ٢٦، واتە: ئەو زاتـە زانای نادیار و غەیبە،غەیبی خۆی بۆ هیچ كەسێك دەرناخات و ئاشكرا ناكا)).

بـەڵێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ نیـشانە بـچووك و گـەورەكانی زانیـوە ئـەوەی كـە ڕوویداوەو ئەوەی كە ڕوودەدات لە پێش هاتنی قیامەت.

لە پێشدا باسی ئەو فەرموودەمان كرد، كە ئیمامی (البخاری)[1] ڕیوایەتی كردووە لـە فەرموودەیـەكی (عـوف ی كـوڕی مالـك)ەوە لـە پێغەمبـەری خـواوە ﷺ كـە فەرموویەتی: (( " أعدد ستا بين يدي الساعة: موتي، ثم فتح بيت المقـدس،ثم موتـان يأخذ فيكم كقصاع الغنم، ثم أستفاضـة المـال حتـى يعطـي الرجـل مائـة دينـار فيظـل ساخطا، ثم فتنـة لا يبقـى بيتـا في العـرب إلا دخلتـه، ثـم هدنـة تكـون بيـنكم وبـين بـني الأصفر فيغدرون، فيأتونكم تحت ثمانين غاية تحت كل غايـة أثنـا عـشر ألفـا))، واتـە: شەش نیشانە بژمێرە لە پێش هاتنی قیامەت: مردنی من، پاشان ڕزگار كردنی (بیت المقدس)، پاشان مردنێكی لە ناكاو و كوت و پڕ لە ناوتاندا بڵاو دەبێتەوە وەكو ئەو دەردەی لە مەڕ دەدات، پاشان زۆربوونی سـەروەت و سـامان تـاوەكو هـەر پیاوێك سەد دیناری پـێ دەدرێت كەچـی هێشتا هـەر پەسـت و نارازییـە، پاشـان فیتنـە و ئاژاوەیـەك پەیدا دەبێت هـیچ مـاڵێكی عـەرەب نامێنێـت ئـیللا ئـەو فیتنەیـەی تـێ دەچێت، پاشان ڕێككەوتنامەیەك لە نێوان ئێوە و ڕۆمەكاندا مۆر دەكرێت، جا ئەوان ئەو ڕێككەوتنامەیە دەشكێنن، پاشان لە ژێر هەشتا ئاڵادا هێرشتان بـۆ دەهێـنن لـە ژێر هەر ئاڵایەكدا دوازدە هەزار جەنگاوەر هەیە)).

ئەوەتا ئێمـە دەگەڕێینـەوە لای فەرموودەكـە لـە سـەرەتاكەیەوە بـۆ ئـەوەی لـە خزمەت وشەكانیدا بوەستین وشە بە وشە و نیشانە بـە نیشانە (كـە لـە پاشـدا بـە درێژی باسیان دەكەین).

پێغەمبەری خوافەرموویەتی ﷺ : ((أعدد ستا بين يـدي الـساعة: )) واتـە: شـەش نیشانە بژمێرە لە پێش هاتنی قیامەت)).

---

١ـ لە پێشدا بە كورتی باس كرا.

## نیشانەی یەکەم: (( مَوْتِي )).

واتە: مردنی من))، مردنی خۆشەویستﷺ، بە مردنی ئەو نازدارە ئەم نیشانەیە هاتەدی، مردنی پێغەمبەرﷺ لە کۆن و ئێستادا یەکێکە لە گەورەترین ئەو کارەسات و بەدبەختی یەی کە توشی ئەم ئوممەتە هاتووە، لە (سنن الترمذي)و (ابن ماجة)و (مسند أحمد) هاتووەو (شێخ ألبانی)[1] بە دروست (صحیح)ی زانیوە، کە (أنس) فەرموویەتی: ((لما كان اليوم الذي دخل فيه رسول اللهﷺ المدينة أضاء كل شئ . فلما كان اليوم الذي مات فيه أظلم منها كل شئ، وما نفضنا عن رسول اللهﷺ الأيدي، وإنا لفي دفنه حتى أنكرنا قلوبنا))واتە: ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەری خواﷺ هاتە شاری مەدینەوە هەموو شتێك ڕووناك بووەوە وە کاتێ ئەو ڕۆژەی کۆچی دوایی کرد هەموو شتێك تاریك بوو وە هێشتا دەستمان لە تەپوتۆزەکەی کاتی ناشتنی پێغەمبەرﷺ نەتەکاندبوو، هێشتا خەریکی ناشتنی بووین تاکو ئینکاریمان لە دڵەکانمان دەکرد)).

ڕەزای خوا لە ڕەیحانەکەی پێغەمبەری خواﷺ (فاطمەی زەهرا) کاتێ بە(أنس)ی فەرموو: ((يا أنس أطابت أنفسكم أن تحثوا التراب على رسول الله ﷺ))[2] واتە: ئەی ئەنەس...ئایا چۆن دڵتان هات گڵ بەسەر جەستەی پێغەمبەری خواداﷺ بکەن ؟؟)).

کەوایە بە مردنی پێغەمبەری خواﷺ نیشانەیەك لە نیشانەکانی قیامەت هاتە دی چونکە خوای باڵا دەست پێغەمبەرە هەڵبژێردراوەکەی خۆی و خۆشەویستەکەیﷺ نەناردووە بۆ ئەوەی لەم ژیانەدا بە نەمری بمێنێتەوە. خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ

---

١ـ أخرجه أحمد في (٣/ ٢٢١، ٢٦٨)، والترمذي كتاب المناقب، باب في فضل النبيﷺ (٣٦١٨) وقال: ((حديث غريب صحيح)) وابن ماجة، كتاب الجنائز، باب ذكر وفاته و دفنهﷺ (١٦٣١)، والدارمي في المقدمة (٨٨)، والبغوي في ((شرح السنة)) (٣٨٣٤)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي وابن ماجة))

٢ـ أخرجه البخاري كتاب المغازي باب مرض النبيﷺ ووفاته (٤٤٦٢).

ٱلْمَوْتِۗ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةًۖ وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴾ الأنبياء: ٣٤ـ ٣٥، واتە: ئێمە پێش تۆ وامان نەکرد مرۆیەك نەمرێ ئایا ئەگەر تۆ بمری، ئەوانە ژیانی هەتا هەتاییان دەبێ؟! نە، هەرگیز شتی وا نییە، وەك دەفەرموێ: (كل من عليها فان ويبقى وجه ربك ذو الجلال والإكرام)(٣٤) هەموو گیانێك تامی مردن هەر دەچێژێ و دەمرێ، بە ناخۆشی، خۆشی، هەژاری، دەوڵەمەندی، لەش ساغی و نەخۆشی، تا سابیر و ناشوکر دەرکەوێ وەئیللا خوا بۆ خۆی دەزانێ وە بەمەش بەڵگەیان لەسەر رادەگرێ تا کەس بیانووی نەمێنێ سەرەنجام هەر بۆ لای خۆمان دەگێردرێنەوە ئەوسا بە پێی رەفتار و دەرچوونتان لە تاقی کرنەوەکەدا پاداش و تۆڵە وەرئەگرن (((٣٥)) .

واتە: ئەگەر پێغەمبەری خواﷺ کۆچی دوایی بکات ئایا هیچ کەسێك لە پاش ئەو بەنەمری دەمێنێتەوە؟.

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔاۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴾ آل عمران: ١٤٤، واتە: موحەممەدیش تەنها هەر پێغەمبەرێکە و چیتر نییە، بەر لەویش گەلێ پەیامبەرانی تر هاتوون و رۆیشتوون و مردوون و ئایینەکەشیان دوای خۆیان هەر ماوەتەوە، ئەمیش هەر وەك ئەوان وایە، باشە! ئەگەر ئەو وەفاتی کرد وەك (مووسا)و (عیسا) وەیان کوژراو شەهید بوو وەك (زەکەریا)و (یەحیا) ئێوە پاشگەز دەبنەوەو لە ئایین وەردەگەڕێن؟ بەڵێ ئەو رۆژەی کە هاوبەشدانەرەکان بڵاویان کردەوە کە: پەیامبەرﷺ کوژراوە، ترس و بیمێکی زۆر کەوتە دڵی هەندێ لە موسڵمانەکانەوە و لە نێو گۆڕەپانەکەدا سست و لاواز بوون، ئەوسا خوایش بەو ئایەتە گلەیی لێ کردن، خۆ هەرکەسێکیش: پاشگەز بێتەوە و لە ئایین وەرگەڕێ با چاك بزانێت کە هەرگیز ناتوانێ زیانێ بە خوا بگەیەنێت، بەڵکو هەر لە خۆی زیان دەدات، دڵنیاشبن کە خوا پاداشتی شوکرانەبژێران ئەداتەوە و سەریان دەخات)).

پێغەمبەری خواﷺ کۆچی دوایی کرد، لەسەر جێگەی مردن نوست، بەڵکو تامی سەرەمەرگی مردنیشی چەشت ئەوەتا ئەو خۆشەویستە دەستەکانی دەکاتە ناو پەرداخێکی ئاوەوە و ئارەقەی نێو چاوانە پیرۆز و روناکەکەی دەسڕێ و دەڵێت: ((لا إله إلا الله إن للموت سكرات)) واتە: لا الە الا الله بە راستی مردن سەرەمەرگی هەیە)) تاکو دایکی ئیمانداران (عائیشە) دەفەرموێت: ((مات رسول اللهﷺ بين حاقنتي وذاقنتي، أو بين سحري و نحري، فما أكره شدة الموت لأحد بعدما رأيت رسول اللهﷺ))[1]، واتە: پێغەمبەری خواﷺ کۆچی دوایی کرد لە کاتێکدا سەری لەسەر سنگم بوو، چیتر هەرگیز سەختی مردنی هیچ کەسێکی ترم لا سەیر نییە لە پاش ئەوەی پێغەمبەری خوامﷺ بەو شێوەیە بینی)) .

کەوابوو نیشانەی یەکەم: هەروەکو خۆشەویستﷺ فەرمووی: (موتي) ئەوا ئەو نیشانەیە هاتە دی .

## نیشانەی دووەم: ((ثم فتح بيت المقدس))

واتە: ئەمجار رزگار کردنی (بيت المقدس)))، هەروەها ئەم نیشانەیەش رووی داوە کاتێك کە (بيت المقدس) رزگار کرا لە سەردەمی (عمر ی کوڕی خەتتاب)دا بە سەرکردایەتی (ابی عبیدە ی کوڕی الجراح) پێغەمبەری خواﷺ لە ساڵی (یازدەی کۆچی) کۆچی دوایی کرد و خوای گەورە دەرووی لە هاوەڵانی کردەوە (لە سەردەمی عمردا) بە رزگارکردنی (بيت المقدس) لە ساڵی شازدەی کۆچی .

(عمر ی کوڕی خەتتاب) لە مەدینەوە هات بۆ خاکی فلسطین بە مەبەستی وەرگرتنی کلیلەکانی (بيت المقدس) بە دەستی خۆی لە گەڵ ڕێورەسمێکی سالار و شکۆمەنددا کە جوانی و شکۆمەندی زیاد دەکات بەو خۆ بەکەمزانینەی، پێشەوای باوەڕداران(عمری کوڕی خەتتاب) کە (الفاروق)و (الأواب)ە لە گەڵ خزمەتکارەکەیدا لەسەر پشتی تەنها یەك وڵاخ، جارێك ئەو سواری دەبوو وە جارێك خزمەتکارەکەی

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب المغازي باب مرض النبيﷺ ووفاته (٤٤٤٦، ٤٤٤٩)، وأنظر: الترمذي كتاب الجنائز، باب ما جاء في التشديد عند الموت (٩٧٨) وقال:((حديث حسن غريب)).

سوار دەبوو و کاتێ گەیشتنە خاکی (بیت المقدس) وڵاخەکەی لە تەنگاوێکەوە ڕۆیشت و ئەویش ترسا کە لە تەنگاوەکەوە بڕوات و لە کاتێکدا ئەم وا لەسەر وڵاخەکەیە بۆیە دابەزی و پێڵاوەکەی خستە بن باخەڵی و وڵاخەکەی ڕاکێشا و خۆی کەوتە پێش وڵاخەکە، کاتێ کە (أبی عبیدە ی کوڕی الجراح) (سەرکردەی لەشکری سەرکەوتوو) ئەوەی بینی فەرمووی: ((یا أمیر المؤمنین، ما أحب أن القوم قد أسشرفوك)) واتە: ئەی پێشەوای باوەڕداران پێم خۆش نییە ئەو خەڵکە بتبینن و تۆیش لەو حاڵەتەدای))، پێشەوا فەرمووی: ((أوە یا أبا عبیدة، لو قالها غیرك یا أبا عبیدة، لقد کنا أذل قوم فأعزنا الله بالإسلام، فمهما ابتغینا العزة في غیره أذلنا الله))[1] واتە: (ئۆۆهـ ئەی أبو عبیدە... با یەکێکی تر ئەو قسەی بگوتایە ئەی أبو عبیدە، ئێمە کەساسترین میللەت بووین و خوای گەورە بەئیسلامەوە شکۆیی پێ بەخشین و هەر کاتێ بە شوێن شکۆمەندیدا بگەڕێین جگە لە ئەو (واتە لە ئیسلام) ئەوا خوای گەورە کەساسمان دەکات)) لە سەردەمی ئەم مەزنەدا (عومەر) و لە سەردەمی دەستپاکی ئەم ئوممەتەدا (امین الأمة) (ابو عبیدە ی کوڕی الجراح) خوای گەورە (بیت المقدس)ی ڕزگار کرد. داوا لەخوا دەکەم جارێکی تر بیگەڕێنێتەوە بۆ موسڵمانان هەر خۆی پشت و پەنامانە و بە توانایە بە سەر هەموو شتێکدا.

## نیشانەی سێیەم : (ثم موتان یأخذ فیکم)

واتە: پاشان مردنێکی لە ناکاو و کوت و پڕ لەناوتاندا بڵاو دەبێتەوە)) (کقعاص الغنم) بڵاو دەبێتەوە واتە: وەکو ئەو دەردەی کە توشی مەڕ دەبێت و دەیفەوتێنی. ئەوەش شتێکە لە لووتی وڵاخ و ئاژەڵەوە دەردەچێت و یەکسەر دەیفەوتێنی)).

زانایانمان فەرموویانە[2]: ئەم نیشانەیەش ڕوویداوە لە تاعونی عمواس (چاوەقوڵەی عمواس)[3] لە وڵاتی شام،ئەوەی کە پەسەندە بە پێی قسەی کۆمەڵێکی

١ــ أخرجه الحاكم في المستدرك (١/١٣٠)، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (١/ ١١٧).
٢ــ ((فتح الباري)) (٦ / ٣٢١).
٣ــ وحديث الطاعون، في ((صحيح البخاري)) (٥٧٢٩) ومسلم (٢٢١٩).

زۆر لە ئەهلی (سیرە و مێژوو) لە ساڵی هەژدەی کۆچی ڕوویداوە و لەم دەردەدا و لەم تاعونەدا بیست و پێنج هەزار موسڵمانی کوشت لە سەرووی هەموویانەوە دەستپاکی ئەم ئوممەتە (أمین الأمة) (ابو عبیدە ی کوڕی الجراح) بەڵکو بە هۆیەوە خۆشەویستەکەی پێغەمبەری خواﷺ (معاذ ی کوڕی جبل) کۆچی دوایی کردووە .

**نیشانەی چوارەم : پێغەمبەری خواﷺ دەڵێت: (( ثم أستفاضة المال حتى يعطي الرجل مائة دينار فيظل ساخطا )) وە ( استفاضة المال ) واتە : زۆر بوونی سەروەت و سامان، واتە : پاشان سەروەت و سامان زۆر دەبێت تاوەکو هەر پیاوێك سەد دیناری پێ دەدرێت کەچی هێشتا هەر پەست و نارازییە )).**

لە (صحيح البخاری)[1] دا هاتووە لە فەرموودەی (عدی کوڕی حاتم) دەڵێت: ((بينا أنا عند النبيﷺ إذ أتاه رجل فشكا إليه الفاقة – يعني: الفقر – ثم أتاه آخر فشكا قطع السبيل، فقال النبيﷺ لعدي بن حاتم: ((يا عدي، هل رأيت الحيرة ؟)) قلت: لم أرها، وقد أنبئت عنها، فقال النبيﷺ: ((فإن طال بك حياة لترين الظعينة – والظعينة: هي المرأة في الهودج الذي يوضع على البعير – ترتحل من الحيرة، حتى تطوف بالكعبة لا تخاف أحدا إلا الله)) قلت فيما بيني و بين نفسي: فأين دعار طيئ الذين قد سعروا البلاد؟ – أي: اين هؤلاء الذين قطعوا الطريق على المسافرين؟ – ((ولئن طالت بك حياة لتفتحن كنوز كسرى)) قلت: كسرى بن هرمز؟ قال: كسرى بن هرمز، ولئن طالت بك حياة لترين الرجل – وهذا هو الشاهد – يخرج ملء كفه من ذهب أو فضة يطلب من يقبله منه، فلا يجد أحدا يقبله منه)) قال عدي: فرأيت الظعينة ترتحل من الحيرة حتى تطوف بالكعبة لا تخاف إلا الله، وكنت فيمن افتتح كنوز كسرى بن هرمز – صلى الله على الصادق – قال: ((ولئن طالت بكم حياة لترون ما قال النبي أبو القاسم ﷺ: ((يخرج ملء كفه )) . واتە: لە کاتێکدا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بوومﷺ کابرایەك هاتە خزمەتی و سکاڵای هەژاری لێ کرد،

١ـ أخرجه البخاري، كتاب الزكاة، باب الصدقة قبل الرد (١٤١٣)، وأنظر (٣٥٩٥).

ئـەمجار کابرایـەکی تـر هاتـە خزمـەتی و سـکاڵای زۆربـوونی ڕێگرانـی کـرد، جـا پێغەمبـەری خـواﷺ بـە(عـدی کـوڕی حـاتم) ی فـەرموو: ((ئـەی عـدی، ئایـا شـاری (حیرە)ت بینیوە؟ گوتم: نەمبینیوە بەڵام باسیان بۆ کردووم، پاشـان پێغەمبـەری خواﷺ فەرمووی: ئەگەر تەمەنت درێژ بێت ئەوا ئافرەت دەبینی کە دەخرێتـە سـەر کەژاوەیەك و دەخرێتە سەر وڵاخێك و لە(حیرە)وە دەردەچێت و تاکو تەواف کەعبـە دەکات و لە هیچ شتێك ناترسێت تەنها خوا نەبێت، منیش لە دڵی خۆمدا گوتم: ئـەی ئەوانەی کە ڕێگایان لە خەڵکی دەگرد لە کوێن؟ ئـەمجار فـەرمووی: ئەگـەر تەمـەنت درێژ بێت ئەوا گەنجینە و وڵاتی کیسرا رزگار دەکەن، گوتم: کیـسرای کـوڕی هرمـز؟ فەرمووی: کیسرای کوڕی هرمز، ئەگەر تەمەنت درێژ بێت ئەوا سـەردەمێك دێـت کـە کابرایەك دەبینی پڕ دەسـتی خـۆی ئـاڵتون و زیـو دەکـات بـۆ ئـەوەی کەسـێك لێـی وەربگرێت کەچی هیچ کەس نادۆزێتـەوە، (عـدی) دەڵێـت: ئـافرەتم دەبـینی لـە نـاو کەژاوەیەکدا بوو بە سەر وڵاخەوە لە (حـیرە) وە دەردەچـوو تـاکو تـەواف کەعبـەی دەکرد و لە هیچ کەس نەدەترسا تەنها خـوا نـەبێت، مـن یـەکێك بـووم لەوانـەی کـە گەنجینە و وڵاتی (کیسرای کـوڕی هرمـز) مـان رزگـار کـرد صـەڵات و سـەلام لەسـەر راستگۆی باوەر پێکراو... فەرمووی: وە ئەگەر ئێوە تەمەنتان درێژ بێت ئـەوا ئـەوە دەبینن کە پێغەمبەرمان (ابو القاسم)ﷺ فەرمووی:- کەسێك پڕ دەسـتی زێـڕ و زیـو دەر دەکات)).

هەنـدێ لـە ئـەهلی عـیلم فەرموویانـە[1]: ئـەو ڕووداوە وەکـو خـۆی ڕوویـدا لـە سەردەمی (عمر ی کوڕی عبدالعزیز)دا (رحمه الله) لە ماوەی دوو ساڵ و نیودا جارێکی تـر ژیان گەڕایـەوە لـە سـەردەمی ئـەودا وەکـو ئـەوەی باسـی سـەردەمی پێغەمبـەرﷺ دەکەین لە بەر دادپەروەری و خواناسی و دینداری ئەم پیاوە لـە شـێوە و شـێوازی (عمر ی کوڕی خەتتاب).

لەسـەردەمی(عمـر ی کـوڕی عبـدالعزیز)دا خـەڵکی لـە هـەرزانی و فـراوان بـوونی سامان و خۆشگوزرانیدا دەژیـان بـەڵکو فـەرمانی کـردە بانگەوازکارێك بـە شـاران و وڵاتاندا بانگ بکات دەیگوت: ((هەرکەسێ قەرزی لە سەرە ئەوا دانەوەی قەرزەکـەی

[1]ـ أنظر ((الفتح)) للحافظ ابن حجر (٦ / ٧٤٣ ط الحديث).

لەسەر (بیت المال)ی موسڵمانانە، هەر کەسێ هەژار و کەمدەستە ئەوا پێویستییەکەی لە (بیت المال)ی موسڵمانانەوە دابین دەکرێت وە هەر کەسێ بیەوێ حەج بکات و خەرجی حەجەکەی نییە ئەوا لە(بیت المال)ی موسڵمانانەوە بۆی دابین دەکرێت وە هەر کەسێ بیەوێ ژن بهێنێ ئەوا خەرجی ژن هێنانەکەی لە (بیت المال) ی موسڵمانانەوە دابین دەکرێت))وە بە فەزڵی خوای گەورە ئەو میللەتە دەوڵەمەند بوون تاوەکو لە پاش ئەوە بانگەوازکارێك دەردەچوو بانگی دەکرد کەچی کەسی نەدەدۆزییەوە بەخشینەکەی لێ وەرگرێت یان (صدقە) کەی وەرگرێت.

هەندێ لە زانایان دەڵێن[1]: ئەم ڕووداوە جارێکی تر لە دوا سەردەمدا ڕوو دەدات، لە پێش قیامەت لە سەردەمی (المهدی و عیسا ی کوڕی مەریەم) علیهما السلام، ئەو باسەیشە بە درێژی باسی دەکەم (إنشاء الله) کاتێ کە زەوی پڕ بەرەکەت دەبێت و کاتێك کە بەرەکەت دادەبەزێت و سەروەت و سامان زۆر دەبێت ڕەنگە کەسێك دەرچێت بە سەروەت و سامانەوە کەچی کەسێك نادۆزێتەوە (صدقە) کەی لێ وەرگرێت چونکە خەڵکی لە سەردەمی عیسادا؈ دڵنیا دەبن کەوا قیامەت نزیك بووەتەوە و ڕووی لێ کردوون و بۆیە ئەوانیش لەو کاتەدا بە دڵنیاییەوە، خەریکی خواپەرستی و گوێڕایەڵی خوای گەورەن و ئەنجامدانی کاری چاکەن بۆیە لەو کاتەدا دڵیان پەیوەست نابێت بە دونیاوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێت: ((حتی یعطي الرجل مائة دینار فیظل ساخطا))، واتە: تاوەکو سەد دینار دەدرێت بە کەسێك کەچی هێشتا هەر پەستو نارازییە)) .

هەندێ لە ئەهلی زانست(عیلم) فەرموویانە[2]: یان لە بەر نەبوونی قەناعەتە و ڕازی نەبوونە، یاخود لە بەر ئەوەیە ئەو پارەیە پێویستییەکانیان بۆ دابین ناکات و هەموو خەرجییەکانی کە پێویستی پێیەتی دابینی ناکات.

---

١ـ أنظر: ((الفتح)) للحافظ ابن حجر (٦ / ٧٤٣ ط الحديث).

٢ـ انظر: ((عمدة القاري)) (١٥/ ١٠٠) لبدر الدين العيني.

## نیشانەی پێنجەم: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((فتنة لا يبقى بيت من العرب إلا دخلته)).

واتە: پاشان فیتنەو ئاژاوەیەك پەیدا دەبێت هیچ ماڵێکی عەرەب نامێنێت ئیللا ئەو فیتنەیەی تێ دەچێت)). هەندێ لە ئەهلی زانست فەرموویانە: ڕەنگە ئەم فیتنەیە مەبەستی دەزگاکانی ڕاگەیاندن بێت بە هەموو شێوازەکانییەوە و بە هەموو جۆرەکانییەوە جا ئەگەر هاتوو ئەو هۆکارانە بینراو یان بیسراو یان خوێندراو بێت بەڵام لە گەڵ ئەوەیشدا دڵنیا نیم و بڕیار نادەم ئەوە مەبەستی فەرموودەکەی پێغەمبەربێتﷺ تەنها خوای گەورە دەزانێت مەبەستی پێغەمبەرەکەیﷺ چییە لەم نیشانەیەدا.[1]

## نیشانەی شەشەم: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((ثم تكون هدنة)).

واتە: پاشان ڕێککەوتنامەیەك، یان ئاگربەست مۆر دەکرێت)) وە ئێستا زۆرێك لەڕێککەوتنامە هەیە لەنێوان زۆربەی وڵاتە ئەورووپییەکان و ئەمریکییەکان لەلایەك و وڵاتە ئیسلامییەکان لە لایەکی ترەوە، خوای گەورە خۆی باش دەزانێت.((ثم تكون هدنة بينكم وبين بني الأصفر)) واتە: پاشان ڕێککەوتنامەیەك لە نێوان ئێوە و ڕۆمەکاندا[2] مۆر دەکرێت))، ((فيغدرون فيأتونكم تحت ثمانين غاية)) واتە: جا ئەوان ئەو ڕێککەوتنامەیە دەشکێنن پاشان لە ژێر هەشتا ئاڵادا هێرشتان دەکەنە سەر)) مەبەستی ئاڵایە... بۆیە ناوی نراوە غایە (مەبەست) چونکە ئەوە مەبەستی سوپایە، ئەگەر هاتوو ئاڵاکە رووخا ئەوا مەبەستەکەیش دەرووخێت وە رووخان دەچێتە نێو دڵی تاکەکانی سوپاوە ((تحت كل غاية أثنا عشر ألفا))، واتە: لە ژێر هەر ئاڵایەکدا دوازدە هەزار جەنگاوەر هەیە)).

---

١ــ وبعض أهل العلم أشار إلى أن هذه الفتنة ربما تكون ما وقع من فتن بين الصحابة رضوان الله عليهم، بداية من مقتل عثمان، واستمرت بعده. انظر: ((فتح الباري)) (٦ / ٣٣٨).

٢ــ بفهوم العصر: هم أهل أوربا و أمريكا.

له (مسند الإمام أحمد)و (سنن ابی داود و ابن ماجه)و (صحيح ابن حبان)[1] دا هاتووه به سەنەدێکی (صحيح) له فەرموودەی کابرایەك له هاوەڵانی پێغەمبەرەوەﷺ پێیان دەگوت: (ذو مخمر) دەڵێن: (مخبر) فەرمووی: گوێم لێ بوو کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((ستصالحون الروم صلحا آمنا، فتغزون أنتم وهم عدوا من ورائكم، فتنصرون وتغنمون و تسلمون، ثم ترجعون حتى تنزلوا بمرج ذی تلول "- والمرج: المكان الذي يكثر فيه الماء والخضرة - " فيرفع رجل من أهل النصرانية الصليب، فيقول: غلب الصليب، فيغضب رجل من المسلمين فيدقه، فعند ذلك تغدر الروم وتجمع للملحمة ))))، واته: ئێوه پەیماننامەیەکی ئاشتی له گەڵ ڕۆمدا مۆر دەکەن، جا ئێوه دەجەنگن و له کاتێکدا ئەوان دوژمنتانن له پاشەوەتان، ئێوه سەردەکەون و دەستکەوتتان دەست دەکەوێت و خەڵکی دەکەنە موسڵمان، پاشان دەگەڕێنەوه تاکو له جێگایەکدا دادەبەزن، که پێی دەڵێن: (مرج ذي تلول) (وەمانای مرج: ئەو جێگایەیە که سەوزایی و ئاوی زۆر لێیە، واته: مێرگ) ئەمجار کابرایەکی گاور خاچەکەی بەرز دەکاتەوه و دەڵێت: خاچ سەرکەوت... بۆیه کابرایەك له موسڵمانان پەست دەبێت و له ملی دەدا، جا لەو کاتەدا ڕۆمەکان غەدرتان لێ دەکەن و خۆیان ئامادە دەکەن بۆ داستانێك)).

له (صحيح مسلم)[2] دا هاتووه له فەرموودەی (حذيفة ی کوڕی اسيد الغفاری)یەوه دەڵێت: ( أطلع النبیﷺ علينا، ونحن نتذاكر، فقال ﷺ: " ما تذاكرون؟" قالوا: نذكر الساعة يا رسول الله، فقالﷺ: " إنها لن تقوم حتى ترون قبلها عشر آيات ) ) فذكر الدخان، والدجال، والدابة، وطلوع الشمس من مغربها، ونزول عيسى ابن مريمعليه السلام ويأجوج ومأجوج، وثلاثة خسوف: خسف بالمشرق، وخسف بالمغرب، وخسف بجزيرة العرب، وآخر ذلك نار تخرج من اليمن – وفي رواية: (( من قعرة عدن )) –

---

١ـ أخرجه ابو داود،كتاب الملاحم، باب ما يذكر من ملاحم الروم (٤٢٩٢، ٤٢٩٣)، وابن ماجة كتاب الفتن، باب الملاحم (٤٠٨٩) وقال البوصيري في ((الزوائد)): ((إسناده حسن)) وأحمد في ((المسند)) (٤/٩١) و (٥/ ٣٧١، ٤٠٩)، وابن حبان (٦٧٠٨، ٦٧٠٩)، والحاكم (٤/ ٤٦٧)، وصححه ووافقه الذهبي، وابن أبي شيبة في ((مصنفه)) (١٩٤٤٩)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٣٦١٢)، و((المشكاة)) (٥٤٢٨).

٢ـ أخرجه مسلم، كتاب الفتن، باب الآيات التي تكون قبل الساعة (٢٩٠١).

تطرد الناس إلى محشرهم)) واتە: پێغەمبەری خواﷺ بە سەری کردینەوە لە کاتێکدا ئێمە گفتوگۆ و قسەمان دەکرد، جا فەرمووی: دەربارەی چی گفتوگۆ دەکەن و باسی چی دەکەن؟ ئێمەش لە وڵامدا وتمان: باسی قیامەت دەکەین ئەی پێغەمبەری خواﷺ (تەماشای کێشەی هاوەڵان بکە و باسی چی دەکەن !)، فەرمووی: قیامەت هەڵناسێت تا لە پێشدا دە نیشانە نەبینن ئەمجار باسی کرد و فەرمووی: (دوکەڵێك)و (دەجال)و (زیندەوەرێکی سەیر (دابة))و (هەڵهاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە)و (دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم)و (یأجوج و مأجوج) و سێ ڕۆچوون ڕوو دەدات: (ڕۆچوونێك لە ڕۆژهەلات) و (ڕۆچوونێك لە ڕۆژئاواوە) و (ڕۆچوونێك لە دورگەی عەرەبەوە) لە کۆتایی ئەوانە (ئاگرێك لە یەمەنەوە دەردەچێت) (لە ڕیوایەتێکی تردا: لە قوڵایی عەدەنەوە) خەڵکی ڕادەماڵێت بەرەو مەحشەر)).

ئەمە نمونەیەکە لە نیشانە گەورەکانی قیامەت، لە ڕیوایەتی تردا هاتووە کەوا پێغەمبەری خواﷺ باسی ئەم نیشانانەی کردووە بە ڕیزبەندێکی جیاواز لەوەی کە (حذیفة ی کوڕی أسید الغفاری) ڕیوایەتی کردووە، بەڵام بە هەر حاڵ ئەوە بزانە کە نیشانە گەورەکان ئەگەر یەکێکیان ڕوو بدات ئەوا ئەوانی تر بە شوێنیدا ڕوو دەدەن وەکو گرێیەك وایە ئەگەر هاتوو کرایەوە ئەوا دەنکەکانی پەرتەوازە دەبن.

پێغەمبەری خواﷺ باسی ئەمەی کردووە هەر وەکو چۆن لە (مسند أحمد) و (مصنف ابن أبی شیبە) دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (عبداللە ی کوڕی عمرو) لە لای (الحاکم) لە فەرموودەی (أنس)ەوە یە لە چەند ڕێگایەکی ترەوە کە بە کۆی هەمووی (شێخ ئەلبانی)[1] بە دروست (صحیح) ی زانیوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((الأمارات خرزات)) واتە: نیشانەکان وەك دەنکەکانن)) ((منظومات في سلك))، واتە: لە دەزوویەکدا هۆنراونەتەوە)) تەماشای شێوازی دەربڕینی پێغەمبەری خواﷺ بکە کە خوای گەورە چۆن ئەو ڕەوانبێژییە بێ وێنەی پێ

---

١ـ أخرجه أحمد(٢ / ٢١٩)، وابن أبي شيبة (٣٧٢٧٤)، والحاكم (٤/٥٢٠) ط العلمية عن عبدالله بن عمرورضي الله عنه ورواه الحاكم عن أنسرضي الله عنه (٤ / ٥٨٩)، ورواه ابن حبان (٦٨٣٣)، والطبراني في ((الأوسط)) (٤٢٧١) عن أبي هريرة، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٢٧٥٥، ٣٢٢٧) و ((الصحيحة)) (١٧٦٢، ٣٢١٠).

بەخشیوە ((فإن يقطع السلك يتبع بعضها بعضا))، واتە: ئەگەر دەزووەکە بچڕا ئەوا شوێنی یەکتر دەکەون)) ئەی پەروەردگارمان بمانپارێزە... چەند نیشانەیەکی یەك لە دوای یەك، ئەگەر نیشانەیەکی هاتەدی ئەوا ئەو دوای نیشانەکان شوێنی دەکەون... داوا لە خوا دەکەم کەوا ئیمان بە نسیبی من و ئێوە بکات و لەسەر ئەو ئیمانە بمرین کە خۆی لێی رازییە...

چەندەها ڕووداوی زۆر... ئەی باشە دەربارەی ئەم سەردەمەی ئێمەی تیادا دەژین؟؟ ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کردووە؟؟ بەڵێ!! حاڵەتێکی شوێن کەوتنی ڕیسوایی، حاڵەتێکی لاوازی و کەساسی کە ئوممەتەکەمانی پیادا تێدەپەڕێ لەم ساڵانەدا، پێغەمبەری خوای زەوی و ئاسمانەکان ﷺ باسی کردووە... ئایا بە ئێوەم نەگوت کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ شتێکی لەم بوونەوەرەدا جێ نەهێشتووە کە ڕوودەدات تاکو قیامەت ئیللا باسی کردووە؟ ئەوەی زانی و ڕەوانی کرد ئەوا زانی و ڕەوانی کرد وە ئەوەیشە نەیزانی و ڕەوانی نەکرد ئەوا نەیزانی و ڕەوانی نەکرد)) ئەوەی کە خوای گەورە ویستی لەسەر بێت بۆ ئێمەیان گواستووەتەوە، کەوابوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەم کات و سەردەمە بەسۆیە چی فەرمووە ؟؟

ئیمامی (بوخاری و مسلم)[1] لە فەرموودەیەکی (أبی سعید الخدری) ڕیوایەتیان کردووە کە خۆشەویستمان ﷺ فەرموویەتی: ((لتتبعن)) تەماشاکە کەی ئەو فەرموودە پیرۆزەی فەرمووە؟؟ پێش چواردە سەدە... ((لتتبعن سنن من كان قبلكم، شبرا بشبر، وذراعا بذراع، حتى لو دخلوا جحر ضب تبعتموهم " قالوا: يا رسول الله: اليهود والنصاري، قال: "فمن ؟؟))، واتە: ڕێگا و ڕێسای ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون بست بە بست و باڵ بە باڵ تەنانەت ئەگەر ئەوان بڕۆنە کونی بزنمژەیەکەوە ئەوا دوایان دەکەون . فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستت جوولەکە و گاورە؟ فەرمووی: ئەی کێ؟)) واتە: ئەی جگە لەوان کێیە؟ تەماشای

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب أحاديث الأنبياء، باب ما ذكر عن بني إسرائيل (٣٤٥٦)، ومسلم كتاب العلم، باب اتباع سنن اليهود و النصارى (٢٦٦٩).

ئەم شێوازە ڕەوانبێژییە جوانە بکەن کە پێغەمبەری خوایﷺ بەو شێوە جوانە دەڕی بڕیوە و دیاری کردنێکی وردبینانەی کردووە بۆ حاڵی ئەم ئوممەتە بەسۆیە لەو شوێن کەوتن و ڕیسوا بوونە کە لەم سەردەمەدا تێدەپەڕێ چونکە ڕۆژگار دەستەوامە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾ آل عمران: ١٤٠، واتە: ئێمە ئەو ڕۆژگارەی سەرکەوتن و تێکشکانە، لە نێو مەردمدا دەستاو دەستی پێ دەکەین ڕۆژێ بۆ ئێوەیە و ڕۆژێکیش بۆ ئەوان)).

ڕێزداران... ئەم قسانە ئەوە ناگەیەنێت کەوا ئەم ئوممەتە پیاو چاکی تیادا نەماوە، بەڵام پێغەمبەری خوایﷺ باسی حاڵەتێك لە حاڵەتەکان دەکات کە ئەم ئوممەتە لەو لاوازی و شوێن کەوتنەدا تیادا تێدەپەڕێ لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی مێژوو وە پڕ سەروەری و دوور و درێژەکەی هەرچەندە ئەگەر هاتوو ئەم ئوممەتە ئێستا بەم قۆناغەدا تێدەپەڕێ ئەوا سەردەمانێك بووە بە چەندەها قۆناغی تردا تێپەڕیوە کە پڕ بووە لە پایەداری و توانابوون، دڵنیا بن جارێکی تر بە ویستی خوای گەورە پایە و دەسەڵاتی بۆ دەگێڕێتەوە چونکە ئەوە بەڵێنێکە لە پێغەمبەری نازدارەوەﷺ... کە لە پاشدا باسی دەکەم ـ إنشاء الله ـ .

ئیمامی أحمد لە(مسند)ەکەیدا و ابن ماجە لە (سنن)ەکەیدا بە سەنەدێکی (صحیح)[1] لە فەرموودەیەکی (ابو هریرە)وە ڕیوایەتیان کردووە کەوا پێغەمبەری خوایﷺ فەرموویەتی: ((سيأتي على الناس سنوات خداعات، يصدق فيها الكاذب ويكذب فيها الصادق ويؤتمن فيها الخائن ويخون فيها الأمين وينطق فيها الرويبضة)) قيل: وما الرويبضة يا رسول الله؟ قال: ((الرجل التافه)) وفي لفظ: ((الرجل السفيه يتكلم في أمر العامة)) واتە: ساڵانێکی هەڵخەڵەتێنەر بە سەر خەڵکیدا دێت، باوەڕ بە کەسی درۆزن دەکرێت و کەسی ڕاستگۆ بە درۆ دەخرێتەوە، کەسی دەستپیس

---

١ـ أخرجه أحمد (٢ / ٢٩١, ٣٣٨)، وابن ماجة، كتاب الفتن, باب شدة الزمان (٤٠٣٦)، والحاكم (٤ / ٥١٢، ٥٥٧)، وقال الحافظ في ((الفتح)) (١٣ / ٨٤): ((سنده جيد))، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (١٨٨٨، ٢٢٥٣).

وناپـاك دەبێتـە دەسـتپاك و کەسـی دەسـتپاکیش دەبێتـە دەسـتپیس و ناپـاك، (الرويبضة) دیتە قسە کردن و دەبێتـە دەم سـپی، فـەرموویان: ئـەی پێغەمبـەری خواﷺ (الرويبضة) کێیە؟ فەرمووی: کەسانێکی هیچ و پووچ و نـەفام لـە کاروبـاری گشتیدا قسە دەکەن)).

کەوابوو هەموو ئەوانەی کە ئێستا بـە چـاو دەیبیـنین و بـە گوێیـەکانمان ئـەمڕۆ دەیبیسین پێغەمبەری خواﷺ باسی کردووە چونکە ئەو هیچ قسەیەکی لـە خـۆ وە نەکردووە وە هەردەم من باسی ئەوە دەکەم بۆ ئـەوەی هیـوا و ئـاوات برژێنمـە نـاو دڵەکان لە کاتێکدا کەوا هیوا و ئاوات کەم بوونەتەوە و بێ ئومێـدی زۆر بـووە و بـێ هیوایی باڵی کێشاوە بـە سـەرماندا، دڵـەکان هاتوونەتـە لـەرزە، ئـەو کەسـەی کـەوا باسی حاڵی ئێستای خەڵکی کردووە بەو شێوەیەی ئێستا تیایدا دەژیـن بـەو شـێوە ڕوون و ئاشکرایە، باوك و دایك و ڕوح و گیـانم بـە فیـدای بێـتﷺ هـەر ئـەوە باسـی سـەرکەوتنی دیـنی خـوای کـردووە و باسـی دەسـەڵاتی ئـەم ئوممەتـە پـیرۆز و کامەرانەی کردووە وە پشت بە خـوا مـوژدەی ئـەوەتان پـێ دەدەم لـە قـسەی ئـەو ڕاستگۆیەوە کە هەرگیز لە خۆ وە قسە ناکاتﷺ.

من پڕ بە دەم دەڵێم: ئەگەر هەموو بێ باوەڕان لە هەموو بوونەوەردا کۆ ببنـەوە بە مەبەستی ئەوەی ڕەگ و ریشەی موسڵمانان لە بـن دەربێـنن یـا خـود سـەوزی و گەشـی موسـڵمانان لـەم دونیایـەدا لـە نـاو بـەرن ئـەوە نـاتوانن و هـەرگیز نـاتوانن هەرچەندە کۆ ببنەوە.

پێغەمبەری خواﷺ بەو موژدەیە موژدەی داوە هەروەکو چۆن ئیمـامی (مـسلم) لە (صحيح)[1] ەکەیدا لەفەرموودەی(ثوبان)ەوە ریوایـەتی کـردووە کـەوا پێغەمبـەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إن الله زوى لي الأرض فرأيت مشارقها ومغاربها )) واتە: خـوای گەورە زەوی بۆ نزیك کردمەوە تاوەکو ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاوام بینی)).

کەوا بوو پەروەردگارمان ئەم زەوی یەی بۆ پێغەمبەرەکەی بچووك کردەوەﷺ و ئەویش ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەوی بینی، هەروەکوو چۆن (المسجد الأقـصى) ی بـۆ

---

١ــ أخرجه مسلم، كتاب الفتن و أشراط الساعة، باب هلاك هذه (الأمة بعضهم ببعض ٢٨٨٩).

ڕوونکردەوە لە پاش گەڕانەوەی لە گەشتەکەی بۆ ئاسمان لە شەوی (إسراء و معراج)دا هەروەکو دەزانن خوای گەورە وێنەکەی بۆ گواستەوە و لە پێش چاوی دانا هەر کە بێ باوەڕان پرسیاریان بکردایە دەربارەی هەر شتێك ئەوا تەماشای دەکرد و وەسفی بۆ دەکردن[1]! ئەوەیش لای خوای گەورە زۆر گران و دەگمەن نییە.

ئەمجار پێغەمبەرمانﷺ فەرمووی: ((وإن أمتی سیبلغ ملکها ما زوی لی منها)) واتە: بە دڵنیاییەوە موڵك و سامانی ئوممەتەکەم دەگاتە ئەو جێگایەی کە بۆم بچووك کرایەوە)).

پێغەمبەری خواﷺ موژدە بە هاوەڵانی دەدات لە کاتێکدا ئەوان لە مەککەن و قامچی دوژمنان لەسەر پشتیانە و خوێن بە جەستەیانەوە ڕێدەکات وە بێ باوەڕان ئازاری ئەوانیان دەدا لەسەر ئەو لمە گەرمە و لەو قرچەی گەرمادا... موژدەی چییان پێ دەدا؟؟ بە سەر کەوتن و پایەداربوون... دەفەرموێت: ((وإن أمتی سیبلغ ملکها ما زوی لی منها، وأعطیت الأحمر و الأبیض))، واتە: وە بە دڵنیاییەوە موڵك و سامانی ئوممەتەکەم دەگاتە ئەو جێگایەی کە بۆم بچووك کرایەوە وە خوای گەورە سوور و سپی پێ بەخشیم)).

ئەوەش موڵکی کیسرا و قەیصەرە هەروەکو لە هەردوو کتێبی (الصحیح)[2] دا هاتووە لە فەرموودەی (ابی هریرە)وە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إذا هلك کسری فلا کسری بعده، وإذا هلك قیصر فلا قیصر بعده، والذي نفسي بیده لتنفقن کنوزهما في سبیل الله))، واتە: ئەگەر کیسرا لە ناوچوو ئەوا کیسرای تر بە دوایدا نایەت، ئەگەر قەیصەر لە ناوچوو ئەوا قەیصەری تر بە دوایدا نایەت، سوێند بێ بە ئەو کەسەی گیانی منی بە دەستە هەموو گەنجینەکانیان لە پێناوی خوادا دەبەخشن)) .

---

١ـ انظر: البخاري (٣٨٨٦)، ومسلم (١٧٠) من حدیث جابر ﷺ ومسلم (١٧٢) من حدیث أبي هریرةﷺ.

٢ـ أخرجه البخاري، کتاب الجهاد والسیر، باب الحرب خدعة (٣٠٢٧)، ومسلم کتاب الفتن و أشراط الساعة، باب لا تقوم الساعة حتی یمر الرجل بقبر الرجل، فیتمنی أن یکون مکان المیت من البلاء (٢٩١٨)، وروي عن جابر بن سمرة عند البخاري (٣١٢١) و مسلم (٢٩١٩).

براکەم... کەس باوەڕ بەوە ناکات تەنها کەسانێك نەبێت کە خوای گەورە دڵی پڕ کردووە لە ئیمان و دڵنیایی هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا﴾ الأحزاب:٢٢، واتە: جا کە بڕواداران ئەو هەموو لەشکر و دەسەڵاتەی حیزبەکانیان چاوکرد کە بەرەو روویان دەهاتن بۆ مەدینە گوتیان: ئەمە هەر ئەو بەڵێنە بوو کە خوا و پەیامبەرەکەیﷺ پێیان داین، واتە: لە پێشەوە بەڵێنیان پێ داین بە رۆژە دژوارو سەختەکان، لە پاشان بە یاریدەدان و سەرکەوتن، خوا و پەیامبەرەکەیﷺ ڕاستیان فەرمووە، باوەڕدارەکان پتر باوەڕ و ملکەچییان زیادی کرد)).

ئەمە دروشمی ئیماندارە ڕاستگۆکانە، بەڵام دوورووەکان ئەوا قسەکانیان خراپ و چەپەڵە هەروەکو خوای گەورە باسی دەکات﴿مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا﴾ الأحزاب: ١٢، واتە: ئەو بەڵێنەی خوا و پێغەمبەرەکەیﷺ پێیان داین بە سەرکەوتن، هەر فریودان و لە خشتە بردن بوو بۆمان!)).

پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((وإني سألت ربي لأمتي أن لا يهلكها بسنة عامة،- أي بقحط عام – وأن لا يسلط عليهم عدوا من سوى أنفسهم فيستبيح بيضتهم وإن ربي قال: يا محمد إني إذا قضيت قضاء فإنه لا يرد، وإني أعطيتك لأمتك أن لا أهلكهم بسنة عامة، وأن لا أسلط عليهم عدوا من سوى أنفسهم يستبيح بيضتهم ولو اجتمع عليهم من بأقطارها))، واتە: من داوام لە پەروەردگاری خۆم کرد کەوا ئوممەتەکەم بە گرانییەکی سەختی گشتگیری لە ناو نەبات، دوژمنێکی جگە لە خۆیان باڵا دەست نەکات بە سەریاندا بگاتە رادەیەك کە وەچە و نەوەیان لە ناو ببات، پەروەردگارم پێی فەرمووم: ئەی محمدﷺ من ئەگەر هاتوو هەر فەرمایشتێکم بڕیار دابێت ئەوا گەڕانەوەی نییە، دڵنیابە ئەوەم پێ بەخشیت کەوا ئوممەتەکەت بە گرانییەکی سەختی گشتگیری لە ناو نەبەم و دوژمنێکی جگە لە خۆیان باڵا دەست نەکەم بە سەریاندا بگاتە رادەیەك کە وەچە و نەوەیان لە ناو

ببات، ئەگەرچی هەموو خەڵکی دەور و بەریان لەسەر کۆ ببنەوە)).

ئای چی موژدەیەکی خۆشە....!!

لە فەرموودەیەکی تردا کە (أحمد) و(الحاکم)[١] و جگە لەوان بە سەنەدێکی (صحیح) لەسەر مەرجی (مسلم) لە (تمیم الداری) یەوە ریوایەتیان کردووە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((لیبلغن هذا الأمر - واته: ئەم دینە - ما بلغ اللیل والنهار)) — واتە: ئەم دینە دەگاتە ئەو جێگایانەی کە شەو و ڕۆژ پێی گەیشتوون)) ئایا شەو و ڕۆژ هێچ جێگایەکیان جێهێشتووە و پێی نەگەیشتبن؟ نەخێر سوێند بە خوا — ((ولا یترُكُ الله بیت مَدَرٍ ولا وَبَرٍ إلا أدخله الله هذا الدین، بعزِ عزیزٍ أو بذل ذلیلٍ، عزاً یعز الله به الإسلام، وذلاً یذل الله به الکفر))، واتە: خوای گەورە هیچماڵێکی لە قوڕ دروستکراو و هیچ ماڵێکی لە خوری دروستکراو بە جێ ناهێڵێ ئیللا ئەم دینەی پێ دەگەیەنێت، جا چ بە شکۆی شکۆمەندانەوە یان زەلیلی خاوەن زەلیلیەکانەوە، شکۆیەك خوای گەورە ئیسلامی پێ شکۆدار دەکات و زەلیلییەك خوای گەورە کوفری پێ زەلیل بکات)).

وەرن... ئەی چاکەکاران... لە پاش ئەم پێشەکییە زانستییە... لە پاش ئەم باسە لە نیشانەکانی پێش هاتنی قیامەت... وەرن با پێکەوە باسێك دەربارەی (دوایین ڕووداوەکان)) بەدرێژی بکەین، ئەم زنجیرە پرۆگرامییە لە نێوان بناغەیەکی زانستی و پرۆگرامێکی پەروەردەیی و شێوازێکی بانگەوازی کۆ دەکاتەوە... لە کاتێکدا پێشکەشی دەکەم کە شەهەوات و ماددییات زاڵ بوونە،زۆربەی خەڵکی لەسەر بەرنامەکەی خوای پەروەردگار لایان داوە و تاوەنەکانیش لەسەر یەك کۆ بوونەتەوە و ترس لە خوای پەروەردگار کەم بووتەوە... ئەمە پێشکەش ناکەم بۆ ئەوەی لەم واقیعە هەڵبێم، بەڵکو پێشکەشی دەکەم بۆ ڕاستکردنەوەی واقیع بۆ ئەوەی ئەو مرۆڤایەتییەی، کە وەکو سەرخۆش لەبەر خۆیانەوە وڕینە دەکەن و پێدەکەنن وەکو شێت ڕادەکەن، وەکو کەسێکی هەڵاتوو و کارو کردەوەیەك بە

---

١ـ أخرجه أحمد(٤ / ١٠٣)، و الحاكم(٤ / ٤٣٠، ٤٣١)، والبيهقي في((الكبرى)) (٩ / ١٨١) من حديث تميم، وله شاهد عند أحمد (٦ / ٤)، وابن حبان (٦٧٠١)، والحاكم (٤ / ٤٧٦) ط العلمية، والطبراني في ((الكبير)) (٢٠/ ٢٥٤)، والبيهقي في((الكبرى)) (٩/١٨١)من حديث المقداد بن الأسود، وصححه الشيخ الألباني في((الصحيحة))(٣).

یەکتر دەکەن، کە گیاندارە دڕندەکان شەرم دەکەن بە یەکتری بکەن لە جیهانی دارستاندا! ! بۆ ئەوەی بزانن بە دڵنیاییەکەوە، کەوا مردن کۆتایی ژیان نییە... نەخێر نەخێر ... بەڵکو لە پاش مردن زیندووبوونەوە هەیەو لەپاش زیندووبوونەوەش حەشر هەیە و لە پاش حەشر لێپرسینەوە و، ڕاوەستان لەبەر دەستی خوای پەروەردگاردا بەزەلیلی و ترسەوە هەیە بە مەبەستی پرسیار کردن دەربارەی کەم و زۆر، بچووك و گەورە.

خوای گەورە دەفەرمویێت ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾ الزلزلة: ٨، واتە: ئینجا هەر کەسێك کێشی وردیلەیەك چاکەی ئەنجام دابێت، پاداشەکەی دەبینێتەوە.(٧) کەسێکیش کێشی وردیلەیەك شەر و خراپەی کردبێت، تۆڵەکەی دەبینێتەوە. مەگەر خوا قەڵەمی عەفوو بێنێ بە سەریا، کەوابوو با هەموومان هۆشیار و زیرەك و وریابین، بزانین رۆژانە چی ئەکەین و لە خوا بترسین (٨)).

خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ﴾ الأنبياء: ٤٧، واتە: بێ گومان ڕۆژی قیامەت ئێمە ترازووی دادپەروەری دائەنێین و کردەوەکانیانی پێ ئەکێشین ئەوسا هیچ کەسێك کەمترین ستەمی لێ ناکرێ چ لە چاکەکاران و چ لە خراپەکاران، تەنانەت ئەگەر کردەوەکانیانی بە ئەندازەی سەنگی دەنکە خەرتەلەیەکیش بێت کە لە بچووکیدا کراوە بە نموونە، ئێمە ئەیهێنین و ئامادەی ئەکەین وە ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە کە بە وردی ژمێریاری کردەوەکانیان بین)).

لە پاش لێپرسینەوە بەهەشت یان دۆزەخ هەیە... خۆشییەك هەرگیز ناخۆشی بە دوایدا نایەت وە یا خود ناخۆشییەك هەرگیز خۆشی بە دوابیدا نایەت ((یا أهل الجنة خلودا فلا موت ... ویا أهل النار خلود فلا موت))، واتە: ئەی ئەهلی بەهەشت بە نەمری بژین و چیتر مردن نییە... ئەی ئەهلی ئاگر بە نەمری بژین چیتر مردن نییە)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ فَمِنْهُمْ شَقِىٌّ وَسَعِيدٌ ﴿١٠٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُوا۟ فَفِى ٱلنَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ ﴿١٠٦﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٠٧﴾ ۞ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُوا۟ فَفِى ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۖ عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ﴾هود: ١٠٥ـ ١٠٨، واتە: رۆژێکیش کە دێت هیچ کەسێك بۆی نییە بە فەرمانی خوا نەبێت قسە بکات ئینجا ئەو خەڵکە دەبنە دوو کۆمەڵ، هەیانە بە هۆی لاساری و کلابونییەوە بەدبەختە و چارەڕەشە، هەشیانە بە بۆنەی چاکیی و باشی خۆیەوە بەختیار و روو سپییە(١٠٥) جا ئەوانەیان بەدبەخت و لار و لاسارن لە ئاگردان، هەر لەوێیش تووشی هەناسە کورتی و تەنگە نەفەسی دەبن و هەر هاوار هاواریانە(١٠٦) تا ئاسمانەکان و زەوی هەبن ئەوانیش تێیدا ئەمێننەوە. عەرەب ئەگەر ویستبای بڵێ ئەو شتە بەردەوام و هەمیشەیە دەیگوت: (ما دامت السموات والأرض) کەوابوو بە هەتا هەتایی لە دۆزەخدا دەمێننەوە و لێی دەرناچن، مەگەر پەروەردگارت بیەوێ لە وەخت و کاتێکدا دەریان بهێنێ بۆ ئەوەی بە جۆرێکی تر لە سزا سزایان بدات، بە راستی پەروەردگاریشت زۆر بە دەسەڵاتە بیەوێ هەر شتێ بکات دەیکات وە هیچ بەرگرێکی بۆ نابێت.(١٠٧) ئەوانەیشیان کامەران و بەختەوەرن لە ئەوەڵ لەحزەوە لە بەهەشتن و بۆ هەمیشە لەوێ ئەمێننەوە تا ئاسمانەکان و زەوی بن مەگەر ئەوەندە پەروەردگارت مەیلی هەبێ کارێ تر بکات جا ئەوکاتە لە بەهەشتدا نابن.(إبن کثیر) ئەڵێت: مانەوەیان لە بەهەشتدا بە هەتا هەتایی واجیب و پێویست نییە لەسەر خوا، بەڵکو خوا بە فەزڵ و منەتیەتی، جا بۆ ئەوە سوپاس و تەسبیحاتی بکەن زیکری (سبحان الله، الحمد لله) ئەخرێتە سەر زاریان، ئەو بەخششە هەتا هەتایی و نەبڕاوەیە.(١٠٨))).

باسەرەتایی ((دواین رووداوەکان)) ببێتە کۆتایی... بەڵێ... ئەمە کۆتاییەکی بێ گومانی راستییە بۆ هەموو مرۆڤێك لەسەر زەویدا هەر چەندە رێزی بەرز بێت یان پلەی بەرز بێت یا نزم بێت! ئەوە مردنە...

داوا لە خوا دەکەم لەم زنجیرەیەدا پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین و ببێتە سەرەتایەك بۆ گەڕانەوەیەکی ڕاست بۆ لای خوا... ببێتە هۆیەك بۆ گەڕانەوەی ئەم ئوممەتە بۆ پلە و پایە و پێشەنگی و کەرامەت و خۆشگوزرانی لە دونیا و قیامەتدا ئەویش بە نەهێشتن و بنەبڕ کردنی لاوازی و بێ دەسەڵاتی و بێ ئومێدی و داروخانی دەروونە بکوژەکەیە... ئەو حاڵەتە لەرزۆکە ترسناکە کە توشی بووە و بووتە هۆی وازهێنان لە کار کردن و داهێنان بە هۆی خراپ تێگەیشتن لە مەبەستی خوا و پێغەمبەرەکەیﷺ. هەروەها داوا لە خوای گەورە دەکەم کە ببێتە هۆیەك بۆ کارێکی دڵسۆزانەو داهێنان لە دین و دونیادا پێکەوە. دڵنیا بن کە ئەم ئوممەتە ناتوانێت ڕێگایەك بۆ خۆی بکاتەوە بەرەو شکۆمەندی و کەرامەت لە نێو بەردی سیستەمی نوێی جیهانی بەڵکو ناتوانێ خۆی خۆشگوزەران بکات لە دوا ڕۆژدا بە بەهەشتی بەرین تەنها بە زانست و کردەوە (علم وعمل) نەبێت.

چەند بێ نرخە هەندێ کەس پڕوپاگەندەی ئەوە دەکەن کە هیچ لە کێشەکە ناگۆڕێت تاکو (المهدی) لە دوا ڕۆژدا دەرنەچێت چیتر با ئەم ئوممەتە واز بهێنێ لە زانست و کار و کردەوە (علم وعمل) با چاوەڕوانی (المهدی) ئاخر زەمان بکەین . ئەگەر وابوایە ئەوا پێغەمبەری خواﷺ بەرگەی ئەو هەموو ئازارەی نەدەگرت و بە سەر درك وداڵدا ڕێی نەدەکرد بۆ ئەوەی دینی خوا بگەیەنێ .

کەوابوو هەموو ڕابن و هەستنەوە بۆ خۆشگوزرانی دونیا و قیامەت و داوا لە خوا دەکەم کە ئەم کارە تەنها لە بەر ئەو بێت و پشکمان لە دینەکەماندا تەنها قسەکردن نەبێت و داوای لێ دەکەم کە مەبەست و نیەتمان پاك بکاتەوە. إنە ولي ذلك وهو مولاه.

# سەرەمەرگی

با هەموو کەسێك بزانێت ئەم دونیایە هەرچەندە درێژە بکێشێت ئەوا هێشتا هەر کورتە، هەر چەندە گەورە و مەزن بێت ئەوا سووك و ریسوایە، چونکە شەوگار هەرچەندە درێژە بخایەنێت ئەوا هەر دەبێت شەبەق دەرکەوێت، لە بەر ئەوەی تەمەن هەرچەندە درێژ بێت ئەوا هەر دەبێت بچینە ناو گۆڕەوە.

أيـــا مــــن يــــدعى الفهـــم　　إلى كـــم يـــا أخـــى الـــوهم
تتبــــع الـــذنب بالــــذنب　　وتخطـــــى الخطـــــأ الجـــــم
أمـــا بـــان لــــك العيـــب　　أمـــا أنــــذرك الــــشيب
ومـــا فـــى نـــصحه ريـــب　　أمـــا نـــادى بــك المـــوت
أمـــا أسمعـــك الـــصوت　　أمـــا تخـــشى مـــن الفـــوت
فتحتـــــــاط وتهـــــــتم　　فكـــم تـــسير فـــى الـــسهو
وتختـــال مــــن الزهـــــو　　وتـــــنفض إلى اللـــــــهو
كـــأن المـــوت مـــا عـــم!　　كــــأني بــــك تـــــنحط
إلى اللحــــــد وتـــــنغط　　وقـــــد أســـــلمك الــــرهط
إلى أضـــيق مــــن ســـم　　هنـــاك الجــــسم ممــــدود
ليـــــستأكله الـــــدود　　إلى أن ينخــــر العـــــود
ويمـــسى العظـــم قـــد رم　　فــــزود نفـــسك الخـــير
ودع مـــا يعقـــب الـــضير　　وهيـــئ مركـــب الـــسير
وخـــف مـــن لجـــة الـــيم　　بـــذا أوصـــيك يـــا صـــاح
وقـــد بحتـــك مـــن بـــاح　　فطـوبى لفتـى راح بـآداب محمـد يـأتم

واتە: ئەی ئەوکەسەی بانگەشەی تێگەیشتن دەکەی،هەتاکەی-براکەم-خەیاڵ و گومان و ئەندێشە؟،بە تاوان شوێنی تاوان دەکەویت، بەهەنگاوی زۆر هەنگاو دەنێیت، ئایا شوورەیی و کەم وکووڕیت بۆ روون نەبووەتەوە؟، ئایا پیری وریای

نەکردیتەوە؟ هیچ گومانێك لە ئامۆژگاری ئەودا نییە، ئایا مردن بانگی نەکردووی؟ ئایا دەنگەکەی ئەوت نەبیست؟ ئایا لە لەدەست دەرچوون ناترسیت؟ جا بایەخ دەدەیت و گرنگی دەدەیت ، هەتا کەی لە خامۆشیدا ڕێ دەکەی؟ لەخۆت بایی دەبیت لە بەر جوانی و قەشەنگی، دەڕۆی بۆ لای ڕابواردن و خلافاندن، دەڵێی مردن هەموو کەسێك ناگرێتەوە! وا دەتبینم کە بەرەو خوارەوە دەکەویت کاتێ داهێڵرای بۆ ناو گۆڕەکەت، لە کاتێك کەوا خەڵکی تۆیان سپارد، بۆ جێگایەك کە تەنگترە لە کونی دەرزی، لەوێ جەستەکەت درێژ بووەتەوە،بۆ ئەوەی کرمەکمان بیخۆن، تاکو ئەو دار و چیلکەیە پووك دەبێتەوە، کە ئێوارە هات ئێسکەکە دەڕزێ، بۆیە چاکە بکە توێشووی خۆت واز بهێنە لەوەی لە پاش زیان دێت، بۆیە سوارێکی ڕۆیشتن بۆ خۆت ئامادە بکە لە بەر زۆری ئاوی دەریاکە لە سەرخۆبە، بە ئەوە ئامۆژگاریت دەکەم ئەی هاورێکەم، ئەوا هەموو شتێکم بۆ ئاشکرا کردی، جا مژدە بۆ ئەو کەسەی کە دەڕوات، لەسەر ڕێ و شوێنی پێغەمبەرو جێ بەجێی دەکات.

ژیان زۆر بە پەلە دەڕوات!! زۆربەی خەڵکی وان لە بێ ئاگابووندا دەربارەی ئەوەی کە دێت - ئیللا کەسانێك نەبێت کە خوای گەورە خۆی ڕەحمی پێ کردبێتن-، ئەگەر کەمێك بگەڕێیتەوە بۆ پاشەوە، دەڵێیت: مانگی ڕەمەزانی پێشوو وا هەست دەکەم تەنها لە مانگی پێشوودا بووە، بەڵکو ئەمڕۆ کە تۆی تیادای ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ هەمان ڕۆژ لە هەفتەی ڕابوردوو وا هەست دەکەیت کە پێش کاتژمێرێك بووە! دڵنیا بە کە تەمەن دەڕوات وەڕۆژگار دەڕوات وە مانگەکانیش بە دوایدا دەڕۆن وە ساڵەکان لە گەڵ خۆیاندا ڕادەکێشن وە تەمەنیش بە دوای خۆیدا ڕادەکێشی وە ژیانی نەوە دادەخرێت لە پاشان نەوەیەکی تر و لە پاشان نەوەیەکی تر... وە پاش هەموو ئەوانە، هەموو خەڵکی لە بەر دەستی پادشای شکۆمەندا ڕادەوەستن بە مەبەستی لێپرسینەوە لە گەورە و بچووك ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾ الزلزلة: ٧ـ٨، واتە: ئینجا هەر کەسێك کێشی وردیلەیەك چاکەی ئەنجام دابێت، پاداشەکەی دەبینێتەوە.(٧) کەسێکیش کێشی وردیلەیەك شەر و خراپەی کردبێت، تۆڵەکەی دەبینێتەوە. مەگەر خوا قەڵەمی عەفوو بێنێ بە سەریا، کەوابوو با هەموومان

هۆشیار و زیرەك و وریابین، بزانین ڕۆژانە چی ئەکەین و لە خوا بترسین.(٨))).

زۆربەی خەڵکی وان لە بێ ئاگابووندان لەوەی کە دێت نموونەیان وەکو لێشاوی شەپۆلە یەك لە دوای یەکەکانی دەریاکانە هەر کاتێك شەپۆلێك لە ڕۆخی دەریاکەدا بشکێتەوە ئەوا شەپۆلێکی تر بە شوێنیدا دێت.

نموونەیان وەکو ئەو ئاوە بە خوڕەیە کە لە ڕووبار و دەریا و زەریاکانەوە هەڵدەقوڵێن بزانە کە ئەو ئاوەی ئەم ساتە چاوەکانتی دەکەوێتە سەر جیاوازە بە تەواوەتی لەو ئاوەی کە پێش ساتێك بینیوتە، چونکە ئاو دەڕوات و دەگۆڕێت وە ژیانیش دەڕوات و دەگۆڕێت، منداڵدانەکان بەرهەم دەهێنن و منداڵ دەردەهێنن و زەویش قووتی دەدات، چەندەها ئافرەت لە هەموو ساتێکدا لە ڕووی زەویدا منداڵیان دەبێت، خەڵکانێك لە هەموو ساتێکدا لە ڕووی زەویدا بەرەو گۆڕستان دەبرێن . وە ڕۆژێك دادێت کە بوونی مرۆڤایەتی بە گشتی رادەوەستێ و ڕوناکی هەموو ئەستێرەکانی ئاسمان دەکوژێتەوە و ئاوەکان ڕادەوەستن، ئاوی کانی و بیرو چاڵاوەکان وشك دەکەن، ئاوی روبار و دەریا و زەریاکان رادەوەستن بۆ ئەوەی لە پاش ئەوە هەمووان هەستنەوە بۆ راوەستان لە بەر دەستی خوای گەورە و میهرەبان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴾ إبراهیم: ٤٨، واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا ئەم زەوییەی ئێستا ئەگۆڕدرێ بە زەوییەکی تر، ئاسمانەکانیش هەروا! ئەوجا هەموان لە گۆڕەکانیان دەهێنرێنە دەرو، دەبرێن بۆ بەردەم خوای تاك و تەنیای دەسەڵاتدار)).

هەموو شتێك لە ژیانی ئەم دونیایەدا گۆڕا و تەواو بوو، وە بوونی مرۆڤایەتی بە گشتی راوەستا، بووەستە لە گەڵ ئەم ساتەدا، کات و ساتی تۆ – ئەی برا خۆشەویست و ژیرەکەم– بە مردنت دەست پێ دەکات و کات و ساتی من بە مردنم دەست پێ دەکات، قیامەتی تۆ بە مردنت دەست پێ دەکات وە لە ژیانی ئەم دونیایە دەگوێزرێیتەوە بۆ ژیانی دوایی، بە تەواوەتی جیاوازە لەو ژیانەی کە تۆی تیادا دەژیت، خوای گەورە مەبەست و هۆی دروستکردنمانی روون کردووەتەوە وە

ڕاستی ئەم دونیایەی تیایدا دەژین بۆ روون کردوویینەتەوە.

خـــــوای گـــــەورە دەفـــــەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ الذاريات:٥٦، واتە: من هەر بۆیـە جنۆکـە و ئـادەمیم دروسـت کـردووە بم پـەرسـتن و بمناسن)).

ئەمـە ئـەو مەبەسـت و ئامانجەیـە، کـە لـە پێناویـدا دروسـت کـراوین، هـەر لـەو پێناوەدا زەوی و ئاسمانەکان دروست کراون، بەهەشت و دۆزەخ، هەر لەو پێنـاوەدا خوای گەورە کتێبی دابەزاند و هەموو پێغەمبەرانی ڕەوانە کردووە، هەموو بوونەوەر تەنها لەو پێناوەدا دروست کراوە، لە پێناوی ئەوەی کە خـەڵکی بـە تـاك و تـەنهایی خوای خۆیان بپەرسـتن و بـە تـەنها خـوای بـزانن و بـۆ ئـەوەی تـەنها خـوای گـەورە بپەرستن و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن.

بۆیە ئەم مەبەست و ئامانجە بە جوانی بناسە و بزانە، وریا بە وەکو قسەی ئـەو کابرا گومڕایە نەکـەیت کـە دەڵێـت: ((هـاتم... نـازانم لـە کـویَ وە.. بـەڵام هـاتم ... ڕێگایەکم لە پێش خۆم بینی و لە سەری ڕۆیـشتم ... بـەردەوام لەسـەر ئـەم ڕێگایـە دەڕۆم بمەوێت یان نا... چۆن هاتم؟؟ چۆن ڕێگاکەی خۆم بینی.؟؟ نازانم! !)).

بەڵام کەسی موسڵمان دەزانـێ، هـەر کەسـێ خـوای گـەورە بناسـێ دەزانـێ ئـەو دروستکراوێکە لە دروستکراوەکانی خوا، خوای گـەورە لـەم دونیایـەدا بـۆ ئامانجێك دروسـتی کـرددوە، بـەڵکو چارەنووسـی بـۆ دیـاری کـردووە، کۆمـەڵێك وان لـە بەهەشتدان و کۆمەڵێك لە دۆزەخ، داوا لە خوای باڵا دەست دەکەم من و ئێوە بکاتە ئەهلی بەهەشت هەر خۆی پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

کەوابوو مەبەست و ئامـانج تـەنها پـەرسـتنە، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ الـذاريات: ٥٦، واتـە: مـن هـەر بۆیـە جنۆکـە و ئادەمیزادم دروست کردووە بم پەرستن و بمناسن)).

ئایا ڕاستی و دروستی ژیانی ئەم دونیایە چییە؟

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ ۖ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمًا ۖ وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٌ ۚ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴾ الحديد: ٢٠، واتە: بزانن کە بە ڕاستی ژیانی ئەم دونیایە تەنها گەمەو گەپ و جوانی و زۆرکردنی ماڵ و منداڵ و خۆهەڵکێشانی نێوانتانە وەك وێنەی بارانێکە شینابیەکەی گەشتیاران سەرسام بکات پاشان وشك ببێ جا ببینیێ بە زەرد بوویی، دواتر ورد و خاشاك ببێ و (با) هەر پرووشەی بباتە جێگاکەوە، واتە: زیبا و جوانی ئەم دونیایەش هەروەك مەزراو کشتوکاڵێك وایە کە زۆر بە جوانی و رێك و پێکی بنج داکوتێ سەوز ببێ پاشان وشك و زەرد وەرگەڕێ و بایەکی توندی بۆ هەڵکەوێ هەرپرووشەی بخاتە بن دارێك لە پاشە ڕۆژێشدا سزایەکی سەخت هەیە بۆ کافر و بێ باوەڕان، لێبووردن و، ڕەزامەندیش لای خوا هەیە بۆ دۆستانی ژیانی دونیا تەنها کاڵای دەستخەڕۆکارە، کەوابوو هۆشیار بن و نەخەڵەتێن بە دونیا)).

مەبەست لە (الکفار) لێرەدا باخەوانە.

کەوایە تەماشای راستی و دروستی ژیانی دونیا بکە بۆ ئەوەی راست و دروستی ئەم دونیایە بزانی کە خوای گەورە کردوویەتیە جێگای بەڵا و تاقیکردنەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً ﴾الأنبياء: ٣٥، واتە: بە ناخۆشی، خۆشی، هەژاری، دەوڵەمەندی، لەش ساغی و نەخۆشی، تا سابیر و ناشوکر دەرکەوێ ئەگینا خوا بۆ خۆی دەزانێ وە بەمەش ئیقامەی حوججەیان لەسەر دەکات تا کەس بیانووی نەمێنێ)) بۆ تاقیکردنەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴾ الملك: ٢، واتە: ئەو خوایە کە مردن و ژیانی دروست کرد، ئەوەتا هەندێ ئەژێنێ، هەندێ ئەمرێنێ خۆ مردنیش گواستنەوەیە لە جێگایەکەوە بۆ

جێگایەکی تر، پاشان لە جێگای دووەمدا ژیانێکی نوێ دەست پێ ئەکاتەوە، بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە کامەتان کار و کردەی چاکتر و باشترە، پاشانیش بە پێی ئەوە پاداش وەرگرێتەوە، واتە: تاقی دەکرێنەوە بۆ ئەوە کە خۆی و خەڵکانی تر بزانن لە ئایندەدا چ کارێ ئەنجام ئەدات، تەنها ئەوە دەسەڵاتدار، (ئەتوانێ تۆڵە لە هەموو کەسێك وەربگرێ، زۆریش گوناهپۆش و لێبووردەیە، بۆ هەر کەسێك تەوبە بکا و پەشیمان بێتەوە و بگەڕێتەوە بۆ لای)).

کەوایە تۆ لێرەدای لەم جێگایە بۆ تاقیکردنەوە وە لە ژیان و ماڵی تاقیکردنەوەی، چونکە دونیا ماڵی ڕێڕەوە و ماڵی مانەوە نییە، دونیا ڕێگایەکە یان بەرەو بەهەشت یان بەرەو ئاگر، ئەم دونیایە کێڵگەیەکە بەرهەمێك دەچێنێ کە بەرەو بەهەشت دەتبات وە یاخود بەرەو دۆزەخ خوای گەورە من و ئێوە بپارێزێ لە ئاگر.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ فَأَصۡبَحَ هَشِيمٗا تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَٰحُۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقۡتَدِرًا ﴿٤٥﴾ ٱلۡمَالُ وَٱلۡبَنُونَ زِينَةُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ أَمَلٗا﴾ الکهف: ٤٥- ٤٦، واتە: ئەی پێغەمبەرﷺ تۆ نەزیلەی ژیانی ئەم دونیایەیان بۆ بهێنەوە لە جوانی و ڕازاوەییدا وە لە فەنا و تیاچوونیدا بەوەی کە وەکو ئەو ئاوە وایە کە لە ئاسمانەوە دەیبارێنینە سەر زەوی ئەوجا تێکەڵ بە ڕووەك و تۆوی ناو زەوی دەبێ و هەموو تەرزی گژوگیایەکی جوان و هەمە جۆرەی پێ سەوز دەبێ، هەندێکی پێ ئاوێتە بە هەندێکی تری دەبێ و سەر لێك دەدەن و زەوی دەرازێننەوە کەچی لە دوای ماوەیەك دەبێتە پووش و پەڵاش و (با) پرژ و بڵاوی دەکاتەوە، هەمیشە خوای گەورە بە سەر هەموو شتێکا بە توانا و بە دەسەڵاتە (٤٥) ماڵ و منداڵ زینەت و جوانی ژیانی دونیان، کەوابوو هەق نییە کەسێکی پێ بخڵەتێ و، کارو کردەوە چاکە هەرماوەکان وەکو خزمەت بە دین و بە خەڵك و ئاوەدانکردنەوەی شار و گوند و هەرکارێکی تر لەو شێوە، باشترە و باشترین هیوایە بۆ مرۆڤ (ئیبن کەسیر) دەڵێت: زۆربەی ریوایەتەکان دەڵێن: (الباقیات الصالحات) زیکری (سبحان

الله و الحمد لله و لا اله الا الله والله أكبر و لا حول ولا قوة الا بالله) يه.(٤٦))).

پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ ڕاستێتی ژیانی ئەم دونیایەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە، هەروەكو چۆن لە (سنن الترمذي)دا بە سەنەدێكی (صحيح)[1] لە فەرموودەی (ابن عمر)ەوە هاتووە كە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((لو كانت الدنيا تعدل عند الله جناح بعوضة ما سقى كافراً منها شربة ماء))واتە: ئەگەر ئەم دونیایە لای خودا تەنها باڵی مێشێكی بهێنایە ئەوا تەنها قومێك ئاوی بە كافر نەدەدا)).

تەماشای ئەم دونیایە بكە بە هەموو نەخش و نێگار و جوانییەوە چەندە لای خوای گەورە سووك و ڕیسوایە، بزانە كەوا بۆ بێ باوەڕ و باوەڕدارە، هەمووان بە پێی گرتنە بەری هۆكارەكانی دەست دەكەوێت.

خوای گەورە بوونەوەری دروست كردووە، زەوی دروست كردوو، هۆكارەكانی و یاسا و ڕێساكانی تیادا داناوە، ئەو خودایە پەروەردگاری بێ باوەڕ و باوەڕدارە وەكو یەك ڕزق و ڕۆزی بێ باوەڕ و باوەڕدار دەدات ئەگەر هاتوو بێ باوەڕان هۆكارەكانی گرتە بەر ئەوا بە پێی هۆكارەكانی بەرهەمی دەست دەكەوێت، ئەگەر ئیماندار هۆكارەكان نەگرێتە بەر بە دڵ و ئەندامەكانی ئەوا تەنها هۆكارەكان هیچی پێ نادات، كەواتە نابێت هۆكارەكان وەرنەگرین نە بە دڵ و نە بەنهێنی و ئاشكرا . ئەم دونیایە لە لای خوداوەند سووك ریسوایە تەنانەت باڵی مێشێك ناهێنێت، كاتێ كە ژیر و هۆشمەندەكان ڕاستێتی ئەم ماڵەیان زانی بۆیە ئەم دونیایەیان كێڵا و چاندیان و لە دوا ڕۆژدا بەرهەمەكانی دەدورنەوە.

إن للـــه عبـــاداً فطنـــا طلَّقوا الـدنيا وخافــوا الفتنـا
نظــروا فيهـــا فلمـــا علمـــوا أنهـــا ليـــست لِحَـــيِّ وطنـــاً
جعلوهـــا لُجَّـــة واتخـــذوا صـالح الأعمـال فيهـا سُفُنـا[2]

واتە: خوای گەورە چەندەها بەندەی ژیری هەیە، دونیایان تەڵاقداوە و لە فیتنە

---

١ـ أخرجه الترمذي كتاب الزهد، باب ما جاء في هوان الدنيا على الله (Y) (٢٣٢٠)، وقال: ((حديث صحيح غريب من هذا الوجه))، وابن ماجه كتاب الزهد، باب مثل الدنيا (٤١١٠)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٥٢٩٢) و((الصحيحة)) (٩٤٣).

٢ـ انظر: ((رياض الصالحين)) للنووي (ص ٣٨) ط دار الذخائر.

ترسان، تەماشایان کردوو کاتیـّك زانیان، کـەوا بـۆ کەسـی زینـدوو نیـشتمان نییـە، بۆیە ئەم دونیایان کردە ئاوێکـی زۆر و، کارە چاکەکانیان تیادا کردە کەشتی.

ئەم وشانە چەندە جوان و ڕێك و پێکن؟؟!! (جعلوها لجة)، واتە: ئـاو، کـردەوە چاکەکانیان تیادا کردە کەشتی، بۆ ئەوەی بە ئەم کەشتییە بە نێو شەپۆلی یەك لـە دوای یەکەکاندا لە شەپۆلی فیتنە (فیتنەی گومان و هەوەسبازی (شـەهەوەت)) بـۆ ئەوەی بەم کردەوە چاکانە بپەڕنەوە بۆ بەهەشتەکەی خوای پەروەردگار. دونیا بە گشتی لۆمە کراو و زەمکراو نییە، ئەمەیشە یەکێکە لـە بنـەما زانستیەکان کـە حـەز دەکەم جەخت لە سەری بکەم. لە قورئان و سوننەتدا بە گشتی خودی ئەم دونیایە لۆمە و زەم نەکراوە[1] نە بۆ کاتەکەی (کە شەو و ڕۆژە) وە نەبۆ جێگا و شـوێنەکەی (کە زەوییە)و، نە بۆ پیت و کەڵك و سوودەکانی و ئەوەی کە تیایدایە.

چۆن لە کاتێکدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ خِلۡفَةٗ لِّمَنۡ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوۡ أَرَادَ شُكُورٗا ۝٦٢ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا﴾الفرقان: ٦٢، واتە: ئەو خوایەیە شەو و ڕۆژی جێنشینی یەك کردووە، بە نۆرە لە دوای یەك دێن، ئەمەیان ڕەشە و تاریك ئەوەشیان ڕووناك و سپی، بۆ کەسێك بیەوێ لە نیعمەتەکانی خوا بیر بکاتەوە و یان بیەوێ سوپاسگوزار بێت)). کەوایە شەو و ڕۆژ دوو ئایەتن لە ئایەتەکانی خوای پەروەردگا...

خـوای گـەورە دەفـەرموێت ﴿وَءَايَةٞ لَّهُمُ ٱلَّيۡلُ نَسۡلَخُ مِنۡهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظۡلِمُونَ ۝٣٧ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ۝٣٨ وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ﴾ یس: ٣٧- ٣٩، واتە: شەویش نیشانەو بەڵگەیەکی ترە بۆیان کە ئێمە ڕووناکی خۆر و ڕۆژی لێ دەردەکێشین جا لـە ناکاو شـەو دێ و دەڕۆنە تاریکییەوە.(٣٧) بەڵگەیەکی تر بۆیان خۆرە کە بەردەوام دێت و دەچـێ تـا

---

١- انظر: ((جامع العلوم والحكم)) لابن رجب (٣٦٩) ط الحديث.

کاتی دیاریکراوی خۆی بۆ راوەستان و لە کارکەوتن چی دەبینی بەرەو بنەوخولگەی خۆی هەر لە گەڕدایە تا ئەوکاتە بۆی دیاری کراوە، ئەو هاتوچۆ و گەڕانە بەو شێوە وردە، خەملاندنی خوای بە دەسەڵاتی زانایە .(٣٨) گەڕانی مانگیشمان خەملاند — کە ئەمیش بەڵگەیەکە بۆ دەسەڵات و توانایی خۆمان — بە بیست وهەشت مەنزڵ و ئاسۆ، تا هەموو شەوێك دابەزێتە جێگایەکیانەوە پاشان دوو شەو یان شەوێك پەنا ئەگرێ تا وەك پەلی کۆنی باریکی وشکی زەرد بووی کەوانەیی داری خورمای لێ دێت (٣٩))).

زەویش نیشانەیەکی ترە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلْأَرْضُ ٱلْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَـٰهَا وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ ﴾ یـس:٣٣، واتە: نیشانەیەك بۆیان لەسەر زیندووبوونەوە، زەوی مردووە، زیندوومان کردۆتەوە بە باران و، دانەوێڵەیەکمان لێ دەرهێناوە لێی ئەخۆن و پێی دەژین)).
خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ﴾ ( ٢٠ ) سورة العنكبوت))،واتە: ئەی پێغەمبەرﷺ پێیان بڵێ: بگەڕێن گەشتی زەوی بکەن و بنواڕن خوا چۆن دروستکردنی جیهانی دەس پێ کرد؟)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴾ الملك: ١٥، واتە: ئەو خوایەیە کە زەوی رام کردووە بۆتان، بە هەر شێوەیەك بتانەوێ سوودی لێ وەربگرن ئامادەیە، لە گەڵ ئەو هەموو جم وجۆڵە و سووڕانەوەیدا، ئێوە زۆر بە ئاسوودەیی ژیانی خۆتانی تیا ئەبەنە سەر. جا کەوابوو بچن بە هەموو گۆشەو کەنارێکیا هەوڵی ژیانی خۆتان بدەن و بازرگانی بکەنە پیشە و لەڕزق و رۆزی بخۆن، هەر بۆ لای خوایە زیندوو بوونەوە بۆ حیساب و جەزا)).

چیاکان و روبارەکان و دەریاکان و زەریاکان و دارەکان و بەرووبومەکان و پیت و بەرهەمەکان و هەموو ناز و نیعمەتەکانی خوای پەروەردگارن بۆ بەندەکانی، لەسەر زەویدا ئامادەی کردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا

تُحۡصُوهَآۗ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَظَلُومٞ كَفَّارٞ ﴾ إبـراهيم:٣٤، واتـە: خـۆ ئەگـەر ئێـوە بتانەوێ نیعمەتەکانی خوا بژمێرن هەرگیز لە ئەژمار نایەن بۆتان بـە راسـتی مرۆڤـی لاڕێ زۆر ستەمکار و کوفرکەرو سپڵەیە ! بۆیە لە بەرامبەر ئەو هەموو بەخششانەوە ئەوەندە بەدنمەکەو پێ نازانێت)).

ئەو زەم و لۆمەی کە لە قورئاندا دەربارەی دونیا هاتووە تەنها ئەو سەرپێچیانە دەگرێتەوە کە خوای گەورە پێی ڕازی نییە هەر لـە هاوەڵدانان (کـە ترسـناکترین و گەورەترین سەرپێچییە لە سەرپێچییەکان) تاکو بچووکترین سەرپێچی تـاکو ئـەوەی بەردێك بخەیتە سەر ڕێگا بۆ ئەوەی ڕێگا لە جموجوڵی خەڵکی بگریت.

بۆیە علیﷺ دەفەرموێت: (( الدنيا دار صدق لمن صدقها، ودار غنـى لمـن تـزود منها ودار نجاة لمن فهم عنها،، فهي مهبط وحي الله ومصلى أنبيـاء اللــه ومتجـر أوليـاء اللـه ربحوا فيها واكتسبوا فيهـا الجنـة))[1]، واتـە: دونیـا مـاڵی ڕاسـتگۆیی یـە بـۆ هـەر کەسێ ڕاستی لە گەڵدا بکـات، مـاڵێ دەوڵەمەندییـە بـۆ هـەر کەسـێ تێشووی تیـادا کۆبکاتەوە، ماڵی رزگار بوونە بۆ هەر کەسـێ لێـی تێگەیـشت، چـونکە ئـەم دونیایـە شوێنی دابەزینی سروشی خوایە، جێ نوێژگەی پێغەمبەرانی خوایە، شوێن بازرگـانی پیاو چاکان و خۆشەویستانی خوایە،سۆزو میهرەبانیـان تیـادا بـردەوە بەهەشـتیان تیادا قازانج کرد)).

بەڵێ... تۆ لە دوا ڕۆژدا بەهەشت بە دەست ناهێنی ئەگەر لەم دونیایەدا شتی بۆ نەچێنی هەر کە لەم پردە پەڕیتـەوە یـان دەگەیتـە بەهەشـتی بـەرینی پـڕ لـە نـاز و نیعمەت یان بۆ ئەوی تر، داوا لە خوا دەکەم کە من و ئێوە لەوی تر بپارێزی.

(ئیمامی بوخاری و مسلم)[2] ڕیوایەتیان کردووە لـە فـەرموودەی (أنـس)ەوە کـەوا پێغەمبەری خواﷺ فـەرموویەتی: ((ما من مسلم يغرس غرساً أو يزرع زرعاً فيأكل منه

---

١ـ أخرجه ابن أبي الدنيا في ((إصلاح المال)) (١٠٨)، و ((ذم الدنيا)) (١٤٧) بسند فيه نظر، كما قال الحافظ ابن رجب في ((جامع العلوم والحكم)) (٣٩٩).

٢ـ أخرجه البخاري كتاب المزارعة، باب فضل الزرع والغرس إذا أكل منـه (٢٣٢٠)، ومسلم كتـاب المساقاة، باب فضل الغرس والزرع (١٥٥٣).

طير أو إنسان أو بهيمة إلا كان له به صدقة ))، واتە: هەر کاتێك موسڵمانێك دارێکی ڕواند یان زەوییەکی کێڵا و چاندی و پاشان هەر مەلێك یان مرۆڤێك یان ئاژەڵێك لێی بخوات ئەوا بە هۆیەوە صەدەقەیەکی دەست دەکەوێت)).

تەماشای ڕاستێتی و دروستی ئەم دونیایە بکە، بە هەڵەوە تەماشای مەکە، بەڵکو دەست بە ژیانەوە بگرەو، هەرگیز بێ هیوا مەبە و بێ ئومێد مەبە دڵتەنگ مەبەو، بزانە کەوا ئەمڕۆ تۆ لێرەیت ئەگەر بە کارێکی چاك و باشەوە بە سەرت برد، کە خەیری دونیا و دینەکەتی تیادا بێت ئەوا تۆ لە بەهەشتدای، ئەگەر نەچیتە بەهەشتی ئەم دونیاوە ئەوا ناچیتە بەهەشتی دوارۆژەوە، ئیماندار هەردەم لە ژیانی بەختەوەری و ئاسوودەییدا دەژی، چونکە بە تەواوەتی حەقیقەتی ئەم دونیایە و حەقیقەتی دوارۆژ دەزانێ، چونکە لە ناخەوە بڕان و دابڕانی تیادا نییە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً﴾ النحل: ٩٧، واتە: هەر کەسێك – لە نێر یان لە مێ– هەر کارێکی چاك ئەنجام بداو بە ئیمان و باوەڕداریش بێت، بەڵێن بێت بیژێنین بە ژیانێکی پاك، واتە: بە ژیانێکی بە قەناعەت و بە سەعادەت...) ئەمە بەهەشتی دونیایە: ﴿وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ النحل: ٩٧، واتە: بە چاکتریش لەوەی کردوویانە پاداشتیان بدەینەوە)).

ئەمە حەقیقەتی بەختەوەرییە بۆیە حەقیقەتی ژیانی ئەم دونیایە بزانە و بناسە. ئەگەر ئەو ڕاستیەت بۆ ڕوون بووەوە ئەوا بە دڵنیایی یەوە بزانە کەوا ژیانی دونیا بە ئاکام و دەرئەنجامێك دیاری کراوە، تەماشای ژیان مەکە بە ڕێگای تەماشا کردنت بۆ میللەت و سەدەکانی ڕابووردوو و داهاتوو! بەڵکو کات و ساتەکەی بناسە لە ڕێگای ژیانی تایبەتی خۆتەوە چونکە ژیانی تۆ ئەو ماوەیەیە کە لەسەر ئەم زەوییە دەمێنیتەوە، ژیان بە نسبەت من و بە نسبەت تۆوە سنووردار و دیاری کراوە بە ئاکامێك، هەروەها بەنسبەت ژیانی دونیاوە هەرچەندە درێژە بخایەنێت ئەوا سنوردارەو دیاری کراوە بە ئاکامێك وە بەو دڵنیایی یەوە ژیانی ئەم دونیایە تەواو دەبێت بە شێوەیەکی گشتی و بە شێوەیەکی تایبەتی بە نسبەت من و تۆ وە هەرچەندە درێژە بخایەنێت ئەوە کورتە، هەر چەندە خۆی بە مەزن و شکۆدار

بزانێت و ئەوا سووك و ریسوایە چونکە هەروەکو گوتمان شەوگار هەر چەندە درێژ بخایەنێت ئەوا دەبێت شەبەق هەڵبێ وە هەرچەندە تەمەن درێژ بێت هەردەبێ بچینە ناو گۆڕەوە، دڵنیابە کە چاکەکاران دەمرن و خراپەکارانیش دەمرن، جەنگاوەران و تێکۆشەران دەمرن و تەوەزەل و تەمبەڵەکانیش دەمرن، ئەوانەی کە بە بیرو باوەڕەکەیانەوە شانازی دەکەن دەمرن و، ئەوانەی زەلیلی دەستی بەندەکانن دەمرن، ئەو شکۆدارانەی کە سوورن لەسەر ژیانی پڕ شکۆمەندی و پایەداری دەمرن وە ئەو ترسنۆکانەی کە سوورن لەسەر ژیان بە هەر چی شێوە و نرخێك بێت دەمرن، خاوەنی بایەخدارە گەورەکان و ئامانجە بەرزەکان دەمرن، ئەو هیچ و پووچانەی کە تەنها لە پێناوی هەوەسە ریسواکەیان و ئامانجە کورت و بێ نرخ و هەرزانەکانیاندا دەژین دەمرن... هەمووان دەمرن... خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴾ (٢٧) سورة الرحمن))، واتە: هەرچی بە سەر پشتی زەوییەوەیە هەر هەموو لە نێو دەچێ.(٢٦)وە تەنها رووی پەروەردگاری خاوەن شکۆ و کەرەمکرد دەمێنێتەوە(٢٧))).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ﴾القصص: ٨٨، واتە: هەموو شتێك تیا دەچێت جگە لە رووخساری پیرۆزی ئەو نەبێ .)) دڵنیابە کە ئەوە گەورەترین راستییە... کە هەموو ژیانی مرۆڤایەتی بە رەنگی زەلیلی و بەندایەتی ڕەنگ دەکات بۆ خوای گەورە و باڵادەست و بەدەسەڵات. ئەوە ئەو راستییە کە بانگی هەموو کەسێکی هۆشمەند و هەموو بیرمەندێك و ئەدیبێك: بە هیچ شێوەیەك مانەوە نییە تەنها بۆ ئەو خوایەی کە زیندووە و نامرێت، ئەوە ئەو راستییە هەموو پێغەمبەران تامیان کردووە (علیهم الصلاة والسلام) بەڵکو سەرپێچی کەران و گوێڕایەڵان... ئەوە ئەو راستییە کە هەموو مرۆڤێك لەسەر ئەم زەویەدا پێی خۆش بێت یان نا دەبێ بیچێژێ...

دع عنك ما قد فات في زمن الصبا     واذكر ذنوبك وابكها يا مذنب

لم ينسه الملكان حين نسيته     بل أثبتاه وأنت لاه تلعب

والـــروح منـــك وديعــــة أودعتهـــا ستردهـــا بالرغـم منـك وتـسلب
وغـــرور دنيـــاك التـــي تـــسعى لهـــا دار حقيقتهـــا متـــاع يذهــــب
الليــــل فــــاعلم و النهــــار كلاهمــــا أنفاسـنا فيهمـا تعــد وتحـسب

واتـە: واز بهێنـە لـەوەی کـە ڕۆیـشت لـە تەمـەنی لاوێتیـدا، یـادی تاوەنـەکانت بکەرەوە و بگری ئەی تاوانبار، دوو فریشتەکە لە بیریـان نـەکرد کـاتێ تـۆ لـەبیرت کرد، بەڵکو ئەوان تۆماریان کرد و کەچی تۆ رادەبـوێری و یاریـت دەکـرد ، روحـیش لای تۆ بە بارمتە دانراوە ، هەرکاتێك بێت دەیگەڕیننەوە و دەیبەنـەوە بتـەوێت یـان نا، مەغرور بونت بـەو دونیایـە کـە هـەوڵی بـۆ دەدەی، ئـەوە ماڵێکـە و راسـتیەکەی شمەکێکـەو دەڕوات شـەوگار و رۆژگـار هـەردوو بزانـە، هەناسـەکانمان تیایانـدا دەژمێردرێت و حیساب دەکرێت.

(الفضیل ی کوڕی عیـاض) گەیـشتە کابرایـەك، (الفـضیل) بـە کـابرای فـەرموو: تەمەنت چەندە ؟ کابرا فەرمووی: شەست سـاڵە، (الفـضیل) فـەرمووی: کەواتـە تـۆ شەست ساڵە بەرەو لای خوا دەڕۆیت و زۆرت نەماوە پێـی بگـەی. کـابرا فـەرمووی: إنا لله وإنا إلیه راجعون، (الفضیل) فەرمووی: ئایا ماناکەی دەزانی؟ کابرا فەرمووی: بەڵێ دەزانم من بەندەی خـودام و بـۆ لای ئـەو دەگەڕێمـەوە. (الفـضیل) فـەرمووی: براکەم... هەرکەسێ زانی کەوا بەندەی خودایە و بـۆ لای ئـەو دەگەڕێتـەوە ئـەوا بـا بزانێت کە لـە بـەر دەسـتێدا رادەوەسـتێ، هـەر کەسـێ زانـی کـەوا لەبـەر دەسـتیدا رادەوەستێ ئەوا با بزانێت کە بەرپرسیارە، هەر کەسێ زانی کەوا بەرپرسـیارە ئـەوا با بۆ ئەو پرسیارە وڵامێك ئامادە بکات... کابرا دەستی بە گریان کـرد و فـەرمووی: ئەی چارە چییە؟ (الفضیل) فەرمووی: ئاسانە... کابرا فەرمووی: ئەی ئـەوە چـییە رەحمەتی خوات لێ بێت؟ (الفضیل) فەرمووی: ئەو تەمەنەی کە ماوە باشەی تیـادا ئـەنجام بـدە، خـوای گـەورە لـە تاوانـەکانی رابـووردوو و ئەوانـەی کـە مـاوە خـۆش دەبێـت، ئەگـەر لـەوەی، کـە مـاوە خراپـە بکـەیت ئـەوا سـزای کـردارە خراپـەکانی رابووردوو و داهاتووت وەردەگریتەوە.[١]

---

١ــ أخرجه ابو نعيم في((الحلية))(٨/ ١١٣)، وانظر:(جامع العلوم والحكم)(٣٨٣)، و(لطائف المعارف) (١٠٨).

(سلێمان ی كوڕی عبدالملك) پرسیاری كرد له(ابو حازم) زانای خواناسی زاهید و فەرمووی[١]: ئەی (ابو حازم) ئایا بۆ دونیامان خۆش دەوێت و رقمان لە مردنە ؟؟ (ابو حازم) فەرمووی: چونكە ئێوە دونیای خۆتانتان ئاوەدان كردەوە و دوارۆژی خۆتانتان وێرانە كرد بۆیە ئێوە رقتان لەوەیە لە ئاوەدانییەوە بگوێزرێنەوە بۆ وێرانە . (سلێمان ی كوڕی عبدالملك) فەرمووی: ئایا چ بەش و پشكێكمان هەیە لای خوای گەورە ئەی (ابو حازم)؟ فەرمووی: خۆت بینیوە و خۆت هەڵسەنگێنە بە كتابەكەی خوداوە و بۆ ئەوەی بزانی چ پشكێكت هەیە... فەرمووی: ئایا ئەوە لە كوێ دەدۆزمەوە (دەیبینمەوە)؟ فەرمووی: لەو ئایەتەدا كە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ ٱلْفُجَّارَ لَفِى جَحِيمٍ﴾ الإنفطار: ١٣- ١٤، واتە: بە راستی چاكەكاران لە ناو خۆشی بەهەشت دان (١٣)و بێ گومان تاوانباران و بەدكارانیش لە ئاگری دۆزەخ دان(١٤))). (سلیمان) فەرمووی: كەوابوو رەحمەتی خوا لە كوێیە ئەی(ابو حازم)؟ فەرمووی: ڕەحمەتی خوا زۆر نزیكە لە پیاوچاكان و چاكەكارانەوە. (سلیمان ی كوڕی عبدالملك) فەرمووی: ئایا سبەینێ گەڕانەوە و گەیشتن بۆ لای خودا چۆن دەبێت ؟(ابو حازم) فەرمووی: كەسی ئیماندار وەكو كەسێكی بزر وایە و بگەڕێتەوە بۆ لای كەس و كارەكەی، بەڵام كەسی خراپ وەكو بەندەیەكی ڕاكردوو وایە و بگەڕێتەوە بۆ لای گەورەكەی.

بیربكەرەوە لەم ڕاستییە... دەزانم كە تۆ دەیزانی و منیش دەیزانم، بەڵام خۆمانی لێ بێ ئاگا دەكەین و لە بیری خۆمانی دەبەینەوە و یادی ناكەین تەنها ئەو كاتە نەبێت، كە تەرمێك بە شان هەڵدەگرین، بەڵكو ڕەنگە هەندێ لەوانەی، كە لە ڕێ و رەسمی سپاردنی جەنازەیەكدا ئامادەن لێی بێ ئاگان بۆیە دەبینی لەو كاتەدا باسی كاروباری دونیا دەكەن لە كاتێكدا، كە مردن لە پێش چاوی خۆیان دەبینن بەڵكو مردووەكە بە شانی خۆیان هەڵدەگرن كەچی خۆیان خەریك كردووە — تەنانەت لەو كات و ساتەدا — لەو ڕاستیە خۆیان بێ ئاگا دەكەن ئەو ڕاستییەی كە

---

١ــ أخرجه الخطيب في (تاريخه) (٦/ ٦٩)، وابن عساكر في ((تاريخه)) (٢٢ / ٣٠، ٣٩). وانظر: ((صفة صفوة)) لابن الجوزي (٢ / ١٥٨).

خوای گەورە یادی خستوینەتەوە، هەروەها پێغەمبەرمانﷺ یادی خستوینەتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَاءَتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ﴾ ق: ١٩، واتە: وا بێهۆشی و سەختی و بووڕانەوەی مرۆڤی گیانەڵا پێش هات پێت ئەوترێ: ئەوەش ئەوەیە کە کاتی خۆی خۆتت لێ لادەداو نەت دەویست دووچاری بیت، دە ئایا ڕاست نییە؟)) کەوابوو مردن سەکەراتی هەیە، تەنانەت پێغەمبەری خوای زەوی ئاسمانەکانﷺ لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت کە لە (صحیح البخاری)دا هاتووە و دایکی ئیمانداران (عائیشە) ڕیوایەتی کردووە و دەڵێت: ((كان النبيﷺ يمد يده في قدح به ماء ويمسح العرق عن جبينه الأزهر الأنور و يقول: ((لا إله إلا الله إن للموت لسكرات)) وتقول عائشة – والحديث في البخاري وغيره – ((مات النبي وإنه لبين حاقنتي وذاقنتي، فلا أكره شدة الموت لأحد بعد النبيﷺ))، واتە: پێغەمبەری خواﷺ لە کاتی سەرەمەرگدا دەستی درێژ دەکرد بۆ ناو پەرداخێك کە ئاوی تێدا بوو، ئارەقەی ناوچاوانە گەش و ڕوونە پیرۆزەکەی خۆی دەسڕی و دەیفەرموو ((لا اله الا الله، بە ڕاستی مردن سەکەراتی هەیە))، عائیشە دەفەرموێت: پێغەمبەری خواﷺ کۆچی دوایی کرد لە کاتێکدا سەری لەسەر سنگم بوو، چیتر هەرگیز سەختی مردنی هیچ کەسێکی ترم لا سەیر نییە لە پاش ئەوەی پێغەمبەری خوامﷺ بەو شێوەیە بینی)).

بەڕاستی مردن توند بوو لەسەر خۆشەویستمان...ئاه ه ه... جاریکی تر ئاه ه ه ... ئەگەر شەیتان لە سەرت ببینی (خوا من و ئێوە بپارێزێ) کاتێ دینێکی ترت بۆ پێشنیار دەکات لەم کات و ساتەی ئەشکەنجە و خەفەتەتدا، لە کاتی سەکەراتدا و لەو سەرەمەرگییەدا.

هەندێ لە ئەهلی عیلم فەرموودەیەکیان بە بەڵگە هێناوەتەوە لەسەر کێشەی پێشنیار کردنی دینەکانی تر بە سەر هەندێ کەسدا لە کاتی سەرەمەرگدا... کە (ئیمامی مسلم)[١] ڕیوایەتی کردووە لە فەرموودەی (جابر ی کوڕی عبدالله)وە کەوا

١ـ أخرجه مسلم، كتاب الأشربة،باب استحباب لعق الأصابع والقصعة،و أكل اللقمة الساقطة، بعد ما يصيبها من أذى (٢٠٣٣).

پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إن الشيطان يحضر أحدكم عند كل شئ من شأنه)) واتە: شەیتان لە هەموو کاروبارێکی هەر یەکێکتاندا ئامادە دەبێت)).

پرسیار کرا لە (شيخ الإسلام ابن تيمية) دەربارەی کێشەی پێشنیار کردنی دینەکانی تر لە سەرەمەرگدا ئەویش فەرمووی[1]: ((هەندێ خەڵکی دینەکانی تری بۆ پێشنیار دەکرێت و هەندێك پێشنیاریان بۆ ناکرێت وە ئەمە بەشێکە لە فیتنەی ژیان و مردن (المحيا والممات) کە پێغەمبەرمانﷺ فەرمانی پێ کردووین پەنا بگرین بە خوا لێی لە نوێژەکانماندا. لەو فەرموودانەی کە هاتووە فەرموودەیەکی (الصحيح)[2]دا: ((أمرنا النبيﷺ أن نستعيذ في صلاتنا من أربع: ((من عذاب القبر ومن عذاب جهنم ومن فتنة المحيا والممات ومن فتنة المسيح الدجال)) واتە: پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی پێ کردووین پەنا بگرین بەخوا لە چوار شت: لە نوێژەکانماندا لە سزای ناو گۆڕ، لە سزای دۆزەخ، لە فیتنەی ژیان و مردن، لە فیتنەی (المسيح الدجال))).

عبدالله ی کوڕی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (پێشەوای ئەهلی سوننە) دەڵێت: ((کاتێ باوکم لە سەرە مەرگدا بوو بە دەستی ئیشارەتی دەکردوو دەیفەرموو: هێشتا نا...هێشتا نا (لا بَعدُ... لا بَعدُ) سێ جار .کاتێ هاتەوە سەرخۆ، گوتم: بابە گیان، ئەوە چیت گوت لەم کاتەدا؟ فەرمووی: کوڕم، چی دەڵێم؟ فەرمووی: بە دەستەکانت ئیشارەت دەکەیت و دەڵێیت (هێشتا نا)... فەرمووی: کوڕم... ئەوە(ئیبلیس)ە لەعنەتی خوای لێ بێت لە ژووری سەرمەوە دانیشتووە، پەنجەکانی خۆی دەگەزێت و دەڵێت: ئەی ئەحمەد لە دەستم دەرچوویت... منیش دەڵێم: هێشتا نا تاکو نەمرم لەسەر یەکتاپەرستی...[3]

ساتێکە لە تەنگانەترین ساتەکان ئەویش ساتی سەکەرات و سەرەمەرگییە خوای

١ـ ((مجموع الفتاوى)) (٤ / ٢٥٥) بتصرف، وانظر: ((التذكرة)) للقرطبي (٣٣) وما بعدها.

٢ـ أخرجه مسلم، كتاب المساجد، باب ما يستعاذ منه في الصلاة (٥٨٨) من حديث أبي هريرة (t)، وهو في البخاري، كتاب الجنائز، باب التعوذ من عذاب القبر (١٣٧٧) بلفظ مختلف، ورواه مسلم، (٥٩٠) عن ابن عباس.

٣ـ أخرج هذهالقصة البيهقي في(الشعب) (٨٥٢)، وأبو نعيم في(الحلية)(٩ / ١٨٣)،وابن عساكر(٥/٣٢٤، ٣٢٥).

گـــەورە دەفـــەرموێت:﴿وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّ﴾ق: ١٩، واتـــە: وا بێهۆشـــی و سەختی و بوورانەوەی مرۆڤی گیانەڵا هاتە پێشت)).

ئایا دەزانی حەق چییە؟حەق ئەوەیە کە تۆ دەمریت – هەمووان دەمرن– تـەنها خوا زیندووە و نامرێت وە حەق ئەوەیە فریشتەی ڕەحمـەت یـان فریـشتەی عـەزاب ببینی لە کاتی مردنتدا، حـەق ئەوەیـە کـە گۆڕەکـان ببێتـە باخێك لـە باخـەکانی بەهەشت یان چاڵێك لە چاڵەکانی دۆزەخ.

﴿ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ﴾ق: ١٩، واتە: ئەوتریێ: ئـەوەش ئەوەیـە کـە کـاتی خـۆی خۆتت لێ لادەدا و نەت دەویست دووچـاری بیـت، دە ئایـا راسـت نییـە ؟))، واتـە: نـاتوانی لێـی هـەڵبێی یـان بـڕۆی یـا رابکـەیت... دەڕۆی بـۆ لای پزیـشك ئەگـەر نەخۆشییەك رووی لێ کردی لە ترسی مردنا، دەڕۆی بۆ لای خواردن ئەگەر هەسـتت بە برسییەتی کرد لە ترسی مـردن... دەڕۆی بـۆ لای خواردنـەوە کـاتێ هەسـتت بـە تینیـوتی کـرد لـە ترسـی مـردن... ئـەمجار چـی؟ ئـەی هـەرزەکاری بـەهێز... ئـەی زیرەکـی بلیمـەت... ئـەی کەسـی گـەورە... ئـەی کەسـی بـچووك... ئـەی کەسـی دەوڵەمەند... ئەی کەسی هـەژار... ئـەی کەسـی سـاغ و سـەلامەت... ئـەی کەسـی نەخۆش...

کـــل بـــاك فـــسیبكی     وكـــل نـــاع فـــسینعی
وكـــل مـــذخور ســـیفنی     وكـــل مـــذكور سینـــسی
لـــیس غـــیر الله یبقـــی     مـــن عـــلا فـــالله أعلـــی

واتـە: هـەموو ئەوانـەی دەبوونـە هـۆی گریـانی خـەڵکی دەبـێ بگـرین ، هـەموو ئەوانـەی هـەواڵی مـەرگیان دەگەیانـد دەبـێ مردنیـان رابگەیـەنرێ، هـەموو شـتێکی پاشەکەوت کراو دەبێ نەمێنی، هەموو شتێکی باسکراو دەبێ لە بیر بـچێتەوە، هـیچ شتێك جگە لە خوا نامێنێ، هەرکەسێ بەرز بووە و ئەوا خوا لە هەمووی بەرزترە.

تەماشا بکە بۆ ئەوەی لاوازییەکەی ببینی لەو کات و ساتەدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِىَ (٢٦) وَقِيلَ مَنْۜ رَاقٍ (٢٧) وَظَنَّ أَنَّهُ ٱلْفِرَاقُ (٢٨) وَٱلْتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ (٢٩) إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمَسَاقُ﴾ القيامة: ٢٦ـ ٣٠، واتە: نەخێر هەر ئاوا بۆیان ناچێتە سەر، کاتێ گیان گەیشتە قوڕقوڕاگەو مرۆڤ گەیشتە گیانەڵان و هیچ نوشتەو ئەفسانەیەك کەڵکی نەما.(٢٦) ئەو کاتە بەوەی لە دەورەیەتی گوترا: کێ چارەسەری دەکات؟ (٢٧) زانی ئەوە ساتی جیابوونەوەیە لە دونیادا، ئیتر(نەخۆشەکە) دڵنیا دەبێت ئەو حاڵەی ئەوی تێدایە بە ئێجگاری مردن و کاتیماڵئاوایی و جیابونەوەیە لە دونیادا، چونکە فریشتەکانی مەرگ دەبینێ (٢٨) لاقێکی لەوی تری ئاڵا (کاتی گیان کێشان) لە بەر سەختی ڕۆژەکە.(٢٩) ئەو ڕۆژە حوکمی ڕاپێچکردن بۆ پەروەردگارتە بۆ لێپرسینەوە و خواردنی بەری کێڵگەکەی خۆت(٣٠))).

تۆمارگەکە کرایەوە و کتێبەکان ڕاگەیەندران و بڵاوکرانەوە دەبینی ﴿فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ (٣١) وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ القيامة: ٣١ـ ٣٢، واتە: جا مرۆڤی بێ باوەڕ لە بەر ئەوە کە نەبڕوای کردووە و نە نوێژیشی خوێندووە .(٣١) بەڵکو قورئانی بە درۆ زانیوە و ڕوویشی لێ وەرگێڕاوە، لە قیامەتدا خەجاڵەتە(٣٢))). پشتی لێ کرد و ئایەتەکانی خوای بە درۆ خستووەتەوە و فەرموودەکانی پێغەمبەریﷺ بە درۆ خستەوە و باوەڕی پێیان نەبوو، پشتی لە حەق کرد و لە ڕێگای لایدا ﴿كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِىَ (٢٦) وَقِيلَ مَنْۜ رَاقٍ﴾القيامة: ٢٦ـ ٢٧. ابن عباس دەڵێت: ((وَقِيلَ مَنْ رَاقٍ)) ئەگەر ڕوحەکەی بەرز کرایەوە، فریشتەکان دەڵێن: ئایا کێ بەرزی دەکاتەوە فریشتەی ڕەحمەت یاخود فریشتەی عەزاب)[1] ئەی پەروەردگارمان بمانپارێزە... بمانپارێزە...!!

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ

---

١ـ أخرجه الطبري في ((التفسير)) لسورة القيامة: (آية ٢٦، ٢٧)، و عزاه السيوطي في ((الدر المنثور)) لابن أبي الدنيا في ((ذكر الموت))، وابن أبي حاتم، وهو في ((تفسيره)) (القيامة: ٢٦، ٢٧) من طريق: عمرو بن مالك عن أبي الجوزاء عن ابن عباس.

﴿٣٠ نَحۡنُ أَوۡلِيَآؤُكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَشۡتَهِيٓ أَنفُسُكُمۡ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ٣١ نُزُلٗا مِّنۡ غَفُورٖ رَّحِيمٖ﴾ فصلت: ٣٠-٣٢، واتە: بێ گومان ئەو کەسانەش وتیان: پەروەردگارمان خوایە پاشان خۆیان ڕاست کردبوویەوە، واتە: زۆر بە مەحکەمی لەسەر یەکتاسین وەستان و بە هیچ لایەکدا لایان نەدا، کاتێ مردن، لە گۆڕدا لە کاتی زیندووبوونەوەدا فریشتە دائەبەزنە لایان و پێیان دەڵێن: لە پاشەڕۆژتان مەترسن و بۆماڵ و منداڵیشتان – پاش خۆتان– دڵ زویر مەبن ئێمە چاودێریان دەبین موژدەتان لێ بێت بەو بەهەشتەی بەڵێنتان پێ دەدرا لە دونیادا، مزگێنی بێت ئەمڕۆ ئەکەونە خۆشی و شادییەوە.(٣٠) ئێمە لە ژیانی دونیادا دۆستان بووین، لە پاشەڕۆژیشدا،دۆستان دەبین وە لەوێ نەفستان چ بخوازێ ئامادەیە بۆتان و هەرچیش بخوازن لە بەهەشتدا بۆتان هەیە.(٣١) ئەم مێوانداریەش،میوانداریییەکە لەلایەن پەروەردگارێکی گوناهپۆشی بەبەزەییەوە (٣٢)).

ئەهلی ئیمان و ئەهلی بەردەوام بوون لەسەر ڕێگای ڕاستی، فریشتەکان لە لایەن خوای گەورەوە بە سەریاندا دادەبەزن، کەسی ئیماندار فریشتەی دامەزرێنەر دەبینێ ئایا ئەوە چی سات و کاتێکە؟؟ ڕەنگە یارمەتی بدرێت لەوەی کە خوای گەورە بۆی ئامادەکردووی لە بەهەشتی بەریندا لەو ساتەدا...

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت لە فەرموودەیەکی (صحیح)دا کە (ابن ماجە)[1] و جگە لەو ریوایەتیان کردووە لە فەرموودەی (ابو هریرە)ەوە دەڵێت: ((المیت تحضره الملائكة))، واتە: لە کاتی مردندا (فإذا كان الرجل صالحا قالوا – واتە: فریشتە بە روحەکەی دەڵێت: ((أخرجي أيتها النفس الطيبة كانت في الجسد الطيب، أخرجي حميدة، وأبشري بروح و ريحان، و رب راض غير غضبان)) واتە: ئەی ئەو نەفسەی کە لە جەستەیەکی پاکدا بوویت بە سوپاسگوزارییەوە دەرچۆ، موژدە بۆ تۆ بە بۆن و بەرامی خۆشی بەهەشت و پەروەردگارێك کە لێت ڕازییە و تووڕە و پەست نییە)) خودایە بمانگێڕە لەو هەڵبژێردراوە لە خواترسانە...

---

١ـأخرجه ابن ماجه، كتاب الزهد، باب ذكر الموت و الاستعداد له (٤٢٦٢) و أحمد (٢ / ٣٦٤) وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجه))

له پاشان ئەم وشانه به درێژی دەناسین له بەشەکانی داهاتوودا (انشاء الله) داوا له خوا دەکەم که کۆتایی ژیانی من و ئێوه به یەکتاپەرستی و ئیمان بێت و خوای گەوره کۆتایی ژیانمان به چاکه بگێڕێ.

# گیان دەرچوون

لە بەشی ڕابوردوودا لە باسی ئەم دیمەنە ترسناك و سامناکە راوەستاین، کە بە ئاشکرا لاوازی مرۆڤی تیادا بە دی دەکرێت هەر چەندە کەسەکە بە هێز و بە دەسەڵات بێت وە هەرچەندە خاوەن پلە و پایە بێت، لە سەرەمەرگدا دەیبینی کەسێکی زۆر بێ هێز و لاوازە... هەموو هۆکارەکانی بزر کردووە و لێی بڕاوە... هەموو شتێکی ون کردووە. ئەوەتا تەماشای (هارون الرشید) بکەن... کە بە هەورەکەی دەگوت کاتێ لە چەقی ئاسماندا بوایە پێی دەگوت: ئەی هەورەکە لە هەر کوێیەك دەباری بە ئارەزووی خۆت ببارە، دڵنیابە کە داهاتەکەت هەر دەگەڕێتەوە بۆ لای خۆم ـ انشاء الله...

ئایا دەزانی — برا شیرینەکەم — مانای ئەم وشانە چییە؟ مانای ئەوەیە دەیەوێ بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە، تا چەند موڵك و دەسەڵاتەکەی فراوانە...

تەماشای فراوانی موڵکی (هارون الرشید) بکەن... کاتێ لەسەر جێگای مردن بوو، ئاکام و ئەجەلەکەی لێی نزیك بووەوە وکۆتایی ژیانی هات، دەستی بە گریان کرد و فەرمووی: ﴿مَآ أَغْنَىٰ عَنِّي مَالِيَهْ ۜ (٢٨) هَلَكَ عَنِّي سُلْطَٰنِيَهْ﴾ الحاقة: ٢٨ـ ٢٩، واتە: دارایی و ماڵەکەم هیچ کەڵکێکی پێ نەگەیاندم بۆ ئەم ڕۆژەم.(٢٨) ئەو موڵك و دەسەڵاتەی بووم لە دەس چوو نە ڕشتەم نە پایەوپلەم، هیچیان نەیان توانی تۆزقاڵەیەك ئارامم بکەنەوە(٢٩))).کوا سەروەت و سامان؟ کوا دەسەڵات و سوڵتان؟ کوا موڵکەکان؟ هەمووی نەما و بزر بوو... بۆیە (هارون الرشید)سوور بوو لەسەر ئەوەی کە هەڵیگرن و بیبەن بۆ ئەوەی گۆڕەکەی ببینێ کە تیادای دەنێژن... لە پاش ئەو هەموو موڵکە... ئەو فراوانییە ئەو رابواردن و خۆشگوزرانییە ئەو کامەرانییە ئەو خەیر و خەیراتە... دەیەوێ ئەو چاڵە ببینێ تیادا دەخەوێ تاکو ئەو کاتەی خوا خۆی ویستی لێ بێت... دەیەوێ گۆڕەکەی خۆی ببینێ هەڵیانگرت...(هارون الرشید) تەماشای گۆڕەکەی خۆی کرد و دەستی

بە گریان کرد ئەمجار سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و فەرمووی: ((ئەی ئەو کەسەی هەرگیز موڵکەکەی لە ناو ناچێت ڕەحم بکە لەو کەسەی موڵکەکەی لە ناوچوو...)).[1]

ئەی خودایە...!! کوان پادشاکان؟؟ کوان سوڵتانەکان؟؟ کوان دەوڵەمەندەکان؟؟ کوان هەژارەکان؟؟ کوان ستەمکاران؟؟ کوان بە هێز و شکۆدارەکان؟ کوان کیسراکان؟ کوان قەیصەرەکان؟؟

أين الظالمون و أين التابعون لهم في الغي ... بل أين فرعون وهامان؟
أين من دوَّخوا الدنيا بسطوتهم ... وذكرهم في الورى ظلم و طغيان ؟
هل أبقى الموت ذا عزّ لعزته ... أو هل نجا منه بالسلطان إنسان ؟
لا والذي خلق الأكوان من عدم ... الكلُّ يفنى فلا إنس و لا جان

واتە:کوان ستەمکاران و کوان شوێنکەوتووانیان لەگومڕاییدا؟، بەڵکو کوا فیرعەون و هامان ؟، کوان ئەوانەی کە دونیایان قاڵ کردبوو بە دەسەڵاتیان و، یادی ئەوان لە نێو دروستکراوەکاندا لە ستەم و سەرکەشی؟، ئایا مردن هیچ خاوەن عیززەتێکی هێشتووەتەوە بە هۆی عیززەتەکەیەوە، یان ئایا هیچ مرۆڤێك بە هۆی سوڵتانەکەیەوە رزگاری بووە؟ نەخێر سوێند بەو کەسەی کە بوونەوەرەکانی لە نەبوونەوە دروستکردووە، هەموو نامێنن نە مرۆڤ و نە جنۆکە.

أيا عبد كم يراك الله عاصيا ... حريصا على الدنيا وللموت ناسيا
أنسيت لقاء الله واللحد والثرى ... ويوما عَبُوساً تشيبُ فيه النواصيا
لو أن المرء لم يلبس ثيابا من التقى ... تجرد عريانا ولو كان كاسيا
ولو أن الدنيا تدوم لأهلها ... لكان رسول الله حياً وباقيا

---

١ـ ((إحياء علوم الدين)) (٤ / ٤٨١). وقد روى ابن أبي الدنيا في (المحتضرين) (١١٧) عن عبدالله بن بساط قال: أحتضر بعض الملوك، فجعل يقول: ((يا من لا يزول ملكه، ارحم من قد زال ملكه)).

ولكنهـــا تفنـــى ويفنـــى نعيمهـــا وتبقى الذنوب والمعاصي كما هي

واتە: ئەی بەندەکە، تا چەند خودا لە سەرپێچیدا دەتبینێ؟ سووری لەسەر دونیا و مردنت لە بیر کردووە، ئایا دیدەنی خوا و گۆڕ و خاکت لە بیر چووە، ڕۆژێکی گرژو مۆن کە پەرچەم و ناوچاوەکان تیایدا پیر دەبێت، ئەگەر کەسێك پۆشاکی تەقوا نەپۆشێت، ئەوا کەسێکی رووتە هەرچەندە جل و بەرگی لە بەردا بێت، ئەگەر دونیا بۆ دانیشتوانەکەی بەردەوام بوایە، ئەوا پێغەمبەری خوا ﷺ زیندوو دەبوو و دەمایەوە، بەڵام لە ناو دەچێت و خۆشگوزرانەکەیشی لە ناو دەچێت، کەچی تاوان سەرپێچیەکان دەمێننەوە هەر وەکو خۆی.

| | |
|---|---|
| يـــا نفـــسُ أزف الرحيـــل | وأظلـــك الخطـــب الجليـــلُ |
| فتـــأهبي يـــا نفـــس | لا يلعـب بـك الأمـل الطويـلُ |
| فلتَنَـــزِلنَّ بمنـــزلٍ ينـــسى | الخليـــل بـــه الخليـــلُ |
| وليركـــبن عليـــك فيـــه | مـــن الثـــرى ثقـــل ثقيـــلُ |
| قُـــرِن الفنـــاء بنـــا جميعـــا | فما يبقى العزيز ولا الذليلُ |

واتە: ئەی نەفسەکەم کاتی کۆچکردن نزیك بووەتەوە، کارەکانی خودای شکۆمەند سێبەری بۆ کردووی، بۆیە ئەی نەفسەکەم خۆت ئامادە بکە، هەرگیز هیوا درێژی یاریت پێ نەکات، ڕۆژێك دێت کە دەچیتە جێگایەك هاوڕێ هاوڕێی لە بیر دەچێتەوە، خاکی زۆر قورس لەسەر شانت کۆ دەبێتەوە، فەوتان هاودەمە لە گەڵ هەمووماندا بۆیە هیچ کەس نامێنێت نە شکۆمەند و نە زەلیل.

خوای گەورە بە خۆشەویستە هەڵبژێرداروەکەو پێغەمبەرکەی ﷺ خۆی فەرموە: ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ أَفَإِين مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَـٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾الأنبياء:٣٤ـ ٣٥، واتە: ئێمە پێش لە تۆ وامان نەکرد مرۆیەك نەمرێ ئایا ئەگەر تۆ بمری، ئەوانە ژیانی هەتا هەتاییان دەبێ؟! نە، هەرگیز شتی وا نییە(٣٤) هەموو گیانێك تامی مردن هەر

دەچێژێ و دەمرێ، بە ناخۆشی،خۆشی، هەژاری،دەوڵەمەندی، لەش ساغی و نەخۆشی،تا سابیر و ناشوکر دەرکەوێ ئەگینا خوا بۆ خۆی دەزانێ وە بەمەش ئیقامەی حوججەیان لەسەر دەکات تا کەس بیانووی نەمێنێ سەرەنجام هەر بۆ لای خۆمان دەگێردرێنەوە ئەوسا بەپێی ڕەفتارو دەرچوونتان لە تاقی کرنەوەکەدا پاداش و تۆڵە وەرئەگرن(٣٥))).

خـــــوای گـــــەورە دەفـــــەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّ ٱلْمَوْتَ ٱلَّذِى تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمْ﴾ الجمعـة:٨، واتـە: پێیـان بڵـێ: ئـەی پێغەمبـەرﷺ بـێ گومـان ئـەو مردنەی کە ئێوە لە بەری هەڵدێن و ئەترسن پێی بگەن بە ڕاستی هەر ئەتانگاتێ)).

خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ﴾ الأعراف: ٣٤، واتە: جا هەر کە کۆتایی ماوەکەیان هات نە سات و کاتێك دوادەکەون و نەپێشیش دەکەون لـەو سـات و وەختـەی بۆیـان دیـاری کـراوە ئەوسـایش گشت دەچنەوە لای خوا)).

| | |
|---|---|
| النفس تبكى على الدنيا وقد علمت | أن السلامة فيها ترك ما فيها |
| لا دار للمرء بعد الموت يسكنها | إلا التى كان قبل الموت يبنيها |
| فإن بناها بخير طاب مسكنها | وإن بناها بشر خاب بانيها |
| أموالنا لذوى الميراث نجمعها | ودورنا لخراب البوم نبنيها |
| وكم من مدائن فى الآفاق قد بنيت | أمست خراباً وأفنى الموت اهليها |
| أين الملوك؟ التى كانت مسلطنة | حتى سقاها بكأس الموت ساقيها |
| إن المكارم أخلاق مطهرة | الدين أولها والعقل ثانيها والعلم ثالثها |
| والحلم رابعها والجود | خامسها والفضل باقيها |
| لا تركنن إلى الدنيا | فالموت لاشك يفنينا ويفنيها |
| واعمل لدار غد رضوان خازنها | والجار أحمد والرحمن ناشيها |
| قصورها ذهب والمسك طينتها | والزعفران حشيش نابت فيها |
| أنهارها لبن مصفى ومن عسل | والخمر يجرى رحيقاً فى مجاريها |

والطير تجري على الأغصان عاكفةً تسبح الله جهراً في مغانيها
فمن يشتري الدار في الفردوس يعمرها بركعة في ظلام الليل يحييها

واتە: نەفسەکەم بۆ دونیا دەگری و باش دەزانیّ، کە بێوەیی تیایدا واز هێنانە لەوەی کە تیایدایە،بۆ هیچ کەس لە پاش مردن هیچ خانویەك نییە تیایدا نیشتەجیّ بیّ، تەنها ئەوە نەبێت کە لە پێش مردن بنیات ناوە، ئەگەر بە چاکە دروستی کردووە ئەوا جێگایەکی خۆشە، ئەگەر بە خراپە دروستی کرد ئەوە دروستکەرەکەی پەشیمان دەبێتەوە، سامانەکانمان بۆ کەس و کاری پاش خۆمان کۆی دەکەینەوە خانووەکانمان بۆ کاول کردنی رۆژگار دروستی دەکەین، چەندەها شار لەو ئاسۆیانەدا دروستیان کرد، کەچی هەموو کاول بوون و مردنیش ئەهلەکەی فەوتاند، کوان ئەو پادشایانەی کە دەسەڵاتدار بوون، تاکو بە دەستی ئاوگێر (بەرداخی مردنی) کردە نۆشی، ڕێگا و شتە جوانەکان پاك و تەمیز و دیارن، ئاین یەکەمیانە و هۆش دووەم و زانست سێیەمە، هێمنی و لە سەرخۆیی چوارەمە و بەخشندەیی، پێنجەمە و چاکەکاری پاشماوەکەیەتی، خۆت مەدە پاڵی دونیا چونکە بیّ گومان مردن ئێمە و ئەویش لە ناو دەبات، بۆیە کار بکە بۆ ماڵەکەی سبەینیّ کە (رضوان) گەنجینەوانییەتی وهاوسێکەت (أحمد)ەو (الرحمن) دروستی کردووە، کۆشکەکانی ئاڵتونە و قوڕ و خاکەکەی مسکە،وە گژ و گیاکەی زەعفەرانە و تیایدا سەوز بووە، ڕووبارەکانی ماستی پاڵفتەن و هەنگوین، مەی وەکو شیلە بەرووبارەکانیدا تێدەپەڕیّ، باڵندەکان لەسەر لقەکانی دێن و دەچن، یاد و تەسبیحاتی خوا بە ئاشکرا دەکەن لە لانەکانیاندا، کیّ دیەویّ ماڵێك بکریّ لە فیردەوسدا، ئاوەدانی بکاتەوە بەرکاتێك لە تاریکی شەودا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِيَ ﴿٢٦﴾ وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ﴾ القيامة: ٢٦ـ ٢٧، واتە: کیّ ڕوحەکەی بەرز دەکاتەوە.... کیّ دوعای بۆ دەکات... کیّ چارەسەری دەکات؟ پزیشکەکانی دەوریان لێداوە ئەم پزیشکە تایبەتە بە نەشتەرگەری دڵەوە... ئەویتر تایبەتمەندە بە نەشتەرگەری مێشك و دەمارەکانەوە سێیەم مامۆستایەکی گەورەی لێهاتووە لە بواری بێهۆشکەریدا و ئەویتر لە بوارێکی

ترداو پێنجەم لەبوارێکی تردا لەدەوری کۆ بونەتەوە و پزیشکەکان سەرسام بوون و بێ توانا بوون... تەماشای بکە لە کاتێکدا ئەو ڕەنگی زەرد بووەتەوە وەرەنگی بزرکاوەو، پەلەکانی سارد بوتەوە و پێستەکەی گرژ بووەتەوە و هەست بە ساردییەکی سەخت دەکات لەم کاتی سەکەراتدا بەرەو سەرپەنجەکانی هەردوو دەست و هەردوو پێییەکان دەڕوات، لەم کات و ساتەدا... هەولێکی بێ وچان دەدات — لە کاتێکدا ئەو لە سەرەمەرگدایە — لێوەکانی بجولێنێتەوە و زمانەکەی بە وتنی وشەی (التوحید) یەکتاپەرستی خوای گەورەیە بە وشەی (لا الـه الا الله) وا هەست دەکات کە زمان و لێوەکانی وەکو چیا وان و نایەوێ بە هیچ شێوەیەك بجولێتەوە... تەنها بۆ ئەو کەسانە نەبێت کە خوای گەورە بۆی ئاسان دەکات و دەتوانێت بڵێیت( لا اله الا الله).

لەم کاتەدا من هەست دەکەم و لەحاڵی ئەو دەزانم...خەڵکی لێی کووبونەتەوە و دەڵێن: فلان ناتوانێ زمانی بجولێنێتەوە وە ناتوانێت براکانی بناسێت، ناتوانێ وەڵامی هاوسێ و براکانی بداتەوە... هەست دەکەم لە حاڵی ئەو کاتێ گوێی لە قسەکانی ئەوانە... بەڵام توانای نییە وەڵامیان بداتەوە... وە هەست دەکەم کاتێ کە تەماشای ئەوان دەکات لە ساتێکی بە ئاگا بووندا لە نێوان سەکەرات و سەرەمەرگدایە وە بەزمانی حاڵ وڵامیان دەداتەوە بەڵکو ڕەنگە بە زمانی قسەکردن پێیان دەڵێت: ئەی کەس و کارەکەم... ئەی خۆشەویستەکانم... ئەی کوڕەکانم ... بە تەنها جێم مەهێڵن... بە تەنها لە گۆڕم مەنێن... من باوکی ئێوەم... من خۆشەویستی ئێوەم... من بووم ئەو کۆشکانەم دروست کرد... من بووم خانووەکانم ئاوەدان کردەوە... من بووم پەرەم بە بازرگانی دا من بووم ئەو هەموو سەروەت و سامانەم کۆ کردەوە... کێ لە ئێوە تەنها یەك ساڵ یان دوو ساڵم بۆ زیاد دەکات... مانگێك یان دوو مانگ ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ... کاتژمێرێك یان دوو کاتژمێر.

لێرەدا قسەی خوای گەورە بەرز و بڵند دەبێتەوە: ﴿فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ

غَيْرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩٠﴾ فَسَلَٰمٌ لَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩١﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٩٢﴾ فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٩٣﴾ وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ ﴿٩٤﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴿٩٥﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ﴾ الواقعة: ٨٣ـ ٩٦، واتە: جا بۆ چ كاتیێ گیانی یەكێكتان گەیشتە گەروو(٨٣) و ئێوەیش لەو كاتەدا سەیری ئەكەن چۆن گیانی دەرئەچیێ؟(٨٤) ئێمە نزیكترین لێیەوە لە ئێوە، زاناترین بە حاڵی لە ئێوە، بەڵام ئێوە فریشتەكان نابینن چۆن ئامادە بوون بۆ گیان كێشانیان جا ئەگەر ئێوەن دروستكەر — وەك خۆتان نكوولّی هەق ئەكەن— بۆچی گیانی ئەو مردووە ناگێڕنەوە؟! (٨٥) دەبا ئەگەر پاداشتی كردەوەكانتان نادرێتەوە وەك ئێوە پێتان وایە!.(٨٦) گیانەكەی بۆ دەگێڕنەوە ئەگەر راست ئەكەن زیندووبوونەوە نییە و لێپرسینەوە نییە، دیارە كە هەرگیز ئەو دەسەڵاتەتان نییە، جا چاك بزانن كە ئەبیێ هەر خوا ئەوە بكات و بڕوایشی پیێ بێنن(٨٧) ئینجا ئەگەر مردووەكە لە نزیكخراوەكان بێت(٨٨) ئەوە ئیسراحەت و رزق و ڕۆزییەكی چاك و بەهەشتی بەرینی بۆ هەیە(٨٩) خۆ ئەگەر لە یارانی لای راست بێت(٩٠) فریشتەكان پێیان ئەڵێن: لە لایەن یارانی لای راستەوە سڵاوت لیێ بیێ (٩١) بەڵام ئەگەر لە دەستەی بیێ باوەڕان و گومڕایان بیێ(٩٢) ئەوە میواندارە لە ئاوێكی كوڵ بە كوڵێ(٩٣) و خرانە نێو ئاگری بۆ هەیە.(٩٤)بیێ گومان ئەمەی بۆت باس كرا لەم سوورەتەدا ئەی محمدﷺ سەبارت بە هەرسیێ دەستەكە، هەواڵێكی ڕاستی بیێ گومانە(٩٥) جا كەوایە تەسبیح بكە بە یادی ناوی خوای مەزنت(٩٦))).

پاكی و بێگەردی بۆ تۆ(ئەم قسەیە جگە بۆ تۆ بە كەسی تر ناگوترێت) ئەی ئەو كەسەی كە بە مردن گەردنی شكۆمەندانت زەلیل كردووە...

پاكی و بیێ گەردی بۆ تۆ...! ئەی ئەو كەسەی بە مردن هیوا و ئاواتی قەیصەرەكانت بڕییەوە...

ئەی ئەو كەسەی بە مردن لە كۆشكەكانیانەوە گواستیانتەوە بۆ گۆڕەكانیان... لەروناكی جێگاكانیانەوە بۆ تاریكی گڵكۆكانیان... لە یاریكردن لە گەڵ ئافرەت و

منداڵ و خزمەتکارەوە بۆ هاوبەشی لە گەڵ کرم و ریسواییدا... لە رابواردن لە نێو جۆرەها خواردن و خواردنەوە بۆ گەوزانەوە لە نێو جۆرەها خاك و قوڕاودا... ﴿فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ﴾.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾ فصلت: ٣٠، واتە: بێ گومان ئەو کەسانەش فەرموویان: پەروەردگارمان خوایە پاشان خۆیان راست کردبوویەوە، واتە: زۆر بە مەحکەمی لەسەر یەکناسین وەستان و بە هیچ لایەکدا لایان نەدا، کاتێ مردن، لە گۆڕدا لە کاتی زیندووبوونەوەدا فریشتە دائەبەزنە لایان و پێیان دەڵێن: لە پاشەرۆژتان مەترسن و بۆ ماڵ و منداڵیشتان – پاش خۆتان – دڵ زویر مەبن ئێمە چاودێریان دەبین موژدەتان لێ بێت بەو بەهەشتەی بەڵێنتان پێ دەدرا لە دونیادا، مزگێنی بێت ئەمڕۆ ئەکەونە خۆشی و شادییەوە)) .

کەی فریشتە دادەبەزێتە سەر ئەهلی باوەڕ و سەقامگیران؟؟

ئەهلی عیلم لەم بارەیەوە دوو بۆچوونیان هەیە:[١]

یەکەم... زانایانمان فەرموویانە: ((فریشتە دادەبەزێتە سەر ئەهلی باوەڕ و یەکتاپەرستی و بەردەوامبوون لە کاتێکدا ئەوان لە سەرەمەرگدان لەم ساتانەدا... ساتەکانی سەکەرات و سەرەمەرگی... فریشتە دادەبەزێ بە مەبەستی دامەزراو کردنیان... بەڵێ بۆ دامەزراوکردن... خودایە ئاخر خەیرمان بە نسیب بکە . فریشتە لەسەر سەری کەسی ئیمانداری ڕاستگۆی یەکتاپەرست دادەنیشێت بە مەبەستی دامەزراوکردنی... خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّـٰلِمِينَ ۚ﴾ إبراهيم: ٢٧،

---

١ـ انظر: تفسير الطبري، وابن كثير عند تفسير سورة فصلت آية (٣٠).

واتە: جا ئەوانە کە باوەڕیان بە خوا و بە گشت بڕیارەکانی خوا هێناوە، بە هۆی ئەم وشە جێگر و نەگۆڕاوەی (لا اله الا الله) خوا پێگەیان قایم و سابت ئەکا لە ژیانی ئەم دونیا و لە ژیانی ئەو دونیا و ستەمکارانیش گومرا و سەر لێشێواو دەکات خوا بیەوێ هەر شتێ بکات زۆر بە ئاسانی دەیکات حەز بکا کێ رینموویی بکا و کێیش گومڕا و سەر لێشێواو بکا ئەمانە هەموو لە دەسەڵاتی ئەودان)).

بۆیە کەسی وا دەبینین لە سەرەمەرگدا بە بزەوە گیانی دەردەچێت... تەماشا دەکەن وەکو ئەوەی قسە لە گەڵ کەسانێکدا بکات تەنها ئەو دەیانبینێ... هەموو ئەوانەی کە لە ژوورەکەدا دانیشتوون لە گەڵیدا هیچ نابینن، چونکە ئەو بە کردەوە دەستی کردووە بە گواستنەوە بۆ جیهانێکی تر . فریشتەکانی خوا یارمەتی دەدەن بۆیە دەبینی رووی گەش دەبێتەوە لە بەر خۆیەوە و لەسەر خۆ وشەی یەکتاپەرستی (توحید) دووبارە دەکاتەوە... بە سووك و ئاسانی... بۆ ؟؟

چونکە ئەوەی لەم ساتانەدا ئەو وشەیە دووبارە بکاتەوە ئەوە ئەو کەسەیە کە باوەڕی بە خوای زەوی و ئاسمانەکان هێناوە و خوای زەوی و ئاسمانەکانیش باوەڕی بە ئەو کردووە و دەیناسێت، ئەوە کەسێکە لە ژیانیدا لەسەر وشەی یەکتاپەرستی (توحید) ژیاوە... هەر کەسێ لەسەر شتێك بژێت ئەوا لەسەر ئەو شتە دەمرێت... هەر کەسێ بە هەر شتێکەوە بمرێت ئەوە بەو شێوەیە زیندوو دەکرێتەوە ئەگەر تۆ لەسەر گوێڕایەڵی بژیت ئەوا لەسەر گوێڕایەڵی دەمرێت و لەسەر هەمان گوێڕایەڵی زیندوو دەکرێیتەوە... هەروەها ئەگەر کەسێك لەسەر سەرپێچی ژیا بێت... ئەوا لەسەر هەمان سەرپێچی دەمرێت...ئەگەر تەوبە نەکات...

ئەو برایانە لە ئەمریکا بۆیان گێڕامەوە– کاتێ بە سەردانێك چووم بۆ لایان – دەربارەی گەنجێکی ئەمریکی، کە لە نوێژی بەیانیدا دێتە ژوورەوە بۆ یەکێ لە مزگەوتەکانی شاری(بروکلن) لە ویلایەتی (نیویورك) کاتێ ئەوان لە نوێژەکەیان بوونەوە بەوانی گوت: دەمەوێ ببمە کەسێك لە شوێنکەوتوانی (محمد ی کوڕی عبدالله)ﷺ... دەمەوێ بێمە نێو دینی ئیسلامەوە بۆیە ڕێگام نیشان بدەن چی

بکەم؟؟ فەرموویان: تۆ کێیت؟ چیرۆکەکەت چییە؟؟ چی تۆی هێناوە بۆ ئێرە؟

فەرمووی: ڕێگام نیشان بدەن، کە چی بکەم و پرسیار مەکەن...

فەرموویان: هەستە خۆت بشۆ و شایەتمان بهێنە... ئەویش هەستا خۆی شت و شایەتمانی هێنا و ئەمجار فێری نوێژیان کردوو نوێژی بەیانی کرد...

فەرمووی: دەمەوێ لەگەڵ ئێوەدا بمێنمەوە لە مەڵبەندەکەتان بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك بۆ ئەوەی دەربارەی ئیسلام شت فێر بم... ئەوانیش ڕێگایان پێ دا بۆ ئەوەی لە گەڵیاندا بمێنێتەوە... ڕۆژی یەکەم بەسەر چوو... دووەمیش... سێیەمیش... لەو ماوەیەدا سەرنجی براکانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا بوو، لە بەر درێژی سوژدەکانی لە بەر دەستی خوای گەورەدا و لە بەر زۆر گریانی و سوور بوونی لەسەر گوێگرتن لە قورئانی پیرۆز... کاتێ لە نوێژی مەغریب بوونەوە لە تەنیشت برایەك لە براکانمان دانیشت بۆ ئەوەی گوێ لە خوێندنەوەی قورئان بگرێت... ئەو برایە پێی گوت: براکەم... وام لێهاتووە، خۆم بە کەم دەزانم بە تەنیشتی تۆ وە، هەر کاتێ تەماشات بکەم ئەوا خۆم بە کەم دەزانم.. من بۆ ماوەی دە ساڵە هاتوومەتە نێو ئەم دینەوە وە تۆیش تەنها دوو ڕۆژە هاتووی کەچی دەتبینم هەردەم بە گریان و ترسەوەی و دەتەوێ هەموو کاتێك گوێبیستی قورئان بیت... براکەم ... توخوا... پێم بڵێ باسەکەت چییە؟ چیرۆکەکەت چییە؟

ئەویش فەرمووی: بۆ ماوەی چوار ساڵە دەبێ هیچ شەوێك بە سەرمندا تێناپەڕێ ئیللا من دەگریم و لە خوا دەپاڕێمەوە کەوا ڕێنموییم بکات بۆ سەر دینی حەق و ڕاستی... دەڵێت: ئەو شەوەی، کە من بۆ بەیانییەکەی هاتم بۆ لاتان بە گریانەوە خەوم لێ کەوت لە کاتێکدا من لە خوا دەپاڕامەوە... کە ڕێنموییم بکات بۆ سەر دینی حەق و ڕاستی فەرمووی: ئەو شەوە (عیسا ی کوڕی مەریەم)م لە خەودا بینی(علیە وعلی نبینا أفضل الصلاة والسلام) بە پەنجەی ئیشارەتم بۆ دەکات و دەڵێت: ببە(محمد)ی ... ببە شوێن کەوتووانی (محمد)... دەڵێت: منیش دەرچووم و، پاشان هاتم بۆ لای ئێوە، چونکە یەکەم مزگەوت بوون لەسەر ڕێگاکەم، ئەو برایانە سوێند دەخۆن بە خوای پەروەردگار ... کاتێ بانگدەرەکە

بانگی بۆ نوێژی عیشا فەرموو ئەو گەنجە لەگەڵ براکانیدا چووە ناو نوێژەکەوە و لە ركاتی یەکەمدا و لە سوژدەی یەکەمدا سوژدەی برد و سەری بەرز نەکردەوە و نوێژەران نوێژەکانیان تەواو کرد و پێشەواکە سەلامی دایەوە کەچی ئەو برایە لە سوژدەدایە و ... بانگی لیّ کرد ... ئەی فلان ئەی فلان کەچی وەڵامی نەبوو بۆیە هەستا بۆ لای ... وە براکانی کە نوێژیان بە تەنیشتەوە دەکرد بانگیان کرد، یەکێکیان جوڵاندیەوە ئەویش بە زەویدا کەوت، کە تەماشایان کرد کەوا گیانی دەرچووە و گەیشتووەتە لای خواکەی... ئەی خودایە، کۆتایی ژیانمان بە چاکە بگێڕی... لە کاتێکدا لە بەر دەستی خوادا سوژدەی بردبوو... چەند کۆتاییەکی خۆشە؟!!! هەر کەسیّ بە سوژدەوە بمرێت ئەوا لە قیامەتدا بە سوژدەوە لە گۆڕەکەیدا زیندوو دەکرێتەوە، بۆ لای خوای گەورە بە سوژدەوە حەشر دەکرێت، هەروەکو چۆن ڕاستگۆی باوەڕپێکراو، کە هەرگیز لە خۆ وە قسە ناکات دەفەرموێت لە فەرموودەیەکی (جابر)ەوە کە لە (صحیح مسلم) [1] دا هاتووە دەڵێت:((یبعث کل عبد علی ما مات علیە))، واتە: هەموو بەندەیەك لەسەر ئەوە زیندوو دەکرێتەوە کە لە سەری مردووە)).

هەرکەسیّ لەسەر گوێڕایەڵییەك بمرێت ئەوا لەسەر هەمان گوێڕایەڵی زیندوو دەکرێتەوە... هەر کەسیّ بە جل و بەرگی ئیحرامەوە لە حەج و عومرەدا بمرێت ئەوا ڕۆژی قیامەت بە جل و بەرگی ئیحرامەوە زیندوو دەکرێتەوە لە کاتێکدا ئەو لە گۆڕەپانی مەحشەردا بانگ دەکات و دەڵێت: ((لبیك اللهم لبیك)).

کابرایەك هەبوو کاری بانگدان بوو، خوای گەورە دەوڵەمەندی کردبوو و ژیانی لیّ فراوان کردبوو... لە پێش مردنی توشی نەخۆشییەکی سەخت بوو... بووە هۆی ئەوەی لەسەر جێگا بکەوێت . هەموو هۆی گریانەکەی ئەوە بوو کە ئەو لە دوا ڕۆژانی تەمەنیدا لە بانگدان بووە و ناتوانێت بانگ بدات، لەو ڕۆژەی کە خوا ویستی لیّ بوو کۆچی دوایی تیادا بکات دەستی بە گریان کرد و دەیگوت:: پەروەردگارا... پەروەردگارا ... ئایا من چی تاوانێکم کردبوو... کە بووە هۆی ئەوەی لە

---

١ـ أخرجه مسلم، کتاب صفة القیامة، باب الأمر بحسن الظن بالله عند الموت (٢٨٧٨).

دوارۆژەکانی ژیانمدا بانگدانی لێ حەرام کردووم تاوەکو تەوبەی لێ بکەم ؟؟ پەروەردگارا.. بە هۆی تاوانەکانمەوە بانگدانم لێ حەرام مەکە کە هەردەم دڵم پێوەی پەیوەست بووە... لە ژیانمدا سوور بووم لە ئەنجامدانی... پاشان کاتی نوێژی عەسر هات... گوێی لە بانگ بوو لە مزگەوتەکانی نزیك ماڵیانەوە بەرز بووە وە ئەویش دەستی بە گریان کرد لە کاتێکدا ناتوانێت هەڵسێتە سەر پێ... ناتوانێت بجوڵێتەوە... ناتاوانێت لە ماڵ دەرچێت... لە ناکاودا هەستایە سەر پێ و لەسەر جێگاکەی خۆی کە لە سەری خەوتبوو ڕاوەستا... ڕووی لە قیبلە کرد و دەستی بە بانگدان کرد... الله أکبر... تاکو گەیشتە کۆتایی بانگەکە دەڵێت... لا الـه الا الله... پاشان کەوتە سەر جێگاکەی... کەس و کار و منداڵەکانی... لێی کۆبوونەوە بینیان گیانی دەرچووە لە گەڵ وتنی وشەی... لا الـه الا الله... ئاااى چەند کۆتاییەکی خۆشە ! ! ؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((انما الأعمال بالخواتیم))،[1] واتە: هەموو کردەوەکان بە پێی دواییینیانە))

پەروەردگارا... تاوانەکانمان داپۆشە و ئابروومان مەبە... ئەی بە بەزەییترینی هەموو میهرەبانەکان...

وەرە لە گەڵ مندا با پێکەوە دیمەنێکی تر ببینین... خوای گەورە من و ئێوەی لێ بپارێزێ... قوتابییەك بە گریانەوە هاتە ژوورەوە بۆ لام.. سوێندی دام بە خوا بۆ ئەوەی دوعا بۆ باوکی بکەم لە وانەی هەفتانەی ڕۆژی پێنج شەممە بەڵکو خوای گەورە دوعای یەکێ لە پیاوچاکانی ئامادە بووی ئەو کۆمەڵە وەربگرێت کە ئامادەی وانەکە دەبن... وەبینیم کاریگەرییەکی زۆر بە سەر ئەو برامانەوە دیارە... گوتم:براکەم چی بووە؟؟ فەرمووی: باوکم مرد... گوتم: داوا لە خوا دەکەم کە ڕەحمی پێ بکات... فەرمووی: ئەی مامۆستا بەڵام شێوەی مردنەکەی زۆر ناشیرین و قیزەون بوو... گوتم: پێم بڵێ چی بووە؟ فەرمووی: باوکم کەسێکی زۆر بە هێز بوو... تا ڕادەیەك ئەم برامانە لە یادی نایەت کە باوکی هەرگیز توشی ئازارێك یان نەخۆشییەك هاتبێت... خوای گەورە تەندروست و لەشساغی پێ بەخشیبوو...

---

١ـ تقدم، وهو في ((صحيح البخاري)).

فەرمووی: لەم ڕۆژانەدا پاش خواردنی نانی نیوەڕۆ هەستی بە سك ئێشەیەك کرد... وای بە باش زانی ئەوەی کە لە سکیدایە دەبێ دەری بهێنێ و برشێتەوە... فەرمووی: چووە سەر ئاو وە لەسەر ئاوکۆکە (حوض) وەستا... ئەمجار دەستی بە هاوار کرد... بۆ ئەوەی هەر شتێك لە سکیدایە دەری بهێنی... بەدەنگی بەرز هاواری دەکرد و هەموو گوێمان لە هاوارەکەی بوو... فەرمووی: کاتێ ڕاوەستانی درێژەی خایاند (لە کاتێکدا هێشتا پێویستی پێیەتی) لە بەر زۆر بوونی ئازارەکەی کەوتە سەر ئەژنۆکانی... دەمی لە ئاودەستەکە نزیك کردەوە – دوور بێ لە رووتان – ((أعزكم الله)) نەیتوانی لەسەر ئاوکۆکە بووەستێ بۆیە لە پێش ئاودەستەکە کەوتە سەر ئەژنۆ، هەر کاتێك بیەوێ برشێتەوە ئەوا دەمی لە ئاودەستەکە نزیك دەکردەوە، چونکە نەیدەتوانی ڕابوەستێ ..فەرمووی: پاشان گوێمان لە دەنگێکی بەرز بوو... ئێمەیش چووینە ژوورەوە بینیمان رووی لە ناو ئاودەستەکەدایە لە پاش ئەو هاوارە... جوولەی لێ بڕاوە... کاتێ بەرزمان کردەوە بینیمان گیانی دەرچووە و ڕۆیشتووە بۆ لای خوای گەورە.. پەروەردگارا.. بمانپارێزە... گوتم: پەنا بە خوا... گیانی دەرچوو لە کاتێکدا رووی لە ناو ئاودەستەکە بوو؟ کوڕەکەی فەرمووی: بەڵێ لە ناو ئاودەستەکە... گوتم: براکەم... پێم بڵێ... ئایا حاڵی باوکت چۆن بوو؟ (بە گریانەوە) فەرمووی: تەنها یەك نوێژی بۆ خوا نەکردبوو ..

ئەی خودایە !! ئەی تۆ براکەم... ئایا تاکو ئێستا نوێژەکانت دەفەوتێنێ ؟؟ ئەی خوشکەکەم ئایا تاکو ئێستا نوێژەکانت دەفەوتێنی؟ تاکو ئێستا سەرقاڵی بە بازرگانی کردنەوە ؟؟ تاکو ئێستا سەرقاڵی بە پلە و پایەوە؟؟ تا ئێستاش دەڵێیت: من سەرقاڵم؟ بەڵام دڵنیابە کە تۆ هەر وا دەبیت... ئەگەر خۆت بدەیتە دەستی گەردەلوولی کارکردنەوە و بەردەوام بیت لەسەر ئەو ڕێگەیە... ئەوا بە ئاگا نایەیتەوە ئیللا لە ناو گۆڕستاندا نەبێت لە نێو لەشکری مردووەکاندا... کەوابوو هەستە بۆ ئەنجامدانی نوێژەکەت... نوێژ دیاری خودایە بۆ ئەم ئوممەتە... پێغەمبەری هەڵبژێردراوﷺ لە سەرووی حەوت ئاسمانەوە هەڵیدەگرێت... بۆ ئەوەی ببێتە پەیوەندییەك لە نێوان ئوممەتەکەی و پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکان...

نوێژ پەیوەندی و خەڵاتە... ئەویش دوایین ئامۆژگاری پێغەمبەربووﷺ لە کاتێکدا لە سەرەمەرگدا بوو... بۆیەئەو بەردەوام دەیگوت: ((الصلاة الصلاة وما ملکت أیمانکم))[1] واتە: ئامان وریای نوێژەکانتان بن، وریای نوێژەکانتان بن و ئاگاداری ژێردەستەکانتان بن)).

ئەی بەندەکە...

| | |
|---|---|
| تـــأتي للـــصلاة فی فتـــور | و کأنـک قـد دعیـت إلی الـبلاء |
| و إن أدیتهـا جـاءت بـنقص لمـا | قد کان منک من شرک الریاء |
| و إن تخلـو عـن الإشـراک فیهـا | تـدبر للأمـور بالارتقـاء |
| و یـا لیـت التـدبر فی مبـاح | ولکـن فی المـشقة والـشقاء |
| و إن کنت المصلي یوما بین خلقه | أطلـت رکوعهـا بالانحنـاء |
| وتعجـل خـوف تـأخیر لـشغل | و کـأن الـشغل أولی باللقـاء |
| وإن کنـت المجـالس یومـا أنثـی | قطعت الوقت من غیر اکتفاء |
| أیـا عبـد لا یـساوي الله معـک | أنثـی تناجیـه بحـب وصـفاء |

واتە: دێیت بۆ نوێژەکەت بە سستی و لاوازییەوە، وا دەزانی بانگهێشت کراوی بۆ بەڵایەك، ئەگەر ئەنجامی بدەیت ئەوا بە کەم و کوورییەوە، چونکە نوێژەکەت (شیرکی ریای) تیادایە، ئەگەر (شیرکی ریای) تیادا ئەنجام نەدەیت، ئەوا بە جوانی بیردەکەیتەوە بۆ سەرکەوتنی کارەکانت، خۆزگە بیرکردنەوەکەت لە شتێکی ڕێدراودا بوایە، بەڵام ماندوویەتی و بەد بەختی یە، ئەگەر ڕۆژێك لە ناو خەڵکیدا نوێژ بکەی ئەو کرنۆش بردنت درێژ دەکەیتەوە، پەلە دەیکەیت لە ترسی دوا کەوتنی کارەکەت، وادەزانی کە کاردنەکە لە پێش ترە بۆ ئەنجامدانی، ئەگەر ڕۆژێك لە مەجلیسێکدا ئافرەت هەبوو، ئەوا کاتەکەت دەبڕیت بە بێ تێر بوون ، ئەی بەندەکە

---

١ـ أخرجه أبو داود کتاب الأدب، باب في حق المملوك (٥١٥٦)، وأحمد في ((المسند)) (٧٨/١)، وابن حبان (٦٦٠٥)، والبخاري في ((الأدب المفرد)) (١٥٨)، وأبو یعلی (٥٩٦)، وصححه الشیخ الألباني في ((صحیح الجامع)) (٤٦١٦). و ((الصحیحة)) (٨٦٨) من حدیث عليرضي الله عنه.

ئایا خوای گەورە هێندە ناهێنێت لەگەڵیدا، لە ئافرەتێك موناجاتی لە گەڵدا بکەیت بە خۆشەویستی و بێگەردییەوە.

کەوایە هەر ئێستا پەیمان بدە پەروەدگارەکەت... نوێژەکانت لە کاتی خۆیدا ئەنجام بدەیت و بیانپارێزی... وە تۆیش ئەی خوشکەکەم پەیمان بدە پەروەردگارت کە نوێژەکانت لە کاتی خۆیدا ئەنجامی بدەیت و بیانپارێزی... هیچ سەرقاڵییەك سەرقاڵت نەکات وە بە هیچ شتێکی تر مەیگۆرەوە...

ئەم برایە دەڵێت: کەوا باوکی هەرگیز نوێژی بۆ خوا نەکردووە!! گوتم: براکەم... دەزانم مەترسی وازهێنان لە نوێژ چەندە ترسناکە بەڵام سوێندت دەدەم بە خوا کە پرسیار لە دایکت بکە: کە باوکت چی کارێکی دەکرد؟ فەرمووی: باشە ئەو پرسیارە دەکەم... ئەمجار ئەم کوڕە ڕێزدارە ڕۆیشت بۆ لای دایکی و پرسیاری لێ کرد: کە ئایا باوکی چی دەکرد تاکو کۆتایی ژیانی بەم شێوە ترسناك و تۆقێنەرە بێت؟ دایکی دەستی بە گریان کرد و فەرمووی: کوڕی خۆم... باوکت لە ناو خەڵکیدا بە سوو (ربا) ڕەفتاری دەکرد! ئەویش لە هەزار، هەزار و پێنج سەدی دەردەهێنا...

گوتم: ئاه ه ه...ئەمە... ئەمە... باوکت حەرامی دەخوارد... سامانی خەڵکی بە ساختە و خۆرایی دەخوارد... کەوا بوو دەبا بخوات... لە کوێ ؟؟ لە ئاودەست!! دەبا کۆتایی ژیانی بەو شێوە بێت ﴿ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَـٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ ۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ﴾ البقرة: ٢٧٥، واتە: ئەو کەسانەی سوو ئەخۆن، (دینارێك بە دوو دینار، یان بە زیاتر دەدەن) کە لە گۆڕ دەنرێن پاشان زیندوو ئەکرێنەوە و ڕاست دەبنەوە، وا ڕاست دەبنەوە هەر دەڵێی شەیتانەکان دەستی لێ وەشاندوون. عەرەبەکان بە مرۆڤی پەرکەمداروو فێدار دەیانگوت: جنۆکە دەستی لێ وەشاندووە، ئەوجا قورئانی پیرۆزیش لەسەر زمانی ئەوان هات، بە کورتی: پیاوی سوو خۆر لە ڕۆژی قیامەتدا وەکو مرۆڤی پەتەڕی و شێتی لێدێ، چونکە لە دونیادا

دەیانگوت: مامەڵەو کڕین و فرۆشتنیش هەر وەکو مامەڵەکردن بە سوو وایە(( واتە هەردوکیان بە لای ئەوانەوە یەکسانن))، چونکە ئەوان باوەڕیان بە حەرام و حەڵاڵ نییە ؟خۆ خواش کڕین و فرۆشتنی ڕێداوە و سوو خۆریشی حەرام و یاساغکردووە)).

دع الحـــرص علـى الـدنيا وفي العــيش فــلا تطمــع
لا تجمـــع مـــن الحـــرام فـــلا تـــدري لمـــن تجمـــع
فـــإن الـــرزق مقـــسوم وســـوء الظـــن لا ينفـــع
فقـــير كـــل مـــن يطمـــع غـــنى كـــل مـــن يقنـــع[١]

واتە: واز بهێنە لە سووربون لەسەر دونیا، تەماحت با نەبێت بۆ ژیان، هەردەم حەرام کۆمەکەرەوە، چونکە نازانیت بۆ کێی کۆ دەکەیتەوە، دڵنیابە کە رزق دابەش کراوە گومانی خراپ هیچ سوودی نییە، هەژارە هەر کەسێ چاوچنۆك و چڵێس بێت دەوڵەمەندە هەرکەسێ ڕازی بێت.

الـنَّفسُ تَجـزَعُ أن تكـونَ فَقـيرَة والفقـرُ خَـيرٌ مِـن غِنَـى يُطْغِيهَـا
وَغِنَى النفُوسِ هُوَ الكَفَافُ فَإن أَبَتْ فجميعُ ما فى الأرضِ لا يكفِيهَا
هَـى القَنَاعــةُ فالْزَمْهَـا تَكُـنْ مَلكـاً لَـو لَـم تَكُـنْ لَـكَ إلاَّ رَاحـةُ البـدنِ
وأنْظُـر لمِـن مَلَـكَ الـدُّنْيا بأَجْمَعِهَـا هَل رَاحَ مِنْهَا بِغَيرِ الطيب والكَفَنِ

واتە: نەفس شپرز دەبێت کاتێ هەژار دەبێت، هەژاری چاکترە لە دەوڵەمەندییەك زاڵ بێت بە سەریدا، دەوڵەمەندی نەفسەکان ئەوەیە کە بژێوی ڕۆژانەت هەبێ، ئەگەر ڕازی نەبوو ئەوا هەموو سەر زەوی بەشی ناکات، ئەوە ڕازی بوونە ئەگەر دەستی پێوە بگری دەبیتە پادشا، ئەگەر هیچ شتێکت نەبێت تەنها ئارامی جەستەت، تەماشای ئەوانە بکە کە بوونە خاوەنی هەموو دونیا، ئایا جگە لە بۆن و کفن هیچی تری لە گەڵ خۆیدا برد؟.

---

١ـ انظر: ((عقلاء المجانين)) لابن حبيب (٧٤ ط ابن خلدون).

بەڵێ... هیچ شتێك لە گەڵ خۆتدا نابەیتە ناو گۆڕەکەت تەنها ئیمان و کردەوەی چاکە نەبێت...

برایەکی تر بۆی گێڕامەوە... سوێندی بۆ خواردم بە خوای گەورە... کە دەرهاوسێیەکی هەبوو لە قاتی سەرەوە هەمیشە کاری گوێگرتن بوو لە گۆرانی بیانی و جگە لە بیانی... مۆسیقای دەنگ بەرز... دەڵێت: پاش ئەوەی یادیم خستەوە بە یادی خوا چەند جارێك و هەردەم دووبارەم دەکردەوە کەچی هیچ سوودی نەبوو بەڵام ئەوەی منی بێزار کردبوو ئەوە بو کە ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی دەنگی ئامێرەکەی بەرز بکاتەوە بە شێوەیەك ئازار بە خەڵکی بگەیەنێت بە بیانوی ئازادی (وا دەزانێ کە ئازادی بێ سنوورە) دەڵێت: ڕۆژێك لە ڕۆژان لە کارەکەم گەڕامەوە، گوێم لە دەنگی گریان و هاواری ژن و منداڵ بوو، گوتم: ئەمە چییە؟ گوتیان: فلان لە سەرەمەرگدایە... دەڵێت: لە کاتێکدا من گوێم لە دەنگی گۆرانییە بە دەنگی بەرز لە نێو گریان و هاواردا فەرمووی: چوومە سەرەوە و گوتم: ڕۆڵەکانم باوکتان لە سەرەمەرگدایە کەچی تا ئێستاش سوورن لەسەر گۆرانی لەم کات و ساتەدا ؟؟ قورئانێك بخەنە سەر ئامێرەکە... چونکە ئەم جێگایە ئێستا فریشتەی تیادا ئامادە دەبێت، گوتیان: ئەگەر بە ئەرك نەبێت کاسێتێکی قورئانمان بۆ بهێنە . دەڵێت: سوێند بە خوا بە پەلە دابەزیمە خوارەوە و کاسێتێکی قورئانم هێنا و بە دەستی خۆم کاسێتەکەم کردە ناو ئامێرەکە دەڵێ: لە پاش کەمێك لەو کاتەی کابرا لە نێوان سەکەرات و سەرەمەرگدایە کاتێ گوێی لە قورئانەکە بوو گوتی: نەخێر نەخێر من نامەوێت گوێم لەو دەنگە بێت من نامەوێت گوێ لە قورئان بگرم...!! واز لە ئامێرەکە بهێنن با گۆرانییەکە بڵێت چونکە من گۆرانی دڵم ئاسوودە دەکات... کابرا دەڵێت: سوێند بە خوا بە گریانەوە لە ماڵەکە دەرچووم کابرا هیچ قسەیەکی نەکرد تەنها ئەم وشانە نەبێت...

ئەی خودایە... ((انما الأعمال بالخواتیم))، واتە: هەموو کردار و ڕەفتارەکان بە پێی دواییینیانە)) .

باش بیر لەم چەند وشانە بکەرەوە ((الخواتیم میراث السوابق)) واتە: هەر کەسێ لەسەر گوێڕایەڵی ژیا ئەوا کۆتایی ژیانی بە گوێڕایەڵی دەبێت وە هەر کەسێ لەسەر سەرپێچی ژیا ئەوا کۆتایی بە سەرپێچی دەبێت .

ئەمە یەکەم بۆچوونی زانایانمانە دەربارەی ئەو دوو کاتەی کە فریشتە دادەبزنە سەر ئەهلی ئیمان و بەردەوام بوون.

بەڵام بۆچوونی دووەم...

زانایانمان فەرموویانە: فریشتە دادەبزێتە سەر ئەهلی ئیمان و بەردەوام بوون لە کاتی دەرچوون و زیندوو بوونەوە لە گۆڕەکانیانەوە...ڕۆژی زیندوو بوونەوەو هەڵسانەوە لە کاتی دەرچوونی خەڵکی لە گۆڕەکانیانەوە دیمەنێکی زۆر سەیر دەبینی! لەگەڵ مندا بیر بکەرەوە و بیهێنە پێش چاوی خۆت کەسێك لە گۆڕەکەیەوە دەردەچێت و لەسەر ڕووی ڕێ دەکات...دەمەوێ ئەم دیمەنە هەردەم لە پێش چاوت بێت کە خەڵکی دەبینی بەژن و پیاوەوە لەسەر ڕوویان ڕێ دەکەن! ئەوەچی دەڵێت؟!

دەڵێم: خوای پەروەردگار باسی چەند کۆمەڵێکی کردووە کە بە سەر ڕوویاندا ڕێ دەکەن کاتێ لە گۆڕەکانیان دەردەچن... خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا﴾ الإسراء: ٩٧، واتە: لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە دەمەو ڕوویی و کوێری و لاڵی و کەڕی هەموو کۆ دەکەینەوە و حەشریان دەکەین چونکە لە دونیادا هەقیان نەبیستووە، هەقیان نەدیتووە لەوێش هەر نابینا و کەڕ و لاڵ دەبن)).ئەو کەسێکە هیچ نابیسێت!! قسە ناکات!! نابینێت!!کەچی لەسەر ڕووی ڕێ دەکات... بەرەو کوێ دەڕوات؟؟ بەرەو دۆزەخ و خراپترین ئاکام ﴿كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَاهُمْ سَعِيرًا﴾ الإسراء: ٩٧، واتە: هەر جارێکیش بڵێسەی ئاگرەکە کەم و کز بوو دووبارە نیلی دەدەین و هەڵی دەگیرسێنینەوە و زیاتری دەکەین بۆیان)).

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[١] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (أنس) ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (( يحشر الكافر يوم القيامة على وجهه )) قالوا: يا رسول الله كيف يحشر على وجهه ؟! فقال: إن الذي أمشاه في الدنيا على قدمين قادر على أن يمشيه يوم القيامة على وجهه )) وفي لفظ: (( أليس الذى أمشاه على رجلين فى

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب التفسير باب سورة الفرقان (٤٧٦٠)، ومسلم كتاب صفة القيامة والجنة والنار، باب كيف يحشر الكافر على وجهه (٢٨٠٦).

الدنیا قادر علی أن یمشیه علی وجهه یوم القیامة؟)). قال قتادة: بلی وعزة ربنا)) واتە: بێ باوەڕ لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر رووی حەشر دەکرێت، فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ چۆن بە سەر روویدا حەشر دەکرێت؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئەو کەسەی کە لە دونیادا لەسەر دوو پێ رێی پێ دەکرد دەتوانێت لە قیامەتدا لەسەر رووی رێی پێ بکات))، لە گوتەیەکی تردا ((ئایا ئەو کەسەی رێی پێ دەکرد لەسەر دوو پێ لە دونیادا بە توانا نییە لەسەر رووی رێی پێبکات ؟؟)).

قەتادە فەرمووی: بەڵێ سوێند بە عیززەتی پەروەردگارمان)).
من لەگەڵ هەموو کەسێکی ئیمانداری یەکتاپەرستی ڕاستگۆدا دەڵێم: بەڵێ سوێند بە عیززەتی پەروەردگارمان ئەو دەتوانێ...

لە ریوایەتێکی تردا کە لە(سنن الترمذي)و (مسند أحمد)[1] دا هاتووە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((یُحشر الناس یوم القیامة ثلاثة أصناف، صنف مشاة، وصنف رکبان، وصنف علی وجوههم))، واتە: خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا بەسێ شێوە حەشر دەکرێن، هەندێك بە پێ (پیادە)، هەندێکی تر بە سوار، هەندێکی تریان لەسەر ڕوویان)).

ئەوانەی کە سوار دەبن ئەوانە بەندە لە خواترسەکانن (خودایە من و ئێوە بگێڕێت لەوانە)) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَٰنِ وَفْدًا ﴾ مریم: ٨٥، واتە: ئەی پێغەمبەرﷺ باسی ئەو ڕۆژە بکە، کە ئێمە دەستە دەستە خۆپارێزەکان بەڕێز و حورمەتەوە دەبەینە دیداری خوای بەخشندە بۆ پاداشت بەریز و بە سواری هەروەکو چۆن پێشوازی لە وفدێ دەکرێ)).

کەوابوو فریشتە دادەبەزنە سەر ئەهلی ئیمان و یەکتاپەرست و بەردەوام بوون، لە کاتێکدا ئەوان لە گۆڕەکەیان دەردەچن... کاتێ ئیماندار لە گۆڕەکەی دەردەچێت دەبینێ فریشتە لە پێشوازی ئەو دایە و (سواری) بۆ ئامادە کردووە کە تەنها خوداوەند خۆی دەزانێت چەندە جوان و بەڕێزە بۆ ئەوەی کەسی ئیمانداری

---

١ـ أخرجه أحمد (٢ / ٣٥٤)، والترمذي، کتاب تفسیر القرآن، باب ومن سورة بني إسرائیل (٣١٤٢) وقال: ((هذا حدیث حسن)). وضعفه الشیخ الألباني في ((ضعیف الجامع)) (٦٤١٧) و ((المشکاة)) (٥٥٤٦).

لە خواترس سواری بێت، هەرگیز فریشتە ناهێڵێت بە سەر زەویدا ڕێ بکات... لە هەمان کاتدا ئەو موژدە خۆشەی پێی دەدات، کاتێ پێشوازی لە هەموو ئەهلی ئیمان دەکەن و پێیان دەڵێن:﴿أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ﴾ فصلت: ٣٢، واتە: لە پاشەڕۆژتان مەترسن و بۆ ماڵ و منداڵیشتان –پاش خۆتان– دڵ زویر مەبن ئێمە چاودێریان دەبین موژدەتان لێ بێت بەو بەهەشتەی بەڵێنتان پێ دەدرا لە دونیادا، مزگێنی بێت ئەمڕۆ ئەکەونە خۆشی و شادییەوە.(٣٠) ئێمە لە ژیانی دونیادا دۆستان بووین، لە پاشەڕۆژێشدا،دۆستان دەبین لەوێ نەفستان چ بخوازێ ئامادەیە بۆتان و هەرچیش بخوازن لە بەهەشتدا بۆتان هەیە.(٣١) ئەم مێواندارییەش، مێوانداریی‌یەکە لەلایەن پەروەردگارێکی گوناهپۆشی بە بەزەییەوە(٣٢))).

کەوابوو باوەڕدار هەر لە یەکەم ساتی دەرچوونی لە گۆڕەکەیەوە موژدەی پێ دەدرێت و ڕێزی لێ دەگیرێ...

دەڵێم: کاتێ گیان دەرچوو.. بەندەکە مرد ... هەموو کارێکی تەواو بوو... هەموو شتێك تەواو بوو... ئەوەی قازانجی کرد ئەوا قازانجی خۆی کرد... ئەوەی زیان لێ کەوتوو بوو ئەوا زیان لێ کەوتوو دەبێت... دەڵێن: فلان کەس کە هەموو دونیای پڕ کردبوو لە عیلم و پلە و پایە و ڕێزی ناو خەڵکی و فەرمانڕەوایی... ئەوا مرد... فلان دەشۆردرێ... ڕووت کرایەوە لە هەموو فەرمانڕەواییەك... لە هەموو جل و بەرگێك... فلان کفن دەکرێت وە هیچ کەس لەم دونیایە دەرنەچووە ئیللا بەو کفنەوە نەبێت هەموو شتێکی بە جێ هێشت... فلان ئەوا بە شان هەڵدەگیرێ... بەرەو کوێ دەیبەن؟ بەرەو گۆڕ... ئەو چاڵە تاریکە وە لەمە بە دواوە لە بەشەکانی تردا باسی دەکەین –انشاء الله– داوا لە خوا دەکەم من و ئێوە کۆتاییمان بە چاکە بگێڕێ و بە ئیمان و یەکتاپەرستییەوە بمرین ... آمین...

# تەرم ( جەنازە )

لە بەشی ڕابوردودا لە کاتی دەرچوونی روحدا لێبوینەوە، کاتێ کە مردن دادەبەزێتە سەر مرۆڤ و دەمرێت... کاتێ کە توشی نارەحەتی و سەرەمەرگ دەبێت و توشی سەکەرات دەبێت... روحەکە لە جەستەکەی جیا دەبێتەوە و ژیانی مرۆڤ کۆتایی پێ دێت و لاپەرەکانی دادەخرێت... پاشان دەخرێتە سەر (تەختە شۆر) ئەمجار کفن دەکرێت... ئێستا بووەتە جەنازە و پاشان بە شان هەڵدەگیرێ... چیرۆکی ژیانت تەواو بوو ئەی ئادەمیزاد.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلْكَرِيمِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِى خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِىٓ أَىِّ صُورَةٍ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ﴾ الإنفطار: ٦ـ٨، واتە: ئەی ئادەمیزاد..! چی تۆی تەفرە و فریوداوە بەرامبەر بە پەروەردگاری بەخشندەت کافر بوویت لە گەڵ ئەو هەموو نیعمەت و بەخششانەدا؟ (٦) ئەوەی دروستی کردیت لە نەبوون، ئینجا بە شێوەیەکی زۆر جوان ئەندامەکانی رێك خستیت قەد و بەژن وباڵا و ئەندامی شیاو و گونجاوی پێ بەخشیت جا رێك و پێکی کردیت واتە: قەد و قامەت و باڵا لە جوانترین شێوەی پێ بەخشیت(٧) لەهەر شێوە و دیمەنێکدا خۆی ویستی یەکی خستیت (٨))).

فلان ... ئەو.... چ کەسێکە ئەو! !؟؟ خاوەن سوڵتان و فەرمانڕەوایی بوو... موڵك... خانەدانی... ناسراوی و شکۆمەندی... پێنووس... بیرو هۆش... خاوەنی ئەدەب و زانست... خاوەنی هێز و لەشساغی... ئەو ئێستا هەڵگیراوە و لەسەر شانە... بەرەو کوێ دەیبەن؟ بۆ گۆڕستان...

جەنازەکە ئێستا بە شان هەڵدەگیرێ... ئەم دیمەنە بە هەموو دڵ و دەروونتەوە بهێنە یادی خۆت و تیایدا بژی... ئایا دەزانی کە ئەو جەنازەیە بە شان هەڵگیراوە هەر کە پیاوەکان لەسەر شانەکانیان بەرزی دەکەنەوە دەست بە قسە کردن دەکات؟؟ چی دەڵێیت؟؟

ئیمامی بوخاری[١] ریوایەتی کردووە لە فەرموودەیەکی (ابی سعید الخدری)یەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إذا وضعت الجنازة، واحتملها الرجال على أعناقهم، فإن كانت صالحة قالت: قدموني، وإن كانت غير صالحة قالت:يا ويلها، أين يذهبون بها؟ يسمع صوتها كل شئ إلا الإنسان - ولو سمعه صعق))، واتە: ئەگەر جەنازەیەك ئامادە کراو خەڵکی بە سەر شانەکانیان هەڵیان گرت، جا ئەگەر کەسەکە لە چاکەکاران بوو ئەوا دەڵێت: پێشم بخەن ..پێشم بخەن.. ئەگەر لە چاکەکاران نەبوو ئەوا دەڵێت: وەیل بۆ خۆی، بۆ کوێی دەبەن؟ هەموو شتێك گوێی لەو دەنگە دەبێت تەنها مرۆڤ نەبێت، ئەگەر گوێی لێ بوایە ئەوا دەبورایەوە لە ترساندا)).

هەر لە یەکەم ساتی هەڵگرتنی لەسەر شانەکان قسە دەکات ئەگەر هاتوو ئەم کەسە لە پیاوچاکان بوو ئەوا دەڵێت: تکایە پەلە بکەن و دوام مەخەن، واتە: پێشم بخەن پێشم بخەن... چونکە جێگاکەی خۆی لە بەهەشتدا دەبینێ، ئەوەی بۆی ئامادە کراوە دەیبینێ، خوای گەورە لەو خۆشگوزرانییە بۆی ئامادە کردووە... ئەگەر (پەنا بەخوا) کەسێکی خراپ بوو ئەوا دەڵێت: يا ويلها ... أين يذهبون بها؟؟ واتە: ویل بۆ خۆی... بۆ کوێی دەبەن؟ هەر لە رەحمەتی خوایە بۆ بەندەکانی کە پەردەیەکی خستووەتە نێوان بەندەکانی و دەنگی خاوەن جەنازەکان، ئەگەر ئەو پەردەیە نەبوایە و خەڵکی گوێیان لە دەنگی خاوەن جەنازەکان بوایە ئەوا ژیان تێك دەچوو... هەروەها لە ڕەحمەت و بەزەیی و میهرەبانی خوای گەورەیە بۆ ئێمە و لاوازییەکەمان کە پەردەیەکی خستووەتە نێوان ئێمە و تەسبیحاتی ئەم بونەوەرەی دەور و بەرمان ..

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ﴾ الإسراء: ٤٤، واتە: هەر حەوت ئاسمانەکان و زەوی و هەموو ئەوانەش کە تێیاندان هەموو گەورەیی و بێ خەوشی

١ـ أخرجه البخاري، كتاب الجنائز، باب حمل الرجال الجنازة دون النساء (١٣١٤).

ئەو(خوا)یە دەڵێن گەواهی بۆ یەکتایی ئەو دەدەن، هەموو شتێك هەر هاواری تاك و تەنیایی ئەو ئەکەن، پاڕانەوە و تەسبیحاتی و حەمدی ئەو دەڵێن، واتە: هەموو نیازمەندی ئەون ئەو بێ نیازە لە هەموو بەڵام ئێوە لە پاکانە و تەسبیحاتیان تێ ناگەن، چونکە عەقڵ و ژیریتان ناخەنە کار بۆ تێگەیشتن)) بۆ؟ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴾، واتە: بە راستی ئەو (خوا)یە هەمیشە بە حەوسەڵە و لەسەر خۆیە بۆیە لە گەڵ ئەو هەموو گوناهـ و تاوانەدا مۆڵەتی ئێوە دەدا و ناتانگرێ، زۆریش لێبووردەیە، بۆیە هەرکەسێك داوای لێبووردنی لێ بکات لێی دەبووری)). لە سەرخۆیە و هێمنە بەرانبەرتان، کاتێ کە پەردەیەکی خستووەتە نێوان ئێوە و دەنگی تەسبیحاتی هەموو دروستکراوەکان لە دەوروبەرتان... ئەگینا ئەگەر ئەو پەردەیە نەبوایە لە نێوان ئێمە و دەنگی تەسبیحاتی بوونەوەرەکان لە دەوروبەرمان ئەوا عەقڵمان لە دەست دەدا وە ژیانمان سەقامگیر نەدەبوو... وای دابنێ، کە خوای گەورە ئەو پەردەیەی نێوان تۆو جل و بەرگەکەتی لادا و گوێت لە دەنگی جل و بەرگەکەت دەبوو کاتێ تەسبیحاتی دەکرد... یان دەنگی تەسبیحاتی ئەو خواردنەی کە دەیخۆی... یان دەنگی تەسبیحاتی ئەو خانووەی کە تێایدا نیشتەجێی... سوێند بە خوا ئەوا عەقڵت لە دەست دەدا دڵنیابە کە هەموو بوونەوەر بێ ئاگا نین لە یاد و تەسبیحاتی خوا... بەڵکو ئێمە بێ ئاگاییەکەمان درێژەی کێشا... لە رێ لادانمان زۆر بووە و لە خوای گەورە زۆر دوور کەوتینەتەوە ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴾.

جەنازەکە گەیشتە گۆڕەکەی...گەیشتە ماڵی نامۆیی...گەیشتە ماڵی سامناکی و دڵتەنگی... گەیشتە ماڵی تەنگ و چەڵەمەیی... گەیشتە ماڵی خاك و کرم ... فلان خانەدان و ناسراوی شکۆمەند... خاوەنی فەرمانڕەوایی... ئێستا دەکرێتە ناو ئەم چاڵەوە... ئەم جێگا تەنگ و چەڵەمەیە لە ناو ئەم خاك و خۆڵە... هەرگیز جێگای ئاورێشمی تیادا راناخەن... ئەوان گەڕانەوە و تۆیان بە جێهێشت... تۆیان خستە ناو ئەو خاك و خۆڵە ... هەر چەندە ئەگەر لە گەڵتدا بمانایەوە ئەوا هیچ سوودی نەدەبوو... لەوێ... لەو تەنهاییە هیچ شتێك لە گەڵ تۆدا نەماوەتەوە تەنها

کردەوەکانت و ڕەحمەتی ئەو خوایەی کە زیندووە و نامرێت...

پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی هەروەکو لە هەردوو (صحیح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی(أنس)ەوە: ((یتبع المیت ثلاث: أهله وماله وعمله، فیرجع اثنان و یبقی واحد، یرجع أهله وماله ویبقی العمل)) واتە: سێ شت شوێنی مردوو دەکەوێت: کەسو کارەکەی و سامانەکەی و کردەوەکانی، جا دووانیان دەگەڕێنەوە و یەکێکیان دەمێنێتەوە، کەسوکار و سامانەکەی دەگەڕێنەوە و کردەوەکانی دەمێنێتەوە)).

هەموو سامانەکەی بە سەر کەس و کارەکەیدا دابەش دەکرێت... لەم ژیانی دونیا و تەنها کردەوەکانی مایەوە کە ئەم بەندە بە دەستەکانی خۆی پێشی خۆی خستووە... هیچ کەس لە کەس و کارت ناتوانن تەنها شەوێك لە گەڵ تۆدا و لە ناو گۆڕەکەتدا بمێننەوە هێچ سوودی نییە تەنها ئەوە نەبێت کە بە دەستەکانی خۆت پێشت خستون...

بە(حاتم الاصم)[2] یان گوت: بە چی شتێك پشت بەستنت بە خوا هێنایە دی؟ فەرمووی: بە چوار ئاکار و ڕەوشت: دڵنیا بووم کە ڕزقەکەم هیچ کەسێکی تر نایبات بۆیە دڵنیا بووم، دڵنیا بووم کە کارەکانم جگە لە خۆم بە جوانی هیچ کەسی تر ئەنجامی نادات بۆیە خۆم پێوە خەریك کردووە وە دڵنیا بووم کە مردن لە ناکاودا دێت بۆیە من دەست پێشخەر بووم... دڵنیا بووم کە خوای گەورە هەموو کاتێك دەمبینێت بۆیە شەرمم کرد لە کاتی سەرپێچیدا بمبینێ)).

چەند وشەیەکی کەم دەبوایە بە روناکی و بە ئاوی چاو بنوسرایە نەك بە ئاوی ئاڵتون... بەڵێ... کەس و کار دەگەڕێنەوە... سەروەت و سامان دەگەڕێنەوە... تەنها کار و کردەوەکانت دەمێنێ... بۆیە هەر ئێستا چاکە بروێنە... بۆ رۆژێك کە پێویستت بە تەنها یەك تەسبیحاتە... یان یەك جار وتنی (لا اله الا الله)... یان یەك (الله اکبر) یان تەنها یەك رکات لە تاریکی شەودا و لە بەر دەستی خوای گەورە و باڵا دەست دا.

١ـ أخرجه البخاري، كتاب الرقاق، باب سكرات الموت (٦٥١٤)، ومسلم كتاب الزهد والرقائق (٢٩٦٠).
٢ـ أخرجه البيهقي في ((الشعب)) (١٢٧٤)، وأبو نعيم في ((الحلية)) (٨ / ٢٧٣).

لە ئەمریکا بووم – بە سەردانێك چوو بووم بۆ لای ئەو برایانە–... پێیان گوتم: فلان کەس یەکێکە لەو برایانەمان لێرە دەژی... کەچی هیچ یارمەتیمان نادات بە سەروەت و سامان بۆ ئەنجامدانی پرۆژە خەیرییەکان... ئامادە نابێت لە گەڵماندا لە کاتی نوێژەکاندا... کەچی خوای گەورە سەروەت و سامانێکی فراوانی پێداوە بە هۆی ئەو بازرگانییەوە و نزیکی ئەم مزگەوتەیە... حەز دەکەین بڕۆین بۆ لای و یادی خوای بهێنیتەوە... مردن و گۆڕ و ڕۆژی دوایی یاد بهێنەوە... بەڵکو خوای گەورە ڕازی بوون بخاتە ناو دڵیەوە بە هۆی قسەکانتەوە ... منیش ڕۆیشتم بۆ لای ئەو کابرایە لە گەڵ چەند برایەکدا ... یادیم خستەوە بە یادی خوای گەورە کەچی هیچ سوودی نەبوو... هەندێ قورئانم بە سەردا خوێندەوە کەچی هیچ کاریگەری لەسەر نەبوو... یادیم خستەوە بە هەندێ لە فەرموودەکانی پێغەمبەری نازدارﷺ کەچی دڵی هیچ نەجوڵایەوە... ئەمجار پێی گوتم: ئەی مامۆستا خۆت هیچ ماندوو مەکە... گوتم: خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە دڵنیات کردم... کاتێ دڵتەنگی و غەمباری بە ڕوومەوە بینی ڕووی لێ کردم، منیش گوتم: خەیر... داوا لە خوا دەکەم کە دڵی تۆی کردبێتەوە بۆ وەرگرتنی حەق... گوتی: من دڵنیات دەکەمەوە ئەگەر کاتێ گەڕامەوە بۆ شار و وڵاتەکەی خۆم ئەوا مزگەوتێك بۆ خوا دروست دەکەم ... خۆم یەکلا دەکەمەوە بۆ خواپەرستی و گوێڕایەڵی... گوتم: کەوابوو پێنوسێك و پەڕەیەکی کاغەزم بدەرێ... گوتی: بۆ؟ گوتم: دەمەوێت بەڵێننامەیەك بنوسیت و فریشتەی مردن (ملك الموت) لە سەری ئیمزا بکات بۆ ئەوەی (ملك الموت) بە هیچ شێوەیەك نزیکت نەبێتەوە تاکو دەگەڕێیتەوە وڵاتەکەت و مزگەوتێك دروست دەکەیت و دەگەڕێیتەوە بۆ لای خوا و خۆت یەکلا دەکەیتەوە بۆ گوێڕایەڵی و خواپەرستی... کابرا پێکەنی و لە مەبەستەکەم تێگەیشت... تەماشایەکی کردم و گوتی: من نەهاتووم بۆ ئەم وڵاتە تەنها بۆ (دۆلار) کۆکردنەوە نەبێت... ئەمجار گوتی: من هەر کاتێك توشی سەر ئێشەیەك ببم ئەوا لە گیرفانم کاغەزێکی سەد دۆلاری دەردەهێنم و دەیخەمە سەر سەرم و بە بێ دواکەوتن سەر ئێشەکەم نامێنێ... گوتم: کەوابوو تۆ بەندەی دۆلاری...(عبد للدولار).

ڕاستی فەرمووە پێغەمبەری هەڵبژێردراوﷺ کە دەفەرموێت: ((تعس عبدالدينار، وعبد الدرهم، وعبد الخميصة: إن أعطي رضي و إن لم يعط سخط، تعس و انتكس، وإذا شيك فلا انتقش))، [1] واتە: کەساس و چارەڕەش بوو بەندەی دینار و بەندەی دەرهەم و بەندەی (الخميصه) ئەگەر پێی بدرێ ئەوا ڕازی دەبێت و ئەگەر پێی نەدرێ ئەوا پەست دەبێت، کەساس و سەرەوژێر بوو، ئەگەر درکێك چوو بە لەشیدا ئەوا کەسێك نابینێتەوە بۆی دەربهێنێ)).

سوێند بە خوا هیچ شتێك سوودی بۆت نییە تەنها ئەوە نەبێت کە پێشی خۆتی دەخەیت...

پێغەمبەری خواﷺ بە هاوەڵانی دەفەرموێت: ((أيكم مال وارثه أحب إليه من ماله؟ قالوا: يا رسول الله، ما منا أحد إلا ماله أحب إليه . قال: ((فإن ماله ما قدم، ومال وارثه ما أخر)) [2] واتە: کام لە ئێوە سامانی میراتگرەکەی لە سامانەکەی خۆی خۆشتر دەوێت؟ فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ هیچ کەسێك لە ئێمە نییە وە هەموومان سامانەکەی خۆمان لا خۆشەویستترە، فەرمووی: کەواتە سامانەکەی خۆی ئەوەیە کە پێشی خۆی دەخات و سامانی میراتگرەکەی ئەوەیە کە پاشی خۆی دەخات و جێی دەهێڵێ)).

کەوابوو سەروەت و سامانە ڕاستەقینەکەت ئەوەیە کە لە ژیانتدا و لە دونیادا خەرجت کردووە بە دەستەکانی خۆت... بۆیە هەرگیز پیسکە مەبە لەسەر خۆت ئەو سەروەت و سامانەی کە سەرقاڵی کردووی لە یادی خوا... سەرقاڵی کردووی لە گوێڕایەڵی خوا... لە نوێژ ... لە کردەوەی چاکە بۆ دوا ڕۆژت... بەڵکو ڕەنگە تۆ ئەو هەموو سامانە لە ڕێگای حەرامەوە کۆت کردبێتەوە، خۆت نەدەپاراست لە کاتی خواردنی حەڵاڵ، یان پارویەکی حەڵاڵ بکرێتە دەمی کەس و کار و منداڵەکانتەوە ... ئەم سامانە لە بەر دەستی خوای گەورە پرسیارت لێ دەکرێت دەربارەی: لە چی ڕێگایەکەوە پەیدات کرد و لەچی ڕێگایەکەوە خەرجت کردووە؟ سامانەکەت بە

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب الجهاد و السير، باب الحراسة في الغزو في سبيل الله (٢٨٨٦، ٢٨٨٧) من حديث أبي هريرة ﷺ.

٢ـ أخرجه البخاري كتاب الرقاق، باب ما قدم من ماله فهو له (٦٤٤٢) من حديث عبدالله بن مسعود ﷺ.

جێ دەهێڵی... بە سەر میراتگرەکانتدا دابەش دەکرێت... ئەگەر بڕۆی بۆ ناو گۆڕ... هیچ شتێك لە ناو گۆڕدا لە گەڵ تۆدا نامێنێتەوە تەنها کردەوەکانت نەبێت... گۆڕەکەت داخرا... بە تەنها مایتەوە ئەی بەستەزمان... پەروەردگارا... یارمەتیمان بدە لە تەنهایی ناو گۆڕ ئەی بە بەزەییترین کەسی میهرەبانەکان ..

لە فەرموودەیەکدا کە (الترمذي و ابن ماجة و الحاكم)[١] بە سەنەدێکی (حسن) ریوایەتیان کردووە ((كان عثمان إذا و قف على قبر بكى حتى يبل لحيته . فقيل لـه: تذكر الجنة والنار فلا تبكي، وتبكي من هذا؟ قال عثمان: إن رسول الله قال: إن القبر أول منازل الآخرة، فإن نجا منه، فما بعده أيسر منه، وإن لم ينج منه فما بعده أشد منه)) وقال رسول الله (ما رأيت منظرا قط إلا والقبر أفظع منه))، واتە: ((ئەگەر ئیمامی عوسمان لەسەر گۆڕێك ڕابوەستایە دەستی بە گریان دەکرد تاکو ریشی تەڕ دەبوو، پێیان گوت: باسی بەهەشت و ئاگرت بۆ دەکرێت کەچی ناگریت، بەڵام لەم کاتەدا دەگری؟ عوسمان فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گۆڕ یەکەم ماڵە لە ماڵەکانی دوارۆژ ئەگەر لێی رزگار بووی ئەوانەی لە پاش ئەو دێت سووك و ئاسانترە وە ئەگەر لێی رزگار نەبیت ئەوانەی کە لە پاش ئەو دێت سەختترە)) وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هیچ دیمەنێکم نەبینیوە ئیللا گۆڕ لەو ترسناکترەو سامناکترە))

من حەز دەکەم بە هەموو دڵێکەوە بۆ هەر کەسێ هەستی کرد بە دڵ رەقی و وشك بوونی چاوەکانی ئەوا با لە گەڵ جەنازەیەکدا بڕوات... و بە قەستی تەماشی ناو گۆڕەکە بکات لە پێش ئەوەی مردووەکەی تیادا بنێژن... بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردووین بە سەردانی گۆڕستان و دەڵێت: ((نهيتكم عن زيارة القبور، فزوروها))[٢] واتە: من سەردانی گۆڕستانم لە ئێوە قەدەغەکردبوو جا لێرە بە دواوە سەردانی بکەن))

---

١ـ أخرجه الترمذي، كتاب الزهد، باب (٥) رقم (٢٣٠٨) وقال: ((حديث حسن غريب))، وابن ماجه، كتاب الزهد، باب ذكر القبر والبلى (٤٢٦٧)، وأحمد (٤٥٦)، والحاكم (١/ ٣٧١)، وحسنه الألباني في ((صحيح الجامع)) (١٦٨٤)، و((المشكاة)) (١٣٢).

٢ـ أخرجه مسلم، كتاب الجنائز، باب استئذان النبي ﷺ ربه في زيارة قبر أمه (٩٧٧).

له ڕیوایەتێکی تردا کە لە (صحیح مسلم) دا هاتووە ((فإنها تذکر الموت))[1] واتـە: چونکە مردنتان یاد دەخاتەوە)).

ئەی ئەو کەسەی هەست بە ڕەق بوونی دڵەکەت دەکـەیت بەرانبـەر بـە گـۆڕ... تەماشای بکە... تەماشای ڕوبەڕەکەی بکـە و بـیر بکـەرەوە لـە تـەنهایی و تـەنگ و چـەڵمەیی، تەماشـای ئـەو خاکـە بکـە کـە لـە بـن گۆڕەکەدایـە... ئـەمجار بیهێنـە بەرچـاوی خـۆت کـە ئـەوە تـۆی ئـەو هـەموو گڵـە دەکەنـە سـەر لاشـەت و دەم و چاوتدا... یادی ئەو گڵە بکەرەوە کە دەکرێتە سەر لاشەتدا... بە تەنها لـەو جێگـە تەسـك و تەنهاییـە دەمێنیتـەوە، حـەز دەکـەم لێـرەدا هەنـدێ ڕاوەسـتم وەکـو بنەمایەکی زانستی، ناچارم کـە بیڵـیم... ئـەگینا حـەزم دەکـرد هـەر لـەم باسـەدا بـەردەوام بوایـەم وە بـە چـەند وشـەیەکی نـەرم و نیـان و ناسـك لـە پێغەمبـەری خوداوەﷺ پێشینە چاکەکارانمانەوە بۆ ئـەوەی دڵـەکان بـدوێنم... بـەڵام هـەروەکو باسم کرد من تەنها دڵەکان نادوێنم... وە تەنها عەقڵەکان نادوێنم بەڵکو دڵ و عەقڵ هەردوو پێکەوە دەدوێنم لە هەمان کاتدا... بەڵێ... چونکە هەندێ خەڵکی بەرانبەر بە گورێك و لە گەڵ گۆڕێکدا ڕادەوەستێ... دەڵێت: ئـەو خۆشـگوزرانییە و سـزایەی ناو گۆڕ کە باسی لێوە دەکەن تەنها ئەفسانە و قسەی پڕ و پووچـە... چـونکە ئـەم کارە عەقڵ پێی ڕازی نییە... چونکە هیچ گونجا و بـە جـێ نییـە کـەوا گـۆڕ فـراوان بێتەوە یان تەسك بێتەوە یان خاوەنەکەی خۆشگوزران بێت یاخود سـزا بـدرێت...؟ ئەمـە کارێکـە عـەقڵ وەری ناگرێـت... هـیچ عـەقڵێکی سـاغ و تـەواو بـاوەڕی پـێ ناکات...

براکانم... من هەرگیز لە ڕێز و پایـەی عـەقڵ کـەم ناکەمـەوە... بـەڵکو دووپـاتی دەکەمەوە کەوا هەرگیز ڕوناکی(وەحی) سرووش ڕوناکی عەقڵ ناکوژێنێتـەوە بـەڵکو پاکی دەکاتەوە و بە هێزی دەکات و پڕ بەرەکەتی دەکات... بە مەرجێ ئەو عەقڵـە لە گەڵ هەموو بوونەوەردا سوژدە بەرن و ملکەچی خوای گەورە بن... خوای گەورە عەقڵی بە پاکی ناو بردووە لە قورئاندا وە پایە و شکۆمەندی روونکردووەتەوە..

---

١ـ أخرجه مسلم، كتاب الجنائز، باب استئذان النبيﷺ ربهفي زيارة قبر أمه (٩٧٦).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَلَا يَعْقِلُونَ﴾ یس: ٦٨، واتە: دە ئایا ئەوان تێ ناگەن و ژیرییان ناخەنە کار)) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ﴾محمد: ٢٤، واتە: ئایا ئەوانە بۆ لە ئایەتەکانی قورئان رانامێنن و تێ نافکرێن تا پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرن)) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ ثُمَّ انظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ﴾ الأنعام: ١١، واتە: پێیان بڵێ: بچن بە وڵاتی بێ باوەڕەکاندا ئەوانەی یاخی بوون گەشتێ بکەن ئەوسا تەماشاکەن بزانن پاشە رۆژی ئەوانە چۆن بوو کە ئایەتەکانی خوایان بە درۆ دادەنا؟))، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ﴾ آل عمران: ١٩٠، واتە: بە راستی لەو شێوە دروستکردنە سەرسوڕهێنەرەی ئاسمانەکان و زەوی و ئاڵوگۆڕی شەو و رۆژ چەندین بەڵگە و نیشانەی پتەو هەیە لەسەر بوونی خوا و تاك و تەنیایی بۆ کەسانێ خاوەن ژیری و هۆشمەندن)). بۆ خاوەنی عەقڵە روناکەکان... کەوابوو عەقڵ چەندە مەزنە؟؟!! عەقڵ چەندە بە شکۆیە؟؟!! عەقڵ چەندە بەڕێزە؟ بە مەرجێ جگە لەو رۆڵەی کە پێی سپێردراوە هیچ رۆڵێکی تر نەبینی... سنوری خۆی نەبەزێنی... لە توانای خۆی زیاتر هەنگاو نەنێت... دەبێت عەقڵ لەگەڵ هەموو بوونەوەردا ملکەچی خوای گەورە بن...

چونکە زۆر ئەستەمە کەوا عەقڵ بتوانێت ڕاستیەکانی(وەحی) سرووش بزانێت و بناسێت و لێی تێبگات لەم راستێتیە گەورە بە بێ (وەحی) سرووش. من پرسیار لەو برا و خوشکانە دەکەم: ئایا کێ خاوەنی پاکترین و شکۆدارترین و مەزنترین و خاوێنترین عەقڵە کەوا ئەم زەوییە ناسیویەتی ؟؟ ئەو کەسە محمد ی کوڕی عبدالله یەﷺ... لە گەڵ ئەوەیشدا پێغەمبەرمانﷺ نەیدەتوانی راستیەکانی ئیمان و قورئان بناسێت ئیللا لە پاش هاتنی (وەحی) سرووش لە لایەن خوداوەندەوە... چۆن ئەم قسەیە دەکەیت؟؟ ئایا پێغەمبەری خواﷺ ڕاستیەکانی ئیمانی نەدەناسی بە عەقڵە روناکەکەی ئیللا پاش دابەزینی(وەحی) سرووش؟؟ بەڵێ...

خوای گەورە دەفەرموێت: .. ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ الشورى: ٥٢، واتە: هەروەك بۆ پەیامبەرانی پێشین وەحیمان کرد ئاوایش ئەم قورئانەمان بۆتۆ وەحی کرد بە بڕیار و فەرمانی خۆمان و ڕۆح و گیان و ئەقڵ دەژێنێتەوە تۆ لەپێش وەحی نەت ئەزانی کتێب و بڕوا چییە؟ بەڵام ئێمە ئەو قورئانەمان کردە نوور و ڕووناکییەك تا بە هۆی ئەوەوە هەر کەسێکمان بوێت لە بەندەکانمان ڕێنمایی بکەین کەوابوو چ قورئان چ بڕوا هەردوو بەهرەی خوان بێ گومان تۆ ئەی موحەممەدﷺ بۆ ڕێگەیەکی ڕاست خەڵکی ڕێنوێنی دەکەیت)).

کەواتە... تەنانەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەیدەتوانی لە پێش (وەحی) سرووش ڕاستیەکانی وەحی بزانێت و بناسێت... عەقڵ بواری خۆی هەیە، دەبا لە بوارەکەی خۆیدا داهێنان ئەنجام بدات... خۆت دەزانی کە چەندە پێویستمان بە داهێنانی عەقڵەکان هەیە لەم کات و ماوەیەدا ... بەڵام ئێمە عەقڵ بکەینە(حاکم) دادوەرێك بە سەر دینی خوای گەورەوە ئەوا سوێند بە خوا ئەم دینە دەبووە یاریەك بە دەستی عەقڵی مرۆڤەکانەوە... ئەگینا من پرسیار دەکەم، ئەو چۆن دینێك دەبێت کە ئێمە وەری دەگرین ؟؟ ئەو دینەی کە عەقڵی تۆ بڕیاری لە سەرداوە ؟؟ یان ئەوە دینەی کە عەقڵی من بڕیاری لە سەرداوە ؟؟ یان ئەو دینەی کە عەقڵی فلان بڕیاری لە سەرداوە؟؟ یان عەقڵی فلان... ئەم دینە کام دینە و چۆن دینێکە ؟؟ !

ئیمامی عەلیرضي الله عنه دەڵێت: ((لو كان الدين بالرأي لكان المسح على باطن الخف أولى من المسح على أعلاه))،[1] واتە: ئەگەر دین بە بۆچوون(رأی) بوایە ئەوا سڕینی ژێرەوەی خوف لە پێشتر و ڕەواتر بوو لە سڕینی سەرەوەی)) ئەگەر بتەوێت خوفەکانت بسڕی ئەوا سوننەت وایە کە سەرووی خوفەکان بسڕی... نەوەك ژێرەوەی کە دەکەوێتە سەر زەوییەکە... ئەگەر دین بە پێی عەقڵ بوایە ئەوا ژێرەوەی خوفەکان لە پێشتر و ڕەواترە بۆ سڕین لە سەرەوەی خوفەکە... بەڵام

---

١ـ أخرجه ابو داود،كتاب الطهارة، باب كيف المسح؟ (١٦٢ – ١٦٢)، والدار قطني في ((السنن)) (١ / ١٩٩، ٢٠٤)، والبيهقي في ((السنن الكبرى)) (١ / ٢٩٢)، وصححه الألباني في (الإرواء) (٣).

دین ئـەرك پێـدان و یاسـادانانە، ئەمەیـشە ئـەوە ناگەیـەنێت کـە ئێمـە عـەقڵ پـووچ بکەینەوە و هەڵیبوەشێنینەوە... دەبـا بیربکەینـەوە بـە عەقڵـەکانمان لـە فـەرمانی پەروەردگارمان و پێغەمبەرمانﷺ .. من (هەروەکو باسم کرد) ڕێـز و پایـەی عـەقڵ کەم ناکەمەوە لە بایەخ و گرنگی کەم ناکەمـەوە... ئـەگینا ئەگـەر عـەقڵ بـەرنگاری روناکی (وەحی) سرووش ببێتەوە وە ئەو عەقڵـە لـە پـەیرەو بەرنامـەی پێغەمبـەری خواﷺ لا بدا یان لە بەرنامەی پێغەمبەران (علیهم الـصلاة والـسلام) بـە شـێوەیەکی گشتی... سوێند بەو خودایەی کە هیچ خودایەك جگە لە ئەو نییە ئەوا عەقڵ لە نـاو زەلکاوێکی بـێ نرخـەوە نـوقم دەبێـت... نـوقم دەبـوو لـە نـاو زۆنگـاوی گـومڕایی و ئارەزووەوە... ئایا بە بیرتدا دێت عەقڵی وا هەیە مانگا دەپەرستێ ؟؟ بەڵکو عەقڵی وا هەیە مـشك دەپـەرستێ ؟؟ ئایـا بـاوەڕ دەکـەیت؟؟ کـە مانگایـەك لـە سـەردەمی ئـەتۆم و سـەردەمی(فـضائیات)دا وە لـە سـەردەمی(انترنێـت)دا تـاکو ئێـستا کردوویانەتە خوایەك و دەیپەرستن؟؟ دەیپەرسـتن جگـە لـە خـوا..(جـل جلالـە)وە هەروەها لە سەردەمی ئەتۆمدا مشك دەپەرستن لە پەرستگا گەورە و شکۆدارەکاندا جگـە لـە خـوا؟؟(جـل جلالـە) بـەڵکو عـەقڵی وا هەیـە کـە ئەنـدامی نێرینـەی پیـاو دەپەرستێت؟؟ بەڵکو عەقڵی وا هەیە کە ئەندامی مێیینەی ئـافرەت دەپەرسـتێت؟؟ عەقڵی وا هەیە مرۆڤ دەپەرستێت؟ ئـەوەتا عیـسا ی کـوڕی مـریم دەپرسـتن (علیـە وعلی نبینا أفضل الصلاة والسلام)وە (العزیر)یان دەپەرست... عەقڵی وا هەیە کـەوا کچەکەی خۆی دەکوژێت، کـە هێـشتا زینـدووە لـە ترسـی برسـێتی و شـەرمەزاری! عـەقڵی وا هەیـە بـەرگری لـەزۆرانبازی(گـا) دەکـات! عـەقڵی وا هەیـە بـەرگری لـە رەگەزپەرسـتی رەنگـی پیـستەکان دەکـات! عـەقڵی وا هەیـە(نـاڵێم چـەندەها ماڵ)،بەڵکو چەندەها دەوڵەت و میللەت لە ناو دەبـەن لـە ڕێگـای موشـەك و چـەکی هاوێژەر و فرۆکە و راجیمە و زرێپۆشەوە بە ناوی ئازادی و دیموکراسییەوە، عـەقڵی وا هەیە خاوەنەکەی دەڵێت:

هبوني عیدا یجعل العرب أمة    وسیروا بجسماني علی دین برهم

سـلام علـی کفـر یوحـد بیننـا    وأهــلا وســهلا بعــده بجهــنم

واتە: بمبەخشنە جەژنانەیەك بە مەرجێ عەرەب بکاتە میللەتێك، لاشەکەم بکەنە

سەر دینی (برهم)، سڵاو لە کوفرێك ببێتە هۆی یەکگرتنمان، لە پاش ئەوە دۆزەخ بە خێر بێت.

عەقڵی وا هەیە خاوەنەکەی دەڵێت: دواین کەڵەشێر کە بانگی دەکرد(قوقاندی) سەرمان بڕی ئێستا هیچ نەماوەتەوە تەنها خوا نەبێت...!! ئەوا ئاسکێکی تر رادەکات هەموو سەگەکانی راوی دوای کەوتوون ئێمەیش دوای دەکەوین پاشان راوی خوا دەکەین...))عەقڵێکی تر هەیە خاوەنەکەی دەڵێت: ئەو خودا ناپەرستیٚ و شەیتانیش ناپەرستیٚ ئەمجار دەڵێت: هەردووکیان دیوارێکن چاوەکانم دەگرن و دایدەپۆشن... ئایا دیوارێك بگۆڕمەوە بە دیوارێکی تر... عەقڵی ئافرەتێکی تر هەیە خاوەنەکەی دەڵێت: تەنانەت (یەکتاپەرستی) ش ستەمی لە ئافرەت کردووە. پێیان گوت: چۆن؟ گوتی: وشەی یەکتاپەرستی بریتییە لە(لا الە الا هو) ئایا بۆ نالێن(لا الە الا هي)؟ ئایا ئەمانە عەقڵن ئەی بەرێزان؟؟ ڕەحمەتی خوا لە زانای پایەدار (ابن القیم) کاتیٚ دەڵێت:

لا يستقل العقل دون هداية بالوحي تأصيلا ولا تفصيلا
كالطرف دون النور ليس بمدرك حتى يراه بكرة و أصيلا

واتە: هەرگیز عەقڵ سەربەخۆ نابێت بە بیٚ هیدایەتی، وەحی لە بناغەوە و بەدوور و درێژی، وەکو چاوێك بە بیٚ روناکی نابینیٚ،تاوەکو تەماشا بکات بەیانیان و ئێواران.

تۆ چاوەکانت دەبینیٚ... منیش چاوەکانم دەبینیٚ... بەڵام ئایا لە تاریکیدا هیچ دەبینین ؟؟ هیچ نابینین لە تاریکیدا... لە گەڵ ئەوەیشدا هەستی بینیمان هەیە... بەڵکو دەبیٚ روناکی یەك هەبێت بۆ ئەوەی ببینیٚ...بۆیە عەقڵەکەی من و عەقڵەکەی تۆ پێویستی بە روناکی پێغەمبەرایەتی یە... بۆ ئەوەی ئەم عەقڵە حەق و راستی لەسەر راستێتی خۆی ببینیٚ... ئەگینا ئەوا ئەم عەقڵە نوقمی تاریکی گومڕایی دەبێت... عەقڵی وا هەیە لە بواری دونیادا داهێنان دەکەن (من نکۆڵی لە داهێنان ناکەم) بەڵام ئەگەر لە رووی بیرو باوەڕە و ئەخلاقەوە تەماشای بکەیت ئەوا دەبینی

کەوتووەتە نێو قوڕاو و لێتاودا بە بێ ناکۆکی...

| | |
|---|---|
| لا يستقل العقل دون هداية | بالوحي تأصيلا ولا تفصيلا |
| كالطرف دون النور ليس بمدرك | حتى يراه بكرة و أصيلا |
| نور النبوة مثل نور الشمس | للعين البصيرة فاتخذه دليلا |
| فإذا النبوة لم ينلك ضياؤها | فالعقل لا يهديك قط سبيلا |
| طرق الهدى محدودة إلا على | من أم هذا الوحي والتنزيلا |
| فإذا عدلت عن الطريق تعمدا | فأعلم بأنك ما أردت وصولا |
| يا طالبا درك الهدى بالعقل | دون النقل لن تلقى لذاك دليلا[1] |

واتە: هەرگیز عەقڵ سەربەخۆ نابێت بەبێ هیدایەتی، وەحی لە بناغەوە و بە دوور و درێژی، وەکو چاوێك بە بێ روناكی نابینێ ، تاکو تەماشا بکات بەیانیان و ئێواران، روناکی پێغەمبەرایەتی وەك روناکی رۆژە، بۆ ئەوەی چاوەکان ببینن بۆیە بیکە رێ پێشاندەر، ئەگەر پێغەمبەرایەتی روناکی خۆی پێت نەبەخشی، ئەوا عەقڵ بە تەنها هەرگیز بۆ رێگا رێنموییت ناکات، رێگاکانی هیدایەت دیاریکراون تەنها ئەو کەسە نەبێت کە بۆ پیشەوای ئەم سرووشە و قورئانە، ئەگەر بە قەستی لە رێگا لابدەیت ئەوا بزانە کە خۆت نەتویستووە بگەیتە جێ، ئەی ئەو کەسەی کە دەتەوێت هیدایەت لە رێگای عەقڵەوە بەدەست بهێنی، بە بێ قورئان و فەرموودە بزانە کە ئەوە نابێتە ڕابەرت.

| | |
|---|---|
| علم العليم وعقل العاقل اختلفا | من ذا الذي فيهما قد أحرز الشرفا |
| العلم قال: أنا أحرزت غايته | والعقل قال: أنا الرحمن بي عرفا |
| فأفصح العلم إفصاحا وقال له | بأينا الله في قرآنه اتصفا |
| فأيقن العقل أن العلم سيده | فقبل العقل رأس العلم و انصرفا |

زانستی زانیارێك و عەقڵی هۆشمەندێك بووە جیاوازییان، كام لەوان پلە و پایە و شكۆمەندیان بە دەست هێنا، زانستەكە گوتی: من ئەو مەبەستەیەم بە دەست

---

١ـ ((الصواعق المرسلة)) لابن القيم (٣/ ٩٧٩) ط دار العاصمة.

هێناوە عەقڵ گوتی: لە ڕێگای منەوە خەڵکی (الرحمن) ی ناسیوە، بۆیە زانستەکە بە دەربڕینێك دەربڕی و گوتی: بە کام لە ئێمە خوای گەورە لە قورئاندا وەصفی خۆی کردووە،بۆیە عەقڵ زانی کەوا زانست گەورەی ئەوە، پاشان عەقڵ سەری زانستی ماچ کرد و بڵاوەیان لێ کرد.

کەوابوو ئەمە بنەمایەکە دەبێ بزانین لە کێشە و باسی سزا و خۆشگوزرانی و ناو گۆڕ و تاوەکو حوکم نەدەین بە سەر دینی خوداوە بە عەقڵەکانمان.

بنەمای دووەم...

دەڵێن:... سزای ناو گۆڕ لە قورئانی پیرۆزدا نەچەسپاوە، هەر چەندە لە سوننەتدا هاتبێت ئەوا بەسە بۆ ئێمە تەنها لە قورئانەوە شت وەرگرین!!

قسەیەکی زۆر ترسناکە... بەڵکو لەو پەڕی ترسناکیدایە وە ڕەنگە ئەوان ئەو ئایەتە بکەنە بەلگە کە دەڵێت: ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِي ٱلْكِتَٰبِ مِن شَيْءٍ﴾ الأنعام: ٣٨، واتە: لە هیچ شتێك کەمتەرخەمیمان نەکردووە لە(لوح المحفوظ) دا)) ئەم قسەیە راستە بەڵام مانای ئەوە ناگەیەنێت کە ئێمە پێویستمان بە سوننەت نییە و تەنها قورئان بەسە! چونکە ترسناکییەکی زۆر گەورەیە... چونکە بە دەقی قورئانی پیرۆز خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ الحشر: ٧، واتە: هەرچی پەیامبەرﷺ پێی دان وەری بگرن، واتە: بەچی فەرمانی پێ کردن بیکەن چ لەم دەستکەوتەدا و، چ لە هەر شتێکی تردا جێبەجێی بکەن. ڕێیشی لە هەر شتێ لێ گرتن، ئێوەش دەستی لێ هەڵگرن، خۆتان لە خەشم و غەزەبی خوا بپارێزن بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و وازهێنان لە قەدەغەکراوەکانی بە ڕاستی خوا سەخت تۆڵەیە قاری لە هەر کەسێك گرت ڕزگاری نابێ)).

ئایا ئەوانە لە بیریان چووە کە خوای گەورە ئەم قورئانەی بە جارێك دانەبەزاند؟ بەڵکو خوای گەورە هەردوو (وەحی) سرووشەکەی پێکەوە دابەزاند (قورئان و سوننەت) بیر بکەینەوە ئەی موسڵمانان... من ڕووی دەمم لە هەموو ئەم ئوممەتە

لەسەر زەوی بە گشتی دەکەم و لە گەڵ ئەواندا قسە دەکەم... کە تۆ فـەرمانت پـێ کراوە بە وەرگـرتنی سـوننەتەکەی پێغەمبـەری خۆشەویستﷺ... بـەڵکو قورئـانی پیرۆز ئەم مەسەلەی یەکلا کردووەتەوە...

خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا﴾ الأحـــزاب: ۳٦، واتە: بۆ هیچ پیاو و ژنێکی بڕوادار نییـە کـاتێ خـوا و پەیامبەرەکـەی بڕیـاری کارێکیان دا سەرپشککرانیان بۆ هەبێ لە کارەکەیاندا واتە: بۆیان نییە خۆیان بارێك هەڵبژێرن، بەڵکو دەبێت بێ سەرلێکردنەوە فەرمانبەردار و ملکەچ بن، ئەمانە گشت ئەو ڕاستییە دووپات دەکەنەوە کە دەبێ موسڵمان هەمیشە گوێڕایەڵی لە خـوا و لـە پێغەمبەرەکەی بکەن و نابێ بۆ خۆی – بێجگـە لـەوە – بریـارێکی تـر بـدات (ئـیبن کەسیر) یش ئەڵێت: ((ئەم ئایەتە هەموو بوارەکانی ژیان دەگرێتـەوە، کـەوابوو هـەر کات خوا و پەیامبەرەکەیﷺ بڕیاری شتێکیان فەرموو لە هـەر بوارێکـدا ئـیتر ئـەبێ هەر ئـەوە پیـادە بکـرێ ئـەگینا یـاخیبوون و سەرپێچییە)) هەرکەسێك سەرپێچی بکات لە فەرمانی خوا و پەیامبەرەکەی بەو شێوەیە کە جگە لـە بڕیارەکـانی ئـەوان کـارێکی دی هەڵبـژێرێ بـۆ خـۆی ئـەوە بـێ گومـان گـومڕا بـووە بـە گومڕابـوونێکی ئاشکرا)) .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخْشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ﴾ النـــور: ٥١ـ ٥٢، واتە: وتە و گوفتاری بڕوادارەکانیش کاتێ بانگ دەکرێن بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەیﷺ بۆ ئەوەی لە نێوانیاندا داوەری بکا هەر ئەمەیە کە ئەڵێن: ئەوا بیستمان و گوێڕایەڵیشین، ئا ئەوانە – کە بۆ ڕەزامەندی خوا پەلە ئەکەن – سەرفرازی ڕاستەقینەی دونیا و قیامەتن .(٥١)هەر کەسێ گوێڕایەڵی خوا و پەیامبەرەکەی بکا و لە خوا بترسێت لە بەر ئەو درێغییانەی کە کردوویەتی وە لە سەرپێچیش خۆی بپارێزێ ئا ئەوانەن

سەرکەوت و برەوەن(٥٢))).

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَٱحْذَرُواْ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ﴾ المائـــدة: ٩٢، واتـــە: دەبـــێ بەبـــەردەوام گوێڕایـەڵی خـوا بـن و بەرفـەرمانی پەیامبـەر بـن و وریاشـبن هەمیـشە لـەو شـتە ناپەسەندانە دوور بگرن جا ئەگەر لە قسەم دەرچوون و رووتان لـە ئامۆژگارییـەکانم وەرگێڕا ئەبێ بزانن کە بە راستی پەیامبەر جگە لە راگەیانـدنی پـەیامی خـوا هیـچی تری لەسەر نییە سزاو تۆڵەیش هەر بەدەستی خوایە)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْۖ فَإِن تَنَٰزَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾ النساء: ٥٩، واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە! گوێڕایەڵی فەرمانی خوا و پەیامبەر بن لە هەموو کاروبارێکدا وە بەر فەرمانی کاربەدەستان و کارسازانی خۆتان بن، واتە: بە قسەی ئەو کاربەدەست و زانایان بکەن کە لە خۆتان بن .واتە: لە چوار چێوەی شەریعەتدا گوێڕایەڵیان بن، ئینجا ئەگەر لە شتێکدا کێشەو ناکۆکیتان بوو جا بیگێڕنەوە بۆ لای خوا و پەیامبەرﷺ واتە: با تەنها قورئان و سوننەت داوەر و حەکەمتان بن، بەڵێ پێویستە لە هەموو شتێکدا بگەڕێینەوە لای خواو پەیامبەرﷺ دیارە کە بڕیاری پەیامبەریشﷺ هەر بڕیاری خوایە. ئەگەر باوەڕتان بە خوا و بە رۆژی دوایی هەیە دەبێ ئاوابێت، ئەو گێڕانەوەی کێشە و هەرایە بۆ لای قورئان و سوننەت جوانتر و چاکترە بۆتان چاکترین رەفتاریشە بۆ داهاتووتان)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا﴾ النساء: ٦٥، واتە: نەخێر وەك ئەوە نییە دوو رووەکان دەیزانن سوێند بێ بە پەروەردگارت ئەی پێغەمبەر نابنە باوەڕدار تا بۆ یەکلا کردنەوەی کێشەکانی نێوانیان تۆ دەکەنە داوەر و ئەوساش بەرامبەر بەو بڕیارەی تۆ داوتە هیچ

تەنگیەکیان دەست نەکەوێ لە دەروونیاندا و بەچاکیش تەسلیم و ملکەچ ببن بەڵێ دەبێ ملکەچی و ڕەزامەندی تەواومان بۆ هەموو بڕیارەکانی خوا و پەیامبەرﷺ هەبێ)).

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ ١ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ وَمَا غَوَىٰ ٢ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ٣ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٌ يُوحَىٰ ٤ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ﴾ الـنجم: ١ـــ ٥، واتـە: سوێند بەو ئەستێرەیە کە بە خێرایی ئاوا دەبێت، یا لە شوێنی خۆی دەترازێت و بەر دەبێتەوە کاتی نزیکبوونەوەی قیامەت (١) هاوەڵەکەی ئێوە (موحەممەد)ﷺ لە ڕێی هەق لای نەداوە و باوەڕی پووچیشی نەبووە (٢) وە قسەو گوفتاری (پێغەمبەر) لە ڕووی هەواوهەوەسەوە نییە، جا کەسێ ئاوابێ چۆن ڕێگە ون ئەکات ؟! (٣) ئەو قورئانەی کە ئەو دەیڵێت، جگە لەوەی کە بە وەحی بۆی دەنێررێ هیچی تر نییە، واتە: ئەم قورئانە هەر لە لایەن خواوەیە(٤) خاوەن هێز و بە زەبر (جوبریل) ی فریشتەیە، قورئانی فێرکردووە (٥).))

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ﴾ الجمعـــة: ٢، واتـــە: خـــوا هـــەر ئـــەو پەروەردگارەیە کە لە ناو عەرەبە نەخوێندەوارەکاندا -وەك ئیبن عەبباس- ئەڵێ: پەیامبەرێکی پایەبەرزی لە خۆیان نارد، ئایەتەکانی قورئانەکەی ئەویان بە سەرا دەخوێنێتەوە هەرچەند ئەمیش خوی نەخوێندەوارە، ودڵ و دەروون و ڕەواڵەتیان پـاك دەکاتـەوە لـەبیروباوەڕی بتپەرستی و یاسـای لاروچـەوتی کۆمەڵایـەتی ئـەو سەردەمە و قورئان و فەرموودەکانی خۆیان فێر دەکات خۆ بەڕاستیش پێش هـاتنی ئەو ئەوان لە گومڕایی و سەر لێشێواوییەکی ئاشکرادا بـوون... سیاسـەتی پـووچ و گەندەڵ، ڕەوشت و ئەخلاقی ڕووخاو، باری کۆمەڵایەتی پەست و قێزەون... هتد)).

خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَٱذۡكُرۡنَ مَا يُتۡلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلۡحِكۡمَةِۚ﴾ الأحـزاب: ٣٤، واتـە: و یـاد بگـرن ئـەوەی دەخوێنرێتـەوە لـە ماڵەکانتاندا لە ئایەتەکانی خوا و فـەرموودەکانی پێغەمبـەرﷺ واتـە: مـادەم ئێوە

ماڵەكانتان جێگەی سروش و نیگای خوایە ئەبێ زۆر ساڵح و چاك و پاك بن)) مەبەست لە (آيات الله) قورئانە و مەبەست لە (الحكمە) بە یەكدەنگی هەموو ئەهلی سوننە: مەبەستی سوننەتە...

ئیمامی الشوكانی دەڵێت[1]: ((جێگیر بوونی بەڵگەیەتی سوننەت و سەربەخۆبوونی لە یاسادانانی حوكمەكان، یەكێكە لە پێویستی یە دینیەكان، وە هیچ كەسێك لەو قسەیەدا جیاواز نییە ئیللا كەسێك نەبێت كە هیچ پشكێكی لە ئیسلامدا نەبێ))...

زۆر ئەستەمە كە لە قورئان تێبگەین بە بێ سوننەت ئەو كەسەی كە قورئانی لە سەردابەزیوە وە پێویستە لە سەرمان دڵنیا بین و لێبكۆڵینەوە لە راست و دروستی فەرموودە(صحة الحديث) چونكە هەركەسێ بە دەم پێغەمبەری خوداوەﷺ بە قەستی درۆی كرد ئەوا با جێگای خۆی لە ئاگردا ئامادە بكات هەروەكو لە (صحيح البخاري)[2] دا هاتووە لە فەرمودەی (عبدالله ی كوڕی عمرو)ەوە كەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((بلغوا عني ولو آية، وحدثوا عن بني إسرائيل ولا حرج، ومن كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده من النار)) واتە: لە منەوە ئەگەر تەنها یەك ئایەتش بووە بگەیەنن، لە بەنی ئیسرائیلەوە باسەكان بگەڕێننەوە بە بێ ئەوەی قەدەغە بێت، هەركەسێ بە دەم منەوە بە قەستی درۆ بكات ئەوا با جێگای خۆی لە ئاگردا ئامادە بكات))

بۆیە ئەگەر ڕاست و دروستی فەرموودەیەكی جێگیر بوو بە پێی ئەو بنەمایانە كە دانراوە لە لایەن زانا رەخنەگر و لێهاتووەكان، دانا بە سەلیقەكان لە فەرموودەناسان ... ئەوا پێویستە لە سەرمان كەوا ملكەچی فەرموودەكەی پێغەمبەری خوابینﷺ، جا ئەگەر هاتوو عەقڵمان لێی تێگەیشت یان لێی تێنەگەیشت.

---

١ـ ((إرشاد الفحول)) (ص ٥٣).

٢ـ أخرجه البخاري في كتاب أحاديث الأنبياء، باب ما ذكر عن بني إسرائيل (٣٤٦١).

ابن القيم دەفەرموێت[1]: سوننەت لە گەڵ قورئاندا سێ رووی هەیە یا خود بە سێ شێوەیە: ...

ڕووی یەكەم: ئەو سوننەتەی كە لە گەڵ قورئاندا دەگونجێ لە هەموو ڕوویەكەوە... ئەمە مانای چییە؟ مانای ئەوەیە: كەوا خوای گەورە لە قورئاندا فەرمان دەكات بە نوێژ و ڕۆژوو و زەكات و حەج... خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ البقرة: ٤٣، واتە: فەرمانیان پێ بكە با بە تێر و تەسەل نوێژ ئەنجام بدەن و بەشێكی دارایيشیان بە زەكات بدەن)) وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾آل عمران: ٩٧، واتە: خوا حەجی كەعبەی بڕیارداوە لەسەر مەردم لەسەر ئەوەی توانای ڕێگای هەبێ)). ...هتد .

ئەمجار سوننەت دێت ئەو فەرمانە كە قورئان فەرمانی پێ كردووە دەیچەسپێنێت... بۆیە خاوەنی سوننەتﷺ دەڵێت: هەروەكو لە هەردوو كتێبی (صحيح)[2] دا هاتووە لە فەرموودەیەكی (ابن عمر) ەوە:

((بني الإسلام على خمس: شهادة أن لا إله إلا الله، و أن محمدا رسول الله، و إقام الصلاة، و إيتاء الزكاة، وصيام رمضان، وحج البيت)) واتە: ئیسلام بنیات نراوە لەسەر پێنج پایە: شایەتیدان كە هیچ خوایەك نیە شایەنی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت و محمد یش نێردراوی (الله) یە، نوێژ كردن و زەكات دان و ڕۆژووگرتن و حەجی ماڵی خوا)).

كەوابوو فەرمان بەوە دەكات كە قورئان فەرمانی پێكردووە بۆیە بەڵگەكانی سوننەت و بەڵگەكانی قورئان هاوكار و پشتیوانی یەك دەكەن ئەمە یەكەم ڕووە ..

---

١ـ ((إعلام الموقعين)) (٢ / ٢٧١، ٢٧٠) ط الإيمان (بتصرف).

٢ـ أخرجه البخاري في كتاب الإيمان، باب: دعاؤكم إيمانكم (٨)، ومسلم، كتاب الإيمان، باب: أركان الإسلام و دعائمه العظام (١٦).

ڕووی دووەم : سوننەت ببێتە ڕوونکەرەوە و ڕاڤەکردنی ئەوەی کە قورئان بە کورتی و پوختی باسی کردووە:... خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ البقرة:٤٣) ئەگەر بڵێیت چۆن نوێژ بکەم؟ چۆن نوێژەکان ئەنجام بدەم بەو شێوەی کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە؟ پێت دەڵێم: بڕۆ قورئان بکەرەوە و تەنها یەك ئایەتم بۆ دەربهێنە کە پێمان بڵێت نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکەعاتە ... خێراکە لە قورئان پایەکانی حەجم بۆ دەربهێنە ... هەروەها ئەو شتانەی کە نوێژ پووچ دەکەنەوە و هەروەها چەنییەتی و بڕەکانی زەکات... هتد...

ئەوا هەموو ئەوانە نادۆزیتەوە ئیللا لە سوننەت دا نەبێت ... لە قورئاندا فەرمانی کورت و پوخت کراوە: ((وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ)) ئەمجار خاوەنی سوننەت دێتﷺ و لە پێش چاوی هاوەڵان نوێژ دەکات... دەڵێت: ((صلوا كما رأيتموني أصلي))[1] واتە: نوێژ بکەن بەو شێوەی کە منتان دەبینی نوێژم دەکرد)).

قورئان فەرمان دەکات ﴿وَأَتِمُّواْ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ البقرة: ١٩٦، واتە: هەربۆ خوا حەج و عومرە بە چاکی و بە تەواوی ئەنجام بدەن واتە ئەگەر نیازی هەریەك لەوانەتان کرد دەبێ زۆر بەرێك و پێکی جێبەجێیان بکەن و تەنها نییەتی خوایان لێ بێنن)) پاشان پێغەمبەری خوارحەج دەکات و هەموو بنەما و ڕێساکانی حەج بە تەواوی لە پێش چاوی هاوەڵان دەکات و بەوان و بە هەموو ئەم ئوممەتە لە پاش خۆی، دەڵێت: ((لتأخذوا عني مناسككم))،[2] واتە: هەموو یاسا و ڕێسا و چۆنییەتی حەج لە منەوە وەرگرن و فێر بن)).

کەوابوو سوننەت ڕوونکەرەوەی قورئانە و درێژە پێدانی ئەم ئایەتانەیە کە بە کورتی و پوختەیی باس کراوە...

ڕووی سێیەم : ئەویش بە بایەخترین ڕووی سوننەتە لە گەڵ قورئاندا... ئەویش ئەوەیە کە سوننەت شتێك بەپێویست(واجب) دابنا کەچی قورئان باسی نەکردووە و لێ بێ دەنگ بووە لە (واجب) بوونی یا خود شتێکی بە حەرام دانابێ کە قورئان

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب الأذان، باب الأذان للمسافر إذا كانوا جماعة (٦٣١).

٢ـأخرجه مسلم، كتاب الحج، باب استحباب رمي جمرة العقبة يوم النحر (١٢٩٧)، وأحمد (٢ / ٣٦٦).

لێی بێ دەنگ بووە لە بە حەرام زانینی... کەوابوو پێغەمبەری خواﷺ یاسا دادەنات چونکە هەرگیز هیچ قسەیەك لە خۆوە ناكات... لە كتێبی (سنن ابي داود و الترمذي)دا[١] بە سەنەدێكی(صحیح) هاتووە لە فەرموودەیەكی (المقدام ى كوڕی معد یكرب)ەوە كەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (( ألا إني أوتيت الكتاب ومثله معه ألا يوشك رجل شبعان على أريكته، يقول: عليكم بهذا القرآن، فما وجدتم فيه من حلال فأحلوه وما وجدتم فيه من حرام فحرموه ))، (( ألا لا يحل لكم لحم الحمار الأهلي، ولا كل ذي ناب من السبع، ولا لقطة معاهد، و إن ما حرم رسول الله كما حرم الله ))، واتە: خوای گەورە قورئانی پێ بەخشیوم و هاوشێوەكەی لە گەڵدایە (واتە: سوننەت) خەریكە وای لێ دێت كەسێكی تێر لەسەر قەنەفەكەی دانیشتووە و دەڵێت: دەست بگرن بەم قورئانەوە (واتە: تەنها ئەم قورئانەمان بەسە) ئەوەی حەڵاڵ بوو تیایدا ئەوا بە حەڵاڵی بزانن و ئەوەی حەرام بوو تیایدا ئەوا بە حەرامی بزانن))، جا بزانن كەوا گۆشتی گوێدرێژی ماڵی حەڵاڵ نییە بۆتان، لە گەڵ هەموو دڕندەیەكی كەڵپەداردا و دۆزراوەی پەیمان پێدراوەكان، دڵنیابن ئەوەی كە پێغەمبەری خواﷺ حەرامی كردووە هەروەكو ئەوەیە چۆن خوای گەورە حەرامی كردبێت)).

لێرەدا پلە و پایەی سوننەتمان زانی و بۆمان دەركەوت كە تەنها قورئان بەس نییە.[٢]

كەوابوو خێراكەن... لە پاش ئەم بناغە گرنگە لە (ابن القيم)ی زۆر زانەوە فەرموون دەربارەی كێشەی سزا و خۆشییەكانی ناو گۆڕ باس بكەین ... من بە قەستی ئەم بنەما زانستییە زۆر گرنگەم باس كرد بۆ ئەوەی عەقڵ و دڵ لە یەك كاتدا پێكەوە بدوێنم...

پێت دەڵێم: برای خۆشەویستم ..خوشكی بەڕێزم... ژیانی ناو گۆڕ پێی دەڵێن: ژیانی بەرزەخ... هیچ كەسێك حەقیقەتەكەی نازانێت نە فریشتەیەكی نزیككراو و نە

---

١ـ أخرجه ابو داود،كتاب السنة، باب لزوم السنة (٤٦٠٤)، والترمذي، كتاب العلم، باب ما نهى عنه أن يقال عند حديث رسول اللهﷺ (٢٦٦٤)، وصححه الشيخ الألباني في ((المشكاة)) (١٦٣).

٢ـ بۆ زیاتر ئاشنا بوون لەم بابەتە بڕوانە كتێبی ((پلە و پایەی سوننەت لە ئیسلامدا و تەنها قورئان بەس نییە) لە دانانی زانای پایەدار محمد ناصر الدين الألباني و وەرگێرانی مامۆستای بەڕێز خلیل أحمد كەلاری.

پێغەمبەرێکی نێردراو... ئەمەیشە بنەمایەکی گرنگە و لەوپەڕی گرنگیدایە...
کەوابوو مانای بەرزەخ چییە؟

براکانم ... لە پاش مردن، ژیانی دووەم و ماڵێکی تر هەیە... وە ژیانیش لەم ماڵەدا بە تەواوەتی جیاوازە لە ژیانمان لە ماڵی دونیا...

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ (٩٧) وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ (٩٨) حَتَّىٰ إِذَا جَاءَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ (٩٩) لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّا إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ المؤمنون:٩٧ـ ١٠٠، واتە: بڵێ پەروەردگاری من! پەنا بە تۆ ئەگرم لەتێ کوتاندن و دنەدنەو وەسوەسەی شەیتانەکان کە بەرەو کاری خراپ بمبەن و نەهێڵن لە بەرامبەری خراپەوە چاکە بکەم.(٩٧)و خۆشم هەر بە تۆ ئەسپێرم ئەی پەروەردگار! کە ئەوان بێنە لامەوە بۆ تێکدانی کارەکانم.(٩٨) خوانەناسان هەر درێژە بە کاری خراپ و بێ بڕوایی خۆیان ئەدەن تا کاتێ مردن یەخەی یەکەبەیەکەیان دەگرێت و ئەحواڵی ئاخیرەتی بۆ ئاشکرا دەبێ، ئەوسا ئەڵێ: پەروەردگارم! بمگێڕەوە بۆ دونیا.(٩٩) بەشکو ئەو کارە چاکەی کاتی خۆی لە دەستم چووە بیکەم،نەخێر هەرگیز ئەو داخوازیە جێبەجێ نابێت ئەوەیش هەر قسەیە و — ئەو بە ناچاری — دەیکات،تا ڕۆژی زیندوو دەکرێنەوە لەمپەرێکی زۆر گەورەیان لە پێشدایە و ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ دونیا واتە: هەرگیز ناگەڕێنەوە و هەر لە سزاشدا دەبن(١٠٠))).

ابن القیم دەڵێت [١]: ((خوای گەورە سێ ماڵی دروست کردووە ئەوانیش: ماڵی دونیا و ماڵی بەرزەخ و ماڵی نیشتگە(قرار) بەهەشت یان دۆزەخ))... ماڵی دونیا هەموو دەزانین چییە... ئەی لە پاش دونیا چی دێت؟ هەرکە مرۆڤ دەمرێت و لە گۆڕەکەیدا دەنێژرێت... ئەوا دەگوێزرێتەوە بۆ ماڵی دووەم کە ئەویش ماڵی بەرزەخە ﴿لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّا إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ

١ـ كتاب ((الروح)) (ص ٦٣، ٦٤)، وانظر: ((العقيدة الطحاوية)) (ص ٣٩٠).

﴿ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴾ المؤمنون: ١٠٠، واتە تا ڕۆژی قیامەت... مالّی سێیەم: مالّی نیشتگە (دار القرار) یان بەهەشت دەبێت یان دۆزەخ (داوا لە خوا دەکەم کە من و ئێوە بگێڕێ لە ئەهلی بەهەشت)) من و ئێوە بپارێزێ و دوورمان بکاتەوە لە دۆزەخ).

ئاگاداری ئەم بنەمایە بە... چونکە ئەگەر تۆ لێی تێبگەیت ئەوا هەموو دژواری و کێشەیەك کە دەتەوێت پرسیاری لێ بکەیت نامێنێ.

ابن القیم دەڵێت: ((خوای گەورە ئەحکامەکانی لە مالّی دونیادا بە سەر جەستەدا چەسپاندووە و روحەکان شوێنکەوتەی ئەون)) ئەم قسەیە زۆر بە نرخە و بە بەهایە... تۆ بە جەستە نوێژ دەکەیت و کاریگەری لەسەر روحت دەبێت... بە جەستە رۆژوو دەگریت و روح و دەروون پاك دەبێتەوە... بە جەستە (صەدەقە) دەدەیت و بە روح و دەروون پاك دەبێتەوە... فەرمووی: ((خوای گەورە ئەحکامەکانی مالّی بەرزەخی بە سەر روحەکاندا سەپاندووە و جەستەکان شوێنکەوتەی ئەون)) ئایا کێشە و گومان چارە کرا؟؟ تۆ پرسیارم لێ دەکەیت: چۆن سزا دەدرێت یان خۆشگوزران دەبێت کەسێك بمرێت بە خنکان، یان بمرێت بە سووتان؟ پێت دەڵێم: خوای گەورە لە ژیانی بەرزەخدا ئەحکامەکانی چەسپاندووە بە سەر روحەکاندا... ئایا روح چییە؟؟ ئایا وەکو ئاسن رەقە؟یان وەکو ئاو شلە؟ یان وەکو دوکەڵ گازە؟ ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾ الإسراء: ٨٥، واتە: وە لە بابەت (ڕۆح)ـەوە لێت دەپرسن و دەڵێن: باشە ئەو ڕۆحەی کە هۆی ژین و زیندوێتی ئادەمیزادە چییە؟ ئایا شتێکی کۆنە، تازەیە، هەقیقەتی هەیە؟! پێیان بڵێ: ڕۆح منیش هیچی لێ نازانم چونکە لە فەرمانە نهێنییەکانی پەروەردگارمە بە دەسەڵاتی خۆی بە دیهێناوە و مرۆڤ و گیانلەبەرانی پێ دەجووڵێ و دەژی ئەو هەر خۆی لێی بە ئاگایە، ئێوە بە تایبەتی لە بابەت ڕۆحەوە بەشێکی کەم زانیاریتان پێ دراوە کەوابوو دەم لە هەموو شتێك مەکوتن و بێ چەند و چون خۆ بە دەسەوە بدەن زۆر باشترە ئەمەیش ئەوە ناگەیەنێت کە مرۆڤ دەبێ دەرگای هەموو هەوڵ و تێکۆشانێك لە خۆی دابخات، بەڵکو تەنها ئەوە دەگەیەنێت کە: بۆ عەقڵ و ژیری مرۆڤ سنوورێك دانراوە لەوە بەو

لاوە ڕێ دەرناکات کەوابوو بێ دەنگ بوون لە(ڕۆح) خێر و قازانجە بۆی)).

بۆیە کەس نازانێت روح چییە کەس نازانێت روحی مرۆڤ لە چی پێك هاتووەو چۆنەو تاکو ئێستا هەرچەندە زانستی ئەمڕۆ لەسەردەمی ئەتۆمدا گەیشتووەتە پلەیەکی زۆر پێشکەوتوو کەچی تاکو ئێستا نازانێت روح چییەو لەچی دروست بووەو چۆنە؟

کەوابوو روح لە خۆشگوزرانیدا دەبێت و سزا دەدرێت وە جەستەیش شوێن کەوتەی روح دەبێت لە خۆشگوزرانی و سزای سەختدا... کەواتە هەرکەسی بە سووتان مرد یان بە خنکان مرد... یان بە تەزووی کارەبا... یاخود کەسێ لە دەریاکاندا بووە خۆراکی ماسییەکان ئەوا پشکی خۆی دەست دەکەوێت لە کامەرانی یان سزای بەرزەخ هەرگیز حوکم مەدە بە عەقڵەکەت بە سەر ئەو چاڵە تەسکەدا کە دەیبینی و بڵێیت: من هەرگیز چاڵێکم نەبینیوە فراوان ببێتەوە یان تەسك ببێتەوە...

براکانم... فەرموو بنەمای چوارەم وەربگرە کە ئەویش لەو پەڕی گرنگیدایە... ابن القیم دەڵێت[١]: ((نهێنی مەسەلەی روناکی و ئاگری ناو گۆڕ و فراوان بوون و تەنگی گۆڕ بەو شێوە ناسراوەی لای خەڵکی نییە لە جیهانی دونیادا)) جاری وا هەیە لە بیابانێکی فراوان، یان کۆشکێکی گەورە، کە بە شکۆدارترین کەل و پەل ئامادە کراوە... لە گەڵ ئەوەیشدا هەست دەکەیت وا خەریکە دەخنکێیت... جێگاکە خەریکە بە سەرتەوە تەنگ دەبێت.. دەڵێی روحت یان دەروونت خەریکە لە کونی دەرزییەکەوە دەردەچێت... ئەمە لەم دونیادا... ئەوەی لە جیهانی بەرزەخدا روو دەدات سەیرترە... روناکی ناو گۆڕ جیاوازە لە روناکی دونیا وە ئاگری ناو گۆڕ جیاوازە لە ئاگری دونیا وەفراوانی ناو گۆڕ جیاوازە لە فراوانی دونیا وە تەنگی ناو گۆڕ جیاوازە لە تەنگی دونیا وە نهێنی ئەم مەسەلەیە لەوەدایە کە روناکی و ئاگری ناو گۆڕ و فراوان و تەنگی ناو گۆڕ لەو شێوە زانراوە نییە کە خەڵکی لە جیهانی دونیادا دەیناسن...

---

١ ـ ((الروح)) (٧٢، ٧٣ بتصرف).

ابن القیم نمونەیەکی نایابی هێناوەتەوە و دەڵێت: دوو پیاو لەسەر جێگەیەك دەخەون لە یەك ژووردا و لە یەك کاتدا... کەسی یەکەم هەڵدەستی و شوێنەواری کامەرانی بە روویەوە دیارە و دادەنیشێت و رووی گەش بووتەوە و سنگی فراوان بووەو باسی خەوێکت بۆ دەکات لە جوانترین ئەو خەوانەی کە بینیویەتی بۆ نمونە دەڵێت: لە خەودا لە گەڵ پێغەمبەری خوادا بووم ﷺ یان دەڵێت:لە خەودا لە ناو بەهەشتدا بووم... فلان شت و فلان شتم بینی... شوێنەواری کامەرانی بە روویەوە دیارە بە هۆی ئەو خەوەوە کە لە چەند ساتێکدا بینیبووی... بەڵام ئەویتر هاوار دەکات و ئازار دەچێژێ، لە جێگەکەی بێزابووە، لە خەو هەڵدەستێ و بە روویەوە شوێنەواری سزا و ئازار دیارە بەڵکو رەنگە بە سەر لاشەیەوە... ئەو دەڵێت: کەوا لە خەوێکی ناخۆشدا بوو کەوا خەریکە پەراسوکانی بشکێنی و هەناسەکانی تەنگ کردبوو... ئەو هاواری دەکرد... بەڵام ناتوانێ دەنگی خۆی بگەیەنێتە هیچ کەسێك بۆ ئەوەی لەو خەوە ناخۆشە رزگاری بکات...

مەبەست لەم نمونەیە ئەوەیە: .....

کەسی یەکەم لە کامەرانیدا بوو... روحەکەی لە کامەرانیدا بوو بەڵکو رۆیشت بۆ بەهەشت کەچی هێشتا لە جێگاکەی خۆیدایە و نەجوڵاوەتەوە و نەگوێزراوەتەوە و هەستی بە ئازاری براکەی نەدەکرد کە بە تەنیشتییەوە لە ئەشکەنجەدا بوو وە بە هەمان شێوە براکەی هەستی بە کامەرانییەکەی ئەم نەدەکرد... ئەمە لەم دونیایەدا روودەدات، ئەی گومانت چۆنە بەوەی کە لە ژیانی بەرزەخدا روودەدات؟ وادەزانم من عەقڵتم دواند... بۆ ئەوەی بزانیت بە دڵنیاییەوە کەوا ئەم کارە عەقڵی هۆشمەندەکان نکۆڵی لی ناکەن لە سەرووی ئەو هەموو بەڵگانەی لە کتێبەکەی پەروەردگاری زەوی و ئاسمان و بەڵگەی فەرموودەکانی پێشەوای پێغەمبەران و گەورەی لە خواترس و پوختەکان ﷺ... سوێند بە خوا ئەگەر باسی ئەو بەڵگە عەقڵیانەم نەکردبایە و تەنها یەك ئایەت لە کتێبەکەی خوای گەورە و یەك فەرموودەی دروست (صحیح) لە فەرموودەکانی پێغەمبەری راستگۆم ﷺ بکردایە ئەوا پێویست (واجب) بوو لە سەرت کە ئەوە بڵێیت کە ئیماندارە پێشینە و

ڕاستگەکان دەڵێن:

﴿سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ﴾البقرة: ٢٨٥،واتە، ئەڵێن: وتەی خوامان بیست و گوێڕایەڵی فەرموودەکانی خواین، ساتۆش ئەی پەروەردگارمان! (هەرچی بفەرموی ئامادەین)، داوای لێ بوردنت لیێ ئەکەین،دەسا تۆیش لێمان خۆش ببە ئەی پەروەردگارمان! چاکیش دەزانین کە سەرەنجام گەڕانەوەشمان تەنها بۆ لای تۆیە)).

بەڵام بە قەستی ویستم هەموو عەقڵەکان و هەموو دڵەکان بدوێنم... داوا لە خوا دەکەم لەم ساتانەدا خوای گەورە عەقڵەکان و دڵەکان لە یەك کاتدا بجولێنێتەوە بە تەوبە و گەڕانەوە بۆ لای خۆی... بە ئەنجامدانی کاری چاکە بۆ ئەم چاڵە تەنگە... داوا لە خوا دەکەم بیکاتە جێگایەکی خۆش بۆ ئێمە و ئێوە... ئێمە و ئێوە لە سزای دوارۆژ دوور بکاتەوە و بمانپارێزی... هەر خۆی پشت و پەنامانە و بە تواناییە بە سەر هەموو شتێکدا...

دەڵێیت: ئایەتێکم لە قورئانەوە دەوێ؟

بەڵێ ... ئێستا لە قورئانەوە ئایەتێکی ڕوون و ئاشکرات بۆ دەڵێم ... کە زانایانی ئەهلی سوننە ڕێك کەوتوون لەسەر ئەوەی کەوا ئەم ئایەتە لەسەر سزای ناو گۆڕە... بەڵکو پێشەوای ئەم دونیایە و خاوەنی ڕاستترین کتێب لە پاش قورئان کە ئەویش ئیمامی بوخاری یە لە (صحیح)ەکەیدا و لە (کتاب الجنائز)[1] دەرگایەکی داڕێژاوە و دەڵێت: (باب ما جاء في عذاب القبر)[2] واتە: (دەرگای ئەو فەرموودانەی کە دەربارەی سزای ناو گۆڕ هاتوون) وە تەنها داڕێژانی ئەو دەرگایە (باب) ە بەسە بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگەی مەسەلەکەمان... بۆیە زانایان فەرموویانە: (فیقهی بوخاری لە داڕێژانی دەرگاکانیدایە)[3] بەمانای ئەوەی داڕێژانەکەی خۆی لە خۆیدا پڕ لە فیقهە... ئیمامی بوخاری ئەم ڕاستییەی جێگیر کردووە لەو داڕێژانە ڕەوانبێژە ...

---

١ـ رقم (٢٣)

٢ـ رقم (٨٦).

٣ـ ((فتح الباري)) (١ / ١٣، ٢٤٣).

باسی ئایەتەکان لە قورئانی پیرۆز و فەرموودە راستەکان لە فەرموودەی پێغەمبەرەوە ﷺ...

بیربکەرەوە لە گەڵ مندا لەو ئایەتەی خوای گەورە کە لە سورەتی (غافر)دا هاتووە دەربارەی بنەماڵە و کەس وکاری فیرعەون: ﴿ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ ۝٤٥ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۖ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ﴾ غافر: ٤٥- ٤٦، واتە: ئەو سزابەد و توندەش داروودەستەکەی فیرعەونی داگرت، واتە: لە دەریاکەدا نوقم کران (٤٥) لەسەر ئاگر رادەنوێنرێن بە بەیانی و نیوەڕۆ بە دواوە ئەمەش هەر لە گۆڕەوە تا قیامەت، ڕۆژێکیش قیامەت بەرپا دەبێت خوا بە فریشتەکان دەفەرموێ: ئال و شوێنکەوتوانی فیرعەون بخەنە ناو سەختترین سزاوە(٤٦))).

ئەم ئایەتە روون و ئاشکرایەی خوای گەورە باسی دوو سزای کردووە لە ئایەتەکەدا... سزای بەرزەخ و سزای دوارۆژ ﴿ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۖ ﴾ واتە: بەیانیان و ئێواران... ئەمە لە بەرزەخدا بە بەڵگەی وتەی خوای گەورە کە لە پاش ئەوە دێت لە هەمان ئایەتدا ﴿ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ﴾.

الحافظ لە (الفتح)دا دەڵێت[١]: ((ئیمامی قرطبي فەرموویەتی: رای جمهوری زانایان ئەوەیە کە ئەم نمایش دانە لە بەرزەخدا دەبێت... ئەمەیشە بەڵگەیە بۆ جێگیر بوونی سزای ناو گۆڕ، جگە لەو گوتوویەتی... باسی سزای هەردوو ماڵەکە (الدارین) لەم ئایەتەدا روونکردووەتەوە بەڵام بەڵگەی لەسەر ئەو کەسانەی کە نکۆڵی لە سزای ناو گۆڕ دەکەن بە رەهایی نەك لەسەر ئەوەی تایبەتە بە بێ باوەڕانەوە وە بەڵگەیشە لەسەر ئەوەی کەوا روحەکان دەمێنن لە پاش جیابوونەوەیان لە لاشەکەیان... ئەوەیشە گوتە و فەرموودەی ئەهلی سوننەیە)).

---

١- (٣ / ٢٧٦).

ئەمجار فەرموو ئەوە سوننەتە(صەڵات و سەلام لەسەر خاوەنی سوننەت) لە هەردوو کتێبی (الصحیح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەی (البراءی کوڕی عازب) ەوە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إذا أقعد المؤمن في قبره)) واتە: ئەگەر کەسی ئیماندار لە گۆڕەکەیدا دایاننیشاند)) چۆن دایدەنیشینن لە گۆڕەکەیدا ؟؟ من پێش ئێستا بە تۆم گوت: کە نهێنی مەسەلەی روناکی و ئاگری ناو گۆڕ و فراوانی و تەنگی ناو گۆڕ بەو شێوە ناسراوەی لای خەڵکی نییە لە جیهانی دونیادا وە ئەویشە بە زۆر مەزانە لە توانا و مەزنی خوای گەورە...

ئیمامی (بوخاری و مسلم)[2] ڕیوایەتیان کردووە لە فەرموودەیەکی (ابو هریره) وە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: _ ((كان رجل يسرف على نفسه، فلما حضرته الموت: قال لبنيه: إذا أنا مت فأحرقوني ثم اطحنوني ثم ذروني في الريح))، واتە: کابرایەك هەبوو لە ئەنجامدانی تاواندا زیادە ڕەوی کردبوو، کاتێ مەرگ لێی نزیك بووەوە بە کوڕەکانی گوت: ئەگەر من مردم ئەوا لاشەکەم بسوتێنن و پاشان ورد وردی بکەن و بمکەن بە بادا)).

لە ڕیوایەتێکی تردا کە لە(صحیح)دا هاتووە((فاذروا نصفي في البر ونصفي في البحر)) واتە: نیوەی خۆڵەمێشەکەم فرێدەنە وشکانی و نیوەکەی تری فرێدەنە دەریاوە)) بە ڕاستی وەسێتێکی نامۆیە فەرمووی: فوالله لئن قدر الله عليَّ ليعذبني عذابا ما عذبه أحداً من العالمين، فلما مات فُعِل به ذلك. فأمر اللـه الأرض، فقال: اجمعي ما فيك منه، ففعلت: فإذا هو رجل قائم)) فقال الله سبحانه: ((ما حملك على ما صنعت؟ فقال: يا رب خشيتك))وفي لفظٍ: ((مخافتك يا رب، وأنت أعلم))((فغفر اللـه له))، واتە: سوێند بە خوا ئەگەر خوا بتوانێت زیندووم بکاتەوە ئەوا سزایەکم دەدات کە هەرگیز هیچ کەسێکی بەو شێوە سزا نەدابێت، کاتێ کابرا مرد

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب الجنائز، باب في عذاب القبر (١٣٦٩) ومسلم، كتاب صفة القيامة والجنة والنار، باب عرض مقعد الميت من الجنة أو النار عليه، و إثبات عذاب القبر والتعوذ منه (٢٨٧١).

٢ـ أخرجه البخاري، كتاب أحاديث الأنبياء، باب(٥٤)، (٣٤٨١)، وكتاب التوحيد (٧٥٠٦)، ومسلم، كتاب التوبة، باب في سعة رحمة الله تعالى و أنها سبقت غضبه(٢٧٥٦)، وانظر: صحيح البخاري(٧٥٠٨)، ومسلم(٢٧٥٧).

ئامۆژگارییەکەیان جێ بە جێ کرد، جا خوای گەورە فەرمانی کردە زەوی: ئەوەی لە تۆدا هەیە کۆی بکەرەوە، ئەویش کردی و بە بێ دواکەوتن بووە کابرایەك و راست بووەوە، خوای گەورە پێی فەرموو: چی وای لێ کردی ئەو کارە بکەیت؟ ئەویش فەرمووی: ترسی تۆ ئەی پەروەدگارا)) لە گوتەیەکی تردا: واتە: ترسی تۆ ئەی پەروەردگارم و خۆتیش دەزانی)) ((خوای گەورە لێی خۆش بوو)).

بەڵکو لە ڕیوایەتێکی تردا کە لە (صحیح) دا هاتووە: ((فأمر اللـه البحر)) واتە: خوای گەورە فەرمانی کردە دەریا)) ئەمجار پێغەمبەری خواﷺ بە گوتەی(البحر) دەستی پێ کرد ((فجمع ما فیه وأمر البر فجمع ما فیه ثم قال: لم فعلت؟ قال: من خشیتك وأنت أعلم. فغفر له)) واتە: ئەویش ئەوەی تیادا بوو کۆی کردەوە و فەرمان کردە وشکانی ئەوەی تیادا بوو کۆی کردەوە ئەمجار پێ گوت: بۆ ئەو کارەت ئەنجام دا؟ ئەویش فەرمووی: لە ترسی تۆ تۆیش باش دەزانی، بۆیە خوای گەورە لێی خۆش بوو)).

ئایا هیچ شتێك بە زۆر دەزانی لە توانای خوای گەورە و لە مەزنی خوا و ویستی خوای گەورە... لە گەڵ مندا بگەڕێرەوە بۆ ئەو فەرموودەی لە پێش دا باسمان کرد ((إذا أقعد المؤمن في قبره، أتي ثم شهد أن لا اله إلا الله، و أن محمدا رسول الله فذلك قول الله تعالى: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأَخِرَةِ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴾ إبراهیم: ٢٧، واتە: ئەگەر کەسی ئیماندار لە گۆڕەکەیدا دایانیشاند دەهێنن و ئەمجار شایەتی دەدا کە هیچ خوایەك نییە شایەنی پەرستن بێت تەنها(الله) نەبێت و (محمد)یش نێردراوی ئەوە، ئەوەیشە مانای ئەو ئایەتەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأَخِرَةِ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴾، واتە: جا ئەوانە کە باوەڕیان بە خوا و بە گشت بڕیارەکانی خوا هێناوە،بەهۆی ئەم وشە جێگر و نەگۆڕاوەی(لا اله الا الله)، خوا پێگەیان قایم و سابت ئەکا لە ژیانی ئەم دونیا و لە ژیانی ئەو دونیا و ستەمکارانیش گومرا و سەر

لێشێواو دەکات خوا بیەوێ هەر شتێ بکات زۆر بە ئاسانی دەیکات حەز بکا کێ رینموویی بکا و کێیش گومڕا و سەر لێشێواو بکا ئەمانە هەموو لە دەسەڵاتی ئەودان)).

لە ڕیوایەتی (مسلم)دا هاتووە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((نزلت في عذاب القبر، فيقال له: من ربك؟ فيقول: ربي الله، ونبيي محمد فذلك قوله: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴾ إبراهيم: ٢٧، واتە: لەسەر سزای ناو گۆڕ دابەزیوە، پێی دەڵێن: کێ پەروەردگاری تۆیە؟ ئەویش دەڵێت: پەروەردگاری من(الله)یەوە پێغەمبەرەکەم(محمد)ەﷺ ئەوەیشە مانای ئەو ئایەتەی خوای گەورەیە کە دەفەرموێت: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴾.

چەند وشەیەکی ڕوون و ئاشکرایە، لەو پەڕی ڕوونیدایە لە ڕاستگۆی باوەڕ پێکراوەﷺ کە هەرگیز لە خۆ وە قسە ناکات...

لە پێشدا باسی فەرموودەیەکمان کرد لە(عثمان)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((إن القبر أول منازل الآخرة))، واتە: گۆڕ یەکەم ماڵە لە ماڵەکانی دوارۆژ)).

لە هەردوو (صحيح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (ابن عباس)ەوە دەڵێت: ((مر النبيﷺ بقبرين ثم قال: ((إنهما ليعذبان وما يعذبان في كبير، أما أحدهما فكان لا يستتر من البول، وأما الأخر فكان يمشي بالنميمة)) واتە: پێغەمبەری خواربە تەنیشت دوو گۆڕەوە تێپەڕی ئەمجار فەرمووی: ئێستا ئەم دوو گۆڕە سزا دەدرێن، لەسەر شتێکی گەورەش سزا نادرێن – مەبەستی ئەوەیە کە وازلێهێنانی زۆر گەورە نییە ئەگینا بەڵێ ئەویش گەورەیە وەکو تاوان – پاشان فەرمووی: جا یەکێکیان

---

١- أخرجه البخاري، كتاب الوضوء، باب ما جاء في غسل البول (٢١٨)، وانظر طرفيه هناك. ومسلم، كتاب الطهارة، باب الدليل على نجاسة البول ووجوب الاستبراء منه (٢٩٢).

خۆی لە میز پاك نەدەکردەوە و ئەویتریان لە کۆششکردندا بوو بۆ قسە هێنان و بردن)) .

لە گوتەیەکی تردا هاتووە ((لا یتنزه من بوله))واتە: خۆی لە میز پاك نەدەکردەوە)).

کارێکی زۆر سووك و ئاسانە کە مرۆڤ خۆی لێ دوور بکاتەوە تاوەکو نەبێتە هۆیەك لە هۆکارەکانی سزای ناو گۆڕ... ئەگینا پێغەمبەری خواﷺ لە ترسناکی قسەهاوردن و بردن (نمیمە) کەم ناکاتەوە و لە ترسناکی خۆنەشاردنەوە و خۆپاك رانەگرتن لەمیز... نەخێر ئەوە مەبەستەکەی نییە بەڵکو سووك و ئاسانە بۆ ئێمە کە واز لە قسەهاوردن و بردن (نمیمە) بهێنین و یان خۆمان بشارینەوە لە کاتی میز کردندا و خۆمان پاك بکەینەوە لە میزکردن... لە پاشان دەگەڕێمەوە بۆ روونکردنەوەی مانای ئەو وشانەی پێغەمبەری خواﷺ ـ انشاء الله ـ لە کاتی باس کردنی هۆکارەکانی سزای ناو گۆڕ... بەڵام ئەم ریوایەتەم بۆیە هێنایەوە چونکە بەڵگەیەکی زۆر روونە لەسەر سزای ناو گۆڕ . (البخاری و مسلم)[1] ریوایەتیان کردووە لە فەرموودەیەکی (ابو هریرە) ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ زۆر جار ئەم دوعایەی دووبارە دەکردەوە ((اللهم إني أعوذ بك من عذاب القبر)) واتە: پەروەردگارا... من پەنا دەگرم بە تۆ لە سزای ناو گۆڕ)).

هەروەها ئیمامی مسلم لە(صحیح)ەکەیدا[2] لە فەرموودەیەکی (زید ی کوڕی ثابت)ەوە ریوایەت کردووە دەڵێت: (بینما النبي في حائط لبني النجار على بغلة له ونحن معه إذ حادت به، فكادت تلقيه،( أي: كادت بغلة رسول الله أن تلقيه على الأرض حين نفرت به فجأة) يقول زيد: وإذا أقبر ستة، أو خمسة،أو أربعة، فقال: ((من يعرف أصحاب هذه الأَقْبُر؟)) قال رجل: أنا أعرفها يا رسول الله! ، قال: ((فمتى مات هؤلاء؟)) قال الرجل:ماتوا في الإشراك (أي: في الشرك قبل الإسلام)، فقال عليه

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب الجنائز، باب التعوذ من عذاب القبر (١٣٧٧)، ومسلم كتاب المساجد، باب ما يستعاذ منه في الصلاة (٥٨٨).

٢ـ أخرجه مسلم، كتاب صفة القيامة والجنة والنار، باب عرض مقعد الميت من الجنة أو النار عليه و إثبات عذاب القبر والتعوذ منه (٢٨٦٧).

الصلاة والسلام: ((إن هذه الأمة تُبْتَلَى في قبورها، فلولا أن لا تدافنوا لدعوت اللــه أن يُسْمِعَكُم مـن عذاب القبر الذي أسمع))، واتە: لە کاتێکدا پێغەمبـەرخواﷺ لـە نزیکـی باخچەیەکی بەنی نەجار بوو لەسەر وڵاخەکەی، ئێمـەش لـە گەڵیـدا بـووین لـە ناکـاو لێی ترازا و خەریك بوو فڕێی بداتە خوارەوە (واتە: خەریك بوو وڵاخەکە پێغەمبـەری خواﷺ فڕێی بداتە سەر زەوییەکە کاتێ لە ناکاودا ترسا) زید دەڵێت: لەوێدا چەند گۆڕێك هەبوو شەش یان پێنج یان چوار بـوو، فـەرمووی: کـێ خـاوەنی ئـەم گۆڕانـە دەناسـێت؟ کابرایـەك فـەرمووی: مـن دەیناسـم ئـەی پێغەمبـەری خـواﷺ ئـەویش فەرموویی: کەواتە ئەوانە کەی مـردوون؟ کـابرا فـەرمووی: لـە کاتێکـدا مـردوون کـە هاوەڵیان بۆ خوا دادەنا (واتـە لـە سـەردەمی هاوەڵدانانـدا و پـێش هـاتنی ئیـسلام) پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئـەم ئوممەتـە لـە گۆڕەکەیدا توشـی بـەڵا دەبـن وە ئەگـەر ئێـوە مردووتـان نەناشـتبایە ئـەوا داوام لـە خـوا دەکـرد، کـە دەنگـی سـزای گۆڕەکانتان ببیستایە لەوەی کە من دەیبیسیم)).

بەڵکو سەرسام دەبین کاتێ بزانین کـەوا هەڵبـژێردراوی خـواﷺ هـاوەڵانی فێـری ئەو دوعا ترسناکە دەکرد (کە ئێـستا باسـی دەکـەم) هـەروەکو چـۆن سـورەتەکانی قورئانی فێر دەکردن...

تاکو ئەو رادەیە؟ بەڵێ... تکـام وایـە کـەوا ئێمـەیش ئـەو فەرموودەیـە لـە بـەر بکەین کە (ئیمامی مسلم) ریوایەتی کردووە لە (صحیح)[1] دکەیدا لـە فەرموودەیـەکی (ابن عباس)ەوە ((أن رسول اللهﷺ كان يعلمهم هـذا الـدعاء كمـا يعلمهـم الـسورة مـن القرآن يقول: ((قولوا: اللهم إنا نعوذ بك من عـذاب جهـنم وأعـوذ بـك مـن عـذاب القـبر وأعوذ بك مـن فتنـة المحيـا والممـات وأعـوذ بـك مـن فتنـة المـسيح الـدجال))، واتـە: پێغەمبـەری خـواﷺ ئـەم دوعایـەی فێـر دەکـردن هـەروەکو چـۆن سـورەتێکی لـە قورئانەوە فێر دەکردن و دەیفەرموو: ((بڵێن: خودایە ئێمە پەنا دەگـرین بـە تـۆ لـە سزای دۆزەخ وە پەنا دەگرم بە تۆ لە سزای ناو گۆڕ و پەنا دەگرم بە تۆ لە فیتنەی ژیان و مردن و پەنات پێ دەگرم لە (المسیح الدجال) .لـە پاشـان بـە درێـژی باسـی

١ـ أخرجه مسلم، كتاب المساجد، باب ما يستعاذ منه في الصلاة (٥٩٠).

دەکەم ـ انشاء اللە ـ.

ئێستایش فەرموو بۆ وەرگرتنی فەرموودەیەکی روون و ئاشکرا لەسەر سزای ناو گۆڕ کە ئەویش فەرمودەیەکی کۆڵەکە و پشت پێبەستراوە لەم بابەتەدا... (ئیمامی أحمد) ریوایەتی کردووە لە(مسند)ەکەیدا و (أبو داود) لە(سنن)ەکەیدا و (النسائی) لە(سنن)ەکەیدا و (الحاکم) لە (مستدرك)ەکەیدا و جگە لەوان[1] لە فەرموودەی (براء ی کوڕی عازب)ەوە دەڵێت: ((خرجنا مع رسول الله ﷺ في جنازة رجل من الأنصار فانتهينا إلى القبر ولما يلحد، فجلس النبي على شفير القبر وجلسنا حوله،كأنما على رؤوسنا الطير))، واتە: لە گەڵ پێغەمبەری خواداﷺ دەرچووین لە شوێن تەرمی (جەنازەی) کابرایەکی ئەنصاری جا کە گەیشتینە گۆڕەکە هێشتا نەنێژرابوو، ئەمجار پێغەمبەری خواﷺ دانیشت و ئێمەیش بە دەوریدا دانیشتین،کو ئەوەی کە باڵندەیەك بە سەر سەرمانەوە نیشتبێتەوە))(بێ دەنگی و خامۆشی و شکۆمەندی و رێزگرتن بە هۆی مردنەوە) قال: وفي يده عود ينكت به في الأرض – أي: يضرب به في الأرض – فرفع النبي رأسه فقال: ((استعيذوا بالله من عذاب القبر)) مرتين أو ثلاثا ثم قال: ((اللهم إني أعوذ بك من عذاب القبر ثلاثا)) ثم قال: ((إن العبد المؤمن إذا كان في انقطاع من الدنيا وإقبال من الآخرة نزل إليه ملائكة من السماء بيض الوجوه كأن وجوههم الشمس))، واتە: پێغەمبەری خواﷺ دارێکی بە دەستەوە بوو لە زەوییەکەی دەدا پاشان سەری بەرز کردەوەو فەرمووی: پەنا بگرن بە خوا لە سزای ناو گۆڕ، دووجار یاخود سێ جار ئەو رستەیەی دوو بارە کردەوە ئەمجار فەرمووی: خودایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە سزای ناو گۆڕ (سێ جار دووبارەی کردەوە) ئەمجار فەرمووی: دڵنیابن کەوا بەندەی ئیماندار ئەگەر کاتی ئەوەی هات لە دونیا دەرچێت و روو لە دوا رۆژ بکات ئەوا لە ئاسمانەوە چەند

---

١ ـ أخرجه ابو داود،كتاب السنن، باب المساءلة في القبر و عذاب القبر (٤٧٥٣)، والنسائي كتاب الجنائز باب عذاب القبر (٢٠٥٨) مختصراً، وابن ماجه كتاب الزهد، باب ذكر الموت والبلى (٤٢٦٩) مختصراً، والترمذي كتاب الجنائز،باب ما جاء في عذاب القبر (١٠٧١) والحاكم (١ / ٣٧–٤٠) وصححه على شرط الشيخين و أقره الذهبي، وأحمد (٤ /٢٩٥،٢٨٨،٢٨٧، ٢٩٦)وصححه الشيخ الألباني في((صحيح الجامع))(١٦٧٦)، و((أحكام الجنائز)) (١٩٨، ٢٠٢).

فریشتەیەکی روو سپی بۆ دادەبەزن روویان وەکو رۆژ وایە))

ئەی خودایە بمانگێڕە لەو لەخواترس و پوختانەی کە فریشتە بە سەریاندا دادەبەزێ بە مەبەستی جێگیر کردنیان ئەی پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکان ((معهم كفن من أكفان الجنة، وحنوط من حنوط الجنة، حتى يجلسوا منه مد البصر، ثم يجيء ملك الموت حتى يجلس عند رأسه فيقول: يا أيتها النفس الطيبة اُخرجي إلى مغفرة من الله ورضوان))، واتە: ئەو فریشتانە کفنیان پێیە کە لە بەهەشتەوە هێناویانە و بۆنی خۆشیان پێە کە لە بەهەشتەوە هێناویانە تاکو لای دادەنیشن بە قەد ئەوەی چاو بڕ دەکات، ئەمجار فریشتەی گیان کێشان دێت بۆ لای و تا لای سەری دادەنیشێت و دەڵێت: ئەی نەفسە پاکەکە دەرچۆ بۆ لێبوردن و ڕەزامەندی خوای گەورە)).

وە لە ڕیوایەتێکی تردا کە ئیمامی احمد[1] لە (ابو هریرە)وە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كانت في الجسد الطيب اخرجي حميدة، و أبشري بروح و ريحان و رب غير غضبان)) واتە: ئەی ئەو نەفسەی کە لە جەستەیەکی پاکدا بوویت بە سوپاسگوزارییەوە دەرچۆ، مژدە بۆ تۆ بە بۆن و بەرامی خۆشی بەهەشت و خوایەك کە لێت پەست نییە)).

ئەی خودایە...! ! پەروەرگارا هەموومان بگێڕە لەوانەی کە ئەم بانگە شیرینەیان لێ دەکرێت.

((قال ﷺ: ((فتخرج تسيل كما تسيل القطرة من في السِّقَاء))، واتە: جا نەفسەکەی دەردەچێت هەروەکو ئەوەی کە دڵۆپە ئاوێك لە دەمی شەربەیەکەوە بە سووك و ئاسنی دێتە خوارەوە)) ((فيأخذها، فإذا أخذها لم يدعوها في يده طرفة عين حتى يأخذوها، فيجعلوها في ذلك الكفن، وفي ذلك الحنوط، ويخرج منها كأطيب نفحة مسك وجدت على وجه الأرض))، واتە: ئەمجار دەیبات، کاتێ بردی ئەوا دەیکەنە نێو ئەو کفن و بۆنە خۆشەوە کە بۆی ئامادە کراوە وە بۆنێکی خۆشی لێوە دەردەچێت وەکو خۆشترین بۆنی میسك کە لەسەر ئەم زەوییەدا بینراوە)).

---

١ـ أحمد في ((المسند)) (٦ / ١٣٩، ١٤٠).

کەسی وامان تیادایە بە لوتی خۆی بۆنی کردووە و بە چاوەکانی بینیوەیەتی وە بە گوێی خۆی بیستیویەتی شتی زۆر سەیر... کاتێك کە کەسێکی چاکەکار لە ئەهلی چاکسازی کۆچی دوایی کردووە و بۆنێکی زۆر خۆش و بەرێزیان لێ بیستووە کە ئەو جێگایەی هەموو پڕ کردووەتەوە.

((قال: ((فيصعدون بها فلا يمرون على ملأ من الملائكة إلا قالوا: ما هذا الروح الطيب؟ فيقولون: فلان ابن فلان، بأحسن أسمائه التي كانوا يسمونه بها في الدنيا، حتى ينتهوا بها إلى السماء الدنيا، فيستفتحون له، فيفتح لهم، فيشيعه من كل سماء مقربوها إلى السماء التي تليها، حتى ينتهي إلى السماء السابعة،فيقول الله عز وجل: اكتبوا كتاب عبدي في عليين وأعيدوه إلى الأرض، فإني منها خلقتهم، وفيها أعيدهم، ومنها أخرجهم تارة أخرى، فتعاد روحه في جسده، فيأتيه ملكان، فيجلسانه فيقولان له: من ربك؟ فيقول: ربي الله، فيقولان له: ما دينك؟ فيقول ديني الإسلام، فيقولان له: ما هذا الرجل الذي بعث فيكم؟ فيقول هو رسول الله))، واتە: ئەمجار بەرزی دەکەنەوە وە بە لای هیچ کۆمەڵێکی فریشتەدا تێناپەڕن ئیللا دەڵێن: ئەم روحە پاکە کێیە؟ ئەوانیش دەڵێن: ئەمە فلان ی کوڕی فلانە، بە جوانترین و خۆشترین ئەو ناوەی کە لە دونیادا بانگیان دەکرد تاکو دەگەنە ئاسمانی دونیا ئەمجار داوای ئەوە دەکەن کە دەرگایان بۆ بکرێتەوە و پاشان دەرگایان بۆ دەکرێتەوە، جا لە هەر ئاسمانێك نزیکەکانیان لە خوداوە شوێنی دەکەون تاوەکو دەگەنە ئاسمانەکەی تر، تاکو دەگەنە ئاسمانی حەوتەم، ئەمجار خوای گەورە دەفەرموێت: ناو و نوسراوی بەندەکەم لە (عليين)دا بنووسن و بیگەڕێننەوە بۆ زەوی چونکە من لە زەوییەوە دروستیانم کردووە و هەر بۆ ئەوێیش دەیانگێڕمەوە و لەوێیشەوە جارێکی تر دەریاندەهێنم، ئەمجار روحەکەی دەگەڕێننەوە بۆ لای جەستەکەی، دوو فریشتە دێن بۆ لای و دایدەنیشێنن پێی دەڵێن: پەروەردگاری تۆ کێیە؟ ئەویش دوڵێت: پەروەردگاری من (الله)یە، ئەوانیش پێی دەڵێن: ئایا دینەکەت چی دینێکە؟ ئەویش دەڵێت: دینی من ئیسلامە، ئەوانیش پێی دەڵێن: ئەو پیاوە کە لە ناوتاندا رەوانە کرا کێیە؟ ئەویش دەڵێت: ئەوە پێغەمبەری خودایە ﷺ)).

((چونکه ئەو لەم دونیایە جگە لە دینی ئیسلام لەسەر هیچ دینێکی تر نەژیاوە؟ لەسەر جگە لە یەکتاپەرستی و ئیمان نەژیاوە؟ نە مردووە تەنها لەسەر ئەو نیعمەتە نەبێ؟ ویستی خوای گەورە وا بووە ئەوەی لەسەر هەر شتێك بژێت ئەوا هەر لەسەر ئەوە دەمرێت وە ئەوەی لەسەر هەر شتێك بمرێت ئەوا لەسەر ئەوە زیندوو دەکرێتەوە)).

((فيقولان له: وما علمك؟ فيقول: قرأت كتاب الله فأمنت به وصدقت، فينادي مناد من السماء: أن صدق عبدي فأفرشوه من الجنة، وألبسوه من الجنة، وافتحوا له باباً إلى الجنة، فيأتيه من روحها وطيبها، ويأتيه رجل حسن الوجه حسن الثياب، طيب الريح، فيقول: أبشر بالذي يسرك، هذا يومك الذي كنت توعد، فيقول له: من أنت؟ فوجهك الوجه الذي يجيء بالخير؟ فيقول: أنا عملك الصالح))، واتە: ئەمجار پێی دەڵێن: ئەی زانستەکەت چییە؟ ئەویش دەڵێت: کتێبەکەی خوای گەورەم خوێندەوە و باوەڕم پێ هێناو بە راستم زانیوە، بۆیە بانگکارێك لە ئاسمانەوە بانگ دەکات و دەڵێت: کەوا بەندەکەم راستی فەرموو ئەوا لە بەهەشتەوە جێگای بۆ راخەن وە لە پۆشاکی بەهەشتی لە بەرکەن وە لە بەهەشتەوە دەرگایەکی بۆ بکەنەوە، جا بۆیە لە بۆن و بەرامی بەهەشتی پێ دەگات، ئەمجار کابرایەکی روو خۆشی جلوبەرگ پاك و جوان و بۆن خۆش دێت بۆ لای و پێی دەڵێت: موژدە بێ لێت بەو شتەی کە دڵخۆشت دەکات، ئەمە ئەو رۆژەیە کە پەیمانت پێ درا بوو ئەویش دەڵێت: تۆ کێیت؟ چونکە رووت ئەو رووەیە کە چاکەی لە گەڵ خۆیدا هێنا بێت؟ ئەویش دەڵێت: من کردەوە چاکەکانتم)).

من یەکتاپەرستییەکەتم، نوێژەکەتم، رۆژووەکەتم، زەکاتەکەم، حەجەکەتم، چاکەکەتم، شەونوێژییەکەتم، فەرمان کردنەکەتم بە چاکە، نەهی کردنەکەتم لە خراپە، صەدەقەکەتم، من باڵا پۆشێکەتم ئەی خوشکی موسڵمان و رێزدارم)).

((فيقول: رب أقم الساعة، حتى أرجع إلى أهلي ومالي، وإن العبد الكافر إذا كان في انقطاع من الدنيا، وإقبال من الآخرة، نزل إليه من السماء ملائكة سود الوجوه، معهم المسوح فيجلسون منه مد البصر ثم يجيء ملك الموت حتى يجلس عند

رأسه،فيقول: أيتها النفس الخبيثة اخرجي إلى سخط من الله وغضب، فتفرق في جسده فينتزعها كما ينتزع السفود من الصوف المبلول، فيأخذها، فإذا أخذها لم يدعوها في يده طرفة عين حتى يجعلوها في تلك المسوح، ويخرج منها كأنتن ريح جيفة وجدت على وجه الأرض، فيصعدون بها فلا يمرون بها على ملأ من الملائكة إلاّ قالوا: ما هذه الروح الخبيثة؟! فيقولون: فلان ابن فلان بأقبح أسمائه التي كان يسمى بها في الدنيا حتى ينتهي بها الى السماء الدنيا، فيستفتح له، فلا يفتح له))، واته: پەروەردگارا! قیامەت هەڵسێنە تاكو بگەڕێمەوە ناو كەس و كار و ماڵەكەم، بەڵام بەندەی بێ باوەڕ ئەگەر كاتی ئەوەی هات لە دونیا دەرچێت و رووبكاتە دوارۆژی ئەوا لە ئاسمانەوە چەند فریشتەیەك دەموچاو رەش بۆ لای دادەبەزن كفنی ئاگرینیان پێیە، لە لایدا دادەنیشن بە قەد ئەوەی چاو بڕ دەكات ئەمجار فریشتەی گیان كێشان دێت بۆ لای و لە ژوور سەری دادەنیشێت و پێی دەڵێت: ئەی نەفسە پیسەكە دەرچۆ بۆ پەستی و توڕەیی خوای گەورە، ئەمجار ئەویش روحەكەی بە لاشەیدا بەش بەش دەبێت ئەوانیش رایدەكێشن هەروەكو چۆن (شیشی گۆشت برژاندن) بە ناو خوری تەڕدا رابكێشرێت، ئەمجار دەیبات، جا ئەگەر بردی ئەوا لە چاوتروكانێكدا بەری نادات تا دەیخەنە ناو ئەو كفنی ئاگرینەوە جا بۆنێكی لێوە دەردەچێت وەكو پیسترین و ناخۆشترین بۆن كە لەسەر زەویدا بینرابێت، پاشان بەرزی دەكەنەوە و بە لای هیچ كۆمەڵێكی فریشتەدا تێناپەڕن ئیللا دەڵێن: ئەم روحە پیسە كێیە؟ دەڵێن: فلانی كوڕی فلانە... بە ناخۆشترین ناوەكانی كە پێی بانگ دەكرا لە دونیادا، تا دەگەنە ئاسمانی دونیا، جا داوای ئەوە دەكەن دەرگایان بۆ بكرێتەوە كەچی دەرگایان بۆ ناكرێتەوە، ئەمجار پێغەمبەری خوا(ρ)ئەو ئایەتەی خوێندەوە كە دەفەرموێت: ﴿لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلْخِيَاطِ﴾ الأعراف: ٤٠، واتە: ئەو كەسانەش ئایەتەكانی ئێمەیان بە درۆ دانا، باوەڕیان پێ نەكردن و لە ئاستیان خۆیان بە گەورە گرت، هەرگیز دەروازەكانی ئاسمان بۆ رۆحیان و بۆ كار و كردەوەیان ناكرێتەوە و ناشچنە بەهەشتەوە، هەتا وشتر نەچێ بە كونی دەرزی درووماندا، واتە: خۆ هەرگیز ئەمە

دەست نادات كەواتە ئەوانيش دەست نادات بچنە بەهەشت))، ((فيقول الله عز وجل: اكتبوا كتابه في سجين في الأرض السفلى، فتطرح روحه طرحاً))، واتە: خواى گەورە دەفەرموێت: ناو و نوسراوەكەى لە (سجين)دا بنووسن و لە زەوى ژێرەوە ئەمجار روحەكەى بە فرێدان فرێى دەدەنە خوارەوە)) ئەمجار پێغەمبەرى خواﷺ ئەو ئايەتەى خوێندەوە، كە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ﴾ الحج : ٣١، واتە: هەركەسێك هاوەڵ و هاوبەش بۆ خوا دابنێت وەكو ئەوەيە لە ئاسمانەوە بەربێتەوە (بۆ قوڵايى زەوى) كتوپڕ هەر لە هەواوە مەل و پەلەوەر لە سەرى ئامادە بێت و بيفرێنێ و پارچە پارچەى بكات ياخود بايەكى بەهێز و قورس بيبا بۆ جێگايەكى دوور و چەپەك و ملى بشكێنێ، ئەوە نموونەى كەسێكە هاوەڵ بۆ خوا دابنێ چونكە لە ئاسۆى بەرزى باوەڕەوە ئەكەوێتە چاڵى هەرە خوارى تيا چوونەوە و جێگەى قايمى خۆى لە دەست داوە و پەلەوەر سەرى تێ ئەكەن)). ((قال: فتعاد روحه في جسده ويأتيه ملكان فيجلسانه فيقولان له: من ربك؟ فيقول: هاه.. هاه.. لا أدرى، فيقولان له: ما دينك؟ فيقول: هاه.. هاه.. لا أدرى، فيقولان له: ما هذا الرجل الذي بُعِثَ فيكم؟ فيقول: هاه.. هاه.. لا أدرى، فينادي منادٍ من السماء: أن كذب فأفرشوه من النار وافتحوا له بابا إلى النار فيأتيه من حرها وسمومها، ويضيق عليه قبره حتى تختلف فيه أضلاعه، ويأتيه رجل قبيح الوجه، قبيح الثياب، منتن الريح، فيقول: أبشر بالذي يسوءك، هذا يومك الذي كنت توعد فيقول: من أنت فوجهك الوجه يجئ بالشر؟ فيقول: أنا عملك الخبيث، فيقول: رب لا تقم الساعة))، واتە: فەرمووى: ئەمجار روحەكەى دەگێڕنەوە بۆ لاى جەستەكەى، ئەمجار دوو فريشتە دێن بۆ لاى و دايدەنيشێنن و پێى دەڵێن: پەروەردگارى تۆ كێيە؟ ئەويش دەڵێت: هاه ..هاه... نازانم، ئەوانيش دەڵێن: ئەى دينەكەت چ دينێكە؟ ئەويش دەڵێت: هاه... هاه... نازانم، ئەوانيش دەڵێن: ئەو پياوەى كە لە ناوتاندا رەوانە كرا كێ بوو؟ ئەويش دەڵێت: هاه... هاه... نازانم... ئەمجار بانگكەرێك لە ئاسمانەوە بانگ دەكات: كەوا درۆى كرد و لە ئاگر جێگايەكى بۆ رابخەن وە دەرگايەكى لە دۆزەخەوە بۆ

بکەنـەوە، جـا لـە گـەرمی ناخۆشـی دۆزەخـی بـۆ دێـت، گۆڕەکـەی لەسـەر تـەنگ دەبێتەوە و دێتە یەك تا پەراسۆکانی تێك دەچن و دەچـن بـە نـاو یەکدا، ئـەمجار کابرایـەکی ڕوو ناشـیرین دێـت بـۆ لای جلوبـەرگێکی پیـسی لـە بەردایـە و بـۆنێکی بۆگەنی لێ دێت، پێی دەڵێت: موژدە بێت بۆ ئەو شتەی کە دڵتـەنگت دەکـات ئەمـە ئەو ڕۆژەیە کە پەیمانت پێ دراوە، ئەویش دەڵێـت: تـۆ کێیـت؟ ڕووت بـە ئـەو ڕووە دەکات کە شەڕ و خراپەی لە گەڵ خۆیدا هێنابێـت؟ ئـەویش دەڵێـت: مـن کـردەوە خراپەکانی تۆم، ئەویش دەڵێت: پەروەردگارا قیامەت هەڵمەسێنە)) ... داوا لە خـوا دەکەم من و ئێوە بگێڕێ لە ئەهلی کامەرانی... هـەموومان ڕزگـار بکـات لـە سـزا و دۆزەخ و داپۆشراومان بکات بە پۆشاکە جوانەکـەی خـۆی لـە دونیـا و دوارۆژدا هـەر ئەو پشت و پەنامانە و بە توانایە بە سەر هەموو شتێکدا.

براکـەم ... کارەکـە زۆر تۆقێنـەر و ترسـناکە... کێشەکە زۆر ناشـیرین و ئێـسك قورسـە، بەسـە بـۆ مـرۆڤ تـەنها تەماشـایەکی نـاو گـۆڕ بکـات تەنانـەت بـا لـە نێـو زیندووەکانیشدا بێت بۆ ئەوەی دڵـەکان دەرچـێتە دەرەوە... سـوێند بـە خـوا هـیچ کەس لە ئێمە ناتوانێت کە تەنها یەك شەو لە نـاو گۆڕێکـدا لـە گۆڕسـتان بمێنێتـەوە کـە هێـشتا زینـدووە... ئـەی گومانـت چـۆنە ئەگـەر ڕوحەکـەی لـێ دەرچـووە و لـە لاشەکەی جیابووتەوە؟ گومانت چۆنە ئەگەر هەر یەکە لـەو خەڵکـە ببـینی کـە هـیچ شتێکی پێ نەماوە تەنها کردەوە چاکەکانیان نەبێت؟

دەڵێم: ڕەنگە خۆشەویستەکانم پرسیارم لێ بکەن ئایـا هۆکارەکـانی سـزای نـاو گۆڕ چییە؟ پرسیارێکی ترسناکە و لەو پەڕی گرنگیدایە... منیش وەڵامەکەم بـە ئـەم شێوەیەیە...

١: (النمیمە) قسەهێنان و بردن... ئایە(النمیمـە) چییە؟ گواستنەوەی قـسە لـە نێوان خەڵکیدا بە مەبەستی خراپەکاری ... چەندەها کەس بە و هۆیەوە توش بوون لـەژنان و پیـاوان... داوا لـە خـوا دەکـەم کـە ئێمـە و ئێـوە داپۆشـێت لـە دونیـا و دوارۆژدا. (نمـام) لـە ماڵێکـەوە دەڕوات بـۆ مـاڵێکی تـر... لـە نوسـینگەیەکەوە بـۆ نوسینگەیەکی تر... لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر بۆ ئەوەی قـسە بگوازێتـەوە!

ئایا نەتبیستووە کەوا فلان دەربارەی تۆ قسەی کردووە و فلان شت و فلان شتی گوت؟ ئەمجار گوێیەکان دەکرێنەوە بۆ ئەم وشە پیس و ترسناکە (بۆ قسەی دوو زمان) کە خۆشەویستان لە یەك جیادەکاتەوە و ماڵەکان و خێزانەکان تێك دەدات... جاری وا هەیە یەك وشەی دووزمان ڕەنگە ببێتە هۆی جیابوونەوەی پیاو لە ژنەکەی... لە نێوان برا و براکەیدا... ڕەنگە بە وشەیەکی ڕاست خێزانێك بەختەوەر بکەیت... ڕەنگە بە یەك وشەی (نمیمە) خێزانێك بە تەواوی بەد بەخت و بێ نەوا بکات.

ئەی موسڵمانان... تەنها وشەیەك بە کەم مەزانن – من قسە لە گەڵ هەموو ئەم ئوممەتەدا دەکەم... هەموو خاوەن پێنوسەکان دەدوێنم خاوەنی زمانەکان دەدوێنم... وشەیەکی ترسناکە، بە وشەیەك مرۆڤ ڕەزامەندی خوا بە دەست دەهێنێ... بە وشەیەك مرۆڤ پەستی خوا بە دەست دەهێنێ وە بە وشەیەك دەچێتە بەهەشتەوە وە بە وەشەیەك دەچێتە ئاگرەوە... بەڵکو بە تەنها وشەیەك ئافرەتێك بۆ پیاوێك حەڵاڵ دەبێت، بە تەنها وشەیەك لێی حەرام دەبێت ئەوە تەنها وشەیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ ق: ١٨، واتە: هەر وتەیەکی لە دەم دەردەچێت فریشتەی چاودێری ئامادە لە لایەتی دەینووسێ ئایا فریشتەکان هەموو قسەیەك دەنووسن؟ یا تەنها ئەو قسەیە دەنووسن کە پاداش و تۆڵەی هەیە؟ بەڵێ بە پێی ئەم ئایەتە هەموو وتە و قسەیەك ئەنووسن)).

بەڵکو پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ فەرموویەتی هەروەکو چۆن لە هەردوو کتێبی (صحیح)[١]دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (ابوهریرە)ەوە ((إن العبد ليتكلم بكلمة من رضوان الله لا يلقى لها بالاً يرفعه الله بها درجات، وإن العبد ليتكلم بالكلمة من سخط الله لا يلقى لها بالاً يهوى بها في جهنم))، واتە: بەندەی وا هەیە کە تەنها یەك وشەی لە ڕەزامەندی خوادا دەکات و گوێی پێ نادات کەچی خوای گەورە چەندان

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب الرقاق، باب حفظ اللسان (٦٤٧٨)، ومسلم كتاب الزهد والرقائق، باب التكلم بالكلمة يهوي بها في النار (٢٩٨٨) مختصراً.

پله بەرزی دەکاتەوە، بەندەی واش هەیە کە تەنها یەك وشە لە پەستی خوادا دەکات و گوێی پێ نادات کەچی خوای گەورە دەیهاوێژێتە ناو دۆزەخەوە))، کەوابوو وریای دووزمانی بە... هیچ شتێك پەیوەندی نێوان زانایان و بانگخوازانی تێك نەداوە تەنها ئەم جۆرە وشانە نەبێت... کەسی دووزمان لە زانایاکەوە دەڕوات بۆ لای زانایەکی تر وە لە بانگخوازێکەوە دەڕوات بۆ لای بانگخوازێکی تر وە لە نێوان برا و براکەیدا و لەنێوان پیاو و خێزانەکەیدا بە تەنها یەك وشە کە خۆشەویستییەکە تێك دەدات... ئەم ئاوە پاکە پیس دەکات...

بیر بکەرەوە لەم فەرموودەیە کە دڵەکان لە بن دەردەهێنێ کە ئیمامی أحمد لە (مسند)ەکەیدا و (ابو داود)و جگە لەوان ڕیوایەتیان کردووە بە سەنەدێکی (صحیح)[1] لە فەرموودەیەکی (ابن عمر)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((من قال في مؤمن ما ليس فيه، أسكنه الله ردغة الخبال حتى يخرج مما قال وليس بخارج))، واتە: هەرکەسێك دەربارەی ئیمانداریك شتێك بڵێت کە ئەو ڕەوشتەی تیادا نەبێت ئەوا خوای گەورە لە (ردغه الخبال) دا نیشتەجێی دەکات تاکو ئەوەی کە گوتوویەتی دەرنەچێت وە ئەوەیشە دەرناچێت)).

ئایا دەزانی (ردغة الخبال)چییە؟ ئەوە گوشراو و رینگاوەی ئەهلی ئاگرە...

براکەم ... لە خوا بترسە لە قسەکانتدا... چونکە بەردان و وازهێنانی زمان ئەوا دەبێتە هۆی بوختانی کوێرانە... بە بێ ڕوونکەرەوەیەك یان بەڵگەیەك ڕێگا خۆش دەکات بۆ هەموو کەسێك کە ئارەزووی لێ بێت هەرچی دەڵێت بە ئارەزووی خۆی بیڵێت... لە هەر کاتێکدا ئارەزووی لێ بێت پاشان بۆی دەردەچێت بە دڵنیایی و بە بێ ترسەوە... جاری وا هەیە ڕۆژ دەبێتەوە کۆمەڵێکی بێ وەی و بێ کێشە کەچی کاتێ ئێوارە دادێت دەبینی ناموسی ئەو کۆمەڵە برینداربووە و ناوبانگی خراپ بووە. هەموو تاکێك تاوانبار کراوە یان هەڕەشەی تاوانباری لێکراوە... ئەم

---

١ـ أخرجه أحمد في ((مسنده)) (٢ / ٧٠)، وأبو داود كتاب الأقضية باب فيمن أعان على خصومة من غير أن يعلم أمرها (٣٥٩٧)، والحاكم (٢ / ٣٢)، وصححه ووافقه الذهبي، والطبراني في ((المعجم الكبير)) (١٢ / ٣٨٨)، ((و الأوسط))(٦٤٩١)، وعبدالرزاق في ((المصنف)) (٢٠٩٠٥) والبيهقي في ((الشعب)) (٥ / ٣٠٤، ٣٠٥) و (٦ / ١٢١)، و ((الكبرى)) (٦ / ٨٢) و (٨ / ٣٣٢)، وصححه الشيخ الألباني في ((الإرواء)) (٧ / ٣٤٩)، و ((صحيح الجامع)) (٦١٩٦)، و ((صحيح الترغيب)) (١٨٠٩)، و ((الصحيحة)) (٤٣٧).

حاڵەتەی لە دڵەڕاوکێ و گومان و دوودڵی کە لە هیچ حاڵەتێك لە حاڵەتەکان وەری ناگرێت...

کەوابوو وریای (نمیمە) بن، چونکە ئەوە هۆیەکی گەورەیە لە هۆکارەکانی سزای ناو گۆڕ...

((إنهما ليعذبان وما يعذبان في كبير، أما أحدهما فكان يسعى بالنميمة)) واتە: ئێستا ئەم دوو گۆڕە سزا دەدرێن، لەسەر شتێکی گەورەش سزا نادرێن، جا یەکێکیان کۆششی دەکرد بۆ قسە هێنان و بردن)) سوێند بە خوا ئەگەر بیر لەم فەرموودەیە بکەینەوە بە جوانی ئەوا هەزار جار بیرت دەکردەوە لە پێش ئەوەی یەك جار قسە بکەیت وە پێش ئەوەی یەك جار بدوێی... تۆ ئەی خوشکەکەم زمانت بپارێزە و وریای (نمیمە) بە، چونکە (نمیمە) هۆیەکە لە هۆکارەکانی کەساسی زۆربەی پیاوان و ژنانی موسڵمانان، دڵنیابە کە وشەیەکی زۆر ترسناکە... داوا لە خوا دەکەم کەوا من و ئێوە بگێڕێ لە ڕاستگۆیان.

هۆکاری دووەم : خۆنەشاردنەوە لە کاتی میزکردن... دیمەنێکی ناشیرینە و هیچ شەرمێکی تیادا نییە کاتێ پیاوێك ببینی لە شوێنیکی گشتی دا ڕاوەستاوە و میز دەکات بە بێ ئەوەی خۆی داپۆشێت... تەماشای ئەم بەها ناسکە جێگیرە بکە لە سوننەتی پێغەمبەری خوداوەﷺ... بەڵام کوا داپۆشین؟ کوا شەرم؟ کوا پاك و خاوێنی؟

إذا لم تخش عاقبة الليالي ولم تستح فاصنع ما تشاء

فلا والله ما في العيش خير ولا الدنيا إذا ذهب الحياء

واتە: ئەگەر لە ئاکامی شەوان ناترسیت، شەرم ناکەیت ئەوا ئارەزووی چی دەکەیت بیکە، سوێند بەخوا ئەم ژیانە خەیری تیادا نیە، لەدونیایشدا(خەیر نییە)ئەگەر شەرم نەما و ڕۆیشت.

ئەم پیاوە لە ناو گۆڕدا سزا دەدرێت... چونکە خۆی نەدەپۆشا لە کاتی میز کردن... ئەندامێك لە ئەندامەکانی خۆی ئاشکرا کردووە لە کاتی میزکردندا... ئەی گومانت چییە کەسێك هەموو جەستەی ئاشکرا بکات؟ یان ئافرەتێك هەموو

جەستەی ئاشکرا بکات؟ داوا لە خوا دەکەم کەوا ئێمە و ئێوە داپۆشێت...

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((وأما الأخر فكان لا يستتر من البول))، واتە: ئەویتریان لە کاتی میزکردن خۆی نەدەشاردەوە)).

لە گوتەیەکی تردا ((لا يتنزه من بوله))، واتە: خۆی پاك نەدەکردەوە لە پاش میزکردن))... دڵنیا بن کە دینەکەمان دینی پاکی و خاوێنی و جوانییە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ﴾ البقرة: ٢٢٢، واتە: بە ڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش ئەوێ کە لە گوناه پەشیمان ئەبنەوە و خۆیان بە پاك و خاوێن ڕائەگرن)).

برای موسڵمانم:

با ڕواڵەتت پاك بێت... لە ناخیشدا پاك بیت... پاك ڕاگرتنی ناخ بەڵگەیە لەسەر پاکی ڕواڵەت... پاك ڕاگرتنی ڕواڵەت بەڵگەیە لەسەر پاکی ناخ... انشاء الله... چونکە ناخ و ڕواڵەت لای ئەهلی سوننە و جەماعە لە یەك جیانابنەوە... چونکە ئەگەر ڕواڵەت لە ناخ جیا ببێتەوە ئەوا کەسەکە دەبێتە کەسێکی دوو ڕوو.

هۆکاری سێیەم: لە ترسناکترین هۆکارەکانی سزای ناو گۆڕ. خواردنی حەرامە(پەروەردگارا...ئێمە و ئێوە بپارێزێ لە حەرام و ڕزقی حەڵاڵمان پێ ببەخشێت)) لە هەردوو کتێبی (صحيح)[1]دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (أبوهريره)ەوە ((أن رجلا مات فقال الناس: هنيئاً له الشهادة إنه في الجنة، فقال رسول الله: ((بل والذى نفسي بيده، إن الشَّمْلَة التي أصابها يوم خيبر من المغانم لم تصبها المقاسم،لتشتعل عليه ناراً))، واتە: کابرایەك مرد و خەڵکی فەرموویان: مۆژدە بۆ خۆی بۆ بە دەست هێنانی پلەی شەهادەت ئەو لە بەهەشتدایە، جا پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: بەڵکو سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ئەو کالایەکی برد لە ڕۆژی خەیبەردا لە دەستکەوتەکان پێش ئەوەی دابەش بکرێت وە ئەوەیشە بووەتە ئاگر و دەیسوتێنێ)).

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب المغازي، باب غزوة خيبر (٤٢٣٤)، ومسلم كتاب الإيمان، باب غلظ تحريم الغلول، و أنه لا يدخل الجنة الا المؤمنون (١١٥).

ئەی خودایە ! ! کاڵایەکی بردووە (بەرگێکی فراوانە بۆ خۆپێچانەوە و داپۆشین) لە پێش ئەوەی دەستکەوتەکان دابەش بکرێت... بەجگە لە مافی خۆی برد بووی... کەوا بوو خواردنی سامانی خەڵکی بە ناحەق و خواردنی حەرام لە ترسناکترین هۆکارەکانی سزای ناو گۆڕە... بۆیە وریای حەرام بە و خۆتی لێ بە دوور بگرە... لە(صحیح مسلم) [1]دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (أبو هریرە)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((أیها الناس! إن الله طیب لا یقبل إلا طیبا، و إن الله أمر المؤمنین بما أمر به المرسلین))، واتە: ئەی خەڵکینە خوای گەورە چاك و باشە بۆیە ئەوەی چاك و باش نەبێت وەری ناگرێت وە خوای گەورە فەرمانی کردووەتە ئیمانداران بەوەی فەرمانی کردووەتە پێغەمبەران)) خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ المؤمنون: ٥١، واتە: وتمان: ئەی پەیامبەران! هەر لە خۆراکی پاك و حەڵاڵ بخۆن و بەردەوام کاری چاك ئەنجام بدەن، واتە: پەیامبەرانمان گشت بەو جۆرە ڕێنمایی کردوون کەواتە ئوممەت و گەلەکەیشیان دەبێ هەروا ڕەفتار بکەن)) وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ﴾ البقرة: ١٧٢، واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! لەو نیعمەتە پێماندان و کردمانە ڕۆزیتان کامی پاکە ئەوە بخۆن)).

((ثم ذکر الرجل یطیل السفر، أشعث أغبر، یمد یدیه إلی السماء: یا رب یا رب ! ومطعمه حرام ومشربه حرام، وملبسه حرام، وغذي بالحرام فأنی یستجاب لذلك ؟)) ئەمجار باسی کابرایەکی کرد کە سەفەرەکەی درێژ دەکاتەوە و قژگڤ و تۆزاوی یە، دەستی بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان پەروەردگارا... پەروەردگارا .... لە کاتێکدا خواردنەکەی حەرامە و خواردنەوەکەیشی حەرامە و پۆشاکەکەی حەرامە و حەرامی دەرخوارد دراوە ئیتر چۆن وەڵام بدرێتەوە؟)).

---

١ـ أخرجه مسلم کتاب الزکاة، باب قبول الصدقة من الکسب الطیب و تربیتها (١٠١٥).

برا بەڕێزەکەم... سامانی خەڵکی بە ناحەق مەخۆ... بەرتیل مەخۆ... سامانی هەتیوان مەخۆ... خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا﴾ النساء: ١٠، واتە: ئەو کەسانەی کە بە ستەم و ناهەق ماڵ و سامانی منداڵی هەتیوو دەخۆن بێ سۆ تەنها ئاگر دەکەنە سك ورگیانەوە و بە زووییش دەخرێنە ناو ئاگرێکی زۆر گەرم و بەگڕی دۆزەخەوە)).

سوێند بە پەروەردگاری کەعبە ئەو هەموو سامانە دەبێتە میراتی و بۆ کەس و کارت بە جێی دەهێڵی... بەهۆیەوە خۆشگوزران دەبن و رادەبوێرن کەچی تۆ دەربارەی ئەو سامانە لەبەردەستی خوای پەروەردگاردا پرسیارت لێ دەکرێت... لە کوێ بە دەستت هێنا؟ لە کوێ خەرجت کرد؟.

هۆکاری چوارەم : لە هۆکارەکانی سزای ناو گۆڕ... درۆ کردن، بەد رەوشتی و داوێن پیسی، سوو خواردن (ربا) هەروەکو چۆن لە فەرموودەی (سمرة ی کوڕی جندب الطویل)دا هاتووە لە (صحیح البخاری)[١]دا.

بەڵام درۆ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ التوبة: ١١٩، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ! لە نافەرمانی خوا پارێز بکەن و هەمیشە لە گەڵ دەستەی ڕاستان بن)).

لە هەردوو کتێبی(صحیح)[٢] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (عبدالله ی کوڕی مسعود)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((علیکم بالصدق، فإن الصدق یهدي إلی البر، وإن البر یهدي الی الجنة، وما یزال الرجل یصدق و یتحری الصدق حتی یکتب عند الله صدیقا، و إیاکم و الکذب، فإن الکذب یهدي الی الفجور، و إن الفجور یهدي الی النار، وما یزال الرجل یکذب و یتحری الکذب حتی یکتب عند الله کذابا))، ((واتە:

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب الجنائز، باب ما قيل في أولاد المشركين (١٣٨٦)، وانظر (٨٤٥).
٢ـ أخرجه البخاري، كتاب الأدب، باب قول الله تعالى: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ﴾ التوبة: ١١٩،(٦٠٩٤)،ومسلم كتاب البر والصلة و الآداب،باب قبح الكذب و حسن الصدق وفضله(٢٦٠٧)واللفظ له.

دەست بگرن بە ڕاستگۆیی یەوە چونکە ڕاستگۆیی ڕێنمویی خاوەنەکەی دەکات بۆ چاکە، چاکەیش ڕێنمویی خاوەنەکەی دەکات بۆ بەهەشت، بەردەوام کەسێك ڕاست دەکات و بە دوای ڕاستیدا دەگەڕێت تاکو لای خوای گەورە بە ڕاستگۆ دەژمێردرێت، خۆتان بە دوور بگرن لە درۆ چونکە درۆ ڕێنمویی خاوەنەکەی دەکات بۆ خراپە، خراپەیش ڕێنمویی خاوەنەکەی دەکات بۆ دۆزەخ وە بەردەوام کەسێك درۆ دەکات و بە دوای درۆدا دەگەڕێت تاکو لای خوای گەورە بە درۆزن دەژمێردرێت)).

سوو خواردن (ربا) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَمۡحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرۡبِي ٱلصَّدَقَٰتِۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ﴾ (البقرة: ٢٧٨) واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە! دەبێ بە تەواوی ملکەچی فەرمان و قەدەغەکراوەکانی خوا بن، و لە گشت سنوورەکانی پارێز بکەن و لە پاشماوەی سووەکەشتان – کە بە لای ئەم و ئەوەوەیە واز بێنن و داوای مەکەن ئەگەر باوەڕداری ڕاستەقینەن، دەبێ گوێڕایەڵی تەواوی فەرمودەکانی خوا بن و لەو سووەش بێدەنگ بن)).

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت هەروەکو لە (صحیح مسلم)[1]دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (ابن مسعود) و(جابر)ەوە: (لعن رسول الله آكل الربا و مؤكله وكاتبه و شاهديه وقال: ((هم سواء)) واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی کردووە لەو کەسەی سوو دەخوات و ئەوەی دەبێتە وەکیلی و نووسەرەکە و هەردوو شایەتەکە و ئەمجار فەرمووی: هەمووان وەکو یەکن)).

داوێن پیسی (زنا) تاوانێکی گەورەیە لە نابووترین تاوانە گەورەکانە: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ

---

١ ـ أخرجه مسلم كتاب المساقاة باب لعن آكل الربا و مؤكله (١٥٩٧) من حديث ابن مسعود رضي الله عنه، وفي (١٥٩٨) من حديث جابر رضي الله عنه وهذا لفظه.

﴿حَسَنَٰتٍۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ الفرقان: ٦٨ـ ٧٠، واتە: ئەوانەی وێڕای خوا هیچ پەرستراوێکی تر ناپەرستن، کەسێکیش ناکوژن کە خوا کەشتنی یاساغ کردبێ، مەگەر بە هەق و ڕەوا. زیناش ناکەن وە هەرکەسێ ئەو کاروکردەوە ناپەسەندانە بکات ئەوە لە دوارۆژدا دەگاتە سزای تاوانەکەی خۆی (٦٨) لە ڕۆژی قیامەتیشدا دوو بەرامبەر ئازار دەدرێ چونکە لە لایەکەوە هاوەڵی بۆ خوا بڕیار داوە لە لایەکی تریشەوە ئەو گوناهە ناشیرینانەی کردووە و بە سووکی و زەلیلی و ریسواییەوە بە هەتا هەتایی هەر لەوێدا ئەمێنێتەوە (٦٩) مەگەر کەسێك پەشیمان دەبێتەوە و بڕوا بێنێ و کاری چاك ئەنجام بدا ئا ئەو کەسانە خوا گوناه و خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە، هەمیشە خوا گوناه پۆش و میهرەبانە (٧٠))).

کەواتـە لـە ترسـناکترین هۆکارەکـانی سـزای نـاو گـۆڕ بـەڵکو سـزای دوارۆژیـش درۆکردن و داوێن پیسی و سووخورادنە...

بـە گـشتی... ڕێـزداران... هـەموو سەرپێـچیەکان لـە هۆکارەکـانی سـزای نـاو گۆڕن... کەوابوو چارەسەر و دەرمانەکەی چییە؟

وەڵامەکەی لە چـەند وشـەیەکی کەمدایـە... ئـەویش ئەوەیـە کـە بـەردەوام بیـت لەسـەر ڕێگـا و بەرنامەکـەی پـەروەردگاری زەوی و ئاسمانـەکان... بـە ئەنجامـدانی فەرمانـەکانی و دوور کەوتنـەوە لـە قەدەغـەکراوەکانی وە لەسـنوورەکانی خۆیـدا ڕابوەستێ... دوور بکەوێتەوە لە (نمیمە) و (غەیبەت) و دوور بکەوێتەوە لـە هـەموو ئەوانەی کە دەبێتە هۆی پەست بوونی خوای گەورە...

یـادت دەخەمـەوە ئـەی بـرا خۆشەویـست و ژیرەکـەم بـە خوێندنـەوی سـورەتی (الملك) لە هەموو شەوێکدا.

جا لە فەرموودەیەکدا هاتووە، کە (الترمذي و أبو داود و ابن ماجە)[١] ریوایـەتیان کردووە و شێخ ئـەلبانی لـە کتـێبی (صـحیح الجـامع) دا بـە (صـحیح) ی زانیـوە لـە فەرموودەیەکی (ابو هریرە)ەوە کەوا پێغەمبەری خـواﷺ فەرموویـەتی: ((إن سـورة

١ـ أخرجه أبو داود، كتاب الصلاة، باب عدد الآي (١٤٠٠)، والترمذي كتـاب فـضائل القرآن، بـاب مـا جـاء في فضل سورة الملك (٢٨٩١) وقال: ((حديث حسن))، وابن ماجه، كتاب الأدب، باب ثواب القرآن (٣٧٨٦)، وأحمـد (٢ / ٢٩٩)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٢٠٩١)، و((المشكاة)) (٢١٥٣).

من القرآن ثلاثون آية، شفعت لرجل حتى غفر له، و هي سورة تبارك الذي بيده الملك )) واتە: سورەتێك لە سورەتەکانی قورئان هەیە سی ئایەتە، شەفاعەتی بۆ کابرایەك کرد تاکو خوا لێی خۆش بوو، ئەویش سورەتی تبارك الذي بيده الملك ە)).

لە (مصنف)ی عبدالرزاق و (الکبری) ی ئیمامی (النسائی) دا و (مستدرك الحاكم)و (سنن البیهقی) بە (موقوف)ی هاتووە(واتە قسەکە دراوەتە پاڵ هاوەڵێك لە هاوەڵان) وە لە لای (ابن مردویە) بە (مرفوع)ی هاتووە (واتە قسەکە دراوەتە پاڵ پێغەمبەری خواﷺ) بە سەنەدێك کە شێخ ئەلبانی بە (صحیح)ی[1] زانیوە و لە فەرموودەیەکی (ابن مسعود)ەوە کەوا خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: ((سورة الملك هي المانعة من عذاب القبر )) واتە: سورەتی (الملك) ڕێگرە لە سزای ناو گۆڕ)) کەوابوو سوور بە لەسەر خوێندنەوەی سورەتی (الملك) لە هەموو شەوێکدا... ئەگەر قەدەری خوا وابوو بمریت ئەوا لەسەر گوێڕایەڵی دەمریت ..

لە گەورەترین هۆکارەکانی ڕزگار بوون لە سزای ناو گۆڕ شەهید بوونە لە ڕێگای خوادا... وە ئیمامی (الترمذي و ابن ماجة و احمد و جگە لەوان)[2] ریوایەتیان کردووە لە فەرموودەیەکی (المقدام ی کوڕی معد یکرب)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((للشهيد عند الله ست خصال: يغفر له في أول دفعة من ( دمه ) ويرى مقعده من الجنة، و يجار من عذاب القبر، و يأمن من الفزع الأكبر، و يوضع على رأسه تاج الوقار، الياقوتة منها خير من الدنيا وما فيها، و يزوج اثنتين و سبعين زوجة من الحور العين، و يشفع في سبعين أقاربه))، واتە: شەهید لە لای خودا شەش ئاکاری هەیە: لەگەڵ یەکەم دڵۆپە خوێندا خوای گەورە لە تاوانەکان خۆش دەبێت،جێگای خۆی لە بەهەشتدا دەبینێت، لە سزای ناو گۆڕ دەپارێزرێت، لە ترسی گەورە دڵنیا

---

١ـ أخرجه عبدالرزاق (٦٠٢٤، ٦٠٢٥)، والنسائي في ((الكبرى)) (١٠٥٤٧)، و الحاكم (٢/٥٤٠) والطبراني في ((الكبير)) (٩ / ١٣٢، ١٣١)، و ((الأوسط)) (٦ / ٢١٢)، والبيهقي في ((الشعب)) (٢ / ٤٩٤)، وأبو نعيم في ((الحلية)) (٧/ ٢٤٨)، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (١١٤٠)، و ((صحيح الجامع)) (٣٦٤٣)، و ((صحيح الترغيب و الترهيب)) (٢/٩١).

٢ـ أخرجه الترمذي، كتاب فضائل الجهاد، باب في ثواب الشهيد (١٦٦٣) وقال: ((حسن صحيح غريب))، وابن ماجه، كتاب الجهاد باب فضل الشهادة في سبيل الله (٢٧٩٩) و أحمد (١٦٧٣٠) والبيهقي في (السنن) (٩ / ١٦٤) وفي(الشعب) (١٠٨٢٣، ١٠٨٢٤) وصححه الشيخ الألباني في(صحيح الجامع) (٥١٨٢) و (أحكام الجنائز)(٣٥, ٣٦).

دەبێت، تاجێكی ڕێز لێنانی لەسەر دادەنرێت، كە تەنها یەك(یاقوتە)ی هەموو دونیاو ئەوەیشی تیادایە دەهێنێت، حەفتا و دوو حۆری لە (حور العین) ی لێ مارە دەكرێت، شەفاعەت دەكات بۆ حەفتا كەس لە كەس و كاری)).

داوا لە خوا دەكەم كە من و ئێوە لە سزای ناو گۆڕ بپارێزی...

خۆشەویستان... ئایا لە پاش ئەمانە چی دێت؟ لە بەشی داهاتوودا بە پشتیوانی خوای گەورە باسی دەكەین و داوا لە خوا دەكەم كردەوە چاكەكانی ئێمە و ئێوە وەربگرێت... آمین

# نیشانە بچووكەكانی قیامەت

لە بەشی رابوردوودا لە باسی گۆڕدا راوەستاین... ئا ئەوەتا گۆڕەكە بە سەر خاوەنەكەیدا داخرا!! تاكو كەی؟ تاكو رۆژی قیامەت... داوا لە خوا دەكەم گۆڕەكانمان بۆ بكاتە باخچەیەك لە باخچەكانی بەهەشت و نەیكاتە چاڵێك لە چاڵەكانی ئاگر... ئەمجار فەرموون با پێكەوە باسی قیامەت و نیشانەكانی بكەین...

پێش ئەوەی باسی قۆناغەكانی قیامەت بكەم لە زیندووبوونەوە و حەشر و ترازوو و لێپرسینەوە و سیرات و بەهەشت و دۆزەخ... تاوەكو ئەو دوای ئەو هەموو كارە مەترسیدارانە... كۆمەڵێك بنەمای گرنگ هەیە دەیخەمە روو...

## بنەمای یەكەم : قیامەت دێت و هیچ گومانێكی تیادا نییە

ئەم ڕاستییە دەبێ هەموو ستەمكارێك و ستەملێكراوێك پێكەوە بیزانن... با ستەمكار بزانێت كەوا ئەو لە بەر دەستی خوادا رادەوەستێ بە مەبەستی تۆڵە لێسەندنەوە (القصاص) (واتە: سزا بە گوێرەی تاوانەكەی خۆی)، موژدە بێ بۆ ستەملێكراو كەوا نەیتوانی لە دونیادا حەقەكەی خۆی وەرگرێتەوە ئەوا لە تەنیشتی ئەو كەسەی ستەمی لێكردووە رادەوەستێنرێت... وە لە لای خوداوەند دوژمنان و نەیاران كۆدەبنەوە بۆ ئەوەی خوای گەورە بە تەواوەتی و بە بێ كەم و كووری مافەكانی خۆی بداتەوە ...

لا تظلمن إذا ما كنت مقتدراً     فالظلم ترجع عقباه الى الندم
تنام عيناك والمظلوم منتبهٌ     يدعوا عليك و عين الله لم تنم

واتە: هەرگیز ستەم مەكە ئەگەر بوویتە كەسێكی بە توانا و دەسەڵاتدار، چونكە هەردەم ستەم پەشیمان بوونەوەی بە دواوەیە، تۆ دەخەوی و چاوەكانت لە یەك

دەنێت و ستەملێكراویش بە ئاگایە، دوعات لێ دەكات و چاوەكانی خوایش نەخەوتووە.

لە پاشاندا بە درێژی باسی (القصاص) دەكەم (انشاء الله)، داوا لە خوا دەكەم كەوا من و ئێوە داپۆشێت لە دونیا و قیامەتدا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٦﴾ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِى ٱلْقُبُورِ﴾ الحج: ٦ـ ٧، واتە: دروستكردنی ئادەمیزاد بەو جۆرەو زیندووكردنەوەی زەویش بەو شێوەیە هەر هەموو بۆ ئەوەیە ئێوە بیربكەنەوەو چاك بزانن كە بەراستی تەنها خوا زاتێكی راست و هەقە و بێ گومان هەر ئەویشە مردووان زیندوو ئەكاتەوە و هەر ئەوە بە سەر هەموو شتێكدا بە توانایە (٦) دڵنیابن قیامەتیش بەرپا دەبێت، كە هیچ گومانی تێدا نییە،و بە راستی خوا هەموو ئەوانەی لە گڵكۆ و گۆڕدان زیندوو ئەكاتەوە تا پاداشت و تۆڵەیان وەرگرنەوە(٧))).

ئەم مرۆڤە لە گۆڕەكەیدا دەمێنێتەوە تاكو گوێی لە بانگەواز دەبێت... هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ ٱلْمُنَادِ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٤١﴾ يَوْمَ يَسْمَعُونَ ٱلصَّيْحَةَ بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُرُوجِ﴾ ق: ٤١ـ ٤٢، واتە: گوێ راگرە ئەی پێغەمبەرﷺ! بۆ ئەو هەواڵەی پێت دەدەین لە ئەحواڵی قیامەت، رۆژێك (ئیسرافیل) بانگ دەكا لە شوێنێكی نزیك بە خەڵك هەمووتان دەرچن لە گۆڕەكانتان بۆ حەشر (٤١) ئەو رۆژە كە هەموو ئەو (صیحە) و هاوارەیان بە هەق گوێ لێ دەبێ، ئا ئەو رۆژە رۆژی لە گۆڕ دەرچوونە بۆ حەشر و پاداش و تۆڵە(٤٢))) .

خوای گەورە فەرمان دەكاتە (ئیسرافیل) بە فووكردن بە بووقدا، كە ئەویش فووكردنی زیندووبونەوەیە... لەو كاتەدا زەوی دێتە لەرزە و دەجوڵێتەوە بۆ ئەوەی خۆی رزگار بكات لەو بارە قورسەی كە پێیەتی، بۆ ئەوەی هەرچی لە ناخیدایە فرێی بداتە دەرەوە لە مرۆڤەكان، هەر لە (ئادەم)ەوە تاوەكو دووایین مرۆڤ، كە قیامەتی بە سەردا هاتووە...

خــوای گــەورە دەفــەرموێت: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾ الزلزلة: ١ـ ٢، واتە: کاتێ کە زەوی بە توندی تەکانی داو کەوتە لەرزە لەرز و جووڵە جوولّ بە هەر هۆیەکەوە بێت، (ئیبن عەبباس) ئەڵێ: ئەوە لە (نەفخە) ی یەکەمدایە بە جۆرە لەرزەیەکی وا کە شایستەی ئەو بێت جا ئەبێ ئەو حاڵەتە چ ڕووداوێکی گەورە بێت.(١) زەوی هەرچی باری گران و قوورسی هەبوو فرێی دایە دەرەوە: (مردوان، نەوت و ئاو و خەزنە و هەزاران هەزار شتی تر)! (٢))).

واتە: هەموو مردووەکان فرێ دەداتە دەرەوە ﴿وَقَالَ ٱلْإِنسَٰنُ مَا لَهَا﴾ الزلزلة: ٣، واتە: ئەو کاتە ئادەمی کافر بە سەر سوڕمانێکەوە دەڵێ: زەوی چییەتی وا دەکات...؟(٣))).

بۆیە لەو کاتەدا مرۆڤی ترساوی تۆقیو نکۆڵی لەو کارە دەکات دەڵێت: ما لها؟ ئەوە چییەتی؟ چی شتێك جێگیر بوون و هێمنییەکەی تێك داوە؟ پێش ماوەیەك ئەم زەوییە جێگیر و دامەزراو و هێمن بوو کەچی ئێستا دەجولێتەوە و تێك چووە و شلّژاوە، ئەوە فەرمانی خوای بە سەردا دابەزیوە لەوەی کە خوای گەورە بۆی ئامادە کردووە لە لەرینەوە و بوومەلەرزە، کە هیچ دالّدەیەکی نییە... پاشان ئەوەی لە ناخیدا بوو لە مردووەکان لە پێشینەکان و پاشینەکان فرێی داوەتە دەرەوە وە لەو کاتەدا خەڵکی نکۆڵی لەو کارە دەکەن وە ئەم زەوی یە دەگۆڕدرێت بە زەوی یەکی تر... دێنە دەرەوە و دەردەکەون بۆ لای خوای تاك و بەتوانا[1]...

﴿يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا۟ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٦﴾ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ﴾الزلزلة:٤ـ ٨، واتە: لەو ڕۆژەدازەوی هەواڵەکانی خۆی چاك و خراپ ڕادەگەیەنێت و مەردوم تێ ئەگات کە ئەو زەمین لەرزەیە سەرەتای ڕۆژێکی سەخت و وێران بوونی دونیایە(٤) ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە

---

١ـ ((تفسیر ابن کثیر)) (٤/٥٢٤).

پەروەردگارت وەحی و فرمانی پێ کردووە بەو زەلزەلەیە: لە خۆیەوە ناتوانێ هیچ بکات و هەردەم لە ژێر دەستەڵاتی خوادایە.(٥) لەو ڕۆژەدا خەڵکی بە پەرش و بڵاوی لەگۆڕەکانیان دەردەچن بۆ شوێنی حیساب بۆ ئەوەی پاداش و تۆڵەی کار و کردەوەکانیان نیشان بدرێت.(٦) ئینجا هەر کەسێك کێشی وردیلەیەك چاکەی ئەنجام دابێت، پاداشەکەی دەبینێتەوە(٧) کەسێکیش کێشی وردیلەیەك شەڕ و خراپەی کردبێت، تۆڵەکەی دەبینێتەوە. مەگەر خوا قەڵەمی عەفوو بێنێ بە سەریا، کەوابوو با هەموومان هۆشیارو زیرەك و وریابین، بزانین ڕۆژانە چی ئەکەین و لە خوا بترسین(٨)).

بە ڕاستی دیمەنێکی ترسناکە و دڵەکان لە بن دەردەهێنێ! وە بزانە کەوا قیامەت دێت و نزیکە... ئەگەر تۆ بە پێوەرە مرۆڤایەتییەکەت بیپێوی ئەوا هێشتا دوورە، خوای گەورەی بەرز و بەرێز هەواڵمان دەداتێ کەوا نزیکە و زۆر نزیکە.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُ بَعِيدًا ﴿٦﴾ وَنَرَاهُ قَرِيبًا﴾ المعارج: ٦ـ ٧، واتە: بە ڕاستی ئەوان ئەو ڕۆژە بە دوور دەبینن!(٦) وە ئێمەیش بە نزیکی ئەبینین، چونکە بۆ ئێمە هیچی تێ ناچێت(٧)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ﴾ الأنبياء: ١، واتە: کاتی حیساب و لێپرسینەوەی مەردم لە کار و کردەوەیان نزیك بۆتەوە و ئەوانیش لە خەفڵەتان لەو ڕۆژە، ڕوو دەسووڕێنن و گوێیان لێ نییە و لەوە داناچڵەکێن کە خوا پێیان ئەکات!(١)).

بیر بکەرەوە لەو قسەی خوای گەورە کە دەفەرموێت: ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ﴾ القمر:١[1]، واتە: ڕۆژی قیامەت نزیك بۆتەوە، مانگیش لەت بوو(١)).

خوای گەورە باسی قیامەت دەکات بە شێوازی ڕابوردوو ﴿أَتَىٰ أَمْرُ اللَّهِ فَلَا

---

١ـ قيل: إن انشقاق القمر هي الآية التي ظهرت على عهد النبيﷺ، كما ثبت ذلك في الصحيح، وقيل: بل المعنى: إنه ينشق، كما في قوله (﴿أَتَى أَمْرُ اللَّهِ﴾ النحل: ١، أي: يأتي، وانظر: ((التذكرة)) للقرطبي (٦٣٨، ٦٣٩).

تَسْتَعْجِلُوهُ﴾ النحل: ١، واته: ئەوا بەفەرمانی خوا بۆ سزای بێ باوەڕان هات و گەیشت و قیامەت بەرپا بوو، بەڵێ چونکە قیامەت هەر لە هاتندایەو سەرئەنجامیش (هەر پێش دێت) خوای گەورە بە کرداری رابووردوو (ماضي) وشەی (أتـی)ی هێنا، جا کەوایە پەلەی ئەو ڕۆژە مەکەن، بێ گومان بن هەر دێت (١)). خوای گەورە بە شێوازی رابووردوو دەربڕیوە کە بە بێ گومان روو دەدات[١]، بیر بکەرەوە لە گەڵ مندا لەو قسەیەی خوای گەورە: ﴿يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِ ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا﴾ الأحزاب: ٦٣، واته: بێ باوەڕەکان پرسیاری هاتنی ڕۆژی قیامەتت لێ ئەکەن !پێیان بڵێ: ئەی پێغەمبەرﷺ! هەر خوا خۆی زانیاری و ئاگاداری تەواوی هەیە بە ڕۆژی قیامەت کە کەی دێت،جا تۆ چووزانیت لە قیامەت؟ لەوانەیە کاتی هاتنیشی زۆر نزیك بێت! (٦٣)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا ﴿٤٥﴾ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا﴾ النازعات: ٤٢ـ ٤٦، واته: له بابەت ڕۆژی قیامەتەوە: لێت دەپرسن کە چ کاتێ روو ئەدا؟.(٤٢) جا تۆ چیتە لە باسکردنی ئەو ڕۆژە؟ واته: تۆ هیچی لێ نازانیت، ئیتر ئەوانە بۆ ئەوەندە تەنگاوت دەکەن...؟ (٤٣) سەرەنجام و کۆتایی دونیا تەنها لای پەروەردگارتە، واته: هەر خواوەندت کاتەکەی دەزانێ.(٤٤) ئەرکی تۆ تەنها بێدار کردنەوەو ترساندنی ئەوانەیە لەو ڕۆژە دەترسن و خۆیانی بۆ ئامادە دەکەن ئیتر دیاریکردنی کاتەکەی بە تۆی نەسپاردراوە.(٤٥) ئەو ڕۆژە کە ئەوانە قیامەت دەبینن، وا ئەزانن لە دونیادا تەنها ئێوارەیەك یا چێشتەنگاوێك ماونەتەوە، واته: لە بەر درێژی و سەختی و گرانی ئەو ڕۆژەیە، ماوەی ژیانی دونیایان بەلاوە زۆر کەم دەبێ!.(٤٦)).

واته: ئەگەر هەستانەوە لە گۆڕەکانیان بۆ مەحشەر ئەو ماوەی ژیانی دونیایان بە کەم دەزانن تاکو وا دەزانن لای ئەوان ئێوارەی ڕۆژێك بووە یان تەنها

---

١ـ ((تفسير ابن كثير)) (٢/ ٥٤٣).

چێشتەنگاوێك[١]، ئـەهلی زەوی وا هەسـت دەکـەن کـەوا ئـەوان لەسـەر زەویـدا نەماونەتەوە تەنها یەك کاتژمێر نەبێت...

براکەم... هەر چەندە ڕۆژگار درێژە بکێشی ئەوا قیامـەت هـەر دێـت، و قیامـەتی تۆ بـە مردنـت دەسـت پـێ دەکات، هەرچـەندە ژیـان درێـژە بکێـشێ وە هەرچـەند شەوگار درێژ بێت ئەوا هەر دەبێ شەبەق دەرکەوێت... هەرچەندە تەمەن درێژ بێـت ئەوا هەر دەبێ بچینە ناو گۆڕەوە، هەرچەندە مانەوە لـە نـاو گـۆڕدا درێـژە بکێـشێ ئەوا هەر دەبێ لـە گۆڕەکـەمان دەرچـینە دەرەوە بـە مەبەسـتی ڕاوەسـتان لـە بـەر دەستی خوای بەرز و پیرۆزدا...

کەوا بوو ئەگەر تەماشای قیامەت بکەین بە ئەم پێوەری مرۆڤییانـە ئـەوا هێـشتا دوورە بەڵام پەروەردگارمان ئاگادارمان دەکاتەوە کەوا زۆر نزیکـە... خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَمَآ أَمۡرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا كَلَمۡحِ ٱلۡبَصَرِ أَوۡ هُوَ أَقۡرَبُۚ﴾ النحـل: ٧٧، واتە: وە هاتنی ڕۆژی قیامەتیش هێندە ئاسانە و خێرایە هەر بە قەد چاوترووکانێکە، یـان لـە خێراییـدا لـەوەیش نـزیکترە چـونکە تـەنها هـەر ئەوەندەیـە کـە خـوا پێـی بفەرموێ ببە، ئەوجا دەست بە جێ دەبێت، جا ئەو کاتە ئەو ڕۆژە هات ئیتر هەق و ناهـەق ڕوونـتر دەرئەکـەوێ ((٧٧)) لـە هـیچ فەرهـەنگێکی زمانەوانیـدا دەربڕینێـك نادۆزیتەوە لەسەر نزیك بوونـەوەی هـاتنی قیامـەت وەکـو ئـەم چـەند وشـە کەمـە و یەکلایی کەرەوە... هەرکە چاوەکانت لە یەك نا و نوقاندت ئەمجار بیکەیتـەوە ئـەوا هەموو شت کۆتایی پێ هاتووە.

## بنەمای دووەم : نیشانەکانی قیامەت

بنەمایەکـە ئێمـە باسـی دەکـەین دەربـارەی نیـشانەکانی قیامـەت و دووبـارەی دەکەمەوە: زانیاری دەربارەی هاتنی قیامەت ئەوا خوای گـەورە هـیچ کەسێکی لـێ ئاگـادار نەکردووەتـەوە نەفریـشتەیەکی نزیککـراو و نـە پێغەمبـەرێکی نێـردراو هـەر چەندە ئـەو کەسـە پێغەمبـەری هەڵبـژێردراو بێـتﷺ ... کـەوا بـوو هـاتنی قیامـەت

١ـ ((المصدر السابق)) (٤ / ٤٥٤).

زانیارییەکەی نادیارە و کەس نازانێت تەنها خوای گەورە نەبێت.

پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ فەرموویەتی هەروەکو لە (صحیح البخاری) دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (ابن عمر)ەوە: ((مفاتح الغیب خمس لا یعلمهن إلا الله)) (واتە: کلیلەکانی غەیب پێنج دانەن هیچ کەسێك دەربارەیان نازانێت تەنها خوا نەبێت) ئەمجار ئەو ئایەتەی خوای گەورەی خوێندەوە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٌ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗاۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٖ تَمُوتُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرُۢ ﴾ لقمان:٣٤، واتە: ئینجا خوا باسی پێنج شت ئەکات کە تەنها هەر خۆی ئەیان زانێ: (١) بە راستی زانیاریی هاتنی رۆژی قیامەت هەر لای خوایە، جگە لەو کەسێکی تر نازانێ قیامەت کەی دێت ( ٢)تەنها ئەویش باران ئەبارێنێ لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا، کەسێکی تر ناتوانێ باران ببارێنێ(٣) ئەویش ئەزانێ چی لە منداڵدانەکاندایە، واتە: هەر لەو کاتەوە کە هێشتا ئاوە، خوا خۆی دەزانێ چییە: کوڕە یان کچ، بەختیارو سەرفرازە، یان لاسار و بەدبەختە، بەژن و باڵای کورتە، یا... هتد (٤)هیچ کەسێك – نەچاکەکار و نەخراپەکار– سەد لە سەد نازانێت سبەینێ چی دەکا لەچاك و لە خراپ (٥) هیچ کەسیش نازانێ لەسەر کام زەوی ئەمرێ، واتە: کام جێگا دەبێتە گۆڕ و ئارامگای، هەرچەندە لەوانەیە هەوڵیش درابێ بۆ زانینی ئەمە! چونکە هەر خوایە زانا و بە ئاگایە بە تەواوی رووداوەکان و گشت نهێنی و ئاشکرایەکیشی لا یەکسانە (٣٤)).

لە جوانترین ئەو شتانەی کە لەم بابەتەدا خوێندوومەتەوە ئەوەیە کە ئیمامی (أحمد) ریوایەتی کردووە لە(مسند) هکەیدا و ابن ماجە لە (سنن)ەکەیدا و البوصیری لە (الزوائد)دا بە سەنەدێکی (صحیح) و پیاوانی سەنەدی فەرموودەکە لە باوەڕپێکراوەکانن (رجاله ثقات)، الحاکم لە (المستدرك)و بە (صحیح) ی زانیوە (الذهبي) لە گەڵیدا هاودەنگەوە و العلامە (أحمد شاكر) بە (صحیح) ی زانیوە[1] لە

---

١ـ أخرجه أحمد (٥/ ١٨٩) و وابن ماجة، كتاب الفتن و باب فتنة الدجال وخروج عيسى ابن مريم و خروج يأجوج و مأجوج (٤٠٨١)، وقال البوصيري في ((الزوائد)): ((هذا إسناد صحيح، رجاله ثقات، و مؤثر بن عفارة ذكره ابن حبان في الثقات، وباقي رجال الإسناد ثقات)). و الحاكم (٤ / ٤٨٨، ٤٨٩) و قال: ((حديث صحيح

فەرمووەیەکی (عبدالله ی کوڕی مسعود)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ دەڵێت::
((لقيت ليلة أسري بي إبراهيم و موسى و عيسى – صلوات الله عليهم أجمعين- فتذاكروا أمر الساعة))، واتە: ئەو شەوەی کە گەشتی ئیسرایان پێ کردم چاوم کەوت بە ئیبراهیم و عیسا و موسا (صەڵات و سەلامی خوا لە هەموویان بێت) باسی کێشەی قیامەتیان کرد)) ئەی خودایە...! ((الخليل و الكليم وروح رب العالمين وسيد البشر)) کە پێشەوای هەموو مرۆڤایەتی و گەورەیان و هەڵبژێردراویانە بایەخیان بە قیامەت داوە... ئاگاداری ئەم ئەدەبە بە... پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((فردوا أمرهم إلى إبراهيم، فقال: لا علم لي بها)) واتە: کێشە و باسەکەیان گەڕاندەوە بۆ لای ئیبراهیمعليه السلام و ئەویش فەرمووی: هیچ شتێك دەربارەی نازانم)) تەماشای ئەو ئەدەبە بکە لە گەڵ خوای پەروەردگاردا! ! ((فردوا الأمر إلى موسى، فقال: لا علم لي بها، فردوا الأمر إلى عيسى، فقال: أما وجبتها، فلا يعلمها أحد إلا الله، و فيما عهد إلي ربي أن الدجال خارج . قال: ومعي قضيبان، فإذا رآني ذاب كما يذوب الرصاص فيهلكه الله))، واتە: ئەمجار کێشە و باسەکەیان گەڕاندەوە بۆ لای موساعليه السلام و ئەویش فەرمووی: هیچ شتێك دەربارەی نازانم ئەمجار کێشە و باسەکەیان گەڕاندەوە بۆ لای عیساعليه السلام و ئەویش فەرمووی: بەڵام کاتی ڕوودانەکەی، هیچ کەسێك زانیاری دەربارەی نییە تەنها خوا نەبێت وە ئەوەی کە خوا پەیمانی پێداوم کە دەجچال دەردەچێت، ئەمجار فەرمووی: وە دوو داردەستم پێیە کاتێ ئەگەر من ببینێ ئەوا دەتوێتەوە هەروەکو چۆن قورقۆشم (رصاص) دەتوێتەوە و خوا بە هەلاکەتیا دەبات)).

لە ڕیوایەتێکی تردا (کە لە پاشدا بە درێژی باسی دەکەم انشاء الله) ((ذاب كما يذوب الملح في الماء)) واتە: دەتوێتەوە هەروەکو چۆن خوێ لە ئاودا دەتوێتەوە)).

کەوابوو کاتی هاتنی قیامەت هیچ کەسێك نازانێت تەنها خوا نەبێت... زانیاری دەربارەی کاتەکەی لە لای خوداوەندی بەرز و پیرۆزە ..

---

الإسناد ولم يخرجاه))، ووافقه الذهبي و صححه الشيخ أحمد شاكر في ((المسند)) (٣٥٥٦)، وضعفه الألباني في ((ضعيف الجامع)) (٤٧١٢).

بەڵکو لە (صحیح مسلم)[١] دا هاتووە کەوا جبریلﷺ پرسیاری کردووە لە پێغەمبەری خواﷺ: ((متى الساعة؟ فقال المصطفىﷺ: "ما المسؤول عنها بأعلم من السائل . قال: فأخبرني عن أمارتها . قال: ((أن تلد الأمة ربتها، و أن ترى الحفاة العراة العالة رعاء الشاء يتطاولون في البنيان)) واتە: قیامەت کەی دێت؟ پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرمووی: ئەو کەسەی کە پرسیاری لێ دەکرێت لە پرسیارکەر زاناتر نییە . فەرمووی: کەواتە نیشانەکانیم پێ بڵێ . ئەویش فەرمووی: کەنیزەك گەورەو خاوەنی خۆی لێوە لە دایك دەبێت، خەڵکانی پێ پەتی و ڕووت و هەژار و شوانی مەڕەکان ببینی کە پێشبرکێ بکەن لە بەرزکردنەوەی کۆشکەکانیاندا)) بەڵام ئەو خوایەی کە کاتی هاتنی قیامەتی لە هەموو دروستکراوەکانی شاردووەتەوە ئەوا پێغەمبەرو خۆشەویستە هەڵبژێردراوەکەیﷺ خۆی ئاگادار کردووەتەوە لە نیشانەکانی قیامەت کەوابوو هیچ ڕێگرێك نییە لە شاردنەوەی کاتی هاتنی قیامەت و زانینی نیشانەکانی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا السَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً فَقَدْ جَاءَ أَشْرَاطُهَا ﴾ محمد: ١٨، واتە: ئایا ئەمانە مەگەر چاوەڕێی هاتنی قیامەت ناکەن لە ناکاو دەرگایان لێ بگرێت؟! خۆ بێ گومان هەندێ لە نیشانەکانی قیامەت هاتوونە پێش و دەرکەوتوون(١٨))). ئەمە نیشانەکانی قیامەتەو خوای گەورە پێغەمبەرەکەمانیﷺ ئاگادار کردووەتەوە... پێغەمبەرەکەمانﷺ هەرگیز لە خۆ وە قسە ناکات چونکە قورئان سروشە(وەحی)یەو سوننەتیش وەحییە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَىٰ ﴾ النجم:١-٥، واتە: سوێند بەو ئەستێرەیە کە بە خێرایی ئاوا دەبێت، یا لە شوێنی خۆی دەترازێت و بەر دەبێتەوە کاتی نزیکبوونەوەی قیامەت(١) هاوەڵەکەی ئێوە(موحەممەدﷺ) لە ڕێی هەق لای نەداوە و باوەڕی پووچیشی نەبووە(٢) قسەو گوفتاری (پێغەمبەر) لە ڕووی

---

١ـ أخرجه مسلم، كتاب الإيمان، باب بيان الإيمان و الإسلام و الإحسان ووجوب الإيمان بإثبات قدر الله سبحانه و تعالى (٨).

هەواوهەوەسەوە نییە، جا کەسێ ئاوابێ چۆن ڕێگە ون ئەکات ؟!(٣) ئەو قورئانەی کە ئەو دەیڵێت، جگە لەوەی کە بە وەحی بۆی دەنێررێ هیچی تر نییە، واتـە: ئـەم قورئانە هەر لە لایەن خواوەیە(٤) خاوەن هێز و بـە زەبـر (جوبریـل) ی فریشتەیە، قورئانی فێرکردووە، بەڵێ زۆر بە هێزە، دەست پاکە، زمان پاکە؟!!(٥))).

لە فەرموودەیەکدا کە(ابـو داود و الترمـذي) ریوایـەتیان کـردووە لـە فـەرموودەی (المقدام ی کوڕی معد یکرب)ەوە کـەوا پێغەمبـەری خـواﷺ ((ألا إنـي أوتيـت القـرآن ومثلـه معـه ))، واتـە: مـن قورئـانم بـۆ هـاتووە و دابـەزیوە و هاوشێوەکەیـشی لـە گەڵدایە)) (واتە: سوننەت).

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ﴾ الجمعـة:٢، واتـە: خـوا هـەر ئـەو پەروەردگارەیە کە لە ناو عەرەبە نەخوێندەوارەکانـدا پەیامبـەرێکی پایەبەرزی لـە خۆیـان نـارد، ئایەتـەکانی قورئانەکـەی ئـەویان بـە سـەرا دەخوێنێتـەوە هەرچـەند ئـەمیش خـۆی نەخوێنـدەوارە،دڵ و دەروون و ڕەوانـەتیان پـاك دەکاتـەوە لـە بیروباوەری بتپەرستی و یاسای لاروچەوتی کۆمەڵایـەتی ئـەو سـەردەمە و قورئـان و فـەرموودەکانی خۆیـان فێـر دەکـات خـۆ بـە ڕاسـتیش پـێش هـاتنی ئـەو ئـەوان لـە گـومڕایی و سـەر لێـشێواوییەکی ئاشـکرادا بـوون... سیاسـەتی پـووچ و گەنـدەڵ، ڕەوشت و ئەخلاقی رووخاو، باری کۆمەڵایەتی پەست و قێزەون... هتد(٢)).

مەبەست لە (الحكمة) سوننەتە.

کەوا بوو – ئـەی ڕێـزداران – خـوای گـەورە پێغەمبەرەکـەیﷺ لـە نیـشانەکانی ئاگـادار کردووەتـەوەو پێغەمبـەری خـواﷺ هـاوەڵانی ئاگـادار کردووەتـەوە ئـەوەی لەبەری کرد ئەوا لە بەری کرد و ئەوەی لە بیری کرد ئەوا لە بیری کرد .

لە هـەردوو کتـێبی (الـصحيح)[١]دا هـاتووە لـە فەرموودەیـەکی (حذیفـة ی کـوڕی اليمان)ەوە دەڵێـت: ((: لقـد خطبنـا الـنبيﷺ خطبـة مـا تـرك فيهـا شيئا إلى قيـام

---

١ـ تقدم، وهو في ((صحيح البخاري)) برقم (٦٦٠٤)، ومسلم (٢٨٩١).

الساعة إلا ذكره علمه من علمه وجهله من جهله))، واتە: پێغەمبەری خواﷺ وتارێكی بۆ خوێندینەوە كە هیچ شتێكی تیادا بە جێ نەهێشت تاكو هاتنی قیامەت ئیللا باسی بۆ كردین ئەوەی لێی تێگەیشت ئەوا لێی تێگەیشت و ئەوەیشی لێ تێنەگەیشت ئەوا لێی تێنەگەیشت)).

لە(صحیح مسلم)دا هاتووە لە فەرموودەیەكی (أبی زید عمرو ی كوڕی أخطب الأنصاري)ەوە دەڵێت: ((صلى بنا رسول اللهﷺ الفجر، و صعد المنبر. فخطبنا حتى حضرت الظهر، فنزل فصلى ثم صعد المنبر، فخطبنا حتى حضرت العصر، ثم نزل فصلى،ثم صعد المنبر فخطبنا حتى غربت الشمس، فأخبرنا بما كان وبما هو كائن فأعلمنا أحفظنا))[1] واتە: پێغەمبەری خواﷺ نوێژی بەیانی پێ كردین و ئەمجار چووە سەر مینبەر و وتاری بۆ خوێندینەوە تاكو نیوەڕۆ هات ئەمجار دابەزی نوێژی كردوو دیسان چووە سەر مینبەر و وتاری بۆ خوێندینەوە تاكو نوێژی عەسر، ئەمجار دابەزی و نوێژی عەسری بۆ كردین دیسان چووە سەر مینبەر و وتاری بۆ خوێندینەوە تاكو ڕۆژ ئاوا بوو... ئەوەی كە ڕویداوە و ئەوەی كە ڕوودەدات باسی بۆ كردین زاناترینمان ئەو كەسە بوو كە زیاتری لە بەر كردبوو)) ئەمەیشە جیاواز نییە لە گەڵ گوتەی پەروەردگارمان كە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ ﴾ لقمان:٣٤، واتە: بە ڕاستی زانیاریی هاتنی ڕۆژی قیامەت هەر لای خوایە، جگە لەو كەسێكی تر نازانێ قیامەت كەی دێت))، كەواتە كاتی هاتنی قیامەت هیچ كەسێك نازانێت تەنها خوای بەخشندە و میهرەبان نەبێت... بەڵام نیشانەكان و ئەو ڕووداوانەی كە لە پێش هاتنی قیامەت دێن ئەوا خوای گەورە پێغەمبەرەكەی لێ ئاگادار كردووەتەوەﷺ ... خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿عَـٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ ﴾ الجن:٢٧، واتە: ئەو زاتە زانای نادیار و غەیبە،غەیبی خۆی بۆ هیچ كەسێك دەرناخاو ئاشكرا ناكا .(٢٦) مەگەر بۆ پەیامبەرێك كە خۆی لێی ڕازی بێت، ئەو كاتە ئاگاداری هەندێ لە نهێنییەكانی خۆی

---

١ـ أخرجه مسلم، كتاب الفتن و أشراط الساعة، باب في الآيات التي تكون قبل الساعة (٢٨٩٢).

دەکات، کەوابوو غەیب زانین، تایبەتە تەنها بەزاتی پەروەردگارمانەوە(جل جلالە) ئیتر هیچ کەسێك پەی پێ نابات، مەگەر کەسێکی خاوەن خووی جوان و شیرین و راسالٚ و ملکەچ بۆ فەرمانەکانی خوا لە پەیامبەران(٢٧))).

کەواتە ئەم نیشانانە چین ؟

نیشانەکان دەبنە دوو بەشەوە: نیشانە بچووکەکان و نیشانە گەورەکان...

**نیشانە گەورەکان:** پێغەمبەری خواﷺ باسی دە نیشانەی کردووە، هەروەکو لە (صحیح مسلم)[١]دا لە فەرموودەی (حذيفة ی کوڕی أسيد الغفاري) یەوە هاتووە کەوا پێغەمبەری خواﷺفەرموویەتی: ((اطلع النبي علينا ونحن نتذاكر، فقال: ((ما تذاكرون؟)) قالوا: نذكر الساعة، قال :((إنها لن تقوم حتى ترون قبلها عشر آيات فذكر الدخان والدجال، والدابة، وطلوع الشمس من مغربها، ونزول عيسى ابن مريم عليه السلام، ويأجوج ومأجوج، وثلاثة خسوف، خسف بالمشرق، وخسف بالمغرب، وخسف بجزيرة العرب، وآخر ذلك نار تخرج من اليمن تطرد الناس إلى محشرهم))))،واتە: پێغەمبەری خواﷺ بەسەری کردینەوە لە کاتێکدا ئێمە گفتوگۆ و قسەمان دەکرد، جا فەرمووی: دەربارەی چی گفتوگۆ دەکەن و باسی چی دەکەن؟ فەرموویان: باسی قیامەت دەکەین ئەی پێغەمبەری خواﷺ، فەرمووی: قیامەت هەڵناسێت تا لە پێشدا دە نیشانە نەبینن ئەمجار باسی کرد و فەرمووی: (دوکەڵێك)و (دەججال)و (زیندەوەرێکی سەیر (دابة))و (هەڵاتنی رۆژ لە رۆژئاواوە)و (دابەزینی عیسا ی کوڕی مەریەم)و (یأجوج و مأجوج)و سێ رۆچوون روو دەدات: (رۆچوونێك لە رۆژهەڵات)و (رۆچوونێك لە رۆژئاواوە)و (ڕۆچوونێك لە دورگەی عەرەبەوە) لە کۆتایی ئەوانە ئاگرێك لە یەمەنەوە دەردەچێت خەڵکی ڕادەماڵێت بەرەو مەحشەر)).

کەوابوو ئەمانە نیشانە گەورەکانن... بەڵام وەرن پێش ئەوەی باسی نیشانە گەورەکان بکەین با باسی نیشانە بچووکەکان بکەین...

---

١ـ أخرجه مسلم، كتاب الفتن و أشراط الساعة, باب إخبار النبيﷺ فيما يكون إلى قيام الساعة (٢٩٠١).

**نیشانە بچووکەکان:** ئاگاداری ئەم بنەما گرنگە بە... چونکە هەندێ لەوانەی کە باسی ئەم مەسەلەیان کردووە لێیان تێکەڵ بووە...

دەڵێم: هەندێ لە نیشانە بچووکەکان هاوجووتن لە گەڵ دەرکەوتنی نیشانە گەورەکان وەکو دەرکەوتنی (المهدی) چونکە دەرکەوتنی (المهدی) لە سەردەمی (عیسا ی کوڕی مەریەم) دا دەبێت وە ئەگەر (عیسا ی کوڕی مەریەم) بە دیار بکەوێت واتە دەججال هەیە و مەوجوودە... بەڵکو (عیسا) و (المهدی) دەردەچن بۆ کوشتنی دەججال هەروەکو چۆن لە پاشاندا بە درێژی باسی دەکەین (انشاء الله).

کەوابوو هەندێ لە نیشانە بچووکەکان لە گەڵ هەندێ لە نیشانە گەورەکاندا دەردەکەون وە هەندێکیان لە پاش نیشانە گەورەکان دەردەکەون وەکو (با)، ئایا دەزانی (با) چییە؟ بە پشتیوانی خوا لە پاشاندا بە درێژی باسی دەکەین (انشاء الله) بەڵام ئەو (با) یە بایەکی ساردی خۆشە کە گیانی ئیمانداران دەکێشێ لەسەر رووی زەوی تاکو لەسەر زەویدا تەنها کەسێك نامێنێتەوە بڵێت ((الله، الله)) وە لەسەر زەویدا هیچ کەس نامێنێتەوە تەنها خراپترین کەسەکان نەبێت وە قیامەت بە سەر ئەواندا هەڵدەستێ وە لەم سەردەمەدا کەعبە دەروخێنرێت بەرد بە بەرد، کەوابوو فەرموون با باسی نیشانە بچووکەکان بکەین ...

ڕەوانە کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ و مردنی و رزگار کردنی (بیت المقدس).

## نیشانەی یەکەم : ڕەوانە کردن و هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتوو لە فەرموودەی (سهل ی کوڕی سعد الساعدي)) لە فەرموودەی (أنس ی کوڕی مالك))ەوە و گوتەکەی هی (مسلم)ە لە فەرموودەی (أنس)ەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بعثت أنا والساعة كهاتين)) واتە: هاتنی من و قیامەت وەکو ئەم دووانەیە)) پێغەمبەری خوا ﷺ

---

١ ـ أخرجه البخاري، كتاب التفسير، باب (١) (٤٩٣٦)، و مسلم، كتاب الفتن و أشراط الساعة، باب قرب الساعة (٢٩٥٠) من حديث سهل. و أخرجه البخاري، كتاب الرقاق، باب قول النبي ﷺ ((بعثت أنا والساعة كهاتين)) (٦٥٠٤) ومسلم كتاب الفتن و أشراط الساعة باب قرب الساعة (٢٩٥١) من حديث أنس رضي الله عنه.

هەردوو پەنجەی شایەتمان و پەنجەی ناوەڕاستی یەك خست و دایە پاڵ یەك... بۆ؟ چونکە لە نێوان ئەو دوو پەنجەیەدا پەنجەی سێیەم نییە... یان لە بەر ئەوەی پەنجەی شایەتمان لە پاش پەنجەی ناوەراست دێت... یان لە بەر ئەوەی پەنجەی ناوەراست لە پاش پەنجەی شایەتمان دێت بە بێ جیاوازی... هەروەها پێغەمبەری خواﷺ و هاتنی قیامەت (هێندە لە یەك نزیکن)، تەمەنی میللەتان جیاوازە لە تەمەنی تاکەکان (تاکو مەسەلەکەت لێ تێکەڵ نەبێت) کەوا بوو هاتن و رەوانەکردنی پێغەمبەری خواﷺیەکەم نیشانەیە لە نیشانەکانی قیامەت چونکە لە پاش پێغەمبەری خواﷺ پێغەمبەری تر نییەو ئەو دوایین پێغەمبەرەﷺ...

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴾ الأحزاب: ٤٠، واتە: موحەممەدﷺ باوکی هیچ پیاوێکتان نییە، نە زەید و نە کەسی دیکە، بەڵکو ئەو پەیامبەری خوایە دواهەمینی پەیامبەرانە، کۆتایی زنجیرەی پەیامبەرانی پێ هاتووە، هەمیشەش خوا بە هەموو شتێك زانا و بە ئاگایە (٤٠) .))

ئەو بە بێ گومان دوایین پێغەمبەرەﷺ و پێغەمبەری تر لە پاش ئەو نییە وە هیچ نێردراوێك لە لایەن خوداوە نییە بەڵکو لە پاش پێغەمبەری خواﷺ راستەوخۆ قیامەت دێت...

هەروەکو لە هەردوو کتێبی (الصحیح)[1] دا هاتووە – بە پێی گوتەی (مسلم) – لە فەرموودەیەکی (ابو هریرە)وە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (( فضلت على الأنبياء بست: أعطيت جوامع الكلم ونصرت بالرعب، وأحلت لى الغنائم، وجعلت لى الأرض طهوراً ومسجداً، وأرسلت إلى الخلق كافة، وختم بي النبيون ))، واتە: فەزڵی من دراوە بە سەر پێغەمبەرانی تردا بە شەش ئاکار: من رەوانبێژییەکی تەواوم پێ بەخشراوە وە سەرخراوم بە سەر دوژمندا بە ترس, وە دەستکەوت و

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب الجهاد والسير، باب قول النبي (ﷺ): ((نصرت بالرعب مسيرة شهر)) (٢٩٧٧)، ومسلم كتاب المساجد و مواضع الصلاة (٥٢٣).

غەنیمەتم بۆ حەڵاڵ کراوە وە هەموو سەر زەویم بۆ پاك کراوە و کراوەتە نوێژگە، من بۆ هەموو خەڵکی ڕەوانە کراوم، کراومەتە دوایینی پێغەمبەران)).

مەبەستمان لەم فەرموودەیە ((وختم بي النبيون))واتە: کراومەتە دوایینی پێغەمبەران)) هەرچەندە چەند بانگەواز کارێکی درۆزن بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکەن ئەوا دڵنیا بە کەوا لە پاش(محمد) پێغەمبەری تر نایەتﷺ ... لە پاش ئەو خۆشەویستە هەڵبژێردراوە هیچ نێردراوێك لە لایەن خوداوە نییە، جا پێغەمبەری خوداﷺ دوایین پێغەمبەرە و دوایین نێردراوە و بە ڕەوانە کردنی ئەو زاتە پیرۆزە یەکەم نیشانە لە نیشانەکانی قیامەت دەرکەوت هەروەکو خۆی فەرموویەتی: ((بعثت أنا والساعة كهاتين))، واتە: هاتنی من و قیامەت وەکو ئەم دووانەیە))، هەردوو پەنجەی شایەتمان و ناوەڕاستی لە یەك ناو یەکی خست...

## نیشانەی دووەم و سێیەم و چوارەم و پێنجەم و شەشەم و حەوتەم:

هەموو ئەوانە لە فەرموودەکەی (عوف ی کوڕی مالك) دا هاتووە کە (ئیمامی بوخاری)[1] ڕیوایەتی کردووە (لە سەرەتادا وەکو نمونەیەك لە نمونەکانی قیامەت باسم کرد) پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((أعدد ستا بين يدي الساعة: موتي، ثم فتح بيت المقدس،ثم مُوتان يأخذ فيكم كقصاع الغنم، ثم أستفاضة المال حتى يعطي الرجل مائة دينار فيظل ساخطا، ثم فتنة لا يبقى بيتا في العرب إلا دخلته، ثم هدنة تكون بينكم وبين بني الأصفر فيغدرون، فيأتونكم تحت ثمانين غاية تحت كل غاية أثنا عشر ألفا)) واتە: شەش نیشانە بژمێرە لە پێش هاتنی قیامەت: مردنی من، پاشان ڕزگار کردنی (بيت المقدس)، پاشان مردنێکی لە ناکاو و کوت و پڕ لە ناوتاندا بڵاو دەبێتەوە وەکو ئەو دەردەی لە مەڕ دەدات، پاشان زۆربوونی سەروەت و سامان تاوەکو هەر پیاوێك سەد دیناری پێ دەدرێت کەچی هێشتا هەر پەست و نارازییە، پاشان فیتنە و ئاژاوەیەك پەیدا دەبێت هیچ ماڵێکی عەرەب نامێنێت ئیللا ئەو فیتنەیەی تێ دەچێت، پاشان ڕێککەوتنامەیەك لە نێوان ئێوە و ڕۆمەکاندا مۆر

---

١ ـ سبق وهو في البخاري (٣١٧٦).

دەکرێت، جا ئەوان ئەو ڕێککەوتنامەیە دەشکێنن، پاشان لە ژێر هەشتا ئاڵادا هێرشتان بۆ دەهێنن لە ژێر هەر ئاڵایەکدا دوازدە هەزار جەنگاوەر هەیە))

ئێستا با پێکەوە لەگەڵ ئەو نیشانانەدا ڕابوەستین، کە ڕوویداوە لەم فەرموودە پیرۆزەدا:

## ١ــ مردنی ئەو:

خۆشەویستمان کۆچی دوایی کردﷺ ... وە کۆچی دوایی ئەو خۆشەویستە گەورەترین کارەسات بوو کە بە سەر ئەم ئوممەتەدا هاتووە... تاکو (أنس) دەڵێت: وە فەرموودەکە لە سنن (الترمذي)دا هاتووە بە سەنەدێکی (صحيح)[1]: ((لما كان اليوم الذي دخل فيه رسول اللهﷺ المدينة أضاء كل شيء . فلما كان اليوم الذي مات فيه أظلم منها كل شيء، وما نفضنا عن رسول اللهﷺ الأيدي، وإنا لفي دفنه حتى أنكرنا قلوبنا))، واتە: کاتێ ئەو ڕۆژە پێغەمبەری خواﷺ هاتە شاری مەدینەوە هەموو شتێك ڕووناك بووەوە وە کاتێ ئەو ڕۆژە کۆچی دوایی کرد هەموو شتێکی تیادا تاریك بوو وە هێشتا دەستمان لە تەپوتۆزەکەی کاتی ناشتنی پێغەمبەرﷺ نەتەکاندبوو، هێشتا خەریکی ناشتنی بووین تاکو ئینکاریمان لە دڵەکانمان دەکرد)).

ڕەزای خوا لەم خۆشەویستە ئەویندارە... بۆ نا؟ بە مردنی ئەو وەحی لە ئاسمانەوە بڕا... ئای ئەوە چ کەرامەتێکە! زۆربەی خەڵکی لێی تێناگەن...

لە (صحيح مسلم)[2] هاتووە لە فەرموودەی (أنس)ەوە دەڵێت: ((قال ابو بكرﷺ بعد وفاة رسول اللهﷺ لعمرﷺ: انطلق بنا إلى أم أيمن نزورها كما كان رسول الله يزورها، قال: فلما انتهينا إليها بكت، فقالا لها: ما يبكيك؟ ما عند الله خير لرسوله فقالت: ما أبكي أن لا أكون أعلم أن ما عند الله خير لروسله، ولكن ابكي أن الوحي قد انقطع من السماء، فهيجتهما على البكاء، فجعلا يبكيان معها))، واتە: ئەبو بەکر بە

---

١ـ سبق تخريجه، رواه أحمد (٣ / ٢٢١، ٢٦٨) والترمذي (٣٦١٨)، وابن ماجه (١٦٣١).
٢ـ أخرجه مسلم، كتاب فضائل الصحابة، باب من فضائل أم أيمنﷺ (٢٤٥٤).

عومەری فەرمووی لە پاش مردنی پێغەمبەری خواﷺ: هەستە با پێکەوە بڕۆین بۆ سەردانی (أم أيمن) هەروەکو چۆن پێغەمبەری خواﷺ سەردانی ئەوی دەکرد، فەرمووی: کاتێ گەیشتنە لای ئەو دەستی بە گریان کرد، ئەوان بە (أم أيمن) یان فەرموو: بە هۆی چییەوە دەگریت؟ ئەوەی لە لای خوداوەندە چاکتر و باشترە بۆ پێغەمبەرەکەیﷺ. ئەویش فەرمووی: بۆ ئەوە ناگریم و دەزانم ئەوەی لای خوداوەندە باشترە بۆ پێغەمبەرەکەیﷺ بەڵام بۆ ئەوە دەگریم کە بە مردنی ئەو وەحی لە ئاسمانەوە بڕا، جا هەستی ئەوانی وروژاند و ئەوانیش لە گەڵ ئەودا دەستیان بە گریان کرد)).

چونکە وەحی لە ئاسمانەوە بڕا... بەڵام پێغەمبەری خواﷺ بە سوننەتەکەی لە گەڵماندایە... بە شەریعەتەکەی لە گەڵماندایە... بە ڕەوشت و ئاکارەکانی لە گەڵماندایە... بە ڕێنموویيەکانی لە گەڵماندایە... بەڵکو ئێستا ئەو خۆشەویستە و لە ژیانی بەرزەخدایە و هیچ کەس حەقیقەتی و چۆنیەتییەکەی نازانێ نە فریشتەیەکی نزیککراو و نە پێغەمبەرێکی نێردراو...

لە فەرموودەیەکی (أوس ی کوڕی أوس)دا هاتووە کە (ئیمامی أحمد و الترمذي و ابو داود و النسائي و ابن ماجه) بە سەنەدێکی (حسن)[1] ریوایەتیان کردووە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إن من أفضل أيامكم يوم الجمعة، فأكثروا علي من الصلاة فيه، فإن صلاتكم معروضة علي)) فقالوا: يا رسول الله، وكيف تعرض صلاتنا عليك وقد أرمت؟ يقولون: بليت[2] ـ أي: أكلت الأرض جسدك يا رسول الله ـ قال: (إن الله تبارك وتعالى حرم على الأرض أن تأكل أجساد الأنبياء))، واتە: باشترین ڕۆژ لە ڕۆژەکانی ئێوە ڕۆژی هەینییە، بۆیە صەڵاواتم زۆر بۆ بنێرن لەو ڕۆژەدا و دڵنیاش بن کە صەڵاواتەکانتنان بۆم نمایش دەکرێت) فەرموویان ئەی پێغەمبەری خواﷺ ..

---

١ ـ أخرجه أحمد (٤ / ٨) و أبو داود، كتاب الصلاة، باب فضل يوم الجمعة و ليلة الجمعة (١٠٤٧)، و ابن ماجة كتاب إقامة الصلاة و السنة فيها (١٠٨٥)، وكتاب الجنائز، باب ذكر وفاته و دفنه (١٦٣٦)، والنسائي (٣ / ٦٢، ٩١)، و في ((الكبرى)) (١ / ٥١٩)، وابن حبان في ((صحيحه)) (٩١٠)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود، وابن ماجة) و غيرهما.

٢ـ انظر ((لسان العرب)) (مادة: أرم).

چۆن صەڵاواتەکانمان نمایشت دەکرێت لە کاتێکدا تۆ بوویت بە خاك و خۆڵ؟ فەرمووی: خوای بەرز و پیرۆز حەرامی کردووە لەسەر زەوی جەستەی پێغەمبەران بخوات)) .

ئەی باشە گومانتان چۆنە بەجەستەی پاکترین پیغەمبەر و پێشەوای لەخواترسان و پوختەکان وە خۆشەویستی پەروەردگاری زەوی و ئاسمان؟!

بەڵێ خۆشەویستان ... کۆچی دوایی پێغەمبەری خواﷺلە گەورەترین ئەو کارەساتانەیە کەوا توشی ئەم ئوممەتە هاتووە ..بەڵکو من باوەڕم وایە کەوا مەزنترین کارەساتە بەڵام خوای گەورە ویستی و قەدەری وایە کەوا هیچ کەسێك لەسەر زەویدا بە نەمری نامێنێتەوە هەرچەندە ئەو کەسە خۆشەویستی هەڵبژێردراوی خۆی بێتﷺ.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾ الأنبياء: ٣٤- ٣٥، واتە: ئێمە پێش لە تۆ وامان نەکرد مرۆیەك نەمرێ ئایا ئەگەر تۆ بمری، ئەوانە ژیانی هەتا هەتاییان دەبێ؟! نە، هەرگیز شتی وا نییە(٣٤) هەموو گیانێك تامی مردن هەر دەچێژێ و دەمرێ، تاقیتان دەکەینەوە بە ناخۆشی،خۆشی، هەژاری، دەوڵەمەندی، لەش ساغی و نەخۆشی، تا سابیر و ناشوکر دەرکەوێ وەئیللا خوا بۆ خۆی دەزانێ وە بەمەش ئیقامەی حوججەیان لەسەر دەکات تا کەس بیانووی نەمێنێ سەرەنجام هەر بۆ لای خۆمان دەگێردرێنەوە ئەوسا بە پێی ڕەفتار و دەرچوونتان لە تاقی کرنەوەکەدا پاداش و تۆڵە وەرئەگرن (٣٥))) .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾آل عمران: ١٤٤، واتە: موحەممەدیش تەنها هەر پێغەمبەرێکە و چیتر نییە، بەر لەویش گەلێ پەیامبەرانی تر هاتوون و ڕۆیشتوون و

مردوون و دینەكەشیان دوای خۆیان هەر ماوەتەوە، ئەمیش هەر وەك ئەوان وایە، باشە ! ئەر ئەو وەفاتی كرد وەك (مووسا) و (عیسا) وەیان كوژراو شەهید بوو وەك (زەكەریا)و (یەحیا) ئێوە پاشگەز دەبنەوەو لە دین وەردەگەڕێن؟ خۆ هەركەسێكیش: پاشگەز بێتەوە و لە دین وەرگەڕێ با چاك بزانێت كە هەرگیز ناتوانێ زیانێ بە خوا بگەیەنێت، بەڵكو هەر لە خۆی زیان دەدات، دڵنیاشبن كە خوا پاداشتی شەكرانەبژێران ئەداتەوە و سەریان دەخات.(١٤٤))).

كەوابوو مردنـی پێغەمبـەری خـواﷺ نیـشانەیەكە لەنیـشانەكانی قیامـەت،دایك و باوك و روحم بە فیدای بێت...

## ٢ــ رزگار كردنی (بیت المقدس):

پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((ثم فتح بیت المقدس)) واتـە: پاشـان رزگـار كردنی (بیت المقدس) لە پاش كۆچی دوایی پێغەمبەری خـواﷺ بـە چـەند سـاڵێكی كەم (بیت المقـدس) ڕزگـرا كـرا... چـونكە پێغەمبـەری خـواﷺ لـە سـاڵی (یـازدەی كۆچی) كۆچی دوایی كرد و (بیت المقدس) لەسەردەمی (عومەر ی كـوڕی خـەتتاب) دا رزگـار كـرا لەسـەر دەسـتی (ابـو عبیـدە ی كـوڕی الجـراح) لـە سـاڵی شـازدەی كۆچی... (عومەر ی كوڕی خەتتاب) لە مەدینەی پیرۆزەوە هـات بـۆ (فلـسطین) بـە مەبەستی وەرگرتنی كلیلەكانی (بیت المقدس) وە بـە شـێوەیەكی نـەرم و نیـانی لـە گەڵ خەڵكەكەیدا جوڵایەوە و ئارامی بەخشی یـە خەڵكەكـە و سـەروەت و سـامانیان بەڵكو تەنانەت كەنیسەكانیان و هەمووانی رازی كرد ..

## ٣ـ دەرد و نەخۆشی و درم (الوبـاء):

((ثم مُوتان یأخذ فیكم كقصاع الغنم))، واتە: پاشان مردنێكی لە ناكاو و كـوت و پڕ لە ناوتاندا بڵاو دەبێتەوە وەكـو ئـەو دەردەی لـە مـەڕ دەدات)) دەرد و ئافـات و درم, تاعون (چاوە قووڵە)، ئەمەیشە مەبەستی: (تاعونی عمـواس) بـوو، (عمـواس): شارێكە لە فلـسطین بـە دووری نزیكـەی شـەش میـل لـە رێگـای (بیـت المقـدس) لـە

جێگایەك کە پێی دەڵێن (الرملة). لەم تاعونەدا واتە: (تاعونی عمواس) بیست و پێنج هەزار موسڵمان کوژران... لە سەرووی هەموویانەوە (ابو عبیدە ی کوڕی الجراح و معاذ ی کوڕی جبل) ڕەزای خوا لەوان و لە هەموو هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ ((ثم موُتان يأخذ فيكم كقصاع الغنم)) واتە: لە نێو ئێوەدا بڵاو دەبێتەوە هەروەکو چۆن دەرد و ئافات و درم لە نێو ئاژەڵ و مەڕدا بڵاو دەبێتەوە وە ئەم نیشانەیش هاتە دی و ڕوویدا... هەروەکو زانایانمان فەرموویانە...

## ٤ـ زۆر بوون و فرەبوونی سەروەت و سامان (أستفاضة المال).

((ثم أستفاضة المال)) واتە سەروەت و سامان زۆر دەبێت... وە لە گوتەی (البخاری) دا هاتووە ((لا تقوم الساعة حتى يكثر المال)) واتە: قیامەت هەڵناسێت تاوەکو سەروەت و سامان زۆر نەبێت)) .

لە ڕیوایەتێکی تردا کە لە هەردوو کتێبی (الصحیح)[1] دا لە فەرموودەی (ابی موسی الاشعری) ەوە هاتووە ((لیأتین علی الناس زمان یطوف الرجل فیه بالصدقة من الذهب ثم لا یجد أحدا یأخذها منه)) واتە: سەردەمێك بە سەر خەڵکیدا دێت کەوا کەسێك بە (صەدەقە)ی ئاڵتونەوە دەسوڕێتەوە کەچی هیچ کەسێك نادۆزێتەوە لێی وەربگرێت)).

لە (صحیح البخاری)[2] دا لە فەرموودەی (عدی کوڕی حاتم))ەوە هاتووە دەڵێت: (((بينا أنا عند النبيﷺ إذ أتاه رجل فشكا إليه الفاقة، ثم أتاه آخر فشكا قطع السبيل، فقال النبي ﷺ لعدي بن حاتم: ((يا عدي، هل رأيت الحيرة ؟)) قلت: لم أرها، وقد أنبئت عنها، فقال النبيﷺ :((فإن طال بك حياة لترين الظعينة ترتحل من الحيرة، حتى تطوف بالكعبة لا تخاف أحدا إلا الله)) يقول عدي: قلت فيما بيني و بين نفسي: فأين دعار طيئ الذين قد سعروا البلاد؟ يقول عدي: وقال لي رسول اللهﷺ ((ولئن

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب الزكاة، باب الصدقة قبل الرد (١٤١٤)، ومسلم، كتاب الزكاة، باب الترغيب في الصدقة قبل أن لا يوجد من يقبلها (١٠١٢).

٢ـ أخرجه البخاري، كتاب الزكاة، باب الصدقة قبل الرد (١٤١٣)، وانظر (٣٥٩٥).

طالت بك حياة لتفتحن كنوز كسرى )) قلت: كسرى بن هرمز؟ فقال الصادق: كسرى بن هرمز، قال عدي: فرأيت الظعينة ترتحل من الحيرة حتى تطوف بالكعبة لا تخاف إلا الله، وكنت فيمن افتتح كنوز كسرى بن هرمز، ولئن طالت بكم حياة لترون ما قال النبي أبو القاسم: لترين الرجل يخرج ملء كفه من ذهب أو فضة يطلب من يقبله منه، فلا يجد أحدا يقبله منه )) واتە: لە كاتێكدا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووم ﷺ كابرایەك هاتە خزمەتی و سكاڵای هەژاری لێ كرد، ئەمجار كابرایەكی تر هاتە خزمەتی و سكاڵای زۆربوونی ڕێگرانی كرد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بە (عدی كوڕی حاتم)ی فەرموو: ((ئەی عدی، ئایا شاری (حیرە)ت بینیوە؟ گوتم: نەمبینیوە بەڵام باسیان بۆ كردووم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر تەمەنت درێژ بێت ئەوا ئافرەت دەبینی، كە دەخرێتە سەركەژاوەیەك و دەخرێتە سەر وڵاخێك و لە(حیرە)وە دەردەچێت و تاكو (تەواف كەعبە) دەكات و لە هیچ شتێك ناترسێت تەنها خوا نەبێت، منیش لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەی ئەوانەی كە ڕێگایان لە خەڵكی دەگرد لە كوێن؟ ئەمجار فەرمووی: ئەگەر تەمەنت درێژ بێت ئەوا گەنجینەی وڵاتی كیسرا ڕزگار دەكەن، گوتم: كیسرای كوڕی هرمز؟ فەرمووی: كیسرای كوڕی هرمز، (عدی) دەڵێت: ئافرەتم دەبینی لە ناو كەژاوەیەكدا بوو بە سەر وڵاخەوە لە (حیرە)وە دەردەچوو تاكو تەواف كەعبەی دەكرد و لە هیچ كەس نەدەترسا تەنها خوا نەبێت وە من یەكێك بووم لەوانەی كە گەنجینە و وڵاتی (كیسرای كوڕی هرمز) مان ڕزگار كرد، ئەگەر ئێوە تەمەنتان درێژ بێت ئەوا ئەوە دەبینن كە پێغەمبەرمان (ابو القاسم) ﷺ فەرمووی: ئەوا سەردەمێك دێت كابرایەك دەبینی پڕ دەستی خۆی ئاڵتون و زیو دەكات بۆ ئەوەی كەسێك لێی وەربگرێت كەچی هیچ كەس نادۆزێتەوە لێی وەرگرێت)).

ئایا ئەمە ڕوویداوە؟ بەڵێ ڕوویداوە ..لە چی سەردەمێكدا؟ لە سەردەمی (عمری كوڕی عبدالعزیز) دا هەروەكو چۆن زۆربەی لێكۆڵەروان لە ئەهلی زانست دەڵێن[1]... تا گەیشتە ئەو ڕادەیە كە لە سەردەمی (عمر)دا كەسی وا هەبوو

---

١ـ انظر: ((فتح الباري)) (٦/ ٧٤٣ ط الحديث).

(صەدەقە)ی لە ماڵەکەی دەردەکرد کەچی کەسی نەدەدۆزییەوە لێی وەربگرێت چونکە خوای گەورە بە فەزڵی خۆی دەوڵەمەندی کردوون و پێشەوایەکی دادپەروەری پێ بەخشیبوون.. بۆیە ئەویش بانگەوازکارێکی دەنارد و بە شاران و وڵاتاندا بانگی دەکرد: ((هەرکەسێ قەرزی لە سەرە ئەوا دانەوەی قەرزەکەی لەسەر (بیت المال)ی موسڵمانانە)) جا عمر ی کوڕی عبدالعزیز قەرزی هەموو قەرزارانی دایەوە ((وە هەر کەسێ لەگەنجان دەیەوێ ژن بهێنێ ئەوا خەرجی ژن هێنانەکەی لە (بیت المال)ی موسڵمانانەوە دابین دەکرێت، هەر کەسێ بیەوێ حەج بکات و خەرجی حەجەکەی نییە ئەوا لە (بیت المال)ی موسڵمانانەوە بۆی دابین دەکرێت بۆیە کەسی وا هەبوو کە صەدەقەی لە سامانەکەی دەردەهێنا و بە دوای هەژارێکدا دەگەڕا کەچی نەیدەدۆزییەوە)) سبحان الله!!

خوای گەورە بە فەزڵی خۆی دەوڵەمەندیانی کردبوو بە بەرەکەتی (بیت المال)ی موسڵمانان ئەمجار بە فەزڵی دادپەروەری ئەم پێشەوا لە خواترس و دەستپاکە... چونکە ئەو لە جۆر و شێوە و شێوازی (عمر ی کوڕی خەتتاب)ە...

هەندێ لە ئەهلی زانست فەرموویانە[1]: ئەم ڕووداوە لە دواسەردەمدا ڕوو دەدات لە سەردەمی عیسا دا‌ﷺ کاتێ بۆ جارێکی تر بەرەکەت دادەبەزێتە سەر زەوی... چونکە ئێستا بەرەکەت لە کاتەکاندا نەماوە و بەرکەت لە خواردن و خواردنەوە و تەمەن و تەندروستی و لەشساغی و بەروبومدا نەماوە ... بەرەکەت لە بن دەرهێنراوە... جارێکی تر بەرەکەت دادەبزێتە سەر زەوی بە ئیزنی خوای پەروەردگار لە سەردەمی عیسای کوڕی مەریەم دا‌ﷺ (هەروەکو لە پاشاندا بە درێژی ڕوونی دەکەمەوە انشاء الله) تاوەکو وای لێ دێت لەو سەردەمەدا کەسێك (صەدەقە) لە ماڵەکەی دەردەکات کەچی هیچ کەسێك نادۆزێتەوە (صەدەقە) کەی لێ وەربگرێت چونکە خەڵکی دەزانن کەوا قیامەت نزیکە و هەروەها دەزانن کەوا پێویستیان بەو جۆرە سامانە نییە.

---

١ـ هەمان سەرچاوە.

## ٥ـ فیتنە و ئاژاوە (الفتنة).

پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: (( ثم فتنة لا يبقى بيتا في العرب إلا دخلته)) واتە: پاشان فیتنە و ئاژاوەیەك پەیدا دەبێت هیچ ماڵێکی عەرەب نامێنێت ئیللا ئەو فیتنەیەی تێ دەچێت)) وە خوای گەورە خۆی دەزانێ مەبەستی پێغەمبەرەکەیﷺ لەم (فیتنەیە) چییە.. خۆتان دەزانن کەوا فیتنە لەم سەردەمەدا چەند زۆر بووە... بەڵام نە بە عەقڵ و نە دادپەروەرییە کەوا عاقڵێك بە بەڵگەی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەیﷺ قسە بکات بڕیار بدات کەوا ئەم فیتنەیە مەبەستی دەزگاکانی ڕاگەیاندنە (بۆ نمونە) بە هەموو شێوازەکانی بینراو و بیسراو و خوێندراو... دەڵێم: نابێت هیچ کەسێك فەرموودەیەك دابەزێنێتە سەر خودی شتێکدا بەڵکو خوای گەورە خۆی مەبەستی پێغەمبەرەکەی دەزانێ ﷺ ...[١]

## ٦ـ ڕێککەوتنامەیەك لە نێوان موسڵمانان و ڕۆمەکاندا (الهدنة بين المسلمين وبني الاصفر).

ئەمەیشە نیشانەی شەشەمە لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت ((ثم هدنة تكون بينكم وبين بني الأصفر))، واتە: پاشان ڕێککەوتنامەیەك لە نێوان ئێوە و ڕۆمەکاندا مۆر دەکرێت)) مەبەست لە (بني الاصفر): ڕۆمەکانە... ڕۆمەکانیش بە زمانی ئەم سەردەمە ئەهلی ئەوروپا و ئەمریکا دەگرێتەوە...

دەڵێت: ((فيغدرون، فيأتونكم تحت ثمانين غاية)) واتە: جا ئەوان ئەو ڕێککەوتنامەیە دەشکێنن، پاشان لە ژێر هەشتا ئاڵادا هێرشتان بۆ دەهێنن)) مەبەستی لە (غاية) ئاڵایە کە بۆ سوپا بەرز دەکرێتەوە و بە ئاڵا دەڵێن مەبەست (غاية)، چونکە ئاڵا مەبەستی هەر لەشکرێکە و ئەگەر ئاڵاکە ڕووخا ئەوا مەبەستەکەیش لە گەڵیدا دەڕوخێت ..

---

١ـ قال القرطبي في ((التذكرة)) (ص ٦١٢): ((والذي ينبغي أن يقال به في هذا الباب إن ما أخبر به النبيﷺ من الفتن و الكوائن أن ذلك يكون، و تعيين الزمان في ذلك من سنة كذا يحتاج إلى طريق صحيح يقطع العذر.. )).

ڕیوایەتێکی تریشدا، کە لە پێشدا باسم کرد لە (سنن ابی داود و ابن ماجە) و (صحیح ابن حبان) دا هاتووە بە سەنەدێکی (صحیح)[١] لە فەرموودەی کابرایەك لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ پێیان دەگوت: (ذو مخمر)، دەڵێن (مخبر) کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((ستصالحون الروم صلحا آمنا، فتغزون أنتم وهم عدوا من ورائكم، فتنصرون وتغنمون و تسلمون، ثم ترجعون حتى تنزلوا بمرج ذی تلول "- والمرج: المكان الذي يكثر فيه الماء والخضرة - " فيرفع رجل من أهل النصرانية الصليب، فيقول: غلب الصليب، فيغضب رجل من المسلمين فيدقه، فعند ذلك تغدر الروم وتجمع للملحمة))) واتە: ئێوە پەیماننامەیەکی ئاشتی لە گەڵ ڕۆمدا مۆر دەکەن، جا ئێوە دەجەنگن و لە کاتێکدا ئەوان دوژمنتانن لە پاشەوەتانن، ئێوە سەردەکەون و دەستکەوتتان دەست دەکەوێت و خەڵکی دەکەنە موسڵمان، پاشان دەگەڕێنەوە تاکو لە جێگایەکدا دادەبەزن کە پێی دەڵێن (مرج ذي تلول)ە (مانای مرج: ئەو جێگایەیە کە سەوزایی و ئاوی زۆر لێیە واتە: مێرگ) ئەمجار کابرایەکی گاور خاچەکەی بەرز دەکاتەوە و دەڵێت: خاچ سەرکەوت... بۆیە کابرایەك لە موسڵمانان پەست دەبێت و لە ملی دەدا، جا لەو کاتەدا ڕۆمەکان غەدرتان لێ دەکەن و خۆیان ئامادە دەکەن بۆ داستانێك)) لەو فەرموودەی کە ئێستا ئێمە لە باسی ئەودایین ((فيأتونكم تحت ثمانيين غاية تحت كل غاية أثنا عشر ألفا))، واتە: پاشان لە ژێر هەشتا ئاڵادا هێرشتان بۆ دەهێنن لە ژێر هەر ئاڵایەکدا دوازدە هەزار جەنگاوەر هەیە)).

بیر بکەرەوە... ئەم فەرموودەیە یەکێکە لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خواﷺ کە تیایدا باسی شەش نیشانە لە نیشانەکان دەکەن کە لە پێش هاتنی قیامەت ڕوودەدەن، ئا ئەوەتا ئێمە باسی نیشانە نیشانە لە بەشەکانی داهاتوودا دەکەین...

---

١ـ أخرجه ابو داود وكتاب الملاحم باب ما يذكر من ملاحم الروم (٤٢٩٢، ٤٢٩٣)، وابن ماجة كتاب الفتن باب الملاحم (٤٠٨٩)، وقال البوصيري: ((إسناد حسن))، وأحمد في ((المسند)) (٤/٩١) و (٣٧١، ٤٠٩)، وابن أبي شيبة (١٩٤٤٩)، وابن حبان في صحيحه (٦٧٠٨، ٦٧٠٩)، والحاكم (٤ / ٤٢١)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٣٦١٢)، و ((المشكاة)) (٥٤٢٨).

## دەرکەوتن و بڵاو بوونەوەی فیتنە (ظهور الفتن)

وشەی (الفتن) کۆی (فتنة) یە، مەبەست لە (فیتنە) تاقیکردنەوە و ئەزمون دێت... خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً﴾ الأنبیاء: ٣٥، واتە: تاقیتان دەکەینەوە بە ناخۆشی، خۆشی، هەژاری، دەوڵەمەندی، لەش ساغی و نەخۆشی، تا سابیر و ناشوکر دەرکەویٚ وەئیللا خوا بۆ خۆی دەزانیٚ وە بەمەش ئیقامەی حوججەیان لەسەر دەکات تا کەس بیانووی نەمێنیٚ (٣٥)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ﴾ الأنفال: ٢٨، واتە: بشزانن کە بیٚ گومان هەموو ماڵ و سامان و منداڵتان هۆی تاقیکردنەوەن بۆتان بۆ ئەوەیە دەرکەویٚ ئاخۆ ئێوە چۆن هەڵسوکەوتیان لە گەڵ ئەکەن؟ (٢٨)) . مەبەست لە فیتنە لێرەدا تاقیکردنەوەیە... دەڵێت: (فتنت الذهب بالنار إذا امتحنته لتظهر جودته من رداءته)،[١] واتە: ئاڵتونەکەت بە ئاگر تاقیکردەوە, ئەگەر تاقیتکردنەوە بۆ ئەوەی چاك و خراپیت بۆ دەرکەویٚ)) کەواتە دەرکەوتنی تاقیکردنەوە و زۆربوونی لە نیشانەکانی قیامەتە، وا دەزانم ئێستا تاقیکردنەوە بە چاوی خۆمان دەبینین — داوا لە خوا دەکەم ئێمە و ئێوە بپارێزیٚ بە میهرەبانی و ناز و نیعمەت و چاکەی خۆی هەر ئەو پشت و پەنامانە و بە توانایە بە سەر هەموو شتێکدا —پێغەمبەری خواﷺ ئەم تاقیکردنەوەیانەی بە وردی وەصف کردووە، لە گەڵ مندا بیر بکەرەوە لەم وشانەی پێغەمبەری نازدارﷺ.

لە صحیح (مسلم)[٢]دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (أبو هريره)وە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((بَادِرُوا بِالأعْمَال فِتَناً)) واتە: بە کردەوەی چاکە پێشبرکیٚ بکەن پێش ئەوەی تاقیکردنەوە دابەزێتە سەر هەر یەکێکتاندا))... ((كقطع الليل المظلم، يصبح الرجل مؤمناً ويمسي كافراً أويمسي مؤمناً ويصبح كافراً)) واتە: وەکو پارچەیەك لە شەوەزەنگی تاریك، کە ڕۆژ دەبێتەوە کابرا ئیماندارە و کەچی ئێوارەی بە سەردا دێت کافر بووە یان کە ئێوارە دێت ئیماندارە و کاتیٚ ڕۆژ

---

١ ـ معجم مقاييس اللغة (٤ / ٤٧٢)، ولسان العرب مادة ((فتن)).

٢ـ أخرجه مسلم، كتاب الإيمان، باب الحث على المبادرة بالأعمال قبل تظاهر الفتن (١١٨).

دەبێتـەوە کـافر بـووە)) لـە یـەك ڕۆژدا کـوفر دەکـات یـان لـە یـەك شـەودا... بـۆ؟ پێغەمبەری خواﷺ دەفـەرموێت: ((یبیـع دینـە بعـرض مـن الـدنیا)) واتـە: دینەکـەی خۆی دەفرۆشێت بە شتێکی بێ نرخی دونیا)).

لە نوێژی بەیانیدا لە گەڵ تۆدا دەبێت لە ماڵێك لـە ماڵـەکانی خـوای پـەروەردگار بەڵام نوێژی مەغریب یان لە نوێژی عیشا بـە دوایـدا دەگـەڕێت کەچی نایدۆزیتـەوە !! ڕۆژی دووەم دیسان نایدۆزیتەوە و ڕۆژی داهـاتوو دیـسان نییـە، ئـەی بـۆ کـوێ ڕۆیشت؟ ئەو دینەکەی خۆی فرۆشتووە، بەرانبەر بە شتێکی کـەم و هـیچ و پووچـی ئەم دونیایـە... ڕەنگـە ئێـوارە بچێتە ژوورێکـەوە لـە ژوورەکـانی (الـشات) یـان لـە ژووری (دردشە) (لە ئەنتەرنێت)یان سایتێکی بەرەڵایی (إبـاحی) وە لـەو ژوورە یـان لەو سایتە دەرناچێت ئیللا دینەکـەی خـۆی فرۆشـتووە بەرانبـەر بـە شـتێکی کـەمی دونیـا (لا حـول ولا قـوە الا بـالله) بـە پلـە و پایەیـەکی تیاچـوو... بـە هـەوەس ئارەزوویەکی قەدەغەکراو... بە تـام و چێژێکی لـە ناوچـوو... بـە پلەیـەکی هـیچ و پووچی بێ نرخ... بە ڕاستی واقیعێکی ترسناکە و زۆربەی خەڵکی تێـی کـەوتون لـە ئاستی هەموو مرۆڤایەتی... کەسێك دەبینی (کەم تەرخەمە) لە نوێژەکانیدا یـان لـە باڵاپۆشی خێزانەکەی یان خواردنی حەرام و سوو یان خواردنی سـامانی خـەڵکی بـە ناحەق لە پێناوی شەهوەتێکی بێ نرخدا...

ئایا ئێستا دەیهێنیتە پێش چاوی خۆت لە پاش ئـەو دەربڕینـە پـڕ ڕەوانبێژییـە پێغەمبەرایەتیـە ((بـادروا بالأعمـال فتنـاً کقطـع الليـل المظلـم)) ئـەوە دەربـڕینی پێغەمبەرایەتی یە لەو پەڕی ڕەوانبێژیدایە کـە خـوای گـەورە (جوامـع الکلـم) ی پـێ بەخـشیوە... خۆشەویـستمان دەربـارەی ئـەو فیتنەیـە بـەو شـێوەیە دەری بڕیـوە ((کقطع الليل المظلم)).

بەڵێ... هـیچ ڕزگـار بوونێـك نییـە لـەو فیتنـە زۆر تاریـك و ڕەشـەدا... کـە هـیچ تروسکایی و ڕوناکی تیـادا نییـە... تـەنها بـە کـرداری چاکە نـەبێت... پێغەمبـەری خۆشەویستمانﷺ سەرنجمان ڕادەکێشێ بە ڕوونی بۆ لای چارەسەرێك چـونکە ئـەو میهرەبانییەکی بە دیاری نێـردراوە، ئـەو خۆشەویـستە نەخۆشـییەکەمان بـۆ دیـاری

دەکات و پاشان ئەم ئوممەتە جێ ناهێڵێ بە سەرسامی بمێنێتەوە بەڵکو چارەسەرەکەی بە وردی و دەستپاکی یەوە دیاری و دەست نیشانی دەکات .

لە صحیح (مسلم)[١]دا و لە فەرموودەیەکی (عبدالله ی کوڕی عمرو)ەوە هاتووە: ((نادى منادي رسول الله ﷺ: الصلاة جامعة)) واتە: بانگەوازکارێکی پێغەمبەرﷺ بانگی کرد: الصلاة جامعة)) ئەمە سەرنج رادەکێشێ و دڵەکان دەجولێنی و ماناکەی ئەوەیە: ئەی موسڵمانان کۆبنەوە بۆ نوێژ بۆ ئەوەی گوێبیستی پێغەمبەری خواﷺ بن... ڕوونکردنەوەیەکی پێغەمبەری خواﷺ هەیە و ئێستا بە سەر خەڵکیدا بڵاو دەکرێتەوە... یان چاکەیەکە دەبێتە فەرمانێك بۆ ئەم ئوممەتە یان خراپەیەك کە دەبێتە قەدەغەکراوێك لەسەر ئەم ئوممەتە...

کاتێك پێت دەڵێن: خوای گەورە فەرمووی، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی... ئەوا بە جوانی گوێ بگرە و دڵت بکەرەوە کەوا بوو خۆشەویست چی فەرموو ؟؟ فەرمووی: ((إنه لم يكن نبي قبلي إلا كان حقا عليه أن يدل أمته على خير ما يعلمه لهم وينذرهم شر ما يعلمه لهم)) واتە: هیچ پێغەمبەرێك لە پێش من نەهاتووە ئیللا لە سەری بووە کە رێنمایی ئوممەتەکەی بکاتەوە لە هەر چاکەیەك بۆیان کە بیزانێت و ئاگاداریان بکاتەوە لە هەر خراپەیەك بۆیان کە بیزانێت)).

دڵنیابە کە هەموو پێغەمبەران بۆ هەموو خەڵکی ڕەحمەتن، مرۆڤایەتی پەرتەوازە بوون و بڵاوبوونەوە هەروەکو چۆن ڕانە مەڕ پەرتەوازە دەبن... ئەمجار خوای گەورە میهرەبانییان بە سەردا دادەبەزێنێ بە ناردنی پێغەمبەران... بۆیە نابێت مرۆڤایەتی وا ببینێت (تەنانەت لە سەردەمی فضائیات دا) کەوا گەیشتوونەتە پلەیەك چیتر پێویستییان بە بەرنامەی پێغەمبەران نەماوە... ئەوانەی کەوا پەروەردگاری جیهان ناردوونی بۆ ئەوەی ئەو مرۆڤایەتییە پەرتەوازەی ونبووی گومڕایە رێنمویی بکەن بۆ رێگای ڕاست و هیدایەت... بۆ رێگای پەروەردگاری جیهان چونکە ئێستا خەڵکی وا هەن دەچپێننە گوێی مرۆڤەکانەوە و دەڵێن: شوێن کەوتنی پێغەمبەران دەبێتە بەردێك لەسەر عەقڵی مرۆڤ بۆ تێگەیشتن لەوەی کە

---

١ـ أخرجه مسلم، كتاب الإمارة، باب وجوب الوفاء ببيعة الخلفاء الأول فالأول (١٨٤٤).

لەم سەردەمەدا پێی گەیشتوون وە ئەم هەموو جیهانەی کردووەتە گوندێکی بچووك لە ڕێگای ئەم پێشکەوتنە زانستییە سەرسوڕهێنەرە لە جیهانی گەیاندن و پەیوەندی و هاتووچۆدا... تاکو کۆتایی ئەم وشە بریقەدارانە... سوێند بە خوا هیچ شتێك مرۆڤایەتی ناگەیەنێتە ئاستێك کە پێویستیان بە پێغەمبەران نەبێت... لە سەرووی هەموویانەوە و مەزنترینیان و پێشەوایان محمدﷺ ئەو کەسەی کە ئەگەر لە هەر سەردەمێکدا بوایە ئەوا پێویست بوو خەڵکی بڕۆن بۆ لای و شوێنی بکەون و باوەڕی پێ بهێنن و پشتیوانی بکەن و کۆمەکی بکەن و بە ڕێزداری بزانن ـ صلی الله وسلم وبارك علیه ـ.

پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ دەفەرموێت: (( إنه لم یکن نبي قبلي إلا كان حقا علیه أن یدل أمته علی خیر ما یعلمه لهم وینذرهم شر ما یعلمه لهم وإن أمتكم هذه جعل عافیتها في أولها )) واتە: هیچ پێغەمبەرێك لە پێش من نەهاتووە ئیللا لە سەری بووە کە ڕێنمایی ئوممەتەکەی بکاتەوە لە هەر چاکەیەك بۆیان کە بیزانێت و ئاگاداریان بکاتەوە لە هەر خراپەیەك بۆیان کە بیزانێت، ئەم ئوممەتەی ئێوە خوداوەند لە سەرەتاکەیدا خراپەی لێ دوور کردەوە))

تەماشای یەکەمین سەدە بکە، سەدەی پڕ خەیر و بەرەکەت هەروەکو پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (لە هەردوو کتێبی (صحیح)[١]دا هاتووە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی مسعود)ەوە: (( خیر الناس قرني، ثم الذین یلونهم، ثم الذین یلونهم )) واتە: باشترینی خەڵکی ئەوانەی ئەم سەدەیەن، پاشان ئەوانەی لە پاش ئەوان دێن، پاشان ئەوانەی لە پاش ئەوان دێن)).

کەوابوو پێغەمبەری خواﷺ باسی یەکەمین باشترین سەدەکان دەکات، باسی سەردەمی هاوەڵان و سەردەمی شوێنکەوتووان و سەردەمی شوێنکەوتووانی شوێنکەوتووان دەکات و دەڵێت: ((وإن أمتكم هذه جعل عافیتها في أولها، وسیصیب آخرها بلاء، و أمور تنكرونها )) واتە: ئەم ئوممەتەی ئێوە هێز و ڕەنگ و بۆی لە

---

١ـ أخرجه البخاري، کتاب الرقاق، باب ما یحذر من زهرة الدنیا (٦٤٢٩)، ومسلم، کتاب فضائل الصحابة، باب فضل الصحابة (٢٥٣٣ / ٢١٢).

سەرەتاکەیدایە و کۆتاییەکەی توشی بەڵا دەبن و توشی چەندەها کێشە دەبن کە ئینکاری لێ دەکەن))

فیتنەی وا دێت وای دەبینی زۆر سەختە و دەڵێی: من بەرگەی ئەم بەڵایە ناگرم، بەرگەی ئەم فیتنەیە ناگرم ئەمجار ئەو فیتنەیان لەسەر لادەچێت، فیتنەیەکی تر دێت کە فیتنەی پێشوو ناسك دەکاتەوە، واتە: کاتێ تەماشای فیتنەی دووەم دەکەیت دەبینی کە فیتنەی یەکەم هیچ نییە لە چاو ئەودا... پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێت: ((وتجيء فتنة فيرقق بعضها بعضا، وتجيء الفتنة فيقول المؤمن: هذه مهلكتي ثم تنكشف وتجيء الفتنة فيقول المؤمن: هذه هذه، فمن أحب أن يزحزح عن النار ويدخل الجنة فلتأته منيته، وهو يؤمن بالله واليوم الآخر، وليأت إلى الناس الذي يحب أن يؤتى إليه ))، واتە: فیتنەی وا دێت کە یەکتری ناسك دەکەنەوە (واتە: هەر فیتنەیەك دێت و ئەوەی پاش ئەو لەو خراپتر و گەورەترە)، فیتنە دێت و کەسی ئیماندار دەڵێت: بە ڕاستی ئەم فیتنەیە بە هەلاکەتما دەبات، ئەمجار ئەو فیتنەیەی لەسەر لادەچێت و فیتنەیەکی تر دێت و ئیماندار دەڵێت: ئەمە ئەمە (واتە: ئەمە بە ڕاستی بە هەلاکەتما دەبات) جا هەر کەسێ دەیەوێ لە ئاگر ڕزگاری بێت و بچێتە بەهەشتەوە با کاتێ دەمرێت باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەبێت و بڕوات بۆ لای ئەو کەسانەی کە پێی خۆشە بچێت بۆ لایان)) .

دڵنیابە کە پێغەمبەری خوا ﷺ چارەسەرەکەی دیاری کردووە بۆ هەر فیتنەیەك لە چەند وشەیەکی کەمدا بەڵام لەوپەڕی ڕەوانبێژی و ئاشکرادایە... پێویست لەسەر موسڵمان ئەوەیە لەم فیتنەیەدا باوەڕەکەی خۆی ساغ بکاتەوە و بتەوی بکات، چونکە ئیمان کۆتی ئارامی و دڵنیایی یە و پەیژەی ڕزگار بوونە لە نێو دەریای ئەم هەموو فیتنە لەسەریەك و هەڵچوانەدا... ئیمان قەڵای دڵنیاییە لە نێوان ئەم گەردەلوولە هەڵچووەدا –گەردەلوولی فیتنە – ئیمانیش پێویستی بە تازە کردنەوە هەیە بە گوێڕایەڵی... چونکە (ئیمان) وتە و باوەڕ و کردەوەیە... بە گوێڕایەڵی زیاد دەکات و بە سەرپێچی کەم دەکات... حاڵی دڵت لە کاتێکدا تۆ گوێبیستی: خوای گەورە فەرمووی... پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی... دوارۆژت دەهێننە یاد و بڕیار

دەدەیت بە دڵت کە تەوبە بکەیت و بگەڕێیتەوە... زۆر ئەستەمە حاڵی ئیمان لە دڵتدا لەم کاتەدا وەکو حاڵی ئەو کاتەی دڵت بێت کاتێ تەماشای فلیمێکی بێ ئابڕوو بکەیت یان زنجیرەیەك لە زنجیرە نزمە بێ نرخەکان!! خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِى قُلُوبِ ٱلْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِيمَـٰنًا مَّعَ إِيمَـٰنِهِمْ﴾ الفتح:٤، واتە: ئەو خوایەیە کە ئاسوودەیی و ئارامی ڕۆحی و مەعنەوی دابەزاندە دڵی بڕوادارەکان، لە کاتی پەیمانەکەی حودەیبییەدا بۆ ئەوەی بڕوایان زیاد بکات لە گەڵ بڕواکەیاندا، تا تەنها پشت بە خوا ببەستن و دڵیان تەنها یادی ئەوی تیا بە دی بکرێ)).

کەوابوو ئیمان بە گوێڕایەڵی زیاد دەکات، بە یادی خوا زیاد دەکات، بە کۆڕ و مەجلیسی زانست زیاد دەکات، بە دوور کەوتنەوە لە خوای گەورە کەم دەکات لەسەر هەر زەوییەك بێت یاخود لە ژێر هەر ئاسمانێکدا بێت...

لێرەدا ئاوڕدانەوەیەکی زانستی تر هەیە کە ئەوەیش: گوتەی پێغەمبەری خوا ﷺ (( وليأت إلى الناس الذي يحب أن يؤتى إليه ))، واتە: بڕوات بۆ لای ئەو کەسانەی کە پێی خۆشە بچێت بۆ لایان)) کەوابوو لێرەدا مافی خودا هەیە و مافی خەڵکی هەیە وە لێرەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەی (أنس) ەوە: (( لا يؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه ))، واتە: هیچ کەسێك لە ئێوە ئیمانی کامل نییە تاوەکو ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش بێت)).

ئەگەر لەم ڕوانگەوە لە گەڵ خەڵکیدا هەڵسوکەوت بکەیت، ئەوا هەرگیز ئازاری کەس نادەیت، بیر بکەرەوە لەو وشەیەی پێش ئەوەی لە حەقی کەسێکدا بیڵێیت، ئایا پێت خۆشە ئەو کەسە بە هەمان شێوە قسە لە گەڵ تۆدا بکات؟ بە هەمان زمان و شێواز؟ بە هەمان ئەو وشانەی کە تۆ ئێستا لە گەڵ ئەودا دەیکەیت؟ ئایا پێت خۆشە ئەو کردارەت پێ بکرێت کە تۆ بە براکەت دەیکەیت؟

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب الإيمان، باب من الإيمان أن يحب لأخيه ما يحب لنفسه (١٣)، ومسلم كتاب الإيمان، باب الدليل على أن من خصال الإيمان: أن يحب لأخيه المسلم ما يحب لنفسه من الخير (٤٥).

براکەم... ئەگەر تۆ کەسێکی بە توانای ئەوا بیر بکەرەوە لە توانای خوای گەورە بە سەرتەوە، ئەگەر دەوڵەمەندیت ئەوا بیر لە هەژاری خۆت بکەرەوە بەرانبەر خوای گەورە، هەر کەسێك خودای خۆی ناسی ئەوا خۆیشی دەناسێ، ئەگەر هەر کەسێك خودای خۆی بە دەوڵەمەندێکی رەها ناسی ئەوا خۆی بە هەژارێکی رەها دەناسێ... وە هەر کەسێ خواکەی خۆی بە عیززەتێکی تەواوەوە ناسی ئەوا خۆی بە زەلیلێکی تەواوەوە دەناسێ، هەر کەسێ خواکەی خۆی بە خاوەن زانستێکی تەواوەوە ناسی ئەوا خۆی بە نەفامێکی تەواوەوە دەناسێ ....

براکەم... ئەگەر تۆ کەسێکی زانایت ئەوا کێ فێری کردیت؟ وە ئەگەر تۆ کەسێکی دەوڵەمەندی ئەوا کێ دەڵەمەندی کردی؟ وە ئەگەر تۆ کەسێکی بە هێزی ئەوا کێ بە هێزی کردی؟ لە خۆ بایی مەبە... بەڵکو خواکەی خۆت باش بناسە بۆ ئەوەی توانای خۆت بناسی و بزانیت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿١٥﴾ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٦﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ﴾ فاطر:١٧، واتە: ئەی خەڵکینە! ئێوە هەژارن و نیازتان بە خوا هەیە، ئەو بێ نیاز و سوپاسکراوە هەرچەندە خەڵکی ململانێ بکات.(١٥) ئەگەر بیەوێ ئێوە لە ناو ببا و خەڵکێکی تازە بێنێت، وادەکات.(١٦) ئەو کارەش بۆ خوا گران نییە (١٧))) .

من وا دەبینم کە ئەگەر ئەم ئوممەتە هیچ شتێك جێ بە جێ نەکات تەنها ئەم ئامۆژگارییە نەبێت ئەوا هەڵسوکەوت و مامەڵەی نێوان خەڵکی ڕێك و پێك دەبوو وە ئەگەر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پێغەمبەری خواﷺ دەبووین لەم چەند وشانەدا ئەوا خوای گەورە لە فیتنە ڕزگاری دەکردین ئەوانەی کە ئاشکران و ئەوانەی کە شاراوەن...

دەڵێم: ترسناکی فیتنەکان زیاتر و زۆرتر دەبن کاتێ کە کەسانێك پێی هەڵسن و ئاگرەکەی زیاتر خۆش بکەن ((أناس من جلدتنا ويتكلمون بألسنتنا ويلبسون ملابسنا))،واتە: خەڵکانێك لەنەوەی خۆمانن و بەزمانی خۆمان قسە دەکەن و جل و بەرگەکەی ئێمە لەبەر دەکەن)) ئەوا فیتنەکە بە زەبرتر وتوندتر دەبێت...

ڕەزای خوا لە (حذیفة ی کوڕی الیمان)... دەستپاك و جێی باوەڕی نهێنییەکانی پێغەمبەری خوایە ﷺ، دەڵێی خوای گەورە منەتی کردووە بە سەریدا بۆ گواستنەوەی ئەو فەرموودانەی کە دەربارەی (فیتنەکان) هاتوون.

(حذیفة ی کوڕی الیمان)[١] دەڵێت: ((کان الناس یسالون رسول اللهﷺ عن الخیر وکنت أسأله عن الشر مخافة أن یدرکني ))، واتە: خەڵکی پرسیاریان دەکرد لە پێغەمبەری خواﷺدەربارەی خێر و چاکە، بەڵام من پرسیاری شەڕ و خراپەم لێ دەکرد لە ترسی ئەوەی پێم بگات)).

تەماشای ئەم فیقهە و تێگەیشتنە بەرزە بکە... حذیفة دەستمان دەخاتە سەر دەرگایەك لە ترسناکترین دەرگاکان، چونکە چاکە لای هەموو خەڵکی ئاشکرایە و دیارە، بەڵام هەندێ فیتنە هەیە کە پێویستی بە چاوساغی و زانیاری و تێگەیشتن هەیەو پێویستی بە دڵسۆزی و یارمەتی خوا هەیە . بۆیە ئاگاداری ئەم گفتوگۆ نایاب و بەنرخە بە، حذیفة دەڵێت: ((یا رسول الله إنا کنا في جاهلیة وشر فجاءنا الله بهذا الخیر، فهل بعد هذا الخیر من شر؟؟)) قال ﷺ: ((نعم)) واتە: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئێمە لە ناو نەفامی و شەڕ و خراپەدا بووین — واتە: پێش ئیسلام — ئەنجا خوا ئەم خێرەی هێنا و ئێمەش تێیداین و تۆشی هێنا بۆمان، ئایا لە پاش ئەم خێرە شەڕ و خراپە هەیە وەك چۆن لە پێشەوەیدا هەبوو؟ پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: بەڵێ)) ئەی خودایە! بمانپارێزە... حذیفة فەرمووی: ((و هل بعد ذلك الشر من خیر؟)) واتە: ئایا لە پاش ئەو شەڕ و خراپەیە خێر و چاکە هەیە ؟)) پرسیارێکی سەیرە! ئەگەر پێی بگوتایە بەڵێ پاش ئەوە شەڕ هەیە و حذیفة بێ دەنگ بوایە و پرسیاری دووەمی لێ نەکردایە ئەوا فیتنەکە گەورە دەبوو، بەڵام حذیفة دوودڵ بوو بۆیە فەرمووی: (( و هل بعد ذلك الشر من خیر؟ فقالﷺ : ((نعم وفیه دخن))، واتە: ئایا لە پاش ئەو شەڕ و خراپەیە خێر و چاکە هەیە؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: بەڵێ بەڵام خەڵتێکی (خەوشێك) تێدایە)) هەمووی خەیر و

---

١ـ أخرجه البخاري کتاب المناقب، باب علامات النبوة في الإسلام (٣٦٠٦)، ومسلم، کتاب الإمارة، باب وجوب ملازمة جماعة المسلمین (١٨٤٧).

چاکەی پاڵاوتە نییە بەڵکو خەیرێکە و گومان و ئارەزووەکانی تێکەڵە کەواتە پێویست بە چاورووونی دەکات بۆ ڕۆیشتن بە سەر ڕێگادا... حذیفة فەرمووی: ((وما دخنه؟ قال: ((قوم يهدون بغير هديي تعرف منهم وتنكر)) قلت: فهل بعد ذلك الخير من شر ؟))، واتە: ئایا خەوشەکە چییە؟ فەرمووی: خەڵکانێك دەبێت لەسەر بەرنامە و ئاکاری من ناڕۆن، چاکە و خراپەشیان لێدەبینیت، گوتم: ئایا لە پاش ئەو خێر و چاکەیە خراپە و شەڕ هەیە ؟)) واتە: ئایا لە پاش ئەو خەیرەی کە تێکەڵ بە خەڵتە شەڕی تر هەیە؟ لە گەڵ مندا وریای وڵامەکەی داهاتوو بە . ((دعاة على أبواب جهنم من أجابهم إليها قذفوه فيها))، واتە: بانگەوازکارانێك لەسەر دەرگاکانی دۆزەخ راوەستاون، هەر کەسێك وەڵامیان بداتەوە ئەوا فڕێی دەدەنە ناو دۆزەخەوە))

جا حذیفة بەردەوام پرسیار دەکات لە پێغەمبەری خوا ﷺ و دەڵێت .((قلت: يا رسول الله صفهم لنا، قال: هم من جلدتنا ويتكلمون بألسنتنا )) واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەسفیان بۆمان بکە؟ فەرمووی: ئەوانە لە پێستی خۆماندان و بە زمانی خۆمان قسە دەکەن (مەبەستی ئەوەیە مرۆڤن ))).

جاری یەکەم دەڵێت: ((وما دخنه؟)) ئەویش دەڵێت: (( قوم يهدون بغير هديي تعرف منهم وتنكر)).

جاری دووەم دەڵێت: ((صفهم لنا يا رسول الله )) ئەویش دەڵێت: ((هم من جلدتنا ويتكلمون بألسنتنا)) بانگەوازکارانێك لەسەر دەرگاکانی دۆزەخ راوەستاون خەڵکی بانگ دەکەن بۆ ناو دۆزەخ بە وتە و کردەوەکانیان !! یان ئەوان (خەڵکی بانگ دەکەن بۆ بەهەشت بە وتەکانیان بەڵام بە کردەوەکانیان بانگیان دەکەن بۆ ئاگر، جا هەر کاتێك بە قسەکانیان بە خەڵکی بڵێن: وەرنە پێشەوە و بێن بۆ لامان ... ئەوا کردەوەکانیان دەڵێت: گوێیان لێ مەگرن) هەروەکو (ابن القيم) [1] گوتویەتی، بۆیە زۆرجار خەڵکی دەبینی زۆر سەرسام دەبن .

---

١ـ الفوائد (٦١).

لێرەدا ریوایەتێکی تر هەیە کە چەند وشەیەکی سەیری تێدایە، ئەویش فەرمایشتی پێغەمبەری خوایەﷺکە دەفەرموێت: ((رجال قلوبهم قلوب الشياطين في جثمان إنس))[١] ماناکەی ئەوەیە: بە رواڵەتدا رواڵەتی مرۆڤە بەلام دڵەکانیان دڵی شەیتانە - پەنا بە خوا - دەبینی بە زمانی عەرەبی قسە دەکات و جل و بەرگەکەی ئێمە لە بەر دەکات کەچی دەڵێت: ((پێنووسێکی سوورم بدەنێ با هەڵەکانی قورئانتان بۆ راست بکەمەوە))!.

گوێی لێ دەگریت و لەوەوە دەخوێنیتەوە کاتێك دەڵێت: ((تەنانەت (یەکتاپەرستی) ش ستەمی لە ئافرەت کردووە، چونکە وشەی یەکتاپەرستی دەڵێت (لا اله الا هو) ئایا بۆ ناڵێن (لا اله الا هي؟))).

گوێی لێ دەگریت و لەوەوە دەخوێنیتەوە کاتێك دەڵێت: ((کۆمەڵگای هاوەڵان کۆمەڵگایەکی پارچە پارچە و سەرقاڵی کارە سووك و ریسواکان و ئارەزووە جنسیەکان بوون، ئەم دەستدرێژییە جنسییە تەنها هاوەڵە بەناوبانگەکانی نەگرتبووەوە و بەڵکو هاوەڵە ئافرەتە ناسراوەکانیشی گرتبووەوە! چونکە کاتێك نێر مێ، مێ و نێر بە یەك دەگەن و بوو بووە نەریتێکی رۆژانە کە کۆمەڵگای (یثرب) لە سەری راهاتبوون، بۆیە (محمد) بۆ نەهێشتنی تەنگی ناچار بوو کە رێگە بداتە هاوەڵانی کەوا کێشە نییە ئەگەر بچنە مزگەوتەکانەوە بە لەشگرانییەوە)).

گوێی لێ دەگریت و لەوەوە دەخوێنیتەوە کاتێك دەڵێت: من خودا هەڵنابژێرم و شەیتانیش هەڵنابژێرم چونکە هەردووکیان دیوارێکن چاوەکانم دەگرن و دایدەپۆشن... ئایا دیوارێك بگۆڕمەوە بە دیوارێکی تر؟)).

ئەی پەروەردگارمان! پەستی و تووڕەیی خۆت لە سەرمان هەڵگرە، بە پێی قسە و کردەوەی نەفامەکانمان مامەڵەمان لە گەڵدا مەکە هەر تۆ پشت و پەنایت و توانات بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

جارێکی تر دەگەڕێینەوە بۆ فەرموودەکە، حذیفة فەرمووی: ((يا رسول الله، فما تأمرني إن أدركني ذلك؟))، واتە: ئەی پێغەمبەری خواﷺ بە چی شتێك فەرمانم پێ

١ـ وهي في ((صحيح مسلم)) برقم (٥٢ / ١٨٤٧).

دەکەی ئەگەر ئەو سەردەمەم بە سەردا هات ؟))، واتە: لە کاتی فیتنەدا چی بکەم؟ پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرمووی: ((تلزم جماعة المسلمين و إمامهم)) واتە: پەیوەست دەبیت بە کۆمەڵی موسڵمانان و پێشەواکەیانەوە))، بە راستی ئەم رێگایە رێگای رزگاربوون و دەربازبوونە، لە سەردەمی فیتنەدا، ئەو شتەی کە خوای گەورە لە سەرت فراوانی کردووە خۆت لەسەر خۆت تەنگی مەکە ! وە مەڵێ: کۆمەڵەکەی من کۆمەڵەی فلانە... حزبەکەم حزبی فلانەو... مەبە کەسێکی حزبی و... مەبە کەسێکی دەمارگیر... واز بهێنە لەم دەمارگیریە سەرسەخت و گەنیوە، تەنها با دەمارگیرییەکەت بۆ کۆمەڵی حەق بێت لەسەر رووی ئەم زەوییەدا کە ئەویش کۆمەڵی موسڵمانانە، هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ ( ٧٨ ) سورة الحج ) واتە: لە پێشدا و لەم قورئانەشدا هەر خوا ئێوەی ناوناوە موسڵمان و خۆ بەدەسەوەدەر) ) خوای بەرز و بەرێز خۆی ئەم ناوەی لێ ناوین بۆیە تۆیش دەست بگرە بە کۆمەڵی موسڵمانانەوە هەروەکو چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ رێنمویی حذیفەی کردووە و فەرموویەتی: ((تلزم جماعة المسلمين و إمامهم)) کەچی حذیفة بەردەوامە لە پرسیارەکانی دەڵێت: (( فإن لم يكن لهم جماعة و لا إمام ؟))، واتە: ئەی ئەگەر موسڵمانان نە کۆمەڵیان هەبوو نە پێشەوا)) ئەویش فەرمووی: (( فاعتزل تلك الفرق كلها ولو أن تعض بأصل شجرة حتى يدركك الموت وأنت على ذلك)) واتە: خۆت بە دوور بگرە لە هەموو ئەو فیرقە و تاقمانە، ئەگەر چی بە قەپ گرتنیشت بێت بە رەگی دارێك هەتا مردن پێت دەگات، تۆش هەر بە هەمان شێوە دوور بگرە)).

جا بۆیە فیتنە و تاقیکردنەوەکە زیاد دەکات و گەورە دەبێتەوە کاتێ کەسانێك ئاگرەکە گڕ بدەن و بەرێوەی ببەن لە پێستی خۆمانن و بە زمانی خۆمان قسە دەکەن هەروەکو چۆن ئەو راستگۆیە فەرموویەتی کە هەرگیز لە خۆ ، قسە ناکات.

بەڵاکە زیاتر و زۆرتر دەبێت کاتێ بزانیت کەوا فیتنەکە رووبەرووی دڵەکان دەبێتەوە... هەندێ کەس هەن وا دەزانن ئەگەر لە جێگای فیتنەکە دوور بکەونەوە لە پاش ئەوەی رووبەرووی بووەوە بە چاوەکانی بینی و بە گوێیەکانی گوێبیستی

وشەکانی بوو بەڵکو ڕەنگە بە ئەندامەکانی بەشداری کرد بەڵکو ڕەنگە دڵەکەی پەیوەست بوو پێوە، پاش ئەوە وا دەزانێ ئەگەر ئەو لەو جێگەیە دوور بکەوێتەوە ئەوا هەموو شتێك تەواو دەبێت... بەڵام کاتێ دەڕوات بۆ سەر جێگەکەی بۆ ئەوەی بخەوێ ئەوا دیمەنی ئەو فیتنانە دیسان بە بەر چاویدا دێن و دەچن و وێنە بە وێنە وشەکانی فیتنە دەبیسێ و لە گوێیدا دووبارە دەبێتەوە وشە بە وشە...بۆ؟

چونکە پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: (هەروەکو لە (صحیح مسلم))[1]دا هاتووە لە فەرموودەی (حذیفة ی کوڕی الیمان)ەوە کە دەڵێت: ((تعرض الفتن علی القلوب کالحصیر عودا عودا))، واتە: فیتنەکان ڕووبەڕووی دڵەکان دەبنەوە وەکو حەسیرێك دار بە دار))، واتە: فیتنە بە فیتنە ((فأي قلب أشربها نكتت فيه نكتة سوداء))، واتە: هەر دڵێك خواردیەوە و وەریگرت ئەوا خاڵێکی ڕەشی تیادا بە جێ دەهێڵێ)) ئەی خودایە!! جا هەر دڵێك هەندێ لەو فیتنەیەی چەشت ئەوا شوێنەوارێکی ڕەش لە ناو دڵیدا دەهێڵێتەوە ((وأي قلب أنكرها))، واتە: هەر دڵێك ئینکاری لێ کرد و ڕەدی کردەوە))، بە هیچ شێوەیەك جێگای فیتنەی تیادا نابێتەوە، چونکە بە فەزڵی خوا پڕە لە ئیمان و قورئان نوێژ و تەسبیحات و ئیستغفار و فەرمان کردن بە چاکە و بانگەواز کردن بۆ خوا و خۆشویستنی هەژاران و نەداران، جا ئەوە دڵێکە پڕە لە چاکە، بۆیە فیتنە دێت بە دوای جێگایەکدا دەگەڕێت لەو دڵە ڕوناك و گوێڕایەڵەدا کەچی هیچ جێگایەك بۆ خۆی نادۆزێتەوە و ئەمجار دەردەچێت! بەڵێ... ئەو فیتنەیە ڕووبەڕوو دەبێتەوە بەڵام لە ناو دڵەکەیدا جێی نابێتەوە و دڵەکان هیچی لێ ناخواتەوە چونکە ئەو ئینکاری لێ کردووە .

ئەی من لە پێشدا نەمگوت: کەوا دەبێ چۆڵکردن و بەتاڵکردن (التخلية) لە پێش خۆڕازاندنەوە (التحلية) وە دەبێ دڵەکان پاك بکەیتەوە لە پێشدا بۆ ئەوەی مادەی ئیمانی تیادا جێگیر بێت بۆیە لە پاش ئەوە ئەگەر فیتنەی ڕووبەڕو بێتەوە ئەوا ڕەدی دەکاتەوە و وەری ناگرێت ((وأي قلب أنكرها نكت فيه نكتة بيضاء حتى تصير على قلبين، على أبيض مثل الصفا، فلا تضره فتنة ما دامت السموات

---

١ـ أخرجه مسلم، كتاب الإيمان، باب رفع الأمانة و الإيمان من بعض القلوب و عرض الفتن على القلوب (١٤٤).

والأرض،وعلى أسود مربادا كالكوز مجخياً لا يعرف معروفا ولا ينكر منكرا إلا ما أشرب من هواه )) وقلب أبيض لا تضره فتنة ما دامت السماوات والأرض))، واتە: هەر دڵێك ئینكاری لە فیتنەكە كرد ئەوا خاڵێكی سپی تیادا بە جێ دەهێڵێ، تاكو دەبێتە دوو جۆرە دڵ: یەكێكیان سپی هەروەكو شتێك روون و پاك و بێگەرد بۆیە چیتر هیچ زیانی پێناگەیەنن تاكو زەوی و ئاسمانەكان هەن، ئەویتریان دڵێكی رەشە وەكو گۆزەیەكی لارەوە بوو وایە جا هیچ چاكەیەك ناناسێت، هیچ خراپەیەك ئینكار ناكات ئیللا شتێك كە ئارەزووەكەی پێ ئاو بدات)) ئەوە دڵێكە پڕ لە هەوەس و ئارەزووە !.

هەوەس و ئارەزوو پادشایەكی ستەمكاری نەفامی زۆردارە، گوێیەكان كەڕ دەكات بۆ بیستنی حەق وە چاوەكان كوێر دەكات بۆ بینینی بەڵگە و چاكەكاری، هەرچەندە ئەو بەڵگە و چاكەیە وەكو ڕۆژی روون و روناك ببێت لە كاتی چێشتەنگاودا وە وەكو رۆژ وابێ كاتێك دەدرەوشێتەوە، خاوەنی هەوەس و ئارەزوو هەرگیز قسەیەك وەرناگرێت لە خوداوە و یان لە پێغەمبەری خوداوەﷺ، پێی دەڵێیت: گۆشتی بەراز حەرامە، كەچی ئەو پێت دەڵێت: بەڵی جاران حەرام بووە چونكە نەخۆش بووە و نەخۆشی لە گەڵ خۆیدا گواستووەتەوە، بەڵام ئێستا بەراز لە كێڵگە تەندروستەكاندا بە خێو دەكرێت و لە ژێر چاودێری پزیشكی پسپۆردا ئیتر بۆ حەرامە؟! پێی دەڵێیت: ئاڵتون حەرامە، ئەو دەڵێت: بۆ؟ چی شتێك و هۆكارێك هەیە بۆ حەرام كردنی ئاڵتون لە پیاوان؟

پێی دەڵێیت: مەی حەرامە... ئەو دەڵێت: بەڵێ، بەڵام ئەوانەی ئەم سەردەمە پێی ناڵێن مەی بەڵام پێی دەڵێن (المشروبات الروحية) بە ناوی ترەوە ناویان لێ ناوە بە هۆی ئەوەی لە گەڵ ئەم سەردەمەی تیایدا دەژین بیگونجێنن...

إن قلت قال الله قال رسوله — همزوك همز المنكر المتغال
أو قلت قال الصحابة و الأولو — تبعٍ لهم في القول والأعمال
أو قلت قال الشافعي وأحمد — وابو حنيفة والإمام الغالِ
صدوا عن وحي الإله ودينه — وأحتالوا على حرام الله بالإحلال

یـا أمـة لعبـت بـدين نبيهـا كتلاعـب الـصبيان فى الأوحـال

حاشا رسول الله يحكم بالهوى تلــــك حكومـــــة الــــضلال

واتە: ئەگەر بڵێیت خوا و پێغەمبەرەکەی فەرمووی، ئەوا چاوەقرپێت لێ دەکەن وەکـو کەسـێکی بـێ بـڕوای لـە خۆبـایی، یـان بڵێیـت هـاوەڵان فـەرموویان و شوێنکەوتووانی ئـەوان لـە وتـە و کردەوەکانیانـدا، یـان بڵێیـت (الـشافعی) و أحمـد فەرمووی ابو حنیفە و پێشەوای بە نـرخ و گرانبـەها (مەبەسـتی مالکـە)، بەرهەڵستی وەحی خوا و دینەکەی دەکەن، فێڵ دەکەن لەوەی خوا حـەرامی کـردووە و حـەلاڵی دەکەن، ئەی ئەو ئوممەتەی کە بـە دیـنی پێغەمبەرەکـەی یاریـان کـردووە وەکـو یاریکردنی منداڵ لە نێو قوڕاودا،حاشا بێت کە پێغەمبەر حوکم بە هەوەس بکات، بە راستی ئەوە حوکمێکی کوێرانەیە...

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ﴾ ص:٢٦، واتە: ئەی داوود! بە راستی ئێمە تۆمان کردە جێنشین لەسەر زەویدا بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری مەردم، دەسا تۆیش بە شێوەیەکی پەسەند و بە هەق و دادگەرانە لە نێوان خەڵکدا بڕیار بدە و حوکم بکە، و شوێن هەوا و ئارەزوو مەکەوە لە حوکمکردندا تا بەو هۆیەوە لە رێگای خوا گومڕات بکات بێ گومان ئەو کەسانەی کە لە رێی خوا لادەدەن و گومڕا ئەبن سزا و جەزرەبەی توند و سەختیان بۆ هەیە بە هۆی ئەوەی کە رۆژی حیساب و پاداشت و تۆڵەیان لە بیرکردووە)).

حذیفة دەڵێن [١]: ((القلوب أربعة: قلب أجرد فيه سراج يزهر– أي: ينير– وقلب

١ـ أخرجه ابن أبي شيبة في ((المصنف)) (١١/ ٣٦) عن أبي البختري عن حذيفة، قال أبو نعيم في ((الحلية)) (٤ / ٣٨٥): ((و أرسله) وقد روي مرفوعاً، أخرجه أحمد (٣ / ١٧)، و أبو نعيم (٤ / ٣٨٥) عن أبي سعيد الخدري مرفوعاً، وفيه علتان: ضعف ليث، والانقطاع بين أبي البختري و أبي سعيد، وضعفه الشيخ شعيب في تحقيق المسند (٢٩ / ١١)، وانظر: ((مجمع الزوائد)) (١ / ٦٣).

أغلف مربوط على غلافه، وقلب منكوس، وقلب مصفح، فأما القلب الأجرد فقلب المؤمن سراجه فيه نوره، وأما القلب الأغلف فقلب الكافر، وأما القلب المنكوس فقلب المنافق عرف ثم أنكر، وأما القلب المصفح فقلب فيه إيمان ونفاق فمثل الإيمان فيه كمثل البقلة يمدها الماء الطيب، ومثل النفاق فيه كمثل القرحة يمدها القيح والدم، فأي المادتين غلبت على الأخرى غلبت عليه))، واتە: دڵەکان چوار جۆرن: دڵێکی رووت و بەتاڵ چرایەکی تێدایە و روناکی دەتاتەوە، دڵێکی بەرگ گیراو و بە بەرگەکەی بەستراوەتەوە (واتە: دڵکوێربووە)، دڵێکی سەرەوخوار، دڵێکی گوشاد، جا دڵە رووتەکە ئەوا دڵی ئیمانداره چراکەی تێدا روناکییەکەیەتی، دڵە بەرگ گیراوەکە ئەوا دڵی بێباوەڕە، دڵە سەرەوخوارەکە ئەوا دڵی دووڕووە حەقی ناسی، بەڵام پاشان نکۆڵی لیّ کرد، دڵە گوشادەکە ئەوا ئەو دڵەیە کەوا ئیمان و دووڕووی تێدایە جا نمونەی ئیمانەکە وەکو سەوزی وایە و ئاوی پاکی پیّ دەگات، نمونەی دووڕوویییەکەی وەکو برینێك وایە و خوێن و زوخمی پیّ دەگات، جا هەر مادەیەك لەو دووانە زاڵ بوو بە سەر ئەویتردا ئەوا زاڵ دەبیّ بە سەریدا)).

بەڵیّ ئەی ڕێزداران... هاتنی فیتنە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی قیامەت جا ئەو فیتنەیە زۆر بووەتەوە و زیادی کردووە و گڕی گرتووە وەکو ئەوەی کە پووش و پەڵاش ئاگری تیّ بەر بووبێت...

پێش ئەوەی ئەم بەشە تەواو بکەم دەڵێم: فیتنە بە گشتی دەبنە دوو بەشەوە و سێیەمیان نییە ئەوانیش:

فیتنەی هەوەس و ئارەزوو (الشهوات)، فیتنەی گومان و دوو دڵی ((الشبهات))

- فیتنەی هەوەس و ئارەزوو (الشهوات)...

ئەمەیشە جۆرەکانی زۆرە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ﴾ آل عمران:١٤، واتە: حەزوو ئارەزوو بۆ ژنان بۆ کوڕانی زۆر و بۆ کۆگا و کیسەی زێڕ و زیوو، بۆرەوە ئەسپی نیشاندار و پڕخاڵ و

بۆ مەڕ و بزن و وشترو گاو مەزرا و کشتوکاڵ ڕازێنراوەتەوە بۆ خەڵك و لایان شیرینکراوە تەنانەت گەلێ جار زیانی خۆشیانی تێدایەو ملی خۆیانی بۆدەشکێنن کەچی هەر کەمی ناکەنەوە!!)) ئەمە نمونەیەکە لە نمونەکانی فیتنەی هەوەس و ئارەزوو.

پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەی (عمرو ی کوڕی عوف الأنصاري) ەوە دەڵێت: ((والله ما الفقر أخشى عليكم ولكني أخشى أن تبسط عليكم الدنيا كما بسطت على من قبلكم، فتنافسوها كما تنافسوها، وتهلككم كما أهلكتهم))، واتە: سوێند بە خوا هەرگیز لە هەژاری لێتان ناترسم بەڵام لەوە دەترسم کە نیعمەتەکانی دونیاتان بە سەردا بڕێژرێ هەروەکو چۆن بە سەر ئەوانەی پێش ئێوەدا ڕژا و ئێوەش پێشبڕکێی تیادا بکەن هەروەکو ئەوان کردیان و ئەمجار بەهەلاکەتدا بتانبات هەروەکو چۆن ئەوان بە هەلاکەتدا چوون)).

تەماشای فیتنەی سامان بکە و تەماشای فیتنەی دونیا بکە، جا سامان فیتنەیەکی زۆر سەختە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ﴾ التغابن: ١٥، واتە: بە ڕاستی ماڵ و منداڵەکانتان بەڵان بۆتان پێیان تاقی دەکرێنەوە تا دەرکەوێ کامتان گوێڕایەڵی دەکەن و کامیشتان یاخی دەبن کەوابوو بێدار و هۆشیار بن پێیان فریو نەخۆن!))، واتە: تاقیکردنەوە، جا منداڵ فیتنەیە، بەڵێ بەرپرسیاری دەربارەی ئەوان، ئەوان دەبنە جێی تاقیکردنەوەی تۆ، جاری وا هەیە خوای گەورە (خەیر) دەکاتە فیتنە هەروەکو چۆن لە (شەڕ) دا فیتنە هەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً﴾ الأنبياء:٣٥، واتە: تاقیتان دەکەینەوە بە ناخۆشی،خۆشی، هەژاری، دەوڵەمەندی، لەش ساغی و نەخۆشی، تا سابیر و ناشوکر دەرکەوێ وەئیللا خوا بۆ خۆی دەزانێ وە بەمەش

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب الرقاق، باب: ما يحذر من زهرة الدنيا و التنافس فيها (٦٤٢٥) وفي (٣١٥٨)، ومسلم كتاب الزهد والرقاق باب (٥٣) (٢٩٦١).

ئیقامەی حوججەیان لەسەر دەکات تا کەس بیانووی نەمێنیٚ)).

ئێستا(ترمومتر)ێکی زۆر ورد دەخەمە بەر دەستت بۆ ئەوەی نیعمەتەکانی بەردەستت بناسیتەوە، ئایا ئەوە نیعمەتە یان تۆڵە سەندنەوەیە (نقمە)؟ تەماشای ئەو سامانەی بەردەستت بکە کە خوای گەورە پێی بەخشیوی ئایا نیعمەتە یان فیتنەیە؟ منداڵەکانت ئایا نیعمەتن یان فیتنەن؟ ئەو کورسییە و پلە و پایەی کە تۆی تیادای، پێگە کۆمەڵایەتییەکەت، ئایا نیعمەتە یان فیتنەیە؟ چۆن ئەوە بزانم؟ خێراکە پێم بڵێ چۆن لە یەك جودایان بکەمەوە؟ وەڵام: (بە ددانەکانت توند بیگرە و بزری مەکە،چونکە زۆر بەنرخە!!) دەڵێم: ئەگەر ئەو سامانەی بەردەستت لە خوای گەورە نزیکت بکاتەوە ئەوا نیعمەتە، هەروەها ئەگەر سەروەت و سامانەکەت لە ڕێگای حەلاڵەوە کۆت کردەوە و حەقی خوای گەورەت لێ دەرهێنا ئەوا نیعمەتە، ئەگەر سامانت بە حەرام کۆ کردەوە، لە گەڵ ئەوەیشدا خوای گەورە سامانەکەت زیاد دەکات ئەوا دڵنیا بە کە فیتنەیە و لە بەرگی نیعمەت دایە، کەوابوو هەموو خەیرێك کە لە بەر دەستت دایە ئەگەر لە خوا نزیکت بکاتەوە ئەوا نیعمەتە و ئەگەر لە خوا دوورت بکاتەوە ئەوا فیتنەیە و لە بەرگی نیعمەتدایە. وە هەروەها پلە و پایە ئەگەر لە خوا نزیکم بکاتەوە ئەوا من ئەم کارەم کردووە لەم جێگەیەدا بۆ خوای گەورە و دینی خوا و خزمەتی موسڵمانان، ئەم کار و کورسییە یان ئەم پلە و پایەم نەگرتووەتە دەست بۆ ستەم کردن لە هەژاران و نەداران یان بەدەست هێنانی هەوەس و ئارەزوویەکی پیس و بێ نرخ، یان شتێکی کورتی لەناوچوو، ئەگەر لەخوا نزیکی کردیتەوە ئەوا نیعمەتە و پێویستی بە سوپاسگوزاری هەیە، ئەگەر لە خوا دووری کردینەوە ئەوا دڵنیا بە کە فیتنەیە هەر چەندە لە پێش چاوت پۆشاکی نیعمەتی لە بەر کرد، جا دڵنیابە ئەو فیتنەیە کە ڕاستییە.

باش بیر بکەرەوە لە گوتەی خوای گەورە کاتێك دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِمۡ أَبۡوَٰبَ كُلِّ شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ أَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةً فَإِذَا هُم مُّبۡلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْۚ وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ الأنعام: ٤٤-٤٥، واتە: جا کە ئەو هەموو ئامۆژگاریەیان لە بیرخۆ بردەوە کە لەسەر زمانی پەیامبەران کرابوون ئینجا ئێمەیش بۆ خەفڵاندنیان و وەك(إستدراج) ێکیش،

دەروازەی هەموو خێرێکمان بۆ والآ کردنەوە و رزق و ڕۆزییەکی فرەمان رشت بە سەریاندا و ئەوانیش خۆشی و نەشوە گرتنی هەتا بەو ماڵ و منداڵەی پێماندابوون دەعیەو فیزگرتنی و لە ڕێی راست لایاندا ئەوسا ئێمەیش کتوپڕێك رقمان لێ گرتن و ئەوانیش لەو هەموو خۆشگوزرانییە بێ هیوا و نائومێد بوون.(٤٤) ئینجا ئەوانەی کە ناهەقی و ستەم پیشەیان بوو، هەموو خێر و خۆشیەکیان لە کیس چوو و دوابڕاو بوون سوپاس و ستایشی بێ پایانیش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان.(٤٥)).

جۆرەکانی هەوەس و ئارەزوو زۆرن، بەلآم دەڵێم: جۆری ئارەزووەکە هەر چۆنێك بێت ئەگەر بەندەکە تەوبەی لێ کرد و گەڕایەوە بۆ لای خوا ئەوا خوا تەوبەکەی لێ وەردەگرێت هەرچەندە ئەگەر توشی زینایش هاتبێ، ئەگەر توشی کردارەکانی قەومی (لوط) بوو، ئەگەر مەی خواردەوە، ئەگەر دزی کرد وە هەرچەندە تاوانەکە گەورە بێت، هەرچەندە تاوانەکە ترسناك بێت ئەگەر بەندەکە تەوبەی کرد و لە بن دەریهێنا و پەشیمان بووەوە و کرداری چاکەی ئەنجام دا ئەوا خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، چونکە ئەهلی سوننە هیچ کەسێك بە کافر نازانن کاتێ تاوانێك لە تاوانە گەورەکان ئەنجام بدات ئەمەیشە فەزڵی خوای گەورەیە بە سەر بەندەکانییەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ الفرقان: ٧٠، واتە: مەگەر کەسێك پەشیمان دەبێتەوە و بڕوا بێنێ و کاری چاك ئەنجام بدا ئا ئەو کەسانە خوا گوناه و خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێت بەچاکە، هەمیشە خوا گوناه پۆش و میهرەبانە)).

- بەلآم فیتنەی گومان و دوو دڵی (الشبهات).

ئەمە ترسناکترە، چونکە ئەگەر دڵەکان تامی گومانی چەشت ئەوا دەبێتە باوەڕێك لای خاوەنەکەی و رەنگە لەو پێناوەدا بکوژرێت یان ئەو لەو پێناوەدا کەسی تر بکوژێت، چونکە ئەو وا دەزانێ لەسەر بیر و باوەڕی راستی یە، ئەویش لەو رێگایەوە دین سەر دەخات، کەچی لە راستیدا گومان و دوو دڵی یە ! !

(ئیمامی أحمد) و (أبو داود) و (الحاكم) و (الدارمی) و جگە لەوان ڕیوایەتیان كردووە بە سەنەدێكی (صحیح)[1] لە فەرموودەی (معاویە ی كوڕی أبو سفیان)ەوە كەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (( افترقت الیهود علی إحدی و سبعین فرقة فواحدة في الجنة وسبعون في النار، وافترقت النصاری علی ثنتین و سبعین فرقة فإحدی و سبعون في النار و واحدة في الجنة والذي نفس محمد بیده لتفترقن أمتي علی ثلاث وسبعین فرقة، فواحدة في الجنة وثنتان و سبعون في النار )) قیل: یا رسول الله ! من هم! قال: (( الجماعة )) واتە: جولەكەكان لە نێو خۆیاندا بوونە حەفتا و یەك تاقم و فیرقەوە و یەكێكیان لە بەهەشتدایە و حەفتای لە ئاگردایە،وە گاورەكان لە نێو خۆیاندا بوونە حەفتا و دوو تاقم و فیرقەوە حەفتا و یەك تاقمیان لە ئاگردایە و یەكێكیان لە بەهەشتدایە، سوێند بەو خوایەی كە گیانی (محمد)ی بە دەستە بە دڵنیاییەوە ئوممەتەكەم دەبێتە حەفتا و سێ تاقم و فیرقەوە، یەكێكیان لە بەهەشتدایە و حەفتاو دووی لە ئاگردایە، فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ كێن ئەو كۆمەڵە ڕزگار بووە؟ فەرمووی: كۆمەڵی موسڵمانانە)).

لە ڕیوایەتێكی تردا كە (الترمذي)[2] ڕیوایەتی كردووە: ((علی ثلاث و سبعین ملة كلها في النار إلا واحدة)) قالوا: من هي یا رسول الله . قال: ((ما أنا علیه و أصحابي))، واتە: دەبێتە حەفتا و سێ تاقم و فیرقەوە، یەكێكیان لە بەهەشتدایە و حەفتاو دووی لە ئاگردایە، فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ كێن ئەو كۆمەڵە ڕزگار بووە؟ فەرمووی: ئەو بەرنامەیەیە كە ئەمڕۆ من و هاوەڵانمی لە سەرە)).

---

١ـ أخرجه أحمد (٤/ ١٠٢)، وأبو داود، كتاب السنة، باب شرح السنة (٤٥٩٧)، والدارمي (٢٥١٨)، والحاكم (١٢٨/١) بسند حسن عن معاوية رضي الله عنه.

قال الحاكم: ((هذه أسانيد تقام بها الحجة في تصحيح هذا الحديث)) ووافقه الذهبي.

وقال شيخ الإسلام في ((الاقتضاء)) (١ / ١٢٢): ((هذا حديث محفوظ من حديث معاوية)) و أصل حديث الافتراق ثابت من طرق أخرى، كما عند أبي داود (٤٥٦٦)، والترمذي (٢٦٤٠)، وابن ماجه (٣٩٩١)، وأحمد (٢ / ٣٣٢)، من حديث أبي هريرة مرفوعاً، وسنده حسن

٢ ـ أخرجه الترمذي، كتاب الإيمان، باب ما جاء في افتراق هذه الأمة (٢٦٤١) وقال: ((هذا حديث حسن مفسر غريب))، والحاكم في ((المستدرك)) (١ / ١٢٨، ١٢٩) من حديث عبدالله بن عمرو مرفوعاً، وفي سنده الأفريقي و هو ضعيف، لذا ضعفه من هذا الوجه الحاكم، ورمز السيوطي لضعفه في ((الجامع الصغير)) (٧٥٣٢ – فيض).

وقال الشاطبي في ((الأعتصام)) (١ / ١٦٥): ((إسناده غريب)).

ئـەم گومانانـەش زۆر ترسـناکن، کەبـە هۆیـەوە چـەندەها کۆمـەڵ جیابوونـەوە, هـەروەکو ابـن القـیم[1] دەفـەرموێت: هـیچ شـتێك (القدریـە و المرجئـە و الخـوارج و المعتزلـە و الـروافض) و هـەموو کۆمەڵـەکانی تـری ئـەهلی بیدعـەی بـەو ڕێگایـەدا نەبردووە کە تێی کەوتوون تەنها خراپ تێگەیشتن لە خوا و پێغەمبەرکەیﷺ.

ئایا دەزانی الخوارج ئیمامی (علی) یان بە کافر دەزانـی ؟؟ لـە کاتێکدا ئـەو چ کەسێکە ! ! ؟؟ ئەو ئەو کەسەیە کە لە ماڵەکەی پێغەمبەری خواداﷺ گەورە بووە و ئەوەیشە بەسە... بە کافریان زانی بە هـۆی گومانێکـەوە ! کـە ئێستا کـاتی ئـەوە نییە باسی بکەین وە بە درێژی لە کتێبی (الفتنة بین الصحابة) دا باسـم کـردووە بـۆ هەر کەسێ دەیەوێ بگەڕێتەوە بۆی، بەڵام دەمەوێت باسەکە تەواو بکەم بـە دانـانی چەند خاڵێکی کرداری (عملی) وەکو چارەسەرێك بـۆ ئـەم نەخۆشـییە ترسـناکە، لـە کاتێکدا کە فیتنە بڵاو بووەتەوە، فیتنەی هەوەس و ئـارەزوو وە فیتنـەی گومـان و دوو دڵی... وە من هیچ سەردەمێك نازانم (بە پێی خوێندنەوەکانم) کە بـەو شـێوەیە فیتنەی تیادا بڵاو ببێتەوە (لە هەردوو جۆرە فیتنەکە) وەکو ئەم سەردەمە, کـەوابوو هەنگاوە کردارییەکان (عملی) چین بەرەو ڕێگای ڕزگار بوون ؟

## یەکەم: خاڵی کرداری سەر ڕێگا

ڕاستکردن و دڵسۆزی لە کاتی داواکردنی یارمـەتی لـە خوداوەنـدی گـەورە و بـێ هاوتاوە، والله من هیچ ڕزگار بوونێکم نییە و تۆیش هیچ ڕزگار بوونێکت نییـە تـەنها بەڕاستکردن لە کاتی پەنا گرتندا بە خوای گەورە، بەو زانیارییەی کە پێتـە هـەرگیز لە خۆ بایی مەبە، نە بە گوێڕایەڵیکەتیش، نە بە پەرستنەکەتیش... بەڵکو پـەنا بـە خوا بگرەو دڵنیابە، کـە هـیچ ڕزگارکـەرێك و هـیچ پەنایـەك نییـە تـەنها بـۆ لای ئـەو نەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾ البقـــــرة: ١٨٦، واتە: هەر کاتێ بەندەکانم لە بارەی من پرسیارت لێ دەکەن: ئایا مـن دوورم لێیانەوە یان نزیك؟ دەبێ بـزانن، مـن زۆر نـزیکم لێیانـەوە بـە هانـاو پاڕانـەوەی نـزا

---

١ـ ((الروح)) (ص ٦٣ دار الكتب العلمية).

گوێیانەوە دێم و وەڵامیان ئەدەمەوە هەر کە لێم وەپاڕێن دەبا ئەوانیش فەرمان و داخوازی من وەڵام بدەنەوە و فەرمانەکانم پشتگوێ نەخەن و باوەڕی تەواو بتەویان بە من هەبێ، بەشکو ڕێی ڕاست بۆ خۆ بە دی بکەن.))

هیچ هێز و توانایەکمان نییە بۆ ئەنجامدانی گوێڕایەڵی یان وازهێنان لەسەرسەرپێچی یان هەڵاتن و دەرباز بوون لە فیتنە تەنها بە یارمەتی خوای گەورە نەبێت...

ابن الجوزی[1] دەڵێت: ((شێخێك لە ئەهلی زانست و زانیاری لە قوتابییەکەی خۆی پرسی کە لە مەجلیسکەدا لای بوو، فەرمووی: کوڕم... چی دەکەیت ئەگەر بە لای ڕانەمەڕێکدا تێپەڕیت و سەگی ڕانەمەڕەکە پێت وەڕی (حەپەی کرد)؟ فەرمووی: مەڕەکان لە خۆم دوور دەخەمەوە تا لە توانامدایە، فەرمووی: ئەی چی دەکەیت ئەگەر جارێکی تر پێت وەڕی؟ فەرمووی: سەگەکە دەگەڕێنمەوە تاکو دەتوانم. فەرمووی: ئەی چی دەکەیت ئەگەر بۆ جاری سێیەم وەڕی؟ فەرمووی: وەکو ئەوەی جاری پێشوو دەکەم... فەرمووی: کوڕم... جا ئەوە درێژە دەکێشێ، بەڵام ئەگەر ڕزگار بوونت دەوێ و دەتەوێت بپەڕیتەوە پەنا بگرە بە خاوەنی مەڕەکە ئەوا سەگی ڕانەمەڕەکەت لە کۆڵ دەکاتەوە... ئەگەر ڕزگار بوونت دەوێ ئەوا پەنا بە خوا بگرە جا فێڵی شەیتانت لە کۆڵ دەکاتەوە)) کەوابوو هیچ ڕێگا چارەیەك نییە لە فیتنە ڕزگارت بکات تەنها بە ڕاستکردن نەبێت لە پەنا گرتنت بە خوای گەورە...

**هەنگاوی دووەم: دەست گرتن بە بەردەوامبوونەوە لە کاتی تەنگانەدا ...**

لە پاش ئەوەی پەنات بە خوا گرت و پەرستنەکانت ئەنجامدا، نوێژەکان لە کاتی خۆیدا ئەنجامدا و خوێندنەوەی قورئان و پارێزگاری کردن لە ویردەکان و ئیستغفارو زەلیلی نواندن و پاڕانەوە و تەسبیحات و سوپاس گوزاری خوداوەند و وتنی (لا الە الا اللە و اللە أکبر).. تاکو کۆتایی ئەو جۆرەکانی تر لە جۆرەکانی پەرستن...

گوێ بگرە و بزانە پێغەمبەری خواﷺ چی دەفەرموێت، فەرموودەکەیش لە

[1] ـ في ((تلبيس إبليس)) (٤٧) بتصرف.

(صحيح مسلم)[١] دایە لە فەرموودەی (معقل ی کوڕی یسار)ەوە دەڵێت: ((العبادة في الهرج)) واتە: پەرستن لە (الهرج) دا .... الهرج چییە؟ مەبەستی فیتنەیە ((العبادة في الهرج كهجرة إلي))، واتە: پەرستن لە (الهرج)دا وەکو ئەوەیە کەسێك کۆچ بکات بۆ لا من)) واتە هەرکەسێ خوای گەورە دەپەرست لە سەردەم فیتنە و کوشتار دا ئەوا پاداشتەکەی وەکو پاداشتی کەسێکە کە کۆچی کردبێت بۆ لای پێغەمبەری خوا(ρ) لە شاری مەککەوە بۆ شاری مەدینە... کەوا بوو پارێزگاری لە پەرستنەکانت بکە لە کاتی فیتنەدا...

### هەنگاوی سێیەم: ئامادەبوون لە مەجلیسی زانستدا.

هەرگیز ئەو مەجلیسە باشانە لە دەستی خۆت دەرمەکە بۆ ئەوەی باشتر خوای گەورە بناسیت، باشتر پێغەمبەری خواﷺ بناسیت و باشتر حەڵاڵ و حەرام بناسیت وە باشتر سوننەت و بیدعە بناسیت، جا هەرکەسێ ڕێگایەکی گرتەبەر بە مەبەستی فێربوونی زانیاری ئەوا خوای گەورە ڕێگای بەهەشتی بۆ سووك و ئاسان دەکات ...

### هەنگاوی چوارەم: هاوڕێتی کەسانی باش ..

واز لە چاکەکاران مەهێنە، چونکە ئەوانەن،کە خوای گەورەت بەبیر دەهێننەوە و ئاگاداری ئاگرت دەکەنەوە وە لە خراپە و خراپەکاران دوورت دەکەنەوە، بەردەوام بە لە هاوڕێتی ئەو کەسانە.

لە فەرموودەیەکدا کە (أبو داود و الترمذي) و جگە لەوان ریوایەتیان کردووە بە سەنەدێك کە شێخ (الباني) بە (حسن)ی زانیوە لە فەرموودەی (ابی سعید الخدری) کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی ((لا تصاحب إلا مؤمنا، ولا يأكل طعامك إلا تقي))[٢] واتە: هاوڕێتی هیچ کەسێك مەکە تەنها ئیماندار نەبێت و هیچ کەسێك

---

١ـ أخرجه مسلم، كتاب الفتن و أشراط الساعة، باب فضل العبادة في الهرج (٢٩٤٨).

٢ـ أخرجه ابو داود،كتاب الأدب، باب في كراهية المراء (٤٨٣٢)، والترمذي كتاب الزهد، باب ما جاء في صحبة المؤمن (٢٣٩٥)، وابن حبان في ((صحيحه)) (٥٥٤، ٥٦٠)، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٧٣٤١)، و((المشكاة)) (٥٠١٨).

چێشتەکەت نەخوات تەنها کەسی لە خواترس نەبێت)) وە بەم چەند وشەیە کۆتـایی بە بەشەکە دێنم و چەند کۆتاییەکی خـۆش و گرنگـە!! هـەرگیز بـێ ئاگا مەبـە لـە یادی خوا چـونکە یادکردنـەوە ژیانـەوەی دڵەکانـە هـەروەکو خۆشەویـستی دڵـەکان محمدﷺ فەرموویەتی.

لــە هــەردوو کتــێبی (صــحیح)[١] دا هــاتووە لــە فــەرموودەی (ابــی موســی الاشعری)یەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((مثل الذي يذكر ربه، والـذي لا يذكر ربه، كمثل الحي و الميـت)) واتـە: نموونـەی ئـەو کەسـەی یـادی خـوا دەکـات و ئەوەی یادی ناکات وەکو زیندوو و مردوو وایە)).

داوا لە خوا دەکەم لە بەر خاتری ناوە بەرز و مەزنەکـەی خـۆی (الاسـم الأعظـم) ئەگەر هەرکەسێ بەو ناوەوە داوای لێ بکات ئەوا خوای گـەورە پێـی دەبەخـشێ وە ئەگەر لێی بپارێتەوە ئەوا وەڵامی دەداتەوە، کە وا ئێمە و ئێـوە لـە فیتنـە بپـارێزێ ئەوانەی کە ئاشکران و ئەوانەی شاراوەن و هەر خۆی پشت و پەنامانە و توانـای بـە سەر هـەموو شـتێکدا هەیـە... لـە نیـشانەکانی قیامـەت ئەوەیـە: کـە کـار دەدرێتـە دەستی کەسانێکەوە شایەنی ئەو کارە نەبێت و ئەمە بە درێژی لە بەشـی داهـاتوودا باسی دەکەین - انشاء الله - .

---

١. أخرجه البخاري، كتاب الدعوات، باب فضل ذكر الله (٦٤٠٧) واللفظ له، ومسلم، كتاب صلاة المسافرين و قصرها، باب استحباب صلاة النافلة في بيته و جوازها في المسجد (٧٧٩).

# لە نیشانەکانی قیامەت: فەوتان و بزرکردنی سپاردە

# (ضیاع الأمانة).

بەڕێزان ... بەردەوامین لە باسکردنی نیشانە بچووکەکانی قیامەت و لەم بەشەدا وتارەکەم تەرخان دەکەم بەو نیشانەیەوە کە ئەگەر بە جوانی گوێی لیّ بگری وا دەزانم کە دڵەکەت پڕ دەبێت لە خۆشەویستی خوای پەروەردگار و پێغەمبەرە دەستپاکە راستگۆکەیﷺ.... ئەم نیشانەیە لە ئاستی مرۆڤایەتی بڵاوبووەتەوە، لە هەموو جیهاندا بە شێوەیەکی گشتی وە لەم ئوممەتەدا بە شێوەیەکی تایبەتی ولا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم ...

بە وردی لە گەڵ مندا بیربکەرەوە لەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خواﷺ کە لە (صحيح البخاری)[١] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (ابو هريرە)ەوە دەڵێت: ((بينما النبي ﷺفي مجلس يحدث القوم، جاءه أعرابي، فقال: متى الساعة؟- واتە: لە کاتێکدا کەوا پێغەمبەری خواﷺ لە نێو هاوەڵانیدا بوو قسەی بۆ ئەوان دەکرد کابرایەکی دەشتەکی هات بۆ لای و فەرمووی: کەی قیامەت دێت ؟)) فمضى رسول اللهﷺ يحدث، فقال بعض القوم: سمع ما قال، فكره ما قال، وقال بعضهم: بل لم يسمع حتى إذا قضى حديثه، قال: ((أين السائل عن الساعة ؟)) قال: ها أنا يا رسول اللهﷺ. قالﷺ: ((فإذا ضيعت الأمانة فانتظر الساعة)). فقال الأعرابي -الفقيه-: كيف إضاعتها يا رسول الله ؟واتە: کەچی پێغەمبەری خواﷺ لەسەر باسەکەی خۆی ڕۆیشت و وەڵامی نەدایەوە بۆیە هەندێ لە خەڵکەکە فەرموویان: ئەوەی کابرا فەرمووی بیستی و پێی ناخۆش بوو، هەندێکیان فەرموویان: بەڵکو ئەو قسەکەی نەبیست، تاکو لە قسەکانی بووەوە ئەمجار فەرمووی: کوا ئەو کەسەی پرسیاری قیامەتی دەکرد؟ فەرمووی: ئەوەتا لێرەم ئەی پێغەمبەری خواﷺ... پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئەگەر سپاردە فەوتا و بزر بوو ئەوا چاوەڕوانی قیامەت

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب العلم، باب فضل العلم (٥٩).

بکە...ئەمجار دەشتەکییەکە فەرمووی: (ئەو دانا و تێگەیشتووە): ئەی پێغەمبەری خواﷺ فەوتان و بزر بوونی چۆن دەبێت؟)). بۆیە پێغەمبەری خواﷺ باسی شێوەیەك لە شێوەکانی بزر کردن و فەوتانی سپاردەی کردوو فەرمووی: (( إذا وسد الأمر إلى غير أهله فانتظر الساعة))، واتە: ئەگەر کار درا بە دەستی کەسانێکەوە شایستەی ئەو جێگەیە نەبوون ئەوا چاوەڕوانی قیامەت بکە)).

لە گوتەیەکی تردا هاتووە: ((إذا أسند الأمر إلى غير أهله)).[1]

ئایا من بە ئێوەم نەگوت کە ئەو کەسێکە هەرگیز لە خۆ وە قسە ناکات؟!

ئەی ئێستا کاروبار نەدراوەتە دەستی جگە لە خاوەنەکانیان؟ بەڵێ سوێند بە پەروەردگاری کەعبە... لە هەموو بوارەکانی ژیاندا کارەکان دراونەتە پاڵ کەسانێکی ناشایستە بە بێ ئەوەی هیچ بوارێکی فەرامۆش کردبێت ... ((ئیللا مەگەر خوا بە رەحمی خۆی رەحمی کردبێت)) من تەنها باسی یەك شێوە لە شێوەکانی سپاردە ناکەم کە ئەویش: ویلایەت و دەسەڵاتە – ئەم شێوەیە لە پاشاندا باسی دەکەم بەڵام دەمەوێت هەر لە سەرەتاوە بزانن کە سپاردە چەندەها شێوە و جۆری هەیە ...

لێرەدا خۆشەویستﷺ کردەوەیەك بدرێتە دەستی کەسێکەوە جگە لە خاوەنەکەی ئەوا کردوویەتیە جۆرێك لە جۆرەکانی فەوتان و بزرکردنی سپاردە ... فەوتانی سپاردەکانیش نیشانەیەکە لە نیشانەکانی قیامەت و وا دەزانم کە ئەم نیشانەیە روویداوە و بڵاو بووەتەوە وە زۆر بە جوانی بۆ هەموو کەسێك روون بووەوتەوە...

پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ لەفەرموودەیەکی تردا زۆر بەوردی باسی نەمان و فەوتانی سپاردەکانی کردووە.. کەوابوو خێراکە – ئەی برای موسڵمانم – فێربە و بزانە چۆن سپاردە وەردەگیرێت؟ ئەمجار چۆن بەرزدەبێتەوە؟ وە چۆن بزر دەبێت؟ لە پاشان باسی شێوەکانی سپاردە بە درێژی دەکەین (انشاء الله)

---

١ـ أخرجه البخاري،كتاب الرقاق، باب رفع الأمانة (٦٤٩٦).

هەروەکو باسمان کرد ... ڕێزداران ... من نامەوێ تەنها باسی نیشانەکە بکەم و بە سەریدا بڕۆم... نەخێر... بەڵکو لە گەڵ نیشانەکەدا رادەوەستم بۆ ئەوەی نەخۆشییەکە دیاری بکەم... وەپاشان چارەسەرەکەی دیاری بکەم... بەڵکو پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکان ئێمە و ئێوە رزگار بکات لەم جۆرە فیتنانە... چ نهێنییەکان و چ ئاشکراکان هەر خۆی پشت و پەنامانە و بە توانایە بە سەر هەموو شتێکدا ..پێغەمبەری خواﷺ باسی ئەوە دەکات چۆن سپاردە بەرز دەبێتەوە و دەفەوتێ ... دەڵێت: (فەرموودەکە ئیمامی (البخاری و مسلم)[١] ریوایەتیان کردووە لە فەرموودەی (حذیفة ی کوڕی الیمان)ەوە دەڵێت: ((حدثنا رسول اللهﷺ حدیثین رأیت أحدهما وأنا أنتظر الآخر، حدثنا: ((أن الأمانة نزلت في جذر قلوب الرجال، ثم نزل القرآن، ثم علموا من القرآن، ثم علموا من السنة))،[٢] واتە: پێغەمبەری خواباسی دوو فەرموودەی بۆ کردین و من یەکێکیانم بینیوە و چاوەروانی ئەوی ترم، باسی بۆ کردین کە سپاردە دابەزیوەتە ناو رەگی دڵی پیاوان ئەمجار قورئان دابەزیوە و ئەمجار لە قورئانەوە فێر بوون و ئەمجار لە سوننەتەکانەوە فێر بوون)).

تەماشای شێوەی دابەزینی سپاردە بکە.

ئەمجار حذیفة دەڵێت: وحدثنا عن رفعها، قال: ((ینام الرجل النومة، فتقبض الأمانة من قلبه، فیظل أثرها مثل أثر الوكت))[٣] واتە: ئەمجار باسی بەرزبوونەوەی سپاردەی بۆ کردین و فەرمووی: کابرایەك دەخەوێ و سپاردەکە لە دڵیدا دەردەهێنرێت و شوێنەوارەکەی لە دڵیدا وەکو خاڵێك دەمێنێتەوە)).

صەڵات و سەلام لەسەر ئەو کەسەی کە خوای گەورە پاکترین و بەرزترین پلەی رەوانبێژی پێ بەخشیوە ... کابرایەك شەوێك لە شەوان دەخەوێ کە سبەینێ هەڵدەستی کەچی سپاردە لە دڵیدا دەرهێنراوە... بووەتە کەسێکی ناپاك

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب الرقاق، باب رفع الأمانة (٦٤٩٧)، ومسلم كتاب الإيمان، باب رفع الأمانة و الايمان من بعض القلوب و عرض الفتن على القلوب (١٤٣).

٢ـ وأسوق لطيفة سريعة فقط لأحبابنا و إخواننا من طلبة العلم بأن البداية الحقيقية الصحيحة للطلب تكون – بنص هذا الحديث: القرآن ثم السنة !.

٣ـ قال ابن منظور في ((اللسان)) (مادة وكت): ((الوكت: الأثر اليسير في الشيء)).

((فتقبض الأمانة من قلبه، فيظل أثرها مثل أثر الوكت))، واتە: جا سپاردە لە دڵیدا دەردەهێنرێت، شوێنەوارەکەی دەمێنێتەوە هەروەکو خاڵێك)) تەماشای ئەو خاڵە رەشە کەمە بکەن لەو جێگایەی کە سپاردەی لێ بەرز بووەتەوە، ئەمجار فەرمووی: ((ثم ينام النومة فتقبض، فيبقى أثرها مثل المجل[1] كجمر دحرجته على رجلك فنفط، فتراه منتبرا، وليس فيه شيء))، واتە: ئەمجار شەوێکی تر دەخەوێ دیسان سپاردەکە لە دڵیدا دەردەهێنرێت و شوێنەوارەکەی لە دڵیدا وەکو پارچە پێستێکی ئاوساو دەمێنێتەوە بەڵام بەتاڵەو هیچی تێدا نییە (لە زمانی عەرەبیدا مانای المجل واتە: شوێنەواری کارکردن لە ناو دەستی مرۆڤدا) وەکو پارچەیەك ئاگر بە سەر پێیەکانتدا بیهێنی و ئەویش بەرز دەبێتەوە و دەئاوسێ بۆیە دەیبینی بەرز و ئاوساو بووە کەچی هیچی تێدا نییە ئەگەر فشاری بخەیتە سەر ئەوا دەگوشرێ)).

((فيصبح الناس يتبايعون، فلا يكاد أحدهم يؤدي الأمانة، فيقال: إن في بني فلان رجلا أمينا))، واتە: پاشان خەڵکی دەکڕن و دەفرۆشن کەچی وای لێ دێت هیچ کەسێك نادۆزنەوە کە حەقی سپاردە بدات، دەڵێن: لە بەنی فلاندا کابرایەکی دەستپاك هەیە)) ئەی خودایە..! کابرایەك بە پەنجەی دەست ئیشارەتی بۆ دەکرێت لە (بەنی فلان) ((ويقال للرجل ما أعقله؟ وما أظرفه وما أجلده ؟))، واتە: تاکو بە پیاوێك دەڵێن: چەند ژیرە؟!، چەند رووخۆش و قسە خۆشە؟!، چەند بە غیرەتە؟!)) لە پێش خۆی هەڵیدەنێن و بە نارەواوە کەسەکە دەپێون ((وما في قلبه مثقال حبة خردل من إيمان)) واتە: کەچی لە دڵیدا یەك گەردیلە باوەڕی تێدا نییە)) حذیفة دەڵێت: ((ولقد أتي علي زمان وما أبالي أيكم بايعت)) واتە:سەردەمێك هاتووەتە سەرمدا کە هیچ گوێم پێی نەدەدا کە شمەکێك بفرۆشمە فلان یا لە فلانی بسێنم))، ((لئن كان مسلما رده علي الإسلام)) واتە: من لە گەڵ هەموو کەسێکدا ڕەفتار دەکەم... ئەگەر ئەو کەسەی کە من ڕەفتاری لە گەڵدا دەکەم کەسێکی موسڵمان بوو ئەوا ئیسلام بوونەکەی رێگەی لێ دەگرێت کە ناپاکی لە گەڵ مندا بکات ((وإن كان نصرانياً رده علي ساعيه)) واتە: وە ئەگەر ئەو کەسەی کە من

---

١ـ المجل: أثر العمل في الكف (اللسان مادة: مجل).

ڕەفتاری لە گەڵ دا دەکەم (لە سەردەمی حذیفـەدا) کەسێکی جگە لـە موسـڵمانان بوو ئەوا ناپاکیم لە گەڵدا ناکات، چونکە فەرمانڕەوا یان کار بەدەست سزای دەدات ئەگەر ناپاکی کرد یاخود ناپاکییەکەی لێ دەسێنێتەوە ((فأما الیوم فما كنـت أبـايع إلا فلانا و فلانـا ))، واتـە: ئـەو لـە سـەردەمی پێغەمبـەرﷺ و سـەردەمی الـصديق و سەردەمی راشیدیندا دەیکڕی و دەیفرۆشت و لـە گـەڵ هـەموو کەسێکدا مامەڵـەی دەکرد جا ئەگەر لە موسڵمانان بوایە یان جگە لە موسڵمانان بوایە بەڵام ئەمڕۆ ((لـە دوا سەردەمەکانی حذیفەدا)) دەڵێت: ((فما كنت أبايع إلا فلانا و فلانـا)) واتـە: تـەنها لە گەڵ فلان و فلاندا مامەڵە دەکەم)) مەبەستی ئەوەیە تەنها ئـەهلی سـپاردەکان و بەس... تا ئەو رادەیە؟ بەڵێ... ئەی ڕێزداران...

لـە شـێوەکانی فـەوتانی سـپاردە ئەوەیـە کـە کـار و فـەرمان بدرێتـە دەسـت کەسانێکی جگە لە خاوەنەکانیان (واتـە شایـستەی ئـەو جێگەیـە نـین) ئوممـەتێکی ناپاك ئەو کارانە ئەنجام دەدات واتە: خەڵکانێك پێش دەخـەن کـە شایـستەی ئـەوە نین پێش بکەون... شایستەکان دوا دەخرێن کە بە کەڵکی ئەو کات و شوێنە بێن... نهێنی مەزنی پێغەمبەری خواﷺ ئەوەیە کە ئەوەیەك بـۆ ئـەم دونیایـە دەربهـێنێ و ئامادەی بکات هەرگیز مرۆڤایەتی لە شێوەی نەبینیوە چونکە ئەو — باوك و دایك و ڕوحم بە فیدای بێت — هەموو کەسێکی لە هاوەڵان لە جێگەی خـۆی دادەنـا کـە بـە پێی شارەزایی و تواناکەیدا بگونجێ...

جا بۆیە (مصعب ی کوڕی عمیر)ی نارد بۆ مەدینە...

(معاذ ی کوڕی جبل) بۆ یەمەن.

(ابو عبیده ی کوڕی الجراح) بۆ یەمەن یان ئەهلی نەجران.

(خالدی کوڕی الولید) لە هونەر و شێوازەکانی جەنگ و کوشتاردا.

(زید ی کوڕی ثابت) لە کۆکردنەوە و نوسینی قورئاندا...

هەموو کەسێك بە پێی پسپۆر و بوارەکەی خۆی، جا ئوممەتی دەستپاك ئەوەیـە کە کەسی شایستە پێش دەخەن و کەسی شیاو لە جێگەی شیاو و لـە کـاتی شـیاو دادەنا ... ئەگەر ئەم ئوممەتە کەسانێکی لە پلە و پایەیەك دانا یـان لـە کورسـییەك

جا ئەو پێگە و جێگە هەر پلە و پایەیەك بێت (هەروەکو چۆن ئێستا باسی دەکەم بۆ ئەوەی کەوا هیچ کەسێك وا نەزانیت ئەم کارە تەنها فەرمانڕەوای گشتی دەگرێتەوە !). کاتێك ئوممەتێکی دەستپاك دەبینێ کە فلان شایەنی ئەو جێگایە نییە ئەوا پێویستە لەسەر ئەو کەسە ئەگەر لە راستگۆ خۆیەکلایی کەرەوەکان بوو ئەوا بگەڕێتەوە و خۆی دوا بخات، چونکە کێشەکە سپاردەیە و دەربارەی پرسیاری لێ دەکرێ لە بەر دەستی خوای گەورەدا وە ئەگەر بینیان کەسێکی تر هەیە شایستە ترە لە ئەو ئەوا با پێشی بخەن وە ئەم ئوممەتە بەرەو پێشەوە دەبێ ڕەوانەی بکات...

جارێکیان (ابو ذر) دەڕوات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ (فەرموودەکە لە (صحیح مسلم)[١] دایە) دەڵێت: گوتم : ((یا رسول الله ألا تستعملني ؟– واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پلە و پایەیەکم پێنادەی؟ لە وەزارەت و ئەمارەت و ویلایەت . – قال: فضرب بیده علی منکبي، ثم قال: یا أبا ذر إنك ضعیف، وإنها أمانة وإنها یوم القیامة خزي وندامة إلا من أخذها بحقها وأدی الذی علیه فیها ))، واتە: فەرمووی: ئەویش بە دەستەکانی دای بە سەر شانمدا و ئەمجار فەرمووی: ئەی (أبوذر) تۆ کابرایەکی لاوازی، ئەوەیشە سپاردەیە، ئەوەیشە لە ڕۆژی قیامەتدا شەرمەزاری و پەشیمان بوونەوەی بە دواوەیە تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە حەقەکەی خۆی داوە و ئەوەی لە سەری بووە جێ بە جێی کردووە)).

بە ڕاستی ئەوە سپاردەیەکی گەورەیە، بەر پرسیارییەتیەکی مەزنە، لە بەر دەستی خوای گەورەدا پرسیارت لێ دەکرێ جا ئەو بەر پرسیارێتییەی هەرچەندە گەورە یان بچووك بێت و قەبارە و پایەکەی چەند بێت وە قەبارەی سپاردەکە چەند بێت کە پێت سپێردراوە...

لە (سنن الترمذي) و (ابو داود) دا هاتووە بە سەنەدێکی (صحیح)[٢] لە فەرموودەی (أبی هریرە) وە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (( أد الأمانة إلی

---

١ـ أخرجه مسلم، کتاب الإمارة، باب کراهة الإمارة بغیر ضرورة (١٨٢٥).

٢ ـ أخرجه ابو داود،کتاب الإجارة، باب في الرجل یأخذ حقه من تحت یده (٣٥٣٥)، والترمذي، کتاب البیوع، باب (٣٨) (١٢٦٤)، والدارمي (٢٥٩٧)، والحاکم (٢ / ٥٣)، وصححه علی شرط مسلم، ووافقه الذهبي، وصححه الشیخ الألباني في ((الصحیحة)) (٤٢٣).

من ائتمنك، ولا تخن من خانك)) واتە: سپاردە بگەڕێنەوە بۆ ئەو كەسەی كە سپاردەكەی پێ سپاردووی و ناپاكی مەكە لەوانەی كە بەرانبەرت ناپاكیان كردووە)) .

ئەمە (ابو عبیدە ی كوڕی الجراح)ە دەستپاكی ئەم ئوممەتەیە بە شایەتی ئەو ڕاستگۆیەی كە لە خۆ وە قسە ناكاتﷺ (ابو بكر) سەركردایەتی بەرەی موسڵمانانی لە وڵاتی شامدا خستە ئەستۆی ئەو، لە پاشان (ابو بكر) وای بە باش زانی كە (خالد ی كوڕی الولید) لە ئەو شایستە ترە لەم كات و ساتەدا و ئەویش پیاوی گۆڕەپان و پیاوی ئەو كاتەیە، ئایا یەكەم جێنشینی ڕاشیدی پێغەمبەرﷺو گەورەترین ڕاستگۆی ئەم ئوممەتە چی كرد؟ (ابو عبیدە)ی لە كارەكەی خۆی لادا و (خالد كوڕی الولید) ی پێش خست بۆ ئەو جێگەیە ! ! ئەمە بۆچوونی (ابو بكر) بوو... وای بە باش زانی كە پیاوی ئەو كات و ساتە(خالد)ە، بۆیە با (خالد) پێش بكەوێت وە (ابو عبیدە) ئەو جێگەیە چۆڵ بكە بۆ (خالد)... وە ئەم لادانەی (ابو عبیدە) لە كارەكەی هیچ لە كەسایەتی ئەو كەم ناكاتەوە... وە ڕێز و گرنگی و بایەخ و پلە وپایەی كەم ناكاتەوە، جا بۆیە (ابو بكر الصدیق) نامەیەكی قەشەنگ و جوانی ڕەوانەی (ابو عبیدە ی كوڕی الجراح) دەكات و تیایدا دەڵێت: پاش ئەوەی سوپاسگوزاری خوا بوو وە صەڵات و سەلامی نارد بۆ پێغەمبەری نازدارﷺ... أما بعد:

لە(ابو بكر عبدالله ی كوڕی ابی قحافە)وە بۆ (ابو عبیدەی كوڕی الجراح)...

سڵاوی خوات لێ بێت.. لە پاشاندا... ئەوا من تۆم لەسەر كارەكەت لادا و (خالد ی كوڕی الولید) م لەسەر سەركردایەتی بەرەی وڵاتی شام دانا، بۆیە گوێ بیستی بە و گوێڕایەڵ بە، سوێند بە خوا من (خالد ی كوڕی الولید) م لەو جێگەیە دانەناوە ئیللا گومانم وایە كە ئەو شارەزاییەكی زۆری لە جەنگ هەیە كە لە تۆدا نییە، تۆ لای من لە (خالد) چاكتری، خوای گەورە بۆ ئێمە و ئێوە چاكەی دەوێت والسلام)).[1]

---

١ـ ((مجموعة الوثائق السیاسیة للعهد النبوي والخلافة الراشدة)) (٣٩٢، ٣٩٣) لمحمد حمیدالله. نقلاً عن كتاب د.الصلابي (أبو بكر الصدیق) (٢٩٩, ٣٠٠).

صەڵات و سەلام لەسەر ئەو کەسەی پەروەردەی کرد و فێری کرد... ئەم دڵە پاك و یەکلایی یە چییە؟(خالد) پیاوی ئەو کات و ساتەیە، کەوابوو با(خالد) پێش بکەوێت با (ابو عبیدە ی کوڕی الجراح) لە سەرکردایەتی سوپا و سەرکردایەتی ئەو بەرەیە واز بهێنێ!

بۆ ئەوەی (ابو عبیدە) ببێتە سەربازێکی گوێڕایەڵ پاش ئەوەی دوێنێ ی نزیك سەرکردەیەکی گوێلێڕاگیراو بوو! ! ئایا بیری لەوە نەکردەوە کە کودەتایەکی سەربازی بە سەر (ابوبکر) دا ئەنجام بدات؟ نەخێر... ئەی بە سەر (خالد)دا؟ نەخێر، چونکە ئەوانە تێناکۆشن لە پێناوی دونیادا... بە هیچ شێوەیەك ئەوان لە پێناوی پلە و پایە و کورسیدا ناجولێنەوە، هەر یەکێك لەوان ئاواتەخوازە گیانی خۆی ببەخشێتە دینی خوا ... پێگەی هەر چەند بێت لەسەر گۆڕەپانی جەنگ یان لە ناو گۆڕەپاندا...

لە (صحیح البخاری)[١] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی(أبوهریرە) ەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((طوبى لعبد آخذ بعنان فرسه في سبيل الله، أشعث رأسه، مغبرة قدماه، إن كان في الحراسة كان في الحراسة، وإن كان في الساقة كان في الساقة، إن استأذن لم يؤذن له، وإن شفع لم يشفع))، واتە: موژدە بۆ بەندەیەك کە جڵەوی ئەسپەکەی خۆی گرتووە لە پێناوی خوادا، قژی گڤ و هەردوو پێی تۆزاوی، ئەگەر لە کاتی پاسەوانیدا بێت ئەوا ئەو پاسەوان دەبێت، ئەگەر پێویست بوو لە پاشەوە بێت ئەوا ئەو لە پاشەوەیە، ئەگەر داوای مۆڵەت بکات ئەوا مۆڵەتی پێ نادرێت، ئەگەر داوای لێ خۆش بوون بۆ کەسێك بکات ئەوا لێ ی خۆش نابن)).

ئەو کابرایەکە کە پیاهەڵنانی ناوێت بە ناڕەوایی... چونکە ئەو دەیەوێ هەر شتێکی هەیە پێشکەشی بکاتە خوای پەروەردگار... چیتر گرنگ نییە ئەگەر لە پێشەوە لە گەڵ سەرکردەکاندا بێت یان لە پاشەوە لە گەڵ سەربازەکاندا بێت... چونکە ئەو دڵنیایە کە لەسەر ڕێگایەکە کار بۆ ڕەزامەندی خوا دەکات... لوتکەی دڵسۆزی و خۆیەکلایی کردنەوە، ئەگەر حەز دەکەیت بڵێ لوتکەی دەستپاکی.

---

١ ـ أخرجه البخاري، كتاب الجهاد، باب الحراسة في الغزو في سبيل الله (٢٨٨٧).

پاشان (ابو بکر الصدیق) کۆچی دوایی دەکات و ئەمجار (جیاکەرەوەی ئوممەت) کە (عومەری کوڕی خەتتاب)ە دەبێتە خەلیفەی موسڵمانان، ئا ئەوەتا (عمر) بۆچوونێکی تری هەیە: وای دەبینی کە نابێت هیچ کەسێك بخرێتە پێش دەستپاکی ئەم ئوممەتە (ابو عبیدە ی کوڕی الجراح) بۆیە(عومەر ی کوڕی خەتتاب) جارێکی تر (خالد)ی لەسەر کارەکەی لادا و (ابو عبیدە) ی لە جێگای ئەو دانا.. جا ئەنجامەکەی چی بوو؟

(خالد ی کوڕی الولید) وازدەهێنێ لە سەرکردایەتی سوپاکە بۆ (ابو عبیدەی کوڕی الجراح) دەستپاکی برای.... بۆ ئەوەی (خالد ی کوڕی الولید) ببێتە سەربازێکی گوێڕایەڵ لە پاش ئەوەی دوێنێی نزیك سەرکردەیەکی بە سامی فەرمانبەردار بوو...

بە ڕاستی ئەمە دەستپاکی یە... ئەوە خۆیەکلایی کردنەوە و دڵپاکییە... براکەم... من لە ناخی خۆمدا وا دەبینم کە شایەنی ئەم جێگایە نیم بۆیە واز دەهێنم ... چونکە لەسەر ئەم کورسییەی کە لە سەری دانیشتووم پرسیارم لێ دەکەن وە پرسیارم لێ دەکرێ دەربارەی ئەم سپاردەیەی هەڵم گرتووە لە بەر دەستی خوای پەروەردگاردا.

کەوابوو سپاردە تەنها وشەیەك نییە — بە هیچ شێوەیەك —وە تەنها بواری فەرمانڕەوایی ناگرێتەوە لە گەڵ ئەوەیشدا جەخت دەکەم لەسەر ئەوەی کە فەرمانڕەوایی گەورەترین سپاردەیە، کە کەسێکی دەستپاك بکرێتە فەرمانڕەوای موسڵمانان، لەسەر حوکمی موسڵمانان بەراستی ئەوە سپاردەیەکی گەورەیە و بەر پرسیارێتییەکی ترسناکە. !

لە هەردوو کتێبی(صحیح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (معقل ی کوڕی یسار)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((ما من عبد یسترعیه الله رعیة یموت یوم یموت وهو غاش لرعیته إلا حرم الله علیه الجنة)) واتە: هیچ بەندەیەك نییە

---

١ ـ أخرجه البخاري، كتاب الأحكام، باب من استرعى رعية فلم ينصح (٧١٥٠)، ومسلم، كتاب الإيمان، باب استحقاق الوالي الغاش لرعيته النار (١٤٢).

کاتێ کە خوای گەورە پلەو پایەیەکی دەداتێ و دەیکاتە بڕا گەورەی کۆمەڵێك و دەمرێت، لە ڕۆژێکدا دەمرێت کە ئەو ساختەی لەو کۆمەڵە کەسە کردووە ئیللا خوای گەورە بەهەشتی لێ حەرام کردووە)).

هەروەها لە هەردوو کتێبی (صحیح)[١] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (عبدالله ی کوڕی عومەر)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((کلکم راع وکلکم مسؤولُ عن رعیته، الإمام راع))، واتە: هەر هەمووتان شوان و بەرپرسن و بەر پرسیارن لەو ژێر دەستەی کە پێتان سپێردراوە وە پێشەوا شوان و بەرپرسە..)) واتە: حاکم و فەرمانڕەوا، ئەمەیشە بەرپرسیارێتییەکی گەورەیە ((الإمام راع ومسؤول عن رعیته))، واتە: پێشەوا شوان و بەرپرسە و بەرپرسیارە لەسەر ژێر دەستەکەی)) ئایا من بە ئێوەم نەگوت کە بەرپرسیارێتی لەسەر هەمووانە، کەوابوو وا مەزانە تۆ بەرپرسیار نیت ئەگەر پلە و پایەکەت هەرچی بیت وە ئێستا ئەوە روون دەکەمەوە انشاء الله ((والرجل راع فی أهله وهو مسؤول عن رعیته، والمرأة راعیة فی بیت زوجها ومسؤولة عن رعیتها، والخادم راع فی مال سیده ومسؤول عن رعیته و کلکم راع و مسؤولُ عن رعیته)) وە پیاو شوان و بەرپرسە لەسەر خێزانەکەی و هەر ئەویش بەرپرسیارە لەسەر ژێر دەستەکەی، ئافرەت شوان و بەرپرسە لە ماڵی پیاوەکەیدا وە هەر ئەویش بەر پرسیارە لەسەر ژێر دەستەکەی، خزمەتکار شوان و بەرپرسە لە ماڵی گەورەکەیدا و هەر ئەویش بەرپرسیارە لەسەر ژێردەستەکەی، کەواتە هەر هەمووتان شوان و بەر پرسن و هەمووتان بەرپرسیارن لەسەر ژێر دەستەکەتان)) ئەوەتا پێغەمبەری خواﷺ لە سەرەتای فەرموودەکە و لە کۆتاییەکەی دووپاتی دەکاتەوە جارێکی تر دەڵێت ((و کلکم راع و مسؤولُ عن رعیته)).

کەوابوو سپاردە مانایەکی گەورەی هەیە، کە تەنها بواری فەرمانڕەوایی ناگرێتەوە، تەنها ئەوە ناگرێتەوە کە کەسێك شتێك لای کۆمەڵە خەڵکێك دادەنێ، هەروەها ئەمەیشە جۆرێکی ترە لە جۆرەکان و شێوەکانی سپاردە، هەروەکو لە

---

[١] ـ أخرجه البخاري، كتاب الجمعة، باب الجمعة في القرى و المدن (٨٩٣)، و مسلم كتاب الإمارة، باب فضيلة الإمام العادل (١٨٢٩).

پێشدا باسمان کرد: ((أد الأمانة إلى من ائتمنك، ولا تخن من خانك)) واتە: سپاردە بگەڕێنەوە بۆ ئەو کەسەی کە سپاردەکەی پێ سپاردووی و خیانەت مەکە لەوانەی خیانەتت بەرانبەر دەکەن))، لە جۆرەکانی سپاردە ئەوەیە کە کەسێك سپاردەیەك لای تۆ دابنێ شێوەکەی هەرچی بێت، جا ئەگەر پارەیەکی لای تۆ دانا یان کەس و کار و منداڵەکانی بە تۆ سپارد یان نهێنییەکی خۆی، بەڵام... ئاه بۆ هەر شێوەیەك لەو جۆرە سپاردانە شێوەیەکی ناپاکی و خیانەت هەیە... ناپاکی بۆنی دەرچووە و بڵاو بووتەوە، بۆنی گەنیوی و بۆگەنی بڵاو بووتەوە لەم سەردەمەدا کە رژێمی ڕۆژئاوا سەرکردایەتی دەکات ... چەندان خوێن رژان...! چەندەها جەستە پارچە پارچە بوون!! بە ناوی ئازادی یەوە، بەناوی دیموکراسییەوە... تاکو ئەو دوای ئەو هەموو درۆشمە درۆ و ناپاك و هەڵبەستراوانە... خوێن رژا لەسەر خاکی عێراق... لەسەر خاکی فلسطین... لەسەر خاکی لبنان... ئەفغانستان... شیشان، لە زۆر جێگای تر–کە لە پاشاندا بە درێژی باسی دەکەم انشاء الله–.. کەوایە سپاردە بارێکی قورس و گەورەیە... بیهێنە پێش چاوی خۆت کە ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان... ئەم دروستکراوە گەورەو بەهێزە نەیتوانی ئەم سپاردەیە هەڵگرێ... خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا ﴾ الأحزاب:٧٢، واتە: بە راستی ئێمە سپاردە و (تەکالیف)ەکانمان خستە سەر ئاسمانەکان و زەوی و کێوەکان کەچی هیچیان لە خۆیانرا نەدی و لە هەڵگرتنیان نکوولییان کرد.)).

ئەی خودایە!! هەموو ئەم دروستکراوە گەورانە رازی نەبوون کە ئەم بارە قورسە هەڵگرێت...

﴿فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴾ الأحزاب:٧٢، واتە: کەچی هیچیان لە خۆیانرا نەدی و لەهەڵگرتنیان نکوولییان کردو نەچوونە ژێری و ترسان کە: نەتوانن هەڵسن بە جێبەجێکردنی داخوازییەکان کەچی مرۆڤ هاتە پێشەوەو و چووە ژێرباری و هەڵی گرت! بە راستی ناهەقی لە خۆکرد و

نەیزانی بە ئەنجام ئەگینا هەرگیز هەڵی نەئەگرت واتە: بە جێ هێنانی فەرمانەکانی خوا ئەوەندە گرنگە ئاسمان و زەوی و شاخەکان لە گەڵ ئەو هەموو توانایەدا بۆیان هەڵنەگیرا!! کەچی ئادەمیزاد – بە نەزانی خۆی – هەڵی گرت)).

بیهێنە پێش چاوی خۆت... ئاسمانەکان ترسی لێ نیشت!! زەوی ترسی لێ نیشت! چیاکان لە هەڵگرتنی ئەو سپاردەیە ترسیان لێ نیشت! کەچی مرۆڤی کەم تەمەن، لاوازی گێل، کە حەز و ئارەزووەکانی حوکمی بە سەردا دەکەن، ئەم مرۆڤە پێش دەکەوێت بۆ هەڵگرتنی ئەم سپاردەیە، جا ئەگەر هەر کەسێ بە جوانی و بە تەواوی بە جێی هێنا و بە پێی ویستی خوای گەورە ئەوا کەسێکی دەستپاکە... وە هەر کەسێ ناپاکی تیادا کرد ئەوا کەسێکی ستەمکار و نەفامە ﴿فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا﴾ لأحزاب:٧٢، واتە: مرۆڤ هاتە پێشەوەو و چووە ژێرباری و هەڵی گرت! بە راستی ناهەقی لە خۆکرد و نەیزانی بە ئەنجام ئەگینا هەرگیز هەڵی نەئەگرت)).

- پەرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: سپاردە چییە؟
- وەڵامەکە لەم مانایانەدایە...

ابن عباس رضي الله عنه دەڵێت: ((سپاردە ئەو فەرزانەیە کە خوای گەورە لەسەر بەندەکانی فەرزی کردووە))[١] هەمان پێناسە لە (سعید ی کوڕی جبیر) ەوە گێردراوەتەوە...

أبو العالية دەڵێت: ((سپاردە ئەوەیە کە فەرمانی پێکراوە و ئەوانەی کە نەهی لێ کراوە)).[٢]

قتادة دەڵێت: ((سپاردە: ئایینە))،[٣] جا ئایین هەمووی سپاردەیە، و سپاردەیش ئایینە...

کەواتە: ڕێزداران...سپاردە تەنها وشەیەك نییە! بەڵکو جێ بەجێ کردن و کردارە...

---

١ـ أخرجه ابن جرير في ((تفسير)) لسورة الأحزاب (٧٢).
٢ـ أخرجه ابن أبي حاتم في ((تفسيره)) كما في ((الدر المنثور)) (٦ / ٥٩١).
٣ـ أخرجه الطبري في ((تفسيره)) لسورة الأحزاب.

دەڵێم: ئەوەی کە ئەمڕۆ تەماشای ئەم واقیعە بکات بە دڵنیاییەوە دەزانێ کە کەسانێك ئێستا جیهان بەڕێوە دەبەن و مرۆڤایەتی بە تەواوی لە ناو دەبەن کەسانێکن ئەو کار و فەرمانەیان دراوەتە پاڵ لە کاتێکدا ئەوان شایستەی ئەو جێگەیە نین!.

لێرەدا لەگەڵ فەرموودەیەکی پێغەمبەری خواداﷺ رادەوەستم، کە ئیمامی أحمد لە (مسند)ەکەیدا و الحاکم لە (مستدرك)ەکەیدا بە سەنەدێکی(صحيح)[١] ریوایەتیان کردووە لە فەرموودەیەکی (أبو هريرە)وە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((سيأتي على الناس سنوات خداعات، يصدق فيها الكاذب، ويكذب فيها الصادق، ويؤتمن فيها الخائن، ويخون فيها الأمين، وينطق فيها الرويبضة )). قيل: وما الرويبضة؟ قال: (( الرجل التافه )) . وفي لفظ: (( الرجل السفيه يتكلم في أمر العامة))، واتە: سالآنێکی هەڵخەڵەتێنەر بە سەر خەڵکیدا دێت، باوەڕ بە کەسی درۆزن دەکرێت و کەسی راستگۆ بە درۆ دەخرێتەوە، کەسی دەستپیس و ناپاك دەبێتە دەستپاك و کەسی دەستپاکیش دەبێتە دەستپیس و ناپاك، (الرويبضة) دێتە قسە کردن و دەبێتە دەم سپی. فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ (الرويبضة) کێیە؟ فەرمووی: کەسانێکی هیچ و پووچ و نەفام لە کاروباری گشتیدا قسە دەکەن)).

بەڵکو چەندەها بڕیار لە لایەن نەفامانەوە دەردەچێت کە بە هۆیەوە بە شێوەیەکی سەخت و پڕ لە ئازار خوێن دەرێژرێ، لەسەر رووی زەویدا، خوێن بووەتە هەرزانترین شت، خوێنی خەڵکی حەڵاڵ کراوە بە هۆی چەند بڕیارێکەوە کە دڵەکان لە بن دەردەهێنن و جێ بە جێ دەکرێن، بە چەند وشەیەك دەگوترێت، چەندەها لەشکر و سوپا لەوپەڕی زەویەوە بە رێ دەکەون بۆ ئەوەی بێن بۆ ناو جەرگەی وڵاتی موسڵمانان !وە صەڵات و سەلام لەسەر راستگۆی دەستپاك. کەوابوو سپاردە ئایینە و ئاینیش هەمووی سپاردەیە.

تۆ بەر پرسیاریت، منیش بەر پرسیارم، بۆچوونی دانانی پاساوهێنانەوە

---

١ـ أخرجه أحمد (٢ / ٢٩١، ٣٣٨)، وابن ماجه، كتاب الفتن، باب شدة الزمان (٤٠٣٦)، والحاكم (٤ / ٥٢١)، وصححه، ووافقه الذهبي، وحسنه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (١٨٨٧).

(التبريرية) بۆ هەڵەکان و کەمتەرخەمی کەسایەتی و قسە هەڵواسین لەسەر فەرمانڕەوایان،یان لەسەر دوژمنان، یان لەسەر زانایان،ئەوا بۆچوونێکی ناپەسەند و نەویستراوە بە دەقی ئایەتی قورئانی پیرۆز، نابێت خەڵکی تر بکەیتە هەڵواسەیەك و بۆ ئەوەی هەڵەکانی خۆتی پیا هەڵواسێت ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ﴾آل عمران: ١٦٥، واتە: ئاخۆ کاتێ زیانتان پێ گەیشت لە تێکشکانەکەی ڕۆژی ئوحوددا و سەرتان سوڕما، ئێوەش لە (بەدر) دوو ئەوەندە زیانتان بەوان گەیاند، گوتتان: هۆی دووچاربوونمان چی بوو؟، ئەی پێغەمبەر ﷺپێیان بڵێ: ئەوە هەر لە خۆتانەوە بوو تووشتان بوو، هۆی سەرەکی لە خۆتانەوە بوو چونکە ئێوە فەرمانی پێغەمبەرتانﷺ شکاند)).

براکەم ... من گەردیلەیەکی زۆر بچووك (کە تەنها بە میکروسکوب دەبینرێت) لە چاوی تۆدا دەبینم بەڵام چاوپۆشی لە پارچە دارێکی گەورە دەکەم لە چاوەکانی خۆمدا، تۆیش گەردیلەیەکی زۆر بچووك لە چاوەکانی مندا دەبینی کەچی چاوپۆشی لە پارچە دارێکی گەورە لە چاوەکانی خۆتدا دەکەیت، وای لێهاتووە هەر یەکێك لە ئێمە براکەی خۆی کردووەتە هەڵواسەیەك بۆ ئەوەی هەڵە و کەمتەرخەمییەکانی خۆی بەرانبەر بە خواکەی پیا هەڵواسێت، کەمتەرخەمییەکان بەرانبەر بە پێغەمبەرەکەی ﷺ ، ئەمجار بەرانبەر بە دینەکەی، ئەمجار بەرانبەر بە خودی خۆی، ئەمجار بەرانبەر بە کەس و کارەکەی، ئەمجار بەرانبەر بە کار و پیشەکەی، ئەمجار بەرانبەر بە خەڵکە نزیکەکانی خۆی، ئەمجار بەرانبەر بە خەڵکانی تر.. ! !

براکەم ... ئایین سپاردەیە... پەرستن سپاردەیە، فەرزەکان سپاردەن... جا نوێژیش سپاردەیە، ئایا ئەم سپاردەیە بە ویستی خوای گەورە جێ بە جێ دەکەیت؟ ئایا نوێژەکانت لە کاتی خۆیدا ئەنجام دەدەیت هەروەکو چۆن خوا و پێغەمبەرەکەتﷺ فەرمانیان پێ کردوویت؟ هەروەها ڕۆژوو سپاردەیە، ئایا ئەم سپاردەیە بە سپاردنەوە جێ بە جێ دەکەیت؟ یان جڵەوی چاوەکانی خۆت بەرەڵا دەکەیت بۆ تەماشاکردنی ئەوەی کە خوا حەرامی کردووە لە کاتی ڕۆژوودا؟ هەروەها زمانت جڵەوی بۆ شل دەکەیت بۆ گوتنی ئەوەی کە خوا پێی ڕازی نییە لە

ڕۆژانی ڕەمەزاندا؟هەروەها جلەو بۆ گوێیەکانت شل کردووە بۆبیستنی ئەوەی کە خوا حەرامی کردووە لەشەوان و ڕۆژانی مانگی ڕەمەزاندا؟ئایا ئەم سپاردەیە حەقی خۆیت داوە؟

هەروەها زەکات... ئایا ئەو سپاردەیە بە جوانی جێ بە جێت کردووە؟ ئایا ئەو سامانەی کە هەتە لە حەڵاڵدا کۆت کردووەتەوە؟ لە خودا ترساوی لە کاتی کۆ کردنەوەیدا؟ حەقی هەژاران و نەدارانت لێ دەرهێناوە؟

هەروەها حەج سپاردەیە... ئەگەر خوای گەورە ڕزقەکەتی فراوان کردووە... بۆ حەجەکەت ئەنجام نادەیت؟

بە کابرایەکم گوت: (کاتێ بینیم خوای گەورە رزقی فراون کردووە): براکەم بۆ ناڕۆیت بۆ ئەنجامدانی حەجەکەت؟ گوتی: ئەی شێخ... دەتەوێت بڕۆم شەست هەزار خەرج بکەم بۆ ئەوەی لە کەعبە بەردێك ماچ بکەم؟! ئا بەم شێوەیە — پەنا بە خوا — جا ئەمە شێوەیەکە لە شێوەکانی خیانەت، کەوابوو فەرزەکان سپاردەن وە ئەندامەکانی لاشەت سپاردەن... چاوەکانت سپاردەن، گوێیەکانت سپاردەن، زمانت سپاردەیە، دامێنت سپاردەیە... پێیەکانت... دەستەکانت... هەموو ئەندامەکانی لاشەت سپاردەن.

بە جوانی لە گەڵ مندا بیر لەو ئایەتەی خوای گەورە بکەرەوە ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا﴾ الإسراء: ٣٦، واتە: بە دوای شتێکدا مەچۆ و نەزانی چییە و چۆنە و زانیاریت دەربارەی نییە، واتە: تا بە تەواوی زانینت بە شتێ نەبێت، هەنگاوی جیددی بۆ نەنێیت و قسەی لێ نەکەیت و بە دووی گومان مەکەوە، چونکە بە ڕاستی هەموو ئەمانە: (گوێ و چاو و دڵ) هەریەکەیان لە ڕۆژی قیامەتدا بەرپرسیارن لێی)).

دڵنیابە کە دەربارەی هەموو ئەم ئەندامانە پرسیارت لێ دەکرێت، چونکە هەموو ئەوانە سپاردەن لای تۆ، ئایا ئەم سپاردانەت بە جوانی و سپاردنەوە بە کار هێناوە؟ یان تۆ کەوتویتە ناو خیانەتەوە؟

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ ﴾ الأنفال: ٢٧، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ! گزی و خیانەت لە خوا و لە پێغەمبەر و لە سپاردەکانتان مەکەن، واتە: نەیار و دوژمنی ئەوان مەکەنە یار و دۆستی خۆتان و نهێنییەکانیان لا بدرکێنن بۆ خۆیشتان چاك ئەزانن، کە گوناه و تاوانی خەیانەت کردن چەندە گەورەیە و دەشکەرێتەوە سەر ئەستۆی ئێوە)).

ئایا بەندەیەك دەتوانێت خیانەت لە خوا و پێغەمبەرﷺ بکات؟ بەڵێ... چۆن؟

ابن عباس[1] دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ ﴾ بە وازهێنان لە فەرزەکانی ((وَٱلرَّسُولَ)) بە فەوتاندن و بزر کردنی سوننەتەکان و ئەنجامدانی سەرپێچییەکانی ((وَتَخُونُواْ أَمَانَاتِكُمْ)) ئەو سپاردانە لە نێو خۆتاندا پووچ مەکەنەوە بە بزر کردن و فەوتاندنی)) .

ئایا ئێستا زانیت کە بەندە چۆن خیانەت دەکات لە پەروەدگارەکەی؟ چۆن خیانەت لە پێغەمبەرەکەیﷺ دەکات؟ کەوابوو خێراکە –براکەم– بۆ ئەوەی ببیتە کەسێکی ئەهلی سپاردە، ببە کەسێکی دەستپاك بە جێ بەجێ کردنی فەرمانەکان... ببە کەسێکی دەستپاك بە وازهێنان لە قەدەغەکراوەکان... ببە کەسێکی دەستپاك بە وەستان لەسەر سنوورەکانی خوای پەروەردگار ... ببە کەسێکی دەستپاك لە گەڵ خۆشەویستە هەڵبژێردراوەکەتداﷺ بە شوێن کەوتنی سوننەتەکەی... بە بەرگری و پاراستنی شەریعەتەکەی... بە گەیاندنی بانگەوازەکەی و هەوڵدان بۆ دینەکەی لە نێو خەڵکیدا بە قسەکانت، بە ڕاستگۆیەکەت، بە ڕەوشتت، بە ئاکارەکانت، بە کردەوەکانت...

لێرەدا ئاوڕدانەوەیەکی گرنگ هەیە پێم خۆشە کە ئاگادارت بکەمەوە ئەویش: هیچ مانای نییە کاتێك کە فلان خیانەتت لێ دەکات و تۆیش خیانەتی لێ

---

[1] ـــ أخرجه ابن جرير الطبري في تفسيره (لسورة الأنفال: ٢٧)،،ابن أبي حاتم في ((تفسيره))، وانظر: ((الدر المنثور)) (٤ / ٤٥، ٤٦).

دەکەیت!! نەخێر... بەڵکو ئەگەر جگە لە موسڵمانان خیانەت بکەن ئەوا ئەهلی ئیسلام خیانەت ناکەن... ئەگەر جگە لە موسڵمانان غەدر بکەن ئەوا موسڵمانان غەدر ناکەن... چونکە ئێمە دینێکمان هەیە قسەکانمان و کردەوەکانمان و هەستەکانمان و ڕەوشتەکانمان ڕێك دەخات وە بۆ هیچ کەسێك نییە کە ئەوەی بیەوێ بیکات و لە چی کاتێکدا بیکات... نابێت هیچ کەسێك ئەوەی ئەیەوێ بیڵێت لە هەر کاتێکدا خۆی بیەوێ... نەخێر... چونکە تۆ دینێکت هەیە هەموو هەڵسوکەوتێکی تۆی ڕێکخستووە تەنانەت خۆشەویستی... ڕق لێ بوون... بەخشین... گرتنەوە... کەوابوو تۆ لە سەرتە پارێزگاری سپاردە بکەیت، لە هەموو کات و ساتێکدا لە هاتن و ڕۆیشتندا لە چوونە ژوورەوە و دەرچووندا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ ﴾ الإسراء:٨٠، واتە: ئەی موحەممەدﷺ بڵێ: پەروەردگاری من ! لە هەر جێگایە هەم و هەر کارێکم بە دەستەوە بێ هاوکاری و یارمەتیم بدە بۆ ئەنجامدانی چ لە دونیا و چ لە پاشە ڕۆژدا تا بە ڕاست و ڕاستانە بتوانم ئەنجامی بدەم، واتە: با هەردەم جێگەی ڕەزامەندی تۆ بێت، بە ڕاست و ڕاستانە و سەرفرازانەش لە جێگایەدا بەرێم بکە بە کورتی: چوونم بۆ هەر جێگایەك هەر لە بەر ڕەزامەندی و خۆشنوودی تۆ بێت دەرچوونیشم بۆ هەر جێگایەك با بە پێی مەیل و خواستی تۆ بێ و بتوانم بە باشی لێیان بچمە دەرێ)).

کەوابوو دەبێ جێگای چوونە ژوورەوەت چوونە ژوورەوەیەکی ڕاست بێت وە جێگای دەرچوونت دەرچونێکی ڕاست بێت... با قسە و کردەوەکانت قسە و کردارێکی ڕاست بێت...

ئەمە ئیمانداری دەستپاکە.... جا هەموو ئیمانداران دەستپاکن، دووڕووەکان ناپاك و خائینن – داوای لێبوردن دەکەم کە شێوازی قسەکانم توندن بەڵام ئەوە ڕاستییە – چونکە کەسی دووڕوو ناپاکە (خائینە) وە بۆ خیانەتەکەی چەند نیشانەیەك هەیە...

لە هەردوو کتێبی (صحیح البخاری ومسلم)[١] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (أبی هریرە) ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((آیـة المنافق)) واتە: نیشانەکانی دووڕوو ((ثلاث: إذا حدث کذب)) واتە: سێ دانەن: ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات)) خودایە ئێمە و ئێوە رزگار بکات لە درۆ وە بمانگێڕە لە راستگۆکان ((وإذا وعد أخلف، وإذا أؤتمن خان)) واتە: ئەگەر بەڵێنی دا ئەوا نایباتە سەر و ئەگەر سپاردەیەکی پێ سپێردرا ئەوا خیانەتی لێ دەکات)).

## بەڵێ خیانەت ئاکارێکە لە ئاکارەکانی دووڕوویی.

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[٢] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (عبدالله ی کوڕی عمرو)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:: ((أربع من کن فیه کان منافقا خالصا، ومن کانت فیه خصلة منهن کانت فیه خصلة من النفاق حتی یدعها، إذا اؤتمن خان، وإذا حدث کذب و إذا عاهد غدر و إذا خاصم فجر)) واتە: چوار ئاکار و رەوشت هەن هەرکەسێ تێیدا بوو ئەوا دوورەووەیەکی روونە . وە ئەگەر هەرکەسێك ئاکارێکی تێدا بوو ئەوا ئاکارێکی لە دووڕووی تێدایە تاکو وازی لێ دەهێنێ: ئەگەر سپاردەیەکی پێ سپێردرا ئەوا خیانەتی لێ دەکات و ئەگەر قسەیەکی کرد درۆ دەکات و ئەگەر پەیمانێکی دا ئەوا غەدر دەکات و ئەگەر دوژمنایەتی و نەیارێتی کەسێکی کرد ئەوا لە راستی لا دەدا))

کەوابوو... ئیمانداران دەستپاکن... دووڕووەکان ناپاك و خائینن... بۆیە سپاردەکان جێ بە جێ بکە و خۆت مەچوێنە بە دووڕووەکان لە هیچ ئاکارێك لە ئاکارەکانیان...

هەروەها بزانە کە تەنها وشەیەك سپاردەیە... تەنها وشەیەك بە کەم مەزانە... هەرچەندە ئەو وشەیە بینراو بێت یان خوێندراو یان بیستراو یان وێنەکێشراو یان نوسراو... چونکە رەنگە بە تەنها وشەیەك ڕەزامەندی خوا بە دەست بهێنی، یان بە

---

١ـ أخرجه البخاري، کتاب الإیمان،باب علامات المنافق(٣٣)،ومسلم، کتاب الإیمان،بیان خصال الإیمان (٥٩).

٢ـ أخرجه البخاري،کتاب الإیمان،باب علامات المنافق(٣٤)، ومسلم، کتاب الإیمان،بیان خصال الإیمان (٥٨).

تەنها وشەیەك توشی پەستی خوا ببی، من یادی خۆم و براکانم لە ئەهلی زانست دەکەمەوە، براکانم لە ئەهلی ئەدەب، رۆژنامەوانان و بیرمەندان و پەروەردەکاران و فێرکاران... وە بە هەمووان دەڵێم... تەنها وشەیەك سپاردەیە ..! داوا لە خوا دەکەم کە من و ئێوە بگێڕێ لە ئەهلی ئەم جۆرە سپاردەیە وە بۆ هەموو شێوەیەك لە جۆرەکانی سپاردە... بۆیە چاودێری خواکەت بکە -برای موسڵمانم- لە پێش ئەوەی تەنها وشەیەك بە زمانتدا بێت وە پێش ئەوەی قسە بکەیت...

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (أبوهريرە)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إن العبد ليتكلم بالكلمة من رضوان الله لا يلقي لها بالا يرفعه الله بها درجات، وإن العبد ليتكلم بالكلمة من سخط الله لا يلقي لها بالا يهوي بها في جهنم))، واتە: بەندەی وا هەیە تەنها وشەیەك لە ڕەزامەندی خوادا دەڵێت و گوێی پێ نادا کەچی خوای گەورە بە هۆیەوە پلەی بەرز دەکاتەوە و بەندەیەك تەنها وشەیەك لە پەستی خوادا دەکات و گوێی پێ نادا کەچی بە هۆیەوە دەهاوێژرێتە ناو دۆزەخەوە)).

لە گەڵ مندا بیر بکەرەوە لەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ ق: ١٨، واتە: هەر وتەیەکی لە دەم دەردەچێت فریشتەی چاودێری ئامادە لە لایەتی دەینووسێ ئایا فریشتەکان هەموو قسەیەك دەنووسن؟ یا تەنها ئەو قسەیە دەنووسن کە پاداش و تۆڵەی هەیە؟ بەڵێ بە پێی ئەم ئایەتە هەموو وتە و قسەیەك ئەنووسن)).

هەروەها نهێنی سپاردەیە... ئەگەر هەر برایەك نهێنییەکی خۆی لای تۆ درکاند ئەوە تۆ ببە کەسی ئەهلی پاراستنی ئەو سپاردەیە وە هەرگیز نهێنی براکەت مەدرکێنە... تۆیش ئەی خوشکی بەڕێزم ئەگەر یەکێك لە دەستە خوشکەکانت نهێنییەکی خۆی لای تۆ درکاندا ئەوا ببە کەسی ئەهلی پاراستنی ئەو نهێنییە وە

---

١ ـ أخرجه البخاري، كتاب الرقاق، باب حفظ اللسان (٦٤٧٧) واللفظ له، و مسلم كتاب الزهد و الرقاق، باب التكلم بالكلمة يهوي بها في النار (٢٩٨٨).

هەرگیز سپاردەکەی بزر مەکە و مەیفەوتێنە... لە نابوترین جۆری خیانەت ئەوەیە کە پیاوێك لە گەڵ خێزانەکەیدا و لە جێگادا دوو بە دوو بوونەوەدا ئەم قسەی خۆی لای ئەو باس کرد و ئەویش قسەی خۆی لا ئەم باس کرد کاتێ کە رۆژ بووەوە دادەنیشێت لە نێو هاوەڵ و هاوڕێ و هاوکارەکانیدا لەسەر کار یان لە نوسینگە یان لێرە یان لەوێ و نهێنی ژنەکەی خۆی دەدرکێنێ بەڕاستی ئەمە خیانەتێکی بۆگەن و گەنیوە...

تکام وایە لە گەڵ مندا بیر لەم هەڕەشەیە بکەیتەوە، لە فەرموودەیەکدا کە ئیمامی (مسلم)[1] ریوایەتی کردووە لە فەرموودەی (ابی سعید الخدری)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إن من أشر الناس عند الله منزلة يوم القيامة)) واتە: لە خراپترینی پایەی خەڵکی لە لای خوا لە رۆژی قیامەتدا))، لە ریوایەتێکی تردا هاتووە : ((إن أعظم الأمانة عند الله يوم القيامة: الرجل يفضي إلى امرأته و تفضي إليه، ثم ينشر سرها)) واتە: لە مەزنترین سپاردە لای خوا لە رۆژی قیامەتدا ئەوەیە: پیاوێك نهێنی خۆی لای ژنەکەی باس دەکات و ژنەکەی نهێنی خۆی بۆ پیاوەکەی باس دەکات کەچی پاشان نهێنییەکەی بڵاو دەکاتەوە)) ولا حول ولا قوه الا بالله.

ئازارەکان زۆرترە و زیاتر دەبێت کاتێ دەبیسم یان هەندێ نامە دەخوێنمەوە لەوانەی بۆم دەنێرن یان هەندێ جار پرسیارم لێ دەکرێ لەو جۆرە وشانەی کە دەگوترێت بە بێ هیچ رێکخەرێك لە هەندێ لە نوسینگەکانی کارکردندا هەندێ جار خوشکی زێزدارمان دادەنیشێ و گفت و گۆ دەکات لەسەر کارەکەی لە گەڵ پیاوێکدا (بە بانگەشەی برادەری) دەربارەی نهێنییەکانی جێگەی خەوتن... یان پیاوێك لەسەر کارەکەی دادەنیشێت بۆ برادەرێکی باسی نهێنییەکانی جێگای خەوتن دەکات لە گەڵ خێزانەکەیدا... بە راستی ئەمە خیانەتێکی بۆگەنی گەنیوە...

لە ناسکترین باس لەم بابەتەدا خوێندبێتمەوە ئەوەیە، کەوا کابرایەکی هۆشمەندی چاکەکاری دەستپاك هەبوو ویستی خێزانەکەی خۆی تەڵاق بدات بە هۆی جیاوازییەکەوە لە نێوانیاندا روویدا بوو، هەندێ خەڵکی چوون بۆ لای و

---

١ـ أخرجه مسلم، كتاب النكاح، باب تحريم إفشاء سر المرأة (١٤٣٧).

گوتیان: بۆ دەتەوێ خێزانەکەت تەڵاق بدەیت؟ چی شتێکی بە دڵت نییە؟ ئەم کابرا دەستپاك و دەمپاکە فەرمووی: کەسی هۆشمەند نهێنی خێزانی خۆی ئاشکرا ناکات !.. خوای گەورە قەدەری وابوو کە خێزانەکەی خۆی تەڵاق دا پاشان ڕۆیشتن بۆ لای (لە پاش ئەوەی تەڵاقی دابوو) گوتیان: تۆ ئێستا تەڵاقت داوە ئایا بۆچی ئەو ژنەت تەڵاق دا؟ ئەم پیاوە دەستپاکە فەرمووی: چیم دەوێ لە ژنی خەڵکی؟ ئەمە چۆن سپاردەیەکە؟؟!! بە ڕاستی ئەوانە دەستپاکن...

هەروەها زانست لای زانا سپاردەیە، ئەگەر لە خواترسا و ئەوەی لە سەرێتی بە جوانی جێ بە جێی کرد... بە تێگەیشتنی وردەوە... بە تێگەیشتنێکی قووڵەوە... بە چەند وشەیەکی ڕاستەوە، ئەم زانستەی ساختە نەکرد و ئەم زانستەی لە پێناوی ئارەزووەکانیدا پێشکەش نەکرد یان لە پێناوی دونیادا یان لە پێناوی ساماندا یان لە پێناوی پلە و پایەدا... ئەوا کەسێکی دەستپاکە وە هەرکەسێ زانستەکەی خۆی شاردەوە لە کاتێکدا دەزانێ ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا بە لەغاوی ئاگرین لەغاو دەکرێت.. چونکە کەسێکی ناپاك و خائینە و سپاردەکەی فەوتاندووە و بزری کردووە... داوا لە خوا دەکەم کە من و ئێوە بگێڕێ لە ئەهلی سپاردە.

هەروەها قەرز سپاردەیە... پێویستە لە سەرت – برای موسڵمانم – ئەی ئەو کەسەی کە قەرزت لە براکەت بردووە دەبێ دەستپاك بیت وە دەبێ حەقەکەی خۆی لە کاتی دیاری کراودا ببەیتەوە ئەگەر توانات هەبوو ئەو قەرزە بدەیتەوە، کاتێ رزقەکەت فراوان بوو ئەوا فێڵ دەکەیت وەکو فێڵی ڕێوییەکان... ئەمەیشە جۆرێکە لە جۆرەکانی خیانەت کەوابوو قەرز سپاردەیە... پێویستە لە سەرت دەبێت دەستپاك بیت لەم سپاردەیە ..

لە ناسکترین شت لەم بابەتەدا خوێندبێتمەوە ئەوەیە کە ئیمامی (البخاری)[1] بە شێوەی (تعلیق بصیغە الجزم) لە فەرموودەی (ابو هریرە) ەوە ڕیوایەتی کردووە لە پێغەمبەری خوداوەﷺ کە فەرموویەتی: ((أنه ذكر رجلا من بني إسرائيل سأل بعض بني اسرائيل أن يسلفه ألف دينار فقال: ائتني بالشهداء أشهدهم فقال كفى بالله

---

١ ـ أخرجه البخاري، كتاب الكفالة، باب الكفالة في القرض و الديون بالأبدان و غيرهما (٢٢٩١) معلقاً.

شهيدا قال: ائتني بالكفيل قال كفى بالله كفيلا قال صدقت فدفعها إليه إلى اجل مسمى فخرج في البحر فقضى حاجته ثم التمس مركبا يركبها يقدم عليه للأجل الذي أجله فلم يجد مركبا فأخذ خشبة فنقرها فأدخل فيها ألف دينار وصحيفة منه إلى صاحبه ثم زجج موضعها ثم أتى بها الى البحر فقال اللهم إنك تعلم أني كنت تسلفت فلانا ألف دينار فسألني كفيلا فقلت كفى بالله كفيلا فرضي بك وسألني شهيدا فرضي بك وإني جهدت أن أجد مركبا أبعث إليه الذي له فلم أقدر، وإني أستودعكها فرمى بها في البحر حتى ولجت ثم انصرف وهو في ذلك يلتمس مركبا يخرج إلى بلده فخرج الرجل الذي كان أسلفه ينظر لعل مركبا قد جاء بماله فإذا بالخشبة التي فيها المال فأخذها لأهله حطبا فلما نشرها وجد المال والصحيفة ثم قدم الذي كان أسلفه فأتى بالألف دينار فقال: والله مازلت جاهدا في طلب مركب لآتيك بمالك فما وجدت مركبا قبل الذي أتيت فيه،قال: هل كنت بعثت إلي بشيء ؟ قال أخبرك أني لم أجد مركبا قبل الذي جئت فيه قال: إن الله قد أدى عنك الذي بعثت في الخشبة فانصرف بالألف دينار راشدا))، واتە: باسی کابرایەکی کرد لە بەنی ئیسرائیل داوای لە کابرایەکی تر کرد هەر لە بەنی ئیسرائیل کە هەزار دیناری بە قەرز پێ بدات، کابرا فەرمووی: چەند کەسێکم بۆ بهێنە تا ببنە شایەت لە نێوانماندا، ئەویش فەرمووی: خودا بەسە ببێتە شایەتی نێوانمان، ئەویش فەرمووی: کەوابوو کەفیلێکم بۆ بهێنە، ئەویش فەرمووی: خودا بەسە ببێتە کەفیلم، فەرمووی: ڕاست دەکەی ئەویش پارەکەی پێدا بۆ ماوەیەکی دیاری کراو، ئەویش دەرچوو سواری دەریا بوو وە پێویستییەکەی خۆی جێ بە جێ کرد، ئەمجار بە دوای کەشتیەکدا دەگەڕا بۆ ئەوەی سواری ببێت و لە کاتی دیاری کراودا بگەڕێتەوە کەچی هیچ کەشتییەکی نەدۆزییەوە، بۆیە پارچە دارێکی هێناو هەڵیکۆڵی هەزار دینارەکەی تێ کرد و نامەیەکی لە گەڵدا نارد بۆ کابرای هاوڕێی ئەمجار جێگاکەی ڕێك و پێك کرد پاشان هێنایە سەر روبارەکە و فەرمووی: ئەی پەروەردگاری من! خۆت باش دەزانی کەوا من لە فلان کەس هەزار دینارم قەرز کردبوو ئەویش داوای کەفیلی لێ کردم منیش گوتم: خودا بەسە ببێتە کەفیلم وە ئەویش بە کەفالەتی تۆ رازی بوو، ئەمجار داوای شایەتی لێ کردم و

منیش گوتم: خودا بەسە ببێتە شایەتی نێوانمان وە ئەویش بە شایەتی تۆ رازی بوو وە خۆت باش دەزانی کەوا من هەوڵێکی زۆرم دا بۆ ئەوەی کەشتیەك بدۆزمەوە تا پارەکەی پێدا بنێرمەوە کەچی نەمتوانی بۆیە من ئەم پارەیەت پێ دەسپێرم، ئەمجار فرێی داوە ناو دەریاکە تاوەکو نوقمی ئاوەکە بوو، ئەمجار گەڕایەوە، لە گەڵ ئەوەیشدا بە دوای کەشتییەکدا دەگەڕا بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە وڵاتەکەی خۆی، جا ئەو کابرایەی کە پارە قەرزەکەی دابوویە لە ماڵ دەرچوو بۆ سەر دەریا بەڵکو کەشتییەك بگەڕێتەوە و پارەکەی بۆ هێنابێتەوە، جا لەسەر دەریاکە پارچە دارەکە کە پارەکەی تێدا بوو بینی، ئەویش هەڵیگرت و بردیەوە بۆ ماڵ بە مەبەستی بە کار هێنانی بۆ سوتەمەنی کاتێ کردیەوە پارە و نامەکەی تێدا دۆزییەوە، پاشان کابرای قەرزار گەڕایەوە و هەزار دینارەکەی لە گەڵ خۆیدا هێنا و فەرمووی: سوێند بە خوا من بەردەوام هەوڵم دەدا بۆ ئەوەی کەشتیەك بدۆزمەوە تا لە کاتی خۆیدا پارەکەت بۆ بگێڕمەوە کەچی هێچ کەشتیەکم لە پێش ئەم کەشتیە نەدۆزییەوە، فەرمووی: ئایا تۆ هیچ شتێکت بۆ من ناردووە؟ فەرمووی: من پێت دەڵێم لە پێش ئەم کەشتییە کە پێی هاتووم هیچ کەشتیەکی ترم نەدۆزییەوە، فەرمووی: کەوابوو بزانە کەوا خوای گەورە ئەو پارەی کە بە پارچە دارەکەدا ناردبووت گەیاندیە دەستم، ئەویش گەڕایەوە بە هەزار دینارەکەی خۆیەوە)) .

تەماشای سپاردەی قەرزدار و قەرزدەر بکە !!((فمن أخذ أموال الناس يريد أداءها أدى الله عنه ومن أخذ أموال الناس يريد إتلافها أتلفه الله))[1] هەروەکو راستگۆ فەرموویەتیﷺ... واتە: هەرکەسێ پارەی لە خەڵکی بە قەرز برد و دەیەوێ بیگێڕێتەوە ئەوا خوای گەورە یارمەتی دەدات بۆ دانەوی، هەرکەسێ پارەی لە خەڵکی برد و دەیەوێ بیفەوتێنێ ئەوا خوای گەورە دەیفەوتێنێ)).

هەروەها بازرگانی سپاردەیە، ئیمامی (البخاري ومسلم)[2] ریوایەتیان کردووە لە

١ـ أخرجه البخاري، كتاب الاستقراض و أداء الديون و الحجر و التفليس، باب من أخذ أموال الناس يريد أداءها أو إتلافها (٢٣٨٧) من حديث أبي هريرةﷺ.

٢ـ أخرجه البخاري، كتاب البيوع، باب إذا بيّن البيعان، ولم يكتما، ونصحا (٢٠٧٩)، ومسلم كتاب البيوع، باب الصدق في البيع و البيان (١٥٣٢).

فەرموودەیەکی (حکیم ی کوڕی حزام)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((البیعان بالخیار ما لم یتفرقا، فإن صدقا و بینا بورك لهما في بیعهما، وإن کتما و کذبا محقت برکة بیعهما))، واتە: کڕین و فرۆشتن لە نێوان دوو کەسدا بە هەڵبـژاردن دەبێت (واتە: ئەگەر بیەوێ بیکڕێ یان نا) بە مەرجێ لە یەك جیانەبنەوە، جا ئەگەر ڕاستیان کرد و هەموو شتێکیان ڕوون کردەوە ئەواخوای گەورە بەرکەت دەخاتە ناو ئەو کڕین و فرۆشتنەوە، بەڵام ئەگەر درۆیان کرد و لە یەکتر شتیان شاردەوە ئەوا بەرکەت لەو کڕین و فرۆشتنەدا نامێنێ)).

هەروەها ئەو ژنەی کە لە لای تۆیە سپاردەیە، دڵنیابە کە دەربارەی ئەو پرسیارت لێ دەکرێت لە بەردەستی خوادا وە بزانە کە نەیار و دوژمنت جگە لە خێزانەکەت ئەگەر ستەمی لێ بکەیت ئەوا پێغەمبەری خوایەﷺ هەروەکو لە (مسند أحمد) و (سنن ابن ماجه)و (مستدرك الحاکم)و (صحیح ابن حبان) و جگە لەوان[1] لە فەرموودەیەکی(ابو هریرە)ەوە هاتووە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((اللهم إني أحرج علیکم حق الضعیفین الیتیم والمراة))، واتە: ئەی خودایە... من نرخ و بەهای مافی ئەو دوو بەندە لاوازەت لا گران دەکەم: هەتیو و ئافرەت)).

هەروەها ئەو پیاوەی لە لای تۆیە سپاردەیە (ئەی خوشکی بەڕێزم) دڵنیابە کە پرسیارت لێ دەکرێت دەربارەی، جا ئەگەر لە ماڵەوە نەبوو ئەوا دەستپاك بە و سامانەکەی بپارێزە، ناموسەکەی بپارێزە، شەرەفەکەی بپارێزە، ئابڕۆکەی بپارێزە، پلە و پایەکەی بپارێزە، منداڵەکانی بپارێزە، بە پەروەدەیەکی سەنگینەوە پەروەدەیان بکە لەسەر قورئان و سوننەت، لەسەر قسەی ڕاستی و لەسەر کردەوەی چاك و دڵنیابە کەوا منداڵەکانت سپاردەن... لە بەر دەستی خوادا دەربارەی ئەو سپاردەیە پرسیارت لێ دەکرێت، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ﴾ التحریم: ٦، واتە: ئەی ئەوانەی

---

١ ـ أخرجه أحمد (٢ / ٤٣٩)، وابن ماجه، کتاب الأدب، باب حق الیتیم (٣٦٧٨)، والنسائي في ((الکبری)) (٩١٤٩)، والحاکم (١٣١/١)، وابن حبان (٥٥٦٥)، وصححه العلامة الألباني في ((الصحیحة)) (١٠١٥).

باوەڕتان هێناوە! خۆتان و ژن و ماڵ و کەس وکارەکەتان بپارێزن لە ئاگرێك سووتەمەنییەکەی جەستەو لاشەی مرۆی کافر و بەردە، یان ئەو بەردانەن خەڵکی دەیپەرستن، مەبەست ئەوەیە کە زۆر بڵێسەدار و بە گڕ و گەرمە،ك ئاگری ئەم دونیا نییە کە تەنها بە دار و بە چیلکە هەڵگیرسێ بەڵکو ئەو بە بەرد زیاتر گردەگرێ و بڵێسە ئەسێنێ ! کۆمەڵە فریشتەیەکی زبر و توند و تیژ بە سەریەوەن هەر چەندە داوای بەزەییان لێ بکرێ کەڵکی نییە نافەرمانی خوا ناکەن لە هەرشتێك فەرمانیان پێ بکا وە هەر فەرمانێکیشیان پێ بسپێرێ بە خێرایی ئەنجامی دەدەن)) .

داوا لە خوا دەکەم من و ئێوە لە خیانەت پاك بکاتەوە...

ڕێزداران... چەند پێویستیمان بە سپاردەیە!! بە قەستی درێژەم بە باس و شێوەکانی سپاردە دا چونکە ئێمە لەوپەڕی پێویستی داین بۆ سپاردە، هەر یەکێك لە ئێمە سپاردەیەکی پێی سپێردراوە وە یادی خۆم و براکانم و خوشکانم دەخەمەوە کەوا ببینە ئەهلی ئەو سپاردەیە جا قەبارەکەی چەند بێت... بزانە تۆ لەو پلە و پایەی کە تیایدا دەبێت دەستپاك بیت... هەر لار و لەوێریەك لە ئەنجامدانی کارەکەتدا بە وەرگرتنی بەرتیل یان خواردنی سامانی خەڵکی بە ناڕەوایی یان فەوتانی بەرژەوەندییەکانی خەڵکی... ئەوە شێوەیەکە لە شێوەکانی خیانەت... فەوتانی سامانی گشتی بە بانگەشەی ئەوەی کە سامانی بێ سەرپەرشت (سایب) خاوەنی نییە و چاودێری نییە وە دڵنیابە کە فەوتاندن و خەرج کردن لە جێگەیەکی بێ سوود دا ئەوا ناشیرینترین شێوەیە لە شێوەکانی خیانەت.

کەوابوو با لە خوا بترسین و پاراستن و چاودێری خوا بکەین... دڵنیابە کەوا خوای گەورە دەبینی و دەبیسێ وە فەوتان و بزرکردنی سپاردە ڕوویداوە وە پێغەمبەری خوا ﷺ کردوویەتییە نیشانەیەك لە نیشانەکانی قیامەت، ئەوەتا ئێمە بە چاوی خۆمان دەیبینین و هەستی پێ دەکەین کەوا بڵاو بووەتەوە لە ئاستی مرۆڤایەتی بە بێ ناکۆکی و جیاوازی و لا حول ولا قوە الا باللە.

داوا لە خوا دەکەم من و ئێوە بگێڕێ لە ئەهلی سپاردە... من و ئێوە لە خیانەت بپارێزێ... چاومان گەش بکاتەوە بە بینینی سەرکەوتنی ئیسلام و عیززەتی موسڵمانان، هەر خۆی پشت و پەنامانە و بە توانایە بە سەر هەموو شتێکدا.

## لە نیشانە بچووکەکانی قیامەت

# زۆربوونی کوشتن و بڵاو بوونەوەی داوێن پیسی و دزی...

لەم بەشەدا باسەکەمان–بە پشتیوانی و یارمەتی خوا– دەربارەی نیشانەیەکی ترسناک، کە بە شێوەیەکی ترسناك و دیار بڵاو بووەتەوە... هەر کاتێك دەخوێنمەوەو ئەو هەموو دیمەنانە دەبینم ئەوا دڵەکان لە بن دەردەهێنن لە پەخشنامە هەواڵییەکان و لە ڕێگای کەناڵە ئاسمانییەکانەوە یان لە ڕێگای ئیزگەکانەوە یان ڕۆژنامەو گۆڤارەکانەوە... سوێند بەو خوایەی کە جگە لەو هیچ خوایەکی تر نییە خۆشەویستیم بۆ پێغەمبەری خواﷺ زیاد دەکات، باوەڕ و دڵنیاییم زیاد دەکات کەوا خۆشەویستە هەڵبژێردراوەکەم هیچ شتێك کەوا ڕوویداوە یان ئێستا تیایداین یان لە داهاتوودا ڕوودەدات لە هەموو بوونەوەردا و لە پێش قیامەت ئیللا پێغەمبەری خواﷺ باسی کردووە، ئەو کەسەی کە هەرگیز لە خۆ وە قسە ناکات وەکو خۆی ڕوویداوە، پێغەمبەری خواﷺ باسی ئەو شێوازە کوشتنە نابووتەی کردووە کە ئەمڕۆ دەیبینین لە هەر پەخشنامەیەك لە پەخشنامە هەواڵییەکان وە ڕەنگە زیادە ڕەویم نەکردبێت کاتێ بڵێم: هیچ پەخشنامەیەکی هەواڵی یان ڕۆژنامەیەکی ڕامیاری نییە باسی ئەو جۆرە تاوانە خراپانە نەکات... دەربارەی ئەو هەموو خوێنە کە دەڕژێت و دەڕوات وە دەربارەی ئەو هەموو جەستانە کە ڕۆژانە پارچە پارچە دەکرێن لەسەر ڕووی زەویدا...

لە گەڵ مندا بیر بکەرەوە و دڵ و بوون و هۆشت کۆ بکەرەوە، ئیمامی (مسلم) لە (صحیح)[1] دەکەیدا ڕیوایەتی کردووە لە فەرموودەیەکی (ابوهریرە) دوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((لا تقوم الساعة حتى يكثر الهرج)) قالوا: وما الهرج يا رسول الله؟ قال: ((القتل القتل)) واتە: قیامەت هەڵناسێت تاوەکو (الهرج) زۆر

---

١ ـ أخرجه مسلم، كتاب الفتن واشراط الساعة، باب إذا تواجه المسلمان بسيفيهما (١٨ / ١٥٧).

نەبێت... فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا(الهرج) چییە؟ فەرمووی: کوشتن کوشتن)) .

لە ڕیوایەتێکی تردا کە لە (مسلم)[١] دا هاتووە لە فەرموودەیەکەی (ابو هريره)ەوە —لەگەڵ مندا بیر لەم ڕیوایەتە بکەرەوە — کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((والذي نفسي بيده))، واتە: سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە ...) جا ئەو کەسێکی ڕاستگۆیە و هیچ پێویست بە سوێند ناکات، بەڵام سوێند دەخوات! لەسەر چی؟! دەڵێت: ((والذي نفسي بيده لاتذهب الدنيا حتى يأتي على الناس يوم لا يدري القاتل فيم قتل، ولا المقتول فيم قتل)) ، واتە: سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە ئەم دونیایە بە سەر ناچێت تاکو ڕۆژێك دێت بە سەر خەڵکیدا کەوا بکوژ نازانێت بۆ دەکوژێت و کوژراویش نازانێت بۆ کوژراوە)).

کاتێ من بە وردی تەماشای هەندێ لەو گفت و گۆیانە دەکەم کە لە گەڵ هەندێ سەربازەکان ڕوویداوە، ئەو سەربازانەی کە لەوپەڕی زەوییەوە هاتوون، لە ئەمریکاوە بۆ ناوجەرگەی عێراق یان لە بریتانیاوە یان لە ئیتاڵیاوە یان لە ئوستralیاوە بۆ ناوجەرگەی عێراق، هەندێ لە ڕۆژنامەکان ئەو گفت و گۆیانەیان ئەنجام داوە لە گەڵ هەندێ سەربازدا... بۆچی هاتووی بۆ ئێرە؟ نازانێت... ئەمجار ئەوەی کە سواری فڕۆکەکەی دەبێت یان سواری زرێپۆشەکەی دەبێت نالێم ماڵێك بەڵکو شارێك بە تەواوەتی لە ناو دەبات، بەڵکو وڵاتێك بە تەواوەتی بە چەندەها تەنێکی ترسناك لەو چەکە کوشندە فرێ دەداتە خوارەوە... بەڵکو ئەو جۆرە چەکانەی کە قەدەغەکراوە و بە تاوان دەژمێردرێت لە نێو دەوڵەتاندا (ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر ئەوان ڕێز لە یاسا نێو دەوڵەتییەکان بگرن) بە هەزاران تەن لەو جۆرە چەکە قەدەغەکراو و تاوانکارو کوشندانە فرێ دەدەنە خوارەوە کە هەر لە یەکەم ساتیدا سەدان بەڵکو هەزاران لە ناو دەبات... کە شار و قوتابخانە و کارگە و کێڵگە لە ناو دەبات هەر ئەوەیە، کە جەستەی مرۆڤەکان دەکاتە لاشەیەکی بێ

---

١ـ أخرجه مسلم، كتاب الفتن واشراط الساعة، باب لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل بقبر الرجل فيتمنى أن يكون مكان الميت من البلاء (٥٦ / ٢٩٠٨).

گیان و دەیکاتە کۆمەڵە تەپۆڵکەیەك لە گۆشتی بچڕ بچڕ و دەریایەك لە خوێن... تاکو وای لێهاتووە ئێستا خوێن لە گڵ هەرزانترە... کەچی ئەو کەسەی کە ئەو هەموو بارە قورسەی کە هەزاران کەس لە مرۆڤەکان لە ناو دەبات نازانێت بۆ دەکوژێت؟ ئەو هەژارە ئاگای لە هیچ شتێك نییە... ئەو پیرەمێردەی کە لاشەی پارچە پارچە بووە و ئەو منداڵە شیرەخۆرەی کە لەسەر خەونە شیرینەکانی خۆی خەوتووە کەچی لاشەی دەتەقێتەوە بە هەموو ئەو تەنە هاوێژەرانە و ئەو هەموو راجیمە و موشەك و فرۆکە کە هەر لە یەکەم بیستنی ئەو دەنگانە دەمرێت پێش ئەوەی بە ڕاستی بمرێت، لە ترساندا دەمرێت لە پێش ئەوەی بمرێت وە لە پێش ئەوەی روحی لە جەستەی جیا ببێتەوە لە کاتێکدا ئەو منداڵێکی رووخۆشە... بەڵکو هێشتا ئەو منداڵێکی شیرەخۆرە ئالاوەتە پەڕۆ و پاڵەکەیەوە، ئەی ئاخۆ تاوانی چییە؟ بۆ کوژرا؟ نازانێت!.

ئەو ئافرەتە بەستەزمانە کە هیچ چەکێکی هەڵنەگرتووە و لە ماڵەکەی خۆیدا و لە نێو منداڵەکانیدا دانیشتووە لە ناکاودا دەبینێ منداڵەکانی پارچە پارچە دەکرێن لە بەر دەستیدا و لە پێش چاوی، رەنگە خۆیشی لاشەی پارچە پارچە بێت ... کەچی نازانێت بۆ منداڵەکانی کوژران؟ وە نازنێت بۆ مێردەکەی کوژرا؟ وە نازانێت بۆ باوکەکەی کوژرا؟ نازانێت بۆ خۆی کوژرا؟ ((لا يدري القاتل فيم قتل ولا المقتول فيم قتل)).

بە راستی تاوانێکی نابووتە و دڵەکان گڕ دەدات... هەر پەخشنامەیەك لە پەخشنامەکانی هەواڵ چاوەکان بیانبینێ ئیللا فرمێسکی لێ دێتە خوارەوە و دەگری... مرۆڤ دەیانبینێ دڵی پارچە پارچە دەبێت و جەرگی دەبڕێت لەسەر رشتنی ئەو خوێنە هەرزانە ... کە رۆژانە دەرژێن ... بەڵکو (سوێند بە پەروەردگاری کەعبە) زیادە رەویم نەکردووە ئەگەر بڵێم لە هەموو کاتژمێرێکدا خوێن دەرژێت لە عێراق لەم ساڵانە کەمەی دواییدا بە هەزاران کەس کوژران لە پیاوان و ژنان و منداڵان!! ئایا ئەو هەموو لاشەیەی کەوتووەنەتە سەر ئەو ئاوانە بۆ؟ سەریان بڕیوە و لە دارستانەکان و کێڵگەکاندا فرێ دراون وە لەسەر تەنیشتی

ڕێگاکان؟ بۆ ئەو هەموو خوێنە ڕژان کە خاکی عێراقی ڕەنگ کردووە ... لە لوبنان و فلسطین و ئەفغانستان و شیشان و صۆماڵ و سودان ... لە هەموو جێگایەك!! بۆ تا ئەو ڕادە و بەو شێوەیە خوێن هەرزان بووە؟ لە سەرووی هەموو ئەوانەوە کە بووەتە هۆی ئەوەی دڵەکان خوێنیان لێ بتکێ و خوێنیان لێ بڕژێ و جەستەکان پارچە بێت بە ناوی دیموکراسی و ئازادییەوە یان بە ناوی ئەو پڕوپاگەندەو دروشمە درۆ و هەڵخەڵەتاندنەوە... خوێن بووەتە هەرزانترن شت لەم بوونەوەردا، مرۆڤیش بووەتە قێزەونترین شت ....ولا حول ولا قوة الا بالله.

ئەی موسڵمانان ... بەڵکو ئەی دانیشتوانی هەموو جیهان... خوێن حورمەتێکی تایبەتی خۆی هەیە... ئاواتەخواز بووم ئەگەر ئەم چەند وشانەم وەربگێردرایەتە زمانەکان بۆ ئەوەی هەموو مرۆڤایەتی گوێبیستی بێت – لە گەڵ جیاوازی بیرو باوەر و زمان و زاراوەکان – کەوا خوێنی هەر مرۆڤێك حورمەتی تایبەتی خۆی هەیە، ئەو خودایە خۆی مرۆڤی دروستکردووە ڕێزی لێ گرتووە و فەرمانی کردە فریشتەکان کە سوژدەی بۆ ببەن و لە ڕوحی خۆی فووی پیادا کردووە و لە پێناویدا چەندەها کتێبی دابەزاندووە و لە پێناویدا چەندەها پێغەمبەرانی ناردووە و بەڵکو لە پێناویدا یاسا و ڕێسایەکی بتەوی داناوە کە خوشگوزرانی دونیا و دوا ڕۆژی تیادایە... مافەکانی خۆی تیادایە، لە مەزنترین ئەو مافانە مافی ژیانە... ئەو مافە کە هیچ کەسێك بۆی نییە حورمەتەکەی ئەتك بکات یان سنوورەکانی ببەزێنێت و حەڵاڵی بکات چونکە خوای گەورە تەنها خۆی ژیانی بە خەڵکی بەخشیوە ... جا بۆیە بۆ هیچ کەسێك نییە لە دروستکراوەکانی ئەو ژیانە لە خەڵکی تر زەوت بکات و لێی بسێنی بەو شێوە قێزەونە هەرزانە بێ نرخە...!! ئەم مافە تەنها مافی خوای گەورەیە و لە سنوری ئەو یاسا و ڕێسایەدا کە خۆی دایڕێژاوە بۆ بەندەکانی... جا ئەو خۆی تەنها دەزانێ کێی دروست کردووە... خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ﴾ الملك: ١٤، واتە: مەگەر خوا نازانێ کێی دروست کردووە و چۆنی دروست کردووە لە کاتێکدا زۆر وردبین و بە ئاگایە؟)).

نابێت بە هیچ شێوەیەك ئەو ژیانە لە هیچ کەسێك زەوت بکرێت تەنها لە سنووری شەرعدا نەبێت ... لەسەر دەستی فەرمانڕەوای وڵات، ئەو کارە بە شێوەیەك بە جێ نەهێڵراوە هەرکەسێ بیەوێ بکوژێت ئەوا بکوژێت و لە چی کاتێکدا بیەوێت ئەوا بیکوژێت... پاشان بە دڵنیایی و ئارامییەوە بۆی دەرچێت بە بانگەشەی ئەوەی سنورێك لە سنورەکانی خوای جێ بە جێ کردووە!! نەخێر... ئەو کارە بۆ هیچ کەسێك جێ نەهێڵراوە چونکە خوێنەکان حورمەتیان هەیە و ژیانیش حورمەتی هەیە...

بائەوانەی ئاگری جەنگیان هەڵگیرساندو ئەوانەی خوێنی بێ تاوانەکانیان رشت و جەستەی منداڵ و ئافرەتانیان پارچە کرد، هەڕەشەی پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکان ببیسن لەو ئایەتەی کەوا خوای گەورە لە سورەتی (النساء) دا باسی کردووە و دەڵێت: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا ﴾ النساء: ٩٣، واتە: و هەرکەسێك بە دەستی ئەنقەست مرۆڤێکی خاوەن ئیمان بکوژێ سزا و تۆڵەی هەر دۆزەخە و بە هەتا هەتاییش تێیدا ئەمێنێتەوە غەزەب و تووڕەیی خوا لە سەرەو نفرینیشی لێ کردووە و سزایەکی گەورە و قورسیشی بۆ ئامادە کردووە)).

ئایا لە هەموو قورئاندا لە سەرەتای سورەتی (الفاتحە) تاکو کۆتایی سورەتی (الناس) هەڕەشەیەکی تر هەیە لەم هەڕەشەیە مەزنتر بێت؟ نەخێر...ئاواتە خواز بووم کە بە بەرزترین دەنگم هاوارم بکردایە بۆ ئەوەی هەموو سەرۆك و سەرکردەکانی جیهان بیانبیستایە... ئەوانەی کە ئێستا خوێن دەرێژن بە ناوی ئازادی و دیموکراسییەوە وە لە لای ئەوانە خوێن بووەتە هەرزانترین شت لە بوون و بوونەوەردا ئەمجار لە پاش هەموو ئەوانە دینەکەمان تۆمەتبار دەکرێت... ئیسلامەکەمان تۆمەتبار دەکەن کەوا دینی خوێن رشتنە و دینی توندڕەویی و تۆقاندنە...!! ئەمجار پێغەمبەرە هەڵبژێردراو و بە بەزەییەکەمان ﷺ تۆمەتبار دەکرێت کە ئەو نەهاتووە بۆ مرۆڤایەتی تەنها بە توندو تیژی نەبێت... تەنها بە تۆقاندن نەبێت... دینەکەی بڵاو نەکردووەتەوە تەنها بە زەبری شمشێر نەبێت!! تا کۆتایی ئەو هەموو پڕوپاگەندە بەتاڵ و ناڕەوایە کە تەنها ناڕەواییەکەی بەسە بۆ

ناڕەوایی کردنی و تەنها فەسادەکەی بەسە بۆ فەسادکردنی... وە بەڵاو موسیبەت و کارەساتەکە زیاتر دەبێت لە زاری کابرایەك (کە دەبوایە ئەویش وەکو ئەوانیتر ببوایەتە کۆترێك لە کۆترەکانی ئاشتی هەروەکو دەڵێن) کەچی پێغەمبەری ئاشتی ﷺ تۆمەتبار دەکات کەوا ئەو نەهاتووە بۆ مرۆڤایەتی تەنها بە تۆقاندن و ترساندن نەبێت... لە کاتێکدا ئەو پێغەمبەری میهرەبانییە ﷺ ... ئەمە دینەکەی (محمد ی کوڕی عبدالله) یە کە ئایەتەکەی خوای پەروەردگارمان بۆ دەخوێنێتەوە... ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴾ النساء: ٩٣، بە ڕاستی هەڕەشەیەکی ترسناکە لە کتێبەکەی خوای گەورەدا ...

ئەی پێغەمبەری میهرەبانی ﷺ چی فەرمووە؟ ئەو کەسەی هات بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی دڵنیا بکاتەوە و جەخت بکات لەسەر ئەم مافە واتە مافی ژیان وە هات بۆ ئەوەی حورمەتی خوێن روون بکاتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی (هەروەکو لە(صحيح البخاري)[1] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (عبدالله ی کوڕی عومەر)ەوە: ((لن يزال المؤمن في فسحة من دينه، ما لم يصب دما حراما)) واتە: کەسی ئیماندار بەردەوام وا لە نێو فراوانی دینەکیدا، تاوەکو خوێنێکی قەدەغەکراو نەڕێژێ)).

جا بۆیە (عبدالله ی کوڕی عومەر) دیفەرموو: ((إن من ورطات الأمور، التي لا مخرج لمن أوقع نفسه فيها: سفك الدم الحرام بغير حله))،[2] واتە: لە کارە گرفت و کارەساتەکان ئەوەیە هەرگیز رزگاربوونی نیە ئەگەر هاتوو کەسێك خۆی تێوەگلاند: رشتنی خوێنی حەرامە بە بێ حەڵاڵ کردنی)).

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا کە(أحمد و النسائي و جگە لەوان)[3] ڕیوایەتیان

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب الديات، باب قول الله تعالى: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ ﴾ النساء: ٩٣، (٦٨٦٢).

٢ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو (٦٨٦٣).

٣ ـ أخرجه أحمد (٤ / ٩٩)، والنسائي كتاب تحريم الدم (٣٩٨٤)، وفي ((الكبرى)) (٣٤٤٦)، والحاكم(٤/٣٩١) وقال: ((صحيح الإسناد))، ووافقه الذهبي، والطبراني في ((الكبير)) (١٩/ ٣٦٤، ٣٦٥) ((والأوسط)) (٥/٢١٩)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٤٥٢٤) و ((الصحيحة)) (٥١١).

کردووه له فەرموودەیەکی (معاویـة)ەوە، هـەروەها (ابـوداود) ریوایـەتی کـردووە لـە فەرموودەی (أبي الدرداء)[١]ەوە کـەوا پێغەمبـەری خـواﷺ فەرموویـەتی: ((کـل ذنـب عسى الله أن يغفره، إلا من مات مشركا، أو مـؤمن قتـل مؤمنـا متعمـدا)) واتـه: هـەموو تاوانێك ڕێی تێ دەچێت و ڕەنگە خوا لێی خۆش بێت تـەنها کەسێك نـەبێت کـە بـە موشـریکی مـردووه یـان کەسـێکی ئیمانـدار بـە قەسـتی کەسـێکی ئیمانـداری کوشتووه)).

خـوای گـەوره دەفـەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ﴾ النساء: ٤٨، واته: بێگومان هەرگیز خوا له دانانی هاوبـەش بـۆی نـابوورێ و له خوار شیرکەوە له هەر گوناهێك دەبوورێ بۆ هەر کەسێك خۆی بیەوێت)) .

خـوای گـەوره دەفـەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ﴾ الفرقـان: ٦٨، واتـه: ئەوانـەی وێـڕای خوا هیچ پەرستراوێکی تر ناپەرستن، کەسێکیش نـاکوژن کـە خـوا کەشـتنی یاسـاغ کردبێ، مەگـەر بـە هـەق و ڕەوا وەکـو پاشـگەز بوونـەوە لـە ئیـسلام، زینـا کـردن، کوشتنی خەڵکی بێ تاوان . زینا و داوێن پیسیش ناکەن)).

جا لێرەدا تاوانی گەورەی کوشتنی خستووەته پاش تاوانی گەورەی هاوەڵدانەوە و ئەمجار دەفەرموێت:﴿ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا ٦٨ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ٦٩ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٍۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ الفرقان: ٦٨-٧٠، واته: ... هەرکەسێ ئەو کاروکردەوە ناپەسەندانە بکات ئەوە له دواڕۆژدا دەگات بە سزای تاوانەکەی خۆی (٦٨) لە ڕۆژی قیامەتیشدا دوو بەرامبەر ئازار دەدرێ و بە سووکی و زەلیلی و ریسواییەوە بە هەتا هەتایی هەر لەوێدا ئەمێنێتەوە.(٦٩) مەگەر کەسێك پەشیمان دەبێتەوە و بڕوا بێنێ و کاری چاك

---

١ـ أخرجه ابو داود، كتاب الفتن والملاحم، باب تعظيم قتل المؤمن(٤٢٧٠)، وصـححه الـشيخ الألبـاني هنـاك، وهذا لفظه.

ئەنجام بدا ئا ئەو کەسانە خوا گوناه و خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە، هەمیشە خوا گوناه پۆش و میهرەبانە(٧٠))).

پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی هەروەکو لە (سنن النسائی)[1] دا هاتووە بە سەنەدێکی (صحیح) لە فەرموودەی (بریدە)وە: ((قتل المؤمن أعظم عند الله من زوال الدنیا)) واتە: کوشتنی ئیماندارێك لای خوا گەورە ترە لە رووخان و نەمانی دونیا)).

تەماشای حورمەتی خوێن بکە لە دینی خوادا و لە دینەکەی (محمد ی کوڕی عبدالله)دا بۆ هەموو مرۆڤێك... پێغەمبەری خواﷺ ئەم مافەی بۆ جگە لە موسڵمانان لە بیر نەکردووە ئەگەر لە کاتێکدا بەرانبەر بە موسڵمانان نەجەنگاون یاخود بێ باوەڕی خۆی رانەگەیەنێ و شمشێرەکەی بەرزنەکاتەوە بە سەریاندا.

پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی هەروەکو ئیمامی (البخاری) ریوایەتی کردووە (التاریخ – تعلیقا)وە (النسائی) لە (سنن)[2] ەکەیدا لە فەرموودەی (عمرو ی کوڕی الحمق الخزاعی)ەوە: ((من أمن)) واتە: هەرکەسێ ئەمانیدا بە کەسێکی تر ((من أمن رجلا علی دمە فقتلە، فأنا بریئ من القاتل وإن کان المقتول کافرا)) واتە: هەرکەسێ ئەمانی دا بە کابرایەك لەسەر خوێنەکەی و ئەمجار کوشتی، ئەوا من لەبکوژەکە بەریم و هەرچەندە ئەگەر کابرای کوژراو کەسێکی بێ باوەڕ بوو)).

با هەموو دونیا ببیسێ... با فاتیکان ببیسێ... با ئەوروپا ببیسێ... با ئەمرکا ببیسێ ... با هەموو ئەوانەی کە پێغەمبەری خواﷺ تۆمەتبار دەکەن کەوا ئەو نەهاتووە بۆ مرۆڤایەتی تەنها بە توند و تیژی و تۆقاندن نەبێت، با هەموو دونیا ببیسێ کە (محمدی کوڕی عبدالله) چی فەرمووە...؟!

---

١ـ أخرجه النسائي، كتاب تحريم الدم، باب تعظيم الدم (٣٩٩٠)، وفي ((الكبرى)) (٢/٢٨٥)، وصححه الألباني في ((صحيح الجامع)) (٤٣٦١).

٢ـ أخرجه البخاري –معلقاً – في ((التاريخ)) (٣/ ٣٢٢)، والنسائي في ((الكبرى)) – بلفظ قريب – (٥/٢٢٥)، وابن حبان (٥٩٨٢)، والطيالسي (١٢٨٥)، وعبدالرزاق في ((مصنفه)) (٩٦٧٩)، والبيهقي في ((الكبرى)) (٩/ ١٤٢)، والبزار في ((مسنده)) (٦ / ٢٨٥)، وصححه الألباني في ((صحيح الجامع)) (٦١٠٣) و ((الصحيحة)) (٤٤١).

سوێند بە خوا ئەم سەر زەوییە هیچ کەسێکی نەناسیوە وەکو پێغەمبەری خوای ﷺ میهرەبانتر و ڕاستگۆ تر و بە وەفاتر و پاکتر و شەریفتر بێت ... ئەگەر هەر کەسێك بەڵێنی بە کەسێك دا بە ئارامی و هێمنی پاشان غەدری لێ کرد ئەوا لە ڕەوشت و ئەخلاقی (محمد) نیە و لە دینی خوای باڵا دەست نییە...

من چەند جارێك گوتوومە... ڕێزداران ... ئەگەر جگە لە موسڵمانان خیانەت بکەن ئەوا موسڵمانان خیانەت ناکەن وە ئەگەر ئەوان غەدر بکەن ئەوا موسڵمانان غەدر ناکەن، دڵنیابە کە موسڵمانان بە وەفا و دەستپاك و ڕاستگۆن چونکە ئەوان دینێکیان هەیە هەموو قسە و کردار و هەستەکان و خۆشەویستی و ڕق لێ بوون و بەخشین و گرتنەوەیان و جوڵانەوە و وەستانیان ڕێك دەخات بە فەزڵی خوای گەورەی باڵا دەست...

لە بەر بواری بنەمایەکی زانستییەوە حەز دەکەم باسی بنەمایەك بکەم کەوا لەسەری ڕێك کەوتووین چونکە من عەقڵەکان و دڵەکان دەدوێنم ..

دەڵێم: جگە لە موسڵمانان دەبنە چوار بەشەوە بۆ ئەوەی لە کاغەزاکانی بەر دەستی براکانمان تێکەڵ نەبێت...

١- بێباوەڕێکی جەنگاوەر (شەڕکەر) (کافر محارب) : کە دەست درێژی دەکاتە سەر موسڵمانان لە خاکی خۆیاندا... لە وڵاتی خۆیاندا کەوابوو ئەمە دەجەنگێ وە بە هەموو ڕێگایەکەوە بەرگری دەکات وە ئەمەیشە لای زانایانمان بە تێکۆشانی بەرگری دەناسرێت (جهاد الدفاع) ئەمەیشە فەرزی عەینە (فرض عين) لەسەر دانیشتوانی ئەو جێگەیەی کە دوژمنێکی بازدەر هاتووەتە سەری و ئەمەیشە یەك دەنگی زانایانی لە سەرە لە کتێبە فیقهێکاندا بە فەزڵی خوای پەروەردگار...

٢- بێباوەڕێکی هاوپەیمان (کافر معاهد) لە گەڵ موسڵماناندا پەیمانێکی مۆر کردووە بۆیە نابێت بە هیچ شێوەیەك بکوژرێت تاوەکو لە پاش ئەوەی کە ئەو پەیماننامەیە هەڵوەشێتەوە.

٣- بێباوەڕێکی تەئمین کراو (کافر مستأمن) هەر کەسێك ئارامی و دڵنیایی بۆ بێباوەڕێك ئاشکرا کرد نابێت بکوژرێت لە پاش ئەوە بە هۆی بێباوەڕییەوە بەڵکو

ئەگەر بێ باوەڕێکی جەنگاوەر باوەڕی وابوو کە موسڵمانان قسەیان لە گەڵدا کردووە و ئارامی و دڵنیای یان پێداوە ئەوا دەبێتە کەسێکی (مستأمن)[1] و کوشتنی حەڵاڵ نییە.

٤ـ بێباوەڕێکی خاوەن کتێبی ئاسمانی (کافر ذمي): بە هیچ شێوەیەك نابێت بکوژرێت تا لە کاتی بەڵێنەکەیدایە...[2]

برای بەرێزم... وەرە لە گەڵ مندا و تەماشای مەزنی ئەم دینە بکە ...(لقد ذهبت أم هانئ بنت أبي طالب إلى رسول اللهﷺ عام الفتح فوجدته يغتسل، وفاطمة ابنته تستره قالت: فسلمت عليه، فقال: ((من هذه؟)) . فقلت: أنا أم هانئ بنت أبي طالب، فقال: ((مرحبا بأم هانئ)) فلما فرغ من غسله قلت: يا رسول الله، زعم ابن أمي أنه قاتل رجلا قد أجرته – فلان ابن هبرة، فقال الوفي الأمينﷺ(لأم هانئ: ((قد أجرنا من أجرت يا أم هانئ))[3] واتە: (أم هانی کچی أبي طالب ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ لە ساڵی ڕزگار کردنی مەککەدا، لەو کاتەدا پێغەمبەری خواﷺ خۆی دەشۆرد

فاطمەی کچی سوتری بۆ دەکرد، فەرمووی: سڵاوم لێ کرد، ئەویش فەرمووی: ئەو کێیە؟ گوتم: منم (ام هانی کچی أبو طالب) ئەویش فەرمووی: سڵاو لە (أم هانی) کاتێ لە خۆششتنەکەی بووەوە گوتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ کوڕەکەی دایکم وا دەبینێ – مەبەستی علی برایەتی – کەوا ئەو دەیەوی کابرایەك بکوژێت کە من پەنام داوە – فلانی کوڕی هبرە – جا علی دەیەوێ بیکوژێت چونکە ئەو کەسێکی بێباوەڕە و نایەوی دان بەو پەنادانەدا بنێت کە(أم هانی) بەو کابرایەی داوە، جا پێغەمبەری دەستپاك و بە وەفاﷺ بە(أم هانی) فەرموو: ئەوا ئێمە پەنای ئەو کەسەمان دا کە تۆ پەنایت دابوو))، صەڵات و سەلام لەسەر ئەو کەسەی کە هەموو جیهانی فێری تام و چێژی وەفا کرد.

---

١ـ ((الصارم المسلول)) (١ / ١٩١، ٢٧٣ دار ابن حزم) لشيخ الإسلام.

٢ـ انظر في هذه الجزئية: الصارم (١ / ٩٤)، و ((المغني)) لابن قدامة (١٢ / ٦٥٥ دار الحديث).

٣ـ أخرجه البخاري،كتاب (الصلاة)، باب (الصلاة في الثوب الواحدة ملتحفاً) (٣٥٧٠)،ومسلم، كتاب (الحيض)، باب (تستر المغتسل بثوب و نحوه) (٣٣٦).

بەڵکو لە (صحیح مسلم)[١] دا لە فەرموودەیەکی (أبی هریرە) ەوە هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((وذمة المسلمين واحدة، يسعى بها أدناهم . فمن أخفر مسلما – واتە پەیمانەکەی هەڵوەشێنێتەوە – فعليه لعنة الله والملائكة والناس أجمعين، لا يقبل منه صرف ولا عدل)) واتە: زمە و پەنای موسڵمانان یەکێکە، خوارترین کەسیان هەوڵی بۆ دەدا، جا هەر کەسێ پەیمانی موسڵمانێك هەڵوەشێنێتەوە ئەوا نەفرەتی خودا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لێ بێت وە هیچ فەرزێك و سوننەتێکی لێ وەرناگیرێت)) ئەمە قسەی پێغەمبەری خوایە ﷺ ، ئایا هەموو دونیا کەسێکی تری ناسیوە لەو ڕاستگۆ تر و بە وەفاتر بێت؟ نەخێر (سوێند بە خوا) بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ تەنانەت خیانەتی نەبووە لە سۆمای چاوەکانیدا...

هەروەکو(ابوداود و النسائی و الحاکم) و جگە لەوان ریوایەتیان کردووە بە سەنەدێکی (صحیح)[٢] و بە چەند (شواهد)ێکەوە کەوا ((عوسمانی کوڕی عەففان) لە ڕۆژی ڕزگار کردنی مەککەدا (عبدالله ی کوڕی سعد ی کوڕی ابی السرح)ی لە گەڵ خۆیدا هێنا... کەچی لە پێش ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ خوێنی حەڵاڵ کردبوو... واتە: بە هاوەڵانی فەرموو بوو ئەگەر بینیتان خۆی هەڵواسیبووە پەردەکانی کەعبەوە ئەوا بیکوژن... من ئەو باسە بۆ خۆت بە جێ دەهێڵم کە ئاخۆ ئەو کەسە چی کردبێت تاوەکو پێغەمبەری خوا ﷺ خوێنی حەڵاڵ بکات ئەگەرچی خۆی هەڵواسیبێتە پەردەکانی کەعبەوە !! کەچی لە ناکاودا پێغەمبەری خوا ﷺ (عبدالله ی کوڕی سعد) لە بەر دەستیدا دەبینی لە گەڵ عوسمانی کوڕی عەففاندا ئەو کەسە بە شەرمەیە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ شەرمی لێ دەکرد و لە هەمان کاتدا بە پێغەمبەری خوای ﷺ فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەیعەی پێ بدە ! کەچی

---

١ـ أخرجه مسلم، كتاب ((الحج))، باب ((فضل المدينة و دعاء النبي ﷺ فيها بالبركة)) (٤٧٠ / ١٣٧١).

٢ـ أخرجه ابو داود،كتاب ((الجهاد))، باب ((قتل الأسير ولا يعرض عليه الإسلام))(٢٦٨٣)، (٤٣٥٩) والنسائي كتاب ((تحريم الدم))، باب ((الحكم في المرتد)) (٤٠٦٧)، وابن أبي شيبة في ((مصنفه)) (٣٦٩١٣) والحاكم في ((المستدرك)) (٣/ ٤٥)، وقال: ((صحيح على شرط مسلم ولم يخرجاه))، وأبو يعلى (٧٥٧)، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (١٧٢٣).

پێغەمبەری خواﷺ تەماشای عبدالله ی کوڕی سعد کرد و ئەمجار رووی لێ وەرگێڕا دیسان عوسمان فەرمووی: (بۆ جاری سێیەم) ئەی پێغەمبەری خواﷺ بەیعەی پێ بدە... بۆیە پێغەمبەری خواﷺ دەستی درێژ کرد و ئەویش بەیعەی پێدا کاتێ کە عبدالله ی کوڕی سعد رۆیشت پێغەمبەری خواﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: ((ئایا پیاوێکی هەستیارتان تێدا نەبوو هەستێت – کاتێ بینی من لە سەرەتادا دەستم درێژ نەکرد بۆ بەیعە– و بیکوژێت ؟)) فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئێمە چۆن بزانین ! کە چی شتێك لە ناخی تۆدا هەیە، بریا بە چاوەکانت ئیشارەتت بۆ بکردینایە بۆ کوشتنی... بۆیە راستگۆی بە وەفا فەرمووی: ((هیچ پێغەمبەرێك بۆی نییە کە خیانەت لە سۆمای چاوەکانیدا هەبێ)).

بەڕاستی ئەمە حورمەت و پایەی خوێنە لای پێغەمبەری خواﷺ هەر لەو پێناوەدا بوو لە رۆژی عەرەفەدا فەرمووی (لە کاتێکدا ئەو لەسەر کێوی عەرەفات) راوەستاوە لەو رۆژە بەرێز و مەزن و شکۆدار و میهرەبانە رادەوەستێ بۆ ئەوەی وتارە پارێزگارەکەی بخوێنێتەوە، بۆ ئەوەی بۆ هاوەڵان و هەموو مرۆڤایەتی حورمەت و پلە پایەی خوێن روون بکاتەوە، دەڵێت: هەروەکو (جابر ی کوڕی عبدالله) ریوایەتی کردووە لە(صحیح مسلم)[1]دا: (إن دماءكم وأموالكم حرام عليكم كحرمة يومكم هذا في شهركم هذا في بلدكم هذا ألا كل شئ من أمر الجاهلية تحت قدمي موضوع، و دماء الجاهلية موضوعة، وإن أول دم أضع من دمائنا دم ابن ربيعة بن الحارث كان مسترضعا في بني سعد فقتلته هذيل وربا الجاهلة موضوع و أول ربا أضع ربانا ربا عباس بن عبدالمطلب )) واتە: بزانن کەوا خوێنەکانتان و سامانەکانتان لە سەرتان حەرامە وەکو حورمەتی ئەمڕۆ لەم مانگەتاندا و لەم شارەتاندا، جا هەموو کارێکی سەردەمی نەفامی لە ژێر پێمدا دانراوە، ئەو خوێنەی کە لە سەردەمیدا نەفامی روویداوە ئەوا دانراوە و پووچ بووەوە،وە یەکەم خوێنێك لە خوێنی ئێمە دادەنرێت و پووچ دەبێتەوە خوێنی (ابن ربيعه ی کوڕی حارث)ە کە بە دوای دایاندا دەگەڕا لە بەنی سەعد و هۆزی هذیل کوشتیان، هەموو سوویێکی سەردەمی نەفامی

١ـ أخرجه مسلم، كتاب الحج، باب حجة النبيﷺ (١٢١٨).

دانراوە و پووچ دەبێتەوە وە یەکەم سوویێك کە دایدەنێین و پووچی دەکەینەوە سووی عباس ی کوڕی عبدالمطلب ە)).

لە ڕیوایەتێکی ابن عباس دا کە لە (صحیح البخاری)[1] دا هاتووە و ریوایەتی (أبی بکرە)یە کە لە هەردوو کتێبی (صحیح)[2] دا هاتووە: ((أن النبيﷺ خطب الصحابة يوم النحر، فقال: أي يوم هذا؟ قلنا: الله ورسوله أعلم، فسكت حتى ظننا أنه سيسميه بغير أسمه،قال: أليس يوم النحر؟ قلنا: بلى . قال: أي شهر هذا؟ قلنا: الله ورسوله أعلم، فسكت حتى ظننا أنه سيسميه بغير أسمه،قال: أليس ذا الحجة؟ قلنا: بلى . قال: أي بلد هذا؟ قلنا: الله ورسوله أعلم، فسكت حتى ظننا أنه سيسميه بغير أسمه،قال: أليست بالبلدة الحرام؟ قلنا: بلى .))، واتە: پێغەمبەری خواﷺ لە ڕۆژی قوربان دا وتاری بۆ هاوەڵان دەخوێندەوە و فەرمووی: ئەمڕۆ چی ڕۆژێکە؟ گوتمان: خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ دەزانن، ئەویش بێ دەنگ بوو تاکو وامان زانی ناوێکی تری لێ دەنا جگە لە ناوەکەی خۆی، ئەمجار فەرمووی: ئایا ئەمڕۆ ڕۆژی قوربان نییە؟ گوتمان: بەڵێ، ئەمجار فەرمووی: ئەم مانگە چی مانگێکە؟ گوتمان: خواو پێغەمبەرەکەیﷺ دەزانن، ئەویش بێ دەنگ بوو تاکو وامان زانی ناوێکی تری لێ دەنا جگە لە ناوەکەی خۆی، ئەمجار فەرمووی: ئایا ئەم مانگە مانگی (ذي الحجة) نییە؟ گوتمان: بەڵێ، ئەمجار فەرمووی: ئەم شارە چی شارێکە؟ گوتمان: خواو پێغەمبەرەکەی دەزانن، ئەویش بێ دەنگ بوو تاکو وامان زانی کەوا ناوێکی تری لێ دەنا جگە لە ناوەکەی خۆی، ئەمجار فەرمووی: ئایا ئەمە (البلد الحرام) نییە؟ گوتمان: بەڵێ)) ئەمجار لە پاش ئەم باس کردنە خۆش و شیرینە و ڕەوانبێژییە کەم وێنەیە فەرمووی: ((فان دمائكم وأموالكم عليكم حرام كحرمة يومكم هذا في شهركم هذا في بلدكم هذا))، واتە: کەوابوو بزانن خوێنەکانتان و سامانەکانتان لەسەرتان حەرامەوەکو حورمەتی ئەمڕۆ لەم مانگەتاندا و لەم شارەتاندا)).

---

١ ـ أخرجه البخاري، كتاب الحج، باب الخطبة أيام منى (١٧٣٩) عن ابن عباس.

٢ـ أخرجه البخاري، كتاب الحج، باب الخطبة أيام منى (١٧٤١)، ومسلم، كتاب القسامة، باب تغليظ تحريم الدماء و الأعراض و الأموال (١٦٧٩) عن أبي بكرة.

لەو پێناوەدا... ڕێزداران... خوێن یەکەم شتە خوای گەورە فەرمانی لەسەر دەدات لە نێوان دروستکراوەکانیدا لە ڕۆژی قیامەتدا... ئەمە ئاوڕدانەوەیەکە... بەڵام چۆن؟ ئێمە زانیمان کە یەکەم شت بەندەکان لە ڕۆژی قیامەت دەربارەی لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێت نوێژە؟ وڵامەکە ئەوەیە کە هیچ جیاوازی و دژایەتییەك لە نێوان ئەو دوو فەرموودەیەدا نییە چونکە ڕاستی لە یەك چرا و سەرچاوەوە دەردەچێت ... کەوابوو ئەو دوو فەرموودەیە چۆن کۆ دەکرێنەوە وە لە هەردوو تێدەگەین، لە نێوان ئەو فەرموودیەی کە لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتووە و دەڵێت: ((إن أول شئ يقضي فيه يوم القيامة بين الناس في الدماء)) واتە: یەکەم شتێك لە ڕۆژی قیامەتدا لە نێوان خەڵکیدا حوکمی لەسەر بدرێت خوێنە)) وە لە نێوان ئەو فەرموودەیەی کە خاوەنی (السنن)ەکان ریوایەتیان کردووە ((إن أول ما يحاسب به العبد يوم القيامة الصلاة))[2] واتە: یەکەم شتێك کە لە ڕۆژی قیامەتدا بەندەکان لێپرسینەوەیان لەسەر بکرێت نوێژە)).

دەڵێین: نوێژ حەق و مافی خودایە و خوێن حەق و مافی بەندەکانە وە یەکەم شت لە ڕۆژی قیامەتدا فەرمانی لەسەر دەدرێت لە مافی بەندەکان ئەوا خوێنە ... ئەی خودایە!! ئەگەر ڕۆژ نزیك بووەوە لەسەر سەری مرۆڤەکان، دۆزەخیان هێنا کە حەفتا هەزار جڵەو (زمام)ی هەیە و لە گەڵ هەر جڵەو (زمام)ێکدا حەفتا هەزار فریشتە هەن و ڕایدەکێشن و ئەویش هاوار دەکات و دەنەڕێنێت و پەست و تووڕە بووە کە هەرگیز لە پێش ئەو کاتە وا پەست نەبووە و لە پاش ئەوە بەم شێوەیە پەست نابێت...!! لەو کات و ساتەدا کابرای بکوژ هەموو ئەوانەی کە لە دونیادا کوشتبوویان دەیانبینێ وە ڕەنگە ژمارەیان نەزانێت، هەموویان لەو کات و ساتەدا

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب الرقاق، باب القصاص يوم القيامة (٦٥٣٣)، ومسلم، كتاب القيامة، باب المجازاة بالدماء في الآخرة (١٦٧٨) من حديث ابن مسعود رضي الله عنه.

٢ـ أخرجه الترمذي في أبواب الصلاة، باب ما جاء أن أول ما يحاسب به العبد يوم القيامة الصلاة (٤١٣)، والنسائي كتاب الصلاة، باب المحاسبة على الصلاة (١ / ٢٣٢)، وابن ماجه، كتاب إقامة الصلاة، باب أول ما يحاسب به العبد الصلاة (١٤٢٥)، وأحمد (٢/ ٢٩٠، ٤٢٥)، وصححه الألباني في((الصحيحة)) (١٣٥٨)من حديث أبي هريرة رضي الله عنه

دەبینێ لەسەر زەوی مەحشەر لە بەر دەستی خوای پادشاو باڵا دەستدا ئەوانیش هەموو لە دەوری كۆبوونەتەوە و رایدەكێشن بۆ ئەوەی لە بەر دەستی پادشای پادشاكاندا رایبوەستێنن... هەموو كوژراوەكان (دەمەوێت لە گەڵ مندا بە دڵت لەو دیمەنەدا بژیت) چەندی كوشتووە؟ دە كەسی كوشتووە!! هەزاری كوشتووە!! ئوممەتێكی كوشتووە!! هەموویان دێن و هەر یەك لە كوژراوەكان دێن و خۆیان و برینەكەیان كەوا هێشتا خوێنیان لێ دەتكێ... ئەی خودایە ..!! سەد كەس لە دەوری ئەون... یان هەزار كەس دەوریان لێ گرتووە وە هەمووان توند دەستیان پێوە گرتووە و راپێچی دەكەن و پاڵی پێوە دەنێن بۆ ئەوەی لە بەر دەستی پادشای حەق و راستیدا رایبوەستێنن وە هەموو یەكێك لە كوژراوەكان بە پەروەردگارەكەی دەڵێت: ئەی پەروەردگارمان ... پرسیاری لێ بكە بۆ منی كوشت؟ ئەو نازانێت!! زۆربەی ئەو بكوژانە نازانن، زۆربەی كوژراوەكان نازانن بۆ كوژران؟ ئەوانە بۆ كوژران؟ ئەی ئەوانە بۆ خەڵكیان كوشت؟ لە پێناوی نەوتدا خەڵكی دەكوژرێت؟ یان لە پێناوی باوەڕێكی دەمارگیری سەرسەخت و گەنیو و بۆگەندا، خوێن دەرێژن و لاشەكان پارچە پارچە دەكەن وە چەندەها شارستانیەت لە ناو دەبەن و چەندەها شار دەروخێنن و چەندەها كارگە وێران دەكەن و چەندەها خانوو چەندەها كێڵگە؟ ئایا بۆ مرۆڤ بە برای مرۆڤی ئەو كردارە ناشرینە دەكات؟ بۆ مرۆڤ بە راستی ئاشتی بڵاو ناكەنەوە و دەستەبەری ناكەن؟!! بۆ كەسە ژیرەكانی جیهان بە راستی ئاشتی بڵاو ناكەنەوە و دەستە بەری ناكەن؟ بۆ ئەوەی مرۆڤەكان بە ئاشتی بژین هەروەكو چۆن پێغەمبەری ئاشتیﷺ فەرموویەتی: ((أفشوا السلام وأطعموا الطعام وصلوا والناس نيام، تدخلون الجنة بسلام))[1] واتە: ئاشتی بڵاو بكەنەوە و سەلام لە یەكتر بكەن و نانی خەڵكی بدەن و لە كاتێكدا نوێژ بكەن خەڵكی خەوتبن و ئەوا بە ئاشتی و ئارامییەوە دەچنە

---

١ـ أخرجه الترمذي كتاب صفة القيامة باب (٤٢) (٢٤٨٥) وقال: ((حديث صحيح))، وابن ماجه كتاب إقامة الصلاة باب ما جاء في قيام الليل (١٣٣٤)، وفي الأطعمة (٣٢٥١)، وأحمد (٥/٤٥١)، والدارمي (١٤٦٠، ٢٦٣٢)، وابن أبي شيبة في ((المصنف)) (٣٥٨٤٧)، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (٥٦٩) من حديث عبدالله بن سلام رضي الله عنه.

بەهەشتەوە)) بەڵێ... هەموو دینەکەمان ئاشتییە وە سڵاوی ئیمانداران ئاشتی یە(السلام) لە نوێژەکەتدا بە ئاشتییەوە نەبێت لێ نابیتەوە (السلام) ناچیتە بەهەشتەوە ئیللا فریشتەکانی خوا بە ئاشتییەوە پێشوازیت لێ دەکەن... خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَٰمٌۚ﴾ الأحزاب: ٤٤، واتە: ئەو ڕۆژەش کە بە دیداری ئەو دەگەن ڕێز و تەحیەیان سەلامە بە سڵاو کردن لە لایەن خوای میهرەبانەوە پێشوازییان لێ دەکرێت)).

جا خودایە... پەروەردگارمان... ئاشتی دابەزێنە سەر هەموو زەوی... ئەمجار لە پاش ئەوە پێغەمبەری ڕەحمەت و میهرەبانیﷺ کە خوای گەورە ڕەوانەی کردووە تا ببێتە ڕەحمەتێك بۆ هەموو جیهان تۆمەتبار دەکرێت بە تۆقاندن، ئەو ڕەحمەتە بۆ هەموو مرۆڤایەتی نەك تەنها بۆ موسڵمانان﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ﴾الأنبياء: ١٠٧، واتە: ئێمە هەر بۆیە تۆمان نارد کە ڕەحمەت و بەزەیی و میهرەبانییەك بیت بۆ هەموو جیهانیان تادەستی تەواوی مەردوم بەرەو هیدایەت و ڕێگەی بەختیاری بگری)).

کەوابوو کوشتن تاوانێکە لە ناشرینترین تاوانەکان پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: (هەروەکو لە (سنن النسائی) دا بە سەنەدێکی (حسن)[1] لە فەرموودەی (ابن عباس)ەوە ((يجئ المقتول متعلقا بالقاتل و أوداجه تشخب دما، يقول: يا رب، سل هذا فيم قتلني)) واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا کەسی کوژراو دێت و دەستی گرتووە بە بکوژەکەیەوەو برینەکانی هێشتا خوێنیان لێ دەتکێ، دەڵێت: ئەی پەروەردگاری من ! پرسیار لەم کەسە بکە لە بەر چی منی کوشت؟)).

ئایا وڵامەکەت چی دەبێت ئەی بکوژ؟ وە تۆ ئەی ئەو کەسەی کە خوێن هەرزان دەکەیت و دەردەچیت بۆ کوشتنی هەر مرۆڤێك بۆ تۆڵە سەندنەوەیەکی کوێرانە؟ وریابە کە نابوتترین تاوان و شەرمەزارترین تاوان کە لەسەر ڕووی زەویدا ڕوودەدات

---

١ـ أخرجه النسائي، كتاب ((تحريم الدم))، باب ((تعظيم الدم)) (٣٩٩٩)، وفي ((الكبرى)) (٣٤٦٨)، والترمذي كتاب ((تفسير القرآن))، باب ((ومن سورة النساء)) (٣٠٢٩)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي والنسائي)).

له پاش هاوەڵ دانان بۆ خوای گەورە کوشتنی نەفسێکە کە خوای گورە حەرامی کردووە تەنها بە حەقی خۆی نەبێت... ئایا ئەو حەق و مافە چییە؟.

له هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتووه لـه فـەرموودەی (ابن مسعود) ەوە کـەوا پێغەمبەری خـواﷺ فەرمووەیـەتی: ((لا یحل دم امرئ مسلم، یشهد أن لا الـه الا الله وأني رسول الله، إلا بإحدى ثلاث: النفس بالنفس..))، واتـە: خـوێنی هـەر موسڵمانێك کە شایەتی دابێـت هـیچ خوایـەك نییـە شـایەنی پەرسـتن بێـت تـەنها (الله) نـەبێت و محمد نێردراوی ئەوە حـەڵاڵ نییـە تـەنها بـە یـەکێ لـەم سـێ شـتە نەبێـت: نـەفس بەرانبەر بە نەفس ..)) واتە: بکوژ کاتێ دەکوژێت ئەوا فەرمانڕەوا و دەسەڵات بـەر پرسیارە ئـەگینا کۆمـەڵگای موسـڵمانان دەبـووە پاشـاگەردانی وە هەرکەسـێ کێـی بویستایە بکوژێ وە لە هەر کاتێکدا بیەوێ ئەوا دەیکوشت !! جا خوێن حورمـەتی تایبەتی خۆی هەیە هەروەکو چۆن باسمان کرد﴿ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ ﴾ خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡقِصَاصِ حَيَوٰةٞ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴾ البقـرة: ١٧٩، واتە: ئەی خاوەنانی فام و ژیری ! لـەم تۆڵـە وەرگرتنـەوەدا ژیـانی خـۆش و مەزنتان هەیە، واتە: ئەم یاسایە دەبێتە مایەی مانەوەی ژیانی مرۆڤ و خۆ دورگـرتن لە کوشت و کوشتار، چونکە کابرای بکوژ بزانـێ کەسـێ بکـوژێ دەکوژرێتـەوە ئـیتر دەس درێـژی بـۆ سـەر گیـانی ئـەم و ئـەو ناکـات، بـەڵکو لـە بـەر ئـەو یاسـایە لـە سـنوورەکانی خـوا خۆبپـارێزن ئاسـوودەیی و بـەختیاری بـۆ وڵات و ناوچـەکەتان بگەڕێتەوە و خوێن ڕێژی نەکرێ)) .

( ...والثیـب الزانـي ... ) پاشـان دەگەڕێمـەوە بـۆ لای ماناکـەی (انـشاء الله) لـە نیشانەیەکی تر لە نیشانەکانی قیامەت (( .. والتارك لدینه المفـارق للجماعـة )) واتـە: ئـەو کەسـەی واز لـە دینەکـەی خـۆی دەهێنێـت و لـە کۆمـەڵی موسـڵمانان جیـا دەبێتەوە)).

---

[1] ـ أخرجـه البخـاري، كتـاب ((الـديات))، بـاب ((قـول الله تعـالى: ﴿ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ وَٱلۡعَيۡنَ بِٱلۡعَيۡنِ ﴾ المائدة: ٤٥، (٦٨٧٨)، ومسلم، كتاب ((القسامة))، باب ((ما يباح به دم المسلم)) (١٦٧٦).

کەوابوو ئیسلام زۆر لە هیچ کەسێك ناکات بۆ هاتنە ناو دینەکەوە دەبێ ئەمە وەکو بناغەیەك بزانیت، جا ئێمە ئەم دینە دەگەیەنین و بۆ خەڵکی ڕوونی دەکەینەوە بە ڕاستی و دانایی و میهرەبانی و ئەدەب و خۆ بەکەم زانینەوە جا هەر کەسێ لە پاش ئەم گەیاندنەوە و پاش ئەم بانگەوازە و پاش ئەم ڕوونکردنەوەیە گوتی: نەخێر نایەمە ناو ئەم دینەوە ئەوا ئەو قسەی بۆ دەکەین هەروەکو چۆن خوای گەورە بۆی کردووە ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ﴾ البقرة: ٢٥٦، واتە: لە دینی ئیسلامەدا داسەپاندن و ناچار کردن و زەبر و زەنگ نییە بۆ دینداری و وەرگرتنی ئایینی ئیسلام، چونکە بێ گومانە کە ڕێگای چاك و ڕاست لە ڕێگای ناڕاست و کوفر و تووڵە ڕێگاکان لێك جیاکراوەتەوە و ئاشکرا و نمایانە جا لە بەر ئەوە نایەوێ زۆر لە هیچ کەسێك بکرێت بۆ ئیسلامبوون و هەر کەسەش بە مەیلی خۆیەتی)) . وە دەڵێین هەروەکو چۆن خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ﴾ الكهف: ٢٩، واتە: پێیان بڵێ: ئەی پێغەمبەرﷺ هەق و ڕاستی تەنها هەر ئەوەیە کە لە لای پەروەردگارتانەوە هاتووە بۆتان، کەواتە دوای ئەو بێ دینە غافڵانە مەکەون ئینجا پاش دەرکەوتنی هەق و ڕاستی هەمووشتان سەربەستن کێ باوەڕ دێنێ و موسڵمان دەبێ با بڕوا بێنێ و کێیش دەیەوێ کافر و بێ بڕوا بێت با هەر کافر بێت دیارە ئەمە هەڕەشەیە چونکە هەرگیز خوای گەورە ڕازی نییە بە کوفر و داوا لە خەڵك ناکات کە: بچن ڕێبازی کوفر هەڵبژێرن لەولایشەوە هەق و ناهەق بە بوون و نەبوونی سامانی ئەم دونیا نییە هەتا وا بزانن هەموو دەوڵەمەندێك ڕاست و چاك و پاکە، هەموو هەژارێکیش نەگریس و نەگبەتە)). خوا گەورە دەفەرموێت: ﴿لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ﴾ الكافرون: ٦، واتە: دین و ئایینی خۆتان بۆ خۆتان و منیش دین و ئایینی خۆم بۆ خۆم)) ئەوە لە پاش بانگەواز و ڕوونکردنەوە بەڵام بیربکەرەوە و تێفکرە... ئەگەر بە ویستی خۆی هاتە ناو دینەکەوە وە بە هەڵبژاردنی خۆی و حەزی خۆی ئەوا بۆی نییە چیتر لە دینەکەی دەرچێت هەرکاتێك بیەوێ بۆ ئەوەی بنکەکانی کۆمەڵگای

موسڵمانان بهێنێته لەرزه!! نەخێر... بە هیچ شێوەیەك بۆی نییە، بەڵام مافی خۆیەتی لە پاش گەیاندنی دینەکە بڵێت: من دێمە ناو ئەم دینەوە یان نایەمە نێو ئەم دینەوە بەڵام ئەگەر هاتە ناو دینەکەوە و هەر کاتێك بیەوێت دەرچێت ئەوا لە دینی خوادا نەویستراوە وە ئێوە لەسەر ڕووی زەویدا دەستورێکم بۆ بهێنن کە بە ئەمە ڕازی بێت بۆ ئەندامەکانی و ئەهلەکەی بەڵکو ئەگەر کەسێك لە دەستوری دەوڵەتێك لە دەوڵەتەکان دەرچێت ئەوا بە خیانەتی مەزن تۆمەتبار دەکرێت (الخيانة العظمى) وە هەمووما دەزانین سزای خیانەتی گەورە چییە... ئەویش کوشتنە، ئایا گومانت چۆنە کەسێك خیانەت لە دینی خوا بکات وە خیانەت لە خوا و پێغەمبەرەکەیﷺ بکات خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ الأنفال: ٢٧، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ! گزی و خیانەت لە خوا و لە پێغەمبەر و لە سپاردەکانتان مەکەن، بۆ خۆیشتان چاك ئەزانن کە گوناه و تاوانی خەیانەت کردن چەندە گەورەیە و دەشگەڕێتەوە سەر ئەستۆی ئێوە)).

کەوابوو ڕێزداران ... کوشتن نابوتترین و ناشرینترین تاوانە لەسەر ڕووی زەویدا لە پاش هاوەڵدانان کە ئەنجام دەدرێت... حەزم دەکرد لە باسی ئەم تاوانە گەورەدا زیاتر بڕۆم کەوا پێغەمبەری هەڵبژێردراوﷺ کردوویەتی بە نیشانەیەك لە نیشانەکانی قیامەت پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((((لا تقوم الساعة حتى يكثر الهرج)) قالوا: وما الهرج يا رسول الله؟ قال: ((القتل القتل)) واتە: قیامەت هەڵناسێت تاکو (الهرج) زۆر نەبێت، فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ (الهرج) چییە؟ فەرمووی: کوشتنە کوشتن))

لە ڕیوایەتێکی تردا کە لە پێشدا باسمان کرد ((والذي نفسي بيده لاتذهب الدنيا حتى يأتي على الناس يوم لا يدري القاتل فيم قتل، ولا المقتول فيم قتل)) واتە: سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە ئەم دونیایە بە سەر ناچێت تاکو ڕۆژێك دێت بە سەر خەڵکیدا کەوا بکوژ نازانێت بۆ دەکوژێت و کوژراویش نازانێت بۆ کوژراوە)).

# لە نیشانەکانی قیامەت

## زۆربوونی زینا و داوێن پیسی

ئەم نیشانەیە یەکێکە لە نیشانە ترسناکەکان کە ئاشکرا بووە و بڵاو بووەتەوە لەم سەردەمەدا... بەڵام ئایا پێغەمبەری خواﷺ باسی ئەمەی کردووە؟ وە باسی ئەوەی کردووە کەوا بڵاوبوونەوەی داوێن پیسی لە نیشانەکانی قیامەتە؟ بەڵێ ...

ئەی خودایە ... خێزانەکانمان و کچەکانمان داپۆشە و منداڵەکانمان بپارێزە و لاوەکانمان چاکەکار بکە وە دامێنمان بپارێزە ئەی بە بەزەییترین میهرەبانەکان ..

ئەی ڕێزداران ... زینا تاوانێکی ترسناکە . یەکێکە لە تاوانە گەورەکان کە دڵەکان لە بن دەردەهێنێ وە ناموس و شەرەفی مرۆڤایەتی کە بە میرات بۆیان بە جێ ماوە . جا ئەتك کردنی ئەم ناموسە کارێکی تۆقێنەرە، بۆیە پێغەمبەری خواﷺ زینای بە نیشانەیەك لە نیشانەکانی قیامەت ژماردووە.

ئیمامی (البخاری ومسلم)[1] ڕیوایەتیان کردووە لە فەرمودەیەکی (أنس) ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((إن من أشراط الساعة: أن يرفع العلم، ويثبت الجهل، ويشرب الخمر، ويظهر الزنا))، واتە: لە نیشانەکانی قیامەت: زانست و زانیاری بەرز دەبێتەوە و نەفامی جێگیر و دامەزراو دەبێت و مەی دەخورێتەوە و زینا ئاشکرا دەبێت)).

لە ڕیوایەتێکی تردا کە(مسلم) ڕیوایەتی کردووە ((ويفشوا الزنا)) واتە: زینا بڵاو دەبێتەوە)).

لە ڕیواتێکی لای (البخاری)[2]: ((ويكثر الزنا)) واتە: زینا زۆردەبێت)).

جا زینا زۆر بووە و بڵاو بووەتەوە وە حەزم دەکرد لێرەدا سەرژمێرییەك هەیە

١ـ أخرجه البخاري، كتاب العلم، باب رفع العلم وظهور الجهل، (٨٠، ٨١)، ومسلم كتاب العلم، باب رفع العلم وقبضه (٢٦٧١، ٢٦٧٢).

٢ـ عند البخاري، كتاب النكاح، باب يقل الرجال و يكثر النساء (٥٢٣١).

باسی بکەم کە لە سەری ڕاوەستام و قەبارە و گەورەیی تاوانی زینا لام ئاشکرا بوو لەسەر ڕووی زەویدا لە ئەوروپا و ئەمریکا و هەندێ لە وڵاتە ئیسلامییەکان!

سوێند بە خوا هیچ ڕێگرێك لە ڕێگامدا نەبوو ئەو سەرژمێر و لێکۆڵینەوەیە باس بکەم تەنها ئەوە نەبێ کە ترسام دڵەکانتان بە هۆی ئەم چەند کاغەزە بچووکانەوە رابچەڵەکێنم، گومان دەکەم کە هەندێ لەو برایانەی سەردانی ئەو سایتانەی سەر تۆڕی ئەنتەرنێت دەکەن باش دەزانن تا چەند قەبارەی ئەو سەرژمێرییە بە شێوەیەکی ترسناك زۆر بووە بە ڕاستی ئەوە کارێکی ترسناك و ناشیرین و نابووتە!!

لەم سەردەمەدا فلیمەکانی داوێن پیسی وێنەگیراوە, وە گواستراوەتەوە بۆ زۆربەی ماڵی موسڵمانان وە زۆرێك لە خەڵکی شەوانە دەمێننەوە... نەك بۆ ئەوەی لە گەڵ خوادا بن یان لە گەڵ نوێژدا بن وە نەك لە گەڵ سوننەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بمێننەوە بەڵکو لە گەڵ ئەو فلیمە داوێن پیس و بێ ئابڕووانە شەوگار دەمێنێتەوە لە گەڵ زینادا... هەرگیز قەبارە و ژمارەی ئەو هەموو پەیوەندییانەم لە بیر ناچێت وە ئەو هەموو پرسیارە ترسناکانە دێت بۆ ئەوەی لە هەموو کاتژمێرێکدا پرسیار بکات دەربارەی ئەم نەخۆشییە کە زۆربەی ماڵەکانی وێران کردووە ... جا زۆربەی پیاوان وازیان لە ژنەکانیان هێناوە بە هۆی ئەو فلیم و گۆڤارانەوە کە وێنەی ئەو فلیمە داوێن پیسانەی گرتووە بە هەموو شێوەکانییەوە... و لا حول ولا قوه الا بالله.

جا زینا تاوانێکی ناشیرین و نابووتە ئەگەر ژنێك یان کچێك زینا بکات ئەوا سەری باوکی شۆڕ دەکات و سەری دایکی و سەری براکانی و خێزانەکەی دەکاتە ناو گڵ و قوڕاودا،ئەگەر کچێك بە هۆی زیناوە سك پڕ بوو وە لە ئەنجامی تاوانەکەی ترسا ئەوا دەیکوژێت بۆیە دوو تاوان لە تاوانە گەورە و ترسناکەکان ئەنجام دەدات کە ئەوانیش: تاوانی زینا و تاوانی کوشتنە کە هەردوو لە تاوانە گەورەکانن!!

ئەگەر ژنێك شووی کردبوو، کەوتە ناو تاوانی زیناوە و خوای گەورە تاوانەکەی داپۆشی و شاردییەوە ئەویش منداڵی زینای هێنایە ژوورەوە بۆ لای پیاوەکەی و بۆ لای ماڵەکەی و، بۆ لای منداڵ و کەس و کارەکەی ئەوا کەسێکی ئەجنەبی

هێناوەتە ژوورەوە بۆ لایان، کاتێ دوو بە دوو ببێتەوە کەسێکی ئەجنەبییە لە میراتەکەیاندا دەبات لە کاتێکدا هیچ مافێکی نییە، پیاو ئەگەر زینای کرد ئەوا حورمەتی برا و خوشکانی ئەتك کردووە... بە ڕاستی تاوانێکی گەورە و تاڵە و هەست بە تاڵی دەکەیت کاتێ کە تەنها باسی دەکەیت بۆیە خوای گەورە لە چەند ئایەتێکی توندا دەفەرموێت: ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى...﴾ النـور: ٢، واتە: ئەو کوڕ و کچەی کە تاوانی زینایان ئەنجامداوە ...)) لە پێشان بە کچە داوێن پیسەکە (الزانیە) دەستی پێ کردووە چونکە ئەو ڕێگاکە خۆش دەکات، زۆر ئەستەمە پیاوێك بگاتە ئافرەتێك و بگاتە ئەو تاوانە گەورە و قێزەونە بە بێ ئەوەی ئافرەتەکە بە تەواوی ڕێگاکەی خۆش نەکردبێت... ئەی خوشکی موسڵمانم ... لە خوا بترسە لە جل و بەرگەکەتدا... لە پۆشاکەکەتدا... لە وشەکانتدا... لە چۆنییەتی دەرچوونت و، ملکەچی قسەکانیان مەبە ..

ئەی خوشکی موسڵمانم ... وریابە... شەیتان هەنگاونانی هەیە وە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ البقرة: ١٦٨، واتە: هەرگیز بە شوێن هەنگاوەکانی شەیتانیشدا مەڕۆن و پەیڕەوی لێ مەکەن)) ڕەنگە ئافرەت یەکەم جار نەکەوێتە ناو زیناوە ڕەنگە یەکەم جار ئەو هەڵە گەورەیە بە پیاوان نەکات بە ئەنجامدانی زینا ... لێرەدا چەند هەنگاوێك هەیە... ئەگەر یەکەم هەنگاو هەنگاو بنێیت... ئەگەر خوا نەتپارێزێ — ئەوا تێدەکەویت وە ئەگەر یەکەم هەنگاو بنێیت ئەگەر خوا نەتپارێزێت ئەوا دەهاوێژرێیتە خوارەوە ئەی خودایە بە پارێزگاری خۆت بمانپارێزە .... یا أرحم الراحمین.

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِى دِينِ ٱللَّهِ﴾ النـور: ٢، واتە: ئەو کچ و کوڕەی زینا و داوێن پیسی ئەکەن دەبێ لە هەریەکەیان سەد جەڵدە (شەلاق)ی لێ بدەن ئەمە تۆڵەی هەر کەسێکە (نێر یان مێ) پێشتر بە شێوەی شەرعی جووت نەبووبێ (واتە: کچ و کوڕ) بن، نابێ بەزەیی و نەرم و نیانی و سۆز بتانگرێ لە بەرامبەر هەریەك لەو دوانەوە لە

ڕاپەڕاندنی حوکمی خوادا واتە: لەکاتی جێبەجێ کردنی بریاری خوادا توندو تیژبن و بەزەییتان بە زیناکەراندا نەیەتەوە بەوشێوەیە ژمارەی شەلاقەکان یا بەردە بارانەکە وەکو خۆی جێ بە جێ نەکەن)) . خوای بەخشندە و میهرەبان و بەسۆز و بە بەزەیی ئەو قسەیەی فەرمووە ﴿ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۖ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢﴾ الزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ ﴾ النـــور: ٢ـــ ٣، واتــە: نابێ بەزەیی و نەرم و نیانی و سۆز بتانگرێ لە بەرامبەر هەریەك لەو دوانەوە لە ڕاپەڕاندنی حوکمی خوادا، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە جا بۆ ئەوەی ئەو دوانە پتر ئێشیان پێ بگات و خەڵکیش پەند وەرگرن با کۆمەڵێ لە بـرواداران ئامـادەی سـزاکەیان بـبن و ببیـنن (٢) پیـاوی زیناکـەر و داوێـن پـیس هەردەبێ ژنی زیناکەر و داوێن پـیس وە یـان موشـریك و بتپەرسـت مـارە بکـات بـۆ خۆی، ژنی زیناکار و داوێـن تـەڕیش وە پیـاوی زیناکـار و موشـریکیش هـەروا ئـەبێ بێگومانە ئەو جـۆرە شـووکردنە و(مـارەکردنی ژنـانی زیناکـاران) لەسـەر بروادارانـی داوێن پاك حەرام کراوە، چونکە زیانی گەورە تێدایە(٣) .

خــوای گــەورە دەفــەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُولَٰئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ ۗ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ الفرقان: ٦٨ـ ٧٠، واتە: ئەوانەی وێرای خوا هیچ پەرستراوێکی تر ناپەرستن، کەسێکیش ناکوژن کە خوا کەشتنی یاساغ کردبێ، مەگەر بە هەق و ڕەوا. زینا و داوێن پیسیش ناکەن وە هەرکەسێ ئەو کاروکردەوە ناپەسەندانە بکات ئەوە لە دوارۆژدا دەگات بە سزای تاوانەکـەی خـۆی .(٦٨) لـە ڕۆژی قیامەتیـشدا دوو بەرامبـەر ئـازار دەدرێ و بـە سووکی و زەلیلـی و ریسواییەوە بـە هـەتا هـەتایی هـەر لەوێدا ئەمێنێتـەوە .(٦٩)

مەگەر کەسێك پەشیمان دەبێتەوە و بڕوا بێنێ و کاری چاك ئەنجام بدا ئا ئەو کەسانە خوا گوناه و خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێت بەچاکە، هەمیشە خوا گوناه پۆش و میهرەبانە(٧٠))).

| | |
|---|---|
| یا هاتکا حرم الرجال و تابعا | طرق الفساد فأنت غیر مکرم |
| من یزني فی قوم بألفي درهم | فی قومه یزن بربع درهم |
| إن الزنا دین إذا أستقرضته | کان الوفا من أهل بیتک فأعلم |

واتە: ئەی ئەو کەسەی کە حورمەتی پیاوانت ئەتك کردوو و شوێنی ڕێگای خراپەکاری کەوتوویت بزانە کە تۆ کەسێکی بێ ڕێزی، بزانە کە هەرکەسێ لە گەڵ خەڵکیدا زینا بکات بە دوو هەزار درهم ئەوا لە گەڵ کەس و کارەکەیدا بە چارەکە دەرهەمێك زینا دەکرێت، بزانە کەوا زینا قەرزە، ئەگەر قەرزت کرد، ئەوا دانەوەی ئەو قەرزە لەسەر کەس و کارەکەت دەبێت.

زۆر کەس هەیە وا دەزانێ دەتوانێت ئەوەی بیەوێ بیکات... هەرچی ویستی لە سەری بوو ئەوا بیکات... دڵنیابە لە سزا و تۆڵەکەی! جا وریابە...

دڵنیابە کە زینا قەرزە و دەبێ بدرێتەوە لەم دونیایەدا و لە پێش قیامەت وە دەربارەی زینا پێغەمبەرمانﷺ فەرموویەتی: لە کاتێکدا سزا و تۆڵەی زینا ڕووندەکاتەوە.. هەروەکو لە فەرموودەیەکی (سمرە ی کوڕی جندب الطویل)ەوە هاتووە لە (صحیح البخاري)[1] دایە، تیایدا هاتووە کە (جبریل و میکائیل) هاتوون بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ و بە ئەویان فەرمووە: ((انطلق انطلق، قال: فانطلقنا فأتینا علی مثل التنور أعلاه ضیق وأسفله واسع)) واتە: بە ڕێکەوە بە ڕێکەوە، دەڵێت: ئێمەیش دەرچووین و کەوتینە ڕێ، جا چووینە جێگایەك وەکو تەنوور وابوو سەرەوەی فراوانە و خوارەوەی تەنگە)) ئایا لەگەڵ مندا ئەو دیمەنە دەهێنیتە پێش چاوی خۆت ؟((قال الصادق: ((فأتینا علی مثل التنور فأطلعنا فیه، فإذا فیه رجال

---

١ـ أخرجه البخاري،کتاب الجنائز، باب ما قیل في أولاد المشرکین (١٣٨٦)، وفي کتاب التعبیر، باب تعبیر الرؤیا بعد صلاة الصبح (٧٠٤٧).

ونساء عراة، يتوقد تحته نارا فإذا اقترب ارتفعوا، حتى كاد أن يخرجوا (من التنور)، فإذا خمدت رجعوا فيها ))واتە: ڕاستگۆﷺ فەرمووی: ئەمجار چووینە سەر شتێك وەکو تەنوور وابوو، ئێمەش تەماشامان کرد و بینیمان چەندەها پیاو و چەندەها ئافرەتی بە ڕووتی لێیە لە ژێرەوەی ئاگری تێدا هەڵگیرساوە هەرکاتێك لێیان نزیك ببێتەوە ئەوان بەرز دەبوونەوە تاوەکو خەریك بوو لە تەنوورەکە دەردەچن، ئەگەر ئاگرەکە کپ ببێتەوە ئەوا دیسان دەگەڕێنەوە ناوەوە))، واتە: بۆ قووڵایی و بنی تەنوورەکە، فقال النبيﷺ: من هؤلاء يا جبريل؟ قال: وأما الرجال والنساء العراة الذين في مثل بناء التنور و فإنهم الزناة والزواني))، واتە: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئەی جبریل ئەوانە کێن؟ فەرمووی: ئەو پیاو و ژنانەی، کە لە ناو ئەو شێوە تەنوورەدا بوون ئەوانە پیاوان و ژنانی داوێن پیس و زیناکارن)).

لە هەردوو کتێبی (الصحيح) دا هاتووە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی مسعود)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((لايحل دم امرئ مسلم يشهد أن لا اله إلا الله وأني رسول الله إلا بإحدى ثلاث: النفس بالنفس والثيب الزاني))، واتە: خوێنی هەر موسڵمانێك شایەتی دابێت کە هیچ خوایەك نییە شایەنی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت و محمد نێردراوی ئەوە حەڵاڵ نییە تەنها بە یەکێ لەم سێ شتە نەبێت: نەفس بەرانبەر بە نەفس و کەسێك زینا بکات لە کاتێکدا خاوەنی ژن بێت...)).

واتە هەرکەسێ زینای کرد و لە کاتێکدا خاوەن ژن بوو، خوای گەورە رزقێکی حەڵاڵی پاکی پێ بەخشیوە بەڵام ئەو وازی لە حەڵاڵ هێناوە وە دەڕوات بۆ لای حەرام و گەنیو ((والتارك لدينه المفارق للجماعة))، واتە: ئەوەی واز لە دینەکەی خۆی دەهێنێت و لە کۆمەڵی موسڵمانان جیا دەبێتەوە)).

لە هەردوو کتێبی (الصحيح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەی (أبو هريرە)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن، ولا يسرق

---

١ ـ أخرجه البخاري، كتاب ((المظالم))، باب ((النُّهْبَى بغير إذن صاحبها))، (٢٤٧٥)، ومسلم كتاب ((الإيمان))، باب ((نقصان الإيمان بالمعاصي)) (٥٧).

السارق حين يسرق وهو مؤمن، ولا يشرب الخمر حين يشربها وهو مؤمن))، واتە: کاتێ کەسی زیناکار لەو کاتەدا زینا دەکات ئەوا ئیماندار نییە، کاتێ کەسی دز لەو کاتەدا دزی دەکات ئەوا ئیماندار نییە وە کاتێ کەسی مەیخۆر لەو کاتەدا مەی دەخواتەوە ئەوا ئیماندار نییە)).

لە گوتەیەکی تردا لە (ابن عەبباس)[1]ەوە هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا(ρ) فەرموویەتی: ((لا يزني العبد حين يزني وهو مؤمن، ولا يسرق حين يسرق وهو مؤمن، ولا يشرب حين يشرب وهو مؤمن، ولا يقتل حين يقتل وهو مؤمن))قال عكرمة: قلت لأبن عباس: كيف ينزع الإيمان منه؟ قال هكذا: وشبك بين أصابعه، ثم أخرجها، فإن تاب عاد إليه هكذا، وشبك بين أصابعه)) واتە: کاتێ بەندەیەك زینا دەکات لەو کاتەدا زینا دەکات ئەوا ئیماندار نییە، کاتێ کەسێ دزی دەکات لەو کاتەدا دزی دەکات ئەوا ئیماندار نییە وە کاتێ کەسی مەیخۆر لەو کاتەدا مەی دەخواتەوە ئەوا ئیماندار نییە، کاتێ کەسی بکوژ کەسێك دەکوژێت لەو کاتەدا کە دەیکوژێت ئیماندار نییە، عکرمە فەرمووی: بە (ابن عباس) م گوت: چۆن ئیمانی لێ دەسێنرێتەوە؟ ئەویش فەرمووی: بەم شێوەیە (پەنجەکانی کردە نێو یەکتردا و ئەمجار دەریهێنا)وە ئەگەر تەوبەی کرد ئەوا ئیمانەکەی بەم شێوەیە بۆ دەگەڕێتەوە(ئەمجار پەنجەکانی کردە نێو یەکتردا))).

ئیمامی بوخاری ریوایەتی کردووە (تعليقا بصيغه الجزم)[2] کە فەرموویەتی: ((ينزع منه نور الإيمان في الزنى))، واتە: روناکی ئیمانی لێ دەردەهێنرێت بە هۆی زیناوە)).

ئیمامی (الطبري) لە (تهذيب الآثار)و ابن عساكر لە (التاريخ) دا ریوایەتیان کردووە بە سەنەدێکی (منقطع)[1] لە (عبدالله ی کوڕی رواحه)، کە فەرموویەتی: ((إن

---

١ ـ أخرجه البخاري كتاب ((الحدود)) باب ((إثم الزناة)) (٦٨٠٩).

٢ـ أخرجه البخاري كتاب ((الحدود)) باب ((الزنى وشرب الخمر))، قبل حديث (٦٧٧٢)، ووصله ابن أبي شيبة في ((كتاب الإيمان)) (٩٤) ولفظه أن ابن عباس قال لغلمانه: ((من أراد منكم الباءة زوجناه، لا يزني منكم زان إلا نزع الله منه نور الإيمان، فإن شاء رده، و إن شاء أن يمنعه منعه))، وحسنه الشيخ الألباني هناك.

مثل الإيمان مثل قميصك، بينما أنت وقد نزعته إذ لبسته، وبينما أنت قد لبسته إذ نزعته )) واتە: نمونەی ئیمان وەکو نمونەی کراسەکەت وایە، لە کاتێکدا تۆ دایدەکەنیت ئەگەر لەبەرت کردبوو وە لە کاتێکدا تۆ لەبەری دەکەیت ئەگەر داتکەندبوو)).

پرسیار کرا لە (ابو هريره) دەربارەی ئەو فەرموودەیە: ((لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن))، ئەو کاتە ئیمانەکەی لە کوێیە؟ فەرمووی: (ئا بەم شێوەیە لە سەری دەبیت) بە دەستەکانی ئیشارەتی کرد... ئەگەر وازی هێناو تەوبەی کرد ئەوا ئیمانەکەی بۆ دەگەڕێتەوە)).[٢]

ئەمەیشە ڕاستکردنەوەی فەرمودەیەکی پێغەمبەری خوایەﷺ کە (ابو داود والحاكم و جگە لەوان)[٣] ریوایەتیان کردووە لە (ابو هريره) وە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إذا زنى الرجل خرج منه الإيمان كان عليه كالظلة، فإذا انقلع رجع إليه الإيمان ))، واتە: ئەگەر کەسێك زینای کرد ئەوا ئیمانەکەی لێی دەردەچێت، لەسەر سەری وەکو سێبەرێك دەمێنێتەوە، ئەگەر وازی لە زیناکەی هێنا ئەوا بۆی دەگەڕێتەوە)).

لە پاشاندا بە درێژی و روونی باسی ئەم مەسەلەیە دەکەم بە پشتیوانی خوا... کە ئەویش ئەوەیە.

ئایا ئەو کەسە کە زینای کرد بۆی هەیە تەوبە بکات؟ ئایا ئەو کەسەی کەسێکی کوشت بۆی هەیە تەوبە بکات ؟.

وڵامی ئەم پرسیارە لە بەشی داهاتوودا باس دەکەم انشاء الله... داوا لە خوا دەکەم بە (اسم الأعظم) کە ئەگەر هەر کەسێ بەو ناوەوە بانگی بکات ئەوا بێ

---

١ ـ أخرجه الطبري في ((تهذيب الآثار)) (٩٦٦) مسند ابن عباس، وابن عساكر في ((تاريخه)) (٢٨ / ١١١، ١١٢).

٢ـ أخرجه المروزي في ((تعظيم قدر الصلاة)) (٥٣٩).

٣ـ أخرجه ابو داود،كتاب ((السنة))، باب ((الدليل على زيادة الإيمان و نقصانه)) (٤٦٩٠)، والحاكم (١/٧٢)، وابن مندة في الإيمان (٥١٩)، والمروزي في ((تعظيم قدر الصلاة)) (٥٣٦)، والطبري في ((تهذيب الآثار)) (٢ / ١٥٤، ١٤٠٩, ١٤١٠)، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (٥٠٩).

بەشى ناكات، ئەگەر داوا بكات پێى دەدرێت... كە خێزانەكانمان و منداڵەكانمان چاكساز بكات و بمانپارێزێ لە كەساسى و زەبوونى وە ئێمە و ئێوە بگێڕێ لەوانەى كە ئەگەر هەر قسەيەك ببيسن ئەوا شوێنى چاكەكانى دەكەون، بە ڕاستى ئەوانە ئەو كەسانەن كە خوا ڕێنمويى كردوون و ئەوانە خاوەن عەقڵەكانن.

ئايا بكوژ و داوێن پيس (زيناكار) بۆيان هەيە تەوبە بكەن ؟؟

خۆشەويستانم ...

لە بەشى ڕابوردوودا و لە باسى نيشانەكانى قيامەت باسى ئەم دوو نيشانە ترسناكەم كرد... كە ئەوانيش بريتى بوون لە زۆر بوونى كوشتن و بڵاو بوونەوەى زينا ... كۆتايى بەشەكەم بەو پرسيارە هێناوە،وا دەزانم كە زۆربەخۆشەويستانم لەبرايانم و خوشكانم چاوەڕوانى وەڵامى ئەم پرسيارە گرنگەن كە ئەويش ئەوەيە:

ئايا بكوژ و زيناكار بۆيان هەيە تەوبە بكەن؟

وڵامەكەى: بەڵێ... بە بێ باسكردن و هێنانەوەى پێشەكى، خواى گەورە فەرموويەتى (ئاگادارى ڕەوشت و سيفاتى بەندەكانى (الرحمن) بە كە خاوەنى ئەو ڕەوشتە جوانانەن): ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُولَٰئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ ۗ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَإِنَّهُ يَتُوبُ إِلَى اللَّهِ مَتَابًا﴾ الفرقان: ٦٨ـ ٧١، واتە: ئەوانەى وێڕاى خوا هيچ پەرستراوێكى تر ناپەرستن، كەسێكيش ناكوژن كە خوا كەشتنى ياساغ كردبێ، مەگەر بە هەق و ڕەوا، زينا و داوێن پيسيش ناكەن، هەركەسێ ئەو كاروكردەوە ناپەسەندانە بكات ئەوە لە دوارۆژدا دەگات بە سزاى تاوانەكەى خۆى.(٦٨) لە ڕۆژى قيامەتيشدا دوو بەرامبەر ئازار دەدرێ و بە سووكى و زەليلى و ريسواييەوە بە هەتا هەتايى هەر لەوێدا ئەمێنێتەوە .(٦٩) مەگەر كەسێك پەشيمان دەبێتەوە و بڕوا بێنێ و كارى چاك ئەنجام بدا ئا ئەو كەسانە خوا گوناه و خراپەكانيان بۆ

دەگۆڕێت بە چاکە، هەمیشە خوا گوناه پۆش و میهرەبانە(٧٠) ئەوەی لە گوناهەکانی تەوبەی کرد و کردەوەی چاکی کرد ئەوە بە ڕاستی زۆر بە مەزنی دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا(٧١).

ئای ئەوە چی فەزڵێکە!! ئەوە چی ڕێزێکە!!

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ...﴾ الزمر: ٥٣، واتە: ئەی موحەممەدﷺلە منەوە بڵێ: ئەی بەندەکانی من ! ئەی ئەوانەی ستەم و زیادە ڕۆییتان لە خۆتان کردووە..!))

خوای گەورە باسی ئەوانەی کردووە کە زیادە ڕەوییان کردووە لە ئەنجامدانی تاواندا و کردوونی بە بەندەی خۆی ئەمجار دەفەرموێت: ﴿لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾، واتە: ئێوە لە ڕەحمەت و میهرەبانی خوا بێ ئومێد مەبن . بە ڕاستی خوا لە هەموو گوناهێك خۆش ئەبێ دیارە ئەم بانگەشەیە بۆ تەواوی تاوانبارانە کە بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئەگەرچی گوناهیشیان بە ئەندازەی کەف سەر زەریاکان بێ. چونکە ئەوە لێبووردە و میهرەبان.)).

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ﴾ النساء:٤٨، واتە: بێگومان هەرگیز خوا لە دانانی هاوبەش بۆی نابووری)) ئەمە ئەو تاکە تاوانەیە کە لێی خۆش نابێت کە ئەویش بریتییە لە هاوەڵدانان ((وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ)) واتە: لە خوار شیرکەوە لە هەر گوناهێك دەبووریٚ بۆ هەر کەسێك خۆی بیەوێت)) تەنانەت (مشرك) یش ئەگەر تەوبە بکات ئەوا خوای گەورە لێی خۆش دەبێت ... ئایا (مشرك) چۆن تەوبە دەکات ؟؟ بە داماڵین و داکەندنی پۆشاکی هاوەڵدانان لە بەر دەرگای ئیسلام و باوەڕ و یەکتاپەرستی... وە پەشیمان ببێتەوە لەوەی کە ئەنجامی داوە لە هاوەڵدانان و سەر پێچی... پاشان ئەو کارانە ئەنجام بدات کە لە خوای بەخشندە و میهرەبان نزیکی دەکاتەوە... ئەو کاتە خوای گەورە تەوبەکەی لێ وەردەگرێت... بەڵکو خوای گەورە خۆشحاڵ دەبێت بە گەڕانەوەکەی لە کاتێکدا

خۆی دەوڵەمەندە و پێویستی بە هیچ كەسێك نییە لەم بوونەوەردا . خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿١٥﴾ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٦﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ﴾ فاطر:١٥ــ ١٧، واتە: ئەی خەڵكینە! ئێوە هەژارن و نیازتان بە خوا هەیە، ئەو بێ نیاز و سوپاسكراوە هەرچەندە خەڵكی ململانێ بكات.(١٥) ئەگەر بیەوێ ئێوە لە ناو ببا و خەڵكێكی تازە بێنێت، وادەكات.(١٦) ئەو كارەش بۆ خوا گران نییە(١٧).

بۆیە روو لە خوا بكە و مەترسە — ئەی ئەو كەسەی كە كەوتویتە ناو تاوانی زیناوە —هەروەها روو لە خوا بكە ئەی ئەو كەسەی كەوتویتە ناو تاوانی گەورەی كوشتنەوە —هەرگیز مەترسە...سوێند بە خوا پەروەردگارەكەت خۆشحاڵ دەبێت بە تەوبە و گەڕانەوەكەت بۆ لای... هەرگیز بێ ئومێد و بێ هیوا مەبە چونكە تۆ كەسێكی خواكەت بە تاك و تەنها دەناسیت... چونكە تۆ شوێن كەوتەی پێغەمبەری خۆشەویستیﷺ جا ئێمە مرۆڤین، فریشتە پاكەكان نین... هەروەها شەیتانە سەرسەختەكان نین... بەڵكو ئێمە مرۆڤین كە لە ناخماندا وەرگرتن و رەتكردنەوە هەیە (الاقبال والاحجام) وە لە ناخماندا چاكە و خراپە هەیە... حەڵاڵ و حەرام هەیە..گوێڕایەڵی و سەرپێچی هەیە... خراپەكاری و چاكەكاری تیادایە... نزیك بوونەوە و دوور كەوتنەوەی تیادایە...

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا﴾ الشمس:٧ـ ١٠، واتە: سوێند بە نەفس و دەروونی مرۆ و بەو زاتەی دروستی كردووە بە رێكوپێكی(٧).ئینجا ئیلهامی بەدكاری و پارێزگاری بۆ كرد، واتە: خێر و شەڕی بۆ روون كردەوە، نیشانی دا چی چاكە بیكا و چی خراپە نەیكا و خۆی لێ بپارێزێ (٨) سوێند بەوانە هەموو بێ شك رزگاری بوو ئەو كەسەی كە نەفسی خۆی لەهەرچی كاری بەدوو فەسادە پاك و پوختەی كردەوە.(٩) و بەراستی ئەو كەسەش كە نەفسی خۆی بە گوناه و تاوان ئالوودە كرد نائومێد و ناموراد بوو(١٠).

هەرگیز مەڵێ... من کەوتومەتە ناو تاوانێکی گەورەوە چونکە خواکەت زۆر لەوە گەورەتر و ڕێزدارتر و شکۆمەندترە کەسێك لە دەرگاکەی بدات و ئەویش دەرگاکەی بە ڕوویدا بگرێت...!! بۆیە ڕووی لێ بکە و هەرگیز بێ ئومێد مەبە لە میهرەبانی خوای گەورە.

ئەی برا خۆشەویست و ژیرەکەم... ئەوا تۆ گوێبیستی هەندێك لە ئایەتەکانی کتێبەکەی خوای پەروەردگار بوویت وەکو بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا لەسەر ئەوەی کە خوا هەرگیز دەرگای تەوبە داناخات بە ڕووی هەرکەسێکداکە بیەوێ بگەڕێتەوە بۆلای و پەشیمان ببێتەوە بە مەرجێ نەگەیشتبێتە قۆناغی غەرغەرە وە هێشتا ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە دەرنەچووبێت — پشت بە خوا لە پاشاندا باسی ئەو نیشانەیە دەکەم—

بەڵام هەرگیز کاری ئەمڕۆ مەخەرە سبەینێ چونکە مردن لە ناکاودا دێت و دەبێتە میوانت... بۆیە هەر ئێستا پەیمان بە خواکەت بدە بە گەڕانەوە و تەوبە... وە دڵنیا بە کە خوای گەورە لێت خۆش دەبێت... بەڵکو خۆشحاڵ دەبێت بە تەوبەکەت و گەڕانەوەکەت، لە کاتێکدا زۆر دەوڵەمەندە و پێویستی بە هیچ کەسێك نییە لەم بوونەوەرەدا...

کەوابوو ئەی ئەو کەسەی کە لە تاوانەکانت پەشیمان بوویتەتەوە کوا شوێنەواری پەشیمان بوونەوەکەت؟ کوا گریانەکەت لەسەر پێ هەڵخلیسکانەکەت؟ بزانە کە گەورەترین پایە لە پایەکانی تەوبە پەشیمان بوونەوەیە لە کردەوەکانی ڕابوردوو... نەوەك هەر کاتێك تاوانەکانت بێتەوە یادت خۆشحاڵ بیت، بەڵکو دەبێ هەست بە ئازاری برینی دڵەکەت بکەیت... شکانەوە و پەشیمانیت لە بەر دەست پەروەردگارەکەتدا بنوێنی...

ئەگەر تاوانەکە پەیوەندی بە کەسێکەوە هەبوو لە براکانت ئەوا هەوڵ بدە کە مافەکەی خۆی بگێڕیتەوە بۆ خاوەنەکەی... بەڵام ئەی چۆنە ئەگەر کەسێك کەوتبووە ناو تاوانی زیناوە و بەرانبەر بەو کەسەی کە ئەو کارەی لە گەڵدا کردووە پێی بڵێت ئەو کارەم کردووە؟ ناتوانێت... لەو کاتەدا لە سەری نییە بەڵکو تەنها لە

سەریەتی تەوبە و گەڕانەوەکەی تازە بکاتەوە وە بە خوێن بگریەت لە جێی فرمێسك وە کوشش بکات بۆ ئەنجامدانی کاری چاکە تاکو خواکەی لە خۆی ڕازی دەکات، ئەگەر کارەکە نەگەیشتە فەرمانڕەوا و سنووری شەرعیان بە سەردا نەسەپاند...

ئێستا ئەم چەند موژدەیەت بە دیاری دەدەمێ لە فەرموودەکانی ئەو میهرەبانە دیاری کراوە و، ئەو نیعمەت بەخشراوە پاکترین صەڵات و سەلامی لەسەر بێت...

بە نیسبەت کوشتنەوە:ئەوا (البخاری و مسلم)[1] ریوایەتیان کردووە لە فەرموودەیەکی (ابی سعید الخدری) یەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرمووەتی: ((کان فیمن کان قبلکم رجل قتل تسعة و تسعین نفسا فسأل عن أعلم أهل الأرض فدل علی راهب، فأتاه، فقال: إنه قتل تسعة و تسعین نفسا، فهل له من توبة؟ فقال: لا ! فقتله فکمل به مائة))، واتە: لە پێش ئێوە کابرایەك هەبوو نەوەت و نۆ کەسی کوشتبوو، پاشان پرسیاری کرد کە زاناترین کەسی سەر زەوی کێیە؟ ئەوانیش خواناسێکیان بۆدەست نیشان کرد، ئەویش ڕۆیشت بۆلای و فەرمووی: کە نەوەت و نۆ کەسی کوشتووە ئایا بۆی هەیە تەوبە بکات؟ گوتی: نەخێر... بۆیە ئەویشی کوشت و ژمارەکە بووە سەدی تەواو)) داوای لێبوردن دەکەم بۆ ئەوەی چەند وشەیەکی کەم بڵێم... پاشان دەگەڕێمەوە سەر فەرموودەکە بە پشتیوانی خوا...

جارێکیان بابەتی کەسێکی ڕێزدارم خوێندەوە کە لە گۆشەیەك لە گۆشەکانی ڕۆژنامەیەك نوسیبووی کاتێك ئەم فەرموودەیەی لە زانایەکەوە یان لە وتاربێژی مزگەوتێکەوە بیستبوو... ئەو نوسەرە دەڵێت: ئەم قسەیە زۆر ترسناکە وە ئەم قسەیە بەربڵاوە ! ! ئێوە بەم شێوەیە دەرگای کوشتن دەکەنەوە و پاشان بکوژەکە دەڵێت: من دەمەوێت تەوبە بکەم!من پێی دەڵێم: هەرگیز وانییە ئەی مامۆستا.. ئەمە مانا و مەبەستەکە ناگەیەنێت... لە پێشاندا حورمەتی خوێنمان ڕوون کردەوە وە باسی ئەوەم کرد کە خوای گەورە لە هەموو قورئانی پیرۆزدا هیچ هەڕەشەیەکی

---

١ـ أخرجه البخاري، کتاب ((أحادیث الأنبیاء)) (٣٤٧٠)، ومسلم، کتاب ((التوبة))،باب ((قبول توبة القاتل و إن کثر قتله)) (٢٧٦٦).

وەکو هەڕەشەی کوشتن نەداوە هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا ﴾ النساء: ٩٣، واتە: هەرکەسێك بە دەستی ئەنقەست مرۆڤێکی خاوەن باوەر بکوژێ سزا و تۆڵەی هەر دۆزەخە و بە هەتا هەتاییش تێیدا ئەمێنێتەوە غەزەب و تووڕەیی خوای لەسەرەو نەفرینیشی لێ کردووەو سزایەکی گەورەو قورسیشی بۆئامادە کردووە))بەراستی ئەمە هەڕەشەیەکی ترسناکە بۆ بکوژ!!

بەڵام ئەم فەرموودە دروستە (صحيح)ە دەرگا دەکاتەوە بۆ ئەو جۆرە کەسانە کە دەستیان چووەتە رشتنی خوێنی خەڵکی وە یاخود خوێنیان ڕژاندووە بە بێ هیچ جوامێری و مەردایەتی و دینێك... لەگەڵ ئەوەیشدا پێی دەڵێین: خێراکە ... دەستەکانت لەو خوێنە پاك بکەرەوە... چونکە دەرگای تەوبە کراوەتەوەو نابەسترێت تاکو کاتی غەرغەرە کردن یان تاوەکو رۆژ لە رۆژئاواوە دەردەچێت... ئێستا ئەوەت لە سەرە کە دڵەکەت پاك بکەیتەوە لەم باوەڕە خراپە... لە دەرگای تەوبە بدەو دڵنیابە کە خوای گەورە تەوبەکەت لێ وەردەگرێت ...بەڵام ئەو راهبە خواپەرستە کە فەتوای بە بکوژەکە دا نە قورئان و نە سوننەتی بە سەردا جێ بە جێ نابێت، بەو دوو پێوەرە فەتوای نەداوە کە ئەو بکوژە بۆی نییە تەوبە بکات... دەرگای تکا بە روویدا داخست و لە ژیان بێ ئومێدی کردووە... لە کاتێکدا ئەم کابرایە دەیەوێ لاپەرەیەکی نوێ لە ژیانیدا بکاتەوە... بە هیچ شێوەیەك فەرموودەکە دەرگا ناکاتەوە بۆ ئەوەی کەسانێك بوێرن کە خوێنی خەڵکی برێژن... بەڵکو ئەم فەرموودەیە دەرگای تکا دەکاتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە دەستەکانیان بە خوێنی خەڵکی سوور کراوە... دەیەوێ تەوبە بکات لای پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکان... دەرگا دەکاتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە کەوتوونەتە ناو ئەم تاوانە گەورە و سامناك و ترسناکەوە... خوای گەورە دەرگای تەوبە و گەڕانەوە دەکاتەوە... تەوبەکەی تەواو نییە ئەگەر پەشیمان نەبێتەوەو لەو تاوانەی کە ئەنجامی داوە وە بۆ یەکجاری واز لەو تاوانە گەورە بهێنێ... دەست بکاتە کردەوەی چاکە کە پەروەدگاری زەوی و ئاسمانەکان ڕازی دەکات... ئەمە

مەبەستی پێغەمبەرکەمانەﷺ ئەی مامۆستای ڕێزدار...

ئەمەیشە بەڵگەیەکی تـرە لەوپـەڕی جـوانی و قەشـەنگیدایە لـە فـەرموودەی گەورەی هـەموو پیـاوان (محمـدی کـوڕی عبـداالله)ﷺ جـارێکی تـر دەگەڕێمـەوە بـۆ یەکەم فەرموودە... بەڵام دەمەوێت بەڵگەیەك بهێنمـەوە لەسـەر ئـەو بنەمایـەی کـە ئێستا باسی دەکەم چونکە من دەمەوێت دڵ و عەقڵ پێکەوە بدوێنم...

ئیمامی (البخاری و مسلم)[١] لە (ابوهریرە)وە ریوایەتیان کردووە کەوا پێغەمبەری خواﷺ لە پەروەردگارییەوە دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ((أذنـب عبـد ذنبـا )) واتـە: بەندەیەك تاوانێکی لە تاوانەکان ئەنجامدا)) من و تۆ ئەو بەنـدە تاوانبـارەین... داوا لە خوا دەکەم کە لە هەموومان خۆش بێت و بۆ ئەوەی ئێمەش بگەڕێینـەوە بـۆ لای خۆی (( فقال: اللهم أغفر لي ذنبي))، واتە: جا فەرمووی: ئەی خودایە ! لە تاوانەکـەم خۆش بە)) ئەگینا کەسێك تاوانباری سووك و ریسوا و لاسار بۆ کوێ بڕوات ئیللا بـۆ لای خوای بەخشند و میهرەبان نەبێت.

یا رب إن عظمت ذنوبي كثرة فلقـد علمـت بـأن عفـوك أعظـم
إن كـان لا يرجـوك إلا محـسن فمن ذا الذي يرجوا و يـدعو الآثم

واتە: پەروەردگارا... ئەگەر تاوانەکانم زۆر و گەورە بوون، ئـەوا مـن بـاش دەزانم کەوا لێبوردنی تۆ گەلێك گەورەترە، ئەگەر تەنها چاکەکاران تکات لێ بکـەن و داوات لێ بکەن، ئەی کەسی تاوانبار و گوناهبار بۆ کوێ بڕوات؟

ئایا کەسی تاوانبار بۆ کوێ دەڕوات جگـە بـۆ لای خـوای بەخـشندە و میهرەبـان نەبێـت؟ کەسی هەژار بۆ لای دەوڵەمەند نەبێ بۆ کوێ بڕوات؟ کەسی زەلیل بـۆ لای خوای بە عیززەت نەبێت بۆ کوێ بڕوات؟ ئایـا هـەڵاتن بـۆ کوێـە؟ بـۆ کـوێ دەڕۆن؟ هیچ پەناگەیەك و رزگارکەرێك نییە لە خوا ئیللا بۆ لای خـوا نـەبێت، چـونکە هـەموو زەوی زەوی ئەوە، هەموو موڵکەکان مـوڵکی ئـەون... بـەرزی و پـیرۆزی هـەموو بـۆ ئەوە...

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب ((التوحيد)) (٧٥٠٧)، ومسلم، كتاب ((التوبة))،باب ((قبول التوبة من الذنوب و إن تكررت الذنوب و التوبة)) ( ٢٧٥٨)، واللفظ.

قال: ((أذنب عبد ذنبا، فقال: اللهم! أغفر لي ذنبي، فقال تبارك وتعالى: أذنب عبدي ذنبا، فعلم أن له رباً يغفر الذنب، ويأخذ بالذنب، ثم عاد فأذنب))، واتە: بەندەیەك تاوانێكی لە تاوانەكان ئەنجامدا، جا فەرمووی: ئەی خودایە ! لە تاوانەكەم خۆش بە... خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەكەم تاوانێك لە تاوانەكانی ئەنجامداو پاشان زانی كەوا خودایەكی هەیە لەتاوانەكان خۆش دەبێت، بەهۆی تاوانەوە دەبات، ئەمجار گەڕایەوە و تەوبەی كرد))،پەروەردگار هەر پەروەردگارە و بەندەش هەر بەندەیە ((فقال: أي رب ! أغفر لي ذنبي)) فەرمووی: ئەی خودایە! لە تاوانەكەم خۆش بە)) بۆ جاری دووەم؟ بەڵێ...بۆ جاری دووەم و جاری سێیەم، تاكو بە راستییەوە بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، پەشیمان بووبێتەوە، بەردەوام لەو جێگایەدا نامێنەتەوە كە تاوانەكەی ئەنجام دا، بۆیە لێرەدا خوای گەورە لێ وەردەگرێت ((فقال تبارك وتعالى: عبدي أذنب ذنبا فعلم أن له ربا يغفر الذنب و يأخذ بالذنب . ثم عاد فأذنب، فقال: أي رب! اغفر لي ذنبي. فقال تبارك وتعالى: أذنب عبدي ذنبا فعلم أن له ربا يغفر الذنب و يأخذ بالذنب، فقال تبارك وتعالى: اعمل ما شئت فقد غفرت لك ))، واتە: خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەكەم تاوانێك لە تاوانەكانی ئەنجامدا و پاشان زانی كەوا خودایەكی هەیە لە تاوانەكان خۆش دەبێت، بە هۆی تاوانەوە دەبات، ئەمجار گەڕایەوە و تەوبەی كرد فەرمووی: ئەی خودایە! لە تاوانەكەم خۆش بە، خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەكەم تاوانێك لە تاوانەكانی ئەنجامدا و پاشان زانی كەوا خودایەكی هەیە لە تاوانەكان خۆش دەبێت، بە هۆی تاوانەوە دەبات، خوای گەورە دەفەرموێت: هەر كارێك دەكەیت بیكە چونكە من لە تۆ خۆش بوومە)) لە ریوایەتێكی تردا: (( غفرت لعبدي فليعمل ما شاء )) واتە: من لە بەندەكەم خۆش بووم جا هەر كارێك دەكات با بیكات)) .

لە فەرموودەیەكدا كە لە هەردوو كتێبی (صحيح)[1]دا هاتووە لە فەرموودەی (أبو هريره) وە كەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((جعل الله الرحمة مائة جزء

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب ((الأدب))، باب ((رحمة الولد و تقبيله و معانقته)) (٦٠٠٠)، ومسلم، كتاب ((التوبة))، باب ((في سعة رحمة الله)) (٢٧٥٢).

فأمسك عنده تسعة وتسعين جزءا وأنزل في الأرض جزءا واحدا، فمن ذلك الجزء تتراحم الخلائق، حتى ترفع الدابة حافرها عن ولدها خشية أن تصيبه)) واتە: خوای گەورە بەخشندەیی کردووەتە سەد بەشەوە، جا نەوەت و نۆ بەشی لای خۆی هێشتووەتەوە و تەنها یەك بەشی دابەزاندووەتە سەر زەوی، جا تەنها لەو بەشەیە هەموو دروستکراوەکان لە نێو خۆیاندا بە بەزەیین تەنانەت ئەو وڵاخەی کە سمی بەرز دەکاتەوە لە ترسی ئەوەی بەر بێچووەکەی نەکەوێت)) .

خوای گەورە تەنها یەك بەش لەو ڕەحمەتە مەزنەی داگرتووە سەر زەوی هەر لەو تەنها بەشەیە، ڕەحمەتی پێغەمبەری خواﷺ ، ڕەحمەتی دایك بەرانبەر منداڵەکەی، ڕەحمەتی باوك بەرانبەر بە منداڵەکەی، ڕەحمەتی پزیشك بەرانبەر نەخۆشەکەی، ڕەحمەتی دەوڵەمەند بەرانبەر بە هەژاران، ڕەحمەتی بەهێز بەرانبەر بە لاواز و بێ هێزەکان، هەموو لەو شێوە و شێوازی ڕەحمەتە ناسك و جوانە کە لەم بوونەوەرەدا دەبینین ئەمە تەنها بەشێکە لە سەد بەش لە ڕەحمەتی خوای بەخشندە و میهرەبان...

سوێند بە خوا هەر کەسێ خوای ناسی و ڕەحمەتەکەی ناسی ئەوا هەرگیز بێ ئومێدو بێ هیوا نابێت... هەرچەندە تاوانی گەورەی ئەنجام دابێت... هەر چەندە سەرپێچی ئەنجام دابێت، بەڵام براکەم هەر لە ئێستاوە واز لە تاون بهێنە... پەشیمان ببەرەوە لەوەی کە لە ڕابووردوودا ئەنجامت داوە، پەیمان بدە خواکەی خۆت بەتەوبەو گەڕانەوە و کرداری چاکە... سوێند بەو خوایەی کە هیچ خوایەك جگە لەو نییە ئەوا خوای گەورە خۆشحاڵ دەبێت بە تەوبەکە و گەڕانەوەکەت لە کاتێکدا خۆی دەوڵەمەند و پێویستی بە هیچ کەسێك نییە لە جیهاندا.

لە هەردوو کتێبی (صحيح)[١] دا لە فەرموودەیەکی (عومەر ی کوڕی خەتتاب)ەوە ریوایەت کراوە کەوا فەرموویەتی: ((قدم على رسول الله بسبي فإذا امرأة من السبي تبتغي إذا وجدت صبيا في السبي أخذته فألصقته ببطنها وأرضعته))، واتە: هەندێ

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب ((الأدب))، باب ((رحمة الولد و تقبيله)) (٥٩٩٩)، ومسلم، كتاب ((التوبة))، باب ((في سعة رحمة الله)) (٢٧٥٤).

دیلیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ لە ناو دیلەکاندا ئافرەتێك هەبوو هەوڵی دەدا تاکو منداڵێکی لە نێو دیلەکاندا دۆزییەوە توند نوساندی بە سنگی خۆیەوە و شیری پێدا)) ئەگەر منداڵێك لە دایکەکەی بزر بێت ئەوا عەقڵەکەی لە گەڵ منداڵەکەدا بزر دەبێت بە تەواوی، عەقڵەکەی ون دەبێت و راستی لە دەست دەدات و هەموو شتێکی لە دەست دەردەچێت، رەنگە بە پەلە لە ماڵ دەرچێت کەچی سەرپۆشەکەی بە سەردا نەداوە یان بە تەواوی جل و بەرگەکەی لە بەر نەکردووە، چونگە عەقڵەکەی بە تەواوی فرێ داوە، عەقڵیش جێگای پێ سپاردن و سەپاندنە. لە گەڵ ئەوەیشدا پێغەمبەری خواﷺ ئەو ئافرەتە دەبینێ وە منداڵەکەی کردووەتە سەر سنگی و شیری پێ دەدات بۆیە پرسیار لە هاوەڵان دەکات و دەڵێت: ((أترون هذه المرأة طارحة ولدها في النار ؟)) قالوا: لا والله وهي تقدر على أن لا تطرحه، فقال رسول اللهﷺ : ((لله أرحم بعباده من هذه بولدها))، واتە: ئایا وا دەبینن کەوا ئەو ئافرەتە منداڵەکەی خۆی فرێ بداتە ناو ئاگرەکەوە؟ فەرموویان: نەخێر سوێند بە خوا لە کاتێکدا ئەو دەتوانێ فرێ نەداتە ناو ئاگرەکەوە، جا پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: باش بزانن کەوا خوای گەورە زۆر بە بەزەیی ترە بەرانبەر بە بەندەکانی لەو ئافرەتە بەرانبەر بە منداڵەکەی)).

یەکێ لە پیاوچاکان فەرموویەتی: خودایە... تۆ باش دەزانیت کە دایکم لە هەموو خەڵکی زیاتر میهرەبانترە بەرانبەرم، منیش باش دەزانم کە تۆ لە دایکم میهرەبانتری بەرانبەر بە من ... دایکم رازی نابێت بە من سزا و لە ناو چوونم ئایا تۆ پێی رازی دەبیت لە کاتێکدا تۆ (أرحم الراحمین)ی؟؟

براکەم... بە دڵنیایی و هێزەوە روو لە خوا بکە و مەترسە هەروەکو چۆن خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰيَحْيَىٰ خُذِ ٱلْكِتَٰبَ بِقُوَّةٍ﴾ مریم: ١٢، واتە: ئەی یەحیاعليه السلام بە هەرچی تواناتە ئەو نامەی تەوراتە بگرە و کار و رەفتاری پێ بکە)).

هەروەکو چۆن خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰمُوسَىٰٓ أَقْبِلْ وَلَا تَخَفْ﴾ القصص: ٣١، واتە: ئەی مووسا بەرە و رووی من وەرە و مەترسە)).

هەموومان کەمتەرخەمین و هەموو مرۆڤێك هەڵە دەکات و باشترینی هەڵەکاران تەوبەکارانن... تەنانەت کوشتنیش؟ بەڵێ ...

لە گەڵ مندا جارێکی تر بگەڕێرەوە بۆ فەرموودەی کابرای بکوژی نەوەت و نۆ کەس... پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((کان فیمن کان قبلکم رجل قتل تسعة و تسعین نفسا فسأل عن أعلم أهل الأرض فدل علی راهب، فأتاه، فقال: إنه قتل تسعة و تسعین نفسا، فهل له من توبة؟ فقال: لا! فقتله فکمل به مائة ثم سأل عن أعلم أهل ألأرض))، واتە: لە پێش ئێوە کابرایەك هەبوو نەوەت و نۆ کەسی کوشتبوو، پاشان پرسیاری کرد کە زاناترین کەسی سەر زەوی کێیە؟ ئەوانیش خواناسێکیان بۆ دەست نیشان کرد، ئەویش رۆیشت بۆ لای و فەرمووی: کە نەوەت و نۆ کەسی کوشتووە ئایا بۆی هەیە تەوبە بکات؟ گوتی: نەخێر... بۆیە ئەویشی کوشت و ژمارەکە بووە سەدی تەواو ئەمجار پرسیاری کرد دەربارەی زاناترین کەسی سەر زەوی)) جارێکی تر؟ بەڵێ ..((فدل عل رجل عالم)) واتە: ئەوانیش کابرایەکی زانایان بۆ دەست نیشان کرد)) لێرەدا فەزڵی زانست و پایەی زانایانت بۆ روون دەبێتەوە ((فقال: إنه قتل مائة نفس فهل له من توبة؟ فقال: نعم)) واتە: فەرمووی: کە ئەو سەد کەسی کوشتووە، ئایا ئەو بۆی هەیە تەوبە بکات؟ فەرمووی: بەڵێ)) بە راستی ئەمە رووناکی زانستە ((ومن یحول بینه و بین التوبة؟!)) واتە: ئایا کێ دەتوانێت نێوان ئەو و تەوبە بگرێت ؟)) ئایا لەسەر رووی زەویدا کەسێك هەیە بتوانێت دەرگای تەوبە بە رووی کەسێکدا دابخات؟ نەخێر ... بە هیچ شێوەیەك نابێت خۆمان هاوتای خوا بکەینەوە و حوکم بە سەر خەڵکیدا بدەین بە بەهەشت یان دۆزەخ... چونکە ئەوە مافی هیچ بەندەیەك نییە بەڵکو ئەوە کاری خوای گەورەو میهرەبانە کە هەر خۆی کۆتایی و دواساتەکانی هەموو مرۆڤێك دەزانێت ...

((فدل علی رجل عالم، فقال: إنه قتل مائة نفس، فهل له من توبة؟ فقال: نعم، ومن یحول بینه وبین التوبة))، واتە: ئەوانیش کابرایەکی زانایان بۆ دەست نیشان کرد، جا فەرمووی: کە ئەو سەد کەسی کوشتووە، ئایا ئەو بۆی هەیە تەوبە بکات؟ فەرمووی: بەڵێ، ئایا کێ دەتوانێت نێوان ئەو و تەوبە بگرێت ؟)) بەڵێ بەڵام تەوبە چەند مەرجێکی هەیە ... ئەو مەرجانە چین؟ زانای چاوروون فەرمووی ((انطلق إلی أرض کذا و کذا، فإن بها أناسا یعبدون الله فاعبد الله معهم، ولا ترجع الی أرضك فإنها

أرض سوء)) واتە: دەرچوو بۆ زەوى فلان، چونكە لەوێ كەسانێك هەن خودا دەپەرستن و تۆيش لە گەڵ ئەواندا خودا بپەرستە، چيتر مەگەڕێوە زەوێيەكەى خۆت چونكە ئەمە زەوى خراپەكارييە)) بۆيە دەبێت ژينگەى سەرپێچى بگۆڕيت... ئەو هاوەڵانەى كە هانى دەداى بۆ ئەنجام دانى زينا و كەوتنە ناو تاوانى كوشتنەو و خواردنەوەى مەى و عەرەقەوە... دەبێ بە هێزەوە و بە پياوانە و ورەيەكى بەرزەوە بڕيار بدەيت بڕيارێكى يەكلايى كەرەوە ئەو هاوەڵە خراپانە بگوردرێت.

وعل قدر أهل العزم تأتي العزائم وتأتي على قدر الكرام المكارم
وتعظم فى عين الصغير صغارها وتصغر فى عين العظيم العظائم
وإذا كانــت النفــوس كبــارا تعبــت فى مرادهــا الأجــسام

واتە: ئەگەر نەفس و دەروونەكان گەورە و مەزن بوون ئەوا جەستەكان بۆ بەدى هێنانى مەبەستەكانيان ماندوو دەبن.

بەڵێ ... دەبێ بڕيارێكى پياوانە بدەيت وە دەبێ هاوەڵە خراپەكانت بگۆڕيت... وە دەبێ فەرمانەكەى پێغەمبەرى خواﷺ جێ بە جێ بكەيت كە دەفەرمووێت: ((لا تصاحب إلا مؤمنا ولا يأكل طعامك إلا تقي))[1] واتە: هاوڕێتى كەس مەكە تەنها ئيماندار نەبێت، هيچ كەسێك چێشتەكەت نەخوات تەنها كەسى خۆپارێز و لە خواترس نەبێت)) هەرگيز هاوڕێتى كەس مەكە تەنها كەسى ڕێزدار و لە خواترس و پوختە نەبێت...

لەهەردوو كتێبى (صحيح)[2] دا لە فەرموودەيەكى (ابى موسى الاشعرى) ەوە هاتووە كەوا پێغەمبەرى خواﷺ فەرموويەتى: ((مثل الجليس الصالح والجليس السوء كحامل المسك ونافخ الكير فحامل المسك إما أن يحذيك، وإما أن تبتاع منه، وإما

---

[1] ـــ أخرجه ابو داود،كتاب ((الأدب))، باب ((من يؤمر أن يجالس)) (٤٨٣٢)، والترمذي، كتاب ((الزهد))، باب ((ما جاء في صحبة المؤمن)) (٢٣٩٥) وقال: ((حديث حسن إنما نعرفه من هذا الوجه))، وابن حبان (٥٥٤، ٥٦٠)، وحسنه الألباني في ((صحيح الجامع)) (٧٣٤١).

٢ـــ أخرجه البخاري كتاب ((الذبائح والصيد))، باب ((المسك)) (٥٥٣٤)، ومسلم ((كتاب البر والصلة و الأدب))، باب ((استحباب مجالسة الصالحين و مجانبة قرناء السوء)) (٢٦٢٨).

أن تجد منه ريحا طيبة، ونافخ الكير إما أن يحرق ثيابك، وإما أن تجد ريحا خبيثة)) واتە: نموونەی هاودەمی چاك و هاودەمی خراپ وەکو هەڵگری میسك و ئەو کەسەیە فوودەکاتە کوورەی ئاسنگەردا، جا هەڵگری میسك یان هەندێکت پێ دەدا وە یان هەندێکی لێ دەکڕیت وە بۆنێکی خۆشی لێوە دەبیسی، بەڵام ئەو کەسەی فوودەکاتە کوورەدا یان جل و بەرگەکەت دەسوتێنێت وە یان بۆنێکی ناخۆشی لێ دەبیسی)).

ئەم فەرموودەیە نابێتە حەرام کردنی کاری ئاسنگەری... نەخێر بە هیچ شێوەیەك... بەڵام ئەمە لە یەکچوونە بۆ هاوڕێی چاك و هاوڕێی خراپ... بۆیە زۆر وریابە... هیچ کەسێك مەهێنە ماڵەکەت تەنها لە خواترسان نەبێت... وە خواردن و خواردنەوەی خۆت پێشکەش کەس مەکە تەنها چاکەکاران و چاکسازان نەبێت وە ئەهلی فەزڵ و خواترسان و دین نەبێت ... بۆیە دەبێ ئەو ژینگەیەی خۆت بگۆڕیت...

ئەوەتا ئەم زانایە ئامۆژگاری دەکات و پێی دەفەرموێت: ((انطلق إلى أرض كذا و كذا، فإن بها أناسا يعبدون الله فاعبد الله معهم، ولا ترجع الى أرضك فإنها أرض سوء)) جا لە ماڵ دەرچوو وە نیەت و بڕیاری یەکلایی کەرەوەی دا وە بە کردار (فعلی) بەرەو زەوی تەوبە و خواپەرستی کەوتە ڕێ... تەنها نیەتی نەهێنا و واز لە جێ بە جێ کردن بهێنێ... نەخێر... بەڵکو نیەتی هێناو کەوتەڕێ، خۆشەویستە هەڵبژێردراوەکەمانﷺ دەڵێت: (فانطلق، حتى إذا نصف الطريق))، واتە: گەیشتە ناوەڕاستی ڕێگاکە لە نێوان زەوییەکەی خۆی زەوی سەرپێچی و خراپەکاری و نێوان زەوی گوێڕایەڵی و تەوبە وخواپەرستی ((فأنطلق حتى إذا نصف الطريق أتاه الموت، فاختصمت فيه ملائكة الرحمة وملائكة العذاب، فقالت ملائكة الرحمة: جاء تائبا مقبلا بقلبه إلى الله، وقالت ملائكة العذاب: إنه لم يعمل خيرا قط، فأتاهم ملك في صورة آدمي فجعلوه بينهم))، واتە: دەرچوو تاوەکو گەیشتە ناوەڕاستی ڕێگاکە، لەو کاتەدا مردن یەخەی پێ گرت، بۆیە فریشتەی ڕەحمەت و فریشتەی عەزاب بووە مشت و مڕیان، فریشتەی ڕەحمەت فەرمووی: ئەم کابرایە بە تەوبەوەو بە دڵەوە

بەرەو لای خوا هاتووە وە فریشتەی عەزاب فەرمووی: ئەم کابرایە هەرگیز کرداری چاکەی نەکردووە، بۆیە فریشتەیەك لەسەر روخساری ئادەمیزاد هات بۆ لایان ئەوانیش ئەویان کردە دادەوەری نێوانیان)) واتە: کردیانە دادوەرێك لە نێوان خۆیاندا ((فقال: قیسوا ما بین الأرضین)) واتە: نێوان زەوی تەوبە و زەوی سەرپێچی (بپێون) ((فإلى أيتهما كان أدنى فهو له)) واتە: بۆ هەر کام لەو دوو زەوییە نزیك بوو ئەوا حەقی خۆیەتی))

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((فأوحى الله إلى هذه أن تقربي، وأوحى الله إلى هذه أن تباعدي، وقال: قيسوا ما بينهما، فقاسوا المسافة، فوجدوا أدنى إلى أرض التوبة بشبر، فقبضته ملائكة الرحمة))، واتە: خوای گەورە وەحی بۆ ئەمیان کرد کە نزیك بەرەوە و وەحی بۆ ئەویتر کرد کەوا دوور بکەوەرەوە، و فەرمووی: نێوان هەردوو زەوییەکە بپێون، ئەوانیش پێوایان، بینیان کەوا لە زەوی تەوبەکاریەوە بە بستێك نزیکترە، بۆیە فریشتەی رەحمەت گیانیان کێشا)) بەرەحمەت و بەزەیی خوای پەروەردگار لێی خۆش بوو وە لە ریوایەتێکی تردا ((فغفر له))، واتە: خوای گەورە لێی خۆش بوو)).

ئایا کەسێك تاوانی زینای ئەنجامدا و ئەمجار گەڕایەوە بۆ لای خوا و تەوبەی کرد ئایا خوای گەورە تەوبەکەی وەردەگرێت و، لە منداڵ و کەس و کارەکەیدا سزای نادات؟ بەڵێ... تەوبەی لێ وەردەگرێت، چونکە تەوبە تاوانەکانی پێش خۆی دەسڕێتەوە... بەڵام بە مەرجێك لە گەڵ خواکەی خۆیدا ڕاست بکات و، ڕەنگە کەسێك بڵێت: من تەوبەم کرد، بەڵام هەندێ جار لاواز دەبم بەرانبەر بە تاوان، پێی دەڵێم: جارێکی تر تەوبە بکە و بگەڕێوە و بزانە، کە خوای گەورە هەرگیز بێزار نابێت تاکو تۆ بێزار نەبێت... بزانە کە هیچ شەوێك بە سەرماندا تێپەڕ نابێت ئیللا خوای گەورە دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا (دابەزینێك کە شایستەی گەورەیی و شکۆمەندی خۆی بێت) بزانە ئەوەی کە بە هۆش و بیرتدا دێت خوای گەورە لەوە جیاوازە ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌۭ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ الشورى: ١١، واتە: هیچ شتێك نییە لە وێنەی ئەو (خوا) یە نە لە زاتیا نە لە سیفاتیا نە لە کرداریا بۆ خۆی

تەنیایە و لە هەموو شتێك بێ نیازە و هەموو شتێکیش نیازمەندە بەو، ئەویشە بیسەری بینا بە ئاگایە بە وتەی بەندەکانی بینایە بۆ کار و کرداریان)).

هیچ سیفاتێك لە سیفاتەکانی خوای گەورە ئینکار مەکە (تعطیل) وە چۆنییەتێکەی مەچوێنە بە هیچ شتێك... هیچ سیفاتێکی مەچوێنە بە سیفاتی هیچ دروستکراوێك لە دروستکراوەکانی، پاکی و بێگەردی بۆ خوای گەورە وە هیچ هاوشێواز و هاوچەشن و هاووێنە و هاوشان هاوتایەکی نییە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ﴾ طـه:٥، واتە: ئەو خوا بەخشندەیە چوویە سەر عەرشی خۆی . بەڵێ ..مەبەست بەم چوون و سەرکەوتنەیە بۆ سەر عەرش، سەرکەوتنێکە شیاوی زاتی بڵندی ئەو بێ و بەو شێوەیە کە (سەلەف) و پێشینانمان تەفسیریان کردووە و بێ هیچ شوبهاندن و لێکدانەوە و چوونە ناو قوڵاییەوە)).

(استوی) بەو شێوەیەی کە خۆی باسی کردووە، بەو شێوەی کە خۆی ویستی لەسەر بووە وە ماناکەی ئەوەیە کە فەرموویەتی، (استواء)ێك بە بێ جێگۆرکێ و چوونە ناو دروستکراوەکانەوە، چونکە عەرش ئەوی هەڵنەگرتووە، (الکرسی) جێی متمانەو پەنای نییە بەڵکو عەرش و هەڵگرانی، کورسی و مەزنێتی، هەمووی بە توانای خۆی هەڵگیراوە و بە مەزنی و توانای خۆی و ملکەچن بۆ گەورەیی و دەسەڵاتی خوا, بۆیە واتای (الاستواء) دیار و ئاشکرایە، چۆنییەتیەکەی نەزانراوە، باوەڕهێنان پێی واجبە، پرسیار کردن دەربارەی بیدعەیە... جا خوای گەورە دادەبەزێت... بۆ ؟

لەهەردوو کتێبی (صحیح)[١] دا لە فەرموودەیەکی (ابی هریرە)ەوە هاتووە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((ینزل الله إلى السماء الدنيا كل ليلة حين يمضي ثلث الليل الأول، فيقول: أنا الملك أنا الملك، من ذا الذي يدعوني فأستجيب له من ذا

---

١ ـ أخرجه البخاري، كتاب ((التهجد))، باب ((الدعاء والصلاة من آخر الليل)) (١١٤٥)، ومسلم، كتاب ((صلاة المسافرين و قصرها))، باب ((الترغيب في الدعاء و الذكر في آخر الليل و الإجابة فيه)) (٧٥٨ / ١٦٩). واللفظ لمسلم.

الذي يسألني فأعطيه، من ذا الـذي يـستغفرني فـأغفر لـه، فـلا يـزال كـذلك حتـى يـضئ الفجر)) واتە: خـوای گـەورە هـەموو شـەوێك دادەبەزێتـە ئاسمـانی دونیـا کـاتێ کـە یەکەم سێیەکی شـەو دەڕوات، دەڵێـت: مـن پادشـام مـن پادشـام، کـێ هـاوارم پـێ دەکات و بانگم دەکات تاکو وڵامی بدەمەوە، کێ داوام لێ دەکات تـاکو پێـی بـدەم، کێ داوای لێخۆشبوونم لـێ دەکـات تـاکو لێـی خـۆش بم، بـەردەوام وا دەبێـت تـاکو گزنگ دەردەچێت)) .

لە (صحیح مسلم)[1] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (ابی موسی الاشعری)ەوە کـەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی ((إن الله يبسط يده بالليل ليتوب مسئ النهار ويبسط يده بالنهار ليتوب مسئ الليل حتى تطلع الشمس مـن مغربهـا ))، واتـە: خـوای گـەورە شەوانە دەستەکانی فراوان دەکاتەوە بـۆ ئـەوەی لـە تاوانکـاری ڕۆژ خـۆش بێـت وە ڕۆژانە دەستەکانی فراوان دەکاتەوە بۆ ئەوەی لە تاوانکاری شەو خـۆش بێـت تـاکو ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە دەردەچێت)) ئەمەیشە نیشانەیەکە لە نیشانەکان کە لە پاشان بـە درێژی باسی دەکەم انشاء الله .

هەروەها هەرکەسێ تاوانی گـەورەی زینـا ئـەنجام بـدات...پاشـان بیـەوێ تەوبـە بکـات و بگەڕێتـەوە بـۆ لای خـوا... پەشـیمان بـووەوە وازی لـە تاوانەکـەی هێنـا و کرداری چـاکەی ئـەنجام دا ئـەوا خـوای گـەورە وەری دەگرێـت ... چـونکە بـەڵێنی داوە... پێغەمبەرەکەی ﷺ بەڵێنی داوە... ئەو کەسەی کە هەرگیز لـە خـۆ وە قـسە ناکات ...

لەگەڵ مندا بیر بکەرەوە لەم ریوایەتە خـۆش و شـیرینە ... هـەروەکو (ئیمـامی مسلم)[2] ریوایەتی کردووە و دەڵێـت: (مـاعز ی کـوڕ مالـك) هـات بـۆ لای پێغەمبـەری خوا ﷺ و فەرمووی: ((يا رسول الله ! طهرني)) واتە: ئەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ پـاکم بکەرەوە) پێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرمووی: ((ويحـك ارجـع فاسـتغفر الله، وتـب إليـه )) واتە: ((تیابچیت.. بگەڕێوە... داوای لێ خـۆش بـوون لـە خـوا بکـە و تەوبـە بکـە))

---

١ـ أخرجه مسلم، كتاب ((التوبة))، باب ((قبول التوبة من الذنوب و إن تكررت الذنوب و التوبة)) (٢٧٥٩).
٢ـ أخرجه مسلم، كتاب ((الحدود))، باب ((من أعترف على نفسه بالزنا)) (١٦٩٥).

صەلات و سەلام لەسەر ئەو ڕەحمەتە بە دیاری نێردراوە ئەو نیعمەتە بەخشراوە، بزانە کە ئیسلام تینووی خوێن ڕشتن نییە هەروەکو چۆن دوژمنان تۆمەتباری دەکەن، ئەویش دەڕوات بەلام زۆر دوور ناکەوێتەوە و جارێکی تر دەگەڕێتەوە و دەڵێت: ((یا رسول الله طهرني)) بۆ جاری دووەم؟ بەڵێ بۆ جاری دووەم، ئەی پێغەمبەری خوا(ρ)چی بە ئەو فەرموو ؟! فەرمووی: ((ويحك ارجع فاستغفر الله، وتب إليه )) واتە: ((تیابچیت.. بگەڕێوە... داوای لێ خۆش بوون لە خوا بکە و تەوبە بکە)) ئەویش دەڕوات بەلام زۆر دوور ناکەوێتەوە و جارێکی تر دەگەڕێتەوە و دەڵێت: ((یا رسول الله طهرني)، بۆیە پێغەمبەری خواﷺ بۆ جاری سێیەم پێی فەرموو: ((ويحك ارجع فاستغفر الله، وتب إليه )) سێ جار لەسەر یەك، چونکە پێغەمبەرﷺ هەمووی میهرەبانییە هەمووی ناسك و نەرمییە، سۆز و خۆشەویستییە، سوێند بە خوا ئەگەر (ماعز ی کوڕی مالك) بگەڕایەتەوە و داوای لێخۆشبوونی لە خوا بکردایە و تەوبەی بکردایە ئەوا خوا لێ ی خۆش دەبوو، ئەوەتا خوای گەورە لە حەقی پێغەمبەرەکەیداﷺ دەڵێت: ﴿بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ التوبة: ١٢٨، واتە: بەرامبەر بە بڕواداران زۆر دڵسۆز و بە بەزەیی و دلۆڤانە)) . من لێرەدا جەخت لەسەر ئەم بەشە دەکەم چونکە ئێمە زۆر جار دەبیسین گوایە کە ئیسلام دینێکە هەردەم تینووی خوێنە ! نەخێر، ئەوە دینێکە کە زۆر ڕێز لە خوێن دەگرێت وە ڕێز لە ژیان دەگرێت – لە پێشدا باسی ئەوەم بە درێژی کرد– وە تکام لای خوا ئەوەیە کە لەم ئوممەتەدا کەسانێك هەبن کەوا ئەم چەند وشەیەم بگۆڕنە زمانەکانی تر چ بە نوسراوی یان بە بیستراوی بۆ ئەوەی ئەهلی ڕۆژهەلات و ئەهلی ڕۆژئاوا بیخوێننەوە، داوا لە خوای گەورە دەکەم کە خەڵکی ڕێنمووی بکات بۆی، هەر خۆی پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە... ئەوەتا پێغەمبەری خواﷺ بە (ماعز ی کوڕی مالك) سێ جار دەفەرموێت: ((ويحك ارجع فاستغفر الله، وتب إليه)) ئەویش زۆر دوور نەکەوتەوە و دیسان گەڕایەوە – بۆ جاری چوارەم – فەرمووی: ((یا رسول الله طهرني )) ئەم پیاوە دان بە تاوانەکانی خۆیدا دەنێت – وە دان پیانانیش گەورەی بەڵگەکانە

هەروەكو دەڵێن – پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی ((مم أطهرك؟))واتە: لە چی پاكت بكەمەوە؟)) فەرمووی: ((من الزنا) واتە: لە ئەنجامی زینا كردن)).. پێغەمبەری خواﷺ لێی پرسی: ((أبه جنون ؟)) واتە: ئایا ئەم كابرایە هیچ شێتییەكی تێدایە؟)) بۆیە پێیان راگەیاند كە هیچ شێتییەكی تێدا نییە – وتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خواﷺ كەواتە ئەم پرسیارە بەسە، بەلام پێغەمبەری خواﷺ پرسیارێكی تری كرد و فەرمووی: ((أشربت خمرا)) واتە: ئایا عارەقت (مەی)ت خواردووەتەوە))، سەر خۆشی كردبێتی و نەزانی چی دەڵێیت؟ بۆیە پیاوێك هەستاو بۆنی دەمی ئەوی كرد كەچی بۆنی عارەقی لە ئەوەوە نەبیست فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ عارەقی نەخواردووەتەوە، لە پاش هەموو ئەوانە پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((أزنيت؟))، واتە: ئای تۆ زینات كرد؟)) فەرمووی: بەڵێ، بۆیە پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی كرد و بەردباران كرا، خەڵكەكە دەربارەی ئەو بوونە دوو بەشەوە هەندێكیان دەیانگوت: ماعز لەسەر خراپترین كارەكانیدا تیاچوو وە تاوانەكانی دەورەیان لێ گرتبوو، هەندێكیان دەیانگوت: هیچ تەوبەیەك لە تەوبەكەی ماعز باشتر نەبووە كە خۆی هات بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ و دەستی خستە نێو دەستی و ئەمجار وتی: بە بەرد بمكوژن، دەڵێت: بەو شێوەیە دوو سێ رۆژ مانەوە، ئەمجار پێغەمبەری خواﷺ هات بۆ لایان، لە كاتێكدا ئەوان دانیشتبوون، سڵاوی لەوان كرد و دانیشت و فەرمووی: ((استغفروا لماعز بن مالك))واتە: داوای لێخۆشبوون بۆ ماعزی كوڕی مالك بكەن)).

ئەم پیاوە زینای كردووە، سنووری شەرعی بە سەردا جێ بە جێ كرا بە فەرمانی پێغەمبەری خواﷺ بەلام پێغەمبەری خواﷺ خودی خۆی فەرمان دەكاتە هاوەڵانی، كە داوای لێخۆشبوونی بۆ بكەن ... بەڵێ براكەم ... من و تۆ مرۆڤین... بۆیە تەماشای خەڵكی مەكە بە تەماشا كردنێكی وشك و ڕەقەوە... وا دەزانی خۆت هیچ كەم و كورییەكت نییە و لە هەموو تاوانێك پاك كراویتەتەوە، كۆتاییت بۆ خۆت دەستەبەر كردووەو بە دەستت هێناوە!! نەخێر سوێند بە خوا... دڵنیا بە كەماڵەكەی من لە شووشە دروست كراوە وە ماڵەكەی تۆیش لە شووشە دروست

کراوه... ئەگەر هەرکەسێ ماڵەکەی لە شووشە دروست کرابوو ئەوا نابێت بە هیچ شێوەیەك (ئەگەر عاقڵ بێت) بەرد لە خەڵکی بگرێت و، ئێمە لە فریشتە نزیککراوەکان نین... تەنها خوا خۆی دەزانێت کە کۆتایی هەر یەکێك لە ئێمە چۆن دەبێت (داوا لە خوا دەکەم کۆتایی من و ئێوە و هەمووان بە باوەڕەوە بێت) خاوەن دڵە گەورەکان زۆر بە کەمی جێگای ناحەزی و توند و تیژی و تۆڵە سەندنەوەی تیادا دەبێتەوە، چونکە ئەوانە لەو جۆرە دڵەن کە پڕن لە میهرەبانی و نەرم و نیانی و ناسکی، بۆیە تەماشای خەڵکی تر مەکە بە تەماشاکردنێکی ناحەزی و توندو تیژییەوە... خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِىٌّ حَمِيمٌ ﴾ فصلت: ٣٤، واتە: ئەوسا ئەبینی ئەو کەسەی کە لە نێوان تۆ و ئەودا دوژمنایەتییە، وای لێ دێ دەڵێی دۆستێکی نزیك و بە سۆزە)).

ئەوەتا جادوو بازەکانی فیرعەون لەو کات و ساتەدا دەیانگوت ﴿بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴾ الشعراء: ٤٤، واتە: بە یارمەتی و دەسەڵات و توانای فیرعەون ئێمە بە سەر مووسادا زاڵ ئەبین و دەیبەینەوە)) لە یەك ساتدا، کاتێك دڵەکانیان بە روناکی یەکتاپەرستی و باوەڕ روناك بووەوە و گەڕانەوە بۆ لای خودای بەخشندە و میهرەبان و سوژدەیان بۆ پەروەردگارەکەی موسا و هارون برد وە بە فیرعەونیان گوت ئەو وشە نەمر و یەکلایی کەرەوە ((لا ضَيرَ))واتە: چی دەکەی بیکە, لە پەند و نموونەی زاراوەی خۆمان (مەبەستی میسرییە) دەڵێن: ((أعلى ما في خيلك أركبه)) واتە: لە وڵاخەکەی خۆت بەرزتر سواربە)) چونکە دڵەکان تام و چێژ و شیرینی باوەڕی چەشت... دڵنیایی و باوەڕیان زیاتر و بتەوتر بوو بە بەڵێنەکەی خواکەیان... بۆیە چیتر جگە لە ئەو لە کەسی تر ناترسن...

ئەوەتا لێرەدا پێغەمبەری خواﷺ بە هاوەڵە پاکەکانی وەکو (أبوبکر و عمر و عوسمان و عەلی و ئەوانیتر)) دەفەرموێت: ((استغفروا لماعز بن مالك)) ئەوانیش فەرموویان: خوا لە ماعز ی کوڕی مالك خۆش بێت ..)) جا ئەوان نەیانگوت: چۆن داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەین لە کاتێکدا ئەو زینای کردووە ئەی پێغەمبەری خواﷺ

؟ نەخێر وایان نەگوت... چونکە ئەوە فەرمانی پێغەمبەرایەتییە... ئەمجار خۆشەویستمانﷺ فەرمووی: ((لقد تاب توبة لو قسمت بین أمة لوسعتها))، واتە: بە راستی ئەو تەوبەیەکی کردووە ئەگەر دابەش بکرایەتە سەر ئوممەتێکدا ئەوا بەشی هەمووی دەکرد)).

دەڵێت: ئەمجار ئافرتێك لە (غامد لە الازد) واتە: غامدی بوو، هات بۆ لای و وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! پاکم بکەرەوە . ئەویش فەرمووی: ((ویحكِ ارجعي فاستغفري الله، وتوبي إليه)) واتە: تیابچیت... بگەڕێوە و داوای لێخۆشبوون لە خوا بکە و لای خوا تەوبە بکە)) ئەویش فەرمووی: ((لعلك ترید أن ترددني كما رددت ماعز بن مالك)) واتە: رەنگە بتەوێت بمگەڕێنیتەوە هەروەکو چۆن ماعز ی کوڕی مالك ت گەڕاندەوە)) فەرمووی: ((وما ذاك ؟)) واتە: ئەوە چییە؟ ((قالت: إنها حبلی من الزنا)) وتی: ئەو لە ئەنجام ئەو زینایە ئێستا دووگیانە(سکی پڕە) ؟)) ئەمجار ئەو رەحمەتە بە دیاری نێردراوە و نیعمەتە بەخشراوە فەرمووی: ((أرجعي حتی تلدي)) واتە: بگەڕێوە تاوەکو منداڵەکەت دەبێت .)) ئەویش گەڕایەوە تاکو منداڵەکەی بوو ئەمجار منداڵەکەی لە گەڵ خۆیدا لە نێو پەڕۆوپاڵەیەکدا هێنا بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ و فەرمووی: ((ها هو یا رسول الله قد ولدته))، واتە: ئەوەتا ئەی پێغەمبەری خواﷺ منداڵەکەم بوو)) ئەو ئافرەتە نەچوو پاسەپۆرتێکی ساختە دروست بکات ! هەڵنەهات بۆ هاندەران ! بەڵکو ئەو خۆی بە پێی خۆی هات، ئایا ئەو ڕەحمەتە نێردراوە چی بە ئەو فەرمووی؟ فەرمووی: ((ارجعي فأرضعیه حتی تفطمیه)، واتە: بگەڕێوە وشیری بدەیە تاکو لە شیر دەبڕێتەوە)) ئەو دەبێ دوو ساڵ شیر بەو منداڵە بدات ! ئایا ئەمە ئەو ئیسلامەیە کە تینووی خوێن ڕشتنە!؟ –ئەی بانگەوازکارانی دروستکردنی گومان و دوودڵی بیخوێننەوە – ((فجاءت بە وقد فطمته، وفي یده شئ یأكله، فأمر الصبي، فدفع الی رجل من المسلمین و أمر بها فحفر لها و أمر بها فرجمت)) واتە: لە پاش دوو ساڵ دیسان هێنایەوە، لە کاتێکدا لە شیر براوەتەوە و شتێکی بە دەستەوەیە خەریکە دەیخوات . ئەویش فەرمانی کرد و منداڵەکەیان دا بە دەست کابرایەکەوە لە موسڵمانان، ئەمجار فەرمانی کرد و چاڵیان

بۆ کرد و بەرد بارانیان کرد...))

ئەو ئافرەتە هەر ئەو ئافرەتەیە...لە پاش دوو ساڵ هەڵنەهات و رابکات، چونکە پێغەمبەری هەڵبژێردراو ﷺ ئەوانی لەسەر چاودێری پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکان پەروەردە کردووە نەك لەسەر چاودێری یاسای ئێرە و ئەوێ یان لەسەر چاودێری خوودی خۆی (دایك و باوکم و روحم بە فیدای بێت)) هەرگیز ...

بەڵکو ئەوانی فێر کردوون لەسەر چاودێری ئەو پەروەردگارەی کە نەمرو زیندووە و هەرگیز نامرێت .

چەند پێویستمان لەو جۆرە وانانە هەیە!! دەمەوێت لە هەموو موسڵمانێك چاودێری خواکەی بکات، ئەو خوایەی کە دەبینێ و دەبیسێ... دڵنیابە کە خوا هەموو قسەو هەناسەکانت دەبیسێ هەرچەندە بە تەنها بیت... هەموو کردەوەکانت دەبینێ هەرچەندە بە تەنها بیت... بۆیە چاودێری یاسا مەکە بەڵکو چاودێری پەروەردگاری جیهان بکە.

اذا ما خلوت الدهر يوماً فلا تقل خلوت ولكن قل عليَّ رقيب

ولا تحسبن الله يغفل ساعة و لا أن ما تخفي عليه يغيب

واتە: ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان بە تەنها بوویتەوە مەڵێ، بە تەنهام بەڵکو بڵێ چاودێرێك وا بە سەرمەوەیە، هەرگیز وا مەزانە خوا تەنها ساتێك بێ ئاگا دەبێت یان شتێکی لێ بشاردرێتەوە و ئەو لێی بێ خەبەرە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَـٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟﴾ المجادلة:٧، واتە: ئایا نەتزانیوە کە خوا دەزانێ چی لە ئاسمانەکان و زەویدایە؟ هەر سێ کەسێك لە گەڵ یەکتردا چپە بکەن خوا چوارەمینیانە، هەر پێنج کەسێك چپە بکەن خوا شەشەمیانە وە لەو ژمارانەش کەمتر یا زۆرتر لە هەر کوێدا بن هەر خوایان لەگەڵە، واتە: ئەوانە هەر چەند ببن،

هەرچی بکەن، هەرچی بڵێن، لە هەر شوێنێکدا بن خوا لەگەڵیانەو ئاگای لەهەموو شتێکیانە)).

جا ئەو خوایە لە گەڵیاندایە لە هەر کوێیەك بن بە زانیاری و بینین... بۆیە قەبارە و جەستە بۆ خودا دامەنێ (لا تجسم) مەیچوێنە بە هیچ شتێك (لا تشبه): ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴾ الشوری:١١، واتە: هیچ شتێك نییە لە وێنەی ئەو(خوا) یە ئەویشە بیسەری بینا بە ئاگایە بە وتەی بەندەکانی بینایە بۆ کار و کرداریان)).

لە پاش دوو ساڵ ئەو ئافرەتە (غامدی)یە هاتەوە، بۆ ئەوەی پێغەمبەری خواﷺ سنووری لەسەر جێ بە جێ بکات وە فەرمانی کرد بەرد باران بکرێت، خالد یەکێك بوو لەوانەی کە بەرد بارانی دەکرد، بۆیە بەردێکی لێدا و دڵۆپێك لە خوێنەکەی کەوتە سەر گۆنای بۆیە ئەویش جوێنی پێدا، جا پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((مهلا یا خالد، فوالذي نفسي بیده لقد تابت توبة لو تابها صاحب مکس لغفر له... ثم أمر بها فصلى علیها و دفنت)) واتە: لە سەرخۆبە ئەی خالد، سوێند بێ بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ئەو بە ڕاستی تەوبەیەکی کرد ئەگەر خاوەنی (مکس: باج) ئەو تەوبەی بکردایە ئەوا خوا لێی خۆش دەبوو ئەمجار فەرمانی کرد نوێژیان لەسەر کرد و ناشتیان)) بەڵێ پاشان پێغەمبەری خواﷺ لە سەری نوێژ دەکات وە بەڵگەیش لەسەر ئەوە لە (صحیح مسلم)[1] دا هاتووە کە عومەری کوڕی خەتتاب پرسیار دەکات لە پێغەمبەری خواﷺ و دەڵێت: ((یا رسول الله أتصلي علیها وقد زنت! ؟ فقال النبيﷺ ((لقد تابت توبة لو قسمت بین سبعین من أهل المدینة لوسعتهم، وهل وجدت توبة أفضل من أن جادت بنفسها لله تعالى ؟)) واتە: ئەی پێغەمبەری خواﷺ نوێژی لەسەر دەکەیت لە کاتێکدا ئەو زینای کردووە ؟! پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: بە ڕاستی ئەو تەوبەیەکی کردووە ئەگەر دابەش بکرایەتە سەر حەفتا کەس لە ئەهلی مەدینەدا ئەوا بەشی دەکردن، ئایا هیچ

١ـ أخرجه مسلم، کتاب((الحدود))، باب ((من أعترف على نفسه بالزنا)) (١٦٩٦).

تەوبەیەکی لەوە باشتر دۆزییەتەوە کە بە بێ پێچ و پەنا خۆی ببەخشێتە خوای گەورە)).

بەڵگە لەسەر ئەم بابەتە روون و ئاشکرایە... هەرچەندە لە وڵامی ئەم پرسیارە ترسناکەدا درێژەم پێدا بەڵام هۆکارەکەی ئەوەیە کە دەرگای تکا کردن بکەمەوە بۆ تاوانباران و کەمتەرخەمان ..(هاوشێوەکانی من) بۆ ئەوەی رووبکەنە خوای پەروەدگار... تەنانەت ئەگەر کەوتونەتە ناو تاوانی گەورەی کوشتنەوە، دەستەکانت لە خوێنی حەرام پاك بکەرەوە... دڵەکەت پاك بکەرەوە لەو باوەڕە پووچ و ناڕەوایە... هەروەها تاوانی گەورەی زینا ئەوا ئەندامەکانت پاك بکەرەوە و دامێنت بپارێزە و ئەوەی کە لە سەرتە تەوبە و گەڕانەوە و پەشیمان بوونەوەیە... گەڕانەوە بۆ لای خوای پەروەدگار... دڵنیابە کە ئەگەر بەندەیەك گەڕایەوە بۆ لای خوای گەورە و تەوبەیەکی راستی کرد ئەوا خوای گەورە تەوبەکەی لێ وەردەگرێت...

ئەم باسە بە هەڵویستێکی کاریگەر کۆتایی پێ دەهێنم ..رۆژێك لە جێگایەکی گشتیدا بووم گەنجێك رووی لێ کردم وە سوێندی بۆ خواردم بە خوا کە ئەو منی خۆش دەوێ ئەمجار دەستی بە گریان کرد... گوتم: برا خۆشەویستەکەم بۆ دەگری؟ فەرمووی: سوێند بەخوا ئەی مامۆستا... خوای گەورە تۆی کردە هۆی هیدایەت دان و تەوبەکردنم، گوتم: سوپاس بۆ خوا، ئەی خودایە کردەوەکانمان تەنها لە بەر خاتری تۆ ئەنجام بدەین... کردەوەکانمان لێ وەربگرە و لە ریا و دووڕوویی دوورمان بکەرەوە... راستگۆییمان بە نسیب بکە... لە کردار و کردەوە و هەموو حاڵەتێکدا...خودایە بەش و پشکمان لەدینەکەماندا تەنها قسەکردن نەبێت و کردار و نیەتمان پاك بکەرەوە ئەی پەروەردگاری هەموو جیهان... ئەمجار گوتم: پێم بڵێ... برا خۆشەویستەکەم... ئەمجار ئەویش دەستی بە قسەکردن کرد و باسی ئەوەی کرد کە هیچ خوانێك نەبووە ئیللا لە پێش ئەوەی ئاو دابنێن عارەقیان دادەنا، ئەمجار گوتی: نوسینگەیەکی گەورەم هەبوو و بەشێکی تایبەتی تیادا بوو تایبەت بە زینا... باسی بۆ کردم کە فەرمانبەرێکی تایبەتی بۆ ئەو مەبەستە دامەزراند بوو بۆ ئەوەی جوانترین کیژۆڵە و کچی بۆ بهێنێ (خودایە خێزان و کچ و

خوشـكەكانمان داپۆشـە و بیانپـارێزە و گەنجـەكانمان چاكـساز بكـە و ڕێنمـویی منداڵەكانمان بكە و دامێنمان بپارێزە یا أرحم الـراحمین ..) ئـەمجار پێـی گـوتم: لـە شەوی سێیەمی ڕەمەزانێك لە ڕەمەزانەكانی پێشوو گوێی لە هەندێ خەڵكی بـوو لـە دەرەوە نوێـژی تـەراویحیان دەكـرد و دەڵێـت: منـیش سـەرم بـادەدا و گاڵتـەم بـەو دەروێشانە دەكرد وە لە دڵی خۆمدا دەمگوت: ئەوانە چین؟ چیان بە سەر هـاتووە؟ چی دەكەن؟ سوێندی بۆ خواردم بە خوا كە لە تەمەنیدا تەنها یەك كرنۆشی بۆ خـوا نەبردووە، من وا هەستم كرد كە تەمەنی لە سی و پێنج سـاڵ تێپـەڕیوە لـە كاتێكـدا كە ئەو لە خێزانێكـی ناسـراوە و پایـەدارە... (داوا لـە خـوا دەكـەم كـە لـە دونیـا و قیامەتدا دامان پۆشێت) پێی گـوتم: لـەم شـەوەدا كـچێكی جوانكیلـەیان بـۆ ئامـادە كردم بەڵام لە پاش ئەوەی زینای لە گەڵدا كرد هیچ تام و چێژێكی لێ وەرنەگرت... بۆیە فەرمانی كردە ئەو فەرمانبەرەی كە تایبەتە بۆ ئەو مەبەستە بچێت بـۆ ئـەوەی یەكێكی جوانتری بۆ ئامادە بكات... گوتی: دەرچووە دەرەوە... منیش (ریمـوت)ی تەلەفزیونەكەم گرتە دەستەوە... بەردەوام بە دوای كەناڵێكدا دەگەڕام... دەرباری فلیمێكی خراپ و ئابڕوبـەر... بـۆ ئـەوەی كاتەكـەی خـۆی لـە گەڵـدا بـە سـەر ببـات تاوەكو ئەو كچەی بۆ ئامادە دەكەن ... دەڵێت: سـبحان اللە... لـە كاتێكـدا لـە نێـو كەناڵەكاندا دەگەڕام... لـە ناكـاو ڕووی تـۆم لەسـەر شاشـەكە بـینی... گـوتم: چـی شتێك ئەمـەی بـە هەڵـە هێناوەتـە ئێـرە؟ بـەڵام چـركەیەك چـاوەڕوان بـووم... دوو چركە... دە چـركە... لـە كاتێكـدا مـن تەماشـای وێنەكـەتم دەكـرد... ئـەو دیمەنـە دەبینم... ریش و ئامۆژگاری لەسەر شاشەی تەلەفزیونەكە... لە دڵی خۆمـدا گـوتم: هیچ سوودی نییە ئەمە لێرە بێت... گوتم: چارەكە خولەكێك بە سـەر منـدا تێپـەڕی ئەمجار نیو خولەك... لە كاتێكدا (ریموت) ەكە بە دەسـتمەوەیە... ئـەمجار هەسـتم كرد كە گوێ دەگرم... گوتم: ئەوا خوا ویستویەتی گوێ بگری و هیدایەت و چـاكەی بۆ تۆ ویستووە ... دەڵێـت: بـۆ مـاوەی یـەك خولـەك گـوێم دەگـرد... ئـەمجار سـێ خولەك پاشان (ریموت) ەكەم دانا و دەستم بـە گریـان كـرد... پێـی گـوتم: وانەكـە (محاضرة) ەكە بە ناونیشانی (ترسناكی زینـا) بـوو... ئـەی خودایـە!! تەقـدیرێكی پەروەدگاری بوو... كە هـیچ كەسـێك هـەرگیز ناتوانێـت ڕێكـی بخـات... وانەكـە لـە یەكێ لە دەوڵەتەكانی كەنداو بوو... ڕاسـتەوخۆ پـەخش دەكـرا... لـە كاتێكـدا ئـەو

کەناڵەکانی ئەم دیو ئەو دیو دەکرد ... خوای زەوی و ئاسمانەکان ویستی کە گوێی لەو وانە بێت لە لایەن بەندەیەکی هەژارەوە بۆ پادشای بە توانا... دەڵێت: چل خولەك گوێم لەو وانەیە بوو... لە کاتێکدا خۆی یەك کاتژمێر بوو وە لە گەڵ خۆیدا قسەی دەکرد و دەڵێت: دەستم بە گریان کرد و وات دەزانی کە لە ژیانمدا هەرگیز نەگریاوم... وە چووە ژوورەوە بۆ نوسینگە تایبەتەکەی خۆی و خۆی شێت و لەش گرانی لەسەر خۆی لادا لە ئەنجامی زیناکەیدا... بۆ یەکەم جار... لە پاش کەمێك فەرمانبەرەکە هاتە ژوورەوە و کچێکی جوانی ئامادە کردبوو... فەرمانبەرێکی تری لە گەڵدا بوو... تەماشای نوسینگەکەیان کرد... کەچی کەسیان نەبینی پاشان تەماشایان کرد کابرایەك لە سوژدەدایە لە بەر دەستی خوای بەرز و باڵادەستدا... دەگری بە کوڵ، فرمێسك لە چاوەکانی دێتە خوارەوە باوەڕیان نەدەکرد... کوا فلان؟ زۆر ئەستەمە ئەم کابرایە کە لە سوژدەدایە ئەو بێت !! ئەی من بە ئێوەم نەگوت ﴿ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِىٌّ حَمِيمٌ ﴾ فصلت:٣٤، واتە: ئەوسا ئەبینی ئەو کەسەی کە لە نێوان تۆ و ئەودا دوژمنایەتییە، وای لێ دێ دەڵێی دۆستێکی نزیك و بە سۆزە)).

براکانم .... (ئیمامی مسلم)[1] ریوایەتی کردووە لە (عبد الله ی کوڕی عمرو ی کوڕی العاص)) دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (إن قلوب بني آدم كلها بين إصبعين من أصابع الرحمن . كقلب واحد يصرفه حيث يشاء)) واتە: دڵی مرۆڤەکان هەمووی لە نێوان دوو پەنجەیە لە پەنجەکانی خوای میهرەباندا،کو تەنها دڵێکە هەرچۆن بیەوێ ئەمدیو ئەودیوی دەکات)) ئەمجار پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((اللهم مصرف القلوب صرف قلوبنا على طاعتك)) واتە: ئەی خودایە ! ئەی ئەو کەسەی دڵەکان ئەم دیو ئەودیو دەکەی دڵەکانمان لەسەر گوێڕایەڵی خۆت دامەزراو بکە)).

دڵ وەکو ژوورێکی تاریك وایە... کە دەچیتە ژوورەوە دەبینی تاریکییەکی سەخت و هیچی تیادا نابینیت... هەست بە دیوارەکانی دەکەیت... هەر کە دەستەکانت بدات لە کلیلی روناکییەکەی وە فشاری بخەیتە سەر و دەستی پیادا

١ـ أخرجه مسلم، كتاب القدر، باب تصريف الله تعالى القلوب كيف شاء (٢٦٥٤).

بنێیت بە ناسکی ئەوا روناکی ئەو گڵۆبە هەموو تاریکییە سەختەکە دەکاتە روناکییەکی زۆر...هەروەها دڵەکان دەبێتە روناکییەکی زۆر بە فەزڵی خوای بەرز و بەڕێز... بە فەزڵی ئەو کەسەی کە دڵەکان بە دەستی ئەوە... کاتێ کە چوونە ژوورەوە بۆ لای بر اکەمان لە کاتێکدا ئەو لە سوژدەدایە... گوتیان: ئەی فلان... مەسەلەکە چییە؟ چی روویداوە؟ تۆ لە پێش کەمێك...!! (دەستی بە گریان کرد) بە ئەوانی گوت: سوێند بە خوا رووداوەکە بەم شێوەیە بوو... پرسیاریان لێ کرد دەربارەی ئەو کچە جوانە کە ئامادەیان کردووە... کەچی ئەو گوتی: نەخێر... هەموو شتێك کۆتایی پێهات... ئەی خودایە...!! بە راستی دڵەکەی تامی شیرینی باوەڕی چەشت... خۆشی ئیمان چووە دڵییەوە... بۆیە کچەکە رۆیشت... چونکە چیتر ئەم پێویستی بە ئەو نەما... سوێندی بۆ خواردم کە ئەم رووداوە لە سێیەم شەوی ڕەمەزاندا بوو... لە پێنجەم رۆژی رەمەزاندا من و خێزانەکەم رۆیشتین بۆ مەککە بە مەبەستی عەمرە و دەڵێت: لەو شەوەوە دەستم بە نوێژ کردووە و وازم لێ نەهێناوە بە فەزڵی خوای بەرز و باڵادەست.. پاشان موژدەیەکی تری پێدام.. موژدەیەکی شیرین... گوتی: (لە کاتێکدا سوێندی بۆ دەخواردم بە خوا) کە لەو کاتەوە نزیکی هیچ ئافرەتێك نەکەوتووە بە مەبەستی خراپەکاری... بە راستی فەزڵی خوایە دەیداتە هەرکەسێ کە خۆی ویستی لەسەر بێت وە خوای گەورە خاوەنی فەزڵی گەورەی مەزنە... بۆیە براکەم... هەرگیز بێ ئومێد مەبە لە ڕەحمەتی خوا... هەرگیز بێ هیوا مەبە لە ڕەحمەتی خوا... هەر لە ئێستاوە دڵت بە شکاوی و زەلیلی یەوە فرێ بدە بەر دەستی خوای گەورە... دان بنێ بە هەژاری خۆت بەرانبەر بە ئەو ... دان بنێ بە لاوازییەکەتدا وە دان بنێ بە کەم توانایی و کەم تەرخەمی و هەڵەکانتدا و بڵێ ...

بك أستجير ومن يجير سواك ... فأجر ضعيفاً يحتمي بحماك
إني ضعيف أستعين على قوي ... ذنبي و معصيتي ببعض قواك
أذنبت يا ربي و قادتني ذنوب ... ما لها من غافر إلاك
دنياي غرتني و عفوك شدني ... ما حيلتي في هذه أو ذاك
لو أن قلبي شك لم يك مؤمناً ... بكريم عفوك ما غوى و عصاك

ربـاه هـا أنـا ذا خلصت من الهوى     واسـتقبل القلـب الخلـي هـداک
ربـــاه قلـــب تائـــب ناجـــاک     أتـــرده وتـــرد صـــادق تـــوبتي
حاشـاک تـرفض تائبـا حاشـاک     فليرض عني الناس أو ليسخطوا
أنا لم أعد أسعى لغير رضاک

واتە: پەنا دەگرم بە تۆ، جگە لە تۆ کێ پەنا دەدات؟ بۆیە پەنای لاوازێك بدە کە داڵدەی داوەتە داڵدەکەت، من کەسێکی لاوازم و پەنا بە کەسێکی بەهێز دەگرم، لـە تاوان و سەرپێچییەکانم بە هەندێ لە تواناکەت، من تاوانم ئەنجامـدا ئـەی خودایـە و تاوانەکانم رێنوینیم دەکەن  کە هیچ کەسێك نییە لێی خۆش بێت جگە لە تۆ نەبێت، دونیاکەم مەغروری کردم و لێخۆشبوونی تۆ رایدەکێشام، هیچ دەسـەڵاتی مـنی تێـدا نییە نەلە ئەمیاندا و نەلە ئەویتردا، ئەگەر دڵم گومانێك بکات ئەوا ئیماندار نییـە، بـە خانەدانی لێخۆشبوونەکەت هەرگیز وێڵ نەدەبوو و سەرپێچی نەدەکرد، پەروەردگارا ! ئەوەتا من خۆم لە ئارەزوو پاك کردەوە، دڵم پێشوازی لە هیدایەتە پاکەکـەی تـۆ دەکات، پەروەردگارا ! دڵی تەوبەکارێك هـاوارت لـێ دەکـات، ئایـا تـۆ دەیگێریتـەوە تەوبە ڕاستەکەم دەگەڕێنیتەوە، زۆر دوورە لە تۆوە کە تەوبەکارێك وەرنـەگریت زۆر دوورە دەبا خەڵکی لـێم رازی بێـت یـان پەسـت بن،چـیتر مـن هـەوڵ نـادەم لەجگـە لەرازی بوونی تۆ.

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيُدۡخِلَكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ يَوۡمَ لَا يُخۡزِي ٱللَّهُ ٱلنَّبِيَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥۖ نُورُهُمۡ يَسۡعَىٰ بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَبِأَيۡمَٰنِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا وَٱغۡفِرۡ لَنَآۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ التحريم:٨، واتە: ئـەی ئەوانـەی باوەڕتان هێناوە ! بگەڕێنەوە بۆ لای خوا بە تەوبەو گەڕانەوەیەکی یەکجاری، واتـە: بە شێوەیەك، ئیتر جارێکی تر نەگەڕێنەوە سەر ئەو تـاوان و گوناهانـە، لـە پێـشەوا (عومەر) یان پرسی: تەوبەی (نەسووح)چییە ! فەرمووی: تەوبەی (نەسووح) ئەوەیە کە ئەو کەسە تاوانکارە لە تاوانەکانی پەشیمان ببێتەوە و جـارێکی تـر نەگەڕێتـەوە

سەریان، چۆن شیر هەر کە لە گوانی ئاژەڵەکە هاتەدەر جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ گوانی ئاژەڵەکە، دڵنیابن – ئەگەر تەوبەی ئاوا بکەن – پەروەردگارتان لە گوناهەکانتان خۆش دەبێت، دەتانباتە ناو چەندین باخی بەهەشتەوە کە لە ژێر بنکی دار و درەختەکانیانەوە ئاو و رووبار بە خوڕم دەڕوات، لەو ڕۆژەدا (ڕۆژی قیامەت) خوا پەیامبەر و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ریسوا و سەر شۆڕ ناکات لە بەردەمیانەوە و لە لای راستیانەوە بە سەر پردی (صراط)دا پێی دەڕۆن و دەڵێن: پەروەردگاری ئێمە ! نوور و روناکییەکەمان بۆ تەواو بکە و بەردەوام بێت و لێمان خۆش ببە بە راستی تۆ بە سەر هەموو شتێکدا بە توانایت .))

رێزداران... لە نیشانەکانی قیامەت... ((أن تلد الأمة ربتها)) لە گوتەیەکی تردا ((أن تلد الأمة ربها)) ئەمە مانای چییە ؟؟ ئەمە لە بەشی داهاتوو باسی دەکەین انشاء الله... داوا لە خوا دەکەم تەوبەمان لێ وەرگرێت و ئێمەیش تەوبەی لا بکەین... لە تاوانەکانمان خۆش بێت و کەم و کورییەکانمان داپۆشێت... کێشەکانمان لەسەر ئاسان بکات... هەر خۆی پشت و پەنامانە و بە توانایە بە سەر هەموو شتێکدا...

## لە نیشانەکانی قیامەت

# أن تلد الأمة ربتها...

مانای ئەم نیشانەیە چییە؟ مانای ئەوە چییە کە دەفەرموێت ((أن تلد الأمة ربتها أو ربها))؟ لە گەڵ مندا بیر لەم فەرموودەیە بکەرەوە کە بەشێکە لە فەرموودەیەکی درێژی جبریل لە ((صحیح مسلم))[1] دا هاتووە وە من باسی فەرموودەکە بە درێژی دەکەم لە بەر شیرینی و شکۆمەندی فەرموودەکە وە لە بەر پەند و ئامۆژگارییەکەی ... کە چەند زۆرن !! بۆ نا؟ لە کاتێکدا ئەوە فەرموودەی کەسێکە کە خوای گەورە ڕەوانبێژییەکی تەواوی پێ بەخشیوەﷺ (قال الإمام مسلم ﵀حدثني أبو خيثمة زهير بن حرب، حدثنا وكيع، عن كهمس، عن عبد الله بن بريدة، عن يحيى بن يعمر، (ح) وحدثنا عبيد الله بن معاذ العنبري – وهذا حديثه – حدثنا أبي، حدثنا كهمس، عن ابن بريدة، عن يحيى بن يعمر، قال: كان أول من قال في القدر – يعني: بنفي القدر – بالبصرة معبد الجهني، فانطلقت أنا وحميد بن عبد الرحمن الحميري حاجين – أو معتمرين – فقلنا: لو لقينا أحدا من أصحاب رسول الله ﷺ ، فسألناه عما يقول هؤلاء في القدر، فوفق لنا عبد الله بن عمر بن الخطاب داخلا المسجد، فاكتنفته أنا وصاحبي أحدنا عن يمينه، والآخر عن شماله، فظننت أن صاحبي سيكل الكلام إلي – يعني: سيتركني أسأل عبدالله بن عمر –، فقلت: أبا عبد الرحمن إنه قد ظهر قبلنا ناس يقرءون القرآن، ويتقفرون العلم، – يعني: يبحثون عن غوامض العلم و خوافيه و دقائق مسائله – وذكر من شأنهم، وأنهم يزعمون أن لا قدر، وأن الأمر أنف، – يعني: لا يعلم الله الأشياء إلا بعد أن تحدث و تقع – قال: " فإذا لقيت أولئك فأخبرهم أني بريء منهم، وأنهم برآء مني "، والذي يحلف به عبد

---

١ـ أخرجه مسلم، كتاب ((الإيمان))، باب ((بيان الإيمان و الإسلام و الإحسان ووجوب الإيمان بإثبات قدر الله سبحانه و تعالى)) (٨).

الله بن عمر " لو أن لأحدهم مثل أحد ذهبا، فأنفقه ما قبل الله منه حتى يؤمن بالقدر " ثم قال: حدثني أبي عمر بن الخطاب قال: بينما نحن عند رسول الله ﷺ ذات يوم، إذ طلع علينا رجل شديد بياض الثياب، شديد سواد الشعر، لا يرى عليه أثر السفر، ولا يعرفه منا أحد، حتى جلس إلى النبيﷺ ، فأسند ركبتيه إلى ركبتيه، ووضع كفيه على فخذيه، وقال: يا محمد أخبرني عن الإسلام، فقال رسول الله ﷺ: " الإسلام أن تشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول اللهﷺ ، وتقيم الصلاة، وتؤتي الزكاة، وتصوم رمضان، وتحج البيت إن استطعت إليه سبيلا "، قال: صدقت، قال: فعجبنا له يسأله، ويصدقه، قال: فأخبرني عن الإيمان ؟، قالﷺ: " أن تؤمن بالله، وملائكته، وكتبه، ورسله، واليوم الآخر، وتؤمن بالقدر خيره وشره "، قال: صدقت .، قال: فعجبنا له يسأله، ويصدقه، قال: فأخبرني عن الإحسان، قال: " أن تعبد الله كأنك تراه، فإن لم تكن تراه فإنه يراك "، قال: فأخبرني عن الساعة، – وهذا هو الشاهد – فقال الصادقﷺ: " ما المسئول عنها بأعلم من السائل " قال: فأخبرني عن أمارتها – يعني: عن علاماتها و أشراطها – فقالﷺ: " أن تلد الأمة ربتها)) وفي لفظ: ((أن تلد الأمة ربها، وأن ترى الحفاة العراة العالة رعاء الشاء يتطاولون في البنيان "، قال: ثم انطلق، فلبثت مليا، ثم قال ليﷺ: " يا عمر أتدري من السائل؟ " قلت: الله ورسوله أعلم، قال: " فإنه جبريل أتاكم يعلمكم دينكم)).

واتە: ئیمامی موسلیم ریوایەتی كردووە بە سەنەدێك لە (یحیى ی كوڕی معمر) ەوە فەرمووی: یەكەم كەسێك دەربارەی قەدەر قسەی كرد (واتە: بە نەبوونی قەدەر) لە شاری بەسرەدا (معبد الجهنی) بوو، من و (حمید ی كوڕی عبدالرحمن الحمیری) دەرچووین بە مەبەستی حەجكردن یان بۆ عەمرە، گوتمان: بەڵكو یەكێ لە هاوەڵانی پێغەمبەرمان بینیﷺ و پرسیاری قسەی ئەوانەمان لێ كرد دەربارەی قەدەر، دەڵێت: (عبدالله ی كوڕی عمر ی كوڕی خەتتاب) مان بۆ رێك كەوت لە كاتێكدا ئەو دەچووە ناو مزگەوتەوە، من و هاورێكەم هاوشانی ئەو بووینەوە، یەكێكمان لای راستی و ئەویتر لای چەپی، گومانم وا بوو كە هاورێكەم پرسیارەكە بۆ من بە جێ دەهێڵێ و من پرسیار لە (عبدالله كوڕی عمر) بكەم بۆیە گوتم: ئەی

(باوکی عبدالرحمن)، لای ئێمە خەڵکێك پەیدا بوونە قورئان دەخوێنن و بە دوای وردەکاری و نادیاریەکانی زانستدا دەگەڕێن – وە باسی ئەوانی کرد –ئەوان وا دەبینن کە قەدەر نییە و هەموو کردارێك پێش وەخت نییە (واتە: خوای گەورە هیچ شتێك نازانێت ئیللا لە پاش ئەوەی روونەدات) عبدالله کوڕی عمر فەرمووی: ئەگەر گەیشتیتە ئەوان و ئەوانت بینی ئەوا پێیان بڵێ کەوا من لەوان بەریم و ئەوانیش لە من بەرین وە ئەوەی کە عبدالله ی کوڕی عمر سوێندی لەسەر دەخوات ئەوەیە ئەگەر یەکێك لەوان بە قەد چیای ئەحوود ئاڵتون ببەخشێت ئەوا خوا لێی وەرناگرێت تاکو باوەڕ بە قەدەر نەهێنێ، ئەمجار فەرمووی: باوکم عمری کوڕی خەتتاب بۆی گێڕامەوە و فەرمووی: لە کاتێکدا ئێمە ڕۆژێك لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین لە پڕێکدا کابرایەك هاتە ژوورەوە، جلوبەرگێکی زۆر سپی لە بەردابوو وە قژێکی زۆر ڕەشی هەبوو، شوێنەواری سەفەری پێوە دیار نەبوو، هیچ کەس لە ئێمە ئەوی نەدەناسی تاکو نزیك پیغەمبەری خوا ﷺ دانیشت هەردوو ئەژنۆی توند کرد لە هەردوو ئەژنۆی پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستی خستە سەر هەردوو رانی و فەرمووی: ئەی (محمد) پێم بڵێ ئیسلام چییە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((ئیسلام ئەوەیە کە شایەتی بدەیت کەوا جگە لە (الله) هیچ خوایەکی تر نییە شایەنی پەرستن بێت و (محمد) یش نێردراوی خوایە و نوێژەکانت بە ڕێك و پێکی ئەنجام بدەیت و زەکاتی ماڵەکەت بدەیت و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگریت و حەجی ماڵی خوا بکەیت ئەگەر توانات هەبوو)) کابرا فەرمووی: ڕاست دەکەیت . فەرمووی: ئێمەیش سەیرمان پێهات پرسیاری لێ دەکات و هەر خۆیشی بە ڕاستی دەخاتەوە،فەرمووی: ئەی پێم بڵێ ئیمان چییە؟ ئەویش فەرمووی: ئەوەیە باوەڕی تەواو بهێنیت بە خوای گەورە و فریشتەکانی و کتێبە ئاسمانییەکان و هەموو پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی و وە باوەڕیش بە قەزاو قەدەر بهێنیت چ چاك بێت یان خراپ: فەرمووی: ڕاست دەکەیت... فەرمووی: ئێمەیش سەیرمان پێهات پرسیاری لێ دەکات و هەر خۆیشی بە ڕاستی دەخاتەوە،فەرمووی: ئەی پێم بڵێ چاکە(ئیحسان) چییە؟ ئەویش فەرمووی: ئەوەیە بە شێوەیەك خودا بپەرستیت

وەکو ئەوەی کە دەیبینی خۆ ئەگەر تۆ ئەو نەبینی ئەوا باش بزانە ئەو تۆ دەبینێ، فەرمووی: پێم بڵێ قیامەت کەی دێت؟ (مەبەستی هێنانەوەی فەرموودەکە لێرەدایە) فەرمووی: ئەو کەسەی کە پرسیاری لێ دەکرێت لە پرسیارکەر زاناتر نییە . فەرمووی: کەوایە نیشانەکانم پێ بڵێ؟ فەرمووی: لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە: کەنیزەك گەورەو خاوەنی خۆی لێوە لە دایك ببێت، خەڵکانێکی پێ پەتی رووت و هەژار و شوانی مەڕ پێشبڕکی بکەن لە بەرز کردنەوەی کۆشك و خانووەکانیاندا . (عمر) دەڵێت: پاش ئەوە کابرا هەڵسا و ڕۆیشت و منیش ماوەیەك رامام، ئەمجار پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئەی (عمر) ئایا دەزانی ئەو پرسیارکەرە کێ بوو؟ گوتم: خوا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن, فەرمووی: ئەوە (جبریل) بوو, هاتبوو بۆ ئەوەی لە دینەکەتان شارەزاتان بکات .

مەبەستم لە هێنانەوەی بۆ ئەم فەرموودە جوانە فەرموودەکەی پێغەمبەری خوایەﷺ ((أن تلد الأمة ربتها )) لەریوایەتێکی تردا((ربها)) پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: ئەمە مانای چییە؟.

هەندێ لە ئەهلی زانست و زانیاری فەرموویانە[1] (یتزوج الرجل السید الأمة) وە مانای (الأمة) ئافرەتێکی کۆیلەی کەنیزەکە... واتە: کابرایەکی گەورەی ئازاد کەنیزەکێ لە کەنیزەکان مارە دەکات... پاشان کوڕێکی لێ دەبێت، ئەم کوڕە کە لەو کەنیزەکە بووە دەدرێتە پاڵ ئەو پیاوە و بە ناوی ئەوەوە بانگ دەکرێت وە بە ئازادی و گەورەیی (سید) گەورە دەبێت چونکە کوڕی ئەو پیاوەیە لە کاتێکدا کە دایکی هێشتا کەنیزەکێکە لە کەنیزەکەکان وە ئەو فەرموودەیە (أن تلد الأمة ربها) واتە گەورەکەی، یان (أن تلد الأمة ربتها ) یان لە پیاوەکە کچێکی دەبێت و ئەو کچە دەبێتە گەورەی دایکەکە چونکە لە پیاوەکەیە وە دایکەکەیش بە کەنیزەکی دەمێنێتەوە بۆیە مانای فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە کەنیزەیەك گەورەی خۆی دەبێت، ئەمە قسەی هەندێ لە ئەهلی زانست و زانیاری یە...

١ـ انظر: ((فتح الباري)) (١/ ١٥٣)

هەندێکیان دەڵێن [١]((أن تلد الأمة ربتها أو ربها)) ڕەنگە کەسێکی ئازاد و گەورە کەنیزەیەکێ لە کەنیزەکان مارە دەکات و پاشان منداڵی لێ دەبێت و کوڕی ئەو کەنزەیە گەورە دەبێت و پاشان ئەو کەنیزەیە لە بازارەکاندا دەفرۆشرێت و بۆ جارێکی تر ئەو کەنیزەیە دەگەڕێتەوە بۆ لای کوڕەکەی خۆی بۆ ئەوەی ببێتە بەندە و کەنیزەکی... کەچی لە بنەڕەتدا دایکی خۆیەتی... ئەمە مانایەکە لە ماناکانی ...

باشترین و ڕێدارترین مانا بۆ فەرموودەکەی پێغەمبەری خواﷺ (أن تلد الأمة ربتها أو ربها)) قسەکەی (ابن حجر)ە...

(الحافظ ابن حجر)[٢] دەڵێت: ((زۆربوونی ڕەنجاندن و سەرپێچی دایک و باوک لە لایەن منداڵەکانیانەوە، فەرمووی: ئەم کارەیشە لە پێش هاتنی قیامەت ڕوودەدات چونکە لە پێش هاتنی قیامەت هەموو کارەکان ئاڵوگۆڕ دەبن... بۆیە کەسی فێرخواز دەبێتە پەروەردەکار و کەسی بێ ڕێز بەرز دەبێتەوە، جا منداڵ ڕەفتار لە گەڵ دایکیاندا دەکەن هەروەکو چۆن گەورەیەک لە گەڵ کەنیزەکەیدا دەیکات... لە سووکایەتی پێ کردن و لێدان و بە کارهێنان، بۆیە ناونراوە بە گەورەکەی و لێرەدا (مجاز)ە، یان مەبەست لە (الرب) پەروەردەکارە بۆیە لێرەدا (حقیقە)یە، فەرمووی: ئەمە ڕێدارترین بۆچوونە لای من لە بەرگشتاندنی)) (تەواو بوو بە دەستکارییەوە).

دەڵێم: ئەمە نزیکترین بۆچوونە لەسەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خواﷺ، وا دەزانم ئەم نیشانەیە بەم مانایە زۆر بووە و بڵاو بووەتەوە بە شێوەیەک کە دڵەکان خوێناوی دەکەن، ڕەنجاندن زۆر بووە بۆیە کەسی فێرخواز بووەتە پەروەردەکار ... وای لێهاتووە ئەو کوڕەی کە لەسەر دەستی دایک و باوکی پەروەردە بووە ئێستا فەرمان دەکاتە باوکی... وە فەرمان دەکاتە ئەو دایکە بەڕێزە کە ئەو شایستەی ئەو جێگایە نیە ... یان ئەو باوکە بەڕێزە کە شایستەی ئەو جێگایە نییە... بۆیە زۆربوونی ڕەنجاندنی دایك و باوك یەکێکە لە نیشانەکانی قیامەت بە

---

١- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

دەقی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ: ((أن تلد الأمة ربتها)) هەروەکو باسمان کرد کچان ڕەفتار لە گەڵ دایکیاندا وەکو ڕەفتاری گەورەیەك لە گەڵ کەنیزەکەیدا دەیکات وە هەروەها کوڕان ڕەفتار لە گەڵ دایکیاندا وەکو گەورەیەك لە گەڵ کەنیزەکەیدا دەکات، ئەم دیمەنە زۆربووە و بڵاو بووەتەوە ! ولا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم، ڕەنجاندنی دایك و باوك بە شێوەیك بڵاو بووەتەوە کە دڵەکان خوێناوی دەکەن ...

دەڵێم: بە ڕاستی دایك و باوك نیعمەتێکن لە بەرزترین و گەورەترین نیعمەت، ڕەنگە زۆربەی منداڵەکانمان و براکانمان درك بەو نیعمەتە نەکەن ئیللا مەگەر لە دەستی بدەن ئەو کاتە پێی دەزانن ... داوا لە خوا دەکەم کە بەرەکەت بخاتە تەمەنی دایك و باوکمانەوە هەر ئەو پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە...

دایك و باوك هەر بە فیترەت منداڵەکانیان خۆش دەوێت و حەزیان لە پارێزگاری و پاراستن و چاکەکردنە لە گەڵیاندا، بەڵکو ڕەنگە دایك و باوك خۆیان بکەنە قوربانی منداڵەکانیان بە خوێن و ڕەگ و ڕیشە، بە هێز و توانا، بە حەوانەوە و سرەوتن، بە خواردن، بە خواردنەوە لە پێناوی خۆشگوزران و بەختیار کردنی منداڵەکانیان، بۆیە دەبینین خۆشترین کات و سات لای باوکان ئەو ساتەیە کە پارووێەك لە دەمی خۆی دەردەهێنێ و دەیکاتە دەمی منداڵەکەیەوە، خۆشترین کات و سات لای دایك ئەو کاتەیە کە شەوان بە تەواوی لە پێناوی خەوتنی منداڵەکەیدا شەونخوونی دەکات، یان لە پێناوی حەوانەوەی کوڕەکەیدا، یان لە پێناوی دڵشادکردنی کچەکەیدا... بە ڕاستی ئەوە خۆشترین کات و ساتە لای دایك و باوك، من باش دەزانم کە ئەو کەسەی خوای گەورە منداڵی پێ بەخشیوە ئەوا زیاتر ڕێزی دایك و باوکی دەزانێ لە پاش ئەوەی بووە کەسێکی بەرپرسیار، بە دڵنیاییەوە دەزانێ کە ئەو باوکە بەڕێزە چەند ماندوو بووە لە گەڵ ئەواندا و باش دەزانێ کە ئەو دایکە بەڕێزە چی پێشکەشی ئەوان کردووە چونکە ئەو ئێستا لە کاتی بەخشیندایە، هەروەکو چۆن رووەکێك هەموو خواردنێك لە تۆوێکەوە دەمژێت

و پاشان ئەو تۆوە دەبێتە پارچەیەك پووش و پەڵاش و (با) بە ئارەزووی خۆی یاری پێ دەکات، یان هەروەکو چۆن جووجەڵەیەك هەموو خواردنەکەی خۆی لە هێلکەوە دەمژێت پاشان ئەو هێلکەیە دەبێتە توێکڵێکی بەتاڵ بەو شێوەیە منداڵان هەموو شیلەکان دەمژن، هەموو تێکۆشانەکان، هەموو بەخشین و تینەکانی دایك و باوك، بۆیە لە ئەنجامدا ئەوان دەبنە پێرەمێرێکی بە ساڵاچوو لە گەڵ ئەوەیشدا ئەوان دڵخۆش و بەختیارن چونکە بەخشندەیی دایك و باوك هەرگیز لە بن نایەت و تەواو نابێت .

بەڵام منداڵان – ولا حول ولا قوه الا باللە – تیایاندا هەیە ئەم بەخشین و خۆشەویستی و نازەی لە بیر دەچێت ! بە شێوەی ئینکاری و درندانە و سەرپێچی و ناسوپاسگوزاریەوە وڵامیان دەداتەوە، بە خراپ رەفتارکردن لە گەڵ دایك و باوکدا، بە بێ بەزەیی و میهرەبانی و چاکەکاری! ئەو رەنجاندنە رەشە دەگەیەتە ئەو پەڕی، کاتێ کە منداڵێك بە خراپی رەفتار دەکات لە گەڵ باوکیدا، یان کاتێ کوڕێك دەدا لە دایکی، سوێند بە خوا رووداوی وا دەخوێنمەوە دڵەکان لە بن دەردەهێنن وە ئەگەر ئەوانە روو بدەن ئەوا بەڵگەیە بۆ نزیك بوونەوەی قیامەت، کوڕێك بەرانبەر بە باوکی دەست بەرزدەکاتەوە ! یان کچێك بەرانبەر بە دایکی دەست بەرز دەکاتەوە ! بە راستی ئەوە شێوەیەکی زۆر ناشیرین و نابووتە لە شێوەکان رەنجاندنی دایك و باوك !

بۆیە خوای گەورە فەرمانی کردووە بە چاکەکاری لە گەڵ دایك و باوکدا لە پاش ئەوەی فەرمانی کردووە بە پەرستن و یەکتاپەرستی خۆی بە راستەوخۆیی، دەمەوێت ئێستا رێزی دایك و باوك و پلەی پایەی چاکەکاری لە گەڵیاندا بهێنیتە پێش چاوی خۆت...

لەگەڵ مندا بیر لەم ئایەتە بکەرەوە: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا﴾ الإسراء:٢٣، واتە: پەروەردگارت بڕیاری داوە و وەسیەتی کرد کە: دەبێ هەر خۆی بپەرستن وە فەرمانی دا کە: دەبێ لە گەڵ دایك وبابدا چاکە بکەن)) بەڵکو پێغەمبەری خواﷺ هاوەڵدانانی کردووەتە گەورەترین تاوان و ئەمجار ئەو

تاوانە گەورەی لە پاش هاوەڵدانان دێت (ڕەنجاندنی دایك و باوك)ە، ئەم قسەیەت لە کوێ هێنا؟ من زۆر دەترسم ڕێنوینیم بکە خوا ڕێنوینیت بکات .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (أبو بکرە)ەوە ((ألا أنبئكم بأكبر الكبائر؟ قالوا: بلى يا رسول الله قال: ((الإشراك بالله و عقوق الوالدين))، واتە: ئایا پێتان بڵێم کەوا گەورەترینی تاوانە گەورەکان چییە؟ فەرموویان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هاوەڵدانان بۆ خودا و ڕەنجاندنی دایك و باوك).

ئاواتە خواز بووم کە ئەم قسەیە هەموو منداڵەکانمان گوێبیستی بوایەن، هاوەڵدانان گەورەترین تاوانە، ستەمکارترین ستەمە، نابوترین و ناشیرینترین تاوانە لەسەر ڕووی زەویدا ئەنجام دەدرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ﴾ لقمان: ١٣، واتە: کوڕەبچکۆلەکەم! هەر شتێك یا کەسێك مەکە بە شەریك و هاوبەشی خوا بە ڕاستی شەریك و هاوبەشدانان بۆ خوا ستەمێکی گەورەیە لە هەموو تاوانێك گەورەترە و هەرگیز بێ تەوبە قابیلی عەفو و لێبووردن نییە)).

خوای گەورە بە پێشەوای یەکتاپەرستان و پێشەنگی لێکۆڵەرەوان و گەورەی پێغەمبەران ﷺ دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ ...)) واتە: وەحی کراوە بۆ تۆ و بۆ ئەو پەیامبەرانەی بەر لە تۆ بوون: کە ئەگەر گریمان بە هاوبەش قایل ببێت بۆ خوا، ئەوە بێ گومان هەموو کردەوەکانت پووچەڵ دەبێ..)) بیر لە توندی ئەم هەڕەشەیە بکەرەوە، خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەمان ﷺ دەفەرموێت:﴿...لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ۝٦٥ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعۡبُدۡ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ الزمر:٦٥_ ٦٦، واتە:... ئەوە بێ گومان هەموو

---

١ـ أخرجه البخاري في كتاب الشهادات، باب ما قيل في شهادة الزور (٢٦٥٤)، ومسلم كتاب الإيمان، باب بيان الكبائر و أكبرها (٧٨).

کردەوەکانت پووچەڵ دەبێ وە لە زیانمەندانیش دەبیت .(٦٥) نەخێر، هەرگیز بە گوێیان نەکەیت بەڵکو تەنها هەر خوا بپەرستە و لە شوکرانە بژێران بە(٦٦)).

هێندە ڕەنجاندنی دایك و باوك ترسناکە و راستەوخۆ لە پاش هاوەڵدانان دێت؟! بەڵێ لە پاش هاوەڵدانان.

کوڕە شیرینەکەم ... بیربکەرەوە... کچە بە نرخ و بەرێزەکەم ئاگادار بە... برا ڕێزدارەکەم تۆیش، بە ڕاستی کارەکە زۆر سامناك و ترسناکە...

ابن عباس[1] دەڵێت:((سێ ئایەت دابەزیون لە گەڵ سێ شتی تردا پێکەوەبەندن و هیچ یەکێ لەوان بە بێ هاوڕێکەی وەرناگیرێت...

یەکەمیان: ئەو ئایەتەی خوا گەورەیە کە دەفەرموێت: ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾ المائدة: ٩٢، واتە: دەبێ بە بەردەوام گوێڕایەڵی خوا بن و بەرفەرمانی پەیامبەر بن)) جا هەرکەسێ گوێڕایەڵی خوای گەورە بوو بەڵام گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی ﷺ نەبوو ئەوا لێی وەرناگیریت.

دووەمیان: ئەو ئایەتەی خوا گەورەیە کە دەفەرموێت: ((وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾البقرة: ٤٣، واتە: فەرمانیان پێ بکە با بەتێر و تەسەل نوێژ ئەنجام بدەن و بەشێکی داراییشیان بە زەکات بدەن)) جا هەرکەسێ نوێژی کرد و بەڵام زەکاتی سەروەت و سامانەی دەرنەکرد ئەوا لێی وەرناگیریت .

سێیەمیان: ﴿أَنِ ٱشْكُرْ لِي وَلِوَٰلِدَيْكَ﴾ لقمان: ١٤، واتە: کەوایە (ئەی مرۆڤ !) بەردەوام سوپاسی من بکە لەسەر نیعمەتەکانم و سوپاسی باوك و دایکیشت بکە لەسەر ئەو هەموو ئەزیەت و ئازارە لە پێناوی تۆدا چێشتوویانە)) جا هەرکەسێ سوپاسگوزاری خوا بوو بەڵام سوپاسگوزاری دایك و باوکی نەبوو ئەوا لێی وەرناگیرێت.

---

١ـ ذكره ((الذهبي في الكبائر)) (٥٤)، والهيتمي في الزواجر (١٤٧/٢).

ئایا دەزانی کەوا رەنجاندنی دایك و باوك هۆیەکە لە هۆکارەکانی دوورکەوتنەوە لە ڕەحمەتی خوا گەورە وە بێ بەش بوون لە بەهەشت؟ هەرچەندە چاکە پێشکەش بکەیت ئەوا هیچ سوودی نییە، چونکە خوای گەورە نە فەرزەکانت لێ وەردەگرێت و نە سوننەتەکانیش لە رۆژی قیامەتدا، بەڵێ... رەنجاندنی دایك و باوك یەکێکە لە تاوانە نابوت و ناشرینە گەورەکان کە ئێستا بە شێوەیەکی غەمگین بڵاو بووەتەوە .

(أبو عاصم) لە کتێبی (السنه) و (الطبراني) لە (معجم)ەکەیدا و جگە لەوان بە سەنەدێکی (حسن)[1] ریوایەتیان کردووە لە فەرموودەیەکی (ابو أمامه) ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((ثلاثة لا يقبل منهم صرفا ولا عدلا: عاق، ومنان، ومكذب بالقدر)) .واتە: سێ کەس هەن بە هیچ شێوەیەك فەرزەکان و سوننەتەکانیان لێ وەرناگیرێت، ئەو کەسەی دڵی دایك و باوکی دەرەنجێنێ و منەتکەر و ئەو کەسەی قەدەر بە درۆ دەخاتەوە)).

لە فەرموودەیەکی تردا کە پێشەوا (النسائي) لە (سنن) ەکەدا و (أحمد) لە (مسند) ەکەیدا و الطبراني لە (الكبير) دا و البزار لە (مسند) ەکەیدا و جگە لەوان بە سەنەدێکی (حسن)[2] لە فەرموودەیەکی (عبدالله ی کوڕی عمر)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((ثلاثة لا ينظر الله إليهم يوم القيامة: العاق لوالديه)) !

((والمرأة المترجلة))، واتە: ئەو ئافرەتەی کە خۆی بە پیاو دەچوێنێ لە هەموو شتێکدا، لە قسەکردنیدا و لە جلێ و بەرگیدا، (والديوث)، واتە: ئەوەی کە دەزانێ خراپەکاری لە کەس و کار و خێزانەکەیدا هەیە و پێی رازییە ولا حول ولا قوه الا بالله...

---

١ـ أخرجه ابن أبي عاصم في ((السنة)) (٣٢٣)، والطبراني في ((الكبير)) (٧٩٥) بسندٍ حسنه المنذري في ((الترغيب)) (٣/ ٢٢١)، ووافقه الألباني في ((الصحيحة)) (١٧٨٥).

٢ ـأخرجه أحمد (٢/ ١٣٤)، والنسائي، كتاب الزكاة، باب المنان بما أعطى (٥ / ٨٠)، وابن خزيمة في التوحيد (٢٣٥)، والطبراني في ((الكبير)) (٨٧٩)، و (١٣٠٠٢)، وابن حبان (٥٦)، والبزار، كما في ((المجمع)) للهيثمي (١٤٧،١٤٨/٨)، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (٦٧٤)، وانظر: ((صحيح الجامع)) (٣٠٧١).

(مانای فەرموودەکە: سێ کەس هەن کەوا خوای گەورە لەو ڕۆژی قیامەتدا تەماشایان ناکات: ئەو کەسەی کەوا دایك و باکی خۆی دەرەنجێنێ و ئەو ئافرەتەی کە خۆی بە پیاو دەچوێنێ و گەواد)).

زۆر بە باشی بیر بکەرەوە کەوا ڕەنجاندی دایك و باوك هەر دەبێ بەرهەمە تاڵەکەی لەم دونیایەدا درووینە بکەیت – لێرە لە دونیا – پێش قیامەت، ئەم قسەیە لە منەوە وەربگرە و خۆت بە دوایدا بگەڕێ، تەماشای هەر موسڵمانێك بکە کە لە بازرگانیەکەیدا سەرکەوتووە، لە کار و کەسابەتەکەیدا، لە پلە و پایە کۆمەلایەتییەکەیدا، بگەڕێ و بپشکنە لە حاڵی ئەو لە گەڵ دایك و باوکیدا... بە تایبەتی لە گەڵ دایکیدا ... بە دڵنیاییەوە دەڵێم – پڕ بە دەم دەیڵێم – وە بە بەرزترین دەنگم: ئەو پیاوە سەرفراز و سەرکەوتووە دەبینی لە هەموو کەس زیاتر لەگەڵ دایك و باوکیدا باشە و بە جوانی ڕەفتاریان لە گەڵدا دەکات... تەنها نمونەیەکم بۆ بهێنەوە کەسێك لەگەڵ دایکیدا باش بووەو چاکەی لە گەڵیدا دەکرد و ڕێزی لێی دەگرت و ڕێزی لە باوکی دەگرت کەچی خوای گەورە لە کارەکەیدا سەرکەوتووی نەکردووە !... ئەمجار تەنها یەك نمونەم بۆ بهێنەرەوە کەسێك باوکی ڕەنجاندبێ و دایکی ڕەنجاندبێ وە پێم بڵێ: ئەم نمونەیە لە دونیادا سەرکەوتوو بووە؟ و لە بازرگانیەکەیدا قازانجی کردووە؟! بە بەختیاری دەژێت بە هەموو مانایەکەوە؟ بەڵکو لە پەنجەرەکانی بەختیارییەوە چووەتە ژوورەوە لە پێش دەرگاکانی؟! زۆر ئەستەمە! سوێند بێ بە خوا هەر دەبێ تام و چێژی ڕەنجاندن بچێژێ لە دونیادا لە پێش قیامەت، لە لایەن چ کەسێکەوە؟ لە لایەن کوڕ و کچەکەیەوە.

ئیمامی (أحمد و أبو داود و الترمذي و ابن ماجه)[1] و جگە لەوان ریوایەتیان کردووە لە فەرموودەیەکی (أبی بکره)ەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

---

١ـ أخرجه أحمد(٥/ ٣٦ – ٣٨)، وأبو داود، كتاب الأدب، باب النهي عن البغي (٤٩٠٢)، والترمذي، كتاب صفة القيامة، باب (٥٧) (٢٥١١)، وابن ماجة، كتاب الزهد، باب البغي (٤٢١١)، والبخاري في الأدب المفرد (٢٩)، وابن حبان (٢٠٣٩)، والحاكم (٢/٣٥٦) و (٤/١٦٢، ١٦٣)، وابن المبارك في الزهد (٧٢٤)، وصححه الألباني في ((الصحيحة)) (٩١٨).

((ما من ذنب أجدر أن يعجل الله تعالى لصاحبه العقوبة في الدنيا مع ما يدخر له في الآخرة مثل البغي و قطيعة الرحم))، واته: هیچ تاوانێك نییه شایستەتر بێت کەوا خوای گەورە تۆڵەی لە خاوەنەکەی بسێنێتەوە لەم دونیایە لە گەڵ ئەوەی کە بۆی پاشەکەوت کردووە بۆ ڕۆژی دوایی وەکو: ستەمکاری و بچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی)) .

لە فەرموودەیەکی تردا کە (البخاری) لە (التاریخ) ەکەیدا و (الطبرانی) لە (الكبير) دا بە سەنەدێکی (صحیح)[١] و چەند (شواهد) ێکی هەیە لە فەرموودەیەکی (أبی بکرە) ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((أثنتان – وە لە ریوایەتێکی تردا – بابان يعجلهما الله في الدنيا قبل الآخرة: البغي – واتە ستەم وە لە پاشاندا دەگەڕێمەوە بۆ باسی ستەم ان شاء الله تعالى وەکو نیشانەیەکی تر – و عقوق الوالدين)) مانای فەرموودەکە: دوو ئاکار یان دوو دەرگا هەن کە خوای گەورە پەلەی لێ دەکات لە دونیادا پێش قیامەت ئەویش: ستەمکاری و ڕەنجاندنی دایك و باوکە)) . ئاه ه! ! هەر دەبێ تامی ڕەنجاندن بچێژی، وا مەزانە لە کاتێکدا تۆ وای لە نێو سامانەکەتدا و لە نێو پلە و پایەکەتدا و لە نێو ڕووە کۆمەڵایەتییەکەتدا و لە هێز و تواناکەتدا، کەوا تۆ لەو باوکە بێ هێز و لاواز و بەستەزمانە بە هێزتریت، یاخود وا مەزانە ئەی خوشکی بەڕێزم کەوا تۆ لەو دایکە لاواز و بەستەزمانە بەهێزتریت کەوا لە سکیدا هەڵی گردووی، یان لە لە سکیدا تۆی هەڵگردووە بۆ ماوەی نۆ مانگ، –براکەم– پاشان بە خێوی کردووی بەڵکو ئەو خەوی لێ نەدەکەوت تاکو تۆ نەخەویت وە خۆی برسی دەکرد لە پێناوی ئەوەی تۆ تێر ببێت وە خەمبار دەبوو لە پێناوی ئەوەی تۆ دڵشاد بیت، تێبینی ئەوە بکە کەوا زۆربەمان ئێستا ئەو کارەیان لە گەڵدا دەکەین بەڵام حەز دەکەین ئەوان بمرن – ئیللا کەسانێك نەبێت کە خوا خۆی ڕەحمی پێ کردوون لە ئەهلی چاکەکاری، خوای

---

١ـ أخرجه البخاري في (تاريخه) (تعليقاً ١ /١٦٦)، وأحمد(٣٦/٥)، والطبراني في ((الكبير))، ومن طريقه أبو نعيم في ((أخبار أصبهان)) (٩٩/٢) عن أبي بكرة، وله شاهد عند البخاري في (التاريخ الكبير)) (١٦٦/١ تعليقاً) والحاكم (٤ / ١٧٧) عن أنس. والحديث صحيح بشواهده كما في ((الصحيحة)) (١١٢٠)، و ((صحيح الجامع)) (١٣٧).

گەورە ئێمە و ئێوە بگێڕێ لە چاكەكاران — خۆزگە دەخوازێت كەوا دایكی یان باوكی بمرێت، بەڵام باوكت هەموو ئەوانەی بۆ دەكردی و بە زیاترەوە، ئەو هەردەم دەپارایەوە و خۆی زەلیل دەكرد لە بەر دەستی خوادا بۆ ئەوەی تۆ تەمەن درێژ بیت و بە گەورەیی بتبینێ و ببیتە هۆی بەختیاری ئەو، هەروەها دایكەكە هەردەم لە خوا دەپارایەوە بەڵكو دەگریا لە بەر دەستی خوادا لە پێناوی تۆدا، بۆ ئەوەی تۆ هەردەم لە بەختیارییەكی بەردەوامدا بیت...

بەڵام تەماشای بەرهەمی ڕەنجاندنی دایك و باوك بكە، كاتێ باوكەكە لە تەمەندا گەورە بوو، پشتی چەمایەوە، لیك بە دەمیدا هاتە خوارەوە و هێشتا لە گەڵ كوڕەكەی خۆیدا لەماڵەكەدا دەژی، كاتێ كوڕەكە كەف دەمی باوكی دەبینێ دێتەخوارەوە خۆیو خواردنەكەی هەڵدەگرێت و فرێی دەداتە ژوورێكەوە بۆ ئەوەی بە تەنها لەو ژوورەدا بژێت و دووری بكاتەوە لە منداڵەكانی، بەڵام منداڵە بچووكەكانی بە باوكیان گوت: بابە، بۆ ئەم كارە دەكەی؟ بۆ باپیرەت بە تەنها لە ژوورێكدا بە جێ دەهێڵی؟ ئەویش چی گوت؟ گوتی: تاوەكو بێز نەكەنەوە لە لیكەكەی دەمی لە كاتی نانخواردندا! بەڵام پەروەردگارت ویستی وا بوو كە یەكێ لە منداڵەكان بهێنێتە گۆ و بەم كوڕە سەرپێچی كەرە بڵێت: بابە... ئەگەر تۆیش لە تەمەندا گەورە بوویت ئێمەیش بە تەنها لەو ژوورەدا دەتهێڵینەوە هەروەكو تۆ بە باپیرەت كرد، ئەی خودایە! ((بروا آباءكم تبركم أبناؤكم))[١] واتە: لە گەڵ باوكتاندا بە باشی ڕوفتار بكەن ئەوا منداڵەكانتان بە باشی ڕەفتارتان لە گەڵدا دەكەن)) لێرە لەم دونیایە، تەماشا كە برای خۆشەویستم... ئەی ئەو كەسەی لە گەڵ دایك و باوكیدا بە باشی ڕەفتار دەكەیت تۆ دەبینی یەكێ لە منداڵەكانت كە هێشتا تەمەنی نەگەیشتووەتە دوو ساڵ — بۆ نمونە — هیچ شتێك ناخوات تاوەكو پارویەك نەكاتە دەمتەوە! منداڵەكەت كە هێشتا درك بە هیچ شتێك ناكات، هەست بە هەموو شتێك ناكات! نان دەداتە تۆ پێش ئەوەی خۆی بیخوات، هەروەكو ئەوەی خوای گەورە بەرهەمی چاكەكارییەكەت لە گەڵ دایك و باوكتدا بهێنێتە پێش چاوت لە پێش ڕۆژی

---

١ـ وقد ورد هذا في حديث ضعيف، كما في ((ضعيف الجامع)) (٢٣٢٩)، و((الضعيفة)) (٢٠٣٩، ٢٠٤٣).

دوایی، بەڵکو لە هەموو تەمەنتدا بە چاوەکانی خۆت دەیبینی، هەردەم هەست بە سنگ فراوانی دەکەیت، جێگیر بوونی کردەوەکانت و هێزی جەستەت و دڵشادی و دڵخۆشیت لە گەڵ خێزانەکەتدا، لە گەڵ منداڵەکانتدا، لە گەڵ کرێکار و فەرمانبەرەکانتدا، دڵنیابە بە بەختیاری دەژیت بە هۆی ئەو چاکەکارییەوە لەم دونیایە و لە دوارۆژیشدا.

بەڵام باوکی دووەم: کوڕەکەی بە ڕاکێشان لە ماڵ دەری دەکات، باوکەکە پێی دەڵێت: بەسە، واز بهێنە، ڕۆڵەکەم لە تەنیشت دەرگاکە بە جێم بهێڵە، ئەمجار دەستی بە گریان کرد و بە کوڕەکەی خۆی گوت: سوێند بە خوا ئەی کوڕی خۆم... پێش سی ساڵ زیاتر من باوکی خۆم تەنها بۆ لای دەرگاکە ڕاکێشا!!.

من بە چاوی خۆم بینیم لە گۆڕەپانێکی گشتیدا خەڵکێك کۆ بوونەتەوە و غەڵبەغەڵبێك دروست بووە، لە نێوانیاندا پیرەمێردێك دانیشتووە و دەگری، منیش ڕاوەستام و پرسیارم کرد: ئەمە چییە؟ گوتیان: ئەم کوڕە — دەستیان درێژ کرد بۆ کوڕێك کە دانیشتبوو — زلەیەکی دا لە ڕووی باوکی! گوتم: پەنا بە خوا! ئەمجار یەکێ بە منی گوت: شێخ ئەم پیاوە دانیشتووە ودەگری، کاتێ ویستمان لە کوڕەکە بدەین گوتی: نەخێر... وازی لێ بهێنن لێی مەدەن ... گوتمان: بۆ؟ گوتی: ئەوە کوڕی منە، گوتمان: ئەوە کوڕێکی سەرپێچی کەرە و تۆی ڕەنجاندووە و دەبێ تەمێ بکرێت، گوتی: نەخێر، ئەمە قەرزێکە و دەبێ بیگەڕێنمەوە، گوتی: من لە ڕووی باوکی خۆم دا لێرە لە هەمان جێگا!!

سوێند بە خوا هەر دەبێ ئەم قەرزە بدەیتەوە — بیر بکەرەوە ((اثنتان يعجلهما الله في الدنيا قبل الآخرة: البغي و عقوق الوالدين)) سوور بە لەسەر ئەوەی — براکەم — دایکت دوعات بۆ بکات! واتە: ئەگەر تۆ دەستەکانی ئەوت ماچ کرد و پاشان ڕۆیشتی بۆ سەر کارەکەت بەو بەیانییە و لە کاتێکدا ئەو دوعای بۆ کردووی، ئەوا ئەمە شتێکی جوانە، بەڵام ئاه ئەگەر لە دایکت جیابوویتەوە و بە گریانەوە ئەوت بە جێ هێڵا و دوعای لە سەرت دەکرد!! هەرگیز مەڵێ: من کەسێکی لە خواترسم و پەیوەستم بە دینەکەمەوە، بە هەموو دڵمەوە پێت دەڵێم: وای لێ بکە کە دوعات بۆ

بکات، وای لیٚ بکه هەردەم بلێت: ئەی پەروەردگارم، من لێت رازیم ئەی کوڕی شیرینەکەم، ئەوا سوێند بە خوا لە ژیانتدا سەرکەوتوو دەبێت – انشاء الله – .

ئەمە خواپەرستێکە لە خواپەرستەکانی بەنی ئیسرائیل – ئەویش جورەیج ە – چیرۆکەکەی بەناوبانگە هەروەکو لە هەردوو کتێبی (البخاری و مسلم)[١] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (ابو هریره)وە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((لم يتكلم في المهد إلا ثلاثة: عيسى ابن مريم و صاحب جريج، وكان جريج رجلا عابدا ))واتە: هیچ کەسێك لە لانکەکەیدا قسەی نەکردووە تەنها سێ کەس نەبێت: عیسا ی کوڕی مەریەم عليه السلام وە هاوڕێکەی جورەیج، جورەیج کابرایەکی خواناس بوو)) کەسێکی خراپەکار نەبوو بەڵکو کەسێکی لە خواترس و زاهید بوو ((فاتخذ صومعة ))، واتە: جێگایەکی دوور لە چاوی خەڵکی و خۆی یەکلا کردبووەوە بۆ خواپەرستی و گوێڕایەڵی . ((فكان فيها –واتە: لە خەڵوەتگەکەیدا – فأتته أمه و هو يصلي، فقالت: يا جريج، فقال: يا رب أمي و صلاتي )) واتە: دایکی هات بۆ لای و لە کاتێکدا ئەو نوێژی دەکرد فەرمووی: ئەی جورەیج ... ئەویش فەرمووی: خودایە ئایا لەسەر نوێژەکەم بەردەوام بم یان وەڵامی دایکم بدەمەوە ؟!((فأقبل على صلاته فأنصرفت))، واتە: جا لەسەر نوێژەکەی بەردەوام بوو، بۆیە دایکیشی ڕۆیشتەوە)) ئەویش لەسەر نوێژەکەی بەردەوام بوو وە وڵامی دایکی نەدایەوە ((فلما كان من الغد أتته و هو يصلي، فقالت: يا جريج، فقال: يا رب أمي و صلاتي فأقبل على صلاته فأنصرفت))، واتە: بۆ سبەینیٚ دیسان دایکی هاتەوە بۆ لای و لە کاتێکدا ئەو نوێژی دەکرد فەرمووی: ئەی جورەیج ... ئەویش فەرمووی: خودایە ئایا لەسەر نوێژەکەم بەردەوام بم یان وەڵامی دایکم بدەمەوە، جا لەسەر نوێژەکەی بەردەوام بوو، بۆیە دایکی ڕۆیشتەوە)) ئەو نوێژ دەکات دەتوانین بڵێین هەموو کاتەکانی خەریکی نوێژە ((فلما كان من الغد أتته و هو يصلي، فقالت: يا جريج، فقال: أي رب أمي و صلاتي فأقبل على صلاته، فقالت: اللهم لاتمته حتى ينظر إلى وجوه

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب في المظالم، باب إذا هدم حائطاً فليبن مثله (٢٤٨٢)، ومسلم، كتاب البر والصلة والآداب، باب تقديم بر الوالدين على التطوع بالصلاة و غيرها (٢٥٥٠/ ٧، ٨) واللفظ له.

المومسات ))، واتە: بۆ سبەینێ دیسان دایكی هاتەوە بۆ لای و لە كاتێكدا ئەو نوێژی دەكرد فەرمووی: ئەی جورەیج ... ئەویش فەرمووی: خودایە ئایا لەسەر نوێژەكەم بەردەوام بم یان وەڵامی دایكم بدەمەوە، جا لەسەر نوێژەكەی بەردەوام بوو، بۆیە دایكی فەرمووی: خودایە ! ئەم كوڕەی من مەمرێنە تاوەكو تەماشای ڕووی ئافرەتە داوێن پیسەكان دەكات)) بۆیە دایكەكە پەست بوو ! بۆ پەست دەبێت لە كاتێكدا كوڕەكەی خەریكی نوێژە؟ ئایا لە شەرعدا هەیە كە منداڵ بەردەوام بێت لەسەر نوێژەكەی و وەڵامی دایكی نەداتەوە ؟

وەڵامەكەی ئەوەیە: ئەگەر لە نوێژە فەرزەكاندا بوو ئەوا دەبێت بەردەوام بێت لەسەر نوێژەكەی، بەڵام ئەگەر هاتوو لە نوێژە سوننەتەكاندا بوو وە گوێی لێ بوو دایكی بانگی دەكات و دەبینێت دایكی سوورە لەسەر بانگكردنەكەی و ئەوا با نوێژەكەی ببڕێت و وەڵامی دایكی بداتەوە.[1]

خۆشەویستان... ئەمە پلە و پایە و ڕێزی دایكە لە دینی خوای بەرز و باڵادا و لە دینەكەی (محمد ی كوڕی عبدالله)دا ﷺ، تاكو هیچ كەسێك نەڵێت: كەوا ئیسلام ستەمی لە ئافرەت كردووە !! نەخێر! دڵنیابە و بزانە كەوا ئیسلام ڕێزی لە ئافرەت گرتووە كاتێك كە دایكە، ڕێزی لێ گرتووە كاتێك كە كچە و ڕێزی لێ گرتووە كاتێك كە خێزان و خانەوادەیە، بە شێوەیەك ڕێزی لێگرتووە كەوا هیچ بەرنامەیەك لەسەر زەویدا نە لە ڕۆژئاوا و نە لە ڕۆژهەڵاتدا ئەو ڕێزەی لێنەگرتووە...

سبحان الله !بە ڕاستی (دایكی جریج) بە شێوەیەكی زۆر سەیر هەڵچوو، بۆیە دوعای لە (جورەیج) ی خواناس و لە خواترسی زاهید كرد، وریابە... ئەو جوێنی پێ نەدابوو، لێی نەدابوو، بە قسەی ناخۆش وەڵامی نەدابووەوە، چونكە ئەو كابرایە لە كاتی خواپەرستیدا بوو، لە كاتی گوێڕایەڵیدا بوو تەنها تاوانەكەی ئەوە بوو كە نەیتوانی وەڵامی بداتەوە، چونكە ئەو لە كاتی نوێژدا بوو بۆیە دایكی دوعای لێ كردو فەرمووی: ((اللهم لا تمته حتى ينظر الى وجوه المومسات))، واتە: خودایە ئەم كوڕەی من مەمرێنە تاوەكو تەماشای ڕووی ئافرەتە داوێن پیسەكان دەكات)) داوا

---

١ـ انظر: ((شرح مسلم)) للنووي (١٦ / ١٠٥).

له خوا دەكەم كه ئێمه و ئێوه داپۆشێت له دونیا و قیامەتدا! وەڵامی دوعاكەی درایەوە كه له (جورەیج) ی كردبوو! به ڕاستی ئەوە دوعایەكی نامۆیه بەرانبەر بەو كابرا له خواترس و زاهیده كرا، ؟! پێغەمبەری خواﷺ دەڵێت: ((فتذاكر بنو إسرائيل جريجا وعبادته وكانت امرأة بغي يتمثل بحسنها، فقالت: إن شئتم لأفتننه لكم، فتعرضت له، فلم يلتفت إليها، فأتت راعيا كان يأوي إلى صومعته، فأمكنته من نفسها، فوقع عليها فحملت، فلما ولدت قالت: هو من جريج، فأتوه فاستنزلوه وهدموا صومعته وجعلوا يضربونه فقال: ما شأنكم؟ قالوا: زنيت بهذه البغي، فولدت منك، فقال: أين الصبي؟ فجاءوا به، فقال: دعوني حتى أصلي، فصلى، فلما انصرف أتى الصبي فطعن في بطنه، وقال: يا غلام من أبوك؟ قال: فلان الراعي ؟))، واته: بەنی ئیسرائیل باسی جورەیج و پەرستنەكەیان دەكرد، ئافرەتێكی داوێن پیسی زۆر جوان هەبوو، ئەو ئافرەته گوتی: ئەگەر دەتانەوێت توشی فیتنەی دەكەم، بۆیه ئەو ئافرەته ڕۆیشت بۆ لای و خۆی پێشكەشی كرد كەچی ئەو تەنانەت ئاوڕی لێ نەدایەوە پاشان ڕۆیشت بۆ لای شوانێك كه سەردانی خەڵوەتگەكەی دەكرد، ئافرەتەكه توانی ئەو شوانه له خشتەببات و توشی تاوانی زینای بكات و به هۆی ئەو زینایەوە ئافرەتەكه سكپڕ بوو (حەملی پەیدا كرد)، كاتێ منداڵەكه له دایك بوو گوتی: ئەم منداڵه له جورەیجە، ئەوانیش هاتن بۆ لای جورەیج و له خەڵوەتگەكەی هێنایانه خوارەوە و خەڵوەتگەكەیان ڕوخاند و دەستیان به لێدانی كرد، ئەویش گوتی: چی بووە؟ گوتیان: تۆ داوێن پیسیت لەگەڵ ئەم ئافرەته داوێن پیسەدا ئەنجامداوە و ئێستا منداڵی بووە، ئەویش فەرمووی: كوا منداڵەكە؟ ئەوانیش منداڵەكەیان بۆ هێنا، فەرمووی: لێم گەڕێن تاكو نوێژ بكەم، پاشان جورەیج نوێژی كرد، كه له نوێژەكەی بووەوە چووە بۆ لای منداڵەكەو له سكی منداڵەكەی دا و فەرمووی: ئەی منداڵ كێ باوكی تۆیه؟ ئەویش هاته زمان و گوتی: فلان شوان ..)).

ئەم منداڵه له لانكەكەیدایه و تازە له دایك بووە، ئایا چۆن قسەی له گەڵدا كرد؟ تەماشای ئەو بڕوا و دڵنیایی یه بكه لای ئەو كابرایه گەیشتووەته چی پلەیەك؟ له

هەمان کاتدا دوعای دایکی لێ گیرا بوو، ئەو منداڵە بە ویستی خوای گەورە دەستی بە قسە کردن کرد، لە کاتێکدا ئەو بە پەڕۆپاڵەکەیەوە پێچراوەتەوە و دەڵێت: ((فلان الراعي)) بە دوعای دایکی توشی ئیبتلا بوو لە هەمان کاتدا خوای گەورە رزگاری کرد بە هۆی خواپەرستی و باوەڕ و نوێژەکانییەوە، لەو کاتەدا:((فأقبلوا على جريج يقبلونه ويتمسحون به، وقالوا: نبني لك صومعتك من ذهب، قال: لا، أعيدوها من طين كما كانت)) واتە: پاشان ئەو خەڵکە روویان لە جورەیج کرد و ماچیان دەکرد و بە مەبەستی پیرۆزراگرتنی دەستیان بە جەستەیدا دەهێنا و گوتیان: خەڵوەتگەکەت جارێکی تر بۆ دروست دەکەینەوە لە ئالتون، فەرمووی: نەخێر هەروەکو خۆی چۆن لە قوڕ دروست کرابوو ئاوایش دروستی بکەنەوە)).

مەبەست لە هێنانەوەی ئەم فەرموودەیە : دوعای دایکی (جورەیج)ە لە کوڕەکەی گیرابوو...

تەماشای ئەم دیمەنە جوان و روناکەی تر بکە، هەروەکو لە (صحيح مسلم)[1] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (أسیر ی کوڕی جابر)ەوە دەڵێت: ((كان عمر بن الخطاب إذا أتى عليه أمداد[2] أهل اليمن، سألهم: أفيكم أويس بن عامر؟ حتى أتى على أويس)) واتە: ئەگەر کۆمەڵ و خەڵکی یەمەن بهاتبایە بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ئەوا پرسیاری لێ دەکردن: ئایا کەسێکتان تێدایە بە ناوی أویس ی کوڕی عامر؟ تاکو رۆژێك أویس هات بۆ لای)) – ئاگاداری ئەم گفت و گۆیە شیرینە کە ئیمامی عومەر فەرمووی: ((أنت أويس بن عامر؟ قال: نعم، قال: من مراد ثم من قرن؟ قال: نعم)) فەرمووی: ئایا تۆ أویس ی کوڕی عامر ی؟ فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی: لە تیرەی مراد ئەمجار لە قرن؟ فەرمووی: بەڵێ))– موراد و قەرن دوو هۆزن لە وڵاتی یەمەن – ((قال: فكان بك برص فبرأت منه إلا موضع درهم؟ قال: نعم))، واتە: فەرمووی: لە جەستەتدا بەڵەکیك بووە و ئێستا چاك بووەتەوە تەنها جێگای دەرهەمێکی ماوە؟ فەرمووی: بەڵێ)) – تەماشاکە ئیمامی عومەر تەمەنی

---

١ ـ أخرجه مسلم، كتاب فضائل الصحابة، باب من فضائل أويس القرني (٢٥٤٢).

٢ـ الأمداد: هم الأنصار و الأعوان.

نەخۆشییەکە دیاری دەکا و ئەو چاك بووتەوە تەنها جێگای دەرهەمێك نەبێت- ((قال: لك والدة؟ قال: نعم، قال سمعت رسول الله ﷺ، يقول: " يأتي عليكم أويس بن عامر)) ، واتە: دایکت ماوە؟ فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: أويس ی کوڕی عامر دێت بۆ لاتان)).

پێغەمبەری خوا ﷺ (أويس ی کوڕی عامر) نەبینیوە تاوەکو بەم شێوە وردە وەصفی ئەو بکات هەروەکو دیاری کردنی جۆری نەخۆشییەکەی کە بە جەستەوەیە بووە وە هێشتا شوێنەواری ئەو نەخۆشییە بە جەستەیەوە ماوە بە قەد دەرهەمێك! ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَىٰ﴾ النجم:٤ــ ٥، واتە: ئەو قورئانەی کە ئەو دەیلێت، جگە لەوەی کە بە وەحی بۆی دەنێردرێت هیچی تر نییە، واتە: ئەم قورئانە هەر لە لایەن خواوەیە(٤) خاوەن هێز و بە زەبر (جوبريل)ی فریشتەیە، قورئانی فێرکردووە، بەڵێ زۆر بە هێزە، دەست پاکە، زمان پاکە، ؟! !(٥))).

فەرمووی ﷺ: ((يأتي عليكم أويس بن عامر مع أمداد أهل اليمن، من مراد، ثم من قرن، كان به برص فبرأ منه إلا موضع درهم، له والدة هو بها بر، لو أقسم على الله لأبره )) واتە: أويس ی کوڕی عامر دێت بۆ لاتان لە گەڵ کۆمەڵ و خەڵکی یەمەندا لە هۆزی موراد و ئەمجار لە قەرن وە توشی نەخۆشی بەڵەك بووە و پاشان چاك بووەتەوە تەنها جێگای دەرهەمێك نەبێت دایکی ماوە و لە گەڵیدا زۆر چاکەکارە ئەگەر سوێند بخوات کە خوا شتێکی بۆ دەکات ئەوا خوای گەورە سوێندەکەی بۆ جێ بە جێ دەکات)) تەماشای چاکەکاری و شوێنەواری چاکەکاری بکە - ((فإن استطعت أن يستغفر لك فافعل )) واتە: ئەگەر توانیت داوای لێ بکەیت کە داوای لێخۆشبوونت بۆ بکات ئەوا بیکە)).

سەیر لەوەدایە عومەر داوای دوعا لە یەکێ لە شوێنکەوتوان دەکات (تابعی) وە عومەریش کێیە و چی کەسێکە !؟ ئەو ئەو هاوەڵە گەورە و بەرێزەیە کەوا ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای کرد کە ئیسلامی پێ بە عیززەت ببێتەوە و فەرمووی: (هەروەکو الترمذي ریوایەتی کردووە لە فەرموودەیەکی عبدالله ی کوڕی عومەرەوە)

دەڵێت: (( اللهم أعز الإسلام بأحب هذين الرجلين إليك بأبي جهل أو بعمر بن الخطاب ))[١] واته: پەروەردگاری من ئیسلام به عیززەت بکه به خۆشەویسترینی ئەو دوو پیاوە لای تۆ: به ئەبو جەهل یان به عومەری کوڕی خەتتاب)) .

کەچی ئەوەتا لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ بە عومەر دەڵێت: ((فإن استطعت أن يستغفر لك فافعل )) واته: ئەگەر توانیت داوای لێ بکەیت که داوای لێخۆشبوونت بۆ بکات ئەوا بیکه)) ئایا دەتوانیت له گەڵ ئەم مانایانەدا بژێیت ئەی برای بەڕێزم و ئەی خوشکی ڕێزدارم؟!

بۆیه عومەر فەرمووی: ((فاستغفر لي، فاستغفر له )) واته :داوای لێ خۆشبوونم بۆ بکه لای خوا، ئەویش داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد)) بەڵێ... چاکەکاری به تایبەت له گەڵ دایکیدا (أويس) ی گەیانده ئەم پله و پایه بەرز و به نرخه – ئایا ئەم پله و پایەی أويس به چاکەکاری بووه؟ بەڵێ... به چاکەکاری له گەڵ دایکیدا! . (( فقال له عمر: أين تريد؟ قال: الكوفة، قال: ألا أكتب لك إلى عاملها؟ قال: أكون في غبراء الناس أحب إلي)) واته: عومەر بەوی فەرموو: بۆ کوێ دەتەوێ بڕۆیت؟ فەرمووی: بۆ کووفە، فەرمووی: نوسراوێکت بۆ بنووسم بۆ کاربەدەستەکەی ئەوێ؟ فەرمووی: ئەگەر له چینی خوارەوەی خەڵکی بم پێم خۆشتره)) – ئەم پیاوه پێشەنگی و بەناوبانگی و ئەو جۆره شتانەی ناوێت بەڵکو تەنها ڕەزامەندی خوای گەورەی دەوێت و دوارۆژ بۆ خۆی دابین بکات –

(( قال: فلما كان من العام المقبل حج رجل من أشرافهم، فوافق عمر، فسأله عن أويس، قال: تركته رث البيت، قليل المتاع )) واته: بۆ ساڵی داهاتوو کابرایەك له ناودارانیان بەمەبەستی حەج هاتبوو، وا ڕێك کەوت که عومەر ببینێ، ئەویش پرسیاری أويس ی لێ کرد، کابراش له وەڵامدا فەرمووی: کاتێ من به جێم هێشت خاوەنی ماڵێکی شڕ و کەل و پەلێکی کەم بوو)). ئیمامی عومەر بەم کابرایەی فەرموو: ((سمعت رسول الله ﷺ، يقول: " يأتي عليكم أويس بن عامر مع أمداد أهل

---

١ـ أخرجه الترمذي كتاب المناقب باب (١٦) (٣٦٨١) وقال: ((حديث حسن صحيح غريب))، وابن حبان (٢١٧٩)، وأحمد في ((فضائل الصحابة)) (٣١٢)، وعبد بن حميد (٧٥٧)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)).

الیمن من مراد، ثم من قرن، كان به برص فبرأ منه، إلا موضع درهم له والدة هو بها بر، لو أقسم على الله لأبره، فإن استطعت أن یستغفر لك فافعل)) واتە: گوێم لێ بوو كەوا پێغەمبەری خواﷺفەرمووی: أویس ی كوڕی عامر دێت بۆ لاتان لە گەڵ كۆمەڵ و خەڵكی یەمەندا لە هۆزی موراد و ئەمجار لە قەرن وە توشی نەخۆشی بەڵەك بووە و پاشان چاك بووەتەوە تەنها جێگای دەرهەمێك نەبێت دایكی ماوە و لە گەڵیدا زۆر چاكەكارە ئەگەر سوێند بخوات كە خوا شتێكی بۆ دەكات ئەوا خوای گەورە سوێندەكەی بۆ جێ بە جێ دەكات، ئەگەر توانیت داوای لێ بكەیت كە داوای لێخۆشبوونت بۆ بكات ئەوا بیكە)) كابرایش گەڕایەوە بۆ یەمەن و بە دوای أویس ی كوڕی عامردا دەگەڕا ((فأتى أویسا فقال: استغفر لي، فقال أویس: أنت أحدث عهدا بسفر صالح، فاستغفر لي))، واتە: چوو بۆ لای أویس فەرمووی: داوای لێخۆشبوونم بۆ بكە، أویس فەرمووی: تۆ تازە لە سەفەری خەیر گەڕاویتەوەوە، تۆ داوای لێ خۆشبوونم بۆ بكە)) چونكە ئەو كابرایە تازە لە سەفەری حەج گەڕابووەوە بۆیە كابرا پێی گوت: ((استغفر لي، فقال أویس: لقیت عمر؟ قال: نعم)) واتە: داوای لێخۆشبوونم بۆ بكە، أویس فەرمووی: ئایا عومەرت بینی؟ فەرمووی: بەڵێ)) واتە: ئەم قسە و باسە هیچ كەسێك نازانێت تەنها عومەر نەبێت، كەوابوو ئایا تۆ ئەوت بینیوە و باسی بۆ كردووی؟ – ((قال: نعم، أستغفر لي، فاستغفر له، ففطن له الناس، فانطلق على وجهه)) واتە: فەرمووی: داوای لێخۆشبوونم بۆ بكە، ئەویش داوای لێخۆشبوونی بۆ كرد، خەڵكی لێی تێگەیشتن،ئەویش سەری دانواند و ڕۆیشت)) تەماشای فەزڵی چاكەكاری بكە – ئەی ڕێزداران – چەند جوان و شیرینە ! ! .

لە فەرموودەیەكدا، كە (أحمد و النسائي و الحاكم) و جگە لەوان بە سەنەدێكی (صحیح)[1] ڕیوایەتیان كردووە لە فەرموودەی دایكی ئیماندارانەوە (عائیشە) كەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((دخلت الجنة فسمعت فیها قراءة، فقلت: من

---

١ــ أخرجه أحمد (٦ /٣٦، ١٥١، ١٥٢، ١٦٦، ١٦٧)، وفي ((فضائل الصحابة)) (١٥٠٧)، والنسائي في ((فضائل الصحابة)) (١٢٩)، وعبدالرزاق في ((مصنفه)) (١٣٢/١١)، وأبو یعلى (٣٩٩/٧)، والحاكم (٢٠٨/٣)، وصححه على شرط الشیخین ووافقه الذهبي وابن حبان (٧٠١٤، ٧٠١٥)، وأبو نعیم في ((الحلیة)) (٣٥٦/١)، والبغوي في ((شرح السنة)) (٣٤١٨)، وصححه الشیخ الألباني في ((صحیح الجامع)) (٣٣٧١)، و((الصحیحة)) (٩١٣).

هذا؟)) واتە: چوومە بەهەشتەوە گوێم لە خوێندنەوەی قورئان بوو، گوتم: ئەمە کێیە؟)) واتە:ئایا ئەمە کێیە کەوا لە بەهەشتدا قورئان دەخوێنێت؟ ((قالوا: حارثة بن النعمان، فقالﷺ: کذاکم البر، کذاکم البر)) واتە: فەرموویان: حارثة ی کوڕی النعمان ە، خۆشەویستﷺ فەرمووی: ئەوە بە هۆی چاکەکارییەوەیە، ئەوە بە هۆی چاکەکارییەوەیە)) چونکە حارثة لە هەموو کەسێك زیاتر لە گەڵ دایکیدا چاك بووە.

ئەگەر توانیت پێیەکانی باوکت ماچ بکەی خێراکە ماچی بکە و هەرگیز خاو و تەمەڵ مەبە وسوێند بە خوا دایك و باوکت ڕێگاکەتن بەرەو بەهەشت، تۆ ئەی خوشکی بەڕێزم ئەگەر دەتوانیت پێیەکانی دایکت ماچ بکەی ئەوا خێراکە ماچی بکە و هەرگیز دوا مەکەوە چونکە ڕێگاکەتە بەرەو بەهەشت ئەگەر بە دەستی بهێنی، پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((ویحك ! الزم رجلها فثم الجنة))،[1] واتە: تیابچیت! دەست بە پێیەکانی دایکتەوە بگرە ئەوا ڕێگەی بەهەشتە)) من باوەڕم وایە کەوا هیچ کارێك لەوە بە باشتر نازانم کاتێك بگەمە خوا لە چاکەکردن لە گەڵ دایکمدا نەبێت وە داوا لە خوا دەکەم کە هەموو کار و کردەوەکانمان وەرگرێت و دڵسۆزیمان پێ ببەخشێت.

بەڵام چاکەکردن لە گەڵ دایکتدا کارێکی شاراوەیە ...دەستەکانی ماچ دەکەی... سەری ماچ دەکەی ... بە سنگی خۆتەوە دەیگوشیت... و خواردنی دەدەیێ... پارەی لەسەر خەرج دەکەی ... ڕێزی لێ دەگریت ... بە وتەیەکی خۆش دڵشادی دەکەیت ... بە بەخشینێك... هەتا کۆتایی ئەو کردەوە چاکانە ... هەموو ئەوانە هیچ کەسێك پێی نازانێت تەنها خوا نەبێت ...

ئەوەیشە بزانە کەوا پێغەمبەری خواﷺ چاکەکردن لە گەڵ دایك و باوکدا پێشی جیهادی خستووە لە پێناوی خوادا هەروەکو (البخاری و مسلم) لە (صحیح)[2] ەکەیاندا ریوایەتیان کردووە لە فەرموودەیەکی (عبدالله ی کوڕی مسعود) ەوە دەڵێت: ((قلت: یا رسول الله ﷺ، أي العمل أحب الى الله؟ قال: " الصلاة على

---

١ـ أخرجه ابن ماجه كتاب الجهاد، باب الرجل يغزو وله أبوان (٢٧٨١)، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (١٢٤٨)، و((الإرواء)) (٥ / ٢١).

٢ـ أخرجه البخاري، كتاب مواقيت الصلاة، باب فضل الصلاة لوقتها (٥٢٧)، ومسلم كتاب الإيمان، باب بيان كون الإيمان بالله تعالى أفضل الأعمال (٨٥).

وقتها"، قال: ثم أي؟ قال: " ثم بر الوالدين "، قال: ثم أي؟ قال: " الجهاد في سبيل الله ) ) واتە: گوتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ خۆشەویسترین کارێك لە لای خوا چییە؟ فەرمووی: نوێژ کردنە لە کاتی خۆیدا، گوتم: پاشان چی؟ فەرمووی: چاکەکردنە لە گەڵ دایك و باوکدا، فەرمووی: پاشان چی؟ فەرمووی: تێکۆشانە لە پێناوی خوادا ) ).

کەوابوو چاکەکردن لە گەڵ دایك و باوکدا پێشی جیهاد کەوتووە لە پێناوی خوادا، ئەوە ڕاستییەکەو دەبێ بیزانین و فێری ببین .

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[١] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (عبدالله ی کوڕی عمرو)ەوە فەرموویەتی: ((أقبل رجل إلى نبي اللهﷺفقال: أبايعك على الهجرة والجهاد، أبتغي الأجر من الله، فقال له المصطفى ﷺ: " فهل من والديك أحد حي؟ " فقال الرجل: نعم، بل كلاهما، فقال له ﷺ: " فتبتغي الأجر من الله؟ " قال: نعم، قال: " فارجع إلى والديك فأحسن صحبتهما "))، واتە: کابرایەك هات بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: بەیعەتت پێ دەدەم لەسەر کۆچکردن و تێکۆشان لە پێناوی خوادا، چاوەڕوانی پاداشت لە خوا دەکەم، خۆشەویستﷺ فەرمووی: ئایا هیچ لە دایك و باوکت زیندوون؟ فەرمووی: بەڵێ، بەڵکو هەردووکیان ماون، فەرمووی: وە چاوەڕوانی پاداشت لای خوا دەکەی؟ فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی: کەوابوو بگەڕێوە و لە گەڵیاندا بە باشی ڕەفتار بکە)).

لە گوتەیەکی تردا هاتووە ((أحي والداك؟ "، قال: نعم، قل: " ففيهما فجاهد)) واتە: ئایا دایك و باوکت زیندوون؟ فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی: کەوابوو لە گەڵ ئەواندا تێبکۆشە)) .

لە گوتەیەکی تردا هاتووە: ((قال الرجل: جئت أبايعك على الهجرة، وتركت أبوي يبكيان! ، فقال ﷺ: "فأرجع إليهما، وأضحكهما كما أبكيتهما))،[٢] واتە: کابرا

١ـ أخرجه البخاري، كتاب الجهاد والسير، باب بإذن الأبوين (٣٠٠٤)، ومسلم كتاب البر والصلة والآداب (٢٥٤٩).

٢ـ أخرجه ابن ماجه،كتاب الجهاد، باب الرجل يغزو وله أبوان(٢٧٨٢)،وصححه الشيخ الألباني في(صحيح ابن ماجه).

فەرمووی: هاتووم بەیعەتت دەدەمی لەسەر کۆچکردن و باوك و دایکم جێ هێشت لە کاتێکدا ئەوان دەگریان، فەرمووی: بگەڕێوە بۆ لایان ئەوان پێبەکەنینە هەروەکو چۆن ئەوان دەگریان بە هۆی تۆوە)).

لێرەدا قسەیەکی شیرین و خۆشی پێغەمبەری خواﷺ هەیە روومانی بۆ لای خۆی وەردەگێرێنێتەوە هەرچەندە زۆربەی خەڵکی تێی کەوتوون – ئیللا کەسێك نەبێت کە خوا خۆی رەحمی لێ کردبێت –هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (عبداللە ی کوڕی عمرو)ەوە کەوا پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: ((من الكبائر شتم الرجل والديه ))، واتە: یەکێ لە تاوانە گەورەکان ئەوەیە کەسێك جوێن بە دایك و باوکی خۆی بدات)) کاتێ هاوەڵان ئەوەیان بیست فەرموویان: ((يا رسول الله، هل يشتم الرجل والديه ؟)) واتە: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئایا کەس هەیە جوێن بە دایك و باوکی خۆی بدات ؟)).

لە گوتەیەکی تردا هاتووە: ((أيسب الرجل والديه ؟)) فقال النبيﷺ: " نعم يسب أبا الرجل فيسب أباه، ويسب أمه فيسب أمه))، واتە: ئایا کەس جوێن بە دایك و باوکی دەدا؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: بەڵێ، جوێن بە باوکی کەسێك دەدات ئەویش جوێن بە باوکی ئەم دەدات و جوێن بە دایکی کەسێك دەدات و ئەویش جوێن بە دایکی ئەم دەدات)).

ئایا بیرت لەم قسەیەی خۆشەویست کردەوە ؟کابرایەك تۆ جوێن بەدایکی دەدەیت و ئەویش جوێن بە دایکت دەدا، بۆیە تۆ کەوتیتە ناو خراپەکاری و رەنجاندن بەرانبەر بە دایکت، تۆ جوێن دەدەی بە باوکی کابرایەکی تر و ئەویش جوێن بە باوکت دەدا بۆیە تۆ خراپەکاری و رەنجاندنت بەرانبەر بە حەقی باوکت کرد ! !

ڕەنگە هەندێکمان ئێستا دەست بە گریان بکات و ئەم قسانە کاریگەری لەسەر هەبێت و دەڵێت: خوا لێت خۆش بێت! تۆ برینەکانی ئێمەت کولاندەوە چونکە

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب الأدب باب لا يسب الرجل والديه (٥٩٧٣)، ومسلم كتاب الإيمان باب بيان الكبائر و أكبرها (٩٠).

كەسی وامان تێدایە باوكی مردووە یان دایكی مردووە، ئایا ئێستا چی بكات؟ ئایا هیچ هەلێك ماوە شتێك بكەم لە پێش ئەوەی بمرم هەرچەندە دایك و باوكم كۆچی دواییان كردووە؟!

وەلامی ئەم پرسیارە: بەلێ ... هەرگیز بێ ئومێد مەبە وە خوای گەورە مژدەی خەیرت پێ دەدا وە بزانە هیوا و ئاوات بەرانبەر بە خوای گەورە هەرگیز لە بن نایەت ... دەرگای تكا داناخرێت ...تەنانەت ئەگەر لە ژیانی دایك و باوكتدا سەرپێچی فەرمانەكانیانت كردبوو ئێستا ئەوەت لە سەرە كە پەیمان تازە بكەیتەوە وە ئەو سەرپێچییانە بگۆڕیت بە چاكەكاری... ئەگەر دایك و باوكت كۆچی دواییان كردووە ئەوا ئێستایش دەرگای چاكەكاری بەرانبەریان كراوەیە وە ڕێگاكە لە بەر دەستتدایە و فراوانە بەلام گرنگ ئەوەیە هەنگاو بنێیت بە پەلە لەسەر ڕێگای چاكەكاری... ئەوە چۆن دەبێت؟

گوێ لە وەلامەكە بگرە ڕاستەوخۆ لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆ ئەم پرسیارە... هەروەكو لە فەرموودەیەكدا هاتووە كە ئیمامی (أحمد) لە (مسند) ەكەیدا و أبو داود لە (سنن) ەكەیدا و الترمذي و ابن حبان و جگە لەوان[١] ریوایەتیان كردووە (وە لە بەر سپاردەیەكی زانستی لە سەنەدەكەیدا (علی كوڕی عبید الساعدی) هەیە كە تەنها لای ابن حبان باوەڕپێكراوە، بەلام ئەودوای پیاوانی سەنەدی فەرموودەكە لە باوەڕپێكراوەكانن... لە فەرموودەیەكی (أبي أسید الساعدي) ەوە دەلێت: ((بینا نحن عند رسول الله ﷺ: إذ جاءه رجل من بني سلمة، فقال: یا رسول الله ﷺ، هل بقي من بر أبوي شيء أبرهما به بعد موتهما؟ –))، واتە: لە كاتێكدا ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووین ﷺ كابرایەك لە هۆزی بەنی سەلەمە هات بۆ لای،فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا هیچ چاكەیەك ماوە لە گەڵ دایك و باوكمدا لە پاش مردنیان ئەنجامی بدەم ؟)) بە ڕاستی پرسیارێكی ڕاستەوخۆیە و

---

١ـ أخرجه ابو داود،كتاب ((الأدب)) باب ((في بر الوالدين)) (٥١٤٢)، وابن ماجه كتاب ((الأدب)) باب ((صل من كان أبوك يصل)) (٣٦٦٤)، وأحمد (٣/ ٤٩٨)، وابن حبان (٤١٨)، والحاكم (٤/١٥٤)، وصححه ووافقه الذهبي، وضعفه الشيخ الألباني في ((ضعيف أبي داود وابن ماجه)).

بیر لە وڵامەکەی بکەرەوە... پێغەمبەری خواﷺ بە ئەوی فەرموو: ((نعم، الصلاة عليهما، والاستغفار لهما، وإنفاذ عهدهما من بعدهما، وصلة الرحم التي لا توصل إلا بهما، وإكرام صديقهما)) واتە: بەڵێ ئەوانەیش بریتین لە:

یەکەم: ((الصلاة عليهما)) ئەمە مانای چییە؟ مەبەستی لە (الصلاة) ئەو نوێژە نییە کە ڕۆژانە پێنج جار ئەنجامی دەدەین، بەڵکو مەبەستەکەی لێرەدا پاڕانەوە و دوعایە! ڕەنگە هەندێ کەس پێم بڵێت ئەم قسەت لە کوێوە هێنا کەچی ئەو دەڵێت: ((الصلاة عليهما))؟

دەڵێم: ئەم مانایە وەکو ئەو ئایەتەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ﴾ التوبة: ١٠٣، واتە: لە سامانەکەیان زەکات و سەدەقەیە وەرگرە دڵ و دەروونیانی پێ پاکەوەکە هەتا لە گوناهەکانیان پاك ببنەوەو چاکەکانیان فراوان ببێ و دەشگەنە پلەی هەرە بەرز و دوعای چاکیان دەرهەق بۆ بکە چونکە دوعا و نزای تۆ دڵئارامی و ئۆقرەبەخشە بۆیان)) لە پاڕانەوەی پێغەمبەری خواداﷺ هاتووە کاتێ یەکێ لە هاوەڵان خەیری دەکرد، جا ئەویش دەیگوت: ((اللهم صل على آل أبي أوفى))[١] مانای (الصلاه) لێرەدا مانای پاڕانەوەیە.

دووەم: ((والاستغفار لهما)) واتە: داوای لێ خۆشبوون بۆ دایك و باوکت بکە هەروەکو چۆن بە منداڵی تۆیان پەروەردە کرد.

سێیەم: ((وإنفاذ عهدهما من بعدهما)) واتە: جێ بە جێ کردنی ئەو پەیمانانەی دایك و باوکت پەیمانیان دابوو بە مەرجێ پەیمانەکە دروست بێت و حەرام نەبێت.

چوارەم: ((وصلة الرحم التي لا توصل إلا بهما، وإكرام صديقهما)) واتە: گەیاندنی ئەو پەیوەندییە خزمایەتییە کە تەنها لە ڕێگای ئەوانەوە پێت دەگەن، و ڕێز گرتن

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب الزكاة باب صلاة الإمام و دعائه لصاحب الصدقة (١٤٩٧)، ومسلم كتاب الزكاة باب الدعاء لمن أتى بصدقه (١٠٧٨).

له هاوڕێکانیان)) هەردەم ابن عمر دەیفەرموو – هەروەکو لە (صحیح مسلم)[١] دا هاتووه کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إن أبر البر صلة الولد أهل ود أبيه)) واته: له چاکترین چاکەکاری له گەڵ دایك و باوکدا ئەوەیه کەوا منداڵ پەیوەندی لە گەڵ خۆشەویستانی دایك و باوکیدا بگەیەنێت)).

ئەی ڕێزداران ...ڕەنجاندنی دایك و باوك تاوانێکە لە تاوانە گەورەکان و نیشانەیەکە له نیشانەکانی قیامەت هەروەکو ئەو ڕاستگۆیه فەرموویەتی که هەرگیز له خۆوه قسه ناکاتﷺ : ((أن تلد الأمة ربتها))، یان ((أن تلد الأمة ربها)) ئەویش ئەوەیه که کوڕ ڕەفتار و هەڵسوکەوت لە گەڵ دایك و باوکیدا دەکات هەروەکو ڕەفتاری گەورەیەك له گەڵ کۆیلەکانی خۆی دەیکات... هەروەها کچ ڕەفتار له گەڵ دایکیدا دەکات وەکو ڕەفتاری کچه خانەدان و گەورەیەك له گەڵ کەنیزەکەیدا. داوا لە خوا دەکەم بەرکەت بخاتە ژیانی دایك و باوکمانەوە، لە دونیا و دوارۆژدا ڕەحمیان پێ بکات... خودایه ئەگەر باوك و دایکی ئێمه ئێستا لە بەر دەستی تۆدان ئەوا ڕەحمەت و میهرەبانی خۆت برژێنه به سەریاندا و نیشتەجێی بەهەشتی بەرینیان بکه وه هەر یەکێ لەوان ئەگەر زیندووه ئەوا لەسەر گوێڕایەڵی خۆت بیانژێنه وه ئێمه و ئەوان لەسەر سوننەتەکەی پێغەمبەرەکەتﷺ و دینەکەی خۆت بمرێنه ...یا أرحم الراحمین.

---

١ـ أخرجه مسلم، کتاب البر والصلة والآداب، باب فضل صلة أصدقاء الأب و الأم و نحوهما (٢٥٥٢).

## دەرکەوتنی خراپەکاری و بچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی

لەم بەشەدا باسی نیشانەیەکی تر دەکەم کە دەرکەوتووە و بڵاوبووەتەوە بە شێوەیەکی وا کەسی ئیماندار باوەڕی زیاد دەکات بەو کەسەی، کە هەرگیز لە خۆوە قسە ناکاتﷺ.

لەگەڵ مندا بیر بکەرەوە لەم فەرموودەیە کەوا ئیمامی ئەحمەد لە (مسند)ەکەیدا و الحاکم لە(مستدرك)ەکەیدا و جگە لەوان[1] ڕیوایەتیان کردووە لە فەرموودەیەکی (عبدالله ی کوڕی عمرو)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((لا تقوم الساعة حتى يظهر الفحش والتفاحش وقطيعة الرحم وسوء المجاورة)) ، واتە: قیامەت هەڵناسێت تاوەکو خراپەکاری و زمانپیسی و بچڕاندی پەیوەندی خزمایەتی و خراپ مامەڵە کردن لەگەڵ هاوسێدا بڵاو نەبێتەوە)) خێراکەن با پێکەوە لەگەڵ یەکەم نیشانەدا ڕابوەستین، کە لەم فەرموودەیەدا هاتووە، ئەویش فەرموودەکەی پێغەمبەری خوایەﷺکە دەفەرموێت: ((حتى يظهر الفحش والتفاحش))...

جا کەوابوو ((الفحش والتفاحش)) چییە؟

ابن منظور و ابن الأثیرو جگە لەوان لە ئەهلی زمانەوانی فەرموویانە[2]: ((الفحش و التفاحش بریتییە لە هەموو وتەو کردەوەیەکی ناشیرین و ناقۆڵا)) بە ڕاستی وتە و کردەوەی ناشیرین و ناقۆڵا و نارێك بڵاو بووەتەوە بە شێوەیەکی وا کەسی ئیماندار باوەڕەکەی بە فەرموودەکانی پێغەمبەری خواﷺ زیاتر و زۆرتر دەبێت کەوا ئەو ئەم فەرموودانەی فەرمووە، چونکە ئەوانە چەند وشەیەکن لە چرای پێغەمبەرایەتییەوە دەردەچن.

ئێستا وشەی خراپ و ناشیرین و سووك و ڕیسوا زۆر بووە – گەردنم ئازاد بکەن ئەگەر بڵێم: لە زۆر ماڵ و لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن و لە فلیمەکان و لە زنجیرەکاندا و

---

١ـ أخرجه أحمد (٢ / ١٦٢، ١٦٣، ١٩٩)، والحاكم (١ / ١٤٧)، وصححه ووافقه الذهبي، وفي (٤/٥٥٨)، والبزار في ((مسنده)) (٢٤٣٥)، وعبدالرزاق في ((مصنفه)) (٢٠٨٥٢)، وصححه الشيخ أحمد شاكر والشيخ شعيب.

٢ـ لسان العرب (٦/٣٢٥) مادة: ((فحش)).

لە کەناڵە ئاسمانییەکاندا بەڵکو چەندەها کەناڵ بە تـەواوی تایبـەت کراوە بـۆ وێنـە گرتنی خراپەکاری و داوێن پیسی!

ابن الأثیر دەڵێت[١]: ((زۆرجار وشـەی (الفاحـشة) بـە مانـای زینـا دێـت هـەروەکو چۆن خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ﴾ النساء: ١٩،واتـە: جا مەگەر بە ئاشکرا داوێن تەڕی و زینا بکەن، یان هەر کارێکی تری نابەجێ بکـەن، دیارە ئەو کاتە ڕەوایە ناچار بکرێن و تەڵاق بدرێن)).

دەڵێم: خراپەکاری و زینا وێنەگیراوە و هاتووەتە ناو زۆربەی ماڵی موسڵمانانەوە – ولا حول ولا قوه الا بالله – بەڵکو چەندەها گۆڤار و کەناڵ تایبەت کراون بۆ وێنە گرتنی زیناکاری و خراپەکاری –هەروەکو لە پێشدا باسم کرد – تـۆ جـاری وا هەیـە وشـەیەکی زۆر نـامۆ لـە کوڕێـك لـە کوڕەکانتـەوە دەبیـسی و سەرسـام دەبیـت و دەڵێیـت: چـۆن کوڕەکـەم ئـەم قـسەیەی کـرد و بـە زاریـدا هـات! ؟ ئـەو کـوڕە ئـەو وشەیەی لە ماڵەوە نەبیستووە، کەوابوو ئەو وشـەیەی لـە کوێـوە هێنـا؟ ڕەنگـە لـە دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە، یان لەسەر شەقام گوێی لێ بووە، یان لە قوتابخانـە، یـان لـە هـەر هۆکارێـك لـە هۆکارەکـانی ڕاگەیانـدن... هتـد، ئێـستا زۆر وشـەی خـراپ دەرکەوتووەو چەندەها وشەی سووك و ریسوا لە زۆربەی جێگاکان بڵاو بووەتـەوە و چەندەها کردار و کردەوە کە ئابڕوو لەکەدار دەکەن بـەڵکو جـاری وا هەیـە دیـن لـە بنەچەوە هەڵدەکێشێ وە دڵەکان پڕ لە خراپەکاری دەکات و ئـەم کـردەوە خـراپ و سـووکانە دەبنـە هـۆی ئـەوەی جـاری وا هەیـە خوانـاس و زاهیـدەکان دەگـۆڕێن بـە کەسـانی خراپـەکار و بـەدکار ئەگـەر ڕەحمـەتی خـوای کـارزان باڵادەسـتیان پـێ نەگات... بەڵی ئێستاوشەو قسەی خـراپ دەرکـەوتووە و کـردەوە و کـرداری خـراپ دەرکەوتووە بە شـێوەیەکی ڕوون و ئابڕووبـەر، ئـەخلاقیات و ڕەوشـتەکان لـە ڕێگـا لایان داوە... باوەڕم پێ بکەن ئەگەر بڵێم: ئێستا تەنگانەی ئەم ئوممەتە تەنگانـە و نەبوونی ئەخلاق و ڕەوشتە... ڕەنگە کەسێك بڵێت: ئێمە سامانمان دەوێت... ئێمـە چەکمان دەوێت... ئێمە ئابووریمان دەوێت... بەڵێ... من نکۆڵی لـێ ناکـەم... لـە

١ـ ((النهایة)) (٣/٧٩٠).

پایە و قەدری ئەوانە کەم ناکەمەوە... بەڵام من پرسیارت لێ دەکەم — برا خۆشەویستەکەم — ئایا نرخی ئابووری چییە؟ نرخی زانست و زانیاری چییە؟ نرخی فلان و فلان چییە؟... ئەگەر ئاکار و ڕەوشت نەما و لەناوچوو؟ سوێند بە خوا هەموو ئەمانە هیچ نرخیان نییە.

إنما الأمم الأخلاق ما بقيت فإن هموا ذهبت أخلاقهم ذهبوا

واتە: مانەوەی هەر ئوممەتێك پەیوەستە بە ئاکار و ڕەوشتەوە ئەگەر ئاکارەکانیان ڕۆیشت ئەوا ئەوانیش لە ناو دەچن))...

زانایەکی بێ ڕەوشت فیتنەیە بە سەر ئوممەتەکەیەوە.. پزیشکێکی بێ ڕەوشت فیتنەیە بە سەر نەخۆشەکانەوە و بە سەر ئوممەتەوە... ئەندازیارێکی بێ ڕەوشت فیتنەیە بە سەر خەڵکی و بە سەر ئوممەتەوە، من تەنها یەك نموونەتان بۆ دەهێنمەوە: وا دابنێ ئەندازیارێك — هەرچەندە پلەی گەورە بێت — بە دەیان مەلایین دینار ودۆلاری لە بەر دەستدایە ..داوای لێ کرا بە چاککردنی کۆمەڵێك لە ڕێگاکان یان بە دروست کردنی کۆمەڵە بورجێك بەڵام تووشی نەخۆشی (غەش) فێڵ هاتووە... هیچ ڕەوشتی نییە... ڕەوشتی سپاردەی لە دەستداوە... ئایا ئەنجامەکەی چی دەبێت؟ دەبێتە هۆی ڕووخانی ئەو هەموو کۆشك و تەلارانە... ڕشتنی خوێنی دەیان و سەدان کەس... چەندەها ڕێگە چاك دەکرێتەوە لە هەمان ئەو ساڵەی کە چاك کراوەتەوە پێویستی بەوەیە جارێکی تر چاکی بکەیتەوە!

با ئەوەش بزانین کەوا ئەم جۆرە ڕەوشتانە پێویستی بە ڕێنمووی کەس نییە... ئەو کەسە کە پاشماوەکەی خۆی لە ئۆتۆمبیلەکەیەوە فڕێ دەداتە سەر ڕێگا گشتییەکان... ئەو کەسەی کە پاشماوەکەی خۆی فڕێ دەدا، لە سەیرانگایەکی جواندا کە بۆ ئەو و جگە لەو ئامادە کراوە... بە شێوەیەك پاشماوەی خواردن و خواردنەوەکەی بە جێ دەهێڵێ کە ئازارەکان زیاتر دەکەن... ئەمە پێویستی بە ڕێنمووی هیچ کەس نییە... ئەم کابرایە کە ڕاوەستاوە — دوور لە ڕووی ئێوە — میز دەکاتە ناو ڕووباری (نیل)ەوە یان بە خراپە مامەڵە لە گەڵ ئەو کەنارە جوانەی (نیل) دا دەکات بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی خراپەکاری... ئەمە خراپەکارییە

لـە وتـە و کـرداردا... ئـەو ڕەوشـتە ڕیسوایە هـیچ پێویـست ناکـات بـە ڕێنمـوویی کەسێك...

چونکە حەق وایە ئێمە چاودێری خـوای بـەرز و باڵادەست بکـەین... بەڵایـەکی گەورەتر ئەوەیە کە ئاوەڕۆکان بخەینە ناو ڕووباری (نیل)ەوە یان بۆ هەر ڕووبارێکی تر یان بۆ ئەو ئاوانەی کە کێڵگەکان و باخچەکان و بەرهەمەکانی پێ ئاو دەدرێت... هەموو ئەو ڕەوشتانە پێویستی بە ڕێنمـووی کەسـێك نییـە... چـونکە مـن کەسـێکی موسڵمانم پێویستم بەوە نییە بەرپرسێك یان هەر کەسێکی تر یادم بخاتەوە... پـێم بڵێت: ئەوە بکە و ئەوە مەکە... بەڵکو دەبێت من چاودێری خواکەی خۆم بکەم...

لەگەڵ مندا بیر بکەرەوە... بۆ ئەوەی بزانیت کە کێشەیانە ڕەنگـە زۆر کـەس لـە بـرا و خوشـکانمان بـە کـەمی بـزانن ڕەنگـە ببێتـە هۆیـەك لـە هۆیـەکانی پەسـتی و تووڕەیی خوای گەورە لەسەر بەندەکانی، هەر خراپەیەك لە وتـە و کـردەوەدا ڕەنگـە ببێتە هۆی پەستی خوای گەورە لێمان... بەڵێ سوێند بە خـوا... ((لا تقـوم الـساعة حتى يظهر الفحش والتفاحش)) واتە: وتەو کردەوەی خراپ، ئێستا وتـە و کـردەوەی خراپ بڵاوبووەتەوە و لا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم ...

لە فەرموودەیەکی (صحیح)دا کە (أحمد)و (ابن حبـان)و جگـە لـەوان ڕیوایـەتیان کردووە بە سەنەدێکی (صحیح)[1] لـە فـەرمووودەی (اسـامە ی کـوڕی زیـد)ەوە کـەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إن الله يبغض الفـاحش المـتفحش)) واتـە: خـوای گەورە ڕقی لە هەموو کەسێکی خراپەکار و زمانپیسە)).

هەرگیز تەنها وشەیەك بە کەم مەزانە، ڕەنگـە چـەند وشـەیەك ببیـسی و دڵـەکان بهێننە لەرزە لە هۆکارێك لە هۆکارەکانی ڕاگەیاندنەوە و ببێتە هۆی لەکەدار کردنـی هەموو ئافرەتێك... هـەر مرۆڤێـك شـەرم دەکـات کـە خێزانەکـەی یـان کـچەکەی لـە گەڵیدا دانیشتووە بیبیسێ... ڕەنگە چەند وشەیەکی زۆر سووك و ڕیسوا لە بازاڕێك لە بازاڕەکانەوە ببیسی... لە هۆکارێك لـە هۆکارەکـانی ڕاگەیانـدن... ڕەنگـە چـەند

---

١ ـ أخرجه أحمد (٥/٢٠٢)، وابـن حبـان (٥٦٩٤)، والطبراني في ((الكبير)) (١ / ١٦٥، ١٦٦)، و((الأوسط)) (١/١٠٦)، وصححه الألباني في ((الإرواء)) (٧ / ٢١٠)، و((الصحيحة)) (٨٧٦).

وشەیەك لە گۆڤارێکەوە ببیسی ببێتە هۆی لەکەدار کردنی ئابڕوو، بەڵکو ڕەنگە جاری وا هەبێ تەنانەت لە ڕۆژنامەیەکی فەرمییەوە دەردەچێت ! ئاه ه ئەگەر خوای گەورە لە بەندەیەك پەست بێت... ئای ئەوە چ خەسارەتێکە !! بەدبەخت و چارەڕەشە — سوێند بە خوا — ئەو کەسە لە دونیا و دوارۆژدا، کاتێك خوای گەورە لێی پەست دەبێت... هەرکەسێ خوا خۆشی بوێت ئەوا لە دونیا و دوارۆژدا خۆشحاڵ و بەختیارە.

بەڵکو لە فەرموودەیەکدا کە پێشەوا (أبو داود و الترمذي)[1] و جگە لەوان ریوایەتیان کردووە بە سەنەدێکی (صحيح) لە فەرموودەیەکی (أبو درداء)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((ما من شيء أثقل في ميزان المؤمن يوم القيامة من حسن الخلق، وإن الله تعالى ليبغض الفاحش البذيء))، واتە: هیچ شتێك نییە لەسەر ترازووی ئیماندار قورس بێت هێندەی ڕەوشت جوانی، خوای گەورە رقی لە هەموو خراپەکارێکی زمانپیسە)).

ئەو جۆرە قسانە بەکارمەهێنە نە لە گەڵ خێزانەکەتدا و نە لەگەڵ منداڵەکانتدا و نە لەگەڵ سەرگەورە و خوار دەستەکانتدا لەسەر کارەکەت وە نە لە گەڵ هیچ برایەکت لە موسڵمانان یان خوشکێکی موسڵمانان لە جێگایەکی گشتیدا یان تایبەتی... سوێند بە خوا ئەو تەنگانەی کە ئێستا دڵەکان لە بن دەردەهێنن، نەمان و تەنگانەی ئەخلاقە ..چونکە من — هەروەکو باسم کرد— پێویستم بەوە نییە کەسێك ڕێنماییم بکات، بەڵکو لە سەرمە کە چاودێری خوا بکەم ... بۆ جوێن بە خێزانەکەم بدەم؟ بۆ جوێن بەمنداڵەکەم بدەم بە نابوتترین وشە و قیزەون ترین دەستەواژە ؟ بۆ جوێن بە وڵاخی سوار بوونەکەم بدەم؟ تەنانەت لە گەڵ وڵاخەکەتدا بە ژیری و ڕەوشتەوە هەڵسوکەوت بکە. تەماشای ڕەوشتی هەڵبژێردراو بکەﷺ ئەو کەسەی کە هەموو دونیای فێری ڕەوشت و ئەخلاق و ئاکاری جوان و ڕێز کردووە... بەڵکو، لە گەڵ مندا بیر لەم فەرموودە ناسك و جوانە بکەرەوە... بەڵام لە پێشدا

---

١ ـ أخرجه ابو داود،كتاب الأدب، باب في حسن الخلق (٤٧٩٩)، والترمذي، كتاب البر والصلة، باب ما جاء في حسن الخلق (٢٠٠٢) وقال: ((حديث حسن صحيح))، وأحمد في ((مسنده)) (٦ / ٤٤٢، ٤٤٦، ٤٤٨)، والبخاري في ((الأدب المفرد)) (٤٦٤)، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (٨٧٦) و ((صحيح الجامع)) (٥٦٣٢).

پێشەکییەکم بۆت هەیە، لە پێش ئەوەی ئەو چەند وشە پێغەمبەرایەتییەت ئاراستە بکەم وە پێت دەڵێم: ئایا پێغەمبەری خوات خۆش دەوێتﷺ ؟ من دەزانم کەوا تۆ خۆشت دەوێت... بە شەو و بە ڕۆژ لە خوا دەپاڕێیتەوە کە لە گەڵ ئەودا بیت... وە ئایا باوەڕ دەکەیت کە دەتوانیت ببێتە کەسێك لە گەڵ خۆشەویستداﷺ وە ببیتە کەسێك لە نزیکترین پایە و مەجلیسی ئەو لە ڕۆژی قیامەتدا؟ بەڵێ، بەڵام بە چی؟ بە ڕەوشت جوانی دەتوانی بگەیتە ئەو پلە و پایەیە ...

بیر بکەرەوە کە خۆشەویستەکەمانﷺ چی فەرمووە... هەروەکو لە فەرموودەیەکدا کە (ابو داود) و جگە لەو ریوایەتیان کردووە بە سەنەدێکی (صحیح)[١] لە فەرموودەی (عائیشە)ی دایکی ئیماندارانەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إن المؤمن ليدرك بحسن خلقه درجة الصائم القائم)) واتە: کەسی ئیماندار بە ڕەوشت جوانی دەگاتە پلەی ڕۆژووانێك بەردەوام شەونوێژ بکات)) .

سوێند بە خوا ئیسلام هەمووی جوانییە... ئەدەبە... ناسك و نەرمییە وە محمدﷺ ئەو کەسەیە کە هەموو دونیای فێری ڕەوشت و ئەدەب کردووە... ئەو تۆقاندن و توندڕەویی خراپەکاری و ریسوایی نەهێناوە بۆ ئەم دونیایە و وتەی خراپ و کرداری خراپی نەهێناوە ... نەخێر دوور لە ئەو... هەر نەفامێك لەسەر ڕووی زەویدا لە هەر پلەیەکدا بێت و لە هەر پایەیەکدا بێت کە زمان درێژی دەکاتە سەر پێغەمبەری خواﷺ ئەوە کەسێکە هیچ دەربارەی ئەو خۆشەویستە نازانێ و هیچی دەربارەی ژیانی ئەو نەخوێندووەتەوە... جارێکی تر تەلەفزیونی دانیمارکی گەڕایەوە بۆ ئەوەی ئەو وێنە سووکانە بڵاو بکاتەوە کەوا خراپە دەکات بەرانبەر بە پاکی پاك، بەرانبەر بە شەرەفی شەرەف و کەرامەتی کەرامەت و وەفای وەفا و مرواری سەر تاجی هەموو مرۆڤایەتی... چونکە ئەو نەفامانە هیچ شتێك دەربارەی پێغەمبەری پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکانﷺ نازانن دەربارەی ئەو کەسە کە هەموو دونیای فێری ئەخلاق و ئەدەب و وەفا کردووەﷺ ... ئاه ئەگەر ئەوان ژیاننامەیان بخوێندبایەتەوە و ئەخلاق و بەرنامەکەی ئەویان بزانیبایە ... لە

---

١ ـ أخرجه ابو داود،كتاب الأدب باب في حسن الخلق (٤٧٩٨)، وأحمد (٦/٦٤، ٩٠، ١٣٣، ١٨٧)، والحاكم (١/٦٠)، وابن حبان (١٩٢٧)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (١٩٣٢)، و ((الصحيحة)) (٧٩٥).

ڕاستیدا دەڵێم: کێشەکە کێشەی ئێمەیە، کێشەی ئەم ئوممەتەیە، چونکە ئێمە تاکو ئێستا شایەتیمان نەداوە بە دیداری پێغەمبەری نازدارﷺ بە شایەتییەکی ئەخلاقی و شایەتییەکی ڕەوشتی و شایەتییەکی کرداری، ئەگەر کەسێك لە ئەهلی کوفر هات بۆ جێگایەکی گشتی لە یەکێك لە سەیرانگاکانی سەر کەناری جوانی ڕووباری (نیل)، ئەو (نیل)ە کە خوای گەورە کردوویەتیە ئایەتێك لە ئایەتەکانی جوانی و نیعمەتێك لە نیعمەتەکانی خۆی بە سەرمانەوە... ئەگەر ئەو کابرایە هات و لەسەر ئەو کەنارە ڕێی دەکرد و ئەوەی کە ئێمە دەیبینین ئەویش بینی! پیاوێکی بینی لە گەڵ خێزانەکەیدا و لەم جێگا جوانە لە گەڵیاندا بە خۆشگوزرانییەوە خواردنەکەیان خوارد– داوا لە خوا دەکەم کەوا ئەوە بکاتە یارمەتی دەرێکمان بۆ ئەنجامدانی گوێڕایەڵی– بەڵام لە پاش خواردنەکە هەموو پاشماوەکەی لە جێگاکەی خۆی بە جێ هێڵا و دەبێتە هۆی ئەوەی کەوا هیچ کەسێکی تر چیتر ناتوانێ لەو جێگەیە دانیشێت بە هۆی کردەوەکەیەوە، ئەگەر ئەم دیمەنە ببینێ... زۆر ئەستەمە لە پاش ئەوە پێی بڵێیت: کەوا ئیسلام هانی داوین بۆ پاك و خاوێنی، هانی داوین بۆ جوانکاری ئەوا وەڵامت دەداتەوە و پێت دەڵێت: واز لەوە بهێنە چونکە ئەگەر قسە لە گەڵ کردەوەدا جوودا بوو ئەوا بەڵگەی بوونی تۆوی دووڕوویییە لە دڵەکاندا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ﴾ الصف: ٢- ٣، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! بۆچی شتێ دەڵێن و ڕەفتاری پێ ناکەن؟ (٢) خوا لە لای سەختە کە شتێ بڵێن و کاری پێ نەکەن! (٣))).

چۆن داوا لە منداڵەکەم بکەم کەوا ڕەوشتی جوان و بەرز بگرێتە بەر لە کاتێکدا خۆم دەبینی کەوا زۆربەی قسەکانم بریتین لە وشەی سووك و ریسوا و خراپ و بە هیچ شێوەیەك پەیوەندی بە ڕەوشتی جوانەوە نییە و بە هیچ شێوەیەك پەیوەندی بە سیفات و ڕەوشتی کەسی ڕێزدارەوە نییە، سووك و ریسوایی لە وتە و کردەوەدا، هەموو ئەوانە هۆکارن لە هۆکارەکانی پەستی خوای گەورە بە سەر بەندەکانییەوە، لە هەمان کاتدا ڕەوشتی جوان خاوەنەکەی دەگەیەنێتە پلەی کەسانێك کە بە ڕۆژ بەڕۆژوو ببێت و بە شەوان شەونوێژ بکات بۆ خوای گەورە.

ئایا چاکەیەکی تری ڕەوشت جوانیت بۆ باس بکەم؟ ئایا دەتەوێت ببیتە کەسێکی نزیکی پێغەمبەری خواﷺ ؟ بەڵێ ئەوە ئاواتمە... کەواتە لە گەڵ مندا بیر لەو فەرموودەیە بکەرەوە کەوا (الترمذي) و جگە لە ئەو ریوایەتیان کردووە بە سەنەدێکی (صحیح)[١] لە فەرموودەی (جابر ی کوڕی عبدالله) ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إن من أحبكم إلي..)) واتە: خۆشەویسترین کەستان لای من...)) ئەوە کێیە کە دەبێتە خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ و کەسێکی نزیکی ئەو لە رۆژی قیامەتدا؟ فەرمووی: ((إن من أحبكم إلي وأقربكم مني مجلسا يوم القيامة أحاسنكم أخلاقا)) واتە: خۆشەویسترین کەستان لای من و نزیکترین کەستان لە منەوە لە رۆژی قیامەتدا ئەوانەتانن کە رەوشتی لە هەمووان جوانترە)).

کەسێك دەبینی ناتوانێت وشەی هیچ پووچ بێت بە زاریدا... ئەگەر ئەو وشەیەی لێ دەرچوو دەبینی شەرم دەکات و لە خۆی شەرم دەکات بە هۆی وتنی ئەو وشەیەوە وە بەردەوام داوای لێبوردن دەکات وە داوای لێبوردن لە خوای گەورە دەکات چونکە حەز ناکات کە وشەی سووك و ریسوا لە زاری دەرچێت و پێی خۆش نییە کە هیچ وشەیەك بە زاریدا بێت و هەستی کەسێك بریندار بکات... ئەم کەسە خۆشەویستی پێغەمبەری خوایەﷺ و لە پێغەمبەرەوە نزیکە و لەوانەشەوە نزیکە کە پشتگیر و کۆمەڵی ئەون...

ئەوە (عبدالله ی کوڕی عمرو ی کوڕی العاص) ە رەزای خوا لە خۆی و باوکی بێت ... تەماشاکە چی دەڵێت:؟ دەڵێت: (هەروەکو لە هەردوو کتێبی صحیح دا هاتووە)[٢] ((لم يكن رسول اللهﷺ ، فاحشا، ولا لعانا، ولا سبابا))، واتە: پێغەمبەری خواﷺ بە هیچ شێوەیەك کەسێکی بەدگۆ و نەفرەتکەر و جنێوفرۆش نەبووە)) .

لە گوتەیەکی تردا هاتووە: ((لم يكن النبي ﷺ فاحشا ولا متفحشا))، واتە: بە هیچ شێوەیەك پێغەمبەری خواﷺ کەسێکی بەدگۆ و زمانپیس نەبووە)) .

---

١ ـ أخرجه الترمذي كتاب البر والصلة، باب ما جاء في معالي الأخلاق (٢٠١٨) وقال: ((حديث حسن غريب من هذا الوجه))، والخطيب البغدادي في تاريخه (٦٣/٤)، و ((مساوئ الأخلاق)) للخرائطي (٥٩، ٥٥٢) و ((مكارم الأخلاق)) للطبراني (٦)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٢٢٠١) و ((الصحيحة)) (٧٩١).

٢ـ أخرجه البخاري، كتاب المناقب، باب صفة النبيﷺ (٣٥٥٩)،ومسلم كتاب الفضائل باب كثرة حيائه (٢٣٢١).

ئایا ئەو پێشەنگ و چاولێکراو نییە؟

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ الأحزاب: ٢١، واتە: بە ڕاستی پەیامبەری خواﷺ چاکترین نموونەی ڕێك و پێکی و سەرمەشقە بۆتان)).

جـاری وا هەیـە- هەنـدێ جـار- چـەندەها دەزگـای ڕاگەیانـدن دەبـینی لـە ڕێگایەکـەوە پێـی نازانیـت یـان لـە ڕێگایەکـەوە پێـی دەزانـی...کـەوا زۆر جار لای زۆربەی ڕۆڵـەکانمان کێشەی دابـڕان (انفـصام) دروسـت دەکـەن، منداڵەکـەی مـن و منداڵەکەی تۆ دادەنیشن بۆ ئەوەی ئەکتەرێك لە ئەکتەرەکان ببـینێ لـە فلیمێـك لـە فلیمەکان چەندەها وشەی زۆر نابوت و ناشیرین بە زاریدا دێـت... ئـەمجار لـە پـاش ئەوە ئەو ئەکتەرە دێـت بـۆ ئـەوەی ڕۆڵێکـی تـر ببـینێ، ڕۆڵـی کەسـیکی دینـدار لـە زنجـیرە فلیمێکـی ئایینیـدا ! بۆیـە ئـەم منداڵـە پرسـیار لـە دایکـی یـان لـە بـاوکی دەکات...ئایا ئەم ئەکتەرە هەمان ئەکتەر نییە کەوا لە فلان فلیمدا دەیگـوت ئـاوا و ئاوا؟ بۆیە لێرەدا ئەو منداڵە توشی دابڕانێك (انفصام) دەبێت لە کەسـایەتییەکەیدا، لای ئەو منداڵە خراپەکاری و چاکەکاری یەکـسان دەبێـت... !ئایـا بـۆ ئـەم کابرایـە جـاری پێـشوو چـەند وشـەیەکی خراپـی دەگـوت کەچـی ئێـستا ئـاوا دەڵێـت و ئـاوا دەکات... ! ؟

براکـانم ... ئەمانـە هـەمووی شایـستەی تـۆ نـین... چـونکە پێـشەنگی ئێمـە پێغەمبەری خوایەﷺ کە هیچ ڕۆژێك بەدگۆ و زمانپیس نەبووە...

من ئێستا لە تۆم دەوێت – هەروا بە پەلە- کەوا چەند هەڵوێستێك بهێنیتە پێش چاوی خـۆت کـە پێغەمبـەری خـوایﷺ تیایـدا توشـی تەنگانـە بووبێـت... لـە گـەڵ ئەوەیشدا هیچ کاتێك توشی ڕەفتاری نارێك و ناشیرین نەهاتووە و ڕەفتـاری خراپـی ئەنجام نەداوە و قسەی ناڕەوای بە زاردا نەهاتووە...

لە سەرەتاوە بـا لـە ماڵەکەیـەوە دەسـت پـێ بکـەین ...لـە عائیـشەوە ریوایـەت کراوە[١] و دەڵێت: ((كان رسول اللهﷺ يـشرب عـسلا عنـد زينـب بنـت جحـش، ويمكـث عندها، فواطيت أنا وحفصة على: أيتنا دخل عليها فلتقل لـه: أكلـت مغـافير، إنـي أجـد

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب التفسير باب سورة التحـريم (٤٩١٢) و (٥٢١٦) و (٥٢٦٨)، ومـسلم كتـاب الطـلاق باب وجوب الكفارة على من حرم امرأته ولم ينو الطلاق (١٤٧٤).

منك ريح مغافير، قال: (( لا، ولكني كنت أشرب عسلا عند زينب بنت جحش، فلن أعود له، وقد حلفت، لا تخبري بذلك أحدا )) واته: پێغەمبەری خواﷺ دەچوو بۆ لای زینب ی کچی جحش و لەوێ هەنگوێنی دەخوارد و لای ئەو دەمایەوە، جا لە گەڵ حفصە دا ڕێك کەوتین کەوا ئەگەر پێغەمبەری خواﷺ هات بۆ لای هەرکاممان ئەوا پێی بڵێت: ئایا (مغافیر) ت خواردووە؟ چونکە من بۆنی (مغافیر) لە تۆوە دەبیسم؟ – مغافیر– جۆرە رووەکێکە و لە زەوی دورگەی عەرەبی سەوز دەبوو وە بۆنێکی لێ دێت کەوا خۆش نییە)) فەرمووی: نەخێر... بەڵام لای زینب ی کچی جحش بووم و لەوێ هەنگوێنم خوارد چیتر ناگەڕێمەوە بۆ ئەو خواردنە وە من سوێندم خواردووە بەڵام قسە بۆ کەس مەکە)) غیرەت چووە دڵی عائیشە و حەفصەوە، بۆیە ڕێك کەوتن لەسەر پێغەمبەری خواﷺ ... چونکە پێغەمبەری خواﷺ دەچووە ماڵەکەی (زینب ی کچی جحش)ەوە و لەوێ زۆر دەمایەوە کاتێ پێغەمبەری خواﷺ لە ماڵەکەی زینب هاتە دەرەوە چووە ماڵەکەی (حفصە) ەوە کەچی ئەو لێی دوور کەوتەوە! چی بووە؟ حفصە فەرمووی: ((إني أجد منك ريح مغافير))، واتە: من بۆنێك لە تۆوە دەبیسم کە بۆنێکی خۆش نییە!!)) ئایا پێغەمبەری خواﷺ وا بووە؟نەخێر بەڵکو عارەقەکەی پێغەمبەری خواﷺ زۆر بۆن خۆشتر بووە لە گوڵاو و بۆنی خۆش ...

ئەگەر بەڵگەت دەوێت – براکەم – ئەوا بەڵگەی زۆرمان لایە...

هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحيح)[1] دا هاتووە لە (أنس ی کوڕی مالك) ەوە کەوا فەرموویەتی: ((خدمت رسول اللهﷺ عشر سنين، والله ما قال لي: أفا قط ولا قال لي لشيء: لم فعلت كذا و هلا فعلت كذا ؟))، واتە: دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەری خوام کردﷺ سوێند بە خوا هەرگیز بە منی نەگوت: ئۆف... وە هەرگیز بە منی نەگوت بە هۆی شتێکەوە: بۆ وات کرد و خۆزگە وات بکردایە)).

هەروەها لە (أنس)[2]ەوە دەڵێت: ((ما مسست حريرا ولا ديباجا ألين من كف

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب الأدب باب حسن الخلق والسخاء وما يكره من البخل (٦٠٣٨)، ومسلم كتاب الفضائل باب كان رسول الله ﷺ أحسن الناس خلقاً (٢٣٠٩).

٢ـ أخرجه البخاري، كتاب المناقب، باب صفة النبي ﷺ (٣٥٦١)، ومسلم كتاب الفضائل باب طيب رائحة النبيﷺ ولين مسه والتبرك بمسحه (٢٣٣٠، ٢٣٣١) واللفظ له.

النبيﷺ وما شممت ريحا قط - مسكا ولا عنبرا - أطيب من ريح رسول الله ﷺ .واتـه: هـەرگیز دەسـتم نـەداوە لـە هـیچ ئاوریـشمێك و هـیچ پـەشمێك لـە دەسـتەکانی پێغەمبەرﷺ نەرمتر بێت وە هەرگیز بـۆنی هـیچ میسك و عەنبـەرێکم نـەکردووە لـە بۆنی پێغەمبەرﷺ خۆشتر بێت)) .

دخل علينا النبيﷺ فقال - أي: نام وقت القيلولة - عندنا، فعرق، وجاءت أمـي بقارورة، فجعلت تسلت العرق فيها، فاستيقظ النبيﷺ فقـال: " يـا أم سـليم مـا هـذا الذي تصنعين؟ "قالت: هذا عرقك نجعله في طيبنـا، وهـو مـن أطيـب الطيـب))، واتـه: پێغەمبەری خواﷺ هات بۆ لامان لای ئێمە خەوت (لە کـاتی دەمـەو نیـوەڕۆدا)، جـا ئارەقەی کرد، بۆیە دایکم شووشەیەکی هێنا و وای لێ کـرد کـە ئارەقـە بڕژێتـە نـاو شووشەکە، ئەمجار پێغەمبـەری خـواﷺ لـە خـەو هەسـتا و فـەرمووی: ئـەی دایکـی سلیم ئەوە خەریکی چیت؟ فەرمووی: ئەمە ئارەقەکەی تۆیە و ئێمـە دەیکەنـە نـاو بۆنە خۆشەکانمانەوە و ئەویش لە هەموو بۆنە خۆشەکان بۆنخۆشتر)) .

کەچی حفصە دێت و دوور دەکەوێتەوە و بە پێغەمبەری خـواﷺ دەڵێـت: ((إنـي أجد منك ريح مغافير)) بۆیە لێرەدا پێشەنگ و پەروەردەکار دەڵێت:(دایك و باوکم بە فیدای بێت) ((لا، ولكني كنت أشرب عسلا عند زينب بنـت جحـش))، واتـە: نـەخێر... بـەڵام لای زینـب ی کـچی جحـش بـووم و لـەوێ هـەنگوێنم خـوارد)) ئـەمجار لـەوێ دەردەچێت و دەچێتە ژوورەوە بۆ لای عائیشە ئەویش دوور دەکەوێتەوە و دەڵێـت: ((إني أجد منك ريح مغافير)) ئەویش دەڵێت: ((لا، ولكني كنت أشرب عسلا عند زينب بنت جحش، فلن أعود له)).

برای خۆشەویستم... بیهێنە پێش چاوی خـۆت ڕۆژێـك لـە ڕۆژان خێزانەکـەت بـە تـۆی گـوت: بۆنـت خـۆش نییـە... ڕەنگـە ڕاسـتیش بکـات چـونکە تـۆ لەسـەر کـار گەڕاویتەتـەوە و بۆنەکـەت گـۆڕاوە و خێزانەکـەت بـە ڕاشـکاوی پێـت دەڵـێ.. ئایـا کاردانـەوەت چـۆن دەبێـت؟ وە ئایـا وەڵامـی تـۆ چـی دەبێـت؟ دەڵـێم: تەماشـای پێغەمبەری خواﷺبکە کە دەڵێت (بە بێ هیچ هەڵچوونێك): ((لا، ولكـني كنـت أشـرب عسلا عند زينب بنت جحش، فلن أعود له)).

بە ڕاستی ئەمە ڕەوشت و ئەخلاقی پێغەمبەری هەڵبژێردراو بووەﷺ: (((لم یكن فاحشا ولا متفحشا)) وە هەندێ جار هەڵویستی وا هەیە ڕەنگە ببێتە هۆی تەنگكردنی پێغەمبەری خواﷺ لە گەڵ ئەوەیشدا پێغەمبەری خواﷺ بە لوتكەی ئەدەبەوە و بەم ڕەوشتە جوانە وەڵامی دەداتەوە... جارێكیان شتێك ڕوویدا لە نێوان عائیشە و پێغەمبەری خواداﷺ بۆیە پێغەمبەری خوا(ابو بكر)ی بانگ كرد بۆ ئەوەی ببێتە دادوەرێك لە نێوان ئەو و عائیشەدا...

عبدالرزاق لە (مصنف)ەكەیدا و ئیمامی ئەحمەد لە (فضائل الصحابة)دا و ابن حبان لە (صحیح)[١] ەكەیدا بە سەنەدێكی (صحیح) ڕیوایەتیان كردووە و چەند (شواهد) ێكی هەیە لە فەرموودەیەكی عائیشەوە: ((أن النبيﷺ استعذر أبا بكر من عائشة ولم یظن النبيﷺ أن ینال منها بالذي نال منها فرفع أبو بكر یده فلطمها وصك في صدرها فوجد من ذلك النبيﷺ وقال: " یا أبا بكر ما أنا بمستعذرك منها بعد هذا أبدا)) كەوا پێغەمبەری خواﷺ گلەیی كرد لە عائیشە لای ابوبكر، پێغەمبەری خواﷺ نەیدەزانی كەوا عائیشە ئەوەی تووش دەبێت كە لە لایەن ابو بكرەوە توشی بوو، و ئەبوبەكر دەستی بەرز كردەوەو زلەیەكی دا لە عائیشە كەچی پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((ئەی ئەبو بەكر لەمڕۆ بە دواوە چیتر گلەیی لە ئەو ناكەم لە لای تۆ)).

لە ڕیوایەتێكی تردا لای (عبدالرزاق)[٢] بە سەنەدێكی (معضل) بە گوتەیەك: ((أن النبيﷺ دعا أبا بكر فاستعذره عن عائشة، فبینا هما عنده، قالت: إنك لتقول: إنك لنبي، فقام إلیها أبو بكر فضرب خدها، فقال النبي ﷺ: " مه یا أبا بكر، ما لهذا دعوناك))، واتە: پێغەمبەری خواﷺ بانگی ابوبكری كرد و گلەیی لە عائیشە كرد لای ئەو لەو كاتەی هەردوكیان لای ئەو بوون عائیشە فەرمووی: تۆ دەڵێیت: كەوا

---

١ـ أخرجه عبدالرزاق (٢٠٩٢٣)، وأحمد في ((الفضائل)) (١٦٢٩)، وابن حبان (٤١٨٥) عن عائشة، وله شاهد عن النعمان بن بشیر عند أحمد في ((المسند)) (٤ / ٢٧٢، ٢٧١) و أبي داود (٤٩٩٩)، و صححه الألباني في ((الصحیحة)) برقمین: (٢٩٠٠، ٢٩٠١).

٢ـ في ((مصنفه)) (٢٠٩٢٤).

تۆ پێغەمبەری .... بۆیە ابوبکر هەستا و زلەیەکی لە گۆنای دا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لەسەر خۆبە ئەی ابوبکر ئێمە بۆ ئەمە تۆمان بانگ نەکردووە)).

پێغەمبەری خوا ﷺ بە تەنها وشەیەکی خراپ وڵامی عائیشەی نەدایەوە، بە ڕاستی ئەوە هەڵبژێردراوە، کە هەرگیز کەسیکی بەدگۆ و زمانپیس نەبووە وە بۆیە هەردەم ئەم چەند وشانە دووبارە دەکەمەوە بۆ ئەوەی ئەم مانایە لە دڵی برا و خوشکانماندا جێگیر بێت و ببێتە بنەمایەك...

لە (صحیح مسلم)[1] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی ابو هریرە وە فەرموویەتی: ((قیل: یا رسول الله ادع علی المشرکین قال:"إني لم أبعث لعانا، وإنما بعثت رحمة))، واتە: فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوعا بکە لەسەر بێباوەڕان... ئەویش فەرمووی: من وەکو کەسێکی نەفەرتکەر ڕەوانە نەکراوم بەڵکو وەکو ڕەحمەتێك ڕەوانە کراوم)) ئاواتەخواز بووم ئەگەر هەموو مرۆڤایەتی — بە هەموو ئەوانەی کە موسڵمانیش نین — ئەو هەموو مانا ناسك و جوانەیە لەو کەسەوە کە هەموو دونیای فێری ڕەوشت جوانی و ڕێزی بەرز کردووە بزانن و بناسن)) .

ئەوەتا دایکی ئیمانداران عائیشە[2] پێی دەڵێت: ((یا رسول الله! هل أتی علیك یوم کان أشد من یوم أحد؟ قال: ((لقد لقیت من قومك ما لقیت، وکان أشد ما لقیت منهم یوم العقبة، إذ عرضت نفسي علی ابن عبد یالیل بن عبد کلال فلم یجبني إلی ما أردت، فانطلقت وأنا مهموم علی وجهي، فلم أستفق إلا وأنا بقرن الثعالب))، واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ڕۆژێك بە سەرتدا هاتووە کە لە ڕۆژی ئوحوود سەختتر بێت؟ فەرمووی: لە لایەن قەومەکەتەوە تووش بووم ئەوەی کە تووش بووم، سەختترینی ئەوانە ئەوەی ڕۆژی (العقبە) بوو، لە کاتێکدا خۆم پەنا دا بە (ابن عبد یالیل بن عبدکلال)، کە لەناودار و پیاوماقوڵانی طائف بوو — کەچی وڵامی داواکارییەکەمی نەدایەوە منیش بە خەمبارییەوە دەرچووم وە بە ئاگا نەهاتمەوە ئیللا کاتێك کە وا لە (قرن الثعالب) بووم)) تەماشاکەن چی کرا بە پێغەمبەری

١ـ أخرجه مسلم، کتاب البر والصلة و الآداب، باب النهي عن لعن الدواب و غیرها (٢٥٩٩).

٢ـ أخرجه البخاري، کتاب بدء الخلق، باب إذا قال أحدکم آمین (٣٢٣١)، ومسلم کتاب الجهاد والسیر، باب ما لقي النبي ﷺ من أذی المشرکین والمنافقین (١٧٩٥).

خواﷺ لە طائف: بەردبارانیان کرد، جوێنیان پێدا، شار بەدەریان کرد و توانجیان تێگرت و تورەیان کرد، ئەو خوێنە پاکە لە هەردوو پێیە خوێناوییە ماندووەکەیەوە دەڕۆیشت، ئەو لە مەککەوە ڕۆیشت بۆ طائف بە پێ، سوێند بە خوا هیچ ولاخێکی نەبوو سواری ببێت بەڵکو نزیکەی حەفتا کیلۆمەتر بە پێ ڕێ دەکات، لە کاتێکدا ئەو بۆ ئەوە نەچووە داوای سەروەت و سامانیان لێ بکات یان پایەیەك یان دونیا یان جێگایەکی بەرزی کۆمەڵایەتی بەڵکو بۆ ئەوە ڕۆیشت لە تاریکی شیرك و بتپەرستی دەریان بکات بۆ روناکی یەکتاپەرستی و باوەڕ هێنان بە خوای هەموو بوونەوەر – جل وعلا – کەچی لە گەڵ ئەوەیشدا ئەو کارەیان پێ کرد کەوا سووکترین شتێك بوو مرۆڤێك بە برا مرۆڤەکەی بیکات، پێغەمبەری خواﷺ خوێنی لێ دەتکێ، دەڵێت: ((فلم أستفق إلا وأنا بقرن الثعالب)) واتە: بە ئاگا نەهاتمەوە ئیللا کاتێك کە وا لە (قرن الثعالب) بووم)) جێگایەکە کە لە طائف ەوە نزیکەی پێنج کیلۆمەتر دوورە.. پێغەمبەری خواﷺ بە خەمبارییەوە ڕێ دەکات، چونکە بانگەواز لە مەترسیدایە، شوێنی خاوەنی بانگەوازەکە کەوتوون و هاوەڵەکانی لە حەبەشە شوێنیان کەوتوون و لە مەککە ئازار و ئەشکەنجە دەدرێن بە راستی واقیعێکی تاڵ و ئازاراوییە لە گەڵ ئەوەیشدا دەڵێت – بیر بکەرەوە بزانە چی دەڵێت – ((فرفعت رأسي، فإذا أنا بسحابة قد أظلتني، فنظرت فإذا فيها جبريل، فناداني فقال: إن الله قد سمع قول قومك لك، وما ردوا عليك، وقد بعث إليك ملك الجبال لتأمره بما شئت فيهم)) واتە: جا کە سەرم بەرز کردەوە هەورێکم بینی سێبەری بۆ کردووم کە تەماشام کرد جبریل م تێدا بینی، ئەویش بانگی لێ کردم و پێی گوتم: خوای گەورە گوێبیستی قسەی قەومەکەت بوو، گوێبیستی وڵامەکەیان بوو، جا خوای گەورە فریشتەی چیاکانی بۆ ناردووی بۆ ئەوەی چی فەرمانی پێ بکەیت ئەوا بیکەی)).

تەماشا کە بزانە فریشتەی چیاکان چیت بۆ نمایش دەکات؟ لەو کاتەی کە خوێن بە جەستەیدا ڕێ دەکاتﷺ ئەوەیشە بزانە کە بینینی خوێن خوێن هەڵدەقوڵێنێت، بەڵام تەماشاکە بزانە ئەو پێشەنگ و چاولێکراوە چی کرد و نمونەی مرۆڤی چاك بۆ هەموو جیهان تاکو ڕۆژی قیامەت...

پێغەمبەری خواﷺ دەڵێت: ((فناداني ملك الجبال فسلم علي، ثم قال: يا محمد، فقال، ذلك فيما شئت، إن شئت أن أطبق عليهم الأخشبين)) واتە: فریشتەی چیاکان بانگی کرد و سڵاوی لێ کردم ئەمجار فەرمووی: ئەی محمد، ئەوە دەکەوێتە سەر ویستی تۆ، ئەگەر دەتەوێت ئەوا (الأخشبان)یان لەسەر یەك جووت دەکەم)) وە الأخشبان: ناوی دوو چیای مەزنن . کە بە یەکەمیان دەڵێن (ابو قبيس)وە بە دووەم دەڵێن (الأحمر) سوێند بەخوا ئەگەر پێغەمبەری خواﷺ لەو کەسانە بوایە کە تۆڵەی خۆی بسێنێ و حەقی خۆی وەرگرێتەوە ئەوا فەرمانی دەکردە فریشتەی چیاکان کەوا ئەو کاسە سەرە یاخییانە و ئەو کەللە رەقانە تێك و پێك بشکێنێ وە دەریایەك لە خوێن دەرۆیشت: ناڵێم بۆ ئەوەی ئەهلی طائف ببینن بەڵکو بۆ ئەوەی ئەهلی مەککە لە مەککەوە ببینن بەڵام ئایا خاوەنی رەوشتی جوانﷺ چی فەرموو؟ فەرمووی: ((بل أرجو أن يخرج الله من أصلابهم من يعبد الله وحده، لا يشرك به شيئا))، واتە: بەڵکو تکام وایە کەوا خوای گەورە لە نەوەی ئەوانە کەسانێك دەرکات خوای گەورە بە تەنها بپەرستن و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن)).

بۆیە دەڵێم: بابەتی ڕەوشت جوانی پێویستی بە چەندەها وانەی دوور و درێژ هەیە... چەند پێویستمان بە رەوشت هەیە!.. من وا دەزانم کەوا تەنگانەی ئێستا نەبوون و تەنگانەی ڕەوشتە...

ئایا نرخ و بەهای سامان چییە ئەگەر رەوشتی لە گەڵدا نەبێت؟

ئایا نرخ و بەهای پلە و پایە چییە بە بێ رەوشت؟ ئایا نرخ و بەهای پایەی کۆمەڵایەتی و فەرمانڕەوایی چییە بە بێ رەوشت؟ هەموو ئەم شتە بەهادارانە ئەگەر ئەخلاقی لە گەڵدا نەبێت ئەوا دەبنە کۆسپێك بە سەر مرۆڤایەتییەوە هەروەکو چۆن ئێستا لە سایەی ئەم شارستانییە ماددییە وشکەی رۆژئاوادا دەیبینن, کە بە تەواوی ئەخلاقیان لە دەست داوە ئەگینا هەر شارستانییەك لەسەر زەویدا پێویستی بە دوو بنەمای سەرەکی هەیە:

یەکەم: بنەمای ماددی : من هەرگیز نکۆڵی لەوە ناکەم ئەوەی ئێستا شارستانییەتی رۆژئاوا پێی گەیشتووە لەم بوارە ماددیەدا... ئێمە سەرمان لە چاڵ

نانێین بۆ ئەوەی ئینکاری لەو پێشکەوتنە ماددیەی رۆژئاوا بکەین... بەڵام کوا سەرەکیترین بنەما لەم شارستانییەدا؟ کوانی ئەخلاق لەم شارستانییەدا؟ رۆڵەی ئەم شارستانییەتە ئێستا ئەوەی بە مرۆڤ دەکات کەوا درندە کێوییەکان بە یەکتر نایکەن لە جیهانی دارستاندا ! کوا مرۆڤایەتی؟ کوا میهرەبانی؟ کوا رەوشت؟ کوا ئەدەب؟ کوا لێبوردن لە کاتی دەسەڵاتدا؟

بەڵام ئەوەی ئێستا دەیبینی رەوشتی ستەمە، رەوشتی دڵرەقییە، رەوشتی تۆڵەسەندنەوەیە, رەوشتی نەهێشتن و ئیبادەیە، رەوشت نەمان و لەنابردنە, ! لە بنەمای یەکەمدا چاکترین شت دروست دەکات کەوا مرۆڤایەتی ئێستای پێ گەیشتووە، بۆ ئەوەی بە کاری بهێنی بۆ نەهێشتن و لە ناوبردنی مرۆڤ، ئێستا مرۆڤایەتی وەکو سەرخۆش لە بەر خۆیەوە قسە دەکات و (وڕێنە دەکات), وەکو شێت پێ دەکەنێت، رێ دەکات و ناڵەی دێت بە هۆی ئازارەوە، رادەکات وەکو کەسێکی هەڵهاتوو, بە دوای هەموو شتێکدا دەگەرێت، کەچی لە راستیدا هەموو شتێکی هەیە، بەڵام کاتێ لە رێگاکەی خوا و پێغەمبەری خواﷺ لایاندا هەموو شتێکیان لە دەستداو بزریان کرد، تەنگانە و نەبوون – ئێستا – نەبوونی ئەخلاقە.

ئەمجار پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((وقطيعة الرحم)) واتە: بچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی)) واتە: لە نیشانەکانی قیامەت... رەنگە کوڕێك – ئێستا – پەیوەندی لە گەڵ باوکیدا ببچڕێنێت، یان لە گەڵ دایکیدا، یان لە گەڵ پووریدا، بەڵکو رەنگە ئێستا کەسێك پەیوەندی برایەتی لە گەڵ براکەیدا ببچڕێنێت، ولا حول ولا قوه الا بالله... بەڵکو رەنگە کەسێك براکەی خۆی بکوژێت لە پێناوی پارەدا... بەڵێ رەنگە کەسێك پەیوەندی لە گەڵ براکەیدا ببچرێنیت لە پێناوی ئەم دونیایەدا... وە بە پێڵاوەکانی پێ بنێت بە سەر ئەم پەیوەندییەدا... گرنگ ئەوەیە پارەی هەیە... باوەڕم هەیە باوەڕێکی بتەو کەوا لەم رۆژانەدا بچراندنی پەیوەندی خزمایەتی زۆر بووە و بڵاو بووەتەوە، لە سەردەمی ماددیات و ئارەزوو و هەوەسدا لەئاستی رۆژئاوا و لەئاستی ئوممەت، لەئاستی رۆژئاوا، کە گۆرانی بە باڵای ئازادی و دیموکراسیدا دەڵێت... گۆرانی بە پلە و پایە و رێزی ئافرەتدا دەڵێت... تاکۆتایی

ئەو هەموو درۆ گەورانە... ڕەنگە کوڕێك لە تەمەنی شازدە ساڵیدا ماڵەکەی خۆی بە جێ بهێڵێ... ڕەنگە سەردانی دایك و باوکی نەکات تەنها لە ساڵی جارێکدا نەبێت... ئەویش لەو بۆنانەی کە ناویان لێ ناوە جەژنەکانی لە دایك بوون.. بەڵکو ڕەنگە هەندێ جار خۆی نەڕوات و تەنها بە پەیوەندییەکی تەلەفونی بیبڕێتەوە لە گەڵ دایکیدا یان لە گەڵ باوکیدا... !! لەسەر ئاستی ئوممەت بچراندنی پەیوەندی خزمایەتی بە شێوەیەکی خەماوی زۆر بووە و لا حول ولا قوه الا بالله ..

بیر بکەرەوە لەگەڵ مندا بزانە خۆشەویستﷺ چی دەفەرموێت؟ (ئیمامی بوخاری و موسلیم)[1] ڕیوایەتیان کردووە لە فەرموودەیەکی (ابو هریرە)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إن الله خلق الخلق، حتى إذا فرغ منهم قامت الرحم، فقالت: هذا مقام العائذ من القطيعة))، واتە: خوای گەورە کاتێ هەموو دروستکراوەکانی دروستکرد تاکو لێ بووەوە، لەو کاتەدا میهرەبانی و پەیوەندی خزمایەتی هەستا و فەرمووی: ئەمە جێگا وڕێگای کەسێکە کە پەنا دەگرێت لە بچراندن)) بەڵێ... میهرەبانی پەنا دەگرێت لە بچراندن بە پادشای پادشاکان .

ئەی پەروەردگارمان چی فەرموو؟ ((قال: نعم أما ترضين أن أصل من وصلك، وأقطع من قطعك ؟، قالت: بلى، قال: فذاك لك))، واتە: بەڵی... ئایا ڕازی نابیت کەوا ئەوەی تۆ بگەیەنێت منیش بیگەیەنم و ئەوەی تۆ ببچڕێنێت ئەوا منیش بیبچڕێنم؟ فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی: کەوا بوو ئەو بەشە بۆ تۆ)).

بەڵام ئەوە چی پەیوەندییەکە کە خوای گەورە خۆی دەیگەیەنێت ئەگەر کەسێك پەیوەندی خزمایەتی گەیاند؟ جۆرەها پەیوەندییە... وەکو پەیوەندی چاکەکاری، ڕێزداری و ڕزق و ڕۆزی و بەخشین و لێبوردن و لێخۆشبوون و خەیر بەهەموو جۆرەکانییەوە... ئایا حاڵی تۆ چۆن دەبێت ئەگەر خوای گەورە بە تەقوای خۆی گەیاندی؟ چۆنە ئەگەر خوای گەورە بە ڕێنمایی خۆی گەیاندی؟ چۆنە ئەگەر خوای گەورە بە عیززەت و دەوڵەمەندی خۆی گەیاندی؟ سوێند بە خوا ئەوا ژیانی دونیا و

---

١ ـ أخرجه البخاري كتاب التفسير، باب ﴿وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ﴾ محمد: ٢٢، وانظر أطرافه هناك، ومسلم كتاب البر والصلة و الآداب، باب صلة الرحم وتحريم قطيعتها (٢٥٥٤).

دوارۆژت بەختیار دەبێت... ئایا چۆنە ئەگەر خوای گەورە بەندەکەی خۆی بچڕاند؟ پەروەدگارمان... بمانپارێزە بمانپارێزە...!! بەڵێ... ئەی ئەو کەسەی کە پەیوەندیت بچڕاندووە هیچ بەرەکەتێك لە رزق و سامانەکەتدا نابینیتەوە. وە هەموو ئەوەی کۆت کردووەتەوە بڵاو دەبێتەوە... هەموو کارەکەت پارچە دەبێت... ئەوە چۆنە؟ دەتەوێت نوێژ بکەیت، کەچی دەڵێیت: کاتم نییە بۆ ئەوەی نوێژەکەم بکەم...!! دەتەوێت شەو نوێژ بکەیت، دەڵێت: ناتوانم شەو نوێژ بکەم!! دەمەوێت بڕۆم سەردانی دایکم بکەم کەچی ناتوانم!! دەمەوێت سەردانی خوشك و براکەم بکەم کەچی نازانم! چونکە من پەیوەندی خزمایەتیم بچڕاندووە... بۆیە خوای گەورە منی بچڕاندووە، ئەمجار پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( اقرءوا إن شئتم قوله تعالى: واتە: ئەگەر حەز دەکەن ئەو ئایەتەی خوای گەورە بخوێننەوە )) ﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓا۟ أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ ﴾ محمد:٢٢ـ ٢٣، واتە: بۆ بیستنی حەق (وَأَعْمَى أَبْصَارَهُمْ) واتە: بۆ بینینی هیدایەت وە بۆ بینینی بەڵگە وە بۆ بینینی ڕێگای بەختیاری و رزگار بوون لە دونیا و دوارۆژ.((مانای ئایەتەکە: جا ئەگەر ئێوە لە فەرمانی خوا لاریی بکەن و فەساد و گێرە شێوێنی و خوێن رشتن لە زەویدا بەرپا بکەن و هەرچی پەیوەندی خزمایەتی هەیە بیبڕن و بە جێی نەهێنن! (٢٢) ئا ئەوانە کەسانێکن کە خوا نفرینی لێ کردوون و "لە رەحمەتی خۆی بێ بەشی کردوون" ئینجا کەڕی کردوون و کوێرایی هێناوە بە سەر چاویاندا(٢٣)).

براکەم ..تۆ بە دوای فراوان بوونی رزقەکەتدا دەگەڕێیت، هۆکارەکەی لە بەر دەستی خۆتدایە! بە دوای بەرەکەت لە تەمەنەکەتدا دەگەڕێیت، تۆ ئەوەت لە بەردەستدایە... بەڵام تۆ جێ بە جێی ناکەیت، کەواتە، ئێستا تۆ پرسیارم لێ دەکەیت... چۆن رزقەکەم فراوان بکەم؟ چۆن تەمەنم زیاد بکەم؟

وڵامەکە لە فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوادایە ﷺ هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)[١] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (أنس)ەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ

---

١ ـ أخرجه البخاري، كتاب البيوع باب من أحب البسط في الرزق (٢٠٦٧)، ومسلم كتاب البر والصلة و الآداب، باب صلة الرحم وتحريم قطيعتها (٢٥٥٧).

فەرموویەتی: ((من أحب أن يبسط له في رزقه، و ينسأ له في أثره .. )) واتە: هەرکەس دەیەوێت رزقەکەی فراوان ببێتەوە و تەمەنی درێژ بێت ....)) هەموومان دەمانەوێت کەوا رزقەکەی فراوان بێت و تەمەنی درێژ بێت، بەڵام چی بکات؟ پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێت: ((فليصل رحمه )) واتە: با پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنێت)) پەیوەندی لە گەڵ دایکتدا بگەیەنە، لە گەڵ باوکتدا، لە گەڵ مامەکەتدا، لە گەڵ خاڵتدا، لە گەڵ پوورتدا، لە گەڵ براکەتدا، لە گەڵ خێزانەکەتدا بە چاکە، بە وشەیەکی چاك بە مامەڵەو رەفتاری ناسك و نەرم و جوان و بە ئەدەبەوە بە بێ بەدگۆیی و زمانپیسی ... برا خۆشەویستەکەم پەیوەندییە خزمایەتییەکەت بگەیەنە, تۆیش ئەی خوشکی بەڕێزم... ئەوا خوای گەورە رزق و رۆزیتان فراوان دەکات و تەمەنتان درێژ دەکات .

ئەم موژدەیە دەدەمە هەموو ئەهلی میسر, داوا لە خوا دەکەم بە پاراستنی خۆی بیپارێزی و بەڕێزی خۆی ڕێزداری بکات وە هیدایەت و رەحمەت و بەرەکەت و تەقوای خۆی برژێنێتە سەر هەموو وڵاتانی موسڵمانان هەر خۆی پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکدا کەوا ئیمامی (مسلم)[1] ریوایەتی کردووە لە فەرموودەی (أبي ذر)ەوە بە هاوەڵانی دەفەرموێت: ((إنكم ستفتحون مصر... )) واتە: ئێوە وڵاتی میسر رزگار دەکەن)) پێغەمبەری خوا ﷺ موژدەی رزگار کردنی میسری داوە لە پێش ئەوەی رزگار بکرێت !-﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ﴾ النجم: ٣- (( إنكم ستفتحون مصر وهي أرض يسمى فيها القيراط، فإذا فتحتموها فأستوصوا بأهلها خيراً، فإن لهم ذمة ورحما )) واتە: ئێوە وڵاتی میسر رزگار دەکەن، ئەوێیش خاکێکە لە ناویدا پێی دەڵێن (القيراط)، ئەگەر رزگارتان کرد ئەوا لە گەڵ خەڵکەکەیدا بە چاکی و نەرمییەوە رەفتار بکەن، چونکە ئەوان حەقی پەیوەندی خزمایەتییان هەیە)).

خوا پاداشتی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بداتەوە بە باشترین پاداشت، تەماشاکە خوای گەورە بە چی رێزێك رێزداری کردووی ! تەماشاکە پێغەمبەری

---

١ـ أخرجه مسلم، كتاب فضائل الصحابة، باب وصية النبي ﷺ بأهل مصر (٢٥٤٣).

خواﷺ تۆی گەیاندووە بە چی پایەیەك!

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە ((فأحسنوا إلى أهلها فإن لهم ذمة وصهرا)) واتە: بە چاکی و باشی لە گەڵ خەڵکەکەیدا هەڵسوکەوت بکەن چونکە ئەوان مافی پەیوەندی خزمایەتی و مافی ژن پێدانیان هەیە)) وە مەبەستی لە پەیوەندی خزمایەتی چونکە (هاجەرەی دایکی ئیسماعیل) ئافرەتێکی میسری بووە وە مەبەستی لە ژن پێدان (صهر) ئەوەیە کە ماریەی دایکی ئیبراهیم لەوانە.[1]

کەوابوو ئەهلی میسر مافی خزمایەتی و مافی ژنپێدانیان هەیە، داوا لە خوا دەکەم بەرەکەت بخاتە ئەهلی میسر و ئێمە و ئێوە دامەزراو بکات لەسەر حەق و بەرەکەت بخاتە ناو هەموو ئەم ئوممەتەوە و چاوەکانمان گەش بکاتەوە بە سەرکەوتنی ئەم ئیسلامە و بە عیززەتی یەکتاپەرستان، چاوەکانمان گەش بکاتەوە بە نەمانی ئەم لەمپەر و بەربەستانەی نێوان وڵاتانی ئیسلامی .

ئەی موسڵمانان:... دڵنیابە کە هیچ بەربەستێك نییە، لە بنەڕەتدا ئەم ئوممەتە یەك ئوممەتە، داوا لە خوا دەکەم کە چاومان بەو ڕۆژە گەش بکاتەوە هەر ئەو پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە، لە پاشاندا باسی دەکەم - انشاء الله - من لە دەرگای سیاسەتێکی کورتەوە قسە ناکەم وە لە دەرگای خەوێکی خۆشی نەفامانەوە قسە ناکەم، لە دەرگای فشاری ئەم واقیعەوە قسە ناکەم کە لە هەموو لایەکەوە خوێن دەڕژێت و جەستەکان پارچە پارچە دەبن بەڵکو لە ڕوانگەی قورئان و سوننەتەوە قسە دەکەم.

لەگەڵ مندا جارێکی تر بگەڕێوە بۆ پەیوەندی خزمایەتی کە لە هەموو لایەکەوە بچڕاوە، لە گەڵ مندا بیر لەم فەرموودەیە بکەرەوە هەروەکو لە (صحیح مسلم)[2] دا لە فەرموودەی (ابو هريرە)ەوە هاتووە ((أن رجلا قال: يا رسول الله إن لي قرابة أصلهم ويقطعوني، وأحسن إليهم ويسيئون إلي، وأحلم عنهم ويجهلون علي، فقالﷺ: ((لئن كنت كما قلت، فكأنما تسفهم المل ولا يزال معك من الله ظهير عليهم ما دمت على

---

١- ((شرح مسلم)) للنووي (٨/ ٣٣٨) ط الحديث.

٢ ـ أخرجه مسلم، كتاب البر والصلة و الآداب، باب صلة الرحم وتحريم قطيعتها (٢٥٥٨).

ذلك)) واتە: کابرایەك فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ من چەند خزمێکم هەیە و پەیوەندییان لە گەڵدا دەگەیەنم کەچی ئەوان ئەو پەیوەندییە دەبچڕێنن وە من چاکەیان لە گەڵدا دەکەم کەچی ئەوان بە خراپی ڕەفتارم لە گەڵ دەکەن وە من هەردەم ئەوانم لە یادە کەچی ئەوان من لە بیر دەکەن، پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرمووی: ئەگەر ئەوەی تۆ دەیڵێیت بەو شێوە وا بێت ئەوا وەکو ئەوەیە خوڵەمێشی گەرمیان بە دەرخوارد بدەی وە بەردەوام خوای گەورە پشتگیرت دەبێت تاوەکو تۆ لەسەر ئەو کارە بیت)).

براکەم... بزانە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی هەروەکو لە (صحیح البخاری)[1] دا هاتووە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی عمرو) ەوە: ((لیس الواصل بالمكافئ ولكن الواصل الذي إذا قطعت رحمه وصلها)) کەوابوو خێراکە پەیوەندیت بگەیەنە لە گەڵ ئەو کەسانەدا پەیوەندیان بچڕاندووە، چونکە تۆ لەم گەیاندنی پەیوەندییەدا ڕازی بوونی خوات دەوێ و لە بەر خاتری ئەو دەیگەیەنیت، من لە پێشدا باسی ئەوەم کرد، من تەنها باسی نیشانەکە ناکەم چونکە ئامانج تەنها لای من باس کردنی نیشانەکانی قیامەت نییە، بەڵکو ئامانج و مەبەست لای من دیاری کردنی نەخۆشییەکەیە و دیاری کردنی چارەسەرەکەیەتی، داوا لە خوا دەکەم من و ئێوە بگێڕی لەوانەی کە چارەسەرەکەی وەردەگرن و لەسەر ڕێگا دەڕوات لە بەر خاتری ڕەزامەندی خوای زەوی و ئاسمانەکان، هەر خۆی پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە...

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((لا تقوم الساعة حتى يظهر الفحش والتفاحش وقطيعة الرحم وسوء المجاورة))، واتە: قیامەت هەڵناسێت تاوەکو بەدگۆیی و زمانپیسی و بچڕاندی پەیوەندی خزمایەتی و خراپ مامەڵە کردن لە گەڵ هاوسێدا بڵاو نەبێتەوە)).

((وسوء المجاورة)) بە ڕاستی ئەمەیشە ڕەوشتێکی خراپە، ئەمڕۆ وای لێ هاتووە کە دەرهاوسێ دەرهاوسێکەی خۆی ناناسێت! بەڵکو بە هەموو شێوە و شێوازێك

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب الأدب باب ليس الواصل بالمكافئ (٥٩٩١).

ئازارى دەرهاوسێكەى دەدات، نابێت دەنگى ئامێرى تۆماركارەكە (مسجل) ەكە بەرز بكەيتەوە چونكە ماڵە دەرهاوسێكەتان پياوێكى نەخۆشيان هەيە يان ئافرەتێكى نەخۆش، نابێت خاك وخۆڵەكەت بهێنى و لە نزيكى دەرگاى دەرهاوسێكەتان فرێى بدەى بەڵكو ئەگەر توانيت خاك و خۆڵەكەى پێش ماڵى هاوەسێكەتان كۆ بكەيتەوە ئەوا بكە... ئەو كارە بكە لە بەر خۆشەويستى پێغەمبەرى خوا ﷺ.

خراپ ڕەفتاركردن لە گەڵ هاوسێدا رەوشتێكى ناشيرينە و لە رەوشتى ئيسلامدا نييە، لە ڕەوشتى ئەو كەسەدا نييە كە هەموو دونياى فێرى رەوشت كرد ﷺ ئەى من بە تۆم نەگوت: ئاه ە ئەگەر بگەڕێينەوە بۆ لاى هەڵبژێردراو ﷺ بۆ لاى شەرعەكەى و دينەكەى و ڕێنمايى يەكانى ئەوا هەموو مرۆڤايەتى لە دونيا و دوارۆژدا بەختيار دەبوون، سوێند بە خوا هەموو كێشەكانى سەر زەوى چارەسەر دەكرا بەڵكو تەنها بەوەى بگەڕێينەوە بۆ سوننەت و شەرعەكەى خۆشەويستى خوا ﷺ.

پێغەمبەرى خوا ﷺ دەفەرموێت: ((من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يؤذ جاره، ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليكرم ضيفه، ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليقل خيرا أو ليصمت))، واتە: هەركەسێ لە ئێوە باوەڕى بە خودا و ڕۆژى دوايى هەيە ئەوا با ئازارى دەهاوسێكەى نەدات، هەركەسێ لە ئێوە باوەڕى بە خودا و ڕۆژى دوايى هەيە ئەوا با ڕێز لە ميوانەكەى بگرێت، هەركەسێ لە ئێوە باوەڕى بە خودا و ڕۆژى دوايى هەيە ئەوا با قسەى خەير بكات وە يان بێ دەنگ بێت)) فەرموودەكە لە هەردوو كتێبى(صحيح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەى (ابو هريرە)ەوە.

هەروەها پێغەمبەرى خوا ﷺ دەڵێت هەروەكو لە هەردوو كتێبى (صحيح)[(٢)] دا هاتووە لە فەرموودەى (ابن عمر)ەوە ((ما زال جبريل يوصيني بالجار، حتى ظننت أنه سيورثه)) واتە: بەردەوام جبريل ئامۆژگارى دەكردم بە دەرهاوسێ تاوەكو

---

١ـ البخاري كتاب الأدب باب إكرام الضيف و خدمته إياه بنفسه (٦١٣٦، ٦١٣٨)، ومسلم كتاب الإيمان، باب الحث على إكرام الجار والضيف ولزوم الصمت إلا عن الخير (٤٧).

(٢) أخرجه البخاري كتاب الأدب باب الوصاة بالجار (٦٠١٥)، ومسلم كتاب البر والصلة و الآداب، باب الوصية بالجار و الإحسان إليه (٢٦٢٥)، ورواه البخاري (٦٠١٤)، ومسلم (٢٦٢٤) عن عائشة (ع).

گومانم برد کە دەرهاوسێ دەبێتە میراتگری دەرهاوسێکەی)).

دەفەرموێتﷺ : ((والله لا يؤمن، والله لا يؤمن، والله لا يؤمن)) قيل: من يا رسول الله؟ قال: (( الذي لا يأمن جاره بوائقه))،[1] واتە: سوێند بە خوا ئیمان ناهێنی، سوێند بەخوا ئیمان ناهێنی، سوێند بە خوا ئیمان ناهێنی، فەرموویان: کێ ئەی پێغەمبەری خواﷺ ؟ فەرمووی: ئەو کەسەی کە دەرهاوسێکەی لە رەوشتە خراپەکانی دڵنیا نییە))، واتە: هاوسێکەی لە خراپەکانی و لە رەوشتە خراپ و نارێکەکانی دڵنیا نییە.

ئیمامی (أحمد و ابن حبان و الحاكم)[2] و جگە لەوان ریوایەتیان کردووە لە (ابوهريره) ەوە دەڵێت: ((قال رجل: يا رسول اللهﷺ ، إن فلانة يذكر من كثرة صلاتها وصيامها وصدقتها، غير أنها تؤذي جيرانها بلسانها قال: ((هي في النار))، قال: يا رسول الله، فإن فلانة يذكر من قلة صيامها و صدقتها و صلاتها، وأنها تصدق بالأثوار من الأقط، ولا تؤذي جيرانها بلسانها، قال: " هي في الجنة))، واتە: کابرایەك فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ فلان ئافرەت خەڵکی باسی زۆری نوێژ و رۆژوو و صەدەقەکانی دەکەن بەڵام ئەو ئافرەتە بە زمانی ئازاری دەرهاوسێکانی دەدات؟ فەرمووی: ئەو لە ئاگردایە، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ, بەڵام فلان ئافرەت باسی کەمی رۆژوو و صەدەقە و نوێژەکانی دەکەن وە ئەویش بە چەند پارچەیەك لە کەشك صەدەقە دەکات، بەڵام بە زمانی ئازاری دەرهاوسێکانی نادات؟ فەرمووی: ئەو لە بەهەشتدایە)).

لە هەردوو کتێبی (صحيح)[3] دا لە فەرموودەیەکی (أنس) ەوە هاتووە — وەئەم گوتەیە هی (مسلم)ە — کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((لا يؤمن أحدكم حتى يحب لجاره - أو قال: لأخيه - ما يحب لنفسه )) واتە: هەر یەکێك لە ئێوە

---

١ ـ أخرجه البخاري كتاب الأدب باب إثم من لا يأمن جاره بوائقه (٦٠٦١) من حديث أبي شريح (ت).

٢ـ أخرجه أحمد (٢/٤٤٠)، وابن حبان (١٣/ ٧٦) (٥٧٦٤)، والحاكم (٤/١٨٣)، وابن وهب في الجامع (٣١١)، وهناد في الزهد (١٠٣٤)، والخرائطي في مساوئ الأخلاق (٢٧٣، ٥٨٥)، ومسند إسحاق بن راهويه (٢٤٧)، وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب (٢٥٦٠).

٣ـ أخرجه البخاري كتاب الإيمان باب من الإيمان أن يحب لأخيه ما يحب لنفسه (١٣)، ومسلم، كتاب الإيمان، باب الدليل على أن من خصال الإيمان أن يحب لأخيه المسلم ما يحب لنفسه من الخير (٤٥) واللفظ له.

باوەڕی تەواو نابێت تاوەکو ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ دەرهاوسێکەیشی پێی خۆش بێت – یان فەرمووی: بۆ براکەی)).

ئیمامی (الترمذي و أحمد و الدارمی)[١] و جگە لەوان ریوایەتیان کردووە لە فەرموودەیەکی (عبدالله ی کوڕی عمرو) ەوە وە فەرموودەکە (صحیح)ە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((خیر الأصحاب عند الله خیرهم لصاحبه، وخیر الجیران عند الله خیرهم لجاره)) واتە: باشترین هاوڕێ و هاوەڵ لای خوا باشترینیانە بۆ هاوڕێکانیان، باشترین دەرهاوسێ لای خوا باشترینیانە بۆ دەرهاوسێکەی)).

داوا لە خوا دەکەم کە بمانگێڕێتەوە سەر دین و راستی بە جوانترین گەڕانەوە.

---

١ـ أخرجه الترمذي كتاب البر والصلة, باب ما جاء في حق الجار (١٩٤٤) وقال: ((حديث حسن غريب))، وأحمد في ((مسنده)) (٢ / ١٦٨)، والدارمي (٢٤٣٧)، وعبد بن حميد في ((المنتخب)) (٣٤٤)، والبخاري في ((الأدب المفرد)) (١١٥)، وابن خزيمة في ((صحيحه)) (٢٥٣٩)، وابن حبان في ((صحيحه)) (٥١٩)، والحاكم في ((المستدرك)) (١/ ٤٤٣) وصححه على شرط الشيخين ووافقه الذهبي، وصححه الألباني في ((الصحيحة)) (١٠٣).

## زۆربوونی درۆ و شایەتی دانی بە ناحەق و مردنی کت و پڕ و دەرکەوتنی ئافرەتی پۆشتەی ڕووت.

## لە نیشانەکانی قیامەت کەوا ئێستا زۆر بووە و بڵاو بووەتەوە: درۆکردنە...

لە فەرموودەیەکدا ئیمامی (موسلیم)[1] ریوایەتی کردووە لە فەرموودەی (أبو هريرە)ەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((سيكون في آخر أمتي أناس يحدثونكم بما لم تسمعوا أنتم، ولا آباؤكم، فإياكم وإياهم))، واتە: لە دوا سەردەمی ئوممەتەکەمدا خەڵکانێك پەیدا دەبن شتی واتان بۆ دەگێڕنەوە کە نە خۆتان و نە باوکتان نەتانبیستووە، ئامان نزیکی ئەوان مەبنەوە)).

لە ڕیوایەتێکی تردا کە ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردوووە بە سەنەدێکی (حسن)[2] لە فەرموودەی (أبو هريرە)ەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لا تقوم الساعة حتى تظهر الفتن، ويكثر الكذب...)) واتە: قیامەت هەڵناسێت (ڕوونادات) تاوەکو فیتنە دەرنەکەوێت و درۆ زۆر نەبێت)).

لەڕیوایەتێکی ترد کە لە(صحيح مسلم)[3] دا هاتووە لە فەرموودەی (جابر ی کوڕی سمرة)ەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إن بين يدي الساعة كذابين فاحذروهم)) واتە: لە بەر دەستی قیامەتدا(لە پێش قیامەت) پەیدا بوونی چەندان درۆزنە جا ئاگاداریان بن)).

بە ڕاستی درۆ بڵاو بووەتەوە و زۆربووە، من هیچ سەردەمێك نازانم هەبووبێت بەم شێوەیە درۆی تێدا بڵاو بووبێتەوە و درۆزنان زۆر بوبێتن و ڕاستییەکانی تێدا ساختە کرابێ و مافەکانی تێدا بزر بووبێت و فەوتابێت وەکو ئەم سەردەمە، ئەگەر

---

١ـ أخرجه مسلم في المقدمة، باب النهي عن الرواية عن الضعفاء والأحتياط في تحملها (٦).
٢ـ أخرجه أحمد (١٦/ ٤٢٢) ط الرسالة، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (٢٧٧٢).
٣ـ أخرجه مسلم، كتاب الإمارة، باب الناس تبع لقريش و الخلافة في قريش (١٨٢٢).

بیر بکەیتەوە — برا خۆشەویستەکەم —بە پشکنینێکی وردەوە تەماشایەکی ژیانی ئەو خەڵکە بکەیت، ئەوا دەبینی زۆربەی ژیانی خەڵکی بریتییە لە درۆ لە ناو درۆدا، فەرمانڕەوایەك لە گەڵ گەلەکەی خۆیدا درۆ دەکات! گەلێك بە درۆ وە وا دادەنێن کە ئەوان گەلی خوای هەڵبژێردراون وە ئەوان کوڕی خوای بەرز و باڵا دەستن، هەر ئەوان خۆشەویستی ئەون، مافێکی مێژوویان هەیە لە (فلسطین)دا ... هەروەها زانایەکی خراپ لە گەڵ ئوممەتەکەیدا درۆ دەکات، بازرگانێك لە گەڵ کڕیارەکانیدا درۆ دەکات، باوك لە گەڵ کوڕەکەی خۆیدا درۆ دەکات و کوڕ لە گەڵ باوکی خۆیدا درۆ دەکات، ژن لە گەڵ مێردەکەی خۆیدا درۆ دەکات وە پیاو لە گەڵ ژنەکەی خۆیدا درۆ دەکات!! ئاواتە خواز دەبووم کە تەنها جارێك لە گەڵ کەسێکدا مامەڵەم بکردایە لە هەر پیشەیەکدا و ڕاستی بکردایە، ئایا بۆ نابیتە کەسێکی ڕاستگۆ؟ بۆ درۆ دەکەیت؟.

یەکێ لەو برایانە دەڵێت: کابرایەکی زەڕنگەر بە ئەوی گوتووە: ((ئەو کەسەی کە ئەم پێشەی فێرکردم پێی گوتم: لە پێناوی ئەوەی کە ڕزق و ڕۆزی پەیدا بکەیت هەر دەبێت درۆ بکەیت))! سوێند بە خوا هەرگیز سوودمەند نابیت و قازانج ناکەیت، هەرچەندە هەموو دونیا بە دەست بهێنی ئەوا دوارۆژی خۆت دەدۆڕێنیت . بۆ درۆ دەکەن ئەی موسڵمانان... ئەی ئەوانەی پێشەیان زەرنگەرییە و بازرگانییە و ئەندازیارییە و پزیشکییە، هەتا دواییی ئەم پیشانە و جگە لەوانە؟ ئەگەر بە وردی بڕوانیتە ژیانی خەڵکی دەبینی زۆربەی وتە و کردەوە و حاڵی ئەوان درۆیە لە ناو درۆدا، چەندان خوێن ڕژان بە هۆی درۆکردنەوە! چەندەها نامووس ئەتك کران بە هۆی درۆکردنەوە! چەندەها جێگەی پیرۆز پیس و گڵاو بوون بە هۆی درۆکردنەوە! چەندەها وڵات داگیر کرا بە هۆی درۆکردنەوە! سوێند بە خوا وڵاتی عێراق داگیر نەکرا تەنها لە ڕێگای درۆکردنەوە نەبێت، فلسطین داگیر نەکرا تەنها لە ڕێگای درۆوە نەبێت، شیشان داگیر نەکرا تەنها لە ڕێگای درۆوە نەبێت, ئەفغانستان داگیر نەکرا تەنها لە ڕێگای درۆوە نەبێت, جێگا پیرۆزەکان پیس و گڵاو نەکران تەنها لە ڕێگای درۆ وە نەبێت!! چەندەها خانوو لێرە و لەوێ دەروخێنرێن بە هۆی هەواڵی درۆوە... مرۆڤێك چەندەها ساڵ زیندانی دەکرێت بە هۆی چەند وشەیەك و

هەواڵێکی درۆ وە، بەڵام خەڵکی باوەڕپێکردنیان لە دەستداوە لە ڕاستێتی ئەم وشانە و لە ڕاستگۆیی خاوەن ئەم ڕاپۆرتانە، بە ڕاستی خەڵکی بێزار بوونە لە درۆ، چونکە بۆنە گەنیوەکەی هەموو سەر زەوی گرتووەتەوە وە ئەگەر درۆ بۆنێکی هەبوایە ئەوا هیچ کەس لەسەر ڕووی زەویدا نەیدەتوانی هەوایەکی پاك هەڵمژێت، من کەسێکی ڕەشبین نیم، بەڵام نەخۆشییەکەت بۆ دەست نیشان دەکەم تاوەکو چارەسەرەکەت بۆ دیاری بکەم.

ئایا باوەڕ دەکەیت کەوا خوای پەروەردگار درۆکردنی حەرام کردووە و بە تاوان ژماردوویەتی لە زیاتر لە دوو سەد و هەشتا ئایەتی قورئاندا؟ خەریك بوو عەقڵم لە دەست بدەم کاتێ من تەماشای ئەو هەموو ئایەتانەم دەکرد کە خوای گەورە درۆی تێدا حەرام کردووە، جا ئەمە دەبێتە بەڵگەیەك لە ترسناکی ئەم ڕەوشتە ناشیرین و قێزەونە!! دەبێ بزانین درۆ سووکی و ریسوایییە، من باوەڕم وایە کەوا ئەو پیاوەی شانازی بە پیاوەتی خۆیەوە دەکات و شانازی بە پلە و بوونی خۆیەوە دەکات هەرگیز درۆ ناکات، جا ئایا گومانت چۆنە بە کەسێکی ئیماندای ڕاستگۆ کەوا چاودێری خواکەی خۆی دەکات؟ بۆ پیاوێك لە گەڵ خێزانەکەی خۆیدا درۆ دەکات؟ بۆ ئافرەتێك لە گەڵ مێردەکەی خۆیدا درۆ دەکات؟ بۆ بازرگانێك لە گەڵ کڕیارەکانیدا درۆ دەکات؟ بۆ کەسی ئیماندار لە گەڵ خواکەی خۆیدا ڕاست ناکات؟ بۆ کەسی ئیماندار لە گەڵ خۆیدا ڕاست ناکات؟ بۆ کەسی ئیماندار لە گەڵ خەڵکیدا ڕاست ناکات لە وتە و کردەوە و هەموو حاڵێکیدا؟ سوێند بە خوا ئەمجار سوێند بە خوا هەرکەسێ بکەوێتە ناو درۆو بە درۆ وە قسە بکات ئەوا دەگۆردرێتە کەسێکی دووڕوو وە لە گەڵ دووڕووەکاندا دەبێت لە کاتێکدا خۆی بە خۆی نازانێت! بزانە کەوا درۆ ڕەوشتێکە لە ڕەوشتی دووڕووەکان، درۆزن لە دووڕووەکانە!

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ﴾ البقرة: ٩-

١٠، واتە: لەو خەڵکانەدا کەسانێك هەن دەڵێن: باوەڕمان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە کەچی درۆ دەکەن و لە ڕاستیدا بڕوایان نییە (٨) ئەوانە بە نیازی خۆیان دەیانەوێ فێڵ و تەڵەکە لە گەڵ خوادا و ئەو کەسانەدا بکەن کە بڕوایان هێناوە بەڵام لە ڕاستیدا تەنها لە گەڵ خۆیان فێڵ و فەرەج ئەکەن و زیانەکەشی هەر بۆ خۆیان ئەگەڕێتەوەو تەنها خۆیان دەخەڵەتێنن لە حاڵێکدا هەستیش بەو ڕاستیە ناکەن!(٩)دڵیان دەردو نەخۆشی و حەسوودی و گومان و ناپاکی تیادایە جا خوایش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دەردو نەخۆشیەکانی زیاد کردن جگە لەوەیش سزایەکی سەخت و ئێش پێگەیەنەریان بۆ هەیە لە بەر ئەوە کە درۆیان کرد بە تایبەت ئەو کاتەی کە دەیانگوت بڕوامان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە (١٠))).

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ﴾یـونس: ٦٩، واتـە: بڵـێ: ئـەو کەسـانەی کـە درۆ بـۆ خـوا هەڵدەبەسـن هەرگیز ڕزگار و بەختیار نابن)) .

جـا درۆ کـردن بـە نـاو دینی خـوداوە لـە نـابوتترین جۆرەکـانی درۆیـە، مرۆڤێك جورئەت دەکات بە بێ زانیاری و بەڵگە و بورهان فەتوا بدات! وە یەکێ لەوانەی کە خـوای گـەورە حـەرامی کـردووە لەسـەر بەنـدەکانی، ئەوەیـە کـە لـە کتێبەکەیـدا فەرموویـەتی: ﴿وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ الأعـراف:٣٣، واتـە: لـە ئاخـاوتن و قسەکردن دەربارەی خوا بە بێ زانین و بە بێ بەڵگە درۆ هەڵبەسن)) .

جا بۆیە دین بووەتە یارییـەك بـە دەسـتی زۆربـەی ئـەو کەسـانەوە کـە حـەقیان داوەتە خۆیان بە فەتوادان، بۆیە لەبەر خۆیەوە قسەدەکات و نازانێت چی دەڵێـت و وڕینە دەکات بە شتێك کەوا هیچ زانیارییـەکی دەربـارەی نییـە وە ڕازی دەبێـت بـە شتێك بە پێی عەقڵی خۆی و ئەویتر ڕەد دەکاتەوە بە پێی عەقڵی خۆی، لە کاتێکدا ئیمامی عەلیڕضي الله عنه دەفەرموێت: ((لو كان الدين بالرأي لكان المسح على باطن الخف أولى من المسح على أعلاه ))[١] واتە: ئەگەر دین بە بۆچوون (ڕأی) بوایـە ئـەوا سـڕینی

١ـ أخرجه ابو داود،كتاب الطهارة، باب كيف المسح(١٦٢– ١٦٤)،وصححه الألباني في صحيح سنن أبي داود.

ژێرەوەی خوف لە پێشتر و ڕەواتر بوو لە سڕینی سەرەوەی)) .

بە راستی کێشەکە لە ترسناکترین کێشەکانە کەوا کەسێك عەقڵی خۆی بەکار بهێنێ بۆ بەرپەرچ دانەوەی دەقێکی دامەزراوی ئەم دینە چونکە لە گەڵ ئارەزووەکانیدا ناگونجێت ! یان مرۆڤێك قسە بکات لە کێشەیەکدا و هیچ شارەزاییەکی لێ نەبێت، لە کاتێکدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا﴾ الإسراء: ٣٦، واتە: بە دوای شتێکدا مەچۆ و نەزانی چییە و چۆنە و زانیاریت دەربارەی نییە، چونکە بە راستی هەموو ئەمانە: (گوێ و چاو و دڵ) هەریەکەیان لە ڕۆژی قیامەتدا بەرپرسیارن لێی)) .

هەروەها لە شێوە نابووتەکانی درۆ: درۆ کردنە بە زمانی پێغەمبەرەوەﷺ ، پێغەمبەری خۆشەویستﷺ دەفەرموێت: ((إن كذبا علي ليس ككذب على أحد، من كذب علي متعمدا، فليتبوأ مقعده من النار))[1] واتە: درۆ کردن بە زمانی منەوە وەکو درۆکردن نییە بە زمانی کەسێکی ترەوە، هەر کەسێ بە ئەنقەست درۆ بە زمانی منەوە بکات ئەوا با جێگای خۆی لە ئاگردا خۆش کات)).

بۆ شتێك دەدەیتە پاڵ پێغەمبەری خواﷺ کەچی ئەو نەیفەرمووە؟ بۆ شتێك حەڵاڵ دەکەیت یان حەرامی دەکەیت کەچی پێغەمبەرمانﷺ حەڵاڵی نەکردووە یان حەرامی نەکردووە ! ! ؟

## * ئەمجار درۆ کردن بە زمانی خەڵکیەوە:

ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردووە لە(مسند)ەکەیدا و الترمذي لە (سنن)[2]ەکەیدا لە فەرموودەی (الحسن ی کوڕی علی)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب الجنائز باب ما يكره من النياحة على الميت (١٢٩١)، ومسلم في المقدمة،باب وجوب الرواية عن الثقات وترك الكذابين، والتحذير من الكذب على رسول الله ﷺ (٤) من حديث المغيرة بن شعبةرضي الله عنه.

٢ـ أخرجه الترمذي كتاب صفة القيامة باب (٦٠) (٢٥١٨) وقال: ((حديث حسن صحيح))، والنسائي كتاب الأشربة، باب الحث على ترك الشبهات (٥٧١١)، وأحمد (١/ ٢٠٠)، وابن خزيمة (٢٣٤٨)، والحاكم (٢/١٣)، صححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٣٣٧٧، ٣٣٧٨)، و((الإرواء)) (٢٠٧٤).

((دع ما يريبك، إلى ما لا يريبك، فإن الصدق طمأنينة، وإن الكذب ريبة)) واتە: واز بهێنە لەوەی کە گومانت لێیە بۆ ئەوەی کە گومانت لێی نییە، چونکە ڕاستی دڵنارمییە و درووش گومانە)).

لەگەڵ مندا بیر لەم ئایەتەی خوای گەورە بکەرەوە: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُوَ يُدْعَىٰ إِلَى الْإِسْلَامِ ۚ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ الصف:٧، واتە: چ کەسێك هەیە لەوە ستەمکارتر کە لەسەر خوا درۆ هەڵبەستێت لە کاتێکدا بانگ بکرێت بۆ ئیسلام بوون و موسڵمان بوون؟ خواش ڕێنمایی گەل و هۆزی ستەمکار ناکات چونکە شایستەی هیدایەت نییە)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ﴾ المنافقون:١، واتە: کاتێ دووڕووەکان هاتن بۆ لات ئەی پێغەمبەرﷺ ئەڵێن: شایەتی ئەدەین کە بە ڕاستی تۆ پەیامبەری خوایت، لە حاڵێکدا خوا خۆی ئەزانێ کە تۆ پەیامبەری ئەویت وە خوا گەواهی ئەدات کە ئەو دووڕووانە درۆ دەکەن کە ئەڵێن تۆ پەیامبەری خوایت)).

بەڵێ... دووڕوو کەسێکی درۆزنە، لە ڕۆژی قیامەتدا نیشانەیەکی تایبەتی خۆی هەیە لە نێو خەڵکی مەحشەردا ناسراوە، ئایا بەڵگە لەسەر ئەم قسە ترسناکە چییە؟!

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ تَرَى الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى اللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ۚ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ﴾ الزمر: ٦٠، واتە: لە ڕۆژی قیامەتیشدا ئەو کەسانە درۆیان لەسەر خوا هەڵبەستووە، دەبینی ڕوویان ڕەش هەڵگەڕاوە ئایا بۆ خەڵکانی لە خۆ بایی بوو – ئەوانەی ددان بە هەقدا نانێن – لە دۆزەخدا نەوا و جێگا نییە؟)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُوا عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَلَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي

ٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾ الأعراف: ٤٠، واتە: ئەو کەسانەش ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دانا و باوەڕیان پێ نەکردن و لەئاستیان خۆیان بە گەورە گرت، هەرگیز دەروازەکانی ئاسمان بۆڕۆحیان و بۆ کار و کردەوەیان ناکرێتەوە و ناشچنە بەهەشتەوە، هەتا وشتر نەچێ بە کونی دەرزی درووماندا، واتە: خۆ هەرگیز ئەمە دەست نادات کەواتە ئەوانیش دەست نادات بچنە بەهەشت)).

هەرگیز درۆزنی لە خۆبایی ناچێتە بەهەشتەوە تاوەکو وشتر لە کونی دەرزییەوە نەچێتە ژوورەوە ! ئیللا مەگەر تەوبە بکات و بگەڕێتەوە بۆ لای خوای پەروەردگار، کەوا بوو خێراکەن ئەی گرووی موسڵمانان، با ناخی خۆمان پاك بکەینەوە لەم ئاکارە قێزەونە و لەم ڕەوشتە نابووت و ناشیرینە !

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا لە فەرموودەیەکی (ابو هریرة)وە هاتووە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((آية المنافق ثلاث: إذا حدث كذب، وإذا وعد أخلف، وإذا اؤتمن خان))، واتە: نیشانەکانی دووڕوو سێ دانەن: ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات، ئەگەر بەڵێنی دا ئەوا نایباتە سەر و ئەگەر سپاردەیەکی پێ سپێردرا ئەوا خیانەتی لێ دەکات)).

هەروەها لە هەردوو کتێبی (صحیح)[2] دا هاتووە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی عمرو)ەوە: ((أربع من كن فيه كان منافقا خالصا، ومن كانت فيه خصلة منهن كانت فيه خصلة من النفاق حتى يدعها، إذا اؤتمن خان، وإذا حدث كذب و إذا عاهد غدر و إذا خاصم فجر)) واتە: چوار ئاکار و ڕەوشت هەن لە هەرکەسێکدا هەبوو ئەوا دووڕوویەکی ڕوونە . وە ئەگەر هەرکەسێك ئاکارێکی تێدا بوو ئەوا ئاکارێکی لە دووڕووی تێدایە تاوەکو وازی لێ دەهێنێ: ئەگەر سپاردەیەکی پێ سپێردرا ئەوا خیانەتی لێ دەکات و ئەگەر قسەیەکی کرد درۆ دەکات و ئەگەر پەیمانێکی دا ئەوا ناپاکی (غەدر) دەکات و ئەگەر دوژمنایەتی و نەیارێتی کەسێکی کرد ئەوا لە ڕاستی لا دەدا)).

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب الإيمان،باب علامة المنافق(٣٣)ومسلم كتاب الإيمان،باب بيان خصال المنافق (٥٩).
٢ـأخرجه البخاري كتاب الإيمان،باب علامة المنافق(٣٤)ومسلم كتاب الإيمان،باب بيان خصال المنافق (٥٨).

براکانم: سوێند بە خوا هیچ کەسێك لە دونیا و قیامەتدا رزگاری نابێت تەنها بە ڕاستگۆیی نەبێت .

ڕاستگۆیی: ڕاسترین ڕێگایە هەر کەسێ لەسەر ئەو ڕێگایە نەڕوات ئەوا دەبێتە بێ بەش و خەسارەت مەندەکان.

ڕاستگۆیی: شمشێری حەقە لەسەر زەویدا، لە هیچ شتێك نادرێت ئیللا دەیبڕێت، هەر کاتێك ناڕەوا (باطل) ڕووبەڕووی ببێتەوە ئەوا شکستی پێ دەهێنێ و زاڵ دەبێت بە سەریدا وە هەر کەسێ پەلاماری بدات ئەوا پەلاماردانەکەی ڕەد ناکرێتەوە، هەرکەسێ ڕاستگۆیی بە زاریدا بێت ئەوا دەنگی بە سەر نەیارانیدا بەرز دەبێتەوە.

ئایا ئەو سێ کەسەتان بە بیردا دێتەوە کە لە جەنگی تەبوك دا بە جێمان و دوا کەوتن؟! ئەمە (کعب ی کوڕی مالك)ەو دەڵێت[1]: ((فلما بلغني أنه توجه قافلا، حضرني همي، وطفقت أتذكر الكذب، وأقول: بماذا أخرج من سخطه غدا، واستعنت على ذلك بكل ذي رأي من أهلي))، واتە: کاتێ پێم گەیشت کەوا پێغەمبەری خواﷺ لە غەزای تەبوك گەڕایەوە بۆ مەدینە... زۆر خەمبار بووم و دەستم کرد بە بیرکردنەوەی درۆ، دەمگوت: سبەینێ بە چی شتێك لە تووڕەیی ئەو دەرچم؟ بۆیە پەنام دەبرد بۆ هەموو خاوەن عەقڵێك لە کەس و کارم بۆ ئەوەی ڕێگام بۆ دابنێن)). ئەم پیاوە بەردەوام بیری دەکردەوە چۆن لە تووڕەیی پێغەمبەری خواﷺ دەرچێت؟ ئایا چی بڵێت بە پێغەمبەری خواﷺ لە پاش گەڕانەوەی لە جەنگی تەبوك ؟؟ دەڵێت: ((فلما قيل: إن رسول اللهﷺ قد أظل قادما زاح عني الباطل، وعرفت أني لن أخرج منه أبدا بشيء فيه كذب، فأجمعت صدقه، وأصبح رسول اللهﷺ قادما، وكان إذا قدم من سفر بدأ بالمسجد، فيركع فيه ركعتين، ثم جلس للناس، فلما فعل ذلك جاءه المخلفون، فطفقوا يعتذرون إليه ويحلفون له، وكانوا بضعة وثمانين رجلا، فقبل منهم رسول اللهﷺ علانيتهم، وبايعهم واستغفر لهم،

---

١ـ أخرجه البخاري،كتاب الوصايا،باب إذا تصدق أو أوقف بعض ماله أو بعض رقيقه أو دوابه فهو جائز(٢٧٥٧)، وانظر أطرافه هناك و راجع(٤٤١٨)، ومسلم كتاب التوبة باب حديث توبة كعب بن مالك و صاحبيه (٢٧٦٩).

ووكل سرائرهم إلى الله، فجئته فلما سلمت عليه، تبسم تبسم المغضب، ثم قال: " تعال " فجئت أمشي حتى جلست بين يديه، فقال لي: ((ما خلّفك، ألم تكن قد ابتعت ظهرك ؟)) . فقلت: بلى، إني والله لو جلست عند غيرك من أهل الدنيا، لرأيت أن سأخرج من سخطه بعذر، ولقد أعطيت جدلا، ولكني والله، لقد علمت لئن حدثتك اليوم حديث كذب ترضى به عني ليوشكن الله أن يسخطك علي، ولئن حدثتك حديث صدق، تجد علي فيه، إني لأرجو فيه عفو الله، لا والله ما كان لي من عذر، والله ما كنت قط أقوى ولا أيسر مني حين تخلفت عنك، فقال النبي ﷺ: " أما هذا فقد صدق، فقم حتى يقضي الله في أمرك)) واتە: کاتێ گوتیان: کەوا پێغەمبەری خواﷺ بەرێوەیە و نزیك بووەتەوە ئەوا هیچ ناڕەواییەك لە سەرم نەما وە زانیم من هەرگیز رزگارم نابێت بە درۆ کردن ...بۆیە بڕیارم دا لە گەڵیدا راست بکەم پێغەمبەری خواﷺ هاتە ناو مەدینەوە، ئەگەر لە سەفەرێك بگەڕایەتەوە ئەوا دەچووە مزگەوت و دوو رکات نوێژی دەکرد... ئەمجار دانیشت لای خەڵکی ... پاشان ئەوانەی کە نەرۆیشتبوون بۆ جەنگ هاتن بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ دەستیان کرد بە هێنانەوەی بیانوو و سوێندیان بۆ دەخوارد... کە ژمارەیان لە هەشتا کەس زیاتر دەبوو ... پێغەمبەری خواﷺ بیانووەکەیانی وەرگرت ئەوەی کە ئاشکرایە و بەیعەی پێدان و داوای لێخۆشبوونی لە خوا بۆ کردن و نهێنییەکانی گەڕاندەوە بۆ لای خوا ... ئەمجار من هاتم... کاتێ کە سڵاوم لێ کرد... پێغەمبەری خواﷺ تەماشایەکی کردم و ئەمجار بزەیەکی کرد وەکو کەسێك پەست بووبێت... ئەمجار فەرمووی: وەرە... منیش رۆیشتم بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ تاکو لەبەردەستیدا دانیشتم... خۆشەویستﷺ فەرمووی: بۆ دوا کەوتی؟ ئایا ئەو وڵاخەت نەکڕیبوو کە بۆ ئەو جەنگە بە کاری دەهێنی؟ کعب ی کوڕی مالك دەڵێت: گوتم: بەڵێ... سوێند بە خوا من ئەگەر لەبەردەستی جگە لە تۆ دابنشتایەم لەلای ئەوانەی کە ئەهلی دونیان... دەتوانم بە بیانوویەك لە پەستی ئەوان خۆم دەرباز بکەم ... چونکە من توانای گفت وگۆم هەیە (واتە دەتوانم لە هەموو کێشەو گرفتێك خۆم دەرکەم هەروەکو چۆن تاڵە موویەك لە نێو هەویردا دەردەکرێت)... بەڵام سوێند بە خوا ... من دەزانم ئەگەر ئەمڕۆ درۆت لەگەڵدا بکەم و لێم رازی بیت ئەوا زۆری نەماوە کە

خوای گەورە پەستت بکات بەسەرمدا (واتە ئەگەر ئێستا درۆت لە گەڵدا بکەم تۆ لێم رازی بیت ئەوا خوای گەورە درۆکەم ئاشکرا دەکات و چیتر هەتاهەتایە تۆ لێم پەست دەبیت) وە ئەگەر قسەیەکی راستت لەگەڵدا بکەم و هەڵەی منی تێدا ببینیت ئەوا من تکام وایە کە خوای گەورە لێم خۆش بێت ...نەخێر سوێند بە خوا هیچ بیانوویەکم نەبوو ... سوێند بە خوا هیچ کاتێک لەو کاتە بەهێز تر نەبووم و حاڵم باشتر نەبوو کە دواکەوتم لە تۆ... پێشەواﷺ رووی لە هاوەڵانی کرد و گوتی: بەڵام ئەم کەسە قسەکانی راست بوو ... هەستە ... تاکو خوای گەورە حوکمت بەسەردا دەدا)).

تەماشای بەرهەمی راستی بکە, راستگۆیی هۆی رزگاربوونە لە دونیا و قیامەت، هەوڵ بدە ئەزمونی راستگۆیی لە گەڵ هەر مرۆڤێکدا تاقیبکەیتەوە، لە گەڵ هەر کەسێکدا، لە هەر لایەنێکەوە ببێت، پێغەمبەرمانﷺ فێری راستگۆییمان دەکات لە هەموو شتێکدا، راستگۆیی لە نیگادا،لە وشەیەکدا، لە مەبەست و نیەتدا، لەهەموو کردارێکدا و لە هەموو حاڵەتێکدا...

پاشان دەگەڕێینەوە بۆ لای (کعب ی کوڕی مالك) بەڵام لە پێشدا گوێ لەم فەرموودە شیرینە بگرە تاکو بزانیت کەوا راستگۆیی رزگاربوونە لە هەموو تەنگانە و هەڵوێستێکدا.

لە (مسند) ی ئیمامی ئەحمەد دا و لە (سنن) ی (ابو داود) دا بە سەنەدێکی (حسن)[١] ریوایەت کراوە لە (عبد الله کوڕی عامر) ەوە دەڵێت: ((أتانا رسول اللهﷺ في بيتنا وأنا صبي، فذهبت أخرج لألعب، فقالت أمي: يا عبد الله تعال أعطك، فقال رسول الله ﷺ : ((وما أردتِ أن تعطيه؟ )) قالت: أعطيه تمراً، قال: فقال رسول اللهﷺ: ((أما إنك لو لم تفعلي كتبت عليك كذبة))، واتە: پێغەمبەری خواﷺ هات بۆ ماڵمان لە کاتێکدا من منداڵ بووم، منیش دەرچوومە دەرەوە بۆ ئەوەی یاری بکەم، دایکم گوتی: ئەی عبدالله وەرە شتێکت دەدەمێ، پێغەمبەری خواﷺ گوتی: ئایا

---

١ـ أخرجه ابو داود،كتاب الأدب في التشديد في الكذب (٤٩٩١)، وأحمد (٤٤٧/٣) وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن أبي داود)).

دەتەوێت چی بدەیتێ؟ گوتی: دەمەوێ خورمایەکی بدەمێ، دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ گوتی: جا ئەگەر تۆ ئەو کارە نەکەی ئەوا درۆیەکت بۆ دەژمێردرێت)).

دەبینی دایکێك لە گەڵ منداڵەکەیدا درۆ دەکات بۆ ئەوەی واز لە گریان بهێنێ، باوکێك لە گەڵ منداڵەکەیدا درۆ دەکات لە پێناوی ئەوەی ڕازی بکات! ئایا لە پاش ئەوە چۆن دەتەوێت منداڵەکەت فێری ڕاستی بکەیت؟! ئایا چۆن لە پاش ئەوە دەتەوێت کچەکەت فێری ڕاستگۆیی بکەیت ئەی خوشکی بەڕێزم!؟ کچەکەت دەبینێ تۆ لەگەڵ باوکیدا درۆ دەکەیت! ئەمە زۆر ئەستەمە... باوکەکە بە کوڕە بچووکەکەی دەڵێت: (کاتێ کەسێك لە دەرگا دەدات): بڕۆ پێی بڵێ باوکم لە ماڵ نییە... جا ئەو منداڵە بەستەزمانە دەڕوات و لەسەر دڵپاکی خۆی و دەرگاکە دەکاتەوە و دەڵێت: باوکم پێت دەڵێت: کەوا ئەو لە ماڵ نییە!! چونکە منداڵ لاپەڕەیەکی سپی و جوانە، پێغەمبەری ئەکرەمﷺ دەڵێت: ((کل مولود یولد علی الفطرة، فأبواه یهودانه، أو ینصرانه، أو یمجسانه ...))[1] واتە: هەموو منداڵێك لەسەر فیترەتی پاکی ئیسلام لە دایك دەبێت، جا دایك و باوکی دەیکەنە جولەکە یان دەیکەنە گاور یان دەیکەنە مەجوسی (ئاگرپەرست))).

جا هەموو دایك و باوکێك منداڵەکەی خۆیان پەروەردە دەکەن لەسەر ڕاستی یان لەسەر درۆ، لەسەر پیاوەتی و چاکی وە یان لەسەر ناپیاوی، لەسەر ڕەوشت جوانی وە یاخود لەسەر بەدرەوشتی. جا بۆیە پەروەردەکردنی منداڵ ئەرکێکی زۆر گەورەو مەزنە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ﴾التحريم: ٦، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! خۆتان و ژن و ماڵ و کەس وکارەکەتان بپارێزن لە ئاگرێك سووتەمەنییەکەی جەستەو لاشەی مرۆی کافر و بەردە، یان ئەو بەردانەن خەڵکی دەیپەرستن، مەبەست ئەوەیە کە زۆر بڵێسەدار و بە گڕ و گەرمە، وەك ئاگری ئەم دونیا نییە کە تەنها بە دار و بە چیلکە هەڵگیرسێ بەڵکو ئەو بە بەرد زیاتر گڕ دەگرێ و بڵێسە ئەسێنێ!)).

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب الجنائز باب إذا أسلم الصبي فمات هل يصلى عليه (١٣٥٨)، وانظر (١٣٨٥)، ومسلم كتاب القدر، باب معنى كل مولود يولد على الفطرة و حكم موت أطفال الكفار و أطفال المسلمين (٢٦٥٨)

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەی (ابن عمر) ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((كلكم راع وكلكم مسؤولٌ عن رعيته، الإمام راع ومسؤول عن رعيته، والرجل راع في أهله وهو مسؤول عن رعيته......))، واتە: هەر هەمووتان شوان و بەرپرسن وە بەر پرسیارن لەو ژێردەستەی کە پێتان سپێردراوە، پێشەوا شوان و بەرپرسە وە بەرپرسیارە لەسەر ژێر دەستەکەی وە پیاو شوان و بەرپرسە لەسەر خێزانەکەی و هەر ئەویش بەرپرسیارە لەسەر ژێر دەستەکەی...)) تاکۆتایی فەرموودەکە...

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[2] دا هاتووە لە فەرموودەی (معقل ی کوڕی یسار)ەوە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((ما من عبد يسترعيه الله رعية يموت يوم يموت وهو غاش لرعيته إلا حرم الله عليه الجنة))، واتە: هیچ بەندەیەك نییە کاتێ کە خوای گەورە پلەو پایەیەکی دەداتێ و دەیکاتە برا گەورەی کۆمەڵێك و دەمرێت، لە ڕۆژێکدا دەمرێت ئەو ساختەی لەو کۆمەڵە کەسە کردووە ئیللا خوای گەورە بەهەشتی لێ حەرام کردووە)).

لە گەڵ مندا بگەڕێوە بۆ لای ئەو هاوەڵە بەڕێزە (کعب ی کوڕی مالك) کە لە جەنگی تەبوك دا دوا کەوت، جا دەڵێت: ((أما هذا فقد صدق، فقم حتى يقضي الله في أمرك " . فقمت، وثار رجال من بني سلمة فاتبعوني، فقالوا لي: والله ما علمناك كنت أذنبت ذنبا قبل هذا، ولقد عجزت أن لا تكون اعتذرت إلى رسول اللهﷺ بما اعتذر إليه المتخلفون، قد كان كافيك ذنبك استغفار رسول الله ﷺ لك، فوالله ما زالوا يؤنبوني حتى أردت أن أرجع فأكذب نفسي، ثم قلت لهم: هل لقي هذا معي أحد؟ قالوا: نعم، رجلان، قالا مثل ما قلت، فقيل لهما مثل ما قيل لك، فقلت: من هما؟ قالوا: مرارة بن الربيع العمري، وهلال بن أمية الواقفي، فذكروا لي رجلين صالحين، قد شهدا بدرا فيهما أسوة، فمضيت حين ذكروهما لي، ونهى رسول الله ﷺ المسلمين عن كلامنا أيها الثلاثة

---

١ ـ أخرجه البخاري كتاب الجمعة، باب الجمعة في القرى و المدن (٨٩٣)، ومسلم كتاب الإمارة، باب فضيلة الإمام العادل و عقوبة الجائر (١٨٢٩).

٢ـ أخرجه البخاري كتاب الأحكام، باب من استرعي رعية فلم ينصح (٧١٥٠، ٧١٥١)، ومسلم كتاب الإيمان، باب استحقاق الوالي الغاش لرعيته النار (١٤٢) وفي كتاب الإمارة بنحوه (٢١).

من بين من تخلف عنه، فاجتنبنا الناس، وتغيروا لنا حتى تنكرت في نفسي الأرض فما هي التي أعرف، فلبثنا على ذلك خمسين ليلة- هەموو كۆمەڵگەی ئیسلامی بۆ ماوەی پەنجا ڕۆژ وازیان لەوان هێنا و قسەیان لە گەڵیاندا نەدەكرد – ! ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ﴾ التوبة: ١١٨، واتە: تا لە خەفەتدا وای لێهات ئەم زەویە فراوانەیان لا تەنگ بوو، لە خەم و خەفەتدا لە گیانی خۆیان بێزار بوون،))، فأما صاحباي فاستكانا وقعدا في بيوتهما يبكيان، وأما أنا، فكنت أشب القوم وأجلدهم فكنت أخرج فأشهد الصلاة مع المسلمين، وأطوف في الأسواق ولا يكلمني أحد، وآتي رسول اللهﷺ فأسلم عليه وهو في مجلسه بعد الصلاة، فأقول في نفسي: هل حرك شفتيه برد السلام علي أم لا؟ ثم أصلي قريبا منه، فأسارقه النظر، فإذا أقبلت على صلاتي أقبل إلي، وإذا التفت نحوه أعرض عني، حتى إذا طال علي ذلك من جفوة الناس مشيت حتى تسورت جدار حائط أبي قتادة، وهو ابن عمي وأحب الناس إلي، فسلمت عليه، فوالله ما رد علي السلام، فقلت: يا أبا قتادة، أنشدك بالله هل تعلمني أحب الله ورسوله؟ فسكت، فعدت له فنشدته فسكت، فعدت له فنشدته، فقال: الله ورسوله أعلم، ففاضت عيناي، وتوليت حتى تسورت الجدار، قال: فبينا أنا أمشي بسوق المدينة، إذا نبطي من أنباط أهل الشأم، ممن قدم بالطعام يبيعه بالمدينة، يقول: من يدل على كعب بن مالك، قال: فطفق الناس يشيرون له، حتى إذا جاءني دفع إلي كتابا من ملك غسان، فإذا فيه: أما بعد، فإنه قد بلغني أن صاحبك قد جفاك ولم يجعلك الله بدار هوان، ولا مضيعة، فالحق بنا نواسك، فقلت لما قرأتها: وهذا أيضا من البلاء، فتيممت بها التنور فسجرته بها، حتى إذا مضت أربعون ليلة من الخمسين، إذا رسول رسول اللهﷺ يأتيني، فقال: إن رسول اللهﷺ يأمرك أن تعتزل امرأتك، فقلت: أطلقها؟ أم ماذا أفعل؟ قال: لا، بل اعتزلها ولا تقربها، وأرسل إلى صاحبي مثل ذلك، فقلت لامرأتي: الحقي بأهلك، فتكوني عندهم، حتى يقضي الله في هذا الأمر، قال كعب: فجاءت امرأة هلال بن أمية رسول اللهﷺ، فقالت: يا رسول الله ! إن هلال بن أمية شيخ ضائع، ليس له خادم، فهل تكره أن أخدمه؟ قال: (( لا، ولكن لا يقربك)) . قالت: إنه والله ما به حركة إلى

شيء، والله ما زال يبكي منذ كان من أمره ما كان إلى يومه هذا، فقال لي بعض أهلي: لو استأذنت رسول الله ﷺ في امرأتك كما أذن لامرأة هلال بن أمية أن تخدمه؟ فقلت: والله لا أستأذن فيها رسول الله ﷺ، وما يدريني ما يقول رسول الله ﷺ إذا استأذنته فيها وأنا رجل شاب، فلبثت بعد ذلك عشر ليال، حتى كملت لنا خمسون ليلة من حين نهى رسول الله ﷺ عن كلامنا، فلما صليت صلاة الفجر صبح خمسين ليلة، وأنا على ظهر بيت من بيوتنا، فبينا أنا جالس على الحال التي ذكر الله، قد ضاقت علي نفسي، وضاقت علي الأرض بما رحبت، سمعت صوت صارخ، أوفى على جبل سلع بأعلى صوته: يا كعب بن مالك أبشر، قال: فخررت ساجدا، وعرفت أن قد جاء فرج، وآذن رسول الله ﷺ بتوبة الله علينا حين صلى صلاة الفجر، فذهب الناس يبشروننا، وذهب قبل صاحبي مبشرون، وركض إلي رجل فرسا، وسعى ساع من أسلم فأوفى على الجبل، وكان الصوت أسرع من الفرس، فلما جاءني الذي سمعت صوته يبشرني، نزعت له ثوبي، فكسوته إياهما، ببشراه والله ما أملك غيرهما يومئذ، واستعرت ثوبين فلبستهما، وانطلقت إلى رسول الله ﷺ، فيتلقاني الناس فوجا فوجا يهنوني بالتوبة، يقولون: لتهنك توبة الله عليك، قال كعب: حتى دخلت المسجد، فإذا رسول الله ﷺ جالس حوله الناس، فقام إلي طلحة بن عبيد الله يهرول حتى صافحني وهناني، والله ما قام إلي رجل من المهاجرين غيره، ولا أنساها لطلحة، قال كعب: فلما سلمت على رسول الله ﷺ، قال: رسول الله ﷺ، وهو يبرق وجهه من السرور:((أبشر بخير يوم مر عليك منذ ولدتك أمك)) فقال كعب: أمن عندك يا رسول الله أم من عند الله؟قال: (( لا، بل من عند الله)).يقول كعب: وكان رسول الله ﷺ إذا سر استنار وجهه،حتى كأنه قطعة قمر، وكنا نعرف ذلك منه، وقرأ عليه براءته التي أنزلها الله من فوق سبع سماوات: ﴿وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ التوبة:١١٩.

مانای فەرموودەکە بە درێژی: واتە: ((پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵام ئەم کەسە قسەکانی ڕاست بوو، هەستە، تاکو خوای گەورە حوکم بەسەر کێشەکەتدا دەدا)) بۆیە منیش هەستام و گەڕامەوە و کەس و کارەکەم لە بەنی سەلمە هەڵچوون، چەند پیاوێك شوێنم کەوتن ...پێیان گوتم: سوێند بە خوا.. نازانین هیچ تاوانێکت ئەنجام دابێت لە پێش ئەمە ...ئایا نەتتوانی داوای لێبوردن بکەیت هەروەکو چۆن ئەوانی تر داوایان کرد ..جا لێخۆشبوونی پێغەمبەر ﷺ بەس بوو بۆ تاوانەکەت، (کعب) دەڵێت: سوێند بە خوا هێندە هانیان دام تاکو ویستم بگەڕێمەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و خۆم بە درۆ بخەمەوە...ئەمجار گوتم: ئایا بە هیچ کەسێکی تر ئەوەی گوت کە بە منی گوت؟ گوتیان: بەڵێ... دوو کەسی تر وەکو قسەکانی تۆیان گوت... بە ئەوانیش هەر ئەوە گوترا کە بە تۆ گوترا... گوتم: ئەو دوو کەسە کێن؟ گوتیان: (مرارة ی کوڕی الربیع العمري) و(هیلال ی کوڕی أمیة ی الواقفي)یە ... باسی دوو کەسی چاکیان بۆ کردم کە ئامادەی جەنگی بەدر بوو بوون و ئەوانیش بۆ من پێشەنگن... منیش بە ڕێی خۆمدا ڕۆیشتم کاتێ باسی ئەو دوو کەسەیان بۆ کردم، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد کە موسڵمانان لەگەڵ کعب و دوو هاوەڵەکەیدا قسە بکەن ... جا خەڵکی لێمان دوور کەوتنەوە ... بەرانبەرمان گۆڕان ... تەنانەت وا هەستم دەکرد زەویش رووی لێمان هەڵگێڕاوە، وات دەزانی ئەو زەوییە نییە کە ئێمە لەگەڵیدا ئاشنا بوو بووین، بەو شێوەیە پەنجا شەو ماینەوە ... دوو هاوەڵەکەم کەساس و ملکەچ بوون و لە ماڵدا دانیشتن و دەگریان ... بەڵام من لەوان گەنجتر و بەهێز تر بووم ... لە ماڵ دەردەچووم ... لەگەڵ موسڵماناندا نوێژی جەماعەتم دەکرد ... بە بازاڕەکاندا دەسووڕامەوە ... بەڵام کەس قسەی لەگەڵدا نەدەکردم ... دەهاتم بۆ مزگەوت و دەڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و سڵاوم لێ دەکرد لە مەجلیسەکەی خۆیدا و لە پاش نوێژ و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: ئایا لێوی جوڵاندەوە بۆ وەڵامدانەوەی سڵاوەکەم یان نا؟ ئەمجار لە نزیکی ئەو نوێژم دەکرد ... بە سۆمای چاوەکانم تەماشای ئەوم دەکرد ... ئەگەر نوێژەکەم دەست پێ بکردایە ئەوا رووی لێ دەکردم ... ئەگەر رووم لێ

بکردایە ئەوا پشتی لێم دەکرد، تاکو ئەو وشکی یەی خەڵکی بەرانبەرم زیادی کرد، ڕۆیشتم تاکو لە دیواری باخچەیەکی (أبو قتادە)وە چوومە ئەو دیوە کە ئامۆزامە و خۆشترین کەسە لە دڵمدا، چوومە ژوورەوە و سڵاوم لێ کرد ... سوێند بە خوا وەڵامی سڵاوەکەی نەدایەوە ... گوتم: لەبەر خاتری خوا ئەی (ابو قتادە) ئایا دەزانی کە من خوا و پێغەمبەرەکەیمﷺ خۆش دەوێ؟ کەچی ئەو بێدەنگ بوو ... گوتم: لەبەر خاتری خوا ئایا دەزانی کە من خواو پێغەمبەرەکەیمﷺ خۆش دەوێ؟ کەچی ئەو بێدەنگ بوو ... گوتم: لەبەر خاتری خوا ئەی (ئەبو قتادە) ئایا دەزانی کە من خواو پێغەمبەرەکەیمﷺ خۆش دەوێ؟ گوتی: خوا و پێغەمبەرەکەیﷺ دەزانن ... بۆیە خۆم پێ نەگیرا لەبەر وەڵامەکەی چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسك و گەڕامەوە... دیسان لە دیوارەکە چوومە ئەو دیوە . دەڵێت: ڕۆژێك لە بازارەکانی مەدینەدا ڕێم دەکرد ... کابرایەکی گاور لە شامەوە هاتبوو بۆ فرۆشتنی خواردن لە شاری مەدینە... دەڵێت: کێ (کعب ی کوڕی مالك)م پێ نیشان دەدا؟ خەڵکی دەستیان بۆ (کعب) درێژ کرد ئەویش هات بۆلام و نامەیەکی دا بەدەستمەوە کە لە لایەن پادشا (غەسان)ەوە نێردرابوو تێیدا هاتبوو...

أما بعد: ئەی (کعب ی کوڕی مالك) پێم گەیشتووە کە هاوڕێکەت پشتی لێت کردووە و پەراوێزی کردووی ... لە لای منیش جێگەی کەس ون نابێت و کەسیش سووك نابێت ... پەیوەندیمان پێوە بکە تاکو دڵت بدەینەوە...

کاتێ لە خوێندنەوەی نامەکە بوومەوە... گوتم: بەراستی ئەمەیشە جۆرێکە لە جۆرەکانی بەڵا و خراپەکاری... ئەمجار بەرەو تەنوورەکە ڕۆیشتم و نامەکەم خستە ناو تەنوورەکەوە ...پاشان تەنوورەکەم گڕدا و نامەکەم سووتاند ..تاکو چل شەو لەو پەنجا شەوە تێپەڕی ... نێردراوێك لەلایەن پێغەمبەری خواوەﷺ هات بۆ لام فەرمووی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی پێت کردووە لە خێزانەکەت جیا ببیتەوە ... گوتم: تەڵاقی بدەم؟ یان چی بکەم؟ گوتی: نەخێر بەڵکو لێی دوور بکەوەرەوەو نزیکی مەبەرەوە ... بۆ دوو هاوڕێکەم هەمان فەرمانی کردبوو، بە خێزانەکەم گوت: بڕۆرەوە بۆ ماڵ کەس و کارت ... لەوێ بمێنەوە تاکو خوای گەورە حوکمێك دەدا

بەسەر ئەم کێشەیەدا... کعب دەڵێت: خێزانەکەی (هیلال ی کوڕی أمیە) هات بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ هیلال ی کوڕی أمیە کابرایەکی بەتەمەن و گەورە و لاوازە و خزمەتکاری نییە...ئایا رازی دەبی خزمەتی بکەم؟ گوتی: بەڵێ بەڵام بەمەرجێ نزیکت نەبێتەوە ... خێزانەکەی هیلال گوتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ سوێند بە خوا هیچ جوڵەیەکی تێدا نەماوە بۆ هیچ شتێك والله ئەو بەردەوام دەگری لەو کاتەوە ئەو کارە روویداوە تاوەکو ئەمڕۆ... هەندێ لە کەس و کارەکەم گوتیان: بریا مۆڵەتت لە پێغەمبەری خواﷺ وەرگرتبایە بۆ خێزانەکەت هەروەکو چۆن مۆڵەتی بە خێزانەکەی (هیلال ی کوڕی أمیە)دا بۆ خزمەتکرنی... گوتم: سوێند بە خوا.. مۆڵەتی بۆ وەرناگرم لە پێغەمبەری خواﷺ، جا چوزانم کە پێغەمبەری خواﷺ چی دەڵێت ئەگەر مۆڵەتی بۆ وەرگرم لە کاتێکدا من کەسێکی گەنجم... لە پاش ئەوە دە شەو مامەوە تاکو پەنجا شەوەکە تەواو بوو لەو کاتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی کردبوو کەس لە گەڵماندا قسە نەکات ...کاتێ کە نوێژی بەیانی رۆژی پەنجایەمم کرد من لەسەر یەکێ لەسەربانی خانووەکەمانم ... لەو کاتەی کە من دانیشتبووم بەو شێوەیەی کە خوای گەورە باسی دەکات.. دڵم تەنگ بوو بوو... هەموو سەر زەویم لا تەنگ بوو بوو... گوێم لە دەنگی بانگەوازکارێ بوو .... لەسەر چیاکەوە بە دەنگی بەرز هاواری کرد گوتی: ئەی (کعب ی کوڕی مالك) موژدەم بدەیە ...(لەم کاتەدا موژدەدەر دێت، لێخۆشبوونەکەی لە ئاسمانەوە لە لایەن پادشای بەرز و باڵادەستەوە دادەبزێت، تەماشای خۆشەویستی و برایەتی بکە، وەکو ئەوەی ئەمڕۆ نییە، برایەك حەز دەکات براکەی تێ بکەوێت و شکست بهێنێ هەرکە هاوەڵەکە گوێی لە موژدە و لێخۆشبوونەکە بوو دەردەچێت بۆ لای براکانی بۆ ئەوەی موژدەیان پێ بدات و بڵێت)): ئەی (کعب ی کوڕی مالك) موژدەم بدەیە... یەکسەر منیش چوومە سوژدەوە زانیم دەرگام لێ کرایەوە وە پێغەمبەری خواﷺ لێخۆشبوونەکەی ئێمەی ئاشکرا کرد کاتێ کە نوێژی بەیانی کرد، خەڵکیش هاتن بە مەبەستی موژدە پێدانمان وە موژدەدەرانیش رۆیشت بۆ لای دوو هاوڕێکەم، کابرایەك بە سواری

ئەسپەوە بەرەو لام هات و یەکێك بەسەر چیاکەوە بانگی کرد، جا دەنگەکە لە ئەسپەکە بەپەلە تر بوو کاتێ ئەوەی کە گوێم لە دەنگی بوو موژدەی پێدام هات بۆ لام ... ئەو دوو کراسەی لەبەرم دابوو بە هۆی موژدەکەیەوە بە دیاری پێمدا ... سوێند بە خوا لەو دوو کراسە زیاترم نەبوو لەو ڕۆژەدا... دوو کراسم قەرز کرد و لەبەرم کرد ... ئەمجار ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ... خەڵکی کۆمەڵ کۆمەڵ پێشوازیان لێ دەکردم ... پیرۆز بابیم لێ دەکەن بە هۆی وەرگرتنی تەوبەکەمەوە... دەیانگوت: پیرۆزبایی تەوبەکەت لێ دەکەین ... کعب دەڵێت: تاکو چوومە ژوورەوە بۆ ناو مزگەوت، بینیم پێغەمبەری خواﷺ دانیشتووە و خەڵکی لە دەوری کۆ بوونەتەوە، لەو کاتەدا (طلحة ی کوڕی عبیدالله) بە پەلە هات بۆ لام، تاکو تەوقەی لە گەڵدا کردم و پیرۆزبایی لێ کردم سوێند بە خوا جگە لە ئەو یەك کەسێك لە کۆچەران (المهاجرین) هەڵنەستان، هەرگیز ئەو هەڵوێستەم لە (طلحة) وە لە بیر ناچێتەوە، کعب دەڵێت: کاتێ سڵاوم لە پێغەمبەری خواﷺ کرد.. پێغەمبەری خواﷺ ڕووی دەگەشایەوە لە خۆشیدا و پێی گوتم: موژدە بۆ تۆ بە چاکترین ڕۆژ بەسەرتدا تێپەڕیوە لەو ڕۆژەوە لەدایك بووی ...گوتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ لە لایەن تۆوە یان لەلایەن خوای گەورەوە؟ گوتی: نەخێر بەڵکو لە لایەن خوای گەورەوە))کعب دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ ئەگەر شتێك ڕووی بدایە و پێی خۆش بوایە ئەوا ڕووی دەگەشایەوە ... تاکو وات دەزانی ڕووی پارچەیەکە لە مانگەکە، جا ئێمەیش ئەوەمان دەزانی ... ئەمجار ئایەتەکانی خوێندەوە کە لێخۆشبوونی ئەوانی تێدایە و خوای گەورە لە سەرووی حەوت ئاسمانەوە دایبەزاندووە:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ التوبة: ١١٩، واتە: خوا تەوبەی لەو سێ کەسەش

وەرگرت کە خۆیان لە غەزاکە گرتە دواوە، واتە: لە مەدینە مانەوە و نەچوونە جەنگی تەبووك تا لە خەفەتدا وای لێهات ئەم زەویە فراوانەیان لا تەنگ بوو، لە خەم و خەفەتدا لە گیانی خۆیان بێزار بوون!! ئیتر زانییان کە هیچ پەنایەکیان نەماوە، مەگەر هەر پەنا بە خوا بەرن، لە پاشان خوا ڕێنمایی تەوبەی کردن، بۆ ئەوە تەوبە بکەن، ئیتر ئەوانیش تەوبەیان کرد و خوا بەخشینی بە ڕاستی تەنها ئەو خوایە قەبووڵکاری تەوبە و لێبووردەو زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە. (١١٨) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! لە نافەرمانی خوا پارێز بکەن و هەمیشە لە گەڵ دەستەی ڕاستگۆیان بن(١١٩).

خودایە! ڕاستگۆییمان بە قسمەت بکە لە وتە و کردەوە و هەموو حاڵێکماندا.

جا ڕاستگۆیی لە وتە و کردەوە و هەموو حاڵەتێکدا جوانی و مەزنی دەبەخشێت... بەڵام درۆکردن بە ڕاستی ئاکارێکی شووم و زیان و خراپی یەکی هەیە بە سەر خاوەنەکەیەوە وە من باوەڕم وایە باوەڕێکی بتەو کەوا درۆ لەم سەردەمەدا بە شێوەیەکی غەمگین بڵاو بووەتەوە، باوەڕم پێ بکە ئەگەر بڵێم: تەنگانەی ئەم جیهانە ئەمڕۆ تەنگانە و نەبوونی ڕاستگۆییە، دەتوانین بڵێین ڕۆژانە درۆ لە لێدوانەکانەوە دەردەچێت یان لە هەواڵەکانەوە، کار و نمونەی ئەم لێدوانانە وەکو نمونەی (مەلای مەشهوور) وایە کە لەسەر ڕوبارێك جۆگەیەکی دروست کرد بوو، ئاوی لە ڕوبارەکەوە دەردەهێنا و هەمان ئاوی دەگێڕایەوە ناو هەمان ڕوبار! خەڵکی گوتیان: سەیرە بۆ کارەکەت ئەی (مەلای مەشهوور)! چی دەکەیت؟ جۆگەیەکت لەسەر ڕوبارەکە دروست کردووە و ئاوەکە لە هەمان ڕوبارەوە دەگوازێتەوە هەمان ڕووبار؟ مەلای مەشهوور گوتی: تەنها دەنگە دەنگەکەی بەسمە!!

هەروەها ئێستا و لەم سەردەمەدا هاوار و دروشم و سوتانی ئاڵا و سوتانی ئامێرەکان و شکاندنی ئۆتۆمبیل و ڕوخاندنی کارگە و خانوو و شتومەك و کەرەستەو دەربڕینی چەندان دروشمی گەرم و گوڕ بە گەرموویەکی گەرمەوە!!

من هەردەم دەڵێم: هەڵچوونەکانمان بە داخەوە هەمووی هەڵچوون و گەرمبوونێکی کاتییە، ئەمەیشە کارێکە دڵەکان خوێناوی دەکەن بۆیە دوژمنانمان

لەم ڕووانگەوە مامەڵەمان لە گەڵدا دەکەن، لێیان گەڕێن با هاوار بکەن ئێمە هەموومان هاوار دەکەین، بەڵام شایەتیدانێکی کرداری نابینی بۆ پێغەمبەرەکەمانﷺ بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی و راوەستان لەسەر سنوورەکانی و سەرخستنی دین و بانگەواز و شەریعەتەکەی و پەروەردەکردنی (نەوەیەکی قورئانی) نمونەیی لەسەر ئەم قورئانە و سوننەتەکەی پێغەمبەری خواﷺ داهێنان لە لایەن ئەم ئوممەتەوە، با هەموو جیهان شایەتی بدەن و بزانن کەوا (محمد) نەمردووە و کچی بە جێ نەهێشتووە بەڵکو چەندان کەسی پاك و خاوێنی بە جێهێشتووە کەوا لە هەموو بوارەکانی ژیاندا داهێنان ئەنجام دەدەن بە وتەو کردەوە و بە رەوشت و ئاکاری جوانەوە بە راستی ئەمە شایەتی دانە بە حەقی پێغەمبەری نازدارﷺ ، بەڵام کە بووە هاوار و دروشمی گەرم و گوڕی و خۆپیشاندانی زرینگەدار و بەس، ئەمجار کارەکە دەبێتە کارێکی ئاسایی بەڵکو رەنگە بانگ بدرێت بۆ نوێژ کەچی خەڵکی خەریکی خۆپیشاندانە، بۆیە دەبینی کەسانێك لە نێو ئەم خۆپیشاندەرانەدا نوێژی نیوەڕۆ ناکات! رەنگە لە نێو کچاندا کە ئاڵایان بەرزکردووەتەوە کەچی دژایەتی خوا و پێغەمبەرەکەیﷺ دەکات بە جلە رووت و خۆدەرخستن و سفوری یەکەیەوە، ئەم کەسە چۆن پێغەمبەرەکەیﷺ سەر دەخات؟!

سوێند بە خوا بە خۆشەویستییەوە قسەت لە گەڵدا دەکەم، چونکە تۆ برای منی، بە هەموو رێزەوە قسەت لە گەڵدا دەکەم ئەی خوشکە بەرێزەکەم چونکە تۆ خوشکی منی و کچی منی، ناکرێت بەم شێوەیە پێغەمبەرەکەمانﷺ سەربخەین، من دەبینم ئەمە شێوەیەکە لە شێوەکانی درۆ – گەردنم ئازاد بکەن – بۆیە دەبێ بە راستییەوە شایەتی بە دیاری پێغەمبەری نازدار بدەین ﷺ ، بە شوێنکەوتنی، بە جێ بە جێکردنی فەرمانەکانی، بەوەی کەماڵەکانمان بگۆڕینە ماڵێك لەسەر بەرنامەکەی پێغەمبەری خواﷺ و هاوەڵە پاك و پوختەکانی.

برا خۆشەویستەکەم: رەنگە لە کاتژمێر سێی شەودا خێزانەکەت بانگت لی بکات... هەستە! چونکە مناڵەکەمان تاکەی بەرز بووەتەوە بۆ ئەوەی بیبەی بۆ

لای پزیشك، ڕەنگە بە جلو بەرگی خەوتنەوە لە ماڵ دەرچیت و منداڵەکەت لە باوش بگریت - خوا پاداشتی خێرت بداتەوە بۆ ئەم سوزە ناسك و نەرمە - بەڵام من پێت دەڵێم: تەماشای ئەم وڵامدانەوەیە بکە بە هۆی داوای دایکەکە و گریانی منداڵەکەوە، وڵامدانەوەیەکی بە پەلە و بە ڕاستگۆیە بەڵام ئەگەر گەڕایتەوە پاش ئەوەی منداڵەکەت هێنایەوە لە لایەن پزیشکەوە و سەرت لەسەر سەرین نا بۆ ئەوەی بنووی لە پاش کاتژمێرێك یان دوو کاتژمێر، ئەمجار گوێبیستی وشەی (حي على الصلاة، حي على الفلاح، الصلاة خير من النوم) بووی، ئایا حاڵی تۆ چۆن دەبێت ؟! ڕەنگە شتێك بخەیتە سەر گوێیەکانت بۆ ئەوەی ئەو بانگە نەبیسی! جا من پرسیارت لێ دەکەم: ئایا وڵامدانەوەت بۆ بانگی خواکەت وەکو وڵامدانەوەت بوو بۆ بانگی کوڕەکەت؟ ئایا ئەوە درۆ نییە؟ ئایا ڕاستگۆیی لە گەڵ خوا و پێغەمبەرەکەتدا ﷺ لە کوێیە؟ من نامەوێت لەسەر ئەم نیشانەیە لەوە زیاتر بڕۆم، چونکە ئەم بابەتە هۆی پەژارە و خەفەتە، داوا لە خوا دەکەم کە کۆتایی من و ئێوە کۆتاییەکی ئیمانی بێت، بەڵام دەمەوێ جەخت بکەم و بڵێم: تەنگانەی ئەم جیهانە تەنگانە و نەبوونی ڕاستییە، خوێن دەرێژرێ بە هۆی درۆ وە! بە ناوی ئازادییەوە، بە ناوی دیموکراسییەوە ! !

بەڵام - سوێند بە پەروەردگاری کەعبە - کێشەکانی هەموو سەر زەوی چارەسەر ناکرێت تەنها بە ڕاستی نەبێت، دەبێ فەرمانڕەواکان ڕاست بکەن و زانایان ڕاست بکەن، و پیاو ڕاست بکات و ئافرەت ڕاست بکات و لاوان ڕاست بکەن و منداڵان ڕاست بکەن و دەبێ خۆمان و کچانمان لەسەر ڕەوشتی ڕاستی پەروەردە بکەین .

هەروەها لە نیشانەکانی قیامەت: زۆربوونی شایەتی دانی درۆ و شاردنەوەی (شایەتی حەق)ە:

لە فەرموودەیەکدا کە ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردووە لە (مسند)[1] ەکەیدا بە

---

١ـأخرجه أحمد (٤٠٧/١)، والحاكم (١١٠/٤) وقال: ((صحيح الإسناد ولم يخرجاه)) ووافقه الذهبي، والبخاري في ((الأدب المفرد)) (١٠٤٩)، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (٦٤٧)

سەنەدێکی (صحیح) لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی مسعود) ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إن بين يدي الساعة ... شهادة الزور، وكتمان شهادة الحق)) واتە: لە بەر دەستی قیامەتدا (لە پێش قیامەت)... شایەتیدانی درۆ و شاردنەوەی شایەتی حەق هەیە)) .

بە دڵنیاییەوە شایەتی دانی درۆ زۆر بووە، ئێستا بە داخەوە هەریەکێك دەتوانێت بە سەد جونەیە یان هەزار یان دە هەزار – ئەگەر کێشەکە گەورە بێت – کابرایەك بهێنێت بۆ ئەوەی دینەکەی بفرۆشێت، دەڕوات و لە بەر دەستی قازیدا رادەوەستێت لە دادگا بۆ ئەوەی شایەتی درۆ بدات! چۆن دینەکەت بە هەزار جونەیە دەفرۆشیت! ؟ ئەم ستەملێکراوە بەند دەکرێت و تەمەنی خۆی لە بەندینخانەدا بە سەر دەبات بە هۆی ئەو شایەتی دانە ناڕەوایەوە! چۆن ئەو شایەتیدانە ترسناکە – برای موسڵمان– بە کەم دەزانیت! بەڵێ... شایەتیدانێکی ترسناك . کارەساتێکی گەورەیە و لە تاوانە گەورەکانە . ئایا بەڵگە چییە لەسەر ئەوە ؟

بیر لەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خواﷺ بکەرەوە کە هەرگیز لە خۆ وە قسە ناکات هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەی (أبي بكرة) ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((ألا أنبئكم بأكبر الكبائر ؟)) واتە: ئایا ئاگادارتان بکەمەوە لە گەورەترینی تاوانە گەورەکان)) تاوانێکی گەورەی ئاسایی نییە بەڵکو لە گەورەترینی تاوانە گەورەکانە – ((قالوا: بلى يا رسول الله ﷺ! قال: ((الإشراك بالله و عقوق الوالدين))، واتە: گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوارگوتی: هاوەڵدانان بۆ خودا و ڕەنجاندنی دڵی دایك و باوك)) – وجلس وكان متكئا –واتە لەسەر لا بوو ئەمجار ڕاست بووەوە و دانیشت – فقال: ((ألا وقول الزور)) فما زال يكررها حتى قلنا: ليته سكت))، واتە: گوتی: شایەتیدانی درۆیش، دەڵێ: بەردەوام دووبارەی دەکردەوە تاکو گوتمان: بریا بێ دەنگ بوایە)).

---

١ـأخرجه البخاري، كتاب الشهادات، باب ما قيل في شهادة الزور (٢٦٥٤)، ومسلم كتاب الإيمان، باب بيان الكبائر و أكبرها (٨٧).

برایەکی خۆشەویستمان، کە لە دادگا کاری دەکرد پێم گوت: نامۆترین کێشە بەر چاوت کەوتووە چی بووە؟!

گوتی: کابرایەك بە شایەتی ناحەق بەند کرابوو بە تۆمەتی کوشتن و لە بەندیخانەدا مایەوە، تۆمەتبار کراوە بە کوشتن، کە ستەم و دوژمنایەتی لە گەڵدا کرابوو! گوتی: تاوەکو بە هۆی ئەم کێشەیەوە حوکمی لە سێدارەدانی بە سەردا درا، هەموو کاغەزەکانی لە لایەن (مفتی)ەوە ئیمزا کرا... واتە کێشەکە تەواو بوو، دەڵێت: لەو دانیشتنەدا کە سەرۆکی دادگا حوکمەکەی بە سەردا دەدا، دەڵێت: دانیشتم... هۆڵەکە پڕە لە خەڵکی و دیمەنێکی ترسناکە، دەڵێت: پێشەکییەکەیم خوێندەوە و لە کۆتایی خوێندنەکەدا گوتم: ئەوا دادگا بە پێی ئەو بەڵگانەی سەرەوە بڕیاری دا لەسەر ئەوەی ..– لێرەدا دەبوایە بیگوتایە: بە لە سێدارەدانی تاوانبار – بەڵام گوتی: بینیم بە بێ ئەوەی ئاگام لە خۆم بێت گوتم: بە پێی ئەوانەی سەرەوە ئەوا دادگا بڕیاری دا کە تۆمەتبار بێ تاوانە... سبحان الله!! خەڵکی وا بوو لەو دانیشتنەدا هاواری دەکرد، تێیاندا هەبوو دەگریا، گوتم: نابێت!! خۆم پێ ڕانەگیرا بۆیە تەختەکەم بە جێ هێشت و گەڕامەوە بۆ نوسینگەکەم، سەرم خستە نێوان هەردوو دەستم و دەستم بە گریان کرد، هاوەڵانی بە ئەویان گوت: ئەی فلان... گوێی پێ مەدە دەمانەوێت جارێکی تر بە کێشەدا بچینەوەو دیسان لێکۆڵینەوەی تێدا دەکەین، سوێندی بۆ خواردم بە خوا و گوتی: پێش مانگێك بە فەزڵی خوای گەورە ئەمجار بە فەزڵی پیاوانی ئاسایش گەیشتینە بکوژە ڕاستەقینەکە و ئەویش بە دوور و درێژی باسی تاوانەکەی بۆ کردین و چۆنییەتی ئەنجامدانی ئەم تاوانە گەورە و نابوتە، دەڵێی خوای گەورە خۆی ویستی لێ بوو کەوا خۆی ئەم کابرایە بە بێ تاوان دەرکات پێش ئەوەی دادگا بە بێ تاوان دەری کات!

ئەوەی کە دەمەوێت لێرەدا بڵێم: ئەم پیاوە بە ڕاستی حوکمی لە سێدارەدانی بە سەردا درابوو بە هۆی شایەتیدانێکی نارەواوە ئەگەر خوای گەورە دەربازی نەکردبایە، کەوابوو شایەتیدانی نارەوا ڕەنگە ببێتە هۆی لە سێدارەدانی کەسێك

كەچی تۆ ئاگات لێی نییە، یاخود ڕەنگە ببێتە هۆی ئەوەی كەسێك هەموو تەمەنی خۆی لە بەندیخانەدا تەواو بكات كەچی تۆ ئاگات لێی نییە!

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((إن بین یدي الساعة شهادة الزور، وكتمان شهادة الحق)) واتە: لەبەر دەستی قیامەتدا (لە پێش قیامەت)... شایەتیدانی درۆ و شاردنەوەی شایەتی حەق هەیە)).

جا هەركەسێ شایەتی حەق بشارێتەوە ئەوا تاوانبارە هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٌ قَلْبُهُۥ﴾ البقرة: ٢٨٣، واتە: هەر كەسێك كیتمانی شایەتی بكا و بیشارێتەوە، بە ڕاستی دڵی خۆی ژەنگاوی و تاوانبار دەكا)).

جا ئەگەر داوایان لێ كردی كەوا شایەتی بدەیت ئەوا شایەتی حەق بدە، ئاگادار بە سوێند بە درۆ نەخۆیت و لە كاتێكدا خۆت باش دەزانیت كەوا لە ڕاستگۆیان نیت چونكە ئەمە پێی دەڵێن سوێندی درۆ (یمین الغموس) خاوەنەكەی نقومی ئاگری دۆزەخ دەكات.

لە نیشانەكانی قیامەت: زۆرێك لە خەڵكی ئاواتە خوازی مردن دەبن لە بەر توندی ئەو هەموو تاقیكردنەوانەی توشیان دەبێت لە دونیا یا لە دینەكەیاندا.

لە هەردوو كتێبی (صحیح)[1]دا هاتووە لە فەرموودەی (أبو هریرە) وە كەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی ((لا تقوم الساعة حتى یمر الرجل بقبر الرجل فیقول: یا لیتني مكانه)) واتە: قیامەت ڕوونادات تاوەكو پیاوێك بە تەنیشتی گۆڕی كابرایەكدا تێنەپەڕێت و بڵێت: خۆزگە من لە جێی ئەو بوایەم)).

لە ((معجم الطبراني الأوسط و الصغیر)) و الضیاء المقدسي لە ((المختارة)) دا بە سەنەدێكی (حسن)[2] هاتووە لە فەرموودەی (أنس) ەوە كەوا پێغەمبەری خواﷺ

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب الفتن، باب لا تقوم الساعة حتى يُغْبطَ أهل القبور (٧١١٥)، و مسلم كتاب الفتن، باب لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل بقبر الرجل فيتمنى أن يكون مكان الميت من البلاء (٥٣ / ١٥٧).

٢ـ أخرجه الطبراني في ((الأوسط)) (٩٣٧٦)، و ((الصغير)) (٢/١٢٩)، و عبدالرزاق في ((مصنفه)) (٦٧٨٠)، والعقيلي في ((الضعفاء)) (٤/ ١٩٥)، وابن عدي في ((الكامل)) (٢/ ٧٠٥)، وابن الجوزي في ((الواهيات)) (١٤٩١)،

فەرموویەتی: ((بين يدي الساعة أو من أمارات الساعة أن يظهر موت الفجأة)) واتـە: لـە بەر دەستی قیامەتدا یان لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە کەوا مردنی کت و پڕ پەیدا دەبێت)) جا مردنی لـە ناکاو یـان مردنـی کـت و پـڕ نیشانەیەکە لـە نیـشانەکانی قیامەتە، وادەزانم کـەوا مردنـی کـت و پـڕ زۆر بـووە، لـە ناکـاودا پێـت دەڵێن: ئـەو کەسەی کەوا پێش کەمێك لە گەڵیدا بوویت مـرد! تـۆ سەرسـام دەبیـت و دەڵێیـت: دوێنێ لە نوسینگەکە پێکەوە بـووین! یـان لەسـەر کارەکـە! کەچـی ئـەم بەیانییـە مردووە! ئەوە چۆن بوو؟ خۆ ئەو لە پێـشان هـیچ نەخۆشـییەکی نـەبوو... ئـەو بـە نەخۆشی دڵ وەستان (سكتة القلبية) مردووە یان توشی جەڵـدە بـووە. ئـەم جـۆرە نەخۆشییانەی کە ئێستا دەیانبیسین لـە پێـشان هیـچمان دەربارەیـان نەبیـستووە، بەڵێ ..ئێمە ئێستا لە سەردەمێکدا دەژین نەخۆشی ئەوتۆی تێدا پەیدا بووە بە هیچ شێوەیەك پێشینانمان نەیانبیـستووە وە ئەگـەر پرسـیاری هۆکارەکـانم لـێ بکـەی! ئـەوا زۆرە، لـە فەرموودەیەکدا کـە (ابـن ماجـە و الحـاکم) بەسـەنەدێکی (صـحیح)[1] ریوایـەتیان کـردووە لـە فـەرموودەی (عبـدالله ی کـوڕی عمـر)ەوە کـەوا پێغەمبـەری خواﷺ فەرموویەتی: ((يا معشر المهاجرين، خمس إن ابتليتم بهن و أعوذ بالله أن تدركوهن: لم تظهر الفاحشة في قوم قط حتى يعلنوا بها إلا فشا فيهم الطاعون والأوجاع التي لم تكن مضت في أسلافهم ))واتە: ئەی گرووی کۆچەران...پێنج شت هەیە ئەگـەر توشی بن، پەنا بە خوا دەگرم کە ئێوە پێی بگەن: لە هەر میللەتێکدا خراپـەکاری (زینا) ئاشکرا بێت و تاکو بانگەوازی بۆ بکـەن ئـیللا تـاعون و نەخۆشـی وایـان تێدا بڵاو دەبێتەوە کە لە پێشینەکانیاندا نەبووە)).

ئـەی خودایـە... !! ئێمـە لـە پێـشدا دەربـارەی (الأزمـة القلبيـة) هیـچمان نەبیستبوو... هەروەها دەربارەی جەڵدەی مێشك و شیرپەنجەی خـوێن و نەخۆشـی

---

ورواه أبو عمرو الداني في ((الفتن)) (٣٩٥، ٣٩٩) وابن أبي شيبة في ((المصنف)) (٤٨/٣) عن الشعبي مرسلاً، وصححه الشيخ الألباني بشواهد في ((الصحيحة)) (٢٢٩٢)، وعزاه للضياء (ق ١٦١ / ٢).

١ـ أخرجه ابن ماجه، كتاب الفتن، باب العقوبات (٤٠١٩)، والحاكم (٥٤٠/٤)، وأبو نعيم في ((الحلية)) (٣/ ٣٢٠) و (٣٣٣/٨، ٣٣٤)، والطبراني في ((الأوسط)) (٢٨٧/١)، وصححه لشواهده الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (١٠٦).

کەمبوونەی بەرگری (ئایدز) و (الزهیمر) ... هتد، هیچمان نەبیستبوو ...جۆرەها نەخۆشی، داوا لە خوا دەکەم کە نەخۆشی موسڵمانان چارەسەر بکات .

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: (( لم تظهر الفاحشة في قوم قط حتى يعلنوا بها إلا فشا فيهم الطاعون والأوجاع التي لم تكن مضت في أسلافهم الذين مضوا، ولم ينقصوا المكيال والميزان إلا أخذوا بالسنين وشدة المؤنة وجور السلطان عليهم، ولم يمنعوا زكاة أموالهم إلا منعوا القطر من السماء، ولولا البهائم لم يمطروا، ولم ينقضوا عهد الله وعهد رسوله إلا سلط الله عليهم عدوا من غيرهم فأخذوا بعض ما في أيديهم، وما لم تحكم أئمتهم بكتاب الله ويتخيروا مما أنزل الله إلا جعل الله بأسهم بينهم )) واتە: لە هەر میللەتێکدا خراپەکاری (زینا) ئاشکرا بێت و تاکو بانگەوازی بۆ بکەن ئیللا تاعون و نەخۆشی وایان تێدا بڵاو دەبێتەوە کە لە پێشینەکانیاندا نەبووە، ساختە لە کێش و تەرازوودا بکەن ئیللا توشی قات و قڕی و سەختی بژێوی و ستەمی کاربەدەستان لە سەریان دەبن، هەرکاتێك دەست بگرنەوە لە دانی زەکاتی ماڵەکانیان ئیللا خوای گەورە بارانیان لێ دەگرێتەوە، ئەگەر گیانلەبەران نەبوایە ئەوا بارانیان بۆ نەدەباری، هەرکاتێك پەیمانی خوا و پێغەمبەرکەیﷺ بشکێنن ئیللا خوای گەورە دوژمنێك جگە لە خویان زاڵ دەکات بە سەریاندا، هەندێ لەوەی کە لە بەر دەستیاندایە دەیبات، هەرکاتێك پێشەواو کاربەدەستانیان حوکم بەقورئان نەکەن و بە ئارەزووی خۆیان لێی هەڵبژێرن ئیللا خوای گەورە ناکۆکی دەخاتە نێوانیان)).

ئایا هیچ شتێك ماوە پێغەمبەری خواﷺ نەیگوتبێت؟ ئایا ئەمە ئەو واقیعە تاڵەی ئێمە نییە !؟ ئایا ئەم ئوممەتە ئێستا بەو شێوەیە نازێت؟ ئیللا مەگەر کەسانێك نەبێت خوای گەورە خۆی رەحمی پێیان کردبێت ...

خوای گەورە دەفەرموێت: (( إلا الذين ءامنوا وعملوا الصالحات وقليل ما هم )) ( ٢٤ ) سورة ص ) واتە: ئەوانە نەبێت کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە، دیارە ئەوانەیش زۆر کەمن )).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ﴾ سبأ:١٣، واتە: بەڵام لە بەندەکانم کسەمێکیان سوپاسگوزارن)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ﴾ الأنعام: ١١٦، واتە: ئەگەر لە زۆربەی خەڵکانی ئەم سەر زەوییە، کە بێ باوەڕن پەیڕەوی بکەیت لە ڕێگەی خوا لات ئەدەن و چەواشە و سەر لێشێواوت ئەکەن )).

جا پێغەمبەری خواﷺ باسی ئەم واقیعەمان بۆ دەکات بەم دیمەنە پێغەمبەرایەتییە روون و ئاشکرا و ڕاستییە دەربارەی مردنی کت و پڕ، ئەم جۆرە مردنەش بە شێوەیەکی ئاشکرا دەرکەوتووە و نمونەی زۆرمان لە بارەیەوە هەیە و زۆربەمان دەیزانین، جا هەر کاتێک لە جێگایەکدا جەنگ روو بدات و فیتنە و مەینەتی تێدا بڵاو ببێتەوە دەبینی زۆربەی خەڵکی لە هەموو کاتژمێرێکدا خۆزگە بە مردن دەخوازێت —داوا لە خوا دەکەم ئاسایشی ئێمە و ئێوە بپارێزێ وە هەروەها نیعمەت و خۆشگوزرانیو جێگیربوونمان لێ تێك نەدات و خەمیخەمباران نەهێڵێت و کێشەی کێشەداران نەهێڵێ و پەژارەی هەموو موسڵمانان بنەبڕ بکات و هەر خۆی پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

چەندەها خەڵکی هەن هیچ شەوێك بە سەریاندا تێپەڕ نابێت ئیللا لە خوا دەپاڕێنەوە و داوای مردنی لێ دەکەن کەسێك دەبینی خێزان و کۆمەڵێك منداڵی هەیە و هەموو ڕۆژێك داوای خەرجی لێ دەکەن و خواردنی ڕۆژانەیان نییە، بیر لەوە دەکاتەوە ئاخۆ بۆ ڕۆژی جەژن منداڵەکانی چی لە بەر بکەن ! کەچی لەولاشەوە کەسانێك هەن لەو پەڕی خۆشگوزرانیدا دەژین و ئاگایان لە حاڵی بێ نەوایان نییە. چەندەهاخەڵکی هەن ئێستا لەعێراق و فلسطین و سودان و صومال و ئەفغانستان و شیشان و زۆربەی سەر ئەم زەوییە خۆزگە بە مردن دەخوازن لە هەموو ساتێکدا بە بێ هیچ زیادەرەوییەك.

هەموو ئەوانە ڕوویداوە بەو شێوەیەی کەوا خۆشەویست باسی کردووەﷺ — دایك و باوك و ڕوحم بە فیدای بێت — بۆیە دەبینی کەسێك بە تەنیشت گۆڕی کەسێکی ترەوە دەڕوات دەڵێت: خۆزگە من لە جێی خاوەنی ئەم گۆڕە بوایەم... بۆ؟ چونکە فیتنەکان زۆربوونە، ئەویش دەیەوێت دینەکەی خۆی بپارێزێت و لە

دەستی نەدات تاوەکو بە گوێڕایەڵییەوە بگاتە خواکەی خۆی.

هەندێ لە ئەهلی زانست و زانیاری دەڵێن: خۆزگە بە مردن دەخوازێت لە بەر توندی بەڵا لە کارو باری دونیادا، کابرایەك تەنها پارووپەك خواردن شك نابات و دەرخواردی منداڵەکانی بدات، بۆیە رەنگە جاری وا هەبێت خۆی ببینێتەوە ناچار بێت بە کەوتنە ناو حەرامەوە جا لە خوا دەپارێتەوە کە گیانی بکێشێ لە پێش ئەوەی دەستی بۆ حەرام درێژ بکات .

بەڵام پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (أنس)ەوە: ((لا يتمنين أحدكم الموت من ضر أصابه، فإن كان لا بد فاعلا، فليقل: اللهم أحيني ما كانت الحياة خيرا لي، وتوفني إذا كانت الوفاة خيرا لي)) واتە: با هیچ کەس لە ئێوە خۆزگە بە مردن نەخوازێت لە بەر زیان و زەرەرێك کە پێی دەگات، ئەگەر هەر ناچار بوو بیڵێت ئەوا با بڵێت: خودایە بمژێنە ئەگەر ژیان بۆ من باشترە، و بمرێنە ئەگەر مردن بۆ من باشترە)).

براکەم... بە وردی سەرنجی ئەو پارانەوەیانەی پێغەمبەرﷺ بدە کە تۆ ئێستا دەیخوێنیتەوە و بە وردی بیری لێ بکەرەوە.

(سهل ی کوڕی عبدالله التستری) دەڵێت: ((هیچ کەسێك خۆزگە بە مردن ناخوازێت تەنها سێ کەس نەبێت: کابرایەکی بێ ئاگایە لەوەی کە لە پاش مردن چی هەیە، کابرایەك دەیەوێت لە قەدەری خوا هەڵبێت و کابرایەکی تامەزرۆی گەیشتنە بە دیدەنی خوای پەروەردگار)).

جا ئەو کەسەی کە بێ ئاگایە لەوەی کە لە پاش مردن چی هەیە لەو هەموو کارەساتە دەیەوێت لە دونیا هەڵبێت کەچی نازانێت چی لە پێشی هەیە، یان چی توش دەبێت و چی دەبینێ، کابرایەك دەیەوێت بمرێت لە ترسی توش بوونی فیتنە وە لە ترسی ئەوەی کە خوای گەورە تەقدیری کردووە و کابرایەکی خۆشەویست و تامەزرۆی بینین و دیدەنی خوای گەورە دەکات .

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب المرضى، باب نهي تمني المريض الموت (٥٦٧١)، ومسلم كتاب الذكر والدعاء، باب كراهة تمني الموت لضر نزل به(٢٦٨٠).

جا لێرەدا پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ دەفەرموێت: هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)[١] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی دایکە (عائیشە) وە: ((من أحب لقاء الله أحب الله لقاءه، ومن كره لقاء الله كره الله لقاءه)) قالت عائشة: فقلت: يا نبي الله أكراهية الموت؟ فكلنا نكره الموت، قال ﷺ: " ليس كذلك، ولكن المؤمن إذا بشر برحمة الله ورضوانه وجنته، أحب لقاء الله، فأحب الله لقاءه، وإن الكافر إذا بشر بعذاب الله وسخطه كره لقاء الله وكره الله لقاءه)) واتە: هەرکەسێ حەز لە دیدەنی خوای گەورە بکات ئەوا خوای گەورەش حەز بە دیدەنی ئەو دەکات، هەرکەسێ حەز بە دیدەنی خوای گەورەی نەکرد ئەوا خوای گەورەش حەز بە دیدەنی ئەو ناکات، عائیشە دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا مەبەستت رق بوونە لە مردن، ئێمە هەموومان رقمان لە مردنە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مەبەستم ئەوە نییە، بەڵکو کەسی ئیماندار ئەگەر موژدەی رەحمەت و رەزامەندی و بەهەشتی خوای پێدرا ئەوا حەز بە دیدەنی خوا دەکات، کەسی بێ باوەڕ ئەگەر موژدەی سزا و تووڕەیی خوای پێدرا ئەوا حەز بە دیدەنی خوا ناکات و خوایش حەزی لە دیدەنی ئەو نییە)).

لە ((موطأ الإمام مالك))[٢] و جگە لەو بە سەنەدێکی (صحیح) هاتووە کەوا کاتێ عومەری کوڕی خەتتاب تەمەنی گەورە بوو گوتی: ((اللهم كبرت سني، وضعفت قوتي، وانتشرت رعيتي، فاقبضني إليك غير مضيع ولا مفرط)) واتە: ئەی خودایە ! تەمەنم گەورە بووە، و هێزم نەماوە و رەعیەتەکەم (ژێردەستەکەم) بەربڵاو بووە جا گیانم بکێشە بۆ لای خۆت بە بێ تیاچوون و بە بێ زیادەڕەوی)) .

چەند پاڕانەوەیەکی جوانە لە ئەمیری ئیماندارانەوە عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خوای لێ بێت) ! !

ئەم بەشە بە نیشانەیەکی تر کۆتایی پێ دەهێنم کە بڵاو بووەتەوە و زۆر بووە لەم سەردەمەدا، راستگۆی باوەڕپێکراو باسی کردووە، ئەو کەسەی هەرگیز لە

---

١ ـ أخرجه البخاري كتاب الرقاق، باب من أحب لقاء الله أحب الله لقاءه (٦٥٠٧)، ومسلم كتاب الذكر والدعاء،باب من أحب لقاء الله أحب الله لقاءه، ومن كره لقاء الله كره الله لقاءه (٢٦٨٤، ٢٦٨٥).

٢ ـ أخرجه مالك في (الموطأ) (١٥٠٦)، وأبو نعيم في(الحلية)(٥٤/١)، وابن أبي عاصم في(الآحاد والمثاني) (١٠٧/١).

خۆوە قسە ناکاتﷺ هەروەکو ئیمامی ئەحمەد لە (مسند) ەکەیدا و الحاکم لە (مستدرك) ەکەیدا بە سەنەدێکی (صحیح)[١] ریوایەتیان کردووە لە فەرموودەیەکی (عبدالله ی کوڕی عمرو) ەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوافەرموویەتیﷺ: ((سیکون في آخر أمتي رجال يركبون على السروج كأشباه الرحال، ينزلون على أبواب المساجد، نساؤهم كاسيات عاريات، على رؤوسهم كأسنمة البخت العجاف)) واتە: لە کۆتایی ئوممەتەکەمدا پیاوانێك دێن سواری تەخت دەبن وەکو جلی سەر وشتر وایە لە دەرگای مزگەوتەکان دادەبەزن، ژنەکانیشیان پۆشتەی رووتن،سەریان وەکو بانپشتی وشتر وایە)) .

السروج لە زمانەوانیدا: کۆی (سرج) ە ئەویش ئەوەیە کە لەسەر پشتی وشتر دادەنرێت وەکو کۆپانە و کەژاوە، هەروەها مەبەست لە (الرحال): ئەو کەژاوەیەیە کە ئافرەت سواری دەبێت، بە ماڵی هەر پیاوێك دەڵێن: رحل.

جا ئێوە ئێستا دەبینن ئۆتۆمبیل هەروەکو ماڵی لێهاتووە،[٢] هەموو تایبەتمەندییەکی تێدا ئامادەیە بە تەواوی، بەڵکو – دوور لە رووتان – ئۆتۆمبیلی وا هەیە ئاودەستی تێدایە، رەنگە هەر مرۆڤێك لەسەر کورسیەکەی دادەنیشێت و رەنگە بخەوێت، ئێوەش دەزانن ئەو ئۆتۆمبیلانەی کە لە کەرەفانە دەچێت ... هتد

ئەو فەرموودەی پێغەمبەرﷺ کە دەفەرموێت: ((نساؤهم كاسيات عاريات على رؤوسهم كأسنمة البخت العجاف)) البخت: جۆرێکە لەو جۆرە وشترە (خوراسانی)یانەیە کە لە رادەبەدەر ملیان درێژە, والسنام: ئەو بەشە بەرزەی سەر پشتی وشترە.

جاپێغەمبەری خواﷺوەسفی ئەوئافرەتە داپۆشراوە رووتەی کردووەو شێوەیداهێنانەبەرزەکەی پرچی کە پێی دەڵێن: (بریینی شێر)وەکوئەو کۆپارەی سەرپشتی وشتر.

---

١ـ أخرجه أحمد (٢/٢٢٣)، وابن حبان في ((صحيحه)) (٥٧٥٣)، والحاكم (٤/٤٣٦)، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (٢٦٨٣).

٢ـ ونحن لا نجزم بأن هذا هو مراد النبيﷺ!لا،فالجزم بذلك ضرب من التخمين والظن الذي لا ينبغي ولايجوز بحال

له ڕیوایەتێكی تردا كه له (صحيح مسلم)[1] دا هاتووه له فەرموودەی (أبو هريرە) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموويەتی: ((صنفان من أهل النار لم أرهما...)) واته: دوو كۆمەڵ دێن له ئەهلی ئاگرن و من ئەوانم نەبينيوه))

ئەی پەروەردگارمان بمانپارێزه ! ! ئەمه فەرموودەی ئەو پێغەمبەره میهرەبان و بەديارى نێردراوەيه ﷺ: ((قوم معهم سياط كأذناب[2] البقر))، واته: دەستەيەك قامچيان پێيه هەروەكو كلكی مانگا وایه)) براكەم ... ئاگاداری ستەم به، به ناحەق هەرگیز ئازاری هیچ موسڵمانێك مەدە...

لا تظلمن إذا ما كنت مقتدراً    فالظلم ترجع عقباه الى الندم
تنام عيناك والمظلوم منتبه    يدعوا عليك و عين الله لم تنم

واته: هەرگیز ستەم مەكه ئەگەر بوويته كەسێكی به توانا و دەسەڵاتدار، چونكه هەردەم ستەم پەشيمان بوونەوەی به دواوەيه، تۆ دەخەوی و چاوەكانت له يەك دەنێت و ستەملێكراويش به ئاگايه،دوعات لێ دەكات و چاوەكانی خوايش نەخەوتووه.

جا ئەو كەسەی كه ئەو قامچيیەی پێيه و له خەڵكی دەدات به ناحەق و ناڕەوا ئەوه له ئەهلی ئاگره به شايەتی پێغەمبەری هەڵبژێردراو ﷺ ئەگەر تەوبه نەكات و نەگەڕێتەوه بۆ لای خوای بەخشندە و لێبوردە ((ونساء كاسيات عاريات، مميلات مائلات، رؤوسهن كأسنمة البخت المائلة، لا يدخلن الجنة، ولا يجدن ريحها، وإن ريحها ليوجد من مسيرة كذا وكذا)) واته... ئافرەتانێكی پۆشتەی ڕووت خۆيان بۆ پياوان لار دەكەنەو و لەنجەولار دەكەن له ڕێكردندا سەريان وەك بانپشتی وشتر وايه، ئەوانه ناچنه بەهەشتەوه و بۆنيشی ناكەن ئەگەر چی بۆنيشی ئەوەندە و ئەوەندە ڕۆژەرێ دەڕوات)).

---

١ـ أخرجه مسلم، كتاب اللباس والزينة، باب النساء الكاسيات العاريات المائلات المميلات (٢١٢٨).

٢ ـ جمع ذنب، وهو عقب كل شيء، والمراد به هنا:الذيل.

ئیمامی النووی دەفەرموێت: ((ئەم فەرموودەیە یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەرایەتی، ئەوەی ئەو باسی کردووە لەم دواییانەدا ڕوویداوە جا مەبەست لە خاوەنی السیاط ئەو کاربەدەستانەن کە قامچی ستەم لە خەڵکی دەکەن .

بەڵام مەبەستی لە((کاسیات عاریات)) پۆشتەی ڕووت، ئەوا چەند بۆچوونێك هەیە:

* یەکەم: پۆشتەن لەنیعمەتەکانی خوای گەورە،بەڵام ڕووتن لەسوپاسگوزاری ئەو.

* دووەم: پۆشتەن لە جلّ و بەرگدا بەڵام ڕووتن لە ئەنجامدانی چاکەکاری و بایەخ بە دوارۆژی خۆیان و گرنگیدان بە گوێڕایەڵی.

* سێیەم: هەندێك لە جەستەی خۆی دەردەخات لە بەر جوانی جا ئەوانە پۆشتەی ڕووتن.

* چوارەم: جلو بەرگی تەنك لە بەر دەکەن کە ئەوەی لە ژێرەوەیەتی وەسف دەکات جا ئەوانە ڕووتن بەڵام پۆشتەن بە مانا.

مەبەست لە (مائلات و ممیلات) دەڵێن: لە گوێڕایەڵی خوای گەورە لایانداوە لە پاراستنی دامێنی خۆیان و جگە لەوانە، و( ممیلات): جگە لە خۆیان کردەوەکانی خۆیان فێر دەکەن.

دەڵێن: مائلات: واتە بە فیزەوە ڕێ دەکەن وە ممیلات:شانەکانیان لار دەکەنەوە.

دەڵێن: مائلات: واتە پرچەکانیان بە لارەوە دادەهێنن کە ئەویش شێوەی ئافرەتە داوێن پیسەکانی پێ دەناسرێت، ممیلات: بەو شێوە داهێنانە پرچی ئافرەتانی تر دادەهێنن.

دەڵێن: مائلات: لاردەبنەوە و بەرە و لای پیاوان ممیلات: جوانییەکەی خۆیان بۆ پیاوان دەردەخەن.

((رؤوسهن كأسنمة البخت)) واتە: سەر و پرچی خۆیان گەورە دەکەنەوە بەو

قوماش و كڵاوانەی كە دەیدەنە سەری خۆیاندا تاوەكو وەكو كۆپارەی وشتری لێ دێت (ئەمە بە ناوبانگترین مانایە لە راڤەكردنی فەرموودەكە).

(المازري) دەڵێت: رەنگە مەبەست لە ماناكەی ئەوە بێت: تەماحی پیاوان دەكەن و چاویان داناپۆشن بەرانبەریان و سەریان داناخەن.

بەڵام (القاضي) رایەكی تری هەڵبژاردووە كەوا المائلات بە شێوەیەكی لارەوە پرچەكانیان دادەهێنن، دەڵێت: مەبەستی پەلك و هوون و پرچ و توند بەستنەوەی بۆ سەرەوەو كۆ كردنەوەی لە ناوراستی سەریان بۆیە بەشێوەی كۆپارەی وشتری لێ دێت.

دەڵێت: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كەوا مەبەست لە لێچوونی بە كۆپارەی وشتر بەرز بوونەوەی پەلكەكانیان لەسەر سەریان و كۆ كردنەوەی پرچەكانیان لەوێ، زۆر دەبێتەوە تاوكو بە لایەكی سەریدا مەیلان دەكات هەروەكو چۆن كۆپارە مەیلان دەكات.

ابن درید دەڵێت: دەڵێن (ناقة میلاء) ئەگەر هاتوو كۆپارەكەی بە لایەكدا مەیلان بكات . خوایش لە هەمووان زاناترە.

فەرموودەكەی پێغەمبەرﷺ: ((لا یدخلن الجنة)) هەروەكو ئەوانەی پێشوو دوو بۆچوونی لە سەرە:

یەكەمیان: مەبەستی ئەوەیە ئەو كەسە شتی حەرامی حەڵاڵ كردووە هەرچەندە دەزانێت ئەوە شتێكی حەرامە بۆیە پێی كافر دەبێت و بە هەتا هەتایی لە ئاگردا دەمێنێتەوە و هەرگیز ناچێتە بەهەشتەوە .

دووەمیان: مەبەستی ئەوەیە كە لە گەڵ سەركەوتووەكاندا یەكەم جار ناچێتە بەهەشتەوە، خوایش باشتر دەزانێت)) تەواو بوو..

خۆشكی بەرێزم... بۆ خۆدەردەخەیت و خۆ دەرازێنیتەوە؟ چۆن بەو جل و بەرگە ئابڕوبەرەوە دەردەچێتە دەرەوە؟

زۆر بە جوانی بیر لەو وەسفە جوانەی پێغەمبەرﷺ بكەرەوە كەوا لە سەردەمەی ئەودا نەبووە... ئافرەتێك پۆشاكی لە بەردایە بەڵام رووتە!! چۆن؟ چونكە

پۆشاکی زۆر تەنگە جوانی جەستە دەردەخات، یان زۆر تەنك و سووکە یان لە چەند لایەکەوە کراوەتەوە ((کاسیات عاریات ممیلات مائلات)) لە ڕێکردنیدا لارولەنجە دەکات، بۆیە دڵی پیاوانی بۆ لار دەبێتەوە ! بۆ ئەی خۆشکی بەڕێزم!؟ سوێند بە خوا... خوای گەورە حیجابی لە سەرت فەرز نەکردووە و دوو بە دووبوونەوەی لە گەڵ پیاوی ئەجنەبیدا حەرام نەکردووە ئیللا لە بەر ئەوەی تۆ مرواریيەکی پارێزراوی و گەوهەرێکی پۆشراوی، جا تۆ دایکی، تۆ خێزان و خانەوادەی، تۆ کچی و تۆ پوریت، ئەگەر تۆ نیوەی کۆمەڵگا ببەخشیت و خۆتیش نیوەی کۆمەڵگەی کەواتە تۆ هەموو کۆمەڵگەی.

| | |
|---|---|
| يــا درة حفظـــت بـــالأمس غاليـــة | واليـــوم يبغونهـــا للـــهو واللعـــب |
| يـــا حـــرة قـــد أرادوا جعلـــها أمـــة | غريبـــة العقـــل غريبـــة النـــسب |
| هل يستوي من رسول الله قائده دوماً | و آخـــــر هاديـــــه أبـــــو لهـــــب |
| وأيـــن مـــن كانـــت الزهـــراء أســـوتها | من من تقفت خطا حمالة الحطب |
| فـــلا تبـــال بمـــا يلقـــون مـــن شـــبه | وعندك الشرع إن تدعيه يستجب؟ |
| سليه من أنا؟ لمن أهلي؟ لمن نسبي؟ | للغرب أم أنا للإسلام والعُرْبِ ؟ |
| لمـن ولائـي؟ لمـن حـبي؟ لمـن عملـي؟ | لله أم لـــدعاة الإثـــم والكـــذب ؟ |
| هما سبيلان يا أختاه ما لهما من ثالث | فاكـــسبي خـــيرا أو اكتـــسبي |
| ســـبيل ربـــك والقـــرآن منهجـــه | نـور مـن الله لم يحجـب ولم يغـب |

واتە: ئەی ئەو مرواریيەی تا دوێنی بە نرخەوە پارێزراوبوو، بەڵام ئەمڕۆ دەیانەوێت بیکەنە جێگەی گەمە و یاری، ئەی ئەو ئازادەی دەیانەوێت ببێتە کۆیلە بە عەقڵ و بە ڕەچەڵەك نامۆیە، ئایا کەسێك پێغەمبەری خواسەرکردەی بێت هەردەم یەکسانە لە گەڵ کەسێکدا پێشڕەوەکەی ئەبو لەهەب بێت؟، چۆن یەکسانە کەسێك پێشەنگی (زەهرا) بێت، لە گەڵ کەسێکدا شوێن پێی (حمالة الحطب)ی هەڵکردبێ، هەرگیز گوێی پێ مەدە کە گومان دەکەنە دڵتەوە، لە کاتێکدا تۆ شەرعێکت هەیە گەر بانگی بکەی وەڵامت دەداتەوە، لێی بپرسە من کێم؟ ئەهل و

ڕەچەڵەکم بۆ کوێ دەگەڕێتەوە؟، بۆ ڕۆژئاوا یان بۆ ئیسلام و عەرەب ؟، دڵسۆزیم بۆ کێیە؟ خۆشەویستیم بۆ کێیە؟ کارەکەم بۆ کێیە؟، بۆ خوایە یان بۆ بانگەوازکارانی خراپەکاری و درۆیە ؟، ئەوە دوو ڕێگایە – خوشکەکەم – سێیەمیان نییە، بۆیە چاکە بە دەست بهێنە یان داوای بکە، ڕێگای پەروەردگارت و قورئان پەیرەوی ئەوە، روناکی لە خوداوە داناپۆشرێت و بزر نابێت.

خێراکە خوشکی بەڕێزم –هەر ئێستا – ... ئەی گەوهەرە بە نرخەکە ... ئەی مرواریيە پۆشراوەکە... ئەی یاقوتە پارێزراوەکە... خێراکە ئەی کچی یەکتاپەرست ئەی کچی ئیسلام... خێراکە حیجابەکەت داپۆشە... بەرەو ڕەوشت بەرزی، بەرەو داوێن پاکی...

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ﴾ الأحـزاب: ٥٩، واتـە: ئـەی پەیامبـەرﷺ بـە ژنـەکانت بڵێ، بە کچەکانت و ژنانی بڕوادار بڵێ: باڵاپۆش و عاباکانیـان بپێـچن بـە خۆیانـا بـە شێوەیەك کە تەواوی سەر و مل و جەستەیان داپۆشێ)) .

کەوابوو خێراکە ئەی خوشکی ڕۆژووانم ..ئەی خوشکی نوێـژەرم ..خێراکـە ئـەی خوشکی باڵاپۆشم ... خێراکە هەر ئێستا بڕیاری گوێڕایـەڵی خـوا و پێغەمبەرەکـەت بدەﷺ.. بـە خۆشەویستی خـوا، بـە خۆشەویستی پێغەمبەرەکەی ﷺ.. ئـەویش بەوە دەبێ هەر لە ئێستا بە دوواوە چیتر لـە مـاڵ دەرنەچیت ئـیللا بـە پۆشـاکێکی شـەرعییەوە نـەبێت، نابێـت – خوشـکی بـەڕێزم – هـەرگیز ئـەو فەرموودەیـەی پێغەمبەری خواﷺ لە بیر بکەی کە دەفەرموێت: ((صنفان مـن أهـل النـار لم أرهمـا، قوم معهم سياط كأذناب البقر يضربون بها الناس، ونساء كاسيات عاريات)) داوا لـە خوا دەکەم هەرگیز نەبیتە ئەو جۆرە، هەر خۆی پشت و پەنامانە و توانای بە سـەر هەموو شتێکدا هەیە وە داوا لە خوا دەکەم لە دونیا و قیامەتدا دامانپۆشێت ...

# نزیکبوونەوەی ڕۆژگار و کەمبوونەوەی کار و زۆربوونی چروکی و ڕەزیلی

## لە نیشانەکانی قیامەت: نزیك بوونەوەی ڕۆژگار...

ئیمامی (البخاری) لە (صحیح)[١] ەکەیدا ریوایەتی کردووە لە فەرموودەی (أبو هریرە) ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((لا تقوم الساعة حتى يقبض العلم وتكثر الزلازل و يتقارب الزمان ...)) واتە: قیامەت هەڵناسێت تاوەکو زانیاری هەڵنەگیرێت و بومەلەرزە زۆر نەبێت و ڕۆژگار نزیك نەبێتەوە ...)) لە ریوایەتێکی تردا هاتووە ((يتقارب الزمان، وينقص العمل، ويلقى الشح)) واتە: ڕۆژگار نزیك دەبێتەوە و کارکردن کەم دەبێتەوە و چرووکی زۆر دەبێت)) .

نیشانەی یەکەم: لەم فەرموودەیەدا ((تقارب الزمان))... ئایا مانای ئەو فەرموودەیە چییە ((حتى يتقارب الزمان))؟ من مانای ئەم فەرموودەیە بە فەرموودەیەکی تری پێغەمبەری خواﷺ روون دەکەمەوە، چەند جوان و قەشەنگە کەوا هەموو قسەکانمان قسەی پێغەمبەری خوابن ﷺ!؟

لە (مسند) ی ئیمامی ئەحمەد و (صحیح) ی ابن حبان و جگە لەوان بە سەنەدێکی (صحیح)[٢] هاتووە لە فەرموودەیەکی (أبو هریرە) ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((لا تقوم الساعة حتى يتقارب الزمان، فتكون السنة كالشهر، ويكون الشهر كالجمعة، وتكون الجمعة كاليوم، ويكون اليوم كالساعة، وتكون الساعة

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب الاستسقاء باب ما قيل في الزلازل و الآيات (١٠٣٦)، وكتاب الأدب، باب حسن الخلق والسخاء و ما يكره من البخل (٦٠٣٧).

٢ـ أخرجه أحمد (٢/٥٣٧، ٥٣٨)، وابن حبان في ((صحيحه)) (٦٨٤٢)، وأبو يعلى في ((مسنده)) (٦٦٨٠) من حديث أبي هريرة ﷺ.

وله شاهد عن أنس ﷺ أخرجه الترمذي، كتاب الزهد، باب ما جاء في تقارب الزمان (٢٣٣٢)، وصححه العلامة الألباني في ((صحيح الجامع)) (٧٤٢٢).

کاحتراق السعفة الخوصة)) واتە: قیامەت ڕوونادات تاوەکو ڕۆژگار نزیك نەبێتەوە،جا ساڵێك وەکو مانگێك دەبێت و مانگێك وەکو هەفتەیەك دەبێت و هەفتەیەك وەکو ڕۆژێك دەبێت و ڕۆژێك وەکو کاتژمێرێك دەبێت وە کاتژمێرێکیش وەکو سوتاندنی سەعاف دارەخورمایەك دەبێت)) صەڵات و سەلام لەسەر ئەو کەسەی کە هەرگیز لە خۆ وە قسە ناکات، جا ئەم نیشانەیە ڕووی داوە ئێمە پێش چەند ڕۆژێکی کەم ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانمان دەگرت ئا ئەوەتا ئێستا چاوەڕوانی ڕەمەزانێکی تر دەکەین، هەروەها ساڵێك وەکو مانگێکی لێ دێت ! خاوەن کارێك یان خاوەن پیشەیەك یان خاوەن نوسینگەیەك دەردەچێت، هەرکە دەردەچێت و دەچێتە سەر کارەکەی گوێی لەبانگی نیوەڕۆ دەبێت،هەر کە کاغەزەکان ئەمدیو ئەودیو دەکات و دەست بەهەر کارێك دەکات دەبینی کاتەکە وا تەواو بووەو کاتژمێرەکەش ڕۆیشت و ڕۆژەکەیش بە دوایدا تەواو بوو ... الله أكبر.

هەفتە وەکو ڕۆژ وایە، ڕۆژیش وەکو کاتژمێرە، کاتژمێریش هیچ نییە وەکو ئەوەیە گەڵای دارەخورمایەك کەوتە خوارەوە و سووتا.

ئەم نزیك بوونەوە سەیرە بۆ وای لێهاتووە؟

زاناکان لەم بابەتەدا چەند ڕایەکیان هەیە: گرنگترین ڕا لەو ڕایانەدا کەوا دڵم پێی ئارام بێت و نەفسم پێی ڕازی بێت: نەمانی بەرەکەتە لە کاتەکاندا، واتە: بەرەکەت لە کاتەکاندا کەم بووەتەوە، وە لە کارەکاندا ! ئایا تاوانی ئێمە لەوەدا چییە؟ وا مەڵێ... ئێمە هۆکارین، چۆن؟ ! بە تاوان و سەرپێچییەکانمان، ئایا چارەسەر چییە و کار چییە؟ بە دوو شت: ئەوانیش ئیمان و تەقوایە .

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوْاْ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾ الأعراف: ٩٦، واتە: ئەگەر خەڵکی ئەو گوند و شارانە بڕوایان هێنابا و لە خوا ترسیان بووبا و کاریان بە بەرنامەی ئەو کردبا ئێمەش دەرگای گشت خێر و پیتێکی ئاسمان و زەوییمان بە ڕوویاندا واڵا دەکرد)).

جا سەر زەوی هەموو پڕە لە خەیر و بەرەکەت و نیعمەت،ئاڵتونی تێدایە،فوسفات و منجنیز و نەوتی تێدایە و هەروەها بەرەکەت لەئاسمانەوە

دادەبەزێت لەڕەحمەت و باران و خەیرات، بەڵام بەرەکەتی تێدا نەماوەو هەڵگیراوەو لاواز بووە و کەم بووەتەوە... دەتەوێت شەو هەستی بۆ شەونوێژ کەچی بەرەکەت لە کاتەکەدا نابینیتەوە, دەتەوێت پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنیت کەچی بەرەکەت لە کاتەکەدا نەماوە، دەتەوێت کارێك ئەنجام بدەیت کەچی کات نییە، جا بە شێوەیەکی دیار و ئاشکرا بەرەکەت نەماوە! پێغەمبەری خواﷺ راستی فەرمووە کاتێك دەفەرموێت: ((لا تقوم الساعة حتى يتقارب الزمان)).

بەڵام چۆن جارێکی تر بەرەکەت دەگەڕێتەوە بۆ کار و تەمەن و وشە و حاڵ و ماڵ و تەندروستیمان؟ وڵامەکەی هەر ئەوەیە کە باسم کرد بە ئیمان و تەقوا .

بەڵام ئیمان تەنها وشەیەك نییە – داوا لە خوا دەکەم ئیمان بە قسمەتی ئێمە و ئێوە بکات – جا ئیمان بریتییە لە: وتن بە زمان و باوەڕهێنان بە دڵ و کارکردن بە ئەندام و پەلەکان . وە تەقواش بریتییە لە: دین و پرۆگرام و بەرنامە، چونکە تۆ رۆژوو ناگریت تەنها لە بەر تەقوا نەبێت و حەج ناکەیت تەنها لە پێناوی تەقوادا نەبێت و صەدەقە بە هەزاران نادەیت تەنها لە پێناوی تەقوادا نەبێت هەموو پەرستنەکان لە پێناوی تەقوا ئەنجام دەدرێت چونکە مەبەست لە دروست کردنی هەموو دروستکراوەکان تەنها پەرستنە هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ الذاريات: ٥٦، واتە: مـن هـەر بۆیە جنۆکە و ئادەمیزادم دروست کردووە بم پەرستن و بمناسن)) .

بەڵام ئایا دەزانی مەبەست لە پەرستن تەقوایە؟ بەڵێ... خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ البقرة: ٢١، واتە: ئەی خەڵکینە! تەنها پەروەردگاری خۆتان بپەرستن کە ئێوە و پێشووەکانی ئێوەی لە نەبوون دروستکردووە چونکە ئاوا پەرستنێك هێزی پارێزگاری دروست دەکا و بەڵکو ئێوەش خۆ بپارێزن)).

کەوابوو بە تەقوا و ئیمان بەرەکەت دادەبزێتە سەر تەمەن و سامان و خواردنەکانمان، جا هۆی نەمانی ئەم هەموو بەرەکەتانە تەنها تاوان و سەرپێچی

خۆمانە، ئەگەر گەڕاینەوە و لە لای پەروەردگارمان تەوبەمان کرد ئەوا بەرەکەت لە ژێر پێمانەوە هەڵدەقوڵێت و لە ئاسمانەوە بەرەکەتمان بۆ دادەبەزێت...

لە سەردەمێك لە سەردەمەکاندا دەنکە گەنمێکیان لە ناو سنوقێکی شووشەدا دەزیوەتەوە بە قەد ناوکە خورمایەك بووە و لە ژێری نوسراوە: ئەم گەنمە لە سەردەمی بەرەکەتدا لە زەوییەوە سەوز بووە، جارێکی تر بەرەکەت دادەبەزێتەوە (انشاء الله) جا بۆیە بێ هیوا و بێ ئومێد مەبە...

بەڵام ئەم بەرەکەتە لە سەردەمی پێغەمبەری خواعیسادا دەبێت (علی نبینا وعلیه أفضل الصلاة والسلام)، من باسی ئەم بابەتە دەکەم بە درێژی -انشاء الله- لە کاتی باسکردنی دابەزینی عیسا ی کوڕی مەریەمدا عليه السلام چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ تەنانەت باسی ئەو جلوبەرگەی عیسای کردووە کاتێ لە ئاسمانەوە پێوەی دادەبەزێت،- انشاء الله- باسی ئەوە بە درێژی دەکەم لە جێگەی خۆیدا.

جا لێرەوە دەڵێین: ئەو نیشانەیە رویداوە بە شێوەیەك کەوا دڵەکەت پڕ دەکات بە خۆشەویستی و باوەڕ بە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لا تقوم الساعة حتى يتقارب الزمان، وينقص العمل))، واتە: قیامەت هەڵناسێت تاوەکو رۆژگار نزیك دەبێتەوە و کارکردن کەم دەبێتەوە)) ئاه هـ... بە راستی ئەمە کێشەکەیە... دەبینی رەفی کتێبخانەکەمان پڕ دەکەین لە چەندان بەرگی کتێب (مجلدات)، کتێبی ئەوتۆمان هەیە کە پێشینەکانمان نەیانبووە بەڵام کێشەکە کێشەی تیۆر نییە !کەوابوو کوا کارکردن؟! کار کردن کەم بووەتەوە، ئەوەیشە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی قیامەت، دڵنیابە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ راستی فەرمووە دەربارەی هەر شتێك لە خودای گەورەوە کە دەربارەی ئەم دینە هاتبێت ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ﴾ النجم: ٣، واتە: قسەو گوفتاری(پێغەمبەر) لەرووی هەواوهەوەسەوە نییە))، بۆیە کاتێك بەراوردێك دەکەیت لەنێوان کار و کردەوەکانی ئێمەو کارو کردەوەکانی پێشینەکانمان ئەواکەلێنێکی گەورەو جیاوازییەکی زۆر دەبینی بەقەد نیوان زەوی و ئاسمانەکان، دەبینی ئەوان قسەکانیان کەم بووە،بەڵام کردەوەکانیان زۆر بوو وە

ئێمە قسەکانمان زۆر زۆرن کەچی کردەوەکانمان کەمن .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ﴾ یوسف: ٥٣، واتە: خۆ هەرگیزیش پاکانە بۆ خۆم ناکەم، چونکە نەفس و دەروون هەمیشە فەرمان بە خراپە دەدا)). داوا لە خوا دەکەم ڕاستی و ڕاستگۆیی بخاتە سەر زمان و کار و کردەوەمان لە هەموو کات و ساتێکدا، بە ڕاستی کاتێ من خۆم بەراورد دەکەم لە گەڵ پێشینە چاکەکانماندا هەست بە سووکی و گومڕاییەکی سەخت دەکەم! بە ڕاستی کار کردن بە شێوەیەکی غەمگین و شەرمەزاری کەم بووەتەوە! بە ڕاستی ئەم دابڕانە بێخێرە لەنێوان وتەو کردەوەکاندا هۆکارێکی زۆر ترسناکە لەهۆکارەکانی دواکەوتن و ریسوایی و زەلیلی و لاوازی ئەم ئوممەتە، چونکە بە ڕاستی -هەر وەکو باسم کرد- جیهان ناتوانێت فەرمانڕەوایی ئێمە بکات ئیللا لە ڕێگای کردار و داهێنان و ڕەوشت و بەرهەم و بەخشینەکەی نەبێت، بەڵێ... زۆر ئەستەمە کە زانایەك حوکم بە سەرماندا بکات لە ڕێگای وانەیەکی چاکەوە یان وتارێکی زرینگەدار یان تەنانەت لە ڕێگای دەیان بەرگی کتێبەوە کە چاپ دەکرێت، بەڵکو دەمانەوێت ئێمە بە کردار شایەتی بۆ ئەم دینە بدەین، چونکە ئیمان بە بێ کردار هیچ بایەخێکی نییە کەوابوو کردار بەشێکە لە ئیمان، پێشینانمان ﷺ هەرگیز کرداریان لە ئیمان دەرنەدەکرد، جا ئیمان وتەیە بە زمان و باوەڕهێنانە بەدڵ و کردارە بەئەندام و پەلەکان، بۆیە دەبێت ئێمەئەم قسەیە و ئەم باوەڕە بگۆڕینە کردەوەیەکی واقیعی لەسەر زەوی .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی هەروەکو لە (صحیح مسلم)[1] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (أبو هريره)ەوە: ((إن الله لا ينظر إلى صوركم وأموالكم، ولكن ينظر إلى قلوبكم وأعمالكم)) واتە: خوای گەورە تەماشای دیمەن و سامانەکانتان ناکات بەڵکو تەماشای دڵ و کردەوەکانتان دەکات)).

لەگەڵ مندا بیر لەم ئایەتە پیرۆزانە بکەرەوە، هەردەم ئایەتەپیرۆزەکان دێت و

---

١ـ أخرجه مسلم،كتاب البر والصلة و الآداب،باب تحريم ظلم المسلم و خذله و احتقارهو دمه و عرضه و ماله(٢٥٦٤).

ئیمان و کردار دەکاتە هاوڕێی یەك.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ﴾ البقرة:٢٥، واتە: ئەی پێغەمبەرﷺ مژدە بدە بەوانەی کە بڕوایان بە خوا و پەیامبەر و بە ڕۆژی دوایی هەیە و ئاکارە چاك و پەسەندەکان ئەنجام دەدەن کە بێ گومان بەهەشت گەلێکیان بۆ هەیە)) .

خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْفِرْدَوْسِ نُزُلًا﴾ الکهف: ١٠٧، واتە: بێ گومـان ئەوانـەی ئیمـان و باوەڕیـان هێنـاو کـردەوەی چـاکیان ئـەنجام دا هـەر لـە زووەوە باخـەکانی فیردەوسـان کردۆتـە جێـی پەزێراییان)).

بەڵکو خوای گەورە لە ئایەتێکی پیرۆزدا کرداری پێش ئیمان خستووە بۆ ئەوەی سەرنجمان بۆ گرنگـی کـردار ڕابکێشێ و دەڵێـت: ﴿مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ النحل: ٩٧، واتە: هەر کەسێك – لە نێر یان لە مـێ – هـەر کـارێکی چـاك ئەنجام بداو بە ئیمان و باوەڕداریش بێت بەڵێن بێت بیژێنین بە ژیانێکی پـاك، واتـە: بە ژیانێکی بە قەناعەت و بە سەعادەت، بە چاکتریش لەوەی کردوویانـە پاداشـتیان بدەینەوە)) بۆیە دەبێ کردار هەبێت، بەڵکو لە ئایەتێکی پیرۆزی تـردا لـە سـورەتی (الأعراف) خوای گەورە دەفەرموێت لە کۆتـایی ئایەتەکـەدا: ﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلْكُمُ ٱلْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ الأعراف: ٤٣، واتە: (جا کە بەهەشت دەبینن لە لایەن فریشتەکانەوە) بانگ دەکرێن و پێیان دەگوترێ ئـەم بەهەشـتە ئـەو بەهەشـتە بـوو بەڵێنتان پێ درابوو وا ئـەمڕۆ بـە هـۆی (ئـەو کـار و کـردەوە چـاکانەوە لـە دونیـادا ئەنجامتان دان پێتانـدرا بوونـە خـاوەنی، واتـە: بـە هـۆی مانـدوو بـوونی خۆتانـەوە بوو)).

نەوەك لە بەر ئەوەی تێڕوانینتان دەکرد یان خۆتان دەردەخست یان قسەتان دەکرد! هەرگیز وانییە! تێڕوانین چەندە ئاسانە! قسەکردن چەند ئاسانە ! بەڵام کێشەکە ئەوەیە کەوا ئەو قسەیە بگۆڕیتە کردەوە، ئەمە کێشەکەیە ... هەرگیز ئەم ئوممەتە بەختیار نابێت لە دونیا و قیامەتدا تاکو ئەم تیۆرە ئیمانییە و ئەم باوەڕەی ناو دڵەکان نەگۆڕێتە واقیعێکی کرداری و بەرنامەی ژیان، هەموو لە جێگەی خۆیدا و لە بواری خۆیدا.

ئێمە نامانەوێت هەموو ئەم ئوممەتە ببنە بانگەوازکار لەسەر مینبەرەکان، یان وانەبێژ لە کەناڵە ئاسمانییەکان، نەخێر هەرگیز... بەڵکو دەمانەوێت هەموو ئەم ئوممەتە ببێتە بانگەوازرکار بۆ دینی خوا بە وتە و باوەڕهێنان و کردەوە لەسەر مینبەری ئەم ئیسلامە گەورە و بڵندە، هەریەکەو لە پێگەکەی خۆی، هەرکەسێ لە جێگەی بەخششەکەی خۆی، تۆ کەسێکی پزیشکی ئەوا لە بوارەکەی خۆتدا داهێنان دابهێنە، تۆ کەسێکی ئەندازیاری لە کارگەکەی خۆتدا داهێنان دابهێنە، تۆ کەسێکی بازرگانی بازرگانییەکەت پێشبخە، هەروەها ئەو دوای پیشەکان بە گوێرەی ئەوەی کە خوای گەورە منەتی کردووە بە سەرتدا لە توانا و وزە و شارەزاییەکەت، بە راستی ئەوە شایەتییەکە هەرکەسێ بیشارێتەوە سوێند بە پەروەردگاری کەعبە ئەوا تاوانبارە، دەبێ ئێستا هەموو موسڵمانێك شایەتی بدات لە پێناوی ئیسلام و دینەکەیدا، ئێستا دەبێت هەموو خوشکێکی موسڵمان ئەو شایەتییە بدات لە پێناوی ئیسلام و دینەکەیدا بە وتە و باوەڕ و کردار... خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ الأعراف: ٤٣، (لە پێشدا راڤە کرا) .

من پرسیارێك دەکەم... ئایا ئێوە بیلال دەناسن؟ ئەو بیلالەی کە بانگ وێژی پێغەمبەری خوارﷺ بوو... ئەو کۆیلە حەبەشییە کە دینی ئیسلام بۆ ئەو پلە و پایە بڵندە بەرزی کردەوە ... بۆ ئەو جێگە بەرزە ... با رەدی ئەوانە بدەینەوە کەوا گۆرانی بە باڵای ئازادی و دیموکراسییەوە دەڵێن و پێیان بڵێین: بە راستی ئیسلام ئەو دینەیە کەوا یەکسانی لە نێو خەڵکیدا سەپاندووە، لە نێوان کۆیلە و

گەورەکەیدا جیاوازی نەکردووە، ڕێزو کەرامەتی بەخشیوەتە خوا ترسان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ﴾ الحجرات: ١٣، واتە: بێ گومان بەڕێزتریشتان لای خوا، ئەوەتانە کە بە تەقواتر و خۆپارێزتر بێت، لە سنوورەکانی خوا نەترازێت)).

تەماشای بیلال بکە... ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ چی بە ئەو دەفەرموێت؟ هەروەکو لە (صحیح البخاری و مسلم)[١] دا هاتووە لە فەرموودەی (أبو هریرە) ەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((یا بلال حدثني بأرجى عمل عملته في الإسلام، فإني سمعت دف نعليك بين يدي في الجنة)) واتە: ئەی بیلال باسی چاکترین کارێك کە لە ئیسلامدا کردبێتت بۆ بکە، چونکە من گوێم لە دەنگی پێڵاوەکانت بوو لە بەر دەستمدا لە ناو بەهەشتدا)) .

بیلالی کوڕی ڕەباح؟ بەڵێ ... ئەو کەسەی کە لە سەرەتای بانگەوازدا ئازار و ئەشکەنجە دەدرا لەسەر ئەو لمە گەرمەی مەککە و بەردی گەورەیان لەسەر سنگی دادەنا و ئەویش ئەو سرووده شیرین و خۆشەی دەگوت کە گوێی ڕۆژگاری پڕ کردووە: ((أحد أحد)) پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە دەنگی پێلاوەکانی بوو لە بەهەشتدا، بەڵام بە چی شتێك گەیشتووەتە ئەو پلەیە؟ بە کردەوە... جا ئایا ئەو کردارە چییە کەوا بیلال ئەنجامی دەدات؟ تاوەکو لە ڕێگەی ئەوەوە گەیشتبێتە ئەو پایەیە... وە گەیشتە ئەو پلەیە... تا ڕادەیەك کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە دەنگی پێڵاوەکانی ببێت لە بەهەشتدا؟ ئەمە بابەتێکە سوێند بە خوا ئەگەر بیری لێ بکەیتەوە ئەوا عەقڵت لە دەست دەدەیت، تەماشاکە و بزانە کە بیلال چی دەڵێت... کردارێکە ڕەنگە بە بیری زۆربەی برا و خوشکانماندا نەیەت، بریا لەم کارە تێبگەیشتایەن و پاشان هیممەتێك بکەین بۆ جێبەجێکردنی، چونکە ئەم بابەتە بابەتێکی تیۆری نییەو بەس، بابەتێکی قسەو باس نییە هەروەکو باسم کرد... داوا لەخوا دەکەم کە ئیخلاص و وەرگرتنی کردارەکانمان بە نسیب بکات...

---

١ـ أخرجه البخاري، أبواب التهجد ((باب فضل الطهور بالليل والنهار)) (١١٤٩)، ومسلم كتاب فضائل الصحابة ((باب من فضائل بلال)) (٢٤٥٨).

بیلال گوتی: ((یا رسول الله ﷺ ما عملت عملا أرجى عندي: أني لم أتطهر طهورا في ساعة ليل أو نهار إلا صليت بذلك الطهور ما كتب لي أن أصلي))، واتە: ئەی پێغەمبەری خواﷺ هیچ کردارێك نییە لای من چاکتر بێت لەوەی کە هەر کاتێك دەستنوێژ بشۆرم لە هەر ساتێکی شەو یان ڕۆژدا ئەوا بەو دەستنوێژە چەند رکاتێك نوێژ دەکەم)) .(مەبەستی نوێژی دەست نوێژە).

تەنها ! هەرکە دەستنوێژێك بگرێت بە پێی ئەوەی خوا ویستی لیّ بێت نوێژ دەکات، ئەمە ئەو کردارە بوو کە گەیاندییە ئەو پلە و پایەیە؟؟

بەڵێ... لە (صحيح مسلم)[1] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (أبي ذر)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((لا تحقرن من المعروف شيئا، ولو أن تلقى أخاك بوجه طلق)) واتە: هەرگیز چاکە بە کەم مەزانن، هەرچەندە ئەگەر بە بزەیەکەوە بگەیتە برایەکی خۆت)). ڕەنگە کردارێك لای خەڵکی گەورە بێت کەچی لای خوداوەند زۆر سووکە و هیچ کێشێك و بەهایەکی نییە، چونکە خاوەنەکەی لە پێناوی خوادا نەیکردووە،یاخود ڕەنگە کردارێك لای خەڵکی سووك و بێ نرخ بێت بەڵام لای خوداوەند زۆر گەورە و مەزنە... چونکە خاوەنەکەی تەنها لە پێناوی خوادا ئەنجامی داوە ((إِنَّمَا الأعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى))،[2] واتە: کردەوە و پەرستشەکان تەنها بە نیەتەوە دەبن وە هەموو کەسێکیش تەنها ئەوەی بۆ هەیە کە نیەتی لیّ هێناوە)).

کێشەکە کێشەی ڕاستی لە مەبەست و نیەتدایە... ڕەنگە تۆ تەنها جونەیهی بە صەدەقە بدەیت و پێش هەزار جونەیە بکەوێت، بەڵکو پێش یەك ملیۆن جونەیە بکەوێت، چونکە خوای گەورە هیچ کردەوەیەك وەرناگرێت تەنها ئەوانە نەبێت کە تەنها لە پێناوی خۆیدا بووە و ڕاست و ڕێك و پێك بووە واتە: بە گوێرەی ڕێنمایی پێغەمبەری خواﷺ بووە.

---

١ـ أخرجه مسلم، كتاب البر والصلة و الآداب، باب استحباب طلاقة الوجه عند اللقاء)) (٢٦٢٦).

٢ـ أخرجه البخاري كتاب بدء الوحي، باب كيف كان بدء الوحي على رسول الله ﷺ (١) ومسلم كتاب الإمارة باب قوله ﷺ: ((إنما الأعمال بالنية)) (١٩٠٧).

تۆ باش دەزانیت کەوا ئافرەتێك چووە دۆزەخەوە بە هۆی پشیلەیەکەوە کە بەندی کردبوو ئەو نە خواردنی دەدایە و نە ئازادی کردبوو بۆ ئەوەی خۆی شتێك پەیدا بکات[1]، کەچی ئافرتێکی داوێن پیس لە داوێن پیسەکانی بەنی ئیسرائیل چووەتە بەهەشتەوە بە هۆی سەگێکەوە کە پێڵاوەکەی دەرکردبوو و پڕی لە ئاو کرد و ئاوی پێدا و ئەویش خواردییەوە خوای گەور سوپاسگوزاری بوو وە لە تاوانەکانی خۆش بوو.[2]

چەند مانایەکی جوان و ڕێك و پێکن ئەگەر مرۆڤایەتی لێی تێبگەن ئەوا ملکەچی فرمانەکانی خوای گەورە دەبوون، بە خۆشەویستییەوە بەرەو لای پێغەمبەری خواﷺ دەهاتن، ئافرەتێك دەچێتە دۆزەخەوە بە هۆی پشیلەیەکەوە و داوێن پیسێك دەچێتە بەهەشتەوە بەهۆی سەگێکەوە ! الله أکبر! ! ئەمە یانی چی؟ بەراستی دینەکەمان دینێکی نایاب و بێ وێنەیە .

تەماشای (ربیعە ی کوڕی کعب الاسلمی) بکە... فەرموودەکە لە (صحیح مسلم)[3] دا هاتووە دەڵێت: ((کنت أبیت مع رسول اللهﷺ...)) واتە: هەندێ شەو لای پێغەمبەری خواﷺ دەمامەوە ((قال: فأتیتە بوضوئە وحاجتە)) واتە: ئاوی دەستنوێژ و پێویستییەکەیم بۆ هێنا)) باش بیهێنە پێش چاوی خۆت، پێغەمبەری خواﷺ لە خەو هەستا، بینی (ربیعە) هەموو پێداویستییەکی بۆ ئامادە کردووە بۆیە پێغەمبەری خواﷺ ڕەنگە ویستبێتی پاداشتی(ربیعە) بداتەوە لەبەر زرنگ و زیتی و تێگەیشتنەکەی، بۆیە پێغەمبەری خواﷺ بە ربیعە دەڵێت: ((سل یا ربیعة " فقلت: أسألك مرافقتك في الجنة . فقال النبيﷺ: أو غیر ذلك؟)) واتە: داوا بکە ئەی (ربیعە)... گوتم: داوات لێ دەکەم ببمە هاوڕێت لە بەهەشتدا، پێغەمبەری خواﷺ

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب بدء الخلق، باب خمس من الدواب فواسق، يقتلن في الحرم (٣٣١٨) وكتاب المساقاة ((باب فضل سقي الماء)) (٢٣٦٥)، ومسلم كتاب البر و الصلة و الآداب ((باب تحريم تعذيب الهرة ونحوها من الحيوان الذي لا يؤذي)) (٢٢٤٢) وكتاب السلام ((باب تحريم قتل الهرة)) (٢٢٤٢/١٣٣) من حديث ابن عمر رضي الله عنه، ورواه مسلم من حديث أبي هريرة رضي الله عنه (٢٦١٩).

٢ـ أخرجه البخاري كتاب بدء الخلق، باب إذا وقع الذباب في شراب أحدكم فليغمسه (٣٣٢١) و (٣٤٦٧)، ومسلم كتاب السلام ((باب فضل سقيا البهائم المحترمة و إطعامها)) (٢٢٤٥) من حديث أبي هريرة رضي الله عنه.

٣ـ أخرجه مسلم، كتاب الصلاة ((باب فضل السجود و الحث عليه)) (٤٨٩).

گوتى: جگە لەو داوایە ؟)) مەبەستى ئەوەیە هیچ ئاواتێكى ترت نییە؟ ((قلت: هو ذاك)) واتە: گوتم: نەخێر تەنها ئەوە داواكەمە)) هیچ هیوا و ئاواتێكى ترم نییە جگە لەوە، ئایا پێغەمبەرى خواﷺ وازى لێ هێنا؟ هەرگیز نەخێر ..بەڵكو پێغەمبەرى خواﷺ فەرمووى: ((فأعني على نفسك بكثرة السجود)) واتە: تێبكۆشە بە سوژدە زۆر بردن)) كار بكە و تێبكۆشە... دەبێ سوژدەكانت زۆر بكەیتەوە، دەبێ ملكەچ بوونت زیاتر بكەیتەوە... دەبێ شەو نوێژەكانت زۆرتر بكەیتەوە، دەبێ كار بكەیت و ئەو قسانەى دەیكەیت بگۆڕیتە كردار ..

ئەمە (أبو بكر الصديق) ﷺ، یەكەم پیاوە لەم ئوممەتەدا لە پاش پێغەمبەرى خوار لە (صحيح مسلم)[١] دا هاتووە لە فەرموودەى (أبو هريرە) وە كەوا پێغەمبەرى خواﷺ پرسیار لە هاوەڵانى دەكات لە پاش نوێژى بەیانى و دەفەرموێت: ((من أصبح منكم اليوم صائما؟)) قال أبو بكرﷺ: أنا، قال: ((فمن تبع منكم اليوم جنازة؟)) قال أبو بكرﷺ: أنا، قال: ((فمن أطعم منكم اليوم مسكينا؟))قال أبو بكرﷺ: أنا، قال: ((فمن عاد منكم اليوم مريضا؟)) قال أبو بكرﷺ: أنا، فقال رسول اللهﷺ: ((ما اجتمعن في امرئ، إلا دخل الجنة))، واتە: كێ لە ئێوە ئەمڕۆ بە ڕۆژووە؟ ئەبو بەكر فەرمووى: من، پێغەمبەرى خواﷺ فەرمووى: كێ لە ئێوە ئەمڕۆ شوێنى جەنازە كەوتووە؟ ئەبو بەكر فەرمووى: من، پێغەمبەرى خواﷺ فەرمووى: كێ لە ئێوە ئەمڕۆ نانى هەژارێكى داوە؟ ئەبو بەكر فەرمووى: من، پێغەمبەرى خواﷺ فەرمووى: كێ لە ئێوە ئەمڕۆ سەردانى نەخۆشى كردووە؟ ئەبو بەكر فەرمووى: من، پێغەمبەرى خواﷺ فەرمووى: ئەو ئاكارانە لە هیچ كەسێكدا كۆ نابێتەوە ئیللا دەچێتە بەهەشتەوە)) .

تەماشاى ئەو هەموو كارە بكە لە یەك ڕۆژدا! ئەوە(أبو بكر الصديق)ە كەچى هەرگیز نەیدەگوت: من پیاوى یەكەمم لەم ئوممەتەدا ومن موژدەى بەهەشتم پێ دراوەو چیتر دانیشیت و پشوو بدات! نەخێر ..چونكە ئەو نەگەیشتووەتە ئەو

---

١ـ أخرجه مسلم، كتاب الزكاة، ((باب من جمع الصدقة و أعمال البر)) (١٠٢٨)، وهو في كتاب فضائل الصحابة باب فضائل أبي بكر ﷺ.

پایەیە تەنها لە ڕێگای کردارەوە نەبێت و لە گەڵ ئەو باوەڕەی کە بە بتەوی لە دڵیدا جێگیر بوو وە هیچ کەس نەگەیشتووەتە ئەو لوتکەیە تەنها ئەو نەبێت .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەی (أبو هريرە) وە: ((من أنفق زوجين في سبيل الله، نودي من أبواب الجنة: يا عبد الله هذا خير، فمن كان من أهل الصلاة دعي من باب الصلاة، ومن كان من أهل الجهاد دعي من باب الجهاد، ومن كان من أهل الصيام دعي من باب الريان، ومن كان من أهل الصدقة دعي من باب الصدقة"، فقال أبو بكر رضي الله عنه: بأبي أنت وأمي يا رسول الله ما على من دعي من تلك الأبواب من ضرورة، فهل يدعى أحد من تلك الأبواب كلها، قال: " نعم وأرجو أن تكون منهم ))

لەریوایەتێکی تردا کە (ابن حبان) ڕیوایەتی کردووە بە سەنەدێکی (صحیح)[2] لە فەرموودەی (ابن عباس)ەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە: ((نعم و أنت هو يا أبو بكر)) واتە: بەڵێ، تۆ ئەو کەسەی ئەی ئەبو بەکر)).

بزانە کەوا ئەم کێشەیە تەنها کێشەی هیوا و ئاوات نییە... خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ ﴾ النساء: ١٢٣، واتە: پاداش و بەرزونزمکردن و بەڵێنەکانی خوا نە بە ئاوات و ئارەزووی ئێوەیە ئەی موسڵمانان! نە بە ئاوات و ئارەزووی خاوەننامەکانیشە بەڵکو بە هەوڵ و تێکۆشان و گوێڕایەڵی کردنی خوایە)).

ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ بە (فاطمة الزهراء) و بیلبلەی چاوەکانی و جگەر گۆشە و خۆشەویستی دڵەکەی و خۆشەویستی ئێمەی موسڵمانان دەفەرموێت: ((يا فاطمة بنت محمد، سليني ما شئت لا أغني عنك من الله شيئا)) واتە: ئەی فاطمە ی کچی محمد، هەر شتێك ویستت لە سەرە داوام لێ بکە دڵنیابە کە هیچ قازانجێکت

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب الصوم ((باب الريان للصائمين)) (١٨٩٧)، ومسلم كتاب الزكاة ((باب من جمع الصدقة و أعمال البر)) (١٠٢٧).

٢ـ أخرجه ابن حبان في ((صحيحه)) (٦٨٦٧) ولفظه: أنه ﷺ قال: ((يدخل الجنة رجل فلا يبقى أهل دار و لا أهل غرفة إلا قالوا: مرحبا مرحبا إلينا إلينا))، فقال: أبو بكر: يا رسول الله، ما ترى على هذا الرجل من ذلك اليوم؟ قال: ((أجل و أنت هو يا أبا بكر)).

پـێ ناگەیـەنم لـە لای خـوای پـەروەردگار)) وە فەرموودەکـە لـە هـەردوو کتـێبی (صحیح)[١] دا هاتووە لە فەرموودەی (أبو هريره) وە.

لە (صحیح مسلم)[٢] دا هاتووە لە فەرموودەی (أبـو هريـره) وە کـەوا پێغەمبـەری خواﷺ فەرموویەتی: ((.. ومن أبطأ به عمله لم يسرع به نسبه ))، واتە... هەرکەسێك کردەوەکانی دوای بخەن ئەوا ڕەچەڵەکەکەی پێشی ناخات).

مـن لێـرەدا جـەخت لەسـەر بابـەتی کـارکردن دەکـەم – داوا لـە خـوا دەکـەم ڕاستگۆیی بە نسیبی ئێمە و ئێـوە بکـات – چـونکە ئـەم ئوممەتـە هـەرگیز ڕزگـاری نابێت و لە دونیادا لە نێو ئوممەتەکانی سەر زەویدا و لـە دوا ڕۆژدا لـە بـەر دەسـتی خوای گەورەدا ئیللا بە کردەوەی چاك نەبێت . . تەنها بەوە نەبێت ئـەو زانیارییـەی کە گوێبیستی بوویت و فێری بوویت بیگۆڕیتە واقعێکی کرداری و بەرنامەی ژیان .

قسەکردن دەربارەی کار و کردەوە باسێکی دوور و درێژە وە ئێمـەیش لەوپـەڕی پێویـستیداین بـۆ ئـەو کـارە... چـونکە بـە ڕاسـتی کێـشەکە لەوەدایـە کـەوا ئێمـە دابڕانێکی زۆر ترسناك دەبینین لە نێوان وتە و کردەوەدا، ڕەنگە تەماشـای مرۆڤێـك بکەیت و سەرسام بیت بە قسەکانی و لە گەڵ قسە خۆشەکانیدا تێکەڵ بیت بەڵام لە یەکەم گۆڕەپانی کاردا خاوەنی ئەو هەموو قسە خۆشانە تێبکەوێت، ئەگەر کاتێ بە دەرهەم و دینار مامەڵەت لە گەڵدا بکات سەرسام دەبیت و دەڵێیت: کوا هەموو ئـەو قسانەی کە دووبارەی دەکردەوە ! ؟ دابڕان لە نێوان وتە و کاردا! ئەمەیشە دڵـەکان پڕ دەکات لە دووڕوویی ! !

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ۝٢ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾ الصف: ٢ـ ٣، واتە: ئـەی ئەوانـەی باوەڕتان هێناوە !بۆچی شتێ دەڵێن و ڕەفتاری پێ ناکەن؟ (٢)خوا لـە لای سـەختە کە شتێ بڵێن و کاری پێ نەکەن ! (٣))).

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب الوصايا ((باب هل يدخل النساء والولد في الأقارب)) (٢٧٥٣)، ومسلم كتاب الإيمان باب في قوله تعالى (({وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ} (٢١٤) سورة الشعراء)) (٢٠٤)

٢ـ أخرجه مسلم، كتاب الذكر والدعاء ((باب فضل الاجتماع على تلاوة القرآن و على الذكر)) (٢٦٩٩).

خــوای گــەورە دەفــەرموێت ﴿أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ وَأَنتُمۡ تَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ البقرة:٤٤، واتە: ئاخۆ کەی ڕاستە ئێوە فەرمانی چاکە بە خەڵکی بدەن کەچی وا خۆتان لە بیردەکەن و گوێ نادەن؟ و لە کاتێکدا بۆ خۆشتان کتێبی تەورات دەخوێننەوە و بەردەوام دەوری دەکەنەوە و خوێندەوارن؟! داخۆ بیرێکی ورد و تیژ بە کار ناهێنن و ژیرنابن و لەو کارە ناپەسەندانە ناگەڕێنەوە؟!)).

کوا ڕاستی لە وتەکاندا؟ کوا ڕاستی لە کارەکاندا؟ کوانێ وەفا و پەیمان پارێزی؟ کوا سپاردە؟ کوا پیاوەتی؟ کوا خانەدانی؟کوا جوامێری؟کوا کردار؟کوا ڕەوشتی پێغەمبەرﷺلەناو ئەم ئوممەتەدا؟بەڵێ...دەبێت وتە و کردەوە یەك بگرن و جووت بن.

ئیمامی (البخاري و مسلم) [1] ڕیوایەتیان کردووە لە فەرموودەی (أسامە ی کوڕی زید)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((يؤتى بالرجل يوم القيامة، فيلقى في النار، فتندلق أقتاب بطنه، فيدور بها كما يدور الحمار بالرحى، فيجتمع إليه أهل النار، فيقولون: يا فلان ما لك؟ ألم تكن تأمر بالمعروف، وتنهى عن المنكر؟ فيقول: بلى، قد كنت آمر بالمعروف ولا آتيه، وأنهى عن المنكر وآتيه )) واتە: کەسێك دەهێنن لە ڕۆژی قیامەتدا و فڕێ دەدرێتە ناو ئاگرەوە، هەموو ڕیخۆڵەکانی ناو سکی لە جێگەی خۆی دەردەچن، جا پێوەی دەسوڕێتەوە هەروەکو گوێدرێژ بە دەستاڕدا بسوڕێتەوە، جا ئەهلی دۆزەخی لەسەر کۆ دەبێتەوە و دەڵێن: ئەی فلان ئەوە چیتە؟ ئایا تۆ نەبووی فەرمانت پێ دەکردین بە چاکە و نەهیت دەکردین لە خراپە؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ، من فەرمانم بە ئێوە دەکرد و خۆم ئەنجامم نەدەدا و نەهیم دەکرد لە خراپە و کەچی خۆم ئەنجامم دەدا)) .

لە ئەسەردا هاتووە لە ئیمامی (عەلی)ەوە — هەرچەندە لە بەر سپاردەی

---

١ ـ أخرجه البخاري كتاب بدء الوحي ((باب صفة النار و أنها مخلوقة)) (٣٢٦٧)، وكتاب الفتن ((باب الفتنة التي تموج كموج البحر)) (٧٠٩٨)، ومسلم كتاب الزهد والرقاق ((باب عقوبة من يأمر بالمعروف ولا يفعله، وينهي عن المنكر و يفعله)) (٢٩٨٩)

زانستی (الأمانة العلمية) لە سەنەدەکەدا (ضعف)[١] هەیە — دەڵێت: ((یا حملة العلم، اعملوا به، فإنما العالم من عمل بما علم، ووافق علمه عمله، وسيكون أقوام يحملون العلم لا يجاوز تراقيهم، يخالف عملهم علمهم و تخالف سريرتهم علانيتهم،، يجلسون حلقا، فيباهي بعضهم بعضا، حتى إن الرجل ليغضب على جليسه أن يجلس إلى غيره ويدعه، أولئك لا تصعد أعمالهم في مجالسهم تلك إلى الله)) واتە: ئەی ئەوانەی کە زانست و زانیارییان هەڵگرتووە، بەو زانستە کار بکەن، چونکە زانا ئەو کەسەیە کە کار بە زانستەکەی دەکات، زانست و کردەوەکەی وەکو یەك بوون، چەند کۆمەڵێك پەیدا دەبن کە زانستەکەیان ناگاتە دەفەی شانیان، کارەکەیان لە گەڵ کردەوەکانیاندا جیاوازە، نهێنییەکانیان لە گەڵ ئاشکراکانیاندا جیاوازە، بە شێوەی بازنە دادەنیشن، خۆیان بە سەر یەکتردا دەردەخەن، تاکو وای لێ دێت کەسێکیان پەست دەبێت لەوەی لە گەڵیدا دانیشتووە بە هۆی ئەوەی کە لە گەڵ کەسێکی تردا دادەنیشێت یان وازی لەم هێناوە، جا ئەوانە کردەوەکانیان لە مەجلیسەکانیانەوە بۆ لای خوا بەرز نابێتەوە)).

لەگەڵ مندا جارێکی تر بگەڕێوە بۆ لای فەرموودەکە: ((لا تقوم الساعة حتى يتقارب الزمان، وينقص العمل))، واتە: قیامەت هەڵناسێت تاوەکو رۆژگار نزیك دەبێتەوە و کارکردن کەم دەبێتەوە)) باسی کارکردن باسێکی دوور و درێژە، بەڵام من نامەوێ باسەکە درێژ بکەمەوە، چونکە نیشانەکان زۆرن، داوا لە خوا دەکەم کە راستگۆییمان بە نسیب بکات لە وتە و کردار و هەموو حاڵەتێکدا هەر ئەو پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

نیشانەی سێیەم لە فەرموودەکەدا ئەوەیە: دەفەرموێتﷺ: ((ويلقى الشح)) ئایا مانای (الشح) چییە؟ (الشح) مانای چرووکی و پیسکەیی یە و زۆر لە رەزیلی توندترە و لەو زیاتر رێ لە خاوەنەکەی دەگرێت بۆ بەخشین[٢]... خۆتانیش دەزانن:

---

١ـ أخرجه الخطيب في ((الجامع لأخلاق الراوي و آداب السامع)) (٣٢)، وفي الاقتضاء (٩)، والدارمي (١/١٠٦)، وابن عبدالبر في ((جامع بيان العلم و فضله)) (١٢٣٧).

٢ـ راجع ((اللسان)) لابن منظور (٧/٤٢ مادة شحح) و ((القاموس المحيط)) (٢٨٩) للفيروز آبادي.

ڕەزیلی (البخل) ئەو نەخۆشییە پیس و نابوت و ریسوایەیە، جا چرووکی (الشح) لەو پیستر و ترسناکترە ! بەڵێ... جیاوازیان چییە؟ کەسی ڕەزیل (بخیل) ئەو کەسەیە کە: ڕەزیلی دەکات لەخەرجکردنی ئەو فەرزەی کە خوای گەورە لەسەری فەرز کردووە لەزەکات و صەدەقە، کابرایەك ڕەزیلە حەقەکەی خوای گەورە لە سامانەکەی دەرناکات، دەستەکانی خۆی توند گرتووە پارە بۆ خۆیشی خەرج ناکات و بۆ خێزان و منداڵەکانیشی... کەچی خەیرێکی زۆری پێیە، خوای گەورە ڕزقەکەی فراوان کردووە بەڵام منداڵەکانی لە تەنگانە و هەژاریدا دەژین ئەمە مانای ڕەزیلییە (بخل)ە، دەڵێت: من لەوە دەترسم ئەگەر زەکات لە سەروەت و سامانەکەم دەرکەم ئەوا کەم دەبێتەوە، سوێند بە خوا چەندەها جار پرسیارم لێ دەکرێت: ئایا پێویستە لە سەرم هەموو ساڵێك زەکاتی سامانەکەم دەرکەم!؟ ئایا لە هەموو هەزار جونەیە بیست و پێنج جونەیە دەرکەم؟!! بەڵێ، براکەم، کێیە ئەو کەسەی کە ڕێزی لێ گرتووی و نیعمەتی ڕژاندووە بە سەرتدا و فەزڵی خۆی پێت داوە؟.

خوای گەورە بەم سامانە ڕزقی تۆی داوە و دەیەوێ خۆتی پێ پاك بکەیتەوە و بۆ ئەوەی ئەم سامانە گەشەی پێ بدەی و پەرە بسێنێ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا﴾ التوبة: ١٠٣، واتە: لە سامانەکەیان زەکات و سەدەقەیە وەرگرە دڵ و دەروونیانی پێ پاکەوەکە هەتا لە گوناهەکانیان پاك ببنەوەو چاکەکانیان فراوان ببێ و دەشگەنە پلەی هەرە بەرز)).

خوای گەورە هیچ پێویستی بەو پارەیە نییە کە خۆی پێی بەخشیوین، بەڵکو لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە ئیمامی (البخاری و مسلم) [١] ڕیوایەتیان کردووە لە فەرموودەیەکی (أبو هريرە)وە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((قال الله تبارك وتعالى: يا ابن آدم أَنْفِقْ أُنْفِقْ عليك)) واتە: خوای گەورە فەرموویەتی: ئەی بەنی ئادەم خەرج بکەو ببەخشە ئەوا منیش پێت دەبەخشم)).

---

١ـ أخرجه البخاري في كتاب التفسير، باب قوله ﴿وَكَانَ عَرۡشُهُۥ عَلَى ٱلۡمَآءِ﴾ هود: ٧، (٤٦٨٤)، ومسلم كتاب الزكاة ((باب الحث على النفقة و تبشير المنفق بالخلف)) (٩٩٣)

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[١] دا هاتووە لە (ابو هریرە) وە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((ما من یوم یصبح العباد فیه، إلا ملكان ینزلان، فیقول أحدهما: اللهم أعط منفقا خلفا، ویقول الآخر: اللهم أعط ممسكا تلفا ))، واتە: هیچ ڕۆژێك بە سەر بەندەکاندا تێپەڕ نابێت ئیللا دوو فریشتە دادەبەزن و یەکێکیان دەڵێت: خودایە ئەوەی کە دەبەخشێت جێگەی بۆ پڕبکەرەوە، ئەویتر دەڵێت: خودایە ئەوەی کە دەستی خۆی گرتووە سامانەکەی بفەوتێنە)).

کەوابوو کەسی ڕەزیل (بخیل) ئەوەیە کە ڕەزیلی دەکات لەوەی لە بەر دەستیدا لەو پێویستییەی کە لە سەرییەتی یان لەو زەکاتەی کە لە سەری فەرز کراوە لە سامانەکەیدا وە یان بە خەرجکردنی ئەو پارە پێویستە لەسەر خێزان و منداڵەکانی، بەڵام کەسی چرووك و پیسکە (الشحیح) لەو پیسترە ! بۆ؟ چونکە کەسی چرووك (شحیح) ڕەزیلی دەکات لەوەی خۆی وە تەماحی سامانی خەڵکی تریش دەکات، جا ئەو ڕەزیل و چرووکە لە هەمان کاتدا، ئەو تەنها بەوەوە ناوەستێت کە نایەوێت ببەخشێت، بەڵکو دەیەوێ ئەوەی لە دەستی خەڵکی تردایە بۆ ئەو بێت، تەماشاکە، خوای گەورە چی دەفەرموێت؟. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ الحشر: ٩، واتە: هەرکەسێ لە سیفەتی ڕژدی دەروونی خۆی بپارێزێ، واتە: هەرکەسێ خوی بپارێزی لە چرووکی دەروونی جا ئەوانەن برەوەکان .)) واتە: ئەو کەسەی کە خوای گەورە لە چرووکی نەفسی خۆی بیپارێزی ئەوا ئەو کەسەیە کە لە دونیا و دوا ڕۆژدا سەرفەراز و سەرکەوتوو بووە بۆیە هەرگیز باوەڕ و ڕەزیلی لە دڵی هیچ بەندەیەکدا کۆ نابێتەوە، هەروەکو (النسائی) لە (سنن)ەکەیداو (ئەحمەد) لە(مسند)[٢] ەکەیدا ریوایەتیان کردووە لە

١ـ أخرجه البخاري كتاب الزكاة، باب قوله تعالى﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ﴾ الليل: ٥، (١٤٤٢)، و مسلم، كتاب الزكاة، باب في المنفق والممسك (١٠١٠).

٢ـ أخرجه أحمد (٢/ ٢٥٦، ٣٤١، ٤٤١)، والبخاري في ((الأدب المفرد)) (٢٨١) والنسائي، كتاب الجهاد، باب فضل من عمل في سبيل الله على قدميه (٦ / ١٢-١٤) و حسنه العلامة الألباني في ((صحيح النسائي))، وصححه في ((الأدب المفرد)).

فەرموودەی (أبو هريرە) کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((... ولا يجتمعان في قلب عبد: الايمان والشح)) واتە: ...لە دڵی هیچ بەندەیەکدا باوەڕ و چرووکی کۆ نابێتەوە)) وە لە ریوایەتێکی تاردا هاتووە: ((لا يجتمع شح و ايمان في قلب رجل مسلم)) واتە: چرووکی و باوەڕ لە دڵی کەسی موسڵماندا کۆ نابێتەوە) .

جا رزگار بوون و دەربازبوون لەوەدایە کەوا کەسێك خوای گەورە لە چرووکی (شح) بیپارێزێ، لەو ئاکارە پیس و نابووت و قێزەونە ! !

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (ابن عمر) ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((لا حسد إلا في اثنين)) واتە: ئێرەیی دروست نییە تەنها لە دوو شتدا نەبێت)) وە مەبەست لە ئێرەیی (الحسد) لێرەدا (الغبطة)[2] یە وە مانای ئەوە نییە کەوا کەسێك ئاواتە خواز بێت سامانی خەڵکی تر نەمێنێ، بەڵکو (الغبطة) ئەوەیە کەوا ئاواتە خواز بیت خوای گەورە ئەو دوو شتەت پێ ببەخشێت کەوا بە خاوەنی ئەو دوو نیعمەتەی بەخشیوە، ئایا ئەو دوو شتە چین؟

پێغەمبەری ئەکرەمﷺ دەفەرموێت: ((لا حسد إلا في اثنتين: رجل آتاه الله القرآن فهو يتلوه آناء الليل وآناء النهار، ورجل آتاه الله مالا فهو ينفقه آناء الليل وآناء النهار)) واتە: ئێرەیی دروست نییە تەنها لە دوو شتدا نەبێت، کابرایەك خوای گەورە فێری قورئانی کردووە و ئەویش بە شەو ڕۆژ دەیخوێنێتەوە، کابرایەك خوای گەورە سامانێکی پێ بەخشیوە و ئەویش بە شەو و بە ڕۆژ لێی دەبەخشێت)).

ئەی پەروەردگارمان ئێمەیش بگێڕە لەو دوو کۆمەڵە... ئەمە ئەو کەسەیە کە خۆزگە بە خەڵکی تر دەخوازێت، کەسێك کەوا خوای گەورە نیعمەتەکانی خۆی ڕژاندووە بە سەریدا و رزق و ڕۆزی فراوان کردووە و ئەویش بە شەو و بە ڕۆژ لێی

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب التوحيد، ((باب قول النبي ﷺ رجل آتاه الله القرآن)) (٧٥٢٩)، ومسلم كتاب صلاة المسافرين و قصرها، ((باب فضل من يقوم بالقرآن))(٨١٥).

٢ـ قال النووي في ((شرح مسلم)) (٣ / ٣٥٩): ((قال العلماء: الحسد قسمان: حقيقي، ومجازي، فالحقيقي: تمنى زوال النعمة عن صاحبها، وهذا حرام بإجماع الأمة مع النصوص الصحيحة. وأما المجازي: فهو الغبطة، وهو أن يتمنى مثل النعمة التي على غيره من غير زوالها عن صاحبها، فإن كانت من أمور الدنيا كانت مباحة، وإن كانت طاعة فهي مستحبة، والمراد بالحديث: لا غبطة محبوبة إلا في هاتين الخصلتين وما في معناهما)).

دەبەخشێت . بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ۝٥ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ۝٦ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ﴾ الليل ٥ـ ٧. (ابن كثير) دەفەرموێت[١]: ((فَأَمَّا مَن أعْطَى واتَّقى)) واتە: ئەوەی فەرمانی پێ کراوە لێی دەبەخشێت و لە خوا دەترسێت لە کارو بارەکەیدا ((وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى)) واتە: باوەڕی هەیە بە پاداشت لەسەر ئەوانە، دەڵێن: بە (لا الە الا الله)، دەڵێن: بەو نیعمەتەی کە خوای گەورە بە سەریدا ڕژاندوویەتی ((فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ))، واتە: بۆ خەیر وە دەڵێن: بۆ بەهەشت وە هەندێ لە زانایانی پێشین فەرموویانە: ((لە پاداشتی چاکە ئەوەیە کەوا چاکەیەکی تری بە دواوەیە وە لە سزای تاوان ئەوەیە کەوا تاوانێکی تری بە دواوەیە)) ا . هـ

زانایای پایەدار (السعدی)[٢] دەفەرموێت: ((فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ)) واتە: کارەکەی لەسەر سووك و ئاسان دەکەین، هەموو کارێکی چاکەی لا ئاسان دەکەین وە واز هێنانی هەموو خراپەیەکی لا ئاسان دەکەین، چونکە ئەو هۆکارەکانی ئاسانکاری گرتووەتە بەر بۆیە خوای گەورش ئەوانەی لەسەر ئاسان دەکات)) ا . هـ

خوا گەورە هەموو شتێکی لەسەر ئەم کابرایە ئاسان کردووە بە هۆی بەخشین و خەرجکردن و لە خواترسینەوە هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مِنْ أَمْرِهِ يُسْرًا﴾ الطلاق: ٤، واتە: هەر کەسێك خۆ بپارێزی لە بێ فەرمانی خوا، ئەویش کاروباری بۆ ئاسان ئەکات)). خوای گەورە هەموو کارەکانی بۆ ئاسان دەکاتەوە و هەموو کارە جیاواز و دژەکانی بۆ یەك دەخاتەوە .

هەروەکو لە ((سنن ابن ماجە)) بە سەنەدێکی (صحیح)[٣] هاتووە لە فەرموودەی (زید ی کوڕی ثابت)ەوە لای (الترمذي) لە فەرموودەی (أنس) ەوە کەوا پێغەمبەری

---

١ـ ((التفسیر)) (لسورة اللیل: ٥ – ٧) بتصرف یسیر.

٢ـ ((تیسیر الکریم الرحمن)) (اللیل: ٥ –٧).

٣ـ أخرجه أحمد(٥/ ١٨٣)، وابن ماجه (٤١٠٥)، كتاب الزهد ((باب الهم بالدنيا))، والبيهقي في ((السنن)) (٧/ ٢٨٨) من حديث زيد بن ثابت، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) برقم (٩٥٠). و أخرجه الترمذي كتاب صفة الجنة (٢٤٦٥) من حديث أنس بن مالك، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) برقم (٩٤٩)

خوا ﷺ فەرموویەتی: ((من كانت الآخرة همه جعل الله غناه في قلبه وجمع له شمله، وأتته الدنيا وهي راغمة، ومن كانت الدنيا همه جعل الله فقره بين عينيه، وفرق عليه شمله، ولم يأته من الدنيا إلا ما قدر له )) هەرکەسێ دوارۆژ مەبەستی بێت ئەوا خوای گەورە دەوڵەمەندی دەخاتە دڵییەوە و هەموو شتە دژەکانی بۆ کۆ دەکاتەوە وە دونیا بە ملکەچییەوە پێشوازی لێ دەکات، هەرکەسێ ئەگەر مەبەستی دونیا بێت ئەوا خوای گەورە هەژاری دەهاتە نێو چاوی و هەموو شتە دژەکانی بۆ جیاوازتر دەکات و لە دونیادا هیچی دەست ناکەوێت ئیللا ئەوەی کە خوای گەورە بۆی دیاری کردووە )).

ئەمجار وریابە – برای خۆشەویستم – بۆ ئایەتی دووەم: ﴿وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ﴾ اللیل:٨، واتە: ئەوەش چرووکی کرد و خۆی بێ نیاز گرت)). ڕەزیلی دەکات لەوەی کەوا فەرمانی پێ کراوە و وازی لە خەرجکردنی فەرز و سوننەتەکان هێناوە وە نەفسی ڕێگای پێ نادات بۆ جێ بە جێ کردنی ئەوەی کە خوا لە سەری پێویستی کردووە[1] ((وَاسْتَغْنَى)) خۆی بێ نیاز دەگرێت لە خوا، لە فەزڵی خوا، لەوەی کە خوای گەورە ئامادەی کردوو بۆ گوێڕایەڵان ! بە ڕاستی ئەمە خەسارەت مەندی دونیا و دوارۆژە . ﴿وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾﴾، واتە: و بڕواشی بە پاداشی چاکتر نەکرد لە لای خوا .)) بە سزا لە ڕۆژی دواییدا و باوەڕی بە بەهەشت نەکرد و بەوەی کە خوای گەورە لەسەر بەندەکانی فەرزی کردووە لە بە ڕاستزانین و باوەڕ پێ هێنانی، ئایا ئەم کەسە لە ژیانیدا سەرکەوتوو دەبێت؟ نەخێر، بەڵکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾﴾ واتە: ئەوا ئێمەش کار ئاسانی بۆ دەکەین بۆ دژوارترین ڕێگە)) دەبینی هەموو کارەکانی لا گرانە، هەردەم دڵی تەنگە، هەردەم سنگی تەنگە، لە ڕووی جێگا و ڕێگاوە دەبینی هەردەم لە ناخۆشیدا دەژێت هەرچەندە لە جوانترین و فراوانترین کۆشك و تەلاردا بێت، هەست دەکات وا خەریکە دەخنکێت هەرچەندە لە نێو باخچەیەکی جوانکیلەدا بێت ! بەڵێ ... چونکە

---

١-((تیسیر الکریم الرحمن)) (اللیل:٨).

کێشەی تەنگی و فراوانی پەیوەندی بە فراوانی جێگاوە نییە، بەڵکو لە سنگەکاندایە، بۆیە خوای گەورە منەت دەکاتە سەر پێغەمبەرمانﷺ بەو نیعمەتەو دەڵێت: ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ﴾ الشرح:١، واتە: ئەی پێغەمبەرﷺ ئایا سینگمان بۆت گوشاد نەکردیت بە هیدایەتکردنت بۆ ئیسلام ؟)). جا لە پیرۆزترین نیعمەتەکانی خوای گەورە بە سەر بەندەکانییەوە ئەوەیە هەست بە دڵ فراوانی و سنگ فراوانی بکات، هەست بە جێگر بوونی ویژدان و هێمنی بکات، هەست بە رازی بوون و قەناعەت بکات، بۆیە خوای گەورە دەربارەی ئەهلی بەهەشت دەفەرموێت: ﴿سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ﴾محمد: ٥، واتە: لەدونیاشدا ڕێنمایان ئەکات بۆ کاری چاك و هۆکارەکانی بردنە بەهەشت، کاروباریان بۆ ئاسان دەکا و حاڵیشیان چاك ئەکات)). جا دڵ فراوانی و سنگ فراوانی یەکێکە لە نیعمەتەکانی بەهەشت، هیچ دڵتەنگییەك وە هیچ تاڵی و گرژییەکی تێدا نییە[١]. جا فراوانی لە سنگدایە نەك لە جێگاو ڕێگادا.

ڕەنگە مرۆڤێك هەبێت لەیەك ژووردا یان لە خانوویەکی ئاساییدا پێك هاتووە لە دوو ژوور و خۆی منداڵەکانی تێدا دەژین لەو پەڕی رازی بوون و نیعمەت، کەسێکی تر هەبێت لە نێو کۆشك و تەلاردا دەژیت بەڵام هەست بە دڵتەنگی و بەدبەختی و خنکان و خەفەت بکات هەرگیز هەست بە ئارامی و خۆشی و بەختیاری نەکات.

داوا لە خوا دەکەم سنگمان فراوان بکات و دڵەکانمان پڕ بکات لە قەناعەت و رازی بوون، هەر خۆی پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

جا (البخل و الشح) چرووکی و رەزیلی دوو هۆی سەرەکی دڵتەنگی و نەگبەتین، بۆیە پێغەمبەری ئازیزمانﷺ دەفەرموێت هەروەکو لە (صحيح مسلم)[٢] دا هاتووە لە فەرموودەی (جابر ی کوڕی عبدالله)وە: (( اتقوا الظلم، فإن الظلم ظلمات يوم القيامة، واتقوا الشح، فإن الشح أهلك من كان قبلكم، حملهم على أن سفكوا دماءهم واستحلوا محارمهم )) واتە: خۆتان لە ستەمکردن بپارێزن، چونکە ستەم لە رۆژی قیامەتدا تاریکییە، خۆتان لە چرووکی بپارێزن، چونکە چرووکی ئەوانەی پێش ئێوەی بە

---

١ـ ((تيسير الكريم الرحمن)) (محمد: ٥).

٢ـ أخرجه مسلم، كتاب البر والصلة والآداب، باب تحريم الظلم (٢٥٧٨).

هەلاکەتدا برد، وای لیّ کردن کە خویّنی یەکتر بریّژن و قەدەغەکراوەکانیان حەلاّلّ بکەن)) .

بۆیە ئاگاداری ستەم بە و خۆت لە هۆکارەکانی بپاریّزە ... بزانە کەوا پیّغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((لتؤدن الحقوق إلى أهلها يوم القيامة، حتى يقاد للشاة الجلحاء، من الشاة القرناء))[1] واتە: دەبیّت هەموو مافەکان بگیّڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان لە ڕۆژی قیامەتدا تەنانەت مەڕی بیّ شاخ مافی خۆی لە مەڕی شاخدار دەسیّنیّتەوە)) .

ڕاوەستانیّکمان دەبیّت - انشاء الله - کاتیّ باسی قۆناغەکانی قیامەت دەکەین دەربارەی (القصاص) لەسەر زەوی مەحشەر .

پیّغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: هەروەکو لە (صحیح البخاری)[2] دا هاتووە لە فەرموودەی (ابو سعید الخدری)ەوە: ((إذا خلص المؤمنون من النار حبسوا بقنطرة بين الجنة والنار، فيتقاصون مظالم كانت بينهم في الدنيا حتى إذا نقوا وهذبوا، أذن لهم بدخول الجنة، فوالذي نفس محمد بيده، لأحدهم بمسكنه في الجنة أدل بمنزله كان في الدنيا)) واتە: ئەگەر ئیمانداران لە ئاگر ڕزگاریان ببیّت لە پردیّکدا رادەگیریّن لە نیّوان بەهەشت و دۆزەخدا، لەویّدا تۆڵەی ستەمەکان لە یەك دەسیّننەوە تاکو پاك دەبنەوە و پوختە دەبن، ئەمجار ڕیّگەیان پیّ دەدریّت بچنە بەهەشتەوە، سویّند بەو کەسەی کە گیانی محمد ی بە دەستە هەریەکیّکیان (واتە: ئیماندارن) بۆ ماڵەکەی خۆی شارەزاترە لە ڕیّگای ماڵەکەی دونیای)).

لەپاش ئەوەی پیّغەمبەری خواﷺ ئاگاداری کردینەوە لەستەم پاشان ئاگادارمان دەکاتەوە لەچرووکی و دەفەرمویّت: ((واتقوا الشح، فإن الشح أهلك من كان قبلكم، حملهم على أن سفكوا دماءهم واستحلوا محارمهم))، واتە:خۆتان لە چرووکی بپاریّزن، چونکە چرووکی ئەوانەی پیّش ئیّوەی بەهەلاکەتدا بردو فەوتاندنی،ئەوانی وا لیّ کرد،کە خویّنی یەکتر بریّژن و قەدەغەکراوەکانیان حەلاّلّ بکات).

---

١ـ أخرجه مسلم، كتاب البر والصلة والآداب، باب تحريم الظلم (٢٥٨٢) من حديث أبي هريرةﷺ.

٢ـ أخرجه البخاري كتاب المظالم ((باب قصاص المظالم)) (٢٤٤٠).

کەسی (الشحیح) چرووك هەردەم داوای زیاتر دەکات وە بەوەی کە هەیەتی قەناعەت ناکات بەڵکو هەردەم تەماح و هەڵپەی هەیە وە ئەمەیشە بەرەو کەوتنە ناو حەرامەوە دەبیات وە هەروەها بەرەو کوشتن دەبیات، جا چرووکی هۆیەکە لە هۆکارەکانی فەوتان و نەمان.

براکەم ....

دع الحرص على الدنيا وفي العيش فلا تطمع
ولا تجمع من الحرام فلا تدري لمن تجمع
فإن الرزق مقسوم وسوء الظن لا ينفع
فقير كل من يطمع غنى كل من يقنع

واتە: واز بهێنە لە سووربونت لەسەر دونیا، تەماحت با نەبێت بۆ ژیان، هەردەم حەرام کۆمەکەرەوە،چونکە نازانیت بۆ کێی کۆ دەکەیتەوە، دڵنیابە کە رزق دابەش کراوە، گومانی خراپ هیچ سوودی نییە، هەژارە هەر کەسێ چاوچنۆك و چڵێس بێت، دەوڵەمەندە هەرکەسێ ڕازی بێت.

لە ئەمریکا بووم بە سەردانێك چوو بووم بۆ لای ئەو برایانە... ئەو برایانە پێیان گوتم: لە نزیکمان کابرایەك هەیە کە خوای گەورە رزق و ڕۆزی فراوان کردووە، لە نزیك مەڵبەندێکی ئیسلامی لە شاری (بروکلن) لە ویلایەتی (نیویورك)... کەچی ئەم پیاوە هەرگیز نوێژ ناکات و هیچ یارمەتیمان نادات بۆ ئەنجامدانی پرۆژە خەیرییەکانی ئەم مەڵبەندە تەنانەت بە دۆلارێکیش، پرسیارم کرد ئەوەی کە لەسەر منە چییە؟ گوتیان: لە گەڵ ئێمەدا وەرە و خوای بهێنەرەوە یاد.. بەڵکو بە هۆی قسەکانتەوە دڵی نەرم بێت... منیش ڕۆیشتم بۆ لای لە گەڵ چەند برایەکدا ...گوتم: السلام علیکم ئەی فلان... گوتی: علیکم السلام ... ئەمجار دانیشتین، یادیم خستەوە بە یادی خوای گەورە، بەردەوام بە ئەوم دەگوت: خوای گەورە فەرموویی... پێغەمبەری خوارفەرمووی... کەچی ئەو بە منی گوت:ئەی مامۆستا، گوتم: بەڵێ، گوتی: خۆت هیچ ماندوو مەکە!!... گوتم: خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە دڵنیات کردم... ئەمجار پێی گوتم: بەڵێنت پێ دەدەم ئەگەر گەڕامەوە بۆ

شار و ولاتەکەی خۆم ئەوا مزگەوتێك بۆ خوا دروست دەکەم ... خۆم یەکلایی دەکەمەوە بۆ خواپەرستی و نوێژ و گوێڕایەڵی... گوتم: زۆر باشە ...بەڵام پێنوسێك و پەڕەیەکی کاغەزم بە پەلە بدەرێ... گوتی: بۆ؟ گوتم: مەترسە، ئەویش هێنای، منیش گوتم: بنووسە، گوتی: چی بنووسم؟ گوتم: دەمەوێت بەڵێننامەیەك بنوسین و فریشتەی مردن (ملك الموت) لە سەری ئیمزا بکات بۆ ئەوەی نزیکت نەبێتەوە بە هیچ شێوەیەك تاکو دەگەڕێیتەوە بۆ ولاتەکەت و مزگەوتێك دروست دەکەیت و دەگەڕێیتەوە بۆ لای خوا و خۆت یەکلا دەکەیتەوە بۆ گوێڕایەڵی و خوا پەرستی ... کابرا پێکەنی و لە مەبەستەکەم تێگەیشت... تەماشایەکی کردم و گوتی: باوەڕ دەکەیت من هەر کاتێك توشی سەر ئێشەیەك ببم ئەوا لە گیرفانم کاغەزێکی سەد دۆلاری دەردەهێنم و دەیخەمە سەر سەرم و بە بێ دواکەوتن سەر ئێشەکەم نامێنێ...؟ گوتم: کەوابوو تۆ کۆیلەی دۆلاری...(عبد للدولار).

هەروەکو پێغەمبەری هەڵبژێردراوﷺ فەرموویەتی: ((تعس عبدالدینار، تعس عبد الدرهم، تعس و انتكس، وإذا شيك فلا انتقش))،[1] واتە: کەساس و چارەرەش بوو کۆیلەی دینار و کۆیلەی دەرهەم، کەساس و سەرەوژێر بوو ئەگەر دڕکێك بە لەشیدا بچێت ئەوا کەس نییە بۆی دەربهێنێ)) .

ئەم کابرایە دۆلاری کردووەتە کەعبە و قیبلەی خۆی، ئەو تەنها لە پێناوی دۆلاردا دەژێت، لە پێناوی کۆکردنەوەی پارەدا دەگوزەرێت.

برا خۆشەویستەکەم ....هەرچەندە دەتەوێت پارە کۆبکەرەوە، بەڵام بە دوو مەرج: ئەویش ئەوەیە کە لە ڕێگای حەڵاڵەوە کۆی بکەیتەوە و حەقی خوای پەروەردگاری لێ بدەی، من نالێم: واز لە کارکردن بهێنە، نەخێر بەڵکو دەڵێم: پێویستە لە سەرمان کار بکەین و داهێنان بکەین و بەرهەم بهێنین بەڵام لە ڕێگای حەڵاڵەوە چونکە ئێمە دینێکمان هەیە هەموو هەست و کار و سامانمان ڕێك دەخات، هەموو سرەوتن و قسە و کردەوەکانمان و بەڵکو لە هەست و سۆزماندا حوکم دەکات، دینەکەمان حوکمی هەموو شتێك دەکات لە جەستە و ناخماندا .

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب الجهاد والسير، باب الحراسة في الغزو في سبيل الله (٢٨٨٦، ٢٨٨٧).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًا مُّبِينًا﴾ الأحـــزاب: ٣٦، واتە: بۆ هیچ پیاو و ژنێکی بڕوادار نییە کاتێ خوا و پەیامبەرەکەی بڕیاری کارێکیان دا سەرپشك کردنیان بۆ هەبێ لە کارەکەیاندا، هەرکەسێك سەرپێچی بکات لە فەرمانی خوا و پەیامبەرەکەی بەو شێوەیە کە جگە لە بڕیارەکانی ئەوان کارێکی دی هەڵبژێرێ بۆ خۆی ئەوە بێ گومان گومڕا بووە بە گومڕابوونێکی ئاشکرا)).

براکەم ... کەوایە چرووکی لە هەمان کاتدا ڕەزیلییە وە تەماحی سامانی خەڵکی تری تێدایە.

لێرەدا فەرموودەیەکی زۆر ناسکت بۆ باس دەکەم کە ئیمامی ئەحمەد لە (مسند)ەکەیدا و (الترمذي) لە (سنن)ەکەیدا و جگە لەوان بە سەنەدێکی (صحيح)[1] ریوایەتیان کردووە لە فەرموودەی (أبي كبشة الأنماري)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((ثلاث أقسم عليهن))، واتە: سێ شت هەیە سوێندی لەسەر دەخۆم)) ئەو ڕاستگۆیە کە هەرگیز پێویست بە سوێند ناکات لە قسەکانیدا)) ((وأحدثكم حديثا فاحفظوه))، قال: (( فأما الثلاث الذي أقسم عليهن: فإنه ما نقص مال عبد صدقة، ولا ظلم عبد بمظلمة فيصبر عليها إلا زاده الله عز وجل بها عزا، ولا يفتح عبد باب مسألة إلا فتح الله له باب فقر، وأما الذي أحدثكم حديثا فاحفظوه))، فإنه قال: ((إنما الدنيا لأربعة نفر: عبد رزقه الله مالا وعلما، فهو يتقي فيه ربه، ويصل فيه رحمه، ويعلم لله فيه حقه)) (واتة: لة سامان و زانيارةكةدا))، فهذا بأفضل المنازل) واتة: لاي خوداوةند) ((قال: (( وعبد رزقه الله علما ولم يرزقه مالا؟)) قال: (( فهو يقول: لو كان لي مال عملت بعمل فلان) (( قال: ((فهو بنيته فأجرهما سواء ))، قال: ((وعبد رزقه الله مالا ولم يرزقه علما، فهو يخبط في ماله بغير علم، لا يتقي فيه ربه، ولا يصل فيه رحمه، ولا يعلم لله فيه حقه، فهذا بأخبث المنازل)) قال:

---

١ـأخرجه الترمذي كتاب الزهد ((باب ما جاء مثل الدنيا مثل أربعة نفر)) (٢٣٢٥)، وقال: ((حديث حسن صحيح))، وابن ماجه كتاب الزهد ((باب النية)) (٤٢٢٨)، وأحمد (٤/ ٢٣٠، ٢٣١)، والبغوي في ((شرح السنة)) (٤٠٩٧)، والطبراني في ((الكبير)) (٢٢/ ٢٦٧)، والطحاوي في ((شرح مشكل الآثار)) (٢٦٣) و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي وابن ماجه)) و ((صحيح الترغيب والترهيب)) (١٤).

((وعبد لم يرزقه الله مالا، ولا علما فهو يقول: لو كان لي مال لعملت بعمل فلان، قال: هي نيته، فوزرهما فيه سواء))، واتە: قسەیەکتان بۆ دەکەم و باش ڕەوانی بکەن و لە بیری مەکەن،ئەنجا فەرموی: جا ئەو سێ شتەی کە سوێندی لەسەر دەخۆم: هەرگیز صەدەقە سامانی بەندەکان کەم ناکاتەوە، هەر کاتێك بەندەیەك ستەمێکی لێ بکرێت و ئارامی لەسەر بگرێت ئیللا خوای گەورە بە هۆیەوە سەربەرزی پێ دەبەخشێ، هەر کاتێك بەندەیەك دەرگای مەسەلەیەك بکاتەوە ئیللا خوای گەورە دەرگای هەژاری لێ دەکاتەوە، ئەو قسەی کە بۆتان دەڵێم و بە باشی رەوانی بکەن، ئەوەیە کە ئەو فەرموویەتی: ((دونیا تەنها بۆ چوار کەسە: کەسێك خوای گەورە سامان و زانیاری پێ بەخشیوە، جا بە هۆیەوە تەقوای خوا دەکات و پەیوەندی خزمایەتی دەگەیەنێت و دەزانێ لەو سامان و زانیارییەدا حەقی خوای تێدایە، جا ئەمە خاوەنی باشترین پایەیە لای خوا،فەرموی: وە کەسێك خوای گەورە زانیاری پێ بەخشیوە بەڵام سامانی پێ نەداوە، جا ئەو دەڵێت: ئەگەر پارەم هەبوایە ئەوا وەکو فلان کەس کارم دەکرد لە کردەوەی چاکە و خەیر، خۆشەویستﷺ دەفەرموێت: جا ئەو کەسە خۆی و مەبەستەکەی وە پاداشتیان وەکو یەکە (بە راستی ئەمە موژدەیەکە لەو کەسەوە کە هەرگیز لە خۆ وە قسە ناکات) وە کەسێك خوای گەورە سامانی پێ بەخشیوە بەڵام زانیاری پێ نەداوە، جا ئەو کەسە سامانەکەی خۆی تێکەڵ دەکات بە بێ زانیاری و بە هۆیەوە تەقوای خوا ناکات و پەیوەندی خزمایەتی ناگەیەنێت و نازانێت کە حەقی خوای تێدایە، جا ئەمە خراپترین پایەی هەیە، گوتی: وە کەسێك خوای گەورە نە سامان و نە زانیاری پێ نەبەخشیوە (وە ئەویش مەبەستی خراپەیە... خوایە بمانپارێزە) ئەو دەڵێت: ئەگەر سامانم هەبوایە ئەوا وەکو کار و کردەوەی فلان کەسم دەکرد (واتە لە کاری خراپەکاری و سەرپێچی و گاڵتەجاری) گوتی: جا ئەو خۆی مەبەستەکەی و تاوانەکەیان وەکو یەکە).

هەرگیز چرووکی مەکە، سوێند بە خوا سەروەت و سامان وەکو سێبەرێکەو نامێنی و قەرزێکەو دەبێ بگێردرێتەوە، جا پێغەمبەری خواﷺ لە خەیر کردندا لە بایەکی رەوانە کراو بە گورجتر بوو .

لێرەدا قسەکانم بە قسەی زانای پایەدار (ابن القیم) تەواو دەکەم کە لە کتێبە بە نرخەکەیدا (زاد المیعاد) هاتووە، جا ئەو دەفەرموێت[١]:

له هۆکارەکانی سنگ فراوان بوون

لە پێش هەموو ئەو هۆکارانەوە یەکتاپەرستی باس کردووە و پاشان چەند هۆکارێکی تری هێناوە لەوانە:

چاکەکاری لە گەڵ خەڵکیداو، سوود بەخشین پێیان بە سامان و رووی کۆمەلایەتی تا لە توانایدایە وە سوود بەخشین بە خەڵکی بە جەستە و جۆرەکانی چاکەکاری چونکە کەسی چاکەکاری بەڕێزی سەخی لە هەموو کەسێك سنگ فراوانترە و لە هەمووان ناخی پاکترە، لە هەموو کەسێك زیاتر دڵخۆشترە،بەلاّم کەسی رەزیل کە چاکەکاری تێدا نییە لە هەموو کەسێك زیاتر سنگی تەنگترە و ژیانی ناخۆشتر و خەم و پەژارەی لە هەمووان گەورەترە، پێغەمبەری خواﷺ لە (صحیح البخاری)[٢] دا نمونەیەکی هێناوەتەوە و دەفەرموێت: ((مثلاً للبخیل والمتصدق، کمثل رجلین علیهما جبتان من حدید، کلما هم المتصدق بصدقة اتسعت علیه و أنبسطت، حتی یجر ثیابه ویعفي أثره، وکلما هم البخیل بالصدقة لزمت کل حلقة مکانها ولم تتسع علیه )) واتە: نمونەی کەسی رەزیل و کەسی بەخشندە وەکو دوو کەس وان کە دوو جبەی ئاسنینیان لە بەردا بێت، جا هەر کاتێك کابرای بەخشندە بیەوێ ببەخشێت ئەوا جبەکەی فراوان دەبێتەوە و گەورە دەبێتەوە تاکو وای لێ دێت کە جلەکەی بە زەویدا رادەکێشێ و شوێنەواری دەردەکەوێت، هەر کاتێك کەسی رەزیل بیەوێ ببەخشێ ئەوا هەموو ئەڵقەکان جێگەکەی خۆیان توند دەگرن و فراوان نابێتەوە)).

---

١ـ (٢/ ٢٣، ٢٥ ط ابن رجب).

٢ ـ أخرجه البخاري کتاب اللباس، باب جیب القمیص من عند الصدر و غیره (٥٧٩٧)، ومسلم، کتاب الزکاة، باب مثل المنفق والبخیل (١٠٢١).

جا ئەمە نمونەی سنگ فراوانی ئیمانداری بەخشێنەر و دڵگەورەییەتی و نمونەی سنگ تەنگی کەسی رەزیل و دڵ تەنگییەتی)) (مەبەستەکە تەواو بوو).

داوا لە خوا دەکەم سنگمان فراوان بکات و لە چرووکی و رەزیلی و کارە خراپەکانمان بمانپارێزێ، هەر خۆی بە توانایە و دەسەڵاتی بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

# سەلام کردن لە کەسی ناسیاو بە تەنها و بڵاو بوونەوەی بازرگانی

ئیمامی ئەحمەد لە (مسند)ەکەیدا و الحاکم لە (مستدرك)ەکەیدا بە سەنەدێکی (صحیح)[1] ریوایەتیان کردووە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی مسعود)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إن بين يدي الساعة تسليم الخاصة وفشو التجارة حتى تعين المرأة زوجها على التجارة)) واتە: لە بەر دەستی قیامەتدا (لە پێش قیامەت) سەلام کردن تەنها لە کەسی ناسیاو دەبێت و بازرگانی بڵاو دەبێتەوە تاوەکو ئافرەتیش یارمەتی مێردەکەی دەدا لە بازرگانی کردندا)) .

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: ((إن من أشراط الساعة أن يسلم الرجل على الرجل لا يسلم عليه إلا للمعرفة)) واتە: لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە کەوا پیاوێك سەلام دەکات لە پیاوێکی تر تەنها لە بەر ناسیاوی سەلامی لێ دەکات)).

بە راستی ئەم حاڵەتە بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا بڵاو بووەتەوە، کەسی موسڵمان دەبینی لە گەڵ برا موسڵمانەکەیدا لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوای گەورە... بەڵکو بە تەنیشتییەوە و لە پشت یەك ئیمام و بەرەو یەك قیبلە و لە گەڵیدا نوێژ دەکات بۆ یەك پەروەدگار کەچی سڵاو ناکات تەنها لەوانەی کە دەیناسێت !! ئەمەیشە جیاوازە لە سوننەتی پێغەمبەری خواﷺ کەوا فەرمانی پێ کردووین سەلام بکەین لەوانەی کە دەیانناسین و لەوانەی کە نایانناسین، بەڵکو پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرموویەتی هەروەکو لە لە (صحیح مسلم)[2] دا هاتووە لە فەرموودەی (أبو هريرة)ەوە: ((لا تدخلون الجنة حتى تؤمنوا، ولا تؤمنوا حتى تحابوا، أولا أدلكم على شيء إذا فعلتموه تحاببتم؟ أفشوا السلام بينكم))، واتە: هەرگیز ناچنە بەهەشتەوە تاوەکو باوەڕ نەهێنن، باوەڕ ناهێنن تاوەکو یەکترتان خۆش

---

١ـ أخرجه أحمد في مسنده (١ / ٤٠٧، ٤٠٨، ٤١٩)، والحاكم (٤ / ٤٤٥، ٤٤٦)، وصححه ووافقه الذهبي والبخاري في ((الأدب المفرد)) (١٠٤٩)، وقال الهيثمي في ((المجمع)) (٧ / ٣٢٩): ((رواه أحمد والبزار ورجال أحمد و البزار رجال الصحيح))، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (٦٤٧).

٢ـ أخرجه مسلم، كتاب الإيمان، باب بيان أنه لا يدخل الجنة إلا المؤمنون و أن محبة المؤمنين من الإيمان و أن إفشاء السلام سبب لحصولها)) (٥٤).

نەوێت، ئایا ڕێگایەکتان پێ بڵێم ئەگەر جێ بە جێ بکەن ئەوا یەکترتان خۆش بوێت؟ سەلام کردن لە نێوانتاندا بڵاو بکەنەوە)).

جا پێغەمبەرمانﷺ پێغەمبەری سەلام و ئاشتییە، دەبا هەموو ئەم دونیایە ببیسن، بەڵکو پەروەردگارمان خۆی (السلام)ە، بەهەشتیش ماڵی سەلام و ئاشتییە، سڵاوی موسڵمانان کاتێ دەچنە بەهەشتەوە سەلامە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَٰمٌۚ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا﴾ الأحزاب: ٤٤، واتە: ئەو ڕۆژەش کە بە دیداری ئەو دەگەن ڕێز و تەحیەیان سەلامە بە سڵاو کردن لە لایەن خوای میهرەبانەوە پێشوازییان لێ دەکرێت)) سڵاوی فریشتەکان لە بەهەشتدا بۆ ئەهلی باوەڕ سەلامە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ﴾ الزمر: ٧٣، واتە: سڵاو و درووددتان لەسەر بێ، بە خێر هاتن خۆتان پاك ڕاگرت لە دونیادا هەوڵ و تێکۆشان و پاداشتیشتان لێرەدا پاك و خاوێنە یاخوا نۆشتان بێت، دە بچنە ناو بەهەشت بە هەتا هەتایی لەوێدا بن))

جا دڵنیابن کەوا دینەکەمان دینی ئاشتی و سەلامە.

براکەم... سڵاو بکە لە برا موسڵمانەکانت، لەوەی کە دەیناسیت و لەوانەش کە نایانناسیت هەروەکو چۆن پێغەمبەرەکەمانﷺ فەرمانی پێ کردووین، ئەمە مەبەستەکەیە لە (تسليم الخاصة)، بە ڕاستی ئێستا برایەتی ئیمانی زۆر کەم بووەتەوە، ئەو برایەتییە لەدڵەکاندا کەم بووەتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ الحجرات: ١٠، واتە: بە ڕاستی هەر بڕواداران برای یەکن)).

جا لە هەر جێگایەکدا ئیمانێکت بینی بە بێ برایەتی ئەوا بزانە ئەو ئیمانە کەم و کووڕی تێدایە، ئەگەر برایەتییەکت بینی بە بێ ئیمان ئەوا بزانە ئەو برایەتییە برایەتی دینی نییە، برایەتی ئیمان نییە، بەڵکو ئەوە بە یەك گەیشتنی بەرژەوەندییەکانە، گۆڕینەوەی سوودەکانە، ئەگەر ئەو بەرژەوەندییە کۆتایی پێ بێت و ئەو سوودە نەما ئەوا ئەو پەیوەندییە کەم دەبێتەوە، بەڵکو ڕەنگە ئەم پەیوەندییە ببچڕێت، بۆیە دەڵێم: پەیوەندی ئیمانی پاکترین و بێگەردترین

پەیوەندییە و مەزنترین پەیوەندییە، بە نرخترین پەیوەندییە، چونکە ئیمانداران هەموویان وەکو یەك گیان وان، بەڵام لە ناو چەند جەستەیەکی جیاوازدا جێگر بوونە، وەك لقەکانی دارێك وان و لە یەك داری گەورەوە سەرچاوە دەگرن، بۆیە پەروەردگارمان دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ﴾ الحجرات:١٠.

جا لە نیشانەکانی قیامەت هەروەکو پێغەمبەرمانﷺ فەرمویەتی: سڵاو کردن تەنها لە کەسی ناسیاو دەبێت (تسلیم الخاصة)وە کارەساتەکە مەزنتر دەبێت کاتێ بە ئەنقەست سڵاو لە براکانی نەکات، چونکە ئەم موسڵمانە سەر بە بەرنامەیەکە لەوی تر جیاوازە وە پەیوەندی بەو کۆمەڵەوە نییە کە ئەو پەیوەندی پێوەیە، تا کۆتایی ئەو بۆچوونە حیزبییە تەسکە کە هەردەم داوا لە خوا دەکەم کە دڵ و دەروون و بیر و هۆشمانی لێ پاك بکاتەوە.

ئایا ئەم پەیوەندییە چەند بەرێزە و ئەم کۆمەڵە چەند مەزنە و چەند گەورە و رێزدارە ! !، ئەو کۆمەڵەی کەوا پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك کە شانازیی پێوە بکات کە ئەویش کۆمەڵی موسڵمانانە، ئەگەر پرسیاری شێخەکەتیان کرد ئەوا بڵێ: شێخی من پێغەمبەری خوایەﷺ، واز بهێنە لەو حزبایەتییە و دەمارگیرییە کەوا ئەم ئوممەتەی پارچەپارچە کردووە و ریزەکانی تێك داوە و بچڕاندوویەتی، لە کاتێکدا هەمووئوممەتەکان کۆ بوونەتەوە لەدژی ئوممەتی ئیسلام و یەکتاپەرستی و ئیمان کەچی ئێمە بەردەوام پەرتەوازە و جیاوازین، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ ﴾ الأنفال: ٤٦، واتە: قرە قڕ و کێشەش لە گەڵ یەکتردا مەکەن، هەتا هێز و تواناتان بچێ و ئەوساش کز و لاواز و سست بن .)) وە ئەگەر پرسیاریان لێ کردی دەربارەی کۆمەڵەکەت ئەوا بڵێ: ﴿هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴾ الحج: ٧٨، واتە: لە پێشدا و لەم قورئانەشدا هەر خوا ئێوەی ناوناوە موسڵمان و خۆ بەدەسەوەدەر)).

من بە برایان و خۆشەویستانم دەڵێم: واز لەو دەمارگیرییە بهێنن چونکە ئەوە گەنیوە، بگەڕێنەوە بۆ کتێبەکەی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەیﷺ و بۆ کۆمەڵی دایك کە پێویستە هەموو موسڵمانێك شانازی بکات بە پەیوەندی بەو کۆمەڵەوە، کە

ئـەویش کۆمـەڵی موسـڵمانانە، داوا لـە خـوا دەکـەم دڵـەکانمان پێکـەوە گرێـدا و ریزەکانمان یەك بخات و لەسەر قورئان و سوننەت کۆمـان بکاتـەوە بـە تێگەیـشتنی هاوەڵان، هەر ئەو پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

براکەم ... سڵاو بکە لە هەموو برایەکی موسڵمان، تۆیش خوشکی بەرێزم... سڵاو بکە لە هەموو خوشکێکی موسڵمانت، دەڵێیت: ئەم خوشکە بەردەوامە لەسەر سەرپێچی، پێت دەڵێم: خوای گەورەی یاد بهێنەرەوە، دەڵێیت: ئەو دێتە ناو مزگەوتەوە بە جل و بەرگێکی نارێکەوە، پێت دەڵێم: خوای گەورەی یاد بهێنەرەوە بە وشەیەکی جوانی ناسك، تۆیش برای بەرێزم هەرگیز مەڵێ: ئەم پیاوە بیدعەچییە یان کەمتەرخەمە وە خۆتیش دەستەوسان دەوستیت، نەخێر بەڵکو خوای گەورەی یاد بهێنەرەوە، بە شێوازێکی ناسك و جوان ئەگینا سوێند بە خوا ئێمە بە سەر دڵەکاندا زاڵ نین تاوەکو لە بیدعەوە بیگۆڕینە سوننە، لە خراپەکارییەوە بۆ چاکەکاری، لە نارەواوە بۆ حەق و راستی، لە گومڕاییەوە بۆ رێنموویی ئیللا بە پێی بەرنامەی خاوەنی سوننەت نەبێت... خاوەنی رێنمایی، خاوەنی رەوشتی بەرزﷺ ئەو کەسەی کە خواکەی پێی فەرموو: ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ﴾ آل عمران: ١٥٩، واتە: بە هۆی ڕەحمەت و بەزەیی و میهرەبانی خواوەیە، تۆ ئەی پێغەمبەرﷺ. ئەوەندە نەرم ونیان بووی لە گەڵیان، خۆ ئەگەر کەسێکی تووڕە و قسەرەق و دڵ ڕەق بای دەورووبەریان چۆڵ دەکردی و لێت دوور دەکەوتنەوە، دەسا تۆ ئازار و هەڵەکانیان ببەخشە و لە خوایش داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە، تا لە هەڵە و تاوانەکانیان ببورێ، لە تەواوی کارە ستراتیژییەکانیشدا پرس و راو مشۆرەت و راوێژیان پی بکە. ئینجا دوای پرس و ڕا و مەشۆرەت وەختێ لێ بڕایت بۆ ئەنجامدانی کارەکەت پشت بە خوا ببەستە و بچۆ کارەکەت پیادە بکە، بە راستی خوا ئەو کەسانەی خۆش ئەوێ پشت هەر بەو دەبەستن)) .

پاشان پێغەمبەری ئەکرەمﷺ ڕوونی کردەوە کەوا لە نیشانەکانی قیامەت: ((و فشو التجارة)) واتە: بڵاو بوونەوەی بازرگانی)) ئایا بازرگانی حەرامە؟ نەخێر... کەوابوو بۆ پێغەمبەری خواﷺ لە نیشانەکانی قیامەت باسی کردووە؟؟ وریابە ..ئەم بنەمایە زۆر گرنگە... مەرج نییە هەر نیشانەیەك لە نیشانەکانی قیامەت باس کرابێت ئەوا ئەو نیشانەیە حەرام بێت... جا بڵاو بوونەوەی بازرگانی نیشانەیەکە لە نیشانە بچووکەکانی قیامەت، بەڵام بازرگانی حەرام نییە، ئیللا مەگەر ئەو بازرگانییە خۆی بۆ خۆی لە بنەڕەتدا حەرام بێت - هەروەکو ئێستا ڕوونی دەکەمەوە- هەروەها بەرزکردنەوەی کۆشك و خانوو نیشانەیەکە لە نیشانەکانی قیامەت کەچی حەرام نییە، دەرکەوتنی(مەهدی) نیشانەیەکە کەچی حەرام نییە... هتد، بۆیە مەرج نییە هەر نیشانەیەك لە نیشانەکانی قیامەت پێغەمبەری خواﷺ باسی کردبێت ئەوا ئەو نیشانەیە حەرام بێت... جا لەو نیشانانە هەیە حەرامە هەروەکو باسمان کرد وە هەندێکیان پێغەمبەری خواحەرامی نەکردووەﷺ وە بڵاو بوونەوەی بازرگانی بە شێوەیەکی دیار بڵاو بووەتەوە ڕەنگە ئێستا -بە بێ زیادەڕەوی- لە ناو یەك شەقامدا ڕێ بکەی لە نێوان دوکانێك و دوکانێکی تردا دوکانێکی بازرگانی تر ببینی بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا دوکانەکان زۆر بوونە، بیر لەو ئیشارەتە پێغەمبەرایەتییە بکە کە دەفەرموێت: ((حتى تعين المرأة زوجها على التجارة)) واتە: تاوەکو ئافرەتیش یارمەتی مێردەکەی دەدا لە بازرگانی کردندا)) .

صەڵات و سەلام لەسەر ئەو کەسەی کە هەرگیز لە خۆ وە قسە ناکات . حەز دەکەم لێرەدا مەرجەکانی بازرگانی ڕوون بکەمەوە... دەڵێم: دونیا کێڵگەی دوارۆژە، هیچ کەم و کووری نییە کە بازرگانی تێدا بکەین .

ئەی بازرگانی خۆشەویست .... بزانە کەوا پاکترین و شەریفترین کەس بازرگانی کردووە پیغەمبەری خوایەﷺ! هەروەکو دەزانن ئەو بازرگانی بە سەروەت و سامانی خەدیجەوە دەکرد بۆیە بازرگانییەکەی پێغەمبەرﷺ ڕێزێکە بۆ هەموو

بازرگانەکانی سەر زەوی بۆیە هیچ کێشەیەك نییە کە بازرگانی بکەین بەڵام بە دوو مەرج:

* یەکەم: بازرگانی بە شتی حەڵاڵەوە بکەیت، بە پێی مەرجە شەرعییەکان .

* دووەم: حەقی خوای گەورەی لێ دەربکەیت .

جا کێشەکە ئەوە نییە ئێمە ئەم دونیایە بۆ جگە لە موسڵمانان جێ بهێڵین . کێ دەڵێ: هەرکەسێ بۆ دوارۆژ بژێت ئەوا دونیا جێ دەهێڵێ... ؟! کێ ئەمەی گوتووە؟ کێ دەڵێ کەوا پێغەمبەری خواﷺ کە پاکترین و ڕێزدارترین و مەزنترین کەس بوو کە بۆ دوارۆژ کاری دەکرد وازی لە دونیا هێناوە ؟؟! هەندێ کەس دەڵێن: ئەوەی لەسەر ئێمە پێویستە دەبێ زوهد بکەین لەم دونیادا، ئەمە مانای چییە؟ مانای ئەوەیە کە دەبێت بەندەکە جل و بەرگەکەی پاک نەبێت وە بۆنێکی پیسی هەبێت، دیمەنێکی ناشیرینی هەبێت، بەبانگەشەی ئەوەی لە دونیادا زوهد دەکات! بە ڕاستی ئەمە هەڵەیە... زاهیدترین کەس لەم دونیایە پێغەمبەری خوابووەﷺ دڵنیابە کەوا ئەم دونیایە هیچ کەسێکی بە خۆ وە نەبینیوە لە پێغەمبەری خواﷺ زاهید تر بێت... لە گەڵ ئەوەیشدا داواکارێك دێت و داوای لێ دەکات... بیهێنە پێش چاوی خۆت پێغەمبەری خواﷺ چی دەداتێ؟ پێغەمبەری خواﷺ کۆمەڵە مەڕێکی پێدا [1] ! کەچی کاتی وای بە سەردا ڕۆیشتووە کە بەردی بەستووەتە سەر سکی خۆی لە برسانا[2]،! بەڵێ... بۆ ئەوەی حاڵی ئەم دونیایەمان بۆ روون بکاتەوە...

لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواﷺ هەبوو کە میراتەکەی لە ئاڵتون بووە و دابەش کراوە وەکو (عبدالرحمن ی کوڕی عوف) و (ابو بکر الصدیق) و (ابي طلحة الأنصاري)،ئێمە دەمانەوێت کێشەکە بە وردی تێ بگەین.

---

١ ـ أخرجه مسلم، كتاب الفضائل، باب ما سئل رسول اللهﷺ شيئا قط فقال: ((لا)) و كثرة عطائه (٢٣١٢).
٢ـ أخرجه البخاري كتاب المغازي ((باب غزوة الخندق وهي الأحزاب)) (٤١٠١).

بۆیە ئیمامی عەلی ﷺ دەفەرموێت[١]: (( الدنیا دار صدق لمن صدقها، ودار غنى لمن تزود منها، ودار نجاة لمن فهم عنها،، فهي مهبط وحي الله، ومصلى أنبياء الله، ومتجر أولياء الله، ربحوا فيها الرحمة، واكتسبوا فيها الجنة))، واتە: دونیا ماڵی ڕاستگۆیی یە بۆ هەر کەسێ ڕاستی لەگەڵدا بکات، ماڵێ دەوڵەمەندییە بۆ هەر کەسێ تێشووی تیادا کۆبکاتەوە، ماڵی ڕزگار بوونە بۆ هەر کەسێ لێی تێگەیشت، چونکە ئەم دونیایە شوێنی دابەزینی سروشی خوایە، جێ نوێژگەی پێغەمبەرانی خوایە، شوێن بازرگانی پیاو چاکان و خۆشەویستانی خوایە، سۆز و میهرەبانیان تیادا بردەوە وە بەهەشتیان تیادا قازانج کرد)) .

لێرەدا ئەوە تێدەگەین کە مەبەست لە زوهد ئەوەیە واز لە حەرام بهێنی و واز لەوە بهێنی کە خوا پێی ڕازی نییە وە زوهد ئەوەیە کە هەموو شتێك لە بەر دەستتدا هەبێت و دەتوانی هەموو شتێك بکەیت، کەچی هیچ شتێك ناکەیت تەنها ئەوە نەبێت کە خوا حەڵاڵی کردووە، جا تۆ واز لە حەرام دەهێنی لە بەر گوێڕایەڵی خوا و تەقوای خوا و دووپات کردنەوەی خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕاستی ئەمە بەرزترین لوتکەی زوهدە .

کەوا بوو هیچ کێشە نییە — برای خۆشەویستم — لە بازرگانیدا کار بکەیت، بەڵام بەڕێز و شەرەفەوە بازرگانی بکە، بە سپاردە و مەرجەکانەوە، گرنگترین ئەم مەرجانە ئەوەیە کە تەقوای خوات هەبێت و بازرگانییەکەت حەڵاڵ بێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ﴿١﴾ الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ ﴿٢﴾ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ ﴿٣﴾ أَلَا يَظُنُّ أُولَٰئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ ﴿٤﴾ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٥﴾ يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ المطففين: ١ـ ٦، واتە: تیاچوون بۆ یاریکەران بە پێوانە و تەرازوو(١) ئەوانەی کاتێ پێوانە بۆ خۆیان بکەن و شت لە خەڵکی بکڕن، بە ڕێك و پێکی ئەنجامی دەدەن و بە تەواوی وەری ئەگرن (٢) کاتێ پێوانە، یا کێشانە بۆ

---

١ ـ أخرجه ابن أبي الدنيا في ((إصلاح المال)) (١٠٥)، وابن عساكر في ((تاريخه)) (٤٢/ ٤٩٨) و (٥٨ / ٧٩)، وفي إسناده نظر، كما قال ابن رجب، وقد تقدم معنا

خەڵك بکەن و شتیان پێ بفرۆشن بە ناتەواوی بۆیان ئەنجام ئەدەن.(٣) ئایا ئەوانە نازانن و بڕوایان نییە کە بە ڕاستی زیندوو ئەکرێنەوە بۆ وەرگرتنی تۆڵەی فێڵ و خیانەتیان.(٤) بۆ ڕۆژێکی زۆر بە سام و گەورە!!(٥) ئەو ڕۆژەی هەموو خەڵکی بە پێوە دەوەستن بۆ حوکم و فەرمانی خواوەندی جیهانەکان(٦))).

ئەگەر لە خەڵکانی تر بکڕن ئەوا هەموو مافەکانی خۆیانیان بە تەواوەتی دەوێت بەڵام ئەگەر شتێك بە خەڵکی تر بفرۆشن ئەوا جۆرەها فڕوفێڵ بە کار دەهێنن لەکێش و ترازوودا، ولا حول ولا قوه الا بالله، ئەمەیشە ساختە و غەشە لە بازرگانیدا!!

براکەم... چاودێری خواکەت بکە... ئەو خوایەی کە هەموو نهێنی و ئاشکراکانت دەزانێ... بەڵام ئەوەی کە ئێستا دڵەکان دەبچڕێنێت بازرگانێك دەتوانێت زۆر بە ئاسانی لە ترازووەکەیدا دزی بکات، کەچی ئەو بەستەزمانەی لە بەر دەستیدا ڕاوەستاوە ئاگای لە هیچ نییە! جا من بەو بازرگانە دەڵێم: کێ دەخەڵەتێنی؟ ئەگەر ئەو کەسەی کە شتت لێ دەکڕێت تۆ نابینێ، ئایا لە بیرت چوو کە خوای گەورە دەبیسێ و دەبینێ؟!

تۆ... برای خۆشەویستم... بەدڵنیایی یەوە حەڵاڵ و حەرام دەناسیت، سپاردە و ساختە دەناسی، بۆیە فێڵ لە هیچ کەسێك مەکە تەنانەت ئەگەر ئۆتۆمبیلە تایبەتییەکەی خۆتت فرۆشت، جا تۆ لەم سات و کاتەدا دەبیتە بازرگان، بۆیە هەموو شتێك ڕوون بکەرەوە و ڕاست بکە .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەی (حکیم ی کوڕی حزام) ەوە: ((البیعان بالخیار ما لم یتفرقا، - فإن صدقا و بینا بورك لهما في بیعهما، وإن کتما وکذبا محقت برکة بیعهما)) واتە: کڕین و فرۆشتن لە نێوان دوو کەسدا بە هەڵبژاردن دەبێت (واتە: ئەگەر بیەوێ بیکڕێ یان نا) بە مەرجێ لە یەك جیانەبنەوە، جا ئەگەر ڕاستیان کرد و هەموو شتێکیان ڕوون

---

١ ـأخرجه البخاري کتاب البیوع ((باب إذا بیَّن البیعان ولم یکتما و نصحا)) (٢٠٧٩)، ومسلم کتاب البیوع ((باب الصدق في البیع و البیان)) (١٥٣٢).

کردەوە ئەوا خوای گەورە بەرەکەت دەخاتە ناو ئەو کڕین و فرۆشتنەوە، بەڵام ئەگەر درۆیان کرد و لە یەکتر شتیان شاردەوە ئەوا بەرەکەت لەو کڕین و فرۆشتنەدا نامێنیّ)).

جا ئەگەر راست بکەی – ئەی برای بازرگان – ئەوا بەرەکەت دەرژێتە سەر تۆ و کڕیاردا، کەواتە بۆ بازرگانی بەرەکەتی تێدا نەماوە؟بەرەکەت نەماوە بەهۆی ساختە و غەش و درۆ و خیانەتەوە!! نابێت بە هیچ شێوەیەك بڵێیت: من دەمەوێت کەسابەت بکەم ئیتر بە هەر شێوەیەك بێت کێشە نییە، هەرچەندە بە دڵنیاییەوە بزانم کەوا کەرەستەکەم کەم و کوورییەکی ترسناکی تێدایە کە من بانگەشەی بۆ دەکەم بەڵام بە هەموو شێوەیەك دەمەوێت ئەم کەم و کوورییە لە کڕیارەکە بشارمەوە تەنها بۆ ئەوەی کەرەستەکە ببات و بڕوات!! ئەی لە پاش ئەوە چی براکەم؟ سوێند بە خوا هەرگیز ئەو پارەیە هیچ سوودێکی لیّ نابینی کە لە رێگای غەش و ساختەوە پەیدات کردووە، هەرچەندە لە مێشکی خۆتتدا وا دابنێیت کەوا لە دونیادا سوودی لیّ دەبینی ئەوا باش بزانە کەوا پرسیارت لیّ دەکرێت دەربارەی لە بەر دەستی خوادا لە رۆژی دواییدا، هەموو ئەو سەروەت و سامانە بۆ وەرەسەکانت بە جێی دەهێڵی– هەروەکو چۆن ئێستا روونی دەکەمەوە بە پشتیوانی خوا لە کاتی باس کردنی نیشانەیەکی تری ترسناکدا لە نیشانەکانی قیامەت کەوا بە شێوەیەکی غەمگین بڵاوەی کردووە و لا حول ولا قوە الا بالله...

لە (صحیح مسلم)[1] دا هاتووە لە فەرموودەی (أبو هریرە)ەوە:

((أن رسول الله ﷺ مر علی صبرة طعام فأدخل یدە فیها، فنالت أصابعه بللا...))
واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە تەنیشت دەفرێکی خواردندا تێپەری دەستی خستە ناوییەوە بۆیە پەنجەکانی تەڕ بوو...))وە ئەمە پێی دەڵێن (توشیش الأقفاص) دەبینی سەرەوەی سنوقەکە کە نمایش کراوە و لە تۆ وە دیارە شتی باش و چاکە بەڵام ئەگەر تەماشای خوارەوەی بکەی ئەوا...إنا لله و إنا إلیه راجعون...!! بۆ ئەم جۆرە ساختە و غەشە دەکەن ئەی بازرگانان؟ئێمە دەمانەوێت ئەم کاروان و

---

١ـ أخرجه مسلم، کتاب الإیمان، باب قول النبي ﷺ: ((من غشنا فلیس منا)) (١٠٢).

ڕەوشت و ئاکارانەمان راست بکەینەوە بە کتێبەکەی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەیﷺ ، بۆ ئەوەی دونیامان خۆش بێت، ببینە ئەوانەی کە لە دونیا و دوا ڕۆژدا بەختیارن... داوا لە خوا دەکەم کە ببینە ئەهلی خۆشگوزرانی دونیا و دوارۆژ ...

جا کاتێ پێغەمبەری ئەکرەمﷺ ئەو خواردنەی بینی لە ڕواڵەتدا باش و جوانە و دەستی درێژ کرد بۆ خوارەوەی بینی پەنجەکانی تەڕ بوو ..((فقال: " ما هذا يا صاحب الطعام؟" قال أصابته السماء يا رسول الله ﷺ ، قال: " أفلا جعلته فوق الطعام كي يراه الناس، من غش فليس مني))، واتە: فەرمووی: ئەمە چییە ئەی خاوەنی ئەم خواردنە؟ گوتی: ئەوە بارانی بە سەردا باریوە ئەی پێغەمبەری خواﷺ ... فەرمووی: ئەی بۆ لە سەرەوەی خواردنەکە دات نەنا بۆ ئەوەی خەڵکی بیبینێ ! باش بزانە کەوا هەرکەسێ ساختە و غەش بکات ئەوا لە ئێمە نییە)).

هەموو ڕەوانبێژانی سەر زەوی ناتوانن—ئەگەر کۆ ببنەوە — بەو مانا گەوەرەیە و ئەو چەند وشە کەمە و بەو شێوە جوان دەربیبڕن — صەڵات و سەلام لەسەر ئەو کەسەی کە خوای گەورە ئەوپەڕی ڕەوانبێژی پێ بەخشیوە — ئەمە بەرنامەی پێغەمبەرایەتییە کە هەموو سەر زەوی شاد دەکات لە دونیا و دوارۆژدا.

جا ئەی برای بازرگان ... ڕاست بکە و هەموو کەم و کورییەکانی کەرەستە و بازرگانییەکەت ڕوون بکەرەوە، بۆ ئەوەی خەڵکی ببینن، جا کڕیار دەتوانێت نرخی ئەو کەرەستەیە بە پێی ئەو کەم و کورییە دیاری بکات، بەڵکو تۆ ڕوونی بکەرەوە بۆی و خراپەکان دەربهێنە، لە گەڵ خوای خۆتدا ڕاست بکە بۆ ئەوەی خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ناو بازرگانییەکەتەوە، لە بەر ئەوە هیچ سەرسام مەبە کەوا بازرگانی ڕاستگۆ لە گەڵ پێغەمبەری خواداﷺ دەبێت لە بەهەشتدا, هەروەکو لە (سنن ابن ماجە)[1] و جگە لەو هاتووە لە فەرموودەی (ابن عمر) ەوە دەڵێت:

---

١ ـ أخرجه عبد بن حميد (٩٦٦)، والدارمي (٢٥٣٩)، والترمذي كتاب البيوع ((باب ما جاء في التجار و تسمية النبي ﷺ إياهم (١٢٠٩) من حديث أبي سعيد الخدري، وفي سنده انقطاع، ولكن يقويه حديث ابن عمر الذي رواه ابن ماجه، كتاب التجارات ((باب الحث على المكاسب)) (٢١٣٩)، والطبراني في ((الكبير)) (٥٧٧) و ((الأوسط)) (٧٦٠٧)، والحاكم (٥ / ٢٤٣) والدار قطني (٢٨٤٩)، والبيهقي (٥/ ٢٦٦)، وصححه لغيره العلامة الألباني في ((الصحيحة)) (٣٤٥٣) و ((صحيح الترغيب)) (١٧٨٢، ١٧٨٣).

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((التاجر الأمين الصدوق المسلم مع الشهداء يوم القيامة)) ، واتە: بازرگانی دەست پاکی راستگۆی موسڵمان لە ڕۆژی قیامەتدا لە گەڵ شەهیداندا دەبێت)).

لە ڕیوایەتێکی تردا کە (الترمذي) ریوایەتی کردووە لە فەرموودەی (أبی سعید الخدری)ەوە: ((مع النبيين و والصديقين و الشهداء))، واتە: لە گەڵ پێغەمبەران و راستگۆیان و شەهیداندا دەبێت)).

بە ڕاستی پێگە و جێگەیەکە هەرگیز وەسف ناکرێت، ڕەنگە جاری وا هەبێت بازرگانێك ببینی لە خوا ناترسێت و ساختە لە گەڵ خەڵکیدا دەکات، بۆیە دەبینی کەرەستەیەك دەفرۆشێت لە سەری نوسیوە: (لە یابان دروست کراوە)کەچی خۆیشی بە دڵنیاییەوە دەزانێت لە یابان دروست نەکراوە، ئەم کەرەستەیە نرخەکەی سەد جونەیهە چونکە کەرەستەیەکی ئەصلییە، لە راستیدا کەرەستەیەکی ساختەیە و کە تەنها دە جونەیە ناهێنێت و ئەو بە سەد جونەیە دەیفرۆشێت!!! سویند بە خوا ئەو سامانە هەرگیز سوودی لێ نابینی لە دونیا و دوارۆژیشدا.

ئەی بازرگانان ... تۆ بۆ کێ کار دەکەی؟ ئەی کۆتاییەکە چییە؟ دڵنیابە کە دەمریت! منیش دەمرم! ئەو سەروەت و سامانە بۆ وەرەسە بە جێ دەهێڵین، ئەوان بە بەختیارییەوە پێوەی دەژین، تۆی بەستەزمان کە شەو و ڕۆژ نەدەخەوتی دەربارەی ئەو سامانە پرسیارت لێ دەکرێت، لە کوێ هێنات و لە کوێ خەرجت کرد؟؟ هەروەکو خۆشەویستمانﷺ دەفەرموێت: ((لا تزول قدما عبد حتى يسأل عن عمره فيما أفناه، وعن علمه فيم فعل، وعن ماله من أين اكتسبه وفيما أنفقه، وعن جسمه فيم أبلاه))[1] واتە: هەردوو پێی بەندە لە قیامەتدا ناجوڵێتەوە و هەنگاوێك نانێت تاکو دەربارەی چوار شت پرسیاری لێ نەکرێت، تەمەنەکەی چۆن بە سەری

---

١ـ أخرجه الترمذي، كتاب صفة القيامة عن رسول الله ((باب في القيامة)) (٢٤١٧)، والدارمي (٥٤٣)، وأبو يعلى في ((مسنده)) (٣٤٣٤)، وابن ابي الدنيا في ((إصلاح المال)) (٣٠)، وأبو نعيم في ((الحلية)) (١٠ / ٢٣٢) من حديث أبي برزة الأسلميﷺ، وصححه لشواهد الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (٢/ ٦٢٩).

برد، زانستەکەی چی کاریکی پێی کرد، سامانەکەی چۆن پەیدای کرد و چۆن خەرجی کرد، جەستەکەی چۆن دایهێناو و رزاندی (واتە: بەکاری هێنا).

هیچ کێشە نییە لە ئیسلامدا قازانجێك دیاری بکەیت، لەم قازانجە تەقوا و بەزەییت بە خەڵکانی تردا و رادەی رازی بوونت دیاری دەکات .داوا لە خوا دەکەم کە رزق و رۆزی ئێمە و ئێوە فراوان بکات، رازی بوون بە قسمەتی ئێمە و ئێوە بکات، جا رازی بوون چەند جوانە و قەناعەت چەند مەزنە ! !

النَّفسُ تَجزَعُ أن تكونَ فَقيرَة    والفقرُ خَيرٌ من غنَى يُطْغِيهَا
وَغِنَى النفُوسِ هُوَ الكَفَافُ فَإن أَبَتْ    فجميعُ ما فى الأرضِ لا يكفيِهَا
هَى القَنَاعةُ فالزَمْهَا تَكُنْ مَلكاً    لَو لَم تَكُنْ لَكَ إلاَّ رَاحةُ البدنِ
وأنْظُر لمِن مَلَكَ الدُّنْيا بأَجْمَعِهَا    هَل رَاحَ مِنْهَا بِغَيرِ الطيب والكَفَنِ

واتە: نەفس شپرز دەبێت کاتێ هەژار دەبێت، هەژاری چاکترە لە دەوڵەمەندییەك زاڵ بێت بە سەریدا، دەوڵەمەندی نەفسەکان ئەوەیە بژێوی رۆژانەت هەبێ، ئەگەر رازی نەبوو ئەوا هەموو سەر زەوی بەشی ناکات، ئەوە رازی بوونە و دەستی پێوە بگری دەبیتە پادشا، ئەگەر هیچ شتێکت نەبێت تەنها ئارامی جەستەت، تەماشای ئەوانە بکە کە بوونە خاوەنی هەموو دونیا، ئایا جگە لە بۆن و کفن هیچی تریان لە گەڵ خۆیاندا برد؟.

ئەوە(هارون الرشید)ە، ئەو سەرکردەیەکی دادپەروەر بوو ساڵێك غەزای دەکرد لە پێناوی خوادا و ساڵێك حەجی دەرکرد... کە بە هەورەکەی دەگوت کاتێ لە چەقی ئاسماندا بوایە پێی دەگوت: ئەی هەورەکە.. لە هەر کوێیەك دەباری بە ئارەزووی خۆت ببارە، دڵنیابە کە داهاتەکەت هەر دەگەڕێتەوە بۆ لای خۆم انشاء الله ..)) مەبەستی فراوانی موڵك و دەوڵەتەکەیەتی لە سەردەمی خۆیدا – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە گەڵ ئەوەیشدا کاتێ لەسەر جێگەی مردن کەوت دەستی بە گریان کرد و فەرمووی: ﴿مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ﴾ الحاقة ٢٨ـ ٢٩، واتە: دارایی و ماڵەکەم هیچ کەڵکێکی پێ نەگەیاندم بۆ ئەم رۆژەم.(٢٨) ئەو موڵك و

دەسەڵاتەی بووم لە دەس چوو نە رشتەم نە پایەوپلەم، هیچیان نەیان توانی تۆزقاڵەیەك ئارامم بکەنەوە (٢٩))). کوا سەروەت و سامان؟ کوا دەسەڵات و سوڵتان؟ کوا موڵکەکان؟ ئەمجار گوتی: دەمەوێت ئەو گۆڕە ببینم کە لە ناویدا دەنێژرێم، ئەوانیش هەڵیان گرت بۆ لای گۆڕەکەی و ئەویش تەماشای کرد و دەستی بە گریان کرد و فەرمووی: ((ئەی ئەو کەسەی کە هەرگیز موڵکەکەی لە ناو ناچێت ڕەحم بکە لەو کەسەی کە موڵکەکەی لە ناوچوو ..))[١].

بە ڕاستی (هارون الرشيد) لە کۆشك و تەلارەکانەوە گوێزرایەوە بۆ گۆڕەکان، لە جێگەی خۆشی خەوتنەوە بۆ گڵکۆکان وە لە یاری کردن لە گەڵ کەنیزەك و منداڵی جواندا بۆ دەرهاوسێتی کرم و مار، سوێند بە خوا ئەگەر بە جوانی بیر لەم قسەیە بکەیتەوە ئەوا ڕێڕەوت دەگۆڕدرێت، چونکە دونیا هەرچەندە درێژە بکێشێ ئەوا هەر کورتە، هەرچەندە خۆی بە مەزن بزانێت ئەوا سووك و ریسوایە، چونکە شەوگار هەرچەندە درێژە بکێشێت ئەوا هەر دەبێ شەبەق دەرکەوێت، ئەگەر تەمەن هەرچەندە درێژە بکێشێ ئەوا هەر دەبێ بچیتە ناو گۆڕەوە، دڵنیا بە کە بە نەمری لە دونیادا نامێنیتەوە، ئەگەر تەنها کەسێك بە نەمری تێدا بمایەتەوە ئەوا خۆشەویست هەڵبژێردراو دەبوو ﷺ.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا جَعَلۡنَا لِبَشَرٖ مِّن قَبۡلِكَ ٱلۡخُلۡدَۖ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلۡخَٰلِدُونَ ﴾ الأنبياء: ٣٤، واتە: ئێمە پێش لە تۆ وامان نەکرد مرۆیەك نەمرێ ئایا ئەگەر تۆ بمری، ئەوانە ژیانی هەتا هەتاییان دەبێ؟! نە، هەرگیز شتی وا نییە)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ ﴾، واتە: هەموو کەسێك بێ جیاوازی تامی مردن دەچێژێ.)).

---

١ـ انظر: ((إحياء علوم الدين)) (٤ /٤٨١)، و ((تاريخ الخلفاء)) للسيوطي (٢٦٨)، و ((تاريخ بغداد)) ((١٤ / ١٩)) للخطيب، و((تاريخ الإسلام))للذهبي (١٦٣٢، ١٨٣٧، ١٨٣٨))، و((البداية والنهاية)) (١٠ / ٣١٠).

* وروى ابن أبي الدنيا في ((المحتضرين)) (١١٧) عن عبدالله بن بسطام قال: ((احتضر بعض الملوك فجعل يقول: يا من لا يزول ملكه أرحم من قد زال ملكه)).

ئەگەر ئەو کورسییە بۆ خەڵکی تر بەردەوام بوایە ئەوا دڵنیابە بە تۆ نەدەگەیشت، سوێند بە خوا هیچ کەسێك بە نەمری تێدا نامێنێتەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ (٢٦) وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾ الرحمن: ٢٧، واتە: هەرچی بە سەر پشتی زەوییەوەیە هەر هەموو لە نێو دەچێ .(٢٦) تەنها ڕووی پەروەردگاری خاوەن شکۆ و کەرەمکەرت دەمێنێتەوە (٢٧))). بۆیە لەم دونیایە بۆ خۆت دار بڕوێنە بۆ ئەوەی لەوێ بە بەختیاری و عیززەت و کەرامەتەوە دروێنەی بکەیت، داوا لە خوا دەکەم کە من و ئێوە بگێڕێ لە ئەهلی خۆشحاڵی لەدونیاو قیامەتدا.

براکەم: بازرگانی بە سپاردەو شەرەفەوە ئەنجام بدە، جا ئەو بازرگانییە هەر بازرگانییەك بێت، هەموو حەقێکی خوای تێدا بدە و هەرگیز ڕەزیلی مەکە و ئەوەشت لە بیر نەچێت کەوا ئەو ڕزق و ڕۆزییەی تۆ لە فەزڵ و چاکەی خوایە بە سەرتەوە، چونکە تۆ کەسێکی هەژار بوویت و خوای گەورە دەوڵەمەندی کردی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ ۖ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ فاطر: ١٥، واتە: ئەی خەڵکینە ! ئێوە هەژارن و نیازتان بە خوا هەیە، ئەو بێ نیاز و سوپاسکراوە هەرچەندە خەڵکی ململانێ بکات(١٥)).

تاکو دوێنی تۆ کەسێکی هەژار بوویت و ئێستا خوای گەورە بە فەزڵی خۆی ئەو نیعمەتەی بە سەرتدا ڕژاندووە و ڕزق و ڕۆزی لە سەرت فراوان کردووە، بۆیە حەقی خوای باڵا دەست بدە و هەرگیز هەژاران و نەدارانت لە بیر نەچێت، داوا لە خوا دەکەم کە فەزڵی خۆی زیاتر بە سەرتدا بڕێژێ .

بە جوانی بیر لەم فەرموودە مەزنە بکەرەوە، کە پێویستە هەردەم دوو بارەی بکەینەوە و هەرگیز لە دووبارە کردنەوەی بێزار نەبین و فەرموودەکە لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەی (أبو هريرە)وە کەوا پێغەمبەری

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب أحاديث الأنبياء، باب حديث أبرص و أعمى و أقرع في بني إسرائيل (٣٤٦٤)، ومسلم، كتاب ((الزهد والرقائق)) (٢٩٦٤).

ئەکرەمﷺ فەرموویەتی: ((إن ثلاثة في بني إسرائيل: أبرص وأقرع وأعمى، فأراد الله عز وجل أن يبتليهم، فبعث إليهم ملكا، فأتى الأبرص، فقال له: أي شيء أحب إليك؟ قال: لون حسن، وجلد حسن، ويذهب عني الذي قد قذرني الناس))، واتە: سێ کەس هەبوون لە بەنی ئیسرائیلدا، گەڕێك و کەچەڵێك و نابینایەك، خوای گەورە ویستی تاقیان بکاتەوە، بۆیە فریشتەیەکی بۆ ڕەوانە کردن و ئەویش هات بۆ لای کابرای گەڕ و پێی گوت: چی شتێك لای تۆ لە هەموو شتێك خۆشەویسترە ؟( واتە: ئاوات بخوازە) گوتی: ڕەنگێکی جوان و پێستێکی جوان و ئەوەی کە بە هۆیەوە خەڵکی بێزم لێ دەکەنەوە لە سەرم نەمێنی و چاك ببمەوە)) ئەمە ئاواتێکە و لە جێی خۆیدایە چونکە ئەو توشی نەخۆشی گەڕی بووە، بۆیە داوای لە خوا کرد کە شیفای بدات و پێستێکی جوانی پێ ببەخشێ، ئەم بەڵایەی کە بە هۆیەوە خەڵکی لێی دوور کەوتوونەتەوە لە سەری نەمێنێ . ((قال: فمسحه فذهب عنه قذره، وأعطي لونا حسنا، وجلدا حسنا ))، واتە: گوتی: بە دەستەکانی سڕی و ئەویش چاك بووەوەو بێزێکەی نەما و ڕەنگێکی جوان و پێستێکی جوانی پێ بەخشرا)) خوای گەورە چارەسەری کرد و چاك بووەوە.

لە گەڵ مندا بیر لەم فەرموودەیە بکەرەوە کە (أحمد و أبو داود)[1] ریوایەتیان کردووە لە فەرموودەی (أبي رمثة) ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((الله الطبيب)) واتە: خوا پزیشکە))، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ﴾ الشعراء: ٨٠، واتە: کاتێ نەخۆش کەوتم، ئەو شیفام ئەدا و هێزی شیفا هەر ئەو دروستی ئەکات)).

تۆ دەچیت بۆ لای پزیشکێك لە پزیشکەکان بۆ ئەوەی هۆکارەکان بگریتە دەست ئەگینا چارەسەر بە دەستی خوای بالا دەستە، ئەوەیشە بزانە کەوا خوای گەورە هیچ نەخۆشییەکی دانەناوە ئیللا چارەسەرەکەی بۆ داناوە بۆیە چارەسەر بگرنە

---

١ ـ أخرجه أحمد (٢ / ٢٢٦، ٢٢٧) (١٦٣/٤)، وأبو داود كتاب الترجل باب في ((الخضاب)) (٤٢٠٧)، والحميدي (٣٨٢/٢)، والطبراني في الكبير (٢٧٩/٢٢)، وصححه الشيخ الألباني على شرط مسلم في ((الصحيحة)) (١٥٢٧).

بەر، بەڵام دڵت پەیوەست مەکە بە هۆکارەکەوە، باش بزانە کەوا هۆکارەکان بە تەنها نە زیانیان هەیە و نەقازانج، رزقش نادەن و رزقش ناگرنەوە ئیللا بە دەستی خوای باڵا دەست نەبێت، خودایە ... داوات لێ دەکەم لەم کات و ساتە پیرۆزەدا کە بە چارەسەرەکەی خۆت چارەسەر دابەزێنە سەر نەخۆشی موسڵمانان و رەحمەت و بەرەکەتی خۆت بکەیتە هۆی نەمانی هەموو ئازار و ناخۆشییەکانیان... یا أرحم الراحمین.

((ثم قال الملك للأبرص: فأي المال أحب إليك ؟))، واتە: ئەمجار فریشتەکە بە کابرای گەڕی گوت: حەز لە چی جۆرە سامانێك دەکەیت ؟))، ((قال: الإبل)) واتە: حوشتر))، خۆشەویستمانﷺ دەفەرموێت: ((فأعطي ناقة عشراء)) ثم قال الملك: (( بارك الله لك فيها )) واتە: حوشترێکی ئاوسی پێ درا (عشراء: ئەو وشترانەیە کە دە مانگ یان هەشت مانگ بە سەر ئاوس بوونیاندا تێپەڕیوە) ئەمجار فریشتەکە گوتی: خوای گەورە بەرەکەت بخاتە سامانەکەتەوە)) بۆیە بەرەکەت رژا بە سەریدا وە ئەگەر دەتەوێ بڵێ: بەرەکەت بەرەکەتی کرد، ئەمجار فریشتەکە چوو بۆ لای کابرای دووەم - ((فأتى الأقرع، فقال: أي شيء أحب إليك؟ قال: شعر حسن، ويذهب عني هذا الذي قد قذرني الناس، قال: فمسحه فذهب عنه وأعطي شعرا حسنا، قال: فأي المال أحب إليك؟ قال: البقر، قال: فأعطي بقرة حاملا، فقال: بارك الله لك فيها ))، واتە: ئەمجار چوو بۆ لای کابرای کەچەڵ و گوتی: چی شتێك لای تۆ لە هەموو شتێك خۆشەویسترە؟ گوتی: قژێکی جوان و ئەوەی کە بە هۆیەوە خەڵکی بێزم لێ دەکەنەوە نەمێنێ، ئەویش بە دەستەکانی سڕی و ئەویش چاك بووەوەو قژێکی جوانی پێ بەخشرا، گوتی: حەز لە چی جۆرە سامانێك دەکەیت؟ گوتی: مانگا (چێل)، گوتی: ئەویش مانگایەکی ئاوسی پێ درا و گوتی: خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ناو سامانەکەتەوە)) وازی لێ هێنا و بە جێی هێشت، ئەمجار فریشتەکە چوو بۆ لای کابرای سێیەم - ((فأتى الأعمى،فقال: أي شيء أحب إليك؟ قال: أن يرد الله إلي بصري فأبصر به الناس، قال: فمسحه فرد الله إليه بصره )) واتە: ئەمجار چوو بۆ لای کابرای نابینا و گوتی: چی شتێك لای تۆ لە هەموو شتێك

خۆشەویسترە؟ گوتی: خوای گەورە چاوەکانم بۆ بگێڕێتەوە و خەڵکی پێ ببینم، گوتی: ئەویش سڕی و خوای گەورە چاوەکانی بۆ گەڕاندەوە)) بەڵێ هەموو کارەکان لە سەرەتا و کۆتاییدا هی خوایە و بە دەستی خوایە .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ الأنعام: ١٧، واتە: ئەو خوایە دەسەڵاتدارێکی وەهایە ئەگەر تووشی هەر جۆرە بەڵاو زیانێکت بکات بە غەیرە خۆی هیچ کەسێ ناتوانێ لای ببا، خۆ ئەگەر خێر و چاکەیەکیشت پێ بگەیەنێت دیارە هەر خۆی بە سەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتدارە و حەز لە هەرچی بکا دەتوانێ ئەنجامی بدا)).

| | |
|---|---|
| يا صاحب الهمِّ إن الهمَّ منفرج | أبشر بخير فإن الفارج الله |
| وإذا بليت فثق بالله وارض به | إن الذى يكشف البلوى هو الله |
| الله يحدث بعد العسر ميسرة | لا تجزعن فإن الخالق الله |
| والله ما لک غير الله من أحد | فحسبک الله فی کل لک الله |

واتە: ئەی خاوەن خەم و پەژارە بزانە کە خەم نامێنی و دەڕوات، موژدە بێ لێت بە خەیرێك چونکە ئەوەی کێشەکان ناهێڵێ تەنها خودایە، ئەگەر توشی بەڵایەك بویت ئەوا باوەڕت بە خوا هەبێت و بە قەدەری ئەو رازی بە، چونکە ئەوەی بەڵاکان لادەدات تەنها خودایە، خوای گەورە لە پاش هەموو تەنگانەیەك خۆشی دەهێنێ، هیچ بێزار مەبە چونکە دروستکەرمان تەنها خودایە، سوێند بە خوا جگە لە خوا هیچ کەست نییە، بۆیە خودات بەسە لە هەموو شتێکدا تۆ خودات هەیە، داوا لە خوا دەکەم دڵی ئێمە و ئێوە پڕ بکات لە تەقوا و رازی بوون وە بمانگەیەنێتە هێدایەت و رێنمویی خۆی و هەر خۆی پشت و پەنامانە.

((ثم قال الملك للأعمى: فأي المال أحب إليك؟قال الغنم: فأعطي شاة والدا))، واتە: ئەمجار فریشتەکە بە کابرای نابینای گوت: حەز لە چی جۆرە سامانێك دەکەیت؟ گوتی: مەڕ، گوتی: ئەویش مەڕێکی ئاوسی پێدا)) ئەمجار وازی لێ هێناو بە جێی هێشت ((فأنتج هذان وولد هذا))، واتە: ئەو دووانەی پێشوو بەرهەمییان

زیادی کرد و ئەویتر بێچووی زۆری بوو))، ((فکان لهذا واد من الإبل، ولهذا واد من البقر، ولهذا واد من الغنم)) واتە: پاشان ئەمیان پڕ دۆڵێك حوشتری بوو وە ئەمیش پڕ دۆڵێك مانگای بوو ئەویش پڕ دۆڵێك لە مەڕ)، بەڵام ئاگاداری تاقیکردنەوەکان بە، خوایە گیان بمانپارێزەو رزگارمان بکە... ((ثم إنه أتى الأبرص في صورته وهيئته، فقال: رجل مسكين قد انقطعت بي الحبال في سفري، فلا بلاغ لي اليوم إلا بالله ثم بك، أسألك بالذي أعطاك اللون الحسن، والجلد الحسن، والمال، بعيرا أتبلغ عليه في سفري، فقال: الحقوق كثيرة))، واتە: پاشان هات بۆ لای کابرای گەڕ لە شێوە و وێنەی خۆی، گوتی: کابرایەکی هەژارم و هەموو رێگاکان لە سەفەرەکەمدا لێ براوە و هیچ دالّدەیەکم نییە تەنها لای خوا و ئەمجار لای تۆ نەبێت بۆیە داوات لێ دەکەم لە بەر خاتری ئەو کەسەی ئەو رەنگە جوانە و ئەو پێستە جوانە و ئەو سامانەی پێداوی کە وشترێکم پێ بدە بۆ ئەوەی لە سەفەرکەمدا بە کاری بیهێنم، ئەویش گوتی: خەڵکی رەواتر زۆرن)).

ئا بەم شێوەیە مرۆڤەکان بنەڕەتی خۆیان لە بیر دەچێت! هەژاری و لاوازی و بێ دەسەڵاتی خۆی لە بیر دەچێت! جا ئەمەیشە بە ڕاستی کارەساتە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ﴾ الإنفطار:٦، واتە: ئەی ئادەمیزاد... ! چی تۆی تەفرە و فریوداو بەرامبەر بە پەروەردگاری بەخشندەت کافر بوویت لە گەڵ ئەو هەموو نیعمەت و بەخششانەدا ؟)) ئایا هەژاری خۆت لە بیر چوو؟ ئایا ئەصل و بنەڕەتی خۆت لە بیر چوو؟ ئایا نەفامی خۆتت لە بیر چوو؟.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ﴾فاطر: ١٥، واتە: ئەی خەڵکینە! ئێوە هەژارن و نیازتان بە خوا هەیە، ئەو بێ نیاز و سوپاسکراوە هەرچەندە خەڵکی ململانێ بکات)).

هەر کەسێك خودای خۆی ناسی ئەوا خۆیشی دەناسێ، ئەگەر هەر کەسێك خودای خۆی بە دەوڵەمەندێکی رەها ناسی ئەوا خۆی بە هەژارێکی رەها دەناسێ... هەر کەسێ خواکەی خۆی بە عیززەتێکی تەواوەوە ناسی ئەوا خۆی بە

زەلیلێکی تەواوەوە دەناسیٚ، هەر کەسیٚ خواکەی خۆی بە خاوەن هێزێکی تەواوەوە ناسی ئەوا خۆی بە لاوازێکی تەواوەوە دەناسیٚ . سوێند بە خوا هیچ دروستکراوێك لەسەر رووی زەویدا خاوەنی هیچ شتێك نییە، ئەوەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوی لەو هەموو ناز و نیعمەت و بارزگانییە و ئەو هەموو رزق و رۆزییە لە فەزڵ و چاکە و منەتی خوایە بە سەرتەوە و هەموو ئەوانە پێویستیان بە سوپاسگوزارییە، سوپاسگوزاریش تەنها وشەیەك نییە و تەنها ماچێکی دەستەکان نییە ! نەخێر هەرگیز وا نییە . خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱعۡمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكۡرٗاۚ﴾ سبأ: ١٣، واتە: وتمان: ئەی بنەماڵەی داوودعليه السلام! سوپاسگوزاری بکەن لە بەرامبەر ئەو هەموو بەهرانەدا رشتوومە بە سەرتاندا)) بۆیە ئامان هەرگیز هەژاری خۆت و فەزڵی خوات بە سەرەوە لە بیر نەچێت، کاتێ کابرا گوتی: خەڵکی رەواتر زۆرن، فریشتەکە پێی گوت: ((كأني أعرفك، ألم تكن أبرص يقذرك الناس، فقيرا فأعطاك الله؟ فقال: إنما ورثت هذا المال كابرا عن كابر))، فقال: إن كنت كاذبا فصيرك الله إلى ما كنت))، واتە: دەڵێی من تۆ دەناسم؟ ئایا تۆ کەسێکی گەڕ نەبوویت و خەڵکی بێزی لێت دەکردەوە، هەژار بوویت و خوا پێی بەخشی؟ گوتی: بەڵکو من ئەم سامانەم لە باوباپیرە گەورە بەرێزەکانەوە و ئەوانیش لە گەورە بەرێزەکان بۆم بە جێ ماوە)) (تەمشای ئەم نکۆڵییە بکە) گوتی: ئەگەر درۆ دەکەیت ئەوا خوای گەورە بتگێڕێتەوە سەر حاڵی جاران)) جا وەکو پێشووی لیٚ هاتەوە ولا حول ولا قوة الا بالله. هەروەکو چۆن خوای گەورە لە جاری یەکەمدا وڵامی دوعای فریشتەکەی دایەوە ئەوا لە جاری دووەمیشدا وڵامی دوعاکەی دایەوە، بۆیە وەکو جارانی لیٚ هاتەوە و هەموو شتێکی لە دەست دا: پێستی جوان، دیمەنی جوان جارێکی تر توشی نەخۆشی گەڕی بووەوە وە هەموو حوشترەکانی لە دەستدا! ! بۆیە ئاگادارت دەکەمەوە لە سامانی حەرام، چونکە سەروەت و سامان وەکو سێبەرێك وایە و نامێنیٚ، وەکو قەرزێکە و دەبیٚ بگێڕدرێتەوە، ئاگاداری خواردنی سامانی هەتیوان بە، ئاگاداری ئەوە بەهەرگیز سامانی خەڵکی بە ساختە و ناڕەوا مەخۆ، هەرگیز قۆرخی بازار مەکە، بۆئەوەی زاڵ بیت بە سەر نرخی بازاردا و

خوێنی هەژاران و نەداران بمژیت! ئێستا لە ناو خەڵکیدا کەسی وا هەیە ئەگەر تاکو ماوە لە ژیاندا پارەی (بنکنوت) بخوات ئەوا ئەو سامانە تەواو نابێت! ولا حول ولا قوة الا بالله، سوێند بە خوا هەرگیز ئەو سامانە سوودی لێ نابینیت و هەمووی بۆ وەرەسەکەت بە جێ دەهێڵی، لێرەدا هەندێ کەس هەن قسەی ترسناك دەکەن و دەڵێن: ئەگەر خوا لە فلان کەس رازی نەبوایە ئەوا رزقی فراوان نەدەکردەوە! بەڵگەی رازی بوونی خوا لەسەر فلان ئەوەیە کە بەو هەموو سامانە رێزداری کردووە!! جا من دەڵێم: نەخێر... براکەم... ئەمە بەڵگە نییە، ئایا تۆ (قارون) ت لە بیر چوو؟ ئەوەی کە خوای گەورە بە شێوەیەکی وا سەروەت و سامانی پێدابوو کە هەرگیز هیچ عەقڵێك باوەڕ ناکات . بیهێنە پێش چاوی خۆت کۆمەڵێك گەنجی بەهێز ناتوانن کلیلی گەنجینەکانی قارون هەڵبگرن!! لێرەدا قارون قسەکەی کابرای گەڕی گوت بەڵام بە دەستەواژەیەکی قارونییانە کاتێ یادی خرایەوە بەو فەزڵەی خوای گەورە بە سەرییەوە و بەو هەموو نیعمەتانە، ئەو قسەیەکی زۆر پیسی گوت کە لەسەر زمانی زۆربەی خەڵکی دووبارە دەکرێتەوە: ﴿إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ﴾ القصص: ٧٨، واتە: قارون گوتی: ئەو ماڵ و سامانە کە من هەمە، هەمووی بە هۆی زانیاری و زانستی خۆمەوە پێم دراوە، واتە هەر خۆم شایستەی ئەوەم).

ئەوە هەمان ئەو قسەیەیە کە ئێستا و لەم سەردەمەدا دووبارە دەکرێتەوە (فن الادارة) واتە: هونەری کارگێری یان هونەری بەرێوەبردن!) من دەڵێم: زۆر جوانە ئەگەر تۆ هونەری کارگێڕیت هەبێت، بەڵام هەرگیز ئەو کارە مەگێڕەوە بۆ عەقڵی خۆت و فەزڵی خۆت، سوێند بە خوا تۆ لاوازیت، هەمووومان هەژارین، خاوەنی هیچ شتێك نین، چونکە ئەوەی پێت دراوە هەمووی لە فەزڵی خوای گەورەیە، بۆیە هەرگیز مەڵێ: ﴿إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ﴾ هەرگیز مەڵێ: ئەمە هونەری کارگێڕییە! مەڵێ: کارگێڕییەکی یەکلایی کەرەوەیە،! بەڵێ... ئەوەی کە لەسەر تۆیە ببیتە کەسێکی موسڵمانی بەهێزی داهێنەری بەرهەمهێنەری چاك لە هەموو بوارەکانی ژیان، لە هەموو جێگایەکدا لە ژێر سێبەری ئەو ئاسمانەدا، لەسەر هەر

پارچەیەکی ئەم زەوییە، بەڵام هەرگیز فەزڵی خوات لە بیر نەچێت بە سەرتەوە وە بزانە ئەوەی کە تۆ ئێستا تێدای لەو ناز و نیعمەتە هەموو تەنها فەزڵی خوای بەرز و باڵادەستە ئەو کەسەی کە هەردەم پارە لە ڕێگای حەرامەوە کۆ دەکاتەوە و دەبینی سامانەکەی زیاد دەکات ئەوا نزیککردنەوەیە (استدراج) لە لایەن خوای گەورەوە.

هەروەکو لە(مسند)[١]ەکەی ئیمامی ئەحمەد و جگە لەو هاتووە لە فەرموودەی (عقبەی کوڕی عامر)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إذا رأيت الله يعطي العبد من الدنيا على معاصيه ما يحب، فإنما هو استدراج " ثم تلا رسول الله ﷺ: ﴿فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ﴾ الأنعام: ٤٤، واتە: ئەگەر بینیت خوای گەورە نیعمەتەکانی خۆی دەداتە بەندەیەکی لە دونیادا لەسەر سەرپێچییەکانی کە خۆی پێی خۆشە بزانە کەوا ئەوە نزیککردنەوەیە (استدراج) ئەمجار پێغەمبەری خواﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ﴾ الأنعام: ٤٤، واتە: جا کە ئەو هەموو ئامۆژگارییەیان لە بیرخۆ بردەوە کە لەسەر زمانی پەیامبەران کرابوون ئینجا ئێمەیش بۆ خەفڵاندونیان و وەك ((إستدراج) ێکیش، دەروازەی هەموو خێرێکمان بۆ واڵا کردنەوە و رزق و رۆزییەکی فرەمان رشت بە سەریاندا و ئەوانیش خۆشی و نیشوە گرتنی هەتا بەو ماڵ و منداڵەی پێماندابوون دەعیەو فیزگرتنی و لەرێی راست لایاندا ئەوسا ئێمەیش کتوپڕێك قارمان لێ گرتن و ئەوانیش لەو هەموو خۆشگوزرانییە بێ هیوا و نائۆمێد بوون)).

لێرەدا خوای گەورە نەیفەرموو: تۆڵەمان لێیان سەندەوە، نافەرموێت: کردمانە ناخی زەویدا، نافەرموێت: هەموو سامانەکەم لێیان سەندەوە، بەڵکو دەفەرموێت:

---

١ ـ أخرجه أحمد(١٤٥/٤)، والطبراني في ((الأوسط)) (٩٢٧٢)، والبيهقي في ((الشعب))(٤٥٤٠)، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (٤١٣) و ((صحيح الجامع)) (٥٦١).

((فتحنا علیهم أبواب كل شيء)).

بەڵام... چەندەها كەس هەن ئێستا لە ئیستدراجان لە نێو نیعمەتەكانی خوای گەورەدا و كەچی خۆیشی لێی بێ ئاگایە و نازانێت، چەندەها كەس توشی تاقیكردنەوە هاتوون بە مەدح كردنی خەڵكی و خۆیشی لێی بێ ئاگایە ! !

پرسیارە گرنگەكە لێرەدا ئەوەیە: چۆن بزانم ئەو سامانەی ئێستا هەمە ئایا لە نیعمەتەكانی خوایە یان لە تۆڵەسەندنەوەكانییەتی؟ ترمومترێكی جوان و ورد و بچووك دەتوانیت لە گەڵ خۆتدا و لە گیرفانتدا هەڵگریت، دەتوانیت لە هەموو ساتێكدا هەر نیعمەتێكی پێ بپێوی، خێراكە برا خۆشەویستەكەم ئەو نیعمەتەی كە ئێستا لە بەر دەستتدایە بیهێنە، سەروەت و سامان، خێزان، منداڵ، پلەو پایە، كورسی، رووی كۆمەڵایەتی، لەشساغی، جوانی، دەتوانیت بزانیت ئایا ئەوانە نیعمەتن یان تاقیكردنەوەن، بە سووك و ئاسانی، دەڵێم: ئەگەر ئەو نیعمەتە لە خوا نزیكی كردیتەوە ئەوا سوژدە بۆ خوا بەرە و سوپاسگوزاری بەو بزانە ئەوە نیعمەتە، بزانە ئەوە لە فەزڵی خوایە، ئەگەر ئەو نیعمەتە لە خواردنی حەڵاڵ و لە خوای گەورە دووری كردیتەوە ئەوا باش بزانە كە تاقیكردنەوەیە بەڵام لە پۆشاكی نیعمەتتدایە وە بزانە ئەوە فیتنەیە ! لە پۆشاكی بەخشیندایە، ئایا ئەم پلە وپایە لە خوا نزیكی كردمەوە یان دووری كردمەوە؟ بووە هۆی ئەوەی من و نوێژ لە یەك جی بكاتەوە و بووە هۆی ئەوەی من و خەڵكی لە یەك بكات، ئایا من ئەم كورسییەم بە كار هێناوە بۆ نەهێشتنی كێشە لەسەر كێشەداران؟ ئایا ئەم پلە و پایەم بە كار هێناوە بۆ نەهێشتنی خەم لەسەر خەمباران؟ ئایا جێگا و رووە كۆمەڵایەتییەكەم بە كار هێناوە لە جێی خۆیدا؟

تۆ ئەی خوشكی بەرێزم ئایا پلە و پایەی پیاوەكەت بە كار هێناوە؟ ئایا رووە كۆمەڵایەتی پیاوەكەت بە كار هێناوە بۆ ئەنجامدانی چاكە؟ ئایا هانی دەدەی بۆ ئەنجامدانی كاری چاكە؟

براكەم ... هەموو وزە و تواناكەت بە كار بهێنە، هەموو سەروەت و سامانەكەت، خێزان و كچ و كوڕەكانت، هەموو ئەوەی كە هەتە بە كاری بهێنە لە پێناوی دینی خوای باڵادەستدا، بە راستی قازانجی راستەقینە لەوێیە وە بە راستی ئەوە كێڵگەی

ڕاستییە، ئەمە ناشتن و ڕواندنی ڕاستەقینەیە، ئەمە چەند قسە و گوتەیەکە لێرەدا هێنامەوە داوا لە خوا دەکەم کە سوودی بۆ ئێمە و ئێوە هەبێت.

لە گەڵ مندا جارێکی تر بگەڕێوە بۆ فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:

((وأتى الأقرع في صورته، فقال له مثل ما قال لهذا، ورد عليه مثل ما رد على هذا، فقال: إن كنت كاذبا فصيرك الله إلى ما كنت، قال: وأتى الأعمى في صورته وهيئته، فقال: رجل مسكين وابن سبيل انقطعت بي الحبال في سفري، فلا بلاغ لي اليوم إلا بالله، ثم بك، أسألك بالذي رد عليك بصرك شاة أتبلغ بها في سفري، فقال: قد كنت أعمى فرد الله إلي بصري، فخذ ما شئت، ودع ما شئت، فوالله لا أجهدك اليوم شيئا أخذته لله))، واتە: ئەمجار هات بۆ لای کابرای کەچەڵ لەسەر شێوەی خۆی، ئەوەی کە بە کابرای پێشوو گوت بە ئەمیشی گوت، ئەویش وەکو کابرای پێشوو وەڵامی دایەوە، ئەویش گوتی: ئەگەر درۆ دەکەیت ئەوا خوای گەورە بتگێڕێتەوە سەر حاڵی جاران، گوتی: ئەمجار هات بۆ لای کابرای نابینا لەسەر شێوەو دیمەنی خۆی گوتی: کابرایەکی هەژارو ڕێبوارم و هەموو ڕێگاکانم لێ بڕاوە لە سەفەرکەمدا و هیچ دالّدەیەکم نییە تەنها لای خوا و ئەمجار لای تۆ نەبێت بۆیە داوات لێ دەکەم لە بەر خاتری ئەو کەسەی کە چاوەکانی بۆ گێڕایەوە مەڕێکم پێ بدە بۆ ئەوەی لە سەفەرکەمدا بە کاری بهێنم، ئەویش گوتی: من کەسێکی نابینا بووم و خوای گەورە چاوەکانی بۆ گەڕاندمەوە بۆیە هەرچی دەبەی ببە و هەرچی بە جێ دەهێڵی ئەوا بە جێی بهێڵە سوێند بە خوا هەرگیز ڕێگات لێ ناگرم لە بەر خوا هەرچی ببەی))، ئەم کابرایە گەڕایەوە بۆ ڕەسەن و نەژادی خۆی، فەزڵی خوای لە بیر نەچوو بۆیە لە دونیا و دوارۆژدا سەرکەوتوو و بەختیار بوو، گوتی: ((ودع ما شئت، فوالله لا أجهدك اليوم شيئا أخذته لله))، واتە: هەرچی بە جێ دەهێڵی ئەوا بە جێی بهێڵە سوێند بە خوا هەرگیز ڕێگات لێ ناگرم لە بەر خوا هەرچی ببەی))، بۆیە فریشتەکە گوتی: ((أمسك مالك، فإنما ابتليتم، فقد رضي عنك، وسخط على صاحبيك)) واتە: دەست بە سامانی خۆتەوە بگرە، بزانە کە ئێوە تاقی کرانەوە، جا خوای گەورە لە تۆ ڕازی بوو وە لە دوو هاوەڵەکەت پەست بوو)).

جا سەروەت و سامان سێبەرێکە و نامێنێ، بۆیە کار بکە و قازانج بکە بەڵام بە شەرەف و سپاردە و راستگۆیی یەوە، لە بازرگانییەکەتدا هەموو شتێك روون بکەرەوە و ساختە مەکە، من کابرایەکم ڕەنگە لەم بازرگانییە تێنەگەم بۆیە براکەم تۆ ڕاستم لە گەڵدا بکە... راستیمان دەوێت لە ژیاندا، بە راستی لەم سەردەمەدا مامەڵە کردن پڕ بووە لە تاڵی و ئازار، زۆربەی ئەم رێزدارانە دەیانەوێت مامەڵە لە گەڵ ئەهلی سپاردەدا بکەن، لە گەڵ ئەهلی راستگۆییدا لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، بەڵام کارەکە تەنها ئەوەندەی دەوێت کە وێژدانمان لەو خەوە هەڵسێنین.

پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیار لە هاوەڵانی دەکات- هەروەکو لە (صحیح البخاری)[1] دا هاتووە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی مسعود)ەوە- پێیان دەفەرموێت: ((أیکم مال وارثه أحب إلیه من ماله؟ قالوا: یا رسول الله، ما منا أحد إلا ماله أحب إلیه. قال ﷺ: ((فإن ماله ما قدم، ومال وارثه ما أخر))، واتە: کام لە ئێوە سامانی میراتگرەکەی لە سامانەکەی خۆی خۆشتر دەوێت؟ فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ کەسێك لە ئێمە نییە وە هەموومان سامانی خۆمان لا خۆشەویسترە، فەرمووی: کەواتە سامانەکەی خۆی ئەوەیە کە پێشی خۆی دەخات و سامانی میراتگرەکەی ئەوەیە بە جێی دەهێڵێ)).

جا بزانە زۆربەی ئەو سامانانەی کە لە رێگای حەرامەوە کۆ دەکرێنەوە بۆ وەرەسە بە جێ دەهێڵرێ، بەندەکە لە بەر دەستی خوای گەورەدا پرسیاری لێ دەکرێت.

لە(صحیح مسلم)[2] دا هاتووە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی الشخیر)ەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((یقول ابن آدم: مالي مالي، قال: وهل لك، یا ابن آدم من مالك إلا ما أکلت فأفنیت، أو لبست فأبلیت، أو تصدقت فأمضیت ؟)).

بەڕاستی ئەوە سامانی راستەقینەیە کە لە ڕێگای حەڵاڵەوە کۆت کردووەتەوە... بە ئارەقە و کۆشش و یارمەتی خوای گەورە وە حەقی خوای گەورەت لێ

---

١ ـ أخرجه البخاري کتاب الرقاق ((باب ما قدم من ماله فهو له)) (٦٤٤٢).

٢ ـ أخرجه مسلم، کتاب ((الزهد والرقائق)) (٢٩٥٨).

دەرهێناوە ئەمە ئەو سامانەیە کە بە هۆیەوە لە دونیا و دوارۆژدا بەختیار دەبیت.

براکانم: حەز دەکەم ئەم بەشە بە هەڵویستێکی جوان کۆتایی پێ بهێنم رەنگە لە پێشان باسم کردبێت بەڵام نابێتە کێشە ئەگەر جارێکی تر دووبارەی بکەمەوە، داوا لە خوا دەکەم من و ئێوە لەسەر گوێڕایەڵی و ڕازی بوونی خۆی بهێڵێ.

کابرایەك لە شاری (المنصورە) دڵی توشی نەخۆشی هاتبوو (خودایە چارەسەری نەخۆشی موسڵمانان بکە) رۆیشت بۆ (لندن) بەمەبەستی پشکنین و چارەسەرکردن، پاش تێڕوانینی ئەشیعە و پشکنینەکان پێیان گوت: تۆ پێویستت بە ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەکی بە پەلە هەیە بە مەبەستی فراوان کردنی خوێنبەرێك کە پێی دەڵێن: دڵە خوێنبەر (الشريان التاجي)، گوتی: هەرگیز نارازی نیم، ئەمجار داوای یارمەتی کرد لە پزیشك و سەرپەرشتیارانی چارەسەرەکەی کە رێگەی بدەن بگەڕێتەوە بۆ میسر، پێی گوتم: بیرم کردەوە بگەڕێمەوە بۆمیسر بۆ ئەوەی وەسێت بکەم وکارەکانم رێك بخەم و لەدڵی خۆمدا گوتم: هیچ کەسێك زامنی مردن و ژیان ناکات، جا منیش گەڕامەوە بۆ میسر و هەموو کارەکانم رێکخست و هەموو وەزع و حاڵی خۆمم رێکخست، پێش ئەوەی سەفەر بکەم بە چەند رۆژێکی کەم، لە کاتێکدا من لە گەڵ یەکێ لە هاوەڵانمدا دانیشتووم، تەماشای رووی پێشەوەم دەکرد، قەسابێکم بینی، پیرەژنێك سەرنجی راکێشام، هەر کاتێك پارچە ئێسکێك لە دەستی قەسابەکە بەربێتەوە سەر زەوی، یان پارچە بەزێك ئەوا ئەو ئافرەتە هەڵیدەگرێت و لە کیسەیەکی دەنا، جار بە جار تەماشام دەکرد بینیم کارەکەی دووبارە دەبێتەوە، منیش دەرچووم، گوتم: وەرە دایە گیان لێرە چی دەکەیت؟ ئافرەتەکە گوتی: سوێند بە خوا کوڕی شیرینم من خاوەنی شەش کچم بۆ ماوەی هەشت مانگە دەبێت گۆشتیان نەخواردووە، جا منیش ئێستا ئەم پارچە ئێسك و بەزەیان بۆ کۆ دەکەمەوە !! کابرا دەڵێ: بە راستی قسەکانی زۆر کاریگەریان لە سەرم بوو، چونکە ئێمە هەموو رۆژێك گۆشت فڕێ دەدەین، بە ئافرەتەکەم گوت: چەند کیلۆ گۆشتت پێویستە؟ گوتی: نیو کیلۆ کوڕی شیرینم.... کابرا دەڵێت: بە قەسابەکەم گوت: دوو کیلۆ گۆشتی بۆ ببڕە، ئەویش دوو کیلۆ گۆشتی بۆ بڕی، دەڵێت: سبحان الله... ! لەو کاتەدا کە لە بەر دەستی قەسابەکەدا ڕاوەستابوو

خوای گەورە نایە دڵم و بە قەسابەکەم گوت: ئەم ئافرەتە بەڕێزە هەموو هەفتەیەك دێت بۆ لات تۆیش دوو کیلۆ گۆشتی بدەیە، منیش پارەی یەك ساڵ پێشەکیم پێدا، دەڵێت: سوێند بەخوا ئەی مامۆستا ئافرەتەکە هەردوو ئەژنۆی خستە سەر زەوی و سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە لە خوای گەورە پاڕایەوە بە چەند وشەیەك، دەڵێت: بە ڕاستی بە چەند وشەیەك دوعای بۆ کردم کە دڵمی لە بن دەرهێنا، خۆم پێ ڕانەگیرا و دەستم بە گریان کرد، تۆیش باش دەزانی کە دوعای دایکە بەریزەکان چۆنە، خاوەنی ئەو فیترەتە پاك و بێ گەردانە، پارانەوەیەك دڵەکەکان دەردەهێنێ،سبحان الله! بە گریانەوە گەڕامەوە بۆ لای هاورێکەم، لە کاتێکدا ئەو دیمەنە زۆر کاریگەری لە سەرم هەبوو، بەڵام لە ناخمدا هەستم بە سنگ فراوانی و خۆشییەکی زۆر کرد.

گەڕامەوە بۆ ماڵ لەکاتێکدا من کەسێکی دڵ نەخۆشم، گەڕامەوە من زۆر چست و چالاکم، سوێندی بۆ خواردم و گوتی: سوێند بە خوا ئەگەر بە منیان بگوتایە دیوارێك بروخێنە ئەوا دەمڕوخاند، دەڵێت: کاتێك چوومە ژوورەوە بۆ ماڵی خۆم کچەکەم دەرگای بۆ کردمەوە کاتێك تەماشای کرد گوتی: ما شاء الله... رووت بە کەسێکی دڵ نەخۆش ناکات!! دەڵێت: منیش بە ئەوم گوت (لە کاتێکدا من دەگریام): سوێند بە خوا کچی خۆم کارێکی ئاوا روویدا، هەموو باسەکەم لە گەڵ پیرەژنەکەدا بۆ گێڕایەوە، دەڵێت: کچەکەشم دەستی بە گریان کرد و سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوەو گوتی: خودایە...! پەروەردگاری ئێمە...! بە چاکبوونەوەی باوکم دڵخۆشمان بکە هەروەکو چۆن باوکم دڵی ئەو پیرەژنە و کچەکانی خۆش کرد، خوای گەورە وڵامی دوعاکانی دایەوە، دەڵێت: سوێند بەخوا رۆژی یەکەم و دووەم و سێیەم تێپەڕی هەست بە هیچ ئازارێك ناکەم، هەست بە هیچ دابەزینێك ناکەم!! بەڵام خێزانەکەم سوور بوون لەسەر ئەوەی سەفەر بکەم بۆ لندن بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەکە، دەڵێت: منیش لەو کاتەدا دەستم بە گریان کرد، دەڵێی لە پێش ئەوە هەرگیز نەگریاوم، ئەو پزیشکەی کە سەرپەرشتی نەشتەرگەرییەکەی دەکرد بە پەلە پشکنینەکانی بۆ دووبارە دەکردمەوە، کە پشکنینەکەی دووبارەی

کردەوە، تەماشای کردم و گوتی: چی ڕوویداوە؟ زۆر سەرسام بوو و گوتی: هەموو ئەشیعەکانم بۆ ئامادە بکەن، ئەم کابرایە لە فلان جێگەی دڵیدا تەنگییەك هەیە لە خوێنبەرەکانیدا، تکایە ئەشیعەکەی بۆ دووبارە بکەنەوە ئەوانیش دووبارەیان کردەوە بینیان ئەو جێگەیەی کە تەنگە و پێویستی بە نەشتەرگەری هەیە ئێستا بە هیچ شێوەیەك پێویستی پێ نییە!! بۆیە پزیشکەکە هاواری کرد و گوتی: چیت کردووە؟ گوتی: منیش دەستم بە گریان کرد و گوتم: بازرگانیم لە گەڵ خوای باڵادەستدا کرد و ئەویش چارەسەری کردم و شیفای دام.

جا ئەگەر بازرگانییەکە لە گەڵ خوادا بوو ئەوە بازرگانییەکی بە سوود و قازانجە، بۆیە خێراکە لە گەڵ خوادا بازرگانی بکە بە یارمەتی هەژاران و نەداران و هەتیوان و بێوەژنان و قوتابییە هەژارەکانی زانست و زانیاری و ئەو کەسانەی کە تەنها پارووپەکی خواردن شك نابەن لە فلسطین و عێراق و صومال و ئەفغانستان و سودان و هەموو جێگایەکی، بەڵکو لە گوندەکەی خۆتدا و شار و جێگەکەت، بۆیە خێراکە و پارە ببەخشە و لە گەڵ خوادا بازرگانی بکە.

داوا لە خوا دەکەم هەموو کردەوە چاکەکانی ئێمە و ئێوە وەرگرێت و لە تاوانەکانی من و ئێوە خۆش بێت وە ژیانمان بە ئیمانەوە کۆتایی پێ بهێنێ.

# نزیك بوونەوەی بازارەكان و بڵاو بوونەوەی سوو خواردن و خوارادنەوەی مەی

لەنیشانەكانی قیامەت ((نزیك بوونەوەی بازارەكان))ە، جا پێغەمبەری خواﷺ باسی كردووە لە فەرموودەیەكدا كە ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی كردووە لە (مسند)ە كەیدا و جگە لەو بە سەنەدێكی (صحیح)[١] لە فەرموودەی (أبو هريره) وە كەوا خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: ((لا تقوم الساعة حتى تتقارب الأسواق)) واتە: قیامەت روونادات تاوەكو بازارەكان لە یەك نزیك نەبنەوە)).

ئایا مانای نزیكبوونەوە چییە؟ نزیك بوونەوە دوو مانای هەیە:

مانای یەكەم : بە راستی بازارەكان لە یەك نزیك بوونەتەوە بە هۆی زۆر بوون و خێرایی هۆیەكانی گواستنەوەوە تۆ ئێستا دەتوانیت بە فەزڵی خوا سواری ئۆتۆمبیلەكەت ببی و بڕۆیت بۆ هەر بازارێك لە گوندەكەت یان لە شارەكەت یان ناوەندەكەت یان لە وڵاتەكەتدا و لە هەمان رۆژدا بگەڕێیتەوە هەرچەندە سەفەركردن لە پێشان مرۆڤ ئەو رێگایەی بە چەند مانگێكی دوور و درێژ دەبڕی بەڵكو ئێستا دەتوانیت سەفەر بكەیت بۆ نمونە لە وڵاتی میسرەوە بۆ سعودیە یان بۆ دوبەی بۆ ئەنجامدانی هەر كارێك و لە هەمان رۆژدا بگەڕێتەوە -ئەگەر بتەوێت- یاخود بۆ رۆژی دواتر، بەڵكو دەتوانیت سەفەر بكەیت بۆ هەر وڵاتێكی جیهان وە لە چەند رۆژێكی كەمدا بگەڕێیتەوە كەچی لە پێشان ئەو رێگایانە بە چەند مانگێك دەبڕا بەڵكو بە چەند ساڵێك بەڵام ئێستا و لەم سەردەمەدا بازارەكان بەم شێوەیە لە یەك نزیك بونەتەوە.

ئەمەیشە بورصەی جیهانییە، ئێستا دەتوانیت نرخی هەر شمەكێك بزانیت یان نرخی هەر دراوێك لە هەموو كاتژمێرێكدا یان كەمتر لە كاتژمێرێك، تەماشای ئەم

---

١ـ أخرجه أحمد(٢/٥١٩)،وابن حبان في ((صحيحه)) (٦٧١٨)، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (٢٧٧٢)

نزیك بوونـەوە بکـە ...نزیـك بوونـەوە لـە بازارەکانـدا ... نزیـك بوونـەوەی زانـینی نرخـەکان، نزیـك بوونەوەیـەکی راسـتەقینەی هەسـتکراو، ئەمەیـشە نیـشانەیەکە و پێغەمبەری خۆشەویستﷺ باسی بۆ کردووین وە لە پێشدا باسی ئەوەم کرد کەوا مەرج نییە هەر نیشانەیەك لە نیشانەکانی قیامەت حەرام بێت، جا مەبەست لە باسکردنی هەر نیشانەیەك بەڵگەی حەرام بوونی ئەو نیشانەیە نییە لە دینی خوای گەورەدا .

مانای دووەم: لە ماناکانی نزیك بوونەوە: سستی بازرگانی و بێ بازاری (کساد التجارة)[1]

لەگەڵ مندا بیر لەم نیشانە ترسناکە بکەرەوە کەوا ئەویش: بڵاو بوونەوەی سوو خواردنە، داوا لە خوا دەکەم ئێمە و ئێوە لە زۆر و کەمی سوو خواردن پاك بکاتەوە.

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت – هەروەکو لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە (الطبراني) و جگە لەو ریوایەتیان کردووە بە سەنەدێکی (صحیح)[2] لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی مسعود) ەوە–: ((بین یدي الساعة یظهر الربا)) واتە: لە بەر دەستی قیامەتدا زۆر بوون و بڵاو بوونەوەی سوو خواردنە))، مانای(الظهور) لێرەدا زۆر بوون و بڵاوبوونەوەیە، و لا حول ولا قوه الا بالله.

لە ڕیوایەتێکی تردا کە زۆر ترسناکە و لە (صحیح البخاری)[3] دا هاتووە لە فەرموودەی (ابو هریره)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((لیأتین علی الناس زمان لا یبالي المرء بما أخذ المال أمن حلال أم من حرام)) واتە: ڕۆژگارێك بە سەر خەڵکیدا دێت خەڵکی بایەخ بەوە نادەن کە سامانەکەیان لە ڕێگای حەڵاڵەوە یان لە ڕێگای حەرامەوە کۆکردبێتەوە)).

---

١ـ انظر: ((الدر المنثور)) للسیوطي (تفسیر سورة محمد: ١٨).

٢ـ أخرجه الطبراني في ((الأوسط)) (٧٦٩٥، ٨١٥٨)، وقال الهیثمي في ((المجمع)) (١١٨/٤): ((رواه الطبراني في الأوسط و رجاله رجال الصحیح))، وصححه الشیخ الألباني في ((الصحیحة)) (٣٤١٥ /٢).

٣ ـ أخرجه البخاري کتاب البیوع باب قول الله تعالى:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأْكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضْعَٰفًا مُّضَٰعَفَةً ﴾ آل عمران: ١٣٠، (٢٠٨٣).

خۆشەویستانم... بە ڕاستی ئەمە واقیعێکی زۆر ترسناکە، زۆربەی خەڵکی تێدا دەژین لەسەر ئاستی مرۆڤایەتی بە گشتی و لەسەر ئاستی ئەم ئوممەتە بە تایبەتی.

باسی کێشەی سوو خواردن دەکەین و، پاشان دەگەڕێینەوە سەر باسی ئەم فەرموودەیە، چونکە ئەمە شێوەیەکە لە شێوەکانی خواردنی سامان لە ڕێگای حەرامەوە، گرنگ ئەوەیە پارە کۆبکاتەوە هەرچەندە ئەو ڕێگایە حەرام بێت!!

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((فوالله ما الفقر أخشى عليكم ولكني أخشى أن تبسط عليكم الدنيا كما بسطت على من قبلكم، فتنافسوها كما تنافسوها، وتهلككم كما أهلكتهم)) واتە: سوێند بە خوا هەرگیز لە هەژاری بوونتان ناترسم بەڵام لەوە دەترسم نیعمەتەکانی دونیاتان بە سەردا بڕێژرێ هەروەکو چۆن بە سەر ئەوانەی پێش ئێوەدا ڕژا و ئێوەش پێشبڕکێی تیادا بکەن هەروەکو ئەوان کردیان و ئەمجار بەهەلاکەتدا بتانبات هەروەکو چۆن ئەوان بە هەلاکەتدا چوون)).

فەرموودەکە لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەی (عمرو ی کوڕی عوف الأنصاري) یەوە.

خۆشەویستان... بە ڕاستی سوو خواردن دیمەنێکی زۆر ترسناکە، نزمترین و ریسواترین شێوەیە لە شێوەیەکانی وەبەرهێنانی سەرمایە، ئەو شێوە نابووتە کە بە هیچ شێوەیەك گرنگی و بایەخ بە هیچ شەرەف و دینێك نادات . گرنگ ئەوەیە پارە کۆبکاتەوە و قازانج بکات، هەرچەندە لە ڕێگای خوێن مژینی خەڵکانی هەژار و نەدارانەوە بێت! جا سیستەمی ئیسلامی و سیستەمی سوو خواردن بە هیچ شێوەیەك لە بۆچووندا ڕێك ناکەون و لە ئەنجامیشدا بە یەکەوە ڕێك ناکەون، بۆیە لە قورئانی پیرۆزدا هەڕەشەیەکی سەختی کردووە لە سوو و سوو خۆران، من دەڵێم:

یەکەم: ئەو سووە چییە خوای گەورە لە قورئاندا حەرامی کردووە و جۆرەکانی چین؟

---

١ـ أخرجه البخاري، كتاب الجزية والموادعة ((باب الجزية والموادعة مع أهل الذمة و الحرب)) (٣١٥٨) و (٤٠١٥)، ومسلم كتاب ((الزهد والرقائق)) (٢٩٦١).

سوو دوو جۆر: (ربا النسيئة)و (ربا الفضل) ئەوانە مانایان چییە؟

(ربا النسيئة): شێوەکەی ئەوەیە کەوا – بۆ نمونە – کابرایەك دەڕوات بۆ لای کابرایەکی تر، پێی دەڵێت: هەزار دینارم پێ بدە ئەویش بۆ ماوەیەکی دیاری کراو پێی دەدا، داوای لێ دەکات لە کاتی دیاری کراودا هەزار دینارەکەی بۆ بگێڕێتەوە، لەسەر ئەو مەرجانە ڕێك دەکەون، پاشان کابرا لە کاتی دیاری کراودا دێت ئەویش پێی دەڵێت: ناتوانم پارەکەت بۆ بگێرمەوە بۆیە پەلەم لێ مەکە و ماوەیەکم بدەرێ، ئەویش دەڵێت: مۆڵەتت دەدەم، بەڵام بە زیادەوە لە جێی ئەو هەزارە هەزار و دوو سەد یان هەزار و پێنج سەدم پێ بدە!! ئەم شێوەیە پێی دەڵێن (ربا النسیئە)وە ئەمە یەکەم جۆرە کە خوای گەورە لە قورئاندا حەرامی کردووە.

بەڵام (ربا الفضل): مانای ئەوەیە کەوا کەسێك کەرەستەیەك وەکو ئاڵتون بفرۆشێتە کەسێکی تر بە هەمان کەرەستە لە گەڵ وەرگرتنی زیادەوە، یان مرۆڤێك خورمایەکی باش بفرۆشێت بە خورمایەکی خراپ لە گەڵ وەرگرتنی زیادەوە یا بە پێچەوانەوە ئەمە پێی دەڵێن: ((ربا الفضل)).

ئیمامی (البخاری و مسلم)[1] ڕیوایەتیان کردووە لە فەرموودەی (ابو سعید ی الخدری) یەوە کەوا پێغەمبەری ئەکرەمﷺ دەفەرموێت: (( الذهب بالذهب، والفضة بالفضة، والبر بالبر، والشعير بالشعير، والتمر بالتمر، والملح بالملح، مثلا بمثل، يدا بيد، فمن زاد أو استزاد فقد أربى، الآخذ والمعطي فيه سواء )).

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی[2]: ((فإذا اختلفت هذه الأصناف فبيعوا كيف شئتم))، واتە: جا ئەگەر کەرەستەکان لە یەکتر جیاواز بوون ئەوا بە ویستی خۆتان بفرۆشن) بۆ نمونە: من ئۆتۆمبیلێکم هەیە وە تۆ دوو ئۆتۆمبیلت هەیە، پاشان من و تۆ هەستاین بە گۆڕینەوەی ئۆتۆمبیلەکانمان و

---

١ ـ أخرجه البخاري، كتاب ((البيوع))، باب ((بيع الفضة بالفضة))(٢١٧٦، ٢١٧٧)، ومسلم كتاب المساقاة، باب ((الصرف و بيع الذهب بالورق نقدا)) (٨٢ / ١٥٨٤) واللفظ له

٢ـ أخرجه مسلم، كتاب المساقاة،باب(الصرف وبيع الذهب بالورق نقداً)(١٥٨٧)من حديث عبادةبن الصامترضي الله عنه

جیاوازییەکەم پێت دا... ئەوە زۆر ئاساییە، بەڵام لەو شەش جۆرەی کەوا پێغەمبەری خواﷺ باسی کردووە ئەوا ئەو ئاڵوگۆڕە مەکە؟! چونکە ئەوە جۆرێکە لە جۆرەکانی سوو و پێی دەڵێن (ربا الفضل).

کەوایە (ربا النسیئة و ربا الفضل) هەردوو قورئان حەرامی کردوون، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأْكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضْعَٰفًا مُّضَٰعَفَةً ﴾ آل عمران: ١٣٠، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! سوو چین لەسەر چین مەخۆن و وەری مەگرن وەك سەردەمی نەفامی دەچوون بۆ نموونە: (١٠٠) دیناریان ئەدا بە(٣٠٠) دینار، چونکە لە بنەڕەتدا سوو بە هەموو جۆرێ شتێکی حەرامکراوە )).

بە ڕاستی ئێستا سوو خواردن بڵاو بووەتەوە بە شێوەیەکی نابووت، لە گەڵ مندا بیر لەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خواﷺ بکەرەوە کە دەفەرموێت: ((بين يدي الساعة يظهر الربا)) واتە: لە بەر دەستی قیامەتدا دەرکەوتنی سوو خواردنە هەیە)) ڕەنگە هەندێ کەس بپرسن و بڵێن: ئایا لە سەردەمی کۆندا سوو خواردن هەبووە تاکو قورئان حەرامی بکات؟ وڵامەکە: بەڵێ... سوو خواردن هەبووە و پاشان قورئان حەرامی کردووە، بەڵام مەبەست لە دەرکەوتن کە لە فەرموودەکەدا هاتووە زۆربوون و بڵاوبوونەوەیەتی وە دڵنیابن کە بەرەکەت لەسەر زەوی و لە نێوان مرۆڤیاتیدا بنەبڕ نەکراوە تەنها بە هۆی سوو خواردنەوە نەبێت!!

پەروەردگارمان چی فەرمووە؟ پەروەردگارمان فەرموویەتی: ﴿ يَمْحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ ﴾ البقرة: ٢٧٦، واتە: خوا فەڕو پیتی سوو خۆری ناهێڵێ، واتە: هەر داراییەك ریبای تێدا بێت دەرەنجام هەر تیا دەچێت)).

براکەم... دەمەوێت تۆ لە نێو هەموو فەرهەنگەکانی زمانەوانیدا بگەڕێیت – لەسەر زەویدا – بۆ ئەوەی وشەیەك بدۆزیتەوە هاوشێوە و مرادف (یمحق) بێت، دڵنیابە کە هەرگیز هیچ وشەیەك نادۆزیتەوە کە هەمان مانا ببەخشێت !ئەمجار تۆ هەست بە ئەو بێژەیە دەکەیت وەکو ئەوەی لە پێش چاوت بێت، لە بەر دەستت بێت، ئایا ئێستا ڕەوانبێژی رازاوەی قورئانت بینی کە لە پێش چاوت خۆی

دەپارێزێنیتەوە؟ بۆیە ئاگاداری سووخواردن بە، چونکە ئەوە بەدبەختی و نەگبەتییە، دڵتەنگی و بەڵایە.

لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە ئیمامی ئەحمەد لە (مسند)ەکەیدا و ابن ماجە و الحاکم و جگە لەوان بە سەنەدێکی (صحیح)[1] ڕیوایەتیان کردووە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی مسعود) ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((ما أحد أکثر من الربا، إلا کانت عاقبة أمره إلى قلة))، واتە: هیچ کەسێك سامان کۆ ناکاتەوە و زۆری ناکاتەوە لە ڕێگای سوو خواردنەوە ئیللا کۆتایی کارەکەی بەرەو کەمی دڕوات).

ئایا مەترسی سوو خواردنت بینی؟! جا من لە تۆم دەوێت تەنها نموونەیەکم بۆ بهێنیتەوە کەوا کەسێك لەسەر کاری سوو خواردن بەردەوام بووبێت وە نانی لەسەر سووخواردن بێت و پارەی خۆی لە ڕێگای سوو خواردنەوە دەرکات تەحەددا دەکەم ئەگەر لەسەر ئەوە بەردەوام بوو ئەوە بەرەکەتی لێ بنەبڕ دەبێت!!

ڕەنگە سامانەکەی زیاد بکات، بەڵام هەروەکو گوتم: ئەوە بەڵگە نییە لەسەر ڕازی بوونی خوای گەورە لە بەندەکەی وە نموونەی قارونم هێنایەوە، لە پێشدا باسی ئەو فەرموودەیەی خۆشەویستمان کردﷺ کە دەفەرموێت: ((إذا رأیت الله یعطي العبد من الدنیا علی معاصیه، فإنما هو استدراج)) واتە: ئەگەر بینیت خوای گەورە نیعمەت و فەزڵ و پۆشینی تاوان و مۆڵەت دان دەبەخشێتە بەندەیەکی لە دونیادا وە بەندەکەش بەردەوامە لەسەر سەرپێچی و بە بێ تەوبە جا بزانە ئەوە نزیك کردنەوەیە (استدراج)ە)).

جا خوای گەورە مۆڵەت و ماوە دەدات بەڵام هەرگیز فەرامۆش ناکات، ئەمجار پێغەمبەری خۆشەویستﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ

---

١ـ أخرجه أحمد(١ / ٣٩٥، ٤٢٤)، وابن ماجه كتاب ((التجارات))، باب ((التغليظ في الربا)) (٢٢٧٩)، والحاكم في ((المستدرك)) (٨٠٠٦)، وصححه و أقره الذهبي، و حسن سند ابن ماجه المناوي في ((فيض القدير)) (٥/٥٢٥)، وقال البوصيري في ((الزوائد)): ((إسناده صحيح و رجاله موثقون))، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٥٥١٨)، وفي ((الترغيب)) (٣ / ٥٢).

﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ الأنعام:٤٤ـ ٤٥، واتە: جا کە ئەو هەموو ئامۆژگاریەیان لە بیرخۆ بردەوە کە لەسەر زمانی پەیامبەران کرابوون ئینجا ئێمەیش بۆ خەفڵاندنیان دەروازەی هەموو خێرێکمان بۆ واڵا کردنەوە و رزق و رۆزییەکی فرەمان رشت بە سەریاندا و ئەوانیش خۆشی و نەشوە گرتنی هەتا بەماڵ و منداڵەی پێماندابوون دەعیە و فیزگرتنی و لە رێی راست لایاندا ئەوسا ئێمەیش کتوپڕێك رقمان لێ گرتن و ئەوانیش لەو هەموو خۆشگوزرانییە بێ هیوا و نائۆمێد بوون.(٤٤) ئینجا ئەوانەی کە ناهەقی و ستەم پیشەیان بوو، هەموو خێر و خۆشیەکیان لە کیس چوو و دوابڕاو بوون سوپاس و ستایشی بێ پایانیش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان(٤٥)).

لە گەڵ مندا ئایەتەکانی سوو خواردن بخوێنەرەوە لە کۆتایی سورەتی (البقرە) ﴿ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰا۟ ﴾، واتـە: ئـەو کەسـانەی سـوو ئـەخۆن))ئایـا حوکمیـان چییەو شێوەیان چۆنە و سزایان چییە؟ بـیر لـەو ئایەتـە بکـەرەوە: ﴿لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ۚ ﴾، واتـە: کـە لـە گـۆڕ دەنـرێن پاشـان زیندوو ئەکرێنەوە و راسـت دەبنـەوە، وا راسـت دەبنـەوە هـەر دەڵێـی شـەیتانەکان دەستی لـێ وەشـاندوون. بـە کـورتی: پیـاوی سـوو خـۆر لـە رۆژی قیامەتـدا وەکـو مرۆڤی پەتەڕی و شێتی لێدێ)).

ئەی پەروەدگارمان بمانپارێزە!! ئایا ئەم دیمەنەت بینی ؟؟ ئایا بە جوانی بیرت لێ کردووەتـەوە؟ ئایـا بـەجوانی لێـی تێگەیشتووی؟ دەمـەوێت لـە گـەڵ منـدا لـەو دیمەنانـەدا بـژێیت کـاتێ خـەڵکی لـە گۆڕەکانیـان دەردەچـن و خـوای پـەروەدگار فـەرمان کردووەتـە (ئیـسرافیل) بـە فـووکردن بـە بووقـدا کـە ئـەویش فـووکردنی زیندووبوونەوەیە.

هەمووان لە گۆڕەکانیان دەردەچن، خوای گـەورە دەفـەرموێت:﴿ وَٱسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ ٱلْمُنَادِ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٤١﴾ يَوْمَ يَسْمَعُونَ ٱلصَّيْحَةَ بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُرُوجِ ﴾ ق: ٤١ـ ٤٢، واتە: گوێ راگرە ئەی پێغەمبـەرﷺ! بـۆ ئـەو هەواڵـەی پێـت دەدەیـن لـە ئـەحواڵی

قیامەت، ڕۆژێك (ئیسرافیل) بانگ دەکا لە شوێنێکی نزیك بە خەڵك هەمووتان دەرچن لە گۆڕەکانتان بۆ حەشر (٤١) ئەو ڕۆژە کە هەموو ئەو (صیحە) و هاوارەیان بە هەق گوێ لێ دەبێ، ئا ئەو ڕۆژە ڕۆژی لە گۆڕ دەرچوونە بۆ حەشر و پاداش و تۆڵە (٤٢))).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ﴿٢﴾ وَقَالَ ٱلْإِنسَـٰنُ مَا لَهَا﴾ الزلزلة: ١ـ ٣، واتە: کاتێ کە زەوی بە توندی تەکانی داو کەوتە لەرزە لەرز و جووڵە جووڵ بە هەر هۆیەکەوە بێت، (ئیبن عەبباس) ئەڵێ: ئەوە لە (نەفخە) ی یەکەمدایە بە جۆرە لەرزەیەکی وا کە شایستەی ئەو بێت جا ئەبێ ئەو حاڵەتە چ ڕووداوێکی گەورە بێت. (١) زەوی هەرچی باری گران و قوورسی هەبوو فرێی دایە دەرەوە! (٢) . ئەو کاتە ئادەمیزادی کافر بە سەر سوڕمانێکەوە دەڵێ: زەوی چییەتی بۆ وا دەکات ..؟ (٣))). چی ڕوویداوە!!؟ پێش کەمێك ئارام و بێدەنگ بوو! پێش کەمێك دامەزراو و دڵنیا بوو! ﴿يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا﴾ الزلزلة: ٤ـ ٥، واتە: لەو ڕۆژەدا زەوی هەواڵەکانی خۆی چاك و خراپ رادەگەیەنێت و مەردوم تێ ئەگات کە ئەو زەمین لەرزەیە سەرەتای ڕۆژێکی سەخت و وێران بوونی دونیایە(٤) ئەویش بە هۆی ئەوەوە کە پەروەردگارت وەحی و فەرمانی پێ کردووە بەو زەلزەلەیە: لە خۆیەوە ناتوانێ هیچ بکات و هەردەم لە ژێر دەسەڵاتی خوادایە.(٥)

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ﴾ الإنشقاق: ١، واتە: کاتێك ئاسمان لەت و پەت بوو و ئەم دەستوور و سیستەمە نەما و هەڵوەشایەوە )).

بیر بکەرەوە، لەت و پەت بوونی ئاسمانەکان، لەت و پەت بردنێك لە زەویدا؟ بۆ؟ بە مەبەستی لێپرسینەوە. دەمەوێت لە گەڵ مندا لەو دیمەنەدا بژیت، کاتێ خەڵکی لە گۆڕەکانیان دەردەچن.

کۆمەڵێکیان کاتێ لە گۆڕەکانیان دەردەچن راستەوخۆ بە سەر ڕوویاندا ڕێ دەکەن! خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا

وَصُمًّا مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا ﴾الاسـراء: ٩٧، واتـه: لـه ڕۆژی قیامەتیشدا بـه دەمـەو ڕوویـی و کوێری و لاڵـی و کـەڕی هـەموو کۆ دەکەینـەوە و حەشریان دەکەین چوون لە دونیادا هەقیان نەبیستووە، هـەقیان نـەدیتووە لـەوێش هەر نابینـا و کـەڕ و لاڵ دەبـن . هـەر جـارێکیش بڵێسەی ئاگرەکـه کـەم و کـز بـوو دووباره نیلی دەدەین و هەڵی دەگیرسێنینەوە و زیاتری دەکەین بۆیان)) .

کۆمـەڵێك لـه گۆڕەکانیـان دەردەچـن دەیانـەوێت ڕابوەسـتن بـەڵام نـاتوانن، بـه زەویدا دەکەون، ناتوانن دابنیـشن، بـه لای ڕاسـت و چـەپی خۆیانـدا دەسوڕێتەوە، هەر وەکو کەسێکی پەرکـەماوی و فێـدار و شـێت، دەڵێـی شـەیتان بـه لای ڕاسـت و چەپدا دەیانهێنیت و دەیانبـات، بـۆ پێشەوە و بـۆ پاشـەوە، بـه ڕاسـتی دیمـەنێکی ترسناکە، ئەوانه کێن؟ ئەوانـه سـوو خۆرەکـانن؟ ئەمەیـشه نیـشانەکەیانه کـاتێ لـه گۆڕەکانیان دەردەچن لە ڕۆژی زیندووبوونەوە و هەستانەوە.

﴿ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ ﴾ البقرة: ٢٧٥، واته: ئەو کەسانەی سوو ئەخۆن، کە لە گۆڕ دەنرێن پاشان زیندوو ئەکرێنەوە و ڕاست دەبنەوە، وا ڕاست دەبنەوە هەر دەڵێی شەیتانەکان دەستی لێ وەشاندوون، چونکە لە دونیادا دەیانگوت: مامەڵەو کڕین و فرۆشتنیش هەر وەکو مامەڵەکردن بە سوو وایە((واتە هەردوکیان بە لای ئەوانەوە یەکسانن)) چونکە ئەوان باوەڕیان بە حەرام و حەڵاڵ نەبوو . خۆ خواش کڕین و فرۆشتنی ڕێداوە و سوو خواردنیشی حەرام و یاساغکردووە. ئینجا هەر کەسێك ئامۆژگاری پەروەردگاری بۆهات و جێ بە جێی کرد و وازی لە سوو خواردن هێنا ئیتر ئێستا لە سووەی کە لە پێشتر خواردوویەتی چاوپۆشی ئەکرێ چونکە ئەوە پێش یاساغبوونی ڕیبا بووە)).

براکـەم... ئـا ئـەوەتا تـۆ بـه ئایـەتی خـوای گـەورە یادخرایتـەوە بۆیـە هـەر لـه ئێستاوە پەیمان بە خواکەت بدە و سەروەت و سامانەکەت پاك بکەرەوە، ماڵەکـەت

پاك بكەرەوە، منداڵەكانت پاك بكەرەوە، ناخ و دڵ و دەروونت لەو نەخۆشییە كوشندەیە پاك بكەرەوە كە بەرەكەت لە رزقەكەتدا بنەبڕ دەكات . وە بڵێ: خودایە..! لە ئەمڕۆ پەیمانت پێ دەدەم لەو نەخۆشییە كوشندەیە خۆم پاك بكەمەوە و سامانەكەم لە سوو پاك بكەمەوە، جا هەر كەسێ وازی هێنا ئەوا هیچی لەسەر نییە و هیچ تاوانبار نابێت و كارەكەی دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا، بەڵام ئەگەر هەركەسێ بۆ جاری دووەم گەڕایەوە ئەوا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ البقرة: ٢٧٥، واتە: هەركەسیش – پاش ئەم بڕیارە – گەڕایەوە بۆ سوو خواردن، دەبنە یار و هاوڕێی ئاگر بە هەتا هەتاییش تێیدا ئەمێننەوە چونكە ریبایان بە حەڵاڵ زانیوە و بەوەش كافر بوون).

كەوابوو سوو خواردن بەرەكەت بنەبڕ دەكات بەڵام صەدەقە و خێر خوای گەورە پەرەی پێ دەدات و بۆ خاوەنەكەی زیادی دەكات.

لە هەردوو كتێبی (صحیح)[١] دا هاتووە لە فەرموودەی (أبو هریرە) ەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ما تصدق أحد بصدقة من طیب، ولا یقبل الله إلا الطیب، إلا أخذها الرحمن بیمینه، وإن كانت تمرة، فتربو في كف الرحمن حتى تكون أعظم من الجبل، كما یربي أحدكم فلوه أو فصیله ) وفي روایة: (( أو قلوصة )) .واتە: هەر كاتێك كەسێك لە ئێوە صەدەقەیەك لە سامانە پاكەكەی بكات – وە خوای گەورەش تەنها پاك وەردەگرێت – ئیللا خوای گەورە ئەو صەدەقەیە بە راستی خۆی وەردەگرێت، هەرچەندە دەنكە خورمایەك بێت، ئەمجار لە دەستی خوای میهرەبان گەشە دەكات و زیاد دەكات تاوەكو لە چ یایەك مەزنتر دەبێت هەروەكو چۆن یەكێك لە ئێوە بێچووە ماینەكەی پەروەردە دەكات)) لە ریوایەتێكی تردا هاتووە: ((وەكو بێچووە وشترەكەی)).

بیهێنە پێش چاوی خۆت– ئەی برای بەخشێنەر– لە رۆژی قیامەتدا دێیت و پێت دەڵێن: كتێبەكەت بخوێنەرەوە، جا لە لاپەڕەی چاكەكانتدا دەبینی كە تۆ

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب الزكاة، باب ((الصدقة من كسب طیب)) (١٤١٠)، ومسلم، كتاب ((الزكاة))، باب ((قبول الصدقة من الكسب الطیب و تربیتها)) (١٠١٤).

چیاییەكی خورمات بەخشیوە، چۆن ئەوە ڕوویداوە؟ ڕەنگە تۆ بڵێیت: من كەسێكی هەژار و نەدار بووم و نەمتوانی تەنانەت یەك كیلۆ خورما ببەخشم كەچی ئێستا لە لاپەڕەی چاكەكانمدا هاتووە كەوا من لە فلان ڕۆژدا بە قەد چیایەك خورمام بەخشیوە! بەڵام خۆ ئەمە كتێبەكەی تۆیە، كەواتە ئەوە چۆن ڕوویداوە؟ تۆ بە كردەوە بە قەد چیایەك خورمات نەبەخشیوە بەڵكو ئەوە تەنها خورمایەك بوو تەنها لە بەر خاتری خوا بەخشیوتە و ئەمجار خوای گەورە لێی وەرگرتویت و پاشان پەرەی پێداوە تاوەكو بە قەد چیایەكی لێ هاتووە، جا خوای گەورە دەربارەی خۆی دەفەرموێت: ﴿وَيُرۡبِي ٱلصَّدَقَٰتِۗ﴾ البقرة: ٢٧٦، واتە: خێر و خێراتی ماڵ و سامانی سەدەقە، خوا بە فەزڵی خۆی زیادی ئەكات و پیتی تێدەخات بۆ خاوەنەكەی )).

جا ئاگاداری ئەم ئایەتە بە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ....﴾، واتە: ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە...)) دڵت بكەرەوە، بە باشی گوێ بگرە، چونكە ئەو شتەی كە خوای گەورە بە هۆیەوە بانگت دەكات ئەوا بە دڵنیایی یەوە خەیر و چاكەیە و فەرمانت پێ دەكات، یان خراپەیەكە و لێی ئاگادارت دەكاتەوە، خوای گەورە چی فەرمووە؟ فەرموویەتی: ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾.

ئایا مانای ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ چییە؟ ئەو وشەیەی كە زۆر جار دەیبیسین؟ واتە: لە نێوان خۆتان و پەستی و توڕەیی و سزای خوای گەورەدا پاراستنێك دانەن)).

وشەی (التقوى) لە بنەڕەتدا لە (اتقى)وە هاتووە، واتە: خۆی پاراست، چاووگەكەی (الإتقاء) ە واتە: خۆ پاراستن، هەردووكیان لە وشەی (وقى) وە وەرگیراون، (الوقاية) واتە: پاراستنی شتێك لەوەی كە ئازاری دەدا و زیانی پێ دەبەخشێ) وە ئەصلی وشەی (التقوى) ئەوەیە كە بەندەكان لە نێوان خۆیان و پەستی و توڕەی و سزای خوادا پاراستنێك دابنەن، ئەم پاراستنەش بریتییە لە ئەنجامدانی گوێڕایەڵییەكان و دوور كەوتنەوە لە سەرپێچییەكان، خوای گەورە دەفــــــــــــەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن

﴿كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ البقرة: ٢٧٨، واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ! دەبێ بە تەواوی ملکەچی فەرمان و قەدەغەکراوەکانی خوا بن، و لە گشت سنوورەکانی پارێز بکەن و لە پاشماوەی سووەکەشتان – کە بە لای ئەم و ئەوەوەیە واز بێنن و داوای مەکەن ئەگەر باوەڕداری راستەقینەن، دەبێ گوێڕایەڵی تەواوی فەرمودەکانی خوا بن و لەو سووەش بێدەنگ بن)) ئەی باشە چی روودەدا ئەگەر ئەو کارەمان نەکرد؟ ﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ فَأْذَنُوا۟ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ البقره: ٢٧٩، واتە: خۆ ئەگەر واتان نەکرد و دەستتان لە سوو خۆری هەڵنەگرت ئەوسا جەنگێکی گەورە رابگەیەنن لە گەڵ خوا و پەیامبەرەکەیدا ﷺ چونکە سوو خۆری دژایەتی کردنی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەری خوایە ﷺ، واتە: سوو خواردن ئیعلانی جەنگە لە گەڵ خوا و پێغەمبەر ﷺ)).

ئەی پەروەدگارمان بمانپارێزە ! ! کێ دەتوانێت لە گەڵ خوا و پێغەمبەرکەیدا ﷺ بجەنگێت ؟؟ سوێند بە خوا بە راستی ئەوە جەنگە، جەنگ لەسەر دەروونەکان، جەنگە لەسەر ناخ و ویژدانەکان، لێرەدا خنکان و دڵەڕاوکێ و تێکچوون و پەشۆکانی نەفس هەیە، لێرەدا دڵتەنگی و خەم و پەژارە و ئازار هەیە، بەڵێ... سامانەکەی زۆر زۆرە کەچی هیچ بەختیاری و ئاسوودەیی و رازی بوون و دڵفراوانیو هێمنی و جێگیر بوونی ناخەکان و دڵئارامی نابینی! ! بەڵکو لێرەدا بنەبڕکردن و نەمانی بەرەکەت دەبینی، بۆ؟ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأْذَنُوا۟ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ ...﴾البقرة: ٢٧٩ـ ٢٨٠، واتە: ئەوسا جەنگێکی گەورە رابگەیەنن لە گەڵ خوا و پەیامبەرەکەیدا ﷺ، چونکە سوو خۆری دژایەتی کردنی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئەگەر دەست لە سوو خۆری هەڵگرن و لێی پەشیمان ببنەوە سەرمایە کانی ماڵی خۆتان تەنها و (بێ سوو) بسێننەوە لە قەرزارەکان ئیتر نە ئێوە لە قەرزارەکان ستەم کەن و واتە: ((زیاد لە ماڵەکەی خۆتان وەرمەگرنەوە)) وە نە لە لایەن ئەوانیشەوە ستەمتان لێ

کریێ، ((هەر بەو جۆرە کە کەمتر لە سەرمایەکەتان بدرێتەوە. (٢٧٩) ئەگەر قەرزارەکەش دەست تەنگ و نەدار بوو)) دەبێ تا دەسەڵات پەیدائەکا بۆ بژاردنەوەی قەرزەکە ماوەی بدەن...) .

ئەمجار خوای باڵا دەست ئەو ئایەتانە بە چەند ئایەتێکی تر تەواو دەکات و دەفـــــەرموێت: ﴿وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ البقرة: ٢٨١، واتە: خەڵکینە! لە سزای ڕۆژێك بترسن کە هەمووتان تێیدا ئەهێنرێنەوە بۆ لای خوا لە پاشان هەموو کەسێك پاداشی کار و کردەوەی خۆی بە تەواوی دێتەوە ڕێی ستەمیشیان لێ ناکرێ (( کەم و کورتی لە چاکەکانیاندا ناکرێ، زیادیش لە گوناهەکانیاندا )) نادرێ بە کۆڵیاندا)).

يـــا نفـــسُ أزف الرحيـــل ... وأظلـــك الخطـــب الجليـــلُ
فتـــأهبي يـــا نفـــس ... لا يلعب بك الأمـل الطويـلُ
فلتَنَـــــزِلنَّ بمنـــــزلِ ... ينـسى الخليـل بـه الخليـلُ
وليركـــبن عليـــك فيـــه ... مـــن الثـــرى ثقـــل ثقيـــلُ
قُـــرِن الفنـــاء بنـــا جميعـــا ... فما يبقى العزيـز ولا الـذليلُ

واتــە: ئــەی نەفــسەکەم کــاتی کۆچــکردن نزیــك بووەتــەوە، کارەکــانی خــودای شــکۆمەند ســێبەری بــۆ کــردووی، بۆیــە ئــەی نەفــسەکەم خــۆت ئامــادە بکــە هــەرگیز هیــوا درێــژی یاریــت پــێ نــەکات، ڕۆژێــك دێــت کــە دەچــیتە جێگایــەك هــاوڕێ هــاوڕێی خــۆی لــە بــیر دەچــێتەوە، خــاکی زۆر قــورس لەســەر شــانت کــۆ دەبێتــەوە، فــەوتان هاودەمــە لــە گــەڵ هەمووانــدا بۆیە هیچ کەس نامێنێت نە بەرێز و نە زەلیل.

أيـا عبـد كـم يـراك الله عاصـيا ... حريصا على الدنيا وللموت ناسيا
أنـسيت لقـاء الله واللحـد والثـرى ... ويوما عَبُوساً تشيبُ فيه النواصيا
لو أن المرء لم يلبس ثيابا من التقى ... تجـرد عريانـا ولـو كـان كاسـيا

ولـــو أن الـــدنيا تـــدوم لأهلـــها  لكـــان رســـول الله حيـــاً وباقيـــا
ولكنهـــا تفنـــى ويفنـــى نعيمهـــا  وتبقى الـذنوب والمعاصى كما هى

واتە: ئەی بەندەکە تاکەی خودا لە سەرپێچیدا دەتبینێ، سووری لەسەر دونیا و مردنت لە بیر کردووە، ئایا دیدەنی خوا و گۆڕ و خاکت لە بیر چووە، ڕۆژێکی گـرژ و مۆن کە پەرچەم و ناوچاوەکانی تێدا پـیر دەبێـت، ئەگـەر کەسـێك پۆشـاکی تـەقوا نەپۆشێت، ئەوا کەسێکی رووتە هەرچەندە جل و بەرگی لە بەردا بێت، ئەگەر دونیا بـۆ دانیـشتوانەکەی بـەردەوام بوایە،ئـەوا پێغەمبـەری خـواﷺ زینـدوو دەبـوو و دەمایەوە، بەڵام لە ناو دەچێت و خۆشگوزرانەکەشی لە ناو دەچێت، کەچی تاوان و سەرپێچییەکان هەر وەکو خۆی دەمێننەوە.

ئـەی گـرووی موسـڵمانان.. ئاگـاداری سـووخواردن بـن، نـاخ و سـامانتان پـاك بکەنەوە بۆ ئەوەی میهرەبانی و بەرەکەت دابەزێت، کارەکـە پێویـستی بـە ڕێنمـایی هیچ کەسێك نییە، تۆ خۆت و دڵت... تۆ (ترمومترێکی) زۆر وردت پێیە دەتوانیت لە ڕێگایەوە ژیانت ڕێك بخەی.

پێغەمبـەری خـواﷺ دەفـەرموێت: هـەروەکو لـە (صـحيح مـسلم)[1] هـاتووە لـە فەرموودەی (النواس ی کوڕی سمعـان)ەوە: ((الـبر حـسن الخلـق، والإثـم مـا حـاك في صدرك) واتە: چاکە (البر) بریتییە لە ڕەوشتی جوان و تاوان (الإثـم) ئەوەیـە کـە لـە سنگدا دەجوڵێتەوە و ئازارت دەدا...))، واتە: لە ناختدا ئامۆژگارێکی جوان هەیـە و یادی خوات دەهێنێتەوە، ئامۆژگـارێکی خـوایی یـە لـە دڵـی هـەموو موسـڵمانێکدا – ((والإثم ما حاك في صدرك وكرهت أن يطلع عليه الناس)) واتە: تاوان (الإثـم) ئەوەیـە کە لە سنگدا دەجوڵێتەوە و ئازارت دەدا و حەز ناکەیت خەڵکی پێی بزانن)).

هەرگیز مەڵێ: فلان کەس بـەو شـتە فـەتوای بـۆ دام !! نـەخێر بـرای بـەڕێزم ! فەتواکەی من بدە بە قەد دیوارەکاندا ئەگەر هاتوو فەتواکەم لە گـەڵ قـسەی خـوا و پێغەمبەرەکەتداﷺ جیاواز بوو، جا ئەو فەتوایە هیچ نرخێکی نییە ئەگەر هـاتوو لـە گەڵ شەرعدا جیاواز بوو وە تەماشای دڵەکەت بکە چیت پێ دەڵێت؟

---

١ـ أخرجه مسلم، كتاب ((البر والصلة والآداب))، باب ((تفسير البر و الإثم)) (٢٥٥٣).

کەوابوو خێراکە و ماڵەکەت پاك بکەرەوە، سوێند بە خوا ئەوا بەرەکەت دادەبڕێت و خوای گەورە بەرەکەت دەخاتە خێزان و منداڵەکانت و کارەکەت و تەندروستیت و لەشساغیت وە هەر چی شتێك لە بەر دەستتدایە وە ئاگاداری خواردنی حەرام بە، چەندەها جار دەڵێین: پەروەردگارا ... پەروەردگارا .... کەچی هیچ سوودی نییە ! بۆ؟ بە هۆی خواردنی حەرام و خواردنی سوو و خواردنی سەروەت و سامانی هەتیوانەوە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا﴾ النساء: ١٠، واتە: ئەو کەسانەی کە بە ستەم و ناهەق ماڵ و سامانی منداڵی هەتیوو بێ باب دەخۆن بێ سۆ تەنها ئاگر دەکەنە سك و ورگیانەوە و بە زوویش دەخرێنە ناو ئاگرێکی زۆر گەرم و بەگڕی دۆزەخەوە)).

ئێمە هەردەم لە مزگەوتەکاندا هاوار دەکەینە خوای گەورە و لێی دەپاڕێینەوە و لە بەر دەستیدا دەگرین.... ئایا لە نێو ئەو هەموو خەڵکەدا کابرایەکی لە خوا ترس نییە تاوەکو خوای گەورە دوعاکەی لێ وەرگرێت ؟؟ بەڵێ... پیاوچاکان لەم ئوممەتەدا هەن، بەڵام پیاوچاکان لە گەڵ خراپەکاراندا سواری یەك کەشتی بوون، ئەگەر ئەو کەشتییە رزگاری ببێت ئەوا چاکەکاران و خراپەکاران رزگاریان دەبێت، بەڵام ئەگەر کەشتییەکە نوقمی ژێر ئاو بوو ئەوا چاکەکاران و خراپەکاران دەخنکێن.

خوای بەرز و بێ هاوتا دەفەرموێت: ﴿ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ ﴾ الأنفال: ٢٥، واتە: لەو فیتنە و بەڵایەش خۆپارێزن و بترسن، کە کاتێ دێت، تەنها دووچاری ئەوانەتان نابێت ناهەقیان کردووە و دەستیان تێی دایە، بەڵکو یەخەی هەموان — گوناهبار و بێ گوناه، چاك و خراپ — دەگرێتەوە یان وەك دەڵێن (تەڕ و وشك) پێکەوە دەسووتێ)) پاشان هەریەکە و بە پێی نیەت و مەبەستەکەی خۆی زیندوو دەکرێتەوە،جا خوای گەورە سزای خراپەکاران دەدات و

پاداشتی چاکەکاران دەداتەوە .هەروەکو پێغەمبەری راستگۆﷺ فەرموویەتی لە فەرموودەیەکدا کە لە (صحیح البخاری و مسلم) [1] دا هاتووە لە فەرموودەی دایکە (عائیشە) وە دەڵێت: ((ثم یبعثون علی نیاتهم)) واتە: پاشان هەمویان بە پێی نیەت و مەبەستیان زیندوو دەکرێنەوە)) کە لە پاشاندا بە درێژی باسی دەکەین إنشاء الله .

ئێمە هەر هەمووما سواری یەك کەشتی بووین، جا ئەگەر پێم بڵێیت: ئەی دەربارەی دوعاکان چی؟ ئەوا دەڵێم: ئەوە کێشەی خواردنی حەرامە ! !

هەروەکو لەو فەرموودەیەدا هاتووە کە لە پێشدا باسم کرد: ((لیأتین علی الناس زمان لا یبالي المرء بما أخذ المال أمن حلال أم من حرام))، واتە: رۆژگارێك بە سەر خەڵكیدا دێت خەڵكی بایەخ بەوە نادەن کە سامانەکەیان لە رێگای حەڵاڵەوە یان لە رێگای حەرامەوە کۆکردبێتەوە)).

براکانم ... بە راستی سوو خوراردن تاوانێکی نابووت و قێزەونە و ئەوەی سوو دەخوات لەسەر زاری پێغەمبەری خوداوەﷺ نەفرەتی لێ کراوە، لە (صحیح مسلم) [2] دا هاتووە لە فەرموودەی (جابر ی کوڕی عبدالله) وە دەڵێت: (لعن رسول اللهﷺ آکل الربا و مؤکله وکاتبه و شاهدیه وقال: هم سواء)) واتە: پێغەمبەری خواﷺ لەعنەتی کردووە لەو کەسەی سوو دەخوات و ئەوەی دەبێتە وەکیلی ونوسەرەکە و هەردوو شایەتەکە و ئەمجار فەرمووی: هەمووان وەکو یەکن)) .

لە (مسند أحمد)و (معجم الطبراني)دا بە سەنەدێکی (صحیح) [3] هاتووە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی حنظلة) هوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((درهم ربا یأکله الرجل وهو یعلم أشد من ستة وثلاثین زنیة))، واتە: دەرهەمێك لە

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب ((البيوع))، باب ((ما ذكر في الأسواق)) (٢١١٨)، ومسلم كتاب ((الفتن و أشراط الساعة))، باب (الخسف بالجيش الذي يؤم البيت)) (٢٨٨٤)

٢ـ أخرجه مسلم، كتاب ((المساقاة))، باب ((لعن آكل الربا و مؤكله)) (١٥٩٨).

٣ـ أخرجه أحمد (٢٠٩٥١) ط الرسالة، وابن أبي عاصم في ((الآحاد و المثاني)) (٢٤٣٣)، والدار قطني في ((سننه)) (٢٩٥، ٢٩٦))، والطبراني في ((الأوسط)) (٢٧٨٥)، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (١٠٣٣)، و((المشكاة)) (٢٨٢٥)، و((صحيح الترغيب)) (١٨٥٥)، و((صحيح الجامع)) (٣٣٧٥).

ڕێگای سوووەوە کەسێك بیخوات لە کاتێکدا دەزانێت ئەوە سووە ئەوا تاوانەکەی لە سی و شەش زینا گەورەترە)).

بە ڕاستی ئەوە قسەیەکی زۆر ترسناکە, ئایا بۆ ئەم هەڕەشە توندە هاتووە؟ ئایا هۆی نەگبەتی و بەدبەختی خەڵکی چییە کە ئێستا زۆربەی خەڵکی تێدا دەژێت؟

لە (صحیح مسلم)[1] دا هاتووە لە فەرموودەیەکی (أبو هریرە)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((أیها الناس! إن الله طیب لا یقبل إلا طیبا، و إن الله أمر المؤمنین بما أمر به المرسلین)) واتە: ئەی خەڵکینە خوای گەورە چاك و باشە بۆیە ئەوەی چاك و باش نەبێت وەری ناگرێت وە خوای گەورە فەرمانی کردووەتە ئیمانداران بەوەی فەرمانی کردووەتە پێغەمبەران)) خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ﴾ المؤمنون: ٥١، واتە: وتمان: ئەی پەیامبەران! هەر لە خۆراکی پاك و حەڵاڵ بخۆن و بەردەوام کاری چاك ئەنجام بدەن)) خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ﴾ البقرة: ١٧٢، واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! لەو نیعمەتە پێماندان و کردمانە ڕۆزیتان کامی پاکە ئەوە بخۆن)) ثم ذکرﷺ الرجل یطیل السفر، أشعث أغبر، یمد یدیه إلی السماء: یا رب یا رب ! ومطعمه حرام ومشربه حرام، وملبسه حرام، وغذي بالحرام فأنی یستجاب لذلك ؟)) ئەمجار باسی کابرایەکی کرد کە سەفەرەکەی درێژ دەکاتەوە و قژگڤ و تۆزاوی یە، دەستی بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان پەوەردگارا... پەروەردگارا .... لە کاتێکدا خواردنەکەی حەرامە و خواردنەوەکەیشی حەرامە و پۆشاکەکەی حەرامە و حەرامی دەرخوارد دراوە ئیتر چۆن وەڵام بدرێتەوە؟)).

ئایا ئێستا زانیتان نهێنییەکە لە کوێدان؟ بە ڕاستی ڕزگاربوون و سەلامەتی لە خواردنی حەڵاڵ و دوورکەوتنەوە لە خواردنی حەرام دایە، خودایە..!! حەڵاڵمان بە

---

١ـ أخرجه مسلم کتاب الزکاة باب قبول الصدقة من الکسب الطیب و تربیتها (١٠١٥).

قسمەت بکە و بەرەکەتداری بکە و لە حەرام بمانپارێزە و دوورمان بکەرەوە لە نێوان ئێمە و ئەو دوور بخەرەوە هەروەکو چۆن نێوان رۆژئاوا و رۆژهەڵاتت دوور خستۆتەوە.

هەرچەندە زۆر کەس هەیە بایەخ بەوە نادات، گرنگ ئەوەیە ئەو سامانی دەستکەوێت لە رێگای بەرتیلەوە، بە حەڵاڵکردنی سامانی خەڵکی و خواردنی سامانی ئەوان لە رێگای ناڕەواوە و بە رێگەی سوو ەوە، رەنگە یەکێکیان گاڵتە بە تۆ بکات و بڵێت: ئێمە لە سەردەمی هاوەڵاندا نین؟ هەموو ئەوانەی دەورە و بەرمان رازین بەوە ! بەو شێوەیە خەڵکی گوێ بە حەڵاڵ و حەرام نادەن، ولا حول ولا قوە الا بالله، ئەمە نیشانەیەکی ترسناکە لە نیشانەکانی قیامەت، جا کێشەی پاڕانەوە پێویستی بەوە هەیە کە خواردن و خواردنەوەمان پاك بکەینەوە هەروەکو لە فەرموودەیەکدا هاتووە و لە سەنەدەکەیدا (ضعف)[1] هەیە: ((یا سعد أطب مطعمك تكن مستجاب الدعوة))، واتە: ئەی سعد خواردنەکەت پاك بکەرەوە ئەوا دوعاکانت وڵام دەدرێتەوە)).

لەگەڵ مندا بیر لەو ئایەتانەی کۆتایی سورەتی (آل عمران) بکەرەوە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾ فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّى لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم ...﴾ آل

---

١- أخرجه الطبراني في((الأوسط))(٦٦٨٣)، وضعفه الشيخ الألباني في((الضعيفة))(١٨١٢)، وقال((ضعيف جداً)).

عمران:١٩٥، واتە: بەڕاستی لەو شێوە دروستکردنە سەرسوڕهێنەرەی ئاسمانەکان و زەوی و ئاڵوگۆڕی شەو و ڕۆژ چەندین بەڵگە و نیشانەی پتەو هەیە لەسەر بوونی خوا و تاك و تەنیایی بۆ کەسانێ خاوەن ژیری و هۆشمەندن (١٩٠) ئەو کەسانەی کە بە پێوە و بە دانیشتن و لەسەر تەنیشت و ڕاکشان یادی خوا دەکەن لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی ڕادەمێنن و بیر ئەکەنەوە، ئەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە! هەرگیز تۆ ئەم دروستکراوە پڕ لە وردەکارییەت بێهودە و بێ ئامانج دروست نەکردووە، تۆ لە هەموو ناتەواوییەك پاك ڕائەگرین، دەسا تۆیش لە سزای ئاگر بمانپارێزە (١٩١) پەروەردگارا! بێ گومان هەرکەسێ تۆ بیخەیتە ناو ئاگرەوە ریسوات کردووەو لای گشت مەردم ئابڕووی چووەو بۆ خەڵکانی ستەمکار و بێ باوەر هیچ پشتیوانێك نییە (١٩٢) پەروەردگاری ئێمە! گوێمان لە جاڕچییەك بوو بانگی دەکرد، واتە: پەیامبەرﷺ یان قورئان، هەرچەندە (ئیبن کەسیر) دەڵێت: ((ئەو بانگ رایەڵە پێغەمبەرەﷺ.)) بانگی دەکرد بۆ باوەڕهێنان و دەیگوت: بە پەروەردگارتان باوەڕ بێنن، ئەوسا ئێمەیش وەڵاممان دایەوە و بڕوامان هێناو شوێنی کەوتین، ئەی پەروەردگاری ئێمە! دەسا گوناهەکانمان بپۆشە و بە میهرەبانی خۆت لە تاوانە وردەکانمان ببوورە، بیان سڕەوەو لە گەڵ چاکان بمانمرێنە(١٩٣) پەروەردگاری ئێمە! ئەوەمان پێ ببەخشە لەسەر زمانی پەیامبەرانتەوە بەڵێنت پێدابووین شەرمەزار و ڕوو زەردی ڕۆژی قیامەتمان مەکە بە ڕاستی تۆ لە پەیماندا لاریت نییەو دەیبەیتە سەر(١٩٤) ئینجا پەروەردگاریان وەڵامی دانەوە کە: بە ڕاستی من کار و کردەی هەرکام لە ئێوە — نێر و مێتان — زایە و بێ پاداش ناکەم...(١٩٥)).

ئایا بە جوانی بیرت لەو ئایەتە جوان و نەخشینە کردووەتەوە؟ ﴿فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم﴾، جا خوای گەورە لێرەدا نەیفەرموو: بانگی بانگەوازکارێك، چونکە پاڕانەوە خۆی لە خۆیدا کردارە .

ئایا کەسی سووخۆر بۆی هەیە تەوبە بکات؟ بەڵێ... بۆی هەیە تەوبە و گەڕانەوە لە گەڵ خواکەی خۆیدا تازە بکاتەوە، خوای گەورە تەوبەکەی لێ

وەردەگرێت و لە تاوانەکانی خۆش دەبێت، لەسەر ڕووی زەویدا هیچ بوونەوەرێك نییە بتوانێت دەرگای تەوبە بگرێت بە ڕووی کەسێکدا، خوای گەورە دەفەرموێت (لە کاتێکدا ئەوە ڕوون دەکاتەوە کەوا کەسی سوو خۆر ئەگەر ویستی تەوبە بکات ئەوا دەتوانێت تەنها سەرمایەکەی خۆی ببات و لەو دوای پارەکە تەوبە بکات) خوای گەورە دەفەرموێت: ((﴿ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا فَأْذَنُوا بِحَرْبٍ مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ ۖ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَالِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴾ البقرة: ٢٧٩، واتە: خۆ ئەگەر واتان نەکرد و دەستتان لە سوو خۆری هەڵنەگرت ئەوسا جەنگێکی گەورە ڕابگەیەنن لە گەڵ خوا و پەیامبەرەکەیدا ﷺ ئەگەر دەست لە سوو خۆری هەڵگرن ولێی پەشیمان ببنەوە سەرمایە کانی ماڵی خۆتان تەنها و (بێ سوو) بسێننەوە لە قەرزارەکان ئیتر نە ئێوە لە قەرزارەکان ستەم بکەن وە نە لە لایەن ئەوانیشەوە ستەمتان لێ بکرێ)).

بۆیە بگەڕێوە بۆ لای خوا و داوای لێخۆشبوونی لێ بکە و کاری چاکە بکە و ببەخشە و سامانەکەت پاك بکەرەوە و دڵنیابە کە خوای گەورە بە تەوبە و گەڕانەوەکەت خۆشحاڵ دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَهُوَ الَّذِي يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ وَيَعْفُو عَنِ السَّيِّئَاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴾ الشورى: ٢٥، واتە: هەر ئەویشە کە پەشیمانی لە بەندەکانی خۆی وەرئەگرێ لە تاوان و گوناهانیان – بچووك و گەورە – بۆ هەر کەسێك خۆی بیەوێ دەبوورێ وە دەشزانێ چی دەکەن))، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ وَيَأْخُذُ الصَّدَقَاتِ وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴾ التوبة: ١٠٤، واتە: ئاخۆ نەیانزانیبێ کە بێ گومان خوا تەوبە و پەشیمانی لە گشت بەندەکانی خۆی قەبووڵ دەکا وە سەدەقەش لە هەموو بڕواداران و دڵسۆزان وەردەگرێ بێ گومان هەر خوایە قبووڵکاری تەوبە و میهرەبان و دلۆڤانە )) .

داوا لە خوا دەکەین کە لێمان خۆش بێت و ڕزقی حەڵاڵمان بە نسیب بکات و هەر خۆی پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

له نیشانه ترسناکه‌کان: زۆربوونی خواردنه‌وه‌ی مه‌ی و ناونانی مه‌ی به ناوی تره‌وه:

جا مه‌ی له پێش ئیسلام هه‌بووه، موسڵمانان له سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ری خوادا ﷺ خواردوویانه‌ته‌وه له پێش ئه‌وه‌ی حه‌رام بکرێت، له‌و کاته‌دا له دانیشتنه‌کاندا هه‌روه‌کو ئاو پێشکه‌ش ده‌کرا، ئه‌مجار ئیسلام حه‌رامی کرد و قورئان حه‌رامی کرد، هه‌روه‌کو له هه‌ردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتووه له فه‌رمووده‌ی (أنس) ه‌وه که‌وا پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: ((إن من أشراط الساعة أن يرفع العلم، ويظهر الجهل ويشرب الخمر)) واته: له نیشانه‌کانی قیامه‌ت ئه‌وه‌یه که زانست هه‌ڵده‌گیرێ و نه‌فامی ده‌رده‌که‌وێت و مه‌ی ده‌خورێته‌وه)).

ئیمامی ئه‌حمه‌د له (مسند)ه‌که‌یدا و ابن ابی شیبه له(مصنف)ه‌که‌یدا و ئیمامی بوخاری له (التاريخ)ه‌که‌ی دا به سه‌نه‌دێکی (صحیح)[2] هاتووه له فه‌رمووده‌ی (ابی مالك الاشعری)ه‌وه که‌وا خۆشه‌ویست ﷺ فه‌رموویه‌تی: ((ليشربن ناس من أمتي الخمر يسمونها بغير اسمها)) واته: له ئوممه‌ته‌که‌مدا که‌سانێك په‌یدا ده‌بن که مه‌ی ده‌خۆنه‌وه و به ناوی تره‌وه ناوی لێ ده‌نێن)).

به ڕاستی ئه‌مه چه‌ند وشه‌یه‌که له پێغه‌مبه‌ری خوداوه ﷺ که دڵه‌کان پڕ ده‌که‌ن له دڵنیایی و باوه‌ڕ به‌و ڕاستگۆیه‌ی که هه‌رگیز له خۆ وه قسه ناکات .

سه‌رسام ده‌بیت کاتێ بزانیت که‌وا مه‌ی ته‌نها له‌م سه‌رده‌مه‌دا به ناوی تره‌وه ناو نراوه!! جا مه‌ی ئێستا پێی ده‌ڵێن (المشروبات الروحية) ! به مه‌به‌ستی خه‌ڵه‌تاندن و گومڕاکردن و تێکه‌ڵ کردنی شته‌کان !

إن قلت قال الله قال رسوله همزوك همز المنكر المتغالي
أو قلت: قال الصحابة و الأولي تبعوهم في القول والأعمال

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب ((العلم))، باب ((رفع العلم، وظهور الجهل)) (٨٠)، و مسلم كتاب ((العلم))، باب ((رفع العلم و قبضه و ظهور الجهل والفتن في آخر الزمان)) (٢٦٧١).

٢ـ أخرجه أحمد (٥ / ٣٤٢) (٢١٨٢٧)، وابن أبي شيبة (٧/ ٤٦٥)، والبخاري في ((التاريخ)) (٣٠٥/١/١) (٢٢٢/١/٤)، وأبو داود، كتاب ((الأشربة))،باب في ((الداذي)) (٣٦٨٨)، وابن ماجه كتاب الفتن، باب ((العقوبات)) (٤٠٢٠) و صححه الشيخ الألباني في الصحيحة (٩٠).

أو قلت: قال الشافعي وأحمد وابـو حنيفـة والإمـام الغـالي
صـدوا عـن وحـي الإلـه ودينـه وأحتالوا على حرام الله بالإحلال
يـا أمـة لعبـت بـدين نبيهـا كتلاعـب الـصبيان فى الأوحـال
حاشا رسول الله يحكم بالهوى والجهـل تلـك حكومـة الـضلال[1]

واتە: ئەگەر بڵێیت خوا و پێغەمبەرەکەی فەرمووی، ئەوا چاوەقرپێت لێ دەکەن وەکـو کەسـێکی بـێ بـڕوای لـە خۆبـایی، یـان بڵێیـت هـاوەڵان فـەرموویان و شوێنکەوتووانی ئـەوان لـە وتـە و کردەوەکانیانـدا،یان بڵێیت (الـشافعی) و (أحمـد) فـەرمووی، (ابـو حنیفـە) و پـشەوای بـە نـرخ و گرانبـەها (مەبەسـتی مالـك ە)، بەرهەڵستی وەحـی خـوا و دینەکـەی دەکـەن، فێـڵ دەکـەن لـەوەی خـوا حـەرامی کردووە و حەڵاڵی دەکەن، ئەی ئەو ئوممەتەی کە بـە دینی پێغەمبەرەکـەی یاریـان کردووە، وەکو یاریکردنی منداڵ لە نێو قوڕاودا،حاشا بێت کە پێغەمبەرﷺ حوکم بە هەوەس و نەفامی بکات، بە ڕاستی ئەوە حوکمێکی کوێرانەیە.

ئەگـەر بڵێیـت: ئەمـە (مـەی)ە... ئـەوا دەبیـسی کەسـانێك وڵامـت دەدەنـەوە و دەڵێن: نەخێر ئەمە (مشروبات الروحية) ئیتر بۆ حـەرامی دەکـەی؟ ئەگـەر ئـەڵێیت: ئەمە بەرازە! ئەوە یەکێکی تر دەڵێـت: مـن لـە گـەڵ تـۆدا جیـاواز نـیم، بـەڵام ئـەو بـەرازەی جـاران حـەرام کرابـوو بـەرازێکی نەخۆشـی دەردەدار بـووە و جۆرەهـا نەخۆشی پێوە بووە، بەڵام بەرازەکانی ئەمڕۆ لە ژێر چـاودێری پزیـشکدا پـەروەردە دەکرێن، ئیتر چی هۆیەك هەیە بۆ حەرام کردنی !؟ ولا حول ولا قـوة إلا بـالله العلـي العظيم.

بەڵێ ... فێڵ دەکەن لەسەر قەدەغەکراوەکانی خوای گەورە و دەیانەوێ حەڵاڵی بکەن، ئیللا مەگەر کەسانێك نەبێت خوای گەورە رەحمی پێ کردبێتن، جا تەماشای ئەم چەند وشە پێغەمبەرایەتییە بکە کە یەکێکە لە موعجیزاتی پێغەمبەری خـواﷺ: ((لیشربن ناس من أمتي الخمر يسمونها بغير اسمها ))، واتە: کەسانێك لە ئوممەتەکەم مەی دەخۆنەوە و بە ناوی ترەوە ناوی لێ دەنێن)).

---

١ـ ((إغاثة اللهفان)) (١/٢٣٢) ط المعرفة.

براکانم ... بە ڕاستی مەی دەردێکی کوشندە و مەزنە و دایکی هەموو نەخۆشییە پیسەکانە.

ئیمامی (النسائی) بە سەنەدێکی (صحیح)[1] لە گوفتاری عوسمانەوە ڕیوایەتی کردووە کەوا دەڵێت: ((اجتنبوا الخمر فإنها أم الخبائث، إنه كان رجل ممن خلا قبلكم تعبد فعلقته امرأة غوية، فأرسلت إليه جاريتها فقالت له: إنا ندعوك للشهادة فانطلق مع جاريتها، فطفقت كلما دخل بابا أغلقته دونه حتى أفضى إلى امرأة وضيئة عندها غلام وباطية خمر، فقالت: إني والله ما دعوتك للشهادة، ولكن دعوتك لتقع علي أو تشرب من هذه الخمرة كأسا أو تقتل هذا الغلام، قال: فاسقيني من هذا الخمر كأسا، فسقته كأسا، فقال: زيدوني فلم يرم حتى وقع عليها وقتل النفس، فاجتنبوا الخمر،فإنها والله لا يجتمع الإيمان وإدمان الخمر إلا ليوشك أن يخرج أحدهما صاحبه))، واتە: خۆتان بپارێزن لە مەی، چونکە ئەوە دایکی هەموو پیسەکانە، جا کابرایەکی خواپەرست لە پێش ئێوە هەبوو ئافرەتێکی داوێن پیس دڵی پەیوەست بوو پێوە، بۆیە کەنیزەکەکەی خۆی نارد و پێی گوت: ئێمە بانگت دەکەین بۆ گەواهییەك(شایەتییەك) ئەویش لە گەڵ کەنیزەکەکەدا ڕۆیشت، جا زەفەری پێ برد، لە هەر دەرگایەکەوە دەچوونە ژوورەوە ئەوا لە پاشی ئەو دەیگرت، تاکو گەیشتنە لای ئافرەتێکی زۆر جوان کە منداڵێك و دەفرێکی مەی لە نزیك بوو، ئافرەتەکە گوتی: سوێند بەخوا من تۆم بۆ گەواهی بانگ نەکردووە، بەڵکو بۆ ئەوە تۆم بانگ کردووە کە داوێن پیسیم لەگەڵدا ئەنجام بدەیت یان لەو(مەی)ە بخۆیتەوە وە یاخود ئەم منداڵە بکوژیت، (کابرایش بینی کە ناچارە بۆیە بە بۆچوونی خۆی سووکترین تاوانی لەو سێ تاوانە هەڵبژارد) گوتی: پەرداخێك لەو(مەی)ەم بدەرێ، ئەویش پەرداخێکی پێدا، گوتی: زیاترم پێ بدەن، جا وازی لێ نەهێنا تاوەکو لە گەڵ ئافرەتەکەدا داوێن پیسی ئەنجام دا و منداڵەکەیشی کوشت، بۆیە دوور بکەونەوە لە مەی، چونکە-سوێند بە خوا- هەر کە باوەڕ و بەردەوام بوون لەسەر مەی لەیەك دڵدا بیانەوی کۆ ببنەوە ئەوا یەکێکیان ئەویتر دەر دەکات)).

---

١ـ أخرجه النسائي كتاب ((الأشربة))ی، باب ((ذكر الآثام المتولدة عن شرب الخمر)) (٨/٣١٥)، و ((الكبرى)) (٥١٧٧)، وابن أبي شيبة في ((مصنفه)) (٥/ ٥٠٩)، وعبدالرزاق في ((مصنفه)) (٩/٢٣٦)، وانظر: ((الصحيحة)) (٢٧٩٨) وصححه الألباني في (صحيح سنن النسائي)).

جا زۆر ئەستەمە باوەڕ و خۆشویستنی مەی لە یەك دڵدا کۆ ببنەوە.

پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتووە لە فەرموودەی (أبو هريرە)وە: ((لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن، ولا يسرق السارق حين يسرق وهو مؤمن، ولا يشرب الخمر حين يشربها وهو مؤمن))، واتە: کاتێ کەسی زیناکار لەو کاتەدا زینا دەکات ئەوا ئیماندار نییە، کاتێ کەسی دز لەو کاتەدا دزی دەکات ئەوا ئیماندار نییە وە کاتێ کەسی مەیخۆر لەو کاتەدا مەی دەخواتەوە ئەوا ئیماندار نییە)).

إبن عباس[2] و جگە لەو دەفەرموون: ئەگەر کەسی ئیماندار مەی خواردەوە ئەوا بەم شێوە ئیمانی لێ دەسێنرێتەوە، ئەمجار ابن عباس پەنجەکانی کردە نێو یەکتردا و پاشان دەریهێنا، ئەگەر تەوبەی کرد ئەوا ئیمانەکەی بەم شێوەیە بۆ دەگەڕێتەوە (ئەمجار پەنجەکانی کردەوە نێو یەکتردا)، جارێکیان (أبو هريرە) دەستەکانی بەرز کردەوە بۆ سەر سەری و گوتی: ئا بەم شێوەیە ئیمانی لێ دەسێنرێتەوە و وەکو هەورێك لەسەر سەری رادەوەستێ ئەگەر تەوبەی کرد و گەڕایەوە ئەوا ئیمانەکەی بۆ دەگێڕێتەوە بەم شێوەیە[3].

مەڵێ: من مەی ناخۆمەوە بەڵکو تەنها دەیکڕم و دەرخواردی کەسانێکی جگە لە موسڵمانانی دەدەم! جا من دەڵێم: تۆ خۆت دەخەڵەتێنی، ئایا گوێت لەو فەرموودەیەی پێغەمبەرکەت نەبووەﷺ ؟!

ئیمامی ئەحمەد لە (مسند)ەکەیدا و الترمذي و أبو داود و ابن ماجە لە (سنن)ەکانیاندا بە سەنەدێکی (صحیح)[4] لەبەر چەند (شواهد)ێك لە فەرموودەی

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب ((الحدود))، باب ((الزنا و شرب الخمر)) (٦٧٧٢) و (٥٥٧٨)، ومسلم كتاب ((الإيمان))، باب ((بيان نقصان الإيمان بالمعاصي)) (٥٧).

٢ـ أخرجه البخاري كتاب ((الحدود))، باب ((إثم الزناة)) (٦٨٠٩)، من حديث ابن عباس رضي الله عنه وقد سبق.

٣ـ أخرجه المروزي في ((تعظيم قدر الصلاة)) (٤٧٢) وقد سبق.

٤ ـ أخرجه الترمذي، كتاب البيوع، باب ((النهي أن يتخذ الخمر خلاً)) (١٢٩٥)، وقال: ((هذا حديث غريب من حديث أنس))، وابن ماجه، كتاب الأشربة، باب ((لعنت الخمر على عشرة أوجه)) (٣٣٨١)، وله شاهد من حديث ابن عباس أخرجه أحمد (٣١٦/١)، وشاهدٌ آخر عن ابن عمر عند أحمد (٢٥/٢)، وأبي داود (٣٦٧٤)، وابن ماجه (٣٣٨٠)، وصححه العلامة الألباني في ((الصحيحة)) (٨٣٩)، و((الإرواء)) (١٥٢٩) و ((غاية المرام)) (٦٠)، و((صحيح الترمذي))

(أنس و ابن عباس و ابن عمر)ەوە – گوتەكە هی ابن عمرە – كەوا پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((لعن الله الخمر، و شاربها، و ساقیها، و بائعها، و مبتاعها، و عاصرها، و معتصرها، و حاملها، و المحمولة إلیه )) واتە: خوای گەورە نەفرەتی كردووە لە مەی و لەوەش كە دەیخواتەوە و لەوەش پێشكەشی خەڵكی دەكات و لەوەش دەیفرۆشێ و لەوەش دەیكڕێ و لەوەش دەیگوشێ و لەوەش باری دەكات و هەڵیدەگرێ و لەوەش بۆی هەڵدەگیرێ و بار دەكرێت)).

ئایا هیچ كەسێكی تر ماوە كە پێغەمبەری خواﷺ باسی نەكردبێت؟ بە راستی پێغەمبەری خواﷺ هیچ كەسێكی بە جێ نەهێشتووە، بۆیە وریابە هەرگیز نەڵێی: من نایخۆمەوە بەڵكو تەنها پێشكەشی جگە لە موسڵمانانی دەكەم، وریابە بەو قسانە هەڵمەخەڵەتێ ئەگینا تۆ – سوێند بە خوا – نەفرەتت لێ كراوە لە لایەن خوداوە و لەسەر زاری پێغەمبەری خوداوەﷺ ئەگەر ئەو كارە بكەیت لەپاش ئەوەی فێر بوویت و زانیت.

وریابە هەرگیز مەی پێشكەشی هیچ مرۆڤێك مەكە لەسەر زەویدا هەرچەندە ئەو كەسە بێباوەڕترین كەس بێت لەسەر زەویدا، خۆت مەخەرە بەر نەفرەتی خوا، ئەوەش بزانە كە نەفەرتی خوا مانای دوور كەوتنەوەیە لە رەحمەتی خوا، ئەو رەحمەتەی كە هەموو شتێكی گرتووەتەوە، بە راستی ئێمە لەوپەڕی پێویستیداین بۆ رەحمەتی خوداوەندی گەورە و باڵادەست، وریابە هەرگیز مەی هەڵمەگرە، هەرگیز پێشكەشی كەسی مەكە، هەرگیز مەیفرۆشە، هیچ كەسێك بۆی نییە بڵێت: ئەمە بەرژەوەندی تێدایە ! ! نەخێر...

بزانە كە بەرژەوەندییەكان (المصالح) دەبنە سێ بەشەوە [1]:

١. بەرژەوەندی شەرعی (مصلحة شرعیة) .

٢. بەرژەوەندییەكی بەفیڕۆچووی قەدەغەكراوی هەڵوەشاو(مصلحة مهدرة ملغاة محرمة).

٣. بەرژەوەندییەكی تر كە پێی دەڵێن ((مصلحه مرسله)).

---

١ ـ انظر: ((معالم أصول الفقه عند أهل السنة)) (٢٥٢ – ٢٤٣ ط دار ابن الجوزي) للجیزاني.

جا بەرژەوەندی شەرعی (المصلحة الشرعية): بریتییە لەو بەرژەوەندییانەی کە جووتن لە گەڵ بەڵگەی قورئانی پیرۆز یان سوننەتی پێغەمبەری نازدارﷺ ، واتا: هەرکە ئیسلام هەیە واتە بەرژەوەندی هەیە، هیچ کێشە نییە ئەگەر بڵێیت: هەرکە بەرژەوەندی هەیە واتە ئیسلام هەیە – بەو مەرجەی کە باس کرا – چونکە هەرگیز ئیسلام نەهاتووە تەنها لە بەر بەرژەوەندی بەندەکان و خۆشگوزرانی ئەوان لە دونیا و دوارۆژدا نەبێت، بەڵام ئەصل وایە کە بڵێین: هەرکە ئیسلام هەبێت واتە بەرژەوەندی هەیە، بەڵام هەندێ کەس هەن – بۆ نمونە – ترێ دەکەنە مەی لە بەر زیادکردنی سەرمایە و دەڵێت: ئەمە بەرژەوەندییە بە نیسبەت منەوە!! لەو کاتەدا پێی دەڵێین: نەخێر، ئەو بەرژەوەندییە پێی دەڵێین: بەرژەوەندییەکی بەفیڕۆچووی قەدەغەکراو و هەڵوەشاو (مصلحة مهدرة و محرمة و ملغاة) چونکە راستەوخۆ دەدا لە بەرژەوەندی شەرعی کە جیاوازە لە گەڵ قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەری خواﷺ، جا بەرژەوەندی بەفیڕۆچوو (المصلحة المهدرة) بەرژەوەندییەکە لە گەڵ بەرژەوەندی شەرعی دا جیاوازە و ناگونجێت، واتە: لە گەڵ قورئان و سوننەت دا جیاواز و ناکۆکە.

بەڵام (المصلحة المرسلة): بریتییە لەو بەرژەوەندییەی کە لە گەڵ بنەماکانی ئەم دینەدا جووتە، لە گەڵ بنەما گشتییە شەرعیەکاندا جیاواز نییە، بۆ نمونە: قایم کردن و مەحکەم کردنی گرێبەستی هاوسەرگرتن، جا ئەم بابەتە هیچ بەڵگەیەک نییە لە سەری لە قورئان و سوننەتدا، بەڵکو ئەوە پێی دەڵێن (المصلحة المرسلة) بۆ دڵنیاکردن و زامن کردنی مافەکانی ئافرەت لە سەردەمێکدا هەموو پەیمان و بەڵێنەکان تێکچوونە، بەو شێوەیە ئەودوای نمونەکانی بزانە.

کەواتە مەی دایکی هەموو شتە پیسەکانە، خوای گەورە لە یەکەم ئایەتەکاندا کە دەربارەی حەرام کردنی مەی هاتووە فەرموویەتی: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَـٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا﴾ البقرة: ٢١٩، واتە: لە بابەت بادە و شەراب و قومارەوە لێت ئەپرسن: خۆ ئەوانە حەڵاڵ و رەوان یان حەرام و ناڕەوان؟ پێیان بڵێ: تاوان و گوناهیان گەورەیە، بۆ خەڵکیش

بڕێ قازانج و کەڵکیان بۆ هەیە، بەڵام تاوان و زیانەکانیان لە سوود و بەهرەکەیان زۆرترە .)) جا ئەم ئایەتە یەکەم ئایەت بوو، پاشان ئەو ئایەتە دابەزی کە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ﴾ النساء: ٤٣، واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ! لە کاتێکدا سەرخۆشن، نزیکی نوێژ مەکەونەوە، هەتا دەزانن چی دەڵێن ! .)) چونکە مەی عەقڵەکان دادەپۆشێت و داگیری دەکات وە عەقڵیش هۆ و جێگەی پێ سپاردنە (مناط التكليف)، کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی (عومەر ی کوڕی خەتتاب) بانگ کرا و بە سەریدا خوێنرایەوە، ئەویش فەرمووی[1]: ((خودایە دەربارەی مەی ڕوونکردنەوەیەکی یەکلایی کار و دڵ سارێژکەرمان بۆ ڕوون بکەرەوە)) جا لە پاش ئەوە ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾ المائدة:٩٠ـ ٩١، واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕ! بێ گومان بن کە مەی خۆری و قومار بازی و کاغەزی (یانصیب)و ئەو بەردەی حەیوانی بتەکانی لەسەر سەر دەبڕێ بۆ بتەکان و فاڵگرتنەوە بۆ دەرکەوتنی بارێکی چاك یان خراپ یان بۆ تاقیکردنەوەی بەخت وەك عادەت و باو بوو ئەمانە گشت پیسن و لە کاری شەیتانن دەسا ئێوە خۆتانی لەدوور بگرن تا بەڵکو لەدونیاو قیامەتدا رزگار و بەختەوەربن(٩٠) شەیتان هەر ئەیەوێ بەشەراب خواردن و قومارکردن دوژمنایەتی و قین بخاتە ناوتان و لە یادی خوا و لە نوێژکردن رێتان لێ بگرێ و وەرتانگێڕێ ئاخۆ ئیتر ئێوە لەو کارانە دەسبەردار دەبن؟ واتە: دەبێ لەو شتانە دەست هەڵبگرن کە: خوا حەرامی کردون(٩١)).

---

١ ـ أخرجه أحمد(١/٥٣)، وأبوداود كتاب ((الأشربة))، باب ((تحريم الخمر)) (٣٦٧٠)، والترمذي، كتاب تفسير القرآن باب ومن سورة المائدة (٣٠٤٩)، وقال: ((حديث حسن صحيح))، و النسائي كتاب ((الأشربة))، باب ((تحريم الخمر)) (٨/٢٨٦)، وصححه علي ابن المديني. كما في ((الفتح)) (٨/١٢٩)، والحاكم (٤/١٤٣) ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي)).

لەو کاتەدا (عمر) بانگ کرا و بە سەریدا خوێنرایەوە ئەویش فەرمووی: دەستبەرداری بووین، دەستبەرداری بووین)).

ئایا ئێمە دەڵێین: پەروەردگارمان دەستبەرداربووین؟ یان چی دەڵێین؟ ئایا مەیخۆرەکان واز دەهێنن و دەستبەرداری دەبن؟ جا هەرکەسێ لای خوای گەورە تەوبە بکات ئەوا تەوبەکەی لێ وەردەگرێ.

بەڵێ... خێراکەن براکانم، داوا لە خوا دەکەم ئێمە و ئێوە بپارێزێ، من تاکو ئێستایش ئەوان بەبرای خۆم دەزانم چونکە من باش دەزانم کە بەندە هەر بەندەیەو پەروەردگاریش هەر پەروەردگارە... رەنگە هەندێ جار بەندەکان لاواز بن بەڵام لە هەمان کاتدا خەیریان تێدایە، براکەم بۆیە من بانگی تۆ دەکەم، ئەی ئەو کەسەی توشی ئەو بەڵایە هاتووی و کەوتوویتە ناو ئەو زەلکاوەوە وە ئەو تاوانە گەورەیەت ئەنجام داوە، یان تەنانەت (مەی)ت پێش ئاو خستبێت لەسەر خوانی خواردنەکەت، خێراکە هەر ئێستا: داوات لێ دەکەم لە بەر خاتری خوا هەر ئێستا بگەڕێوە بۆ لای خوای پەروەردگار، هەر ئێستا لەسەر خوانی نان خواردنەکەت دووری بکەرەوە، لە بەخچاڵ(ثلاجة) تایبەتییەکەت لەنوسینگەکەت یان لە ماڵەکەت،هەر ئێستا لەو بەڵایە و لەو نەخۆشییە خۆت رزگار بکە و روو لە پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکان بکە، دڵنیابە خوای گەورە شاد دەبێت بە تەوبە و گەڕانەوەکەت، بۆ ئەوەی تۆیش — انشاء الله — لە بەهەشتەکەیدا شادمان بیت بە خواردنەوەی ئەو مەیەی کە بۆ ئەوانەی ئەیخۆنەوە زۆر خۆش و بە مەزەیە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَّثَلُ ٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلۡمُتَّقُونَۖ فِيهَآ أَنۡهَٰرٞ مِّن مَّآءٍ غَيۡرِ ءَاسِنٖ وَأَنۡهَٰرٞ مِّن لَّبَنٖ لَّمۡ يَتَغَيَّرۡ طَعۡمُهُۥ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ خَمۡرٖ لَّذَّةٖ لِّلشَّٰرِبِينَ﴾ محمد: ١٥، واتە: نموونە و سیفەتی ئەو بەهەشتەی بە خۆپارێزان بەڵێن دراوە لە پاشەڕۆژدا پێیا بدرێت ئەم شێوەیە: رووباری زۆری لە ئاوی خاوێن و نەگۆڕاو و بێ بۆنی تێدایە، زۆر رووباری تێدایە، لە شیری سپی و جوان کە بە هۆی مانەوە — وەك شیری دونیا — تامی نەگۆڕاوە و چەندین چەم و رووباری تێدایە لە شەراب و مەیێك — کە بۆ ئەوانی ئەیخۆنەوە — زۆر خۆش و بە مەزەیە، واتە: دوورە لە هەر وەسفێکی مەیی دونیادا.)) مەی لە بەهەشتدا؟

بەڵێ... بەڵام ئەو جۆرەیان هەرگیز توشی سەرئێشەت ناکات و بە هۆیەوە عەقڵت لە دەس نادەیت.

خێراکە هەر ئێستا برای خۆشەویستم هەرگیز بێ هیوا و بێ ئومێد مەبە، ئیمامی (البخاری) لە (صحیح) ەکەیدا ریوایەتی کردووە لە فەرموودەی (عمر ی کوڕی خەتتاب)ەوە دەڵێت: ((أن رجلا علی عهد النبيﷺ كان اسمه عبد الله، وكان يلقب حمارا، وكان يضحك رسول الله ﷺ ، وكان النبيﷺ قد جلده في الشراب، فأتي به يوما فأمر به فجلد، فقال رجل من القوم: اللهم العنه، ما أكثر ما يؤتى به؟ فقال النبيﷺ: " لا تلعنوه، فوالله ما علمت إنه يحب الله ورسوله))،[١] واتە: کابرایەك هەبوو لە سەردەمی پێغەمبەری خواداﷺ ناوی عبداللە بوو وە بە (حمار) ناسراو بوو (واتە: گوێدرێژ) وە هەردەم پێغەمبەری خواﷺ بە هۆی ئەوەوە پێدکەنی، پێغەمبەری خواﷺ بە هۆی خواردنەوەی (مەی)ەوە بە قامچی لێی دابوو، ڕۆژێك ئەویان هێنا و ئەویش فەرمانی کرد و قامچیان لێدا، کابرایەك لە خەڵکەکە گوتی: خودایە نەفرەتی لێ بکە، هێنانی بۆ ئێرە چەندە زۆرە!!؟ کاتێ پێغەمبەری خواﷺ ئەو دەستەواژەی بیست چی فەرموو؟

فەرمووی: نەفرەتی لێ مەکەن، سوێند بە خوا، ئەوەی کە من دەزانم ئەو کابرایە خوا و پێغەمبەرەکەیﷺ خۆش دەوێت).

ئەم پیاوەی کە داری حەدی بە سەردا جێ بە جێ دەکرێت پێغەمبەری خواﷺ دەربارەی دەفەرموێت: ((ئەو خوا و پێغەمبەرەکەیﷺ خۆش دەوێت)) بەڵێ ..چونکە ئەو بەندەیەکی لاوازە، لە هەر ساتێکدا بێت تێدەکەوێ و هەڵە دەکات، بەڵام دەرگا هەردەم والایە، ئومێد و هیوا لە رەحمەتی خوای بە توانا و بە دەسەڵات زۆر و گەورەیە.

لە ڕیواتێکی تردا کە لە (صحیح البخاری) دا هاتووە لە فەرموودەی (أبو هریرە)ەوە دەڵێت: ((أتي النبيﷺ بسكران، فأمر بضربه . فمنا من يضربه بيده

---

١ ـ أخرجه البخاري كتاب ((الحدود))، باب ((ما يكره من لعن شارب الخمر و إنه ليس بخارج من الملة)) (٦٧٨٠).

ومنا من يضربه بنعله ومنا من يضربه بثوبه، فلما انصرف قال رجل: ما له أخزاه الله، فقال رسول اللهﷺ : "لا تكونوا عون الشيطان على أخيكم))[1] واتە: کابرایەکی سەرخۆشیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ ئەویش فەرمانی لێدانی دا، جا تیاماندا هەبوو بە دەستەکانی لێی دەدا، هەبوو بە پێڵاوەکانی، هەبوو بە جل و بەرگەکەی، کاتێ ڕۆیشت کابرایەك گوتی: بە راستی خوا شەرمەزاری کرد، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: مەبنە هاوکاری شەیتان بۆ سەر براکەتان)) .

لە ریوایەتێکی تردا (أبو هريره) دەفەرموێت[2]: ((فقلنا له: ما اتقيت الله، ما خشيت الله، وما استحييت من رسول الله ﷺ، ثم أرسلوه، فقالﷺ ((لا تقولوا هكذا، لا تعينوا عليه الشيطان، ولكن قولوا: اللهم اغفر له، اللهم ارحمه، اللهم تب عليه )) . واتە: ئێمە بە ئەومان گوت: ئایا بۆ خۆت لە خوا نەپاراست، ئایا بۆ لە خوا نەترسای، ئایا بۆ شەرمت لە پێغەمبەری خواﷺ نەکرد، ئەمجار لێی گەڕان و وازیان لێ هێنا، پاشان پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((وا مەڵێن، هاوکاری شەیتان مەکەن لەسەر ئەو، بەڵکو بڵێن: خودایە لێی خۆش بە، خودایە ڕەحمی پێ بکە، خودایە تەوبەی لێ وەرگرە)).

من لێرەوە وەکو شوێنکەوتنی خۆشەویستەکەمﷺ دوعا بۆ هەموو ئەو کەسانە دەکەم کە توشی مەیخواردن هاتوون و دەڵێم: خودایە ڕەحمیان پێ بکەیت، خودایە لێیان خۆش بە.

خێراکە — برا خۆشەویستەکەم — بڵێ، (هەروەکو هاوەڵان گوتیان): پەروەردگارمان ئەوا دەستبەرداری مەی بووین.

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[3] دا هاتووە کەوا (أنس ی کوڕی مالك) دەفەرموێت: ((كنت ساقي القوم في منزل أبي طلحة، وكان خمرهم يومئذ الفضيخ، فأمر رسول

---

١ ـ أخرجه البخاري كتاب ((الحدود))، باب ((ما يكره من لعن شارب الخمر)) (٦٧٨١).

٢ ـ أخرجه أحمد(٢/٢٩٩)، و أبوداود كتاب((الحدود))، باب ((الحد في الخمر)) (٤٤٧٧، ٤٤٧٨)، وصححه الألباني في ((المشكاة)) (٣٦٢١)، ((وصحيح أبي داود)).

٣ـ أخرجه البخاري كتاب ((المظالم))،باب ((صب الخمر في الطريق)) (٢٤٦٤)، وانظر أطرافه هناك، ومسلم كتاب ((الأشربة))، باب ((تحريم الخمر)) (١٩٨٠).

اللهﷺ منادیا ینـادي: " ألا إن الخمر قـد حرمـت " قـال: فقـال لـي أبـو طلحـة: اخـرج، فأهرقها، فخرجت فهرقتها، فجرت في سكك المدينة )) واتە: من مـەیگێڕ بـووم لـە مـاڵی (أبو طلحة) وە ئەو ڕۆژە مەیەکەیان (فضیخ) بوو (واتە: ئارەقی خورما)، لەو کاتەدا پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی کردە بانگەوازکارێك کە بانگ بکات: ئـەوا لـە ئـەمڕۆ بـە دواوە مـەی حـەرام و قەدەغـەکرا . دەڵێـت: (أبـو طلحـة) بـە مـنی گـوت: دەرچـوو، هـەمووی برێـژە . جـا منـیش دەرچـووم و هـەموویم ڕژانـد، بۆیـە بـە شـەقامەکانی مەدینەدا کەوتە ڕێ)).

تەماشـاکە براکـەم وەڵامدانـەوەی هـەموو هـاوەڵان بـۆ فەرمانـەکان چـۆن بـوو! خێراکە – برای موسڵمان – پەلەکە بە گەڕانەوە و وڵامدانەوە.

ئەم باسە بە چیرۆکێکی زۆر جوان تەواو دەکەم، کە ئەویش چیرۆکی (أبو محجـن الثقفـي)[1] ە، (أبـو محجـن الثقفـي) کابرایـەکی سوارچـاکی پاڵـەوان بـوو، لـە گـەڵ ئەوەیشدا توشی بەڵایەك هاتبوو ئـەویش خواردنـەوەی مـەی بـوو، ئـەم کابرایـە زۆر لاواز بوو بەرانبەر بە مەی، لە گـەڵ ئەوەیـشدا دەرچـوو بـۆ جـەنگی (القادسـیە) بـە مەبەستی تێکۆشان لە پێناوی خوادا لە گەڵ (سعد ی کوڕی أبـی وقـاص) دا، لـەوێ لە گۆڕەپانی جەنگەکە جارێکی تر لاواز بوو وە مەی خواردەوە، بۆیـە ئـەویان هێنـا بۆ لای (سعد ی کوڕی أبی وقاص)، (سعد) یش بەنـدی کـرد، حـوکمی دا بـە سـەردا بەوەی کە نابێـت لـەو جەنگـە بەشـداری بکـات – چـونکە سـنوورەکان(الحـدود) لـە گۆڕەپانی جەنگدا جێ بەجێ ناکرێت–ئەمجار جەنگ دەسـتی پـێ کـردو أبـو محجـن گوێبیستی حیلەی ئەسپەکان و دەنگی شمشێرو ڕمەکان بوو دەستی بەگریان کرد و ویستی بەشداری بکات و ویـستی هەسـتێت بـەڵام بـە کـۆت و زنجیر دەسـت و پێـی بەستراوەتەوە.

---

[1] ـ قال ابن حجر: في ((الإصابة)) (٣٢٣/٧): أبو محجن الثقفي الشاعر المشهور، مختلف في اسمـه، فقيـل: هـو عمرو بن حبيب بن عمرو بن عمير بن عوف.. . وقيل: اسمه كنيته، وكنيته أبو عبيد و قيل: اسمـه مالـك، وقيـل: عبدالله.. قـال أبـو أحمـد الحـاكم: ((لـه صحبة و يخيـل إلـيّ أنـه صـاحب سعد بـن أبـي وقـاص.. )). وانظـر: ((ألاستيعاب)) لابن عبدالبر ترجمة ابي محجن.

جا فەرموو ئەمە باسەکەیە بە تەواوی:

لە (مصنف عبد الرزاق)[١] دا بە سەنەدێك لە (ابن سيرين) ەوە هاتووە: أبو محجن هێشتا بەردەوام جەڵدەی لێ دەدرا بە هۆی مەیەوە، کاتێ ئەو کارە زۆر بووەوە بۆیە بەندیان کرد و بە کۆت و زنجیر بەستیانەوە، کاتێ ڕۆژی (القادسیە) هات ئەوانی دەبینی دەجەنگن، وا هاتە پێش چاوی کە بێ باوەڕان لە جەنگەکەدا پێش کەوتبێتن، بۆیە کەسێکی نارد بۆ لای دایکی کوڕەکانی سعد – یا بۆ لای خێزانەکەی – و پێی دەڵێت: کە أبو محجن پێت دەڵێت: ئەگەر ئەو ئازاد بکات و ئەم ئەسپەی پێ بدەی و چەکێکی پێ بدەیی، ئەوا لە پاش جەنگەکە یەکەم کەس دەبێت بگەڕێتەوە ئەگەر نەکوژرێت، جا لەو کاتەدا أبو محجن دەیگوت:

كفى حزناً أن تلتقي الخيل بالقنـــا          واترك مشدوداً على وثاقيـــــا
إذا شئت عنّاني الحـــديد وغلقت          مصاريع من دوني تصم المناديا

ئەمجار ئەویش ڕۆیشت و بە خێزانەکەی (سعد) ی گوت، ئەویش هەموو کۆت و زنجیرەکەی کردەوە و سواری ئەسپێکی کرد کە لە ماڵدا بوو وە چەکی هەڵگرت و ئەمجار بەپەلە خۆی گەیاندە موسڵمانان،جاکە دەگەیشتە هەر کەسێك دەیکوشت و پشتی دەشکاند، لەو کاتەدا (سعد) تەماشای کرد و سەرسام بوو، گوتی: ئەم سوارە کێیە؟ دەڵێت: پاش ماوەیەك خوای گەورە سەرکەوتنی بەخشییە موسڵمانان، جا أبو محجن گەڕایەوە و چەکەکەی گەڕاندەوە جێگەی خۆی و کۆت و زنجیرەکەی لە پێی خۆی کرد هەروەکو جاری پێشوو، پاشان سعد هات، خێزانەکەی گوتی: کوشتارەکەتان چۆن بوو؟ ئەمجار ئەویش بۆی باس کرد و گوتی: توش بووین و توش بووین ... تاکو خوای گەورە کابرایەکی نارد لەسەر ئەسپێکی بەڵەك (دووڕەنگ) بوو، جا ئەگەر من (أبو محجن) م لە کۆتەکەی بە جێ نەهێشتبایە ئەوا گومانم دەکرد ئەو بێت چونکە زۆر لەو دەچوو، ئەویش گوتی:

---

١ ـ أخرجه عبدالرزاق في ((مصنفه)) (٩/٢٤٤،٢٤٣)، وصحح سنده الحافظ في ((الإصابة)) (٧/٣٢٤)، ورواه ابن أبي شيبة في ((المصنف)) (٨/١٠، ١١) من وجهٍ آخر من طريق: إبراهيم بن محمد بن سعد عن أبيه قال: ((أُتي سعد بأبي محجن يوم القادسية)).

سوێند بە خوا ئەوە أبو محجن بوو، کارەکەیش بەو شێوە بوو .... ئەمجار هەموو چیرۆکەکەی بۆ باس کرد، ئەویش ناردی بە شوێنیدا و کۆتەکەی لێ کردەوە و گوتی: دەبێ هەرگیز بە هۆی مەیەوە جەڵدەت لێ نەدەین، أبو محجن گوتی: سوێند بە خوا دەبێ منیش هەرگیز نەیخۆمەوە، چونکە من پێم ناخۆش بوو لە ترسی جەڵدەدا وازی لێ بهێنم، جا لە پاش ئەوە چیتر نەیدەخواردەوە.

برای خۆشەویستم... هەرگیز بێ هیوا مەبە، هەرگیز بێ ئومێد مەبە خوشکی بەڕێزم... دەبا هەموو بگەڕێینەوە بۆ لای خوای بالا دەست و میهرەبان، هەروەها ئاگادارتان دەکەمەوە لە ماددە بێ هۆشکەرەکان... گەنجەکانمان ئاگادار دەکەمەوە... کچەکانمان ئاگادار دەکەمەوە... با ئەوە باش بزانین کەوا هەمووان بەرپرسین و هەموو خێزانێك بەرپرسە، هەموو دەزگایەکی ئاینی و ڕاگەیاندن و پەیڕەو و بەرنامەی فێربوون (المنهاج التعليميە) و یانەیەکی وەرزشی بەرپرسە، چونکە لاوانمان جگەرگۆشە و سۆمای چاوی ئێمەن.

| | |
|---|---|
| مؤامرة تدور على الشباب | لتجعله ركاما من التراب |
| مؤامرة تقول لهم: تعالوا | إلى الشهوات في ظل الشراب |
| مؤامرة يحيك خيوطها | أعداء سوء في لؤم الذئاب |
| تفرق شملهم إلا علينا | فصرنا كالفريسة للكلاب |

واتە: پلانێك بۆ لاوان دەگێڕدرێت، بۆ ئەوەی بیکاتە تەپۆڵکەیەك لە خۆڵ، پلانێکە پێیان دەڵێت: وەرن، بۆ هەوەسبازی لە ژێر سێبەری شەرابدا، پلانێکە دەزووەکەی دەچێندرێت لە لایەن، دوژمنانی خراپەوە لە ریسوایی گورگدا، ڕاو بۆچوونیان لە یەك جیاوازە تەنها لەسەر ئێمە نەبێت، بۆیە بووینە بە نێچیرێك لە بەر دەستی سەگدا.

ئەی برای خۆشەویستم... بگەڕێوە بۆ لای خوا، پارێزگاری لە نوێژی جەماعەت بکە، واز لە هاوەڵی خراپ بهێنە و، هاوڕێتی پاك و پوختەکان بکە، پەنا بگرە بە خوای گەورە و بالا دەست، باش بزانە کە خوداوەندی گەورە هەرگیز پەشیمانت

ناکاتەوە، چونکە ئەوەی پەنا بە ئەو بگرێت و پشت بە ئەو ببەستێ و هەموو کارەکەی بۆ ئەو بگێڕێتەوە ئەوا دڵنیابە کە هەرگیز پەشیمان نابێتەوە.

داوا لە خوا دەکەم هەموو برا و خوشك و لاوەکانمان بپارێزی و ڕێنمایی منداڵەکانمان بکات ﴿رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ الفرقان: ٧٤، واتە: ئەی پەروەردگارمان ! لە هاوسەرانمان و نەوەکانماندا مایەی ڕووناکی دیدە و خۆشیمان پێ ببەخشە تا هاوکاریمان بکەن لە خواپەرستیدا و گەل و کۆمەڵێکی وامان ببێ کە خواناس بێت وە خۆیشمان بگێڕە بە پێشەنگ بۆ لە خواترسان )).

## بەرزبوونەوە و نەمانی زانست و زانیاری و بڵاو بوونەوەی نەفامی

لــە نیـشانە بـچووکەکانی قیامــەت: ئەوەیــە کــە ئیمــامی (البخــاری و مــسلم)[١] ریوایــەتیان کــردووە لــە فــەرموودەی (أنــس)ەوە کــەوا پێغەمبــەری خــواﷺ فەرموویــەتی: (( إن مـن أشـراط الـساعة أن یرفــع العلـم، و یظهـر الجهـل )) واتــە: لــە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیــە کــە زانــست بەرزدەبێتــەوە(هەڵدەگێرێتــەوە) و نــەفامی دەردەکەوێت).

لەڕیوایەتی ئیمامی (البخاری)[٢] دا هاتووە: (( أن یقل العلـم و یظهـر الجهـل )) واتــە: زانیاری کەم دەبێـت و نەفامی دەردەکەوێت).

لە ڕیوایەتێکی تردا کە لە هــەردوو کتـێبی (صـحیح)[٣] دا هــاتووە لــە فــەرموودەی (ابن مسعود و ابی موسی)وە کەوا پێغەمبەری خـواﷺ فەرموویــەتی: ((إن بـین یـدي الساعة لأیاما، ینزل فیها الجهل، ویرفـع فیها العلم، ویکثر فیها الهرج " والهـرج: القتـل )) واتە: لە بەر دەستی قیامەتدا (لە پێش قیامەت) چەند ڕۆژگارێك هەیە نـەفامی تێـدا دادەبەزێت و زانیاری بەرز (هەڵدەگێرێتەوە) دەبێتەوە و (الهرج) زۆر دەبێت، مانـای (الهرج): کوشتنە)).

ڕەنگە کەسێك بڵێت: چۆن دەڵێیت: نەفامی بـڵاو دەبێتــەوە و زانیـاری نـامێنی و بەرز دەبێـتەوە، لە کاتێکدا ئێمە ئەو هەموو پێشکەوتنە زانستیە دەبینین ؟

وڵامی ئەو پرسیارە ئەوەیە کە مەبەست لـە فەرموودەکـەی پێغەمبـەری خـواﷺ زانیاری دونیا نییە بەڵکو زانیاری دەربارەی دوارۆژە و زانیاری دەربـارەی قورئـان و سوننەتە، بەڵام زانیـاری دەربـارەی ئـەم دونیایـە ئـەوا لـە زیـاد بووندایـە هــەروەکو ئێستا دەیبینین.

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب ((العلم))، باب ((رفع العلم، وظهـور الجهـل)) (٨٠)، و مـسلم كتـاب ((العلـم))، بـاب ((رفع العلم و قبضه و ظهور الجهل والفتن في آخر الزمان)) (٢٦٧١).

٢ـ أخرجه البخاري كتاب ((العلم))، باب ((رفع العلم، وظهور الجهل)) (٨١)

٣ـ أخرجه البخـاري كتاب ((الفـتن))، بـاب ((ظهـور الفـتن)) (٧٠٦٢، ٧٠٦٣)، و مـسلم كتـاب ((العلـم))، بـاب ((رفع العلم و قبضه و ظهور الجهل والفتن في آخر الزمان)) (٢٦٧٢).

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ بَلِ ٱدَّٰرَكَ عِلۡمُهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّنۡهَاۖ بَلۡ هُم مِّنۡهَا عَمُونَ ﴾ النمـل:٦٦، واتـە: نـا، بـەڵكو زانیـاری و زانستیان سـەبارەت بـە هاتنی ڕۆژی دوایی كۆتا و كورتە و نایگاتێ تا ئەوان بپرسن كەی دێت؟ بەڵكو ئەوان هەر لە گوماندان لێی، بڕوایـان پێی نییـە بۆیـە ململانـێ ئەكـەن، بـەڵكو لەئاسـتی نابیناو كوێرن بۆیە وا نكوڵی و ئینكاری ئەكەن !)) .

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ﴾ الروم: ٧، واتە: ڕووكەشێك لە ژیانی ئەم دونیا ئەزانن، كەچـی لـە ئـاخیرەت بێ ئاگا و غافڵن!)).

**ئایا پێغەمبەری خۆشەویستﷺ چی فەرمووە؟**

ئیمامی ئەحمەد لـە (مـسند)ەكەیـدا و ئیمـامی بوخـاری لـە (الأدب المفرد)دا بـە سەنەدێكی (صـحیح)[1] لـە (عبـدالله ی كـوڕی مـسعود)ەوە ریوایـەتیان كـردووە كـەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إن بين يدي السـاعة ... وظهـور القلـم)) واتـە: لـە بەر دەستی قیامەت دا (لە پێش قیامەت)... دەركەوتنی پێنووسەكانە)) بـە ڕاسـتی لـەم سـەردەمەدا پێنـووس دەركـەوتووە، نوسـین و ڕۆژنامەگـەری بـڵاو بووەتـەوە، هەروەها ڕۆژنامە و گۆڤار بە شێوەیەكی بەرچاو بڵاو بووەتەوە، بە تایبەتی لە پاش ئەوەی ئامێری چاپی نوێی پەیدا بووە و كە لە تەنها یـەك خولەكدا هـەزاران بـەڵكو مەلایین وشە چاپ دەكات، جا زانیـاری دەربـارەی ئـەم دونیایـە بـەردەوام لـە زیـاد بووندایـە هـەروەكو پێغەمبـەری ڕاسـتگۆﷺ فەرموویـەتی لـە كاتێكـدا كـە زانیـاری دەربارەی قورئان و سوننەت كەم بووەتەوە، بـەڵكو بـە ڕاسـتی نـەفامی دەربـارەی قورئان و سوننەت دەركەوتووە.

بەڵام... ڕێزداران دڵنیاتان دەكەمەوە – بەڵام گەردنم ئازاد بكەن لـە بـەر تونـدی وشەكانم: زۆربەی ئەهلی سەرزەوی بێئاگاو نەفامن دەربارەی پەروەردگاری زەوی و

---

١ ـ أخرجه أحمد (٤٠٧،٤١٩/١)، والبخاري في ((الأدب المفرد)) (١٠٤٩)، ولـه شاهدٌ أخرجه أحمد (٦٩/٥ مختصراً)، و النسائي (٢٤٤/٧ مختصراً) و في ((الكبرى)) (بطوله ٦٠٤٨) والطيالسي (١١٧١)، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (٦٤٧)، (٢٤٦٧).

ئاسمانەکان و بە پێشەوای پێغەمبەران و گەورەی پوختەکانﷺ ! بەڵێ ئەوە ڕاستییەکە و دەبێ ئاشکرا بکرێت، زۆربەی خەڵکی بێئاگان لەم دینە مەزنە.

بیر لەم ئایەتە پیرۆزەی خوای گەورە بکەرەوە: ﴿ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴾ یوسف: ١٠٦، واتە: خۆ بەشی زۆری ئەو خەڵکەش کە باوەڕ دێنێت هەر موشریك و بتپەرستن! چاك دەزانن کە خوا دروستکەری بوونەوەرە، کەچی لە گەڵ ئەوەشدا بتەکانیش دەپەرستن!)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ﴾ الأنعام: ١١٦، واتە: ئەگەر لە زۆربەی خەڵکانی ئەم سەر زەوییە کە بێ باوەڕن پەیڕەوی بکەیت لە ڕێگەی خوا لات ئەدەن و چەواشە و سەر لێشێواوت ئەکەن)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَمَا آمَنَ مَعَهُ إِلَّا قَلِيلٌ ﴾ هود:٤٠ واتە: خۆ ژمارەیەکی کەمیش نەبێت لە گەڵیا بڕوایان نەهێنا)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ ﴾ ص: ٢٤، واتە: ئەوانە نەبێت کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە، دیارە ئەوانەیش زۆر کەمن )).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ ﴾ سبأ: ١٣، واتە: بەڵام لە بەندەکانم کەمێکیان سوپاسگوزارن)).

ڕاستییەکی نەگۆڕە و بە پێی شەرع و قەدەری خوا، زۆربەی خەڵکی سەر زەوی بێئاگان لەو دینەی کە خوای گەورە خۆی ڕازی بووە ببێتە دینی ئەهلی زەوی و ئەهلی ئاسمان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ ﴾ آل عمران: ١٩، واتە: بێگومان تەنها ئەم دینی ئیسلامەیە پەسەند و قبوولە لای خوا چونکە پاڵاوتە و پوختەی تەواوی ئایینە ئاسمانییەکانی ترە)).

جا زۆربەی خەڵکی یەکتاپەرستی خوایان جێ بەجێ نەکردووە، باوەڕ بە پێغەمبەری خوایانﷺ جێ بەجێ نەکردووەﷺ، بەڵکو لەم دینە پیرۆز و بە

رەحمەت نێردراوەدا کەسانێك هەن هێشتا پایەکانی دینەکەیان نازانن بە زانیارییەکی راستی و دروستەوە و بە پێی ویستی خوای گەورە و ویستی پێغەمبەری خۆشەویستﷺ.

جا ئەی بەندەی خوا ! پایەکانی دینەکەت فێربە، چونکە زانیاری دەربارەی ئەو پایانە فەرزی عەینن و پێویستە هەموو موسڵمانێکی پیاو و ئافرەت بزانن)).

جا پایەی یەکەم لەم ئیسلامە یەکتاپەرستییە، ئایا مانای (لا الـه الا الله) چییە؟ ئایا پێویستییەکانی چین؟ ئایا هەڵوەشێنەرەوەکانی یەکتاپەرستی چین؟ ئایا مەرجەکانی وشەی(لا اله الا الله) چییە؟ جا ئەمانە چەند پرسیارێکی زۆر گرنگن، ئاخۆ ئێمە تا چەند شارەزاییمان لە وڵامەکانی هەیە !

هەروەها نوێژ: ئایا پایەکانی چییە؟ پێویستییەکانی چین؟ وە سوننەتەکانی چین؟ ئایا چی شتێك پوچەڵی دەکاتەوە؟ ئایا جیاوازی چییە لە نێوان پایە و پێویست و سوننەت (الرکن والواجب و السنة)؟

هەروەها بەنیسبەت خوشکە بەڕێزەکانمانەوە: ئایا جیاوازی چییە لە نێوانی خوێنی بێنوێژی (حیض) و خوێنی زەیسانی(النفاس)و خوێنی (استحاضة)؟وە حوکمی هەریەکە لەو خوێنانە چییە؟

چەند پرسیارێکە لەو پەڕی بایەخ و گرنگیدان! پێویستە لەسەر هەموو کەسێك شارەزایی لێ هەبێت، ئاگاداری پایەکانی دینەکەی بێت، من ئەو قسەیە ناکەم تەنها لە بەر ئەوەی روونی بکەمەوە کە بە راستی نەفامییەکی ئاشکرا بڵاو بووەتەوە، لە نێو زۆربەی خەڵکی سەر زەویدا بە شێوەیەکی گشتی و لە نێو زۆربەی موسڵماناندا بە شێوەیەکی تایبەتی لە شتێکدا کەوا پێویستە هەر هەموو کەسێك بزانێت، هۆی ئەو کێشەیە ئەوەیە: کە بە راستی زانیاری بەرز بووەتەوە – مەبەستم زانیاری دەربارەی قورئان و سوننەت – وە نەفامی بە شێوەیەکی بەرچاو دەرکەوتووە، چونکە زۆربەی خەڵکی لە دوارۆژی خۆیان بێ ئاگان و خەریکی دونیان، ولا حول ولا قوە الا بالله .

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: ئایا زانیاری چۆن بەرز دەبێتەوە؟ ئەم بابەتە لەوپەڕی ترسناکیدایە، جا ئەوەتا پێغەمبەرەکەمانﷺ بۆمان روون دەکاتەوە کە

بەرز بوونەوەی زانیاری مانای ئەوە نییە: کەوا کابرایەك شەو دەخەوێت و بۆ سبەینێ هەڵدەستێ دەبینی هیچ زانیارییەك لە سنگیدا نەماوە! ! نەخێر، ئەوە مەبەستەکە نییە لە بەرز بوونەوەی زانیاری، کەواتە مەبەستی چییە؟

بیر لەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خواﷺ بکەرەوە، لە هەردوو کتێبی (صحیح)[١]دا هاتووە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی عمرو)ەوە دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((إن الله لا يقبض العلم انتزاعا ينتزعه من الناس، ولكن يقبض العلم بقبض العلماء)) واتە: خوای گەورە کاتێك زانیاری هەڵدەگرێت و دەیباتەوە بە شێوەی هەڵکێشان لە خەڵکییەوە هەڵناکێشێت، بەڵکو ئەم زانیارییە هەڵدەگرێت و بەرزی دەکاتەوە بە مردنی زانایان)).

جا کارەساتەکە لەوێدایە، گەورەترین کارەسات لەم ئوممەتەدا ڕوو بدات مردنی زانایەکە، ئەو شتەی کە دڵەکان خوێناوی دەکات ئەوەیە کەوا ڕەنگە زانایەك لە گەورە زانایان کۆچی دوایی بکات لێرە یان لەوێ کەچی ئەم ئوممەتە ئاگایان لە مردنی نییە، چونکە زۆربەی کەناڵە ئاسمانییەکان یان زۆربەی دەزگاکانی ڕاگەیاندن وازیان لەو بەڕێز و پاك و پوختانە هێناوە و خۆیان خەریك کردووە بە خەڵکانی ترەوە کەوا دەبوایە ئەو زانایانە پێش هەموو یەکێك لەوان بکەوتایە، دەبێت ئەهلی زانیاری و ڕێز پێش بخرێن، لەو کەسانەی کە دەڵێن: خوای گەورە فەرمووی... پێغەمبەری خواﷺفەرمووی... بە زانست و تێگەیشتن و بەڵگە و بورهانەوە...جا مردنی زانایان گەورەترین کۆسپ و کارەساتە لەم ئوممەتەدا ڕوو دەدات.

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((حتى إذا لم يترك عالما، اتخذ الناس رءوسا جهالا، فسئلوا فأفتوا بغير علم، فضلوا وأضلوا)) واتە: تاوەکو هیچ زانایەك نامێنێ، خەڵکی چەند کەسێکی نەفام دەکەنە پێشەوای خۆیان و پرسیاریان لێ دەکەن و ئەوانیش فەتوا دەدەن بە بێ زانیاری، جا خۆیان گومڕا دەبن و خەڵکیش گومڕا دەکەن)) چەند نەفامێکن، لە گەڵ ئەوەیشدا دەوێرن فەتوا بدەن! بە ڕاستی واقعێکی بەسۆیە!.

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب ((العلم))، باب ((كيف يقبض العلم)) (١٠٠)، و مسلم كتاب ((العلم))، باب ((رفع العلم و قبضه و ظهور الجهل والفتن في آخر الزمان)) (٢٦٧٣).

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مەبەست لەو (علم)ەی کە پێغەمبەری خواﷺ باسی کردووە لەو فەرموودەیەی پێشوودا زانیارییە دەربارەی قورئان و سوننەت، جا پێغەمبەری خواﷺ لێرەدا فەرموویەتی: ((فسئلوا فأفتوا بغير علم، فضلوا وأضلوا)) ئاشکرایە کە گومڕایی روو لەم ئوممەتە ناکات ئیللا بە نەمان و بەرز بوونەوەی زانست نەبێت و بە مردنی زانایان نەبێت.

جا کارەساتە گەورەکە ئەوەیە کە ئێستا ئەم ئوممەتەی پێدا تێدەپەڕێت چەند کەسێکی نەفام دەوێرن فەتوا بدەن و بوێرن بەرانبەر بە زانست، من پڕ بە دەم دەڵێم: بە راستی پاشاگەردانی و بێ یاسایی یەك لە فەتواکان دەبینین کە لە رێگای کەناڵە ئاسمانییەکانەوە بڵاو دەکرێتەوە، تا رادەیەك خەڵکی توشی فیتنەیەکی راستەقینە هاتوون و دەڵێن: بە کێ باوەڕ بکەین؟ بەڵکو کەناڵە ئاسمانییەکان ئێستا ئەو شێخ و ئەهلی زانستانە کە لە رێگای شاشەکانیانەوە دەردەکەون دەڵێی شەڕە کەڵەباب دەکەن و بە گژیەکتردا دەچن، هەریەکەو بۆ خۆی قسەی خۆی هەیە!!.

دەڵێم: قسەکردن دەربارەی دینی خوا نە من و نە تۆ و نە هیچ کەسێك لەسەر رووی زەویدا بۆی نییە قسەی تێدا بکات، ئەگەر تۆ بەڵگەیەکت هەیە لە قورئانی پیرۆز و لە سوننەتی پێغەمبەری خواﷺ، بە تێگەیشتنی پێشینانی ئەم ئوممەتە (سەلەف) لە هاوەڵە پاك و پوختەکان و شوێنکەوتووان و شوێنکەوتووانی ئەوان ئەوا قسە بکە، کەچی کاك فلان یان خوشکە فلان دەردەکەون بۆ ئەوەی لە دینی خوادا قسە بکەن بەو شێوە سەیر و بوێرانە و بە بێ بەڵگە و زانیاری، رەنگە جاری وا هەبێت کە عەقڵی خۆی پێش ئایەتەکانی قورئان بکات یان فەرموودەکانی پێغەمبەری خواﷺ بە بانگەشەی ئەوەی کە ئەو زانیاری پێیە!

بەڵێ... زانیاری بەرز بووەتەوە، کەسانێکی نەفام لە قورئان و سوننەتەکەی پێغەمبەری خواﷺ پێشخراون بۆ ئەوەی بنوسێت و قسە بکات و رێنمایی بکات بە بێ ویستی خوا و پێغەمبەرەکەیﷺ!! فیتنە گەورەکە لەوێدایە کە ئەو کەسانەی قسە دەکەن ئەوانە کەسانێکن بە زمانی ئێمەوە قسە دەکەن و لە جل و بەرگی ئێمە

دەپۆشن، بۆیە ((حذیفة ی کوڕی الیمان) دەفەرموێت: (هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)[١] دا هاتووە): ((كان الناس يسألون رسول اللهﷺ عن الخير وكنت أسأله عن الشر مخافة أن يدركني، فقلت: يا رسول الله! إنا كنا في جاهلية وشر، فجاءنا الله بهذا الخير، فهل بعد هذا الخير من شر؟؟)) فقال النبي ﷺ: ((نعم))! قال حذيفة: و هل بعد ذلك الشر من خير؟ قالﷺ: ((نعم وفيه دخن)) قلت: وما دخنه؟ قال: ((قوم يهدون بغير هديي تعرف منهم وتنكر))؟ واتە: خەڵكی پرسیاریان دەكرد لە پێغەمبەری خواﷺ دەربارەی خەیر و چاكە، بەڵام من پرسیاری شەڕ و خراپەم لێ دەكرد لە ترسی ئەوەی پێم بگات، گوتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئێمە لە ناو نەفامی و شەڕ و خراپەدا بووین ئەنجا خوای گەورە ئەم خەیرەی بۆ هێناین، ئایا لە پاش ئەم خەیرە شەڕ و خراپە هەیە وەك چۆن لە پێشەوەیدا هەبوو؟ پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: بەڵێ، حذیفة گوتی: ئایا لە پاش ئەو شەڕ و خراپەیە خێر و چاكە هەیە؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: بەڵێ بەڵام خەڵتێكی تێدایە، گوتم: ئایا خەڵتەكەی چییە؟ فەرمووی: خەڵكانێك پەیدا دەبن لەسەر بەرنامە و ئاكاری من نارۆن، چاكە و خراپەشیان لێدەبینیت)).

واتە: چەند قسەیەكی نامۆ دەربارەی دینی خوا دەبیسی، زۆر بە دووری دەزانی كە ئەوە قسەی خوای گەورە و پێغەمبەرمان بێتﷺ ، یان لە دینی ئیسلامدا هەبێت ((قلت: فهل بعد ذلك الخير من شر؟ قال: ((نعم دعاة على أبواب جهنم من أجابهم إليها قذفوه فيها، قلت: يا رسول الله، صفهم لنا، فقال: هم من جلدتنا ويتكلمون بألسنتنا))، گوتم: ئایا لە پاش ئەو خێر و چاكەیە خراپە و شەڕ هەیە؟ گوتی: بەڵێ... بانگەوازكارانێك لەسەر دەرگاكانی دۆزەخ راوەستاون، هەر كەسێك وەڵامیان بداتەوە ئەوا فرێی دەدەنە ناو دۆزەخەوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ وەسفیان بۆمان بكە؟ فەرمووی: ئەوانە لە پێستی خۆماندان و بە زمانی خۆمان قسە دەكەن (مەبەستی ئەوەیە مرۆڤن)).

١ ـ أخرجه البخاري كتاب ((الفتن))، باب ((كيف الأمر إذا لم تكن جماعة)) (٧٠٨٤)، ومسلم كتاب ((الإمارة))، باب ((وجوب ملازمة جماعة المسلمين عند ظهور الفتن)) (١٨٤٧).

لە ریوایەتێکی تردا کە ئیمامی (مسلم)[1] ریوایەتی کردووە پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((رجال قلوبهم قلوب الشياطين في جثمان إنس)) قلت: فما تأمرني إن أدركني ذلك؟ قال: تلزم جماعة المسلمين و إمامهم، قلت: فإن لم يكن لهم جماعة و لا إمام؟ قال: فاعتزل تلك الفرق كلها ولو أن تعض بأصل شجرة حتى يدركك الموت وأنت على ذلك)) واتە: بە رواڵەتدا رواڵەتی مرۆڤە بەڵام دڵەکانیان دڵی شەیتانە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ بە چی شتێك فەرمانم پێ دەکەی ئەگەر ئەو سەردەمەم بە سەردا هات؟ گوتی: پەیوەست دەبیت بە کۆمەڵی موسڵمانان و پێشەواکەیانەوە,گوتم: ئەی ئەگەر موسڵمانان نە کۆمەڵیان هەبوو نە پێشەوا؟ گوتی:((خۆت بە دوور بگرە لە هەموو ئەو فیرقە و تاقمانە، ئەگەر چی بە قەپ گرتنیشت بێت بە رەگی دارێك هەتا مردن پێت دەگات، تۆش هەر بە هەمان شێوە دوور بگرە)).

بزانە کە بەرزبوونەوەی زانیاری ئەوە ناگەیەنێت کە زەوی چۆڵ دەبێت لە کەسانێك بانگەواز بکەن بۆ دینی خوا، ئەوە مەبەستەکە نییە، بەڵکو نەفامی بە شێوەیەکی زۆر بڵاو دەبێتەوە، ئەو زانایانەی کە تەنها لە بەر خوا کار دەکەن کەم دەبنەوە، بەڵام دەبێت سەر زەوی کەسانێکی تێدا بمێنێتەوە بۆ بانگەواز کردنی خەڵکی بۆ دینی خوا تاکو خوای گەورە خۆی ویستی لەسەر بێت، بزانە کەوا کۆمەڵی رزگار بوو لە هەموو کات و شوێنێکدا هەن، حەز دەکەم بە جوانی لە مەسەلەکە تێبگەین با وا نەزانین جیاوازی هەیە لە نێوان سوننەتەکانی پێغەمبەری خواداﷺ.

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[2] هاتووە لە فەرموودەی (معاویە)وە دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((لا تزال طائفة من أمتي قائمة بأمر الله، لا يضرهم من خذلهم أو خالفهم، حتى يأتي أمر الله وهم على ذلك))، لە ریوایەتەکەی ئیمامی (مسلم) دا هاتووە: ((وهم ظاهرون على الناس)).

---

١ ـ (١٨٤٧ / ٥٢).

٢ـ أخرجه البخاري كتاب ((المناقب))، باب (٢٨)،حديث (٣٦٤١)، ومسلم كتاب ((الإمارة))، باب ((قوله ﷺ: ((لا تزال طائفة من أمتي ظاهرين على الحق لا يضرهم من خالفهم)) (١٠٣٧/١٧٥).

دەبێ کۆمەڵی رزگار بوو بمێنن و بەردەوام رێنمووی خەڵکی بکەن، بۆ ئەوەی راستی روونەوە بکەنەوە بە بەڵگەی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵام نەفامی بە شێوەیەکی گشتی زۆر دەبێت، لەو پێناوەدا پێغەمبەری خوا ﷺ هێندە رێزی لە زانست ناوە و وەسفی زانایان دەکات، بەڵکو خوای گەورە لە قورئانەکەیدا فەزڵی زانستی باس کردووە و پلەو پایە و رێزی زانایانی لە زۆر ئایەتدا باس کردووە.

لە گەڵ مندا بیر لەم ئایەتەی خوای گەورە بکەرەوە: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ الزمر: ٩، واتە: بڵێ: ئایا ئەو کەسانەی کە زانان و شارەزان لە گەڵ ئەو کەسانەدا کە نەزان و نەشارەزان یەکسانن؟! " دیارە هەرگیز یەکسان نین جا هەر بەو جۆرەیش مرۆڤی چاك و خراپ بڕوادار و بێ بڕوا")).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾ فاطر:٢٨، واتە: بە راستی لە بەندەکانی خوادا هەر زاناکانن لە خوا ئەترسن و سەری نەوازشی بۆ دائەنوێنن چونکە هەر ئەوان دەزانن ئەو زاتەی چ خاوەن دەسەڵاتێکە ..)) .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ﴾ المجادلة: ١١، واتە: خوا ئەو کەسانەتان باوەڕیان هێناوە بەرز دەکاتەوە و ئەوانەش زانستیان پێ دراوە پلە گەلێ بە سەر باوەڕدارەکاندا بەرز دەکاتەوە، چونکە رێز و شەرەفمەندی لای خوا تەنها بە باوەڕ و زانستەوەیە...)).

بەڵکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ ﴾ آل عمران: ١٨، واتە: خوا لە رێگەی دروستکراوەکانییەوە شایەتی دەدا — خۆ هەر خۆی بەسە بۆ شایەتی — پاشان فریشتە و زاناکانیش شایەتی دەدەن کە: جگە لە خۆی هیچ پەرستراوێکی شیاوی راستەقینە نییە)).

جا یەکەم کەسێك گەواهی بە تەنهایی خوای گەورە داوە خوای گەورە خۆیەتی، ئەمجار فریشتەکان، ئەمجار لە پلەی سێیەمدا ئەهلی زانست و زانیاری باس کردووە.

ابن القيم دەڵێت: ((بە راستی ئەم دادپەروەرییە لەو پەڕی پلەی بەرزیدایە، چونکە خوای گەورە کەسی لەکەدارکراو ناکاتە شایەتی خۆی))[1]

بۆیە پێغەمبەری خواﷺ بایەخێکی زۆری بە زانست و قوتابیانی زانیاری و زانایان داوە... بایەخێکی زۆر، لە جێگایەکدا بە (علی)[2] دەفەرموێت: (( لأن يهدى الله بك رجلا واحدا خير لك من حمر النعم)) واتە: ئەگەر بە هۆی تۆوە خوای گەورە هیدایەتی کەسێك بدات ئەوا زۆر باشترە بۆ تۆ لە مەڕ و ماڵاتێکی زۆر.

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((من أن يكون لك حمر النعم)) واتە: لەوەی کە مەڕو ماڵاتێکی زۆرت هەبێت))جا بە وردی و جوانی بیر لەو ڕێز و پایەیە بکەرەوە.

لە فەرموودەیەکی تردا کە ئیمامی (الترمذي) و أبو داود و ابن ماجە و جگە لەوان بە سەنەدێکی (حسن)و بە بوونی چەند(شواهد) ێك ڕیوایەتیان کردووە لە فەرموودەی (أبي الدرداء)ەوە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((من سلك طريقا يلتمس فيه علما سهل الله له طريقا الى الجنة، وإن الملائكة لتضع أجنحتها رضا لطالب العلم، وإن العالم ليستغفر له من في السماوات ومن في الأرض، والحيتان في جوف الماء، وإن فضل العالم على العابد كفضل القمر ليلة البدر على سائر الكواكب، وإن العلماء ورثة الأنبياء وإن الأنبياء صلوات الله عليهم لم يورثوا دينارا ولا درهما، إنما ورثوا العلم فمن أخذه أخذ بحظ وافر))،[3] واتە: هەرکەسێك ڕێگایەك بگرێتەبەر بە دوای زانستدا بگەڕێت، ئەوا خوای گەورە ڕێگای بەهەشتی بۆ سووك وئاسان دەکات، فریشتەکان باڵەکانی خۆیان رادەخەن لە پێناوی رازی بوونی قوتابی زانستدا، ئەوەی لە زەوی و ئاسمانەکاندایە بۆ کەسی زانا داوای لێ خۆش بوون دەکەن، تەنانەت نەهەنگەکان لە قوڵایی دەریاکاندا، فەزڵی کەسی زانا لەسەر کەسی خواپەرست وەکو فەزڵی مانگی چواردەیە بە سەر هەموو ئەستێرەکاندا،

---

١ ـ ((مدارج السالكين)) (٢/٤٣٩) و (٣/٤١٢) بتصرف.

٢ـ أخرجه البخاري كتاب ((الجهاد والسير))، باب ((دعاء النبي ﷺ الناس الى الإسلام)) (٢٩٤٢)، ومسلم كتاب ((فضائل الصحابة))، باب ((من فضائل علي بن أبي طالب (ﷺ))) (٢٤٠٦)

٣ ـ أخرجه أحمد (٥/١٩٦)، وأبو داود كتاب ((العلم))، باب ((الحث على طلب العلم)) (٣٦٤١)، والترمذي كتاب ((العلم))، باب ((ما جاء في فضل الفقه على العبادة)) (٢٦٨٢)، وابن ماجه في ((المقدمة)) (٢٢٣)، وحسنه لغيره الألباني في ((صحيح الترغيب)) (٧٠) و ((المشكاة)) (٢١٢)، و((صحيح الجامع)) (٦٢٩٧).

زانایان میراتگری پێغەمبەرانن، پێغەمبەران دینار و دەرهەمیان بە جێ نەهێشتووە بەڵکو زانستیان بە جێ هێشتووە، جا هەرکەسێ لەو زانستەی برد ئەوا بە ناوچاوانێکی چاکەوە بردوویەتی)).

خوای گەورە ئێمە و ئێوە لە ئەهلی زانست و زانیاری و خواپەرستە راستگۆکان بژمێرێت .

لە فەرموودەیەکی تردا ئیمامی (الترمذي)[1] ریوایەتی کردووە بە سەنەدێکی (حسن) لە فەرموودەی (أبي أمامة الباهلي) یەوە: ((ذكر لرسول اللهﷺ رجلان أحدهما عابد والآخر عالم)) — واتە: باسی دوو کەسیان بۆ پێغەمبەری خواکردﷺ یەکێکیان لە خواترس و خواپەرست بووە و ئەویتر زانا بووە — ((، فقال رسول اللهﷺ: " فضل العالم على العابد كفضلي على أدناكم " ثم قال رسول اللهﷺ: " إن الله وملائكته وأهل السموات والأرضين حتى النملة في جحرها وحتى الحوت ليصلون على معلم الناس الخير)) واتە: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: فەزڵی زانا بە سەر خواپەرستەوە وەکو فەزڵی منە بە سەر بچووکەکەتانەوە، ئەمجار پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: خوای گەورەو فریشتەکان و ئەهلی ئاسمانەکان و ئەهلی زەوی و تەنانەت مێروولەیەك لە کونەکەی خۆیدا صەڵاوات دەنێرن بۆ مامۆستای خەیری خەڵکی)).

ئایا ئەمە چۆن فەزڵ و رێزێکە ؟؟!!

لە(صحيح مسلم)[2] دا هاتووە لە فەرموودەی (أبو هريرە) وە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((من سلك طريقا يلتمس فيه علما سهل الله له طريقا الى الجنة وما أجتمع قوم في بيت من بيوت الله يتلون كتاب الله ويتدارسونه بينهم إلا نزلت عليهم السكينة وغشيتهم الرحمة و حفتهم الملائكة، وذكرهم الله فيمن عنده ومن بطأ به عمله

---

١ـ أخرجه الترمذي كتاب ((العلم))، باب ((ما جاء في فضل الفقه على العبادة)) (٢٦٨٥) وقال: ((حديث حسن غريب صحيح))، و الطبراني في ((الكبير)) (٧٩١٢)، وصححه الألباني في ((صحيح الجامع)) (١٨٣٨)، وحسنه في ((المشكاة)) (٢١٣).

٢ـ أخرجه مسلم كتاب ((الذكر و الدعاء و التوبة و الاستغفار))، باب ((فضل الاجتماع على تلاوة القرآن و على الذكر)) (٢٦٩٩).

لم يسرع به نسبه ))، واته: هەرکەسێك ڕێگایەك بگرێتەبەر بە دوای زانستدا بگەڕێت، ئەوا خوای گەورە ڕێگای بەهەشتی بۆ سووك وئاسان دەکات، هەر کاتێك کۆمەڵێك لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوادا کۆببنەوە و کتێبەکەی خوا بخوێننەوە و ڕاڤەی بکەن ئیللا ئارامی و دڵنیاییان بە سەردا دادەبەزێت و بە ڕەحمەتی خوا دادەپۆشرێن و فریشتەکان بە دەورە و بەریاندا دادەبەزن و خوای گەورە لای فریشتەکانی لای خۆی باسی ئەوان دەکات، هەرکەسێ کردارەکەی لە سەرخۆ و هێواشی بکاتەوە ئەوا ڕەچەڵەکەکەی پەلەی پێناکات)).

بەڵکو لە (مسند أحمد) و (معجم الطبراني) دا بە سەنەدێکی (حسن)[1] هاتووە لە فەرموودەی (صفوان ی کوڕی عسال المرادی)ەوە دەڵێت: ((أتيت النبي ﷺ، وهو متكئ في المسجد على برد له أحمر، فقلت له: يا رسول اللهﷺ، إني جئت أطلب العلم، فقال النبي ﷺ: " مرحبا بطالب العلم، إن طالب العلم تحفه الملائكة وتظله بأجنحتها، ثم يركب بعضهم بعضا حتى يبلغوا السماء الدنيا من حبهم لما يطلب)): ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ لە کاتێکدا ئەو لە مزگەوت بوو، لەسەر کراسەکەی خۆی پاڵ کەوتبوو، گوتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ من هاتووم بە دوای فێربوون و داواکردنی زانستدا، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: سڵاو لە قوتابی و داواکاری زانست، دڵنیابە کەوا داواکاری زانست فریشتەکان هەردەم دەوریان گرتووە و بە باڵەکانیان سێبەری بۆ دەکەن، ئەمجار هەندێکیان سواری ئەوانی تر دەبن تاکو دەگەنە ئاسمانی دونیا لە بەر خۆشەویستی ئەوەی کە ئەو داوای دەکات)).

بە ڕاستی ئەمە ڕێزێکی زۆر بەرز و پیرۆزە، جا سڵاوت لێ بێت ئەی برای بەڕێزم... ئەی ئەو کەسەی کە سووری لەسەر ئامادە بوون لە کۆڕی زانستدا، سڵاو لە تۆیش بێت ئەی خوشکی بەڕێزم... ئەی داواکار و قوتابی زانست و ڕاستی.

---

١ـ أخرجه أحمد (٤/ ٢٣٩، ٢٤٠)، والطبراني في ((الكبير)) (٨/٥٤) (٧٣٤٧)، والحاكم (١ / ١٠٠، ١٠١) و صححه ووافقه الذهبي، وابن عدي في ((الكامل)) (٦/٣٣١)، وابن عبدالبر في جامع بيان العلم وفضله (١/ ٣٢)، وحسنه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (٣٣٩٧)

بەڵکو لە سەیرترین فەرموودە لەم بابەتەدا هاتبێت ئەوەیە کە ئیمامی (البخاری و مسلم)[١] ریوایەتیان کردووە لە فەرموودەی (أبي واقد الليثي) یەوە ((أن رسول اللهﷺ بينما هو جالس في المسجد والناس معه، إذ أقبل ثلاثة نفر، فأقبل اثنان إلى رسول اللهﷺ وذهب واحد، قال: فوقفا على رسول الله ﷺ ، فأما أحدهما: فرأى فرجة في الحلقة فجلس فيها، وأما الآخر: فجلس خلفهم، وأما الثالث: فأدبر ذاهبا، فلما فرغ رسول اللهﷺ قال: " ألا أخبركم عن النفر الثلاثة؟ أما أحدهم فأوى إلى الله فآواه الله، وأما الآخر فاستحيا فاستحيا الله منه، وأما الآخر فأعرض فأعرض الله عنه))، واتە: جارێکیان پێغەمبەری خواﷺ لە مزگەوت دانیشتبوو وە خەڵکی لە گەڵیدا بوون، سێ کەس بەرەو لای ئەمان هاتن، دوو کەسیان روویان لە پێغەمبەری خواﷺ کرد و ئەویتر رۆیشت، گوتی: وە لەسەر مەجلیسەکەی پێغەمبەری خواﷺ راوەستان، یەکێکیان کەلایی یەکی لە مەجلیسەکەدا بینی و دانیشت، ئەویتر لە پشتی ئەوانەوە دانیشت، کەسی سێیەم پشتی لەوان کرد و رۆیشت، کاتێ پێغەمبەری خواﷺ لە قسەکانی بووەوە فەرمووی: ئایا باسی ئەو سێ کەسەتان بۆ بکەم؟ یەکێکیان پەنای برد بۆ لای خوا، خواش پەنای ئەوی دا، ئەویتریان شەرمی کرد بۆیە خواش شەرمی لە ئەو کرد، ئەویتریان مەجلیسەکەی فەرامۆش کرد خواش ئەوی فەرامۆش کرد)).

بۆیە هەرگیز پشت لە قورئان و فەرموودە مەکە... ئەی برای شیرینم...

سوێند بە خوا ئەم ئوممەتە سووك و ریسوا نەبوو ئیللا لە پاش ئەوەی لەقورئانەکەو فەرموودەکەی پێغەمبەرﷺ دوور کەوتنەوە... ئیللا لە پاش ئەوەی زانا لە خواترسەکان کۆچی دواییان کرد و کەللە بۆش و نەفام و بەتاڵەکان پێش کەوتن بۆ ئەوەی لە دینی خوادا بە بێ زانیاری قسە بکەن!!

جا باس و کێشەی زانست و زانیاری باسێکی زۆر گەورەیە، لە بەر ئەوە ئێستا من لێرەدا ئاماژە بۆ زۆری فەتوا دەکەم... بە تایبەتی لەسەر تۆڕی ئەنتەرنێت و

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب ((العلم))، باب ((من قعد حيث ينتهي به المجلس))(٦٦)، ومسلم كتاب ((السلام))، باب ((من أتى مجلسا فوجد فرجة فجلس فيها و إلا وراءهم)) (٢١٧٦).

زۆربەی سایتەکان، زۆربەی ڕۆڵە و گەنجەکانمان داوای فەتوا لەو سایتانە دەکەن لە چەندەها کێشەی زۆر ترسناك و گەورە، ئەگەر پرسیار لە (عومەر ی کوڕی خەتتاب) بکرایە ئەوا هەموو هاوەڵانی ئەهلی بەدری بۆ کۆ دەکردنەوە، جا ئەوە بابەتێکە لەوپەڕی ترسناکیدایە، لەو پێناوەدا من دەڵێم: کێشە و باسی زانست و زانیاری لە ترسناکترین کێشەکانە، بەڵکو لە ترسناکترین کێشەیە کە نێوان لاوانی ئەم ئوممەتە و زانا راستەقینەکان بگرن و نەهێڵن گوێیان لێ بگرن، ئەو زانایانەی کە دەڵێن: خوای گەورە فەرمووی ... پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ... بە تێگەیشتنێکی وردەوە، تێگەیشتنێکی قووڵەوە لە قورئان و فەرموودە و ئەو واقیعەی کە ئەم ئوممەتەی تێدا دەژین.

ابن القیم دەڵێت[1]: ((نابێت هیچ زانایەك یان هیچ مفتی یەك یان هیچ دادوەرێك لە هەر بابەتێکدا فەتوا بدات تاکو ئەو دوو زانستەی نەبێت:

یەکەمیان: تێگەیشتن لە واقیع.

زانستی دووەم: تێگەیشتنی پێویستی لە واقیعدا، واتە: تێگەیشتن لە بەڵگە شەرعییەکان کە لەسەر ئەو واقیعە جێ بە جێ دەبێت کەوا ئێمە دەیخوێنین و لێی دەکۆڵینەوە . واتە: پێش ئەوەی بڵێم: خوای گەورە فەرمووی و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ئایا من لە واقیعی ئەو خەڵکە شارەزام و چاوڕوونم یان نا؟ ئایا من شارەزای واقیعی ئەم ئوممەتەم و شارەزای قەبارەی ئەو پلانەم کە لێی دەکرێت یان نا؟

زۆر سووك و ئاسانە ببینە هۆی هەڵچوونی گەجەکانمان، یان سۆزیان بجوڵێنینەوە، بەڵام خیانەتە بەرانبەر بە خوا و پێغەمبەرەکەی(ρ) و ئیمانداران، زانایەك یان بانگەوازکارێك یان پێشەنگی لاوان بێ ئاگا بێت لە واقیعی ئەم ئوممەتە، بێ ئاگا و چاو روون نەبێت لە واقیعی جیهان، چەندەها بەڵگە بۆ لاوان و خۆشەویستانمان لە ڕۆڵە و کوڕەکانمان بهێنین بە بێ لێکۆڵینەوەی هۆکارەکانی

---

١ـ ((إعلام الموقعین)) (١ / ٨٧ ط الجیل – بتصرف).

حوکمی ئەو بەڵگەیانە، بە بێ بەستنەوەی ئەو بەڵگانە لە قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە لایەك و ئەو واقیعەی کە ئەم ئوممەتەی تێدا دەژێت بە تایبەتی و مرۆڤایەتی بە گشتی لە لایەکی ترەوە.!!

جا ئەم کێشە و باسە لەوپەڕی ترسناکیدایە! ! بۆیە دەڵێین: دەبێت لە بەڵگەکان تێبگەین، دەبێ لە بەڵگەی قورئانی پیرۆز و سوننەتەکەی پێغەمبەر تێبگەین .

برای خۆشەویستم ... ئەگەر هاتوو بەڵگەکە ڕاست و دروست بوو ئەوا دەبێ تەماشای تێگەیشتنی بەڵگەکە بکەین، دەبێ پلە و پایەکانی بەڵگەکان بزانین، هۆی حوکمی بەڵگەکان و پوختەکان و ئاشکرا و حوکمە گشتی و تایبەتییەکان و بەڵگە هەڵوەشێنەرەوەکان و هەڵوەشێنراوەکان (الناسخ و المنسوخ) بزانین، جا بەڵگە بە تەنها ئەوپەڕی زانست نییە، بەڵکو دەبێت بەستنەوەیەکی ڕاست و دروست هەبێت لە نێوان بەڵگەکان و گۆڕانکاری و شتە نوێیەکانی ئەم واقیعە، پاشان گەڕانەوە بۆ لای زانا لە خواترسەکان، ئەم ئوممەتە بە فەزڵی خوا هەرگیز چۆڵ نابێت لە ڕۆڵەکانی کۆمەڵەی ڕزگار بوو (الطائفة المنصورة) بۆ ئەوەی لە مەبەستی خوا و مەبەستی پێغەمبەرەکەی تێبگەین، بۆیە ئیمامی (البخاری) لە (صحیح)ەیدا دەرگایەکی کردووەتەوە بە ناوی (کتاب العلم) دەرگایەکە لەوپەڕی تێگەیشتن و فیقهدایە.

دەڵێت: ((باب العلم قبل القول والعمل)) واتە: دەرگای زانست لە پێش وتە و کردەوە)) دەرگایەکی فیقهییە و لێی تێگەیشتووە، واتە: پێش ئەوەی قسە بکەم و کار بکەم دەبێ فێریم و بزانم، لە سەرەتای دەرگاکەدا ئەو ئایەتەی خوای گەورەم هێناوەتەوە کە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێت: ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مُتَقَلَّبَكُمۡ وَمَثۡوَىٰكُمۡ ﴾ محمد: ١٩، واتە: جا ئەی موحەممەد ﷺ ! ئەی ئینسان ! بزانە کە بێ گومان جگە لە (الله) هیچ پەرستراوێکی هەق نییە مافی پەرستنی ببێ، دەسا تۆش لەسەر ئەو بیر و باوەڕە جێگیر بەو هەرگیز نەگۆڕێیت، بۆ خۆت و ئیمانداران لە پیاوان و ژنان داوای لێبووردنی گوناهان بکە، خوا خۆی چاك دەزانێت ئێوە چۆن هەڵدەسووڕێن و چۆن

ئیسراحەت ئەکەن وە بە ڕۆژوو بەشەو چی ئەکەن، واتە: هەموو ئەحوالّتان ئەزانیّ و هیچی لیّ شاراوە نییە)).

لێرەدا خوای گەورە فەرمان دەکاتە پێغەمبەرەکەیﷺ بە دوو شت:

- بە زانست و زانیاری لەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾.
- بە کار کردن لەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ((وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ)) ابن المنير دەڵێت: (لە ابن حجر ەوە دەیگێڕێتەوە)[١]: ((خوای گەورە زانستی پێش کار و کردار خستووە، چونکە زانست و زانیاری راستکەرەوەی نیەت و مەبەستە کە لە ڕێگەیەوە هەموو وتە و کردەوەیەك ڕاست دەکرێتەوە)).

براکەم ... وریابە هەرگیز هیچ هەنگاوێك مەنیّ بە بیّ زانیاری، هەڵچوون و توندی یەکەت ڕێزی خۆی هەیە بەڵام بە تەنها بەس نییە، دڵسۆزیت بۆ ئەم دینە ڕێزی تایبەتی خۆی هەیە بەڵام هەڵچوون و دڵسوزیت بەس نین، کەواتە چیتر هەیە؟ دەبیّ هەڵچوون و دڵسۆزیت پابەندی مەرجەکانی شەرع بن، بەڵی دوای زەرەرمەند دەبین لە کاتێکدا دەمانەویّ سوود بگەیەنین وە کارەکە خراپ دەکەین لە کاتێکدا چاکسازیمان دەوێت، دەبینە هۆی خوێن ڕشتنی خەڵکی بە ناوی تێکۆشان لە پێناوی خوادا و بە ناوی غیرەتمان بۆ دینەکە، دبینە هۆی پەیدا کردنی بیدعە بە ناوی فەرمان کردن بە چاکە وە نەهی کردن لە خراپە!! کەچی کارەکە بە هیچ شێوەیەك وا نییە.

ئایا دەزانی خەواریج – سەگەکانی ئەهلی دۆزەخ – ئیمامی (عەلی) یان بە کافر زانی؟ بە چەند بەڵگەیەکەوە لە قورئانەوە، بەڵام بە تێگەیشتنی خۆیان، ابن عەباس ڕۆیشت بۆ لایان بۆ ئەوەی پرسیاریان لیّ بکات کە ئایا بۆ ئیمامی (عەلی) بە کافر دەزانن؟ لە پێشدا لە ناو لەشکری ئیمام (عەلی) دا بوون بەڵام لە لەشکرەکە

---

١ـ ((الفتح)) (١٦٠/١) ط دار المعرفة. بتصرف.

دەرچوون لە پاش کێشەی (التحکیم) لە نێوان خۆی و مەعاویە، کاتێ کە (ترجمان القران) و زانا و دانای ئەم ئوممەتە ڕۆیشت بۆ لایان، بۆ ئەوەی گفت و گۆیان لە گەڵدا بکات دەربارەی ئەو گومڕاییەی بۆی چوونە، ئایا بەڵگە و بورهانی ئەوان چی بوو ؟!

گوتیان:

یەکەم : ئیمامی عەلی چەند پیاوێکی بە کار هێناوە بۆ حوکم دانان لە دینی خوادا، کەچی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ ﴾ (٥٧) سورة الأنعام) واتە: چونکە هەموو حوکم و بڕیارێك هەر هی خوایە، هەموو شتێ هەر بە دەستی ئەوە)) کەوایە ئیمام عەلی کوفری کردووە! جا بە بەڵگەی ئەم ئایەتە ئەویان بە کافر زانی... ! جا هیچ کەسیك نکۆڵی لەوە ناکات کە ئەمە ئایەتێکی قورئانە بەڵام ئەوان خراپ لێی تێگەیشتبوون .

دووەم : ئیمام عەلی لە گەڵ کۆمەڵێکدا کوشتاری کردووە کەچی ژنەکانیانی بە جاریە و کەنیزەك نەهێناوە (مەبەستی عائیشة و طلحة و الزبیر و معاویة بوو) - ڕەزای خوا لە هەموو هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ - وە ماڵ و سامانیانی بە غەنیمەت و دەستکەوت نەهێناوە، جا ئەگەر ئەوان موسڵمانن ئەوا کوشتاریان حەرامە، ئەگەر ئەوان کافر و بێ باوەڕن ئەوا ژن و سامانیان حەڵاڵە ! بە ڕاستی ئەمە گومان و کارەساتە، جا ئەگەر کەسێك لەم دینە تێنەگەیشتبێت و زانست و زانیاری نەبێت ئەوا دەڵێت: ئەم قسەیە تەواوە ! چونکە ئیمامی عەلی وای کردووە !! سوێند بە خوا بە ڕاستی ئەم گومانە ترسناکە ئەوانی بەرەو ئەو کارەساتە بە سۆیە برد !

سێیەم: ئەو دەستی لە کار کێشایەوە وەکو (أمیر المؤمنین) یێك لە کێشەی (التحکیم) دا، جا ئەگەر ئەو ئەمیری ئیمانداران نەبێت ئەوا ئەمیری بێ باوەڕانە ! ئا بەم شێوەیە ئەمە بەڵگەکانیان بوو...

ڕەد دانەوەی ئەو سێ گومانە:

ئەوەیە کە ابن عەباس فەرمووی... فەرمووی: ئایا ئەگەر ئەو کێشەیە بە ئایەتی

قورئـان و فـەرمودەی پێغەمبـەرﷺ روون بکەمـەوە ئایـا دەگەڕێنـەوە؟ گوتیـان: بەڵێ... کوا ابن عەباس بەڵگەکانت بهێنە... جا تەماشای روناکی زانیاری بکە چۆن تاریکی نەفامی تێك و پێك دەدات .

الجهل قبل الموت موت لأهلـــه و أجسامهم قبل القبور قبـور
وأرواحهم فى وحشة من جسومهم وليس لهم قبل النشور نشور

واتە: نەفامی مردنە بۆ خاوەنەکەی لە پێش ئەوەی بمرێت وە جەستەیان گۆڕە لە پێش ئەوەی ببرێن بۆ گۆڕستان، روحەکانیان لە دڵتەنگی و سامناکیدایە بەرانبەر بە جەستەیان، لە پێش رۆژی زیندووبونەوە زیندووبونەوەیان نییە.

جا لە گەڵ مندا بیر لەو گفتو گۆیە شیرینە بکەرەوە کە لـە نێـوان ابـن عـەباس و سەرکردەی خەواریجەکاندا روویدا لە رێگای ئەم دوو ریوایەتەوە:

یەکەم: لە (عبیداللە ی کوڕی عیاض ی کوڕی عمرو القاری)یەوە ریوایەت کراوە و دەفەرموێت: (عبداللە ی کوڕی شداد) هات و چـووە ژوورەوە بـۆ لای عائیـشە رضي الله عنها، لە کاتێکدا ئێمەش لای ئەو دانیشتبووین، عبداللە لە عێراقەوە گەڕابووەوە، لە پـاش چەند شەوێك لە کوژرانی عەلی رضي الله عنه، دایکە عائیشە رضي الله عنها پێی فەرموو: ئـەی (عبـداللە ی کوڕی شەدداد)، ئایا تۆ لە گەڵ مندا راست دەکەیت ئەگـەر هـەر پرسـیارێکت لـێ بکەم؟ دەربارەی ئـەو کۆمەڵـە بـۆم بـدوێ کـەوا عـەلی رضي الله عنه لـە گەڵەیانـدا دەجـەنگا، گوتی: ئایا چی شتێك وام لێ دەکات کە راستت لە گەڵدا نەکەم؟

ئەویش فەرمووی: فەرموو باسی چیرۆکەکەی ئەوانم بۆ بکە. گـوتی: کاتێك کـەوا عەلی رضي الله عنه بـۆ معاویـە رضي الله عنه نوسـراوێکی نوسـی و دوو کەسـی بـە دادوەر دانـا، هەشـت هەزار قورئان خوێن لە نێو خەڵکییەوە دەرچوون، بۆیە لە جێگایەك جێگیر بوون کە پێی دەڵێن (حروراء) لە نزیك شاری کوفەیە، ئەوانیش گلەیی و گازندەیان لێ کـرد و گوتیان: کراسێك خوای گەورە لە بـەری کردبـووی خـۆت بـە دەسـتی خـۆت لـە بـەر خۆتت داکەند، ناوێك کەوا خوای گەورە ناوی لـێ نـابووی خـۆت سـڕیتەوە، ئـەمجار چوویت کەسانێکت کردە دادوەر لە دینی خوادا، ئێمەش دەزانین کـە هـیچ حوکمێـك

جگە لە حوکمی خوا نییە . کاتێك ئەو هەواڵ و گلەیی و گازندانە گەیشتە عەلیﷺ کە لەو پێناوەدا لێی جیابوونەتەوە، فەرمانی کردە بانگدەرێك ئەویش بانگی دا: کەوا نابێت هیچ کەسێك بچێتە ژوورەوە بۆ لای (ئەمیری ئیمانداران) ئیللا هەڵگرانی قورئان نەبێت . کاتێك ماڵەکە پڕ بوو لە قورئان خوێنان، ئەمجار داوای قورئانی کردو لە بەر دەستی خۆیدا داینا، پاشان بە دەستەکانی دەیدا لە قورئانەکە و دەیفەرموو: ئەی قورئانەکە، بۆ خەڵکەکە قسە بکە . بۆیە خەڵکی بانگیان لێکرد و گوتیان: ئەی ئەمیری بڕواداران، پرسیار چی لێ دەکەیت لە کاتێکدا ئەو تەنها مەرەکەبە لەسەر کاغەز، ئێمەش ئەوە دەڵێین کە لە ئەوەوە ریوایەتمان کردووە، چیت دەوێ؟ گوتی: هاوەڵانتان، ئەوانەی کە دەرچوونە لە نێوان من و ئەواندا قورئان حوکم بکات.

خوای گەورە لە کتێبەکەیدا دەربارەی پیاو و ژنێك دەفەرموێت: (( وإن خفتم شقاق بينهما فابعثوا حكما من أهله وحكما من أهلها إن يريدا إصلاحا يوفق الله بينهما ))[1] جا بزانن کەوا حورمەتی خوێنی ئوممەتی (محمد) مەزنتر و گەورەترە لە پیاو و ژنێك، ئەوان خشم و قینیان لێ هەڵگرتم چونکە من نوسراوێکم بۆ معاویەﷺ نوسی: ئەوەیش نوسی (علی کوڕی ئەبو تالیب) (واتە: نەنوسی ئەمیری ئیمانداران)، بزانن کاتێك (سهیل ی کوڕی عمرو) لە ڕۆژی (الحديبيه)هات و ئێمەش لە گەڵ پێغەمبەری خواداﷺ بووین بۆ ئەوەی لە گەڵ قورەیشدا ڕێك بکەون، جا پێغەمبەری خواﷺ نوسی: ((بسم الله الرحمن الرحيم)) کەچی سهیل گوتی: مەنوسن: (بسم الله الرحمن الرحيم) . ئەویش فەرمووی: ئەی چی بنوسین؟ گوتی: بنوسن: (باسمك اللهم)، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئەمجار بنوسە: (محمد رسول الله). سهیل گوتی: ئەگەر بە پێغەمبەرت بزانم سەرپێچیم نەدەکردی و لە گەڵ تۆدا

---

١ـ واتە: خۆ ئەگەر ترستان لە بشێوی و ناکۆکی ژن و مێرد هەبوو، دەتانزانی پێکەوە هەڵناکەن جا کەسێکی دادوەر لە خزم و بنەماڵەی مێردەکە و دادوەرێکیش لە خزم و کەس و کاری ژنەکە بنێرن بۆ نۆزینەوەی هەڵەکانیان و ئەوسا دانانی چارەسەرێك بە هەر جۆرێك کە ئەوان بە چاکیان دەزانی ئەگەر هەردووك رازی بوون پێك بێنەوە و نییەتیان پاك بوو ئەوا خواش یەکیان ئەخات و پێکیان دێنێتەوەو پیرۆزی ئەخاتە کارەکانیانەوە )).

جیاواز نەدەبووم، ئەویش نوسی: ئەمە ئەو ڕێککەوتننامەیە کە (محمد ی کوڕی عبدالله) و قورەیش لە سەری ڕێککەوتن، خوای گەورە لە قورئانەکەیدا دەفەرموێت: ((لقد كان لكم في رسول الله أسوة حسنة لمن كان يرجو الله واليوم الآخر)).[1]

بۆیە(علی کوڕی ئەبو تالیب)ﷺ عبدالله ی کوڕی عەباس یﷺ بۆ ڕەوانە کردن و منیش لە گەڵیدا چووم، تاکو گەیشتینە ناوەڕاستی سەربازگەکەیان، (ابن الكواء) هەستاو دەستی بە وتار خوێندنەوە کرد و بۆ خەڵکەکە دوا و گوتی: ئەی هەڵگرانی قورئان، ئەمە (عبدالله ی کوڕی عەباس) ە جا هەرکەسێ نایناسێت ئەوا من لە ڕێگای قورئانەوە دەیناسم، ئەمە ئەو کەسەیە کە خوای گەورە لە حەقی ئەو و قەومەکەیدا فەرموویەتی: ﴿قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴾[2] الزخرف:٥٨، بۆیە بیگەڕێننەوە بۆ لای هاوڕێکەی و مەیکەنە تەرازوو بە سەر کتێبی خوداوە، بۆیە چەند وتارخوێنێکی تر هەستان وگوتیان: سوێند بە خوا دەبێ بیکەینە تەرزاوویەك بە سەر کتێبەکەی خوداوە، جا ئەگەر حەقی پێ بوو ئەوا دەیناسینەوە و شوێنی دەکەوین و ئەگەر ناحەق و ناڕەوای پێ بوو ئەوا بە ناڕەواییەکەی خۆی ڕەدی دەکەینەوە، ئەمجار سێ ڕۆژ بە پێی کتێبەکەی خوا لە گەڵیاند دوا، بۆیە چوار هەزار کەسیان لێ گەڕایەوە و تەوبەیان کرد، کە (ابن الكواء)یان تیادا بوو تاکو ڕۆیشتنە خزمەتی عەلیﷺ ، ئەمجار عەلیﷺ هەواڵی بۆ ئەوانی تر نارد و گوتی: کار ومەسەلەکەی ئێمە و خەڵکی گەیشتە ئەوەی کە دەیبینن، بۆیە چیتر بوەستن تاوەکو ئوممەتی(محمد) یەکدەگرن ئەو بەڵێنەی لە نێوان ئێمە و ئێوەدا ئەوەبێت کە خوێن نەڕێژن و ڕێگە نەبڕن و ستەم لە ئەهلی (ذمة) نەکەن، جا ئەگەر واتان کرد ئەوا لە گەڵتاندا ناجەنگین، خوداش ناپاکانی خۆش ناوێت.

عائیشەﷺ پێی گوت:ئەی کوڕی شەدداد، جا عەلیﷺ ئەوانی کوشت ! گوتی: سوێند بە خوا نەچووە سەریان تاکو ئەوان خوێنیان ڕشت و ڕێگەیان بڕی

---

١ـ واتە: بە ڕاستی پەیامبەری خواﷺ چاکترین نموونەی ڕێك و پێکی و سەرمەشقە بۆتان بە تایبەتی بۆ ئەو کەسە، کە بە تەمای خوا و ڕۆژی دواییە)).

٢ـ واتە: هوزێکن هەر دەمبازی دەکەن.

(واته:ڕێگریان کرد) وه (ئەهلی زیمە)یان بە حەڵاڵ زانی . عائیشه گوتی: بڵێ سوێند بە خوا . گوتی: سوێند بەو خوایەی کە جگە لەو هیچ خوایەکی تر نییە بەو شێوەیە بوو، عائیشه رضي الله عنها گوتی: ئەی ئەوە چییە کە لە (ئەهلی زیمە)وە پێم گەیشتووە و دەڵێن (ذو الثدی)، (ذو الثدی)؟ گوتی: من بینیم و لە ناو کوژراوەکاندا بوو، لە گەڵ عەلی رضي الله عنه دا چووینە سەری، ئەویش بانگی خەڵکی کرد، ئایا ئەمە دەناسن؟ خەڵکی زۆر هاتن و دەیانگوت: لە مزگەوتی (بەنی فلان) دەمبینی نوێژی دەکرد، لە مزگەوتی (بەنی فلان) دەمبینی نوێژی دەکرد، هیچ کەس جگە لەو قسانە زیاتری نەدەگوت، عائیشه رضي الله عنها گوتی: ئایا گوفتاری عەلی رضي الله عنه چی بوو کاتێ لە سەری ڕاوەستا هەروەکو ئەهلی عێراق دەیڵێن، گوتی: گوێم لێ بوو دەیگوت: خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕاستیان فەرموو، عائیشه فەرموی: ئایا جگە لەوە هیچ شتێکی ترت لە ئەوەوە بیست؟ گوتی: نەخێر... خوا ئاگادارە، عائیشه فەرموی: بەڵێ خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕاستیان فەرموو، ڕەحمەتی خوا لە عەلی رضي الله عنه،لە قسەکانی ئەو ئەوە بوو کە هەر کاتێك شتێکی ببینایە و پێی سەیر بوایە ئەوا دەیفەرموو خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕاستیان فەرموو، ئەمجار ئەهلی عێراق بە دەم (عەلی)یەوە درۆیان کرد و شتی زیادەیان بۆ هەڵبەست)).[1]

ڕیوایەتی دووەم:

ئیمامی النسائی لە کتێبی (الخصائص)[2] دا ڕیوایەتی کردووە لە (عبدالله ی کوڕی عباس) ەوە دەڵێت:

((کاتێك گرووی (الحروریة) دەرکەوتن خۆیان گۆشەگیرکرد و لە ماڵەکانیاندا دانیشتن، ژمارەیان شەش هەزار کەس دەبوو، بە پێشەوا (علی کوڕی ئەبو تالیب) م گوت: ئەی ئەمیری بڕواداران ...کەمێك نوێژەکە دوا بخە، بەڵکو لە گەڵ ئەو گرووەدا قسە بکەم، گوتی: من لە ژیانت دەترسم، گوتم: نەخێر، دەڵێت: ئەمجار

١ـ أخرجه أحمد (١ / ٨٦، ٨٧)، وأبو يعلى (٤٧٤)، وابن عساكر (٢٧ / ١٠٤)، (٢٩ / ١٤٣)، وقال الهيثمي في ((المجمع)) (٦/ ٣٥٣): ((رواه يعلى و رجاله ثقات))، وإسناده حسن، كما قال الشيخ شعيب في ((المسند)).

٢ـ أخرجه النسائي في ((الخصائص)) (١٨٥)، وهو في ((السنن الكبرى)) (٥/١٦٥، ١٦٧) وسنده حسن.

خۆم لە بەر کرد و بە پێ ڕۆیشتم بۆ لایان لە کاتی (قیلولـە)دا بـوو ئـەوان پـشوویان دەدا و منیش سلاوم لەوان کرد.

ئەوانیش گوتیان: سلاوت لێ بێت ئەی ابن عبـاس، چـی شـتێك تـۆی هێنـاوە بـۆ ئێرە؟ منیش بە ئەوانم گوت: من لە لایەن هاوەڵانی پێغەمبەری خـوداوەﷺ هـاتووم لە پشتیوانان و کۆچەران و کوڕی مام و زاوای پێغەمبەری خـوداوەﷺ، کـە قورئـان بە سەر ئەواندا دابەزی و ئەوانیش لە ئێوە شـارەزاترن بـە سـروش، مـن هـاتووم تـا قسەی ئەوانتان پێ ڕابگەیەنم، کە ئەوان هەواڵ پێ دراون لەو شـتانەی کـە دەیڵێن، کۆمەڵێکیان بەرەو لای من جیابوونەوە، گوتم: پێم بڵێن چی شتێك وای لێکردن بـەو شێوەیە خشم و قین لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواﷺ و کوڕی مامی بگرن؟!

گوتیان: لەبەر سێ شت.

گوتم:ئەو سێ شتە چین؟

گوتیان: یەکێکیان ئەوەیە، ئەو (واتـە: علـی) لـە فـەرمانی خـوادا حـوکمی دا بـە دەست پیاوانەوە کەچی خوای گەورە دەفەرموێت: ((إن الحكم إلا لله))[1] ئـیتر پیـاوان چیان داوە لە حوکم؟ گوتم: ئەمە یەك.

گوتیان: دووەمیان ئەوەیە، ئەو (واتە: عەلی) کوشـتاری کـرد کەچـی لـەوانی بـە دیـل نـەبرد و ئـافرەتی نـەکردە جاریـە و سـامانەکەیانی بـە غەنیمـە و دەسـتکەوت نەبرد، جا ئەگەر ئەوان بێباوەڕن ئـەوا بـە جاریـە کردنـی ئافرەتـەکانیان دروسـتە و ئەگەر ئەوان باوەڕدارن ئەوا بە جاریە کردن و کوشتاریان دروست نییە.

گوتم: ئەمە دوو، ئایا سێیەمیان چییە؟

گوتیان: ئەو ناوی خۆی لە (ئەمیری باوەڕداران) سڕییەوە کەوابوو ئـەو (ئـەمیری بێباوەڕانە).

گوتم: ئایا جگە لەمانە هیچی ترتان پێیە؟ گوتیان: نەخێر... ئەمانەمان بەسـە . گوتم: ئایا ئەگەر چەند ئایەتێکی قورئان و چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری خواﷺ بە سەرتاندا خوێندەوە کە وەڵامی قسەکانتان بێت ئایا ڕازی دەبن -دەگەڕێنەوە-؟

---

١- واتە: گشت حوکم و بڕیارێك تەنها و تەنها هی خوایە، دەبێ تەنها ئەو حاکم و بڕیار بە دەست بێت )).

گوتیان: بەڵێ، گوتم: ئەو قسەیەتان کە باسی حوکمی پیاوانە لە فەرمانەکانی خوادا، ئەوا من لە قورئانەوە ئایەتێکتان بۆ دەخوێنمەوە کەوا خوای گەورە حوکمی دا بە دەست پیاوانەوە لە نرخی چارەکە دەرهەمێکدا، جا خوای گەورە فەرمانی کردووە کە پیاوان حوکمی تێدا بدەن، خوای گەورە دەفەرموێت: ((یا أیها الذین آمنوا لا تقتلوا الصید، وأنتم حرم، ومن قتله منکم متعمدا فجزاء مثل ما قتل من النعم یحکم به ذوا عدل منکم))[1] جا من سوێندتان دەدەم بە خوای گەورە ئایا حوکم کردنی پیاوان لەسەر کەروێشکێك یان هەر شتێکی تر لە ڕاو باشترە یان حوکم کردنیان لە خوێنی نێوان موسڵمانان و ئاشتی نێوانیان، خۆتانیش باش دەزانن ئەگەر خوای گەورە ویستی لێ بوایە ئەوا حوکمی دەدا و چیتر کارەکەی نەدەدایە دەستی پیاوان؟

گوتیان: بێ گومان ئەمە چاکترە.

هەروەها دەربارەی ئافرەت و مێردەکەی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلَاحًا يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا ﴾[2] النساء:٣٥، جا سوێندتان دەدەم بە خوا ئایا حوکمی پیاوان لە ئاشتبوونەوەی نێوانیان و پاراستنی خوێن ڕشتن چاکترە یان حوکم لەسەر کێشەی ئافرەتێك؟

ئایا وەڵامی ئەو پرسیارەم دایەوە و ئێوەش ڕازی بوون؟ گوتیان: بەڵێ.

---

١ـ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ! هەتا لە ئیحرام دان هیچ جۆرە نێچیرێکی وشکانی مەکوژن، گۆشتی بخورێ یا نەخورێ هەرکەسێکتان بە دەست ئەنقەست کوشتی و لە ئیحرامیشدا بوو، لە تۆڵەی ئەوەدا ـەبی وێنەی نێچیرە کوژراوەکە لە مەڕ و بزن و وشتر و گا کەفارەت بدات، دوو کەسی دادگەری زاناشتان ـڕیاری لەسەر بدەن و بڵێن: ئەمە بۆ بارتەقا و کەفارەتی نێچیرە کوژراوەکە دەشێ.. ))

٢ـ واتە: خۆ ئەگەر ترستان لە بشێوی و ناکۆکی ژن و مێرد هەبوو، دەتانزانی پێکەوە هەڵناکەن جا کەسێکی دادوەر لە خزم و بنەماڵەی مێردەکە و دادوەرێکیش لە خزم و کەس و کاری ژنەکە بنێرن بۆ ـوزینەوەی هەڵەکانیان و ئەوسا دانانی چارەسەرێك بە هەر جۆرێك کە ئەوان بە چاکیان دەزانی ئەگەر هەردووك ـڕازی بوون پێك بێنەوە و نییەتیان پاك بوو ئەوا خواش یەکیان ئەخات و پێکیان دێنێتەوەو پیرۆزی ئەخاتە کارەکانیانەوە. ))

گوتم: سەبارەت بە قسەی دووەمتان کە دەڵێن: کوشتاری کرد و کەچی ئافرەتیانی بە جاریە نەبرد و غەنیمە و دەستکەوتی نەبرد، من لێتان دەپرسم: ئایا دەتانەوێ عائیشەی دایکتان بکەن بە جاریە و ئەوەی کە بۆ ئافرەتانی تر حەڵاڵی دەکەن بۆ ئەویش حەڵاڵی بکەن؟ لە کاتێکدا ئەو دایکتانە !؟ جا ئەگەر بڵێن ئەوەی کە بۆ جگە لەو حەڵاڵی دەکەین بۆ ئەویش حەڵاڵی دەکەین ئەوا بە دڵنیاییەوە کافر دەبن، ئەگەر بڵێن: ئەو دایکی ئێمە نییە ئەوا دیسان کافر دەبن، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ((النبي أولى بالمؤمنين من أنفسهم وأزواجه أمهاتهم))[1] جا ئێوە لە نێوان دوو گومڕاییدا دەسووڕێنەوە، بۆیە خۆتان دەرکەن لەو نێوانە؟ گوتم: ئایا وەڵامی ئەو پرسیارەم دایەوە و ئێوەش ڕازی بوون؟ گوتیان: بەڵێ .

گوتم: سەبارەت بە قسەی سێیەمەتان کە دەڵێن: ناوی خۆی لە ئەمیری باوەڕداران سڕییەوە ئەوا من بەڵگەیەکتان بۆ دەهێنمەوە کەوا ڕازیتان بکات، وا دەزانم هەمووتان ئەوەتان بیستووە کاتێ پێغەمبەری خواﷺ لە گەڵ بێباوەڕاند لە ڕێککەوتنامەی (الحديبيه) ئاشتبوویەوە بە (علی) فەرمووو: بنووسە ئەمە ئەو ڕێککەوتنەیە کەوا پێغەمبەری خواﷺ (محمد رسول الله) لە سەری ڕێك کەوتووە، بێباوەڕان گوتیان: نەخێر سوێند بە خوا ئێمە تۆ بە پێغەمبەر نازانین وە ئەگەر بە پێغەمبەرت بزانین ئەوا هەرگیز کوشتارمان لە گەڵ نەدەکردی و گوێڕایەڵت دەبووین، بنووسە (محمد ی کوڕی عبدالله) . پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئەی علی بیسڕەوە و بنووسە ئەمە ئەو پەیمانەیە کە محمد ی کوڕی عبدالله لە سەری ڕێك کەوتووە.

سوێند بە خوا پێغەمبەری خواﷺ لە(علی) چاکترە، لە کاتێکدا ئەو ناوی خۆی سڕییەوە، ئەو سڕینەوە لە پێغەمبەرایەتی نەیسڕییەوە، ئایا وڵامی پرسیارەکەتان درایەوە و ئێوەش ڕازی بوون؟ گوتیان: بەڵێ.

---

١ـ واتە: پەیامبەر ﷺ بە بڕواداران لە خودی خۆیانیش لە پێشترە لە هەموو کار و بارێکی دین و دونیادا، وە ژنەکانیشی دایکیانن پێویستە وەك دایکی خۆیان ڕێز و حورمەتیان لێ بنێن واتە: لە ڕێز گرتن و حەرامی مارەکردنیاندا وەك دایکیانن بەلام لە تەماشا کردن و خەڵوەت و.. هتد وەك ژنانی تر مامەڵەیان لە گەڵ بکرێت)).

بۆیە دوو هەزار کەسیان لێ گەڕایەوە، ئەمجار هەموویان دەرچوون و لەسەر گومڕایی خۆیان کوژران، بۆیە کۆچەران و پشتیوانیان کوشتاریان لە گەڵدا کرد)).

بەڕاستی ئەوە زانست و زانیارییە... ئەوە تێگەیشتنە ... بۆیە ئیمامی بوخاری لە (صحیح) ەکەیدا دەرگایەکی کردووەتەوە و ناوی ناوە (باب الفهم في العلم) واتە: (دەرگای تێگەیشتن لە زانستدا)) جا تێگەیشتن فەزڵێکەو خوای گەورە دەیبەخشێتە ئەو کەسانەی خۆی بیەوێ، خوای گەورەش خاوەنی فەزڵ و چاکەی مەزنە.

ئەوەتا (أبو بكر الصديق) کاتێك پێغەمبەری خواﷺ لەسەر مینبەر راوەستا و فەرمووی: (( إن عبدا خيره الله بين أن يؤتيه من زهرة الدنيا ما شاء، وبين ما عنده، فاختار ما عنده " فبكى أبو بكر وقال: فديناك بآبائنا وأمهاتنا )) خەڵکی دەستیان بە قسە و هەرا کرد لەسەر الصديق، ئایا ابو بکر بۆ وا دەڵێت؟ أبو سعيد الخدری دەڵێت: (ئەوەی کە فەرموودەکە دەگێڕێتەوە): ((فكان رسول الله هو المخبر، وكان أبو بكر هو أعلمنا به )) وە ئەم فەرموودەیە لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتووە لە (أبو سعيد)ەوە.

ئەوەتا عوسمانی کوڕی عەففان[2] ئافرەتێکیان بۆ هێنا لە پاش شەش مانگ شوو کردن منداڵی بووە، بۆیە تۆمەتباریان کرد بە زینا و ویستی داری حەددی بە سەردا جێ بە جێ بکات، ابن عباس گوتی: لەسەر خۆ بە ئەی ئەمیری ئیمانداران، لە ریواتێکی تردا عەلی وتی: لەسەر خۆ بە ئەی ئەمیری ئیمانداران، جاری وا دەبێت ئافرەت بە شەش مانگ منداڵی ببێت !! ئایا ئەم قسەیە چییە ؟؟ ئایا ئەم قسەت لە کوێ هێناوە ئەی عەلی؟ وە یان ئەی ابن عباس؟ گوتی: لە قورئانەوە، ئافرەت دەبێت لە پاش شەش مانگ منداڵی ببێت هەروەکو لە قورئاندا هاتووە؟ بەڵام من

---

١ـ أخرجه البخاري كتاب ((مناقب الأنصار))، باب ((هجرة النبي ﷺ و أصحابه إلى المدينة)) (٣٩٠٤)، ومسلم كتاب ((فضائل الصحابة))، باب ((من فضائل أبي بكر الصديق رضي الله عنه)) (٢٣٨٢).

٢ـ أخرجه الطبري في ((التفسير)) سورة البقرة آية (٢٣٣)، وابن أبي حاتم في ((تفسيره)) لسورة البقرة (آية ٢٣٣)، وعبدالرزاق في ((مصنفه)) (٣٥١/٧).

ورواية علي عند ابن أبي حاتم في ((التفسير)) (لسورة الأحقاف: ١٥)، ومالك في ((الموطأ)) (في الحدود، باب ما جاء في الرجم باب ١ رقم ١١)، وانظر: ((الدر المنثور)) (تفسير البقرة و الأحقاف).

لێرەدا دەڵێم ئەوە نیعمەتی تێگەیشتنە، بیر لەو ئایەتەی خوای گەورە بکەرەوە ﴿وَحَمۡلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهۡرًاۚ﴾ الأحقاف: ١٥، واتە: ماوەی دووگیانی و لە شیر بڕینەوەی (٣٠) مانگی خایاند، واتە: بە هەمووی دوو ساڵ و نیوی خایاندا...)).

واتە: ماوەی دوو گیانی و لە شیر بڕینەوە سی مانگە، شیر بڕینەوە بیست و چوار مانگە هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ لِمَنۡ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَۚ﴾ البقرة: ٢٣٣، واتە: دایکان تا دوو ساڵی تەواو دەتوانن شیر بە مناڵەکانیان بدەن، ئەو دوو ساڵەیش بۆ کەسێکە کە بیەوێ دەورانی شیرپێدان تەواو بکات)).

جا ئەگەر بیست و چوار لە سی دەرکەین ئەوا شەش ی دەمێنێ، جا دەبێت و ئاساییە کە ئافرەت بە شەش مانگ منداڵی ببێت، بەم شێوەیە خوای گەورە ئەو ئافرەتەی بە تێگەیشتنی عەلی یان ابن عەباس رزگار کرد، بە راستی ئەوە تێگەیشتنێکی نموونەیی و بەرزە .

هەروەها عومەری کوڕی خەتتاب کاتێك پرسیار لە هاوەڵان دەکات: چی دەڵێن دەربارەی: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ۝٢ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا﴾ النصر: ١ـ ٣، هەندێکیان گوتیان: فەرمانمان پێکراوە سوپاسگوزاری خوا بین و داوای لێخۆشبوونی لێ بکەین ئەگەر سەرکەوتین و رزگارمان کرد، هەندێکیان گوتیان: نازانین یان هەندێکیان هیچیان نەگوت، ابن عباس لەو کاتەدا گەنجێکی بچووك بوو لە مەجلیسەکەدا دانیشتبوو ئەو مەجلیسەی کە عومەر هەڵیبژاردبوون، گوتی: ئەی ابن عباس، ئایا تۆیش وا دەڵێیت؟ گوتی: نەخێر، گوتی: ئەی چی دەڵێیت؟ گوتی: ئەوە ئەجەلی پێغەمبەری خوایەﷺ خوای گەورە خۆی ئاگاداری کردووەتەوە (( إذا جاء نصر الله والفتح )) مەبەستی رزگار کردنی مەککەیە جا ئەوە نیشانەی ئەجەلی تۆیە (( فسبح بحمد ربك واستغفره إنه كان توابا )) ئیمامی عومەر گوتی: هیچی لێ نازانم تەنها ئەوە نەبێت کە تۆ دەیزانی))[1].

---

١ ـ أخرجه البخاري، كتاب ((المغازي)) باب (٥١) (٤٢٩٤).

بەڕاستی ئەوە نیعمەتی تێگەیشتنە بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ ۚ﴾ الأنبياء: ٧٩، داود و سلێمان هەردوو پێغەمبەری خوان و ڕێزدارن، بەڵام داود لە کێشەیەکدا حوکمی دا و سلیمان ی کوڕی لە گەڵیدا جیاواز بوو، جا خوای گەورە ستایشی تێگەیشتنی سلیمان دەکات بۆ کێشەکە و دەفەرموێت: ﴿فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ ۚ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا﴾، واتە: چارەسەری کێشەکەمان فێری سولەیمان کرد و تێمان گەیاند کە چۆن بڕیار بدا، بە هەردووك – داوود و سولەیمان – داوەری زانیاریمان پێ بەخشین)).

جا لێرەدا تێگەیشتن لە ڕێگەی هەوڵدانەوە دێت، ئەویش بە ئامادە بوون و دانیشتن لە کۆڕ و مەجلیسی زانا لە خواترس و بەڕێزەکان، بە خوێندنەوەی کتێبی نوسەران لە ئەهلی زانست و زانیاری، لە گەڵ ئەوەیش هەرگیز پەلە نەکرێت لە فەتوادان‌دا و بەرانبەر بەخوا بوێرانە مامەڵە نەکات، یان قسە کردن دەربارەی دینی خوا بێ زانست و زانیاری.

بەراستی ئەمە نیعمەتێکی مەزن و گەورەیە (نیعمەتی تێگەیشتن) وە ئەمەیشە لە پاش زەلیلی و خۆ بە کەم زانین بەرانبەر بە خوای گەورەی باڵا دەست دەست دەکەوێت، داوا لە خوا دەکەم هەمووومان تێبگەیەنێت و فێرمان بکات.

بویە ئاگاداری خۆم و ئێوە دەکەمەوە کە هەرگیز بوێر نەبێن لە کاتی فەتوادان، جا لە ترسناکترین شێوەی نەفامی: خۆ بە زانا زان، واتە کەسێك خۆی بە زانا دەزانێ کەچی وایش نییە، بۆیە زانایەك دەبینی کە هیچ بەڵگەیەکی پێ نییە لە گەڵ ئەوەیشدا خۆی بە زانا دەزانێت، بۆ نمونە لە کەناڵێکی ئاسمانییەوە پرسیارێکی لێ دەکریت کەچی شەرم دەکات وەڵام نەداتەوە بە تایبەتی دەزانێ کە خەڵکی تەماشای دەکەن بۆیە خۆی بە زانیار دەزانێت بۆیە بە بێ زانیاری قسە دەکات، جا بە ڕاستی ئەمە لوتکەی نەفامییە، جا خراپترین شێوە لە شێوەکانی نەفامی لە پاش نەناسینی خوا و پێغەمبەری خواﷺ ئەوەیە کە خۆی بە زانیار بزانێت بەرانبەر بە خەڵکی، جا ئەگەر من بەڵگەم پێ نەبێت لەم مەسەلەیەدا چی ڕێگەم لێ دەگرێت

ئەگەر بلێم: وەڵامی پرسیارەکەت لە ئەڵقەی داهاتوودا دەدرێتەوە انشاء الله؟ چی شتێك ڕێگەم لێ دەگرێت ئەگەر ئەم مەسەلەیە بگەڕێنمەوە بۆ لای زانایان، ئەوانەی کە هیچ شتێکیان جێ نەهێشتووە ئیللا باسیان کردووە؟ ئەوەی کە لەسەر منە ئەوەیە کە خۆم یەکلا بکەمەوە بۆ خوای گەورە، کاتێکی دیاری کراو بۆ خۆم دیاری بکەم بۆ دووبارە کردنەوە و خوێندنەوە وە بە ڕاستگۆیی و پاڕانەوە داوا لە خوا بکەم کە فێرم بکات و تێگەیشتووم بکات، خودایە دڵسۆزی و تێگەیشتن و زانیاری بە نسیبی هەموومان بکە.

کەواتە: خۆ بە زانا زان: ئەوەیە کە خۆی بە زانیار بزانێت و کەچی زانا نییە، یان لەو مەسەلەیەدا بەڵگەی پێ نییە، ڕەنگە ئەو کەسێکی زانا بێت بو لە مەسەلەیەکدا خۆی بە زانیار بزانێت کەچی بەڵگەی پێ نەبێت، ئەمە شێویەکە لە شێوەکانی خۆ بە زانا زان، ئەم شێوەش دەرگایەك لە دەرگاکانی ستەم و ناڕەوایی دەکاتەوە کە ئەویش دەرگای قسە کردنە بە دەم دینی خوداوە بە بێ زانست و زانیاری جا کەسی خۆبەزانازان خۆی بە بلیمەت دەزانێت کەچی هێشتا قوتابییە، خۆی بە پێگەیشتو لە قەڵەم دەدا لە پێش ئەوەی پێ بگات، خۆی بە زانا دەزانێت پێش ئەوەی فێر ببێت. ! !

باسی کابرایەك دەکەن لەو جۆرە کە هەرگیز خۆی نەدەپاراست لە قسە کردن لە دینی خوادا تەنانەت لە هەر بابەتێکدا پرسیاریان لێ بکردایە ئەگەر لە پزیشکی و ئەندازیاریشدا بوایە ئەوا وەڵامی هەموویانی دەدایەوە ! ما شاء الله لا قوة الا بالله سبحان الفتاح العليم، جا هەندێ لە قوتابییانی زانست و زانیاری هاتن و گوتیان: بە ڕاستی ئەم کابرایە زۆر ترسناکە لەسەر خەڵکی وە دەمانەوێت ترسناکی ئەو کابرایە بۆ خەڵکی روون بکەینەوە ... بەڵام چۆن؟ گوتیان: وشەیەك دروست دەکەین کە بنچینەی نەبێت نە لە زماندا و نە لە دونیادا، ئەمجار دێین لە مەجلیسەکەی خۆیدا پرسیاری لێ دەکەین، جا بەو شێوەیە بۆ خەڵکی دووپاتی دەکەینەوە کە ئەو کابرایە بە بێ زانیاری قسە دەکات، بۆ خەڵکی روونی دەکەینەوە کە ئەو کابرایە چەند بوێرە بەرانبەر بە دینی خوا، ئەمجار ڕۆیشتن و وشەیەکیان دروست کرد و

ناویان لێ نا (الخنفشار) و ڕۆیشتن بۆ لای کابرا و پرسیاریان لێ کرد و گوتیان: حەز دەکەین لە ڕێگای بەڕێزتانەوە بزانین مانای وشەی (الخنفشار) چییە؟

ئەویش گوتی: (الخنفشار) ڕووەکێکە بۆنێکی خۆشی هەیە لە دەورووبەری یەمەن دەردەچێت (بۆ ئەوەی فەتواکەی بە بێ دەنگییەوە لێ وەرگرن، خۆ هیچ کەسێك ناوێرات بۆ دەورووبەری یەمەن بۆ گەڕان بە دوای ئەو ڕووەکەدا) ڕووەکێکە بۆنێکی خۆشی هەیە لە دەورووبەری یەمەن دەردەچێت ئەگەر وشتر بیخوات ئەوا شیرەکەی دەگیری، هەروەکو شاعیری یەمەن دەفەرموێت:

لقد عقدت محبتكم فؤادي كما عقد الحليب الخنفشار

واتە: خۆشەویستی ئێوە دڵی منی بەستووە... هەروەکو چۆن الخنفشار شیری بەستووە.

أبو داود دەڵێت: مانای الخنفشار بەم شێوە و بەم شێوەیە ..... القرطبي دەڵێت: بەم شێوە و بەم شێوە .... پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: .....!!!

هەموویان هاواریان کردو گوتیان: بێ دەنگ بە ئەی درۆزنی فێڵباز، بە ناوی هەموو ئەوانەوە درۆت کرد، بە زمانی پێغەمبەری خوداوەﷺ درۆ مەکە چونکە ئەو دەفەرموێت[1]:

((ومن كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده من النار))، واتە: هەرکەسێك بە زمانی منەوە درۆ بکات ئەوا با جێگەی خۆی لە ئاگردا خۆش بکات)).

جا ئەم ئوممەتە بەردەوام توشی ئەم جۆرە بەلایانە دەبێت لەو خنفشارییانەی کە خۆیان بە زانا دەزانن، ئەوانەی کە بە بێ زانیاری قسە دەکەن لە دینی خوادا بە بێ زانیاری و بە بێ بەڵگە و بە بێ تێگەیشتنی ورد و قووڵەوە لە مەبەستی خوا و پێغەمبەرکەیﷺ...!

من لێرەدا ئاماژە بەو پاشاگەردانییە زۆرە دەکەم لەو هەموو فەتوایەی کە لەسەر شاشەی کەناڵە ئاسمانییەکان دەردەچێت، داوا لە خوا دەکەم من و هەموو

---

١ ـ أخرجه البخاري، كتاب ((العلم)) باب ((إثم من كذب على النبي ﷺ)) (١١٠)، ومسلم في مقدمة صحيحه، باب ((تغليظ الكذب عل رسول ﷺ)) (٣) من حديث أبي هريرة رضي الله عنه.

برایانم چاوروون بکات بە بینینی راستی و زانست و زانیاری هەر خۆی پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

ئایا هیچ کەسێك هەیە لە پێغەمبەری خوا ﷺ زاناتر بێت؟ نەخێر... هیچ کەسێك لەو زاناتر نییە، کەچی سەرزەنشتی لێ گیرا کاتێك گوتی: سبەینێ وەڵامتان دەدەمەوە[1]، کارەکەی پەیوەست نەکرد بە ویستی خوداوە، بۆیە لەو پێناوەدا خوای گەورە قورئانی دابەزاند: ﴿وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىۡءٍ إِنِّي فَاعِلٞ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ﴾ الکهف: ٢٤، واتە: هەرگیز لە بارەی هیچ شتێکەوە بە دڵنیاییەوە مەڵێ: من بەیانی ئەو کارە دەکەم بە وشەی (انشاء الله) وە نەبێت، واتە: کاتێ ئەتەوێ هەر شتێك بکەیت هەر دەبێ بڵێت: انشاء الله .(٢٣) وە هەر کە لە بیرت چوو (انشاء الله) بکەیت و ئەوجا وە بیرت هاتەوە هەر دەبێ (انشاء الله) بکەیت وە هەمیشەش یادی پەروەردگارت فەرامۆش نەکەیت(٢٤))).

ئا ئەوەتا (عبد الله ی کوڕی عمر)... زانای زوهد و قورئان و سوننەت... الزهری[2] لە (خالد ی کوڕی أسلم) ەوە دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: ((خرجنا مع عبد الله بن عمر نمشي فلحقنا أعرابي فقال: أنت عبد الله بن عمر؟ قال: نعم . قال: قال سألت عنك فدللت عليك فأخبرني أترث العمة؟ فقال ابن عمر: لا أدري . فقال: أنت ابن عمر ولا تدري؟ وقال مرة أخرى: أنت لا تدري ولا ندري؟ قال: نعم اذهب إلى العلماء بالمدينه فسلهم ...فلما أدبر قبل ابن عمر يديه، فقال: نعم ما قال أبو عبد الرحمن، يسأل عما لا يدري، فقال: لا أدري)) واتە: لە گەڵ (عبدالله ی کوڕی عمر)دا دەرچووین، کابرایەکی دەشتەکی شوێنمان کەوت لە کاتێکدا ئێمە ڕێمان دەکرد و گوتی: تۆ (عبدالله ی کوڕی عمر) ی؟ گوتی: بەڵێ... گوتی: پرسیاری تۆم کرد و تۆیان نیشان دام، ئایا لە میراتدا پوور هیچ پشکێکی هەیە؟ ابن عمر گوتی: نازانم... کابرا: گوتی: تۆ (ابن عمر) یت و نازانیت؟ جارێکی تر گوتی: تۆ نازانیت و ئێمەیش نازانین؟ گوتی:

---

١ـ أخرجه ابن إسحاق، كما في ((تفسير ابن كثير))، و((الدر المنثور))والطبري في ((تفسيره)) (٢٢٦٥٧)، عن ابن عباس و سنده ضعيف.

٢ـ أخرجه الدارمي في ((سننه)) (١٧٩، ١٨١)، والحاكم (٦٤٤٦)، والبيهقي في ((الكبرى)) (٨٢/٤).

بەڵێ... برۆ بۆ لای زانایانی شاری مەدینە و پرسیار لەوان بکە... کاتێ کابرا پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت (ابن عمر) دەستەکانی خۆی ماچ کرد و گوتی: باشترین شت ئەوە بوو کە (ابو عبدالرحمن) گوتی، پرسیاری لێ کرا دەربارەی شتێك کە نازانێت گوتی: نازانم)).

بەڵێ... ابن عمر دەڵێت: نازانم... سوێند بە خوا بە ڕاستی جوانترین و خۆشترین و ڕازاوەترین وشەیە.

ئەگەر باسی زانایان بکرێت... ئەوا (مالك ی کوڕی أنس) ئەستێرەیەکە لە ئاسمانی زانست و زانایاندا دەدرەوشێتەوە, کە بە (إمام دار الهجرە) ناسراوە، قوتابییە ژیرەکەی کە (الشافعی) یە دەڵێت: (ئەو (شافیعی)ەی کە یەکێکە لە پێشەوایان، قوتابی (مالك) بووە بە نۆ شەو کتێبی (موطأ) ی ئیمامی (مالك) ی لە بەر کرد) کاتێك ڕۆیشت بۆ لای (مالك) بۆ ئەوەی لە بەر دەستیدا فێری زانست ببێت، ئیمامی (مالك) گوتی: (کاتێك کە (شافعی) بە لەبەر کردنەوە کتێبی (موطأ) ی بۆ خوێندەوە و لە هیچ وشەیەکدا نەوەستا و کێشەی نەبوو): ئەی (شافعی) ... من وا دەبینم کە خوای گەورە ڕوناکییەکی خستووەتە دڵتەوە، تۆیش بە تاریکی سەرپێچی مەیکوژێنەوە)[1]

(شافعی) دەڵێت: هاوڕێتی (مالك) م کرد، جارێکیان پرسیاری لێکرا دەربارەی چل و هەشت مەسەلە کەچی ئیمامی (مالك) بە سی و دوو دانەی گوتی: نازانم.[2]

ئیمامی (شافعی) مامۆستای (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)ە، (ئیسحاق ی کوڕی ڕاهەوەی) دەڵێت: (ئەحمەد) بە منی گوت: ئەی (ئیسحاق) وەرە با کەسێکت پێ نیشان بدەم لە مەککە کە هەرگیز چاوەکانت کەسی وایان نەبینیوە، ! (ئیسحاق) گوتی: جا (الشافعی) پێ نیشان دام ! منیش تێڕوانینم لە گەڵدا کرد دەربارەی فیقە کەچی هیچ کەسێکم وەك ئەو نەبینیوە، دەربارەی قورئان تێڕوانینم لە گەڵدا

---

١- ((الداء والدواء)) (١٠٤) و ((إعلام الموقعين)) (٢٥٨/٤).

٢- ((تفسير القرطبي)) سورة البقرة آية (٣٢)، و ((التمهيد)) لابن عبدالبر (٧٣/١)، ((و آداب الفتوى)) للنووي (١٦)ط الفكر

کرد کەچی هیچ کەسێکم نەبینیوە لەو زاناتر بێت، دەربارەی فەرموده تێڕوانینم لە گەڵدا کرد کەچی هیچ کەسێکم نەبینیوە لەو زاناتر بێت، لە گەڵ (شافعی)دا دەربارەی زمان تێڕوانینمان کرد بینیم ئەو ماڵی زمانە، سوێند بە خوا چاوەکانم کەسی نەبینیوە وەك (الشافعی).[1]

ڕۆژێك ئیمامی (الشافعی) لە مەجلیسە پڕ لە زانستەکەیدا دادەنیشێت کەسێك دێت و لە مەسەلەیەکدا پرسیارێکی لێ دەکات، ئەویش بێ دەنگ دەبێت، کابرا دەڵێت: ئایا وەڵام نادەیتەوە؟ کەچی ئەو بێ دەنگە، کابرا دەڵێت: ئایا وەڵام نادەیتەوە ...؟ خوا رەحمەت لێ بکات... (شافعی) گوتی: چاوەڕێ دەکەم تاوەکو بزانم ئایا فەزڵ و چاکە لە بێ دەنگیمدایە یان لە قسەکردنمدا؟[2]

ئەی خودایە ..! بەڕاستی ئێمە لەوپەڕی بوێریداین ... ئێستا وتەی ئەو شاعیرە دێتە گوێمدا کە دەڵێت:

و غير تقي يأمر الناس بالتقى    طبيب يداوي الناس والطبيب عليل

واتە: ئەوانەی کە لە خواترس نین فەرمان دەکەنە خەڵکی بە لە خوا ترسان، پزیشکێك چارەسەری خەڵکی دەکات و کەچی پزیشکەکە خۆی نەخۆشە.

إلهـي لا تعـذبني فـإني    مقـر بالـذي قـد كـان مـني
فكم من ذلة لي في البرايا    وأنـت علـي ذو فـضل ومـن
يظـن النـاس بـي خـيرا    وإني لشر الناس إن لم تعف عني

واتە: ئەی خودایە سزام مەدە چونکە من، دان بە هەڵەکانی خۆمدا دەنێم ، چەندەها جار هەڵەم دەکرد و تێدەکەوتم، تۆ خاوەن فەزڵ و منەتی بە سەرمەوە، خەڵکی گومانی باش بە من دەبەن، بەڵام من خراپترین کەسم ئەگەر تۆ لێم خۆش نەبیت.

---

١ـ أخرجه ابن عساكر في ((تاريخه)) (٥١ / ٣٢٨ – ٣٣٠).
٢ـ انظر: ((إعلام الموقعين)) (٢١٨/٤)، و ((بدائع الفوائد)) (٧٧٣/٣)، و ((إحياء علوم الدين)) (٢٥/١)، و ((أدب المفتي والمستفتي))لابن الصلاح (١ /١٣).

سوێند بە خوا من باسی ئەم بابەتەم نەکرد بۆ ئەوەی وا هەست بکەم خۆم کەسێکی شایستەم، بەڵکو لە دەرگای هەست کردن بە بەرپرسیارییەتی، جا ئەمەیشە بنەمایەکی أصولی دووپاتی دەکاتەوە، ((ئەگەر ناو نەبوو ئەوا تەیەموم بە خۆڵ بکە))بەڵێ... ئێمە لەوپەڕی پێویستیداین بۆ فێربوون لەکتێبەکەی خوادا و فەرموودەکەی پێغەمبەرﷺ ئەویش بە راستگۆیی و دڵسۆزی و پاڕانەوە و زەلیلی نواندن و دانیشتن لە بەر دەستی زانا لە خواترسەکان، هەر یەکێك لە ئێمە کاتێك بۆ خۆی دانێت بۆ فێربوون، ئەگەر کار و کەسابەتەکەی هەرچی بێت، پلە و پایەکەی هەرچی بێت، رووە کۆمەڵایەتییەکەی هەرچی بێت، دەبێت کاتێك بۆ خۆت دەست نیشان بکەیت بۆ فیربوون دەربارەی خواکەت، دەربارەی پێغەمبەرەکەتﷺ، چونکە خوای گەورە فەرمانی نەکردووەتە پێغەمبەرەکەیﷺ بە داواکردنی زیاتر تەنها لە زانستدا نەبێت، جا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾ طـه: ١١٤، واتە: بلێ: ئەی پەروەردگارم! زانست و زانیاریم زیاد بکە)).

ڕێزداران... نامەوێت چیتر لەمە زیاتر لەسەر نیشانە بچووکەکانی قیامەت بڕۆم بەڵام هەندی نیشانە هەن جووتن لە گەڵ نیشانە گەورەکاندا وەکو دەرکەوتنی المهدی — هەروەکو لە پاشاندا باسی دەکەم انشاء الله —هەروەها روخاندنی کەعبە هەروەکو باسی دەکەین و روونی دەکەینەوە، داوا لە خوا دەکەم کە کارە چاکەکانمان لێ وەرگرێت

# نیشانە گەورەکانی قیامەت

## دەرکەوتن و دەرچوونی مەسیحی دەجال

## ( خروج المسيح الدجال )

بڕوام وایە زۆربەی ئەو نیشانە بچووکانەی پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کردوون روویان داوە، جگە لە چەند نیشانەیەکی کەم، لەوانە بۆ نمونە: ئەو نیشانەیەی کە ئیمامی (مسلم)[1] ریوایەتی کردوە لە فەرموودەی (أبو هريرە)وە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لا تقوم الساعة حتى يَحْسِرَ الفرات عن جبل من ذهب يقتتل الناس عليه، فيُقتل من كل مائة تسعة وتسعون، ويقول كل رجل منهم: لعلِّي أكون أنا الذي أنجو)( واتە: قیامەت هەڵناسێت تاکو رووباری فورات چیایەکی ئاڵتون ئاشکرا دەکات، لە پێناویدا خەڵکی دەجەنگن و لە هەر سەد کەس نەوەت و نۆ کەسی دەکوژرێت، هەر کەسێك لەوانە دەڵێت: بەڵکو من ئەو کەسەیە بم کە رزگارم دەبێت)).

لە ریوایەتێکی تردا کە لە (صحيح مسلم)[2]دا هاتووە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((فمن حضره فلا يأخذ منه شيئاً)) واتە: هەر کەسێك ئەگەر ئامادەی بوو ئەوا با هیچی لێ نەبات)).

جا گومان لەوەدا نییە مەبەست لەم چیایە چیایەکی ئاڵتونی راستەقینەیە، ئەوەی کە هەندێ لە ئەهلی زانست و زانیاری باسیان کردوە و دەڵێن: گوایە مەبەست لەو ئاڵتونە ئاڵتونی رەشە (واتە: نەوت) ئەوا بەو شێوەیە نییە ! ! من خۆم خوێندومەتەوە لە هەندێ لە هەواڵەکانەوە دووپاتی دەکەنەوە کەوا مانگە

---

١ـ أخرجه مسلم كتاب ((الفتن و أشراط الساعة )) ، باب ((لا تقوم الساعة حتى يحسر الفرات عن جبل من ذهب )) (٢٨٩٤ ).

٢ ـ أخرجه مسلم (٣٠/٢٨٩٤).

دەستکردەکان وێنەی چیایەکی ئاڵتونیان گرتوە لە ڕووباری فورات کە دەکەوێتە وڵاتی عێراق، بەڵام ناتوانم ئەوە بسەلمێنم تاکو ئەو باسە ڕوون نەبێتەوە، ئێمە ئێستا لە سەردەمی پەیوەندی و گەیاندندا دەژین، هەموو شتێك لە کاتی خۆیدا دەردەکەوێت، بەڵام هەندێ نیشانە دەمێننەوە کەوا هاوجووت و هاوکاتن لە گەڵ نیشانە گەورەکاندا هەروەکو باسم کرد، لە کاتی خۆیدا ــ إنشاء الله ــ لە گەڵ نیشانەکانی تردا باسی دەکەم.

جا بفەرموون ــ براکانم ــ بۆ ئەوەی نیشانە گەورەکان بناسین کە پێغەمبەری ڕاستگۆﷺ باسی کردوون، ئەو کەسەی کە هەرگیز لە خۆوە قسە ناکات، لە فەرموودەیەکی (صحیح) دا هاتوە کە ئیمامی (مسلم)[1] ریوایەتی کردوە لە فەرموودەی (حذيفة ی کوڕی أسيد الغفاری)یەوە.. حذيفة دەڵێت: (((أطلع النبيﷺ علينا ونحن نتذاكر، فقال ﷺ: " ما تذاكرون؟" قالوا: نذكر الساعة، قالﷺ " إنها لن تقوم حتى ترون قبلها عشر آيات)) فذكر: الدخان، والدجال، والدابة، وطلوع الشمس من مغربها، ونزول عيسى ابن مريم(عليه السلام)، ويأجوج ومأجوج، وثلاثة خسوف: خسف بالمشرق، وخسف بالمغرب، وخسف بجزيرة العرب، وآخر ذلك نار تخرج من اليمن، تطرد الناس إلى محشرهم)) واتە: پێغەمبەری خواﷺ بە سەری کردینەوە لە کاتێکدا ئێمە زیکر و یادمان دەکرد، فەرمووی: ــ ئەوە باسی چی دەکەن؟ فەرموویان: باسی قیامەت دەکەین، فەرمووی ﷺ: قیامەت هەڵناسێت تا لە پێشیدا (دە) نیشانە نەبینن ئەمجار باسی کرد و فەرمووی: (دوکەڵەکە) و (دەججال) و (زیندەوەرێکی سەیر (دابة)) و (هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە) و (دابەزینی عیسا ی کوڕی مەریەم(عليه السلام)) و (یەئجوج و مەئجوج) و سێ ڕۆچوون ڕوو دەدات: (ڕۆچوونێك لە ڕۆژهەڵات) و (ڕۆچوونێك لە ڕۆژئاواوە) و (ڕۆچوونێك لە دوورگەی عەرەبەوە) و لە کۆتایی ئەوانە ئاگرێك لە یەمەنەوە دەردەچێت خەڵکی ڕادەماڵێت بەرەو مەحشەر)).

---

١ ــ أخرجه مسلم كتاب ((الفتن و أشراط الساعة )) ، باب ((في الآيات التي تكون قبل الساعة )) (٢٩٠١) .

ئەم نیشانە گەورانە لە جێگای تردا بە ڕیزبەندییەكی جیاواز باسكراوە، ئەو ڕیزبەندییەی باس كراوە لە فەرموودەكەی پێغەمبەری خوادا ﷺ مەبەست ئەوە نییە كەوا ئەو نیشانانە بەو شێوەیە لە دوای یەك ڕوو دەدەن، چونكە چەند فەرموودەیەكی (صحیح) ی تر هاتوون لەو ڕیزبەندییەی فەرموودەكەی (حذیفة ی كوڕی أسید الغفاری) جیاوازە كە لە (صحیح مسلم) ڕیوایەت كراون.

جا لە پاش كۆ كردنەوە لە نێوان هەموو ڕیوایەتەكان و پەسەندكردنیان بۆمان ڕوون دەبێتەوە ـ هەروەكو الحافظ ابن حجر[1] ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ و جگە لەو لە ئەهلی زانست و زانیاری باسیان كردوە..كە دەرچوونی دەججال یەكەم نیشانەیە لە نیشانەكان و یەكەم ئایەتی گەورەیە كە بانگەشە دەكات بە گۆڕینی هەموو حاڵ و وەزعی جیهان لە سەر ڕووی زەویدا و ئەم گۆڕانكارییەی بارودۆخی زەوی كۆتایی بە دابەزینی عیسای كوڕی مەریەم دێت (علیە وعلی نبینا أفضل الصلاة والسلام) بە مەبەستی كوشتنی دەججال و دوعا كردن لە (یەئجوج و مەئجوج)، هەروەكو لە پاشاندا باسی دەكەم ـ إنشاء الله ـ .

دەرچوونی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە یەكەم نیشانەی گەورەیە كە بانگەشە دەكات بۆ گۆڕینی گەردوون و جیهانی سەرەوە، (العالم العلوی)، ئەوەش بە دەركەوتنی زیندەوەرە سەیرەكە (الدابە) كۆتایی پێ دێت و بۆچوونی پەسەندكراو ئەوەیە كە ئەو زیندەوەرە لە هەمان ڕۆژدا دەردەچێت كە ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە دەردەچێت، چونكە ئەگەر ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە دەرچوو ـ هەروەكو لە پاشاندا باسی دەكەم إنشاء الله ـ چیتر تەوبەی تەوبەكاران وەرناگیرێت، پاشان ئەو زیندەوەرە لە هەمان ڕۆژدا دەردەچێت بۆ ئەوەی ئیمانداران بە سیفەتی ئیمانەوە نیشان بكات و بێ باوەڕان بە سیفەتی بێباوەڕییەوە نیشان بكات بە مەبەستی تەواو بوون و یەكلایی كردنەوە و جیاكردنەوە لە نێوان بڕواداران و بێ باوەڕان، و لا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم.

---

١ (فتح الباري ) (١١/٣٥٣) بتصرف ط المعرفة .

دەرچوونی دەججال: یەکەم نیشانەیە و یەکەم ئایەتە لە ئایەتە گەورەکان کە بانگەشەی گۆڕانی بارودۆخی جیهان دەکات لە سەر رووی زەویدا، بۆیە من بەو کەسانە دەڵێم کە نکۆڵی لەو فەرموودانە دەکەن و ئەوانەی نکۆڵی باس و بوونی دەججال دەکەن و ئەوانەی کە دەڵێن: دەججال تەنها هێمای خراپەکارییە و کەسایەتییەکی راستەقینە نییە ! ! دەڵێم: بە راستی ئەمە پیرۆز راگرتن و پێش خستنی عەقڵە بە سەر دەقە راست و دروستەکاندا.. نابێت ئێمە عەقڵ بکەینە خودایەك و بیپەرستین جگە لە خوا، لێرەدا حەز دەکەم بڵێم: ئێمە لە قەدر و نرخ و پایەی عەقڵ کەم ناکەینەوە بەڵکو روناکی وەحی خوداوەند(سروش) هەرگیز روناکی عەقڵ ناکوژێنێتەوە، بەڵکو پڕ بەرەکەتی دەکات و پاکی دەکاتەوە و بە هێزی دەکات، بە مەرجێك عەقڵ و هەموو بوونەوەر کڕنۆش ببەن بۆ خوای گەورە و میهرەبان، دەبێ عەقڵ داهێنان لەو بوارەدا ئەنجام بدات کەوا لە توانایدا هەیە و خۆی پێی خۆشە، بەڵام ئەگەر هاتوو عەقڵی خۆی کردە خودایەك یان تاغوتێك بۆ ئەوەی حوکم بدات بە سەر دەقە راست و دروستەکاندا و ئەوەی کە عەقڵ پێی رازی بێت پێی رازییە و ئەوەی پێی رازی نەبێت رەدی بکاتەوە ئەوا دینی خوا دەبێتە یارییەك بە دەستی عەقڵی مرۆڤەکانەوە، ئەگینا توخوا پێم بڵێ.. ئایە ئەو دینە کە وەری دەگرین کام دینە؟ ئەو دینەیە کە عەقڵی من پێی رازییە یان ئەو دینەی کە عەقڵی تۆ پێی رازییە؟! ئا بەم شێوەیە دین دەبێتە شتێك بە ویستی خۆمان وەریگرین یان رەدی بکەینەوە! بۆیە بە هیچ شێوەیەك نابێت عەقڵ بکەینە داوەرێك لە بەر دەستی دەقە روون و دروستەکاندا.

علــم العلــيم وعقــل العاقــل اختلفــا    من ذا الذي فيهما قد أحرز الشرفا
العلــم قــال: أنــا أحــرزت غايتــه    والعقل قال: أنا الرحمن بي عرفا
فأفــصح العلــم إفــصاحا وقــال لــه    بأينـــا الله فى قرآنـــه اتـــصفا
فـــأيقن العقـــل أن العلـــم سـيِّده    فقبل العقل رأس العلم و انـصرفا

واتە: زانستی زانیارێك و عەقڵی هۆشمەندێك بوە جیاوازییان کام لەوان پلە و پایە و شکۆمەندیان بە دەست هێناوە، زانستەکە گوتی: من ئەو مەبەستەیەم بە

دەست هێناوە، عەقڵ گوتی: لە ڕێگای منەوە خەڵکی خودایان ناسیوە

بۆیە زانستەکە بە دەربڕینێك دەربڕی و گوتی: بە کام لە ئێمە خوای گەورە لە قورئاندا وەصفی خۆی کردوە، بۆیە عەقڵ زانی کەوا زانست گەورەی ئەوە، پاشان عەقڵ سەری زانستی ماچ کرد و بڵاوەیان لێ کرد.

ڕەحمەتی خوا لە (ابن القیم)[1] کاتێك دەفەرموێت:

| | |
|---|---|
| لا يستقل العقل دون هداية | بالوحي تأصيلا ولا تفصيلا |
| كالطرف دون النور ليس بمدرك | حتى يراه بكرة و أصيلا |
| نور النبوة مثل نور الشمس | للعين البصيرة فاتخذه دليلا |
| فإذا النبوة لم ينلك ضياؤها | فالعقل لا يهديك قط سبيلا |
| طرق الهدى محدودة إلا على | من أم هذا الوحي والتنزيلا |
| فإذا عدلت عن الطريق تعمدا | فأعلم بأنك ما أردت وصولا |
| يا طالبا درك الهدى بالعقل | دون النقل لن تلقى لذاك دليلا |

واتە: هەرگیز عەقڵ سەربەخۆ نابێت بە بێ هیدایەت بە وەحی لە بناغەوە و بە دوور و درێژی، وەکو چاوێك بە بێ روناکی نابینێ تاکو بەیانیان و ئێواران تەماشا بکات، روناکی پێغەمبەرایەتی وەك روناکی رۆژە بۆ ئەوەی چاوەکان ببینن بۆیە بیکە رابەرێك، ئەگەر پێغەمبەرایەتی روناکی خۆی پێت نەبەخشی ئەوا عەقڵ بە تەنها هەرگیز بۆ رێگا رێنموییت ناکات، رێگاکانی هیدایەت دیاریکراون تەنها ئەو کەسە نەبێت کە پیشەوای ئەم سرووش و قورئانەیە، ئەگەر بە قەستی لە رێگا لابدەیت ئەوا بزانە کە خۆت نەتویستوە بگەیتە جێ، ئەی داواکاری هیدایەت لە رێگای عەقڵەوە بە بێ قورئان و فەرموودە بزانە کە ئەوە هەرگیز نابێتە رابەرت.))

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾(الحشر: ٧) واتە: هەرچی پەیامبەر ﷺ پێی دان

---

١ ((الصواعق المرسلة )) (٣/٩٧٩) ط العاصمة .

وەری بگرن، واتە: ـ بەچی فەرمانی پێ کردن لە هەر شتێکدا ئەوا جێبەجێی بکەن. ڕێیشی لە هەر شتێ لێ گرتن، ئێوەش دەستی لێ هەڵگرن و خۆتان لە خەشم و غەزەبی خوا بپارێزن بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و وازهێنان لە قەدەغەکراوەکانی بە ڕاستی خوا سەخت تۆڵەیە رقی لە هەر کەسێك گرت ڕزگاری نابێ)).

جا سوننەتی پێغەمبەرﷺ خۆی لە خۆیدا وەحی خودایە و پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ باسی ئەوەی بۆ کردووین.

هەروەکو (أحمد) و (أبو داود) ریوایەتیان کردوە بە سەنەدێکی (صحیح)[1] لە فەرموودەیەکی (المقدام ی کوڕی معد یکرب)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((ألا إني أوتيت الكتاب ومثله معه ، ألا يوشك رجل شبعان على أريكته يقول: عليكم بهذا القرآن فما وجدتم فيه من حلال فأحلوه، وما وجدتم فيه من حرام فحرموه، ألا لا يحل لكم لحم الحمار الأهلي، ولا كل ذي ناب من السبع ولا لقطة معاهد)) واتە: خوای گەورە قورئانی پێ بەخشیوم و هاوشێوەکەی لە گەڵدایە (واتە: سوننەت) خەریکە وای لێ دێت کەسێکی تێر لەسەر قەنەفەکەی دانیشتوە و دەڵێت: دەست بگرن بەم قورئانەوە (واتە: تەنها ئەم قورئانەمان بەسە) ئەوەی حەڵاڵ بوو تیایدا بە حەڵاڵی بزانن و ئەوەی حەرام بوو تیایدا بە حەرامی بزانن، بزانن کەوا گۆشتی گوێدرێژی ماڵی حەڵاڵ نییە بۆتان، لە گەڵ هەموو دڕندەیەکی کەڵپەدار و دۆزراوەی پەیمان پێدراوەکان)).

لە ڕیوایەتێکی تردا کە (الترمذي) و (ابن ماجە)[2] ریوایەتیان کردوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((و إنما حرم رسول الله ﷺ كما حرم الله)) واتە: دڵنیابن ئەوەی کە پێغەمبەری خواﷺ حەرامی کردوە هەروەکو ئەوەیە چۆن خوای

---

١ أخرجه أحمد (١٣٠/٤) ، وأبو داود كتاب ((السنة)) ، باب (( في لزوم السنة)) (٤٦٠٤) ، و صححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (٢٨٧٠) ، و((صحيح الجامع)) (٢٦٤٣) .

٢ أخرجه الترمذي كتاب ((العلم)) ، باب ((ما نهى عنه أن يقال عند حديث رسول الله ﷺ (٢٦٦٤) وقال : ((حديث حسن غريب من هذا الوجه )) ، وابن ماجه في المقدمة (١٢) ، وأحمد (١٣٢/٤) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي ، وابن ماجه )) .

گەورە حەرامی کردبێت)).

لە شیرینترین و ڕازاوەترین قسەکانی ئیمامی (الشوکانی) ئەوەیە کە دەڵێت[1]: ((جێگیر بوونی بە بەڵگەدانانی سوننەت و سەربەخۆ بوونی لە دانانی حوکمە شەرعییەکاندا یەکێکە لە پێویستییە دینییەکان و هیچ کەسێك لەوەدا جیاواز نییە ئیللا کەسێك نەبێ کە لە ئیسلامدا هیچ پشکێکی نەبێت)).

بۆیە هیچ کەسێك ناتوانێت لە قورئان تێبگات بە بێ سوننەت، ئیللا دەبێ بگەڕێینەوە بۆ ئەو کەسەی کە قورئانی بە سەردا دابەزیوە کە ئەویش پێغەمبەری ئەکرەمە ﷺ.

بۆیە دەڵێم: ئەم قۆناغە ـ لە نیشانەکانی قیامەت ـ ناکرێت و نابێت هیچ یاسایەك لەو یاسایانەی کە ئێستا حوکممان دەکەن حوکمی تێدا بکات، چونکە کارەکە جیاواز دەبێت، هەروەها خۆمان بەو ڕیزبەندییەوە خەریك ناکەین، چونکە ئەگەر نیشانەیەك لە نیشانە گەورەکان دەرکەوێت ئەوا ئەو دوای نیشانەکان بە دوایدا دێن و دەردەکەون هەروەکو خۆشەویست ﷺ باسی کردوە.

ئیمامی ئەحمەد لە (مسند)ەکەیدا و الحاكم لە (مستدرك)ەکەیدا و جگە لەوان[2] ڕیوایەتیان کردوە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی عمرو) کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((الآيات خَرَزات منظومات في سلك، فإن يُقطع السلك يتبع بعضها بعضاً)) واتە: نیشانەکان وەك دەنکەکانن لە دەزوویەکدا هۆنراونەتەوە، ئەگەر دەزوەکە بچڕا ئەوا شوێنی یەکتر دەکەون)).

جا یەکەم نیشانەیەك بانگەشەی گۆڕینی حاڵی سەر زەوی دەکات: دەرچوونی دەججالە.

ئایە دەججال کێیە؟

حەز دەکەم لێرەدا بڵێم: زۆربەی موسڵمانان هیچ شتێك دەربارەی دەججال

١ ـ (إرشاد الفحول ) (٥٣٠) .

٢ ـ أخرجه أحمد (٢/ ٢١٩)، والحاكم (٤/٥٢٠) عن عبدالله بن عمرو، وله شاهدٌ عن أبي هريرة ، أخرجه ابن حبان (٦٨٣٣)، والطبراني في ((الأوسط)) (٤٢٧١) وله شواهد أخرى، صححه بها الألباني في ((الصحيحة)) (١٧٦٢، ٣٢١٠) و ((صحيح الجامع )) (٢٧٥٥) .

نازانن، بەڵکو هەندێکیان دەڵێن: ئەمانە هەموو ئەفسانەن! ئێمە وا لە سەردەمی ئەنتەرنێت و ئۆتۆمەداین، برای بەرێزم... ئەوەش بزانە کە لە نیشانەکانی دەرکەوتنی دەججال ئەوەیە خەڵکی واز لە باسکردنی ئەو بهێنن، هەروەها زانایان و بانگەوازکاران لە سەر مینبەرەکان باسی ناکەن[١]، بە راستی ئەم ئوممەتە دەجالیان لە یاد کردوە ئیللا مەگەر کەسانێك نەبێت خوا رەحمی پێ کردبێتن.

لێرەدا پرسیارێك دەکرێت: ئایە دەججال مرۆڤە یاخود جنۆکەیە؟ ئایە ئەو مرۆڤێکە لە نەوەکانی ئادەم؟ بەڵێ: ئەو مرۆڤە و ئادەمیزادە!

ئایە بۆ ناونراوە بە(المسیح الدجال)؟

وەلامەکە ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کردوە ((الدجال ممسوح العین)) واتە: دەججال چاوی سڕاوەتەوە و رەش بوەتەوە))، (الدجال): لە داپۆشین و گومڕاکردن و درۆکردنەوە هاتوە، چونکە ئەو حەق و ناحەق تێکەڵ دەکات، ناونراوە (المسیح) نەك (المسیخ) چونکە ئەو گومڕاکەر و درۆزن و خەڵەتێنەری خەڵکییە ئیللا کەسانێك نەبێت کە خوا رەحمی پێ کردبێتن.

لەسەر رووی زەویدا هیچ فیتنەیەك نییە لەو رۆژەوە کە خوای گەورە ئادەمی دروستکردوە تاکو رۆژی قیامەت ترسناکتر بێت لە فیتنەی دەجال!!

هەروەکو لە (صحیح البخاری)[٢] دا هاتوە لە فەرموودەی (أم سلمه) ی خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((استیقظ النبي ﷺ ذات لیلة فقال: ((سبحان الله، ماذا أُنزل اللیلة من الفتن، وماذا فُتح من الخزائن، أیقظوا صواحب الحجر — یرید به أزواجه — حتی یصلین،فرب كاسیة في الدنیا عاریة في الآخرة)) واتە: شەویکیان پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەو هەستا و فەرمووی: پاکی و بێگەردی بۆ خوا، ئەمشەو

---

١ ـ كما في حديث الصعب بن جثامة أن النبي ﷺ قال : لا يخرج الدجال حتى يذهل الناس عن ذكره ، وحتى تترك الأئمة ذكره على المنابر )) أخرجه عبدالله بن أحمد في (( زوائد المسند)) (٧١/٤) والطبراني في (( مسند الشاميين )) (٩٩٢) وقال الهيثمي في (( المجمع)) ( ٧/ ٣٣٥) : رواه عبدالله بن أحمد من رواية بقية عن صفوان بن عمرو ، وهي صحيحة ، كما قال ابن معين ، وبقية رجاله ثقات )) ،ذكره الشيخ الألباني في ((قصة المسيح الدجال)) ( ٣٠) .

٢ـ أخرجه البخاري كتاب ((العلم))، باب (العلم والعظة بالليل ) (١١٥) و (٦٢١٨) .

چی شتێك له فیتنـهکان دابـهزیوه، ئایـه چـی شـتێك لـه گهنجینـهکان کراونهتـهوه، خێزانهکانم ههڵسێنن بۆ ئهوهی نوێژ بکـهن، ڕهنگـه کهسێکی داپۆشـراو لـه دونیـادا ڕووت بێت له دوارۆژدا)).

مهبهست و بهڵگه له فهرموودهکهدا ئهوهیه: که دهفـهرموێت: ((مـاذا أُنـزل الليلـة من الفتن، وماذا فُتح من الخزائن؟)).

بـهڵکو لـه (صـحيح مـسلم)[1] دا هـاتوه لـه فـهرموودهی (ابـو هريـره)هوه کـهوا پێغهمبهری خواﷺ فهرموویهتی: ((بَادِرُوا بِالأَعْمَال فِتَناً كقطع الليل المظلـم، يـصبح الرجل مؤمناً ويمسي كافراً، أويمسي مؤمنـاً، ويـصبح كـافراً، يبيـع دينـه بعـرض مـن الـدنيا)) واتـه: بـه کـردهوهی چـاکه پێـشبڕکێ بکـهن پـێش ئـهوهی تاقیکردنـهوه دابهزێتـه سـهر هـهر یهکێکتانـدا وهکـو پارچـهیهك لـه شـهوهزهنگی تاریـك، کـه ڕۆژ دهبێتهوه کابرا ئیمانداره و کهچی ئێوارهی به سهردا دێت کافر بوه یان کـه ئێـواره دێـت ئیمانـداره و کـاتێ ڕۆژ دهبێتـهوه کـافر بـوه دینهکـهی خـۆی دهفرۆشـێت بـه شتێکی بێ نرخی دونیا)) ئهی پهروهردگارمان بمانپارێزه.. بمانپارێزه...!!

له (صـحيح مـسلم)[2] دا هـاتوه لـه فـهرموودهی (عبـدالله ی کـوڕی عمـرو)هوه کـه دهفهرموێت: ((كنا مع رسول الله ﷺ في سفر فنزلنا منزلاً، فمنا من يصلح خبـاءه، ومنا من ينتضل، ومنـا مـن هـو في جـشره، إذ نـادى منـادي رسـول الله ﷺ: الـصلاة جامعة، فاجتمعنا إلى رسول الله ﷺ، فقال:((إنه لم يكن نبي قبلي إلا كـان حقـا عليـه أن يدل أمته على خير ما يعلمه لهم، وينذرهم شر ما يعلمه لهم، وإن أمتكم هذه جعـل عافيتها في أولها، وسيصيب آخرها بلاء و أمور تنكرونها،وتجيء فتنـة فيرقـق بعـضها بعضا، وتجيء الفتنـة، فيقـول المـؤمن: هـذه مهلكـتي، ثـم تنكـشف، وتجـيء الفتنـة فيقول المؤمن: هذه هذه، فمن أحب أن يزحزح عن النار ويدخل الجنة، فلتأته منيتـه وهو يؤمن بالله واليوم الآخر، وليأت إلى الناس الـذي يحـب أن يـؤتى إليـه)) واتـه: لـه سهفهرێکدا لهگهڵ پێغهمبـهری خـوادا بـووین ﷺ لـه جێگایهکـدا دابـهزین و لامانـدا،

١- أخرجه مسلم كتاب ((الإيمان)) باب (الحث على المبادرة بالأعمال قبل تظاهر الفتن)) (١١٨) .
٢ - أخرجه مسلم كتاب ((الإمارة)) باب (وجوب الوفاء ببيعة الخلفاء الأول فالأول )) (١٨٤٤) .

تیاماندا هەبوو چادر و خێوەتەكەی چاك دەكرد و تیاماندا هەبوو تیر و رمەكەی چاك دەكرد و تیژی دەكرد و تیاماندا هەبوو وڵاخەكەی دەلەوەراند، بانگكارێك لە لایەن پێغەمبەری خوداوەﷺ بانگی كرد و فەرمووی: ((الصلاة جامعة)) بۆیە ئێمەش لە دەور و بەری پێغەمبەری خواﷺ كۆ بووینەوە، پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ فەرمووی: هیچ پێغەمبەرێك لە پێش من نەهاتوە ئیللا لە سەری بوە كە رێنمایی ئوممەتەكەی بكاتەوە بۆ هەر چاكەیەك بۆیان كە بیزانێت و ئاگاداریان بكاتەوە لەهەر خراپەیەك بۆیان،كە بیزانێت و ئەم ئوممەتە هێزو رەنگ و بۆی لە سەرەتاكەیدایە و كۆتاییەكەی توشی بەڵا دەبن و توشی چەندەها كێشە دەبن كە ئینكاری لێ دەكەن، فیتنەی وا دێت یەكتری ناسك دەكەنەوە (واتە: هەر فیتنەیەك دێت و ئەوەی پاش ئەو لەو خراپتر و گەورەترە)، فیتنە دێت و كەسی ئیماندار دەڵێت: بە راستی ئەم فیتنەیە بە هەلاكەتما دەبات و لە ناوم دەبات، ئەمجار ئەو فیتنەیەی لەسەر لادەچێت و فیتنەیەكی تر دێت و ئیماندار دەڵێت: ئەمە ئەمە (واتە: ئەمە بە راستی بە هەلاكەتما دەبات) هەر كەسێ دەیەوێ لە ئاگر رزگاری بێت و بچێتە بەهەشتەوە با كاتێ دەمرێت باوەڕی بە خوا و رۆژی دوایی هەبێت و بڕوات بۆ لای ئەو كەسانەی كە پێی خۆشە بچێت بۆ لایان))

لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێین: هیچ فیتنەیەك نییە لە فیتنەی دەججال ترسناكتر بێت، هەروەكو پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێت كە لە ((صحیح مسلم))[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (عمران ی كوڕی حصین)ەوە:

((ما بین خلق آدم إلی قیام الساعة أمر أكبر من الدجال)) واتە: هیچ كارێك لە نێوان دروستكردنی ئادەمەوە، تاوەكو هەستانی قیامەت لە دەججال گەورەتر نییە)).

هەروەها ابن ماجه لە (سنن)ەكەیدا و الحاكم لە (مستدرك)ەكەیدا و الطبراني لە (الكبیر)دا و جگە لەوان[2] لە فەرموودەی (أبی أمامه الباهلی)یەوە ریوایەتیان كردوە

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٩٤٦) .

٢ ـ أخرجه ابن ماجة (٤٠٧٧) والحاكم (٨٦٢٠) والطبراني في (الكبير) (١٤٦/٨) وابن أبي عاصم في (الآحاد والمثاني ) وسنده ضعيف , وله شواهد صححه بها الشيخ الألباني في ((قصة المسيح الدجال)) و (( صحيح الجامع)) (٧٨٧٥) .

کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إنه لم تكن فتنة في الأرض منذ ذرأ الله ذرية آدم أعظم من فتنة الدجال، و إن الله لم يبعث نبياً إلا حذر أُمته الدجال، وأنا آخر الأنبياء و أنتم آخر الأُمم، وهو خارج فيكم لا محالة و إن يخرج و أنا بين ظهرانيكم فأنا حجيج لكل مسلم، وإن يخرج من بعدي فكل امرئٍ حجيج نفسه، والله خليفتي على كل مسلم)) واتە: بەڕاستی هەر لەو کاتەوە خوای گەورە وەچەی ئادەمی دروست کردوە، لەسەر ڕووی زەویدا هیچ فیتنەو تاقیکردنەوەیەکی گەورەترو سەخت تر لە فیتنەی دەججال نەبوە، خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردوە ئیللا ئوممەتەکەی وریا کردۆتەوە لە مەترسی دەججال، من کۆتایی پێغەمبەرانم و ئێوەش کۆتایی ئوممەتانن. کەواتە گومانی تێدا نییە کە دەججال لە ناو ئێوەدا و لە سەردەمی ئێوەدا دەردەکەوێت. ئەگەر لە کاتێکدا دەرکەوێت من لە ناوتاندابم، ئەوە من لەبری هەموو موسوڵمانان بەرەنگاری دەبمەوە و بەڵگەو نیشانە پوچەڵەکانی هەڵدەوەشێنمەوە، بەڵام ئەگەر لە دوای من دەرکەوت ئەوە هەر موسوڵمانە و پارێزگاری لە خۆی دەکات، بەئەندازەی عیلم و یەقینی بە خواو پەیامەکەی لە بەرامبەری دەوەستێت، بەڵام دوای منیش پەروەردگار پارێزەرتان دەبێت)).

بە ڕاستی فەرموودەیەکی زۆر ناسك و نایابە هەرچەندە باسی چەند فیتنەیەکی ترسناکی تێدایە بەڵام لایەنێکی زۆر بەبایەخمان بۆ دەردەخات لە لایەنەکانی سۆز و میهرەبانی پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ، بەرانبەر بە ئەم ئوممەتە پیرۆزە.. ئوممەتی یەکتاپەرستی... ئوممەتی (محمدی کوڕی عبدالله) ﷺ بە ڕاستی مەزنترین و پاکترین و ڕێزدارترین ئوممەتە.. دڵنیابن هەروەها بە پیرۆزترین و باشترین ئوممەت دەمێنێتەوە تاکو ڕۆژی دوایی هەرچەندە ئێستا و لەم کاتەدا بە قۆناغی لاوازی و بێهێزیدا تێدەپەڕێت.. داوا لە خوا دەکەم بە جوانترین شێوە بیگێڕێتەوە سەر ڕاستی و عیززەت.. هەرخۆی پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە..

دەڵێم: لە بەر ترسناکی و سامناکی ئەم فیتنەیە پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ بەو پەڕی وردی و ڕوونییەوە بۆی باس کردووین، چونکە فیتنەکە لەوپەڕی ترسناکی و

سامناکیدایە، تاکو وای لێهاتوە و دەتوانین هەر بە بینینی دەججال بە بێ دواکەوتن بیناسینەوە، ئەمەشە کار و ئەرکی زانایانە بۆ گواستنەوەی ئەو زانیاریانە، پێویستە لەسەریان ئەو ڕاستییانە لە پێغەمبەری ئەکرەمەوە ﷺ بۆ ئەم ئوممەتەی باس بکەن لە باسکردنی وەسفی دەججال، ئایە خۆشەویست ﷺ چی فەرموە؟

ئیمامی (بوخاری و موسلیم)[1] ڕیوایەتیان کردوە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی عمر) ەوە دەڵێت: ((قام رسول الله في الناس فأثنى على الله بما هو أهله، ثم ذكر الدجال، فقال: ((إني لأُنذركموه، وما من نبي إلا وقد أنذره قومه، لقد أنذره نوح قومه، ولكن أقول لكم فيه قولا لم يقله نبي لقومه: تعلّموا أنه أعور، وأن الله تبارك و تعالى ليس بأعور)). واتە: پێغەمبەری خواﷺ هەستا و وتاری لە ناو خەڵکیدا خوێندەوە، سەرەتا سوپاس و ستایشی خوای پەروەدگاری کرد بەوەی کە خۆی شایستەی ئەو وەسف وسەنایەیە، ئەمجار باسی دەججالی کرد و فەرمووی: ((من ئاگادارتان دەکەمەوە لە دەججال، هیچ پێغەمبەرێك نەهاتوە ئیللا ئوممەتەکەی خۆی لێ ئاگادار کردوەتەوە، نوح پێغەمبەر عليه السلام ئاگاداری ئوممەتەکەی کردەوە، بەڵام من شتێك دەربارەی ئەو بە ئێوە دەڵێم کە هیچ پێغەمبەرێك بە ئوممەتەکەی نەگووتوە، بزانن و ئاگاداربن کە دەججال چاوێکی کوێرە، خوای پەروەدگار بە هیچ شێوەیەك کوێر نییە)).

بەرزی و بەرێزی بۆ خوای پەروەردگار، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو لە هەموو لەیەکچوونێك و لەیەکچواندنێك و لە هەر کەم و کووڕیەك، دەججال چاوێکی کوێرە و سڕاوەتەوە و ڕەش کراوەتەوە، (عين طافئة) واتە: ڕوناکی تێدا نەماوە، یان (عين طافية) واتە: عەیبدارە، هەردوو لەو وشانە تەواون.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشۡكَوٰةٖ فِيهَا مِصۡبَاحٌۖ ٱلۡمِصۡبَاحُ فِي زُجَاجَةٍۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوۡكَبٞ دُرِّيّٞ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٖ مُّبَٰرَكَةٖ زَيۡتُونَةٖ لَّا شَرۡقِيَّةٖ وَلَا غَرۡبِيَّةٖ يَكَادُ زَيۡتُهَا يُضِيٓءُ وَلَوۡ لَمۡ تَمۡسَسۡهُ نَارٞۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٖۚ يَهۡدِي ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ

---
[1] ـ أخرجه البخاري (٣٠٥٧) معلقاً ووصله في مواطن ( ٣٣٣٧ , ٤٤٠٢ , ٧١٢٧) ومسلم (١٦٩/٩٥) .

مَن يَشَآءُۚ وَيَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَٰلَ لِلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴾ (النـور: ٣٥) واتە: هەر خوايە نوور و رووناكى ئاسمانەكان و زەوى، نموونەى نوور و رووناكى ئەو خوايە وەك تاقێكە كە چرايەكى گەورەى پرشنگدارى پڕ نوورى تێدا هەڵكرابێت، چراكەش لە ناو چوار چێوەيەكى پاكى درەوشاوەى شووشەيەكدا بێت، شووشەكەش وەك ئەستێرەيەكى پرشنگدار و گەش بێت، چراكە لە دار (زەيتون) ێكى بە فەڕو بەركەوت رۆن و سووتەمەنييەكەى وەربگيرێ، دارەكەشى نە هەميشە لە بەر خۆرگەيە تا بە درێژايى رۆژ خۆر لێى بدا نە هەميشەش لە نسار و سێبەردايە تا هەرگيز خۆر لێى نەدات بەڵكو لە شوێنێكدا روابێت خۆرانگەز نەبێ و بە هەميشەش سەوز و جوان بێت، رۆنەكەشى ئەوەندە پاك و پاكژ بێت نزيك بێت هەر لە خۆيەوە گڕ بگرێ، بە بێ ئەوە ئاگريشى بەركەوێ چونكە زەيتى رەسەن ئەوەندە جوانە كاتێ سەيرى ئەكەى دەڵێيت بێ ئەوە ئاگرى تخون كەوێ خۆى داگيرسێ كاتێ ئاگريشى ئەگاتێ شۆڵەو روناكيەكەى زياتر ئەبێت دڵى باوڕەدرانيش ئاوايە بەنوور و رووناكى خوا دائەگيرسێ پێش ئەوە رێنوێنى و شارەزا بكرێ هەر كاتێكيش باسى ئيسلامى بۆ كرا و رێنما بوو ئەوا بە زوويى بەرەو رێگەى راست ئەڕواو هيدايەت ئەبێ، رووناكى لە سەر رووناكى، تاقەكە، چراكە، شووشەكە، زەيتە پاكەكە، ئەمانە هەر هەمووى ئەبنە هۆى زێدە رووناكى و بريقەى چراكە، بێ گومان خوا ويستى لە هەر كەسێك ببێ ئەوا رێنموونى ئەكات بۆ نوور و رووناكى خۆى، خوا هەميشە بۆ خەڵكى نموونە دێنێتەوە بۆ ئەوەى باشتر و چاكتر تێ بگەن، هەروەها خوا بە هەموو شتێك زانا و ئاگادارە ئەزانێ كێ شايستەى هيدايەتە)).

هەروەها پێغەمبەرى خواﷺ دەفەرموێت هەروەكو لە ((صـحيح مـسلم))[١] هـاتوە لە فەرموودەى (أبو موسى الأشعري))يەوە: ((إن الله(ﷻ) لا ينـام، ولا ينبغـي لـه أن ينام، يخفض القسط و يرفعه، يرفع إليه عمل الليل قبل عمل النهار، وعمل النهار قبل عمل الليل، حجابه النور، لو كشفه لأحرقت سبحات وجهه ما انتهـى إليـه بـصره مـن خلقه)) واتە: خواى گەورە هەرگيز ناخـەوێت، شـياو و گونجـاو نييـە ئـەو بخـەوێت،

[١] ـ أخرجه مسلم (١٧٩)

تەرازووی کردەوەکانی مرۆڤ بەرز دەکاتەوە و نزمی دەکاتەوە، کرداری شەوانەی پێش کرداری ڕۆژی بۆ بەرز دەبێتەوە و کرداری ڕۆژانەی پێش شەو بۆ بەرز دەبێتەوە، پەردەکەی زاتی خوا ڕوناکییە، ئەگەر ئەو پەردە لاببات نووری ڕووخساری هەموو دروستکراوانە دەسوتێنێت کە بینایی پێی دەگات (واتە: هەموو بوونەوەر))).

لە جوانترین و ناسکترین شت لەم بابەتەدا خوێندبێتمەوە ئەوەیە کە ئیمامی (بوخاری و موسلیم)[١] لە فەرموودەی (ابن مسعود)ەوە ڕیوایەتیان کردوە دەڵێت: ((جاء حبر من الأحبار إلى رسول اللهﷺ فقال: يا محمد، إنا نجد: أن الله يجعل السموات على إصبع، والأرضين على إصبع، والشجر على إصبع، والماء والثرى على إصبع، وسائر الخلائق على إصبع، فيقول: أنا الملك، فضحك النبي حتى بدت نواجذه، تصديقا لقول الحبر، ثم قرأ رسول اللهﷺ: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾(الزمر: ٦٧) واتە: زانایەك لە زاناكانی جوولەكە هات بۆ لای پێغەمبەری خواﷺگوتی: ئەی محمد... ئێمە لە کتێبەکانی خۆماندا بینیومانە کە: خوای گەورە هەموو ئاسمانەکان لە سەر پەنجەیەکی دادەنا و زەوی لە سەر پەنجەیەك و دار و درەخت لە سەر پەنجەیەك و ئاو و خاك لە سەر پەنجەیەك و هەموو دروستکراوەکانی تر لە سەر پەنجەیەك، دەڵێت: من پادشام... بۆیە پێغەمبەری خواﷺ پێکەنی تاوەکو ددانەکانی دەرکەوت وەکو پشتگیری کردن و ڕاستکرنەوەی قسەی ئەو زانایە، پاشان پێغەمبەری خواﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ واتە: ئەوانە وەکو پێویست خوایان نەناسی و ڕێزیان لێ نەگرت، ئەگینا چۆن هاوەڵیان بۆ دادەنا؟ لە ڕۆژی قیامەتدا زەوی هەموو لە ناودەستی ئەودایە و ئاسمانەکانیش پێچراونەتەوە و بە دەستی ڕاستیەوەن، خوا پاك و بڵندە لەو شتانە ئەوان ئەیکەنە هاوبەشی)).

---

١ـ أخرجه البخاري (٤٨١١) ومسلم (٢٧٨٦) .

تەماشاکەن چۆن پێغەمبەری خواﷺ ئەم مەسەلەیە بە جوانی ڕوون دەکاتەوە.

ئیمامی (بوخاری و موسلیم)[١] لە فەرموودەی (أنس ی کوڕی مالك)ەوە ڕیوایەتیان کردوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((الدجال ممسوح العين مكتوب بين عينيه كافر)) واتە: دەججال چاوی سراوەتەوە و ڕەشبوەتەوە و لە نێو دوو چاوەکانیدا نوسراوە کافر)).

لە ڕیوایەتێکی تردا کە لە (صحيح مسلم)[٢] دا هاتووە کەوا فەرموویەتی: ((كَفَرَ ـ پێغەمبەری خواﷺ پیت بە پیت خوێندییەوە و فەرمووی: ـ ك ف ر))

لە ((صحيح مسلم))[٣] دا هاتووە لە فەرموودەی (حذيفة ی کوڕی اليمان)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:((مكتوب بين عينيه كافر، يقرؤه كل مؤمن كاتب و غير كاتب)).

مەبەستی ئەوەیە کە ئەو وشەیەی لە نێوان هەردوو چاویدایە دەخوێنێتەوە ئەو کەسە خوێندەوار بێت یا نەخوێندەوار، چونکە خوای پەروەردگار یارمەتی دەدات بە هۆی باوەڕەکەیەوە بە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ بە خوێندنەوەی ئەو وشەیە کە لە نێوچاوی دەججال دا نوسراوە.

ئەی خودایە.. دڵەکانمان پڕ بکە لە باوەڕ و باوەڕدارمان بکە، ئێمە و ئێوە لە هەموو فیتنەیەك بپارێزێت چ فیتنەکە ئاشکرا بێت یان شاراوە.

لە ڕیوایەتێکی تردا کە لە ((صحيح مسلم))[٤] دا هاتوە: ((مكتوب بين عينيه كافر يقرؤه كل مسلم)) واتە: لە نێوان هەردوو چاویدا نوسراوە کافر و هەموو موسڵمانێك دەیخوێنێتەوە)).

براکانم.... ڕەنگە مرۆڤێك بتوانێت هەموو دونیا پڕ بکات لە قسە و هاوار و نوسین، هەموو دونیا پڕ بکات لە زانست و زانیاری بەڵام لە سەرەمەرگدا ناتوانێت وشەی یەکتاپەرستی بڵێت: لا اله الا الله.. کەچی لەولاشەوە پیاوێکی نەخوێندەوار

---

١ ـ أخرجه البخاري (٧١٣١)و(٧٤٠٨) ومسلم (٢٩٣٣/١٠٣) .

٢ ـ أخرجه مسلم (٢٩٣٣/١٠٢) .

٣ ـ أخرجه امسلم (٢٩٣٤/١٠٥) .

٤ ـ أخرجه امسلم (٢٩٣٣/١٠٣) .

لە باوکە باش و چاکەکانمان، دایکێك لە دایکە پاکەکانمان خاوەنی فیترەتێکی پاك لە سەرە مەرگدا دەڵێت: لا اله الا الله، محمد رسول الله.

پزیشکێك لە پزیشکە برینسازە خۆشەویستەکانمان سوێندی بۆ خواردم و گوتی: کابرایەك لە ئەهلی قورئانیان بۆ هێنام بە مەبەستی نەشتەرگەری کردنی، تەمەنی لە حەفتا ساڵ تێپەڕیبوو، ڕووی وەکو مانگی چواردە دەدرەوشایەوە، هەموو ریشی سپی و جوان بوو، دەڵێت: بینیم کابرا دەستی بە گریان کرد، پێم گوت: باوکی بەڕێزم... بۆ دەگری لە کاتێکدا تۆ ئەهلی قورئان و کەسێکی دینداری؟ ئەویش پێی گوت: کوڕی شیرینم.. من لە مردن ناترسم، بەڵام من لە بێهۆشکەر (بەنج) دەترسم! ئەویش گوتی: ئایە بۆ لە(بەنج) دەترسیت؟ گوتی: لەوە دەترسم لەو کاتەدا عەقڵم لە دەست بدەم و چیتر نەتوانم ویردی قورئانی ڕۆژانەی خۆم بخوێنم! پێم گوت: ڕۆژانە چەند دەخوێنێت؟ گوتی: هەموو ڕۆژێك پێنج جوزئی قورئان دەخوێنمەوە — هەموو هەفتەیەك جارێك قورئان خەتم دەکات — پاکی و بێ گەردی بۆ خوا!! پزیشکەکە پێی گوتم:

خوزگەم دەخواست لەو کاتەدا زەوی شەقی ببردایە و منی نوقم بکردایە، کابرایەك تەمەنی لە حەفتا ساڵ زیاترە و دەگری، چونکە لەوە دەترسێت ویردی ڕۆژانەی قورئانی لە دەست دەربچێت، لە کاتێکدا ئەو خەریکی نەشتەرگەرییە! پزیشکەکە گوتی: دەستم کرد بە قسەکردن و پێم گوت:انشاء الله — خوای گەورە پایەدارت دەکات، بەردەوام دڵنیام دەکردەوە بە قسەو گوفتاری شیرین، ئەمجار سوێندی بۆ خواردم و گوتی: سوێند بەخوا.. کۆمەڵێك پزیشکم هێناو هەموویانم لەسەر ئەورووداوە کردە شایەت،چونکە من هەرگیز باوەڕم نەدەکرد لەم سەردەمەدا و لە نێو خەڵکیدا شتی وا ڕوو بدات، پێم گوت: چی ڕوویدا؟ پێی گوتم:

کابرا بەوانی گوت: (بەنج)م پێ مەدەن تاکو دەست بە خوێندنەوەی ویردی قورئانی ڕۆژانەکەم دەکەم، کاتێ ئەم کابرایە دەستی بە خوێندنەوەکەی کرد، پزیشکی تایبەت بە(بەنج) هاتە ژوورەوە و بەنجەکەی لێدا، سوێندی بۆ خواردم بە خوا ئەم کابرایە لە خوێندنەوەی قورئان نەبوەوە لە کاتی ئەنجامدانی

نەشتەرگەرییەکەدا و تاکو تەواو بوونی نەشتەرگەرییەکە و بە ئاگا هاتەوە کەچی ئەو بەردەوام قورئانی دەخوێندەوە!! ئایە تاکو ئێستا و لەم سەردەمەدا شتی وات بینیوە لە ناو خەڵکیدا روو بدات؟! بە راستی ئەوە فیترەتی پاك و بێگەردە، ئەو دڵە روناکەیە کە بە روناکی قورئان روناك بوەتەوە.

داوا لە خوا دەکەم دامەزراومان بکا و رێگای راستیمان نیشان بدات و یارمەتیمان بدات و دڵسۆزیمان پێ ببەخشێت.

جا کێشەکە لەوێدا جیاوازە، ئەو باوەڕدارەی کە خوێندەواری نییە ئەوا خوای گەورە یارمەتی دەدات بۆ خوێندنەوەی ئەو وشەیەی نێو چاوانی دەجال کە نوسراوە: کافر...

برا رێزدارەکانم.... بە راستی ئەو فیتنەیە فیتنەیەکی سەختە... هەروەکو چۆن پێغەمبەری خواﷺ وەسفی بۆ کردووین لە فەرموودەیەکی دوور و درێژدا، لە فەرموودەی (النواس ی کوڕی سمعان) ەوە و لە(صحيح مسلم)[1] دا هاتوە: کاتێ کە هاوەڵان پرسیار لە خۆشەویستی خوا دەکەنﷺ دەربارەی ئەو ماوەیەی کە دەجال لە سەر زەویدا دەمێنێتەوە، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((أربعون يوماً)) واتە: چل ڕۆژ)...واتە: دەجال لە ماوەی ئەو چل ڕۆژەدا هەموو سەر زەوی دەگەڕێت تەنها هەردوو شاری مەککە و مەدینە نەبێت، دەڵێت: ((يوم كسنة، ويوم كشهر، ويوم كجمعة، وسائر أيامه كأيامكم)).واتە: ڕۆژێکیان وەکو ساڵێك وایە و ڕۆژێکیشیان وەکو مانگێکە و ڕۆژێکی تریشی وەکو هەفتەیەکە، ئەو ڕۆژەکانی تریش وەك ڕۆژەکانی ترتانە)).

بەڵام هاوەڵان سەرقاڵی شتێکی ترن ئەویش ئەوەیە... ((قالوا: يا رسول الله، فذلك اليوم الذي كسنة أتكفينا فيه صلاة يوم؟)) واتە: فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خواﷺئەو ڕۆژەی وەکو ساڵێك وایە، ئایا نوێژی تەنها یەك ڕۆژی تیادا بەسە؟)).

تەماشاکە کێشەو خەمی ئەوان لەو ڕۆژەدا چییە؟ نوێژە..((قال: لا، اقدروا له قدره)) واتە: فەرمووی: نەخێر، بەڵکو ئەندازەی بۆ دیاری بکەن)). واتە: چۆن لە

---

١ ـ أخرجه امسلم (٢٩٣٧) .

هەر بیست و چوار سەعاتێکدا پێنج نوێژ دەکرێت بەهەمان شێوەش لە هەموو بیست و چوار سەعاتێکی ئەو ڕۆژەدا پێنج نوێژ بکەن.

(القاضي عياض)[١] لێرەدا تێبینییەکی هەیە و دەڵێت: ((ئەم حوکمە تایبەتە بە ئەم ڕۆژەوە کە لە لایەن خاوەنی شەریعەتەوە هاتوە ﷺ)).

پاشان هاوەڵان پرسیارێکی تری لێ دەکەن... ((قلنا: يا رسول الله، وما إسراعه في الأرض؟ قال: ((كالغيث استدبرته الريح فيأتي على القوم، فيدعوهم فيؤمنون به، ويستجيبون له، فيأمر السماء فتمطر، والأرض فتنبت)) واتە: فەرموویان: خێراییەکەی لە زەویدا چۆنە؟. (ئێوەش تەماشای ئەو ڕەوانبێژییەی پێغەمبەربکەن ﷺ فەرمووی: وەکو بارانێکە کە بایەکی لە پشتەوە بێت و پاڵی پێوە بنێ ئەویش دێت بە لای خەڵکانێك و بانگیان دەکات و ئەوانیش باوەڕی پێ دەهێنن، پاشان فەرمان دەکاتە ئاسمان باران ببارێنێت ؛ بۆیە یەکسەر دەبارێت، فەرمان بە زەوی دەکات ڕووەك بڕوێنێت، یەکسەر دەڕوێت)).

بەڵام کەسی باوەڕدار هەموو ئەوانە هیچ لە باوەڕەکەی کەل ناکات، کاریگەری لە سەر نابێت، چونکە نەخشە و پلانێکی هەیە کە پێغەمبەرە دڵسۆزەکەی ﷺ بۆی داڕێژاوە و هەموو بابەتەکانی بۆ باس کردوە، هیچ گومان و دوو دڵی و سەرلێشێوانێکی نییە، هەموو زانیارییەکی هەیە دەربارەی هەموو ڕووداوەکان کە ڕوودەدەن تاکو ڕۆژی دوایی چونکە ئەو باوەڕی بە خوا و پێغەمبەرەکەی هێناوە ﷺ و سوننەتی خوێندوەتەوە و شارەزای بوە، دەزانێت خاوەنی سوننەت چی فەرموە.. ئەو کەسەی کە هەرگیز لە خۆوە قسە ناکات - دایك و باوك و ڕوحم فیدای بێت ﷺ .

((فيأتي على القوم، فيدعوهم فيؤمنون به، ويستجيبون له، فيأمر السماء فتمطر، والأرض فتنبت، فتروح عليهم سارحتهم أطول ما كانت ذرى، وأسبغه ضروعاً،وأمده خواصر، ثم يأتي القوم، فيدعوهم فيردون عليه قوله)) واتە: بەلای ئاوەدانییەکدا دەڕوات و بانگیان دەکات ئەوانیش ئیمانی پێ دەهێنن و وەڵامی

١ - مسلم بشرح النووي (٩/٢٩٦) ط الحديث .

دەدەنەوە. ئەویش فەرمان دەکات بە ئاسمان باران ببارێنێت ؛ یەکسەر دەبارێت، فەرمان بە زەوی دەکات ڕوەك بروێنێت، یەکسەر دەڕوێت، تاوەکو ئاژەڵەکانیان ئەو ڕۆژە لە لەوەڕگا دەگەڕێننەوە بە تێرترین و قەڵەوترین شێوە، کە کەلەکەیان تێك شکاون و گوانیان پڕ بوون لە شیر لە هەموو ڕۆژێك زیاتر، پاشان بە لای کەمەڵێکی تردا دەڕوات و بانگیان دەکات و ئەوانیش قسەکانی ڕەد دەکەنەوە و بە درۆی دادەنێن)).

بە ڕاستی ئەو کۆمەڵە کۆمەڵی یەکتاپەرست و باوەڕە، ئەو بانگەشە نارەوا و ستەمکار و بێباوەڕییە ڕەد دەکەنەوە ((فینصرف عنهم، فیصبحون ممحلین، لیس بأیدیهم شئ من أموالهم)) واتە: کە بە جێیان دەهێڵێت، هیچ مەڕو ماڵات و ئاژەڵیان نامێنێت و هەمووی دەمرێت و هیچ سەروەت و سامانێك بە دەستیانەوە نامێنێت))

بە ڕاستی فیتنەیەکی ترسناك و سامناکە! بەڵام ئەوە زۆر دوورە و زۆر دوورە لە ئەهلی یەکتاپەرستی و باوەڕەوە چونکە ئەوان هەموو ئەو ڕوداوانە بە باشی دەزانن ((و یمر بالخربة، فیقول لها: أخرجي کنوزك، فتتبعه کنوزها، کیعاسیب النحل، ثم یدعو رجلاً ممتلئاً شبابا، فیضربه بالسیف، فیقطعه جزلتین رمیة الغرض، ثم یدعوه، فیقبل ویتهلل وجهه، یضحك)) واتە: بەلای شوێنێکی وێرانی کاول بوودا دەڕوات و پێی دەڵێت: کەنزو زێڕو زیوو ماددە بەهاکانی ناوەوەت فڕێدە دەرەوە، زەویش کەنزەکەی دەخاتە دەرەوە و دەکەونە شوێن دەجال، وەکو کۆمەڵە هەنگ تۆپەڵ و یەك لە دوای یەك شوێن شاکەیان دەکەون پاشان بانگی پیاوێکی گەنج دەکات و یەك شمشێری لێدەدات و دەیکاتە دوو لەتەوە، پاشان بانگی دەکات، ئەویش چاك دەبێتەوە و بە دەم پێکەنینەوە دێت بۆ لای)).

لە ڕیوایەتێکی تردا کە لە هەردوو کتێبی (صحیح)[١]دا هاتوە لە فەرموودەی (أبی سعید الخدری)یەوە دەڵێت: ((فیخرج إلیه یومئذ رجل هو خیر الناس، أو من خیر الناس)) واتە: لەو ڕۆژەدا کابرایەکی بۆ دەردەچێت کە باشترینی خەڵکییە یان لە باشترین کەسە)).

---

١ ـ أخرجه البخاري (١٨٨٢) ومسلم (٢٩٣٨) .

((یخرج الدجال، فیتوجه قبله رجل من المؤمنین، فتلقاه المسالح، مسالح الدجال)) واتە: دەججال دەردەچێت، پیاوێکی گەنج لە بڕواداران دەڕوات بەرەو دەججال و پاسەوانە چەکدارەکانی دەججال بەرەو ڕووی دەبنەوە)).

واتە: بە چەکەوە، شوێنکەوتوانی دەججال حەفتا هەزار کەسە لە جوولەکەکانی ئەصبەهان، هەروەکو لە ((صحیح مسلم))[1] دا هاتوە. ((فیقولون له: أین تعمد؟ فیقول هذا الرجل المؤمن: أعمد إلى هذا الذي خرج، فیقولون له: أو ما تؤمن بربنا؟ – یعنون الدجال – فیقول: ما بربنا خفاء، فیقولون: اقتلوه، فیقول بعضهم لبعض: ألیس قد نهاکم ربکم – یعني: الدجال – أن تقتلوا أحداً دونه، فینطلقون به إلى الدجال، فإذا رآه المؤمن قال: یا أیها الناس، هذا الدجال الذي ذکر رسول اللهﷺ – )) واتە: پێی دەڵێن: بەرەو کوێت مەبەستە؟. کابرای ئیماندار دەڵێت: بەرەو ئەوەی کە دەرکەوتوە (واتە بەرەو دەججال). پێی دەڵێن: ئەوە تۆ ئیمان ناهێنی بە پەروەردگارمان؟. دەڵێت: پەروەردگاری ئێمە ونو نادیارو نەناسراو نییە (ما بِرَبِّنا خَفاءٌ).دەڵێن: بیکوژن. ئەوجار هەندێکیان بە هەندێکیان دەڵێن: ئەی پەروەردگارتان قەدەغەی نەکرد لێتان کە کەس بکوژن بێ ئەو؟. واتە پێش ئاگاداری ئەو؟. ئەو کاتە دەیبەن بۆ لای دەججال، کە دەججالی بینی دەڵێت: ئەی خەڵکینە، شایەتی دەدەم کە ئەمەیە ئەو دەججالەی پێغەمبەرﷺبۆی باس کردووین.)) چونکە ئەوەی لە نێوان هەردوو چاویدایە خوێندییەوە و نیشانە و وەصفەکەی پێغەمبەری ﷺناسییەوە.

((قال: فیأمر الدجال به، فیشبح، فیقول: خذوه و شجوه، فیوسع ظهره وبطنه ضرباً، قال: فیقول: أوما تؤمن بي؟ قال: فیقول: أنت المسیح الکذاب، قال: فیؤمر به، فیؤشر بالمئشار من مفرقه حتى یفرق بین رجلیه – قال – ثم یمشي الدجال بین القطعتین، ثم یقول له: قم، فیستوي قائماً – قال – ثم یقول له: أتؤمن بي؟ فیقول: ما ازددت فیك إلا بصیرة،قال: ثم یقول: یا أیها الناس إنه لا یفعل بعدي بأحد من الناس، قال: فیأخذه الدجال لیذبحه، فیجعل ما بین رقبته إلى ترقوته نحاساً، فلا

---

١ – أخرجه مسلم (٢٩٤٤) .

يستطيع إليه سبيلاً، قال: فيأخذ بيديه و رجليه، فيقذف به، فيحسب الناس أنما قذفه إلى النار، و إنما ألقي في الجنة)) واتە: ئەو کاتە دەججال فەرمان دەکات درێژی بکەن بۆ لێدان، پشت و سکی لێك دەکێشنەوە بە لێدان (واتە زۆری لێ دەدەن تا پشتی نەرم دەبێت وەك پێستەیەك بە لێدان لێك دەکشێت و تەخت دەبێت لەگەڵ زەویدا). ئەو کاتە پێی دەڵێت: ئێستا ئیمانم پێ ناهێنیت؟..دەڵێت: تۆ مەسیحی درۆزنیت. ئەو جار فەرمان دەکات و بە مشار لە ناوەڕاستی سەریەوە تا دوو لاقەکانی لێك جیا دەکرێتەوە و دەیکاتە دوو پارچەوە و لێکیان دوور دەخاتەوە، خۆی بە نێوان هەردوو پارچەکەدا دەڕوات، لە دواییشدا بە دوو بەشەکە دەڵێت: هەستەوە. ئەویش دێتەوە یەك و دروست دەبێتەوە و ڕاست دەبێتەوە وەکو جاران. لە پاشان بانگی دەکات، ئەویش بۆ لای دێت بە ڕوویەکی گەشاوەو درەوشاوە پێدەکەنێ، ئەو جار پێی دەڵێت: ئێستا ئیمانم پێ دەهێنیت؟.ئەویش دەڵێت: سوێند بەخوا زیاتر دڵنیاییم بۆ زیاد بوو لە سەر بیروباوەڕی پێشووم سەبارەت بە تۆ، ئەوجار گەنجەکە دەڵێت: ئەی خەڵکینە لە دوای من دەججال ناتوانێ وا لە کەس بکات. دەججالیش دەیگرێت بۆ ئەوەی سەری ببڕێت، بەڵام بە مس لە گەردنی تا ئێسقانی چۆڵەمەی سینگی دەبەسترێت، لەبەر ئەوە توانای سەربڕینی نابێت، دوو دەست و دوو قاچەکانی دەگرێت و فڕێی دەدات، خەڵکی وا حیساب دەکەن کە فڕێی داوەتە ناو ئاگرەوە، بەڵام لە ڕاستی دا فڕێ دراوەتە ناو بەهەشتەوە)).

((قال ﷺ: ((هذا أعظم الناس شهادة عند رب العالمين)) واتە: ئەوە شەهیدییەکەی لە هەموو خەڵکی گەورە ترە لای پەروەردگار)).

لە سەیرترین فەرموودە لە سەر دەججال ئەوەیە کە لە (صحیح مسلم)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (فاطمة ی کچی قیس)ەوە، دەڵێت: ((((سمعت نداء المنادي ــ منادي رسول الله ــ ينادي: الصلاة جامعة، فخرجت الى المسجد، فصليت مع رسول اللهﷺ فكنت في صف النساء التي تلي ظهور القوم ــ أي صفوف الرجال ــ فلما

١ ــ أخرجه مسلم (٢٩٤٢) .

قضى رسول الله ﷺ صلاته، جلس على المنبر وهو يضحك، ثم قال: ((ليلزم كل إنسان مصلاه)) ثم قال: ((أتدرون لم جمعتكم؟)) قالوا: الله ورسوله أعلم، قال: ((إني والله! ما جمعتكم لرغبة ولا لرهبة، ولكن جمعتكم لأن تميماً الداري)) ((كان رجلاً نصرانياً، فجاء فبايع و أسلم)) واتە: گوێم لە بانگەوازکارێکی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بانگی دەکرد: (الصلاة جامعة)، بۆیە منیش دەرچووم بۆ مزگەوت، لە گەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ نوێژم کرد و منیش لە ریزی ئافرەتان دانیشتبووم کە دەکەوتە پشتەوەی ریزی پیاوانەوە، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژەکەی بوەوە، لە سەر مینبەرەکە دانیشت لە کاتێکدا ئەو پێدەکەنی، ئەمجار فەرمووی: با هەرکەسێك لە جێ نوێژەکەی خۆی دانیشێت، ئەمجار فەرمووی: ئایە دەزانن بۆ ئێوەم کۆ کردەوە؟ گوتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ دەزانن. فەرمووی: سوێند بە خوا من لە بەر هیچ هاندانێك و هیچ ترساندنێك ئێوەم کۆ نەکردوەتەوە، بەڵام لە بەر ئەوەی ئێوەم کۆ کردەوە چونکە (تميم الداري)... (کابرایەکی گاور بوو پاشان بەیعەی بە پێغەمبەری خوا ﷺ داو موسڵمان بوو).

بە ڕاستی ئەوە جێی شانازییەکی زۆر بەرزە بۆ (تەمیم) کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئەوەوە فەرمووده بگێڕێتەوە، ئەمەشە دەبێتە بەڵگەیەك کە دەکرێ و دەبێت کەسێکی باشتر لە کەسی باشەوە شت بگێڕێتەوە.. لێرەدا (تميم الداري) هەواڵێکی پێیە، ئایە ئەو هەواڵە چییە؟ پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت: ـ

((وحدثني حديثاً وافق الذي كنت أحدثكم عن مسيح الدجال حدثني، أنه ركب في سفينة بحرية، مع ثلاثين رجلاً من لخم وجذام، فلعب بهم الموج شهراً في البحر، ثم أرفؤوا ـ أي: ألجأهم ـ إلى جزيرة في البحر حتى مغرب الشمس، فجلسوا في أقرب السفينة، فدخلوا الجزيرة، فلقيتهم دابة أهلب كثير الشعر، لا يدرون ما قبله من دبره، من كثرة الشعرة، فقالوا: ويلك! ما أنتِ؟ فقالت: أنا الجساسة، قالوا: وما الجساسة؟ قالت: أيها القوم، أنطلقوا إلى هذا الرجل في الدير، فإنه إلى خبركم بالأشواق، قال: لما سمت لنا رجلاً فرقنا منها أن تكون شيطانة، فانطلقنا سراعاً حتى دخلنا الدير، فإذا فيه أعظم إنسان رأيناه قط خلقاً، وأشده وثاقاً، مجموعة يداه إلى عنقه، ما بين

ركبتيـه إلى كعبيـه، بالحديـد، قلنـا: ويلـك! مـا أنـت؟ قـال: قـد قـدرتم علـى خـبري، فأخبروني ما أنتم؟ قالوا: نحن أناس مـن العـرب، ركبنـا في سـفينة بحريـة، فـصادفنا البحر حين اغتلم ، فلعب بنـا المـوج شـهراً، ثـم أرفأنـا إلى جزيرتـك هـذه، فجلـسنا في أقربها، فدخلنا الجزيرة، فلقيتنا دابة أهلب كثير الشعر، لا يدرى ما قبله من دبره مـن كثرة الشعر، فقلنا: ويلك! ما أنتِ؟ فقالت: أنا الجساسة. قلنا:: وما الجساسة؟ قالت: أعمدوا إلى هذا الرجل في الدير، فإنه إلى خبركم بالأشواق، فأقبلنا إليك سراعاً و فزعنـا منها، ولم نأمن أن تكون شيطانة، فقال: أخبروني عن نخل بيسان؟قلنا: عن أي شـئ تستخبر؟ قال: أسألكم عن نخلها، هل يثمر؟ قلنا له: نعم، قال: أمـا إنـه يوشـك أن لا تثمر، قال: أخبروني عن بحيرة الطبرية؟ قلنا: عن أي شئ تـستخبر؟ قـال: هـل فيهـا ماء؟ قالوا: هي كثير الماء. قال: أما إن ماءها يوشك أن يـذهب، قـال: أخبرونـي عـن عين زغر؟ قالوا: عن أي شئ تستخبر؟ قال: هل في العين ماء؟ وهل يزرع أهلـها بمـاء العين؟ قلنا له: نعم هي كثيرة الماء، وأهلها يزرعون من مائها، قال: أخبروني عن نبي الأميين ما فعل؟ قالوا: قد خرج من مكة ونزل يثرب، قال: أقاتله العـرب؟ قلنـا: نعـم، قال: كيف صنع بهم؟ فأخبرناه أنه قد ظهر على من يليه من العرب و أطـاعوه، قـال لهم: قد كان ذلك؟ قلنا: نعم، قال، أمـا إن ذاك خـير لهـم أن يطيعـوه، وإنـي مخـبركم عني: إني أنا المسيح وإني أوشك أن يؤذن لـي في الخـروج، فـأخرج فأسـير في الأرض، فلا أدع قرية إلا هبطتها في أربعين ليلة، غير مكة وطيبة فهما محرمتان علـي كلتاهمـا، كلمـا أردت أن أدخـل واحـدة أو واحـداً منهمـا، اسـتقبلني ملـك بيـده الـسيف صـلتا يصدني عنها، وإن على كل نقب منها ملائكة يحرسونها)) تقول فاطمة بنت قيس: قال رسول الله ﷺ وطعن بمخصرته في المنبر: ((هـذه طيبـة، هـذه طيبـة، هـذه طيبـة ـــ يعني المدينة ـ ألا هل كنت حدثتكم ذلك؟)) فقال الناس: نعم، قـال: ((فإنـه أعجـبني حديث تميم أنه وافق الذي كنت أحدثكم عنه...)) تا كۆتایی ئەو ڕیوایەتە.

واتە: قسەیەكی بۆ كـردووم كـە هاوشـێوەی ئەوەیـە كـە مـن بـۆم بـاس كـردوون سەبارەت بە دەججالی یەكچاو، باسی بۆ كردم كە سواری كەشتییەكی دەریایی بوە لە گەڵ سی پیاو لە هۆزی (لخم)و (جذام) مـاوەی مانگێـك شـەپۆلی دەریاكـە گێـژی

داون و یاری پێکردوون، تاوەکوو سەرەنجام پەنایان بردۆتە بەر دوورگەیەك لە دەریاکەدا تا ڕۆژئاوابوون، لە نزیك کەشتییەکە دانیشتن و پاشان ڕۆیشتنە ناو دوورگەکەوە، دەعبایەکی تووکنی تیسکنیان پێگەیشت، بە هۆی زۆری تووك و مووی دەعباکەوە پێش و پاشیان لە یەك جیا نەدەکردەوە، ئەوانش دەڵێن: تیابچیت!! تۆ کێیت؟ دەڵێت: من (الجساسە)م، دەڵێن: (الجساسە) چییە؟ دەڵێ: ئەی خەڵکینە.. بڕۆن بۆ لای ئەو پیاوەی لە کۆشکەکەدایە (کەنیسەکە)، چونکە ئەو زۆر تامەزرۆی هەواڵی ئێوەیە، دەڵێ: کاتێ ناوی پیاوی هێنا ترساین لێی جۆرە شەیتانێك بێت، ئێمەش بە پەلە ڕۆیشتین تاکو چووینە کۆشکەکەوە (کەنیسەکەوە) کە تەماشامان کرد بینیمان زەلامێکی تێدایە کە هەرگیز زەلامی ئاوامان نەدیبوو، لە هەموو کەسێك زلتر و کەتەتر بوو، لە هەموو کەس زیاتر کۆت و بەند و شەتەك درابوو، هەردوو دەستی تا گەردنی، نێوان هەردوو ئەژنۆی تا قوولە پێی بە ئاسن، وتمان: تیابچیت! تۆ کێیت؟ وتی: ئێوە توانیتان بە سەر دەنگ و باسی من ئاشنا بن، پێم بڵێن ئێوە کێن؟ وتیان: ئێمە خەڵکانێکین لە عەرەب، سواری کەشتییەکی دەریایی بووین، گیرۆدەی داوی دەریا بووین لە کاتی هەڵچوونیدا، ماوەی مانگێك شەپۆلی دەریا گێژی داین، پاشان پەنامان هێنا بەرەو لای ئەم دوورگەیەی تۆ، لە نزیکەوە دانیشتین تا چووینە دوورگەکەوە، گیانلەبەرێکی تیسکنی تووکنمان پێگەیشت، لە بەر موو پێش و پاشیمان بۆ لە یەك جیا نەدەکرایەوە وتمان: تیابچیت! تۆ کێیت؟ ئەویش وتی: من (الجساسە). وتمان: (الجساسە) چییە؟ وتی: بڕۆن بۆ لای ئەو پیاوەی لە کۆشکەکەدایە ئەو تامەزرۆی دەنگ و باسی ئێوەیە، ئێمەش بە پەلە هاتین بۆ لای تۆ و زۆر لێی ترساین، لەوە ترساین جۆرە شەیتانێك بیت، ئەویش وتی: خەبەرم بدەنێ سەبارت بە دارەخورماکانی (بیسان) ـــ ناوی جێگایەکە خەڵکی شام دەیناسنەوە ـ ، وتمان: لە بارەی چی شتێکەوە پرسیار دەکەیت؟ وتی: پرسیارتان دەربارەی دارەخورماکانی لێ دەکەم داخۆ بەر دەگرێت؟ وتمان: بەڵێ، وتی: بەڵام نزیکە چیتر بەرنەگرێت، وتی: خەبەرم بدەنێ دەربارەی دەریاچەی (الطبرية) وتمان: لە بارەی چی شتێکەوە پرسیار دەکەیت؟

وتی: ئایا ئاوی تیادایە؟ وتیان: ئاوی زۆری لێیە، وتی: بەڵام ئاوەکە نزیکە نەمێنێت[1]، وتی: خەبەرم بدەنێ دەربارەی کانیاوی (زغرە)، وتیان: لە بارەی چی شتێکەوە پرسیار دەکەیت؟ وتی: ئایا لەو کانیاوەدا ئاو هەیە؟ ئایا خەڵکەکەی بە ئاوی کانیاوەکە کشتوکاڵ دەکەن؟ وتمان: بەڵێ ئاوی زۆرە، خەڵکەکەشی کشتوکاڵی پێ دەکەن، وتی: خەبەرم بدەنێ دەربارەی پێغەمبەری نەخوێندەوارەکان چی کرد؟ وتیان: لە مەککە دەرچوە و لە (یثرب) نیشتەجێ بوە، وتی: ئایا عەرەب شەڕیان لە گەڵ کرد، وتمان: بەڵێ، وتی: چۆنی پێکردن؟ خەبەرمان پێدا کە سەرکەوتوە بە سەر ئەوانەی لێوەی نزیکن لە عەرەب و ئەوانیش گوێڕایەڵی بوون، پێی وتین: ئەوە بوە؟ وتمان: بەڵێ، وتی: بزانن چاکتروایە بۆیان گوێڕایەڵی ببن - واتە: ئەو کابرایە کە بە کۆت زنجیر بەستراوەتەوە وتی: چاکتر وایە بۆ عەرەب گوێڕایەڵی ببن - منیش خەبەرتان پێدەدەم من کێم: من دەجالم، نزیکە مۆڵەتی دەرچوونم پێ بدرێت و دەرچم و بە زەویدا بڕۆم هیچ دێهاتێك نەهێڵمەوە کە دانەبەزم بۆی لە ماوەی چل شەودا، جگە لە مەککە و (طیبة) نەبێت، چونکە ئەو دوو شارە هەردوکیان لە من قەدەغەکراون، هەر کاتێك بمەوێ بڕۆمە یەکێکیان فریشتەیەك شمشێرێکی رووتی بە دەستەوەیە رووم تێدەکات و بەرهەڵستیم لێدەکات، لە سەر هەر ڕێگەوبانێکی فریشتە وەستاون و پاسەوانی دەکەن)) فاطمة ی کچی قەیس فەرمووی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی - لە کاتێکدا بە داردەستەکەی دەستی دەیدا لە دوانگەکە - : ئەمە (طیبة)یە، ئەمە (طیبة)یە، ئەمە (طیبة)یە - مەبەستی شاری مەدینەیە - ئایا من لەو بارەوە قسەم بۆ کردوون؟ خەڵکەکەش وتیان: بەڵێ، فەرمووی: من قسەکەی (تەمیم)م پێخۆش بوو چونکە هاوشێوەی ئەوە بوو کە من قسەم بۆ کردن...) تا کۆتایی فەرموودەکە.

---

١ - هەندێ لە ڕۆژنامە فەرمییەکان بڵاویان کردوەتەوە، لە لاپەرەی یەکەمیدا بڵاویان کردوەتەوە کەوا بە شێوەیەکی زۆر سەیر ئاوی گۆلە کەمی کردوە.

بەڕێزان.... لێرەدا پرسیارێکی گرنگ و ترسناك هەیە: دەججال کەی دەفـەوتێ و لەناو دەچێت؟ کەی خوای گەورە فیتنەکەی لە سەر زەویـدا کۆتـایی پـێ دێنێت؟ کێ دەیکوژێت؟ لە کوێ دەکوژرێت؟

لە پێش ئەوەی وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە، چەند خاڵێکی گرنگ پێشکەش دەکەم کە هۆکاری رزگار بوونن لە دەججال و لەو فیتنەیە؟

ئەو شتانەی کە لە فیتنەی دەججال رزگارمان دەکەن:

بۆ ڕزگاربوون لەو فیتنەیە چەند رێگا و هەنگاوێك هەیە دەبێ بیکەینە پێشەنگی خۆمان:

**ڕێگا و هەنگاوی یەکەم:** چەسپاندنی باوەڕ و بتەوکردنی، ئایا من بە ئێوەم نـەگوت کە پێغەمبەری ئەکرەمﷺ فەرموویەتی:((یقرؤه کل مؤمن کاتب وغیر کاتـب)) واتـە: هــەموو ئیمانــدارێك دەیخوێنێــتەوە خوێنــدەوار بێــت یــان نەخوێنــدەوار)) بۆیــە باوەڕەکەت بتەو و دامەزراو بکە، ئەوەشە بزانە باوەڕ تـەنها وشـەیەك نییـە! بـەڵکو ئیمـان بریتییـە لـە: گـوتن بـە زمـان و باوەڕهێنـان بـە دڵ و کـارکردن بـە ئەندام و پەلەکانی لەش، تام و چێژێکی تایبەتی خـۆی هەیـە، روناکییـەکی ئاشکرای هەیـە، باوەڕ قەڵایەکی قایمی تۆیە و لە دونیادا دەتپارێزێت، هەروەها لە فیتنـەکانی دونیـا کە ڕوودەدەن و لە فیتنەی دەججال و بەڵکو لـە سـزای نـاو گـۆڕ و لـە دوا ڕۆژیـشدا دەتپارێزێت، ئای خودایە.. ئیمان چەند بە تام و چێژە!! ئەوەش بزانە کەوا ئیمان زیاد دەکات بە گوێڕایەڵی و کەم دەکات بە سەرپێچی، بۆیە برای خۆشەویستم دڵـت بە گوێڕایەڵی و ئیمانەوە گۆش بکە و لە ژینگەی ئیمانەوە خۆت نزیـك بکـەرەوە بـۆ ئەوەی ئیمان لە دڵەکەتدا زیاد بکات، لە ژینگـەی سەرپێـچی خـۆت بـە دوور بگـرە، چونکە ئیمان لە دڵەکاندا بە هۆی سەرپێچی کردنـەوە کـەم دەکـەن، ئـەوەش بـاش بزانن یەکێکیان دەبێ ئەویتر دەرکاتە دەرەوە لە دڵەکاندا، ولا حول ولا قوة الا بالله.

**ڕێگای دووەم:** سەقامگیربوون و دامەزراوبوون لە سەر دینی خوا و باوەڕ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ

ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴿٣٢﴾ ﴾ (فصلت) واتە: بێ گومان ئەو کەسانەش فەرموویان: پەروەردگارمان خوایە پاشان خۆیان ڕاست کردبوویەوە، واتە: زۆر بە مەحکەمی لە سەر یەکتاپەرستی وەستان و بە هیچ لایەکدا لایان نەدا، کاتێ مردن، لە گۆڕدا لە کاتی زیندووبوونەوەدا فریشتەکان دائەبەزنە لایان و پێیان دەڵێن: لە پاشەڕۆژتان مەترسن و بۆ ماڵ و منداڵیشتان - پاش خۆتان - دڵ زویر مەبن ئێمە چاودێریان دەبین موژدەتان لێ بێت بەو بەهەشتەی بەڵێنتان پێ دەدرا لە دونیادا، مزگێنی بێت ئەمڕۆ ئەکەونە خۆشی و شادییەوە (٣٠) ئێمە لە ژیانی دونیادا دۆستان بووین، لە پاشەڕۆژێشدا دۆستان دەبین و لەوێ نەفستان چ بخوازێ ئامادەیە بۆتان و هەرچیش بخوازن لە بەهەشتدا بۆتان هەیە.(٣١) ئەم مێوانداریەش، میوانداری و پەزێراییەکە لە لایەن پەروەردگارێکی گوناهپۆشی بەبەزەییەوە(٣٢).))

لە (صحیح مسلم)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (النواس ی کوڕی سمعان)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((مـن أدركـه مـنكم فليقـرأ عليـه فـواتح سـورة الكهف)) واتە: هەر کەسێك لـە ئێـوە تووشـی بـوو، ئـەوە بـا ئایەتـەکانی سـەرەتای سورەتی (الكهف)ی بەسەردا بخوێنێتەوە)).

هەروەها لە (صحیح مسلم)[2] دا هـاتوە لـە فـەرمووودەی (أبـي الـدرداء)ەوە کـەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((من حفظ عشر آيات من أول سورة الكهف، عـصم من الدجال)) واتە: هەرکەسێك دە ئایەتی سەرەتای سورەتی (الكهف) لە بـەر بکـات ئەوا لە فیتنەی دەجال پارێزراو دەبێت)).

ئەوەش بزانە کـەوا ڕیوایـەتی ڕوون و ئاشـکرا هـەن دەڵێت: دە ئایـەتی کۆتـایی سـورەتی (الكهـف)ە، بـەڵام مـن دەڵـێم: چـی زیـانێکی هەیـە ئەگـەر تـۆ هـەموو

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٩٣٧) .
٢ ـ أخرجه مسلم (٨٠٩) .

سورەتەکە لەبەر بکەیت؟ ئەوە فیتنەیەکە و پێویستی بە خۆپاراستن هەیە، بۆیە هەر ئێستا دانیشە دەست بە لەبەر کردنی ئەو سورەتە بکە، ئای چەند سورەتێکی جوان و مانادار و ناسکە!! سورەتی(الكهف) لەبەربکە تاکو خوای گەورە لە فیتنەی دەججال بتپارێزێت، موژدە بۆئەو کەسەی کە نیشتەجێی شاری مەککەیە و موژدە بۆ ئەو کەسەی نیشتەجێی شاری مەدینەیە، چونکە دەججال بە فەزڵی خوا ناتوانێت بچێتە ناو ئەو دوو شارەوە، هەروەکو پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ فەرموویەتی.

ڕێزداران... کێ دەججال دەکوژێت و لە کوێ دەکوژرێت؟

ئەم باسەو چەند باسێکی تر لە بەشی داهاتوودا باس دەکەین ـ انشاء الله ـ، هەرگیز ئەوەتان لە بیر نەچێت لە هەموو نوێژێکدا و بە دڵێکی پاکەوە پەنا بگرن بە خوا لە فیتنەی دەججال، پێغەمبەری خواﷺ هاوەڵانی فێری ئەو دوعایە دەکرد هەروەکو چۆن فێری سورەتەکانی قورئانی دەکردن.

لە (صحيح مسلم)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابن عباس)ەوە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((اللهم إنا نعوذ بك من عذاب جهنم، وأعوذ بك من عذاب القبر، وأعوذ بك من فتنة المسيح الدجال، وأعوذ بك من فتنة المحيا و الممات)) واتە: خودایە پەنات پێ دەگرم لە سزای دۆزەخ و پەنات پێ دەگرم لە سزای گۆڕ و پەنات پێ دەگرم لە فیتنەی مەسیحی دەججال و پەنات پێ دەگرم لە ئاشوبەی ژیان و مردن).

١ ـ أخرجه مسلم (٥٩٠ ) وانظر صحيح البخاري (٨٣٢) ومسلم (٥٨٩).

# دابەزینی پێغەمبەرعیسی ﷺ و کوشتنی دەجال

# (نزول عیسی ومقتل الدجال)

دەجال لە ماوەی چل شەودا هەموو سەر زەوی دەگەڕێت و تەنها خەڵکی نەفام تووشی فیتنەکەی دەبن، خوای پەروەردگار هیچ کەسێك لەو فیتنەیە دەرباز ناکات تەنها خاوەن باوەڕ و یەکتاپەرستان نەبێت، ئەو کەسانەی کە باوەڕی تەواویان هێناوە بە پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ، بە باشی لە قورئان و سوننەت و فیقهی ئەم قۆناغە تێگەیشتوون، دوور لەو تیورانەی کە نە لە قورئان و نە لە سوننەتەوە هیچ بەڵگەیەکیان نییە، ترسناکترین فیتنە کە مرۆڤایەتی و سەر زەوی ناسیویانە لە ئادەمەوە تاکو ڕۆژی دوایی فیتنەی دەجالە، لەم فیتنە سەختەدا خوای پەروەدگار بە ڕەحم و سۆزی خۆی ئەهلی باوەڕ لەسەر زەویدا دەپارێزێت، خوای گەورە یەکتاپەرستە ڕاستگۆکان دەپارێزێت، ئەوانەی کە شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوانﷺ، خوای گەورە ئەو ئیماندارە پاکانە دەپارێزێت و ڕزگاریان دەکات بە دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم (علی نبینا وعلیه أفضل الصلاة والسلام).

بیر بکەرەوە لەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خواﷺ کە(النواس ی کوڕی سمعان) ڕیوایەتی کردوە و لە بەشی ڕابوردودا بە درێژی باسم کرد، جارێکی تر دەگەڕێمەوە بۆ باسی ئەو فەرموودەیە لە باسی (یەئجوج و مەئجوج) دا (إنشاء الله)، پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((فبینما هو کذلك إذ بعث الله المسیح ابن مریمﷺ)) واتە: لە کاتێکدا دەجال بەو شێوەیەیە لەو کاتەدا خوای گەورە (عیسی)ی کوڕی مەریەمﷺ ڕەوانە دەکات)).

لە کوێوە دادەبەزێت؟ لە ئاسمانەوە، دابەزینی عیساﷺ یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی قیامەت، خوای گەورە دەفەرموێت ـ لە کاتێکدا وەڵامی جولەکەکان دەداتەوە، ئەوانەی بانگەشەی ئەوەیان دەکرد گوایە (عیسای کوڕی مەریەم) (ﷺ)

یان کوشتوه ـ: ـ

﴿وَقَوۡلِهِمۡ إِنَّا قَتَلۡنَا ٱلۡمَسِيحَ عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمۡۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنۡهُۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينَۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿١٥٨﴾ وَإِن مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤۡمِنَنَّ بِهِۦ قَبۡلَ مَوۡتِهِۦ﴾( النساء) واته:..... ئەو بوختانە گەورەیەی بۆ خاتوو (مەریەم) کردیان، گوایا زینای کردبێت!(١٥٦) لە بەر ئەوەش کە دەیانگوت: ئێمە عیسای کوڕی مەریەممان ﷺ کوشت ـ کە پێغەمبەری خوایە، خوای گەورە بە درۆیان دەخاتەوە و دەفەرمووێ: کەچی نە توانییان بیکوژن و نە توانیشیان لە سێدارەی بدەن وەکو خۆیان کردیانە هەرا، بەڵکو سەریان لێ تێکچوو بوو، پیاوێکیان دیت لە شێوە و روخساردا وایان زانی(عیسا)یە و لە سێدارەیان دا، ئەوانەی دەربارەی ئەو کێشەیانە لە دوو دڵی دان، هیچ زانستییەکیان بەوە نییە، جگە لە شوێنکەوتی گومان نەبێ، بۆیە دەفەرمووێ: بە یەقین و بێ گومان نەیانکوشتوە.(١٥٧) بەڵکو خوایگەورە بەرەو خۆی بەرزی کردەوە، خواش هەمیشەو بەردەوام بەدەستەڵات و کارزانە، خۆی دەزانێ چی دەکات، هەرکەسێك پەنای پێ برد، دەیپارێزێ و سەری دەخات.(١٥٨) کاتێ عیسا لە ئاسمان دێتە خوارێ گشت خاوەن کتێبەکان بەر لە مەرگی عیسا ﷺ بڕوای پێ دێنن....(١٥٩).))

ابن عباس[1] دەفەرموێت: ((واتە: لە پێش مردنی عیسا) (علی نبینا وعلیـه أفـضل الصلاة والسلام)

کەواتە ئایا چی دەڵێیت دەربارەی ئەو قسەیەی خوای گەورە کە دەربارەی عیسا ﷺ فەرموویەتی: ﴿ إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوۡقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ ثُمَّ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴾ (آل عمران: ٥٥) واته:

---

١ ـ أخرجه ابن جرير الطبري في التفسير (١٠٧٩٤) و ( ١٠٨٠٧) , وابن أبي حاتم (٦٢٥٤)

ئەوەبوو خوای گەورە فەرمووی: ئەی عیسا ﷺ! بە ڕاستی من دەتبەمەوە بۆ لای خۆم و هەتا ڕۆژێ ئەتگەیەنمە کاتی دیارییکراوی ئاسایی بۆ ژیانت دەمێنیٚ و ئەوسا ئەتمرێنم، واتە: ئێستا بەر لە هاتنی کۆتایی ژیانت ناهێڵم ئەوانە بتکوژن و بمریت وە لە لای خۆیشم جێی بەرزت دەبیٚ و سەرت دەخەم بۆ ئاسمان بۆ لای خۆم، لە بەدکاری ئەوانە کە باوەڕیان نەهێناوە پاکت دەکەمەوە واتە: ڕزگارت دەبیٚ و ناهێڵم زیانت پیٚ بگەیەنن وە ئەوانەش وا شوێنکەوتەی تۆ بوون و خاوەنی باوەڕ بوون، تا ڕۆژی قیامەت ئەگەر بە ڕاستی لێی بنەون زاڵیان ئەکەم بە سەر بیٚ باوەڕان و دوژمنانیاندا لە پاشان هەمووتان هەر بۆ لای خۆم دێنەوە، ئینجا منیش بەراست و دروست گێرە و کێشەی نێوانتان سەبارەت بە کاروباری عیسا ﷺ بە دادپەروەرانە دەبڕمەوە)).

جا لە ئایەتەکەدا خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّى مُتَوَفِّيكَ ﴾ ئەوە مانای چییە؟

بزانە کە مانای (الوفاة) تەنها مردن ناگەیەنێت لە گەڵ بەڵگەیەکی پێکەوەبەندی سەربەخۆ و جیاوازدا نەبێت، هەروەکو چۆن هەموو نوسەرانی تەفسیر فەرموویانە: ڕەنگە جاری وا هەبێت باسی (الوفاة) بکرێت و مەبەستی مردن نەبێت، بەڵکو مەبەستی مردنی بچووك بێت ـ واتە خەوتن ـ بە باشی بیر لەو ئایەتەی خوای گەورە بکەرەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِٱلنَّهَارِ ﴾(الأنعام: ٦٠) واتە: هەر ئەو خوایە کە بە شەودا دەتانخەوێنیٚ و هەستان لیٚ دەسێنیٚ و بە ڕۆژیشدا هەر تاوانیٚ بکەن پێی دەزانیٚ......)) مەبەست لە (الوفاة) لەو ئایەتە پیرۆزەدا: خەوتنە.

پێغەمبەری خوا ﷺ هەر کاتیٚ لە خەو هەڵدەستا دەیفەرموو: ((الحمد لله الذي أحيانا بعد ما أماتنا وإليه النشور))[1] واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ژیاندینییەوە پاش ئەوەی مراندینی، زیندووبوونەوەش هەر بۆ لای ئەوە)) کەواتە خەوتن خۆی لە

١ ـ أخرجه البخاري (٦٣١٢)

خۆیدا مردنێکی بچووکە.

جا خوای گەورە خەوتنێکی دا بە سەر پێغەمبەرەکەی خۆیدا عیسا ﷺ، پاشان بۆ لای خۆی بەرزی کردەوە بۆ ئەوەی ڕزگاری بکات لە پلانی ئەوانەی ویستیان بیکوژن، ئەو کابرایەی کە جێگەکەی عیسای بە جولەکەکان نیشان دا خوای گەورە هێنایە سەر شێوەی عیسا ﷺ و بە ئەوی شوبهاند و ئەوانیش ئەویان کوشت، پاشان خوای گەورە عیسای ﷺ بەرز کردەوە، بۆ ئەوەی خوای پەروەردگار لە دوارۆژدا دایبەزێنێت و بیکاتە نیشانەیەك لە نیشانە گەورەکانی قیامەت، کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کردوە، ئەو کەسەی کە هەرگیز لە خۆوە قسە ناکات.

جا پێغەمبەری خوا ﷺ تەنانەت باس و وەسفی ئەو جل و بەرگەی کردوە کە عیسا پێوەی دادەبەزێت، هەروەها باسی ئەو جێگەیەی کردوە کە تێیدا دادەبەزێت، سوێند بە خوا ئەو جێگەیە بەو شێوەیە نەناسراوە لەو کاتەی کە ئەو تێیدا باسی کردوە!

چی دەڵێیت!؟

پێت دەڵێم: ئەو جێگەیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کردوە و دیاری کردوە بۆ دابەزینی عیسا ﷺ لە سەردەمی خۆیدا ﷺ بەو ناوەوە نەناسراوە!!

کەواتە، پێغەمبەری خوا ﷺ چی فەرموە؟

ئیمامی (مسلم)[1] ریوایەتی کردوە لە فەرموودەی (النواس ی کوڕی سمعان)ەوە لە فەرمودەیەکی درێژدا و تێیدا هاتوە: ((فینزل عند المنارة البیضاء شرقي دمشق بین مهرودتین)) واتە: لەو کاتەدا (عیسی)ی کوڕی مەریەم ﷺ لە ئاسمانەوە دادەبەزێت بۆ لای منارە سپییەکەی ڕۆژهەڵاتی (دیمەشق) لە دوو پۆشاکی ڕەنگ کراودا بە وەرسی زەعفەران))، لە ریوایەتێکی تردا هاتوە[2]: ((بین ثوبین ممصرین)) واتە: دوو پۆشاك ڕەنگەکەی بەرەو ڕەنگی زەرد دەڕوانێ کە ئێمە پێی دەڵێین: (بێجی)، ئەمە وەسفی ئەو پۆشاکەیە کە عیسای ﷺ پێوە دادەبەزێت، ئەو

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٩٣٧).

٢ ـ (صحیح ابن حبان) (٦٨٢١) وصححه الشیخ شعیب علی شرط مسلم.

فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرموێت: ((فینزل عند المنارة البیضاء شرقي دمشق)) لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ و لەو جێگەیە مەنارەی سپی نەبوە، بەڵام ئێستا هەیە لە مزگەوتی (الدمشقی)یە لە سوریا، لە ساڵی (٧٤١) ی کۆچی[١] بە بەردی سپی نۆژەن کرایەوە، لە پاش تێپەر بوونی چەند سەدەیەکی دوور و درێژ لە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ.

﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ۝٤ ﴾ (النجم)

((واضعا کفیه علی أجنحة ملکین إذا طأطأ رأسه قطر وإذا رفعه تحدر منه جمان کاللؤلؤ)) واتە: دوو لەپە دەستەکانی لەسەر باڵی دوو مەلائیکە داناوە کە سەر بەرز کاتەوە و نەوی بکات، دڵۆپە ئاوی سافی لە شێوەی دەنکە زیوی شێوە مرواری لێ دەتکێت)).

لەگەڵ مندا بیر لەو فەرموودەیە بکەرەوە چونکە تۆ قسەیەکی زۆر ترسناك دەخوێنیتەوە، ئیمامی (بوخاری و موسلیم)[٢] ریوایەتیان کردوە لە فەرموودەی (أبو هریرە)ەوە کەوا پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ فەرموویەتی: ((کیف أنتم إذا نزل ابن مریم عليه السلام فیکم و إمامکم منکم؟)) واتە: ئاخۆ دەبێت حاڵتان چۆن بێت کاتێك کە عیسای کوڕی مەریەم عليه السلام دادەبەزێتەوە ناوتان لە کاتێکدا پێشەواکەتان لە خۆتانە؟!)).

براکانم.. وەرن پێکەوە هەندێك لە گەڵ ئەم پێشەوایەدا بوەستین بۆ ئەوەی بیناسین و پاشان دەگەڕێینەوە بۆ لای عیسای کوڕی مەریەم عليه السلام؟

گوتمان: دەججال لە سەر زەویدا بوونی هەیە و مەوجودە، فیتنەکەش ڕوویداوە، خوای گەورە عیسای عليه السلام ڕەوانە کردوە و زانیمان چی لە بەر کردوە و لە کوێ دادەبەزێت، پاشان عیسا عليه السلام بەرەو (بیت المقدس) دەڕوات ، چونکە زۆربەی داستانەکان لەو جێگەیە ڕوودەدەن لە ناوەڕاستی وڵاتی شام، عیسای کوڕی

---

١ ـ في عهد الحافظ ابن کثیر , کما قال – رحمه الله تعالی – وغیره من المؤرخین ومن المحققین من علماء الاسلام والمسلمین .

٢ ـ أخرجه البخاري (٣٤٤٩) ومسلم (١٥٥/٢٤٤) .

مەریەم ﷺ بەرەو لای دەججال دەڕوات کە لە (بیت المقدس)ە بە مەبەستی کوشتنی ئەو، بەڵام لە پێش ئەوەی بگاتە ئەوێ چەند ڕووداوێکی ترسناك ڕوویداوە: ئەو ڕووداوانە چین؟

لە (صحیح مسلم)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (جابر ی کوڕی عبدالله)وە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ρ) فەرموویەتی: ((لا تزال طائفة من أمتي يقاتلون على الحق ظاهرين إلى يوم القيامة، فينزل عيسى ابن مريم، فيقول أميرهم)) واتە:بەردەوام کۆمەڵێك لە ئوممەتەکەم لە سەر حەق سەرکەوتوانە دەجەنگن تا ڕۆژی قیامەت، عیسا ی کوڕی مەریەم ﷺ دادەبەزێت و فەرمانڕەواکەیان پێی دەڵێت:..) واتە: فەرمانڕەوای ئەو کۆمەڵە دیارە کە لە سەر حەق و ڕاستین تا قیامەت، کاتێك ئەو فەرمانڕەوا ئیمانداره عیسا ﷺ دەبینێت یەکسەر دەیناسێتەوە ((فيقول أميرهم، تعال صل لنا)) فيقول عيسى ﷺ: ((إن بعضكم أمراء بعض تكرمة الله لهذه الأمة)) واتە: فەرمانڕەواکەیان پێی دەڵێت: وەرە پێش نوێژیمان بۆ بکە، عیسا ﷺ یش دەڵێت: نا، بە ڕاستی ئێوە هەندێکتان فەرمانڕەوان بەسەر هەندێکی ترتانەوە ئەمە ڕێزێکی خواییە لەم ئوممەتە ناوێتی)).

واتە: کەرامەت و ڕێزێکە لە خوای پەروەردگارەوە بۆ ئوممەتی محمد ﷺ.

ئایە ئەم پێشەوا و ئەمیرە کێیە؟

براکانم... سوننەت هەرگیز دژی یەکتر نین، چونکە حەق و ڕاستی لە یەك جێگەوە سەرچاوە دەگرن، (الحارث ی کوڕی أبی أسامە) لە (مسند)[2] ەکەیدا بە سەنەدێکی (صحیح) ریوایەتی کردوە لە فەرموودەی (جابر ی کوڕی عبدالله)وە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((فيقول أميرهم المهدي: تعال صل لنا)) فيقول عيسى: ((لا، إن بعضكم أمير بعض تكرمة الله لهذه الأمة)) واتە: فەرمانڕەواکەیان کە (المهدی)یە پێی دەڵێت: وەرە پێش نوێژیمان بۆ بکە، پێغەمبەرعیسا ﷺ دەفەرموێت: نا، بە ڕاستی ئێوە هەندێکتان فەرمانڕەوان بە سەر هەندێکی

---

١ ـ أخرجه مسلم (١٥٦) .

٢ ـ أخرجه الحارث كما في (المنار المنيف) لابن القيم (٩٤) وقال : وهذا إسناد جيد .

ترتانەوە، ئەمە ڕێزێكی خواییيه لەم ئوممەته ناوێتی))

جا ئەم (المهدی) یه كێیه و چیرۆك و باسەكەی چییە؟

پێش ئەوەی باسی ئەو پیاوە بكەم دەڵێم: هەندێ كەس شوێنی بۆچوونەكانی (ابن خلدون) كەوتوون كە دەڵێت: ((لەو فەرموودانەی كە دەربارەی (المهدی) هاتوون كەمێكی بە تەواوی گەیشتووە پێمان، بەڵكو زۆر كەم)) بەم شێوەیە ابن خلدون[1] باسی كردوە.

منیش دەڵێم: تەنانەت ئەگەر قسە و بۆچوونەكانی (ابن خلدون) وەرگرین و هیچ فەرموودەیەكی (صحیح)مان پێ نەگەیشتبێت تەنها یەك فەرموودە نەبێت ئەوا پێویست دەبوو لە سەرمان شوێنی بكەوین و وەریبگرین، ئەگینا ئەوا دەبووینە ئەو كەسانەی فەرمانەكانی خوایان ڕەد كردوەتەوە. هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ﴾ (الحشر: ٧)واتە: هەرچی پەیامبەرﷺ پێی دان وەری بگرن، واتە: ـ بەچی فەرمانی پێ كردن بیكەن، ڕێیشی لە هەر شتێ لێ گرتن ئێوەش دەستی لێ هەڵگرن.))

پێشەوای ئەهلی سوننە و جەماعە ئیمامی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل دەفەرموێت: ((ئەگەر فەرموودەیەكی دروستی پێغەمبەرمانﷺ ڕەد كردەوە ئەوا ئەو فەرمانەی خودامان ڕەد كردوەتەوە كە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ﴾

لەو بۆچوونەی (ابن خلدون)دا چەند كەسێكی تر شوێنی كەوتوون لەوانە (شەیخ محمد عبده) و (شەیخ محمد رشید رضا) ڕەحمەتی خوایان لێ بێت.

دەڵێن: ئەو فەرموودانەی كە دەربارەی (المهدی) هاتوون هەمووی فەرمودەی (ئاحاد) ن ئەمە خۆی لە خۆیدا بابەتێكە، هەروەها دەڵێن: ئەو فەرموودانەی كە دەربارەی (المهدی) هاتوون لەهەردوو كتێبی(صحیح)دا نەهاتوون (واتە: بوخاری و مسلم)! بە ڕاستی ئەوە دوو گومانە لە لایەن هەندێ كەس دروستبوە، بۆ وەڵام دانەوەی هەریەك لەو دوو گومانە دەڵێین:

بۆ وەڵام دانەوەی گومانی یەكەم: ئەوان دەڵێن: ئەو فەرموودانەی كە دەربارەی

---

١ ـ تاريخ ابن خلدون (١/٣٢٢) .

(المهدی) هاتوون هەمووی فەرموودەی (ئاحاد)ن و فەرموودەی (ئاحاد) لە بابەتی بیروباوەردا وەرناگیرێت!! بە ڕاستی ئەمە قسەیەکی زۆر ترسناکە کە پێشینە چاکەکانمان نەیانزانیوە ـ ڕەزا و ڕەحمەتی خوایان لێبێت ـ ، بە هیچ شێوەیەك کەسێك لەوان ئەو قسەی نەگووتوە، ئەم قسە و باسە لە زانا پاشینەکانەوە سەری هەڵداوە، بە هیچ شێوەیەك لە هاوەڵانەوە جێگیر نەبوە ـ ڕەزای خوا لە هەموویان ـ ، ئەگەر یەکێك لەوان بە یەك بگەیشتایە و فەرموودەیەکی بۆ بگێڕایەتەوە ئەوا نەیدەگوت: نەخێر، من ئەو هەواڵ و قسەی تۆ وەرناگرم چونکە قسەکانی تۆ قسەی (ئاحاد)ن، برۆ کۆمەڵێك لە هاوەڵان بهێنە بۆ ئەوەی هەموویان شایەتیت بۆ بدەن کەوا پێغەمبەری خواﷺ ئەو قسەیەی فەرموە!! نەخێر ئەو ڕووداوە هەرگیز ڕووی نەداوە.

بە ڕاستی ڕووکردن لە قیبلە بە تەنها هەواڵی کەسێك گۆڕدرا، فەرموودەکە لە (صحیح البخاری و مسلم)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی عمر)ەوە دەڵێت: ((بینما الناس یصلون في مسجد قباء الغداة إذ جاء رجل، فقال: إن رسول الله قد أُنزل علیه اللیلة قرآن، و أُمر أن تستقبل الكعبة، فاستقبلوها، واستداروا، فتوجهوا نحو الكعبة)) واتە: لە کاتێکدا خەڵکی نوێژی نیوەڕۆیان دەکرد لە مزگەوتی (قباء) کابرایەك هات و فەرمووی: پێغەمبەری خوارئەمشەو قورئانی بۆ دابەزیوە و فەرمانی پێکراوە چیتر لە نوێژەکاندا ڕوو لە قیبلە بکرێت. بۆیە خەڵکەکە هەموو ڕوویان لە کەعبە کرد و وەرچەرخان)).هەرگیز نەیانگوت: ئێمە دڵنیا نین لەو هەواڵەی تۆ، چونکە هەواڵەکەی تۆ (ئاحاد)ە!!

برا خۆشەویستەکەم... ئایا نازانیت پێغەمبەری خواﷺ چەندان پەیامبەر و بانگەوازکاری دەنارد بۆ وڵاتان و دەسەڵاتداران و پادشایان و هەرگیز نەمانبیستوە یەکێك لەوان ئەو بانگەوازکارە یان ئەو نێردراوەی کە لە لایەن پێغەمبەری خوداوەﷺ هاتوە گێڕابێتەوە بە بانگەشەی ئەوەی کەوا هەواڵەکەی ئەو هەواڵی ئاحادە، نەخێر بەڵکو هەموو شتێکیان لەم پەیامبەرەوە وەرگرتوە کە لە لایەن

---

١ ـ أخرجه البخاري (٤٠٣) ومسلم (٥٢٦) .

پێغەمبەری خواوەﷺ نێردراوە چ ئەو بابەتەی کە لە پێناویدا نێردرابێت بابەتێکی کرداری بووبێت یان بابەتێکی بیروباوەر، پێغەمبەری خواﷺ هاوەڵانی دەنارد بۆ شار و وڵاتەکان، ئەوەتا (أبو عبیدەی کوڕی الجراح) ی ڕەوانە کرد بۆ لای ئەهلی نەجران و (معاذ ی کوڕی جبل) ی نارد بۆ لای ئەهلی یەمەن و (مصعب ی کوڕی عمیر)ی ڕەوانە کرد بۆ لای ئەهلی مەدینە و (دحیە الکلبی) نارد بۆ لای فەرمانڕەواکەی بصری.. هتد. لە هیچ جێگایەکدا نەهاتوە و باس نەکراوە کە ئەوانە هەواڵی ئەو تاکانەیان ڕەد کردبێتەوە و وەریان نەگردبێت، بۆیە ئەم بابەتە پێویست ناکات زۆر لە سەری ڕاوەستین و باسی لێوە بکەین ئەگەر هاتوو هەواڵەکە ڕاست و دروست بوو.

چۆن دەزانین هەواڵەکە ڕاست و دروستە؟ بۆ ئەو مەبەستە بگەڕێوە بۆ ئەو بنەمایانەی کە زانایان دیاریان کردوە و دایان ناوە ئەو زانا بلیمەت و ناودارانە لە فەرموودەناسان، بە عەقڵی خۆت حوکم بە سەر ڕاست و دروستی فەرموودەکاندا مەدە ئەگینا هەروەکو باسمان کرد ئەوا دینەکەمان لە دەست دەدەین، ئایە لەو کاتەدا چی دینێك وەردەگرین؟ ئەو دینەی کە عەقڵی تۆ پێی ڕازییە؟ یان ئەو دینەی کە عەقڵی من پێی ڕازییە؟!

ڕەزا و ڕەحمەتی خوا لە (ئیمامی عەلی) کاتێك دەفەرموێت: ((لو كان الدين بالرأي لكان أسفل الخف أولى بالمسح من أعلاه))[١] واتە: ئەگەر دین بە بۆچوون (رأی) بوایە ئەوا سڕینی ژێرەوەی خوف لە پێشتر و ڕەواتر بوو لە سڕینی سەرەوەی)).

بەڵام لێرەدا چەندان بنەما هەن کە زانایان فەرموودەناس دایانرێژاوە، بۆیە بگەڕێوە بۆ لای ئەو بنەمایانە بۆ ئەوەی ڕاست و دروستی فەرموودەکەت بۆ روون و ئاشکرا ببێتەوە، لە گەڵ مندا ئەو ئایەتەی خوای گەورە بخوێنەرەوە کە دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓاْ﴾ (الحجرات) واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ئەگەر کەسێکی متمانە پێ نەکراو و (فاسق) هەواڵێکی

---

١ ـ أخرجه أبو داود (١٦٢ –١٦٤)

بۆ هێنان خێرا بڕوای پێ مەکەن بەڵکو لێی بکۆڵنەوە..)) لێرەدا خوای گەورە فەرمانی پێ نەکردین بە لێکۆڵینەوە لە هەواڵی ئیماندارێکی باوەڕ پێکراو، بەڵکو فەرمانی پێ کردین بە لێکۆڵینەوە تەنها لە هەواڵی کەسێکی خراپەکار (فاسق)، ئەگەر هەواڵی کەسێکی ئیمانداری باوەڕ پێکراو پێویست بە روونکردنەوە و جێگیر بوون بوایە ئەوا خوای گەورە دیاری نەدەکرد و نەیدەگوت (کەسی خراپەکار (فاسق) ) و فەرمانی پێ کردین بە لیکۆڵینەوە لە هەواڵەکەی، روون کردنەوەکەی رەها دەکرد و بۆ ئەوەی هەموو کەسێك بگرێتەوە، دەیگوت: ((يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمْ خبر فتبينوا)) بەڵکو کاتێ خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ﴾ ئەوا دەبێتە بەڵگە کە هەواڵی کەسێکی باوەڕپێکراو پێویستی بە روون کردنەوە و لێکۆڵینەوە نییە، یا رەدی بکەینەوە، بە بانگەشەی ئەوەی گوایە هەواڵەکە (ئاحاد)ە یان لە تەنها کەسێکەوە ریوایەت کراوە، ئەمە باسی ئەو مەسەلەیە بوو بە کورتی بۆ ئەوەی ئەو گومان و دوو دڵییە لاچێت و نەمێنێ بە فەزڵی خوای پەروەردگار.

- گومانی دووەم: دەڵێن: ئەو فەرموودانەی کە دەربارەی (المهدی) هاتوون لە هەردوو صحیحی (البخاری و مسلم) دا نەهاتوە و جێگیر نەبوە لەو دوو کتێبەدا ! !

بە راستی ئەم گومانە دەبوایە نەگوترایە، چونکە پێش کەمێك من دوو فەرموودەم گێڕایەوە:

- یەکەمیان: لە (صحیح البخاری) هاتوە و لە فەرموودەی (أبو هریرە) ەوە.
- دووەمیان: لە (صحیح مسلم) دا لە فەرموودەی (جابر ی کوڕی عبدالله) وە.

بەڵام فەرموودەکان بە روونی ناوی ئەوی نەهێناوە، ئەوە بزانە کە سوننەت تەواوکەری یەکترن، هەروەکو ئاشکرایە کە (ئیمامی بوخاری) دەربارەی کتێبەکەی خۆی (الصحیح)[1] فەرموویەتی: ((لەم کتێبەدا تەنها فەرموودەی راست و دروستم

---

١ ـ فتح الباري المقدمة (٩) ط الريان .

هێناوه وه فەرموودەی ڕاست و دروستی زۆرترم لایه).

له ڕیوایەتێکی تردا هاتووه که له (ئیمامی بوخاری)یەوه ڕیوایەت کراوه دەڵێت: ((هیچ فەرموودەیەکم له کتێبەکەمدا دانەناوه تەنها ڕاست و دروستەکان نەبێت، چەندان فەرموودەی ڕاست و دروستم جێهێشتوه باسم نەکردوه لە ترسی ئەوەی کتێبەکە زۆرتر و درێژتر نەبێت)).

(الاسماعيلي) دەڵێت: ئەگەر هەموو فەرموودەیەکی (صحيح) ی ڕیوایەت بکردایه ئەوا له یەك بابەتدا فەرموودەی کۆمەڵێکی له هاوەڵان کۆدەکردەوه، باسی ڕێگای ڕیوایەتی هەریەکە لەوانی دەکرد ئەگەر فەرموودەکە ڕاست و دروست بوایە ئەوه کتێبێکی زۆر گەورە دەبوو)).

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت که هەموو فەرموودەیەکی ڕاست و دروست له هەردوو کتێبی (صحيح مسلم و صحيح البخاري)دا کۆ نەکراوەتەوه بەڵکو دەیان کتێبی تر هەن وەکو (مسند الإمام أحمد)و (سنن الترمذي)و (سنن ابن ماجه)و (سنن أبي داود) و (سنن النسائي)و (الدارمي) و (سنن البيهقي)و (مسند البزار) و..و..کتێبەکانی کۆکردنەوەی سوننەت زۆرن و هەموو پڕن له هەزاران بەڵکو دەیان هەزار فەرموودەی ڕاست و دروست، کەواتە مانای ئەوه نییە ئەگەر هاتوو فەرموودەیەك لە هەردوو کتێبی (صحيح) دا یان لە یەکێکیاندا نەبوو ئەوا فەرموودەیەکی (صحيح) نییە، بەڵکو دەبێت وردبینەوه و بگەڕێین بەشوێن ڕاست و دروستی فەرموودەکەدا له لایەن سەنەد و دەقەوه (متن)، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بوو له سەنەد و له دەقدا ئەوا پێویستە ئەو فەرموودەیه وەرگرین، هەرچەندە ئەو فەرموودەیە له هەردوو کتێبی (صحيح) دا یان له یەکێکیاندا نەبوو، چونکە هەموو سوننەت هەروەکو باسمان کرد لای (ئیمامی بوخاری و موسلیم) کۆ نەکراونەتەوه.

داوا له خوای پەروەردگار دەکەم کە توانیبێتم و یارمەتی دابێتم بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو بابەتە، تاکو کارەکە لەسەر برا و خوشکانمان تێکەڵ نەبێت، داوا لە خوا دەکەم کە خۆی فێرمان بکات و تێگەیشتوومان بکات.

لەگەڵ مندا بگەڕێوه بۆ لای ئەو ئەمیره یاخود بۆ لای پێشەوا (مەهدی) ...

(الحارث ی کوڕی أبو أسامه) لە (مسند)[1] ەکەیدا ریوایەتی کردوە بە سەنەدێکی (صحیح) لە (جابر ی کوڕی عبدالله)وە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((ينزل عيسى ابن مريم، فيقول أميرهم المهدي: تعال صل بنا)) فيقول عيسى: ((لا، إن بعضهم أمير بعض تكرمة الله لهذه الأمة)) واتە: عیسای کوڕی مەریەم ﷺ دادەبەزێت فەرمانڕەواکەیان پێی دەڵێت: وەرە پێش نوێژیمان بۆ بکە، پێغەمبەرعیساﷺ دەفەرموێت: نا، بە راستی ئێوە هەندێکتان فەرمانڕەوان بە سەر هەندێکی ترتانەوە ئەمە رێزێکی خواییە لەم ئوممەتە ناوێتی)).

لە ریوایەتێکی تردا کە (أبو داود) ریوایەتی کردوە بە سەنەدێکی (صحیح)[2] لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی مسعود)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((لا تقوم الساعة..)) واتە: قیامەت هەڵناسێت...)) وە لە ریوایەتێکی تردا: ((لا تنقضي الدنيا حتى يملك العرب رجل من أهل بيتي يواطئ اسمه اسمي، واسم أبيه اسم أبي)) واتە: ئەم دونیایە دوایی نایەت تاوەکو کابرایەك حوکمی عەرەب نەکات لە ئەهلی بەیت و بنەماڵەی منە و ناوی خۆی وەکو ناوی منە و ناوی باوکی وەکو ناوی باوکی منە) واتە: ناوی (محمد ی کوڕی عبدالله)یە.

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتوە کە (أبو داود) بە سەنەدێکی (صحیح)[3] لە فەرموودەی (أم سلمه) ەوە ریوایەتی کردوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((المهدي من عترتي من ولد فاطمة))واتە: مەهدی لە وەچە و نەوەی منە لە نەوەی کوڕەکانی (فاطمة)یە)).

بەڵکو لە فەرموودەیەکی تردا کە ئیمامی ئەحمەد لە (مسند)ەکەیدا و ابن ماجە لە (سنن)ەکەیدا بە سەنەدێکی (صحیح)[4] ریوایەتیان کردوە لە فەرموودەی (علی)یەوە کەوا پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ فەرموویەتی: ((المهدي منا أهل البيت

---

١ ـ أخرجه الحارث بن أبي أسامة في (مسنده) كما في (المنار المنيف) (ص ٩٤ ط العاصمة) وقال ابن القيم: ( وهذا اسناد جيد).

٢ ـ أخرجه أبو داود (٤٢٨٢) والترمذي (٢٢٣٠ ، ٢٢٣١) وقال (حسن صحيح) وصححه الألباني في (صحيح الجامع) (٧٢٧٥).

٣ ـ أخرجه أبو داود (٤٢٨٤) وابن ماجة (٤٠٨٦) والحاكم (٥٥٧/٤) وقال الشيخ الالباني: (( وهذا سند جيد رجاله كلهم ثقات وله شواهد كثيرة) الضعيفة (٨٠) وصححه في (صحيح الجامع) (٦٧٣٤).

٤ ـ أخرجه أحمد (٨٤/١) وابن ماجه (٤٠٨٥) وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٢٣٧١) و (صحيح الجامع) (٦٧٣٥) .

يصلحه الله في ليلة)) واتە: مەهدی لە ئێمەیە و لە ئەهلی بەیتە، خوای پەروەردگار لە تەنها شەوێکدا ئامادە و چاکسازی دەکات)) خوای گەورە خۆی ئامادەی دەکات بۆ ئەوەی سەرکردایەتی هەموو ئەم ئوممەتە بکات لەو شەوەزەنگە تاریکەدا، چونکە خیلافەتی راشیدی لە سەر بەرنامەی پێغەمبەرایەتی دەبێت بگەڕێتەوە بۆ سەر زەوی لە سەر بەڵێنی ئەو کەسەی کە هەرگیز لە خۆوە قسە ناکات، ئەی من بە تۆم نەگوت: هەرگیز بێ ئومێد و بێ هیوا مەبە، ئەوەش تەنها هیوا و ئارەزوو و خەونە خۆشەکان نییە، بەڵکو بە بەڵگەی قورئان و فەرموودەیە.

بیر بکەرەوە و بزانە کە گەورەی مرۆڤایەتی ﷺ چی فەرموە! لە فەرموودەیەکدا کە ئیمامی ئەحمەد لە (مسند)ەکەیدا ریوایەتی کردوە و جگە لەو بە سەنەدێکی (صحيح)[1] لە فەرموودەی (حذيفة ی کوڕی اليمان) کەوا پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ فەرموویەتی: ((تكون النبوة فيكم ما شاء الله أن تكون، ثم يرفعها إذا شاء أن يرفعها))

بەرنامەی پێغەمبەرایەتی بەرز بووەوە، ئایە ماوەی حوکمڕانی لە پاش پێغەمبەرایەتی چەندە و شێوەکەی چۆنە؟ باسی قۆناغی حوکمەکان چۆنە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((تكون النبوة فيكم ما شاء الله أن تكون، ثم يرفعها إذا شاء أن يرفعها، ثم تكون خلافة على منهاج النبوة، فتكون ما شاء الله أن تكون، ثم يرفعها إذا شاء أن يرفعها، ثم تكون ملكا عاضا، فيكون ما شاء الله أن يكون، ثم يرفعها إذا شاء أن يرفعها، ثم تكون ملكا جبريةً، فتكون ما شاء الله أن تكون، ثم يرفعها إذا شاء أن يرفعها، ثم تكون خلافة على منهاج النبوة)) واتە: پێغەمبەرایەتی لە ناوتاندا دەمێنێتەوە تاکو خوای گەورە ویستی لە سەر بێت بمێنێتەوە، پاشان خوای گەورە بەرزی دەکاتەوە ئەگەر ویستی لێ بێت بەرزی بکاتەوە، ئەمجار خیلافەت لە سەر بەرنامەی پێغەمبەرایەتی دەبێت، تاکو خوای گەورە ویستی لە سەر بێت دەمێنێتەوە، پاشان خوای گەورە بەرزی دەکاتەوە ئەگەر ویستی لێ بێت بەرزی بکاتەوە، پاشان پادشایەتییەك دەبێت کە توند گاز لە

---

١ ـ أخرجه أحمد (٢٧٣/٤) والطيالسي في مسنده (٤٣٨) والبزار كما في (كشف الأستار) (١٥٨٨) والبيهقي في (الدلائل) (٤٩١/٦) وصححه الشيخ الألباني في ( الصحيحة ) (٥) .

موڵکەکەی دەگرێت، تاکو خوای گەورە ویستی لە سەر بێت دەمێنێتەوە، پاشان خوای گەورە بەرزی دەکاتەوە ئەگەر ویستی لێ بێت بەرزی بکاتەوە، پاشان پادشایەتییەکی زۆرداری دەبێت، تاکو خوای گەورە ویستی لە سەر بێت دەمێنێتەوە، پاشان خوای گەورە بەرزی دەکاتەوە ئەگەر ویستی لێ بێت بەرزی بکاتەوە، پاشان خیلافەت لە سەر بەرنامەی پێغەمبەرایەتی دەبێت)).

ئەم باسە باسێکە بەڕاستی دڵەکان پڕ دەکات لە ئارامی و دڵنیایی و ڕازیبوون و سەکینەت، بەڵام بە پشت بەستن بە خوای گەورە نەك بە تەمبەڵی و تەوەزەلی، ئەو کەسەی کە ئەم موژدەیەی پێداین پێغەمبەری ڕاستگۆیەﷺ هەموو کات و گیان و خوێنی خۆی تەرخان کردبوو بۆ سەرخستنی ئەم دینە، بۆیە وریابە فەرموودەکان وەکو مەبەستەکەی پێغەمبەری خواﷺ تێبگە نەك بە پێچەوانەوە، ئەمجار واز بهێنی لە کارکردن و بڵێیت: چیتر کار ناکەین هەوڵ نادەین و واز لە هەوڵ وتێکۆشان دێنین! ! نەخێر.. بە ڕاستی ئەمە تێگەیشتنێکی هەڵە و پێچەوانەیە، ئەگینا ئەو کەسەی کە ئەم موژدەیەی پێداین خوای گەورە پێی فەرموە: ﴿قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾﴾ (المدثر) واتە: هەستە، لە ناو نوێچنەکەت خەڵکی بێ باوەڕ بێدار بکەرەوە و بترسێنە لە سزای خوا)).

ئەویش هەستا و چیتر تامی پشووی نەچەشت تاوەکو گەیەشتە لای پەروەردگاری خۆی، بۆیە دەبێت زۆر بە وردی و قووڵەوە لە مەبەستی خوا و پێغەمبەرەکەی بگەین ﷺ.

بە وردی بیر لەو فەرموودەیە بکەرەوە کە (الحاكم) لە (مستدرك)ەکەیدا ڕیوایەتی کردوە و بە (صحيح) ی زانیوە و ئیمامی (الذهبي)[1] یش لە گەڵیدا هاودەنگە لە فەرموودەی (أبي سعيد الخدري) کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((يخرج في آخر أمتي المهدي يسقيه الله الغيث، وتخرج الأرض نباتها، ويعطي المال صحاحاً، وتكثر الماشية، وتعظم الأمة، يعيش سبعاً أو ثمانياً - يعني:

١ - أخرجه الحاكم ( ٤/٥٥٧، ٥٥٨) وصححه ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٧١١).

حِجَجاً)) واتـە: لـە کۆتـایی ئوممەتەکەمـدا مەهـدی دەردەچـێت خـوای پـەروەردگار بـارانی بـۆ دەبارێنێـت، زەوی ڕووەکـی خـۆی سـەوز دەکـات، پـارە بـە یەکسـانی دەبەخشێت، مەڕ و مـاڵات زۆر دەبێـت، ئـەم ئوممەتـە مـەزن و گـەورە دەبێـت، بـۆ ماوەی حەوت یان هەشت ساڵ دەژێت).

برا ڕێزدارەکانم.... ناوی تەواوی ئیمامی (المهدی): محمدی کوڕی عبدالله یە و لە نەوەی (الحسن) ی کوڕی (علی) یە و لە (فاطمة) ی کچی پیغەمبـەرە ﷺ، کەواتـە ئەو (عەلەوییەکی حەسەنی فاطمي) یە، خوای گـەورە لـە تـەنها شـەوێکدا ئامـادەی دەکـات ﴿إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾(یـس: ٨٢) واتـە: بەڕاستی هەرکاتێ ویستی شتێ بـەدی بهێنی هـەر ئەوەیـە کـە پێـی بفـەرمێ ببـە! ئەویش دەست بە جێ دەبێت)).

الحـافظ ابـن كـثير دەفـەرموێت[1]: ((لـە سـەردەمی ئـەودا کشتوکاڵ زۆر دەبێـت، بەروبووم زۆر دەبێت، دین حوکم دەکات، سوڵتان زاڵـە بـە سـەر خەڵکیـدا، دوژمـن ملکەچە، خەیر و چاکە لە سەردەمیدا بەردەوامە، لە شـاری مەککـە دەردەکـەوێت، لـە تەنیـشت کەعبـە بەیعـەی پـێ دەدرێـت لـە کاتێکـدا خـۆی ڕازی نییـە و پێـی ناخۆشە)).

خەڵکێکی زۆر دەرکەوتوون و بانگەشەی (المهدی) یـان کـردوە!! لـەو پێنـاوەدا پێغەمبــەری خۆشەویــستمانﷺ بــە نیــشانەیەکی پێغەمبەرانــەی ڕوون وئاشــکرا ئاگاداری کردینەوە ئەگـەر ئـەو نیـشانەیە دەرکـەوت ئـەوا هـەموو ئیمانـدارانی سـەر زەوی دەزانن کە ئەوەی دەرکەوتوە لەمەککەی پیرۆز ئیمامی مەهدی یە.

ئیمـامی (البخـاری و مـسلم)[2] ڕیوایـەتیان کـردوە لـە فەرموودەیـەکی دایکـی ئیماندارانەوە (عائیشە)ەوە، دەفـەرموێت: ((عبـث رسـول الله ﷺ في منامـه)) واتـە: شەوێك لە شەوان پێغەمبەری خواﷺلای عائیـشە نووسـتبوو، هەنـدێك جووڵایـەوە و پەشۆکا و شپرزبوو پاشان هەستا..((فقالت: يا رسول الله! صـنعت شـيئاً في منامـك

---

١ ـ النهاية في الفتن والملاحم (٣١/١)

٢ ـ أخرجه البخاري (٢١١٨) ومسلم (٢٨٨٤) .

لم تكن تفعلـه)) واتـه: عائیـشه فـەرمووی: ئـەی پێغەمبـەری خـواﷺ، لـه كـاتی نووستنەکەتدا شتێکت کرد له پێشدا نـەتکردوه)) پێغەمبـەری خـواﷺ نووسـتوه و شتێکی بینیوه، که ئێستا بۆمـان دەگێڕێتـەوه، ئایا ئـەو شـته چییه؟ فـەرمووی: ((العجب! إن ناساً من أمتي يؤمّون – أي: يتجهون و يقصدون – بالبيت برجل من قريش قد لجأ بالبيت – أي: لجأ إلى بيت الله الحرام – حتى إذا كانوا بالبيداء خُسف بهم)) هذه هي العلامة: ((قالت عائشة: يا رسول الله! إن الطريق قد يجمع الناس، قال: ((نعم، فيهم المستبصر، والمجبور، وابن السبيل، يهلكون مهلكاً واحداً، و يصدرون مصادر شتى، يبعثهم الله على نياتهم)) واتـه: بـه راسـتی سـەیره! خـەڵکانێك لـه ئوممەتەکـەم بـەرەو کەعبـه دێـن بـۆ کوشـتنی پیـاوێکی قورەیـشی پەنایداوەته کەعبه تا دەگەنه بیابـان زەویەکـه رۆدەچێت و نـوقم دەبـن – ئەمـه نیشانەکەیه – عائیشه فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! رێگا هەموو خەڵکی کۆ دەکاتەوه، ئەویش فەرمووی: راسته، هەنـدێکی بـه نیـاز و مەبەسـتەوه و هەنـدێکی زۆر لێکراوه و ناچاره و هەندێکی رێبـوارن هـەمویان بـه یـەك جـار دەمـرن و خـوای گەوره هەر یەکه و به پێی نییەتی خۆی زیندووی دەکاتەوه)).

هەر یەکه و به پێی نیەتی خۆی زینـدوو دەکرێـتەوه، هەنـدێکیان لـه گـەڵ ئـەو لەشکرەدا دەرچووبوون بۆ کوشتنی ئیمامی مەهدی، هەندێکیان له بەر بەرژەوەندی دەرچوه، هەندێکی ملکەچ و گوێڕایەڵە.

لـه ڕیوایەتێکـدا کـه لـه (صـحیح مـسلم)[1] دا هـاتوه لـه فـەرموودەی دایکـی ئیماندارانەوه (حفصه) دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺفەرموویەتی: ((ليؤمن هذا البيت جيش يغزونه، حتى إذا كانوا ببيداء من الأرض، يخسف بأوسطهم، وينادي أولهم آخرهم، ثم يخسف بهم، فلا يبقى إلا الشريد الذي يخبر عنهم)) واتـه:سوپایەك روو دەکاته کەعبه بۆ داگیر کردنی تاکو ئەو کاته له بیابانێك دەبن ناوەراستیان توشـی رۆچونێك دەبـن بـه شـێوەیەك سـەرەتاکەیان بـانگی کۆتاییەکـەیان دەکـات پاشـان

١ – أخرجه مسلم (٢٨٨٣).

ئەوانیش توشی ئەو ڕۆچوونە دەبن، هیچ کەسێکیان نامێنێ تەنها یەك کەس نەبێت کە هەواڵەکەیان دەبات)

جا لێرەدا پێغەمبەری خۆشەویستﷺ لەوپەڕی وردی و ڕوونیدا باسی مەسەلەکان دەکات.

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: چۆن بزانین ئەوەی کە دەرچوە و بانگەشەی مەهدی دەکات ئیمامی مەهدی یە؟ کاتێ کە ئیمامی مەهدی دەردەکەوێت ئەوا لەشکرێکی بۆ دەردەچێت...بۆ؟ بە مەبەستی کوشتن و لە ناوبردنی.. لەو کاتەدا خوای گەورە ئیمامی مەهدی سەردەخات بە شێوەیەکی قەدەری کە بە هیچ شێوەیەك شوێن دەست و هەوڵ و تێکۆشانی هیچ مرۆڤێکی پێوە دیار نییە، ئەو لەشکرە تووشی رووچوون دەبن و دەچنە ژێر زەویدا، لەو رووچوونەدا هیچ کەسێك نامێنێت تەنها کۆمەڵە کەسێکی کەم نەبێت، بەو شێوەیە هەموو ئەهلی سەر زەوی دەزانن ئەوەی کە درەچوە ئیمامی مەهدی یە.

جا لەو کاتەدا خوای گەورە ئیمامی مەهدی و یەکتاپەرستان ئەوانەی لە گەڵیدان سەریان دەخات ئەوانەی کە لە هەموو سەر زەوییەوە بۆ لای ئەو دەڕۆن و بەیعەی پێ دەدەن و پاشان خوای گەورە بە فەزڵی خۆی و بە جوانترین شێوە سەریان دەخات.

ئیمامی (مسلم)[1] ریوایەتی کردوە لە فەرموودەیەکی (نافع ی کوڕی عتبە)وە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((تغزون جزيرة العرب، فيفتحها الله، ثم فارس، فيفتحها الله، ثم تغزون الروم، فيفتحها الله، ثم تغزون الدجال، فيفتحه الله)) واتە: هێرش دەبەنە سەر دورگەی عەرەب و خوایش سەرتان دەخات، پاشان هێرش دەبەنە سەر فارس خوایش سەرتان دەخات، پاشان هێرش دەبەنە سەر رۆم و خوایش سەرتان دەخات، پاشان هێرش دەبەنە سەر دەججال و خوایش سەرتان دەخات))

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٩٠٠) .

جا ئەم فەرموودەیە ئەوە روون دەکاتەوە ئەو داستان و جەنگانە لە پێش دەرچوونی دەججال ڕوو دەدەن ((ثم تغزون الروم، فیفتحها الله)) پاشان دوا بە دوای ئەوە یەکسەر دەججال دێت، چونکە ئەگەر هەر کاتێك دەججال بوونی هەبوو ئەوا پێغەمبەرعیسا یش عليه السلام بوون و وجودی هەیە، نیشانەکانی قیامەت هەروەکو باسمان کرد: ((خرزات منظومات في سلك فإن یقطع السلك یتبع بعضها بعضا)) واتە: نیشانەکان وەك دەنکەکانن لە دەزوویەکدا هۆنراونەتەوە ئەگەر دەزووەکە بڕا ئەوا شوێنی یەکتر دەکەن)).

ئایە ئەو باس و کێشەیە چییە کە دەفەرموێت: ((ثم تغزون الروم))؟ لە پێشەکی کتێبەکەدا بە دوور و درێژی باسم کرد، لەو فەرموودەیەی کە ئیمامی (مسلم)[1] ریوایەتی کردوە لە فەرموودەی (أبو هریرە)وە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَنْزِلَ الرُّومُ بالأعْماقِ أوْ بَدابِق فَيَخْرُجُ إلَيْهِمْ جَيْشٌ منَ المَدِينَةِ منْ خِيَارِ أهْلِ الأرْضِ يَوْمَئِذٍ، فَإذَا تَصَافُّوا قَالَت الرُّومُ: خَلُّوا بَيْنَنَا وَبَيْنَ الَّذِينَ سَبَوْا مِنَّا نُقَاتِلْهُمْ، فَيَقُولُ المُسْلِمُونَ: لاَ وَ الله! لاَ نُخَلِّي بَيْنكُمْ وَبَيْنَ إخْوانِنَا فَيُقَاتِلُونَهُمْ فَيَنْهَزِمُ ثُلُثٌ لاَ يَتُوبُ الله عَلَيْهِمْ أبَداً وَيُقْتَلُ ثُلُثُهُمْ، أفْضَلُ الشُّهَدَاءِ عِنْدَ الله وَيَفْتَتِحُ الثُّلُثُ لاَ يُفْتَنُونَ أبَداً))، واتە:ـ قیامەت هەڵناسێت تاکو ڕۆمەکان کۆ نەبنەوە دژی موسڵمان لە(أعماق)[2] یان لە (دابق)، سوپایەك لە مەدینەوە دەردەچێ بۆ سەر ڕۆمەکان کە ئەو سوپایە لە باشترین و هەڵبژێردراوترینی ئەهلی سەر زەوی یە لەو کاتەدا، کە بەرامبەر ڕۆمەکان وەستان بە مەبەستی کوشتار ڕۆمەکان دەڵێن: ئەی سوپا ئێوە ڕێگامان بۆ چۆڵ بکەن و وازمان لێ بهێنن تا بچینە سەر ئەو موسڵمانانەی کە لە ئێمەیان بە دیل گرتوە(سبوا منا) بۆ ئەوەی بجەنگین دژیان موسڵمانەکانیش دەڵێن: نەخێر سوێند بە خوا ڕێگاتان بۆ چۆڵ ناکەین بۆ سەر برا موسڵمانەکانمان، ئەمجار جەنگ دەست پێ دەکات سێیەکی سوپای موسڵمانان

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٨٩٧) .

٢ ـ أعماق لە ناوجەرگەی وڵاتی شامە، والروم : بریتین لە ئەورووپی و ئەمریکییەکان ، ئەوان لە نەوەی (عیص ی کوڕی اسحاق ی کوڕی ابراهیم)

پاشه کشه دەکات و را دەکات که هەرگیز خوای گەورە لەوان تەوبە وەرناگرێت و سێیەکیان دەکوژرێن کە باشترین شەهیدن لە لای خوا، ئەو سێیەکەکەی تر سەردەکەون و رزگار دەکەن هەرگیز توشی فیتنه نابن)).

جا ئەوانە ئەو کەسانەن کە رزگار کردنی (قسطنطینیة) لە سەر دەستی ئەوان دەبێت بە پشتیوانی خوای پەروەردگار هەروەکو لە فەرموودەیەکدا کە لە (صحیح مسلم)[1] دا هاتوه، لە فەرموودەی (أبـو هريـره)وە کەوا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی ((: سمعتم بمدينة جانب منها في البر وجانب منها في البحر؟.. قالوا: نعم يا رسول الله قال: لا تقوم الساعة حتى يغزوها سبعون ألفاً من بني إسحاق.. فإذا جاؤوها نزلوا، فلم يقاتلوا بسلاح ولم يرموا بسهم، قالوا: لا إله إلا الله والله أكبر فيسقط أحد جانبيها الذي في البحر ثم يقولوا الثانية: لا إله إلا الله والله أكبر فيسقط جانبها الآخر ثم يقولوا الثالثة: لا إله إلا الله والله أكبر فيفرج لهم فيدخولها فيغنموا، فبينما هم يقتسمون المغانم، إذ جاءهم الصريخ فقال: إن الدجال قد خرج، فيتركون كل شئ، ويرجعون)) واتە: ئایە شارێکتان بیستوە لایەکی لە وشکانیدایە و لایەکەی تری لە ناو دەریادا؟ گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خواﷺ ، خۆشەویستی خوا ﷺ فەرمووی: قیامەت هەڵناسێت تاوەکو حەفتا هەزار رۆمی (لە نەوەی ئیسحاق) ئەو شارە داگیری نەکەن (واتە: شاری(قُسْطَنطنية) (إستنبول) بەڵام کاتێك موسڵمانە سەرکەوتوەکان دێنە سەر شارەکە ناجەنگن دژیان بە چەك و هیچ تیرێکیشیان بۆ ناهاوێژن، بەڵکو تەنها دەڵێن: لا إله إلا الله، والله أكبر، ئەو کاتە یەکسەر یەکێك لە لایەکانی ئەو شارە کە لەناو دەریادایە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانەکان، لەپاشان جارێکی تر دەڵێنەوە: لا إله إلا الله والله أكبر، ئەو کات لاکەی تریشی ژێر باری موسڵمانان دەبێت. بۆ جاری سێیەم دەڵێن: لا إله إلا الله والله أكبر ئەو کاتە رێگاو دەرگایان بۆ دەکرێتەوە، دەچنە ناو شارەوەو سەردەکەون و غەنیمەتیان دەست دەکەوێت، لەکاتێکدا کە ئەوان غەنیمەت دابەش دەکەن لە ناو خۆیاندا، شەیتان هاوار دەکات و دەڵێت: مەسیحی دەججال لە دواوە چوەتە سەر کەس و

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٩٢٠) .

کارو ئەهلەکانتان! ئەوانیش هەموو شتێك جێ دەهێڵن و دەگەڕێنەوە)).

ئەو موسڵمانانە دەگەڕێنـەوە بۆ ئـەوەی بزانن دەربـارەی دەجـاڵ چـی شـتێك ڕوویداوە ! !

لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((فَيَنْهَزِمُ ثُلُثٌ لاَ يَتُوبُ الله عَلَيْهِمْ أَبَداً وَيُقْتَلُ ثُلُثُهُمْ، أَفْضَلُ الشُّهَدَاءِ عِنْدَ الله وَيَفْتَتِحُ الثُّلُثُ لاَ يُفْتَنُونَ أَبَداً)) واتـە: ــ سێیەکی سوپای موسڵمانان پاشە کشە دەکات و ڕا دەکات کە هەرگیز خوای گەورە لەوان تەوبە وەرناگرێت وە سێیەکیان دەکوژرێن کە باشترین شـەهیدن لـە لای خـوا ئەو سێیەکەکەی تر سەردەکەون و ڕزگار دەکەن هەرگیز توشی فیتنە نابن)).

لـە (صـحیح مـسلم)[١]دا هـاتوە لـە فەرموودەیـەکی (یـسیر ی کـوڕی جـابر)ەوە دەڵێت:((هَاجَتْ رِيحٌ حَمْرَاءُ بِالْكُوفَةِ، فَجَاءَ رَجُلٌ لَيْسَ لَهُ هِجِّيرَي، يَا عَبْدَاللهِ بْنَ مَسْعُودٍ! جَاءَتِ السَّاعَةُ، قَالَ: فَقَعَدَ، وَكَانَ مُتَّكِئاً فقال: إِنَّ السَّاعَةَ لا تَقُومُ حَتَّى لاَ يُقْسَمَ مِيرَاثٌ، وَلا يُفْرَحَ بِغَنِيمَةٍ، ثُمَّ قَالَ بِيَدِهِ هَكَذَا _ وَنَحَّاهَا نَحْوَ الشَّامِ _ فَقَالَ: عَدُوٌّ يَجْمَعُونَ لأَهْلِ الإِسْلاَمِ، وَيَجْمَعُ لَهُمْ أَهْلُ الإِسْلاَمِ، قُلْتُ: ــ الرُّومَ تَعْنِي؟ قَالَ: نَعَمْ، وَتَكُونُ عِنْدَ ذَاكُمُ الْقِتَالِ رَدَّةٌ شَدِيدَةٌ، فَيَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ لاَ تَرْجِعُ إِلاَّ غَالِبَةً، فَيَقْتَتِلُونَ حَتَّى يَحْجُزَ بَيْنَهُمُ اللَّيْلُ، فَيَفِيءُ هَؤُلاَءِ وَ هَؤُلاَءِ كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ، ثم يَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ لاَ تَرْجِعُ إِلاَّ غَالِبَةً فَيَقْتَتِلُونَ، حَتَّى يَحْجُزَ بَيْنَهُمُ اللَّيْلُ، فَيَفِيءُ هَؤُلاَءِ وَ هَؤُلاَءِ، كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ، وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ، ثم يَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ، لاَ تَرْجِعُ إِلاَّ غَالِبَةً، فَيَقْتَتِلُونَ حَتَّى يمسوا، فَيَفِيءُ هَؤُلاَءِ وَ هَؤُلاَءِ كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ، فَإِذَا كَانَ الْيَوْمُ الرَّابِعِ: نَهَدَ إِلَيْهِمْ بَقِيَّةُ أَهْلِ الإِسْلاَمِ فَيَجْعَلُ الله الدَّبْرَةَ عَلَيْهِمْ فَيَقْتُلُونَ مَقْتَلَةً لَمْ يُرَ مِثْلُهَا،حَتَّى إِنَّ الطَّائِرَ لَيَمُرُّ بِجَنَبَاتِهِمْ ، فَمَا يُخَلِّفُهُمْ حَتَّى يَخِرَّ مَيْتاً، فَيَتَعَادُّ بَنُو الأب كَانُوا مِائَةً، فَلاَ يَجِدُونَهُ بَقِي مِنْهُمْ إِلاَّ الرَّجُلُ الْوَاحِدُ، فَبِأَيِّ غَنِيمَةٍ يُفْرَحُ؟ أَوْ أَيُّ مِيرَاثٍ يُقَاسَمُ؟ فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ سَمِعُوا بِبَأْسٍ، هُوَ أَكْبَرُ مِنْ ذَلِكَ فَجَاءَهُمُ الصَّرِيخُ: إِنَّ الدَّجَّالَ قَدْ خَلَفَهُمْ فِي ذَرَارِيِّهِمْ، فَيَرْفُضُونَ مَا فِي أَيْدِيهِمْ وَيُقْبِلُونَ، فَيَبْعَثُونَ عَشَرَةَ فَوَارِسَ طَلِيعَةً، إني لأعرف

---

١ ــ أخرجه مسلم (٢٨٩٩) .

أسماءهم وأسماء آبائهم وألوان خيولهم هم خير فوارس على ظهر الأرض يومئذ أو من خير فوارس على ظهر الأرض يومئذ)).

واتە: بایەکی سوور لە کوفەوە هەڵچوو(هەڵیکرد)، کابرایەك هات بە هاوار و دەنگی بەرزەوە (واتە: بە دەنگی بەرزەوە خەریکە لە بەر بەرزی دەنگەکەی لە هیچ وشەیەکی تێنەگەی): ئەی (عبدالله ی کوڕی مەسعود) قیامەت هەستا، فەرمووی: بۆیە (عبدالله) ڕاست بوەوە و دانیشت لە کاتێکدا ڕاکشابوو، گوتی: ــ قیامەت روو نادات تاکو ئەو کات و سەردەمەی میراتی تیادا دابەش ناکرێت و بە دەستکەوت (غەنیمە) دڵخۆش نابن ئەمجار بە دەستەکانی ئیشارەتی بۆ شام کردوە فەرمووی: ــ دوژمنێك کۆدەبنەوە لە دژی ئەهلی ئیسلام و ئەهلی ئیسلامیش کۆ دەبنەوە بۆیان)) گوتم: مەبەستت رۆمەکانە؟ فەرمووی: بەڵێ، لەو جەنگەدا هەڵگەڕانەوەیەکی توند روو دەدات، (ئەمە یەکەم سێیەکە کە پێش کەمێك لە ریوایەتەکەی ــ صحيح مسلم ــ دا باسمان کرد)، موسڵمانان کۆمەڵێك پاڵەوانی ڕاستگۆی دڵسۆز پێش دەخەن بۆ ئەوەی ببنە پێشەنگیان لەم جەنگەدا، ئەوانش مەرج لە سەر خۆیان دادەنێن و پەیمان بە خوای خۆیان دەدەن کە نابێت بگەڕێنەوە ناو ریزی لەشکری موسڵمانان تاوەکو یەکێك لەو دوو ئامانجە دەستەبەر نەکەن: یان سەرکەوتن، یان شەهید بوون، ئەمجار کوشتار دەست پێ دەکات، تاوەکو تاریکایی شەو لێکیان جیا دەکاتەوە، موسڵمانان و جگە لە موسڵمانان دەگەڕێنەوە، لەم رۆژەدا سەرکەوتن نە بۆ موسڵمانان و نە بۆ دوژمنانی موسڵمانان دەستەبەر نابێت، ئەوانەی کە پەیمانیان بە پەروەردگاری خۆیان دابوو لە سەر سەرکەوتن یان شەهید بوون هەموو لە ناو دەچن، ئەگەر رۆژی دووەم هات: موسڵمانان کۆمەڵێکی تر پاڵەوانی ڕاستگۆی دڵسۆز پێش دەخەن، ئەوانیش مەرج لە سەر خۆیان دادەنێن و پەیمان بە خوای خۆیان دەدەن کە نابێت بگەڕێنەوە ناو ریزی لەشکری موسڵمانان تاوەکو یەکێك لەو دوو ئامانجە دەستەبەر نەکەن: یان سەرکەوتن، یان شەهید بوون دیسان جەنگێکی سەخت روودەدات تاوەکو تاریکایی شەو لێکیان جیا دەکاتەوە و شەڕ دەوەستێ بە بێ سەرکەوتنی هیچ لایەك و ئەو

کۆمەڵە فیداکارانە هەموویان لە ناو دەچن، ئەگەر ڕۆژی سێیەم هات کۆمەڵە فیداکارێکی تر هەڵدەبژێرن کە تا مردن نەگەڕێنەوە بە سەرکەوتوویی نەبێت ئەوانیش دەجەنگن تاوەکو دیسان شەو کۆتایی بە جەنگ دەهێنێت و هەردوولا دەگەڕێنەوە بنکەکانیان بە بێ سەرکەوتن بۆ هیچ لایەك و دوای جەنگانێکی تر ئەم کۆمەڵە فیداکارەش لە ناو دەچن، ئەگەر ڕۆژی چوارەمی جەنگ هات باقی موسڵمانان بۆ ڕۆمەکان ڕاست دەبنەوە و بە گژیاندا دەچنەوە و بەربەرەکانیان دەکەن، خوای گەورە مردن و بنەبڕ کردن لە سەر ڕۆمەکان دادەنێت کوشتارێکی وایان لێ دەکرێ کە وێنەی نەبینراوە، یان نابینرێت بە شێوەیەکی وا کە باڵندە بە سەر لاشەکانیاندا بڕوات ناتوانێت لێیان تێپەڕکات و دەمرێت، ئەو کاتە نەوەی باوکێك کە کاتی خۆی سەد کەس بوون ئێستا سەرژمێری خۆیان دەکەنەوە سەیر دەکەن تەنها یەك پیاویان ماوە! لە بەر ئەوە بە چ دەستکەوتێك (غەنیمەتێك) دڵخۆش دەبێت؟ چ میراتێك دابەش بکرێت؟ لە کاتێکدا کە ئەوان دەستکەوت (غەنیمەت) دابەش دەکەن لە ناو خۆیاندا کێشەیەکی تر دەبیسن کە ئەوە لەوی تر گەورەترە، بانگەوازکارێك دێت و بانگ دەکات و دەڵێت: مەسیحی دەججال لە دواوە چووەتە سەر کەس و کار و ئەهلەکانتان ئەوانیش ئەو دەستکەوتەی (غەنیمەتەی) لە دەستیاندا بوو فڕێی دەدەن و دەردەچن، موسڵمانان لە پێش خۆیانەوە (دە) سوار دەنێرن (بۆ ئەوەی بزانن کە ئایە ڕاستە دەججال دەرچووە یان نا).

بە جوانی بیر بکەرەوە بزانە پێغەمبەری خواﷺ (دایك و باوك و گیانم بە فیدای بێت) چی دەڵێت! خۆشەویستی خواﷺدەفەرموێت: من دەزانم ناوی خۆشیان و باوکەکانیشیان چییە و ڕەنگی وولاخەکانیشیان دەزانم، ئەو دە سوارە باشترین و چاکترین سواری سەر زەوین لەو کاتەدا)).

لەگەڵ مندا جارێکی تر بگەڕێوە بۆ لای عیسا ی کوڕی مەریەم؛ تکام وایە کە لە مەسەلەکە باش تێگەیشتبێتی بۆ ئەوەی هەمووی پێکەوە گرێ بدەی.

پاشان دەڕۆن بۆ کوشتار لە گەڵ دەجالدا، هەروەکو لە ریوایەتەکەی (صحیح مسلم) دا هاتوە لە فەرموودەیەکی (أبو هریرە)ەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((فبينما هم يصفون الصفوف،إذ أقيمت الصلاة فنزل عيسى ابن مريم)) واتە: لە کاتێکدا ئەوان ریزیان یەك خستوە (بە مەبەستی کوشتنی دەجال) پێشەوای موسڵمانان لە پێشیانەوە پێش نوێژیان بۆ دەکات (هەندێك ریوایەت بە روونی باسی کردووە کە نوێژی بەیانییە[1]) لەو کاتەدا (عیسی)ی کوڕی مەریەم عليه السلام لە ئاسمانەوە دادەبەزێت)) لای مەنارە سپییەکەی رۆژهەڵاتی (دیمەشق) و بەرەو (بیت المقدس) دەڕوات، ئەوانەی کە لە گەڵیدان کۆمەڵە رزگار بوەکەیە ریزەکانی خۆیان ریك خستوە بۆ کوشتنی دەجال پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت: ((ثم تغزون الدجال فيفتحه الله)) واتە: پاشان هێرش دەبەنە سەر دەجال و خوایش سەرتان دەخات)).

بەڵام خوای گەورە ویستی وا دەبێت کە نەمان و کوشتنی دەجال لە سەر دەستی پێغەمبەرعیسا عليه السلام ببێت.

لە گەڵ مندا جارێکی تر بگەڕێوە بۆ لای ریوایەتەکەی (النواس ی کوڕی سمعان) کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إذ بعث الله المسيح ابن مريم، فينزل عند المنارة البيضاء شرقي دمشق بين مهرودتين واضعا كفيه على أجنحة ملكين، إذا طأطأ رأسه قطر، وإذا رفعه تحدر منه جمان كاللؤلؤ)) واتە: لەو کاتەدا (عیسی)ی کوڕی مەریەم عليه السلام لە ئاسمانەوە دادەبەزێت بۆ لای مەنارە سپییەکەی رۆژهەڵاتی (دیمەشق) لە دوو پۆشاکی ڕەنگ کراودا بە وەرسی زەعفەران دوو لەپە دەستەکانی لەسەر باڵی دوو فریشتە داناوە کە سەر بەرز کات و نەوی بکات، دڵۆپە ئاوی سافی لە شێوەی دەنکە زیوی شێوە مرواری لێ دەتکێت)).

پاشان بەرەو (بیت المقدس) دەڕوات، لەوێ دەبینێ موسڵمانان خۆیان ئامادە کردوە بۆ نوێژی بەیانی - هەروەکو لە سەرتای بەشەکەدا ئاماژەم پێ کرد —

---

1 ـ عند ابن ماجه (٤٠٧٧)

لەو کاتەدا پێشەوای ئیمانداران یان مەهدی هەروەکو ریوایەتەکان بە روونی باسیان کردوە دەیەوێ پێشی بخات، بۆیە عیسا ی کوڕی مەریەم‌ﷺ رازی نابێت کە پێش بکەوێت، لە ریوایەتێکی تردا کە لە (صحیح مسلم)[1] دا هاتوە: ((فیؤمهم عیسی)) واتە: عیساﷺ پێش نوێژیان بۆ دەکات)) بۆیە هەندێك لە ئەهلی زانست و زانیاری دەڵێن: ((فأمّكم منكم)) واتە: بەوەی کە پێتانە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرﷺ پێش نوێژیتان بۆ دەکات، چونکە عیساﷺ بە بەرنامە و شەرعێکی تازەوە دانابەزێت، بەڵکو بە شەرعی پێغەمبەری خواﷺ و ئیسلامەوە دادەبەزێت، هەروەکو ئاشکرایە ئیسلام دینی عیسا و محمدو هەموو پێغەمبەرانە (سەلات و سەلامی خوایان لە سەر بێت)، خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردوە ئیللا دینەکەی ئیسلام بوە، لە سەرتاکەیانەوە کە(نووح)ەﷺ تاکو کۆتاییەکەیان کە(محمد)ە ﷺ.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ﴾( آل عمرا: ١٩) واتە: بێگومان تەنها ئەم دینی ئیسلامەیە پەسەند و قبووڵە لای خوا))، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ﴾(المائدة: ٣) واتە: وا لە ئەمڕۆوە بەرنامە و ئایینەکەتانم بەپایان گەیاند، واتە: لە بارەی عەقیدەو جیهادەوە، لەبارەی حەلاڵ و حەرامەوە هەموو شتێکم بۆ تەواو کردن، نیعمەت و بەخششی خۆمم بۆ تەواو کردن سەرم خستن بە سەر دوژمنانتانا و رێنماییم کردن بۆ رێگەی راست، ئیسلامیشم بە بەرنامە و ئایین بۆ هەڵبژاردن و نابێ هیچ کاتێك لێی لابدەن)) .

لە (صحیح مسلم)[2] دا هاتوە لە فەرموودەی (أبو هريرە) ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((.. فينزل عيسى ابن مريم فأمهم، فإذا رآه عدو الله، ذاب كما يذوب الملح في الماء، فلو تركه لانذاب حتى يهلك، ولكن يقتله الله بيده، فيريهم دمه في حربته)) واتە: عیسا ی کوڕی مەریەمﷺ دادەبەزێت و دەبێتە پێشەوایان کاتێك

---

١ ـ أنظر صحيح مسلم (٢٨٩٧) .

٢ ـ أخرجه مسلم (٢٨٩٧) .

دوژمنی خوا دەیبینێت دەتوێتەوە هەروەکو چۆن خوێ دەتوێتەوە لە ئاودا، ئەگەر عیسا ﷺ وازی لێ بهێنایە ئەوا تاکو مردن دەتوایەوە، بەڵام خوای گەورە ویستی وایە کوشتنی بە دەستی عیسا ﷺ بێت ئەویش خوێنی دەجالیان پیشان دەدات کە لە سەر رمەکەی)).

لە ریوایەتەکەی (النواس) دا کە لە (صحیح مسلم) دا هاتوە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شوێنە دیاری دەکات کە پێغەمبەرعیسا ﷺ دەجالی تێدا دەکوژێت، ئەوەتا دەڵێت: ((فیطلبه حتی یدرکه بباب لد)) واتە: بە دوایدا دەڕوات تاکو لە دەرگای (لد) پێی دەگات..))

(لد) گوندێکە لە وڵاتی فلسطین لە شاری (تل أبیب)ەوە نزیکە، داوا لە خوا دەکەم کێشەی براکانمان لە فلسطین چارە بکات و لەو تەنگانەی کە تیایدان دەربازیان بکات. ئا ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ جێگاکان بە ناوی خۆیانەوە باس دەکات کە لەو کات و سەردەمەدا نەبوونە بۆ ئەوەی دڵنیا بین کە ئەو خۆشەویستە هەرگیز لە خۆوە قسە ناکات، دەفەرموێت: ((فیدرکه عند باب لد فیقتله)) واتە: لە دەرگای (لد) پێی دەگات و دەیکوژێت)

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((ثم یأتي عیسی ابن مریم ﷺ قوم قد عصمهم الله منه – أي: من الدجال – فیمسح عن وجوههم ویحدثهم بدرجاتهم في الجنة، فبینما هو کذلك إذ أوحی الله الی عیسی: إني قد أخرجت عباداً لي لا یدان لأحد بقتالهم، فحرز عبادي الی الطور)) واتە: پاشان عیسا ﷺ دێت بۆ لای کۆمەڵە موسڵمانێك کە خوای پەروەردگار لە فیتنەی دەجال پارستوونی، دەست دەهێنێت بە دەم و چاویاندا و پلەو دەرەجەی خۆیان بۆ باس دەکات کە لە بەهەشتدا دەستیان دەکەوێت، لەو کاتەدا خوای گەورە وەحی دەنێرێ بۆ عیسا ﷺ پێی دەفەرموێت: من بەندە گەلێکی خۆمم – کە (یەئجوج ومەئجوج)ە – دەرخستون، کە کەس توانای جەنگ کردنی نییە بەرامبەر ئەوان، لە بەرئەوە بەندە موسڵمانەکانم بدە پاڵ کێوی (طور) و لەوێ بیان شارەوەو پەنایان بدە)).

ئـەم بەشـە بـەو فەرموودەیـە تـەواو دەکـەم کـە ئیمـامی (بوخـاری و موسـلیم)[١] ریوایەتیان کردوە لە فەرموودەیەکی (ابو هریرە) ەوە دەڵێـت: پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفەرموێـت: ((والـذي نفسي بيده، ليوشكن أن ينزل فيكم عيـسى بـن مـريم حكمـاً مقسـطاً، فيكسـر الصليـب، ويقتل الـخنزيـر، ويضع الـجزية، ويفيـض المال حتـى لا يقبله أحد)) واتە: سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بـە دەسـتە، وا خەریکـە عیـسای کـوڕی مـریم ﷺ دادەبـەزێت و دەبێـت بـە فەرمانڕەواییـەکی دادپـەروەر، خـاچ دەشکێنی و بەراز دەکوژێت و سەرانە هەڵدەگرێت سەروەت و سامان زۆر دەبێـت و خەڵکی بۆ بانگ دەکات کەچی کەس وەری ناگرێت))

ڕێزداران...دەبێ زۆر بایەخ بەزانست و کارکردن بدەین، هەرگیز نابێت تەمبـەڵ و تەوەزەل بین، بەڵکو دەبێت کـار بکـەین، پیـاوەتی لەوەدایـە لـە کاتێکدا دەگەیتـە خواکـەی خـۆت دەسـتت بـە دینەکەتـەوە گرتبێـت، هـەرگیز پـشت بـە کەسـی تـر مەبەستە، نابێت فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بـە شـێوەکی تـر لـە مەبەسـتی خـۆی تێبگەین، دەبێت بایەخ بە زانست و کارکردن بدەین، هەردەم تەوبە نـوێ بکەینـەوە لە گەڵ خوای خۆماندا و باوەڕەکەمان نوێ بکەینەوە و نەفامی بنەبڕ بکەین چونکە ئەوانەی تووشی فیتنەی دەججال دەبـن تـەنها نـەفامانن، هـەرگیز هـیچ کەسـێ لـە فیتنەی دەججال و بەڵکو لە هەر فیتنەیەکی تر رزگاری نابێت تەنها ئـەهلی بـاوەڕ و یەکتاپەرسـتان نـەبێت، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْآخِرَةِ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴾ (إبـراهيم: ٢٧) واتـە: ئەوانـە کـە باوەڕیـان بـە خـوا و بـە گـشت بڕیارەکانی خوا هێناوە، بە هۆی ئەم وشە جێگر و نەگۆڕاوەی (لا اله الا الله)وە خـوا پێگەیان قایم و جێگر ئەکا لە ژیانی ئەم دونیا و لە ژیانی ئەو دونیا و ستەمکارانیش گومڕا و سەر لێشێواو دەکات خوا بیەوێ هەر شـتێ بکـات زۆر بـە ئاسـانی دەیکـات حەز بکا کێ رینموویی بکا و کێیش گـومڕا و سـەر لێشێواو بکـا ئەمانـە هـەموو لـە

---

١ ـ أخرجه البخاري (٢٢٢٢) ومسلم (١٥٥) .

دەسەڵاتی ئەودان )).

ئاخۆ ئەوانەی کە لە پاش مردن و فەوتانی دەججال دەردەچن کێن؟ کە دەبنە فیتنەیەکی تر و خوای گەورە ئەهلی باوەڕ لە فیتنەیان دەپارێزی بە فەزڵی خۆی و ئینجا بە فەزڵی دوعای عیسا ؟ ئەمە و چەند باسێکی تر لە بەشی داهاتوودا باس دەکەین - إنشاء الله - .

داوا لە خوا دەکەم لە بەر خاتری ناوە گەورەکەی خۆی (اسم الأعظم) کە ئەگەر بەو ناوەوە داوای لێ بکرێت ئەوا وەڵام دەداتەوە و ئەگەر هاواری پێ بکرێت ئەوا دێتە فریامانەوە، داوای لێ دەکەم من و ئێوە لە هەموو فیتنەیەك بپارێزێت ئەوانەی کە ئاشکران و ئەوانەی شاراوەن و من و ئێوە ئاخر خەیر بکات و بە باوەڕ و یەکتاپەرستی یەوە کۆتایی بە ژیانمان بهێنی و چاومان بە سەرکەوتنی ئیسلام و ئەهلی ئیسلام گەش و روون بکاتەوە هەر خۆی پشت و پەنامانەو توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

# دەرچوون و دەرکەوتنی یەئجوج و مەئجوج

# ( خروج يأجوج و مأجوج )

لە بەشی رابووردوودا لە باسی ئەو رووداوە ترسناکەدا راوەستاین، لە گەڵ عیسا پێغەمبەردا ﷺ لە کاتێکدا ئەو دەججال دەکوژێت، بۆ ئەوەی سەر زەوی لە ترسناکترین و توندترین فیتنە کە سەر زەوی ناسیویەتی رزگار بکات لە ئادەمەوە تاکو رۆژی قیامەت ئەویش فیتنەی مەسیحی دەججالە، خوای گەورە بە فەزڵی خۆی ئیمانداران رزگار دەکات، ئەمجار بە فەزڵی پێغەمبەرعیسا ﷺ کە مەسیحی دەججال دەکوژێت، هەروەکو باسمان کرد پێغەمبەری خوا ﷺ باسی چۆنییەتی دابەزینی عیسا ی ﷺ کردوە و جێگای دابەزینەکەی بۆ دەستنیشان کردووین بەڵکو ئەو جل و بەرگەی کە پێوەی دادەبەزێت پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ باسی کردوە، لێرەدا جارێکی تر بە پەلە ئەو ریوایەتە دووبارە دەکەینەوە پاشان دەچینە سەر باسی رووداوەکانی تر.

لە فەرمودەیەکدا کە ئیمامی (مسلم)[1] ریوایەتی کردوە لە فەرموودەی (النواس ی کوڕی سمعان)ەوە تێیدا هاتوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ینزل عیسی ابن مریم عند المنارة البیضاء شرقي دمشق، بین مهرودتین،واضعا کفیه علی أجنحة ملکین، إذا طأطأ رأسه قطر، وإذا رفع رأسه تحدر منه جمان کاللؤلؤ، فلا یحل لکافر یجد ریح نفسه إلا مات، ونفسه ینتهي حیث ینتهي طرفه، فیطلبه حتی یدرکه بباب لد فیقتله، ثم یأتي عیسی ابن مریم قوم قد عصمهم الله منه)) واتە: (عیسی)ی کوڕی مەریەم ﷺ لە ئاسمان دادەبەزێت بۆ لای منارە سپییەکەی رۆژهەڵاتی (دیمەشق) لە دوو پۆشاکی ڕەنگ کراودا بە وەرسی زەعفەران، دوو لەپە دەستەکانی لەسەر باڵی دوو فریشتە داناوە کە سەر بەرز کات و نەوی بکات، دڵۆپە

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٩٣٧) .

ئاوی سافی لە شێوەی دەنکە زیوی شێوە مرواری لێ دەتکێت، هەر بێباوەڕێك بۆنی هەناسەکەی بکات یەکسەر دەمرێت، بۆنی هەناسەکشی ئەوەندەی چاوی بڕ دەکات دەڕوات، شوێنی دەججال دەکەوێت و تا لە (باب لد) پێی دەگات و دەیکوژێت، پاشان عیسا ی کوڕی مەریەمﷺ دێتە لای کۆمەڵە خەڵکێك کە خوای گەورە لە فیتنەی دەججال پاراستبوونی)).

واتە: لە فیتنەی مەسیحی دەججال، الله أكبر! ! کۆمەڵە خەڵکێك خوای گەورە لە فیتنەی مەسیحی دەججال رزگاری کردوون، توشی فیتنەکەی ئەو نەبوونە، پێشوازی لە عیسا پێغەمبەرﷺ دەکەن ئەویش بەدەستەکانی روومەتیان دەسڕێ و باسی پلە وپایەی خۆیانی بۆ دەکات لە بەهەشتدا، ئایە لە گەڵ مندا بە جوانی ئەو دیمەنەت دێتە پێش چاو؟ چەند فەرموودەیەکی ناسك و جوانە؟! ((فيمسح عن وجوههم ويحدثهم بدرجاتهم في الجنة، فبينما هو كذلك إذ أوحى الله الى عيسى: إني قد أخرجت عباداً لي لا يدان لأحد بقتالهم، فحرز عبادي الى الطور)) واتە: عیساﷺ دەست دەهێنێت بە دەم و چاویاندا و پلەو دەرەجەی خۆیان پێ دەڵێت کە لە بەهەشتدا دەستیان دەکەوێت، لەو کاتەدا خوای گەورە وەحی دەنێرێ بۆ عیساﷺ پێی دەفەرموێت: من بەندە گەلێکی خۆمم (کە یەئجوج ومەئجوج)ە دەرخستون، کە کەس توانای جەنگ کردنی نییە بەرامبەر ئەوان، لە بەرئەوە بەندە موسڵمانەکانم بدە پاڵ کێوی (طور) و لەوێ بیان شارەوەو پەنایان بدە.)).

واتە: لە گەڵ ئیماندارە یەکتاپەرستەکاندا بەرەو کێوی (الطور) بڕۆن، بۆ سەر ئەو جێگە پیرۆز و بەرێزە، هەروەکو ئاشکرایە کە چیای (الطور) لە (سیناء) ە، داوا لە خوا دەکەم وڵاتی موسڵمانان بپارێزێ لە هەموو خراپەیەك، خوای گەورە هەواڵی پێ دەدات کە کۆمەڵە بەندەیەکی خۆی دەرکەوتوون و هیچ کەسێك لە سەر زەویدا ناتوانێت لە گەڵیاندا بجەنگێت، بۆیە خوای گەورە فەرمان دەکاتە عیساﷺ بەندە ئیماندار و یەکتاپەرستەکان بەرەو کێوی (الطور) ببات، واتە سەر زەوی چۆڵ بکەن بۆ ئەو لەشکرە بە هێزە و زۆرە کە دەرکەوتوون.

ئەوانە کێن؟ ئەوانە (یەئجوج و مەئجوج) ن.

ئایا (یەئجوج و مەئجوج) کێن؟ ئەمەشە نیشانەیەکی ترە لە نیشانە گەورەکانی قیامەت، هەروەکو لە (صحیح مسلم)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (حذیفة ی کوڕی أسید)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ بە هاوەڵان فەرموو: ((إنها لن تقوم حتى ترون قبلها عشر آيات)) فذكر ((الدخان، والدجال، والدابة، وطلوع الشمس من مغربها، ونزول عيسى ابن مريم(ﷺ) ويأجوج ومأجوج.....)) واتە: قیامەت هەڵناسێت تا لە پێشدا دە نیشانە نەبینن ئەمجار باسی کرد و فەرمووی: (دوکەڵەکە) و (دەججال) و (زیندەوەرێکی سەیر (دابة)) و (هەڵهاتنی رۆژ لە رۆژئاواوە) و (دابەزینی عیسا ی کوڕی مەریەم(ﷺ)) و (یەئجوج و مەئجوج)......)) .

زۆربەی خەڵکی دەربارەی یەئجوج و مەئجوج هیچ نازانن، لە گەڵ ئەوەشدا خوای گەورە باسی ئەوانی لە قورئانی پیرۆزدا کردوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴾ (الأنبياء: ٩٦) واتە: دونیاش بەردەوام دەبێت تا ئەو کاتەی دەرگا لە تیرەی (یەئجوج و مەئجوج) ئەکرێتەوە و بڵاو ئەبنەوە، کە ئەوەش نیشانەی نزیکبوونەوەی کۆتای دونیایە، ئەوانیش لە هەموو بەرزایی و کون و کەلێنێکەوە بە پرتاو دادەپەڕن و دەردەچن، واتە: یەئجوج و مەئجوج لە هەموو دەرگا و رێگایەکەوە دێنە دەرەوە بۆ فەساد و گێرە شێوێنی.))

جا باسی ئەوانە (واتە: یەئجوج و مەئجوج) لە قورئانی پیرۆزدا بە روونی هاتوە بەڵام ئەم ئوممەتە سەرقاڵی شتی ترن و وازیان لە زانیاری دەربارەی دینەکەیان هێناوە ئیللا کەسانێك نەبێت خوا رەحمی پێ کردوون، داوا لە خوا دەکەم بە گوێڕایەڵی خۆیەوە سەرقاڵمان بکات هەر خۆی پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴾واتە: لە هەموو جێگایەکەوە دادەبەزن و لە سەر زەویدا بڵاو دەبنەوە، خوای گەورە لە پاش ئەوە

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٩٠١)

دەڵێت: ﴿وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ﴾ باش بیر لەم تێهەڵکێشەی ئایەتەکان بکەرەوە، دەرچوون و دەرکەوتنی یەئجوج و مەئجوج هاوڕێ و هاوەڵە لە گەڵ نزیک بوونەوەی بەڵێنە راست و دروستەکە واتە: هەستانی قیامەت.﴿وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَٰخِصَةٌ أَبۡصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَٰوَيۡلَنَا قَدۡ كُنَّا فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا بَلۡ كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾ (الأنبياء: ٩٧) واتە: ئەوسا ئیتر بەڵێنە راست و دروستەکەش" بۆ هاتنی قیامەت " نزیک دەبێتەوە، واتە: هەر یەئجوج و مەئجوج لەو جێگای خۆیانە هاتنە دەرێ، ئەوە ئیتر قیامەتیش نزیکە، ئەوسا ئیتر چاوی ئەو کەسانەی خوانەناس و بێ بڕوان ئەبڵەق ئەبێ و لە جێی خۆی ناجووڵێ، واتە: لە بەر نارەحەتی ئەو رۆژە چاویان بۆ ناتروکێ، هاواریان لێ بەرز ئەبێتەوە و ئەڵێن: ئەی تیاچوو خۆمان! بە راستی ئێمە لە غەفڵەت و بێ ئاگاییدا بووین لەم رۆژە نەك هەر غافڵ بووین، بەڵکو ستەمکاریش بووین لە خۆمان)) .

بەڵێ... چونکە ئەوانە بەرنگاری حەق بوونەوە و بەرنگاری قسەی پێغەمبەری راستگۆﷺ بوونەوە هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ مُّعۡرِضُونَ ١ مَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٖ مِّن رَّبِّهِم مُّحۡدَثٍ إِلَّا ٱسۡتَمَعُوهُ وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ ٢ لَاهِيَةٗ قُلُوبُهُمۡۗ﴾(الأنبیاء) واتە: کاتی حیساب و لێپرسینەوەی خەڵکی لە کار و کردەوەیان نزیک بۆتەوە و ئەوانیش لە غەفڵەتان لەو رۆژە، روو دەسوورێنن و گوێیان لێ نییە و لەوە داناچڵەکێن کە خوا پێیان ئەکات!(١) هەر بەش و پەندێکی تازەی قورئانیان لە لایەن پەروەردگاریانەوە بۆ بێت، گوێی بۆ رائەگرن، هەتا بزانن چییە؟ کەچی لە گەڵ ئەوەشدا گورج دەکەونە گاڵتە و گەپ پێی.(٢) دڵیان غافڵ و بێ ئاگایە، تا بیرێکی لێ بکەنەوە و بە خۆیاندا بچنەوە، بەڵێ دڵە مردووەکان لە کاتی پێویستدا ئاگایان لە خۆ نییە و هەر سەرگەرمن بە گاڵتەو گەمەوە...(٣))).

بە راستی زۆربەی خەڵکی پشتیان کردوە لە باس و زانیاری دەربارەی ئەو شتانەی کە دێن، زۆربەی خەڵکی لەم ئوممەتەدا هیچ شتێك دەربارەی یەئجوج و

مەئجوج و دەججال و زیندەوەرە سەیرەکە (الدابة) و دوکەڵەکە و دەرکەوتنی رۆژ لە رۆژئـاواوە نـازانن، چـونکە ئێمـە زۆر دوور کەوتوینەتـەوە لـە بەرنامەکـەی خـوای پەروەردگار و سوننەتی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی ﷺ تەنانەت هەنـدێ لـە بـرا و خوشکانم بۆم دەگێڕنەوە و دەڵێن ئەمە یەکەم جارە شتی وا ببیسین، ولا حـول ولا قوة الا بالله.

یەئجوج و مەئجوج کێن؟ ئایا هەواڵ و چیرۆکی ئەوان چییە؟ وریابـە و دڵـت بـدە قسەکانم چونکە ئەم بابەتە لەوپەڕی ترسناکیدایە!!

یەئجوج و مەئجوج دوو ئوممەتن لە ئوممەتەکانی سـەر زەوی، ئـەوانیش مـرۆڤن، ئەو دوو ناوە ئەعجەمین، هەروەکو چۆن لێکۆڵەرەوان لـە ئـەهلی زمـان و زمانـەوانی دەڵێن[1]. لە وشەی (أجیج النار) ەوە هـاتوە واتـە: بڵێسـەی ئـاگر، یـان لـە وشـەی (الماء الأجاج)ەوە هـاتوە واتـە: ئـاوێکی زۆر سـوێر و زۆر گـەرم بێـت، کەواتـە ئـەو وشەیە لە بڵێسەی ئـاگر و گـەرمی و سـوێری یـەوە هـاتوە لـە بـەر ئـەوەی ئـەو دوو ئوممەتە زۆر پیس و چەپەڵن و حەزیان لە تێکدان و خراپەکاری و سوتاندن و وێـران کردنی سەر رووی زەوییە، ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ کتێبـەکانی تەفـسیر و مێـژوو ئـەوا ریوایاتی زۆر سـەیر و هـەواڵی نـامۆ دەخوێنیتـەوە، چـەندەها ریوایـەتی ئیسرائیلی دەبیسی کە کتێبەکانی پڕ کردوە دەربارەی هەواڵی یەئجوج و مەئجوج، مـن لێـرەدا دەڵـێم: ئـەو کەسـەی کـە رێـز لـە عـەقڵ و زانیارییەکـەی خـۆی بگرێـت و رێـز لـە لێکۆڵینەوە و بەڵگەکان بگرێت، ئەوا نابێت هەرگیز خۆی بە ئەو قسە هیچ و پووچ و چیرۆکە ئەفسانـاوییانەوە خەریك بکات، بەڵکو پێویستە لە سەرمان لـە کـاتی باسـی ئەو باسـە غـەیب و نادیارانـەدا تـەنها یـەك وشـەش قـسە نەکـەین ئـیللا بـە بەڵگـەی کتێبەکـەی خـوای پـەروەردگار یـان بـە بەڵگەیـەکی راسـت و دروسـتی پێغەمبـەری ئەکرەم ﷺ، چونکە تۆ باسی بابەتە غەیب و نادیارەکان دەکەیت کـە هـیچ جێگـای عەقڵی تیدا نابێتەوە، هیچ جێگای خەیاڵ و ئەفـسانەی تێـدا نابێتـەوە، چـونکە مـن هەر کاتێك هەندێ لەو کتێبە تەفسیر و مێژووانە دەخوێنمەوە بە راستی هەواڵی وای

---

١ ــ انظر : (النهاية) لابن الأثير (١/٢٥) مادة : أجج , ط التوعية , ولسان العرب (١/٣٠ أجج) .

تێدا دەبینم کە لە بەر شەرمەزاری ئارەقە بە ناوچاوان دەکات، بۆیە بە هیچ شێوەیەك نابێت کەسێکی زانا ڕێز لە بەڵگەکان دەگرێت شوێنی ئەو ئەفسانانە بکەوێت، بۆیە پێویستە لە سەرمان لە کاتی قسەکردنماندا بەڵگەی قورئان و سوننەت بهێنینەوە.

بۆیە ئێمە لەم باسەدا تەنها باسی ئەو بەڵگانە دەکەین کە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودە دروستەکانی پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ هاتوون، دەڵێم:

یەئجوج و مەئجوج نێردراو و ئەهلی ئاگرن، هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] هاتوە لە فەرموودەی (أبو سعید الخدری) کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((یقول اللـه تعالی: یا آدم، فیقول: لبیك وسعدیك والخیر في یدیك، فیقول: أخْرِج بعث النار، فیقول آدم (علیه السلام): وما بعث النار؟ قال: من كل ألف تسعمائة وتسعة وتسعین، قال النبي: فذاك یشیب الصغیر ﴿وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ﴾(الحج: ٢) قال فأشتد علیهم، قالوا: یا رسول الله! أینا ذلك الرجل؟ قال: أبشروا! فإن من یأجوج ومأجوج ألفاً ومنكم رجل))

واتە:خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی ئادەم، دەڵێت: گوێڕایەڵم و لە خزمەتتام چاکەیش لە دەستی تۆدایە، دەفەرموێت: وەفدی ئاگر بنێرە، وتی: وەفدی ئاگر چەندە؟ فەرمووی: لە هەموو هەزارێك نۆ سەد ونەوەت و نۆ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەش لە کاتێکدا منداڵ سەر سپی دەبێت، ﴿وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ﴾(الحج: ٢) واتە: هەرچی مێینەی دوو گیان و سکپڕیشە لە ترس و لە هەیبەتا سکەکەی دادەنێ و لە باری دەچێت و هەموو خەڵکیش وەك مەست و سەرخۆش دەبینی، خۆ لە ڕاستیدا مەست و سەرخۆش نین، بەڵکو سزای خوا زۆر توند و سەختە بۆیە ئاوا بیر و هۆشیان نەماوەو وەك سەرخۆشیان لێ هاتوە)) دەڵێت: ئەوە زۆر نارەحتی کردن، ئینجا

---

١ ـ أخرجه البخاري (٦٥٣٠) و مسلم (٢٢٢) .

فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەو پیاوە کاممانە؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: مژدەتان لێبێت، لە یەئجوج و مەئجوج هەزارێك و لە ئێوە پیاوێك))

ئەی خودایە سوپاس و ستایش بۆ تۆ کە سەربەرزت کردووین بە یەکتاپەرستی و ئیمەت کردوەتە شوێنکەوتەی رزگارکەری کۆیلە و بەندەکان ﷺ، ئیمەت کردوەتە باشترین کۆمەڵ کە خەڵکی پێی ئاشنای بوون، چەند جوانە ڕێز و کەرامەتی یەکتاپەرستی! چەند جوانە فەزڵ و گەورەیی یەکتاپەرستی!! بەڵکو کەرامەت و پلە و ڕێزی ئوممەتەکەی (محمدالمصطفى)ﷺ! بە راستی ئەمانە گوفتارێکن دەبێت ئەو پەڕی بایەخی پێ بدرێت، بۆیە هەر ئێستا سەرت بۆ بڵندترین جێگە بەرزەوە بکەرەوە لە سەردەمێکدا کە زۆربەی موسڵمانان شکستیان هێناوە، شکستێکی دەروونی نەویستراو، لە کات و ساتێکدا هەموو ئوممەتەکانی سەر زەوی شانازی دەکەن بە مێژوو و پاڵەوانێتی و پیاوی ناودار و چالاکییەکانی خۆیانەوە.

من دەڵێم: ڕەواترین ئوممەت لە ئوممەتەکانی سەر رووی زەوی کە مافی خۆی بێت شانازی بە خۆیەوە بکات و لە پێشەوەی ئوممەتەکانی ترەوە بن ئەوا شوێنکەوتوان و ئوممەتی خۆشەویستی هەڵبژێردراوەﷺ، ئەو ئوممەتەی کە خوای پەروەردگار خۆی شایەتی بۆ داوە و فەرموویەتی: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ (آل عمران: ١١٠) واتە: ئێوە چاکترین ئوممەت و کۆمەڵن، هێنراونەتە ئەم سەر زەوییە بۆ کەڵك گەیاندن بە مەردم و ڕێنمایی کردنیان....))

دڵنیابن و باوەڕی بتەوتان هەبێت ئەم ئوممەتە بە باشترین و چاکترین ئوممەت دەمێنێتەوە تاکو ڕۆژی دوایی.

لەگەڵ مندا بگەڕێوە بۆ لای فەرموودەکە، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((أبشروا! فإن من يأجوج ومأجوج ألفاً ومنكم رجل)) واتە:مژدە بۆ ئێوە! نۆ سەدو نەوەت و نۆ لە یەئجوج و مەئجوج بۆ دۆزەخ ــ خوا پەنامان بدات ــ و تەنها کەسێك لە ئێوە)) ئەمجار خۆشەویستﷺ فەرمووی: ((والذي نفسي بيده إني لأطمع أن تكونوا ربع أهل الجنة)) واتە: سوێند بە ئەو کەسەی گیانی من بە دەستە ئومێدەوارم ئێوە چواریەکی ئەهلی بەهەشت بن)) لێرەدا پێویستە کەمێك ڕاوەستین

چونکە شەست و نۆ ئوممەت پێش ئوممەتی موحەممەد ﷺکەوتوون، چاکترین و باشترینیان ئوممەتی موحەممەدە ﷺ.

ئیمامی ئەحمەد لە (مسند)ەکەیدا و (الترمذي) و (ابن ماجە) لە (سنن)ەکەیاندا و (عبد بن حميد) لە (المنتخب)دا بە سەنەدێکی (حسن)[١] ریوایەتیان کردوە لە فەرموودەی (بهز ی کوڕی حكيم)ەوە لە باوکییەوە ئەویش لە باپیرییەوە کەوا پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ فەرموویەتی: ((أنتم توفون سبعين أمة أنتم خيرها و أكرمها على الله تبارك و تعالى)) واتە: ئێوە تەواوی حەفتا ئوممەتن کە لە هەموویان باشتر و بەڕێزترن لە لای خوای گەورە)

خودایە... زۆر سوپاسی نیعمەتەکانی تۆ دەکەین..

وممـا زادنـي فخـراً وتيهـا  وكدت بأخمصي أطأ الثريا

دخولي تحت قولك يا عبادي  ن صـيرت أحمـد لـي نبيـا

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾(الحجرات: ١٧) واتە: ئەوانە بە ئیسلام بوونیان منەت دەکەن بە سەر تۆدا، تۆش پێیان بڵێ: منەت مەکەن بە سەرمدا لە سەر موسڵمان بوونتان، بەڵکو خوا منەت دەکات بە سەرتاندا کە ئێوەی ڕێنمایی کردوە بۆ ئیمان و بڕوا ئەگەر ئێوە لە داوای بڕوا هێناندا ڕاستگۆ بن.))

ئەی بڕای یەکتاپەرست... ئەی ئەو کەسەی شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوایت ﷺ.. سەرت بەرز بکەرەوە و زیاتر بڵندی بکەرەوە بۆ ئەوەی لە گەڵ ئەستێرەی جەوزادا ململانێ بکەیت.. هەستە هەموو سەر ڕووی زەوی بهێنە ژێر عابا پیرۆزەکەی خۆشەویستی خوا ﷺ، با هەموو جیهان گوێبیستی لێدانی دڵت بێت کاتێك بە یادی خواوە لێ دەدا و ئەو دڵەی کە تەنها خوای گەورەی ناسیوە، ئەوە

---

١ ـ أخرجه أحمد (٤/٤٤٧) (٥/٣) وعبد بن حميد (٤٠٩ , ٤١١) والترمذي (٣٠٠١) وقال (حديث حسن) وابن ماجه (٤٢٨٧) (٤٢٨٨) والدارمي (٢٧٦٠) وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح سنن الترمذي وابن ماجه) .

چـاك بزانـە کـە تـۆ پیرۆزتـرین مرۆڤـی لـە سـەر رووی زەویـدا بـە هـۆی یەکتاپەرستییەکەتەوە بۆ خـوای زەوی و ئاسمانـەکان، بـە هـۆی باوەڕهێنانـت بـە باشترین مرۆڤی سەر زەوی کە ئەویش (محمدی کوڕی عبدالله) یـە ﷺ... ئـای ئـەوە چ ڕێزێکە ! ئای ئەوە چ شەرەفێکە ! داوا لە خوا دەکەم ئێمە و ئێوە بگەیەنێتە ئـەو پلەو پایەیەی کـە فـەخر و شانازی بـە خۆدانـەپاڵ (محمدی کـوڕی عبـداللهﷺ) وە دەکات.

پێغەمبـەری خـواﷺ دەفەرموێـت: ((وإني لأطمع أن تكونوا ربع أهل الجنـة)) فحمدنا الله وكبرنا، فقال: ((والذي نفسي بيده إني لأطمع أن تكونوا ثلث أهل الجنة)) فحمدنا الله و كبرنا. فقال المصطفى في الثالثة: ((والذي نفسي بيده إنـي لأطمـع أن تكونـوا شـطر أهـل الجنـة، إن مـثلكم في الأمـم كمثـل الـشعرة البيـضاء في جلـد الثـور الأسود أو كالرقمة في ذراع الحمـار)). واتـە: مـن خوازیـارم ئێـوە چـواریەکی خـەڵکی بەهەشت بن، ئێمەش سوپاس گوزاری خوا بووین و (الله أكبر) مان کرد، پێغەمبـەری خواﷺ فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە من خوازیـارم سـێیەکی ئەهلی بەهەشت بـن، ئێمـەش سـوپاس گـوزاری خـوا بـووین و (الله أكبر)مـان کـرد، پێغەمبەری خواﷺ لە جاری سێیەمدا فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی مـنی بـە دەستە من خوازیارم نیوەی ئەهلی بەهەشت بن، نمونەی ئێوە لە ناو خەڵکیدا وەکو موویەکی سپی وان لە پێستی گایەکی رەشدا یـان وەکـو هێڵێکـی سـپی لـە دەسـتی گوێدرێژا)).

دەڵـێم: پێغەمبـەری خۆشەویـستﷺ ئـەوەی روون کـردەوە کـەوا ئوممەتەکـەی نیوەی ئەهلی بەهەشتن، لە کاتێکدا ئەم ئوممەتە حەفتاهەمین ئوممەتە، بۆ ئـەوەی پلە و پایەی ئوممەتەکەی موحەممەدت ﷺ بۆ دەرکەوێت کە چەند بەرز و بەرێزە ! لە (صحيح مسلم)[1] دا هـاتوە لـە فـەرموودەی (عبـدالله ی کـوڕی عمـرو) ەوە کـەوا پێغەمبەری خواﷺ رۆژێك ئـەو ئایەتـەی خـوای گـەورەی خوێنـدەوە لـە سـەر زاری ئیـــبراهیمعليه السلام: ﴿رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِۖ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّيۖ وَمَنْ عَصَانِي

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٠٢) .

فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾(إبراهيم: ٣٦) واتە: ئەی پەروەردگارم! بە راستی ئەو بتانە خەڵکێکی زۆریان سەرلێشێواو و گومڕا کردوە، هەرکەسێك پەیڕەوی لە من کرد و شوێنی ئاینەکەی من کەوت، بێ گومان ئەوە لە شوێنکەوتوانی منە، هەر کەسێکیش سەرپێچی و نافەرمانی کرد، دیارە تۆ بۆ خۆت چاك دەزانی چی ئەکەیت، چونکە بە راستی تۆ زۆر لێبووردەیت، زۆریش میهرەبانی بەرامبەر بە بەندەکانت.))

هەروەها ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە لەسەر زاری عیسا هاتوە: ﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ (المائدة: ١١٨) واتە: خودایە! ئەگەر تۆ سزایان بدەیت بێ گومانە کە بەندەی خۆتن و کەسیش بۆی نییە هیچ بڵێت، ئەگەر لێشیان ببووریت، ئەوە خۆت چاك دەزانی و بۆ خۆشت دەسەڵاتدار و کارجوانی.)) فرفع يديه، وقال:

((اللهم أمتي أمتي)) وبكى، فقال الله ـ عز وجل ـ : يا جبريل، اذهب إلى محمد، وربك أعلم، فسله ما يبكيك؟ فأتاه جبريل ـ عليه الصلاة والسلام ـ فسأله؟ فأخبره رسول الله ﷺ بما قال، وهو أعلم، فقال الله: يا جبريل، أذهب إلى محمدفقل: إنا سنرضيك في أمتك ولا نسوءك)).

واتە: بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستی بەرز کردەوە و فەرمووی:

((پەروەردگارا.. ئوممەتەکەم ئوممەتەکەم)) ئەمجار دەستی بە گریان کرد، خوای گەورە فەرمووی: ئەی جبریل بڕۆ بۆ لای موحەممەد ﷺ ـ لە کاتێکدا خوا خۆی باشتر دەزانێت ـ پرسیاری لێ بکە بزانە بۆ دەگری؟ جبریل هات بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ و پرسیاری لێ کرد؟ پێغەمبەری خوا ﷺ هۆی گریانەکەی پێ راگەیاند، لە کاتێکدا خوای گەورە خۆی باشتر دەزانێت، خوای گەورە فەرمووی: ئەی جبریل برۆ بۆ لای موحەممەد و بڵێ: ئێمە بەرامبەر ئەممەتەکەت رازیت دەکەین و دڵت ناشکێنین)).

بە ڕاستی ئەم ئوممەتە بەرێزترین ئوممەتە و باشترین ئوممەتە و پیرۆزترین ئوممەتە، ڕەنگە ئێستا کەسێك پرسیار بکات و بڵێت:

ئایە تا ئێستا بەو پیرۆزی و باشییە ماوەتەوە؟ بەڵێ..

تەنانەت لەم قۆناغە بێهێزییەی کە ئێستا ئەم ئوممەتەی پێدا تێدەپەڕێت؟ بەڵێ..

من لەوپەڕی بە ئاگابووندام و باش لە واقیعی ئێستا دەزانم بە فەزڵی خوا، ئەگەر دەتەوێت بە جوانی ڕێز و پیرۆزی ئەم ئوممەتە ببینیت ئەوا تەماشای هەموو ئوممەتەکانی سەر ڕووی زەوی بکە بۆ ئەوەی بە دڵنیاییەوە بزانیت کەوا هیچ ئوممەتێك نییە لە سەر ڕووی زەویدا خوای پەروەردگار بە تاك و تەنهایی بناسن و بیپەرستن تەنها ئوممەتی پێغەمبەری نازدار ﷺ نەبێت.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا لَّا يَسْتَوُونَ﴾(السجدة:١٨) واتە: ئایا ئەو کەسەی بڕوای هێناوە وەك ئەو کەسە وایە کە لە ئیمان دەرچوە! بێ گومان هەرگیز ئەو دوانە چوون یەك نین))

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ﴾ (ص:٢٨) واتە: ئایا دەکرێت ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کارە چاکەکانیان کردوە، وەکو بەدکاران و ئاژاوەگێڕان لە زەویدا دابنێین و وەك یەك حسێبیان بۆ بکەین؟ یاخود دەبێ خەڵکانی پارێزکار لە گوناهـ و تاوان وەکو خەڵکانی خراپکار دابنێین؟)) .

با پێکەوە بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای باسەکە: دەڵێم: بۆ ئەوەی بەجوانی سروشتی خراپەکاری ئەو دوو ئوممەتە بناسیت واتە (یەئجوج و مەئجوج)، تکام وایە لە گەڵ مندا بە پەلە ئەو گفتوگۆ قورئانییە جارێکی تر بهێنیتەوە یادی خۆت لە نێوان ئەو پادشا دادپەروەر و باوەڕدار و یەکتاپەرستەدا کە (زولقەرنەین)ە و ئەو ئوممەتە بێهێز و لاوازەی کە بە دەستی (یەئجوج و مەئجوج)ەوە دەیانناڵاند، بە باشی بیر لەو ئایەتەی خوای پەروەردگار بکەرەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ ۖ قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾﴾(الكهف)) واتە: لە بارەی (زولقەرنەین) یشەوە

پرسیارت لێ دەکەن، پێیان بڵێ: ئەی موحەممەد ﷺ وا هەندێ لە بەسەر هاتی ئەویشتان بۆ باس ئەکەم.(٨٣) بە ڕاستی ئێمە هێز و دەسەڵاتمان لە زەویدا پێدا، لە هەموو شتێك کە پێویست بوو هۆکار و ئامرازەکەیمان بۆ ڕەخساند.(٨٤) ئەوسا ئەویش هۆیەکانی بە کار هێناو بە دوای مەبەستیدا چوو تا گەیشتە مەبەستی خۆی (٨٥))).

هیچ پێویستمان بەوە نییە بکەوینە دوای ئەو خەیاڵات و ئیسرائیلیانەی دەربارەی (زولقەرنەین) باس کراون لە هەندێ لە کتێبەکانی تەفسیر و مێژوودا، ئەوەی کە قورئان باسی کردوە پڕ پێستی خۆیەتی و پێویستمان بە شتی تر نییە، دڵنیابە ئەگەر خوای گەورە بیزانیبایە هەر شتێکی زیاتر لەوەی کە لە قورئاندا هەیە سوودی بۆ ئیمانداران دەبێت ئەوا باسی دەکرد، بۆیە ئێمەش تەنها باسی ئەوە دەکەین لە قورئاندا هاتوە و ئەوەی لە فەرموودە دروستەکانی پێغەمبەری نازدارﷺدا هاتوە، ئەمەش جێی متمانەی دڵەکانە و پێویستییەکانی لێکۆڵینەوەن لە هەمان کاتدا.

ئایە (زولقەرنەین) کێیە؟

ئەو کابرایەکی پادشای دادپەروەر بوە، (زولقەرنەین) ئەو کەسە نییە هەندێ لە تەفسیرەکان باسیان کردوە گوایە ئەسکەندەری مەقدۆنییە، هەرچەندە بە ئەسکەندەری مەقدونی دەگوترا (زولقەرنەین)، بەڵام لە گەڵ ئەو (زولقەرنەین)ەدا جیاوازە باسی لە قورئانی پیرۆزدا هاتوە، چونکە ئەسکەندەری مەقدونی کابرایەکی میسری بێباوەڕ بوە، بەڵام ئەو (زولقەرنەین)ەی چیرۆکەکەی لە قورئاندا هاتوە پادشایەکی باوەڕداری یەکتاپەرستی دادپەروەر بوە.

الحافظ ابن کثیر دەفەرموێت[١]: ((ئەو (زولقەرنەین)ەی بە ئەسکەندەری مەقدونی میسری ناسراوە لە پاش ئەو (زولقەرنەین)ە بوە کە ناوی لە قورئاندا هاتوە بە ماوەیەکی زۆر، ئەو لە پێش مەسیح بوە بە نزیکەی سێ سەد ساڵ)).

---

١ ـ البداية والنهاية (٢/٩٧) و التفسير ١– الكهف آية (٨٣) .

بۆیە تەنها باسی ئەوە دەکەین کە لە قورئان و فەرموودەدا هاتوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَيَسْأَلُونَكَ)) واتە: بێباوەڕان پرسیار لە پێغەمبەرﷺ دەکەن ((عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ قُلْ ..)) ئەو وشەی (قل)ەی کە هاتوە پێی دەڵێن (التلقينية) واتە کەسێك باسی شتێك بۆ کەسێکی تر بکات ئەوەش ئەوە دوویات دەکاتەوە ئەو چیرۆکە لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ نییە بەڵکو ئەوە وەحییە و لەلایەن خوداوەندی گەورەوە هاتوە، پێغەمبەرمان ﷺ تەنها ئەو سرووشەی گواستوەتەوە بۆ ئوممەتەکەی، بەڵکو بۆ هەموو مرۆڤایەتی لە لایەن خوای گەورەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا﴾ وشەی (مِنْ) لێرەدا هاتوە پێی دەڵێن (التبعيضية) واتە: پێغەمبەری خواﷺ هەموو باس و وردەکارییەکانی دەربارەی(زولقەرنەین)باس نەکردوە، مەبەستەکە لەوەدا نییە کەوا ئێمە ناو و شێوەی بزانین، ئەمە بە هیچ شێوەیەك مەبەستی قورئان نییە بەڵکو مەبەست ئەوەیە ئێمە دەرس و عیبرەت و ئامۆژگاری لێ وەرگرین، لەو گفتوگۆ ناسکەدا و لەو چیرۆکە ڕاستەقینانەدا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾﴾(الكهف).

لێرەدا لە گەڵ ئەو وتەیەی خوای گەورەدا ڕادەوەستین: ((إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الْأَرْضِ)) گومانی تێدا نییە کە هێز و دەسەڵات و فەرمانڕەوایی تەنها بە دەستی خوای گەورەیە، هیچ فەرمانڕەوایەك دانانرێت و هیچ فەرمانڕەوایەك لانادرێت و هیچ وڵاتێك بە دەستەڵات نابێت و هیچ وڵاتێك لە ناو ناچێت ئیللا بە فەرمانی خوای گەورەر و پادشای پادشاکان نەبێت و بە دەستی دادوەرترین دادوەران نەبێت، وا مەزانە کاتێك فەرمانڕەوایەك لە سەردەمێکدا دەردەکەوێت دوور لە قەدەری خوای گەورە پەیدا بوە، ڕەنگە فەرمانڕەوایەك دەسەڵات بگریتە دەست نەك لە بەر خودی خۆی یان توانای خۆی بەڵکو لە بەر قەدەرێك خوای گەورە خۆی دەیەوێت.

بە جوانی تەماشای ئەو بنەمایە بکە کە دەبێتە بنەمای ئیمان و دەبێت لە دڵەکاندا بچەسپێن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِى

ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ بِيَدِكَ ٱلْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (آل عمران: ٢٦) ((واتە: بڵێ: خوایە! ئەی خاوەن هێز و دەسەڵات! هەرکەسێك خۆت بتەوێ دەسەڵات و موڵکی پێ ئەدەی، هەرکەسیش خۆت بتەوێ دەسەڵات و حکومەتی لە دەستێنی " دەسەڵاتداری بێ سنوور و بێ مەودا هەر ئەتۆی " هەر کەسیش خۆت بتەوێ باڵادەست و ڕێزداری ئەکەی و هەر کەسیش خۆت بتەوێ زەلیل و سووکی ئەکەی، گشت خێر و چاکەیەك هەر بە دەستی خۆتە بە ڕاستی تۆ بە سەر هەموو شتێکدا بە توانا و دەسەڵاتداری.))

دەبێت ئەم بیروباوەرە لە دڵەکانماندا بچەسپێت، هیچ شتێك لەم گەردوونەدا روو نادات ئیللا بە تەقدیر و حیکمەتی خوای گەورە نەبێت، ئەگەر ئێمە ئەو حیکمەتانەمان لە دەست دەرچوو و درکمان پێیان نەکرد ئەوا لە دادوەرترینی داوەران بزر نابێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ـــ ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾﴾سورة القمر) واتە: بە راستی ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازەیەکی دیاریکراو درووست کردوە.)

خوای گەورە هێز و دەسەڵات دەبەخشێتە(زولقەرنەین): ﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا﴾(الکهف: ٨٤)خوای گەورەهەموو هۆکارەکانی سەرکەوتن و هێز و رزگارکردن و دەسەڵاتی دابوویە: ﴿فَأَتْبَعَ سَبَبًا﴾ واتە: ئەم پادشا دادپەروەر و یەکتاپەرستە هۆکارەکانی هێز و دەسەڵات و سەرکەوتنی بە کار هێنا، هەرگیز کەمتەرخەمی لە هۆکارەکان نەکرد و فەرامۆشی نەکردن، خوای گەورە هۆکارەکانی پێبەخشیبوو ئەویش پاراستنی و ڕێزی لێگرتن و بە کاری هێنا، لە دونیادا و لە واقیعی کار و کردەوەکاندا جێ بە جێی کرد، کردبوویە بەرنامەی ژیان، بۆیە بە دەست گرتنی بە هۆکارەکانەوە بوونە هۆی سەرکەوتن و دەسەڵاتی لە سەر زەویدا.

من لێرەدا ناتوانم لە گەڵ هەموو وشەیەکی چیرۆکەکەدا رابوەستم، چونکە ئەوە کاتێکی زۆری دەوێت، بەڵام ئەو چیرۆکە کورت دەکەمەوە و دەڵێم: قورئانی پیرۆز

باسی سێ گەشت لە گەشتەکانی (زولقەرنەین)مان بۆ دەکات:

گەشتی یەکەم: بەرەو ڕۆژئاوا ڕۆیشت، ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِى عَيْنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا ۗ قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا﴾ (الكهف:٨٦) واتە: خۆی و لەشکرەکەی کەوتنە ڕێ تا گەیشتنە ناوچەکانی خۆر ئاوا، وا هاتە بەرچاوی خۆر لە گۆم و کانیاوێکی ڕەش و لیتاودا ئاوا ئەبێت هەر لەوێیشدا گەلێکی دڵرەق و بتپەرست و خوانەناسی دی، وتمان: ئەی زولقەرنەین! دەتوانی سزایان بدەی، ئەگەر بەردەوام بن لە سەر کوفری خۆیان دەشتوانی ڕێگایەکی چاکیان بۆ هەڵبژێریت بانگیان کەیت بۆ لای ئایینی خوا و چاکەیان لە گەڵ بکەیت.))

گەشتی دووەم: بەرەو ڕۆژهەڵات ڕۆیشت، تاکو گەیشتە ڕۆژهەلات.﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا ﴾ (الكهف: ٩٠) واتە: تا گەیشتە ناوچەکانی خۆرهەڵات، دیتی خۆر لە پێش چاویدا بە سەر هۆزێکدا هەڵدێت کە هیچ پەناگا و داپۆشەرێکمان لەو نەداونەتێ، واتە: هیچ جل و بەرگ و فەرش و رایەخێکیان نەبوو، لە دەشتێکی کاکی بە کاکیدا دەژیان و نە دار و نەدرەخت و نە شاخ و کێوی تێدا نەبوو، تەنانەت بە کەڵکی بینا و باڵەخانە نەدەهات)).

گەشتی سێیەم: ئەو گەشتەیە کە پەیوەندی بە باسکەمانەوە هەیە ئەویش باسی (یەئجوج و مەئجوج) ە کە ئەویش لە باکوور بوو، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ ﴾ الكهف:٩٣) واتە:لە نێوان دوو چیای گەورە و مەزندا.

لێرەدا دەڵێم: هیچ کەسێك ناتوانێت بە تەواوی جێگای ئەو دوو چیایە دیاری بکات ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا﴾(الكهف:٩٣) واتە: تا گەیشتە نێوان دووکێوی گەورە، لە خوارووی دوو کێوەکەدا خەڵکانێکی دیت بێجگە لە دوو دەستەکەی تر لەوانە بوو لە هیچ قسەیەك

تێنەگەن، واتە: خەڵکێکی زماننەزان و کەودەن و دوور لە شارستانییەت بوون، چونکە لە ناوچەیەکی شاخاوی و دوور لە ئاوەدانیدا بوون، ئەو خەڵکە بە دەست دوژمنێکی سەرسەخت بە ناوی (یەئجوج و مەئجوج)ەوە گیرۆدە ببوون، بۆیە کاتێ دەسەڵاتەکەی زولقەرنەین یان دیت، خێرا پەنایان بۆ برد.))

لە نێوان ئەو دوو چیایەدا کۆمەڵە خەڵکێکی بینی لە زمانەکەی زولقەرنەین و هاوەڵانی تێنەدەگەیشتن، نەیاندەتوانی خۆیان لە فیتنە و زیانی یەئجوج و مەئجوج بپارێزن. بۆ؟ بە جوانی بیر لە قسەکانیان بکەرەوە کە بە زولقەرنەینیان گوت، بەو پادشا دادپەروەر و فریادرەسە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالُواْ يَٰذَا ٱلۡقَرۡنَيۡنِ إِنَّ يَأۡجُوجَ وَمَأۡجُوجَ مُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَهَلۡ نَجۡعَلُ لَكَ خَرۡجًا عَلَىٰٓ أَن تَجۡعَلَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَهُمۡ سَدّٗا﴾(الكهف: ٩٤) واتە: وتیان: ئەی زولقەرنەین! بە راستی یەئجوج ومەئجوج لەم وڵاتەدا بەدفەڕوو خراپەکارن،بەڵێ.. ئەمانە لە نەژاددا هەر ئادەمیزادن بەڵام سیمایان تێکەو لێکەیە، هی وایان هەیە کورتە باڵایە، هەیانە باڵابەرزە گەلێکی تاڵانکەرو دز و پیاوکوژن، هەرچییان بەر پەلکەوێ ئەیخۆن. ئاخۆ ئەگونجێ ئێمە باج و خەرجی و دیارییەکت بۆ کۆبکەینەوە، کە لە نێوان ئێمەو ئەواندا بەربەستێك دروست بکەیت، تا ئەوان نەتوانن شاڵاومان بۆ بێنن.)) واتە: پارەیەکت بۆ دیاری دەکەین بەئەندازەی ئەوەی خۆت دەتەوێت، چەندێك خۆت ویستت لە سەر بێت ﴿عَلَىٰٓ أَن تَجۡعَلَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَهُمۡ سَدّٗا﴾تاوەکو ئەو کۆمەڵە خراپەکار ستەممان لێ نەکەن، کاتێ ئەو کۆمەڵە بێدەستەڵات و بێهێزە پێشنیاری پارەیان بۆ زولقەرنەین کرد بۆ ئەوەی لە نێوان ئەوان و یەئجوج و مەئجوج ی خراپەکاردا بەربەستێك دروست بکات، زولقەرنەینی پادشای دادپەروەر وەڵامی ئەوانی دایەوەو فەرمووی: ﴿قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيۡرٞ﴾ (الكهف: ٩٥)) واتە: ئەوەی کە خوای گەورە پێ بەخشیوم لە هۆکارەکانی هێز و دەسەڵات لەوەی ئێوە چاکترە، هەروەها لەو پێشنیارەی ئێوە باشترە لە سەروەت و سامان، بەڵام زولقەرنەین کابرایەکی بلیمەت و پێشەوایەکی دانا بوو، ویستی کارێك بۆ ئەوانە بدۆزێتەوە و بیانکاتە هێزێکی خاوەن وزە و

بەرهـەم بۆیـە زولقەرنـەین بـەوانی گـوت: ﴿فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا﴾(الكهف: ٩٥) واتـە: بـەڵکو ئێـوە بـە هێـزی بـازووی خۆتـان یارمـەتیم بـدەن، ئەوسـا لـە نێـوان ئێـوە و یـەئجوج و مـەئجوج دا بەربەسـتێکی ئەسـتوور دروسـت دەکـەم.)) بـە زمـانی سـەردەم بـە ئـەوانی گـوت: پلانـی ئەنـدازیاری، ئەنـدازیاری بیناسازی و دروستکردن، ئەم پرۆژە گەورە و مەزنە من تەواوی دەکەم، مـن ئـەرکی ئەو کارە دەگرمە ئەستۆی خۆم، بەڵام هێز و بازووی ئێـوەم دەوێ ﴿فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ﴾ واتە: بـە هێـز و بـازووی خۆتـان و دەسـتی کـار یارمـەتیم بـدەن ﴿أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا﴾قۆناغی یەکەم لەو پرۆژە مەزن و گەورەیـە دەسـتی پـێ کـرد، چـی فـەرمووی؟ فەرمووی: ﴿ءَاتُونِي زُبَرَ الْحَدِيدِ﴾واتە: پارچە و وردەی ئاسن، داوای کرد لـەو کۆمەڵـە خەڵکە کە پارچە ئاسنی زۆری بۆ ئامادە بکەن، ئەوانیش کۆمەڵـە ئاسـنێکی زۆریـان بۆ ئامادە کرد، پاشان فەرمانی پێ کردن ئەو پارچە ئاسنانە بخەنە نێـوان ئـەو دوو بەربەسـتەوە، نێـوان ئـەو دوو چـیا مەزنـەوە ﴿حَتَّىٰ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ الصَّدَفَيْنِ قَالَ انفُخُوا﴾ واتە: ئاسنەکان لە گەڵ لوتکەی دوو چیاکەدا یەکسان بوون، یـان لـە گـەڵ لوتکـەی ئەو دوو بەربەستە، ئەمە قۆناغی یەکەم بوو.

قۆناغی دووەم: فەرمانی پێ کردن لە ژێر ئەو ئاسنەدا ئاگر هەڵکـەن، بـە جـوانی بیهێنە بیری خۆت و بەرچاوی خۆت قەبارەی ئەو ئاگرە گەورەیە لە ژێر ئـەو هـەموو تەنە ئاسنە تاکو لە نێوان ئەو دوو چیایەدا بتوێتەوە، ئاسنەکە توایەوە ! !

ئەمجار قۆناغی سێیەم دەستی پێکرد: لە قۆناغەکانی ئەو پرۆژە مەزنە، فەرمانی پێ کردن مسی تواوەی بۆ بهێنن، پاشان فەرمانی کردن مسە تواوەکە بکەنە سەر ئاسنەکەدا، ئەو مسە لە گەڵ ئاسنەکەدا تێکەڵ بوو، بوە بەربەستێکی توندی ئەستوور، ئەمە بەڵگەیە کەوا زولقەرنەین پێش ئەندازیاری سەردەم کەوتوە، پێش زانایانی و ئەندازیارانی ئەم سەردەمە کەوتوە لە بەکارهێنانی ئاسن لە گەڵ مسدا بە مەبەستی زیادبوونی هێز و توندی و قایمی، ئەو بەربەستەی لە نێو ئەو

خەڵکە لاوازە و یەئجوج و مەئجوجی خراپەکاردا دروست کرد ﴿ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلۡحَدِيدِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيۡنَ ٱلصَّدَفَيۡنِ قَالَ ٱنفُخُواْۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارٗا قَالَ ءَاتُونِيٓ أُفۡرِغۡ عَلَيۡهِ قِطۡرٗا﴾ (الكهف: ٩٦) واتە: مسی تواوە، بیر بکەرەوە پاش ئەوە چی ڕوودەدات؟ جارێکی تر یەئجوج و مەئجوج دەرکەوتن و ویستیان دیسان وەکو جارانی پێشوو دەرچن بۆ ئەوەی هێرش بەرنە سەر ئەو میللەتانەدا، بۆیە ئەو بەربەستەیان هاتە پێش کە بوەتە هۆی ئەوەی نەگەنە ئامانج و مەبەستیان!! بیر لەو ئایەتە بکەرەوە: ﴿فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ أَن يَظۡهَرُوهُ وَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقۡبٗا﴾ (الكهف: ٩٧) واتە: ئیتر گێرەشێوینە (مفسد) ـەکان نەیانتوانی سەرکەونە سەری لە بەر ئەستووری و بەرزی، نەشیانتوانی لە خوارەوە کونی کەن لە بەر قایمی و مەحکەمی.))

ئەو ئایەتە کە دەفەرموێت: ﴿فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ﴾ پیتی (تاء)ەکەی هەڵگیراوە و نەماوە، پاشان ئەو پیتی(تاء)ە لە وشەی دووەمدا بە دیار کەوتووە کە ئەویش: ﴿فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ﴾ تەماشای خۆشی و جوانی و ڕەوانبێژی قورئان بکە، تەماشای ئەو دڵخۆشیە بکە کاتێ کەسێك بە دیقەت و سەلیقەوە قورئان دەخوێنێتەوە، ئەو پیتی (تاء)ە لە وشەی یەکەمدا بۆ هەڵگیراوە و نەماوە؟ زانایانی زمانەوانی دەڵێن: ئەو (تاء)ە (تائی سووك)ی پێ دەڵێن (تاء الخفة)، ئەو (تاء)ە هەڵگیراوە لە بەر (التخفيف) واتە سووکی سەر زمان، لە بەر ئەوە لە گەڵ ئەو گفتوگۆ قورئانییەدا ڕێك بکەوێت، چونکە سەرکەوتن بە سەر ئەو بەربەستەدا پێویستی بە سووکی هەیە، تۆ وا هەست دەکەیت کاتێ ئەو وشەیە دەخوێنیتەوە، چاوەکانت یەئجوج و مەئجوج دەبینن و ئەوان خەریکن و دەیانەوێت لە بەربەستەکە بپەڕنەوە و بچنە ئەو دیوە بەڵام هەموو جارێك شکست دەهێنن، ﴿فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ أَن يَظۡهَرُوهُ وَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقۡبٗا﴾ (الكهف: ٩٧) بەڵام لە وشەی دووەمدا پیتی (تاء)ەکە دەرکەوتوە و پێی دەڵێن: (تاء الثقل) واتە تائی قورس یان (تاء التشديد)، چونکە کون کردن و شکاندنی بەربەستەکە پێویستی بە ئامێر و پێویستی بە پیاو و تێکۆشان و کات و

ئارامگرتن و ماندوو بوونە، لە وشەی دووەمدا پیتی (تاء)ەکە هاتوە و بە دیار کەوتوە، چونکە دەگونجێت لە گەڵ ئەو کونکردنەی کە پێویستی بە تێکۆشان و کاتە، لە وشەی یەکەمدا پیتی (تاء)ەکە نەماوە و هەڵگیراوە چونکە چوونە سەر بەربەستەکە و بازدان بە سەریدا پێویستی بە سووکی هەیە، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا لە هەردوو کاتەکەدا شکستیان دەهێنا، تاکو خوای گەورە خۆی ئیزنیان پێ دەدا و دەردەچن.

کاتێ زولقەرنەین ئەو بەربەستە بەهێزەی بینی کە یەئجوج و مەئجوج نەیانتوانی لێی بپەرنەوە و نەشیانتوانی کونی بکەن راستێتی ئەو باوەڕە بەرزەی سەلماند ﴿قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي ﴾، واتە: زولقەرنەین وتی: ئەم دەسەڵات و بەر بەستە ڕەحمەت و میهرەبانییەك بوو لە لایەن پەروەردگارمەوە پێی بەخشیوم، ئەگینا ئەو کارە لە توانای مندا نییە)).

تەماشای سەرکردەی بەهێز و بە توانا بکە کە هەموو وزەکانی بە شێوەیەکی جوان بە کاری هێناوە، ئەمەش ڕەوشت و ئاکاری سەرکردەی سەرکەوتوە، هەموو وزەکانی لە شوێنی خۆیدا تەرخان کردوە، ئای..ئەم ئوممەتە ئێستا چەند پێویستی بەو جۆرە تێگەیشتنەیە ! ! لە هەر کەسێکدا هەبێت سەرکردایەتی دەکات و لە هەر جێگایەکدا بێت، لە هەر بەرپرسیارییەتێك ببێت، وزەکان لەم ئوممەتەدا چەندە زۆرن! ئەو لاو و گەنجانە چەند مەزنن کە دەیانەوێت تێبکۆشن بە هەموو تواناکانیانەوە،بەڵام پرسیار دەکات: چۆن ئەو خزمەتە بکەم؟ ڕێگاکە لە کوێیە؟ لەم کاتەدا ئەم ئوممەتە چەند پێویستی بەو ڕەوشت و ئاکارەی سەرکردە سەرکەوتوە هەیە ! لە هەموو بوارێك لە بوارەکانی ژیان! لە هەموو جێگایەك لە جێگاکانی بەرپرسیارییەتی، ئەو سەرکردە سەرکەوتوە هەرگیز مەغرور و لەخۆبایی نەبوو، سەرکەوتن و دەسەڵاتەکەی لە خشتەی نەبرد بەڵکو گوتی:﴿قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي﴾بە پێچەوانەی ئەوەوە ئەگەر بە بیرتدا دێت کە قارون چی گوت؟ گوتی: ﴿إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِيٓ ﴾( القصص: ٧٨) واتە: قارون گوتی: ئەو ماڵ و

سامانە کە من هەمە، هەمووی بە هۆی زانیاری و زانستی خۆمەوە پێم دراوە، واتە هەر خۆم شایستەی ئەوەم)) بەلاّم ئەم پیاوە بیروباوەری یەکتاپەرستی ئاشکرا دەکات لە هەزاران ساڵەوە کەوا ئەو بەربەستە تەنها بە فەرمانی خوا دروست کراوە، دڵنیابن کەوا زەوی دەیکوتی بەسەریەکدا بۆ ئەوەی یەئجوج و مەئجوج دەرچن لە کاتێکدا کە خوای گەورە ویستی لە سەر بێت.

زولقەرنەین گوتی: ﴿فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ رَبِّي جَعَلَهُۥ دَكَّآءَۖ وَكَانَ وَعۡدُ رَبِّي حَقّٗا﴾ (الكهف: ٩٨) واتە: ئینجا هەرکاتێ بەڵێنی بەرەڵلاّبوونیان لە لایەن پەروەردگارمەوە بە جێ گەیشت کە کاتی نزیك بوونەوەی ڕۆژی قیامەتە ئەو بەربەستە وێران ئەکات و ئەیکوتێ بە سەریەکاو وردوخاشی دەکا، خۆ بێ گومانیشە بەڵێنی پەروەردگاری من ڕاست و دروستە و هەر وەدی دێ)) ئەمەشە هێزی باوەڕی ئەو کابرایە نیشان دەدات، بە دەرچوونی یەئجوج و مەئجوج وەکو نیشانەیەك لە نیشانەکانی ڕۆژی قیامەت، هەروەها وەکو ڕوداوێك لە ڕوداوەکانی قیامەت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ﴾(الأنبياء: ٩٦) واتە: دونیاش بەردەوام دەبێت تا ئەو کاتەی دەرگا ــ بەربەستەکەی (زولقەرنەین) ــ لە تیرەی (یەئجوج و مەئجوج) ئەکرێتەوە و بلاّو ئەبنەوە، کە ئەوەش نیشانەی نزیکبوونەوەی کۆتای دونیایە، ئەوانیش لە هەموو بەرزایی و کون و کەلێنێکەوە بە پرتاو دادەپەڕن و دەردەچن، واتە: یەئجوج و مەئجوج لە هەموو دەرگا و ڕێگایەکەوە دێنە دەرەوە بۆ فەساد و گێرە شێوێنی)).

چۆن دەردەچن؟ پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ وەسفی دەرچونی ئەو میللەتە بە شێوەیەکی ورد و جوانەوە باس دەکات، بەربەستەکە هەیە و مەوجودە، یەکەم کەلێنێك لەو بەربەستە کرایەوە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ بوو، ئایا چی بەڵگەیەك لە سەر ئەوە هەیە؟

بەڵگە لە سەر ئەو قسەیە ئەو فەرموودەیەیە کە ئیمامی(بوخاری و موسلیم)[1]

---

١ ــ أخرجه البخاري (٣٣٤٦) و مسلم (٢٨٨٠) .

ریوایەتیان کردوە لە فەرموودەی دایکی ئیماندارانەوە (زەینەب ی کچی جەحش) دەفەرمویت: ((دخل علیها النبي ﷺ فزعاً ـــ وفي روایة: أستیقظ النبي من النوم محمراً وجهه یقول: ((لا اله الا الله، ویل للعرب من شر قد أقترب، فتح الیوم من ردم یأجوج و مأجوج مثل هذه)) و حلّق بأصبعه الإبهام والتي تلیها، قالت زینب: یا رسول الله ﷺ، أنهلك وفینا الصالحون؟ قال: نعم إذا كثر الخبث)) . واتە: پێغەمبەری خواﷺ هاتە ژوورەوە وەکو کەسێکی راچڵەکاو وابوو ـ لە ریوایەتێکی تردا هاتوە: پێغەمبەری خواﷺ لە خەو هەستا و رووخساری سوور ببوەوە و دەیفەرموو: ((لا اله الا الله، تیاچون و فەوتان بۆ عەرەب لە خراپەی رۆژێك کە نزیك بوەتەوە لێیان، ئەمڕۆ لە بەربەستەکەی یەئجوج و مەئجوج بە ئەندازەی ئەمە کرایەوە)) پێغەمبەری خواﷺ بە هەردوو پەنجەی شایەتمان و ئەویتر ئەڵقەیەکی دروست کرد ـ جوان بیر بکەرەوە ئەو بازنەیە یان ئەو ئەڵقەیە، ئەوە ئەندازەی ئەو کونەیە کە یەئجوج و مەئجوج لە بەربەستەکە کردوویانەتەوە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ـ زەینەب فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ، ئایا بە هەلاکەتدا دەچین لە کاتێکدا پیاوچاکانمان تێدایە؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر خراپە زۆر بوون)).

من لێرەدا دەڵێم: بە راستی خراپە و خراپەکاران زۆر بوونە ! !

ئیمامی ئەحمەد لە (مسند)ەکەیدا و الترمذي و ابن ماجه لە (سنن)ەکەیاندا و ابن حبان لە (صحیح)ەکەیدا و جگە لەوان[١] ریوایەتیان کردوە لە فەرموودەی (ابو هریره)وە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إن یأجوج و مأجوج لیحفرون السد كل یوم، حتى إذا كادوا یرون شعاع الشمس، قال الذي علیهم: ارجعوا فستحفرونه غداً، فیعودون إلیه كأشد ما كان، حتى إذا بلغت مدتهم، وأراد الله ـــ عز وجل ـ أن یبعثهم إلى الناس حفروا حتى إذا كادوا یرون شعاع الشمس قال الذي علیهم: ارجعوا، فستحفرونه غداً إن شاء الله، و یستثني، فیعودون إلیه وهو كهیئته حین تركوه)) واتە: هەموو رۆژێك یەئجوج و مەئجوج لە بەربەستەکە چاڵ دەکەن،

---

١ ـ أخرجه أحمد (٢/ ٥١٠ – ٥١١) والترمذي (٣١٥٣) وقال : (حسن غریب) وابن ماجه (٤٠٨٠) والحاكم (٤/٤٨٨) وصححه ووافقه الذهبي وابن حبان (٦٨٢٩) وصححه الشیخ الألباني في (الصحیحة) ( ١٧٣٥) .

تاکو خەریکە تیشکی ڕۆژ ببینن، لەو کاتەدا ئەو کەسەی کە بە سەریانەوەیە دەڵێت: بگەڕێنەوە سبەینێ چاڵەکە تەواو دەکەن، کە سبەینێ دەگەڕێنەوە دەبینن لە جاران سەختترە، تا ئەو ڕۆژەی کە وادەی دەرچوونیان دێت و خوای گەورە دەیەوێت ڕەوانەیان بکات بۆ خەڵکی چاڵ دەکەن تا خەریکە تیشکی ڕۆژ ببینن ئەو کەسەی کە بە سەریانەوەیە دەڵێت: بگەڕێنەوە، بۆ سبەینێ چاڵەکە تەواو دەکەن انشاء الله، لێرەدا انشاء الله دەڵێت، بۆ سبەینێ کە دەگەڕێنەوە دەبینن وەکو ئەو کاتەیە کە جێیان هێشتبوو)).

واتە: خوای گەورە ئەو جێگەیە چاڵیان کردبوو ناگێڕێتەوە وەکو جاری پێشوو، بەڵکو دەبینن هەروەکو ئەو کاتەیە کە جێیان هێشتبوو، دەست دەکەن بە چاڵکردنی و ئەمجار دەردەچن و لە هەموو کون و کەلێنێکەوە بە پرتاو دادەپەڕن.

لە ڕیوایەتەکەی (النواس ی کوڕی سمعان) کە لە (صحیح مسلم)[1] دا هاتوە: ((وَيَبْعَثُ اللَّهُ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ وَهُمْ مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنْسِلُونَ،فَيَمُرُّ أَوَائِلُهُمْ عَلَى بُحَيْرَةِ طَبَرِيَّةَ، فَيَشْرَبُونَ مَا فِيهَا، وَيَمُرُّ آخِرُهُمْ، فَيَقُولُونَ: لَقَدْ كَانَ بِهَذِهِ مَرَّةً مَاءٌ)) واتە: خوای گەورە یەئجوج و مەئجوج ڕەوانە دەکات لە هەموو کەلێنێکەوە بە پرتاو دەردەچن، سەرەتاکەیان بە سەر دەریاچەی (الطبریة) دا تێدەپەڕێت، ئەوەی تێیدایە دەیخۆنەوە، کاتێ کە کۆتاییەکەیان تێدەپەڕێت دەڵێن: جاران لێرەدا ئاو هەبوە))

لە گەڵ مندا جارێکی تر بگەڕێوە بۆ ڕیوایەتەکەی (أحمد و الترمذي) کە لە پێشدا باسمان کرد، پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((وَيَخْرُجُونَ عَلَى النَّاسِ، فَيُنَشِّفُونَ الْمِيَاهَ، وَيَتَحَصَّنَ النَّاسُ مِنْهُمْ فِي حُصُونِهِمْ، فَيَرْمُونَ بِسِهَامِهِمْ إِلَى السَّمَاءِ، فَتَرْجِعُ وَعَلَيْهَا كَهَيْئَةِ الدَّمِ، فَيَقُولُونَ: قَهَرْنَا أَهْلَ الْأَرْضِ وَعَلَوْنَا أَهْلَ السَّمَاءِ))! ! واتە: یەئجووج و مەئجووج بە سەر خەڵکدا دەردەچن ئاوەکان وشك دەکەن و خەڵکیش لە ناو قەڵاکانیان خۆیان دەشارنەوە لێیان، ئەوانیش تیرەکانیان بەرەو ئاسمان دەهاوێژن تیرەکانیان بە سووری دەگەڕێتەوە بۆیان وەکو خوێناوی بووبێ،

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٩٣٧) .

ئەوانیش دەڵێن: زاڵ بووین بە سەر ئەهلی زەویدا و سەرکەوتین بە سەر ئەهلی ئاسمانیشدا)).

لە ڕیوایەتێکی تردا کە (أحمد) و خاوەنی (سنن)ەکان باسیان کردوە: ((ويفر الناس منهم)) واتە: خەڵکی لە دەستیان هەڵدێن)) لە ریوایەتێکی تردا ((وَيَتَحَصَّنَ النَّاسُ مِنْهُمْ فِي حُصُونِهِمْ)) واتە: خەڵکی لە قەڵاکانیاندا خۆیان دەشارنەوە و خۆیان قایم دەکەن)) هیچ کەسێك ناتوانێت بەرنگاریان ببێتەوە و لە گەڵیاندا بجەنگێت، تەنانەت پێغەمبەرعیسا ﷺ، خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی(عیسا) ﷺ دەفەرموێت: ((إِنِّي قَدْ أَخْرَجْتُ عِبَادًا لِي لا يَدَانِ لأحد بِقِتَالِهِمْ فَحَرِزْ عِبَادِي إِلَى الطُّورِ))[1] بۆیە پێغەمبەرعیسا ﷺ و ئەوانەی کە لە گەڵیدان لە یەکتاپەرستان و خواپەرستان پەنا دەبەنە بەر کێوی (طور)، خەڵکی ڕێگاو بانەکان بۆ یەئجوج و مەئجوج بە جێ دەهێڵن: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ﴾(الأنبياء: ٩٦) واتە: لە زەویدا بڵاو دەبنەوە.

بیر بکەرەوە چییان گوت؟ تەماشای خراپەکاری و کوفری ئەوان بکە، دەڵێن: هەروەکو لە ریوایەتەکەی (مسلم) دا هاتوە: ((لَقَدْ قَتَلْنَا مَنْ فِي الْأَرْضِ هَلُمَّ فَلْنَقْتُلْ مَنْ فِي السَّمَاءِ)) واتە: ئەوانەی لە سەر زەویدان کوشتمان هەستن با بچین ئەوانەی ئەهلی ئاسمان بکوژین)) پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ دەفەرموێت: ((فَيَرْمُونَ بِنُشَّابِهِمْ)) واتە: تیر و ڕمەکانیان بەرەو ئاسمان دەهاوێژن، هەر وەکو ئەوەی لە گەڵ ئەهلی ئاسماندا بجەنگن، ((فَيَرُدُّ اللَّهُ عَلَيْهِمْ نُشَّابَهُمْ مَخْضُوبَةً دَمًا))[2] بۆ ئەوەی فیتنە و تاقیکردنەوەکەیان زیاتر و زۆرتر بێت، واتە: تیری خوێناوییان بۆ دادەبەزێتەوە، بۆیە ئەوانیش وا دەزانن و وای بۆ دەچن کە ئەهلی ئاسمانیان کوشتوە، هەروەکو چۆن ئەهلی زەوییان کوشت، بۆیە لەو کاتەدا ئەو قسە پیس و خراپ و چەپەڵە دەڵێن: ((قَهَرْنَا مَنْ فِي الْأَرْضِ وَعَلَوْنَا مَنْ فِي السَّمَاءِ)) واتە: سەرکەوتین بە سەر

---

١ ـ هذا لفظ (مسلم) .

٢ ـ أخرجه مسلم (٢٩٣٧/١١١)

ئەهلی زەویدا و زاڵ بوین بە سەر ئەهلی ئاسماندا)) ولا حول ولا قوة الا بالله.
بە ڕاستی فیتنەیە.. بەڵام ئایا چارەسەر چییە؟ چ کارێك دەبێ بکرێت؟ ((فَيَرْغَبُ نَبِيُّ اللَّهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ)) واتە: لە یەکتاپەرستان لە ڕۆڵەی کۆمەڵی رزگار بوو لە ئوممەتی گەورەی گشت پێغەمبەران، بۆیە عیسا‌ﷺ و یەکتاپەرستانی ئوممەتی محمدﷺ پێکەوە لە خوای باڵا دەست دەپاڕێنەوە، بۆ ئەوەی خوای گەورە زەوی لە خراپەی یەئجوج و مەئجوج پاك بکاتەوە، لەو فیتنە تاریك و شەوەزەنگە، لەو کاتەدا خوای پەروەدگار وڵامی داواکەی عیسا‌ﷺ و یەکتاپەرستان دەداتەوە ((فَيُرْسِلُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ النَّغَفَ فِي رِقَابِهِمْ)) واتە: خوای گەورە (النغف) بۆ یەئجوج و مەئجوج دەنێرێت، مانای (النغف) چییە؟ کرمێکی بچووکە لە لووتی حوشترەوە دەردەچێت، ئەی خودایە..! ئایا ئەوان نەیانگوت: ئەهلی زەویمان بەزاند و زاڵ بووین بە سەر ئەهلی ئاسماندا، بەڵام تەماشاکە خوای گەورە بە چی شتێك بە هەلاکەتیاندا دەبات: ((فَيُصْبِحُونَ فَرْسَى)) واتە: هەموویان دەکوژرێن و دەفەوتێت))، ((كَمَوْتِ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ)) واتە: هەروەکو مردنی تەنها نەفسێك)) پاکی و بێگەردی بۆ پادشای پادشاکان: ﴿إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾(یس: ٨٢) واتە: بەڕاستی هەرکاتێ ویستی شتێ بەدی بهێنێ هەر ئەوەیە کە پێی بفەرمێ ببە، ئەویش دەست بە جێ دەبێت)).

((ثُمَّ يَهْبِطُ نَبِيُّ اللَّهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ إِلَى الْأَرْضِ، فَلَا يَجِدُونَ فِي الْأَرْضِ مَوْضِعَ شِبْرٍ إِلَّا مَلَأَهُ زَهَمُهُمْ وَنَتْنُهُمْ)) واتە: ئەمجار عیسا‌ﷺ و هاوەڵانی دادەبەزنە سەر زەوی، لە بەر بۆنی درن و گەنیوی ئەوان جێگای تەنها بستێك نادۆزنەوە لە سەر زەویدا هەمووی پڕبوە لەو بۆنە گەنیوە)) گۆشتی گەورە و زۆر مەزن، جەستەی مەزن و گەورە، هیچ کەسێك ناتوانیت بۆنی ئەو بۆنە گەنیوە بکات کە سەر زەوی پڕ کردوە ((فَيَرْغَبُ نَبِيُّ اللَّهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ إِلَى اللَّهِ)) واتە: لە یەکتاپەرستانی ئوممەتی موحەممەدﷺ، لە خوای پەروەردگار دەپاڕێنەوە و تکای لێ دەکەن کەوا

سەر زەوی لە بۆدرن و بۆگەنی ئەوان پـاك بكاتـەوە)) ((فَيُرْسِلُ اللَّـهُ طَيْـرًا كَأَعْنَـاقِ الْبُخْتِ)) خوای گەورە باڵندە رەوانە دەكات كە وەكو ملی وشـتری (البخـت) وایـە)) ئـەویش جۆرێكـە لـە وشـتری خوراسـانی، كـە بـە ملدرێـژی بـە نـاو بـانگن، دەڵێـت: ((فَتَحْمِلُهُمْ فَتَطْرَحُهُمْ حَيْثُ شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّـهُ مَطَـرًا لا يَكُنُّ مِنْـهُ بَيْـتُ مَـدَرٍ وَلا وَبَرٍ)) واتە: ئەو باڵندانە هەموو ئەو جەستانە هەڵدەگرن و دەیانبـەن و لـە جێگایـەك فرێی دەدەن كە خـوا خـۆی ویـستی لـە سـەر بێـت پاشـان خـوای گـەورە بـارانێكی خوڕەم بۆ سەر زەوی دەبارێنێت هەموو گونـد و شـار و چادرنـشێنێك دەگرێتـەوە)) ((فَيَغْـسِلُ الْـأَرْضَ حَتَّـى يَتْرُكَهَـا كَالزَّلَفَـةِ)) واتـە: زەوی دەشـۆرێتەوە تـاكو وەكـو ئاوێنەیەكی زۆر سپی و روونی لیّ دێت، لە ریوایەتێكی تردا كـە (أحمـد و الترمـذي و الحاكم) ریوایەتیان كردوە: ((وَالَّذِي نَفْسُ محمدبِيَدِهِ إِنَّ دَوَابَّ الْأَرْضِ لَتَـسْمَنُ وَتَـشْكَرُ شَكَرًا مِنْ لُحُومِهِمْ و دمائهمْ)) واتە: سوێند بە زاتی ئەو كەسەی گیانی موحەممـەدی بە دەستەﷺ، گیاندارەكانی زەوی بە گۆشت و خوێنی ئەوان زۆر قەڵەو دەبن))

بگەڕیوە بۆ لای ریوایەتەكەی (مسلم): ((ثـم يُقَـالُ لِلْـأَرْضِ: أَنْبِتِـي ثَمَرَتَـكِ، وَرُدِّي بَرَكَتَـكِ)) واتــە: ئــەمجار بــە زەوی دەگوترێـت: بەروبومەكـەت بهێنــە بەرهــەم و بەرەكەتت بگەڕێنەوە)) بە راستی ئەوە ئاسـوودەترین ماوەیـە كـە بـە سـەر زەویـدا تێدەپەڕێت لەو رۆژەوە خوای گەورە دروستی كردوە تاكو رۆژی قیامەت.

لە فەرموودەیەكی تردا كە (الديلمي و الضياء المقدسي) بە سەنەدێكی (صحیح)[١] ریوایـەتیان كـردوە لــە فــەرموودەی (ابـو هریـرە)وە كـەوا پێغەمبــەری خــواﷺ فەرموویەتی: ((طوبى لعيش بعد المسيح، طوبى لعيش بعد المسيح، يؤذن للـسماء في القطر،ويؤذن للأرض في النبات،حتى لو بذرت حبك على الصفا لنبت))،واتە: شـادی و بەختیاری بەژیان لەپاش مەسیحؑ، شادی و بـەختیاری بـەژیان لـەپاش مەسـیح ؑ، مۆڵەت بە ئاسمان دەدرێت دەبارێت و بە زەوی سەوز دەبێت، تەنانەت ئەگـەر

١ ـ أخرجه الديلمي ( ٢/١٦١) والضياء في (المنتقى) (١٢٧/ ١ – ٢) وأبو بكر الأنباري في حديثه (ج١ ورقـة ٦/١-٢ ) كما في (الصحيحة) (١٩٢٦) وصححه الألباني هناك ورواه الحافظ ابو سعيد النقـاش الحنبلـي في (فوائـد العراقيين) (٢٨).

تۆوێك لە سەر بەردێکی لووس بروێنیت ئەوا سەوز دەبێت)) بە راستی ئەوە سەردەمی بەرکەت و سەردەمی میهرەبانییە.

ئەمجار فەرمووی: ((ولا تشاح ولا تحاسد ولا تباغض)).واتە: بە هیچ شێوەیەك رەزیلی و چرووکی و رق و کینە نامێنێت))

لە ریوایەتێکی تردا کە ئیمامی ئەحمەد لە (مسند)ەکەیدا و (ابن حبان و الطیالسي)[1] و جگە لەوان ریوایەتیان کردوە، هەروەرها شەیخ (الالبانی) بە (صحیح)ی زانیوە لە فەرموودەی (ابوهریرە)وە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((فَيُهْلِكُ اللَّهُ فِي زَمَانِهِ الْمِلَلَ كُلَّهَا إِلَّا الْإِسْلَامَ، وَيُهْلِكُ اللَّهُ فِي زَمَانِهِ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ وَتَقَعُ الْأَمَنَةُ عَلَى الْأَرْضِ، حَتَّى تَرْتَعَ الْأُسُودُ مَعَ الْإِبِلِ، وَالنِّمَارُ مَعَ الْبَقَرِ، وَالذِّئَابُ مَعَ الْغَنَمِ، وَيَلْعَبَ الصِّبْيَانُ بِالْحَيَّاتِ لَا تَضُرُّهُمْ، فَيَمْكُثُ أَرْبَعِينَ سَنَةً، ثُمَّ يُتَوَفَّى، وَيُصَلِّي عَلَيْهِ الْمُسْلِمُونَ)). واتە: خوای گەورە هەموو ئوممەتەکان لە ناو دەبات تەنها ئوممەتی ئیسلام نەبێ، لە سەردەمی ئەودا خوای گەورە مەسیحی دەجال دەفەوتێنێ و ئەمن و ئاسایش لە سەر رووی زەویدا بڵاو دەبێتەوە، تا وای لێ دێت وشتر لە گەڵ شێردا پێکەوە دەلەوەڕێن، پڵنگ لە گەڵ مانگادا، گورگ لە گەڵ مەڕدا، منداڵان یاری بە مار دەکەن و هیچ زیانیان پێ ناگەیەنێت، بۆ ماوەی چل ساڵ دەمێنێتەوە، ئەمجار کۆچی دوایی دەکات و موسڵمانان نوێژی لە سەر دەکەن)).

بۆیە پێغەمبەری خواﷺ خۆزگەی بە ژیان دەخواست لە سەردەمی عیسا دا؈، لە (مسند أحمد)[2] بە سەنەدێکی (صحیح) هاتوە لە فەرموودەی (ابو هریرە)وە کەوا پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ فەرموویەتی: ((إِنِّي لَأَرْجُو إِنْ طَالَ بِي عُمُرٌ أَنْ أَلْقَى عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ ؈ فَإِنْ عَجِلَ بِي المَوْتُ، فَمَنْ لَقِيَهُ مِنْكُمْ فَلْيُقْرِئْهُ مِنِّي السَّلَامَ)).واتە: تکام وایە ئەگەر تەمەن رێم بدات عیسا ی کوڕی مەریەم؈ ببینم، ئەگەر مردم و

---

١ ـ أخرجه أحمد (٢/٤٠٦ , ٤٣٧) وأبوداود (٤٣٢٤) وابن حبان (٦٨١٤ , ٦٨٢١) والطيالسي في (مسنده) (٢٥٧٥) وابن أبي شيبة في ( مصنفه) (٣٧٥٢٦) وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٢١٨٢) .

٢ ـ أخرجه أحمد (٢/٢٩٨) وهو حديث صحيح وصححه الشيخ الأرناؤوط على شرط الشيخين .

نەمبینی، هەرکەسێ لە ئێوە ئەوی بینی با سڵاوی منی پێ بگەیەنێت)).

بەم شێوەیە ڕێزداران... خوای گەورە یەکتاپەرستان لە سەر زەویدا لە فیتنەی مەسیحی دەججال و فیتنەی یەئجوج و مەئجوج ڕزگار دەکات.

لەو کاتەدا ئەهلی زەوی لەوپەڕی خۆشیدا دەژین، لە حاڵێکدا دەژین کە سەر زەوی لە مێژوودا ئەو شێوە ژیانەی نەبینیوە، خوای گەورە لە ئاسمانەوە بەرەکەت دادەبەزێنێتە سەر زەوی، لە زەوییەوە بەرەکەت دەردەچێت، هەموو دڵەکان لە ڕق و کینە و حەسودی پاك دەبێتەوە، بە فەزڵی خوای گەورە ئەمن و ئاسایش لە زەویدا بەرقەرار دەبێت، ((فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ بَعَثَ اللّهُ رِيحًا طَيِّبَةً فَتَأْخُذُهُمْ تَحْتَ آبَاطِهِمْ، فَتَقْبِضُ رُوحَ كُلِّ مُؤْمِنٍ وَكُلِّ مُسْلِمٍ وَيَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ يَتَهَارَجُونَ فِيهَا تَهَارُجَ الْحُمُرِ، فَعَلَيْهِمْ تَقُومُ السَّاعَةُ))[1] واتە: خەڵکەکە بەو شێوەیە دەمێننەوە تا ئەو کاتەی خوای گەورە بایەکی خۆش دەنێرێت و دەدات بە ژێر باڵیاندا و گیانی هەموو موسڵمان و ئیماندارێك دەکێشێت، تەنها خراپەکاران دەمێننەوە بە بێ شەرم پیاوان لە گەڵ ئافرەتاندا جووت دەبن لە پێش چاوی خەڵکی وەکو گوێدرێژ، قیامەت بە سەر ئەو جۆرە خەڵکە هەڵدەستێت)) خوای گەورە بایەکی سارد دەنێرێت، بە فەزڵ و ویستی خۆی ڕوحی هەموو ئیمانداران لە سەر زەویدا دەکێشێت، لە سەر زەویدا جگە لە خراپەکاران هیچ کەسێکی تر نامێنێت، قیامەت بە سەر ئەواندا هەڵدەستێت، ئەو ڕۆچوونەی کە لە پاشدا بە درێژی باسی دەکەم - إنشاء الله — ئەوان دەیبینن.

ڕێزداران.. ئەم بەشە بەم فەرموودە جوان و ناسکە تەواو دەکەم، بۆ ئەوەی موژدەتان پێ بدەم — ئەی گرووی یەکتاپەرستان لە پاشین و پێشینەکان لە هاوەڵانی پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ - هەروەکو لە (صحيح مسلم)[2] دا هاتووە لە فەرموودەی (ابو هريرە)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ ڕۆیشت بۆ گۆرستانێك و فەرمووی: ((السَّلَامُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لاحِقُونَ، وَدِدْتُ أَنَّا

---

١ - أخرجه مسلم .

٢ - أخرجه مسلم (٢٤٩) .

قَدْ رَأَيْنَا إِخْوَانَنَا)) قَالُوا: أَوَلَسْنَا إِخْوَانَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: أَنْتُمْ أَصْحَابِي، وَإِخْوَانُنَا الَّذِينَ لَمْ يَأْتُوا بَعْدُ)) فَقَالُوا: كَيْفَ تَعْرِفُ مَنْ لَمْ يَأْتِ بَعْدُ مِنْ أُمَّتِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: ((أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ رَجُلاً لَهُ خَيْلٌ غُرٌّ مُحَجَّلَةٌ بَيْنَ ظَهْرَيْ خَيْلٍ دُهْمٍ بُهْمٍ، أَلا يَعْرِفُ خَيْلَهُ؟)) قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: ((فَإِنَّهُمْ يَأْتُونَ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنَ الْوُضُوءِ، وَأَنَا فَرَطُهُمْ عَلَى الْحَوْضِ)) واتە: سڵاوتان لێ بێت ئەی خاوەنی خانەکان لە ئیمانداران، ئێمەیش بە ویستی خوای گەورە پێتان دەگەین، پێم خۆش بوو براکانمان ببینایە، فەرموویان: ئایا ئێمە برای تۆ نین ئەی پێغەمبەری خواﷺ؟ فەرمووی: ئێوە هاوەڵی منن، بەڵام براکانم ئەوانەن کە هێشتا نەهاتوون، فەرموویان: ئایا ئەوانەی کە پاشان دێن لە ئوممەتەکەت چۆن دەیانناسیت؟ فەرمووی: ئایا ئەگەر کابرایەك چەند وڵاخێکی ناوچاوان و پێ سپی هەبوو لە نێو کۆمەڵە وڵاخێکی رەشی زۆردا بوو ئایا وڵاخەکانی خۆی ناناسێتەوە؟ فەرموویان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خواﷺ، فەرمووی: ئەوانیش لە رۆژی قیامەتدا دێن ناوچاوان و پێیان سپییە بە هۆی دەستنوێژەکانیانەوە من پێشی ئەوان کەوتوم و چاوەروانیانم لە سەر حەوزی کەوسەر)).

ئەی خودایە پاداشتی پێغەمبەری خواﷺ بدەرەوە بە جوانترین و چاکترین پاداشت، ئێمە و ئەو خۆشەویستە لە فیردەوسدا کۆ بکەرەوە، هەر تۆ پشت و پەنایت و توانات بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

# هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە و گیاندارە سەیرەکە و ڕۆچوون

## (( طلوع الشمس من المغرب، والدابة، والخسوف ))

لە پاش ئەو قۆناغە بێ وێنەدا لە مێژووی مرۆڤایەتی کە سەر زەوی پێیدا تێدەپەڕێ، خەڵکی لە خۆشحاڵی و ئاسوودەییدا دەژین کە هەرگیز شتی وایان نەبینیوە، لە شەوێك لە شەوانی ئەو ڕۆژگار و سەردەمە پیرۆز و پڕ بەرەکەتەدا خوای گەورە خۆی ویستی لە سەری دەبێت و هەموو خەڵکی دەخەون، لە کاتی نوێژی بەیانیدا دەچن بۆ مزگەوتەکان، پاشان لە مزگەوت دەردەچن بەڵام هێشتا تاریکە شەوە، چونکە خەڵکی وا ڕاهاتوون کە لە مزگەوت دەرچن ئەوا گزنگ دەرکەوێت و ئاسمان روناك ببێتەوە و پاشان ڕۆژ دەبێتەوە و هەموو سەر زەوی روناك دەکاتەوە، بەڵام ئەمڕۆ ئەوا کاتی نوێژی نیوەڕۆیە و کەچی هێشتا هەر تاریکە شەوە، شەوەزەنگێکی تاریکە... ئەی پەروەردگارمان بمانپارێزە ! ! ئەمجار کاتی نوێژی عەسر هات، کەچی هێشتا هەر تاریکە شەوە و شەوەزەنگە، لەو کاتەدا هەموو خەڵکی سەر زەوی ئایەتێکی سەیر دەبینن لە نیشانە گەورەکانی قیامەت، ئەو نیشانەیە کە دەبێتە هۆی گۆڕانی جیهانی سەرەوە (العالم العلوی) ئەویش: هەڵاتنی ڕۆژە لە ڕۆژئاواوە..

خەڵکی سەر زەوی دەبینن وا ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە دەردەچێت! بە ڕاستی ئەوە نیشانەیەکی سەیرە..! ! لە گەڵ مندا بە هەموو دڵ و عەقڵ و بوونت بیر بکەرەوە و بیهێنە پێش چاوی خۆت کەوا ڕۆژ لەو کاتەوە خوای گەورە دروستی کردوە تاکو ئەمڕۆ لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێ و لە ڕۆژئاواوە ئاوا دەبێت تەنانەت بۆ چرکەیەکیش دوا نەکەوتوە، بەڵکو بە ئەندازە و حیسابێکی وردەوە دێت و دەچێت: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٣٨﴾
وَٱلْقَمَرَ قَدَّرْنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلْعُرْجُونِ ٱلْقَدِيمِ ﴿٣٩﴾ لَا ٱلشَّمْسُ يَنۢبَغِى لَهَآ أَن تُدْرِكَ

ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴿٤٠﴾ (یـس) واتە: بەڵگەیەکی تر بۆیان خۆرە کە بەردەوام دێت و دەچێ تا کاتی دیاریکراوی خۆی بۆ راوەستان و لە کارکەوتن چی دەبینی بەرەو بنەوخولگەی خۆی هەر لە گەڕدایە تا ئەوکاتە بۆی دیاری کراوە، ئەو هاتوچۆ و گەڕانە بەو شێوە وردە، خەملاندنی خوای بە دەسەلاتی زانایە (٣٨) هەروەها گەڕانی مانگیشمان خەملاند - کە ئەمیش بەڵگەیەکە بۆ دەسەلات و توانایی خۆمان - بە بیست وهەشت مەنزڵ و ئاسۆ، تا هەموو شەوێك دابەزێتە جێگایەکیانەوە پاشان دوو شەو یان شەوێك پەنا ئەگرێ تا وەك پەلی کۆنی باریکی وشکی زەرد بووی کەوانەیی داری خورمای لێ دێت (٣٩) نە بۆ خۆر دەکرێ بگاتە مانگ، تا هەردوو پێکەوە کۆببنەوە و نوور و رووناکی مانگ هەلگرێ و تا قیامەت هەر رۆژ بێت نە شەویش پێشی رۆژ دەکەوێ کە ئیتر تا کاتی کۆتایی دونیا، هەر شەو و تاریك بێت، نەخێر شتی وا ناشێ و نابێ بەڵکو خوا هەردووکیانی بە جۆری دروست کرد، کە کاری یەکتر تێك نەدەن، هیچیشیان ناچنە خولگەی ئەویتریان بەڵکو هەریەکەیان لە خولگەی خۆیا دەسووڕێتەوە وەك مەلەوان دێن و دەڕۆن. (٤٠).

هەروەکو دەزانن رۆژ (خۆر) ئایەتێکی سەیرە هەموو فیترەتێکی پاك و هەموو عەقڵێکی پەسەند و هەموو دڵێکی لە خواترس دەهێنێتە گۆ، بۆ ئەوەی شایەتی یەکتاپەرستی خوای کارزان و کاربەجێ بدەن، بەڵام مرۆڤەکان لە گەڵ ئایەتەکانی خوادا لە گەردووندا راهاتوون چیتر بیر لەو ئایەتانە ناکەنەوە و دڵی پێ نادەن، رۆژ لە رۆژهەڵاتەوە هەڵدێ و لە رۆژئاواوە ئاوا دەبێت، تاکو وای لێهاتوە لای زۆربەی مرۆڤەکان بوەتە شتێکی ئاسایی، بەڵام ئەگەر بیر بکەیتەوە و تێفکریت ئەوا دروستکەری زەوی و ئاسمانەکان بە تەنها دەناسیت و هەرگیز هاوەڵی بۆ بڕیار نادەیت، هەروەها پەروەردگاری خۆر بە مەزن دەناسیت، هەرگیز رۆژ لە جێ خولگەی خۆی دواناکەوێت بەڵکو زانایانی پسپۆر لە ئەکادیمی زانیاری لە نیویورك لە ئەمریکا گوتویانە: لە پاش ژماردن و حیسابێکی ورد و زانستی بۆمان دەرکەوتووە کەوا سیستەمی رۆژ و مانگ (هەیڤ) بە ئەندازە و حیسابێکی وردەوە دانراوە، دەڵێن: ئەگەر هاتوو رۆژ کەمێك خولگەکەی خۆی جێ بهێڵێ بەرەو

سەرەوە ئەوا هەموو زیندەوەرانی سەر زەوی دەیانبەست و دەمردن، هەروەها ئەگەر هاتوو ڕۆژ کەمێك خولگەکەی خۆی بە جێ بهێڵێ بەرەو خوارەوە دابەزی بە ئەندازەی یەك سانتیمەتر یان دوو سانتیمەتر یان سێ سانتیمەتر ئەوا هەموو زیندەوەرانی سەر زەوی دەسووتان و لە ناودەچوون.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ بِحُسۡبَانٖ﴾(الرحمن: ٥) واتە: خۆر و مانگ بە حیسابێکی ورد دێن و دەچن)).

ئایا چی ڕوودەدات لە کاتی دیاری کراو و ئەو ئاکامەی کە دروستکەری خۆر دیاری کردوە ؟لەناکاودا هەموو خەڵکی دەبینن وا ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەڵدێ و سیستەمی جوڵەی گەردوون تێکدەچێت بە شێوەیەکی گشتی و گۆڕانێکی دیار لە جیهانی سەرەوەدا دەبینرێت، بەڵکو جیهانی سەر زەویش ئەو گۆڕانە بنەچەییە دەبینێ.

بیر لەو فەرموودەیەی پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ بکەرەوە کە لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1]دا هاتوە ـ لە ریوایەتی (مسلم)و لە فەرموودەی (ابو ذر)ەوە ـ کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((أَتَدْرُونَ أَيْنَ تَذْهَبُ هَذِهِ الشَّمْسُ؟)) قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: إِنَّ هَذِهِ تَجْرِي حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَى مُسْتَقَرِّهَا تَحْتَ الْعَرْشِ فَتَخِرُّ سَاجِدَةً)) واتە: ئایا دەزانن ئەو خۆرە بۆ کوێ دەڕوات؟ فەرموویان: خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ باشتر دەزانن، فەرمووی: ئەم خۆرە دەڕوات تاکو دەگاتە جێگای راوەستانی لە ژێر عەرشدا، لەوێ کڕنۆش دەبات)) چەند وشە وگوفتارێکە دڵەکان پڕ دەکەن لە مەزنی و شکۆمەندی، لە گەڵ ئەوەشدا دڵی گوماندار و دوودڵەکان پڕ دەکات لە گومان و دوودڵی، دڵی بێ باوەر و بەدگومانەکان پڕ دەکات لە بێباوەڕی! !

پێت دەڵێم: برای موسڵمانم قورئان بخوێنەوە، کێشەی ئێمە ئەوەیە زۆر دوور کەوتوینەتەوە لە قورئان، خوای پەروەردگار و بە دەسەڵات لە قورئانەکەیدا باسی کردوە کەوا ڕۆژ کڕنۆش دەبات و دەچێتە سوژدە، ئایا خوای گەورە چی فەرموە؟

١ ـ أخرجه البخاري (٣١٩٩) و مسلم (١٥٩) .

خـوای گـەورە دەفەرموێـت: ﴿ألَمْ تَرَ أنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الأرْضِ﴾(الحج: ١٨) واتە: ئاخۆ نەتزانیوە کە هەرچی لـە ئاسمانـەکان و زەویدایـە سەرجەم هەموو بۆ خوا سوژدە دەبەن؟)) لە گـەڵ منـدا بـژمێرە، خـوای گـەورە بـە درێـژی بـاس دەکـات لـە پـاش ئـەوەی بـە پوختـەیی باسـی کـرد، خـوای گـەورە دەفـــــەرموێت: ﴿وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ النَّاسِ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ الْعَذَابُ وَمَن يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّكْرِمٍ إنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ﴾ (الحـج: ١٨) واتـە: خـۆر و هـەیف و ئەسـتێرە و کێوەکـان و درەخـت و جفـۆك و خزۆکیش و زۆرێکـیش لـە مـەردوم! بـە ئـارەزووی خـۆی و بـە پێخۆشـبوونی خـۆی سـوژدە هـەر بـۆ خـوا دەبـا، زۆرێکیـشیان لاڕێ دەگـرن و سـزای خوایـان لـە سـەر شایستە و پێویست بوە خوا هەر کەسێك بێ ڕێز و سووکی بکات (بـە هـۆی لاسـاری خۆیەوە) واتە: هەر لە ئەزەلدا لای خـوا بـێ بـڕوا و شـەقی بێـت ئـیتر هـیچ کەسـێك ناتوانێ ڕێزی لێ بنێت و بەرەو بەختیاری بیهێنێتەوە، بە ڕاستی خـوا هـەر شـتێکی ویستی بێ ئەیکات، سزای کێ بدات و میهرەبانی لە گەڵ کێ بکات )) .

هـەروەها خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلالُهُم بِالْغُدُوِّ وَالآصَالِ﴾(الرعد:١٥ )واتە: هەموو ئەوانەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدان تەنانەتی سێبەرەکانیشیان، بیانـەوێ و نەیانـەوێ بـە بـەیانیان و ئێـواران، سـەرجەم ئەمانـە گـشتیان سـوژدە بـۆ خـوا دەبـەن، واتـە: خـوای گـەورە ڕژێـم و یاسایەکی بۆ داناون، هەرگیز ناتوانن لێی لا بدەن و لاساری بکەن.)

سێبەری کەسی ئیماندار بە ویستی خۆی بۆ خـوای باڵادەسـت سـوژدە دەبـات و سێبەری کەسی بێباوەڕ بە ناچاری و بێ ویستی خۆی سوژدە دەبات، هیچ شتێك لە سەر زەویدا نییـە ئـیللا بـۆ خـوای گـەورە سـوژدە دەبـەن تـەنها ئەوانـە نـەبێت کـە کوفریان بە خوای گەورە کردوە لە جنۆکە و مرۆڤەکان، ولا حول ولا قوه الا بالله.

خوای کارزان دەفـەرموێت: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإن مِّن شَيْءٍ إلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا﴾ (الإســراء: ٤٤) واتـــە:

هەر حەوت ئاسمانەکان و زەوی و هەموو ئەوانەش کە تێیانـدان هـەموو گـەورەیی و بێ خەوشی ئەو(خوا) یە دەڵێن گەواهی بۆ یەکتایی ئەو دەدەن، هەموو شـتێك هـەر هاواری تاك و تەنیایی ئـەو ئەکـەن، پاڕانـەوە و تەسـبیحاتی و حەمـدی ئـەو دەڵـێن واتە: هـەموو نیازمەنـدی ئـەون ئـەو بـێ نیـازە لـە هـەموو بـەڵام ئێـوە لـە پاکانـە و تەسبیحاتیان تـێ ناگـەن چـونکە عـەقڵ و ژیریتـان ناخەنـە کـار بـۆ تێگەیشتن، بـە راستی ئەو (خوا) یـە هەمیـشە لـە سـەر خۆیـە بۆیـە لـە گـەڵ ئـەو هـەموو گوناهـ و تاوانەدا مۆڵەتی ئێوە دەدا و ناتانگرێ، زۆریش لێبووردەیە، بۆیە هەرکەسێك داوای لێبووردنی لێ بکات لێی دەبوورێ)).

دەمـەوێت لـە گـەڵ منـدا بـە جـوانی لـەو ئایەتـەی خـوای گـەورە تێبگـەیت کـە دەفـــەرموێت: ﴿وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾ واتـــە: بـــەڵام ئێـــوە لـــە پاکانـــە و تەسبیحاتیان تێ ناگەن چونکە عەقڵ و ژیریتان ناخەنە کار بۆ تێگەیشتن))

ئایا دەزانی ئەو جلو بەرگ و پۆشاکەی تـۆ لـە بـەری دەکـەیت تەسـبیحاتی خـوا دەکەن؟ هەروەها ئـەو بـەرد و دارە تەسـبیحاتی ئـەو دەکـەن؟ دڵنیابـە کـە هـەموو شتێك لە گەردووندا و لە دەور و بەری تۆ تەسبیحاتی خوا دەکـەن ﴿وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾(الإسراء:٤٤).

وریابە: لە میانەی قسەکردنەکەدا دەبوایە ئایەتەکە کۆتـایی بـە (سمیعـا بـصیرا) بهاتبایە، چونکە ئەوانەی تەسبیحاتی ئەو دەکـەن دەیـانبینێ و دەیانبیـسێ کەچـی ئایەتەکە بە ((إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا)) کۆتایی پێهات، بۆ؟ چـونکە خـوای گـەورە لـە گەڵ بەندەکانیدا هێمن و هێدییە کاتێ تەسبیحاتی هەموو گەردوون و بونەوەری لـێ شاردینەتەوە، میهرەبانییەکە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە، ئەگینا ــ سوێند بە پـەروەردگاری کەعبـە ـــ ئەگـەر خـوای گـەورە تەسـبیحاتی ئـەو دروسـتکراو و زیندەوەرانەی دەور و بـەرمانی بـۆ ئێمـە ئاشـکرا بکردبایـە ئـەوا بـە راسـتی هـەموو عەقڵمان لە دەسـت دەدا، بیهێنـە پـێش چـاو و خـەیاڵی خـۆت کـەوا خـوای گـەورە دەنگی تەسبیحاتی گەردوونی بۆ ئێمەی ئاشکرا بکردبایە ! تەسبیحاتی پۆشاکەکەت

دەبیسی! خواردنەکەت! دار و درەختەکان! بە راستی ئەو کاتە عەقڵەکانمان بەرگەی نەدەگرت، ئەوە مەبەستی ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت: ((إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا))، بەلام ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ((غَفُورًا)) واتە: لە بەر بێئاگابوون و غەفلەتی ئێوە لە تەسبیحاتی ئەو، لە گەڵ ئەوەشدا رێزداری کردوون و کردوونی بە خاوەن فەزڵ و چاکە بە سەر هەموو شتێکدا لە بونەوەردا، لە گەڵ ئەوەشدا هەموو گەردوون تەسبیحاتی ئەو دەکەن لە کاتێکدا زۆربەی خەڵکی لە بێئاگابوانی مرۆڤ و جنۆکە وئەوانەی کە کوفریان کردوە لە مرۆڤ و جنۆکە.

جا دڵنیابە کە رۆژ (خۆر) کرنۆش دەبات بەلام شێوە و شێوازی ئەو کرنۆشە چۆنە؟ ولامەکە ئەوەیە: ئێمە لە چۆنییەتی کرنۆش بردنی رۆژ تێناگەین، واز بهێنە لە کرنۆش بردنی جەستە و لاشە، گرنگ ئەوەیە دڵەکان کرنۆش بەرن، ئەی دڵ چۆن کرنۆش دەبات؟ تۆ دەڵێیت: (سِرْتُ والقمر)، لەگەڵ ئەوەشدا مانگ لە خولگەکەی خۆیەتی و لە ئاسماندایە و جێگەکەی خۆی جێ نەهێشتوە، لە گەڵ ئەوەشدا لە رێگاکەدا هەنگاو بە هەنگاو لە گەڵ تۆدا بوە، ئەمە نمونەیەکە، بۆیە هەرگیز نابێت تەنها یەك ئایەت یاخود تەنها یەك فەرموودەی (صحیح)ی پێغەمبەری ئازیزﷺ رەد بکەیتەوە بە بانگەشەی ئەوەی کە عەقڵی تۆ ئەو ئایەتە یان ئەو فەرموودەیە وەرناگرێت یان لێی تێناگات.

جا خوای گەورە بۆ خۆر و مانگ و هەموو زیندەوەرانی دەور و بەرمان هەستێکی دروست کردوە هیچ کەسێك چۆنێتییەکەی نازانێت تەنها ئەو نەبێت، ئەو هەموو زیندەوەرانە هەستیان کردوە کەوا سپاردەیەکیان پێ سپێردراوە: ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴾(الأحزاب: ٧٢) واتە: بە راستی ئێمە سپاردە و (تەکالیف)ەکانمان خستە سەر ئاسمانەکان و زەوی و کێوەکان کەچی هیچیان لە خۆیانرا نەدی و لە هەڵگرتنیان نکوولییان کرد و نەچوونە ژێری و ترسان کە: نەتوانن هەڵسن بە جێبەجێکردنی داخوازییەکان کەچی مرۆڤ هاتە پێشەوەو و چوە ژێرباری و هەڵی گرت! بە راستی ناهەقی لە خۆکرد و نەیزانی بە ئەنجام ئەگینا

هەرگیز هەڵی نەئەگرت واتە: بە جێ هێنانی فەرمانەکانی خوا ئەوەندە گرنگە ئاسمان و زەوی و شاخەکان لە گەڵ ئەو هەموو توانایەدا بۆیان هەڵنەگیرا! ! کەچی ئادەمیزاد ـ بە نەزانی خۆی ـ هەڵی گرت)).

لە گەڵ مندا جارێکی تر بگەڕێوە بۆ لای فەرموودەکەی پێغەمبەری ئازیز ﷺ لە کاتێکدا ئەو پرسیار لە هاوەڵان دەکات و بەوان دەڵێت: ((أَتَدْرُونَ أَيْنَ تَذْهَبُ هَذِهِ الشَّمْسُ؟)) قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: إِنَّ هَذِهِ تَجْرِي حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَى مُسْتَقَرِّهَا تَحْتَ الْعَرْشِ فَتَخِرُّ سَاجِدَةً)))) واتە: ئایا دەزانن ئەو خۆرە بۆ کوێ دەڕوات؟ فەرمویان: خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ باشتر دەزانن، فەرمووی: ئەم خۆرە دەڕوات تاکو دەگاتە جێگای راوەستانی لە ژێر عەرشدا، لەوێ کرنۆش دەبات)).

جا رۆژ کرنۆش دەبات بۆ پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکان بە شێوە و شێوازێك کەوا هیچ کەسێك چۆنێتییەکەی نازانێت تەنها ئەو زاتە پیرۆزە نەبێت، هەرگیز نابێت و رەوا نییە ئێمە بەو یاسا و رێسا مادییەی مرۆڤەکان بڕیار بە سەر بابەتێکی غەیبیدا بدەین، ئایا ئەگەر بە تۆم بگوتبایە: لە پێش بیست ساڵ یان پەنجا ساڵی رابوردوو کەوا ئامێرێکی دەستی هەیە لە گەڵ خەڵکیدا قسەی پێ دەکەیت لە ئەمریکا، ئەوا بە منت دەگوت: تۆ شێتیت! ! بەڵام ئەمڕۆ بە دەستەکانی خۆت ئامێری (مۆبایل) بە دەستەوە دەگریت و لە گەڵ رۆژئاوا و رۆژهەڵاتی زەویدا قسە دەکەیت کەچی تۆ لە جێگەکەی خۆت راوەستاویت، ئەگەر پێش سەد ساڵ بە تۆم بگوتبایە: کەوا موسڵمانێك لە ئەمریکا یان لە روسیا یان لە بریتانیا یان لە سەر هەر پارچەیەکی سەر رووی زەوی دەتوانێت من ببینێ ئەوا بە منت دەگوت: کەمێك عاقڵ بە! بەڵام ئەمڕۆ لە سەردەمی (فضائیات) و لە سەردەمی (ئەنتەرنێت) و سەردەمی مۆبایل دا بە چاوی خۆمان شتی سەیر و سەمەرە دەبینین، ئەوە بۆ کەسێك ئەگەر بەڵگەی عەقڵی بوێت، چەند زۆرن ئەو بەڵگە عەقڵیانە! ! ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾(ق: ٣٧) واتە: بێ گومان لەو سەر گوزەشتەی پێشینانەدا ئامۆژگاری هەیە بۆ ئەوەی دڵ و ژیری هەیە، یان بە باشی گوێڕاگرێ و ئامادەش بێت دڵ و

گوێی بداتێ.))

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِنَّ هَذِهِ تَجْرِي حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَى مُسْتَقَرِّهَا تَحْتَ الْعَرْشِ، فَتَخِرُّ سَاجِدَةً فَلَا تَزَالُ كَذَلِكَ، حَتَّى يُقَالَ لَهَا: ارْتَفِعِي، ارْجِعِي مِنْ حَيْثُ جِئْتِ، فَتَرْجِعُ، فَتُصْبِحُ طَالِعَةً مِنْ مَطْلِعِهَا، ثُمَّ تَجْرِي حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَى مُسْتَقَرِّهَا تَحْتَ الْعَرْشِ فَتَخِرُّ سَاجِدَةً وَلَا تَزَالُ كَذَلِكَ، حَتَّى يُقَالَ لَهَا: ارْتَفِعِي، ارْجِعِي مِنْ حَيْثُ جِئْتِ، فَتَرْجِعُ فَتُصْبِحُ طَالِعَةً مِنْ مَطْلِعِهَا)). واتە: ئەم خۆرە دەڕوات تاکو دەگاتە جێگای ڕاوەستانی لە ژێر عەرشدا، لەوێ کرنۆش دەبات لەوێ بەردەوام وا دەمێنێتەوە تاوەکو پێی دەگوترێت بەرزەوە بە، بگەڕێوە بۆ ئەو جێگەی کە لێوەی هاتووی، ئەویش دەگەڕێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە دەردەچێت، دیسان دەڕوات تا دەگاتە جێگای ڕاوەستانی لە ژێر عەرشدا و لەوێ کرنۆش دەبات، لەوێ بەردەوام وا دەمێنێتەوە تاوەکو پێی دەگوترێت: بەرزەوە بە، بگەڕێوە بۆ ئەو جێگەی کە لێوەی هاتووی، ئەویش دەگەڕێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە دەردەچێت))

واتە: بووەتە کارێکی ئاسایی کەوا هەموو ڕۆژێك لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵبێت و لە ڕۆژئاواوە ئاوا بێت.

ئەمجار فەرمووی: ((ثُمَّ تَجْرِي لَا يَسْتَنْكِرُ النَّاسَ مِنْهَا شَيْئًا، حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَى مُسْتَقَرِّهَا ذَاكَ تَحْتَ الْعَرْشِ، فَيُقَالُ لَهَا: ارْتَفِعِي، أَصْبِحِي طَالِعَةً مِنْ مَغْرِبِكِ، فَتُصْبِحُ طَالِعَةً مِنْ مَغْرِبِهَا)) واتە: پاشان دەڕوات کە خەڵکی هیچ گومان و جیاوازییەکی لێ نابێت تاکو دەگاتە جێگای ڕاوەستانی خۆی کە ئەویش لە ژێر عەرشی خوادایە، پێی دەگوترێت: بەرز بەرەوە، لە ڕۆژئاواوە هەڵبێ، ئەویش لە ڕۆژئاواوە هەڵدێ)).

کارەکە بە تەواوی گۆڕاوە، دڵنیابە ئەو ڕۆژە دێت کەوا پادشا و خاوەن و دروستکەری ڕۆژ فەرمان بە ڕۆژ بکات لە ڕۆژئاواوە هەڵبێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَتَدْرُونَ مَتَى ذَاكُمْ؟ ذَاكَ حِينَ)). ﴿لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا﴾ (الأنعام: ١٥٨) واتە: ئایە دەزانن ئەوە کەی ڕوو دەدات؟ ئەوە ئەو کاتەیە کە دەڵێت: ((.. ئیتر هەر کەسێك

پێش ئەوە باوەڕی نەهێنابێ و ئەو ڕۆژە باوەڕ بهێنێ، هیچ قازانجێکی لێ ناکات یان بیبەوێ لەو ماوەیەدا چاکەیەك بە دەست بهێنێ ئەوا بێ سوود دەبێت کەوابوو پێش ئەو ڕۆژە باوەڕ بهێنن و کارێکی باشیش وە دەست بخەن بۆ خۆتان..))

هەموو کارەکە تەواو بوو، إنا لله وإنا إليه راجعون، دەرگای تەوبە داخرا، وریابە برای خۆشەویستم! کاتێك ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەڵات چیتر خوای گەورە تەوبەی بێباوەڕ وەرناگرێت، یان تەوبەی موسڵمانێکی سەرپێچی کار، بۆ؟ کاتێ هەموو دروستکراوەکانی سەر زەوی ڕۆژ ببینن لە ڕۆژئاواوە دەرچێت ئەوا هەموو بوونەوەر ئیمان و باوەڕی خۆیان ئاشکرا دەکەن، بە ڕاستی دوورە و ئەو کارە زۆر دوورە چیتر ئیمان هێنانی هیچ کەسێك سوودی بۆ خاوەنەکەی نییە!!

ئیمامی (بوخاری و موسلیم)[1] ڕیوایەتیان کردوە لە فەرموودەی (ابو هریرە) وە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا، فَإِذَا طَلَعَتْ مِنْ مَغْرِبِهَا آمَنَ النَّاسُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ، فَيَوْمَئِذٍ : ﴿لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا﴾(الأنعام: ١٥٨) واتە: قیامەت هەڵناسێت تاوەکو ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەڵدێت، ئەگەر لە ڕۆژئاواوە هەڵات ئەوا هەموو خەڵکی باوەڕ دەهێنن بەڵام ئەو کاتە.... ((باوەڕهێنان بۆ هیچ کەسێك سوودی نییە، ئەگەر پێشتر باوەڕی نەهێنابێت یان بە باوەڕەکەی خۆی چاکەی نەکردبێت)).

لە ڕیوایەتێکی تردا کە لە (صحيح مسلم)[2] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابو هريرە)وە پێغەمبەری ئازیزﷺ فەرموویەتی: ((ثَلَاثٌ إِذَا خَرَجْنَ لَا يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا: طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَالدَّجَّالُ، وَدَابَّةُ الْأَرْضِ)) واتە: سێ شت هەن ئەگەر دەرکەوتن ئەوا چیتر باوەڕهێنان سوودی نییە بۆ کەسێك پێشتر باوەڕی نەهێنابێت یان بە باوەڕەکەی خۆی چاکەی

---

١ ـ أخرجه البخاري (٤٦٣٥ , ٤٦٣٦) و مسلم (١٥٧) .

٢ ـ أخرجه مسلم (١٥٨) .

نەکردبێت: هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە و دەججال و زیندەوەرە سەیرەکەی زەوی)).

جائەگەر هاتوو هەر نیشانەیەك لەو سێ نیشانەیە دەرکەوت ئەوا چیتر تەوبەی بێباوەر و موسڵمانی یاخیبوو وەرناگیرێت.

جا خێراکە براکەم.. ڕوو لە خوا بکە و بگەڕێوە بۆ لای ئەو، چونکە هێشتا ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە دەرنەچوە و هێشتا ڕوحەکان نەگەیشتوەتە گەروو!!

لە (مسند أحمد)[1] دا بە سەنەدێکی (صحیح) هاتوە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی عمر) ەوە ڕیوایەت کراوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِنَّ اللَّهَ يَقْبَلُ تَوْبَةَ الْعَبْدِ مَا لَمْ يُغَرْغِرْ)) واتە: خوای گەورە تەوبەی بەندەکانی وەردەگرێت ئەگەر ڕوحەکە نەگاتە گەروو)) ئەمەشە لە گەڵ قورئاندا هەرگیز جیاواز نییە، چونکە تۆ نازانێت ئەو ساتە کەیە لە سەر جێگەی مردن دەنویت و ڕوحەکەت دەگاتە گەروو.

لە (صحیح مسلم)[2] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابو موسی الاشعری) یەوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرمویەتی: ((إِنَّ اللَّهَ ــ عَزَّ وَجَلَّ ــ يَبْسُطُ يَدَهُ بِاللَّيْلِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ النَّهَارِ، وَيَبْسُطُ يَدَهُ بِالنَّهَارِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ اللَّيْلِ، حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا)).واتە: خوای باڵادەست بەشەو دەستی ڕادەخات بۆ ئەوەی گوناهبارانی ڕۆژ تەوبە بکەن، بەڕۆژیش دەستی ڕادەخات بۆ ئەوەی گوناهبارانی شەو تەوبە بکەن، هەتا خۆر لە خۆر ئاواوە هەڵدێت)).

هێشتا دەرگا کراوەیە بۆ تاوانباران و سەرپێچیکاران ـ نمونەی من ـ کەوابوو خێراکە.. پەلەبکە.. چاوەڕێی چی دەکەیت؟ خوشکە بەڕێزەکەم چاوەڕوانی چیت؟ هێشتا کات بە دەستەوە ماوە.

دع عنك ما قد فات في زمن الصبا    واذكر ذنوبك وابكها يا مذنب
لم ينسه الملكان حين نسيته    بل أثبتاه وأنت لاه تلعب
والروح منك وديعة أودعتها    ستردها بالرغم منك وتسلب

---

١ ـ أخرجه أحمد (١٣٢/٢) والترمذي (٣٥٣٧) وقال : هذا حديث حسن غريب , وابن ماجه (٤٢٥٣) وحسنه الألباني في (صحيح الجامع ) (١٩٠٣) .

٢ ـ أخرجه مسلم (٢٧٥٩) .

وغـــرور دنيـــاك التـــى تـــسعى لهـــا   دار حقيقتهـــا متـــاع  يذهـــب
الليـــل فـــاعلم و النهـــار كلاهمـــا   أنفاسنا فيهما تعـــد وتحسب

واتـە: واز بهێنـە لـەوەی کـە ڕۆیـشت لـە تەمـەنی لاوێتیـدا و یـادی تاوەنـەکانت بکەرەوە و بگری ئەی تاوانبار، دوو فریشتەکە لە بیریـان نـەکرد کـاتێ تـۆ لـە بـیرت کرد بەڵکو ئەوان تۆماریان کرد و کەچی تۆ رادەبوێری و یاریت دەکرد، روحـیش لای تۆ بە بارمتە دانراوە، هەرکاتێك بێت دەیگەڕیننـەوە و دەیبەنـەوە بتـەوێت یـان نـا، مـەغرور بونـت بـەو دونیایـە کـە هـەوڵی بـۆ دەدەی، ئـەوە ماڵێکـە و راسـتیەکەی شمەکێکـــــە و دەڕوات، شـــــەوگار و ڕۆژگـــــار هـــــەردوو بزانـــــە هەناسەکانمان تیایاندا دەژمێردرێت و حیساب دەکرێت)).

هێشتا تەمەن ماوییەتی دەست و برد بکە، سوێند بـە خـوا! هـیچ کەسێك دڵنیـا نییە لە خۆی کەی دەمرێت، یان کەی کۆچ دەکات و سەفەر دەکات، ئەمڕۆ و سبەی مەکە، کارەکە دوا مەخە، هەرگیز مەڵێ: ماوەیەکی تر تەوبە دەکەم! نـەخێر.. هـەر ئێستا هەستە و تەوبە و گەڕانەوەکەت نوێ بکەرەوە، پەیمان بە خواکەت بدە چیتر واز لە سەرپێچی بهێنی، دەست بە گوێڕایەڵییەوە بگرە، واز لە سوو خواردن بهێنـە، لە گەڵ دایك و باوکتدا مامەڵەی باش بکە.

تـۆش ــ خوشـکی بـەڕێزم ــ پـەیمان بـدە خواکـەت کـەوا پۆشـاکی شـەرعی ببۆشیت و (حیجاب) لـە بـەر بکـەیت، پارێزگـاری لـە نوێـژەکانت بکـەیت لـە کـات و ساتی خۆیدا، لە گەڵ دەرهاوسێکانتدا باش بیت، کارەکانت بە رێك و پێکی ئـەنجام بدەیت، شایەتی بدەیت بۆ ئەم دینە بە گوفتار و دڵ و رەوشت.

پەیمان بە خواکەت بدە ـ ئەی یەکتاپەرستی سەربەرز ــ کـەوا فەرمانـەکانی خوا و خۆشەویستەکەت ﷺ جێ بەجێ بکەیت، واز لـە قەدەغـەکراوەکانیان بهێنی، لە سەر سنوورەکان رابوەستی، چیتر لە هەر کاتێکدا مردن بوو بە میوانـت ئـەوا بـە خۆشـی و ئاسـوودەییەوە پێـشوازی لـێ دەکـەیت و لـە دونیـا و دوارۆژدا بـەختیار دەبیت.

أيـــا عبـــد كـــم يـــراك الله عاصـــيا   حريصا على الدنيا وللموت ناسيا

أنسيت لقاء الله واللحد والثرى ويوما عَبُوساً تشيبُ فيه النواصيا
لو أن المرء لم يلبس ثيابا من التقى تجرد عريانا ولو كان كاسيا
ولو أن الدنيا تدوم لأهلها لكان رسول الله حياً وباقيا
ولكنها تفنى ويفنى نعيمها وتبقى الذنوب والمعاصي كما هي

واتە: ئەی بەندەکە تا کەی خودا لە سەرپێچیدا دەتبینێ سووری لە سەر دونیا و مردنت لە بیر کردوە، ئایا دیدەنی خوا و گۆڕ و خاکت لە بیر چوە و ڕۆژێکی گرژ و مۆن کە پەرچەم و ناوچاوەکان تیایدا سپی دەبێت، ئەگەر کەسێك پۆشاکی تەقوا نەپۆشێت ئەوا کەسێکی رووتە هەرچەندە جل و بەرگی لە بەردا بێت، ئەگەر دونیا بۆ دانیشتوانەکەی بەردەوام بوایە ئەوا پێغەمبەری خوا ﷺ زیندوو دەبوو و دەمایەوە، بەڵام لە ناو دەچێت و خۆشگوزرانەکەیشی لە ناو دەچێت کەچی تاوان سەرپێچیەکان هەر وەکو خۆی دەمێننەوە)).

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: ئایا بۆ خوای گەورە تەوبەی هیچ کەسێك وەرناگرێت ئەگەر ئەو نیشانانە دەرکەوت؟ وەڵامەکەی ئەویە: چونکە خەڵکی نیشانەکان بە ئاشکرا دەبینن، ئەو نیشانانە دەبنە هۆی ملکەچ بوونی گەردنەکان بۆ ئەوەی باوەر بهێنن بە خوای گەورە، لە گەڵ ئەوەشدا زۆربەی خەڵکی وەڵامی ئەو بانگەوازەی خوا نادەنەوە، وەڵامی ئەو ئامۆژگاری و نیشانەکانی خوا نادەنەوە، بەڵکو خەڵکی وا هەبوون کاتێ باسی قورئانت بۆ بکردبایە گاڵتەی پێ دەکردی، گاڵتەی بە سوننەت دەکرد، فەرموودەکانی پێغەمبەری ئازیزی ﷺ بە درۆ دەخستەوە، کاتێ مردن یەخەی پێ گرتن، لە سەر جێگە مردن راکشا، هەموو یادەوەرییەکانی دێتەوە یاد، بەڵام چیتر هیچ شتێك سوودی نییە، چونکە ئەوەتا روحەکە لە گەرووی دەرچوو.. چەند بەستەزمانە!! ئیمامی ئەحمەد لە (مسند)ەکەیدا و ابن ماجە لە (سنن) ەکەیدا بە سەنەدێکی (صحیح)[1] ریوایەتیان کردوە لە فەرموودەی (بسر ی کوری جحاش) ەوە : ((أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَصَقَ يَوْمًا فِي كَفِّهِ، فَوَضَعَ عَلَيْهَا أُصْبُعَهُ، ثُمَّ

١ ـ أخرجه أحمد (٢١٠/٤) وابن ماجه (٢٧٠٧) وقال في (الزوائد) : إسناده صحيح ورجاله ثقات ) ووافقه العلامة الألباني في (الصحيحة) (١١٤٣) .

قَالَ: ((قَالَ اللَّهُ: ابْنَ آدَمَ أَنَّى تُعْجِزُنِي وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِنْ مِثْلِ هَذِهِ؟ حَتَّى إِذَا سَوَّيْتُكَ وَعَدَلْتُكَ، مَشَيْتَ بَيْنَ بُرْدَيْنِ وَلِلْأَرْضِ مِنْكَ وَئِيدٌ، فَجَمَعْتَ وَمَنَعْتَ، حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ التَّرَاقِيَ، قُلْتَ: أَتَصَدَّقُ، وَأَنَّى أَوَانُ الصَّدَقَةِ؟)) واته: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ تفی کردە ناو لەپی خۆی و پەنجەی خستە سەری و گوتی: خوای گەورە دەفەرموێ: ئەی نەوەی ئادەم چۆن لە دەسەڵاتم دەردەچی کەچی من لە شتیٰ وا تۆم دروست کردوە؟ تاکو ئەندامەکانی بە جوانی ڕێك خستووی، لە نێوان دوو کراس و جلوبەرگدا ڕێ دەکەیت و قورسی و گرانیت بە سەر زەوییەوەیە، سەروەت و سامانت کۆ دەکردەوە و لە خەڵکیت دەگرتەوە، تاکو ڕوحت گەیشتە گەرووت، گوتت: ئێستا سامان دەبەخشم، ئەو کاتە کاتی بەخشین کەی ماوە؟!))

لەم کاتەدا قۆناغی دڵنیایی دێت، بە چاوەکانی خۆت ڕوداوەکان دەبینی، وەکو دەرچوونی مەسیحی دەججال و یەئجوج و مەئجوج و عیسا ی کوڕی مەریەم و هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە، ئەم هەموو ڕوداوانە تۆی گواستەوە بۆ قۆناغی دڵنیایی و بەراورد کردنی ڕاستییەکان، ئەمجار لەو ڕۆژەی کە ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە دەردەچێت هەر هەمان ڕۆژ گیاندارە سەیرەکە دەردەچێت!!

ئایا ئەو گیاندارە سەیرە (الدابە) چییە؟ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ﴾(النمل: ٨٢) واتە: کاتیٰ کە فەرمانی سزای ئەوانە دراو بڕیاریش درا کە قیامەت بێت، ئەوا لە سکی زەویدا (دابة الأرض)یان بۆ دەردەهێنین قسەیان لە گەڵ دەکا و دەڵیٰ: بە ڕاستی زۆربەی ئەم خەڵکە باوەڕیان بە ئایەتەکانی ئێمە نەهێناوە یەقینیان پێیان نەبوو.))

هەرگیز نکۆڵی مەکە!! تۆ بو گوێی خۆت تەلەفون دەبیسی قسە دەکات و بە چاوەکانت تەلەفزیون دەبینی قسە دەکات، چیتر هەرگیز ئەو شتانە لە گەڵ عەقڵی خۆتدا بەراورد مەکە، بۆیە هیچ کەسێکی ژیر بۆی نییە دەربارەی ئەو نیشانە و ڕوداوانە بدویٰ تەنها بە بەڵگەی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری ئازیز نەبێت ﷺ.

ئیمامی (مسلم) لە (صحیح)[1] ەکەیدا ریوایەتی کردوە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی عمرو)ەوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((إِنَّ أَوَّلَ الْآيَاتِ خُرُوجًا طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَخُرُوجُ الدَّابَّةِ عَلَى النَّاسِ ضُحًى، وَأَيُّهُمَا مَا كَانَتْ قَبْلَ صَاحِبَتِهَا، فَالْأُخْرَى عَلَى إِثْرِهَا قَرِيبًا)).واتە: یەکەمین نیشانەیەك دەردەچێت هەڵاتنی رۆژە لە رۆژئاواوە و دەرچوونی دەعباکەیە بۆ سەر خەڵکی لە چێشتەنگاودا، هەرکامەیان پێش ئەویان بوو ئەوی تریشی بە شوێندا نزیکە)).

من پێش ئێستا ئەو فەرموودەیەم باس کرد کە لە (مستدرك الحاكم) دا بە سەنەدێکی (صحیح) هاتوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((الأمارات خرزات منظومات في سلك، فإن يقطع السلك يتبع بعضها بعضا)) واتە: نیشانەکان وەك دەنکەکانن لە دەزوویەکدا هۆنراونەتەوە، ئەگەر دەزووەکە بچڕا ئەوا شوێنی یەکتر دەکەون))

ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ کتێبەکانی تەفسیر و مێژوو و چیرۆکەکان ئەوا هەواڵی زۆر سەیر دەبینی، چەندەها ریوایەتی زۆر نامۆ دەبینی لە بارەی زیندەوەرە سەیرەکەوە (الدابە) هاتوون[2]، بەڵام هەرگیز مرۆڤێکی ژیر بۆی نییە، ئەگەر رێز لە زانست و عەقڵ و بەڵگە و لێکۆڵینەوەی زانستی بگرێت خۆی خەریك بکات بەو هەواڵانەوە، یان خۆی خەریك بکات بەو خەیاڵات و چیرۆکە ئەفساناوییانەوە، بەڵکو تەنها ئەوەی قورئان و فەرموودەکان باسیان کردوە بەسە بۆ ئێمە گوێی لێ بگرین، لەو بەڵگەیانەدا هاتوە کەوا زیندەوەرە سەیرەکە دەردەچێت و دێتە گوفتار و لە

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٩٤١)

٢ ـ هەندێك باسی ئەوە دەکەن کە زیندەوەرەکە بەچکەی حوشترەکەی پێغەمبەر (صالح) ە ! هەندێکیان دەڵێن :ئەو مارەیە کە لە سەر کەعبە دەرکەوت و لە بەردەم قورەیش وەستا کاتێ ویستیان کەعبە نوێژەن بکەنەوە و هەندێکیان وەسفی ئەو زیندەوەرە دەکەن کە گوایە سەری وەکو سەری گایە و گوێیەکانی وەکو گوێی فیلە و چاوەکانی چاوی بەرازە ! هەموو ئەوانە هیچ بناغەیەکی نییە و هیچ بەهایەکی زانستی نییە و نابێت خۆمانی پێوە سەرقاڵ بکەین، تەنها قورئان و فەرموودەکانمان بەسە چونکە ئەو شتانە شتی غەیبین و نابێت هیچ عەقڵێك بەشداری تێدا بکات هەرچەندە خاوەنەکەی زیرەك و لێهاتوو بێ , ئەگینا ئەوە قسە بە سەر خواوە دەکات بە بێ زانیاری .

گەڵ خەڵکیدا قسە دەکات بە گوفتارێکی روون و ئاشکرا، بۆ ئەوەی پێیان بڵێت و هەواڵ بە ئەوان بگەیەنێت کەوا خەڵکی باوەڕیان بە ئایەتەکانی خوا نەهێناوە و بە درۆیان خستوەتەوە و دڵنیا نەبوون، چەندەها جار لە پاش پێغەمبەران زانایان یادی ئەوانی خستوە کەچی ئەوان گاڵتەیان پێ دەکردن و باوەڕیان نەدەکرد و بە درۆیان دەخستنەوە، بەڵام کەسی ئیماندار کە باوەڕی بە ئایەتەکانی خوا و فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ هێناوە بە دڵنیاییەوە دەزانێت کەوا ئەو زیندەوەرە سەیرە ئایەتێکە لە ئایەتەکانی خوای پەروەردگار، هەروەها نیشانەیەکە لە نیشانە گەورەکانی قیامەت، دەردەچێت بۆ ئەوەی کەسی ئیماندار و بێباوەڕ لە یەك جیا بکاتەوە و دیاریان بکات ـ ئەی پەروەردگارمان بمانپارێزە ـ کەسی ئیماندار دیاری دەکات و نێو چاوانی روناك دەبێتەوە، کەسی بێباوەڕ دیاری دەکات و سەر لووتی رەش دەبێتەوە، هەروەکو ئیمامی ئەحمەد لە (مسند)[1] کەیدا ریوایەتی کردوە لە فەرموودەی (ابو امامە)وە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((تَخْرُجُ الدَّابَّةُ فَتَسِمُ النَّاسَ عَلَى خَرَاطِيمِهِمْ، ثُمَّ يَغْمُرُونَ فِيكُمْ حَتَّى يَشْتَرِيَ الرَّجُلُ الْبَعِيرَ، فَيَقُولُ: مِمَّنْ اشْتَرَيْتَهُ؟ فَيَقُولُ: اشْتَرَيْتُهُ مِنْ أَحَدِ الْمُخَطَّمِينَ)) واتە: زیندەوەرەکە دەردەچێت و خەڵکی دیاری دەکات لە سەر لووتیان تاکو لە نێوانتاندا بڵاو دەبنەوە تا پیاوێك وشترێك دەکڕێت و پێی دەگوترێت: لە کێ ئەو وشترەت کڕی، ئەویش دەڵێت: لە یەکێ لە دیاریکراوەکان))

هەروەها فەرموودەیەکی تر هەیە و پاڵپشتی ئەو فەرموودەیە، (ئیمامی ئەحمەد) و (الترمذي) و (ابن ماجە) و (الطبري) و (اسحاق ی کوڕی راهویە) لە (مسند)[2] ەکەیدا ریوایەتیان کردوە بە سەنەدێك کە (علی کوڕی زید)ی تێدایە لە

١ ـ أخرجه أحمد (٥/٢٦٨) والبخاري في (التاريخ الكبير) (٣/٢/١٧٢) وابن مردويه كما في (الدر المنثور) وابو نعيم الأصبهاني في أخبار أصبهان (٢/١٢٤) والبغوي في الجعديات (٢٤٦٨) بسند صحيح عن أبي أمامة أما تضعيفه بعمر بن عبدالرحمن ابن عطية بن دلاف فما لا وجه له , فقد وثقه ابن المديني كما في (سؤالات) محمد بن أبي شيبة ( ١١٤) ووثقه كذلك ابن حبان والهيثمي ,أنظر (الصحيحة) (٣٢٢) وتعليق الأرناؤوط على المسند (٢٢٣٠٨) .

٢ ـ أخرجه أحمد (٢/٢٩٥ ,٤٩١) والترمذي (٣١٨٧) وقال: – هذا حديث حسن غريب , وابن ماجه (٤٠٦٦) والحاكم (٤/٤٨٥) والطيالسي (٢٦٧٨) والطبري في (تفسيره) (٨٢) واسحاق في (مسنده) (٤٤٢) وهو في (الضعيفة) (١١٠٨) و (ضعيف الجامع) (٢٤١٣)

فەرموودەی ابو هریرەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((تَخْرُجُ الدَّابَّـةُ مَعَهَا عَـصَا مُوسَـى، وَخَـاتَمُ سُـلَيْمَانَ، فَتَجْلُـو وَجْـهَ الْمُـؤْمِنِ بِالْعَـصَا، وَتَخْـتِمُ أَنْـفَ الْكَـافِرِ بِالْخَاتَمِ، حَتَّى إِنَّ أَهْلَ الْخِوَانِ لَيَجْتَمِعُونَ، فَيَقُولُ هَذَا: يَا مُؤْمِنُ، وَيَقُولُ هَذَا: يَا كَافِرُ)) واتە: زیندەوەرەکە دەردەچێت و دارەکەی (موسا) و ئەنگوستیلەکەی (سلیمان)ی پێیە بە دارەکە ڕووی ئیمانداران پاك دەکاتەوە و بە ئەنگوستیلەکە لووتی بێ باوەڕ دیاری دەکات، تاکو خەڵکانێك لە سەر یەك سفرە دادەنیشن، یەکێکیان بە ئەویتر دەڵێت: ئەی ئیماندار، ئەویش دەڵێت: ئەی بێباوەڕ))

جا ئەو زیندەوەرە لە زەوییەوە دەردەچێت، لە کاتێکدا خوای گەورە ویستی لە سەر بێت، لەو ڕۆژەی کە ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە دەردەچێت ئەو زیندەوەرە سەیرە دەردەچێت، بۆ ئەوەی لە گەڵ خەڵکیدا قسە بکات، بۆ ئەوەی هەواڵیان پێ بگەیەنێت کەوا خەڵکی بە ئایەتەکانی خوای گەورە باوەڕیان نەهێناوە، هەرچەندە لە پاش ئەوە هەرکەسێ باوەڕ بهێنێ ئەوا باوەڕەکەی هیچ سوود و بایەخێکی نییە، چونکە هەروەکو باسم کرد: ئەگەر زیندەوەرە سەیرەکە دەرچوو و ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە دەرچوو و ئەو دوکەڵە دەرکەوت کە سەر زەوی پڕ دەکات، ئەگەر ئەو دوکەڵە توشی موسڵمان ببێت هەروەکو ئەوەیە کەسێك توشی هەڵامەت ببێت کە ئێستا ڕۆژانە دەیبینین، بەڵام کەسی بێباوەڕ ئەم دوکەڵە دەچێتە ژوورەوەی و دەبێتە هۆی پەلەماندنی لە هەموو لایەکەوە لێی دەردەچێت، ئەمەشە نیشانەیەکە لە نیشانە گەورەکانی قیامەت.

پاش ئەوە خوای گەورە بایەکی خۆش و هێمن ڕەوانە دەکات، بۆ ئەوەی گیانی ئیماندارە یەکتاپەرستەکان بکێشێ لە سەر زەویدا، هیچ کەسێك ناهێڵێ لە سەر زەویدا بە ئەندازەی دەنکە گەردیلەیەك ئیمان لەدڵیدا ببێت ئیللا گیانی دەکێشێت و دەمرێت، هەروەکو چۆن لە (صحیح مسلم)[1] دا هاتوە لە فەرمودەی (عبدالله ی کوڕی عمرو)ەوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((يُرْسِـلُ اللَّـهُ رِيحًـا بَـارِدَةً مِـنْ قِبَلِ الشَّأْمِ فَلَا يَبْقَى عَلَى وَجْهِ الْأَرْضِ أَحَدٌ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِـنْ خَيْـرٍ أَوْ إِيمَـانٍ إِلَّـا

---

١ ــ أخرجه مسلم (٢٩٤٠).

قَبَضَتْهُ، حتى لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ دَخَلَ فِي كَبَدِ جَبَلٍ لَدَخَلَتْهُ عَلَيْهِ)) واتە: خوای گەورە بایەکی سارد لە ڕووی شامەوە ڕەوانە دەکات، هیچ کەسێك لە سەر ڕووی زەویدا نامێنێتەوە بە ئەندازەی گەردیلەیەك ئیمان یان خەیر لە دڵیدا بێت ئیللا دەیکێشێت، تەنانەت ئەگەر کەسێکتان بچێتە ناو جەرگەی چیاکانەوە ئەوا شوێنی دەکەوێت و پێی دەگات)).

عبدالله ی کوڕی عمرو دەفەرموێت: ((ثم يبقى شرار الناس عليهم تقوم الساعة))[1] واتە: ئەمجار خراپەکاران دەمێننەوە و قیامەت بە سەر ئەواندا هەڵدەستێت)).

لە ڕیوایەتێکی تردا کە لە (صحيح مسلم)[2] دا هاتوە لە فەرموودەی (أنس)ەوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((لا تقوم الساعة حتى لا يقال في الأرض الله الله)) واتە: قیامەت هەڵناسێت تاکو لە سەر زەویدا کەس نامێنێت بڵێت: الله الله)).

هەروەها لە (صحيح مسلم)[3] هاتوە لە فەرموودەی (ابوهريرە) ەوە کەوا خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: ((إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ رِيحًا مِنْ الْيَمَنِ أَلْيَنَ مِنْ الْحَرِيرِ، فَلا تَدعُ أَحَدًا فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ - وفي رواية - مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ إِيمَانٍ إِلَّا قَبَضَتْهُ)) واتە: خوای گەورە شنەبایەك لە یەمەنەوە هەڵدەکات نەرم و ناسکترە لە ئاورێشم، هەر کەسێك بە ئەندازەی دانەوێڵەیەك ئیمان - لە ڕیوایوتێکی تردا - بە ئەندازەی گەردیلەیەك ئیمان لە دڵیدا بێت گیانی دەکێشێت))

جا ئەو بایە ڕەنگە بایەکی (یەمانی) بێت واتە لە ڕووی یەمەنەوە هەڵدەکات، لە پاش کۆکردنەوەی هەموو دەقەکان، یان ڕەنگە هەڵچوونی ئەو بایە لە یەکێ لەو دوو هەرێمەوە بێت و پاشان بگاتە ئەویتر.[4]

داوا لە خوای باڵادەست دەکەم یارمەتی داپێتم بۆ ئەوەی ڕوداوەکان پێکەوە ببەستم، هەروەها نیشانەکان پێکەوە گرێ بدەم، بۆ ئەوەی بە باشی لە ماناکەی

١ - أخرجه مسلم (١٩٢٤).
٢ - أخرجه مسلم (١٤٨) عن أنس .
٣ - أخرجه مسلم (١١٧) .
٤ - شرح مسلم (١/٢٣١) .

تێبگەیت، بۆ ئەوەی بە دڵ و عەقڵ لە یەك كاتدا بژیت.

دەڵێم: پوختەی قسەكان ئەوەیە، دوكەڵێك دەردەچێت و پاشان بایەكی سارد هەڵدەكات و گیانی ئیمانداران دەكێشێ، دەبێتە هۆی ئەوەی كە تەنها یەك ئیماندار لە سەر ڕووی زەویدا نەمێنێت، پاش ئەوە چەند نیشانەیەكی گەورە هەن، وەكو سێ ڕۆچوونەكە و ئەو ئاگرەی لە ڕۆژهەڵاتەوە دەردەچێت یان لە یەمەنەوە خەڵكی رادەماڵێت بەرەو ڕۆژئاوا.[1]

لە سۆز و میهرەبانی خوا ئەوەیە كە ئوممەتی (محمد) ﷺ ئەو نیشانە سامناك و ترسناكە نابینن، چونكە ئەو نیشانەیە لە نمونە و ئایەتی سزای خوای گەورەن، بۆیە تەنها بێباوەڕان ئەو نیشانەیە دەبینن.

جا ئیمانداران هەموو مردوون و كۆچی دواییان كردوە، بۆیە لێرەدا هیچ سەیر نەبێت لای تۆ ئەگەر بڵێم: لەم قۆناغەدا كەعبەی پیرۆز دەروخێنرێت! بەڵێ، چونكە لەو كاتەدا تەنها ئیماندارێكیش نەماوە بۆ ئەوەی حەجی ماڵی خوا بكات چونكە قیامەت ڕاستەوخۆ لە پاش ئەو ڕوداوانە هەڵدەستێت، بەڵام بە كات و پێوەری ئێمە نییە، بەڵكو ئەوە لە زانست و زانیاری خوای گەورەیە ـ پاكی و بێ گەردی بۆ ئەو زاتە پیرۆزە ـ هەموو ئیمانداران دەمرن و چیتر هیچ كەسێك حەج ناكات.

لە (مستدرك الحاكم) و (مسند أبي يعلى)[2] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابو سعيدالخدری)یەوە كەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((لا تقوم الساعة حتى لا يُحجَّ البيت)).واتە: قیامەت هەڵناسێت تاوەكو حەجی ماڵی خوا ناكرێت)).

هەروەها لە (صحيح البخاري و مسلم)[3]دا لە فەرموودەی (ابو هريرە)وە هاتوە كەوا پێغەمبەری ئازیز ﷺ فەرموویەتی: ((يخرب الكعبة ذو السويقتين من الحبشة)) واتە: خاوەنی دوو لاقی بارێك لە حەبەشە كەعبە دەروخێنێت)) ئا بەو شێوەیە پێغەمبەری ئازیز ﷺ وەسفی ئەو كەسەمان بۆ دەكات كە كەعبەی پیرۆز

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٩٠١) عن حذيفة بن أسيد .

٢ ـ أخرجه الحاكم (٤/٤٥٣) وصححه على شرط الشيخين , وابو يعلى (٩٥٦) وابن حبان (١٨٨٤) وعلقه البخاري في (صحيحه) (١٥٩٣) وصححه الألباني في (الصحيحة) (٢٤٣٠) .

٣ ـ أخرجه البخاري (١٥٩٦) و مسلم (٢٩٠٩)

دەروخێنێت، وەسفی ڕەنگی دەکات، وەسفی شێوەی دەکات، وەسفی لاقەکانی دەکات و دەڵێت: ((یخرب الكعبة ذو السويقتين)).

الحافظ لە (الفتح)[١] دا دەفەرموێت: ((هێنانەوەی (سويقة)ی بە شێوەی (مثنى) کە ئەویش بچووککراوەی وشەی (ساق)ە واتە: خاوەنی دوو لاقی باریکە)).

لە (صحيح البخاري)[٢] دا هاتوە لە ریوایەتی (ابن عباس)ەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((كأني به)) واتە: هەر دەڵێی دەیبینم و لە پێش چاومە، ((أسود أفحج، يقلعها حجرا حجرا))، پاکی و بێ گەردی بۆ خوا، ئەو وەسفە چەند بە وردی باس کراوە! ؟ ئەوا زانیمان کابرایەکی ڕەش پێستە، ئەی واتای: ((الأفحج)) چییە؟ أفحج: واتە: نێوان هەردوو لاقی لە یەکەوە دوورە، ((يقلعها حجرا حجرا)) واتە: بەرد بەرد کەعبە لە بن دەردەهێنێ.

لە (مسند أحمد)[٣] دا هاتوە بە سەنەدێك کە (الحافظ ابن كثير) بە (جيد) ی زانیوە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی عمرو) دەڵێت: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((يُخَرِّبُ الْكَعْبَةَ ذُو السُّوَيْقَتَيْنِ مِنْ الْحَبَشَةِ، وَيَسْلُبُهَا حِلْيَتَهَا وَيُجَرِّدُهَا مِنْ كِسْوَتِهَا، وَلَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ أُصَيْلِعَ أُفَيْدِعَ يَضْرِبُ عَلَيْهَا بِمِسْحَاتِهِ وَمِعْوَلِهِ)) واتە: کابرایەکی خاوەن دوولاقی باریك کەعبە دەروخێنێت، هەموو خشڵەکانی دەبات و بەرگەکەشی لێ دەکاتەوە، هەر دەڵێی لە پێش چاومە و دەیبینم کابرایەکی سەر ڕووتی گوجە، بە خاکەناز و قوڵنگەکەی لێی دەدا)).

واتای أصلع: ئەو کەسەی کە لە پێشەوە سەری ڕووتاوەتەوە.

لە فەرموودەیەکی (صحيح)دا لە (مسند أحمد)[٤] هاتوە لە فەرموودەی (ابو هريرە)وە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((وَلَنْ يَسْتَحِلَّ الْبَيْتَ إِلا أَهْلُهُ فَإِذَا

---

١ ـ الفتح (٣/٥٣٩) .

٢ ـ أخرجه البخاري (١٥٩٥)

٣ ـ أخرجه أحمد (٢/٢٢٠) وقال الحافظ ابن كثير في ( النهاية في الفتن) (٧٠) وهذا إسناد جيد قوي ) وصححه العلامة الألباني بشواهده في (الصحيحة) ( ٦/١/٥٥٥) .

٤ ـ أخرجه أحمد (٢/٢٩١ , ٣١٢) وابن أبي شيبة في (المصنف ) (١٥/٥٢ – ٥٣) والحاكم (٤/٤٥٢ – ٤٥٣) وصححه الألباني في ( الصحيحة) (٢٧٤٣) .

اسْتَحَلُّوهُ، فَلَا يُسْأَلُ عَنْ هَلَكَةِ الْعَرَبِ، ثُمَّ تَأْتِي الْحَبَشَةُ فَيُخَرِّبُونَهُ خَرَابًا لا يَعْمُرُ بَعْدَهُ أَبَدًا)).واتە: کەس کەعبە بە حەڵاڵ نازانێت جگە لە ئەهلەکەی، کە بە حەڵاڵیان زانی کەس پرسیاری فەوتانی عەرەب ناکات پاشان حەبەشییەکان دێن و کەعبە وێران دەکەن بە شێوەیەك چیتر هەرگیز نۆژەن ناکرێتەوە)).

کەوابوو ئەی موسڵمانان پەلە بکەن لە سەردان و زیارەتی ئەو ماڵە پیرۆزە، ئەی خودایە.. بۆ بەشمان مەکە لە سەردانی ئەو ماڵە پیرۆزە و حەج و عەمرەمان بە نسیب بکە و چاومان بگەشێتەوە بە بینینی ئەو جێگە بە نرخ و بە بەهایە هەر تۆ پشت و پەنامانی و توانات بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

براکانم...لە سەر ڕووی زەویدا هیچ کەسێك نامێنێت تەنها خراپەکاران نەبێت، قیامەتیش تەنها بە سەر ئەواندا هەڵدەستێت، هەر ئەوان دوایین نیشانەکانی قیامەت دەبینن کە بریتیە لەو سێ ڕۆچوونە: ڕۆچوونێك لە ڕۆژهەلات و ڕۆچوونێك لە ڕۆژئاواوە و ڕۆچوونێك لە نیمچە دورگەی عەرەبەوە، مانای ڕۆچوونیش ئاشکرایە، واتا لە ناوچون لە خوارەوە: لە فەرهەنگی (لسان العرب)[1] دا هاتوە: ((الخسف: ڕۆچوونی زەوی و ئەوەی بە سەریەوەیە بە ناخی زەویدا، (خسف الله بە الأرض خسفاً) خوای گەورە کردی بە ناخی زەویدا، ئەو ئایەتە پیرۆزە هەر بەو مانایە هاتووە کە دەفەرموێت: ﴿فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ﴾(القصص: ٨١) واتە: سەرەنجام خۆی و خانوەکەیمان برد بە ناخی زەویدا بە سامان و گەنجینەکەشیەوە)).

خوای گەورە ئەهلی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و ناوچەرگەی دورگەی عەرەب دەکاتە ژێر زەویدا.....

هەروەکو باسم کرد لەم قۆناغەدا تەنها یەك کەسی ئیمانداری یەکتاپەرست لە سەر ڕووی زەویدا نەماوە، لە سەر زەویدا هیچ کەسێك نەماوە بڵێت: الله الله، خراپەکارانی سەر زەوی هەر ئەوانن کە ئەو سێ ڕۆچوونە و ئاگرەکە دەبینن.

پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرموێت، هەروەکو لە فەموودەی (حذیفة) وە هاتوە و لە پێشدا باسم کرد: ((خسف بالمشرق، وخسف بالمغرب، وخسف بجزيرة العرب،

---

١ ــ لسان العرب ( مادة خسف ٩/٦٧) .

وآخـر ذلـك نـار)) واتــە: ســێ ڕۆچــوون ڕوو دەدات: (ڕۆچــوونێك لــە ڕۆژهــەڵات) و (ڕۆچوونێك لە ڕۆژئاواوە) و (ڕۆچوونێك لە دورگەی عەرەبەوە) وە لە کۆتایی ئەوانـە (ئاگرێك دەردەچێت).

ئایا ئەو ئاگرە چییە؟ خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت: ((وآخر ذلـك نـار تخـرج مـن الـيمن)) واتــە: لـە کۆتـایی ئەوانـە ئاگرێـك لـە یەمەنـەوە دەردەچـێت). ســەرەتای دەرچـونی ئاگرەکـە لــە یەمەنەوەیــە ((مــن قعـر عـدن)) واتــە: لـە قـوڵایی شـاری عەدەنــەوە)، هــەر وەکـو دەزانـن عــەدەن شــارێکی بــەناوبانگ و ناسـراوە و وڵاتــی یەمەنیش ئاشکرا و ناسراوە، ((تطرد الناس إلی محشرهم)) واتە: خـەڵکی رادەماڵێـت بەرەو مەحشەر)). واتە: زەوی مەحشەر.

ژیانی دونیا کۆتایی پێهات، نیشانە گەورەکانی قیامەت کۆتایی پێهات.

لە پـاش ئـەوە قۆنـاغێکی تـر دەسـت پـێ دەکـات کـە بـە تـەواوی جیـاوازە لـەو قۆناغەکانی تر، بە فووکردنی کەڕەنادا دەست پێ دەکـات و هـەموو زەمـین دێنێتـە لەرزە، هـەموو پەیوەندییـەکانی گـەردوون و سـەر زەوی تێـك و پێـك دەشـکێنێت، کاتێك کە خوای پەروەدگار فەرمان دەکاتە ئیسرافیل بە فووکردن بە کەڕەنادا، ئایا ئەم کەڕەنایە چییە؟

ئیمامی (أحمد و ابو داود و الترمذي)[1] بە سەنەدێکی (صحیح) ریوایـەتیان کـردوە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی عمرو)ەوە دەفەرموێت: ((جاء أعرابي إلی النبي ﷺ فقال: ما الصور؟ قال: ((قرن ینفخ فیه)) واتـا: کابرایـەکی دەشـتەکی هـات بـۆ لای پێغەمبەری خواﷺ و فەرمووی: ئایا (الصور) چییە؟ ئەویش فەرمووی: کەڕەنایەکە فووی پێدا دەکرێت))، (القرن) وەکو کەڕەنایە (بووق).

ئایا کێ فووی پیادەکات؟ ئەوە (ئیسرافیل) ە.

ئایـا (ئیـسرافیل) کێیـە؟ فریـشتەیەکە لـە فریـشتەکانی پادشـای پادشـاکان، فووکردنی کەڕەنای پێسپێردراوە، ئەوە کار و پیشەی ئەوە و لەو پێناوەدا دروسـت

---

١ ـ أخرجه أحمد(٢/١٦٢ , ١٩٢) وابو داود(٤٧٤٢) والترمذي(٢٤٣٠) والنسائي في( الكبرى)(١١٢٥٠) والحاكم (٢/٤٣٦) وابن حبان(٢٥٧٠) وقال الترمذي : هذا حديث حسن , وصححه العلامة الألباني في ( الصحيحة) (١٠٨٠).

کراوە، هەروەکو ئاشکرایە فریشتەکان هەر یەکە و کارێکی پێ سپێردراوە، جبریل وەحی پێ سپێردراوە، میکائیل باران و رزق و رۆزی پێ سپێردراوە، (ملك الموت) گیان کێشانی پێ سپێردراوە، فریشتەی تر هەن لە کرنۆشدان و هەرگیز سەریان بەرز ناکەنەوە، فریشتەیەك سەری نەوی کردوە لە بەر دەستی خوادا و بەرزی ناکاتەوە، فریشتەیەك راوەستاوە و ئەوە کارەکەیەتی، فریشتەیەك تەسبیحات دەکات، فریشتەیەك داوای لێخۆشبوون و ئیستغفار دەکات، فریشتەیەك بە دەوری (بیت المعمور) دا لە ئاسمانی حەوتەم دەسوڕێتەوە،هەر فریشتەیەك کارێکی هەیەو لەو پێناوەدا دروست کراوە، هەرگیز لە زیکری خوا و تەسبیحات راناوەستن و دەست هەڵناگرن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ﴾(التحريم: ٦) واتە: نافەرمانی خوا ناکەن لە هەرشتێك فەرمانیان پێ بکا و هەر فەرمانێکیشیان پێ بسپێرێ بە خێرایی ئەنجامی دەدەن))، هەروەها دەفەرموێت: ﴿يُسَبِّحُونَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ لَا يَفۡتُرُونَ﴾(الأنبياء: ٢٠) واتە: بەردەوام بە شەو و بە رۆژ هەر تەسبیحات و پاکانە ئەکەن و هیچ کات دەست هەڵناگرن و بەڵکو هەردەم تەسبیحی دەکەن)). بەڵام کار و پیشەی ئیسرافیل تەنها ئەوەیە کە فوو بکات بە کەڕەنادا، ئایا ژمارەی فووکردنەکان چەندن؟ ئەهلی زانست و زانیاری لەو بابەتەدا یەکدەنگ نین، هەندێکیان دەڵێن: ژمارەی فووکردنەکان دوو دانەن[1]، بەڵام رای پەسەند ئەوەیە ــ والله أعلم ــ کە سێ فووکردنە: فووکردنێکی ترس و داچڵەکینە (نفخة الفزع)، فووکردنێکی بێهۆشکردن و بورانەوەیە (نفخة الصعق)، فووکردنێکی زیندووبونەوەیە (نفخة البعث).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۚ وَكُلٌّ أَتَوۡهُ دَٰخِرِينَ﴾(النمل: ٨٧) واتە: ئەو رۆژە وەبیربێنە ئەی موحەممەد ﷺ کە فووئەکرێ بە کەڕەنادا بۆ مراندنی هەمووان، هەرکەس لە ئاسمانەکان و لەزەویدا هەیە ترس و بیمێکی زۆر دایدەگرێ و هەموو ئەمرن جگە

---

١ ــ انظر : (التذكرة )للقرطبي (ص ٢٠٩ ط الكتب العلمية ) فقد رجح أنها ثنتان , وكذا الحافظ ابن حجر في (الفتح) (٣٧٧/١١) . أما ابن تيمية وابن كثير وابن العربي فقالوا : هي ثلاث نفخات , ولكل فريق من هولاء دليله . راجع ( مجموع الفتاوى) ( ٣٤١/١) و (٣٩٤/٣) والبداية والنهاية (٤٧/١) والنهاية في الفتن ( ٩١ , ٩٥) .

لەوانە کە ویستی خوا وایە نەترسن و بمێنن ئیتر دوای زینـدوو کردنـەوە هـەموو بـە ملکەچی و بە زەلیلی دێنە لای ئەو)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ((إِلا مَن شَاء اللّهُ)) ئایا ئـەو کەسـە کێیـە توشـی ئـەو ترسە نابێت؟

هەندێ لە زانایان فەرموویانـە: ئەوانـە شـەهیدان و پێغەمبـەرانن (علـیهم الـصلاه والسلام)، هەندێك دەڵێن: فریشتەکانن[1]، بەڵام من دەڵێم: هیچ شتێك لەو بـارەوە لـە پێغەمبەریﷺخواوە نەسەلمێنراوە، بۆیە لە ئایەتی ((إِلا مَن شَـاء اللّـهُ)) راوەسـتین هەروەکو چۆن خوای گەورە باسی کردوە، چیتر پێویستیمان بە زیاتر نییە، دڵنیابە ئەگەر لەوە زیاتر سوودی بوایـە بـۆ ئوممـەتی (موحەممـەد) ﷺئـەوا خـوای گـەورە باسی دەکرد، بۆیە تەنها باسی ئەوە دەکەین کـە لـە قورئـان و سـوننەت دا هـاتوە، داوا لە خوا دەکەم هەموومان بگێڕی لە دڵخۆشان و بەختیارانی دونیا و دوارۆژ، هەر خۆی پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

جا ئەهلی تەقوا و خۆپارێزان هەرگیز ناترسن، نە لە دونیادا و نە لە دوارۆژدا، نە لە کاتی سەرەمەرگدا و نە لە کاتی زیندووبونەوەدا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ﴾ (إبراهیم: ٢٧) واتە: ئەوانە کە باوەڕیان بە خوا و بە گشت بڕیارەکانی خوا هێناوە، بە هۆی ئەم وشە جێگر و نەگۆڕاوەی (لا اله الا الله) وە خوا پێگەیان قایم و سابت ئەکا لە ژیانی ئەم دونیا و لە ژیانی ئەو دونیا))

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾ (فصلت: ٣٠) واتە: بێ گومان ئەو کەسانەش فەرموویان: پەروەردگارمان خوایە پاشان خۆیان راست کردبوویەوە، واتە: زۆر بە مەحکەمی لە سەر یەکتاپەرستی وەستان و بە هیچ لایەکدا لایان نەدا، کاتێ مردن، لە گۆڕدا، لە

١ ــ راجع التذكرة (١٨٩) وما بعدها .

کاتی زیندووبوونەوەدا فریشتە دائەبەزنە لایان و پێیان دەڵێن: لە پاشەڕۆژتان مەترسن و بۆ ماڵ و منداڵیشتان - پاش خۆتان - دڵ زویر مەبن ئێمە چاودێریان دەبین موژدەتان لێ بێت بەو بەهەشتەی بەڵێنتان پێ دەدرا لە دونیادا، مزگێنی بێت ئەمڕۆ ئەکەونە خۆشی و شادییەوە.(٣٠)

ئەی خودایە.. ئیمان و یەکتاپەرستی و بەردەوام بوون و دامەزراوبوونمان بە نسیب بکە، من و ئێوە بگێڕێ لە ئیمانداره لە خواترس و راستگۆکان، هەر خۆی پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

ئیسرافیل فوودەکات بە کەڕەنادا ئەویش فووکردنی ترسە و ئەوە یەکەم فووکردنە، هەروەکو لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە (أحمد و ابو داود و الترمذي) بە سەنەدێکی (صحيح)[1] ریوایەتیان کردوە - لە بەر بوونی چەند (شواهد)ێك - لە فەرموودەی (ابو سعيد الخدري)یەوە، خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت: ((كَيْفَ أَنْعَمُ وَصَاحِبُ الْقَرْنِ قَدْ الْتَقَمَ الْقَرْنَ واستمع الإذن متى يؤمر بالنفخ))واتە: چۆن پشوو بدەم و دڵخۆش بم لە کاتێکدا ئیسرافیل کەڕەناکەی بە دەمگرتوە (قوتداوە) و گوێی شلکردوە چاوەڕوانی ئەوەیە کەی فەرمانی پێ دەکرێت؟)). لەریوایەتێکی تردا هاتوە[2]: ((وَحَنَى جَبْهَتَهُ يَسَّمَّعُ مَتَى يُؤْمَرُ فَيَنْفُخُ)) واتە: سەری دانواندوە و گوێ دەگرێ و چاوەڕوانی ئەوەیە کەی فەرمانی پێ دەکرێت))، لەریوایەتێکی ترد هاتوە[3]: ((وأصغى السمع متى يؤمر)) واتە: گوێی شلکردوە چاوەڕوانی ئەوەیە کەی فەرمانی پێ دەکرێت و ئەویش فوو بە کەڕەنادا بکات)).

ئایا بە باشی و بە جوانی لەو چەند وشەیە تێگەیشتی؟ ئیسرافیل کەڕەناکەی بە دەستەوەیە، بە ئەسپایی گوێی گرتوە، چاوەکانی تێبڕیوە و ناپترووکێنێ، چاوەڕوانی فەرمانی خوای گەورە دەکات لە هەر کات و ساتێکدا، فووی پێدا بکە،

---

١ - أخرجه أحمد (٣/ ٧ , ٧٣ , ٣٧٤) والترمذي (٢٤٣١) وقال : هذا حديث حسن وابن ماجه (٤٢٧٣) بلفظ مقارب وعبد بن حميد في المنتخب ( ٨٨٦) والحميدي في (مسنده) (٧٥٤) عن أبي سعيد , قال الألباني : حسن لغيره وذلك لأن عطية العوفي ضعيف ) ا.هـ , لكنه توبع (الصحيحة ) (١٠٧٩) وللحديث شواهد أوردها الشيخ – رحمه الله تعالى – .

٢ - عند أحمد (٣٦٤/١) عن ابن عباس .

٣ - عند أحمد كذلك (٣٧٤/٤) عن زيد بن أرقم .

ئەویش فووی پێدا دەکات، فووکردنی ترس کە بە هۆیەوە هەموو گەردوون و زەوی دێنێتە لەرزە ـ لە بەشی داهاتودا بە درێژی باسی ئەوە دەکەم ـ انشاء الله ـ پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرموێت: ((کیف أنعم)) واتە: چۆن تام و چێژ لە ژیان وەرگرم و دڵنیا بم لە کاتێکدا ئیسرافیل چاوەڕوانە، لە هەر ساتێك فوو بە کەڕەنادا دەکات!! ئەو قسەیە لە سەر هاوەڵان گران بوو بۆیە فەرموویان: ((فما نقول یا رسول الله ﷺ؟ قال: ((قولوا: حسبنا الله ونعم الوکیل، علی الله توکلنا)) واتە: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئێمە چی بڵێین؟ ئەویش فەرمووی: بڵێن: حسبنا الله ونعم الوکیل، علی الله توکلنا)) چونکە هەرکەسێ ئەوە بڵێت ئەوا بە ئیزنی خوای گەورە دەکەوێتە نێو ئەمن و ئاسایش و دڵنیایی و ئارامییەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿فَٱنقَلَبُواْ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ سُوٓءٞ وَٱتَّبَعُواْ رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَظِيمٍ﴾ (آل عمران: ١٧٤) واتە: ئینجا لە ئاکامی ئەو پشت بەستنەیان بە خواوەوە بە بەخشش و نیعمەتێکی فراوانی خوا و تووشی هیچ ناخۆشی و نارەحەتییەکیش نەبوون لەو هەڕەشانە دەیانکرد هەر لە ڕەزامەندیی و خۆشنوودی خوا دەگەڕان، خواش خاوەنی بەخشش و بەهرەیەکی زۆر گەورەیە.))

ئایا پێغەمبەری ئازیزﷺبەو شێوەیە دەترسێت؟ بەڵێ، بە ئەندازەی خۆشەویستیت بۆ خوای بالادەست لێی دەترسیت و بەمەزنی دەزانیت، تا چەند خۆشەویستییەکەت زیاتر بێت ئەوا زیاتر دڵەکەت پڕ دەبێت لە ترسی ئەو، دڵنیاشبە کەوا سەر زەوی هیچ کەسێکی نەناسیوە لە (محمدی کوڕی عبدالله)ﷺزیاتر لە خواکەی بترسێت.

لەگەڵ مندا بیر لەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خواﷺ بکەرەوە: ((لن یدخل أحداً منکم عمله الجنة)) قالوا: ولا أنت یا رسول اللهﷺ؟ قال: ((ولا أنا إلا أن یتغمدني الله منه بفضلٍ ورحمة)) [1] واتە: هیچ کەسێك کردەوەکانی خۆی نایباتە بەهەشت))

---

١ ـ أخرجه البخاري (٦٤٦٣) و مسلم (٢٨١٦) .

وتیان: تەنانەت تۆیش ئەی پێغەمبەری خواﷺ؟ فەرمووی: تەنانەت منیش، مەگەر خوا بە میهرەبانی و فەزڵی خۆی بمپۆشێت)).

جا بە ئەندازەی ناسینت بۆ خوای گەورە لێی دەترسیت، هەروەها بە ئەندازەی خۆشەویستیت بۆ ئەو و زانیاریت دەربارەی سۆز و میهرەبانی و گەورەیی ئەو، پێغەمبەری خۆشەویستﷺ دەفەرموێت: ((فوالله لأنا أعلمهم بالله، وأشدهم له خشية))[1] واتە: سوێند بە خوا من لە هەموو کەسێك زیاتر خوا دەناسم و لە هەموو کەسێك زیاتر لێی دەترسم)).

لەو پێناوەدا پێغەمبەری ئازیز ﷺدەفەرموێت: ((كيف أنعم وقد ألتقم صاحب القرن القرن، وحنى جبهته،و أصغى سمعه ينتظر متى يؤمر)) واتە: چۆن پشوو بدەم و دڵخۆش بم لە کاتێکدا ئیسرافیل کەڕەناکەی گرتوەتەدەم و سەری دانواندوە و گوێ دەگرێ و چاوەڕوانی ئەوەیە کەی فەرمانی پێ دەکرێت)).

براکانم...لە گەڵ ئێوەدا زیاتر لە باسی ئیسرافیلدا دەبین لە پێش ئەوەی فووی ترس لێ بدات، بۆ ئەوەی لە بەشی داهاتوودا لە گەڵ ئەو دیمەنە مەترسیدارانەدا بە شێوەیەکی فراوانتر بژین، داوا لە خوا دەکەم لە دونیا و دوارۆژدا بمانپارێزی و ئەمن و ئاسایشمان لە دونیا و دوارۆژدا پێ بسپێرێ هەر خۆی پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

---

١ ـ أخرجه البخاري (٦١٠١) و مسلم (٢٣٥٦) .

# فووکردنی زیندووبونەوە

## ( نفخة البعث )

خوای گەورە فەرمان دەکاتە (ئیسرافیل) فوو بە کەڕەنادا بکات، ئەو فوەی کە هەموو بوونەوەر دێنێتە لەرزە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ وَكُلٌّ أَتَوْهُ دَٰخِرِينَ﴾ (النمل: ٨٧) واتە: ئەو ڕۆژە وەبیربێنە ئەی موحەممەد ﷺ کە فووئەکرێ بە کەڕەنادا بۆ مراندنی هەمووان، هەرکەس لە ئاسمانەکان و لەزەویدا هەیە ترس و بیمێکی زۆر دایدەگرێ و هەموو ئەمرن جگە لەوانە کە ویستی خوا وایە نەترسن و بمێنن، ئیتر دوای زیندوو کردنەوە هەموو بە ملکەچی و بە زەلیلی دێنە لای ئەو.))

ئەو فوەی کە شێواز و ڕواڵەتی هەموو جیهان دەگۆڕێت بە بێ ئەوەی هیچ شتێك بە جێ بهێڵێت، ئەوە فووی ترساندنە.. فووی تۆقاندنە.. حەز دەکەم ئەو دیمەنە ترسناکە بهێنیتە پێش چاوی خۆت کە توشی خراپەکاران دەبێت، ئەوانەی قیامەتیان بە سەردا هەڵدەستێت، هەروەکو ئەو ڕاستگۆیەی کە هەرگیز لە خۆوە قسە ناکات ﷺ بۆی باس کردووین، بیهێنە پێش چاوی خۆت زەوی دەست بە لەرزین دەکات، دەیشەکێنێتەوە هەروەکو با بە چرای هەڵواسراوی دەکات، زەوی دەلەرێتەوەو دەلەرزێ هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ ۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَىْءٌ عَظِيمٌ ﴿١﴾ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ ﴿٢﴾﴾(الحج)

بە ڕاستی ئەو زەمین لەرزەیە شتێکی مەزنە، واتە: کارێکی گەورەیە و بەڵایەکی سەختە و کوتەرێکی ترسناکە و ڕووداوێکی سامناکە و کارەساتێکی سەیرە.

دەمەوێت بیهێنیتە پێش چاوی خۆت، دایكێك كۆرپەكەی لە بیر دەچێت!! بەڵكو فڕێی دەداتە سەر زەوی لە ترسی ئەوەی كە دەیبیسی، لە ترسی ئەوەی بە چاوەكانی دەیبینی، بۆیە لەو ترس و بیمەدا خۆشەویسترین كەسی خۆی فەرامۆش دەكات، لە كاتێكدا ئەو بە بەزەییترین كەسە بۆی، سەرسام دەبێت لە كاتی شیر پێدانیدا[1] ﴿وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا﴾ واتە: ئافرەتی دووگیان و سكپڕ لە بەر ئەوەی ترسەكەی زاڵ بوە بە سەریدا و بوەتە هۆی تۆقاندنی بۆیە سكەكەی دادەنێ و لەباری دەچێت.))

جا مانای زەمین لەرزە یان بومەلەرزە ئەوەیە كە ناخ و دەروونەكان توشی ئەو ترس و بیمە دەبن،زەوی دێتە لەرزە و تەكان دەدات، ئاسمان لەت وپەت دەبێت و شەق دەبات، ئەستێرەكان تاریك دەبن و روناكییان نامێنێت، هەروەها خۆریش تاریك دەبێت و روناكی نامێنێت و لە دەستی دەدات، ئەو دڕندانەی كە لە پێش ئەوە خەڵكیان دەترسان ودەیانتۆقاند ئێستا خۆیان دەترسن و تۆقیون، لە كاتێكدا بەرەوە مەحشەر دەڕۆن، ئەو وشتر و وڵاخانە كە بە نرخترین شت بوون خەڵكی ـــ بە تایبەتی عەرەبەكان ـ شانازی بە خاوەندارییەتیەوە بكەن، ئێستا هیچ كەسێك بەر ناكات بە لایانەوە و فەرامۆش كراون، روبارەكان..دەریاكان..زەریاكان.. تاویان سەندوە و گەرم بوونە و بوونەتە پارچەیەك ئاگر، ئەو ئاگرە بە كوڵ و گڕگرتوە فڕێ دەداتە دەرەوە كە هیچ كەسێك چۆنییەتیەكەی نازانێت تەنها خوای گەورە نەبێت، ئەو چیایانە كە لە بەر زۆری زەویان پڕ كردوەتەوە، دەروخێن بە سەر زەویدا بەڵكو لە بن هەڵدەكنرێن و خاپوور دەبن، دەیانبینی هەروەكو خورییەكی پارچە پارچە بە ئاسمانەكاندا باڵ دەگرنەوە.

تكام وایە لە گەڵ مندا بە دڵت لە گەڵ ئەو روداوانەدا بژیت، لە پاش فووكردنی ترساندن، بۆ ئەوەی بە تەواوەتی لە چەند و چونی ئەو ترس و سامە تێبگەی كاتێك توشی ئەم گەردوونە دەبێت لە پاش ئەو فووكردنە، ئەگەر دەتەوێت بە جوانی تێبگەیت ئەوا تەنها لە سەرتە برۆیت ئەو چەند ئایەتە بخوێنیتەوە لە

---

١ ـ تفسير (ابن كثير) لسورة الحج : ١ .

سورەتی(التكوير و الأنفطار و الأنشقاق).

ئیمامی ئەحمەد لە (مسند)ەکەیدا و (الترمذي) لە (سنن)ەکەیدا بە سەنەدێکی (صحيح)[١] ریوایەتیان کردوە لە فەرموودەی (ابن عمر)ەوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((من سره أن ينظر إلى يوم القيامة كأنه رأي عين، فليقرأ: ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾ و ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتْ﴾ و ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ﴾ واتە: هەرکەسێك پێی خۆشە تەماشای ڕۆژی قیامەت بکات هەروەکو ئەوەی بە چاوەکانی دەیبینێ با سورەتی (التكوير و الأنفطار و الأنشقاق) بخوێنێتەوە)).

لەگەڵ مندا بیر لەو ئایەتە بکەرەوە و باش تێفکرە: ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾ واتە: روناکی ڕۆژ ڕۆیشت و ڕۆشنایی نەما ﴿وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتْ﴾ واتە: ئەستێرەکان پەرش و بڵاو بوونەوە و تاریك بوون، ڕۆشنایی و روناکی ئەوان نەما، هەمووی کەوتنە ناو دەریاکانەوە، ئەوانش هەموو دەبنە ئاگر و بڵێسە. ﴿وَإِذَا ٱلْجِبَالُ سُيِّرَتْ﴾واتە: چیاکان دەروخێن بە سەر زەویدا و تێك و پێك دەشکێن و وەکو خورییەکی شیکراوی لێ دێت، دەبێتە لمێکی شل، هەر وەکو خوری لێدێت، دەبێتە تۆز و خۆڵێکی پەرش و بڵاو، دەبێتە تراویلکە.﴿وَإِذَا ٱلْعِشَارُ عُطِّلَتْ﴾وشترە ئاوسەکان فەرامۆش دەکرێن و هیچ کەس بە لایاندا ناچێت و بەرەڵا کران﴿وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ﴾ گیانلەبەران هەموو کۆ دەکرێنەوە لە کاتێکدا ئەوان ترساون و تۆقیون ﴿وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ﴾ واتە: دەریاکان هەموو گڕدران و هەڵگیرسان، هەروەها دەڵێن: ئاوی دەریاکان چوە ناخی زەویدا و نقوم بوو.﴿وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتْ﴾هەموو روحەکان چوونەوە جەستەی خۆیانەوە و یەکیان گرتەوە، یان ئیماندار و خێزانەکانیان لە (حور العين) پێکەوە بە یەکەوە بەسترانەوە یان

---

١ ـ أخرجه أحمد (٢/٢٧ , ٣٦) , والترمذي (٣٣٣٣) وقال : هذا حديث حسن غريب , والحاكم (٤/٥٧٦) وصححه الألباني في (الصحيحة) (١٠٨١) .

بێباوەڕان لە گەڵ شەیتانەکاندا، ﴿وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ ﴿٨﴾ بِأَىِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ ﴿٩﴾﴾ ئەو کچە بەستەزمانە کە زیندە بە چاڵ کرا بە هۆی چی تاوانێکەوە کوژرا؟.

لەگەڵ مندا ئەو چەند ئایەتەی سورەتی (الأنفطار) بخوێنەوە: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتْ ﴿١﴾ وَإِذَا ٱلْكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ فُجِّرَتْ ﴿٣﴾ وَإِذَا ٱلْقُبُورُ بُعْثِرَتْ ﴿٤﴾ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ ﴿٥﴾﴾ (الإنفطار)) واتە: کاتێ ئاسمان (بە فەرمانی خوا) لەت لەت ئەبێ و هێزی کێشندەی دەبچڕێ.(١) ئەستێرەکان بەربوونەوەو پەرش و بڵاو بوون و ڕژانە خوار و لە جێگای خۆیاندا ترازان (٢) ساتێکیش دەریاکان تەقێنرانەوە و بەردرانە ناو یەکتر و بوونە یەکپارچە بە هۆی جموجۆڵی زەوییەوە و شیرین و سوێریان تێکەڵ بوون (٣) کاتێکیش گۆڕەکان هەڵگێردرانەوە و مردوەکان دەرهێنران لێیان و هەرچی لە ناوسکی زەویدا بوو فڕێی دایە دەرێ (٤) کە ئەوانە ڕوویاندا.. ئەوسا هەموو کەسێك ئەزانێ چی پێش خۆی خستوە لە چاك و خراپ دەشزانێ چیشی دوای خۆی خستوە.(٥)))

لە گەڵ مندا ئەو چەند ئایەتەی سورەتی (الأنشقاق) بخوێنەوە: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ﴿١﴾ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ ﴿٢﴾﴾ واتە: ئیزن بە ئاسمان درا لەت و پەت ببێت چونکە خوای گەورە فەرمانی پێداوە کە لەت و پەت ببێت (١) شیاویشە و حەقی خۆیەتی ملکەچی بڕیارەکانی ئەو بێت و هەموو کارەکان بگێڕێتەوە بۆ لای خوای کاربزان(٢) ﴿وَإِذَا ٱلْأَرْضُ مُدَّتْ ﴿٣﴾ وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ ﴿٤﴾﴾ واتە: کاتێکیش زەوی پان و فراوان کرا و کێوەکان بەرز و نزمیان تیا نەما و بوونە دەشتێکی کاکی بە کاکی (٣) وە چی تیا بوو فڕێیدا و خاڵی بووە و لێی (٤).))

هەموو بارە قورسەکەی لە کۆڵ خۆی کردەوە، لێرەو لەوێ زەوی دەستی بە لەرزین کرد. ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ﴿٢﴾﴾واتە: کاتێ کە زەوی بە توندی تەکانی داو کەوتە لەرزە لەرز و جووڵە جووڵ بە هەر هۆیەکەوە بێت. (١) زەوی هەرچی باری گران و قوورسی هەبوو فڕێی دایە دەرەوە:

(مردوان، نەوت و ئاو و خەزنە و هەزاران هەزار شتی تر) (٢) ئەو کاتە ئادەمیزادی کافر بە سەر سوڕمانێکەوە دەڵێ: زەوی چییەتی؟ بۆ وا دەکات..؟ (٣))).

چی ڕوویداوە؟ چی شتێك ئارامییەکەی گۆڕا، چی شتێك هێمنی و ئاسایشی زەوی گۆڕا بۆ ئەم ترس و بیمە؟ ﴿يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ ﴿٦﴾ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ ﴿٨﴾﴾ (الزلزلة)).واته: لەو ڕۆژەدا زەوی هەواڵەکانی خۆی چاك و خراپ رادەگەیەنێت و مەردوم تێ ئەگات کە ئەو زەمین لەرزەیە سەرەتای ڕۆژێکی سەخت و وێران بوونی دونیایە (٤) ئەویش بە هۆی ئەوەوە کە پەروەردگارت وەحی و فەرمانی پێ کردووە بەو زەمین لەرزەیە: لە خۆیەوە ناتوانێ هیچ بکات و هەردەم لە ژێر دەستەڵاتی خوادایە.(٥) لەو ڕۆژەدا خەڵکی بە پەرش و بڵاوی لە گۆڕەکانیان دەردەچن بۆ شوێنی حیساب بۆ ئەوەی پاداش و تۆڵەی کار و کردەوەکانیان نیشان بدرێت.(٦) ئینجا هەر کەسێك کێشی وردیلەیەك چاکەی ئەنجام دابێت، پاداشەکەی دەبینێتەوە.(٧) کەسێکیش کێشی وردیلەیەك شەر و خراپەی کردبێت، تۆڵەکەی دەبینێتەوە. مەگەر خوا قەڵەمی عەفوو بێنێ بە سەریا.(٨) ).

بە ڕاستی حاڵەتێکی پڕ لە ترس و سامە! هیچ وشە و وتەیەك ناتوانم بدۆزمەوە لەو ئایەتەی خوای گەورە رەوانبێژتر و نایابتر و پەسەندتر بێت کە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ ۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ ﴿١﴾ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَىٰ وَمَا هُم بِسُكَارَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ ﴿٢﴾﴾(الحج)

شاعیر دەڵێت:

مثــل لنفـسك أيهـا المغـرور  يـوم القيامـة والـسماء تمـور
إذا كورت شمس النهار وأُدْنِيَت  حتـى علـى رأس العبـاد تـسير

وإذا النجوم تساقطت وتناثرت وتبدلت بعد الضياء كدور
وإذا البحار تفجرت من خوفها و رأيتها مثل الجحيم تفور
وإذا العشار تعطلت وتخربت خلت الديار فما بها معمور
وإذا الجبال تقلعت بأصولها فرأيتها مثل السحاب تسير
وإذا الوحوش لدى القيامة أحشرت وتقول للأفلاك أين نسير؟
وإذا الصحائف نشرت وتطايرت وتهتكت للعالمين ستور
وإذا الجحيم تسعرت نيرانها ولها على أهل الذنوب زفير
وإذا الجليل طوى السماء بيمينه طيَّ السجل كتابه المنشور
وإذا الجنان تزخرفت وتطيبت لفتى على طول البلاء صبور
وإذا الجنين بأمه متعلق يخشى القصاص وقلبه مذعور
هذا بلا ذنب يخاف جناية كيف المصر على الذنوب دهور

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۚ وَكُلٌّ أَتَوۡهُ دَٰخِرِينَ﴾(النمل: ٨٧) واتە: ئەو ڕۆژە وەبیربێنە ئەی موحەممەد ﷺ کە فووئەکرێ بە کەڕەنادا بۆ مراندنی هەمووان، هەرکەس لە ئاسمانەکان و لەزەویدا هەیە ترس و بیمێکی زۆر دایدەگرێ و هەموو ئەمرن جگە لەوانە کە ویستی خوا وایە نەترسن و بمێنن، ئیتر دوای زیندوو کردنەوە هەموو بە ملکەچی و بە زەلیلی دێنە لای ئەو)).

لە پاش چل....

چل ڕۆژ؟ خوا باشتر دەیزانێ، چل مانگ؟ خوا باشتر دەیزانێ، چل ساڵ؟ خوا باشتر دەیزانێ.

لە هەردوو کتێبی (صحیح)دا[1] هاتوە لە فەرموودەی (ابوهریرە)وە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((ما بين النفختين أربعون)) قالوا: يا أبا هريرة،

---

١ ـ أخرجه البخاري (٢٩٥٥) ومسلم (٢٩٥٥)

أربعون يوماً؟ قال: أبيتُ، قالوا: أربعون شهراً؟ قال: أبيتُ، قالوا: أربعون سنة؟ قال: أبيتُ)) واتە: لە نێوان هەردوو فووکردنەکەدا چل هەیە... فەرموویان ئەی (أبو هريره) چل ڕۆژە؟ فەرمووی: نەمویست پرسیار بکەم. فەرموویان: چل مانگە؟ فەرمووی: نەمویست پرسیار بکەم. فەرموویان: چل ساڵە؟ فەرمووی: نەمویست پرسیار لە پێغەمبەری خواﷺ بکەم دەربارەی ئەوە)).

ئیمامی (النووی)[1] دەفەرموێت: واتە:نەمویست بیبڕمەوە و یەکلای بکەمەوە کە مەبەستەکەی چل ڕۆژە یان چل ساڵە یان چل مانگە، بەڵکو ئەوەی کە دانی پێدا بنێم بە کورتی ئەو ماوەیە چلە، لە جێگای تردا هاتوە بە ڕوونی لە جگە ریوایەتی (مسلم) کەوا مەبەستی چل ساڵە)).

الحافظ لە (الفتح)[2] دا دەڵێت: ((مەبەستی لە (أبيتُ) ئەوەیە: کە شتێك بڵێم و نەمبیستبێت، بەڵام (أبيتَ) واتە: نەمویست ئەو شتە بزانم، چونکە ئەوە شتێکی نادیار و غەیبە)).

ئیمامی (البيهقي) لە (إثبات عذاب القبر)[3] دەڵێت: ((دەڵێی (ابو هريره) لە مەبەستی پێغەمبەرەوەﷺ دەربارە ئەو (چل)ە لە بەری نەکردوە، بەڵام ئەهلی تەفسیر دەڵێن: مەبەستی چل ساڵە)).

ئیمامی (القرطبي) لە (التذكرة)[4] دەفەرموێت: ((ئەو قسەی أبو هريره کە دەڵێت (أبيت) دوو لێکدانەوەی هەیە:

یەکەم: أبيت، واتە: نەمویست باسی بکەم و ڕوونی بکەمەوە، بەم پێیە ماناکەی دەزانی، واتە: لە پێغەمبەری ﷺ بیستبوو.

دووەم: أبيت: واتە: نەمویست پرسیار لە پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ بکەم، بەم پێیە هیچ زانیاری دەربارەی نەبوو. مەبەستی یەکەم ئاشکراترە، کە ئەو ڕوونی نەکردەوە چونکە هیچ پێویستییەکی نەبینی بۆ ئەو ڕوونکردنەوەیە)).

---

١ ـ شرح مسلم للنووي (٣٤٣/٩).

٢ ـ الفتح (٥٥٨/٨).

٣ـ ٢٢٢ .

٤ ـ التذكرة (١٨٨).

دەڵێم: لە پاش چل ـ کە هیچ کەسێك چۆنییەتیەکەی نازانێت تەنها خوای بەرز و باڵادەست نەبێت ـ خوای گەورە فەرمان بە ئیسرافیل دەکات کە فوو بکات بە کەڕەنادا ئەویش فووکردنی بێهۆشکردن و مراندنە، هەندێ لە زانایان هیچ جیاوازی نابینن لە نێوان فووکردنی ترساندن و فووکردنی بێهۆشکردن و مراندندا، ئەو دوو فووکردنە بە یەك دانە دەژمێرن، دەڵێن: کاتێ کە ئیسرافیل فووی ترساندن بە کەڕەنادا بکات ئەوا هەموو ئەوانەی لە سەر زەویدان دەبوریێنەوە و دەمرن لە ترسی ئەو فووکردنەدا ئیللا ئەوانە نەبێت خوا خۆی ویستی لە سەر بێت لە بەر ترسی ئەو فووکردنە[1]، بەڵام رای پەسەند لای لێکۆلەرەوان ئەوەیە: ئیسرافیل فووی ترساندن دەکات بە کەڕەنادا و ئەمجار لە پاش چل ـ کە تەنها خوا خۆی چۆنیەتیەکەی دەزانێت ـ دیسان خوای گەورە فەرمان دەکاتە ئیسرافیل جارێکی تر فوو بە کەڕەنادا بکات کە ئەویش فووکردنی مردنە.

لە گەڵ مندا ئەو چەند ئایەتە بخوێنەوە: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ﴾ واتە: هەرکە لە لایەن ئیسرافیلەوە فوو بە شەیپووردا (کەڕەنادا)کرا، ئیتر ئەو کاتە هەموو ئەوانەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدان مەگەر کەسێك خوا خۆی بیەوێ نەمرێت)) ئەمەش سێیەم فووکردنە لەو ئایەتەدا کە دەڵێت: ﴿ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ﴾ (الزمر: ٦٨) واتە: لە پاشان بۆ جارێکی تر کە فووی پیاکرا ئەوجا لە ناکاو تەواوی دروستکراوەکان لە گۆڕەکانیاندا هەڵئەسنەوە و چاوەڕوانن چییان پێ بکرێ)).

با هەندێك لە گەڵ فووکردنی مردندا رابووەستین: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ﴾ واتە: مرد ﴿مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ﴾ ئایا ئەوە کێیە کە لەو بڕیارە بەدەرە؟ ئایا ئەوە کێیە کە خوای گەورە بڕیاری مردنی بە سەردا نادات و لەو بڕیارە جیاوازە؟ لە کاتێکدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلُّ مَنۡ عَلَيۡهَا فَانٖ﴾

---

[1] ـ التذكرة (٢٠٩) وهو ترجيح القرطبي كما سبق .

(الرحمن: ٢٦) واتە: هەرچی بە سەر پشتی زەوییەوەیە هەر هەموو لە نێو دەچیّ.))

جا مەبەست لە (عليها) لەو ئایەتە پیرۆزەدا: واتە: سەر ڕووی زەوی، پاشان گوفتاری خوای پەروەردگار دێت، زۆر بە ڕوونی و ئاشکرایی و دەفەرموێت: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ﴾ (القصص:٨٨) واتە: هەموو شتێك تیا دەچێت جگە لە ڕووخساری پیرۆزی ئەو نەبیّ.))

بەرزی و مەزنی بۆئەو زاتەی کە هەر خۆی هەڵسوڕێنەری زەوی و ئاسمانەکانە و زیندووی بێ سەرەتا و بێ کۆتایی و ئەزەلە، هەرگیز خەوی لێ ناکەوێت و هەرگیز نامرێت.

دەڵێم: زانایان لە بارەی ئەو کەسەوە کە لەو بڕیارە بە دەرە ((مەبەستم: إِلَّا مَن شَاء اللَّهُ)) جیاوازن: ئایە ئەو کەسە کێیە[1]؟ لە پێشدا بە کورتی باس کرا:

هەندێ لە ئەهلی زانست و زانیاری دەڵێن: فریشتەکانن.

هەندێکیان دەڵێن: بەڵکو مەبەستی تەنها، جبریل و ئیسرافیل و میکائیل و (ملك الموت) و هەڵگرانی عەرشە.

هەندێکیان دەڵێن: بەڵکو ئەوانە (حور العين) ن.

هەندێکیان دەڵێن: بەڵکو ئەوانە شەهیدانن، چونکە شەهیدان زیندوون لای خوداوەندی خۆیان بژێوی وەردەگرن و ڕادەبوێرن.

هەندێکیان دەڵێن: بەڵکو ئەوانە پێغەمبەرانن.

هەندێکیان دەڵێن: بەڵکو ئەوە پێغەمبەر(موسا)یە (على نبينا و عليه أفضل الصلاة والسلام).

جا ئەوانەی ئەو قسەیە دەکەن ئەو فەرموودەیان کردوەتە بەڵگە کە لە (صحيح البخاري)[2]دا هاتوە لە فەرموودەی (ابو هريرە)وە کەوا ئازیزەکەمان ﷺ دەفەرموێت: (إني أول من يرفع رأسه بعد النفخة الآخرة، فإذا أنا بموسى متعلق

---

١ ــ انظر : (التذكرة ) للقرطبي (١٨٩ – ١٩٣) وقال : قال شيخنا ابو العباس : والصحيح أنه لم يرد في تعيينهم خبر صحيح والكل محتمل ) .

٢ ــ أخرجه البخاري (٤٨١٣) .

بالعرش، فلا أدري أكذلك كان، أم بعد النفخة)) واتە: من یەکەم کەس دەبم لە پاش دواین فووکردن سەر بەرز دەکەمەوە، کە سەر بەرز دەکەمەوە دەبینم موسا پێغەمبەرخۆی بە عەرشدا هەڵواسیوە، نازانم هەروا بووە یان لە پاش فووکردنەکە خۆی هەڵواسیوە)).

وەلە ریوایەتێکی تردا کە لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1]دا هاتوە: ((لا تخيروني على موسى، فإن الناس يصعقون فأكون أول من يفيق، فإذا موسى باطش بجانب العرش فلا أدري أكان فيمن صعق فأفاق قبلي أو كان ممن أستثنى الله)) واتە: لە موسا بە زیاترم مەزانن چونکە کە هەموو خەڵکی دەمرن من یەکەم کەس دەبم بە ئاگادێمەوە، کەچی دەبینم موسا لە تەنیشتی عەرشەوە ئیتر نازانم لە نێو ئەوانەدا بوو کە مردن و پێش من بە ئاگا هاتەوە یان لەو کەسانەیە کە خوای گەورە لەو بڕیارە بە دەری خستوون)).

جا من لێرەدا دەڵێم:ئەگەر پێغەمبەری هەڵبژێردراو ﷺ نەتوانێت یەکلای بکاتەوە ئایە موسا پێغەمبەرپێش ئەو مردوە و ئەمجار بەئاگا هاتوەتەوە یان لەو کەسانەیە کە خوای گەورە لەو بڕیارە بە دەری کردوە؟ چیتر هیچ کەسێك بۆی نییە قسەیەکی یەکلاکەرەوە بدات دەربارەی ئەو بابەتە.

جا بۆمان دەرکەوت و روونبووەوە کەوا پێغەمبەری ئازیزﷺ یەکلای نەکردوەتەوە کەوا موسا پێغەمبەر پێش ئەو مردوە و ئەمجار بەئاگا هاتوەتەوە یان لەو کەسانەیە کە خوای گەورە لەو بڕیارە بە دەری کردوون؟ هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)دا هاتوە.

دەڵێم: لە فەرموودەیەکی درێژدا دەربارەی کەڕەنا هاتوە، هەروەکو (ابو يعلى الموصلي) لە (الكبير)دا و ئیمامی (البيهقي) لە (البعث) دا و (الطبري) لە تەفسیرەکەیدا و (الطبراني) لە (الطوالات)دا و جگە لەوان ریوایەتیان کردوە، هەموویان لە رێگای (اسماعيل ی کوڕی رافع) ەوە کە کەسێکی (ضعيف)[2] ە، تیایدا

---

١ ـ أخرجه البخاري (٣٤٠٨) ومسلم (٢٣٧٣/١٦٠) .

٢ ـ أخرجه الطبري في تفسيره (٤٩٣٩) , وابن ابي حاتم في تفسيره (١٥٥٤٩) والبيهقي في (البعث) (٥٩٣) وابو الشيخ في (العظمة) (٣٧٩) وابو يعلى في (الكبير) والطبراني في (الطوالات) كما في الفتح ( ٣٧٦/١١) .

هاتوە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((فإذا مات كل من في السماوات وكل من في الأرض إلا من شاء الله جاء ملك الموت الى الملك، فقال مَلَكُ المَوْتِ: يَا رَبِّ، مَاتَ كل من في السماوات وَالأَرْضِ إلا مَنْ شِئْتَ، فَيَقُولُ الله ـ جل و علا ـ : مَنْ بَقِيَ؟ وهو أعلم سبحانه ـ فَيَقُولُ ملك الموت: جِبْرِيلُ وإسرافيل و مِيكائِيلُ و حَمَلَةُ العرش و بَقِيتَ أَنَا ـ يعني:ملك الموت ـ فَيَقُولُ ملك الملوك ـ جل جلاله ـ : ليمت جبريل، فيموت جبريل، ليمت ميكائيل، فيموت ميكائيل، ليمت إسرافيل، فيموت إسرافيل، ليمت حملة العرش)) واتە: کاتێك هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەن دەمرن ئیللا ئەوانە نەبێت خوا خۆی ویستی لە سەر بێت، فریشتەی مردن دێت بۆ لای پادشای پادشاکان، فریشتەی مردن دەڵێت: ئەی پەروەردگارا... هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەویدان مردن تەنها ئەوانە نەبێت خۆت ویستت لە سەری بوە نەمرن، خوای گەورە دەفەرموێت: کێ ماوە؟ ــ لە کاتێکدا خۆی باشتر دەزانێت ــ فریشتەی مردن دەڵێت: جبریل و ئیسرافیل و میکائیل و هەڵگرانی عەرش و من ـ واتە: فریشتەی مردن ـ پادشای پادشاکان دەفەرموێت: با جبریل بمرێت، بۆیە دەست بەجێ جبریل دەمرێت، با میکائی بمرێت، دەست بە جێ میکائیل دەمرێت، با ئیسرافیل بمرێت، دەست بەجێ ئیسرافیل دەمرێت، با هەڵگرانی عەرش بمرن....)).

جا ئەگەر هەڵگرانی عەرش (حملة العرش) بمرن کێ عەرشی خوا هەڵدەگرێ؟ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ﴾(طه: ٥).

(استوى) بەو شێوەیەی کە خۆی باسی کردوە، بەو شێوەی کە خۆی ویستی لەسەر بوە، ماناکەی ئەوەیە کە فەرموویەتی، (استواء)ێك بە بێ جێگۆرکێ و چوونە ناو دروستکراوەکانەوە، چونکە عەرش ئەوی هەڵنەگرتوە و (الکرسی) جێی متمانەو پەنای نییە بەڵکو عەرش و هەڵگرانی، کورسی و مەزنێتی، هەمووی بە توانای خۆی هەڵگیراوە و بە مەزنی و توانای خۆی و ملکەچن بۆ گەورەیی و دەسەڵاتی خوا.

بۆیە واتای (الاستواء) دیار و ئاشکرایە، وە چۆنییەتییەکەی نادیارە، باوەڕهێنان پێی پێویست و واجبە، پرسیار کردن دەربارەی بیدعەیە.

دەڵێت: ((لیمت حملة العرش، فیموت حملة العرش، ویبقى ملك الموت مع ملك الملوك، فیقول ملك الملوك لملك الموت: یا ملك الموت، وأنت خلق من خلقي، وخلقت لما ترى ، فمت یا ملك الموت، فیموت ملك الموت ویبقى ملك الملوك)) واتە: با هەڵگرانی عەرش بمرن، دەست بەجێ هەڵگرانی عەرش دەمرن، تەنها فریشتەی مردن و پادشای پادشاکان دەمێننەوە، بۆیە پادشای پادشاکان بە فریشتەی مردن دەڵێت: ئەی فریشتەی مردن تۆیش دروستکراوێکی لە دروستکراوەکانم، بۆ ئەوەی کە بینیت دروستکراوی، بۆیە ئەی فریشتەی مردن تۆیش بمرە، دەست بەجێ فریشتەی مردن دەمرێت، تەنها پادشای پادشاکان دەمێنێتەوە)).

تەنها پادشای پادشاکان (شای شاهان) دەمێنێ، ئەو دوایین کەسە هەروەکو چۆن یەکەم کەس بوو، ئەو دیار و ئاشکرایە هەروەکو چۆن پەنهان و شاراوەیە، هیچ شتێك لە سەرەوەی ئەو نییە، ئەو یەکەمینە و پێش ئەو هیچ شتێك نەبوە و دوایەمین کەسە هیچ شتێك پاش ئەو نییە، ئەو دیار و ئاشکرایە و هیچ شتێك لە سەرەوەی نییە و ئەو پەنهان و شاراوەیە و هیچ شتێك لە خوارەوەی نییە.

﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْـَٔاخِرُ وَٱلظَّـٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ (الحدید: ٣) واتە: ئەویشە یەکەم کە هیچ شتێك لە پێشیەوە نییە، دواهەمینیش هەر ئەوە کە هیچ لە دوایەوە نییە و بوونی ئاشکرا بە بەڵگەکانی هەر ئەوە، واتە: لە ژوور ئەوەوە ئاشکراتر نییە، پەنهان و هەقیقەت و کونهی لە دروستکراوەکانی ئەوە کە لەو پەنهاترە نییە، هەر ئەویش زانایە بە هەموو شتێك لە گەردیلەیەکەوە تا وردتر ئاگاداریەتی.))

لە ناوەراستی ئەو بێدەنگییە سەیرەدا دەنگی پادشای شکۆمەند بەرز دەبێتەوە، خاوەنی ئەو دەنگە پرسیار دەکات و هەر خۆی وڵام دەداتەوە، چونکە لەو رۆژەدا هیچ کەسێك نییە پرسیار بکات و هیچ کەسیش نییە وڵام بداتەوە تەنها ئەو نەبێت، ئەهلی زەوی و ئاسمانەکان هەموو مردن، لەو کاتەدا دەنگی خوای باڵا دەست بەرز دەبێتەوە و دەفەرموێت: ﴿لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ۖ﴾واتە: ئەمرۆ موڵك و دەسەڵات هی کێیە؟ هیچ کەسێك وەڵامی خوای تاك تەنها ناداتەوە، بۆیە خوای تاك

تەنها خۆی ولاّم دەداتەوە و دەفەرموێت: ﴿لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ﴾(غافر: ١٦) واتە: موڵك و دەسەلاّت ئەمڕۆ هەر بۆ خوای تاك و تەنها و بەدەسەلاّتە)).

لە ریوایەتێکدا کە لە هەردوو کتێبی (صحیح)[١]دا هاتوە: ((يَقْبِضُ اللَّهُ الْأَرْضَ يوم القيامة، وَيَطْوِي السَّمَاء بِيَمِينِهِ، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ، أَيْنَ مُلُوكُ الْأَرْضِ؟)) واتە: خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا زەوی دەگریت و ئاسمانەکان بە دەستی ڕاستی دەپێچێتەوە و ئەمجار دەفەرموێت: منم پادشا، کوان پادشاکانی سەر زەوی؟)).

لە ریوایەتەکەی (مسلم)[٢] دا هاتوە: ((أَيْنَ الْجَبَّارُونَ؟ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ؟)) واتە: دەسەلاّتدارە بە زەبرەکان لە کوێن؟ خۆ بەزلزانەکان لە کوێن؟)).

دەڵێم: لە پاش چل ـ کە تەنها خوای گەورە خۆی دەزانێ مەبەست لەو چلە چییە ـ خوای گەورە لە ئاسمانەوە ئاوێك دەنێرێت بە شێوەی نمە بارانێك، هەروەکو لە (صحیح مسلم)[٣] دا هاتوە: ((ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّهُ ـ أَوْ قَالَ: يُنْزِلُ اللَّهُ ـ مَطَرًا كَأَنَّهُ الطَّلُّ، أَوْ الظِّلُّ، فَتَنْبُتُ مِنْهُ أَجْسَادُ النَّاسِ))[٤] واتە: ئینجا خوای گەورە نمە بارانێك دەبارێنێت کە لە مەنی پیاوان دەچێت جەستەی خەڵکی بە هۆیەوە شین دەبێتەوە)) لە ریوایەتێکی تردا: ((ثُمَّ يُنْزِلُ اللَّهُ مِنْ السَّمَاءِ مَاءً، فَيَنْبُتُونَ كَمَا يَنْبُتُ الْبَقْلُ)) واتە: ئینجا خوای گەورە لە ئاسامانەوە بارانێك دەبارێنێت، شین دەبنەوە هەروەکو چۆن ڕوەك شین دەبێتەوە)).

جا ئەو ئاوە دادەبەزێتە سەر ئەو جەستە و لاشانەدا، پاشان جەستەکان لە ژێر زەوییەوە یان لە گۆڕەکانیانەوە سەوز دەبێتەوە (شین دەبێتەوە) لە پاش مردنیان، ئەگەر خوای گەورە ویستی دروستکراوەکانی زیندوو بکاتەوە، ئەوا (ئیسرافیل) زیندوو دەکاتەوە و دیسان فەرمانی پێ دەکات کە کەڕەناکە بە

---

١ ـ أخرجه البخاري (٦٥١٩) ومسلم (٢٧٨٧)

٢ ـ كتاب (صفة القيامة ) (٢٧٨٨) .

٣ ـ أخرجه مسلم (٢٩٤٠) .

٤ ـ قال النووي في (شرح مسلم) (٣٣١/٩) : قال العلماء :الأصح الطل بالمهملة , وهو الموافق للحديث الآخر (أنه كمني الرجال) .

دەستەوە بگرێت و فووی سێیەمی پێدا بکات، کە ئەویش فووی زیندوو کردنەوەیە، بۆ ئەوەی خەڵکی لە گۆڕەکانیانەوە و لە ژێر زەوییەوە هەستنەوە، روحی ئیمانداران دەهێنن روناکی لێ دەدرەوشێتەوە، بەلاّم روحی بێباوەڕان بە تاریکی رووڕەشییەوە، ئینجا روحەکان دەگێردرێتەوە جەستەکانیان، بۆئەوەی هەموو مرۆڤەکان ـ خوای گەورە دروستی کردوون هەر لە ئادەمەوە تاکو دوایین کەس ـ دەرچنە دەرەوە، جەستەکان سەوز دەبنەوە لە ئێسکێکی زۆر وردەوە، ئەو ئێسکە پێی دەڵێن: (عَجْب الذنب).

بیر لە فەرموودەکەی پێغەمبەری خواﷺ بکەرەوە چی فەرموە؟ ئەو ئێسکە لەم ساڵانەی دواییدا زانایان دۆزیانەتەوە، بۆ ئەوەی هەموو موسڵمانێ دڵنیا بێت کەوا خۆشەویستەکەی ﷺ هەرگیز لە خۆوە قسەی نەکردوە، لەو فەرموودەی کە لە پێشدا باس کرا[1]، ((لیس من الإنسان شئ إلا یبلی إلا عظماً واحداً، وهو عجب الذنب، ومنه یرکب الخلق یوم القیامة)) واتە: هیچ شتێك لە لاشەی مرۆڤدا نامێنێتەوە تەنها یەك ئێسك نەبێت کە ئەویش (عجب الذنب) ە، لەو ئێسکەوە دیسان مرۆڤەکان لە رۆژی قیامەتدا بەدیدەهێنرێنەوە)) چونکە ئەوە یەکەم شت بوە دروستکراوە لە جەستەی مرۆڤدا، هەر ئەوەیە کە دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی دیسان لەوێوە دروست بکرێتەوە[2].

ئیمامی (النووي)[3] دەفەرموێت: واتای (عَجْب الذنب) بریتییە لەو ئێسکە نەرم و ناسکەی کەوتوەتە خوارەوەی بڕبڕەی پشت، سەری ئەو ئێسکە بچووکەیە کە دەکەوێتە کۆتایی بڕبڕەی پشتەوە و پێی دەڵێن (عصعص)، هەروەها هەندێ کەس پێی دەڵێت: (عجم) ئەویش یەکەمین شتە کە لە ئادەمیزاددا دروست دەبێت)).

جا قەبارەی (عجب الذنب) لە دەنکە نیسکێك تێپەڕ نابێت، دەکەوێتە خوارەوەی زنجیرەی بڕبڕەی پشتی هەموو مرۆڤێك خوای گەورە لە سەر زەویدا دروستی

١ ـ عند الشیخین , الذي إوله : (ما بین النفختین) .
٢ ـ شرح النسائي (٣/٣٠٨) وتنویر الحوالك (٢٤٧) للسیوطي , وانظر : (( فیض القدیر)) (١٢/٥) للمناوي .
٣ ـ شرح مسلم (٩/٣٤٣) .

کردوە، خوای گەورە ئەو ئێسکە دەهێنێت، خۆی زۆر بە باشی ئێسکی هەموو مرۆڤێك دەناسێتەوە هەر لە ئادەمەوە تاکو قیامەت، دەیهێنێت و جەستە و لاشەی مرۆڤەکە بە دەوریدا کۆ دەکاتەوە، هەموو ئەو بەشانەی کە بوەتە خاك و خۆڵ و بڵاو بوونەتەوە کۆی دەکاتەوە،تەنانەت ئەوەی کەوتوەتە ناو دەریاو سکی ماسی و دڕندەکانەوە، جەستە و لاشەکان لە ژێر زەویدا هەموو تەواو دەبن بە بێ کەم و کووڕی، ئەمجار خوای گەورە فەرمان دەکاتە ئیسرافیل فوو بە کەڕەنادا بکات، هەموو روحەکان دەگەڕێتەوە جەستەکانیان، خوای گەورە پاش فووی سێیەم (واتە: فووی زیندووبوونەوە) فەرمان دەکاتە زەوی و ئەویش دێتە لەرزە و سەر زەوی لەت و پەت دەبێت، بۆ ئەوەی لەو بارە قورسە خۆی رزگار بکات و چی لە سکی زەویدایە فڕێی بداتە دەرەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ﴿٢﴾ وَقَالَ ٱلْإِنسَـٰنُ مَا لَهَا ﴿٣﴾ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا۟ أَعْمَـٰلَهُمْ ﴿٦﴾ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾﴾(الزلزلة) واتە: کاتێ کە زەوی بە توندی تەکانی داو کەوتە لەرزە لەرز و جووڵە جووڵ بە هەر هۆیەکەوە بێت. (١) وە زەوی هەرچی باری گران و قوورسی هەبوو فڕێی دایە دەرەوە (٢) ئەو کاتە مرۆڤی کافر بە سەر سوڕمانێکەوە دەڵێ: زەوی چییەتی وا دەکات..؟ (٣) لەو رۆژەدا زەوی هەواڵەکانی خۆی چاك و خراپ رادەگەیەنێت و خەڵکی تێ ئەگات کە ئەو زەمین لەرزەیە سەرەتای رۆژێکی سەخت و وێران بوونی دونیایە (٤) ئەویش بە هۆی ئەوەوە کە پەروەردگارت وەحی و فرمانی پێ کردوە بەو زەلزەلەیە: لە خۆیەوە ناتوانێ هیچ بکات و هەردەم لە ژێر دەستەڵاتی خوادایە.(٥) لەو رۆژەدا خەڵکی بە پەرش و بڵاوی لە گۆڕەکانیان دەردەچن بۆ شوێنی حیساب بۆ ئەوەی پاداش و تۆڵەی کار و کردەوەکانیان نیشان بدرێت.(٦) ئینجا هەر کەسێك کێشی وردیلەیەك چاکەی ئەنجام دابێت، پاداشەکەی دەبینێتەوە.(٧) کەسێکیش کێشی

وردیلەیەك شەر و خراپەی کردبێت، تۆڵەکەی دەبینێتەوە. مەگەر خوا قەڵەمی عەفوو بهێنێ بە سەریا.(٨).

خــــوای گـــــەورە دەفــــەرموێت: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴿١٠٥﴾ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ﴿١٠٧﴾ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ لَا عِوَجَ لَهُۥ ۖ وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا ﴿١٠٨﴾﴾ (طـه) واتە: لە بارەی کێوەکانەوە لێت دەپرسن: ئاخۆ لە ڕۆژی قیامەتدا چییان لێ دێت؟ لە وەڵامدا بڵێ: پــەروەردگارم لــە جێگــەی خۆیانــدا هــەڵیان ئەکــەنێ، بــەڵام چــۆن هەڵکەنــدنێك! وردوخاشاکیان ئەکا و بەبایان دەکا (١٠٥) شوێنەکەشیان دەکاتە دەشتێکی ساف و پان و کاکی بە کاکی، وەك هەر هیچی تیا نەبووبێ (١٠٦) هیچ خواری و نـاڕێکی و بەرزی و نزمی تیا نابینی، هەمووی یەك پارچە ئەبێتـەوە (١٠٧) لـەو ڕۆژەدا هـەموو خـەڵکی دوای دەنگـی جاڕچـی (بانگـەوازکارێك) ئەکـەون، کـە هـیچ وەرچـەرخان و لادانێك نییە لێی.... (١٠٨)

ئایا ئەو بانگەوازکارە کێیە؟ فریشتەیەکە لـە فریـشتەکانی خـوای گـەورە بـانگی ئـەو هـەموو دروسـتکراوانە دەکـات بـۆ ئـەوەی لـە بـەر دەسـتی خـوای گـەورەدا ڕابووەستن بـە مەبەسـتی حەشـر کردنیـان ﴿وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا﴾ (طـه:١٠٨) واتـە: هـەموو خـەڵکی لەبـەر خـوای بەخـشندە دەنگیـان نـەوی دەبێ، دەنگی ژێرلێو و چپەچپ و ئەسپایی نەبێ هیچ شتی تر نابیسی)).

لەگـەڵ منـدا ئـەو ئایەتـەی خـوای گـەورە بخوێنـەوە:﴿وَٱسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ ٱلْمُنَادِ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٤١﴾ يَوْمَ يَسْمَعُونَ ٱلصَّيْحَةَ بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُرُوجِ ﴿٤٢﴾﴾(ق) واتـە: گـوێ ڕاگرە ئـەی پێغەمبـەرﷺ! بـۆ ئـەو هەواڵـەی پێـت دەدەیـن لـە ئـەحواڵی قیامـەت، ڕۆژێك(ئیسرافیل) بانگ دەکـا لـە شـوێنێکی نزیـك بـە خـەڵك هـەمووتان دەرچـن لـە گۆڕەکانتان بۆ حەشر(٤١) ئەو ڕۆژە کـە هـەموو ئـەو(صـیحە)و هاوارەیـان بـە هـەق گوێ لێ دەبێ،ئائەو ڕۆژە ڕۆژی لەگۆڕ دەرچوونە بۆ حەشرو پاداش و تۆڵە (٤٢))).

هەروەها ئەو ئایەتە پیرۆزە بخوێنەوە کە دەفەرموێت: ﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْـَٔازِفَةِ إِذِ ٱلْقُلُوبُ لَدَى ٱلْحَنَاجِرِ كَـٰظِمِينَ ۚ مَا لِلظَّـٰلِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ ﴿١٨﴾ يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِى ٱلصُّدُورُ ﴿١٩﴾ ﴾ (غافر) واتە: ئەوانە لە ڕۆژە نزیکەکەی قیامەت بترسێنە (آزفة) یەکێکە لە ناوەکانی ڕۆژی قیامەت، بۆیە دەوترێ (آزفة) چونکە نزیکە بێت، کاتێ لە ترس و هەیبەتا گیان و دڵەکان دەگەنە گەروو و ڕادەوەستن بە پیشخواردوویی دڵەکانیان پڕن لە خەم و خەفەت، ئەو کات ستەمکاران هیچ پشتیوان و دۆستێکیان نییە، بتوانێ کەڵکیان پێ بگەیەنێ و هیچ تکاکارێکیشیان نییە، تکای وەربگیردرێ، هەموو پەیوەندییەك دەبچڕێ (١٨) ئەو خوایە هەمیشە بە چاوە خیانەتکارەکان ــ بەرامبەر بە نافەرمانی خوا ــ دەزانێت و بەوەش سینەکان حەشاری دەدەن (١٩).

بە جوانی بیر لە ئایەتەکان بکەرەوە، بە عەقڵ و دڵ و هەموو بوونت لە گەڵ ئەو چەند ساتەدا بژی کە دڵەکان لە بن دەردەهێنن بەڵکو سوێند بە خوا لە جەستەکان دێتە دەرەوە، لە بەر ترسناکی و سامناکی ئەو ڕۆژە دڵەکان دەگەنە قورگ و گەروو، چەند ترسناکییەکی سەختە! دروستکراوەکان لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە ـ لە ژێر زەوییەوە ـ پێڵاویان لە پێدا نییە و پێیان پەتییە، هەموو ڕووتن و هیچ جل و بەرگێکیان لە بەردا نییە، بە خەتەنە نەکراوی،((غرلا): بە منداڵێك دەگوترێت هێشتا خەتەنە نەکرابێت)، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ نَطْوِى ٱلسَّمَآءَ كَطَىِّ ٱلسِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ۚ كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا فَـٰعِلِينَ ﴾ (الأنبياء: ١٠٤) واتە: باسی ئەو ڕۆژە بکە ئاسمان وەکو هەڵپێچانی تۆماری قاقەز بۆ نووسین هەڵدەپێچین، چۆن نوسەر ئەو پەڕەی بەردەستی لوول دەکاو ئەیپێچێتەوە هەر وەك چۆن لە سەرەتاوە دروستمان کرد، دیسان هەر ئاوایش وەك خۆی لێ ئەکەینەوە بەڵێنێکە ئەنجامدانی لە سەر ئێمەیە و بێ گومانیش ئێمە هەر ئەنجامی ئەدەین))

لەگەڵ مندا تەماشای ئەو دیمەنانە بکە کە دڵەکان دادەتەکێنن و لە بن دەری دەهێنن، ئەوەش بزانە کە حاڵ و وەزعی خەڵکی جیاوازە، خەڵکی وا هەن لە

گۆڕەکەیان دەردەچن رووی وەکو مانگ دەدرەوشێتەوە و روناك دەبێتەوە و لە بەر دەستیدا و لە لای راستییەوە روناکی و رۆشناییە، خودایە.. ئێمەش لە ئەهلی روناکی بگێڕە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ تَرَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِم بُشْرَاكُمُ الْيَوْمَ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ (الحديد:١٢) واتە: رۆژی قیامەت پیاوان و ژنانی بڕوادار دەبینی روناکییەکەیان لە بەردەم و لە لای راستیانەوە دەدرەوشێتەوە فریشتە پێیان دەڵێت: دەسا ئەمڕۆ موژدە بێ لێتان بە باخانێك جۆگە و رووبار بە ژێر دار و درەخت و کۆشکەکانیدا دەڕوات، بە هەتا هەتاییش تێیدا ئەمێننەوە، ئا ئەوەیە سەرکەوتن و سەرفرازی گەورە.))

موژدە بۆ ئێوە ئەی ئیمانداران....

موژدە بۆ ئێوە ئەی یەکتاپەرستان....

موژدە بۆ ئێوە ئەی شوێنکەوتوانی (محمد)ی کوڕی (عبدالله) ﷺ.

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ يَوْمَ لَا يُخْزِي اللَّهُ النَّبِيَّ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ ۖ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَاغْفِرْ لَنَا ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾(التحريم:٨) واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ! بگەڕێنەوە بۆ لای خوا بە تەوبەو گەڕانەوەیەکی ئیجگاری، واتە: بە شێوەیەك، ئیتر جارێکی نەگەڕێنەوە سەر ئەو تاوان و گوناهانە، دڵنیابن ـ ئەگەر تەوبەی ئاوا بکەن ـ پەروەردگارتان لە گوناهەکانتان خۆش دەبێت، دەتانباتە ناو چەندین باخی بەهەشتەوە کە لە ژێر بنکی دار و درەختەکانیانەوە ئاو و رووبار بە خوڕم دەڕوات، لەو رۆژەدا (رۆژی قیامەت) خوا پەیامبەر و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ریسوا و سەر شۆڕ ناکات، نوور و روناکی لە بەردەمیانەوە و لە لای راستیانەوە بە سەر پردی(صراط) دا پێی دەڕۆن و دەڵێن: پەروەردگاری ئێمە !

نوور و روناکییەکەمان بۆ تەواو بکە و بەردەوام بێت و لێمان خۆش ببە بە راستی تۆ بە سەر هەموو شتێکدا بە توانایت))

عبدالله ی کوڕی مەسعود دەفەرموێت: ـ هەروەکو (الطبري و ابن ابی حاتم) بە سەنەدێکی (صحیح)[1] ریوایەتیان کردوە ـ دەڵێت: ((خەڵکی دەهێنرێن روناکییان بە ئەندازەی کردەوەکانیانە، تیایاندا هەیە روناکییەکەی بە قەد دارە خورمایەکە، تیایاندا هەیە روناکییەکەی بە قەد کەسێکی راوەستاو وایە، کەمترینیان کەسێکە سەر پەنجەیەکی دەگرێت و دەکوژێتەوە)) خەڵکی وا هەیە لە هەموو لایەکەوە تاریک دەوری لێ گرتوە، ﴿يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ﴾ (الحدید:١٣) واتە: لەو رۆژەدا پیاوانی دووڕوو و ژنانی دووڕوو بەوانەی باوەڕیان هێناوە دەڵێن: چاوەڕوانیمان بکەن با لە رووناکییەکەتان وەرگرین، بە گاڵتەوە پێیان دەوترێت: بگەڕێنەوە بۆ دواوەوەتان ـ بۆ دونیا ـ لەوێ رووناکییەك بخوازن، دەستبەجێ شوورەیەك دەخرێتە نێوان ئیماندارەکان و دووڕووەکان دەرگایەکی تیایە دیوی ناوەوەی رەحمەتی تێدایە، واتە: ئەوەی لە ئیماندارەکانەوە دیارە، لە دیوی دەرەوەشی سزایە، واتە: ئەوەی لە دووڕووەکانەوە دیارە.))

ئەهلی تاریکی بانگ دەکەن لە ئەهلی روناکی، ئەهلی دووڕوویی بانگی یەکتاپەرستان و ئیمانداران دەکەن، ئایا ئێمە لە دونیادا لە گەڵ ئێوەدا نەبووین؟ ئایا نوێژی جەماعەتمان لە گەڵ ئێوەدا نەدەکرد؟ ئایا لە گەڵ ئێوەدا رۆژووی مانگی رەمەزانمان نەدەگرت؟ ﴿يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَٱرْتَبْتُمْ﴾واتە: بەهەشتییەکان دەچنە جێی خۆیان و دووڕووەکانیش بانگیان لێ ئەکەن و دەڵێن: باشە ئێمە لە گەڵ ئێوە نەبووین؟ موسڵمانەکان

---

١ ـ أخرجه الطبري في (تفسيره) لسورة الحديد : ١٢ , وابن ابي حاتم كما في ابن كثير (البقرة : ٢٠) و (الحديد : ١٢) .

دەڵێن: بەڵێ.. بە ڕواڵەت لە گەڵمان بوون، بەڵام ئێوە خۆتانتان تووشی دووڕوویی کرد چاوەڕوانیتان دەکرد تووشی بەڵا بین و هەمیشە لە دوودڵی و گوماندا دەژیان بەرامبەر بە ئایینەکەی خوا)).

گومانتـان لـەو ئایـەت و فەرموودانـە دەکـرد کـە بـە سـەرتاندا دەخوێنرایـەوە ﴿وَغَرَّتْكُمُ ٱلْأَمَانِيُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ﴾ (الحدیـد: ١٤) واتـە: هیـوا و ئارەزووی نەشیاو فریویدان تا فەرمانی خوا هات بـە مـردن، شـەیتانی خراپـەکاریش سەبارەت بە بڕیارەکانی خوا فریوی دان))

((ومنهم من يبعث، ينبعث منـه دم، اَللَّـوْنُ لَـوْنُ الـدَّمِ وَالـرِّيحُ رِيـحُ الْمِـسْكِ)) واتـە: خەڵکی وا هەیە کاتێ زیندوودەکرێتەوە، خوێن لـە جەسـتەی دەتکێـت، ڕەنگەکـەی ڕەنگی خوێنە و بۆن و بەرامی بۆنی میسکە))

ئەوانـە کـێن؟ ئەوانـە ئـەو شـەهیدانەن کـە لـە پێنـاوی خـوادا شـەهید بـوون، پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرموێـت:هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1]دا هاتوە لـە فەرموودەی (ابوهريرە)وە ـ: ((وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَـا يُكْلَـمُ أَحَـدٌ فِـي سَـبِيلِ اللَّـهِ ـ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُكْلَمُ فِي سَبِيلِهِ ـ إِلَّا جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَاللَّوْنُ لَوْنُ الدَّمِ، وَالـرِّيحُ رِيـحُ الْمِسْكِ))واتە: سوێند بە زاتی ئـەو کەسـە گیـانی مـنی بـە دەسـتە هـیچ کەسـێك لـە پێناوی خوادا برینێك لە جەستەی نابێـت ـ خـوا بـۆ خـۆی بـاش دەزانـێ کـێ لـە پێناوی ئەودا بریندار بوە ـ ئیللا لە ڕۆژی قیامەتدا دێت ڕەنگەکەی ڕەنگی خوێنە و بۆن و بەرامەکەی بۆنی میسکە)).

ئەمە ئەو کەسەیە کە لە پێناوی خوادا خوێنی ڕژاوە، لە پێناوی دونیـادا نـەبوە، لە پێناوی سـەرکردایەتیدا نـەبوە، لـە پێنـاوی جـوامێری و کەڵەمێردیـدا نـەبوە، لـە پێناوی نیشتماندا نەبوە، یان لە بەر زیرەکی نەبوە، بەڵکو تەنها لە پێنـاوی خـوادا، کاتێك دێـت خوێنی لێ دەتکێت، ڕەنگەکەی ڕەنگی خوێنە، بەڵام بۆن و بەرامەکـەی بۆنی میسکە.

خەڵکی وا هەیە کە زیندوو دەکرێتەوە، هەر کە لە گۆڕەکەی دەردەچێت دەڵێت: ((لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، إن الحمد والنعمة لك والملك لا شريك لـك))

---

١ ـ أخرجه البخاري (٢٨٠٣) ومسلم (١٨٧٦)

ئەوە کێیە؟ ئەوە کەسێکە لە کاتێکدا مردوە خەریکی حەج کردن یان عومرە بوە، بە پۆشاکی ئیحرامەوە مردوە.

لە (صحیح مسلم)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (جابر ی کوڕی عبداللە) وە کەوا پێغەمبەری ئازیز ﷺ فەرموویەتی: ((یبعث کل عبد علی ما مات علیه)) واتە: هەموو کەسێك لە سەر ئەو حاڵەتە زیندوو دەکرێتەوە کە لە سەری مردوە)) هەر کەسێ لە سەر گوێڕایەڵی خوای گەورە بمرێت ئەوا لە سەر ئەو گوێڕایەڵییە زیندوو دەکرێتەوە، هەر کەسش لە سەر سەرپێچی بمرێت ئەوا لە سەر هەمان سەرپێچی زیندوو دەکرێتەوە ئەگەر تەوبەی نەکردبێت.

خەڵکی وا هەن کاتێ زیندوو دەکرێتەوە سکی ئاوساوە، ئەگەر بیەوێ ڕێ بکات یان لە سەر پێ بوەستێ ئەوا ناتوانێت، بەڵکو بە سەر زەویدا دەکەوێت، ئەگەر لە سەر زەوی دانیشێت ئەوا بە لای ڕاست و چەپیدا دەپلکێتەوە، ناتوانن ڕێ بکەن، ئەوانە کێن؟ ئەوانە سوو خۆرانن ﴿ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ﴾ واتە: لە گۆڕەکانیان ڕاست نابنەوە﴿إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡبَيۡعُ مِثۡلُ ٱلرِّبَوٰاْۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ﴾(البقرة: ٢٧٥) واتە: ئەو کەسانەی سوو ئەخۆن، کە لە گۆڕ دەنرێن پاشان زیندوو ئەکرێنەوە و ڕاست دەبنەوە، وا ڕاست دەبنەوە هەر دەڵێی شەیتانەکان دەستی لێ وەشاندوون. چونکە لە دونیادا دەیانگوت: مامەڵەو کڕین و فرۆشتنیش هەر وەکو مامەڵەکردن بە سوو وایە " واتە هەردوکیان بە لای ئەوانەوە یەکسانن ")).

خەڵکی وا هەن کە زیندوو دەکرێتەوە منداڵی بچووك بە دەور و پشتیدا رایدەکێشن و پاڵی پێوە دەنێن! بۆ کوێی دەبەن؟ بۆ ئەوەی لە بەر دەستی خوای پەروەردگاردا ڕاییبوەستێنن!! ئەوانە کێن؟ ئەوانە هەتیوانن، ئەو کابرایەش ئەو کەسەیە کە بە ستەمەوە سەروەت و سامانی هەتیوانی خواردوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٨٧٨)

وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴾(النساء: ١٠)واتە: ئەو کەسانەی کە بە ستەم و ناهەق ماڵ و سامانی منداڵی هەتیوو دەخۆن بێ شك تەنها ئـاگر دەکەنـە سـك و ورگیانـەوە و بـە زووییش دەخرێنە ناو ئاگرێکی زۆر گەرم و بەگڕی دۆزەخەوە.))

خەڵکی وا هەن کە زیندوو دەکرێتەوە ئەوەی کە دزیەتی بە شان هەڵیگرتوە.

خـــوای گـــەورە دەفەرموێـــت: ﴿وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾ (آل عمران:١٦١واتە: هەرکەسێ گزیی و نادادی بکات، ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو گزیی و تەشقەڵەیە بە کۆڵیەوەیە - بۆ ئەوە ئابڕووی بچێت - دەبیندرێ))

ئەی خودایە بمانپارێزە و دامانپۆشە و شەرمەزارمان مەکە.

بە ڕاستی چەند دیمەنێکن لەوپەڕی مەترسیدان و دڵەکان لە بن دەردەهێنن.

لە فەرموودەیەکدا کە (بوخاری و موسلیم)[1] ڕیوایـەتیان کـردوە لـە فـەرموودەی دایکـی ئیماندارانـەوە (عائیـشە) دەفـەرموێت: پێغەمبـەری خـواﷺ فەرموویـەتی: ((یحشر الناس یوم القیامة حُفَاةً عُرَاةً غُرْلًا)) فقَالَتْ عَائشَةُ للنبي ﷺ: يَا رَسُولَ اللّه النِّسَاءُ و الرِّجَالُ جميعاَ يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ؟ قَالَ ﷺ: يـا عائـشة،الْأَمْرُ أَشَـدُّ مِـنْ أَنْ ينظر بعضهم الى بعض)) واتـە: خـەڵکی لـە ڕۆژی قیامەتـدا دەدرێـن لەبـەر و کۆ دەکرێنەوە بە ڕووتـی و پـێ پـەتێتی و خەتەنـە نـەکراوی، عائیـشە بـە پێغەمبـەری خوای ﷺ فەرموو: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئافرەتان و پیـاوان هـەمووان تەماشـای یـەکتر دەکـەن؟ ئـەویش فـەرمووی: ئـەی عائیـشە، کارەکـە زۆر لـەوە تونـدتر و سەختترە کە تەماشای یەکتر بکەن)).

لە ڕیوایەتەکەی بوخاریدا هاتوە: ((الْأَمْرُ أَشَدُّ مِنْ أَنْ يُهِمَّهُمْ ذَاكِ)) واتـە: کارەکـە زۆر لەوە سەختترە ئەوە ببێتە خەمیان)).

سوێند بە خوا ئەگـەر بـە وردی بـیر لـەم فەرموودەیـە بکەیتـەوە ئـەوا قـەبارە و ئەندازەی ئەو ترس و بیمەت دەهاتە پێش چاو.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ((فَـإِذَا جَـاءَتِ الـصَّاخَّةُ))، واتـە: ئـەو ڕۆژەی کـە گوێیەکان لە بەر دەنگە دەنگی بەرز و هاوار و ترس کەڕ دەبن : ((يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ

١ ـ أخرجه البخاري (٦٥٢٧) ومسلم (٢٨٥٩) .

أَخِيهِ (٣٤) وَأُمِّهِ وَأَبِيهِ (٣٥) وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيهِ )) واتە: لەو ڕۆژەدا برا لە برای خۆی ڕادەكا (٣٤) لە دایك و باوكیشی (٣٥) وە لە خێزانی و كوڕەكانی)) ئایە بۆ خەڵكی لە منداڵ و خێزان و باوك و دایك و برای خۆی ڕا دەكات و هەڵدێ؟ خوای گەورە دەفەرموێت: ((لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ)) واتە: چونكە هەر كەسێك لێیان سەرگەرمی كاروكێشەی خۆیەتی و ناپەرژێتە سەر ئەوی تر)).

خەڵكی هەموو سەرقاڵی كێشە و گرفتی خۆیەتی و هیچ كەسێك ڕوو لە كەسێكی تر ناكات، بەڵكو دایك ڕوو لە منداڵە كۆرپەكەی خۆی ناكات، ئەو دایكەی وەكو نمونەی سۆز و میهرەبانی باس دەكرا، كۆرپە شیرە خۆرەكەی فرێ دەداتە سەر زەوی، بەڵكو سكەكەی لە بار دەچێت، لە ترسی ئەوەی كە دەیبینێ! !

بەڵام بە داخەوە هەندێ كەس باوەڕ بە زیندووبوونەوە ناكات و وا دەزانێ ژیان بە مردن كۆتایی پێ دێت! ! وا دەزانن خەڵكی لە بەر دەستی خوادا ڕاناوەستن و نمایش ناكرێن و خەڵكی لێپرسینەوەیان لە گەڵدا ناكرێت! !

سوێند بەو خوایەی كە هیچ خوایەكی تر جگە لەو نییە هەمووان لە پاش مردن زیندوو دەكرێنەوە، بەڵكو خوای پەروەردگار فەرمان دەكاتە پێغەمبەرەكەی ﷺ كە بۆ ئەو مەبەستە سوێند بخوات: ﴿زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ﴾ (التغابن: ٧) واتە: ئەوانەی كافر و بێ بڕوا بوون گوتیان: هەرگیز پاش مردن زیندوو ناكرێنەوە، پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەرﷺ: بەڵێ سوێند بە پەروەردگارم بێ گومان لە گۆڕەكانتاندا دەرئەهێنرێن و زیندووئەكرێنەوە پاشان لە هەر كارو كردەوەیەك ئەنجامتان داوە ئاگادار دەكرێن لە گەورە و لە بچووك و هەر بەوەش پاداشت دەدرێنەوە ئەوەیش بۆ خوا كارێكی ئاسانە چونكە ئێوە خۆتان دەزانن كە لە سەرەتاوە شتێك نەبوون و وجودتان نەبوو پاشان دروستی كردن و بوون باشە ئیتر چۆن ناتوانێ زیندووتان بكاتەوە؟!))

ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ: ﴿بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ﴾ چونكە بێباوەڕان وایانیشان دەدەن كە زیندوو ناكرێنەوە، ﴿وَقَالُوٓاْ إِنۡ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا وَمَا نَحۡنُ بِمَبۡعُوثِينَ﴾ (الأنعام:

٢٩) واتە: هەتا لە دونیاشدابوون دەیانگوت: بێجگە لەم ژیانەی دونیایەمان هیچ ژیانی تر نییە و هەرگیز زیندوو ناکرێینەوە، واتە: نە ژیانی تر هەیە و نە زیندوو بوونەوەش))

﴿وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾ (الجاثية:٢٤) واتە: هاوبەشدانەرەکان وتیان: جگە لەم ژیانی دونیایەمان شتێکی تر لە گۆڕدا نییە، بۆ خۆمان ئەژین و ئەمرین، واتە: دەستەیەك ئەژی و دەستەیەك ئەمرێ ئیتر دوای ئەوە نەزیندوو بوونەوە هەیە، نە لێپرسینەوە!! هەر سروشت و زەمانە و ڕۆژگارە دەمان مرێنی و لە ناومان دەبات، ئەوانەش ئەو قسە ئەکەن، هیچ جۆرە زانستێکیان لەو بارەوە نییە، هەر لە خۆیانەوە ئەو قسە دەکەن، واتە: ئەوەی دەیڵێن لە ڕێی زانستەوە نییە، بەڵکو تەنها گومان ئەبەن، گومان بەو لاوە هیچ دڵنیاییەکیان نییە))

ئەوە ڕاستییەکە و دەبێت هەموو خەڵکی بزانن کە لە پاش مردن زیندووبوونەوە هەیە، خوای گەورە چەند نمونەیەکی لە قورئاندا هێناوەتەوە لە سەر باسی زیندووبوونەوە لە پاش مردن، بۆ ئەوەی خەڵکی وا نەزانن کە ژیان بە مردن کۆتایی پێ دێت و لاپەرەکانی ژیانی تا ئەو کات و ساتە تەواو دەبێت و دادەخرێت!! نەخێر..

لە کۆندا یەکێ لە سەرپێچیکاران هات بۆ لای خۆشەویستی خوا ﷺ! ئەویش (العاص ی کوڕی وائل) بوو ئێسکێکی رزیوی هێنا و بە دەستەکانی وردی دەکرد، هەروەکو لە (المستدرك) و (تفسیر ابن أبی حاتم) و جگە لەوان بە سەنەدێکی (صحیح)[١] هاتوە لە (ابن عباس)ەوە دەفەرموێت: ((جَاءَ الْعَاصِ بْنُ وَائِلٍ السهمي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِعَظْمٍ حَائِلٍ، فَفَتَّهُ بِيَدِهِ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، أيبعث اللَّهُ هَذَا بَعْدَ مَا

---

١ ـ أخرجه ابن ابي حاتم في (تفسيره) كما في ابن كثير (تفسير سورة يس : ٧٨) والحاكم في (المستدرك) (٣٥٦٥) وقال : ( هذا حديث صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه ) والبيهقي في البعث , والاسماعيلي في (معجمه) والضياء في ( المختارة) كما في (الدر المنثور) وأخرجه الطبري في تفسيره وأورده الشيخ مقبل في الصحيح المسند من أسباب النزول (١٩٧) .

أرم؟ قَالَ:"نَعَمْ، يَبْعَثُ اللَّهُ هَذَا، ثُمَّ يُمِيتُكَ، ثُمَّ يُحْيِيكَ، ثُمَّ يُدْخِلُكَ نَارَ جَهَنَّمَ)) واتە: (العاص ى كوڕى وائل السهمى) هات بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ و ئێسکە ڕزیوێکی هێنا و بە دەستەکانی وردو خاشاکی کرد و ڕووی لە پێغەمبەری خواﷺکرد و گوتی: ئەی موحەممەد: تۆ پێت وایە خوا ئەمە زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا ورد و خاش بوە؟! ئەویش فەرمووی: بەڵێ.. خوای گەورە ئەمە زیندوو دەکاتەوە و ئەمجار تۆ ئەمرێنێ، لە پاشان زیندووت ئەکاتەوە ئەمجار دەتخاتە ناو ئاگری دۆزەخەوە)) لە پاش ئەوە ئەو ئایەتانەی سورەتی (یاسین) دابەزی کە دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَ ٱلْإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقْنَٰهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُۥ ۖ قَالَ مَن يُحْيِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ فَسُبْحَٰنَ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾﴾(یس) واتە: ئایا ئەو مرۆیە کە ئینکاری توانا و دەسەڵاتی خوا دەکا لەسەر زیندوبوونەوە نەیزانیوە کە ئێمە ئەومان لە تنۆکە ئاوێکی قێزەون دروست کردوە؟ کەچی وائێستا - لەباتی سوپاسگوزاری - دوژمنێکی ئاشکرایە و نکۆڵی زیندووبوونەوە ئەکات!!(٧٧) مەسەل و نمونەیەکی بۆ هێنایەنەوە و ئینکاری دەسەڵاتی ئێمەی کرد بۆ زیندووکردنەوەی ئادەمیزاد و جنۆکە و دروستبوونی خۆی لە بیر کرد! وتی: کێ ئەتوانێ ئەو ئێسك و پروسکە رزیوانە زیندووبکاتەوە؟!(٧٨) تۆ بڵێ ئەی موحەممەد ﷺ: هەر ئەو کەسە کە یەکەمجار دروستی کردوون زیندوشتان دەکاتەوە، چونکە ئەو خوایە بە هەموو دروستکراوێك زاناو بە ئاگایە، ئەزانێ چۆنی دروستکردون و چۆنیش زیندوویان بکاتەوە (٧٩) هەر ئەو زاتە دەسەڵاتدارەیە ئێوە زیندوو دەکاتەوە کە لە داری سەوز و شین و تەڕ ئاگری بۆ دروستکردوون، ئینجا ئێوەش ئاگری لێ ئەکەنەوە (٨٠) ئاخۆ ئەو خوایە توانیبێتی ئەم ئاسمانان و

زەوییە بەدی بهێنێ توانای نییە بۆ جارێکی تر وێنەیان دروست بکاتەوە؟ بەڵێ ئەتوانێ و هەر ئەویشە دروستکار و زانیار (٨١) بەڕاستی هەرکاتێ ویستی شتێ بەدی بهێنی هەر ئەوەیە کە پێی بفەرمێ ببە!، ئەویش دەست بە جێ دەبێت (٨٢) پاکی و بێ عەیبی هەربۆ ئەو خوایە دەسەڵاتی هەموو شتێکی بە دەستەوەیە، هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە بۆ لێکۆڵینەوە و پاداش و تۆڵە (٨٣).

خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت: ـ هەروەکو ئیمامی بوخاری[1] ریوایەتی کردوە لە فەرموودەی (ابو هريرە)وە ئەویش لە پێغەمبەری خواوەﷺ ـ : ((قَالَ اللَّهُ: كَذَّبَنِي ابْنُ آدَمَ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ، وَشَتَمَنِي وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ)) واتا: خوای گەورە دەفەرموێت: بەنی ئادەم بە درۆی خستمەوە لە کاتێکدا بۆی نەبوو ئەوە بکات و جوێنی پێدام لە کاتێکدا بۆی نەبوو ئەوە بکات))

خواکەت بە درۆ خستەوە ئەی بەنی ئادەم؟! جوێنت بە خواکەت دا ئەی بەنی ئادەم؟!

((فَأَمَّا تَكْذِيبُهُ إِيَّايَ فَقَوْلُهُ: لَنْ يُعِيدَنِي كَمَا بَدَأَنِي، وَلَيْسَ أَوَّلُ الْخَلْقِ بِأَهْوَنَ عَلَيَّ مِنْ إِعَادَتِهِ)) واتە: بە درۆخستنەوەکەی ئەوەیە کە دەڵێت: خوای گەورە جارێکی تر نامگێڕێتەوە و زیندووم ناکاتەوە هەروەکو چۆن لە سەرەتادا منی بە دی هێنا، باش بزانن کە سەرەتای دروستکردن سووکتر و ئاسانتر نییە بە لای منەوە لە گەڕانەوەی)).

ئەو خوایەی کە لە نەبوونەوە دروستکراوەکانی دروست کردوە بە توانایە بەدیبهێنێتەوە، بەڵکو بە توانایە لە نەبوونەوە بەدیبهێنێتەوە و لە نەبوونەوە دروست بکاتەوە، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو، توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە، خوای گەورە لە فەرموودە قودسییەکەدا ئەمجار دەفەرموێت: ((وَأَمَّا شَتْمُهُ إِيَّايَ فَقَوْلُهُ: اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا! وَأَنَا الْأَحَدُ الصَّمَدُ لَمْ أَلِدْ وَلَمْ أُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لِي كُفُئًا أَحَدٌ)) واتا: بەڵام جوێن پێدانەکەی بەرانبەر بە من ئەوەیە کە دەڵێت: خوای گەورە کوڕی هەیە، لە کاتێکدا من تەنهاو بێ نیازم و نە منداڵم بوە و نە لە کەسیش بوومە و

---

١ ـ أخرجه البخاري (٤٩٧٤) ، (٤٩٧٥) .

هەرگیز هیچ کەسیش هاوشێوە و هاوتای من نییە)).

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ۝٣ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ۝٤﴾(الإخلاص) واتا: ئـەی موحەممەدﷺ بڵێ: ئەو پەروەردگارەی کە من دەیپەرستم تاك و تەنیایە و هاوەڵ و هاوبەشی نییە (١) ئەو خوایە ـ کە ناوی الله یە ـ جێگـای هیـوا و ئومێدە و بـێ نیازیشە هیچ کەسێکیش ـ جگە لەو ـ شایانی ئەوە نییـە گیروگرفتـەکان ببرێنـە لای بۆ چارەسەر، هەر ئەوزاتە گەورەیشە کە دەبێ هەر بۆ لای ئەو بگەڕێینەوە (٢) کەسی لێ نەبوە و هـیچ رۆڵەیـەکی نییـە ـــ وەك جولەکـە و گـاوڕ و بتپەرسـتەکان دەڵـێن ـــ چـونکە خـوا زۆر بلّنـد و پـاك و بێخـەوش و دوورە لـەو جـۆرە بـیر و بۆچوونانە و لە کەسیش نەبوە و بێ دایك و بابە، چونکە هەموو شتێکی لە دایك بوو تازە و نوێیە و خوا نییە و سەرەتایەکی هەیە، بەڵام خوا بێ سەرەتا و(ئەزەل) ییـە (٣) هەرگیز هـیچ کەسـێك هاوشـێوە و هاوتـای نییـە و کەسـێ نـاتوانێ بەرهەڵسـتی بکات (٤).

بەڵکو خوای گەورە چەندەها نمونەی نایاب و قەشەنگی هێناوەتەوە هەر لە سەر زیندوو بوونەوەی پاش مردن.

لە گەڵ مندا ئەو چەند ئایەتە بخوێنەوە:

﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِي حَآجَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ فِي رَبِّهِۦٓ أَنۡ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ إِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُۖ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأۡتِي بِٱلشَّمۡسِ مِنَ ٱلۡمَشۡرِقِ فَأۡتِ بِهَا مِنَ ٱلۡمَغۡرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِي كَفَرَۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ۝٢٥٨ أَوۡ كَٱلَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرۡيَةٖ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحۡيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۖ فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٖ ثُمَّ بَعَثَهُۥۖ قَالَ كَمۡ لَبِثۡتَۖ قَالَ لَبِثۡتُ يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۖ قَالَ بَل لَّبِثۡتَ مِاْئَةَ عَامٖ فَٱنظُرۡ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمۡ يَتَسَنَّهۡۖ وَٱنظُرۡ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجۡعَلَكَ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِۖ وَٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡعِظَامِ كَيۡفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ

نَكۡسُوهَا لَحۡمٗاۚ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥ قَالَ أَعۡلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾ البقرة
واتا: ئایا تۆ دیمەنی ئەو کەسەت نەدیبوو کە چۆن لە گەڵ ئیبراهیمدا﷣ـ سەبارەت بە پەروەردگاری ـ دەمەقاڵێ و ململانێی دەکرد و وایدەزانی هەر خۆی خوایە؟! لە بەر ئەوە خوا پاشایەتی و دەسەڵاتی پێدابوو ئەوی کە خۆی بە خوا زانی بە عینادییەوە لێی پرسی و گوتی: تۆ پەروەردگارت کێیە؟ ئیبراهیمیش﷣ لە وەڵامدا گوتی: پەروەردگاری من هەر ئەو زاتەیە کە ژیان دەبەخشێت و دەشمرێنێ، واتە: ژیان و مردن هەر بە دەستی ئەوە، کەچی ئەویش وتی: خۆ منیش کەسانێ دەژێنم و کەسانێکیش دەمرێنم ئارەزووم لە هەر کەسێك بوو ئەوا ئەیکوژم و دەیمرێنم، وەیان چاوپۆشی لێ ئەکەم و دەیژێنم، دیارە ئەم وەڵامە هەر لە رووی عینادییەوە بوو ئەگینا ئەوە وەڵام نەبوو، کە ئیبراهیم﷣ زانی وەڵامەکەی ناڕاستە، بەڵگەیەکی تری هێنایەوە بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی خوا و دەمکوت کردنی ئەو بۆیە دەفەرموێ: دەی باشە خوا لە خۆرهەڵاتەوە خۆی دێنێ، دەسا تۆیش کە داوای خوایەتی ئەکەیت لە خۆر ئاواوە بیهێنە، واتە: یاسای بوونەوەر بگۆڕە ئەگەر تۆیش خوایت ئەوسا ئیتر ئەو ستەمکار و بێ باوەڕە حەپەسا و نقەی لێبڕا و وەڵامی نەما و بوو بە قسەی خۆیەوە و پەکی کەوت، بێگومان خوا هۆز و گەلی ستەمکاران ڕێنمایی ناکات، واتە: بەڵگە و نیشانەکانی خۆیانیانی فێر ناکات هەتا بتوانن سەر لە هەقەوە دەرکەن (٢٥٨) یان دەنگوباسی ئەو کەسەت بیستوە کە بە قەراخ گوندێکی وێراندا رابردوو دیتی داروبەردی هەموو بە سەریەکا کەوتوە و چۆڵ و وێرانەیە و دیوارەکانیشی بە میچکەیەوە تەپیوە؟ ئەوسا بە سەر سوڕمانێکەوە ـ لەبەرخۆیەوە ـ وتی: ئاخۆ خوا دوای وێرانبوونی ئەم گوندە و مردنی خەڵکەکەی چۆن دەتوانێ ئەمە زیندوو ئاوەدان بکاتەوە؟ ئینجا خوا بۆ ماوەی سەد ساڵ مراندی و بێ گیان کەوت، پاشان زیندووی کردەوە تا بە چاو دەسەڵاتی ئەو خوایە ببینێ، خوا لە سەر زاری فریشتە لێی پرسی و فەرمووی: تۆ چەندەت پێ چوە بە مردووی؟ لە وەڵامدا وتی: وا ئەزانم رۆژێك یا کەمتریش لە رۆژێك ماومەتەوە، زاناکان دەڵێن: ئەو رۆژە کە مرد و بێ گیان کەوت کاتی

چێشتەنگاو بوو کاتێکیش زیندووی کردەوە و هەڵیساند کاتی خۆرئاوا بوو بۆیە ئەویش ئەو وەڵامەی دایەوە، خوا فەرمووی: نەخێر بەڵکو سەد ساڵت پێ چوە، ئەوسا لە گەڵ ئەوەیشدا تەماشایەکی خواردەمەنی و خواردنەکەشت بکە، دەبینی تا ئێستاش تام و ڕەنگیان نەگۆڕاوە و فاسید نەبوون، بشنوارە بۆ گوێدرێژەکەت چۆن ئێسك و پروسکی ڕزیوە و چۆنیش هەر ئێستا لە پێش چاوخۆتەوە زیندووی دەکەینەوە؟ بۆ ئەوە ئەم مەسەلەی بەسەرهات و زیندووبوونەوەیەت بکەینە مۆعجیزە و پەندێك بۆ خەڵك،هەتا دڵنیابن لە مەسەلەی زیندووبوونەوە سەرنجی ئەم ئێسقانانەش بدەو بزانە چۆن ئەیانبزوێنین و پێکیان دەلکێنینەوە، دوای ئەو ماوە زۆرەیە لەپاشان بە گۆشت دایان دەپۆشین هەروەك یەکەمجاری لێ ئەکەینەوە ئینجا کاتێ ئەو دەسەڵاتەی بۆ دەرکەوت و بۆی ڕوون بوویەوە، وتی: وا ئێستا چاك ئەزانم و بە چاویش دیتم کە بەڕاستی خوا بە سەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتی هەیە و دەتوانێ هەموو کارێ بکا.(٢٥٩))).

جا ئەمە کابرایەکی بەنی ئیسرائیلییە [١]، خوای گەورە وەکو نمونە هێناویەتی بۆ بابەتی زیندووبوونەوە لە پاش مردن، سواری گوێدرێژەکەی دەبێت، پاشان خوای گەورە بۆ ماوەی سەد ساڵ دەیمرێنێت، ئەمجار زیندووی دەکاتەوە، خوای گەورە لەڕێگای فریشتەیەکەوە پرسیاری لێ کرد: ماوەی چەند مایتەوە؟ کە تەماشای کرد بینی ڕۆژ لە ئاوابووندایە، بۆیە ئەویش وایزانی هەمان ئەو ڕۆژەیە کە تیایادا نوستوە، فەرمووی: ((قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالَ بَلْ لَبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ)) بەلام چۆن بزانم؟ لێرەدا پێویستی بە دوو بەڵگە هەیە یەکێکیان بەراوردکردنێکی نەگۆڕ و ئەویتر گۆڕاو.

جا بەراوردکردنە نەگۆڕەکە بریتی بوو لە: خواردن و خواردنەوە، بۆیە فەرمووی: ((فَانْظُرْ إِلَى طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ))، واتە: نە بۆنەکەی گۆڕاوە و نە تامەکەی و نە ڕەنگەکەی.

---

١ ـ اختلف أهل العلم في هذا المار، من هو؟ والمشهور أنه عزير، كما قال ابن كثير في (التفسير) (٢/٤٥٣ ط أولاد الشيخ) .

له تۆم دەویٚ که پێشکەوتوو ترین (دیب فریزر) بەفرکەر له سەر زەویدا بهێنیٚ و بۆ ماوەی سەد ساڵ خواردن و خواردنەوە بپارێزیٚ هەر دەبیٚ ڕەنگ و بۆن و تامەکەی بگۆڕدریٚ! ! پاکی و بیٚ گەردی بۆ ئەو کەسەی که توانای به سەر هەموو شتێکدا هەیە، ئەمە بەراورده نەگۆڕەکەیە.

بەراورده گۆڕاوەکە، گوێدرێژەکە، بوەته ئێسکێکی رزیو، خوای گەورە فەرمان دەکات به زیندوو بونەوەی گوێدرێژەکە، بۆیە ئێسکەکان لێرە و لەویٚ هەموو کۆبوەوە، ئێسکی پێیەکان لە گەڵ ئێسکی پێیەکاندا، دەستەکان لە گەڵ دەستەکاندا، ئێسکی پشت و بڕبڕه له گەڵ ئێسکی پشت و بڕبڕەکاندا، پاشان ئەو ئێسکانه به گۆشت داپۆشران، ئەمجار روحی پیادا کرا، بۆیە یەکسەر گوێدرێژەکە دەستی به زەڕین کرد، به ئیزنی خوای باڵا دەست زیندوو بوەوە به بەرچاو و لە بەر دەستی عوزەیردا، بۆیە یەکسەر فەرمووی: ((أَعْلَمُ أَنَّ اللَّـهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)).

له پاش ئەوه خوای گەوره دەفەرموێت: ((وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ الْمَوْتَى قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِنْ قَالَ بَلَى وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ)) واته: وه بیربێنەو باسی ئەمە بکە، ئیبراهیمﷺ به پەروەردگاری فەرموو: ئەی پەروەردگاری من! نیشانم بدە ـــ به چاوی سەر ببینم ـ که تۆ چۆن مردووان زیندوو ئەکەیتەوە؟ خوا فەرمووی: مەگەر تۆ هێشتا بڕوات به زیندوو بوونەوە نییە؟ ئیبراهیمﷺ وتی: بەڵیٚ چاك باوەڕم هەیە، که تۆ دەتوانی مردووان زیندوو بکەیتەوە بەڵام حەز ئەکەم به چاو ببینم تا به تەواوی دڵنیابم)).

دڵنیابه که ئیبراهیمﷺ هیچ گومان و دوودڵییەکی نەبوو.

وەکو ئەوەی تۆ به من بڵێیت: کوڕەکەت ئەمساڵ ڕێژەی ١٠٠ ٪ هێنا لە تاقیکرنەوەکانی ئامادەیی کۆتایی ساڵدا و ئەمەش بڕوانامەکەیەتی، منیش دەڵێم: ما شاء الله، چۆن ئەم ئەنجامەت به دەست هێناوە؟ کەچی من گومانم نییە لەو ئەنجامەی به دەستی هێناوە، ئیبراهیمﷺ فەرمووی: ((رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ الْمَوْتَى قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِنْ قَالَ بَلَى وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِنَ الطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ))

واتە: ئەی پەروەردگاری من! نیشانم بدە - بە چاوی سەر ببینم - کە تۆ چۆن مردووان زیندوو ئەکەیتەوە؟ خوا فەرمووی: مەگەر تۆ هێشتا بڕوات بە زیندوو بوونەوە نییە؟ ئیبراهیم‌ﷺ وتی: بەڵێ چاك باوەڕم هەیە، کە تۆ دەتوانی مردووان زیندوو بکەیتەوە بەڵام حەز ئەکەم بە چاو ببینم تا بە تەواوی دڵنیابم، خوا فەرمووی: دەسا چوار پەلەوەر بگرە و جوان سەرنجیان بدە)).

بیانبڕە، هەموو باڵندەیەك بناسە و بە جوانی بتوانی بیانناسیتەوە، ((ثُمَّ اجْعَلْ عَلَى كُلِّ جَبَلٍ مِنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ادْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا)) واتە: ئەوسا هەرچواریش سەر بڕە، ئینجا پەل پەلیان کەو خوێنگۆشتەکەیان تێکەڵ بکە و بیانکە چوار کوت پاشان هەر کوتێکیان لەسەر لوتکەی کێوێك دانێ ئەوجا بانگیان بکە و بە فەرمانی خوا بە پەلە ((زیندوو ئەبنەوە و دێنە لات و هەر پارچەی لە گەڵ پارچەکەی خۆیدا یەك ئەگرێتەوە)).

نەیفەرموو: بە فڕین دێن بۆ لات، بەڵکو (يأتينك سعيا) بۆ ئەوەی ئیبراهیم‌ﷺ هەر باڵندەیەك بە تەنها لە سەر ڕاستێتی خۆی ببینێ.

بەڵکو (ابن كثير) و جگە لەو باسیان کردوە[1]: ئیبراهیم‌ﷺ بە دەستەکانی خۆی سەری باڵندەکانی هێنا،کاتێ جەستەکەی لە سەر کۆکراوە، ئەمجار گۆشت ئێسکەکانی داپۆشی، پاشان بە پەڕ داپۆشرا، ئەگەر ئیبراهیم‌ﷺ هەر سەری باڵندەیەکی جگە لە سەری خۆی پێوەی بنابا ئەوە یەکتری نەدەگرت و ئەگەر سەری باڵندەکە خۆی بوایە ئەوا یەکتری دەگرتەوە، ئەمجار ئەو باڵندانە هاتن بۆ لای ئیبراهیم‌ﷺ (سعيا) لە پێش چاوی و لە بەر دەستیدا، ((ثُمَّ ادْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا وَاعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ)) واتە: ئەوجا بانگیان بکە و بە فەرمانی خوا بە پەلە ((زیندوو ئەبنەوە و دێنە لات و هەر پارچەی لە گەڵ پارچەکەی خۆیدا یەك ئەگرێتەوە بزانە و بێ گومانبە کە خوا چەندە دەستەڵاتدارە، کاردروستە ((بیەوێ هەر کارێك بکات ئەیکات و پڕیشە لە حیکمەت)).

---

١ - تفسير ابن كثير ( ٤٥٦/٢) وتفسير البغوي (٣٢٤/١) .

ئایا چیرۆکی یارانی ئەشکەوتتان بە بیر دێ؟ خوای بەرز و بالا دەفەرموێت: ﴿ وَلَبِثُواْ فِي كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِاْئَةٍ سِنِينَ وَٱزْدَادُواْ تِسْعًا ﴾(الكهف ــ ٢٥) واتە: لاوەکانیش لە ئەشکەوتەکەیاندا سێ سەد ساڵی هەتاوی بە خەوتووی مانەوە و نۆ ساڵیشیان بۆ زیاد کرد.)) الله أكبر...(٣٠٩) ساڵ لە ئەشکەوتێکدا!

﴿ ثُمَّ بَعَثْنَٰهُمْ لِنَعْلَمَ أَيُّ ٱلْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓاْ أَمَدًا ﴾ (الكهف: ١٢) واتە: پاشان دوای ماوەیەکی دوور و درێژ هەڵمان ساندن و خەبەرمان کردنەوە، تا بزانین و دەرکەوێ کام یەك لەو دوو دەستە و گروپەیان - کە قسەیان جیاوازە لە بارەی دیاری کردنی ماوەی مانەوەیان - هەر بە هەژمارساڵەکانی مانەوەیان لە بیر ماوە، کام لە دوولا دەزانن کە چەند ساڵە خەویان لێ کەوتوە، بەلام دەمانەوێ زانایی و توانایی خۆمانیان نیشان بدەین تا زیاتر سووربن لە سەر باوەڕەکەیان.))

خوای گەورە زیندووی کردنەوە لە پاش مردنیان بە چەندەها ساڵ.

ئەم بەشە بە فەرموودەیەکی ناسك و جوان تەواو دەکەم، کە پێغەمبەری ئازیزﷺ باسی زیندووبونەوەمان بۆ روون دەکاتەوە، هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابو هريرە) وە کە خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت: ((قَالَ رَجُلٌ لَمْ يَعْمَلْ خَيْرًا قَطُّ: فَإِذَا مَاتَ فَحَرِّقُوهُ وَاذْرُوا نِصْفَهُ فِي الْبَرِّ وَنِصْفَهُ فِي الْبَحْرِ، فَوَاللَّهِ لَئِنْ قَدَرَ اللَّهُ عَلَيْهِ لَيُعَذِّبَنَّهُ عَذَابًا لَا يُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِنْ الْعَالَمِينَ. فَأَمَرَ اللَّهُ الْبَحْرَ فَجَمَعَ مَا فِيهِ، وَأَمَرَ الْبَرَّ فَجَمَعَ مَا فِيهِ، ثُمَّ قَالَ: لِمَ فَعَلْتَ؟ قَالَ: مِنْ خَشْيَتِكَ وَأَنْتَ أَعْلَمُ، فَغَفَرَ لَهُ)) واتە: پیاوێك کە هەرگیز چاکەی لێنەوەشاوەتەوە — بە خێزان و کەسوکارەکەی وت - : ئەگەر مردم بمسوتێنن پاشان خۆڵەمێشەکەم پرش و بلاوبکەنەوە، نیوەی بە وشکانیدا و نیوەکەی تریش بە ناو دەریادا، سوێند بە خوا ئەگەر خوا تەقدیری کردبێت لە سەری ئەوا سزایەکی ئەوتۆی دەدات کە هیچ کەس لە خەڵکی جیهانیانی ئاوا سزا نەدابێت، — کاتێك پیاوەکە مرد ئەوەی فەرمانی پێکردبوون بۆیان کرد - خوا فەرمانی کرد بە وشکانی چی تیابوو — لە

١ ـ أخرجه البخاري (٧٥٠٦) ومسلم (٢٧٥٦) .

ئەندامانی ئەو - کۆی کردەوە و فەرمانی کرد بە دەریا چی تیابوو ئەویش کۆی کردەوە، پاشان فەرمووی: ((بۆ ئەوەت کرد؟ وتی: لە ترسی تۆ ئەی پەروەردگار، خۆیشت زاناتری. خوایش لێی خۆش بوو))

بەڵێ.. ترسان لە خوای گەورە دەبێتە هۆی سڕینەوەی تاوانەکان و لێبوردنی خوای گەورە، تەماشای ئەو ترسە بکە، تەماشای فەزڵی ترس بکە.

ئیمامی ئەحمەد لە (مسند)ەکەیدا و (ابن ماجه) لە (سنن)ەکەیدا بە سەنەدێکی (حسن)[1] ریوایەتیان کردوە لە (بسر ی کوڕی جحاش ی القرشی) کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((أن النَّبِيُّ ﷺ بزق يوما في كَفِّه فوَضَعَ عليه أُصْبُعَهُ ثم قَالَ: قال اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ابْنَ آدمَ! أَنَّى تُعْجِزُنِي وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِنْ مِثْلِ هَذِهِ؟ حتى إذا سويتك وعدلتك مشيت بين بردين وللأرض منك وئيد، فجمعت، ومنعت، حتى بَلَغَتِ التراقي قُلْتَ: أَتَصَدَّقُ وَأَنَّى أوَانُ الصَّدَقَةِ))

واتە: ڕۆژێك پێغەمبەری خواﷺ تفی کردە ناو لەپی خۆی و پەنجەی خستە سەری و گوتی: خوای گەورە دەفەرموێ: ئەی نەوەی ئادەم چۆن لە دەسەڵاتم دەردەچی کەچی من لە شتێ وا تۆم دروست کردوە؟ تاکو ئەندامەکانی بە جوانی ڕێك خستووی، لە نێوان دوو کراس و جلوبەرگدا ڕێ دەکەیت و قورسی و گرانیت بە سەر زەوییەوەیە، سەروەت و سامانت کۆ دەکردەوە و لە خەڵکیت دەگرتەوە، تاکو ڕوحت گەیشتە گەرووت، گوتت: ئێستا سامان دەبەخشم، ئەو کاتە کاتی بەخشین کەی ماوە؟!))

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلْكَرِيمِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِى خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِىٓ أَىِّ صُورَةٍ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾ كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِٱلدِّينِ ﴿٩﴾ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَٰفِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَٰتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴿١٢﴾ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ ٱلْفُجَّارَ لَفِى جَحِيمٍ ﴿١٤﴾ يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿١٥﴾ وَمَا هُمْ عَنْهَا بِغَآئِبِينَ ﴿١٦﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا يَوْمُ ٱلدِّينِ

---

١ ـ أخرجه أحمد (٢١٠/٤) وابن ماجه (٢٧٠٧) والحاكم ( ٣٨١٤ , ٨٠٣١) وقال البوصيري : اسناده صحيح , وصححه العلامة الألباني في ( الصحيحة) (١٠٩٩) .

﴿١٧﴾ ثُمَّ مَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴿١٨﴾ يَوۡمَ لَا تَمۡلِكُ نَفۡسٌ لِّنَفۡسٍ شَيۡـٔٗاۖ وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٍ لِّلَّهِ ﴿١٩﴾﴾(الأنفطار).واتە: ئەی مرۆڤ...! چی تۆی تەفرە و فریوداو بەرامبەر بە پەروەردگاری بەخشندەت کافر بوویت لە گەڵ ئەو هەموو نیعمەت و بەخششانەدا؟(٦) ئەوەی دروستی کردیت لە نەبوون، ئینجا بە شێوەیەکی زۆر جوان ئەندامەکانی ڕێك خستیت قەد و بەژن وبالا و ئەندامی شیاو و گونجاوی پێ بەخشیت ڕێك و پێکی کردیت واتە: قەد و قامەت و بالا لە جوانترین شێوەی پێ بەخشیت (٧) لە هەر شێوە و دیمەنێکدا خۆی ویستی یەکی خستیت (٨) نەخێر، ئێوە تەفرە مەخۆن بەو ڕێز و حورمەتەی من بەرامبەرتان و لاڕێ مەبن، جادەبوو سوپاسگوزار بن، کەچی هێشتا بڕواشتان بە ڕۆژی پاداشت و تۆڵە نییە و ئینکاری دەکەن (٩) لە کاتێکدا - کە ئێوە ئەوەندەش لاسار و یاخین - دەستەیەك لە فریشتەی چاودێر و پارێزەرتان لە سەر دانراوە، هەرچی بکەن ئەینووسیێ (١٠) ڕێزدارانێکی نووسەرن (١١) ئەزانن چی دەکەن، واتە: بە هەموو کارو کردەوەیەکتان بە ئاگان(١٢) بە ڕاستی چاکان لە ناو خۆشی بەهەشت دان (١٣) و بێ گومان تاوانباران و بەدکارانیش لەئاگری دۆزەخ دان (١٤) لە ڕۆژی پاداشتدا دەچنە ناوی و گەرمای ئەچێژن و دەسوتێن (١٥) قەتیس دەمێنن و هەرگیز لێ نابڕێن و دوور نابن بەڵکو بە هەتا هەتایی لەوێن (١٦) تۆ چی ئەزانیت (ئەی ئینسان!) ڕۆژی پاداشت چییە و چۆنە؟ ئەوەندە گران و سەختە، مەگەر خوا خۆی وێنەیت بۆ باس بکات (١٧) دیسان - بۆ جارێکی تر - تۆ چووزانیت ڕۆژی قیامەت و پاداشت و تۆڵە چییە و چۆنە؟ (١٨) ڕۆژێکی سەختی وەهایە کە هیچ کەسێك بۆ کەسێکی تر هیچی بە دەست نییە و ئەو ڕۆژە هەموو کار و فەرمانێك هەر بۆ خوایە. هیچ کەسیش ناتوانێ ململانێ لە گەڵ خوا بکا(١٩)))

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ وَأَشۡرَقَتِ ٱلۡأَرۡضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ وَجِاْيٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ

لَا يُظْلَمُونَ ﴿٦٩﴾ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾(الزمر). واته: هەرکە لە لایەن ئیسرافیلەوە فوو بە شەیپووردا (کەڕەنادا)کرا، ئیتر ئەو کاتە هەموو ئەوانەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدان مەگەر کەسێك خوا خۆی بیەوێ نەمرێت، لە پاشان بۆ جارێکی تر کە فووی پیاکرا ئەوجا لە ناکاو تەواوی دروستکراوەکان لە گۆڕەکانیاندا هەڵئەسنەوە و چاوەڕوانن چییان پێ بکرێ (٦٨) زەویش لەو ڕۆژەدا بە نووری پەروەردگاری خۆی ڕووناك دەبێتەوە و هەموو خەڵکی کۆ ئەکرێتەوە و نامەی کرداریان لە بەردەمیان دادەنرێت و پەیامبەران و شایەدان لە فریشتەکان ئەهێنرێنە روو و ئامادە ئەبن بۆ ئەوەی چی ڕاست و دروستە بیڵێن و بە ڕاست و عەدل لە نێوانیاندا داوەری دەکرێ و ستەمیشیان لێ ناکرێ (٦٩) هەرکەس هەرچی کردوە بە تەواوی و بێ کەم و کوڕی پاداشی ئەدرێتەوە، ئەو خۆی لە هەموو کەس زاناترە ئەگەر چی پێویست بە هیچ نامە و شایەتێك نییە بەڵام لە گەڵ ئەوەیشدا نامە و شایەت هەر دەهێنرێ (٧٠).))

ئایا لە پاش زیندوو بونەوە چی هەیە؟ لە پاش ئەوەی لە گۆڕەکان دەرچین چی دەبینین؟ ئا ئەوەتا خوای گەورە بانگەوازکارێکی لە فریشتەکان ڕەوانەی کردوە... بۆ چی مەبەستێك؟ بۆ ئەوەی هەموو مرۆڤایەتی بەرەو زەوی مەحشەر ڕاپێچ بکات!! خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴾ (إبراهيم: ٤٨) واته: لە ڕۆژی قیامەتدا کە ئەم زەوییەی ئێستایە ئەگۆڕدرێ بە زەوییەکی تر، ئاسمانەکانیش هەروا! ئەوجا هەموان لە گۆڕەکانیان دەهێنرێنە دەرو، دەبرێن بۆ بەردەم خوای تاك و تەنیای دەسەڵاتدار)).

بە جوانی بیر لەو ئایەتەی خوای باڵادەست بکەرەوە کە دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ لَا عِوَجَ لَهُۥ ۖ وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا ﴾(طـه: ١٠٨) واته: لەو ڕۆژەدا هەموو خەڵکی دوای دەنگی جاڕچی (بانگەوازکارێك) ئەکەون، کە هیچ وەرچەرخان و لادانێك نییە لێی، هەموو خەڵکی لەبەر خوای بەخشندە

دەنگيان نەوى دەبىؘ،دەنگى ژێرلێو و چپەچپ و ئەسپايى نەبىؘ هيچ شتى تر نابيسى.))

ڕێزداران.. ئايە حەشر چييە؟ ئايە ئەو زەوييە چييە كە لە خەڵكى لە سەر حەشر دەكرێت؟ ئايە سيفەتەكانى چۆنە؟ ئايا گروپ و حاڵ و كۆمەڵانى خەڵك چۆنە كاتىؘ لە بەر دەستى خواى گەورەدا حەشر دەكرێن؟ ئايا مەترسى ئەو كات و ساتە چۆنە لەو قۆناغەى قيامەت؟ ئەمە و چەند باسێكى تر لە بەشى داهاتوودا باس دەكەين انشاء الله.

# ڕۆژی مەحشەر و ترس و سامناکی قیامەت

خوای باڵا دەست فەرمانی کردە (ئیسرافیل) بۆ ئەوەی بۆ جاری سێیەم فوو بە کەڕەنادا بکات، ئەویش: فووی زیندوبونەوەیە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ﴾(الزمر: ٦٨).واتە: پاشان بۆ جارێکی تر کە فووی پیاکرا ئەوجا لە ناکاو تەواوی دروستکراوەکان لە گۆڕەکانیاندا هەڵئەسنەوە و چاوەروانن چیيان پێ بکرێ)).

کاتێك خوای گەورە هەموو دروستکراوەکان زیندوو دەکاتەوە، ئەوا یەکەمین کەسێك زیندوو دەکرێتەوە خۆشەویستی پەروەردگارە ﷺ هەروەکو لە (صحیح مسلم)[١] دا هاتوە لە فەرموودەی (أبو هریرە) ەوە کەوا پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ فەرموویەتی: ((أنا سید ولد آدم یوم القیامة، وأول من ینشق عنه القبر، وأول شافع، و أول مشفع)) واتە: من گەورەی نەوەی ئادەمم لە رۆژی قیامەتدا و یەکەم کەسێك دەبم کە گۆڕم لە سەر دەکرێتەوە وە یەکەم شەفاعەتکارم و یەکەم شەفاعەت وەرگیراوم)) دایك و باوك و روحم فیدات بێت ئەی خۆشەویستەکەم.

ڕێزداران...ئەوا خوای گەورە هەموو دروستکراوەکانی زیندوو کردەوە هەر لە ئادەمەوە تاوەکو دوایین کەسێك کە قیامەتی بە سەردا هاتوە بۆ ئەوەی هەمووان لە بەر دەستی خوای گەورەدا رابووەستن﴿إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ لَّقَدْ أَحْصَاهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْدًا ﴿٩٥﴾﴾(مریم) واتە: بە ڕاستی هەرچی لە ناو ئاسمانەکان و زەویدایە سەرجەم هەموو بە بەندێتی و خوڵامەتی دێنە لای پەروەردگاری بەخشەر و ملکەچی دەبن (٩٣) بە ڕاستی زۆر بەوردی سەر حیسابی هەموویانە و هەر بە هەژمار سەرژمێری

---

١ ـ أخرجە مسلم (٢٢٧٨) .

کردوون و هەرچیشیان کردوە چاك ئەیزانێ (٩٤) هەر هەموویشیان ڕۆژی قیامەت بە تاك و تەنیایی و دوور لە هەموو دەسەلاتیك ((دێنە لای خوا)) (٩٥)

هەموو مرۆڤایەتی كۆ بوونەتەوە، پادشای پادشاکان فریشتەیەك لە فریشتەکان دەنێرێت بۆ ئەوەی هەموو خەڵکی بەرەو زەوی مەحشەر ببات، بەرەو زەوییەکی نویێ.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴾ (إبراهيم: ٤٨) واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا کە ئەم زەوییەی ئێستایە ئەگۆڕدرێ بە زەوییەکی تر، ئاسمانەکانیش هەروا!، ئەوجا هەموان لە گۆڕەکانیان دەهێنرێنە دەرو، دەبرێن بۆ بەردەستی خوای تاك و تەنیای دەسەلاتدار))

پێغەمبەری ئازیزﷺ بە وردی باسی ئەو زەوییەی بۆ کردووین - دایك و باوك و روحم بە فیدای بێت - دەفەرموێت هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (سهل ی کوڕی سعد الساعدی) دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((یحشر الناس یوم القیامة علی أرض بیضاء عفراء کقرصة النقي)) واتە: خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا لە سەر زەوییەکی سپی خاکی پاك کۆدەکرێنەوە (زیندوودەکرێنەوە)، وەکو کولێرەیەکی دروستکراو لە ئاردێکی بێژراو وایە)).

زەوییەکی نوێ بە هیچ شێوەیەك خوێنی لە سەر نەرێژراوە و هیچ تاوانێکی لە سەر ئەنجام نەدراوە، زەوییەکی سپی، پاك و بێ گەرد زۆر سپییە، ((کقرصه النقی)) واتە: وەکو کولێرەیەکی دروستکراو لە ئاردێکی بێژراو وایە)) بە هیچ شێوەیەك غەش و گەردی تیادا نییە، بە وردی بیر لەو وەسفەی پێغەمبەرﷺ بکەرەوە،سهل یان جگە لەو دەفەرموێت: ((لیس فیها معلم لأحد)) واتە: هیچ نیشانەیەکی تیادا نابینیت لەو نیشانانەی کە لە دونیادا رێگا و بانەکانمان دەناسییەوە لە دونیادا، لەوێ هیچ خانوویەك نییە، هیچ دار و درەخت و روبارێك نییە، ئەوە زەوییەکی ترە کە بە تەواوی جیاوازە لەو زەوییەی کە هەزاران هەزار

---

١ - أخرجه البخاري (٦٥٢١) ومسلم (٢٧٩٠) .

ساڵ مرۆڤی لە سەر ژیاوە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَيَوْمَ نُسَيِّرُ ٱلْجِبَالَ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً وَحَشَرْنَٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا ﴾ (الكهف: ٤٧) واتە: و ئاگاری خەڵك بکەوە بە ڕۆژێ کە کێوەکان (بەر لەهاتنی قیامەت) دەخەینە گەڕ وەکو هەور بەهەوادا دەڕۆن و زەویش بە ڕووتەڵ دەبینی کە:هیچ شتێکی بەسەرەوە نەماوە، نەکیو،نەدار،نەدرەخت، هەمووی تەخت بوە، ئەو خەڵکەیش هەموو (چاك و خراپیان) کۆ دەکەینەوە بۆ پرسیار و وەڵام و لێپرسینەوە لەکارو کردەوەکانی دونیایان و هیچ کەسێکیان ناهێڵینەوە بێ لێپرسینەوە)).

هیچ کەسێك لەو جێگەیە دواناکەوێت.

ئەمجار خەڵکی بە شێوەیەکی سەیر پۆلێن دەکرێن، کۆمەڵێك لە سەر هەردوو پێیەکانی حەشر دەکرێن، لەو کات و ساتە ترسناکەدا و لەو کێشە و گرفتە ناهەموارەدا کۆمەڵێك هەر لە گۆڕەکەی زیندوو دەکرێتەوە دەبینێن فریشتەکانی خوای پەروەردگار لە چاوەڕوانی و پێشوازی ئەودان لە کەرەستەکانی قیامەتی بۆ ئامادەکراوە مەگەر تەنها ئەو کەسە جوانییەکەی بزانێت کە خۆی ئامادەی کردوە، ئەوانە کێن؟ ئەوانە بەختەوەرانن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَٰنِ وَفْدًا﴾ (مریم: ٨٥) واتە: ئەی پێغەمبەرﷺ باسی ئەو ڕۆژە بکە کە ئێمە دەستە دەستە خۆپارێزەکان بەڕێز و حورمەتەوە دەبەینە دیداری خوای بەخشندە بۆ پاداش بەریز و بە سواری هەروەکو چۆن پێشوازی لە وفدێ دەکرێ.))

واتە: بە سواری، کەسی خواناس و لە خواترس کاتێ لە گۆڕەکەی زیندوو دەکرێتەوە ڕەنگە لە دونیادا هەژار بووبێت، بەڵام لە دوارۆژدا تەنها هەنگاوێك بە پێ ناڕوات، بەڵکو جۆرەها سواری ئەوتۆی بۆ ئامادە کراوە وەفریشتەکان لە چاوەڕوانی و پێشوازی ئەودان بۆ ئەوەی پێی بڵێن: سواربە، وە ئەو موژدەیەی پێ دەدەن کە دەڵێن: ﴿أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴾( فصلت: ٣٠) واتە: لە پاشەڕۆژتان مەترسن و بۆ ماڵ و منداڵیشتان

ـ پاش خۆتان ـ دڵ زویر مەبن ئێمە چاودێریان دەبین موژدەتان لێ بێت بەو بەهەشتەی بەڵێنتان پێ دەدرا لە دونیادا، مزگێنی بێت ئەمڕۆ ئەکەونە خۆشی و شادییەوە.))

تەماشای ئەو ڕێزە پیرۆزە بکە بەرانبەر ئەو کۆمەڵە ڕێزدارە لە لایەن فریشتەکانەوە!!

ئەو کۆمەڵە موژدەی بەهەشتیان پێ دەدرێت هەر کە لە گۆڕەکەیان هاتنە دەرەوە، لە خواترسان پرسیاریان لێ دەکەن و دەڵێن: ئێوە کێن خوا موژدەی بە خەیرتان بداتێ؟ ئەوانیش بە زمانێکی شیرین وەڵامیان دەدەنەوە و دەڵێن: ﴿نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ﴾ (فصلت: ٣١) واتە: ئێمە لە ژیانی دونیادا دۆستتان بووین و لە پاشەڕۆژیشدا دۆستتان دەبین و لەوێ نەفستان چ بخوازێ ئامادەیە بۆتان و هەرچیش بخوازن لە بەهەشتدا بۆتان هەیە.))

خودایە.. من و ئێوە لەو خۆشبەختانە بگێڕێت.

ئەگەر هاتوو خەڵکی لەو ڕۆژەدا هەستیان بە ترس کرد ئەوا لە خواترسان لە ئارامی و دڵنیایی و ئاسوودەییدا دەبن خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٍ﴾ (الدخان: ٥١) واتە: گومان پارێزکاران لە جێگایەکی هێمن و ئاسایشدان))

هەرگیز ناترسن کاتێ خەڵکی دەترسن! هەرگیز غەمبار و دڵتەنگ نابن کاتێ خەڵکی دڵتەنگ و غەمبار دەبن!

گرووی سێیەم: هەر کە لە گۆڕەکانیان زیندوو دەکرێنەوە ئەوا بە ڕوویاندا ڕێ دەکەن!! ئایە ئەو دیمەنە بە جوانی دێنێتە پێش چاوی خۆت؟ سوێند بە خوا ئەوە دیمەنێکەو دڵەکان لە بن دەردەهێنن، بیهێنە پێش چاوی خۆت کاتێ تۆ ڕێدەکەیت یان بە سواری لە ڕۆژی مەحشەردا کەچی لە پێشەوە یان لە پاشەوە،

لای ڕاستەوە یان لای چەپتەوە خەڵکی بە سەر ڕوویاندا ڕێ دەکەن!! دەبینی پێیەکانی لە سەرەوەیە و ڕووی لە سەر زەوییە!! بە ڕاستی دیمەنێکی سەیر و ترسناکە! خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا ۖ مَّأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ ۖ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَاهُمْ سَعِيرًا ﴾(الإسراء:٩٧ ) واتە: لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە دەمەو ڕوویی و کوێری و لاڵی و کەڕی هەموو کۆ دەکەینەوە و حەشریان دەکەین چوون لە دونیادا هەقیان نەبیستوە، هەقیان نەدیتوە لەوێش هەر نابینا و کەڕ و لاڵ دەبن،جێ و ڕێیان دۆزەخە هەرجارێکیش بڵێسەی ئاگرەکە کەم و کز بوو دووبارە نیلی دەدەین و هەڵی دەگیرسێنینەوە و زیاتری دەکەین بۆیان))

ئیمامی (الترمذي) لە (سنن)[1]ەکەیدا ریوایەتی کردوە لە فەرموودەی (ابوهریرە) وە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((يُحشر الناس يوم القيامة ثلاثة أصناف: صنفاً مشاة، وصنفاً ركبانا، وصنفاً على وجوههم)) فقالوا: يا رسول اللـه.! وكيف يمشون على وجوههم؟! قالﷺ: ــ إن الذي أمشاهم على أرجلهم قادر على أن يمشيهم على وجوههم، أما إنهم يتقون بوجوههم كل حدب وشوك)) واتە: خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا بە سێ شێوە و گروو حەشر دەکرێن، گروویەك بە پێ (پیادە)، گروویەکی بە سواری، گروویەکیان لەسەر ڕوویان)) فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ چۆن بە سەر ڕوویاندا ڕێ دەکەن؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ــ ئەو کەسەی کە لە دونیادا لەسەر دوو پێ ڕێی پێیان دەکرد دەتوانێت لە قیامەتدا لەسەر ڕوو ڕێیان پێ بکات، ئەوان بە ڕوویان خۆیان لە هەموو جێگایەکی بەرز و درك وداڵ دەپارێزن)).

لە ریوایەتێکی تردا کە (بوخاری و موسلیم)[2] ریوایەتیان کردوە لە فەرموودەی (أنس)ەوە: ((أن رجلا قال: يا رسول الله، كيف يحشر الكافر على وجهه يوم القيامة؟ قال ﷺ: ((أليس الذى أمشاه على رجليه فى الدنيا قادراً على أن يمشيه

---

١ ــ أخرجه الترمذي (٣١٤٢) وقال : هذا حديث حسن , واحمد (٢/٣٥٤ , ٣٦٣) وضعف سنده الألباني في ( ضعيف الجامع ) ٦٤١٧) وضعيف الترمذي , لكن يشهد لبعض ألفاظه الرواية التي تأتي عند البخاري .

٢ ــ أخرجه البخاري (٤٧٦٠) ومسلم (٢٨٠٦) .

على وجهه يوم القيامة؟)). قال قتادة: بلى وعزة ربنا)) واتە:کابرایەك گوتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ، چۆن بێباوەڕ بەسەر روویدا حەشر دەکرێت؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئایا ئەو کەسەی ڕێی پێ دەکرد لەسەر دوو پێ لە دونیادا بە توانا نییە لەسەر رووی ڕێی پێبکات؟؟)) قەتادە فەرمووی: بەڵێ سوێند بە عیززەتی پەروەردگارمان)).

ئێمەش هەموومان دەڵێین: ــ بەڵێ سوێند بە عیززەتی پەروەردگارمان ئەو دەتوانێ...

بە ڕاستی ئەوە دیمەنێکی ترسناك و بە سامە، کۆمەڵێك بە سوار و بەڕێزەوە دەیانبینی، ئەوانە ئەهلی باوەڕ ئەهلی تەقوان، ئەهلی سەقامگیری و بەردەوامبونن، ئەهلی یەکتاپەرستین، ئەهلی شوێنکەوتنن، کۆمەڵێك بە پێ ڕێدەکەن، کۆمەڵێك بە سەر رووياندا ڕێ دەکەن، هەر کە ئەو هەموو خەڵکییە گەیشتنە زەوی مەحشەر... دەمەوێت بە دڵ و گوێ و عەقڵ و هەموو هەستت لە گەڵ مندا بیر بکەیتەوە لە کاتێکدا هەموو مرۆڤایەتی دەبینی هەر لە ئادەمەوە تاکو دوایین کەس قیامەتی بە سەردا هەستاوە، لە سەر یەك زەوی و لە یەك جێگادا لە سەر زەوی مەحشەر، پاشان ڕۆژ (خۆر) لە خەڵکی نزیك دەبێتەوە، هیچ کەسێك ڕاستێتی و چۆنییەتی ئەو ڕۆژە نازانێت تەنها خوا نەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴾(إبراهيم: ٤٨).واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا کە ئەم زەوییەی ئێستایە ئەگۆڕدرێ بە زەوییەکی تر، ئاسمانەکانیش هەروا! ئەوجا هەموان لە گۆڕەکانیان دەهێنرێنە دەرو، دەبرێن بۆ بەردەم خوای تاك و تەنیای دەسەڵاتدار))

پێغەمبەری خۆشەویستﷺ دەفەرموێت ــ هەروەکو لە (صحيح مسلم)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (المقداد ی کوڕی الأسود)ەوە ــ : ((تُدْنَى الشَّمْسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ الْخَلْقِ حَتَّى تَكُونَ مِنْهُمْ كَمِقْدَارِ مِيلٍ)) قَالَ سُلَيْمُ بْنُ عَامِرٍ: فَوَاللَّهِ مَا أَدْرِي

---

١ ــ أخرجه مسلم (٢٨٦٤) .

مَا يَعْنِي بِالْمِيلِ أَمَسَافَةَ الْأَرْض أَمْ الْمِيلَ الَّذِي تُكْتَحَلُ بِهِ الْعَيْنُ قَالَ: ((فَيَكُونُ النَّاسُ عَلَى قَدْرِ أَعْمَالِهِمْ فِي الْعَرَقِ فَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى كَعْبَيْهِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى رُكْبَتَيْهِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى حَقْوَيْهِ وَمِنْهُمْ مَنْ يُلْجِمُهُ الْعَرَقُ إِلْجَامًا)) قَالَ: وَأَشَارَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَدِهِ إِلَى فِيهِ.)) واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا ڕۆژ لە خەڵکییەوە نزیك دەکرێتەوە، تا بە ئەندازەی (میل) ێك لێیانەوە دوور دەبێت)). (سلیم ی کوڕی عامر) دەڵێت: سوێند بە خوا نازانم مەبەستی بە (میل)چییە؟ ئایا پێوانەیەکی زەوییە یان ئەو میلەیە کە چاوی پێ دەڕێژن)) پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرموی: خەڵکی هەر یەکەو بە ئەندازەی کردەوەکانی لە ناو ئارەقەدا دەبێت، هەندێکیان تاوەکو گوێزنگەکانیان، هەندێکیان تاوەکو ئەژنۆیان، هەندێکیان تا ناوکیان، هەندێکشیان ئارەقە بە تەواوی لەغاوی کردوون، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لێرەدا بە دەستەکانی ئاماژەی بۆ دەمی کرد)).

پاشان خەم و پەژارە زیاد دەکات!! ئایا هیچ کێشە و پەژارەیەك هەیە لەوە توندتر و سەختر بێت؟ بەڵێ... ئایا ئەو کۆسپ و خەم و خەفەتانە چییە؟ ((یُؤْتَی بِجَهَنَّمَ)) ئەی پەروەردگارمان بمانپارێزە...﴿ وَجِاْىٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَ ۚ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَـٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ ﴿٢٣﴾ يَقُولُ يَـٰلَيْتَنِى قَدَّمْتُ لِحَيَاتِى ﴿٢٤﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٢٦﴾ ﴾ (الفجر) واتە: وە لەو ڕۆژەدا دۆزەخ دەهێنرێتە ڕوو بۆ گومڕایان، لەو ڕۆژە قورسەدا ئادەمی هەرچی کردبێت بیری ئەکەوێتەوە و پەشیمان دەبێ لەسەر خراپەکانی و پەند دەگرێ وە لە کوێ پەند و ئامۆژگاری کەڵکی دەبێ بۆی؟ لەو ڕۆژەدا.. (٢٣) بەئێش و خەفەتێکەوە دەڵێت: خۆزگە من بۆ ئەم ژیانی پاشەڕۆژەم شتێکم پێش خستبا لەدونیادا..(٢٤) ئینجا لەو ڕۆژەدا سزایەك دەدات، هیچ کەسێك ناتوانێ سزای وابدات! (٢٥) و هیچ کەسێك ناتوانێ پێوەند بکات وەك پێوەندی خوا..(٢٦).

پێغەمبەری ڕاستگۆ ﷺ وەسفی کارەساتی ئەو ڕۆژەمان بە شێوەیەکی زۆر ورد و جوان بۆ دەکات، هەروەکو ئەوەی لە پێش چاومان بێت و ببینین (دایك و باوك و

روحم فیدای بێت) هەروەکو لە (صحیح مسلم)[1] دا هاتوە ((يُؤْتَى بِجَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لَهَا سَبْعُونَ أَلْفَ زِمَامٍ، مَعَ كُلِّ زِمَامٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ يَجُرُّونَهَا)) واتە: دۆزەخ دەهێنرێت حەفتا هەزار جڵەوی هەیە، لە گەڵ هەر جڵەوێکدا حەفتا هەزار فریشتە هەن رایدەکێشن)).

ئەی پەروەردگارمان بمانپارێزە!!

کاتێ دۆزەخ خەڵکی دەبینێ بە گەرمی هەناسە هەڵدەکێشێ و هاوار دەکات و دەنەڕێنێت و دەناڵێنێت! زۆر پەست و تووڕە دەبێت لە بەر پەستی و تووڕەیی خوای پەروەردگار! چونکە خوای پەروەردگار لەم رۆژەدا بە شێوەیەك تووڕە بوە هەرگیز پێش ئەوە بەو شێوەیە تووڕە نەبوە و لەوەو پاشیش بەو شێوەیە تووڕە نابێت، هەروەکو پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت لە فەرموودەی شەفاعەتی بەناوبانگدا کە لە پاشاندا بە درێژی باسی دەکەم (انشاء الله).

رۆژ لەسەر سەری دروستکراوەکانە، خەڵکی لە نێو ئارەقەی خۆیاندا نوقم بوون، لەولاشەوە دۆزەخ هاوار دەکات و دەناڵێنێت و دەنەڕێنێت و پەست و تووڕە بوە لە بەرتووڕە بوونی خوای پەروەردگار و خەڵکیش لە نێو ترس و باك و سامدان، لێرەدا هەرگیز ناتوانم بە جوانی روونی بکەمەوە کەوا ئەو ترس و سامە چەندە کە تووشی هەموو مرۆڤایەتی دەبێت بە بێ جیاوازی تەنانەت پێغەمبەرانیش، هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)[2] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابو هریرە) وە دەڵێت: پێغەمبەری ئازیزﷺ دەفەرموێت: ((يَجْمَعُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، فَيُسْمِعُهُمْ الدَّاعِي وَيَنْفُذُهُمْ الْبَصَرُ، وَتَدْنُو الشَّمْسُ، فَيَبْلُغُ النَّاسَ مِنْ الْغَمِّ وَالْكَرْبِ مَا لَا يُطِيقُونَ وَمَا لَا يَحْتَمِلُونَ، فَيَقُولُ بَعْضُ النَّاسِ لِبَعْضٍ: أَلَا تَرَوْنَ مَا أَنْتُمْ فِيهِ؟ أَلَا تَرَوْنَ مَا قَدْ بَلَغَكُمْ؟ أَلَا تَنْظُرُونَ مَنْ يَشْفَعُ لَكُمْ إِلَى رَبِّكُمْ؟ فَيَقُولُ بَعْضُ النَّاسِ لِبَعْضٍ: ائْتُوا آدَمَ، فَيَأْتُونَ آدَمَ، فَيَقُولُونَ: يَا آدَمُ، أَنْتَ أَبُو الْبَشَرِ، خَلَقَكَ اللَّهُ

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٨٤٢) وانظر (التتبع) للدار قطني (ص ٢٢٦ , ٢٢٧) وكذا (علله الكبير ) (٧٣٢) فقد قال : ( والموقوف أصح عندي) ا . هـ قله حكم الرفع .

٢ ـ أخرجه البخاري (٣٣٤٠) ومسلم (١٩٤) .

بِيَدِه، وَنَفَخَ فيكَ مِنْ رُوحِه، وَأَمَرَ الْمَلَائِكَةَ فَسَجَدُوا لَكَ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلَا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فيه؟ أَلَا تَرَى إِلَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ آدَمُ: إِنَّ رَبِّي غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنَّهُ نَهَانِي عَنْ الشَّجَرَةِ فَعَصَيْتُهُ، نَفْسِي، نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى نُوحٍ، فَيَأْتُونَ نُوحًا فَيَقُولُونَ: يَا نُوحُ، أَنْتَ أَوَّلُ الرُّسُلِ إِلَى الْأَرْضِ، وَسَمَّاكَ اللَّهُ: عَبْدًا شَكُورًا، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلَا تَرَى مَا نَحْنُ فيه؟ أَلَا تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ لَهُمْ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنَّهُ قَدْ كَانَتْ لِي دَعْوَةٌ دَعَوْتُ بِهَا عَلَى قَوْمِي، نَفْسِي، نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى إِبْرَاهِيمَ عليه السلام، فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ، فَيَقُولُونَ: أَنْتَ نَبِيُّ اللَّهِ وَخَلِيلُهُ مِنْ أَهْلِ الْأَرْضِ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلَا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فيه؟ أَلَا تَرَى إِلَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ لَهُمْ إِبْرَاهِيمُ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَا يَغْضَبُ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَذَكَرَ كَذَبَاتِه، نَفْسِي، نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى مُوسَى، فَيَأْتُونَ مُوسَى عليه السلام، فَيَقُولُونَ: يَا مُوسَى، أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ، فَضَّلَكَ اللَّهُ بِرِسَالَاتِه وَبِتَكْلِيمِه عَلَى النَّاسِ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلَا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فيه؟ أَلَا تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ لَهُمْ مُوسَى عليه السلام: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنِّي قَتَلْتُ نَفْسًا لَمْ أُومَرْ بِقَتْلِهَا، نَفْسِي، نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى عِيسَى عليه السلام فَيَأْتُونَ عِيسَى، فَيَقُولُونَ: يَا عِيسَى، أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ، وَكَلَّمْتَ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ، وَكَلِمَةٌ مِنْهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ، وَرُوحٌ مِنْهُ، فَاشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلَا تَرَى مَا نَحْنُ فيه؟ أَلَا تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ لَهُمْ عِيسَى عليه السلام: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ - وَلَمْ يَذْكُرْ لَهُ ذَنْبًا - نَفْسِي، نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى مُحَمَّدٍ ﷺ، فَيَأْتُونِّي، فَيَقُولُونَ: يَا مُحَمَّدُ، أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ، وَخَاتَمُ الْأَنْبِيَاءِ، وَغَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلَا تَرَى مَا نَحْنُ فيه؟ أَلَا تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ (فأقول: أنا لها)[1]، قال: فَأَنْطَلِقُ فَآتِي تَحْتَ الْعَرْشِ، فَأَقَعُ سَاجِدًا لِرَبِّي، ثُمَّ يَفْتَحُ اللَّهُ عَلَيَّ، وَيُلْهِمُنِي مِنْ مَحَامِدِه، وَحُسْنِ الثَّنَاءِ عَلَيْهِ شَيْئًا لَمْ يَفْتَحْهُ لِأَحَدٍ قَبْلِي، ثُمَّ يُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ، ارْفَعْ رَأْسَكَ، سَلْ تُعْطَهْ، اشْفَعْ تُشَفَّعْ)). واتە: خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا خەڵکی پێشینان و پاشینان هەموو

---

١ ـ هذا الرواية عند البخاري (٧٥١٠) ومسلم (١٩٣/٣٢٦).

لە یەك شوێندا کۆدەکاتەوە، بانگخواز دەنگی دەیانگاتێ چاو دەیانبینێت، خۆریش نزیك دەبێتەوە، خەڵکی تووشی غەم و پەژارەیەك دەبن بەرگەی ناگرن و لە توانایاندا نییە، هەندێکیان بە هەندێکی تریان دەڵێن: ئایا نابینن ئێوە لە چ حاڵێکدان؟ ئایا نابینن چی یەخەی پێ گرتوون؟ ئایا ناگەڕێن بە دوای کەسێکدا لە لای خوا شەفاعەتتان بۆ بکات؟ هەندێکیان بە هەندێکی تریان دەڵێن: بچن بۆ لای ئادەم‌ﷺ دەچن بۆ لای ئادەم‌ﷺو پێی دەڵێن: ئەی ئادەم ﷺ تۆ باوکی هەموو مرۆڤیت، خوا بە دەستی خۆی تۆی دروستکردوە، لە ڕۆحی خۆی گیانی بەبەرداکردووی، فەرمانی کرد بە فریشتەکان کڕنۆشیان بۆ بردی، کەواتە لای پەروەردگارت تکامان بۆ بکە، ئایا نابینی ئێمە لە چی حاڵێکداین؟ ئایا نابینی چی یەخەی گرتووین؟ ئادەمیش‌ﷺ دەڵێت: ئەمڕۆ پەروەردگارم تووڕەبوونێك تووڕە بوە کە لەمەو پێش ئاوا تووڕە نەبوەو، لەمەولاش ئاوا تووڕە نابێت، ئەو درەختەکەی لە من قەدەغەکرد و منیش سەرپێچیم کرد، ئێستا هەر خەمی خۆمە، خەمی خۆمە، بچن بۆ لای یەکێکیتر، بچن بۆ لای نوح‌ﷺ دەچن بۆ لای نوح‌ﷺ و دەڵێن: ئەی نوح‌ﷺ تۆ یەکەم ڕەوانەکراوی بۆ سەر زەوی، خوای گەورە ناوی ناوی: بەندەی سوپاسگوزار، کەواتە لای پەروەردگارت تکامان بۆ بکە، ئایا نابینی ئێمە لە چی حاڵێکداین؟ ئایا نابینی چی یەخەی پێ گرتووین؟ ئەویش پێیان دەڵێت: ئەمڕۆ پەروەردگارم تووڕەبوونێك تووڕە بوە کە لەمەو پێش ئاوا تووڕە نەبوەو، لەمەولاش ئاوا تووڕە نابێت، لە ڕاستیدا من یەك دوعام هەبوو ئەویش لە گەلەکەمم کرد، ئێستا هەر غەمی خۆمە غەمی خۆمە، بچن بۆ لای ئیبراهیم‌ﷺئەوانیش دەچن بۆ لای ئیبراهیم‌ﷺ و پێی دەڵێن: تۆ پێغەمبەری خوایت و خۆشەویستی ئەوی لە سەر زەویدا، پەروەردگارت تکامان بۆ بکە، ئایا نابینی ئێمە لە چی حاڵێکداین؟ ئایا نابینی چی یەخەی پێ گرتووین؟ ئیبراهیم‌ﷺ پێیان دەڵێت: ئەمڕۆ پەروەردگارم تووڕەبوونێك تووڕە بوە کە لەمەو پێش ئاوا تووڕە نەبوەو، لەمەولاش ئاوا تووڕە نابێت،، ئینجا باسی درۆکانی کرد، ئێستا هەر غەمی خۆمە غەمی خۆمە، بچن بۆ لای کەسێکی تر، بچن بۆ لای موسا‌ﷺ ئەوانیش دەچن بۆ لای موسا‌ﷺ و پێی دەڵێن: ئەی موسا‌ﷺ تۆ پێغەمبەری خوایت، خوای

گەورە ڕێزی زیاتری داوە بە تۆ بە پەیامەکانی و بە قسەکردن لە گەڵ تۆدا، کەواتە لای پەروەردگارت تکامان بۆ بکە، ئایا نابینی ئێمە لە چی حاڵێکداین؟ ئایا نابینی چی بەخەی پێ گرتووین؟ موسا﵇ پێیان دەڵێت: ئەمڕۆ پەروەردگارم توورەبوونێك توورە بوە کە لەمەو پێش ئاوا توورە نەبوەو، لەمەولاش ئاوا توورە نابێت، من کەسێکم کوشتوە فەرمانم پێنەکرابوو بیکوژم، ئێستا هەر غەمی خۆمە غەمی خۆمە، بچن بۆ لای عیسا﵇ ئەوانیش دەچن بۆ لای عیسا﵇ و پێی دەڵێن: ئەی عیسا﵇ تۆ پێغەمبەری خوای، لە بێشکەدا (لانکە) قسەت لە گەڵ خەڵکیدا کردوە، ڕۆحی خوا و وشەیەکی پیرۆزی ئەویت کە هەڵی داوە بۆ مریەم و بەخشراوی بە مریەم کەواتە لای پەروەردگارت تکامان بۆ بکە، ئایا نابینی ئێمە لە چی حاڵێکداین؟ ئایا نابینی چی بەخەی گرتووین؟ عیساش﵇ پێیان دەڵێت: ئەمڕۆ پەروەردگارم توورەبوونێك توورە بوە کە لەمەو پێش ئاوا توورە نەبوەو، لەمەولاش ئاوا توورە نابێت،، ئێستا هەر غەمی خۆمە غەمی خۆمە، بچن بۆ لای کەسێکیتر بچن بۆ لای موحەممەد ﷺ ئەوانیش دێن بۆ لام، دەڵێن: ئەی موحەممەد ﷺ تۆ پێغەمبەری خوایت، دوایین پێغەمبەری، خوای گەورە لە گوناهە پێشووەکانیشت خۆش بوە، تکامان بۆ بکە لای پەروەردگارت ئایا نابینی ئێمە لە چ حاڵێکداین؟ ئایا نابینی چی بەخەی گرتووین؟ (منیش دەڵێم: من بۆ ئەو کارە) دەڵێت: منیش رادەپەڕم و دێمە ژێر عەرش، دەکەوم بە سوجدەدا بۆ پەروەردگار، ئینجا خوا دڵم دەکاتەوە چەند سوپاسگوزاریەك و ستایشێکی پیرۆز دەخاتە دڵمەوە کە لەوەوپێش نەیداوە بە کەس، ئینجا دەفەرموێت: ئەی موحەممەد ﷺ سەرت بەرز بکەرەوە، داوابکە دەتدرێتێ، تکا بکە لێت وەردەگیرێت)).

جا ئەمە ئەو ڕێزەیە کە پێی دەڵێن (المقام المحمود) کە هەموو پێغەمبەران خۆزگەی پێ دەبەن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴾(الإسراء:٧٩) واتە: لە بەشێکی شەویشدا خەوت ماندوو بکە بە شەونوێژەوە و قورئانی زۆری تیا بخوێنە، ئەمەش بەهرەیەکی تایبەتەو، دراوە بە تۆ و زیادە لە فەرزەکانیشە، بە ئومێد بە پەروەردگارت بتنێرێتە

شوێن و جێگایەکی پەسەند و بەرێزەوە (مقام المحمود) پێشینان و پاشینانیش سوپاست بکەن)).

دەڵێم: سوێند بە خوا هیچ کەسێك رێز و پایەی پێغەمبەری خواﷺ نازانێت وەکو خوای پەروەردگار، خۆشەویستمان ﷺ لەم کات و ساتە ترسناك و بە سامەدا پلە و پایە و رێزی دەردەکەوێت، لە کاتێکدا ابراهیم‌عليه السلام دەفەرموێت: هەر غەمی خۆمە، موسا‌عليه السلام دەفەرموێت: هەر غەمی خۆمە، عیسا‌عليه السلام دەفەرموێت: هەر غەمی خۆمە، نوح‌عليه السلام دەفەرموێت: هەر غەمی خۆمە، هەروەها باوکی هەموو مرۆڤایەتی کە ئادەم‌عليه السلام دەفەرموێت: هەر غەمی خۆمە، بەڵام خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت: ئەو کارە بۆ من بە جێبهێڵن.

خۆشەویستان... ئەمە رێز و پلە و پایەی پێغەمبەری نازدارە ﷺ لای خوای پەروەردگار: ((يَا مُحَمَّدُ، ارْفَعْ رَأْسَكَ، سَلْ تُعْطَهْ، اشْفَعْ تُشَفَّعْ ، فَأَرْفَعُ رَأْسِي، فَأَقُولُ: يَا رَبِّ، أُمَّتِي أُمَّتِي)) واتە: ئەی موحەممەدﷺ.. سەرت بەرز بکەرەوە داوابکە دەتدرێتێ، تکا بکە لێت وەردەگیرێت، منیش سەرم بەرزدەکەمەوەو دەڵێم: ئەی پەروەردگارم ئوممەتەکەم ئوممەتەکەم))

لەو کاتەدا خۆشەویستمانﷺ ئوممەتەکەی پێش هەموو ئوممەتەکان دەخات، ئەو ئوممەتەی کە بە جوانی قەدری پێغەمبەرەکەیﷺنازانێت ــ ئیللا کەسانێك نەبێت خوای گەورە رەحمی پێ کردبێت ــ سوێند بە خوا ئەگەر ئەم ئوممەتە قەدری پێغەمبەرەکەیﷺ بزانیبایە ئەوا بەم شێوەیە نەدەبوو، ئاهـ ئەگەر ئەم ئوممەتە قەدری بزانن و بگەڕێنەوە بۆ سەر رێگا و بەرنامەکەی ئەو، فەرمانەکانی ئەویان جێبەجێ بکردبایە و وازیان لە قەدەغەکراوەکانی بهێنابا و سنورەکان ئەویان نەدەبەزاند و دەستیان بە شەریعەت و بەرنامەکەی ئەوەوە بگردبایە و بانگەوازەکەیان بڵاودەکردەوە، سوێند بە خوا ئەگەر وا بکەن ئەوا هەرگیز ئەو قەزەمە بێ نرخ وسووکانە لێرە و لەوێ نەدەچوونە سەر ئەو لوتکە بەرزانە، زمانیان درێژ نەدەکردە سەر مرواری تاجی سەر هەموو مرۆڤایەتیﷺ، دڵنیابن ئەو کورتە باڵا بێنرخانە هەرگیز دەست درێژی و دەمدرێژیان نەکردوەتە سەر پێغەمبەری

خوا ﷺ ئیللا بە هۆی کەمتەرخەمی ئێمەوە نەبێت! تەنها بە هۆی تاوانەکانمانەوە نەبێت! تەنها بە هۆی دوور کەوتنەوەمان لە رێگا و بەرنامەکەی خۆشەویست و بیلبیلەی چاوەکانمان ﷺ!

لە فەرموودەیەکی دوور و درێژدا کە لە بەشی پێشوودا باسم کرد، ئەو فەرموودەیە کە (ابو یعلی الموصلی) لە(الکبیر)دا و ئیمامی (البیهقی) لە(البعث)دا و (الطبري) لە تەفسیرەکەیدا و (الطبراني) لە (الطوالات)دا و جگە لەوان ریوایەتیان کردوە(کە لە سەنەدەکەیدا (ضعف)[1] هەیە)، هەموویان لە رێگای (اسماعیل ی کوڕی رافع) ەوە کە کەسێکی (ضعیف) ە، هەروەها (محمدی کوڕی زیاد) لە سەنەدەکەیدا هەیە کە کەسێکی نەناسراوە (مجهول)ە، لەو فەرموودەیەدا هاتوە کە خوای گەورە بە خۆشەویستەکەی ﷺ دەفەرموێت: ((یَا مُحَمَّدُ، ارْفَعْ رَأْسَكَ، سَلْ تُعْطَهْ، اشْفَعْ تُشَفَّعْ)) واتە: ئەی موحەممەد.. سەرت بەرز بکەرەوە داوابکە دەتدرێتێ، تکا بکە لێت وەردەگیرێت)) خۆشەویست دەفەرموێت: ((یا رب وعدتني الشفاعة فشفعني في خلقك)) واتە: ئەی پەروەردگارا! بەڵێنت پێدام بە شەفاعەت، کەواتە شەفاعەتم وەرگرە بەرانبەر بە دروستکراوەکانت)).

الله أکبر! ! ((فأقضي بينهم)) واتە: داوەری نێوانیان دەکەم)) ئەم شەفاعەتە پێی دەڵێن (الشفاعه العامه) واتە: شەفاعەتی گشتی، چونکە شەفاعەتێکی تر هەیە تەنها بۆ ئوممەتەکەی (موحەممەد)ە ﷺ، بەڵام شەفاعەتی گشتی بۆ هەموو خەڵکییە، پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ شەفاعەت دەکات بۆ هەموو مرۆڤایەتی بۆ ئەوەی خوای پەروەردگار لە نێوان خەڵکی حوکمی خۆی بکات، بۆ ئەوەی خەڵکی لەو جێگە ترسناك و بە سامەدا رانەوەستن لە مەحشەردا، خوای گەورە دەفەرموێت: ((قد شفعتك، أنا آتيكم لأقضي بينكم)) قال ﷺ ((فأرجع فأقف بين يدي الناس)) واتە: ئەوا شەفاعەتەکەی تۆم وەرگرت، ئێستا دێم بۆ ئەوەی لە نێوانتاندا داوەری بکەم)) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: منیش دەگەڕێمەوە و لە

---

١ ـ و راجع كلام الحافظ في (الفتح) (٣٦٨/١١).

نێوان خەڵکیدا ڕادەوەستم))

ئەمجار فریشتەکان دەست بە دابەزین دەکەن و بۆ ئەوەی لە دەوری خەڵکی بووەستن پۆل پۆل لە هەموو لایەکەوە، پاشان ئەو فریشتانە دادەبەزن کە هەڵگرتنی عەرشیان پێ سپاردراوە بە (حملە العرش) ناسراون و ئەوانیش دەڵێن: ((سبحان ذي الملك والملكوت، سبحان ذي العزة والجبروت، سبحان من كتب الموت على الخلائق، وهو الحي الذي لا يموت، سبحان قدوس قدوس، رب الملائكة والروح)) فيقول أهل الأرض للملائكة: ((أفيكم ربنا؟ فيقولون: لا هو آت)) واتە: پاکی وبێگەردی بۆ خاوەن موڵك و شكۆ و دەسەڵات، پاکی و بێگەردی بۆ خاوەن عیززەت و هێز و توانا، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو کەسەی مردنی لە سەر هەموو دروستکراوەکان نوسیوە، هەر ئەویش زیندوە و هەرگیز نامرێت، پاکی و بێگەردی بۆ کەسی پیرۆز و موبارەك و خاوێن، خوای فریشتەکان و جبرائیل)) خەڵکی سەر زەوی بە فریشتەکان دەڵێن: ئایا پەروەردگارمان لە گەڵ ئێوەدایە؟ ئەوانیش دەڵێن: نەخێر ئەو ئێستا دێت))

خوای گەورە دێت، هاتنێك شایستەی گەورەیی و مەزنی ئەو بێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِى ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ﴾(البقرة:٢١٠) واتە: ئاخۆ پەیرەوانی شەیتان بێلەمە لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە لە پەڵەهەورێکی سپیدا بێتە لایان و داوەریان بکا، فریشتەکانیش بەریز ئامادە بن بۆ تێپەرانی بڕیارەکانی خوا، دادگایشیان ببڕێتەوە و بنێردرێن بۆ دۆزەخ، دەبێ بەدەرلەمە چاوەڕوانی چی بن؟ ئەوساش ئەنجامی هەموو کارێ بێنرێتەوە لای خوای گەورە و بەدادگەرانە داوەریان بکات.)).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾(الفجر: ٢٢)

براکەم وەسفی هاتنی خوای گەورە دامەڕنە و مەیچوێنە و مەیشوبهێنە و لاشەی بۆ دامەنێ، بزانە هەر خەیاڵاتێك بە مێشکتدا دێت، ئەوا خوای گەورە لەوە جیاوازە،

خـوای گـەروە دادەبـەزێت بـە شـێوەیەك شایـستەی گـەورەی و مـەزنی خـۆی بێـت ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ الشورى: ١١، واتە: هیچ شتێك نییە لە وێنەی ئەو (خوا) یە نە لە زاتیا نە لە سیفاتیا نە لە كرداریا بۆ خۆی تەنیایە و لە هەموو شتێك بێ نیازە و هەموو شتێكیش نیازمەندە بەو، ئەویشە بیسەری بینـا بـە ئاگایە بە وتەی بەندەكانی بینایە بۆ كار و كرداریان)) .

پاكی و بێگەردی بۆ ئەو كەسەی بە هیچ شتێك ناشوبهێنرێت و وێنە و شێوە و هاوتا و هاوچەشنی نییە، نە كوڕی هەیە نە باوك: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ۝٤﴾(الإخلاص) واتا: ئەی موحەممەدﷺ بڵێ: ئەو پەروەردگارەی كە من دەیپەرستم تاك و تەنیایە و هاوەڵ و هاوبەشی نییە (١) ئەو خوایە – كە ناوی الله یە – جێگای هیوا و ئومێدە و بێ نیازیشە هیچ كەسێكیش – جگە لەو – شایانی ئەوە نییە گیروگرفتەكان ببرێنە بۆ چارەسەر، هەر ئەوزاتە گەورەیشە كە دەبێ هەر بۆ لای ئەو بگەڕێینەوە (٢) كەسی لێ نەبوە و هیچ رۆڵەیەكی نییە – وەك جولەكە و گاوڕ و بتپەرستەكان دەڵێن – چونكە خوا زۆر بڵند و پاك و بێخەوش و دوورە لەو جۆرە بیر و بۆچوونانە و لە كەسیش نەبوە و بێ دایك و بابە، چونكە هەموو شتێكی لە دایك بوو تازە و نوێیە و خوا نییە و سەرەتایەكی هەیە، بەڵام خوا بێ سەرەتا و (ئەزەل) یە (٣) هەرگیز هیچ كەسێك هاوشێوە و هاوتای نییە و كەسێ ناتوانێ بەرهەڵستی بكات (٤).

خوای گەورە دادەبەزێت و عەرش و كورسی دادەنرێت بە شێوەیەك خوای گەورە خۆی ویستی لێ بێت و شایستەی مەزنی خۆی بێت ئەمجار بانگ دەكات و دەڵێت: ((أیها الناس، لقد أنصت إلیكم كثیرا منـذ خلقـتكم الى یـومكم هـذا، أسمـع صـوتكم، وأرى أعمالكم، فأنصتوا الیوم إلي فإنما هـي أعمـالكم و صـحفكم تقـرأ علـیكم، فمـن وجـد خـیراً فلیحمـد الله، ومـن وجـد غـیر ذلـك فـلا یلـومن إلا نفـسه)). واتـە: ئـەی خەڵكینە ! لەوكاتـەوە ئێـوەم دروسـت كـردوە تـاكو ئـەمڕۆ زۆر لـە ئێـوەم بیـست و

کردەوەکانتـان دەبیـنم، ئـەمڕۆ گـوێ لـە مـن بگـرن، تـەنها کردەوەکـان و نامـەی کارەکانتانە بە سەرتاندا دەخوێنرێتەوە، هەرکەسێ چاکەی بینی ئەوا بـا سوپاسـی خوا بکات و هەرکەسێ جگە لەوەی بینی ئەوا بە تەنها لۆمەی خۆی بکات)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿۞ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ الشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ اعْبُدُونِى ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا ۖ أَفَلَمْ تَكُونُوا۟ تَعْقِلُونَ ﴿٦٢﴾ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ الَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٦٣﴾ اصْلَوْهَا الْيَوْمَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٦٤﴾ الْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٦٥﴾﴾ (يس). واتە: ئەی نەوەکانی ئادەم! ئاخر من پێشتر وەسیەتم بۆ نەکردن کە شەیتان نەپەرستن چونکە ئەو بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە؟ (٦٠) ئەی فەرمانم پێ نەکردن کە تەنها من بپەرستن و پەیرەوی لە من بکەن، ئا ئەمەیە (واتە: پەرستنم بە تەنیا) ڕێ ڕاستەکە.(٦١) بێ گومان شەیتان خەڵکێکی زۆری گومڕا کرد لێتان دە ئایا تێناگەن و ژیرنابن؟.(٦٢) ئا ئەمە هەر ئەو دۆزەخەیە کە لە دونیادا بەڵێنتان پێ درابوو، بڕواتان نەکرد.(٦٣) دەفەرموون بە هۆی بێ باوەڕیتانەوە ئەمڕۆ بچنە ناوی.(٦٤) ئەمڕۆ (ڕۆژی قیامەت) مۆر دەدەین بە سەردەمیاندا و ناتوانن بە زمان هیچ قسەیەك بکەن دەستەکانیشیان قسەمان لەگەڵ ئەکەن پێیەکانیشیان شایەتی دەدەن بەوەی کردوویانە. (٦٥).

| | |
|---|---|
| تذكر وقوفك يوم العرض عرياناً | مستوحشاً قلق الأحشاء حيراناً |
| والنار تلهب من غيظ ومن حنق | على العصاة.. ورب العرش غضباناً |
| اقرأ كتابك يا عبدُ على مهل | فهل ترى فيه حرفاً غير ما كانا؟ |
| فلما قرأت ولم تنكر قراءته | وأقررت إقرار من عرف الأشياء عرفانا |
| نادى الجليل.. خذوه يا ملائكتي | وأمضوا بعبد عصى للنار عطشاناً |
| المشركون غداً في النار يلتهبوا | والموحدون بدار الخلد سكاناً |

خوای گەورە من و ئێوە لە ئەهلی ئیمان و یەکتاپەرستی بگێڕێت، خودایە بە

ڕەحمەتی خۆت دامانپۆشە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٢١ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلۡمَلَكُ صَفّٗا صَفّٗا ٢٢ وَجِاْيٓءَ يَوۡمَئِذِۭ بِجَهَنَّمَۚ يَوۡمَئِذٖ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكۡرَىٰ ٢٣ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي قَدَّمۡتُ لِحَيَاتِي ٢٤ فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٞ ٢٥ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٞ ٢٦ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ٢٧ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ٢٨ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ٢٩ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ٣٠﴾ (الفجر) واتە: لەو ڕۆژەدا پەروەردگارت هات بە هاتنێك شیاوی خۆی بێت و فریشتەکانیش لەگەڵی ریز ریز (٢٢) وە لەو ڕۆژەدا دۆزەخ دەهێنرێتە ڕوو بۆ گومڕایان، لەو ڕۆژە قورسەدا ئادەمی هەرچی کردبێت بیری ئەکەوێتەوە و پەشیمان دەبێ لەسەر خراپەکانی و پەند دەگرێ وە لە کوێ پەند و ئامۆژگاری کەڵکی دەبێ بۆی؟ لەو ڕۆژەدا (٢٣) بەئێش و خەفەتێکەوە دەڵێت: خۆزگە من بۆ ئەم ژیانی پاشەڕۆژەم شتێکم پێش خستبا لەدونیادا (٢٤) ئینجا لەو ڕۆژەدا سزایەك دەدات، هیچ کەسێك ناتوانێ سزای وابدات! (٢٥) و هیچ کەسێك ناتوانێ پێوەند بکات وەك پێوەندی خوا (٢٦) وە لەسەرەمەرگدا بە نەفسی ئیماندار دەوترێت: ئەی گیان و ڕۆحی! ئارامبە بە یاد و زیکری خوا..(٢٧) بگەڕێوە بۆلای پەروەردگارت، ئاوا کە ڕازی کردبوویت بە پاداشتی خۆی و لێت ڕازی بوە بەهۆی ئەوەی پێشی خۆتت خستوە لە کردەوەی چاك (٢٨) دەبچۆرە ناو گیانی بەندە ساڵحەکانمەوە (٢٩) وە بچۆرە بەهەشتە ڕازاوەکەمەوە کە ئامادەم کردوە بۆت (٣٠).

بەڕێزان.. ئایا دەزانن یەکەم کەس کێیە خوای گەورە لەو ڕۆژە سامناك و ترسناکەدا بانگ دەکات؟ ئەو کەسە ئادەمە.!

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتوە لە فەرمودەی (ابوسعید الخدری) یەوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((يقول الله تعالى: يا آدم، فيقول: لبيك وسعديك، والخير في يديك، فيقول: أخْرِج بعث النار، قال: وما بعث النار؟ قال: من كل ألف

١ ـ أخرجه البخاري (٣٣٤٨) و(٦٥٣٠) ومسلم (٢٢٢) .

تسعمائة وتسعة وتسعين، فعنده يشيب الصغير، وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا، وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُم بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ)) قالوا: يا رسول الله، وأينا ذلك الواحد؟ قال: ((أبشروا، فإن منكم رجلا، و من يأجوج ومأجوج ألفاً))ثم قال: ((والذي نفسي بيده إني أرجوا أن تكونوا ربع أهل الجنة)) فكبرنا، فقال: ((أرجوا أن تكونوا ثلث أهل الجنة)) فكبرنا. فقال: ((أرجوا أن تكونوا نصف أهل الجنة)) فكبرنا، فقال: ((ما أنتم في الناس إلا كالشعرة السوداء في جلد ثور أبيض أو كشعرة بيضاء في جلد ثور أسود))، واتە: خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی ئادەم، دەڵێت: گوێڕایەڵم و لە خزمەتتام چاکەیش لە دەستی تۆدایە، دەفەرموێت: وەفدی ئاگر بنێرە، ئەویش دەڵێت: وەفدی ئاگر چەندە؟ فەرمووی: لە هەموو هەزارێك نۆ سەد ونەوەت و نۆ، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: لەو کاتەدا منداڵ سەری سپی دەبێت، ﴿وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ﴾(الحج: ٢) واتە: هەرچی مێینەی دوو گیان و سکپڕیشە لە ترس و لە هەیبەتا سکەکەی دادەنێ و لە باری دەچێت و هەموو خەڵکیش وەك مەست و سەرخۆش دەبینی، خۆ لە ڕاستیدا مەست و سەرخۆش نین بەڵکو سزای خوا زۆر توند و سەختە بۆیە ئاوا بیر و هۆشیان نەماوە و وەك سەرخۆشیان لێ هاتوە)) فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خواﷺئەو پیاوە کاممانە؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: مژدەتان لێبێت، لە یەئجوج و مەئجوج هەزارێك و لە ئێوە پیاوێك)) ئەمجار پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: سوێند بە ئەو کەسەی گیانی من بە دەستە ئومێدەوارم ئێوە چواریەکی ئەهلی بەهەشت بن)).

ئێمەش سوپاس گوزاری خوا بووین و وتمان (الله أكبر)، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: من خوازیارم سێیەکی ئەهلی بەهەشت بن)) ئێمەش سوپاس گوزاری خوا بووین و وتمان (الله أكبر)، پێغەمبەری خواﷺ لە جاری سێیەمدا فەرمووی: من خوازیارم نیوەی ئەهلی بەهەشت بن، نمونەی ئێوە لە ناو خەڵکیدا وەکو موویەکی ڕەش وان لە پێستی گایەکی سپیدا یان وەکو موویەکی سپی لە پێستی گایەکی ڕەشدا )).

پاشان بانگی (نووح) دەکرێت، هەروەکو لە (صحیح البخاری)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابی سعید الخدری) یەوە کەوا خۆشەویستمان ﷺ فەرموویەتی: ((((یدعى نوح عليه السلام يوم القيامة، فيقول: لبيك وسعديك يا رب، فيقول: هل بلغت؟ فيقول: نعم. فيقال لأمته: هل بلغكم؟ فيقولون: ما أتانا من نذير، فيقول: من يشهد لك؟ فيقول: محمدوأمته، فتشهدون له أنه قد بلغ ((وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا)).

واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا بانگی نووح عليه السلام دەکرێت، ئەویش دەڵێت: گوێڕایەڵم و لە خزمەتتام ئەی پەروەردگارا.. خوای گەورە دەفەرموێت: ئایا بانگەوازی دینەکەی خوات گەیاند؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ، ئەمجار بە ئوممەتەکەی دەڵێن: ئایا نووح عليه السلام ئاگادارتانی کردەوە؟ ئەوانیش دەڵێن: هەرگیز هیچ ترسێنەرێکمان بۆ نەهاتوە، ئەویش بە نووح عليه السلام دەڵێت: کێ شایەتیت بۆ دەدات؟ ئەویش دەڵێت: (موحەممەد)ﷺ و ئوممەتەکەی، ئێوەش شایەتی بۆ دەدەن کە بانگەوازەکەی گەیاندوە و ئەوانی ئاگادار کردوەتەوە ((وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا)). واتە: پەیامبەریش بەسەر گشتانەوە چاودێر و شایەت بێت ئاخۆ کێ دوای کەوتوە و کێیش سەرپێچی لێ کرد)).

بە ڕاستی قەومەکەی نووح سەیرن!! نۆ سەد و پەنجا ساڵ بانگی ئەوانی کرد بۆ سەر ڕێگای ڕاستی کەچی دەڵێن: هەرگیز ئەویان نەبینیوە!! خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمۡ أَلۡفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمۡسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمۡ ظَٰلِمُونَ﴾ (العنكبوت:١٤) واتە: بە ڕاستی ئێمە (نووح)مان نارده لای هۆزو گەلەکەی خۆی بۆ ئەوەی یەکتاناسینیان پێ ڕابگەیەنێت، ئەویش ئەوەبوو بێ وچان قۆڵی لێ هەڵماڵی، هەزار ساڵ ــ پەنجا کەم ــ لە ناویاندا مایەوە و ژیا بە شەو و بە ڕۆژ، بە ئاشکراو بە نهێنی، تێدەکۆشا و بانگی ئەکردن بۆ لای خوا کەچی ئەوان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بۆ پەرستنی بتەکانیان سوورتر دەبوون دەرەنجام تۆفان و سێڵاو هەموویانی گرت، چوون ئەوان ستەمکار بوون)).

---

١ ــ أخرجه البخاري (٤٤٨٧) .

لە گەڵ ئەوەشدا دەڵێن: هیچ کەسێکمان بۆ نەهاتوە و هیچ ترسێنەرێکمان بۆ نەهاتوە!! بەڵام ئوممەتەکەی (موحەممەد) ﷺ شایەتی بۆ (نووح) دەدەن کەوا ئەو بانگەوازەکەی گەیاندوە ئەمجار گوتی: ئەوە مەبەستی ئەو ئایەتەیە کە دەڵێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴾ ( البقرة١٤٣) واتە: هەرچۆنێ بۆ ئایینی پیرۆزی ئیسلام ڕێنماییمان کردن، هەر ئاواش لە تەواوی ئیش و کاردا کردومانن بە ئوممەت و گەلێکی میانەڕەو واتە: ئێوە ئەی موسڵمانان! نە وەکو گاورەکان (نصاری) زێدە ڕەون و نەوەکو جوولەکەش کەمتەرخەمن، کەوابوو ئێوە ئوممەتێکی خێرخواز و هەڵبژێردراون، تا لەسەر ئەو خەڵکە ببنە شایەت کە: بەڵێ.. پەیامبەر ﷺ پەیامەکەی خوای گەورەی بەراست و ڕەوان گەیاند، و پەیامبەریش ﷺ بەسەر گشتانەوە چاودێر و شایەت بێت ئاخۆ کێ دوای کەوتووە و کێیش سەرپێچی لێ کرد، لە ڕۆژی قیامەتیشدا لەولاشەوە هەم پێغەمبەرﷺ و هەم ئوممەتەکەی ببنە شایەت بۆ پێغەمبەران کە بەرنامەکەی خوایان گەیاند بە ئوممەتەکەیان)).

مانای (الوسط: دادپەروەرییە)

لە ڕیوایەتێکی تردا کە (ابن ماجە) بە سەنەدێکی (صحیح)[1] لە (ابو سعید الخدری) یەوە ریوایەتی کردوە دەڵێت: خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((فتدعی أمة محمد، فیقال: هل بلغ هذا؟ فیقولون: نعم، فیقول: وما علمکم بذلك؟)) واتە: ئەمجار بانگی ئوممەتی موحەممەدﷺ دەکرێت، پێیان دەڵێن: ئایا ئەم پێغەمبەرە پەیامەکەی گەیاند؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ، پێیان دەگوترێت: ئێوە چۆن دەزانن؟))

ئێمە پێغەمبەر(نووح)مان نەبینیوە چۆن شایەتی بانگەوازەکەی دەدەین؟ ئەم ئوممەتە پیرۆزە لە وەڵامدا دەڵێن: ((أخبرنا نبینا ﷺ بذلك أن الرسل قد بلغوا

---

١ ـ أخرجه ابن ماجه (٤٢٨٤) وأحمد (٥٨/٣) وصححه الشيخ الألباني في صحيح ابن ماجه .

فصدقناه)) واته: پێغەمبەرەکەمان ﷺ ئەوەی پێ ڕاگەیاندین کە ئەو پێغەمبەرانە هەموو پەیامەکەی خوایان گەیاندوە و ئێمەش باوەڕمان پێ کرد))

هەموو ئەو باس و هەواڵانەی کە لە (موحەممەد) ﷺ ەوە هاتوە ئێمە باوەڕمان پێی هێناوە.

پاشان بانگی پێغەمبەر (عیسا) دەکرێت: ﴿وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَـٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَـٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ سُبْحَـٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ ۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ۚ تَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِى وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِكَ ۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّـٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِى بِهِۦٓ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۚ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِى كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ قَالَ ٱللَّهُ هَـٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ ٱلصَّـٰدِقِينَ صِدْقُهُمْ ۚ لَهُمْ جَنَّـٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١١٩﴾﴾ (المائدة) واتە: ئەو کاتەش وە بیر بێنە کە خوای کاربەجێ لە ڕۆژی قیامەتدا بە عیسای کوڕی مەریەم ئەڵێ: ئەرێ تۆ بەو خەڵکەت گوت کە لە جیاتی خوای تاك و تەنیا خۆت و دایکت بکەنە دوو خوا؟ عیسایش دەڵێ: خوایە! من هەمیشە تۆ بە پاك و خاوێن ڕائەگرم و هەرگیزیش بۆ من ناشێ شتێکی ناڕاست و ناشیاوی وا بەرامبەر بە تۆ بڵێم ئەگەر ئەو قسەیەم کردبێ،بێ شك تۆ خۆت دەزانی، هەرچی لە ناخی مندایە تۆ ئەیزانیت بەڵام من دەربارەی ئەوەی لە نەفس و زاتی تۆدایە شتێکی ئەوتۆ نازانم بە ڕاستی تەنها هەر خۆتی بە هەموو نادیارەکان زانایت. (١١٦) جیت فەرمان پێ کردوم منیش هەر ئەوەم پێ گوتوون، پێم وتوون: بە تەنها هەر (الله) بپەرستن کە پەروەردگاری من و ئێوەیە هەتا لە ناویشیاندا بووم ئاگاداریان بووم کە مردیشم بە فەرمانی خۆت ئیتر بۆ خۆت چاودێر و ئاگادارایان بوویت دیاریشە کە تۆ بۆ خۆت بە سەر هەموو شتێکا بە ئاگای. (١١٧) ئێستایش ئەگەر تۆ سزایان بدەیت بێ گومانە کە بەندەی خۆتن و

کەسیش بۆی نییە هیچ بڵێت، ئەگەر لێشیان ببووریت، ئەوە خۆت چاك دەزانی و بۆ خۆشت دەسەڵاتدار و کارجوانی.(١١٨) خوای بە هەق پاش ئەو هەموو ئامۆژگارییە کردنی، فەرمووی: ئیتر ئەمڕۆ ڕاستگۆیان، ڕاستگۆییان کەڵکیان پێ دەگەیەنێت، واتە: تەنیا یەك خواپەرستان قازانجیانە، بۆ خواپەرستانی ڕاستگۆ لە بەهەشتدا چەند باخاتێك هەیە و بە بەریاندا چەندین ڕووبار بە خوڕ دەچێت بە هەتا هەتاییش تێیاندا ئەمێننەوە، خوای میهرەبان لێیان ڕازییە، واتە: کردەوەکانی وەرگرتوون و ئەوانیش لە خوا ڕازین هەر ئەوەیش سەرکەوتن و سەرفرازی گەورەیە.(١١٩).

پاشان لەو ڕۆژەدا خوای گەورە بانگی هەموو پێغەمبەران دەکات و دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْ ۖ قَالُوا۟ لَا عِلْمَ لَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ﴾(المائدة: ١٠٩) واتە: لەو ڕۆژە بترسن کە خوا گشت پەیامبەرەکانی خۆی کۆدەکاتەوە ئەوجار لێیان ئەپرسێ و ئەفەرموێ: ئەرێ چۆن وەڵامێکتان درایەوە لە لایەن ئەو گەلانەوە نێردران بۆ لایان، کاتێ بانگتان دەکردن بۆ ڕێی ڕاست؟ لە بەر شەرم و ئەدەبی خۆیان و سەختی ڕۆژەکە ئەڵێن: خوایە! ئێمە هیچ زانیارییەکمان لەو بارەیەوە نییە چونکە بێ گەمان تەنها هەر ئەتۆی کە بە تەواوی لە حاڵی گشت نادیارەکان بە ئاگای)).

(الحسن) و (مجاهد) و جگە لەوان[1] دەڵێن: بە هۆی ترس و سام و بیمی ئەو ڕۆژە بەو شێوەیە وەڵامیان دایەوە)) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ (الأعراف: ٦) واتە: دڵنیابن لەو کەسانە پەیامبەرانیان بۆ هاتوە دەپرسینەوە و دەڵێین: ئاخۆ کاتێ بەرنامەی خواتان پێ ڕاگەیەنرا لە لایەن پێغەمبەرانەوە وەڵامتان چی بوو بۆیان؟ وە لە پێغەمبەرەکانیش دەپرسین: ئەرێ بەرنامەکەی خواتان گەیاند؟)

تەنانەت پێغەمبەرانیش پرسیاریان لێ دەکرێت دەربارەی گەیاندنی پەیامەکەی خوا، هەمووان پرسیاریان لێ دەکرێت!! بە ڕاستی ئەوە دیمەنێکی زۆر گران و

---

١ ـ تفسير ابن كثير لسورة المائدة : ١٠٩ (٤١٠/٥ ط أولاد الشيخ) .

قورسە ! ڕۆژ نزیك بوەتەوە و لە سەر سەری خەڵکی ڕاوەستاوە، لەولاشەوە دۆزەخ دەنەڕێنێت و دەناڵێنێت و هاوار دەکات، پاشان شای شاهان بانگی ئادەم دەکات و دەفەرموێت: ((أخرج بعث النار)) هەروەکو لە پێشدا باسمان کرد، بە جوانی بیر لەو وشانە بکەرەوە، سوێند بە خوا هیچ کەسێك ناتوانێت هەرچەندە خوای گەورە ئەوپەڕی ڕەوانبێژی و زمانپاراوی و پێ بەخشیبێت، کە بە جوانی ئەو مانا و واتانە وەکو خۆی شی بکاتەوە ! !

دەڵێم: لەو کات و ساتە ترسەدا و لەو کات و ساتە سامناکەدا... کە هیچ دەریایەك نییە، هیچ ڕوبارێك نییە، هیچ دار و درەخت و خانوویەك نییە،تەنها زەوییەکی سپییە وەکو ئاردێکی پاکی سپییە، هیچ تاوانێکی لە سەر ئەنجام نەدراوە، هیچ خوێنێکی لە سەر نەڕێژراوە[1] ، هەموو خەڵکی لە نێو ئارەقەی خۆیاندا خنکاون ! !

لەو کات و ساتە بە سامەدا کۆمەڵێك بانگ دەکرێن بۆ ئەوەی خوای گەورە لە ژێر سێبەری عەرشی خۆیدا بیانهێڵێتەوە، لە ڕۆژێکدا هێچ سێبەرێك نییە تەنها سێبەری خوا نەبێت ! ئەوانە کێن؟

ئیمامی (بوخاری و موسلیم)[2] ڕیوایەتیان کردوە لە فەرمودەی (ابو هریرە) وە کەوا خۆشەویستی خوا ﷺ فەرموویەتی: ((سبعة یظلهم الله فی ظله یوم لا ظل إلا ظله، إمام عادل...)) واتە: حەوت جۆر کەس هەن کە خوا دەیانخاتە ژێر سایە و سێبەری خۆیەوە لەو ڕۆژەدا کە هیچ سایە و سێبەرێك نییە جگە لە سایە و سێبەری ئەو زاتە: پێشەوایەکی دادپەروەر...))

تەماشای پلە و پایەی فەرمانڕەوای دادپەروەر بکە، ئەو فەرمانڕەوایەی کە ژێر دەستەکەی خۆی بەختیار دەکات و ژێر دەستەکەی بە هۆی ئەوەوە ئاسوودە و بەختیارن ئەوا ئەو فەرمانڕەوایانە لە ژێر سێبەری عەرشی خوادا دەبن.

---

١ ــ أخرجه الطبري في تفسيره لسورة ابراهيم : ٤٨،عن ابن مسعود أنه تلا هذا الآية (يوم تبدل الأرض غير الأرض والسماوات وبرزوا لله الواحد القهار) قال: ((يجاء بأرض بيضاء كأنها سبيكة فضة , لم يسفك فيها دم , ولم يعمل عليها خطيئة )) والأثر صحيح .

٢ ــ أخرجه البخاري (٦٦٠) و مسلم (١٠٣١) .

((وشاب نشأ فـی عبـادة ربـه))، واتـە: لاوێکـە کـە لـە سـەر خواپەرسـتی گـەورە بوبێت..)) موژدە بۆ تۆ کوڕە شیرینەکەم... کچە بەڕێزەکەم.. ئەی ئەو کەسەی زاڵ بوویتە بە سەر ئارەزووەکانتدا و بە توندی دەستت بە دینەکەی خۆتەوە گرتوە هەروەکو ئەوەی بڵێیت ئاسکلّت بە دەستەوە گرتبێت لە نێو ئەو فیتنەیانەدا، ئـەوا موژدە بـۆ تـۆ ئەگـەر بـەردەوام بیـت لـە سـەر ئـەو رەوشتە جوانـە تـاکو دەگەیتـە خواکەی خۆت.

((ورجل قلبـه معلـق بالمساجد)) واتـە: کەسێکە کـە دڵـی پەیوەسـتی مزگـەوت بێت..)).

لە مزگەوت دەردەچێت لە کاتێکدا ئەو تامەزرۆیە بگەڕێتـەوە بـۆ مزگەوتەکـە بـۆ ئەوەی نوێژە فەرزەکـەی تـر لـە مزگـەوت بکـات، دەبیـنی دڵـی وەکـو چـرایەك بـە بنمچی (سقف) ی مزگەوتەکانەوە هەڵواسراوە، هەر بە تەواو بوونی نوێژە فەرزەکان حەز دەکات جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ مزگەوتەکە.

((ورجلان تحابا فی الله اجتمعا علیه وتفرقا علیه)) واتە: دوو کەس کەلەبەر خوا یـەکتریان خـۆش بوێـت و لـە سـەر ئـەو بنـچینەیە بـە یـەك گەیـشتن، دوای دوور کەوتنەوە و جیابونەوەشیان لە یەکتر خۆشەویستیان بەردەوام بێـت)) داوا لـە خـوا دەکـەم مـن و ئێـوە لـەو کۆمەڵـە بگێڕێـت، بـرای خۆشەویـستم.. تـۆ منـت خـۆش نەویستوە تەنها لە بەر خوا نـەبێت و منـیش ـــ والله ـــ تـەنها لـە بـەر خـوا تـۆم خۆشـدەوێت، لـە کاتێکـدا مـن بـە هـیچ شـێوەیەك ناتناسـم بـەڵام مـن هـەموو یەکتاپەرستێکم لە سەر زەویدا خۆش دەوێت لە بەر خوا.

((ورجل طلبته امرأة ذات منصبٍ وجمال فقال: إنی أخاف الله ورجل تـصدق..)) لە ریوایەتێکی تردا کە (مسلم) ڕیوایەتی کردوە: ((بصدقة فأخفاها ـ أخفـی، حتـی لا تعلم شماله ماتنفق یمینه))، واتە: کەسێك کـە ئـافرەتێکی جـوان و نـاودار بـانگی بکات، ئەویش بڵێت: بە ڕاستی من لە خـوا دەترسـم، کەسێکە کـە خـەیر دەکـات و دەیشارێتەوە هەتا دەستی راستی نازانێت دەستی چەپی چی بەخشیوە))

کابرایەکی دڵسۆزە لە کارەکانیدا هیچ مەبەستێکی نییە تەنها ڕەزامەنـدی خـوای پەروەردگار نەبێت، ئەوەش بزانە کـە هـیچ کێشە نییـە ئەگـەر بـە ئاشـکرا چاکە و

صدقە بدەیت بۆ ئەوەی خەڵکی تر لە پیاوچاکان چاوت لێ بکەن، بەڵام ئەم کابرایە بە شێوەیەکی صدقەی داوە و شاردویەتییەوە تەنانەت کاتێك بە دەستی ڕاستی بەخشیویەتی هەوڵی داوە دەستی چەپی نەزانێت.

((ورجل ذکر اللە خالیاً ففاضت عیناه)) واتە: کەسێکە بە تەنهایی یادی خوا بکات و چاوەکانی ئەسرینیان لێ ببارێت)) گەورەیی و مەزنی خوات هێنایە یادی خۆت، بە تەنهایی و ئەمجار چاوەکانت پڕ فرمێسك بوو پاشان لە ترسی خوادا دەستت بە گریان کرد، پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرموێت: ((لا یلج النار رجل بکی من خشیة اللە حتی یعود اللبن في الضرع))[1] واتە: هەرگیز کەسێك ناچێتە ناو ئاگرەوە لە ترسی خوادا گریا بێت، تاوەکو بۆ جارێکی تر شیر نەگەڕێتەوە گوانی ئاژەڵەوە)) خودایە ئێمە و ئێوە بگێڕێت لەو کەسانەی کە لە ترسی ئەودا دەگرین و لە بەر مەزنی و گەورەیی ئەو دەگرین، هەر خۆی پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

پرسیارێك لێرەدا هەیە، ئایا جگە لەوانە خەڵکی تر لە سێبەری عەرشی خوادا دەمێننەوە؟ وەلامەکە: بەڵێ..

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت هەروەکو لە (صحیح مسلم)[2] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابوهریره) وە: ((إن اللە یقول یوم القیامة: أین المتحابون بجلالی؟ الیوم أظلهم فی ظلی یوم لاظل إلا ظلی)) واتە: بە ڕاستی خوای بالادەست لە ڕۆژی قیامەتدا دەفەرموێت: کوان ئەوانەی کە یەکتریان لەبەر خاتری من خۆش دەویست؟ ئەمڕۆ من دەیانخەمە ژێر سێبەری خۆمەوە لە ڕۆژێکدا کە هیچ سێبەرێك نییە جگە لە سێبەری من)).

بە ڕاستی ئەو خۆشەویستییە تەنها لە پێناوی خوادایە.

ئا بەو شێوەیە بانگ لە خۆشەویستان دەکات ئەوانەی تەنها لە بەر خوا یەکیان خۆشویستوە و بەو موژدە گەورەیە موژدەیان پێ دەدات.

---

١ ـ أخرجه أحمد (٢/٥٠٥)، والترمذي (٢٣١١) وقال: (( هذا حدیث حسن صحیح)، والنسائي (١٢/٦) وصححه الألباني في (صحیح الجامع) (٧٧٧٨) من حدیث أبي هریرة.

٢ ـ أخرجه مسلم (٢٥٦٦).

هەروەها کەسێك خەڵكی تر لە تەنگانەدا دەرباز بکات، هەروەکو لە (صحیح مسلم)[1] دا هاتوە لە فەرموودەیەکی دوور و درێژ کە (ابو الیسر) ریوایەتی کردوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرمویەتی: ((من أنظر معسراً، أو وضع عنه، أظله الله في ظله)).واته: هەرکەسێك ماوەی بە قەرزارێك دا، یان دەستبەرداری (قەرزەکەی) بوو، ئەوا خوای گەورە دەیخاتە سایە و سێبەری خۆیەوە)).

کابرایەك هەندێ پارەی پێ دەدەیت و ئەویش ناتوانێت بیگێڕێتەوە، ئەوا مۆڵەتی بدەیە بە بێ سوو و زیادە و پێی بڵێ: براکەم گوێی مەدەیە، بە پشتیوانی خوا هەر کاتێ بۆت کرا و لە سەرت سووك و ئاسان بوو ئەوا پارەکەم بۆ بگێڕەوە، بە شێوەیەکی جوان، بە نەرم و نیانی و رازیبوون، بە بێ منەت و گرژی و هەست بریندار کردن و ئازارەوە، ئەگەر دەتەوێت لەوە زیاتر و مەزنتر و گەورەتر بزانیت ئەوا بەو کابرایەی کە ناتوانێت قەرزەکەت بداتەوە بڵێ: برۆ گەردنت ئازاد بێت تەنها لە بەر خوا...

دڵنیا بە ئەوا رێز و حورمەتت بە شێوەیەك دەبێت کەوا خوای گەورە لە سێبەری عەرشەکەی خۆیدا بتهێڵێتەوە لە رۆژێکدا جگە لە سێبەری ئەو هیچ سێبەرێکی تر نییە.. ئەی ئەو کەسەی یارمەتی خەڵكی لێقەوماوانت داوە و گەردنی ئەوانت ئازاد کردوە...

بەڵێ.. دیمەنێکە دڵەکان ئارام و هێوردەکاتەوە لە ناوەراستی ئەو کارەسات و ترس و سامناکییەدا...

ئەمجار حیساب و لێپرسینەوە دەست پێ دەکات، ئەوەش باش بزانە کەوا دیمەن و کاتی حیساب و لێپرسینەوە گرانترین و دژوارترین دیمەنەکانی قیامەتە، ئەمجار نمایش دەست پێ دەکات لە بەر دەستی خوادا و پاشان نامەی کردەوەکان دابەش دەکرێت.

---

١ ـ أخرجه مسلم (٣٠٠٦) .

ئیمامی (بوخاری و موسلیم)[1] ریوایەتیان كردوە لە فەرموودەی دایكی ئیماندارانەوە (عائیشە) كەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((من حوسب یوم القیامة عذب)) فقلت: ألیس قد قال الله: ((فأما من أُوتي كتابه بیمینه (٧) فسوف یحاسب حساباً یسیراً (٨))) فقال: ((لیس ذاك الحساب، إنما ذاك العرض، من نوقش الحساب یوم القیامة عذب)) واتە: هەركەسێك لە ڕۆژی قیامەتدا لێپرسینەوەی لە گەڵ كرا ئەوا سزا دەدرێت، عائیشە فەرمووی: ئایا خوای گەورە نەیفەرمووە: ((فسوف یحاسب حساباً یسیرا)) واتە: ئیتر پرسینەوەیەكی سووك و ئاسانی لە گەڵدا دەكرێت، پاشان پاداش وەرئەگریّ و خراپەكانیشی ئەبووردریّ)) پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئەوە لێپرسینەوە نییە بەڵكو ئەوە تەنها پیشاندانی نامەی كردەوەكانە، بەلاّم هەركەسیّ موناقەشەی لێپرسینەوەی لە گەڵدا بكرێت لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوا سزا دەدرێت)).

هەروەها ئیمامی (بوخاری و موسلیم)[2] ریوایەتیان كردوە لە فەرموودەی (عدی كوڕی حاتم) ەوە كەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((ما منكم أحد إلا سیكلمه ربه لیس بینه وبینه ترجمان، فینظر أیمن منه فلا یری إلا ما قدم، وینظر أشأم منه فلا یری إلا ما قدم، وینظر بین یدیه فلا یری إلا النار تلقاء وجهه، فاتقوا النار ولو بشق تمرة)) واتە: هیچ كەسێك لە ئێوە نییە ئیللا خوای پەروەردگار قسەی لە گەڵدا دەكات كە بە هیچ شێوەیەك وەرگێڕ (ترجمان) لە نێوانیاندا نییە، كاتیّ تەماشای لای ڕاستی خۆی دەكات هیچ نابینیّ تەنها كردەوەكانی خۆی نەبێت، تەماشای لای چەپی خۆی دەكات هیچ نابینیّ تەنها كردەوەكانی خۆی نەبێت، تەماشای بەردەست و بەردەمی خۆی دەكات تەنها ئاگر دەبینیّ، بۆیە خۆتان لە ئاگر بپارێزن ئەگەر بە لەتە خورمایەكیش بێت)).

پێش ئەوەی لێپرسینەوە (حیساب) دەست پیّ بكات كۆمەڵێك لە ئوممەتەكەی (محمدالمصطفی)ﷺ بانگ دەكرێن بۆ ئەوەی بە بیّ لێپرسینەوە (حیساب) و ئازار و

---

١ ـ أخرجه البخاري (٦٥٣٦) و مسلم (٢٨٧٦) .
٢ ـ أخرجه البخاري (٦٥٣٩) و مسلم (٦٧/١٠١٦) .

سزا بڕۆنە بەهەشتەوە، کۆمەڵێك هەن لەم ئوممەتە نمایش ناکرێن و لێپرسینەوەیان لە گەڵدا ناکرێت لە بەر دەستی پەروەردگاردا؟ هەر لە زەوی مەحشەرەوە بەرەو بەهەشت بە بێ لێپرسینەوە و بە بێ سزا دەڕۆن؟ ئەوانە کێن؟ لە بەشی داهاتوو ئەوانە دەناسین انشاء الله.

# دیمەن و باسی لێپرسینەوە و حیساب

لە بەشی رابوردوودا لەو کات و ساتە ترسناکەدا راوەستاین کاتێك هەموو مرۆڤایەتی کۆدەکرێتەوە،بەڵکو هەموو دروستکراوەکان لە جنۆکەو مرۆڤ و باڵندە و دڕندەکان و هەموو دروستکراوەکان، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ﴾ التكوير: ٥، واتە: کاتێ گیانلەبەرانی کێوی کۆکرانەوە، پاش ئەوە کە لە ترسی یەکتر نەیان ئەوێرا بە یەکەوە بژین چونکە ئەو رۆژە ئەوەندە سەختە ئەوانیش خۆیان لە بیر ئەچێتەوە و دوژمنایەتیان نامێنێ)).

هەموو دروستکراوەکان زیندووکرانەوە و کۆکرانەوە.. هەموو خەڵکی زیندووکرانەو و کۆکرانەوە..لە گۆڕەپانی مەحشەردا راوەستان و رۆژ لە سەر سەریان نزیك کراوەتەوە بە ئەندازەی یەك میل. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی هەروەکو ئیمامی (مسلم)[1] ریوایەتی کردوە: ((یؤتی بجهنم یومئذ لها سبعون ألف زمام، مع كل زمام سبعون ألف ملك يجرونها)) واتە:: لەو رۆژەدا دۆزەخ دەهێنرێت حەفتا هەزار جڵەوی هەیە، لە گەڵ هەر جڵەوێکدا حەفتا هەزار فریشتە هەن رایدەکێشن)).

ئاگریش لە بەر پەستی و تووڕەیی خوای پەروەردگار هاوار دەکات و دەناڵێنێت، هەموو پێغەمبەران - لە پاش شەفاعەتی پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ بۆ ئەوەی خوای گەورە داوەری خۆی بە سەر خەڵکیدا بدات - دەڵێن: ((اللهم سلّم سلّم)) واتە: خودایە... بمانپارێزە بمانپارێزە)) بەڵکو هەموان بە ئەندازەی تاوان و کردەوەکانیان نوقمی ئارەقەی خۆیان بوونە، لەوکات و ساتە ترسناکەدا، لەوکات و ساتە تۆقینەرەدا کاتێك خوای گەورە دێت، هاتنێك شایستەی گەورەیی و مەزنی ئەو بێت.

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٨٤٢) .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلۡمَلَكُ صَفّٗا صَفّٗا﴾(الفجر: ٢٢) واتە: لەو ڕۆژەدا پەروەردگارت هات بە هاتنێك شیاوی خۆی بێت و فریشتەکانیش لەگەڵی ریز ریز..)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِي ظُلَلٖ مِّنَ ٱلۡغَمَامِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ﴾ (البقرة: ٢١٠) واتە: ئاخۆ پەیڕەوانی شەیتان جگە لەمە لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە لە پەڵەهەورێکی سپیدا بێتە لایان و داوەرییان بکا، فریشتەکانیش بەریز ئامادە بن بۆ تێپەرانی بڕیارەکانی خوا، دادگایشیان ببڕێتەوە و بنێردرێن بۆ دۆزەخ، دەبێ بەدەرلەمە چاوەڕوانی چی بن؟ ئەوساش ئەنجامی هەموو کارێ بێنرێتەوە لای خوای گەورە و بەدادگەرانە داوەرییان بکات.))

خوای گەورە دێت بە شێوەیەك شایستەی گەورەیی و مەزنی خۆی بێت، ئەوەش بزانە هەموو ئەوەی کە بە مێشك و بیر و خەیاڵتدا دێت ئەوا خوای گەورە جیاوازە لەوە، لەو کات و ساتە پڕ ترس و سامەدا خوای پەروەدگار بانگ دەکات و مۆڵەت دەداتە کۆمەڵەکەسێکی ڕێزدار لە ئوممەتی پێغەمبەری خۆشەویستﷺراستەوخۆ و بە بێ لێپرسینەوە بڕۆنە بەهەشتەوە بە بێ هیچ جۆرە سزایەك!

جا پێش ئەوەی باسی ئەو دیمەنە ترسناکە بکەین لە دیمەنەکانی ڕۆژی قیامەت، دەڵێم: لە سایەی ئەو ترسەدا و لە سایەی ئەو هەموو سام و بیمەدا، کۆمەڵێك لە ئوممەتەکەی خۆشەویستی خوا ﷺ راستەوخۆ دەڕۆنە بەهەشتەوە بە بێ لێپرسینەوە ئەو کۆمەڵە لەو شوێن و جێگا ترسناکەدا ڕاناوەستن بۆ ئەوەی لە بەر دەستی خوای گەورەدا لێپرسینەوەیان لە گەڵدا بکرێت بەڵکو نە لەو کاتەدا و نە لە ئاگردا سزا نادرێن و توشی هیچ نارەحەتییەك نابن بەڵکو راستەوخۆ بەرەو بەهەشت دەڕۆن بە بێ لێپرسینەوە و بە بێ هیچ سزایەکی پێشین!! ئایا ئەو کۆمەڵە بەختەوەرە کێن؟؟

وەڵامی ئەو پرسیارە لای خۆشەویستی خوایە ﷺ، لە فەرموودەیەکدا هاتوە کە ئیمامی (بوخاری و موسلیم)[1] ریوایەتیان کردوە لە فەرموودەی (ابن عباس)ەوە

---

١ ـ أخرجه البخاري (٣٤١٠) و مسلم (٢٢٠) .

دەڵێت: خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((عرضت عليَّ الأمم)) واتە: ئوممەتەکان خرانە بەرچاوم)) ئەم نمایشە کەی ڕوویداوە؟

ئیمامی (الترمذي)[1] ڕیوایەتی کردوە ـ جگە لە هەردوو کتێبی (صحیح) نەهاتوە ـ کەوا ئەم نمایشە شەوی (ئیسرا و میعراج) بوە.. ((عرضت عليَّ الأمم، فرأيت النبي ومعه الرهيط، والنبي ومعه الرجل والرجلان، والنبي ليس معه أحد)) واتە: ئوممەتەکان خرانە بەرچاوم، دەبینم پێغەمبەر هەیە کۆمەڵە کەسێکی کەمی لە گەڵدایە، پێغەمبەر هەیە تەنها پیاوێك یان دوو پیاوی لە گەڵدایە، پێغەمبەر هەیە کەسی لە گەڵدا نییە)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ئوممەتەکانی بینی لە کاتێکدا بەرەو بەهەشت دەڕۆیشت، بیهێنە پێش چاوی خۆت ئوممەتێك لە ئوممەتەکان خوای بە بەزەیی پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرە بەڕێزەکانی بۆ ڕەوانە کردوون، کەچی لەو ئوممەتە زۆر و گەورەیە تەنها چەند کەسێکی کەم ئیمانیان بەو پێغەمبەرە بەڕێزە هێناوە کە خوای گەورە ڕەوانەی کردوە و ژمارەیان نەگەیشتوەتە دە کەس، چونکە وشەی (الرهط) لە زمانی عەرەبیدا بە کۆمەڵە کەسێك دەگوترێت ژمارەیان نەگاتە دە کەس، ئەو ئوممەتە هەمووی دەچێتە دۆزەخەوە، لەولاشەوە ئەو پێغەمبەرە و ئەو چەند هاوەڵە کەمەی لە گەڵیدان بەرەو بەهەشت دەڕۆن، ئەوانەی کە باوەڕیان بە خوا و پێغەمبەرەکەی هێناوە.

ئەمجار خۆشەویستەکەم ﷺ دەڵێت: ((إذ رفع سواد عظيم، فظننت أنهم أمتي)) واتە: ئینجا خەڵکێکی زۆرم پیشاندرا، گومانم کرد کە ئوممەتەکەی من بن)).

پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵە کەسێکی زۆر و دەستەیەکی مەزن دەبینی بەرەو بەهەشت دەڕۆن خۆشەویستی خوا ﷺ وای زانی ئەوە ئوممەتەکەی ئەوە، دەفەرموێت: ((فقيل لي: هذا موسى وقومه)) واتە: پێیم وترا: ئەمە موسا و قەومەکەیەتی)) لەوانەی کە باوەڕیان بە خوا و پێغەمبەر موسا هێناوە، ئەمەش

---

١ ـ الترمذي باب (١٦) (٢٤٤٦) وقال : حديث حسن صحيح , وصححه الشيخ الألباني هناك .

ڕێزێکی گەورە و جێی شانازییە بۆ پێغەمبەر موسا - على نبينا وعليه أفضل الصلاة والسلام - کەواتە ئوممەتەکەی (موحەممەدﷺ) لە کوێن؟ کوان ئوممەتە پیرۆزەکەی (موحەممەد)ی بەڕێز و خۆشەویست ﷺ؟ پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((ولكن انظر الى الأفق، فنظرت، فإذا سواد عظيم، فقيل لي: انظر الى الأفق الآخر، فإذا سواد عظيم، فقيل لي: هذه أمتك، ومعهم سبعون ألفاً يدخلون الجنة بغير حساب ولا عذاب)) واتە: بەڵام تەماشای ئاسۆ بکە، منیش تەماشام کرد، بینیم کۆمەڵێکی مەزن و دەستەیەکی زۆرتر بەرەو بەهەشت دەڕۆن، دیسان فەرموویان: تەماشای ئاسۆیەکی تر بکە، منیش کۆمەڵێکی گەورەتر و دەستەیەکی فراوانترم بینی، فەرمویان: ئەوە ئوممەتەکەتە، حەفتا هەزار کەسیان لە گەڵدایە بە بێ لێپرسینەوە و بە بێ سزا دەچنە بەهەشتەوە)).

حەز دەکەم لێرەدا لە گەڵ ئەو کۆمەڵە کەسەدا راوەستین و پاشان دەگەڕێینەوە بۆ تەواو کردنی فەرموودەکە، چونکە بەراستی ئەمە فەرموودەیەکی جوان و بەڕێزە. کەوابوو ئەوانە کێن؟ خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت: ((هذه أمتك، ومعهم سبعون ألفاً يدخلون الجنة بغير حساب ولا عذاب))

لە ڕیوایەتێکی تردا کە لە هەردوو کتێبی (صحیح)[١]دا هاتوە، لە فەرموودەی (ابو هریرە) وە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((يدخل الجنة من أمتي زمرة هم سبعون ألفاً، تضيء وجوههم إضاءة القمر ليلة البدر)) واتە: کۆمەڵێك لە ئوممەتەکەم دەچنە بەهەشتەوە کە ژمارەیان حەفتا هەزار کەسە، روخسار و دەمو چاویان وەکو مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە)).

ئەی خودایە ئێمە و هەموو موسڵمانان بگێڕە لەوانە بە فەزڵ و بەزەیی و میهرەبانی خۆت....ئەی میهرەبانترین کەسی میهرەبانەکان.

لە ڕیوایەتێکی تردا کە لە (مسند أحمد) دا هاتوە بە سەنەدێکی (صحیح)[٢] بە

---

١ - أخرجه البخاري (٥٨١١) و(٦٥٤٢) و مسلم (٢١٦ , ٢١٧) .

٢ - أخرجه أحمد (٢/٣٥٩) وجوّد إسناده الحافظ في (الفتح) (١١/٤١٨) وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (١٤٨٤) .

هۆی چەند (شواهد)ێکەوە لە فەرموودەی (أبو هريرە)وە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((سألت ربي عز و جل، فوعدني أن يدخل الجنة من أمتي سبعون ألفاً على صورة القمر ليلة البدر، فاستزدت فزادني مع كل ألفٍ سبعين ألفاً)) واتە: داوام کرد لە خوای بالآدەست و کارزان ئەویش بەڵێنی پێدام کە حەفتا هەزار کەس لە ئوممەتەکەم بخاتە بەهەشتەوە لە سەر شێوەی مانگی چواردە، داوام کرد خوای گەورە زیاترم پێ ببەخشێت ئەویش ئەو ژمارەیەی زیاد کرد و لە گەڵ هەر هەزارێکدا حەفتا هەزار کەس)).

من وا دەزانم ئەگەر ئەو حەفتا هەزارە لێکدانی لە گەڵ هەر هەزارێکدا بکەین ئەوا ژمارەکە کەم دەبێت لە چاو ئوممەتەکەی (موحەممەد) دا ﷺ بەلآم پێغەمبەری خواﷺ بەوەوە نەوەستا و بەڵکو داوای زیاتر و زۆرتری کرد تەماشای ئەو موژدەیە بکە کە خۆشەویست ﷺ موژدەی پێ داوین، بۆ ئەوەی شانازی بەو خۆشەویستەوە بکەیت و سەرت بڵند بکەیتەوە، تا لە گەڵ ئەستێرەی جەوزادا ململانێ بکات، چونکە تۆ یەکێکی لە یەکتاپەرستان.. تۆ کەسێکی لە شوێنکەوتوانی پێغەمبەری خواﷺ، ئەوەش بزانە کە خۆدانە پاڵ ئەم دینە و هەڵگرتنی ئەم دینە چەند پێویستی و داواکارییەکی خۆی هەیە، چونکە چوونە سەر ئەم دینە تەنها بە وشە نابێت، هەرگیز شتی وا نابێت، بەڵکو بە وتە و باوەڕهێنان و کردەوە دەبێت، تاوەکو ئەو پلە و پایە و ڕێزە بە دەست بهێنی، هەرگیز سست مەبە و واز لە کردەوە بهێنی و تەنها بەو خۆدانە پاڵ ئیسلام و بەو ڕێز و پایەیە دڵخۆش بیت، چونکە بە ڕاستی ئەوە بە هەڵە تێگەیشتنە لەو موژدانە کە پێغەمبەری خواﷺ موژدەی پێ داوین ئەو کەسەی کە هەرگیز لە خۆوە قسە ناکات، کەسی ڕێزدار چەند ڕێزی لێبگریت ئەوا خۆشەویستی و ڕێزی زیاتر بۆ تۆ دەبێت، بەلآم کەسی بێ ڕێز ئەگەر ڕێزی لێ بگریت ئەوا لە خۆی دەردەچێت و فیز پەیدا دەکات، ولا حول ولا قوە الا بالله.

هەروەکو شاعیر فەرموویەتی:

إذا أنت أكرمت الكريم ملكته      وإذا أنت أكرمت اللئيم تمردا

ئوممەتەکەی پێغەمبەری نازدار ﷺ ئەو ڕێز و پلە و پایەی بە دەست نەهێناوە تەنها لە ڕێگای یەکتاپەرستی و شوێنکەوتنی ڕێبازەکەی خۆشەویستی ڕاستگۆوەﷺ نەبێت، ئەوە تەنها هیوا و ئاوات نییە، چونکە شوێنکەوتنی دین بە هیوا و ئاوات و خۆرازاندنەوە نییە بەڵکو بەوەی کە لە دڵەکاندا جێگر بوە و وتە و کردەوەکان ئەو ڕاستییانە دەسەلمێنن، هەرکەسێ وتەی چاکی گوت و کردەوەی چاکی ئەنجام دا ئەوا لێی وەردەگیرێت، هەرکەسێ وتەی چاکی گوت و کردەوەی خراپی ئەنجام دا ئەوا لێی وەرناگیرێت.

بە جوانی بیر لەو وتە شیرینەی پێغەمبەری ئازیز ﷺ بکەرەوە، هەروەکو لە (مسند أحمد) و (سنن الترمذي) و (سنن ابن ماجة)[1]دا هاتوە لە فەرموودەی (أبو أمامە) وە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((وعدني ربي أن يدخل الجنة من أُمتي سبعين ألفاً لا حساب عليهم ولا عذاب مع كل ألفٍ سبعون ألفاً، وثلاث حثياتٍ من حثيات ربي)).واتە: خوای گەورە بەڵێنی پێدام کە حەفتا هەزار کەس لە ئوممەتەکەم بخاتە بەهەشتەوە بە بێ لێپرسینەوە و سزا لە گەڵ هەر هەزارێکدا حەفتا هەزار کەس، لە گەڵ سێ چنگ (مشت) لە مشتی پەروەدگارم))[2].

لە ڕیوایەتێکی تردا کە (ابن حبان و الطبراني)[3] ڕیوایەتیان کردوە لە فەرموودەی (عتبە ی کوڕی عبدِ السلمی) کەوا پێغەمبەری ئازیز ﷺ فەرموویەتی: ((ثم يتبع كل ألفٍ بسبعين ألفاً، ثم يحثي بكفه ثلاث حثيات)) واتە: ئەمجار هەر هەزارێك حەفتا هەزار کەس شوێنیان دەکەون، پاشان خوای گەورە بە دەستی خۆی سێ مشت دەکاتە بەهەشتەوە)) لەو کاتەدا عومەری کوڕی خەتتاب پڕ بەدەم فەرمووی: الله أكبر... چونکە ئەو بە تەواوی لە مانای فەرموودەکە گەیشتبوو، ماناکەی چییە؟

---

١ ـ أخرجه أحمد (٢٥٠/٥ , ٢٦٨) والترمذي باب (١٢) (٢٤٣٧) وقال : حديث حسن غريب , وابن ماجه (٤٢٨٦) وابن حبان (٧٢٤٦) وابن أبي شيبة في (مصنفه) (٣١٧١٤) والطبراني في (الكبير) (١١٠/٨) , وصححه الشيخ الألباني في ( الصحيحة) (٢١٧٩) (٢١٢/٥) و (صحيح الجامع) (٧١١١) و (المشكاة) (٥٥٥٦) .

٢ ـ زەرکەشی پێیوایە لە گەڵ هەر حەفتا هەزار کەس سێ مشتی پەروەردگار شەفاعەت دەیانگرێتەوە ـ وەرگێڕ.

٣ ـ أخرجه ابن حبان (٧٢٤٧) والطبراني في (الكبير) (١٢٦/١٧) (٣١٢) و (الأوسط) (١٢٦/١) (٤٠٢) و (مسند الشاميين ) (١٠٤/٤) (٢٨٦٠) وقال الشيخ شعيب في تحقيق ابن حبان (صحيح لغيره) .

نـاتوانم بـە تـەواوی مانـای فەرموودەکـە روون بکەمـەوە تـەنها بـە فەرموودەیـەکی پێغەمبـەری ئـازیز ﷺ نـەبێت، هـەروەکو لـە فەرموودەیـەکی درێـژی (ابـو سـعید الخدری)[1] یەوە هاتوە - لە پاشاندا باسی دەکـەم انشاء الله کاتێك باسـی سـیرات (صراط) دەکەم - پێغەمبەری ئازیز ﷺ پرسیاری سیرات (الصراط) ی لیّ دەکەن، دەفەرموێت:((دحض مزلة، فیه خطاطیف و کلالیب و حسك)) واتە: پردێکی لوسە و جێی پێخلیسکانی و تیاچوونە و قولاپ و شتی لە ناکاو فڕاندنی بە سەرەوەیە))

جێگایەکە کە پێی لە سەر دەسـوڕێت و خـۆی پـێ ناگیرێـت تـەنها ئـەو کەسـانە نەبێت کە خوای گەورە پێی دامەزراو دەکات، ئەی خودایـە پێمـان لـە سـەر سـیرات (الصراط) دامەزراو بکە.

پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرموێت: ((فیمـر المؤمنـون، کطـرف العـین، وکـالبرق، وکالریح، وکالطیر، وکأجاوید الخیل والرکاب، فناج مُسَلَّمٌ، ومخدوش مرسل، ومکدوس في نـار جهـنم)) واتـە: ئیمانـداران تێدەپـەڕن وەکـو چـاوتروکان و وەکـو بروسـکە (تریشقە) و وەکو با و وەکو باڵندە و وەکو چاکترین ئەسپ و وەکو وشتر، کەسی وا هەیە بـە سـەلامەتی رزگـاری دەبێـت و کەسـی واش هەیـە بـە زەحمـەت و زامـداری رزگاری دەبێت و کەسی واش هەیە فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە)).

پاشان پێغەمبـەری ئـازیز ﷺ باسـی شـەفاعەتی ئیمانـدارانی کـرد، ئەوانـەی کـە خوای پەروەردگار رزگاری کردوون بۆ براکانیان، ئەوانەی کە لە سـەر پـردی سـیرات (الصراط) کەوتنە خوارەوە، دەڵێن: ((ربنا ! کانوا یصومون معنا ویصلون ویحجون. فیقال لهم: أخرجوا من عرفتم. فتحرم صورهم علی النار. فیخرجـون خلقـا کـثیرا قـد أخذت النار إلی نصف ساقیه وإلی رکبتیه. ثم یقولون: ربنا ! ما بقـي فیهـا أحـد ممـن أمرتنا به. فیقول: ارجعوا. فمـن وجـدتم في قلبـه مثقـال دینـار مـن خـیر فـأخرجوه. فیخرجون خلقا کثیرا. ثم یقولون: ربنا ! لم نـذر فیهـا أحـدا ممـن أمرتنـا. ثـم یقـول: ارجعوا. فمن وجدتم في قلبه مثقال نصف دینار من خیر فـأخرجوه. فیخرجـون خلقـا کثیرا. ثم یقولون: ربنا ! لم نذر فیها ممن أمرتنا أحدا. ثم یقول: ارجعوا. فمن وجدتم

١ - أخرجه البخاري (٧٤٣٩) و مسلم (١٨٣) .

في قلبه مثقال ذرة من خير فأخرجوه. فيخرجون خلقا كثيرا. ثم يقولون: ربنا! لم نذر فيها خيرا". فيقول الله عز وجل: شفعت الملائكة وشفع النبيون وشفع المؤمنون. ولم يبق إلا أرحم الراحمين. فيقبض قبضة من النار، (ثم يحثي ربي بكفه ثلاث حثيات) فيخرج منها قوما لم يعملوا خيرا قط. قد عادوا حمما. فيلقيهم في نهر في أفواه الجنة، يقال له نهر الحياة. فيخرجون كما تخرج الحبة في حميل السيل. ألا ترونها تكون إلى الحجر أو إلى الشجر. ما يكون إلى الشمس أصيفر وأخيضر. وما يكون منها إلى الظل يكون أبيض؟" فقالوا: يا رسول الله! كأنك كنت ترعى بالبادية. قال "فيخرجون كاللؤلؤ في رقابهم الخواتم...)) الحديث. واتە: دەڵێن: پەروەردگارا! ئەوانە لە گەڵ ئێمەدا ڕۆژوویان دەگرت و نوێژیان دەکرد و حەجیان دەکرد، پێیان دەگوترێت: ئەوانەی کە ئێوە دەیانناسن دەریانبهێنن، بۆیە روخسار و دیمەنیان لە ئاگر حەرام دەبێت، خەڵکێکی زۆر دەردەکەن کە ئاگر تاکو هەردوو پێی یان تا ئەژنۆی سوتاندوون، ئەمجار دەڵێن: پەروەردگارمان! هیچ کەسێکی لەوانەی کە فەرمانت پێ کردووین تێیدا نەما، ئەویش دەڵێت: بگەڕێنەوە ئەوەی بە ئەندازەی مسقاڵە دینارێك چاکەی لە دڵدایە دەریانبهێنن، بۆیە خەڵکێکی زۆر دەردەهێنن، ئەمجار دەڵێن: پەروەردگارمان! هیچ کەسێکمان بە جێ نەهێشت لەوانەی فەرمانت پێ کردین، ئەمجار دەڵێت: بگەڕێنەوە ئەوەی بە ئەندازەی نیو مسقاڵە دینار چاکەی لە دڵدایە دەریانبهێنن، بۆیە خەڵکێکی زۆر دەردەهێنن، ئەمجار دەڵێن: پەروەردگارمان! هیچ کەسێکمان بە جێ نەهێشت لەوانەی فەرمانت پێ کردین، ئەمجار دەڵێت: بگەڕێنەوە ئەوەی بە ئەندازەی مسقاڵە زەڕرەیەك چاکەی لە دڵدایە دەریانبهێنن، بۆیە خەڵکێکی زۆر دەردەهێنن، ئەمجار دەڵێن: پەروەردگارمان! هیچ چاکەیەکمان تێدا بە جێ نەهێشت، ئەمجار خوای گەورە دەڵێت: فریشتەکان شەفاعەتیان کرد و پێغەمبەران شەفاعەتیان کرد و ئیمانداران شەفاعەتیان کرد هیچ کەسێك نەماوە تەنها میهرەبانترین کەسی میهرەبانەکان نەبێت، خوای گەورە بە مشتی خۆی مشتێك دەدات لە ئاگر، (ئەمەش مەبەستی فەرموودەکەیە کە باسمان کرد (ثم يحثي ربي بكفه ثلاث حثيات)) خوای گەورە بە مشتی خۆی

مشتێك دەدات لە ئاگر خەڵكێك لە ئاگر دەردەهێنی کە هەرگیز چاکەیان نەکردوە و سوتاون، دەیانهاوێژێتە ناو روبارێك لە بەردەم بەهەشتدا پێی دەگوترێت: روباری ژیان ئەوانیش سەوز دەبنەوە هەروەکو تۆوێك لە لیتەی لافاودا سەوز دەبێت، ئایا نایبینن لە سەر بەرد یان لە سەر دار، ئەوەی لە بەر خۆرە زەردە یان سەوزە، ئەوەشی لە بەر سێبەردا بێت سپییە؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێی تۆ لەو دەشتەدا شوانیت کردوە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوانیش دەردەچن لە سەر شێوەی مرواری...) تاکۆتایی فەرموودەکە.

لە گەڵ مندا جارێکی تر بگەڕێوە بۆ فەرموودەکە: ((ثم يحثي ربي بكفه ثلاث حثيات)) بە هیچ شتێك نایچوێنین و نایشوبهێنین و بەکیناخەین، دڵنیابە ئەوەی کە بە بیر و هۆشی تۆدا هاتوە خوای گەورە لەوە جیاوازە، من سوێند دەخۆم بە خوای گەورە کە هیچ کەسێك ئەندازەی مشتی دەستی خوای میهرەبان نازانێت تەنها خۆی نەبێت. ((ثم يحثي ربي بكفه ثلاث حثيات)) عومەری کوڕی خەتتاب فەرمووی: الله أكبر، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((و إن السبعين ألفاً الأول يشفعهم الله في آبائهم، و أمهاتهم، وعشائرهم، وإني لأرجو أن تكون أمتي أدنى الحثوات الأواخر)) واتە: یەکەمین حەفتا هەزار شەفاعەت بۆ باوك و دایك و عەشیرەتەکەیان دەکەن، من تکام وایە کە ئوممەتەکەم دوایین مشت بیانگرێتەوە))

براکانم... ئەو موژدەیانە هەرگیز دڵەکانمان پڕ لە زاتکردن و نەترسان بەرانبەر بە خوای گەورە ناکات، بەڵکو دڵەکانمان پڕ لە تکاکردن و پاڕانەوە دەکات بەرانبەر بە خوای گەورە، من وا دەزانم هەر بەڕێزێك ئەو موژدانە ببیسێت ئەوا خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ لە دڵدا بتەوتر و زیاتر دەبێت، لە هەمان کاتدا ترس و بیمی زیاتر دەبێت، ئەمە کەسی بەرێزە هەست بە نرخ و بەهای ئەو خۆدانە پاڵە دەکات، هەندێ کەس وادەزانن ئەم فەرموودانە دەرگای بەهەشت دەکەنەوە هەرکێ بۆ خۆی!! ئا بەو شێوە و بە هەمان گوفتار! پاکی و بێگەردی بۆ خوای گەورە... کێ ئەو فەزڵ و پایەیە بە دەست دەهێنێ؟ ئەوە ئوممەتی ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ کە خوایان بە تەنها زانی و شایەتییان دا کە هیچ خوایەك نییە تەنها (الله) نەبێت و (موحەممەد) نێردراو و پێغەمبەری ئەوە ﷺ، بەڵکو ئەوانە نوێژیان دەکرد بە

بەڵگەی فەرموودەکەی (ابو سعید الخدری) کە دەفەرموێت: ((کانوا یصومون معنا ویصلون ویحجون)) بەڵام مرۆڤایەتی بێهێزی و لاواز بوونی تێدایە، سەیر لەوەدایە هەندێ لە نوسەرانمان دەڵێن: ئەو فەرموودانە دەرگاکانی بەهەشت دەکەنەوە و دڵی خەڵکی پڕ لە سستی و تەوەزەلی دەکات!! بەڵام من دەڵێم: بەڵکو دڵی خەڵکی پڕ لە تکاکردن و باوەڕ دەکات ئەوەش بزانە هەرچەندە بکەویتە ناو تاوانەوە و توشی ئەو هەڵە بێیت، هەرچەندە دڕکی سەرپێچی کراسەکەی تۆی دەگرت و رایدەکێشا ئەوا هەرگیز بێ هیوا و بێ ئومێد مەبە، تەنها ئەوەت لە سەرە کە واز لەو تاوانە بهێنێت و پێیەکانت لە سەر ئەو درك و داڵە بەرز بکەیتەوە، تەنها ئەوەت لە سەرە بە فرمیسکی تەوبە و گەڕانەوە و پەشیمانی جل و بەرگەکەت بشۆیتەوە، بگەڕێیتەوە بۆ لای خوا و کاری چاکە بکەیت، دیسان پەشیمانی نوێ بکەرەوە لە تاوان و سەرپێچیەکان، لە بەر دەستی خوای گەورەدا، لە کاتێکدا دڵنیابیت و باوەڕی بتەوت هەبێت کەوا خوای گەورە خۆشحاڵ دەبێت بە گەڕانەوە و تەوبەکەت لە کاتێکدا ئەو زۆر دەوڵەمەندە و پێویستی بە هیچ کەسێك نییە، ئەوە مانای تەواوی فەرموودەکەیە، بەڵام تەنها پشت ببەستین بە رەحمەتی خوا و بە هیچ شێوەیەك کار نەکەین و تەوەزەل بین ئەوە پێی دەڵێن (التواكل) ئەوا نابێت، بەڵام کار دەکەیت و پشت بە رەحمەتی خوای خۆمان دەبەستین و باوەڕی بتەومان پێی هەبێت، لە هەردوو کتێبی (الصحیح)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابوهریرە)وە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((لن يدخل أحداً منكم عمله الجنة)) قالوا: ولا أنت يا رسول الله؟ قال: ((ولا أنا، إلا أن يتغمدني الله بفضل ورحمة)) واتە: هیچ کەسێك کردەوەکانی خۆی نایباتە بەهەشت، وتیان: تەنانەت تۆیش ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: تەنانەت منیش، مەگەر خوا بە میهرەبانی و فەزڵی خۆی بمپۆشێت)).

جا ئێمە کار دەکەین، فەرمانەکانی خوای خۆمان جێ بە جێ دەکەین، واز لە قەدەغەکراوەکانی دەهێنین، لە سەر سنوورەکانی رادەوەستین و نایبەزێنین، شوێنی خۆشەویستی خوا دەکەوین ﷺ، خۆشەویستی راستی ئەوەیە کە شوێنی

---

١ ـ أخرجه البخاري (٥٦٧٣) و(٦٤٦٣) و مسلم (٢٨١٦) .

خۆشەویستەکەت بکەویت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (آل عمران: ٣١ ) واتە: ئەی پێغەمبەری ﷺ پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش ئەوێ و ئەتانەوێ لێی نزیك ببنەوە، دەبێ پەیڕەوی لە شەریعەت و بەرنامەکەی من بکەن ئەوسا خوایش ئێوەی خۆش دەوێ و لە هەڵە و گوناهەکانیشتان خۆش ئەبێت، چونکە ئەو خوایە زۆر چاوپۆشیکار و زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە))

ڕاستی فەرمووە شاعیر کە دەڵێت:

| | |
|---|---|
| من یدعي حب النبی ولمْ یفد | من هدیه فسفاهة وهراء |
| فالحب أول شرطه وفروضه | إن کان صدقاً: طاعةٌ و وفاء |

لە (صحیح البخاری و مسلم)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (سهل ی کوڕی سعد) و (أبو سعید الخدری)یەوە - ڕێز و حورمەت و قەدری پێغەمبەری ئەکرەمت ﷺ بۆ دەردەکەوێت لەو کات و ساتە ترسناك و پڕ سامەدا - پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((أنا فرطکم علی الحوض)) واتە: من پێشتان دەکەوم و ئاوگێڕتان دەبم لە سەر حەوزی کەوسەر ((من مرَّ عليَّ شرب، ومن شرب لم یظمأ أبداً)) واتە: هەرکەسێ بە لامدا تێپەڕێت ئەوا لێی دەخواتەوە و هەرکەسێ لێی بخواتەوە ئەوا هەرگیز تینووی نابێت))

ئەی خودایە... لە حەوزی خۆشەویستەکەمان ﷺ خواردنەوەی ئەو ئاوەمان بە نسیب بکە و خواردنەوەیەکی بە تام و چێژ و خۆش هەرگیز لە پاش ئەوە تینومان نەبێت... ئەی پەروەردگاری هەموو جیهانیان.

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((لیردن علي أقوام أعرفهم و یعرفوني، ثم یحال بیني و بینهم)) واتە: خەڵكێك دێن بۆ سەر حەوزەکەم دەیانناسمەوە و ئەوانیش دەمناسنەوە ئەمجار دەکەونە نێوان من و ئەوان))

---

١ - أخرجه البخاري (٦٥٨٣، ٦٥٨٤) و مسلم (٢٢٩٠، ٢٢٩١) .

لە ڕیوایەتێكی تردا دەفـەرموێت: ((إنهم مـني، فيقـال: إنـك لا تـدري مـا أحـدثوا بعدك، فأقول سحقاً سحقاً لمن غيَّر بعدي)) واتە: ئەوانە لە مـنن! پـێم دەگوترێـت: تۆ نازانیت لە پاش تۆ چی شتێكی تازەیـان داهێنـا، منـیش دەڵـێم: دووربكەونـەوە دوور.. ئەوەی كە لە پاش من دینی گۆڕاوە)).

بـەڵێ... ئـەو كەسـەی ئـەو ڕێـز و پلـە و پایـەی دەسـتكەوێت یەكتاپەرسـتانی شوێنككەوتەی پێغەمبەری خۆشەویستن ﷺ .

لە (صحيح البخاری)[1] دا هاتوە، أبو هريره دەفەرموێت: ((قلت: يا رسول الله، من أسعد الناس بشفاعتك يوم القيامة؟ قال رسول الله: (لقد ظننت، يـا أبـا هريـرة، أن لا يسألني عن هذا الحديث أحد أول منـك، لمـا رأيـت مـن حرصـك علـى الحـديث، أسـعد الناس بشفاعتي يوم القيامة من قال: لا إله إلا الله، خالـصاً مـن قلبـه أو مـن نفـسه). واتە: ئەی پێغەمبەری خواﷺ كێ بەختیارترین و كامەرانترین كەسە بـە شـەفاعەتت لە ڕۆژی قیامەتدا؟ پێغەمـەری خـواﷺ فـەرمووی: گومـانی ئـەوەم دەبـرد كـە هـیچ كەسێك پێش تۆ ئەو پرسیارە نەكات ئـەی ئـەبو هـورەیرە، چـونكە دەبیـنم تـۆ زۆر سـووریت لـە سـەر وەرگـرتن و فێربـوونی فـەرمودە، بەختـەوەرترین كـەس لـە ڕۆژ قیامەتـدا بـە شـەفاعەتم ئـەو كەسـەیە وتبـێتی: لا الـه الا الله.. بـە موخلیـصی و دڵسۆزییەوە لە دڵیەوە یان لە ناخی خۆیەوە))

بە ڕاستی ئەوە مەرجی دڵسۆزی و ئیخلاصە.

لـە هـەردوو كتـێبی (صـحيح)[2] دا هـاتوە لـە فـەرموودەی (أبـو هريـره) وە — گوتەكەی هی (مسلم) ە – كەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویـەتی: ((لكـل نـبي دعـوة مستجابة، فتعجل كل نبي دعوته، وإني اختبأت دعوتي شفاعة لأمتي يوم القيامة فهي نائلـة — إن شـاء الله — مـن مـات من أمـتي لا يـشرك بـالله شـيئاً)) واتـە: هـەر پێغەمبەرێك نزایەكی تایبەتی گیرای هەیـە، هـەموو پێغەمبـەرێك پەلـەی كـردوە لـە

---

١ _ أخرجه البخاري (٩٩ , ٦٥٧٠) .

٢ _ أخرجه البخاري (٦٣٠٤ , ٧٤٧٤) و مسلم (١٩٨ , ١٩٩) .

نزاکەیدا بەڵام من نزاکەم شاردۆتەوە بۆ ئوممەتەکەم بۆ ڕۆژی قیامەت ـ انشاء الله ـ گیرایە بۆ هەر کەس لە ئوممەتەم کە مردبێ و هاوەڵی بۆ خوا بڕیار نەدابێ.))

ئایا بە باشی لەو مەرجانە تێگەیشتی؟ چەند مەرجێکی گرانە، ئەو فەرموودانە مەرجەکان دادەنێت، بۆیە دەبێت بە باشی لەو مەرجانە تێبگەیت، بەو تێگەیشتنە گشتییە تێبگەیت.

جارێکی تر لە گەڵ مندا بگەڕێوە، ئەو کەسە پاك و بێگەردانە کێن کە دەچنە بەهەشتەوە بە بێ لێپرسینەوە و سزا، ڕوومەتیان وەکو مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە؟

وەڵامی ئەم پرسیارە چییە؟

کاتێ هاوەڵان ئەو قسانەیان بیست هەر یەکەو بە شێوەیەك لە یەکی دەدایەوە و لێی تێگەیشتن فەرموویان: ((فلعلهم الذين صحبوا رسول الله)) واتە: ڕەنگە ئەوانە بن کە هاوڕێتی پێغەمبەری خوایان کردوە ﷺ)) ئەوەش بزانە کە هاوەڵان پلە و پایەیەکی بەرزیان هەیە.

پێناسەی هاوەڵبوون ئەوەیە هەروەکو (الحافظ ابن حجر)[1] فەرموویەتی: ((هاوەڵ ئەو کەسەیە کە پێغەمبەری خوای بینیوە ﷺ لە ژیانی خۆیدا بە موسڵمانی و لە سەر ئیسلام کۆچی دوایی کردوە)).

جا ڕێز و پلە و پایەی هاوەڵبوون تەنها خوای گەورە خۆی دەزانێ چەندە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلسَّـٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَـٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ (التوبة: ١٠٠) واتە: لە دەستەی یەکەمی پێشەنگی کۆچەران و پشتیوانان و چاك پەیڕەوانی ئەوانیش خوا ڕازی بوو لێیان و ئەوانیش لە خوا ڕازی بوون، بەدەر لەوەش چەندان باخ و بێستانی بۆ سازداون کە بە بەر درەخت و کۆشکەکانییدا ڕووبار گەلێ دەچێت، بە هەتا هەتاییش تێیدا ئەمێننەوە، هەر ئەوەشە دەسکەوت و سەرفرازی گەورە و بە نرخ))

---

١ ـ الإصابة في تمييز الصحابة (١/٨) ط الكتب العلمية .

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ (٨) وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٩)﴾ (الحشر) واتە: ئەو (فەیئ) و دەسکەوتەیە بۆ ئەو هەژار و دووره ولآت و کۆچکردوانەیە لە خانو و سامانی خۆیان دوورکران، لەلایەن مەککەییەکانەوە، تا بەڵکو ورده ورده ژیانیان راست بکرێتەوە و بگاتەوە ئاستی ئاسایی خۆی، پاش ئەوەی، کە بتپەرستەکانی مەککە هەڵیان فراندن و ناچاریان کردن بە هیجرەت، داوای چاکە و رەزامەندی لە خوا دەکەن بۆیە نەیانتوانی لە مەککەدا بژین ئەگینا لە گەڵیاندا خۆیان ئەسازاند و یارمەتی خوا و پەیامبەرەکەی ﷺ دەدەن بۆیە کۆچیان کرد، ئا ئەوانەن راستگۆکان لە باوەڕ و جیهادیاندا(٨) ئەو کەسانەی نیشتەجێی (دار الهجره) و (دار الايمان) بوون واتە: کۆچەریەکانیان خۆش دەوێن و بەشێك لە دارایی خۆیانیان ئەدەنێ و دڵخۆشیان دەکەن و هیچ شتێکیان لە دڵدا نییە سەبارەت بەوەی بە کۆچەریەکان درا لە فەیئی (بنی نظیر)، چونکە پەیامبەری خوا ﷺ لەو هەموو دەستکەوتە تەنها بەشی سێ کەسیانیدا لە گەڵ ئەوەیشدا کەسێك نەبوو پێی ناخۆش بێت، ئیساری کۆچەریەکان دەکەن بە سەر خۆیاندا لە سەروەت و ساماندا، ئەگەرچی خۆیشیان نیازیان پێی هەبێ و هەژاربن، واتە: بەخشینەکەیان لەبەر دەوڵەمەندییان نییە بەڵکو سروشتی ئیمان و باوەڕیان بەرزە و هەر کەسێ لە سیفەتی رژدی دەروونی بپارێزێ، واتە: هەرکەسێ خوا بپارێزی لە چرووکی دەروونی ئەوانەن برەوەکان.(٩).

چەندەها ئایەت لەو بارەیەوە هاتوە.

لە هەردوو کتێبی (صحيح)[١] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابن مسعود) و (عمران ی کوڕی حصين) ەوە کەوا خۆشەویستی خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خير الناس قرني، ثم

---

١ ـ أخرجه البخاري (٣٦٤٩ ، ٣٦٥١) و مسلم (٢٥٣٣، ٢٥٣٥) .

الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم)) واتە: باشترینی خەڵکی ئەوانەی ئەم سەدەی منن، دوای ئەوانەی بە دوایاندا دێن، دوای ئەوانەی بە دوایاندا دێن))

هەروەها لە هەردوو کتێبی (الصحیح)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابو سعید الخدری)یەوە ((لا تسبوا أصحابي، فلو أن أحدكم أنفق مثل أحد ذهباً، ما بلغ مدَّ أحدهم ولا نصيفه)) واتە: جنێو بە یارانی من مەدەن، ئەگەر یەکێ لە ئێوە بە ئەندازەی کێوی ئوحود ئاڵتون بکات بە خێر، ئەوا ناگاتە مشتی یەکێ لەوان و بە نیوەی مشتێکیش))

جا پلە و پایەی ئەوانە زۆر بەرزە، رەزا و رەحمەتی خوا لە هەموویان بێت، لەو بەرێزە پاك و بێگەردانە، هەندێ لە هاوەڵان فەرموویان: ئەوانەی کە دەچنە بەهەشتەوە بە بێ لێپرسینەوە و بە بێ سزا ئەوانە: هاوەڵانن.

هەندێکی تر فەرموویان: ((رەنگە ئەوانە ئەو کەسانە بن کە بە موسڵمانی لە دایك بوونە و هاوەڵیان بۆ خوا دانەناوە)) ئەوانە ئەو کەسانەن کە لە یەکەم هەناسەو چاوتروکاندا یەکتاپەرست بوونە، لە باخچەی یەکتاپەرستی پەروەردە بوونە، هەرگیز توشی هاوڵدانان بۆ خوای گەورە نەهاتوون، ئەوانەن کە بە موسڵمانی لە دایك بوونە و هەرگیز هاوەڵیان بۆ خوا دانەناوە، یەکتاپەرستی چەند مەزن و بڵندە!! یەکتاپەرستی چەند بەرێز و پایەبەرزە!! هاوەڵدانان بۆ خوای گەورە چەند ترسناك و سامناکە!! خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾ (النساء: ٤٨)واتە: بێگومان هەرگیز خوا لە دانانی هاوبەش بۆی نابوورێ و لە خوار شیرکەوە لە هەر گوناهێك دەبوورێ بۆ هەر کەسێك خۆی بیەوێت))

بەڵکو خوای پەروەدگاری بەپێشەوای یەکتاپەرستان و پێشەنگی خواپەرستان و گەورەی هەموو پێغەمبەران ﷺ دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعْبُدْ وَكُن مِّنَ

---

١ ـ أخرجه البخاري (٣٦٧٣) و مسلم (٢٥٤١) .

ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٦﴾ (الزمر) واتە: سوێند ئەخۆم کە بێ گومان وەحی کراوە بۆ تۆ و بۆ ئەو پەیامبەرانەی بەر لە تۆ بوون: کە ئەگەر گریمان بە هاوبەش قایل ببێت بۆ خوا، ئەوە بێ گومان هەموو کردەوەکانت پووچەڵ دەبێ وە لە زیانمەندانیش دەبیت.(٦٥) نەخێر، هەرگیز بە گوێیان نەکەیت بەڵکو تەنها هەر خوا بپەرستە و لە شوکرانە بژێران بە. (٦٦).

هەرخۆی فەرموویەتی - دایك و باوك و گیانم بە فیدای بێت - هەروەکو لە (صحیح مسلم)[١] دا هاتوە لە فەرموودەی (جابر ی کوڕی عبدالله) وە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((من مات لا یشرك بالله شیئاً دخل الجنة، ومن مات یشرك بالله شیئاً دخل النار)) واتە: هەرکەسێ مرد و هاوەڵی بۆ خوا بڕیار نەدابوو ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە و هەرکەسێ مرد هاوەڵی بۆ خوا بڕیار دابوو ئەوا دەچێتە ئاگرەوە)).

هەروەها (الترمذي)[٢] ریوایەتی کردوە لە فەرموودەی (أنس)ەوە کەوا خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسیدا فەرموویەتی: ((یا ابن آدم، إنك ما دعوتني ورجوتني غفرت لك علی ما کان فیك ولا أبالي. یا ابن آدم، لو بلغت ذنوبك عنان السماء ثم استغفرتني غفرت لك ولا أبالي. یا ابن آدم، إنك لو أتیتني بقراب الأرض خطایا ثم لقیتني لا تشرك بي شیئا لأتیتك بقرابها مغفرة)) واتە: ئەی نەوەی ئادەم! تۆ هەر کاتێك هاوارم پێ بکەیت و داوام لێ بکەیت و تکام لێ بکەیت ئەوا لێت خۆش دەبم هەرچی شتێکت کردبێ هیچ باکم نییە. ئەی نەوەی ئادەم! ئەگەر تاوانەکانت گەیشتنە ئاسمانەکان ئەمجار داوای لێخۆشبوونت لێ کردم ئەوا لێت خۆش دەبم و هیچ باکم نییە، ئەی نەوەی ئادەم! ئەگەر بە ئەندازەی هەموو زەوی بە تاوانەوە پێم بگەی و بە من گەیشتی هاوەڵت بۆ من بڕیار نەدابوو ئەوا بە ئەندازەی هەموو زەوی بە لێ خۆش بوونەوەوە پێت دەگەم)).

---

١ ـ أخرجه مسلم (٩٣) ومثله في البخاري (١٢٣٨) ومسلم (٩٢) من حدیث ابن مسعود .

٢ ـ أخرجه الترمذي (٣٥٤٠) وقال : (حدیث حسن غریب) وصححه الشیخ الألباني في (صحیح سنن الترمذي)

لە (صحیح مسلم)[١] دا هاتوە لە فەرموودەی (أبو ذر)ەوە دەڵێت: خۆشەویستی خوا ﷺ فەرموویەتی: ((.. ومن لقيني بقراب الأرض خطيئة لا يشرك بي شيئاً لقيته بمثلها مغفرة)) واتە: ئەگەر بە ئەندازەی هەموو زەوی بە تاوانەوە پێم بگات و بە من گەیشت هاوەڵی بۆ من بڕیار نەدابوو ئەوا بە ئەندازەی هەموو زەوی بە لێ خۆش بوونەوەوە پێت دەگەم))

جا تەماشای یەکتاپەرستی بکە چەند مەزنە!! چەند بەرێزە!! چەند پلەو پایە بەرزە!! چەند شیرینە!!((رەنگە ئەوانە ئەو کەسانە بن کە لە موسڵمانی لە دایك بوونە و هاوەڵیان بۆ خوا دانەناوە)) تاکو ئێستا نازانین ئەو کەسانە کێن کە دەچنە بەهەشتەوە بە بێ لێپرسینەوە و سزا....

لەو کاتەدا پێغەمبەری نازدار ﷺ هات بۆ لای هاوەڵان، گوێبیستی ئەوان بوو کاتێك ئەوان گفتوگۆ و دەمەقاڵەیان بوو، فەرمووی: ((ما الذي تخوضون فيه؟)) قالوا في أولئك..)) واتە: ئەوە باسی چی دەکەن؟ فەرموویان دەربارەی ئەوانە..)) واتە ئەوانەی کە جەنابت باست کرد و فەرمووت: دەڕۆنە بەهەشتەوە بە بێ لێپرسینەوە و سزا. لەو کاتەدا خۆشەویست ﷺ فەرمووی: ((هم الذين لا يرقون، ولا يسترقون ولا يتطيرون وعلى ربهم يتوكلون)) واتە: ئەو کەسانەن کە نوشتە ناکەن و داوای نوشتەکردن ناکەن و ڕەشبینی ناکەن و پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن))

ئەی خودایە ئێمە لەو بەندانە بگێڕە کە تەنها پشت بە زاتی تۆ دەبەستن.

خۆشەویستان: پشت بەستن بە خوای گەورە هەموو پایەکان دەگرێتەوە، یەکەم حەفتا هەزار کە دەڕۆنە بەهەشتەوە بە بێ لێپرسینەوە و بێ سزادان ئەوانەن کە خۆیان سپاردوەتە خوای گەورەی بالا دەست، ئەوانە هەرگیز داوای نوشتەیان (رقیە) لە هیچ کەسێك نەدەکرد، چونکە ئەوان لەو پردە پەڕینەتەوە، ئەوانە هەردەم هەموو داواکارییەکانیان لە خوای بالادەست بوە، تەنها دڵیان بە خوا خۆش بوە، لە هیچ کەسێك نەدەترسان تەنها لە خوا نەبێت و هیچ داواکارییەکیان لە کەس نەبوو تەنها لە خوا نەبێت، چونکە ئەو کەسەی کە نوشتە (رقیە) دەکات

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٦٨٧) .

چاکەکارە و ئەوەشی داوای نوشتە (روقیە) دەکات داواکاری چاکە و بەخشـشە، بەڵام ئەوانە داوا ناکەن تـەنها لـە پـەروەردگاری زەوی و ئاسمانـەکان نـەبێت، هـیچ کێشە نییە ئەگەر کەسێك نوشتەیان بۆ بکات چونکە ئـەوان رەدی ناکەنـەوە بـەڵام خۆیان هەرگیز داواناکەن، هیوادارم شێوەکە بە جوانی لە پێش چاوت بێت، چونکە ئەو دوو دیمەنە جیازیان زۆرە.

هەروەها داوای داخکردن (الكيًّ) لە کەس ناکەن، هـەرگیز رەشبین نین، بەڵکو ئەوان بە باوەڕێکی بتەوەوە پشتیان بـە خـوای پـەروەدگار بەستوە، چونکە باش دەزانن کە پـشت بەسـتن بـە خـوا ئەوپـەڕی هێنانـە دی یەکتاپەرسـتییە، ئـەویش بریتییـە لـە پـشت بەسـتن بـە خـوای باڵادەسـتی دەوڵەمەند، لـە گـەڵ گرتنەبـەری هۆکارەکـان، پەکخـستنی هۆکارەکـان پەکخـستنی پـشت بەسـتنە بـە خـوا، بۆیـە پێویستە لە سەرمان بۆ جێبەجێکردنی پشت بەسـتن بـە خـوای گـەورە هۆکارەکـان بگرینە بەر، هۆکارەکانی داهێنـان، هۆکارەکـانی پێـشکەوتن لـە هـەموو بوارەکـانی ژیاندا، دڵمان هەمیشە پەیوەست نەبێت بە هۆکارەکانەوە، بەڵکو بـە پـەروەردگاری گەورە و دلۆڤانەوە، چونکە کەسی ئیماندار باوەڕی بتەوی هەیە کە هۆکارەکـان بـە تەنها نە زیان دەگەیەنن و نە سوودیان هەیە، نە رۆزی کەسێك دەدەن و نـە رێگـرن لە رویاندا، تەنها بە فەرمانی پادشای پادشاکان نەبێت.

پرسیار کرا لە (حاتم الأصم): چۆن پشت بەستنت بـە خـوای گـەورە جـێ بـەجێ کرد؟فەرمووی: بە چوار شت: زانیم کە رزق و رۆزییەکەم هـیچ کەسـێکی تـر نایبـات بۆیە دڵنیا بووم...

زانیم کارەکەم هیچ کەسێکی تـر جێبـەجێی ناکـات بۆیـە خـۆم سـەرقاڵ کـردوە پێوە..

زانیم کە خوای گەورە ئاگای لە هەموو کار و کردەوەکانمە بۆیە شـەرمم کـرد لـە سەرپێچی فەرمانەکانیدا بمبینێ..

زانیم کە مردن چـاوەڕوانی منـە بۆیـە توێشووم ئامـادە کـرد بـۆ دیـدەنی خـوای گەورە)).

هەروەها (سهل ی کوڕی عبدالله التستری)[١] دەفەرموێت: ((هەرکەسێ نکۆڵی لە هۆکارەکان بکات ئەوا نکۆڵی لە سوننە کردوە، هەرکەسێ نکۆڵی لە پشت بەستن بە خوا بکات ئەوا نکۆڵی لە ئیمان کردوە)).

جا گرتنە بەری هۆکارەکان سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ[٢] و پشت بەستن بە خوای گەورە کار و کرداری پێغەمبەری ئەکرەمە ﷺ، هەرکەسێ دەیەوێ وەکو کاروکردەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بکات ئەوا دەبێت واز لە سوننەتەکەی نەهێنێ، چونکە خاوەنی سوننەت هیچ هۆکارێکی جێنەهێشتووە ئیللا ئەنجامی داوە، ئێوەش باش دەزانن لە ڕۆژی کۆچکردندا بۆ شاری مەدینە چۆن هۆکارەکانی گرتەبەر، بەڵکو لە کاتی جەنگدا دوو قەڵغانی دەپۆشا، بەڵکو ڕزق و ڕۆزی ساڵێکی تەواوی بۆ خێزانەکەی هەڵدەگرت، ئەگەر بیویستایە سەفەرێك بکات ئەوا خواردن و توێشووی لە گەڵ خۆیدا دەبرد، لە کاتێکدا ئەو گەورەی هەموو ئەوانەیە کە پشت بە خوای پەروەردگار دەبەستن، ئەمە ڕاستی پشت بەستنە، هەرکەسێ دەیەوێت بە تەواوی پشت بەستن جێبەجێ بکات هەروەکو چۆن پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ جێبەجێی دەکرد ئەوا با هۆکارەکان بگرێتە بەر هەروەکو چۆن ئەو هەموو هۆکارەکانی دەگرتە بەر، پشت بەستن بە خوای گەورە کۆی هەموو ئیمانە، هەروەکو چۆن (سعید ی کوڕی جبیر) فەرموویەتی[٣].

هەروەها ئەوپەری جێبەجێکردنی یەکتاپەرستییە و ڕاستێتی باوەڕ و پشتبەستنی دڵەکانە بە خوای گەورە لە گەڵ گرتنەبەری هۆکارەکان، ئەوانە ئەو بەختەوەرانەن کە ڕاستەوخۆ بەرەو بەهەشت دەڕۆن بە بێ لێپرسینەوە و هیچ سزایەك.

ئای... ئەم ئوممەتە چەند پێویستی بە هێنانەدی پشت بەستنە بە خوای گەورە لەم کات و ساتەدا، هەروەها باوەڕبوون بە خواکەی خۆی نوێبکاتەوە، نەك پشت

١ ـ انظر : (الحلية) لأبي نعيم (١٠/١٩٥) .
٢ ـ مدارج السالكين (١/١٢١) بتصرف .
٣ ـ أخرجه أحمد في ( الزهد ) (١٠٣) وهناد في (الزهد) (٥٣٤) .

بەستن بە دەوڵەتێك لە دەوڵەتەکان، یان هێزێك لە هێزەکان، یان ئوممەتێك لە ئوممەتەکان، بەڵکو تەنها بە خوای باڵادەست و شکۆمەند، چونکە ئەو کەسەی هەموو ئەوانە بەڕێوە دەبات تەنها خودایە، ئەوەی هەموو گەردوون حوکم دەکات تەنها خوایە، ئێمەش تەنها ئەوە لە سەرمانە هۆکارەکان بگرینە بەر بە ئەندازەی تواناو دەسەڵاتی خۆمان و دڵەکانمان بە توندی پەیوەست بکەینە خوای خۆمانەوە، ئەمە خاڵی جیاوازییە لە نێوان ئەوانەی یەکتاپەرستی ئیمانداری لە خواترس و کەسی بەدبەختی بێباوەڕ بە خوای زەوی و ئاسمانەکان .

خۆشەویستان... چ کەسێك پشتی بە خوا بەستوە و ئەویش پەشیمانی کردوەتەوە؟ چ کەسێك پشتی بە خوا بەستوە و ئەویش بزری کردوە؟ بەڵکو دڵنیابە هەرکەسێ پشتی پێ ببەستێ ئەوە ئەوی بەسە، هەرکەسێ پەنای پێ بگرێت ڕزگاری دەکات، هەرکەسێ کار و فەرمانی خۆی دایە دەستی پەروەردگاری خۆی ئەوا ئەو هیدایەت و ڕێنوێنی دەکات.

بە بیری خۆتی بهێنەرەوە جارێك لە جارەکان بە تەواوی پشتت بە خوا بەستبێت و ئەویش تۆی پەشیمان کردبێتەوە و شەرمەزاری کردبێتی، نەخێر زۆر ئەستەمە سوێند بە پەروەردگاری کەعبە، تۆ تەنها ڕاست بکە و هۆکارەکان بگرە بەر و بڵێ: خودایە هیچ هۆکارێك نەماوە ئیللا من گرتومەتە بەر وە هیچ دەرگایەك نەماوە و هەمووی لە ڕووم داخراوە تەنها دەرگای تۆ نەبێت. ئەمجار پشتی پێ ببەستە بە ڕاستی و لە بەر دەستیدا خۆت بەو پەری زەلیل نیشان بدە و ئەمجار پشتبەستنی تەواو بهێنە دی، هۆکارەکان بگرە بەر ئەوەی کە لە تواناتدا هەیە — هەروەکو وتمان — ئەمجار دڵت پەیوەست بکە بە خواوە، سوێند بە خوای تاك و تەنها! ئەوا دەرووی خەیرت لێ دەکرێتەوە لە پاش تەنگانە و مەینەتی، دەوڵەمەندی دەبینی لە پاش هەژاری، عیززەت و سەر بەرزی دەبینی لە پاش زەلیلی و سەر شۆڕی، ئەمن و ئاسایش دەبینی لە پاش ترس و بیم، حەوانەوەی فیکر و دەروون و جێگر بوونی ویژدان دەبینی لە پاش پەشۆکان و تێکچوون و شپرزی.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓ﴾ الطـلاق:٣، واتـە: هەرکەسێك پشت بە خوا ببەستێ دوای بە کارهێنانی هۆکارەکان، ئەوە تەنها خوای بەسە و کاروباری بۆ ئاسان دەکات)).

هـەروەها خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبۡدَهُۥۖ ﴾ ( الزمـر٣٦) واتە: ئەی پێغەمبەرﷺ! هەر خـوا بـەس نییـە بۆ بەنـدەی خـۆی (موحەممەد) لـە کاتی هەموو خۆشی و ناخۆشییەکدا؟)).

لە خوێندنەوەیەکی تردا هاتوە (قراءة): ((أَلَيْسَ اللّهُ بِكَافٍ عِبادهُ)).

لەم کاتەدا تەنها هەڵوێستەکەی دایکی (موسـا) پێغەمبـەرت بـە بـیر دەهێنمـەوە ئـەگینا هەڵویـست زۆرە، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَرۡضِعِيهِۖ فَإِذَا خِفۡتِ عَلَيۡهِ فَأَلۡقِيهِ فِي ٱلۡيَمِّ ﴾ واتـە: ئێمـە خـستمانە دڵـی دایکـی مووساوە کە شیری بدا، کە لە مووسا ترست بوو بیخە ناو سندوقێکەوە و بیهاوێژە ناو دەریای (نیل)ەوە)) بیهاوێـژە نـاو دەریاکـەوە! زۆر ئەستەمە بـە دایکێك لـە کورپەکـەی بترسـێ بڵێیـت: بیهاوێـژە نـاو دەریاکـەوە! ئـەمجار خـوای گـەورە دەفـــــــــــــــەرموێت: ﴿ٱلۡيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحۡزَنِيٓۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيۡكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾القـصص:٧، واتـە: وە نەبترسـە و، نەغەمیـشت بـۆی ببـێ چـونکە بەڕاستی ئێمە ئەیگێرینەوە لات و هەر خۆت ئەبیتە دایەنی لە ئاییندەشدا دەیکەین بە یەکێ لە پێغەمبەران ئەینێرین بۆ لای ئەو سەرکەشە.. بـەڵێ ئـەویش سـندوقێکی هێنـا و مووسـای خـستە نێـو لانکێکـی بـچووکەوە، بـە مووسـاوە هەڵیدایـە نـاو دەریاکەوە!!)).

تەنها بۆت ناگێڕینەوە بـەڵکو ﴿وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ ئەگـەر دیارییـەك لـە پادشاوە بێت(جل جلاله) دەبێت پڕ بێت لە بۆنی عەتر و گوڵاو.

بە پشت بەستنێکی زۆر بەرزەوە و بە باوەڕێکی بتـەو و دڵنیـایی یـەکی رەهـاوە دایکی موسا کۆرپە بچوکە پیرۆزەکەی دەخاتە نێو سنوقێکەوە پاشان فرێی دەداتە

ناو دەریاوە، دەیهاوێژێتە ناو دەریاوە، ئەمجار ئاوەکە ئەو سنوقە دەبات، لە پێش کۆشکی فیرعەونی ستەمکاردا رادەوەستێ، الله أكبر! ! ئەمە ئەو کەسەیە کە فیرعەون بە دوایدا دەگەڕێت، خوای گەورە کارێکی وای کرد کە فیرعەون ئەو بە خێو بکات و پەروەردەی بکات! ! کاتێك کە خێزانی فیرعەون ئەو کۆرپەیە دەبینێ دەڵێت: ﴿قُرَّتُ عَيْنٍ لِّي﴾(القصص:٩) واتە: ئەم کوڕە مایەی رووناکی چاوی من و تۆیە چاو روونییەکە بۆ هەردوکمان))

خوای گەورە موسا دەرباز دەکات بەو پەڕی داپۆشین و ستری ناسك و سۆزەوە، کە بە مێشك و دڵی هیچ کەسێکدا نەهاتوە، کە ئەویش داپۆشینی خۆشەویستییە، هەرکە خێزانی فیرعەون ئەو کۆرپەیە دەبینێ بە بێ دواکەوتن خۆشەویستی ئەو منداڵە دەچێتە دڵییەوە، دەڵێت: ﴿وَلَكَ لَا تَقْتُلُوهُ﴾ واتە: ئەم کوڕە مایەی رووناکی چاوی من و تۆیە چاو روونییەکە بۆ هەردوکمان مەیکوژن))

ئەی خودایە..! ! موسا! پێغەمبەری خوا! وا لە کۆشکی فیرعەون دایە، چەند دایەنێکی بۆ دەهێنن، دایەن لە دوای دایەن، کەچی بە هیچ دایەنێك رازی نابێت، چونکە خوای گەورە بەڵێنی داوە دەبێت دایکی بە خێوی بکات و شیری پێ بدات، ئەمجار دایکی دەهێنن، ئێستا دایکی موسا لە کۆشکی فیرعەوندا دانیشتوەو موسای لە ئامێز گرتوە، بە جوانی بیهێنە پێش چاوی خۆت، فیرعەونش فەرمانی پێ دەکات: شیری پێ بدە، رێزی لێ بگرە تێری بکە.

تا دوێنێ نزیك لە فیرعەون و داروودەستەکەی دەترسا نەوەك ئازاری موسا بدەن، کەچی ئێستا شیر بە موسا دەدات لە کۆشکی فیرعەوندا و بە فەرمانی فیرعەون! ! تەماشای تام و چێژی پشتبەستن بە خوای گەورە بکە چەند شیرینە! ! دڵنیابە – برا شیرینەکەم – هەرکەسێ بە تەواوی پشت بەستنی بە خوای گەورە بەدیهێنا ئەوا لە دونیا و قیامەتدا بەختەوەر دەبێت.

جا ئەوانە بەختەوەرانن.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((هم الذين لا يسترقون، ولا يتطيرون، وعلى ربهم يتوكلون)).

فقام عكاشة بن محصن فقال: أدع الله أن يجعلني منهم.

قال: أنت منهم.

ثم قام رجل آخر فقال: أدع الله أن يجعلني منهم.

فقال: ((سبقك بها عكاشة)) واتە: ئەوە ئەو کەسانەن کە نوشتە ناکەن و داوای نوشتەکردن ناکەن و ڕەشبینی ناکەن و پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن)) عکاشەی کوڕی محصن هەستا و وتی: داوا لە خوا بکە من لەو کەسانە بگێڕێ، ئەویش فەرمووی: تۆ لەوانی، پاشان کابرایەکی تر هەستا و وتی: داوا لە خوا بکە من لەو کەسانە بگێڕێ، ئەویش فەرمووی: عکاشە پێشت کەوت))

تەماشای ئەو فەزڵ و ڕێزە بکە، بەڵکو تەماشای مەزنی و گەورەیی ڕەوشت و دڵنەرمی پێغەمبەرﷺ بکە.

جارێکی تر لە گەڵ مندا بگەڕێوە بۆ گۆرەپانی مەحشەر، ئەم کۆمەڵە بەڕێزە ڕۆیشتن بەرەو بەهەشت بە بێ لێپرسینەوە و سزادان. ئەمجار لێپرسینەوە و حیساب دەست پێ دەکات و خەڵکی لە بەر دەستی خوای پەروەردگاردا نمایش دەکرێن. ئەمجار نامەی کردەوەکان بە سەر خەڵکیدا بڵاو دەکرێتەوە.

هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)[١] دا هاتوە لە فەرموودەی (عائیشە) وە کەوا خۆشەویستی خوا ﷺ دەفەرموێت: ((من حوسب يوم القيامة عذب)) قالت عائشة: أليس قد قال الله عز وجل: ((فسوف يحاسب حساباً يسيرا)) الانشقاق: ٨)) فقال: ((ليس ذاك الحساب إنما ذاك العرض، من نوقش الحساب يوم القيامة عذب)) واتە: هەرکەسێك لە ڕۆژی قیامەتدا لێپرسینەوەی لە گەڵ کرا ئەوا سزا دەدرێت، عائیشە فەرمووی: ئایا خوای گەورە نەیفەرموو: ((فسوف يحاسب حساباً يسيرا)) واتە: ئیتر پرسینەوەیەکی سووك و ئاسانی لە گەڵدا دەکرێت، پاشان پاداش وەرئەگرێ و خراپەکانیشی ئەبووردرێ)) پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئەوە لێپرسینەوە نییە بەڵکو ئەوە تەنها پیشاندانی نامەی کردەوەکانە، بەڵام هەرکەسێ موناقەشەی لێپرسینەوەی لە گەڵدا بکرێت لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوا سزا دەدرێت))

---

١ ـ أخرجه البخاري (٣٥٣٦ , ٣٥٣٧) وانظر (١٠٣) و مسلم (٢٨٧٦) .

به مەبەستی نزیك کردنەوەی بابەتەکە لە بیر و هۆشەوە، دەڵێم: ئایە تاکو ئێستا ڕۆژێك لە ڕۆژان ئامادە بوویتە لە هۆڵێکی دادگادا کاتێك دادگایی کەسێك دەکرێت؟ تکات لێ دەکەم لە فیکر و خەیاڵت لەو هۆڵی دادگایی کردنە ئامادە بیت، بێهێنە پێش چاوی خۆت ڕووی ئەو خەڵکە چۆنە کاتێك ئەو کارمەندە دێتە ژوورەوە کە لە بەر دەستی دەستەی دادگادا کار دەکات (الحاجب)، بە توندی هاوار دەکات و دەڵێت: محکمە!

هەموو هۆڵەکە لە بەر دەنگی ئەو دەنگ دەداتەوە، هەمووان بێ دەنگ دەبن، دەستە و دایەرەی دادگا دێنە ژوورەوە، سەرۆکی دادگا لە ناوراستی دەستەکەدا ڕاوەستاوە، لە پاش چەند دانیشتنێکی دوور درێژ، چەند گفتوگۆ و باسکردنێك، لە پاش چەند سرووتێکی دیاریکراو بۆ ڕاستکردنەوە و خستنەڕووی چەند ڕاستییەك، سەرۆکی دادگا دەیەوی حوکمی خۆی بدات، وا خەریکە بڕیارەکە دەدات... لەو کاتەدا ڕووی ئەو خەڵکە بهێنە پێش چاوی خۆت! تەماشاکە: دەبینی فرمیسك لە هەندێ ڕوەوە بە خوڕ دێتە خوارەوە، هەندێکی تر ترس و دوودڵی و بیم بە ڕوویانەوە دەبینی، دەبینی سنگی هەندێکی تر بەرز دەبێتەوە و دادەبەزێت، ئەوانەی لە هۆڵەکەدان هەمووان چاویان بڕیوەتە سەرۆکی داداگا تەنانەت ئەگەر بۆیان بکرێت نایترووکێنن، هەمووان بە جوانی گوێیان شل کردوە، بۆ ئەوەی حوکمەکە ببیسن! !هەموو ئەمانە لە هۆڵی دادگا لە دادگاکانی ئەم دونیایە!!!

برا ئازیزەکەم: ئایە بە جوانی ئەو چەند ساتەت هێنایە پێش چاوت؟؟ لە کاتێکدا تۆ لە بەر دەستی خوای زەوی و ئاسمانەکاندا ڕاوەستاویت؟ لە پێش چاوی هەموو خەڵکی، لە پێش چاوی هەموو بوونەوەر، لە کاتێکدا تۆ بە ڕووت و قوتی ڕاوەستاویت هەروەکو ئەو کاتەی کە لە دایك بوویتە: ((یحشر الناس یوم القیامة حفاة عراة غرلاً))[1] واتە: خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا دەدرێن لەبەر و کۆ دەکرێنەوە بە ڕووتی و پێ پەتێتی و خەتەنە نەکراوی)) پێشکەوە بۆ ئەوەی لە بەر دەستی خوادا ڕاوەستیت، فریشتەکان پاڵت پێوە دەنێن و پێشت دەخەن، خوای گەورە دەڵێت:

---

١ ــ جزء من حديث أخرجه البخاري (٦٥٢٧) و مسلم (٢٨٥٩) .

﴿وَجَآءَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّعَهَا سَآئِقٞ وَشَهِيدٞ﴾ ق: ٢١، واتــه: ئــەو ڕۆژە هــەر كەســێك بــۆ مەحشەر دێت، دوو فریشتەی لە گەڵدایە، یەکێکیان پێش خۆی داوە و دەیگەیەنێتە مەحشەر، ئەوی دیکەشیان شایەتی دەدا لە سەری بە کردەوەکانی)).

تۆیش لە گۆڕەپانی مەحشەردا بە ناوی خۆتەوە بانگ دەکرێیت!! کوا فلانی کوڕی فلان؟؟ تۆیش دەڵێیت: ئەوە ناوی منە..!! ئەی فریشتەکانی خوا چیتان دەوێت؟ پێت دەڵێن: پێشکەوە.. بڕۆ بۆ بەر دەستی خوای گەورە.. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوۡمَئِذٖ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِيَ لَا عِوَجَ لَهُۥۖ وَخَشَعَتِ ٱلۡأَصۡوَاتُ لِلرَّحۡمَٰنِ فَلَا تَسۡمَعُ إِلَّا هَمۡسٗا ﴿١٠٨﴾ يَوۡمَئِذٖ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَرَضِيَ لَهُۥ قَوۡلٗا ﴿١٠٩﴾ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلۡمٗا ﴿١١٠﴾ ۞ وَعَنَتِ ٱلۡوُجُوهُ لِلۡحَيِّ ٱلۡقَيُّومِۖ وَقَدۡ خَابَ مَنۡ حَمَلَ ظُلۡمٗا ﴿١١١﴾ وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَا يَخَافُ ظُلۡمٗا وَلَا هَضۡمٗا ﴿١١٢﴾﴾(طه) واتە: لەو ڕۆژەدا هەموو خەڵکی دوای دەنگی جارچی (بانگەوازکار) ئەکەون، کە هیچ وەرچەرخان و لادانێك نییە لێی، هەموو خەڵکی لەبەر خوای بەخشندە دەنگیان نەوی دەبێ، دەنگی ژێرلێو و چپەچپ و ئەسپایی نەبێ هیچ شتی تر نابیسی (١٠٨) لەو ڕۆژەدا تکا و لاڵانەوە لای خوا هیچ سوود نابەخشێ، مەگەر لە کەسێك خوای بەخشندە خۆی مۆڵەتی پێدابێ شەفاعەت بکا، وتار و قسەکەشی پەسەند بکا (١٠٩) خوا بە هەموو ئەو شتانە دەزانێت کە ئەوان پێشیان خستوە و کردویانە لە دونیادا، هەروەها بەو شتانەش چاك دەزانێت کە لە ڕۆژی دواییدا چاوەڕێیانە، واتە: ئاگای لە هەموو شتێکیانە، ئەوان بەزانین و عیلم ناتوانن دەورە بدەن بە بەڕێوەبردن و حیکمەتی خوا (١١٠) هەموو دەموچاو و ڕوخسارەکان لەو ڕۆژەدا لەئاستی ئەو خوایەی، کە هەمیشە زیندوە و هەرگیز نامرێ و ڕاگیرکەری هەموو بوونەوەرە لارە مل و سەرنەوی و ملکەچن و بێ گومان کێ ستەمی کرد و هەڵی گرت زیانمەندو ناهومێدە (١١١) هەر کەسیش ئاکار و کردەوەی چاك ئەنجام بدا لە هەمان کاتیشدا بڕواداریش بێت، نە لەوە دەترسێت، گوناهەکانی لە سەر زیاد بکرێن و نە لەوە چاکەکانی کەم بکرێنەوە(١١٢).

بانگت لیٚ دەکریٚت! بەو بانگ کردنە دلٚت دادەخورپیٚت و رادەچەڵەکیٚ، هەموو گیانت دیٚتە لەرزە، هەموو ئەندامەکانی لاشەت تیٚك دەچن و دەچن بە یەکدا، ئەمجار پالٚت پیٚوە دەنیٚن بۆ ئەوەی لە بەر دەستی خوای گەورەدا رابوەستی، بۆ ئەوەی پادشای پادشاکان لە گەلٚ تۆدا قسە بکات.

هەروەکو لە هەردوو کتیٚبی (صحیح)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (عدی کوڕی حاتم) ەوە کەوا خۆشەویستی خواﷺ فەرموویەتی: ((ما منكم من أحد إلا سيكلمه ربه. ليس بينه وبينه ترجمان. فينظر أمامه فتستقبله النار. وينظر عن أيمن منه فلا يرى إلا شيئا قدمه. وينظر عن أشأم منه فلا يرى إلا شيئا قدمه. فمن استطاع منكم أن يتقي النار ولو بشق تمرة، فليفعل)) واتە: هیچ کەسیٚك لە ئیٚوە نییە ئیللا خوای پەروەردگار قسەی لە گەڵدا دەکات کە بە هیچ شیٚوەیەك وەرگیٚڕ (ترجمان) لە نیٚوانیاندا نییە، تەماشای بەردەست و بەردەمی خۆی دەکات تەنها ئاگر دەبینیٚ، کاتیٚ تەماشای لای راستی خۆی دەکات هیچ نابینیٚ تەنها کردەوەکانی خۆی نەبیٚت، تەماشای لای چەپی خۆی دەکات هیچ نابینیٚ تەنها کردەوەکانی خۆی نەبیٚت، هەرکەسیٚك لە ئیٚوە توانی خۆی لە ئاگر بپاریٚزیٚت تەنانەت ئەگەر بە لەتە خورمایەکیش بوە ئەوا با بیکات و خۆی بپاریٚزیٚت)).

ئەمجار نامەی کردەوەکان بلاٚو دەبیٚتەوە، ئەگەر لە بەختەوەران بویت ئەوا دەبینی نامەی کردەوەکانت دەدریٚتە دەستی راستەوە و کتیٚبەکەت دەخویٚنیتەوە، ئەمجار خوای پەروەردگار قسەت لە گەڵدا دەکات و لە خۆی نزیکت دەکاتەوە، داوا لە خوا دەکەم من و هەموو برایەکی بەریٚز و هەموو خوشکیٚکی بەریٚز لەو بەختەوەرانە بگیٚڕیٚت.

هەروەکو لە هەردوو کتیٚبی (صحیح)[2] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابن عمر)ەوە کەوا خۆشەویست ﷺ دەفەرمویٚت: ((إن الله يدني المؤمن، فيضع عليه كنفه ويستره، فيقول: أتعرف ذنب كذا؟ أتعرف ذنب كذا؟ فيقول: نعم أي رب، حتى إذا

---

١ ـ أخرجه البخاري (٧٥١٢)واللفظ له وانظر (١٤١٣) و مسلم (١٠١٦/٦٧) .

٢ ـ أخرجه البخاري (٢٤٤١ , ٤٦٨٥ , ٦٠٧٠ , ٧٥١٤) و مسلم (٢٧٦٨) .

قرره بذنوبه، ورأى في نفسه أنه هلك، قال: سترتها عليك في الدنيا، وأنا أغفرها لك اليوم، وأما الكافر والمنافق، فيقول الأشهاد: ((هؤلاء الذين كذبوا على ربهم ألا لعنة الله على الظالمين))، واته: خوای گەورە بەندەی ئیماندار لە خۆی نزیك دەكاتەوە تا بە داپۆشین و لێبوردنی خۆی دایدەپۆشێت، پێی دەگوترێت: ئەو تاوانانە دەناسیتەوە؟ ئەو تاوانانە دەناسیتەوە؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ ئەی پەروەردگارا.. تاكو دان بە هەموو تاوانەكانی خۆیدا دەنێت، خۆی وا دەبینێتەوە كەوا بە هەلاكەتدا چوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ئەوە من لە دونیادا بۆم داپۆشیت و ئەمرۆش لێت خۆش دەبم، بەلام كەسی بێباوەڕ و دووڕوو، ئەوا لە پێش چاوی هەموو خەڵكی پێیان دەگوترێت: ﴿هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمْۚ أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾(هود: ١٨)).واتە: ئەمانە بوون ـــ لە دونیادا ـــ لە سەر پەروەردگاریان درۆیان كرد و هاوڕێ و هاوەڵیان بۆ دانا دەبا نەحلەت و نەفرینی خوا لە خەڵكانی ناهەقكار و ستەمكار بێت)) .

ئایە ئەو ئایەتەت خوێندووەتەوە كە دەفەرموێت: ﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلۡزَمۡنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِي عُنُقِهِۦۖ وَنُخۡرِجُ لَهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ كِتَٰبٗا يَلۡقَىٰهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ ٱقۡرَأۡ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفۡسِكَ ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكَ حَسِيبٗا ﴿١٤﴾ مَّنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ رَسُولٗا ﴿١٥﴾﴾ (الإسراء) واتە: ئیتر هەموو مرۆڤێكە كردەوەكەیمان ـ خێر و شەڕ كە لە شەو و ڕۆژدا كردنی ـ ئاوێزانی ملی كرد واتە: لە قیامەتدا نامەی هەموو كاروكردەوەی مرۆڤ وەك (تەوق) و ملوانكە دەكرێتە ملی و هەر بە پێی ئەوەش لە قیامەتدا پاداش و تۆڵە وەردەگرێتەوە، لە ڕۆژی قیامەتدا نامەیەكی ـ كە كردەوەكانی تیا نوسراوە ـ بۆ دەردێنین و ئەویش بە كراوەیی دەگا بەو نامەیە و لێی تێ دەگات.(١٣) پێی دەگوترێت: دەسا بۆ خۆت نامەی كردەوەكانت بخوێنەوە، ئەمرۆ ئیتر هەر تۆ خۆت حیساب لە گەڵ خۆت بكێشە و پێویست بە كەسی تر ناكا، ئەوجا ئەویش خوێندەوار بێت، یا نە، بۆ خۆی كارنامەكەی دەخوێنێتەوە و باش لە ئەنجام و جێ و شوێنی خۆی تێدەگات

(١٤) ئەوەی ڕێگای هەق و ڕاستی بگرێ، ئەوەبو خۆی شارەزا بوە، واتە: قازانج و پاداشەکەی هەر بۆ خۆی دەبێ و لەو ڕۆژەیشدا سەر فراز دەبێت، هەر کەسێکیش ڕێگە گوم بکا و لا ڕێ بێ، ئەوەش تەنها سەر لە خۆی دەکەوێ و زیان و تۆڵەکەی لە سەر خۆیەتی و هەر خۆی گیرۆدە دەبێت (١٥)

ئەو کتێبە هیچ کەتنێکی لە بیر نەکردوە ئەنجامت دابێت، یان هەر سەرپێچییەك شاردبێتەوە، هەموو شتێك باسکراوە و نوسراوەتەوە و تۆمارکراوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ (٧) وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ (٨)﴾(الزلزلة) واتە: ئینجا هەر کەسێك کێشی وردیلەیەك چاکەی ئەنجام دابێت، پاداشەکەی دەبینێتەوە.(٧) وە کەسێکیش کێشی وردیلەیەك شەر و خراپەی کردبێت، تۆڵەکەی دەبینێتەوە. مەگەر خوا قەڵەمی عەفوو بێنێ بە سەریا، کەوابوو با هەمووبمان هۆشیار و زیرەك و وریابین، بزانین ڕۆژانە چی ئەکەین و لە خوا بترسین.(٨)

سوێند بە خوا! خوای گەورە و بەتوانا لە دونیادا هەرگیز تاوانەکانی تۆی دانەپۆشیوە بۆ ئەوەی لە قیامەتدا ئابڕوت ببات، بەڵکو ئەو خۆی فەرموویەتی ـ هەروەکو لە پێشدا ئاماژەم پێ کرد ـ ((سترتها عليك في الدنيا، وأنا أغفرها لك اليوم)) ئەمجار کەسی ئیماندار لە گۆڕەپانی مەحشەردا بۆی دەردەچێت لە کاتێکدا کتێبەکەی گرتوەتە دەستی ڕاستییەوە، بە دوای کەس و کار و خۆشەویستان و هاوەڵانی خۆیدا دەگەڕێت، هەر کاتێك کەسێك ببینێ لەوانەی کە دەیناسێت، پێی دەڵێت: ((هَاؤُمُ اقْرَءُوا كِتَابِيَهْ)) ئا ئەوەتا کتێبەکەم بە دەستی ڕاست وەرگرتوە، لە گەڵ مندا کتێبەکەم بخوێننەوە، ئەمە یەکتاپەرستێکەمە، ئەمە نوێژەکەمە، ئەمە زەکاتەکەمە، ئەمە ڕۆژووەکەمە، ئەمە حەجەکەمە، ئەمە... ئەمە﴿هَاؤُمُ اقْرَءُوا كِتَابِيَهْ (١٩) إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَاقٍ حِسَابِيَهْ (٢٠) فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ (٢١) فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ (٢٢) قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ (٢٣) كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الْأَيَّامِ الْخَالِيَةِ (٢٤)﴾(الحاقة) واتە: ها ئەوەتە نامەکەم بگرن و بیخوێننەوە (چونکە کاتێ کە نامەکەی درایە دەستی

ڕاستی ئیتر هەر بەوەزانی بەختیارە، بۆیە بە سەر بەرزییەکەوە خۆی دەنوێنێ (١٩) چونکە بە ڕاستی من لە دونیادا ئەمزانی و یەقینم بوو کە دەگەم بە حیسابی خۆم!! وا ئەمڕۆش خوای میهرەبان پاداشتی بە چاکە دامەوە.(٢٠) ئەوە لە گوزەرانێکی خۆش و پەسەندکرا وایە (٢١) لە بەهەشتێکی بەرزدا (٢٢) میوەجاتی درەختەکانی نزیکە لێیەوە. واتە: دەس ڕەسە، بە ڕاوەستانەوە، بە دانیشتنەوە، دەستی ئەگاتێ، تەنانەت دەمیشی ئەگاتێ، خوای کارزان بە هیچ شێوەیەك نایەڵێ بەهەشتی ئەزیەت بکێشێ، پاش ئازار و ئەزیەتەکەی دونیای.(٢٣) پێیان ئەوترێ: بخۆن و بخۆنەوە بە خۆشی بە هۆی ئەو کارەجوان و چاکانەوە لە ڕۆژگارەکانی ڕابوردوودا ئەنجامتان دەدا بە کورتی: مرۆڤی بەهەشتی لەوپەڕی خۆشیدا دەبێ (٢٤)

بەڵام کەسی بێباوەڕ، ئەوا کتێبەکەی دەدرێتە دەستی چەپییەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَٰبِيَهْ ﴿٢٥﴾ وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ ﴿٢٦﴾ يَٰلَيْتَهَا كَانَتِ ٱلْقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنِّي مَالِيَهْ ۜ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّي سُلْطَٰنِيَهْ ﴿٢٩﴾﴾الحاقة، واتە: بەڵام ئەو کەسەی کارنامەکەی ئەدرێتە دەستی چەپی ـ کە ئەوەش نیشانەی بەدبەختییە ـ دەڵێ: خۆزگایە.. نامەکەم پێ نەدرابا (٢٥) نەمزانیبا سەرئەنجامی حیساب و لێپرسینەوەم چییە؟ (٢٦) خۆزگایە ئەم مردنەم برابایەوە بە یەکجاری و زیندووش نەکرامایەتەوە(٢٧) دارایی و ماڵەکەم هیچ کەڵکێکی پێ نەگەیاندم بۆ ئەم ڕۆژەم (٢٨) ئەو موڵك و دەسەڵاتەی بووم لە دەس چوو نە ڕشتەم نە پایەوپلەم، هیچیان نەیان توانی تۆزقاڵەیەك ئارامم بکەنەوە .(٢٩)

کوا سەروەت و سامان؟ کوا کەسایەتییەکەم؟ کوا کورسی؟ کوا پلە و پایە؟ ﴿مَآ أَغْنَىٰ عَنِّي مَالِيَهْ ۜ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّي سُلْطَٰنِيَهْ ﴿٢٩﴾ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلْجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَٱسْلُكُوهُ ﴿٣٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣٤﴾ فَلَيْسَ لَهُ ٱلْيَوْمَ هَٰهُنَا حَمِيمٌ ﴿٣٥﴾ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ ﴿٣٦﴾ لَّا يَأْكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلْخَٰطِـُٔونَ ﴿٣٧﴾﴾ (الحاقة) واتە: دارایی و ماڵەکەم هیچ کەڵکێکی پێ نەگەیاندم بۆ ئەم

ڕۆژەم.(٢٨) ئەو موڵك و دەسەڵاتەی بووم لە دەس چوو نە ڕشتەم نە پایەوپلەم، هیچیان نەیان توانی تۆزقاڵەیەك ئارامم بکەنەوە (٢٩) بیگرن، کەلەپچەی بکەن، واتە: کۆت و زنجیر لە دەس و قاچ و ملی بئاڵێنن (٣٠) پاشان بیخەنە ناو ئاگری دۆزەخ.(٣١) ئینجا بیخەنە ناو زنجیرێکی حەفتا گەزیەوە و توندی بکەن، بۆ ئەوەی پتر ریسوا بێت، ئەگینە خۆ تەنها ئاگرەکەی بەسە، ئای ئەو ڕۆژە چەندە ڕۆژێکی گران و ناڕەحەتە! وەرە لە ناو ئاگریشدا هێشتا بەو شێوەیە زنجیر بکرێیت!!(٣٢) چونکە ـ لە دونیادا ـ بڕوای بە خوا نەبوو کە ئەمەش گەورەترین ستەمە، بۆیە هەر دەبێ ئاوا سەر شۆڕو ڕیسوا بکرێ(٣٣) هانی خەڵکی نەدەدا لە سەر خواردن دان بە هەژار، چەند ئاینێکی بەرز و پیرۆزە..! سەرەرای ئەوەی دەبێ لە ماڵ و منالی خۆیان بگرنەوە بەر بۆ هەژاران، دەبێ مەردومیش هان بدەن بۆ بووژاندنەوەیان(٣٤) ئەمرۆش لێرە ـ واتە: ڕۆژی قیامەت ـ هیچ دۆستێکی بۆ نییە تا تکایەکی بۆ بکا و تۆزێ ئەو بارەیەی لێ سووك بکات(٣٥) خواردن و خواردنەوەشی هەر کیم و زوخاوی داچۆڕاوی لاشەی دۆزەخییەکانە(٣٦) گوناهباران نەبێ کەسی دیکە لێی ناخوات، واتە: هەر ئەوانە دەیخۆن کە باوەڕیان بە خوا نەبوو(٣٧).

شاعیر ڕاستی فەرمووە کاتێك دەڵێت:

تذكر وقوفك يوم العرض عرياناً ... مستوحشاً قلق الأحشاء حيراناً
والنار تلهب من غيظ ومن حنق ... على العصاة.. ورب العرش غضباناً
اقرأ كتابك يا عبدُ على مهل ... فهل ترى فيه حرفاً غير ما كانا؟
فلما قرأت ولم تنكر قراءته ... وأقررت إقرار من عرف الأشياء عرفانا
نادى الجليل.. خذوه يا ملائكتي ... وأمضوا بعبد عصى للنار عطشاناً

ئەی خودایە.. من و ئێوە لە یەکتاپەستان بگێڕی!!

خێراکە برا خۆشەویستەکەم... خوشکە بە حیشمەتەکەم...لێپرسینەوە لە گەڵ خۆتدا بکە پێش ئەوەی لە بەر دەستی خوادا لێپرسینەوەت لە گەڵدا بکەن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن

كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَاسِبِينَ ﴾ (الأنبيـــــاء: ٤٧) واتە: بێ گومان ڕۆژی قیامەت ئێمە ترازووی دادپەروەری دائەنێین و کردەوەکانیانی پێ ئەکێشین ئەوسا هیچ کەسێك کەمترین ستەمی لێ ناکرێ چ لە چاك کاران و چ لە خراپــەکاران، تەنانــەت ئەگــەر کردەوەکانیــانی بــە ئەنــدازەی ســەنگی دەنکــە گەردیلەیەکیش بێت کە لە بچووکیدا کراوە بە نموونە، ئێمە ئەیهێنین و ئامادەی ئەکەین وە ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە کە بە وردی ژمێریاری کردەوەکانیان بین)).

جا خوای گەورە پادشای حەق و دادپەروەرە، لە گەڵ ئەوەشدا لەو ڕۆژەدا بە دادپەروەرییەکی ڕەهاوە لێپرسینەوە لە گەڵ بەندەکانی خۆیدا ناکات، بەڵکو بە فەزڵی خۆی لە پاش دادپەروەری، چونکە ئەگەر بەدادپەروەری خۆی لێپرسینەوە و مامەڵەمان لە گەڵدا بکات ئەوا هەمووان بە هەلاکەتدا دەچین! لە گەڵ مندا بیر لەو ئایەتــە پــیرۆزە بکــەرەوە: ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّـٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴾ (فــصلت:٤٦) واتــە: پەروەردگاریشت هەرگیز غەدرباز و ستەمکار نییە لە بەندەکانی و بێ کەم و کورت پاداشتیان ئەداتەوە)).

هــەروەها دەفــەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ﴾(النــساء: ٤٠) واتــە: بــێ گومان خوا بە سەنگی بچووکترین گەردیلە (زەڕڕە) ستەم لە هیچ کەس ناکا)).

بە ڕاستی ئەوپەڕی دادپەروەرییە !!

خــوای گــەورە و کــارزان دەفــەرموێت: ﴿ أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِى صُحُفِ مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴿٣٧﴾ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿٣٨﴾ ﴾ (الــنجم) واتــە: ئایــا هــەواڵی پێنەدراوە بەوەی لە (سفر)ەکانی مووسا (٣٦) وە سحوفی (ئیبراهیم)ی وەفاداردا هاتوە (٣٧) کە هیچ کەسێك گوناهی یەکێکی تر هەڵناگرێت (٣٨).

جا هیچ مرۆڤێك تاوانی مرۆڤێکیتر هەڵناگرێت، بەڵکو لە ناسکترین و ڕەواترین دادپەروەری خوای گەورە، هێنانەوەی بیانوە بۆ بەندەکانی خۆی، بۆیە کار و کردەوەکانیان بە نوسراوی و تۆمارکراوی پێشکەشی خاوەنەکانیان دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا وَمَا عَمِلَتْ مِن

سُوٓءٖ تَوَدُّ لَوۡ أَنَّ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَهُۥٓ أَمَدَۢا بَعِيدٗاۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفۡسَهُۥۗ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴾ (آل عمران: ٣٠) واتە: بترسن لەو ڕۆژەی کە هەموو کەسێك هەر چاکەیەکی کردبێت! دۆسیەو پەروەندەی بۆ کراوە و دەیبینێ و پێی دلخۆش ئەبێت، هەر کارێکی خراپیشی کردبێت (دیسان دەیبینێ و ئاوات خوازە کە لە نێوان خۆی و کارەخراپەکانیدا مەوداو ماوەیەکی زۆر دوور ببوایە و هەر چاوی پێ نەکەوتبا، هەر لە سزای زاتی خوای گەورە دەبێت خۆتان بپارێزن و ئاگادار بن بەرێکو پێکی گوێڕایەڵی بکەن و خوا هەمیشە بەرامبەر بە بەندەکانی خۆی میهرەبان و دڵۆڤانە.))

چیتر نە من و نە تۆ هیچ بیانوویەك یان بەڵگەیەکمان نییە، چونکە کتێبەکە ئامادەیە و مەوجودە، تۆیش هەموو ئەوانەی کە لە سەرت نوسراوە دەیخوێنیتەوە، چەندەها بەڵا و تاوان هەبوو ئێمە لە پەنهانیدا ئەنجاممان دابوو ئێستا خوای گەورە هەمووی دەردەخات، پەشیمان بوونەوە بۆ خۆمان.. لەم کات و ساتەدا کە چەند بێ بایەخ بووین بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوای گەورە، لە گەڵ ئەوەشدا چەند شایەتێکش هەن! ! گەواهی لە سەر بەندەکە دەدەن؟ ئەو شایەتانە کێن؟ گەورەترین شایەت خوای گەورە خۆیەتی، هەروەکو خوای گەورە خۆی دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدًا ﴾ (النساء: ٣٣) بە ڕاستی خوا بە سەر هەموو شتێکا هەمیشە شایەت و ئاگادارە، هەر بە پێی ئەوەیش کە ئەو خەڵکە کردویانە تۆڵە و پاداش ئەداتەوە)).

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ يَوۡمَ يَبۡعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓاْۚ أَحۡصَىٰهُ ٱللَّهُ وَنَسُوهُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴾(المجادلة: ٦) واتە: ڕۆژێك خوا پێشینان و پاشینان، هەموو زیندوو دەکاتەوە ئینجا بە هەموو ئەو کاروکردەوانە کردوویانن ئاگاداریان دەکات، خوا ئاماری کردوەو نووسیویەتی لە سەریان، ئەوان لە بیریان چۆتەوە وە خوا شایەتە لە سەر هەموو شتێك، واتە: هیچ شتێکی لێ بزر نابێ)).

هەموو پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران شایەتن بە سەر ئوممەتەکەیانەوە، هەروەها ئوممەتەکەی خۆشەویستی خوا ﷺ شایەتن بە سەر هەموو ئوممەتەکانەوە،

هەروەها پێغەمبەری نازدار ﷺ شایەتە بە سەر هەموو ئوممەتەکانەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴾ (النساء: ٤١) واتە: ئەبێ حاڵی بێباوەڕان ئەو ڕۆژە چۆن بێ کە ئێمە لە هەر گەلێك شایەتێك دێنین شایەتییان لە سەر بدات، تۆش دەکەینە شایەت ئەی پێغەمبەرﷺ لە سەر هەموو ئەوانە)).

هەروەها فریشتەکان شایەتی دەدەن، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَائِقٌ وَشَهِيدٌ ﴾ (ق: ٢١)، واتە: ئەو ڕۆژە هەر کەسێك بۆ مەحشەر دێت، دوو فریشتەی لە گەڵدایە، یەکێکیان پێش خۆی داوە و دەیگەیەنێتە مەحشەر، ئەوی دیکەشیان شایەتی دەدا لە سەری بە کردەوەکانی)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَاتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴾ الإنفطار:١٠ـ ١٢، واتە: لە کاتێکدا ـ کە ئێوە ئەوەندەش لاسار و یاخین ـ دەستەیەك لە فریشتەی چاودێر و پارێزەرتان لە سەر دانراوە، هەرچی بکەن ئەینووسێ (١٠) ڕێزدارانێکی نووسەرن (١١) ئەزانن چی دەکەن، واتە: بە هەموو کارو کردەوەیەکتان بە ئاگان(١٢).

لە ڕیوایەتێکدا کە لە (سنن الترمذي)و جگە لەو هاتوە ــ بە سەنەدێکی کە(ضعف)[١]ی تێدایە، لە بەر پاراستنی سپاردەی زانستی (الأمانة العلمية) لە فەرموودەی (أبوهريره)وە دەربارەی ئەو ئایەتە، کە دەفەرموێت: ﴿﴿٣﴾ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا﴾ الزلزلة:٤.

قال الرسول: ((أتدرون ما أخبارها؟

قالوا: الله ورسوله أعلم.

---

١ ـ أخرجه أحمد في (المسند) (٢/٣٧٤) والترمذي باب (٧) (٢٤٢٩) وقال : حديث حسن غريب صحيح , وفي كتاب (تفسير القرآن ) (٣٣٥٣) وقال: حسن صحيح غريب، والنسائي في (الكبرى) (١١٦٩٣) وقال الشيخ الألباني : (ضعيف الإسناد) كما في (ضعيف سنن الترمذي) .

قال: ((فان أخبارها أن تشهد على كل عبدٍ أو أمةٍ بما عمل على ظهرها، أن تقول: عمل كذا وكذا يوم كذا وكذا، قال: فهذه أخبارها)) واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ئایا دەزانن هەواڵەکەی چییە؟ فەرموویان: خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ باشتر دەزانن، ئەویش فەرمووی: هەواڵەکەی ئەوەیە کە شایەتی دەدا بە سەر هەموو بەندەیەکەوە بە هەر کارێك لە سەر پشتی ئەنجامی دابێت، دەڵێت: لە فلانە ڕۆژ ئەو کارە و ئەو کارەی ئەنجام داوە، فەرمووی: ئەوە هەواڵەکەیەتی.))

ئەمجار تەماشای جورئەت و بوێری بەندە بکە لەو کات و ساتەدا و لە بەر دەستی خوای باڵادەستدا!

لە (صحيح مسلم)[١] دا هاتوە لە فەرموودەی (أنس)ەوە دەڵێت: ((كنا عند رسول الله فضحك، فقال:((هل تدرون مم أضحك؟))

قال: قلنا: الله ورسوله أعلم.

قال: ((من مخاطبة العبد ربه، يقول: يا رب، ألم تجرني من الظلم؟ قال: يقول: بلى، قال: فيقول: فاني لا أجيز على نفسي الا شاهداً مني، قال فيقول: كفى بنفسك اليوم عليك شهيداً، وبالكرام الكاتبين شهوداً، قال: فيختم على فيه)) واتە: لای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین، پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی و ئەمجار فەرمووی: ئایا دەزانن من بۆچی پێدەکەنم؟ وتیان: خوا و پێغەمبەرکەی ﷺ باشتر دەزانن، فەرمووی: لە گفتوگۆ کردنی بەندە لە گەڵ پەروەردگاریدا لە ڕۆژی قیامەت، دەڵێت: ئەی پەروەردگار ئایا تۆ پەنات نەدام لە ستەم لێکردن؟ خوای گەورەش دەفەرموێت: بەڵێ ئەویش دەڵێ: کەوابوو من ڕازی نابم کەس شایەتیم لەسەر بدات ئیللا لە خۆم نەبێت، خوای گەورەش دەفەرموێت: تۆ ئەمڕۆ بەستە کەوا تەنها خۆت شایەت بیت بە سەر خۆتەوە و فریشتەکان کە نوسەری کردەوەکانتن شایەت بن لە سەرت، دەڵێت: مۆر دەدرێتە سەر دەمیدا...))

ئەمجار خوای گەورە مۆڵەت دەداتە هەموو پەلەکانی و دێنە گوفتار، دەستەکان دێنە گوفتار و قسە دەکەن، هەروەها دامێن، سك، پێیەکان، هەموو ئەندامەکان شایەتی دەدەن.

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٩٦٩) .

خـــوای پـــەروەردگار دەفـــەرموێت: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ نَخۡتِمُ عَلَىٰٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَتُكَلِّمُنَآ أَيۡدِيهِمۡ وَتَشۡهَدُ أَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴾(یـــس: ٦٥) واتـــە: ئـــەمڕۆ (ڕۆژی قیامـــەت) مـــۆر دەدەیـــن بـــە ســـەردەمیاندا و نـــاتوانن بـــە زمـــان هـــیچ قـــسەیەك بكـــەن دەستەكانیشیان قسەمان لـە گـەڵ ئەكـەن پێیەكانیشیان شـایەتی دەدەن بـەوەی كردوویانە))

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَيَوۡمَ يُحۡشَرُ أَعۡدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمۡ يُوزَعُونَ ۝١٩ حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ عَلَيۡهِمۡ سَمۡعُهُمۡ وَأَبۡصَٰرُهُمۡ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ۝٢٠ وَقَالُواْ لِجُلُودِهِمۡ لِمَ شَهِدتُّمۡ عَلَيۡنَاۖ قَالُوٓاْ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنطَقَ كُلَّ شَيۡءٖ وَهُوَ خَلَقَكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ۝٢١ ﴾ (فصلت)، واتە: ئەی موحەممەد ﷺ باسی ئەو ڕۆژە بكە بۆ گەلەكەت كە نەیار ودوژمنانی خوا بەرەو ئاگری دۆزەخ كۆ ئەكرێنەوە، بە ریز ڕائەگێردرێن و دەستە دەستە بەرێ دەكرێن بۆ ئاگر، واتە: هەموو پێكەوە ریز دەكرێن و ئەیانبەن بۆ مەحشەر(١٩) هەتا كاتێ دەگەنە لای ئاگرەكە، گوێ و چاو و پێستیان گەواهییان لە دژ ئەدەن لە هەر كارێ كردوویانە.(٢٠) بە گلەییەوە بە پێستیان ئەڵێن: بۆچی بە زیانی ئێمە گەواهیتان دا؟ خۆ ئێمە لە ئێوە بەرگری ئەكەین! ئەڵێن: ئەو خوایەی كە هەموو شتێكی هێناوەتە قسەوكۆ، ئێمەیشی بە قسە هێنا، واتە: بە ئارەزووی خۆمان نەبوو، ئیتر بۆچی گلەییمان لێ ئەكەن؟ هەر ئەویشە بۆ یەكەمجار لە نەبوونەوە ئێوەی بە دی هێنا و هەر بۆ لای ئەویش دەگێردرێنەوە (٢١).

دەڵێت: ((فيختم على فيه، فيقال لأركانه: أنطقي، قال: فتنطق بأعماله، قال: ثم يخلى بينه و بين الكلام، قال: فيقول: بعداً لكن وسحقاً، فعنكن كنت أناضل)) واتـە: مۆر دەدرێتە سەر دەمیدا و بـە ئەندامـەكانی دەوترێت: بێنـە قـسەكردن، دەڵێت: هەموو كردەوەكانی باس دەكات، پاشان بواری پێ دەدرێت قسەی لە گەڵدا بكـات، ئەویش دەڵێت: دووری و تیاچوون بۆ ئێوە، ئەی خۆ من لـە پێنـاوی ئێـوەدا هـەوڵم دەدا)).

لە پاش ئەم هەموو بنەما دادپەروەریانە ئەمجار فەزڵی خوای گەورە پێشکەش بە یەکتاپەرست و ئیمانداران دەکرێت، خوای گەورە هەموو تاوانەکانیان دەگۆڕێت بە چاکە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ (الفرقان:٧٠) واتە: مەگەر کەسێك پەشیمان دەبێتەوە و بڕوا بێنێ و کاری چاك ئەنجام بدا ئا ئەو کەسانە خوا گوناه و خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە، وە هەمیشە خوا گوناه پۆش و میهرەبانە))

لە فەرموودەیەکی زۆر جوان و ناسکدا هاتوە لە (صحیح مسلم)[١] ریوایەت کراوە لە فەرموودەی (ابو ذر)ەوە لە باسی دوایین کەسێك کە دەچێتە بەهەشتەوە، دوایین کەسێك لە دۆزەخ دەردەچێت، لەو فەرموودەیەدا هاتوە کەوا خۆشەویستﷺ دەفەرموێ: ((رجل یؤتی به یوم القیامة. فیقال: اعرضوا علیه صغار ذنوبه وارفعوا عنه کبارها. فتعرض علیه صغار ذنوبه. فیقال: عملت یوم کذا وکذا، کذا وکذا. وعملت یوم کذا وکذا، کذا وکذا. فیقول: نعم. لا یستطیع أن ینکر. وهو مشفق من کبار ذنوبه أن تعرض علیه.)) واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا کابرایەك دەهێنن و پێی دەگوترێت: تاوانە بچووکەکانی پیشان بدەن و گەورەکانی لەسەر هەڵگرن، ئەمجار هەموو تاوانە بچووکەکانی پیشان دەدرێت و پێی دەگوترێت: فلانە ڕۆژ ئەو کارە و ئەو کارەت ئەنجام داوە و فلانە ڕۆژ ئەو کارە و کارەت ئەنجام داوە، ئەویش دەڵێت: بەڵێ.. ناتوانێ نکۆڵی لێ بکات، لە کاتێکدا ئەو لە تاوانە گەورەکانی خۆی دەترسێت و پیشانی بدرێت))

تەنها ئەو تاوانە بچووکانەی کە بەندەکە هەندێکی لە بیرکردوە و هەندێکی لە بیر ماوە ئێستا هەمووی نوسراوە و مەوجودە، ئەو لەوە دەترسێت تاوانە گەورەکانی نمایش بکرێت و بخرێتە ڕوو، لەو کاتەی ئەو لەو حاڵە ترس و بیمەدایە ((فیقال له: فان لك مكان كل سيئة حسنة))، واتە: پێی دەگوترێت: ئەوا لە جێی

١ ـ أخرجه مسلم (١٩٠) .

هەر خراپەیەك خوای گەورە چاکەیەکی بۆدانای))ئەمجار بەندەکە لێرەدا دەوێرێت و جورئەت دەکات ((فيقول: رب قد عملت أشياء لا أراها ها هنا)) واتە: دەڵێت: پەروەردگارا.. من چەندەها کارم ئەنجام داوە کەچی لێرەدا هیچ لەوانە نابینم)) دەیەوێ ئەو تاوانانەش بگۆڕدرێت بە چاکە، جارێکی تر یەکتاپەرستان فەزڵیان بەرز دەبێتەوە و چاکەکانیان چەند جاران دەبێتەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَاۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَا وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ﴾ (الأنعام: ١٦٠) واتە: هەر کەسێك لەم دونیایەدا چاکەیەك بکا، لە ڕۆژی قیامەتدا دە بەرامبەر چاکەی لە گەڵ دەکرێتەوە، هەر کەسێکیش خراپە بکا تەنها بە ئەندازەی ئەو خراپەیە تۆڵە و جەزرەبە ئەدرێ، واتە: زیاد لە تاوانەکەی خۆی تۆڵە نادرێ بە سەریا وەکو دەفەرموێ: بە هیچ شێوەیەکیش ستەم لە هیچ کەسێکیان ناکرێت)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتۡ سَبۡعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٖ مِّاْئَةُ حَبَّةٖۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾(البقرة٢٦١)، واتە: نموونەی ئەو کەسانەی کە دارایی خۆیان لە ڕێگەی خوادا ئەبەخشن، هەر وەکو دانە تۆمێك کە حەوت گوڵ دەردەکا و هەر گوڵەی سەد دانەی تێدا بێ کەوابوو تەنها دانە تۆمێك (٧٠٠) دەنکی پێوە دەبێ، واتە: پاداشتی گشت خێر و چاکەیەك بە لای خواوە یەك بەدە، تا حەوت سەدە و هێشتا بۆ هەر کەسیش خوا خۆی بیەوێ چەند بەرامبەر پاداش دەدا چونکە خوا بەخششی یەکجار فراوانە، زۆر بە ئاگا و زانایە (ئەزانێ چەندە هەڵئەگرێ).))

لە (مسند أحمد) دا بە سەنەدێکی (حسن)[1] هاتوە لە فەرموودەی (ابو ذر)ەوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((قال الله تعالى: الحسنة بعشر أمثالها أو أزيد، والسيئة بواحدة أو أغفر، ولو لقيتني بقراب الأرض خطايا ما لم تشرك بي، لقيتك بقرابها مغفرة)) واتە: خوای گەورە دەفەرموێت: چاکە و حەسنە بە دە ئەوەندە یا

---

١ ـ أخرجه أحمد في (المسند) (١٤٨/٥) والطيالسي في (مسنده) (٤٦٤) وحسّن إسناده الشيخ شعيب لأجل عاصم وهو صحيح لشواهده .

زیاتر دەینوسم و خراپە (سیئە) بە تەنها یەکێك دەینوسم و یان لێی خۆش دەبم، ئەگەر بە ئەندازەی هەموو زەوی بە تاوانەوە پێم بگەی و بە من گەیشتی هاوەڵت بۆ من بڕیار نەدابوو ئەوا بە ئەندازەی هەموو زەوی بە لێ خۆش بوونەوەوە پێت دەگەم)).

لە (صحیح البخاری و مسلم)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابن عباس)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: خوای گەورە دەفەرموێت: ((فمن هم بحسنة فلم يعملها كتبها الله عنده حسنة كاملة، وان هم بها فعملها كتبها الله عنده عشر حسنات الى سبع مائة ضعف الى أضعاف كثيرة، و ان هم بسيئة فلم يعملها كتبها الله عنده حسنة كاملة، وان هم بها فعملها كتبها الله سيئة واحدة)) واتە: هەرکەسێك ویستی چاکەیەك ئەنجام بدات و ئەنجامی نەدا ئەوا خوای گەورە بە چاکەیەکی بێ کەم و کوڕی دەینوسێ و هەرکەسێك ویستی کارێك ئەنجام بدات و ئەنجامی دا ئەوا خوای گەورە دە ئەوەندەی بۆ دەنوسێ تا حەوت سەد ئەوەندە تا چەندەها جاری زۆر، هەرکەسێك ویستی خراپەیەك ئەنجام بدات و ئەنجامی نەدا ئەوا خوای گەورە بە چاکەیەکی بێ کەم و کوڕی دەینوسێ و هەرکەسێك ویستی خراپەیەك ئەنجام بدا و ئەنجامیدا ئەوا خوای گەورە تەنها یەك خراپەی بۆ دەنوسێ)).

تەماشی فەزڵ و چاکەی خوای گەورە بکە بە سەر بەندەکانییەوە، ئەمە بنەما گشتییەکانی لێپرسینەوە بوو، ئاخۆ یەکەم کۆمەڵێك کە لێپرسینەوەیان لە گەڵدا دەکرێت لە بەر دەستی خوادا کێن؟ یەکەم کۆمەڵ و گروویەك کە حوکمیان بە سەردا دەدرێت لەم ئوممەتە کێن؟ ئایە یەکەم شتێك بەندەکان لێپرسینەوەیان لە سەر بکرێت لە بەر دەستی خوادا چییە؟ یەکەم شتێك خوای گەوەر حوکمی لە سەر بدات لە نێوان بەندەکاندا چییە؟ وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە لە بەشی داهاتوودا دەزانین انشاء الله.

داوا لە خوا دەکەم ئێمە و ئێوە داپۆشێت لە دونیا و قیامەتدا، هەموو کار و کردەوە چاکەکانمان لێ وەرگرێت، هەر خۆی پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

---

١ ـ أخرجه البخاري (٦٤٩١) و مسلم (١٣١) .

# یەکەم کۆمەڵێك داوەرییان لە نێواندا دەکرێت

# أول من يقضى بينهم يوم القيامة

لە بەشی رابوردوودا بنەماکانی دادپەروەری و فەزڵی خوای گەورەمان زانی، ئەو بنەمایانەی کە خوای گەورە بەندەکان لێپرسینەوەیان لە سەر دەکرێت لە رۆژی قیامەت، لە کۆتایی بەشی رابووردوودا پرسیارێکم کرد ئەویش بریتی بوو لە: ئایە یەکەم کۆمەڵ و گرووپەك کێن کە بانگیان لێ دەکرێت بە مەبەستی لێپرسینەوە، بۆ ئەوەی ترس و بیمی ئەو بارودۆخەیان لە سەر سووك بکرێت؟

بۆ وڵامی ئەو پرسیارە دەڵێین: ئەوە ئوممەتی پێغەمبەری نازدارە ﷺ، بەڵێ.. گەورەیی و رەحمەتی خوای گەورە لەو کاتەدا بۆ ئەم ئوممەتە دەردەکەوێت کاتێ ئەم ئوممەتە پێش دەخرێت بە مەبەستی لێپرسینەوە، هەڵوێست و بارودۆخی ئوممەتان لە گۆڕەپانی مەحشەردا و لە رۆژی مەحشەردا بە راستی بارودۆخێکی زۆر سەخت و دژوارە، رۆژ نزیککراوەتەوە بۆ سەر سەری بەندەکان، خەڵکی بە ئەندازەی کردەوەکانیان نوقمی ئارەقە بوون، لەولاشەوە دۆزەخ هاوار دەکات و دەناڵێنێت و تووڕە بوە لە بەر تووڕە بوون و پەستی خوای گەورە، هەموو پێغەمبەران دەڵێن: ((نفسی نفسی)) بە راستی بارودۆخەکە دژوار و ناهەموارە، هیچ کەسێك ناتوانێت.. هەرچەندە خوای گەورە ئەوپەڕی زمان پاراوی پێ بەخشیبێت، ئەوپەڕی شێوازی رەوانبێژی جوانی پێ بەخشیبێت، ئەوپەڕی شیرینی گوفتار و وشەسازی پێ بەخشیبێت، ناتوانێت بە جوانی ترس و بیمی ئەو کات و ساتەی بەر دەستی خوای گەورە بەرجەستە بکات، بەڵێ.. لە سایەی ئەو کات و ساتەدا بانگ لە ئوممەتی(محمدالمصطفى)ﷺ دەکرێت ـ دایك و باوك و گیانم بە فیدای بێت ـ.

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتوە، لە فەرموودەی (أبو هريرە) وە

---

١ ـ أخرجه البخاري (٨٧٦) وانظر (٢٣٨) مسلم (٨٥٥) .

دەفـەرموێت، پێغەمبـەری خـواﷺ فەرموویـەتی: ((نحـن الآخـرون الـسابقون يـوم القيامة)) واتە: ئێمە دوایین ئوممەتین (لە دونیادا) لە قیامەتیشدا یەکەمین)).

ئەمە چ ڕێز و شەرەفێکە؟ دوایین ئوممەتێك ئوممەتی پێغەمبـەری نـازدارە ﷺ، لە هەمان کاتدا یەکـەم ئوممەتێکـە پـێش دەخرێـت بـۆ لێپرسـینەوە، بـەڵکو یەکـەم ئوممەتێکە دەچێتە بەهەشتەوە بە فەرمانی پادشای باڵادەست و دلۆڤان.

لە ریوایەتەکەی (صحیح مسلم)[1]دا هاتوە: ((نحن الآخرون الأولـون يـوم القيامـة)) واتە: ئێمە دوایین ئوممەتین (لە دونیادا) لە قیامەتیشدا یەکەمین)).

لە ریوایەتێکی (ابن ماجه)[2]دا بە سەنەدێکی (صحیح) هاتوە لە فـەرمودەی (ابـن عباس)ەوە کەوا خۆشەویـستی خـواﷺ فەرموویـەتی: ((نحـن آخـر الأمـم، وأول مـن يحاسب، يقال: أين الأمة الأمية ونبيها؟ فنحن الآخرون الأولـون)) واتـە: ئێمـە دوایـین ئوممـەتین (لـو دونیـادا) و یەکـەم ئوممـەتین لێپرسـینەوەیان لـە گەڵـدا دەکرێـت، دەگوترێـت: لـە کوێن ئوممەتـە نەخوێندەوارەکـە و پێغەمبەرکـەیان؟ ئێمـە دوایـین ئوممەتین لە دونیادا و یەکەمین ئوممەتین لە قیامەتدا)).

هەروەها لە ریوایەتێکی تردا لە (ابـن عبـاس)[3]ەوە دەڵێـت: پێغەمبـەری خـواﷺ فەرموویەتی: ((فتُفرِّج لنا الأمم عن طريقنا، فنمضي غـراً محجلـين مـن آثـار الطهـور، فتقول الأمم: كـادت هـذه الأمـة أن تكـون أنبيـاء كلـها)) واتـە: هـەموو ئوممەتـەکان ڕێگامان بۆ واڵا دەکەن و ئێمەش دەڕۆین لە کاتێکدا هـەموان نێـو چـاوان و هـەردوو پێمان سپییە لە بەر شوێنەواری دەستنوێژ، ئوممەتان دەڵێن: دەڵێی ئـەم ئوممەتـە هەموان پێغەمبەرن!!))

ئەمە ئەو ئوممەتەیە کە پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکانی بە تەنها ناسیوە.

جـا ئوممـەتی (موحەممـەد)ی خۆشەویـست ﷺ، ڕێزدارتـرین ئوممـەت بـوە و ئێـستاش وا بـەڕێزە و هـەرواش بـە ڕێـزداری دەمێنێتـەوە، هـەروەها پایـەدارترین

---

١ ـ صحيح مسلم (٨٥٥/٢٠).

٢ ـ أخرجه ابن ماجه (٤٢٩٠) وقال البوصيري: (هذا إسناد صحيح، رجاله ثقات) وكذا قال الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٢٣٧٤).

٣ ـ أخرجه أحمد في (مسنده) (٢٨١/١، ٢٩٥) وأبـو يعلـى في (مسنده) (٢١٣/٤) (٢٣٢٨) وحسنه لغيره الشيخ شعيب في (تحقيق المسند).

ئوممەتە لە دونیا و قیامەتدا، لە گەڵ ئەو هەموو لاوازی و سستییەی لەم قۆناغەدا پێیدا تێدەپەڕێت!! ڕۆژگار دەستا ودەستە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾آل عمران: ١٤٠، واتە: ئێمە ئەوڕۆژگارەی سەرکەوتن و تێکشکانە، لە نێو مەردمدا دەستاو دەستی پێ دەکەین ڕۆژێ بۆ ئێوەیە و ڕۆژێکیش بۆ ئەوان)).

جا ئەگەر ئەم ئوممەتە ئێستا بە قۆناغێکی لاوازیدا تێدەپەڕێت، ئەوا چەندەها سەردەم بوە ئەم ئوممەتە خاوەن هێز و دەسەڵات بوە و بە قۆناغی پڕ سەروەریدا تێپەڕیوە[١].

---

١ ـ من بە هەموو باوەڕێکەوە دەڵێم: کەوا قۆناغی داهاتوو بۆ ئوممەتی موحەممەدە ﷺ ئەوەش باش بزانە کە تاریکترین کاتی شەو ئەو کاتەیە کە روناکی گزنگی بە دواوەیە دڵنیابە کە گزنگ و سپیدەی دینی خوا بەڕێوەیە بە پشتیوانی خوای گەورە و بە بەڵێنی خۆی، هەروەها بە بەڵێنی پێغەمبەری راستگۆﷺ کە هەرگیز لە خۆوە قسەناکات، ئوممەتی موحەممەد ﷺباشترین و بەڕێزترین ئوممەتە , هەموو ئوممەتێك لە سەر رووی زەویدا شانازی بە خۆی و مێژوویەوە دەکات بەڵکو گۆرانی بە باڵای ناودارەکانیانەوە دەڵێن، بەڵکو گۆرانی بە مێژووی خۆیانەوە دەڵێن، رەنگە مێژووەکەشی زۆر رەش و پڕ شەرمەزاری بێت، بۆیە شایستە ترین ئوممەتی سەر رووی زەوی کە شایانی پێشەنگی و شانازی و فەخر بێت ئەوە ئوممەتی پێغەمبەری نازدارە ﷺ بە شایەتی خوای پەروەردگار، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾آل عمران: ١١٠، ئەگەر دەتەوێت برا شیرینەکەم ڕێز و پلەو پایەی ئەم ئوممەتە بزانیت ئەوا تەماشایەکی هەموو ئوممەتەکانی سەر زەوی بکە بە بێ جیاوازی لە رۆژهەڵات یان لە رۆژئاوا یان لە هەر پارچەیەکی سەر رووی زەوی , سوێند بە خوا هیچ ئوممەتێك نادۆزیتەوە کە ئەو مەبەستە بهێننە دی کە خوای گەورە زەوی و ئاسمانەکانی لەو پێناوەدا دروستکردوە، بەهەشت و دۆزەخی دروستکردوە، لە پێناویدا کتێبی دابەزاندوە و پێغەمبەرانی رەوانە کردوە، هیچ ئوممەتێك نادۆزیتەوە کە یەکتاپەرستی خوا جێبەجێ بکەن تەنها ئوممەتی پێغەمبەری خواﷺ نەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت : ((أفمن كان مؤمناً كمن كان فاسقاً لا يستوُن)) هەندێ خەڵکی هەن دەڵێن: واز لەو قسە بێ نرخانە بهێنە. بۆیە باش بزانە کە هەر شارستانییەتێکی ماددی بە بێ دین و ڕەوشت و زانست و پێشکەوتن هیچ بایەخێکی نییە.

دەڵێم: من هەرگیز لە نرخ و بەهای زانست کەم ناکەمەوە، چونکە من دەروێش نیم لە خۆمەوە قسە بکەم و نەزانم چی دەڵێم ، نەخێر، چونکە ئوممەتەکەی ئێمە ئوممەتی زانستە و یەکەم ئایەتێك بۆ سەر دڵی پێغەمبەری خواﷺ دابەزی بانگەوازی بۆ زانست دەکرد (( اقرأ)).

دەڵێم: شارستانییەت دوو کۆڵەکەی هەیە : کۆڵەکەیەکی ماددی و کۆڵەکەیەکی ئیمانی و رەوشت , هەر شارستانییەتێك بە بێ ئەو کۆڵەکەیە هیچ نرخ و بەها و ڕێزێکی نییە، ئایا نرخی ئەو هەموو چەکە چییە کە ئێستا مرۆڤایەتی لە ناو دەبات؟ ئایا ئەو پێشکەوتنە چی بایەخێکی هەیە کە لە نێوان شەو و رۆژێکدا مرۆڤایەتی لە ناو دەبات؟ ئایا نرخ و بەهای شارستانییەت چییە بە بێ رۆح، بە بێ ویژدان بە بێ ئیمان، بە بێ یەکتاپەرستی، بە بێ رەوشت، بە بێ ناسینی پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ و هەموو براکانی لە پێغەمبەران ؟ ئایا

جارێكی تر لەگەڵ مندا بگەڕێوە بۆ لای ئەو ئوممەتە پیرۆزە كە پلەو پایەی ئەو كاتە دەردەكەوێت كاتێك بانگی لێ دەكرێت بۆ ئەوەی شایەتی بە سەر هەموو ئوممەتانەوە بدات، لە گەڵ ئەوەشدا ئێمە تەنها یەك ئوممەت لەو ئوممەتانەمان نەدیوە و پێیان نەگەیشتووین، بەڵام ((ذلِكَ فَضلُ اللهِ يؤتيهِ مَن يَشاءُ)) الجمعة: ٤)) واتە: ئەوە شەرەف و فەزڵ و بەهرەی خوایە، ویستی لە هەر كەسێك ببێ، پێی دەبەخشێت)).

پرسیارەكە لێرەدا ئەوەیە: ئایە چۆن شایەتی دەدەین بە سەر ئوممەتاندا و لە كاتێكدا ئێمە بەوان نەگەیشتووین و ئەوانمان نەبینیوە؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێین: بەسە بۆ تۆ كە باوەڕی بتەوت هێناوە بەوەی كە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ باسی كردوە، ئەو كەسەی كە هەرگیز لە خۆوە قسە ناكات، چونكە كەسی ئیماندار باوەڕی تەواوی هەیە بە هەموو وشە پیرۆزەكانی پێغەمبەرﷺ لەوەی زیاتر كە بە چاوەكانی خۆی دەیبینێ و بە گوێیەكانی دەیبیسێ، بە ڕاستی ئەوە ئیمانداری تەواوە بە خوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ.

---

نرخ و بەهای ئەوشارستانییەتە چییە؟ شارستانییەتی ڕاستەقینە شارستانییەتە لە ڕەوشتدا، لە دانپێنان بە پەروەردگارەكەی، لەباوەڕهێنان بە پەروەردگارەكەی، لەدانپێنان بە هەموو پێغەمبەرانی، ئەوانەی كە ئاشتی و سەلامەتیان پێشكەشی مرۆڤایەتی كردوە، ئەمان و ئاسایش، ڕەوشت و بەهای جوان، نەك خوێن ڕشتن و پارچە پارچە كردنی لاشەكان و ڕوخانی خانوو و نەهێشتنی كێڵگە و كارگە و قوتابخانە، ئوممەتی موحەممەدﷺ ڕێزدارترین ئوممەتە و هەروا بە بەرزی دەمێنێتەوە تا قیامەت، بۆیە سەرت بەرز بكەرەوە بۆ ئەوەی ململانێ لە گەڵ ئەستێرەی جەوزادا بكات، هەستە بە هەموو باوەر و قەناعەتێكەوە، هەموو جیهان بهێنە جۆش و خرۆش و با لێدانی دڵت ببیسن كە بڕیاری یەكتاپەرستی خوای داوە، هەستە هەموو جیهان بهێنە ژێر عابا بۆن خۆشەكەی پێغەمبەرەوەﷺ.

وكدت بأخمصي أطأ الثريا　　　ومما زادني فخراً وتيهـــا
وأن صيرت أحمد لي نبيا　　　دخولي تحت قولك يا عبادي

كێ وەك تۆیە ئەی برای یەكتاپەرست؟ سەرت بەرزبكەوە و شانازی بە ئیمانەكەتەوە بكە بە یەكتاپەرستییەكەتەوە، بە دینەكەتەوە، بە شوێنكەوتنی پێغەمبەركەتەوەﷺ، ئەمجار ئەو فەخر و شانازییە لە گۆڕەپانی كاركردندا جێ بەجێی بكە دوور لە تیور و قسەی زل، بە ڕەوشتت شایەتی بەو شوێنكەوتن و خۆدانەپاڵ ئەم دینە بدە، بە داهێنانت، بە بەخشینت، بە بەرهەمت، بە كاركردنت لە هەموو بوارەكانی ژیانەوە.

ئەی خودایە! ئەم ئوممەتە لە هەموو بەڵا و خراپەیەك بپارێزە، خودایە! ڕەحم بە ئوممەتی موحەممەدﷺ بكە و هەموو خەفەت و كێشە و نارەحەتی و ناخۆشییەكی لە سەر لابە ئەی خوای گەورە و میهرەبان.

له (صحيح البخاری)[1] دا هاتوه له فـهرموودهى (أبـو سـعيد الخـدرى) يـهوه كـهوا خۆشهويست ﷺ فهرموويهتى: ((يدعى نوح يـوم القيامـة فيقـول: لبيـك وسـعديك يـا رب، فيقول: هل بلغت؟ ـ وهو أعلم جل جلاله ـ فيقول: نعـم، فيقـال لأمتـه: هـل بلغكم؟ فيقولون: ما أتانا من نـذير، فيقـول: مـن يـشهد لـك؟ فيقـول: محمـدو أمتـه، فتشهدون أنه قد بلغ)) واته: له رۆژى قيامهتـدا بـانگ لـه (نـووح) دهكريّـت، ئـهويش دهلّيّت: گويّڕايهلّم و له خزمهتتام ئهى پهروهردگارا..ئهويش دهلّيّـت: ئايـا دينهكـهت گهياند؟ ـ له كاتيّكدا خـواى گـهوره خـۆى باشـتر دهزانيّـت ـ ئـهويش دهلّيّـت: بهلّىّ، ئهمجار به ئوممهتهكهى دهلّيّن: ئايا دينهكهى پىّ گهيانـدن؟ ئـهوانش دهلّـيّن: هـيچ ترسـيّنهريّكان پـىّ نهگهيـشتوه ((سـويّند بـه خـوا هـهرگيز نـهمانبينوه و نهماننـاسـيوه ئـهمجار خـواى گـهوره بـه نـووح دهلّيّـت)): كـىّ شـايهتيت بـۆ دهدا؟ ئهويش دهلّيّت: موحهممـهد و ﷺ ئوممهتهكـهى، ئيّـوهش شـايهتى بـۆ دهدهن كـهوا دينهكهى گهياندوه)).

له ڕيوايهتيّكى تردا كه له (سنن ابن ماجه)دا هاتوه به سـهنهديّكى (صـحيح)[2] لـه (أبو سعيد) هوه دهفهرمويّت: پيّغهمبهرى خوا ﷺ فهرموويهتى: ((يجيء النبي ومعه الرجل، ويجيء النبي ومعه الرجلان، ويجيء النبي ومعه الثلاثة،وأكثر من ذلك، وأقـل، فيقال له: هل بلغت قومك،فيقول: نعم، فيدعى قومه، فيقال: هل بلغكم، فيقولون: لا، فيقال: من يشهد لك، فيقول: محمدو أمته،؛فتدعى أمة محمد، فيقـال: هـل بلـغ هـذا؟ فيقولون: نعم. فيقول: وما علمكم بذلك فيقولون: أخبرنـا نبينـا بـذلك، أن الرسـل قـد بلغوا فصدقناه. قـال: فـذلكم قولـه تعـالى: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴾ (البقـرة: ١٤٣) واتـه: لـه ڕۆژى قيامهتدا پيّغهمبهر دههيّنن تهنها يهك پياوى له گهلّدايه، پيّغهمبهر ههيه دوو پيـاوى له گهلّدايه، پيّغهمبهر دههيّنن سىّ كهسى لـه گهلّدايـه، لـهوه زيـاتر و لـهوه كـهمتر، پيّـى دهگوتريّـت: ئايـا بانگهوازهكـهت گهيانـده قهومهكـهت؟ ئـهويش دهلّـىّ: بـهلّىّ،

---

١ ـ أخرجه البخاري (٤٤٨٧) و (٣٣٣٩) .

٢ ـ أخرجه ابن ماجه (٤٢٨٤) وصححه الشيخ الألباني في ( صحيح سنن ابن ماجه ) .

ئەمجار بانگی قەومەکەی دەکەن و پێیان دەگوترێت: ئایا بانگەوازەکەی پێ گەیاندن؟ ئەوانیش دەڵێن: نەخێر، ئەمجار بە پێغەمبەرەکە دەگوترێت: کێ شایەتی تۆیە کە دینەکەت گەیاندوە؟ ئەویش دەڵێت: موحەممەد و ئوممەتەکەی، ئەمجار بانگی ئوممەتی موحەممەد دەکرێت و پێیان دەگوترێت: ئایا ئەم پێغەمبەرە دینەکەی خوای گەیاند؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ، دەڵێت: ئێوە چۆن دەزانن؟ ئەوانیش دەڵێن: پێغەمبەرەکەمان ﷺ باسی بۆ کردووین و پێی راگەیاندوین، کەوا هەموو پێغەمبەران دینەکەی خوایان گەیاند و ئێمەش باوەڕمان پێ کرد، ئەمجار فەرمووی: ئەوە مانای ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴾ البقرة(١٤٣)) واتە: هەرچۆنێ بۆ ئایینی پیرۆزی ئیسلام ڕێنماییمان کردن، هەر ئاواش لە تەواوی ئیش و کاردا کردومانن بە ئوممەت و گەلێکی میانەڕەو واتە: ئێوە ئەی موسڵمانان! نە وەکو گاورەکان (نصاری) زێدە ڕەون و نەوەکو جوولەکەش کەمتەرخەمن، کەوابوو ئێوە ئوممەتێکی خێرخواز و هەڵبژێردراون، تا لەسەر ئەو خەڵکە ببنە شایەت کە: بەڵێ.. پەیامبەرﷺ پەیامەکەی خوای گەورەی بەراست و ڕەوان گەیاند و پەیامبەریشﷺ بەسەر گشتانەوە چاودێر و شایەت بێت ئاخۆ کێ دوای کەوتوە و کێیش سەرپێچی لێ کرد، لە ڕۆژی قیامەتیشدا لەولاشەوە هەم پێغەمبەر و هەم ئوممەتەکەی ببنە شایەت بۆ پێغەمبەران کە بەرنامەکەی خوایان گەیاند بە ئوممەتەکەیان)).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍۭ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴾ (النساء: ٤١) واتە: ئەبێ حاڵی بێباوەڕان ئەو ڕۆژە چۆن بێ کە ئێمە لە هەر گەلێك شایەتێك دێنین شایەتییان لە سەر بدات، تۆش دەکەینە شایەت ئەی پێغەمبەرﷺ لە سەر هەموو ئەوانە)).

برای بەڕێزم.. بۆ ئەوەی ڕێز و پلە و پایەی خۆت و ئوممەتە پیرۆزەکەت بزانی. ئیمامی (موسلیم) لە (صحیح)[١]ەکەیدا ریوایەتی کردوە لە فەرموودەی (أبو

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٤٩) .

هريره)ەوە کەوا خۆشەویست ﷺ هاتە سەر گۆڕستان ـ واتە: چوو بۆ لای بەقیع ـ فەرمووی: ((السلام عليكم دار قوم مؤمنين. وإنا، إن شاء الله بكم لاحقون. وددت أنا قد رأينا إخواننا" قال الصحابة: أولسنا إخوانك يا رسول الله؟ قال "أنتم أصحابي. وإخواننا الذين لم يأتوا بعد". فقالوا: كيف تعرف من لم يأت بعد من أمتك يا رسول الله؟ فقال "أرأيت لو أن رجلا له خيل غر محجلة. بين ظهري خيل دهم بهم. ألا يعرف خيله؟" قالوا: بلى. يا رسول الله! قال "فإنهم يأتون غرا محجلين من الوضوء)).

واتە: سڵاوتان لێ بێت ئەیماڵی قەومی ئیمانداران، ئێمەش ئەگەر خوا بیەوێت شوێنتان دەکەوین پێتان دەگەین، حەزم دەکرد براکانم بدیبایە)) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی ئێمە برای تۆ نین؟ فەرمووی: بەڵکو ئێوە هاوەڵی منن، براکانم ئەوانەن کە هێشتا نەهاتوون)) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن کەسانێك دەناسیتەوە لە ئوممەتت کە هێشتا نەهاتوون)) فەرمووی: ئەگەر پیاوێك ئەسپێکی کوێتی (ناو چاو و دەست و پێ سپی) هەبێت لە ناو کۆمەڵێك ئەسپی رەشی تۆخدا بێت، ئایا ئەسپەکەی خۆی ناناسێتەوە؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دە ئەوانیش رۆژی قیامەت بە ناوچاوی جوان و دەست و پێی سپییەوە، بە هۆی دەستنوێژەوە دێن))

ئای ئەوە چ شەرەفێکە!! ئەوە چ رێز و پلە و پایەیەکە!!

مانای (الغرە): ئەو تووك و پۆپە سپییە جوانەیە کە دەکەوێتە ناوچەوانی ئەسپەوە، هەروەها مانای (التحجیل) ئەو تووکە سپییە جوانەیە کە دەکەوێت سەر پێی ئەسپەوە لە خوارەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أرأيت لو أن رجلا له خيل غر محجلة. بين ظهري خيل دهم بهم. ألا يعرف خيله؟"

قالوا: بلى. يا رسول الله! قال "فإنهم يأتون غرا محجلين من الوضوء.))

واتە: بە هۆی شوێنەواری دەستنوێژەوە! بۆیە پارێزگاری لە دەستنوێژ بکە، هەردەم با دەست بە دەستنوێژ بیت، هەر کاتێك لە ماڵ دەرچویت با دەستنوێژت هەبێت، لە (مسند أحمد)و (سنن ابن ماجە و الدارمي)و (مستدرك الحاكم) و جگە

لەوان[1] هاتوە لە (ثوبان)ەوە کەوا خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: ((... ولا يحافظ على الوضوء الا مؤمن))، واتە:... وە هیچ کەسێك پارێزگاری لە دەستنوێژەکەی ناکات ئیللا کەسی ئیماندار نەبێت))

هەر کە دەستنوێژەکەت لە دەستدا ئەوا پەلە بکە ــ بە پێی توانا ــ نوێی بکەرەوە هەردەم با دەست بە دەستنوێژ بیت، کاتێ دەڕۆیت بۆ سەر کارەکەت، لە ناو ئۆتۆمبیلدای، لە ماڵیت، لە هەر کوێیەك هەی.

جا دەستنوێژ روناکییەکی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵگەی ئیمان و باوەڕی بەندەکانە، ئێستا و لەم سەردەمەدا چەند لێکۆڵینەوەیەکی زانستی تازە بۆی دەرکەوتوە کە ئەو کەسەی دەستنوێژی هەیە خەرمانەیەك لە روناکییەکی هەست پێکراوی راستی دەوری داوە،جا دەستنوێژ روناکییەکی لە ناو چەواندا هەیە، هەروەها لە هەموو ئەندامەکاندا، ئەمەش رێز و پلەپایەیەکە لەم ئوممەتە گیراوە، ئەم ئوممەتە یەکەم ئوممەتە بانگی لێ دەکرێت بە مەبەستی لێپرسینەوە و حیساب.

پرسیارێکی تر لێرەدا هەیە ئەویش ئەوەیە: ئایە یەکەم کۆمەڵ و گرووکێن کە داوەری دەکرێن لەم ئوممەتەدا؟ ئەم پرسیارەش زۆر ترسناکە، هەموو ئەم ئوممەتە پێشکەوتوون بۆ بەر دەستی پادشاکان و دەسەلاتداری زەوی و ئاسمانەکان، لە بەر چاوی هەموو ئوممەتەکانی تر، ئاخۆ کێ یەکەم کەس بانگی لێدەکرێت لەم ئوممەتەدا بۆ لێپرسینەوە؟

ئەوانە ئەو کەسانەن نین کە تاوانە گەورەکانیان ئەنجام داوە! هەروەها ئەوانەش نین کە تاوانە بچوکەکانیان ئەنجام داوە! ڕەنگە باوەڕ نەکەیت ئەگەر بڵێم: ئەوانە شەهیدان و زانایان و قورئان خوێنان و چاکەکاران و بەخشندەکانن.

بەڵگەش لە سەر ئەم قسانە ئەو فەرموودەیە کە ئیمامی (مسلم)[2] ریوایەتی

---

١ ــ أخرجه ابن ماجه (٢٧٧) وأحمد (٥/٢٧٦ , ٢٨٢) والدارمي (٦٥٥) والحاكم (٤٤٧ , ٤٤٨ , ٤٤٩) والطيالسي (٩٩٦) والبيهقي في (السنن الكبرى) (١/٨٢ , ٤٥٧) و (الشعب) ٢٧١٣ , ٢٨٠٢) , وصححه الألباني في (الإرواء) (٤١٢) و( صحيح الجامع) (٩٥٢) .

[2] ــ أخرجه مسلم (١٩٠٥) .

کردوه له فەرمووده‌ی (أبو هريرە)وه که‌وا خۆشەویستی خواﷺ فەرموویەتی: ((إن أول الناس يقضى يوم القيامة عليه رجل استشهد فأتى به فعرفه نعمه فعرفها، قال: فما عملت فيها؟ قال: قاتلت فيك حتى استشهدت، قال: كذبت ولكنك قاتلت لأن يقال: جريء، فقد قيل ثم أمر به فسحب على وجهه حتى ألقي في النار))

بەڵێ.. شەهید!! لە گۆڕەپانی جەنگدا پێکراوە و کوژراوە!! دەخرێتە ئاگرەوە!! بۆ؟؟ خوای گەورە پێی دەڵێت: درۆت کرد.. درۆت کرد... تۆ هەرگیز لە پێناوی خوادا نەجەنگاوی، خوێنی خۆت پێشکەشی خوای گەورە نەکردوە، نەخێر.. بەڵکو لە پێناوی سەرکردایەتی و رابەری و سالاری و پێشەوایەتی و پێشەنگی و نەتەوایەتی و دەمارگیری گەنیو، شەهیدبوونی تۆ بۆ خوا نەبوە، ئەوەش بزانن ئەگەر هەریەکێك لە ئێمە بتوانێت هەموو خەڵکی بخەڵەتێنێت ئەوا ناتوانێت خوای خەڵکی بخەڵەتێنێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ البقرة: ٩، واتە: ئەوانە بە نیازی خۆیان دەیانەوێ فێڵ و تەڵەکە لە گەڵ خوادا و ئەو کەسانەدا بکەن کە بڕوایان هێناوە بەڵام لە راستیدا تەنها لە گەڵ خۆیان فێڵ و فەرەج ئەکەن و زیانەکەشی هەر بۆ خۆیان ئەگەڕێتەوە و تەنها خۆیان دەخەڵەتێنن لە حاڵێکدا هەستیش بەو راستیە ناکەن!)).

خوای بەرز و بەدەسەڵات دەفەرموێت: درۆت کرد، بەڵکو خۆت بە کوشتدا بۆ ئەوەی بڵێن: کەسێك زیرك بوو، تۆ ئەوەت دەویست و ئەوەشت بە دەستهێنا، ئیتر بۆ داوای پاداشت دەکەیت؟

بەڵام کەسی دووەم:

((ورجل تعلم العلم وعلمه وقرأ القرآن فأتى به فعرفه نعمه فعرفها قال: فما عملت فيها؟ قال: تعلمت العلم وعلمته، وقرأت فيك القرآن، قال: كذبت، ولكنك تعلمت العلم ليقال: عالم وقرأت القرآن ليقال: هو قارئ فقد قيل ثم أمر به فحسب على وجهه حتى ألقي في النار)).

زانایەك بە ڕوویدا بە ناو ئاگردا رادەکێشرێت؟ بەڵێ.. زانایەك هەموو جیهانی پڕ کردوە لە قسە و زانیاری و هاوار و ژاوەژاو! بەڵام لە پێناوی خوادا نەبوو! ! ئەی خودایە.. بەش و پشکمان لە دینەکەماندا تەنها قسە و گوفتار نەبێت، هەروەها نیەت و کردەوەکانمان پاك بکەرەوە.

بە ڕاستی فیتنەیەکی زۆر ترسناکە، زانایەك بە ڕوویدا بە ناو ئاگردا رابکێشرێت چونکە ئەو ئیخلاصی نەبوە بۆ خوای بە بەزەیی و میهرەبان، حەزی لە ناوبانگ دەکرد! ئەو دەیویست تەنها پێی بڵێن، زانا، پێی بڵێن: بە راستی کابرایەکی قسەزانە !

بەڵام کەسی سێیەم:

((ورجل وسع الله عليه وأعطاه من أصناف المال كله فأتي به فعرفه نعمه فعرفها، قال: فما عملت فيها؟ قال:ما تركت من سبيل تحب أن ينفق فيها إلا أنفقت فيها لك، قال: كذبت ولكن فعلت ليقال: إنه جواد فقد قيل ثم أمر به فسحب على وجهه فألقي في النار)).

ئەوانە ریاکارانن، یەکەم کەسێك دەبن خوای گەورە حوکمی خۆی بە سەریاندا دەدات لە ڕۆژی قیامەتدا لە ئوممەتی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ، ئەوانە لە کار و کردەوەکانیاندا رازی بوونی خەڵکیان ویستوە، ناوبانگیان ویستوە، ویستوویانە خەڵکی سوپاسیان بکات و پلەوپایەیان پێ بدرێت، ئەوانە رازی بوونی خوایان نەویستوە.

جا(ریا): هەروەکو زمانناسان وەکو (فیروز آبادي) و (ابن منظور) لە (لسان العرب)[1] دا و جگە لەوان دەڵێن: (الرياء) لە وشەی (الرؤيا)وە وەرگیراوە(رای مراءاةً ورياءاً ورآءاً) واتە: بە شێوەیەکی جیاواز لە ناخ و دەروونی خۆی بۆ خەڵکی دەردەبڕێت))، خۆی بە کەسێکی دڵنەرم دەردەخات کەچی ئەو پەڕی دڵڕەقە، خۆی بە ڕاستگۆ دەردەخات کەچی گەورەترین درۆزنە.. خۆی بە لە خواترس

---

١ ـ انظر : لسان العرب (٥/٨٨) مادة رأي , و (المصباح المنير ) (١/٢٤٧) و (تاج العروس) (٨٣٩٤) و (القاموس المحيط) (١٦٥٨) .

دەردەخات کەچی زۆر بوێرە بەرانبەر بە سنوورەکانی خوای گەورە ! ! ئەگەر ئەو ریایە لە بنەماکانی دیندا بوو، واتە: خۆی بە موسڵمان دەربخات و کەچی لە ناخەوە کوفر بشارێتەوە ئەوا پێی دەڵێن (النفاق الأكبر) واتە: دووڕوویی گەورە، ئەوەش دووڕوویی لە بیروباوەڕدایە،خاوەنەکەشی لە ئیسلام دەردەچێت بە کۆڕای زانایان.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُۥ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيُشْهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِى قَلْبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلْخِصَامِ ﴿٢٠٤﴾ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ ٱلْحَرْثَ وَٱلنَّسْلَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ أَخَذَتْهُ ٱلْعِزَّةُ بِٱلْإِثْمِ ۚ فَحَسْبُهُۥ جَهَنَّمُ ۚ وَلَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴾ البقرة: ٢٠٦، واتە: مرۆڤی وا هەیە سەبارەت بە ژیانی ئەم دونیایە بە قسەو گوفتاری سەرسامت دەکا و دەربارەی ئەوەش کە لە دڵیایە خوا دەگرێ بە شایەت کە هەرچی دەڵێ ڕاستە کەچی لە دژایەتی کردندا زۆر بێ ویژدان و سەرسەختە (٢٠٤) هەرکە پشتی لێ هەڵکردی و دوورکەوتەوە دەست دەکات بە کاری بەد فەڕی لەم سەرزەوییەدا بۆ ئەوەی خراپەی تێدا بکا و مەزار و کشت و کێڵگە و تۆرەمە لە ناو ببا، هەرگیز خوا لە بەد فەڕی خۆشی نایە (٢٠٥) هەر کە پێی بگوترێ: دەبێ لە خوا ترست هەبێ، ئەوسا دەمارزلی، زیاتر بەرەو تاوان و گوناهـ دەیبات، جەهەنمی بۆ بەس دەبێت دیارە ئەو جێیەکی زۆر خراپە ! (٢٠٦)

خوای گەورە دەربارەی ئەوان دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴾ (النساء: ١٤٥) واتە: دیارە کە دووڕووەکان لە چینی هەرە خواری ئاگری دۆزەخدان)).

هەروەها خوای گەورە دەربارەی ئەوان دەفەرموێت: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُوا۟ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ﴾ المنافقون:١، واتە: کاتێ دووڕووەکان هاتن بۆ لات ئەی پێغەمبەرﷺ ئەڵێن: شایەتی ئەدەین کە بە ڕاستی تۆ پەیامبەری خوایت، لە حاڵێکدا خوا خۆی ئەزانێ

کە تۆ پەیامبەری ئەویت وە خوا گەواهی ئەدات کە ئەو دووڕووانە درۆ دەکەن کە ئەڵێن تۆ پەیامبەری خوایت)).

بەڵام دووروی لە کردەوەکاندا، پێنج بنەمای هەیە بە کۆی هەردوو ریوایەتەکەی (أبو هريره) و (عبدالله ی کوڕی عمرو)، هەردوو فەرموودەکە لە (صحیح البخاری و مسلم)دا ریوایەت کراوە:

فەرموودەی یەکەم لە هەردوو کتێبی (الصحیح)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (أبوهريره)وە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((آية المنافق ثلاث: اذا حدث كذب، واذا وعد أخلف، واذا أوتمن خان)) واتە: نیشانەکانی دووڕوو سێ دانەن: ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات و ئەگەر بەڵێنی دا ئەوا نایباتە سەر و ئەگەر سپاردەیەکی پێ سپێردرا ئەوا خیانەتی لێ دەکات)).

جا ئەم کابرای دووڕووە کەوتووەتە ناو دووڕووی کردەوەوە.

ڕیوایەتی دووەم لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی عمرو)ەوە کە لە هەردوو کتێبی (الصحیح)[2]دا هاتوە کەوا خۆشەویستی خوا ﷺ فەرموویەتی: ((أربع من كن فيه كان منافقا خالصا، ومن كانت فيه خصلة منهن كانت فيه خصلة من النفاق حتى يدعها، إذا اؤتمن خان، وإذا حدث كذب و إذا عاهد غدر و إذا خاصم فجر)) واتە: چوار ئاکار و ڕەوشت هەن هەرکەسێ تێیدا بوو ئەوا دووڕوویەکی ڕوونە. وە ئەگەر هەرکەسێك ئاکارێکی تێدا بوو ئەوا ئاکارێکی لە دووڕووی تێدایە تاکو وازی لێ دەهێنێ: ئەگەر سپاردەیەکی پێ سپێردرا ئەوا خیانەتی لێ دەکات و ئەگەر قسەیەکی کرد درۆ دەکات و ئەگەر پەیمانێکی دا ئەوا غەدر دەکات و ئەگەر دوژمنایەتی و نەیارێتی کەسێکی کرد ئەوا لە راستی لا دەدا))

ئەمە کەسی دووڕوە، ئەگەر ئەو ڕەوشتانەی تیادا کۆببێتەوە ئەوا دووڕوویەکی تەواوە، ئەگەر یەك ئاکار لەو ئاکارانەی تێدا بوو ئەوا یەك لە ئاکارەکانی دووڕووی تێدایە.

---

١ ـ أخرجه البخاري (٣٣) و مسلم (٥٩) .

٢ ـ أخرجه البخاري (٣٤) و مسلم (٥٨) .

جا ریا - خوا من و ئێوەی لێ بپارێزێ - کردەوەکان پووچەڵ دەکاتەوە، ئەوەش پێی دەڵێن (الشرك الخفی) واتە شیرکی شاراوە، خوای گەورەش هیچ کردارێك وەرناگرێت تەنها ئەوانە نەبێت کە تەنها لە پێناوی رازی بوونی ئەودا ئەنجام دراوە و لە گەڵ سوننەتەکانی پێغەمبەری ئازیزدا ﷺ بگونجێ، رەنگە تۆ کەسێك بیت شوێنکەوتەی خۆشەویست بیت ﷺ و کردەوەکانت بە پێی سوننەتەکانی پێغەمبەربێت ﷺ بەڵام لە بەر رازی بوونی خوا ئەنجامت نەداوە بۆیە ئەو کردەوەیە نەویستراوە و وەرناگیرێت، لە لایەکی ترەوە رەنگە کردەوەکانت تەنها لە بەر رازی بوونی خوا بێت بەڵام بە پێی سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ نەبێت ئەم کردارەش وەرناگیرێت و نەویستراوە، بۆیە دەبێت هەموو کردارێك دوو مەرجی تێدا بێت کە ئەوانیش بریتین لە (الاخلاص و الاتباع) واتە: دڵسۆزی و شوێنکەوتن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا﴾ (الكهف: ١١٠) واتە: ئینجا هەر کەسێك لە ئێوە ئومێدی بە گەیشتنی دیداری پەروەردگاری خۆی هەبێ لە دوارۆژدا با کاری چاك و کردەوەی دروست ئەنجام بدات و لە پەرستنی پەروەردگاری خۆیدا هیچ کەسێك نەکاتە هاوتا و هاوبەشی و ریایی نەکات چونکە خوا تەنها دڵسۆزی و ئیخلاس وەرئەگرێ نە ریا و رووپایی و شیرك و هاوبەشدانان)).

جا کردەوەی باش ئەو کردارەیە، کە تەنها لە پێناوی خوادایە و لە سەر رێنمۆیی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ﴾ البينة: ٥، واتە: لە هەمان کاتا لە (تەورات و ئینجیل)دا فەرمانیان پێ نەدرابوو بەوە نەبێ کە بە تەواوی هەمووان خوا بپەرستن و سەر بۆ ئەو دانەوێنن و ئاینی خالیس هەر بۆ ئەو دابنێن و لە هەموو ئاینێکی هیچ و پوچ لابدەن و بە تێر و تەسەل نوێژەکانیان بکەن لە ماڵ و سامانیان زەکات بدەن بەو شێوەیەی بۆیان روون کراوەتەوە و هەر ئەو

خواپەرستی یەکلا بوونەوەیە و نوێژ و زەکات دانەیە ئاییینی پایەدار و راستە ئاوا فەرمانیان پێ کرابوو کەچی ئەوان جیابوونەوە و بوونە چەند دەستەیەك)).

ڕەنگە کردارێك بچووك بێت لای خەڵکی بەڵام لای خوای گەورە زۆر گەورە و گران بێت چونکە خاوەنەکەی لە کاتی ئەنجامدانیدا تەنها مەبەستی خوا بوە.

لە فەرموودەیەکی قودسیدا هاتوە کە ئیمامی (مسلم)[1] ریوایەتی کردوە لە فەرموودەی (أبو هريره) ەوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((قال الله تبارك و تعالى: أنا أغنى الشركاء عن الشرك، من عمل عملاً أشرك فيه معي غيري، تركته و شركه)) واتە: من لە هەموو شەریکەکان بێ نیاز ترم لە شەریك، کەسێ کردەوەیەك بکات و جگە لە منی تێدا بەشدار بکات ئەوا لە گەڵ شەریکەکەیدا بە جێیان دەهێڵم)).

لە ریوایەتەکەی (ابن ماجە)[2]دا دەفەرموێت: ((فأنا منه برئ، وهو للذي أشرك)) واتە: ئەوا من لێی بەریم و ئەویش بۆ ئەوەیە کە بە شەریکی زانیوە))

جا خوای گەورە هیچ کردارێك وەرناگرێت تەنها ئەوە نەبێت کە بە دڵسۆزی و لە پێناوی ئەودا ئەنجامدراوە، من باشی دەزانم ئەو کارە زۆر گرانە! ئێستا زۆر برا لەو برایانە هەست بە ئازار دەکات، هەروەها زۆر لەو خوشکانە هەست بە ئازار دەکەن، لە کردەوەکانیان دەترسن!!

من پێیان دەڵێم: موژدە بێ لێتان بە موژدەیەك لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆ ئەوەی هیمەتتان بەرز بکەمەوە و ئەو ترسە نەهێڵم، رەنگە برایەك لە برا خۆشەویستەکانمان یان خوشکێك لە خوشکە بەرێزەکانمان یان دایکێك لە دایکە شیرینەکانمان کردارێکی چاك ئەنجام بدات لە پێناوی خوادا و لە هەمان کاتدا لە ریا بترسێت.

دەڵێم: ئەو پاڕانەوەیەت بۆ خوای گەورە کە داوای لێ دەکەیت ئیخلاص و دڵسۆزیت پێ ببەخشێت بەڵگەی دڵسۆزی و ئیخلاصە.

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٩٨٥) .

٢ ـ أخرجه ابن ماجه (٤٢٠٢) وصححه الشيخ الألباني في صحيح سنن أبن ماجه وصحيح الترغيب (٣٤) .

الحسن البصری[١] دەفەرموێت: هیچ کەسێك لە دووڕوویی بیّ ترس و تەئمین نییە تەنها کەسی دووڕوو نەبێت، هیچ کەسێك لە دووڕوویی ناترسێت تەنها کەسی ئیماندار نەبێت)) موژدە بیّ لێت! هەرگیز دوودڵ مەبە و مەترسە، بەڵگەی دڵسۆزیت ئەوەیە لە خوا دەپارێیتەوە ئیخلاصت پێ ببەخشێت، رەنگ کارێك لە کارە چاکەکان ئەنجام بدەیت ئەمجار بە گوێیەکانی خۆت سوپاسگوزاری خەڵکی ببیسیت بۆ خۆت و کارەکانت، بەڵکو رەنگە پلەوپایەی خۆت لە ناو دڵی ئیمانداران و موسڵمانان‌دا ببینیت بۆیە خۆشحاڵ دەبیت، بزانە ئەوە ریا نییە و پێی ناڵێن ریا.

لە (صحیح مسلم)[٢] دا هاتوە لە فەرموودەی (أبو ذر)ەوە دەڵێت: بە پێغەمبەری خوایان ﷺ فەرموو: ((أرأیت الرجل یعمل من الخیر، ویحمده الناس علیه؟ فقال ﷺ: ((تلك عاجل بشری المؤمن)) واتە: کەسی وا هەیە چاکە دەکات و خەڵکیش لە سەر ئەو چاکەیە سوپاسگوزاری دەبن و ستایشی دەکەن؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئەوە موژدەیەکی پەلەیە دەدرێتە کەسی ئیماندار)).

جا ئەوە موژدەیە بۆ تۆ تاوەکو تۆ لە خوا بپارێیتەوە ئیخلاصت پێ بەخشێت و هەموو وتە و کردەوەکانت بۆ خوا بێت.

جا ئەوە شایەتی ئیمانداران و یەکتاپەرستانە بۆ تۆ.

ئیمامی (البزار) بە سەنەدێکی (صحیح)[٣] ریوایەتی کردوە لە فەرموودەی (أبو هریرە) وە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((ما من عبدٍ إلا ولە صیت في السماء فإن کان صیته في السماء حسناً وضع في الأرض)) واتە: هیچ بەندەیەك نییە ئیللا ناوبانگێکی هەیە لە ئاسماندا، ئەگەر ئەو ناوبانگەی باش بوو ئەوا لە سەر زەویشدا دادەنرێت و باش دەبێت)).

١ ـ أخرجه البیهقي في (الشعب) وعلقه البخاري بصیغة التمریض کتاب (الإیمان) .

٢ ـ أخرجه مسلم (٢٦٤٢) .

٣ ـ رواه البزار (ص٣٢٦ – زوائده) وابن عدي (٥٨/٢) وقال الهیثمي في (المجمع) (٢٧١/١٠) : رواه البزار , ورجاله رجال الصحیح , وقوّي إسناده الشیخ الألباني في (الصحیحة) (٢٢٧٥) وصححه في (صحیح الجامع) (٥٧٣٢) .

كەواتە موژدە بۆ خۆت كاتێ لە سەر زاری خەڵكییەوە سوپاسگوزاری دەبیسیت، لـە هـەمان كاتـدا پلـەو جێگەیـەكی تایبـەتی لـە نـاو دڵـی ئیمانـداره راسـتگۆكاندا كردوەتەوە، ئەوە موژدەیەكی خەیرە بۆ تۆ، چونكە باش بزانە زۆر ئەستەمە كەسی دووڕوو كەسی ئیمانداری خۆش بوێت، چونكە هیچ كەسێك رقی لە ئـەهلی زانـست و فەزڵ و سوننە نییە ئیللا كەسی دووڕوو نەبێت. پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی ــ هەروەكو لە (صحيح مسلم)[1]دا لە فەرموودەی (أبـوهريره) وە هـاتوە ــ : ((الأرواح جنود مجندة، فما تعارف منها ائتلف، وما تنـاكر منهـا اختلـف)) واتـە: رۆحـەكانیش سەربازی راهێنراون، ئەوانەیان یەكتری ناناسن لـە یـەك دوور دەكەونـەوە، ئەوانـەی هاوڕەوشت و هاوبیرن پێكەوە دەگونجێن، ئەوانەشیان سروشـت و بیروباوەریـان بـە یەك ناخوات لە یەكتر دوور دەكەونەوە و جیاواز دەبن)).

ئیمامی (الخطابي)[2] دەفەرموێت: ((خـەڵكی هەڵبـژێردراو و پوخـت خۆشەویستی كەسـی هەڵبـژێردراو و پـوختن، هـەروەها خـەڵكی خراپـەكار خۆشەویستی كەسـی خراپەكارن))

جا تەماشاكە براكەم بزانە كێت خۆش دەوێت؟ سۆزت بۆ كێ دێتە جۆش؟ ئـەوە ئامێرێكی (ترمومتر)ی زۆر ورد و كارایە لای هەموو كەسێكی موسڵمان هەیە.

جا ئەگەر خوای گەورە سوپاسگوزاری چاكی تۆی خستە سەر زاری ئیمانـداران و موسـڵمانان، هـەروەها لـە دڵـی خەڵكیـدا جێگـە و پلەوپایـەت هـەبوو، ئـەوا بزانـە موژدەیـەكی پەلەیـە خـوای گـەورە لـەم دونیـادا پێـت دەبەخـشێت، بـۆ ئـەوەی پەیوەست بن لە گەڵ موژدە گەورەكەدا لە رۆژی قیامەتـدا و لـە بـەر چـاوی هـەموو خەڵكی، هەروەكو لە پێشدا باسمان كـرد[3]، كـە تێیـدا هـاتوە: ((يـدنى المـؤمن يـوم القيامة من ربه عـز وجـل، حتـى يـضع عليـه كنفـه، ثـم يقـرره بذنوبـه، فيقـول: هـل تعرف؟ فيقول: أي رب! أعرف، قال: فإني قد سترتها عليـك في الـدنيا، وإنـي أغفرهـا

---

١ ــ أخرجه البخاري (٣٣٦) معلقاً بصيغة الجزم و مسلم (٢٦٣٨) .

٢ ــ مسلم بشرح النووي (٤٣٥/٨) ط الحديث . وانظر (فتح الباري ) (٤٢٦/٦) .

٣ ــ أخرجه البخاري (٢٤٤١) و مسلم (٢٧٦٨) واللفظ له .

لك اليوم، فيعطى صحيفة حسناته)) واتە: خوای گەورە بەندەی ئیماندار لە خۆی نزیك دەكاتەوە تا بە داپۆشین و لێبوردنی خۆی دایدەپۆشێت، تاكو دان بە تاوانەكانیدا دەنێت، پێی دەگوترێت: ئەو تاوانانە دەناسیتەوە؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ ئەی پەروەردگارا.. دەیناسمەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ئەوە من لە دونیادا بۆم داپۆشیت و ئەمڕۆش لێت خۆش دەبم، ئەمجار نامەی چاكەكانی پێ دەدرێت)).

پرسیارەكە لێرەدا ئەوەیە: ئایا دەتوانیت باسی چارەسەری ئەو نەخۆشییە بكەیت؟ بەڵێ.. چونكە ئەوە بابەتێكە لەوپەڕی بایەخدایە؟

یەكەم هەنگاوێك ئەوەیە: واز لە هەموو دەوروبەری خۆت بهێنە و تەنها ڕوو لە خوا بكە و لە بەر دەستی ئەودا زەلیل بە و ئەوەش بزانە كە هیچ هێز و دەسەڵاتێكت نییە جگە لە پشت بەستنت بە خوا نەبێت، بۆیە لە بەر دەستیدا خۆت بە زەلیلی رابگرە و ملكەچی ئەوبە و خۆت بە كەساسی پیشان بدە و بیسەلمێنە كە تۆ لە بەر دەستی خوای بەهێز و لێبوردەدا زۆر زەبوونی، بە دڵ داوای لێبكە كە ئیخلاصت پێ ببەخشێت و لە ریا و دووڕوویی دوورت بكاتەوە.

من دەمەوێت تۆ لە بەر دەستیدا خوادا خۆت بە زەبوونی ببینی، دڵنیابە هەموو ڕێگاكان كە بەرەو لای خوا دەڕۆن پڕن لە پیاوچاكان، ئەگەر ڕێگای یەكتاپەرستی بگریتە بەر ئەوا دەبینی ڕێگاكە پڕە لە یەكتاپەرستان، ئەگەر ڕێگای نوێژ بگریتە بەر ئەوا دەبینی ڕێگاكە پڕە لە نوێژەران، ئەگەر ڕێگای زەكات و ڕۆژوو بگریتە بەر ئەوا پشت بە خوا دەبینی ڕێگاكە پڕە لە چاكەكاران و ئەهلی فەزڵ، بەڵام ئەوەش بزانە ڕێگای خۆ زەبوون كردن و خۆ كەساس كردن لە بەر دەستیدا خوادا خەڵكێكی كەم گرتویانەتە بەر بۆیە نزیكترین ڕێگایە دەگەیتە لای خوای باڵادەستی لێبوردە، ئەوەش بزانە خوای گەورە زۆر دەوڵەمەندە و پێویستی بە گوێڕایەڵی و پەرستنی ئێمە نییە،خوای گەورە دەیەوێ ئێمە لە بەر دەستیدا ملكەچی ئەو بین و كەساس و زەبوونی بەر دەستی ئەو بین، ئایە دەزانی پێغەمبەری خواﷺ چ شتێك ڕێزداری كرد و پلە پایەی بەرزكردەوە؟ ئەو شتە تەنها پەرستن و خۆ بە بەندەی خوا

زانینە، ئەوەش بوە هۆی ئەوە کە بەرزترین پلەی بەندایەتی بۆ خوای گەورە بە دەست بهێنێ، ئەو لە جێگە و پلەوپایەی ئیسرادا بەندە بوو، لە جێگە و پلەوپایەی بانگەوازدا بەندە بوو، لە جێگا و پلەوپایەی بە ڕووداوەستاندا بەندە بوو، خوای گەورە بەو ڕەوشت و سیفاتانە وەسفی دەداتەوە کاتێك دەفەرموێت:

﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ﴾ (الإسراء: ١) واتە: پاکە و خاوێنە لە هەر شتێکی ناپەسەند و خراپ، ئەو خوایەی کە شەوڕەوی بە بەندەی خۆی (محمد) کرد لە بەشێکی زۆر کەمی شەوێکدا)).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّهُ لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللَّهِ يَدْعُوهُ﴾ الجن:١٩، واتە: کاتێ بەندەی خوا (محمد) بۆ خواپەرستی هەڵسا و هەر خوای دەپەرست لە نوێژەکەیدا)).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَإِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا﴾البقرة: ٢٣) واتە: ئەگەر سەبارەت بەو قورئانەی ئێمە ناردوومانەتە سەر بەندەی خۆمان (محمد) ئێوە دوودڵ و بە گومانن: ئاخۆ ڕاستە یان نا؟ سا دەی هەوڵ بدەن هیچ نەبێ بچووکترین سوورەتێك وەك ئەو بێنن)).

بۆیە ملکەچ و زەبوون و کەساس و زەلیل بە بۆ خوای گەورە، ئەوەش بزانە کە زەلیلی بۆ خوا، خۆی لە خۆیدا عیززەت و کەرامەتە، بە زەلیلی خوای گەورە پلەوپایەت بەرز دەکاتەوە و ڕێزت لێ دەگرێت و سەنگ و شکۆت بەرزتر دەکاتەوە، لە دونیا و قیامەتدا شکۆمەندی و پلەوپایەت بەرز و سەنگین دەکات، خوای گەورەش خۆی درۆزن و ڕاستگۆیان باش دەناسێت.

جا یەکەم هەنگاوێك بۆ دوور کەوتنەوە لە ڕیای گەورە و ڕیای بچووك و دووڕوویی گەورە ئەوەیە کە لە بەر دەستی خوادا زەلیل و زەبوون بێت.

هەنگاوی دووەم: چاوڕوون و ئاگاداری ئەنجام و چارەنووسی ڕیا بێت لە دونیا و قیامەتدا، چونکە کەسی ڕیاکار لە دوارۆژدا هیچ پشکێکی نییە، هەروەکو لە پێشدا فەرموودەکەم گێڕایەوە هەرچەندە ئەو کەسە زانا بێت یان قورئان خوێن یان شەهید .

له (مسند أحمد)[١] و جگه لەودا هاتوه له فەرموودەی (محمود ی کوڕی لبيد)ەوه کەوا خۆشەویستی خوا ﷺ فەرموویەتی: ((يقول الله يوم القيامة إذا جزی الناس بأعمالهم: أذهبوا الى الذين كنتم تراؤن في الدنيا، فأنظروا هل تجدون عندهم جزاء؟)) واته: کاتێ خەڵکی پاداشتی کردەوەکانی خۆیان وەرگرتەوە خوای گەورە دەفەرموێت: بڕۆن بۆ لای ئەو کەسانەی کە ریاتان بۆ دەکردن لە دونیادا، تەماشاکەن بزانن هیچ پاداشتێکتان دەدەنەوە؟))

من پێت دەڵێم: ((تۆ ریا بۆ کێ دەکەیت و سەرپێچی کێ دەکەیت؟)) ئایا دەزانی تۆ ریایی بۆ فلان دەکەیت و سەرپێچی خوا دەکەیت؟ دڵی ئەو کەسەی کە تۆ ریای بۆ دەکەیت بە دەستی پادشای پادشاکانە، ئەو بە توانایە کە دڵی ئەو کەسە بگۆڕێت بە دڵێکی پڕ لە رق وکینە بەرانبەرت.

ئەم بنەمایە زۆر گرنگە: ((المعاقبة بنقيض القصد أمر ثابت شرعا وقدراً)) واته: سزادان بە پێچەوانەی مەبەست کارێکی جێگیر و دامەزراوە لە رووی شەرع و قەدەرەوە))

هەروەکو لە (سنن الترمذي) و (عبد بن حميد) و جگە لەوان[٢] هاتوە لە فەرموودەی (عائشە)ەوه کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((من أرضى الله بسخط الناس كفاه الله الناس، ومن أسخط الله برضا الناس وكله الله الى الناس)) واته: هەرکەسێك خوای لە خۆی رازی کرد هەرچەندە تووڕەبوونی خەڵکیشی تێدا بێت ئەوا خوای گەورە خەڵکی لە کۆڵ دەکاتەوە هەموو کارەکانی خۆی جێ بە جێی دەکات، وە هەرکەسێك خوای گەورەی لە خۆی تووڕە کرد لە بەر رازی بوونی خەڵکی ئەوا خوای گەورە پێویستییەکانی دەخاتە دەستی خەڵکی))

جا دڵی خەڵکی لە بەر دەستی خوای گەورەدایە چۆنی بوێت ئاوا هەڵیدەگێڕێتەوە، بۆیە دەبێت چاوڕوون بیت بە ئەنجامی ریاکارانەوە، کەسی ریاکار

١ ـ أخرجه أحمد (٥/٤٢٨ , ٤٢٩) والبيهقي في (الشعب) (٦٨٣١) والبغوي في (شرح السنة) (١٤/٣٢٤) و جود الألباني إسناده في (الصحيحة) (٩٥١) وصححه في (صحيح الجامع) (١٥٥٥) و (صحيح الترغيب) (٢٩) .

٢ ـ أخرجه الترمذي (٦٥) (٢٤١٤) وعبد بن حميد في (المنتخب) (١٥٢٢) وابن حبان (١٥٤٢) وقد روى موقوفاً والمرفوع أصح كما قال الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٢٣١١) .

زۆر بەستەزمانە، هەردەم لە خەم و پەژارەدا دەژیت، چونکە چاوەڕوانە فلان بزەیەکی بۆ بکات، یان چاوەڕوانی قسە و گوفتارێکی فلانە ! ! ئەو بەستەزمانە ناتوانێت هەموو خەڵکی رازی بکات، چونکە رازی بوونی خەڵکی مەبەستێکە و هەرگێز نایەتە دی[١]، چیتر بۆ خۆت ماندوو دەکەیت؟؟ بۆیە لە کردار و گوفتارتدا تەنها مەبەستت خوا بێت، واز لە خەڵکی بهێنە لەبەر رازی بوونی خواکەت، چ خەیرێکی تیادایە خەڵکی ستایشت بکات بەڵام لای خوای گەورە زەمکراو بیت؟ یاخود چ خراپەیەکی تێدایە ئەگەر خەڵکی زەمت بکەن بەڵام لای خوای گەورە ستایشکراو بیت؟ ئەوەش بزانە کە هەرگیز ناتوانیت خەڵکی لە خۆت رازی بکەیت، ئەوە زۆر ئەستەمە، ئەگەر هەموو خەڵکی رازی بوایەن لە کەسێك ئەوا پێغەمبەری خواﷺ رازی دەبوون، خەڵکی وا هەبوو جوێنیان پێ دەدا، خەڵکی وا هەبوو ئازاریان دەدا ! ! بەڵکو ـ سوێند بە خوا ـ ئەگەر هەموو خەڵکی لە کەسێك رازی بونایە ئەوا خەڵکی لە خوای تاك و تەنها رازی دەبوون، بۆیە هەرگیز خۆت ماندوو مەکە، هەردەم دڵت پەیوەست بکە بە خوداوە.

بە ڕاستی شاعیر راستی فەرمووە کاتێك دەڵێت:

| | |
|---|---|
| واللّه لو صحب الانسان جبريل | لم يسلم المرء من قال ومن قيلا |
| قد قيل فى اللّه أقوال مصنفة | تتلى اذا رتل القرآن ترتيلا |
| قد قيل ان له ولداً و صاحبة | زوراً عليه وبهتاناً و تضليلا |
| هذا قولهم فى اللّه خالقهم | فكيف لو قيل فينا بعض ما قيل |

ئەمجار هەموو کارەکانت با شاراوە بێت لە دیندا ئەوەی پێویست بێت بیشاریتەوە، باش بزانە کە ریا هیچ چارەسەرێکی نییە وەکو شاردنەوە و پەنهانی، ئەوەی بەڵگە هەبێت لە شەرعدا بۆ شاردنەوەی، ئەگینا هەرگیز بۆت نییە نوێژی جەماعەت (صلاة الجماعة) بشاریتەوە، یان حەجکردنیماڵی خوا بشاریتەوە، یان بانگەواز بۆ دینی خوا بشاریتەوە، هەر کردارێك بکرێت بشاردرێتەوە ئەوا پەلە لە

١ ـ هذه مقالة للإمام الشافعي , انظر : (شرح العقيدة الطحاوية ) (ص ٢٤٥ ط ابن رجب ) .

شاردنەوەی بکە، بۆ ئەوەی دڵت ڕابهێنیت لە شاردنەوەی کردارەکانت لە سەر ئیخلاصی و دڵسۆزی، لە کاتێکدا تۆ بە ئاشکرا کارەکانت ئەنجام دەدەیت.

جا ئەوانە یەکەم کۆمەڵن، کە خوای گەورە حوکمیان بە سەردا دەدات لە ڕۆژی قیامەتدا.

ئەمجار بانگ لە هەموو خەڵکی دەکرێت، بانگ لە تۆ دەکرێت برا بەڕێزەکەم...! لە تۆیش ئەی خوشکە بەڕێزەکەم...! بۆ ئەوەی لە بەر دەستی خوادا ڕابوەستیت بە مەبەستی لێپرسینەوە.

ئیمامی (القرطبي) لە کتێبی (التذکرة)[1] دا دەفەرموێت:

((بیهێنە بە بیری خۆتدا براکەم، بیهێنە پێش چاوی خۆت لەو کاتەی نامەی کردەوەکان بڵاو دەکرێتەوە، تەرازووەکان دامەزرێندران و بە جێگیری چەسپێندران، ئەمجار ناوی تۆیان بانگ کرد لە پێش چاوی هەموو خەڵکی: کوا فلانی کوڕی فلان؟ لە بەردەستی خوای گەورەدا ئامادەبە، کاتێك زانیت تۆ کەسی داواکراوی ئەوا ئەو بانگە دڵت دەهەژێنێت، هەموو ماسولکەکانی شان و سنگت دێتە لەرزە، هەموو ئەندام و پەلەکانت تێکدەچن و دەچنە بە یەکدا، ڕەنگت دەگۆڕدرێت، هەست دەکەیت دڵت خەریکە دەفرێت، فریشتەکانش هەنگاو بە هەنگاو بەرەو پێشت دەبن کە لە لایەن خوای گەورەوە دەستنیشان کراون بۆ پێش خستنت بۆ بەر دەستی خوای گەورە، بە ناو ریزەکاندا دەتبەن، ریزی مرۆڤەکان، ریزی فریشتەکان، ریزی جنۆکەکان، بۆ ئەوەی لە بەر دەستی خوادا ڕابوەستێنرێیت بە مەبەستی لێپرسینەوە لە بەر دەستی ئەودا، هەموو دروستکراوەکان تەماشات دەکەن.. بیهێنە پێش چاوی خۆت تۆ لە بەردەستی پەروەردگارەکەتدا ڕاوەستاویت، لە کاتێکدا نامەی کردەوەکانت وەرگرتوە، ئەو نامەیەی کە هەر کەتنێك ئەنجامت دابێت جێی نەهێشتوە، هیچ شتێك تۆ شاردبێتتەوە ئەو نەیشاردوەتەوە، چەندان کەتن و کارەساتت شاردبوەوە ئێستا خوای گەورە ئاشکرای دەکات و دەریدەخات،

---

١ ـ التذكرة بأحوال الموتى وأمور الآخرة (٣٣٢) ط الصفا . بتصرف وأختصار .

ئای لەو پەشیمانییەی لەو ساتەدا تووشت دەبێت! کە کەمتەرخەمیت دەکرد لە دونیادا لە گوێرایەڵی پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکان ....))

ئاخۆ یەکەم شتێك بەندەکان لێپرسینەوەیان لە سەر بکرێت لە ڕۆژی قیامەتدا چییە؟ لە پاش ئەوە پرسیاری چی لێدەکرێت؟ ئایا لە پاش ئەوەی خوای گەورە لە داوەری بەندەکان بوەوە لە حەقەکانی خۆی چی دەبێت؟

چی ڕوودەدات؟ ئەمجار مۆڵەت دەدرێت بۆ کێشەی ستەملێکراوەکان و گەڕاندنەوەی مافەکانیان، لای خوای گەورە هەموو نەیاران کۆ دەکرێنەوە، هەر دەبێ هەمووان مافی خۆیان وەرگرنەوە، چونکە هیچ کەسێك ناچێتە بەهەشتەوە ئەگەر مافی یەك کەسی لا مابێت، ئەمە و چەند باسێکی تر لە بەشی داهاتوودا بە درێژی باس دەکەین انشاء الله.

داوا لە خوا دەکەم من و ئێوە لە دونیا و دوارۆژدا داپۆشێت، هەر خۆی پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

# یەکەم شتێك بەندەکان لێپرسینەوەیان لە سەر دەکرێت

# أول ما يحاسب عليه العبد يوم القيامة

لە بەشی ڕابوردوودا باسی یەکەم شتێکمان کرد لە ڕۆژی قیامەتدا حوکمی لە سەر دەدرێت لە نێوان بەندەکاندا، ئاخۆ یەکەم شتێك خوای گەورە لێپرسینەوەی لە سەر دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا چییە؟

وەڵامی ئەم پرسیارە بریتییە لەوەی کە پێغەمبەری خواﷺ باسی کردوە، هەروەکو لە فەرموودەیەکدا کە (أحمد و أبو داود و الترمذي و النسائی و ابن ماجه و جگە لەوان)ریوایەتیان کردوە بە سەنەدێکی (صحیح)[١] لە فەرموودەی (أبو هريره)ەوە کەوا خۆشەویستی خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إن أول ما يحاسب به العبد يوم القيامة من عمله صلاته، فإن صلحت، فقد أفلح و أنجح، وان فسدت فقد خاب و خسر)) واتە: یەکەم شتێك بەندەکان لێپرسینەوەیان لە سەر بکرێت لە ڕۆژی قیامەتدا لە کردەوەکانی ئەوا نوێژە، ئەگەر باش و ڕێك وپێك بوو ئەوا ڕزگار و دەربازی دەبێت، بەڵام ئەگەر خراپ بوو ئەوا پەشیمان دەبێتەوە و لە خەسارەتمەندانە)).

هەروەها لە ریوایەتێکی تردا کە (الطبراني)[٢] بە سەنەدێکی (صحیح) ریوایەتی کردوە لە فەرموودەی (أنس)ەوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((أول ما يحاسب به العبد يوم القيامة الصلاة فان صلحت، صلح سائر عمله وان فسدت فسد سائر عمله)) واتە: یەکەم شتێك بەندەکان لێپرسینەوەیان لە سەر بکرێت لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوا نوێژە، ئەگەر باش و ڕێك وپێك بوو ئەوا ئەودوای کارەکانیشی باش

---

١ ــ أخرجه أحمد (٢/٢٩٠ , ٤٢٥) وأبو داود ( ٨٦٤ , ٨٦٥) والترمذي (٤١٣) والنسائي (١/٢٣٢) وابن ماجه (١٤٢٥) وصححه الألباني في (الصحيحة) بمجموع طرقه (١٣٥٨) .

٢ ــ أخرجه الطبراني في (الأوسط ) (٤٣٣٨) والضياء المقدسي في (المختارة) (٢/٢٠٩) وصححه الشيخ الألباني بمجموع طرقه في (صحيح الجامع) (٢٥٧٣) و (الصحيحة) (١٣٥٨) .

دەبێت بەڵام ئەگەر خراپ بوو ئەوا ئەو کارەکانی تریش خراپ دەبێت)).

براکەم..ئایا دەتوانیت لە سەردەمی گومان و ئارەزوودا و لە سەردەمی خۆپەرستی قێزەوندا واز لەو پەیوەندییەی نێوان خۆت و خواکەت بهێنی؟! کێ لە ئێمە کێشە و گرفتی نییە؟ کێ لە ئێمە خەم و پەژارەی نییە؟ خەمەکانی من و تۆ گەلێك زۆرن! دوودڵی و پەشۆکان و دڵتەنگی و پەژارە زۆرن، تەماشای ئەو خوێنە بکە ڕۆژانە دەڕژێن، ئەو هەموو جەستانەی ڕۆژانە پارچە پارچە دەکرێن، ئەو فرمێسکانەی کە شەوانی جەژن لە چاوی منداڵەکان دێنە خوارەوە، ئەو منداڵە باوکی لە دەست داوە! ئەو کچە بچوکەش دایکی مردوە! ئەو ئافرەتە پیاوەکەی کوژراوە! خەم و خەفەت و ئازار دڵەکان پارچە پارچە دەکەن، هیچ ڕێگا چارەیەکش نییە ئەو خەم و پەژارەمان لە سەر کەم بکاتەوە و ئەو کێشە و گرفتانەمان لە سەر سووك بکاتەوە و بۆدرنی تاوان و سەرپێچییەکانمان پاك بکاتەوە تەنها نوێژ نەبێت، بۆیە خێراکە براکەم بە پەلە هەستە دەستنوێژەکەت بشۆرە، پەنا بە خوا بگرە لە هەر کوێیەك خۆت ویستت لە سەر بێت و لە هەر سەردەمێکدا خۆت ویستت لە سەر بێت، لە ژێر سێبەری هەر ئاسمانێکدا خۆت ئارەزووت لێ بێت، لە سەر هەر زەوییەك حەز بکەیت، دڵ و ناخ و دەروونت فرێدە بەر دەستی خوای گەورە بە زەلیلی و زەبوونی و کەساسی و بڵێ:

بك أستجير ومن يجير سواك ... فأجر ضعيفاً يحتمي بحماك
إني ضعيف أستعين على قوي ... ذنبي و معصيتي ببعض قواك
أذنبت يا ربي و قادتني ذنوب ... ما لها من غافر إلاك
دنياي غرتني و عفوك شدني ... ما حيلتي في هذه أو ذاك
لو أن قلبي شك لم يك مؤمناً ... بكريم عفوك ما غوى و عصاك
رباه ها أنا ذا خلصت من الهوى ... واستقبل القلب الخلي هداك
أترده وترد صادق توبتي ... حاشاك ترفض تائبا حاشاك
فليرض عني الناس أو ليسخطوا ... أنا لم أعد أسعى لغير رضاك

واتە: پەنا دەگرم بە تۆ، جگە لە تۆ کێ پەنا دەدات؟ بۆیە پەنای لاوازێك بدە کە

داڵدەی داوەتە داڵدەکەت، من کەسێکی لاوازم و پەنا بە کەسێکی بەهێز دەگرم، لە تاوان و سەرپێچییەکانم بە هەندێ لە تواناکەت، من تاوانم ئەنجامدا ئەی خودایە و تاوانەکانم ڕێنوینیم دەکەن، کە هیچ کەسێك نییە لێی خۆش بێت جگە لە تۆ نەبێت، دونیاکەم مەغروری کردم و لێخۆشبوونی تۆ ڕایدەکێشام، هیچ دەسەڵاتی منی تێدا نییە نەلە ئەمیاندا و نەلە ئەویتردا، ئەگەر دڵم گومانێك بکات ئەوا ئیماندار نییە، بە خانەدانی لێخۆشبوونەکەت هەرگیز وێڵ نەدەبوو و سەرپێچی نەدەکرد، پەروەردگارا! ئەوەتا من خۆم لە ئارەزوو پاك کردەوە، وە دڵم پێشوازی لە هیدایەتە پاکەکەی تۆ دەکات، پەروەردگارا! دڵی تەوبەکارێك هاوارت لێ دەکات، ئایا تۆ دەیگێڕیتەوە تەوبە ڕاستەکەم دەگەڕێنیتەوە، زۆر دوورە لە تۆوە کە تەوبەکارێك وەرنەگریت زۆر دوورە، دەبا خەڵکی لێم ڕازی بێت یان پەست بن، چیتر من هەوڵ نادەم لە جگە لەڕازی بوونی تۆ)).

خێراکە هەستە دەستنوێژەکەت بشۆرە، دوو ڕکعات نوێژ بکە، سوێند بە خوا ئەگەر ڕاست بکەیت ئەوا خەم و پەژارەکانت لە سەر نامێنێ، خوای گەورە هەموو دوودڵی و پەشۆکانەکەت دەگۆڕێت بۆ ئاسایش و ئارامی، خەمەکانت دەگۆڕێتە بەختیاری، هەژاریت دەگۆڕێتە دەوڵەمەندی... لە گەڵ خوای خۆتدا ڕاست بکە و بزانە کە خوای گەورە لە هەموو تاوان و سەرپێچییەك پاکت دەکاتەوە، هەروەکو پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی.

ئیمامی (البخاري و مسلم)[1] ڕیوایەتیان کردوە لە فەرموودەی (أبو هريرە) ەوە کەوا خۆشەویستی خواﷺ فەرموویەتی: ((أرأيتم لو أنَّ نهراً بباب أحدكم، يغتسل فيه كل يوم خمساً، ما تقول ذلك يبقى من درنه؟))

واتە: ئەگەر لە پێش دەرگای کەسێکتان جۆگەیەك یان ڕوبارێکی جوان و پاك و خاوێن و شیرین هەبێت، هەموو ڕۆژێك پێنج جار خۆی لێ بشۆرێت، ئایا بە سەر جەستەیەوە هیچ پیسی و ناپاکییەکی پێوە دەمێنێ؟

---

١ ـ أخرجه البخاري (٥٢٨) وهذا لفظه و مسلم (٦٦٧) .

قالوا: لا يبقى من درنه شيئاً، قال: ((فذلك مثل الصلوات الخمس، يمحو الله به الخطايا)).

واتە: وتیان: نەخێر.. هیچ پیسی و ناپاکییەکی پێوە نامێنێ، فەرمووی: ئەوە نمونەی پێنج نوێژە فەرزەکەیە، خوای گەورە تاوانەکانی پێ دەسڕێتەوە)).
ئایا هیچی ترت دەوێت؟

ئیمامی (الطبراني) لە (الصغير) و (الأوسط)[1] دا ریوایەتی کردوە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی مسعود)ەوە کەوا خۆشەویستی خوا ﷺ فەرموویەتی: ((تحترقون تحترقون فإذا صليتم الصبح غسلتها، ثم تحترقون تحترقون فإذا صليتم العصر غسلتها، ثم تحترقون فإذا صليتم الظهر غسلتها، ثم تحترقون تحترقون فإذا صليتم المغرب غسلتها، ثم تحترقون تحترقون فإذا صليتم العشاء غسلتها، ثم تنامون، فلا يكتب عليكم شئ حتى تستيقظوا).

واتە: بە تاوان دەسوتێن دەسوتێن کە نوێژی بەیانیتان کرد ئەوا دەیشواتەوە، پاشان بە تاوان دەسوتێن دەسوتێن کە نوێژی عەسرتان کرد ئەوا دەیشواتەوە، پاشان بە تاوان دەسوتێن دەسوتێن کە نوێژی نیوەڕۆتان کرد ئەوا دەیشواتەوە، پاشان بە تاوان دەسوتێن دەسوتێن کە نوێژی مەغریبتان کرد ئەوا دەیشواتەوە، پاشان بە تاوان دەسوتێن دەسوتێن کە نوێژی عیشاتان کرد ئەوا دەیشواتەوە، پاشان دەخەون، چیتر هیچتان لە سەر نانوسرێت تا بە ئاگا دێنەوە))
لە بەر پاراستنی سپاردەی زانستی فەرموودەکە (ضعف) تێدایە.
هەروەها ئیمامی (مسلم)[2] لە فەرموودەی (أبو هريرە)ەوە ریوایەتی کردوە کەوا خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: ((ألا أدلكم على ما يمحو الله به الخطايت ويرفع به

---

١ ـ أخرجه الطبراني في (الأوسط) ( ٢/ ٣٥٨) (٢٢٢٤) و (الصغير) (٤٧/١) والخطيب في (تاريخه) ( ٣٠٥/٤) وقال الهيثمي في (المجمع) (٢٩٩/١) أخرجه الطبراني في الثلاثة، الا أنه موقوف في (الكبير) ( ٥٧/٨) ورجاله الموقوف رجال الصحيح، ورجال المرفوع فيهم عاصم بن بهدلة، وحديثه حسن ) وحسن اسناده المنذري في (الترغيب والترهيب) (١٧٥/١) وقال: (الموقوف أشبه ) وكذا قال ابن رجب في (فتح الباري) (١٨٣/٥) (وقد روى موقوفا وهو أشبه) وقال الشيخ الألباني: (حسن صحيح) في (صحيح الترغيب ) (٣٥٧) .
٢ ـ أخرجه مسلم (٢٥١).

الدرجات؟)).

قالوا: بلى يا رسول الله.

قال: إسباغ الوضوء على المكاره، وكثرة الخطا الى المساجد، وانتظار الصلاة بعد الصلاة، فذلكم الرباط))

واتە: ئایا ڕێنموییتان بکەم بۆ شتێك خوای گەورە تاوانەکانی پێ دەسڕێتەوە و پلەوپایەتانی پێ بەرز دەکاتەوە؟ فەرموویان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: بە تەواوی دەستنوێژ گرتن با لە کاتی نارەحەتیشا بێت (واتە: لە کاتی سەرما و نەخۆشی و شتیتر)، ئینجا هەنگاونانی زۆر بۆ مزگەوت پاشان چاوەڕێکردنی نوێژ لە دوای نوێژ، ئا ئەوەیە لە سەنگەردابوون و پابەند بوون بە فەرمانەکانی خوای گەورەوە)).

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا کە لە (صحيح مسلم)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (أبو هريرە)ەوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((من تطهر في بيته ثم مشى الى بيت من بيوت الله، ليقضي فريضة من فرائض الله، كانت خطوتاه إحداهما تحط خطيئة، والأخرى ترفع درجة)) واتە: هەرکەسێك لە ماڵەکەی خۆی دەستنوێژێکی شوشت ئەمجار ڕۆیشت بەرەو ماڵێك لە ماڵەکانی خوا، بۆ ئەوەی فەرزێك لە فەرزەکانی خوا بە ئەنجام بگەیەنێت ئەوا بە هەر هەنگاوێکی تاوانێکی لە سەر لادەچێت و بە هەنگاوێکی پلەیەکی پێ بەرز دەبێتەوە)).

لە ڕیوایەتێکی تردا کە لە (البخاري و مسلم)[2] هاتوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((الملائكة تصلي على أحدكم، ما دام في مصلاه الذي صلى فيه، ما لم يحدث، تقول: اللهم اغفر له، اللهم ارحمه)) واتە: فریشتەکان سڵاوات دەدەنە دیار کەسێکتان تا لە جێ نوێژگەکەیدا بمێنێتەوە کە نوێژی تێدا کردوە، تاکو دەستنوێژەکەی بمێنێت، فریشتەکان دەڵێن: ئەی خودایە لە تاوانەکانی خۆش بە، ئەی خودایە ڕەحمی پێ بکە))

---

١ ـ أخرجه مسلم (٦٦٦) .

٢ ـ أخرجه البخاري (٤٤٥)وانظر (١٧٦) و مسلم (٦٤٩) .

ئەوەش بزانە کە پاڕانەوە و دوعای فریشتەکان هەرگیز ڕەت ناکرێتەوە، ئەو مـوژدە جوانـەت بەسـە کـە پێغەمبـەری خـواﷺ باسـی کـردوە، هـەروەکو لـە فەرموودەیەکدا هاتوە و (أبو داود و الترمذي و النسائي و جگە لەوان) ڕیوایەتیان کردوە بە سەنەدێکی (صحیح)[1] لە فەرموودەی (بریدە) وە کەوا خۆشەویستی خـواﷺ فەرموویـەتی: ((بـشر المـشائين في الظلـم الى المـساجد بـالنور التـام يـوم القيامة)) واتە: موژدە بدە بەو کەسانەی کە بە تاریکی ڕوو لە مزگەوت دەکەن بە ڕوناکییەکی تەواو لە ڕۆژی قیامەتدا)).

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ لَا يُخْزِي ٱللَّهُ ٱلنَّبِيَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ ۖ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَـٰنِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَٱغْفِرْ لَنَآ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ (التحريم:٨) واتە: لەو ڕۆژەدا (ڕۆژی قیامەت) خوا پەیامبەر ﷺ و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ریسوا و سەر شۆڕ ناکات لە بەردەمیانەوە و لە لای ڕاستیانەوە بە سەر پردی (صراط) دا پێی دەڕۆن و دەڵێن: پەروەردگاری ئێمە! نوور و ڕوناکییەکەمان بۆ تەواو بکە و بەردەوام بێت و لێمان خۆش ببە بە ڕاستی تۆ بە سەر هەموو شتێکدا بە توانایت))

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَـٰنِهِم بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّـٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾الحديد: ١٢،واتە: ڕۆژی قیامەت پیاوان و ژنانی بڕوادار دەبینی ڕوناکییەکەیان لە بەردەم و لە لای ڕاستیانەوە دەدرەوشێتەوە فریشتە پێیان دەڵێت: دەسا ئەمڕۆ موژدە بێ لێتان بە باخانێك جۆگە و ڕووبار بە ژێر دار و درەخت و کۆشکەکانیدا دەڕوات، بە هەتا هەتاییش تێیدا ئەمێننەوە، ئا ئەوەیە سەرکەوتن و سەرفرازی گەورە)).

ئەی خودایە من وئێوە بگێرێت لە ئەهلی ڕوناکی، خودایە! بە ڕەحمەتی خۆت

---

١ ـ أخرجه أبو داود (٥٦١) والترمذي (٢٢٣) وقال : (حديث غريب من هذا الوجه ) وصححه الألباني في (صحيح الجامع ) (٢٨٢٣ ) و صحيح الترغيب (٣١٥ — ٣١٧) .

دوورمان بکەرەوە لە ئەهلی تاریکی و لەوانمان مەگێڕە، ئەمجار خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱنظُرُونَا﴾ واتە: چاوەڕوانمان بن.. بۆ؟ ﴿نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ﴾ چاوەڕوانمان بن لە گەڵ ئێوەدا لە روناکیدا ڕێ بکەین و لەم تاریکستانە بە جێمان مەهێڵن ﴿قِيلَ ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ ﴿١٣﴾ يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ﴾ (الحديد) ئێمە لە گەڵ ئێوەدا بووین لە مزگەوتەکاندا و لە نوێژە بە کۆمەڵەکاندا و لە ڕۆژانی هەینیدا ﴿قَالُوا۟ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ﴾واتە: بەرانبەر بە یەکتاپەرستان و ئیمانداران ﴿وَٱرْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ ٱلْأَمَانِىُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ﴾ الحديد: ١٤، واتە: لەو ڕۆژەدا پیاوانی دووڕوو و ژنانی دووڕوو بەوانەی باوەڕیان هێناوە دەڵێن: چاوەڕوانیمان بکەن با لە ڕووناکییەکەتان وەرگرین، بە گاڵتەوە پێیان دەوترێت: بگەڕێنەوە بۆ دواوەوەتان - بۆ دونیا - لەوێ ڕووناکییەك بخوازن، دەستبەجێ شوورەیەك دەخرێتە نێوان ئیماندارەکان و دووڕووەکان دەرگایەکی تیایە دیوی ناوەوەی ڕەحمەتی تێدایە، واتە: ئەوەی لە ئیماندارەکانەوە دیارە، لە دیوی دەرەوەشی سزایە، واتە: ئەوەی لە دووڕووەکانەوە دیارە (١٣) بەهەشتییەکان دەچنە جێی خۆیان و دووڕووەکانیش بانگیان لێ ئەکەن و دەڵێن: باشە ئێمە لە گەڵ ئێوە نەبووین؟ موسڵمانەکان دەڵێن: بەڵێ.. بە ڕواڵەت لە گەڵمان بوون، بەڵام ئێوە خۆتانتان تووشی دووڕوویی کرد چاوەڕوانیتان دەکرد تووشی بەلا بین و هەمیشە لە دوودڵی و گوماندا دەژیان بەرامبەر بە ئایینەکەی خوا و هیوا و ئارەزووی نەشیاو فریویدان تا فەرمانی خوا هات بە مردن، شەیتانی خراپەکاریش سەبارەت بە بڕیارەکانی خوا فریوی دان (١٤))).

جا یەکەم شتێك لێپرسینەوەت لە سەر بکرێت: نوێژە، بۆیە هەر ئێستا پەیمان بە خواکەت بدە کە چیتر نوێژەکانت نەفەوتێنی، هەرگیز مەڵێ: من ماوەیەکی زۆرە

نوێژم نەکردوە، من پێت دەڵێم: ئێستا نوێژ بکە، موژدەت پێ دەدەم بەو ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت: ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ﴾الفرقان:٧٠، واتە: مەگەر کەسێك پەشیمان دەبێتەوەو بڕوا بێنێ و کاری چاك ئەنجام بدا ئا ئەو کەسانە خوا گوناه و خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە)).

ڕوو لە خواکەت بکە بە دڵێکی پڕ ئومێد و هیواوە، موژدەت پێ دەدەم کە خوای گەورە خۆشحاڵ دەبێت بە تەوبەکەت لە کاتێکدا ئەو دەوڵەمەندە و پێویستی بە کەس نییە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿١٥﴾ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٦﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿١٧﴾﴾ (فاطر) واتە: ئەی خەڵکینە! ئێوە هەژارن و نیازتان بە خوا هەیە، ئەو بێ نیاز و سوپاسکراوە هەرچەندە خەڵکی ململانێ بکات.(١٥) ئەگەر بیەوێ ئێوە لە ناو ببا و خەڵکێکی تازە بێنێت، وادەکات (١٦) ئەو کارەش بۆ خوا گران نییە(١٧).

لە جێگایەکی تردا خوای گەورە بانگی ئەوانە دەکات کە زیادە ڕەوییان کردوە لە تاوان و سەرپێچی - نمونەی من - پێیان دەڵێت: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ﴾ خوای گەورە بە بەندەی خۆیمان دادەنێت لە کاتێکدا ئێمە ئەهلی تاوان و سەرپێچین و دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا﴾ (الزمر: ٥٣) واتە: ئەی موحەممەدﷺ لە منەوە بڵێ: ئەی بەندەکانی من! ئەی ئەوانەی ستەم و زیادە ڕەوییتان لە خۆتان کردوە! ئێوە لە ڕەحمەت و میهرەبانی خوا بێ ئومێد مەبن. بە ڕاستی خوا لە هەموو گوناحێ خۆش ئەبێ دیارە ئەم بانگەشەیە بۆ تەواوی تاوانبارانە کە بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئەگەرچی گوناهیشیان بە ئەندازەی کەفی سەر زەریاکان بێ، چونکە ئەوە لێبووردە و میهرەبان)).

کەوابوو هەر ئێستا پەیمان بە خواکەت بدە لە سەر پارێزگاری کردنی نوێژەکانت، هەر ئێستا دوکانەکەت داخە، نوسینگەکەت داخە، وەرە بۆ مزگەوت و هەرگیز مەترسە، من لێرەوە لە گەڵ هەموو بەرپرساندا دەدوێم و پێیان دەڵێم: ئەنجامدانی نوێژ بەرهەم زیاد دەکات و کەمی ناکاتەوە، لە هەمان کاتدا ئاکار و ڕەوشت و هەستمان ڕێك دەخات.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ﴾ العنكبوت: ٤٥، واتە: بە ڕاستی نوێژی (تێروتەسەل) بەرهەڵستی مرۆڤ لە کاری خراپ و ناپەسەند و گوناهـ و تاوان دەکات))

ئەی ئوممەتە خۆشەویستەکەم.. ئەی یەکتاپەرستانی سەر زەوی، پێتان دەڵێم: وەرن با هەموو پێکەوە پەیمان بە خواکەمان بدەین لە سەر ئەنجامدانی نوێژەکانمان.

داوا لە خوا دەکەم حاڵی ئێمە و هەموو موسڵمانان چاك بکاتەوە.

ئەمجار لە پاش نوێژ پرسیاری چی لە بەندەکان دەکرێت؟

خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا باسی چەند کارێکی دیاری کراوی کردوە کە لە بەر دەستی خوای گەورەدا پرسیاری لە سەر دەکرێت، هەروەها سوننەتیش ئەوەی ڕوونکردوەتەوە، بەڵام ئاشکرایە کە بەندەکان لە بەر دەستی خوادا پرسیاریان لێ دەکرێت دەربارەی هەموو بچووك و گەورەیەك،دەربارەی هەموو وتەو کردەوەکانی، چونکە خوای گەورە خۆی فەرموویەتی: ﴿فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ۝٨﴾(الزلزلة) واتە: ئینجا هەر کەسێك کێشی وردیلەیەك چاکەی ئەنجام دابێت، پاداشەکەی دەبینێتەوە.(٧) وە کەسێکیش کێشی وردیلەیەك شەر و خراپەی کردبێت، تۆڵەکەی دەبینێتەوە. مەگەر خوا قەڵەمی عەفوو بێنێ بە سەریا، کەوابوو با هەموومان هۆشیار و زیرەك و وریابین، بزانین ڕۆژانە چی ئەکەین و لە خوا بترسین(٨))).

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾﴾(الحجر) واتە: سوێند بە پەروەردگارت ئەی (موحەممەد) ﷺ لە هەمووان دەپرسین.(٩٢) لەو كاروكردەوەیە دەیانكرد و چۆنیش وەڵامی پێغەمبەرەكانیان دایەوە؟ (٩٣)).

هەروەها بەندەكان لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیاری خۆشییەكانی ژیانیان لێ دەكرێت، هەروەكو لەو ئایەتەدا هاتوە كە دەفەرموێت: ﴿لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ﴾ (التكاثر: ٨) واتە: پاشان باوەڕتان هەبێت لەو ڕۆژەدا پرسیاری هەموو بەهرەیەكتان لێ دەكرێ: تەندروستی، ماڵ و سامان، خێڵ و هۆز، هەر بەهرەیەكی تر كە خوا پێی دابن، چۆنتان دەست كەوتوە؟ لە ڕێی شەرعەوە یا لە ڕێگاكانی ترەوە؟ چۆنتان بەخت كرد؟))

ئایا واتای (النعیم) لەو ئایەتەدا چییە؟

ابن عباس[١] دەفەرموێت: ((النعیم: واتە: تەندروستی جەستە و بیستن و بینین))
ابن مسعود[٢] دەفەرموێت: ((النعیم: ئاسایش و تەندروستییە))
مجاهد[٣] دەفەرموێت: ((النعیم: هەموو تام و چێژێكی ئەم دونیایەیە))

(الترمذي) و (ابن حبان)[٤] و جگە لەوان ریوایەتیان كردوە لە فەرموودەی (أبو هريرە)ەوە كەوا خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: ((إن أول ما يسأل عنه يوم القيامة ـ يعني: العبد ـ من النعيم أن يقال له ألم نصح لك جسمك، ونرويك من الماء البارد)) واتە: یەكەم شتێك لە ڕۆژی قیامەتدا بەندەكان پرسیاری لە سەر دەكرێن لە نیعمەتەكان ئەوەی كە پێی دەڵێن: ئایا لاشە و جەستەتمان تەندروست و ساغ

---

١ ـ أخرجه الطبري في تفسير سورة التكاثر وأورده عن الحسن البصري , وهناك أقوال أخرى .
٢ ـ المصدر السابق .
٣ ـ أخرجه الطبري في (تفسيره) (تفسير ابن كثير ) لسورة التكاثر : ٨ .
٤ ـ أخرجه الترمذي (٣٣٥٨) وقال : حديث غريب ، وابن حبان (٧٣٦٤) والحاكم (١٩٨/٤) وفي (علوم الحديث) (١٨٧) وعبدالله بن أحمد في (زوائد الزهد) (ص ٣١) والبيهقي في (الشعب) (٤٦٠٧) وصححه الشيخ الألباني في ( الصحيحة) (٥٣٩) و (صحيح الجامع) (٢٠٢٢) .

نەکرد؟ ئایا ئاوی ساردمان بە دەرخوارد نەدا؟))

هەروەها (أحمد و ابن ماجه)[١] لە فـەرموودەی (معـاذ ی کوڕی عبدالله ی کوڕی خبیب) ەوە لە (باوکی)یەوە ئەویش لە (مامی)یەوە دەڵێـت: ((کنـا في مجلس فجاء النبي ﷺوعلى رأسه أثر ماء، فقال له بعضنا: نراك اليوم طيب النفس، فقال: ((أجل و الحمد لله)) ثـم أفـاض القـوم في ذكـر الغنـى، فقـال: ((لا بـأس بـالغنى لمـن أتقـى، والصحة لمن أتقى خير من الغنـى، وطيـب الـنفس مـن النعـيم)) واتـە: لـە مەجلیسی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین، پێغەمبەری خواﷺ هاتە ژوورەوە شوێنەواری ئـاو بـە سەرییەوە دیـار بـوو، هەنـدێکمان بـە ئـەوی گـوت: ئـەمڕۆ دەتبیـنین رووت خۆشـە، ئـــویش فـــەرمووی: بـــەڵێ ســـوپاس بـــۆ خـــوا، ئـــەمجار خەڵکەکـــە زۆر باســـی دەوڵەمەندییان کرد، پێغەمبـەری خـواﷺ فـەرمووی: دەوڵەمەنـدی قەیـدی نییـە بـۆ کەسێك تەقوای هەبێت، تەندروستیش بۆ کەسێك تـەقوای هـەبێت لـە دەوڵەمەنـدی باشترە، هەروەها رووخۆشی لە نیعمەتەکانە)).

لە (مسند أحمد)دا هاتوە بە سەنەدێکی (صحیح)[٢] لەڕێگای چەند(شـاهد) ێکـەوە لە فـەرموودەی (أبـو عـسیب) کـەوا پێغەمبـەری خـواﷺ رۆژێـك چـوە نـاو بـاخێکی هەندێ لە پشتیوانان (الأنصار) خاوەنی باخەکە هەندێ خورما و ئاوی ساردی هێنـا بـۆ پێغەمبـــەری خـــواﷺ (أبـــو بکـــر و عمـــر) ی لـــە گەڵـــدا بـــوو، پێغەمبـــەری خواﷺفەرمووی: ((لتسألنَّ عن هذا يوم القيامة)) واتە: دەربـارەی ئەمـە پرسـیارتان لێ دەکرێت لە رۆژی قیامەتدا)).

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا کە (الترمذي) بە سەنەدێکی (صحیح)[٣] لە رێگای چەند (شواهد)ێکەوە رێوایەتی کردوە، لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی مسعود)ەوە

١ ــ أخرجـه أحمـد (٥/٣٧٢ , ٣٨١) وابـن ماجـه (٢١٤١) والحـاكم (٢/٣) وصـححه ووافقـه الـذهبي وقـال البوصيري : اسناده صحيح ورجاله ثقات وصححه العلامة الألباني في (الصحيحة) (١٧٤).

٢ ــ أخرجـه أحمـد (٥/٨١) والطـبري في (التفـسير) (٣٧٨٩٥) والبيهقـي في (الـشعب) (٤٢٨١) ط الرشـد , وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب ) (٣٢٢١) وهو في (صحيح مـسلم) (٢٠٣٨) مـن حـديث أبـي هريرة .

٣ ــ أخرجه الترمذي (٢٤١٦) وقال : حديث غريب , وبرقم (٢٤١٧) عن أبي بـرزة الأسـلمي وصـححه الـشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٧٢٩٩ , ٧٣٠٠) و(الصحيحة) (٩٤٦) .

کەوا خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: ((لا تزول قدما ابن آدم یوم القیامة من عند ربه حتی یسأل عن خمس: عن عمره فیم أفناه وعن شبابه فیم أبلاه وعن ماله من أین اکتسبه وفیم أنفقه وماذا عمل فیما علم)) واتە: دوو پێی هیچ بەندەیەك گۆڕەپانی لێپرسینەوە بە جێ ناهێڵێت لە ڕۆژی قیامەتدا تا پرسیاری پێنج شتی لێ نەکرێت: دەربارەی تەمەنی کەوا لە چی شتێکدا بە سەری برد، دەربارەی لاوێتی بە چیدا تەواوی کرد، دەربارەی سامانەکەی لە کوێوە پەیدای کرد و چۆن سەرفی کرد، دەربارەی زانیارییەکەی تا چەند کاری پێکرد)).

یەکەم پرسیار لێی دەکرێت: ((عن عمره فیما أفناه)) باش بزانە کە تەمەن گەورەترین سەرمایەیە، هەر ئەویش گەورەترین کوتاڵ و کەرەستەیە، هەر کەسێك سەرمایەکەی یان کوتاڵ و کەرەستەکەی لە دەست بدات و هیچ قازانجێکی نەکردبێت ئەوا بە ڕاستی لە خەسارەتمەندانە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾﴾ المؤمنون.

واتە: ئایا پێتان وابوو بە گەمە و بێ هودە دروستمان کردوون و هەرگیز بۆ لای ئێمە ناهێنرێنەوە بۆ تۆڵەو پاداش؟! (١١٥) مەزنایەتی و بەرزی وبڵندی هەر بۆ خوای پاشا و فەرمانڕەوای هەقە، زۆر لەوەش بەرزترە کە ئەوان گاڵتەی پێ بکەن، هەر ئەوە پاشا، هەر ئەوە ڕاست و دروستبێژ، هەرچی شتە بە دەستی ئەوە، هیچ پەرستراوێکی هەق جگە لەو زاتە نییە هەر خۆی خاوەنی عەرشە (١١٦).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى﴾(القیامة: ٣٦) واتە: ئایا مرۆڤ وا دەزانێ وازی لێ دەهێنرێ بە پشتگوێخراوی و زیندوو ناکرێتەوە و پاداش و تۆڵە نییە؟!)).

بۆیە وریابە سەرقاڵی دونیا مەبە و دوارۆژ لە بیر بکەی، ئەگەر لە دونیادا بە ئاگا نەیەیتەوە ئەوا کاتێك بە خۆت دەزانی لە ریزی مردوانی!! چونکە رۆژگار دێت و دەڕوات، ئەمجار مانگەکان بە دوایدا دەڕۆن، ساڵەکان لە گەڵ خۆیاندا رادەکێشن،

لە پاشدا تەمەن بە دوای خۆیدا دەبات، ئەمجار ژیان قۆناغ بە قۆناغ دەڕوات تاکو تەواو دەبێت، لە پاش هەموو ئەوانە هەموان لە بەر دەستی خوای باڵادەست و شکۆمەندا رادەوەستن، بە مەبەستی پرسیارکردن دەربارەی بچوك و گەورە، دەربارەی کەم و زۆر، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ﴾الأنبياء: ٤٧، واتە: بێ گومان ڕۆژی قیامەت ئێمە ترازووی دادپەروەری دائەنێین و کردەوەکانیانی پێ ئەکێشین ئەوسا هیچ کەسێك کەمترین ستەمی لێ ناکرێ چ لە چاك کاران، چ لە خراپەکاران، تەنانەت ئەگەر کردەوەکانیانی بە ئەندازەی سەنگی دەنکە گەردیلەیەکیش بێت کە لە بچووکیدا کراوە بە نموونە، ئێمە ئەیهێنین و ئامادەی ئەکەین وە ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە کە بە وردی ژمێریاری کردەوەکانیان بین)).

لە فەرموودەیەکدا هاتوە کە ئیمامی (بوخاری)[١] ریوایەتی کردوە لە فەرموودەی (ابن عباس) ەوە کەوا خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: ((نعمتان مغبون فیهما کثیر من الناس الصحة والفراغ)) واتە: دوو نیعمەت هەن زۆربەی خەڵکی لێی بێ ئاگان: تەندروستی و دەست بەتاڵی)).

واتە: هەرکەسێك تەندروستی و کاتی خۆی لە گوێڕایەڵی خوادا بە کار هێنا یان لە کارێکی چاکی دینەکەی یان دونیاکەی ئەوا کەسێکی کامەران و بەختیارە لە دونیا و دوارۆژدا، بەڵام هەرکەسێك تەندروستی و کاتی خۆی بۆ گوێڕایەڵی خوای گەورە بە کار نەهێنا یان بۆ کارێکی چاکی دینەکەی یان دونیاکەی ئەوا کەسێکی زەرەرمەند و خەسارەتمەندە لە دونیا و دوارۆژدا.

دانایەك لە دانایان هەردەم دەیفەرموو[٢]: ((چۆن دڵخۆش دەبێت کەسێك ڕۆژەکەی مانگەکەی بڕوخێنێت و مانگەکەی ساڵەکەی بڕوخێنێت و ساڵەکەی

---

١ ــ أخرجه البخاري (٦٤١٢) .

٢ ــ (ذم الدنيا) لابن أبي الدنيا (١٩٥) وانظر (لطائف المعارف) لابن رجب الحنبلي (٣٢١/١) و (جامع العلوم والحكم) (٣٨٣) .

تەمەنی بڕوخێنێت، هەروەها چۆن دڵخۆش دەبێت کەسێك تەمەنی بەرەو ئاکام و ئەجەلەکەی ڕێنوێنی بکات و ژیانی بەرەو مردنی ڕێنوێنی بکات)).

هەروەها جارێك (الفضیل ی کوڕی عیاض) گەیشتە کابرایەك، (الفضیل) بە کابرای فەرموو[1]: تەمەنت چەندە؟؟ کابرا فەرمووی: شەست ساڵە.

(الفضیل) فەرمووی: کەواتە تۆ شەست ساڵە بەرەو لای خوا دەڕۆیت و زۆرت نەماوە پێی بگەی.

کابرا فەرمووی: إنا لله وإنا إلیه راجعون.

(الفضیل) فەرمووی: ئایا ماناکەی دەزانی؟؟

کابرا فەرمووی: بەڵێ دەزانم من بەندەی خودام و بۆ لای ئەو دەگەڕێمەوە.

(الفضیل) فەرمووی: براکەم.. هەرکەسێ زانی کەوا بەندەی خودایە و بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە ئەوا با بزانێت کە لە بەر دەستێدا رادەوەستێ و هەر کەسێ زانی کەوا لە بەر دەستیدا رادەوەستێ ئەوا با بزانێت کە بەرپرسیارە و هەر کەسێ زانی کەوا بەرپرسیارە ئەوا با بۆ ئەو پرسیارە وڵامێك ئامادە بکات..

کابرا دەستی بە گریان کرد و فەرمووی: ـ ئەی چارە چییە؟

(الفضیل) فەرمووی: ـ ئاسانە..

کابرا فەرمووی: ئەی ئەوە چییە رەحمەتی خوات لێ بێت؟

(الفضیل) فەرمووی: ـ ئەو تەمەنەی کە ماوە باشەی تیادا ئەنجام بدە، خوای گەورە لە تاوانەکانی رابووردوو و ئەوانەی کە ماوە خۆش دەبێت وە ئەگەر لەوەی کە ماوە خراپە بکەیت ئەوا سزای کردارە خراپەکانی رابووردوو و داهاتووت وەردەگریتەوە.))

هەردەم (لقمان الحکیم)[2] بە کوڕەکەی خۆی دەفەرموو: ((کوڕی خۆم! تۆ لەو ڕۆژەوە چاوت بە ژیان هەڵهێنا ئەوا پشتت لە دونیا کردوە و ڕووت لە دوارۆژ کردوە،

---

١ ـ أخرجه ابو نعیم في ((الحلیة )) (٨/ ١١٣) , وانظر : (( جامع العلوم والحکم ))( ٣٨٣) , و ((لطائف المعارف )) (١٠٨ ) .

٢ ـ انظر (حلیة الأولیاء) (٦/٣٢٠) و (ذم الدنیا) لأبن أبي الدنیا(٧٣) و (الزهد) لابن المبارك (١٠٦٠) وابن عساکر في (تاریخه) (٣/٣٢) .

تۆ لەوماڵەی کە رووت لێکردوە نزیکتری تاکو ئەو ماڵەی پشتت لێی کردوە و لێ دوور کەوتویتەوە))

إذا مر بي يوم ولم أقتبس هدى ولم    أستفد علماً فما ذاك من عمري

ئەوە بکە دروشمی خۆت برا شیرینەکەم!

هەروەها جەستەش سپاردەی خوایە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا﴾الإسراء: ٣٤، واتە: بە دوای شتێکدا مەچۆ و نەزانی چییە و چۆنە و زانیاریت دەربارەی نییە، واتە: تا بە تەواوی زانینت بە شتێ نەبێت، هەنگاوی جیددی بۆ نەنێیت و قسەی لێ نەکەیت و بە دوای گومان مەکەوە، چونکە بە راستی هەموو ئەمانە: (گوێ و چاو و دڵ) هەریەکەیان لە رۆژی قیامەتدا بەرپرسیارن لێی))

پرسیارت لێ دەکرێت دەربارەی دڵەکەت.

کێت خۆش دەوێت؟ رقت لە کێیە و کێت خۆشناوێت؟ پشتگیر و پشتیوانی کێ دەکەیت؟ دوژمنایەتی و دژایەتی کێ دەکەیت؟ چی شتێك تۆ دەجولێنێتەوە و کارت تێ دەکات، راستگۆیی یان ئارەزوەکان؟ کێ لە ناو دڵی تۆدایە؟ ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ﴾ البقرة: ١٦٥، واتە: ئەوانەش وا باوەڕیان هێناوە، خوایان لە هەموو شتێك زیاتر خۆش دەوێ)).

پرسیارت لێ دەکرێت دەربارەی جەستەت بە چی شێوەیەك فەوتاندت و بە کارت هێنا؟ لە گوێڕایەڵیدا، یان لە هەوەس و ئارەزوو و تام و چێژی ئەم دونیایەدا؟ هیچ کێشە نییە ئەگەر کار بۆ ئەم دونیایە بکەیت بەڵام هەرگیز دوارۆژت لە بیر نەچێت، لە فەرموودەیەکدا هاتوە کە (الترمذي) ریوایەتی کردوە بە سەنەدێکی (صحيح)[١] لە فەرموودەی (أنس) ەوە دەفەرموێت: پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((من كانت الآخرة همه جعل الله غناه في قلبه وجمع له شمله، وأتته الدنيا وهي

---

١ ـ أخرجه الترمذي (٢٤٦٥) وابن ماجه (٤١٠٥) وأحمد(١٨٣/٥) وصححه الألباني في (الصحيحة) (٩٤٩ , ٩٥٠).

راغمة، ومن كانت الدنيا همه جعل الله فقره بين عينيه، وفرق عليه شمله، ولم يأته من الدنيا إلا ما قدر له)) واتە: هەرکەسێ دوارۆژ مەبەستی بێت ئەوا خوای گەورە دەوڵەمەندی دەخاتە دڵییەوە و هەموو شتە دژەکانی بۆ کۆ دەکاتەوە وە دونیا بە ملکەچییەوە پێشوازی لێ دەکات، هەرکەسێ ئەگەر مەبەستی دونیا بێت ئەوا خوای گەورە هەژاری دەخاتە نێو چاوی و هەموو شتە دژەکانی بۆ جیاوازتر دەکات وە لە دونیادا هیچی دەست ناکەوێت ئیللا ئەوەی کە خوای گەورە بۆی دیاری کردوە)).

هەروەها پرسیارت لێ دەکرێت دەربارەی زانست و زانیارییەکەت، ئایا چ کارێکت بەو زانستە کردوە کە فێری بووی.؟ لە پێشدا باسی ئەو زانایەمان کرد کە دەخرێنە دۆزەخەوە و ئاگریان پێ گڕ دەدرێت، چونکە ئەوە کەسێکی ریاکار بوە ! !

لە فەرموودەیەکدا کە (الترمذي) و جگە لەو بە سەنەدێکی (صحیح)[1] ریوایەتیان کردوە لە فەرموودەی (کعب ی کوڕی مالك) ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((من طلب العلم ليجاري به العلماء أو ليماري به السفهاء أو يصرف به وجوه الناس إليه أدخله الله النار)) واتە: هەرکەسێك بە دوای زانستدا گەڕا فێری بوو بۆ ئەوەی پێشبرکێی پێ بکات لە گەڵ زانایاندا، یان بۆ ئەوەی دەمە دەم و موناقەشەی نەفامانی پێ بکات یان بۆ ئەوەی سەرنج و رووی خەڵکی بۆ لای خۆی راکێشێ ئەوا خوای گەورە دەیخاتە ناو ئاگرەوە)).

بۆیە هەردەم پێغەمبەری خواﷺ پەنای بە خوای گەورە دەگرت لە زانستێکی بێ سوود، هەروەکو لە (صحیح مسلم)[2] دا هاتوە لە فەرموودەی (زید ی کوڕی أرقم) ەوە دەفەرموێت: ((هیچ شتێکتان پێ ناڵێم تەنها ئەوە نەبێت کە پێغەمبەری خواﷺ دەیفەرموو: ((اللهم إني أعوذ بك من علم لا ينفع، ومن قلب لا يخشع، ومن نفس لا تشبع، ومن دعوة لا يستجاب لها)) واتە: ئەی خودایە.. پەنات پێ دەگرم لە زانستێکی بێ سوود و لە دڵێك لە تۆ نەترسێت و لە نەفسێك هەرگیز تێر نەبێت و لە

---

١ ـ أخرجه الترمذي (٢٦٥٤) وصححه الألباني في (الترغيب) (١٠١) وأخرجه ابن ماجه (٢٥٩) عن حذيفة , وأبو داود (٣٦٦٤) وابن ماجه (٢٦٠) عن أبي هريرة , وابن ماجه (٢٥٣) عن ابن عمر , وبرقم (٢٥٤) عن جابر .

٢ ـ أخرجه مسلم (٢٧٢٢) .

دوعايەك وەڵام نەدرێتەوە و گیرا نەبێت)).

هەروەها پرسیارت لێ دەكرێت دەربارەی سەروەت و سامان!! ((وعن ماله من أين اكتسبه و فيم أنفقه)) واتە: هەروەها دەربارەی سەروەت و سامانەكەی پرسیاری لێ دەكرێت لە كوێوە بە دەستی هێنا و چۆن سەرفی كردوە))

سەروەت و سامان نیعمەتێكی خوایە، ئای چەند نیعمەتێكی بەڕێز و چاكە! ئەگەر لە بەر دەستی چاكەكاران و پیاوچاكاندا بێت، بۆ ئەوەی تەنها لە پێناوی رازی بوونی خوای گەورەدا بە كاری بهێنن.

لە (صحیح البخاری)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابن مسعود) ەوە كەوا خۆشەویستی خوا ﷺ فەرموویەتی: ((أيكم مال وارثه أحب إليه من ماله؟ قالوا: يا رسول الله، ما منا أحد إلا ماله أحب إليه. قال ﷺ: ((فإن ماله ما قدم، ومال وارثه ما أخر)) واتە: كام لە ئێوە سامانی میراتگرەكەی لە سامانەكەی خۆی خۆشتر دەوێت؟ فەرموویان: ــ ئەی پێغەمبەری خواﷺ هیچ كەسێك لە ئێمە نییە وە هەموومان سامانی خۆمان لا خۆشەویستترە، فەرمووی: ــ كەواتە سامانەكەی خۆی ئەوەیە كە پێشی خۆی دەخات و سامانی میراتگرەكەی ئەوەیە بە جێی دەهێڵێ)).

هەروەها لە (صحیح مسلم)[2] دا هاتوە لە فەرموودەی (عبدالله ی كوڕی الشخير) كەوا خۆشەویستی خوا ﷺ فەرموویەتی: ((((يقول ابن آدم: مالي مالي، قال: وهل لك، يا ابن آدم من مالك إلا ما أكلت فأفنيت، أو لبست فأبليت، أو تصدقت فأمضيت؟)).واتە: بەنی ئادەم دەڵێت: سامانەكەم..سامانەكەم.. وتی: ئایا چی شتێكت هەیە لە سامانەكەت تەنها ئەوە نەبێت كە خواردت و فەوتاندت، یان ئەوەی لەبەرت كرد و رزاندت و كۆنت كرد، یان ئەوەی بەخشیت و رەوانەت كرد؟)).

ئا ئەوە پاشەكەوتە و بۆت هەڵگیراوە لای خوای گەورە لە دوارۆژدا.

---

١ ـ أخرجه البخاري (٦٤٤٢) .

٢ ـ أخرجه مسلم (٢٩٥٨) .

لە (سنن الترمذي)[١] دا هاتوە لە دایکە (عائشە)وە کەوا ئەوان مەڕێکیان سەربڕی، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((ما بقي منها؟)) قالت: ((ما بقي منها إلا كتفها)) قال: ((بقي كلها غير كتفها)) واتە: چی بەشێکی لێ ماوە؟ فەرمووی:هیچ شتێك نەماوەتەوە تەنها شانەکەی نەبێت، ئەویش فەرمووی: هەموو ماوە تەنها شانەکەی نەبێت)).

دڵنیابە ئەوەی کە بەخشیوتە تەنها ئەوە ماوەتەوە، بۆیە لە حەرام کۆ مەکەرەوە، سوێند بە خوا ئەوە بۆ تۆ هیچ سوودی نییە، چونکە خوای بەرز و باڵادەست مۆڵەت دەدات بەڵام هەرگیز فەرامۆش ناکات، ئەوە نیشانەی خۆشەویستی و رازی بوونی خوا نییە، ئا ئەوەتا قارون کۆمەڵێك لە پاڵەوانە بەهێزەکان ناتوانن کلیلی خەزنەکانی هەڵگرن!! لە گەڵ ئەوەشدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ﴾(القصص: ٨١) واتە: سەرەنجام خۆی و خانوەکەیمان برد بە ناخی زەویدا بە سامان و گەنجینەکەشیەوە)).

بۆیە هەرگیز مەغرور مەبە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ﴾(المؤمنون:١١٥) واتە: ئایا پێتان وابوو بە گەمە و بێ هودە دروستمان کردوون و هەرگیز بۆ لای ئێمە ناهێنرێنەوە بۆ تۆڵەو پاداش؟!)).

بۆیە هەرگیز وا مەزانە پرسیارت لێ ناکرێت دەرابەری ئەوەی کۆی دەکەیتەوە.

لە (مسند أحمد) دا بە سەنەدێکی (صحیح)[٢] هاتوە لە فەرموودەی (عقبە ی کوڕی عامر) کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((إذا رأيت الله يعطي العبد من الدنيا على معاصيه، فإنما هو استدراج)) واتە: ئەگەر بینیت خوای گەورە نیعمەت و فەزڵ و پۆشینی تاوان و مۆڵەت دان دەبەخشێتە بەندەیەکی لە دونیادا وە بەندەکەش بەردەوامە لەسەر سەرپێچی و بە بێ تەوبە بزانە ئەوە نزیك کردنەوەیە

١ ـ أخرجه الترمذي (٢٤٧٠) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن الترمذي) .

٢ ـ أخرجه أحمد (١٤٥/٤) والطبراني في (الأوسط) (٩٢٧٢) والبيهقي في (الشعب) (٤٥٤٠) وصححه الألباني في (صحيح الجامع) (٥٦١) و(الصحيحة) (٤١٣) .

(استدراج)ە)). ئەمجار پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّىٰ إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ الْقَوْمِ الَّذِينَ ظَلَمُوا وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٤٥﴾﴾ الأنعام، واتە: کە ئەو هەموو ئامۆژگارییەیان لە بیرخۆ بردەوە کە لەسەر زمانی پەیامبەران کرابوون ئینجا ئێمەیش بۆ خەفڵاندنیان دەروازەی هەموو خێرێکمان بۆ والا کردنەوە و رزق و ڕۆزییەکی فرەمان ڕشت بە سەریاندا و ئەوانیش خۆشی و نەشوە گرتنی هەتا بەو ماڵ و منداڵەی پێماندابوون دەعیە و فیزگرتنی و لە ڕێی ڕاست لایاندا ئەوسا ئێمەیش کتوپڕێك ڕقمان لێ گرتن و ئەوانیش لەو هەموو خۆشگوزرانییە بێ هیوا و نائومێد بوون.(٤٤) ئینجا ئەوانەی کە ناهەقی و ستەم پیشەیان بوو، هەموو خێر و خۆشیەکیان لە کیس چوو و دوابڕاو بوون سوپاس و ستایشی بێ پایانیش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان.(٤٥)).

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَذَرْهُمْ فِي غَمْرَتِهِمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٥٤﴾ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾﴾ المؤمنون، واتە: ئاخۆ ئەوان پێیان وایە کە بەو ماڵ و منداڵە پێیان دەبەخشین (٥٥) دەمانەوێ بە پەلە لەو نیعمەتانە بەهرەوەریان بکەین؟ نەخێر، ئەوانە تێ ناگەن، ئەگینا ماڵ و منداڵ نیشانەی چاکی و ڕێز لێنان نییە، بەڵکو بۆ تاقیکردنەوەیە (٥٦).

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا الْإِنسَانُ إِذَا مَا ابْتَلَاهُ رَبُّهُ فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَكْرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلَاهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَهَانَنِ ﴿١٦﴾﴾ الفجر، واتە: بەڵام مرۆڤی کافر و خوا نەناس کاتێ، کە پەروەردگاری تاقی کردەوە بە پێدانی ماڵ و دارایی، ڕێزی لێنا و سەروەت و سامانی پێ بەخشی و نیعمەت و بەهرەی بە سەردا ڕشت تا دەرکەوێ: سپڵەیە یان سوپاسگوزارە، بە بایبونێکەوە دەڵێت: پەروەردگارم ڕێزی لێناوم لە بەر ئەوەی شایەنی ئەو بەهرەیەم بۆیە پێی داوم (١٥) بەڵام کاتێکیش تاقی کردەوە بە تەنگانە ڕۆزی لێ گرتەوە، بە ئاگاییەکەوە دەڵێت:

پەروەردگارم سووکایەتی پێ کردوم! چونکە وادەزانێ ڕێزی مرۆڤ بە سامانەوەیە (١٦) نەخێر.. هیچی وا نییە، چونکە خوا ماڵ و سامان بە هەموو کەسێ دەدات، چاك و خراپ، یان لێیان دەگرێتەوە (١٧).

جا مەرج نییە ئەوەی خوای گەورە رزقی فراوان کردبێت بەڵگەی ڕێزی خوای گەورەیە بۆ کەسەکە، لە هەمان کاتدا ئەوەی خوای گەورە ژیانی لێ تەنگ کردبێت بەڵگەی سووکایەتی خوای گەورەیە بۆ کەسەکە!!

دع الحرص على الدنيا وفي العيش فلا تطمع
لا تجمع من الحرام فلا تدري لمن تجمع
فإن الرزق مقسوم وسوء الظن لا ينفع
فقير كل من يطمع غنى كل من يقنع

واتە: واز بهێنە لە سووربون لەسەر دونیا و تەماحت با نەبێت بۆ ژیان، هەردەم حەرام کۆمەکەرەوە چونکە نازانیت بۆ کێی کۆ دەکەیتەوە، دڵنیابە کە رزق دابەش کراوە و گومانی خراپ هیچ سوودی نییە، هەژارە هەر کەسێ چاوچنۆك و چڵێس بێت و دەوڵەمەندە هەرکەسێ ڕازی بێت)).

هەروەها هەموان پرسیاریان لێ دەکرێت دەربارەی ئەو پەیمانانەی کە لە گەڵ خوادا بەستوویانە، ئەو پەیمانەش کە لە گەڵ خەڵکیدا بەستوویانە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا﴾ (الإسراء: ٣٤) واتە: پەیمانیشتان لە گەڵ خوا، لە گەڵ خەڵکی بەرنە سەرێ، چونکە بە ڕاستی خاوەن پەیمان لە دوارۆژدا پرسینەوەی هەیە)).

هەروەها هەموو بەندەیەك پرسیاری لێ دەکرێت دەربارەی ژێر دەستەکەی و دەربارەی خێزانەکەی، هەموو ئافرەتێك پرسیاری لێ دەکرێت لە ڕۆژی قیامەتدا، لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی عمرو) ەوە کەوا

١ ـ أخرجه البخاري , كتاب الجمعة , باب الجمعة في القرى و المدن (٨٩٣) , و مسلم كتاب الإمارة , باب فضيلة الإمام العادل (١٨٢٩) .

پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((ألا كلكم راع وكلكم مسؤولُ عن رعيته، الإمام راع ومسؤول عن رعيته، والرجل راع في أهله وهو مسؤول عن رعيته، والمرأة راعية في بيت زوجها ومسؤولة عن رعيتها، والعبد راع في مال سيده ومسؤول عن رعيته و كلكم راع و مسؤولُ عن رعيته)))) واتە: هەر هەمووتان شوان و بەرپرسن و بەر پرسیارن لەو ژێر دەستەی کە پێتان سپێردراوە، پێشەوا شوان و بەرپرسە و بەرپرسیارە لەسەر ژێر دەستەکەی، پیاو شوان و بەرپرسە لەسەر خێزانەکەی و هەر ئەویش بەرپرسیارە لەسەر ژێر دەستەکەی، ئافرەت شوان و بەرپرسە لە ماڵی پیاوەکەیدا وە هەر ئەویش بەر پرسیارە لەسەر ژێر دەستەکەی، خزمەتکار شوان و بەرپرسە لە ماڵی گەورەکەیدا و هەر ئەویش بەرپرسیارە لەسەر ژێردەستەکەی، کەواتە هەر هەمووتان شوان و بەر پرسن و هەمووتان بەرپرسیارن لەسەر ژێر دەستەکەتان)).

خۆشەویستان... کاتێك خوای گەورە لە لێپرسینەوەی بەندەکان بووەوە دەربارەی مافەکانی خۆی، ئەمجار خوای گەورە فەرمان دەکات کە کێشەی ستەملێکراوەکان ئامادە بکرێت بە مەبەستی تۆڵەسەندنەوە، بۆ ئەوەی مافی هەموو بەندەکان کە لای بەندەکانە بدرێتەوە.

أيها المظلوم صبراً لا تهن  إن عين الله لا تنام
نم قرير العين واهنأ خاطراً  فعدل الله قائم بين الأنام

ئەی ستەمکار..!! بە هەموو دڵێك قسەت لە گەڵدا دەکەم..!! هەرگیز مەغرور مەبە بە هێزەکەت، بە سەروەت و سامانەکەت، بە کەسایەتیت لە ناو خەڵکیدا، بە پلەوپایەکەت، بە کورسییەکەت، بە دەسەڵاتەکەت، بە تەندروستییەکەت، سوێند بە خوا لە بەر دەستی خوای باڵادەستدا رادەوەستیت و لە بارەی هەموو گەورە و بچوکێکەوە پرسیارت لێ دەکرێت، با هیچ کەسێك وا نەزانێت دەچێتە بەهەشتەوە ـ هەرچەندە کەسێکی ئیماندار بێت ـ لە کاتێکدا حەقی موسڵمانێکی لە گەردن بێت، زۆر ئەستەم و مەحاڵە.. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّـٰمٍ

لِّلۡعَبِيدِ ﴾فصلت:٤٦، واته: پەروەردگاریشت هەرگیز غەدرباز و ستەمکار نییە لە بەندەکانی و بێ کەم و کورت پاداشتیان ئەداتەوە)).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ﴾ (النساء: ٤١) واته: بێ گومان خوا بە سەنگی بچووکترین گەردیلە (زەڕە) ستەم لە هیچ کەس ناکا)).

بەڵکو سەرسام دەبیت کاتێ بزانی خوای گەورە تۆڵەی هەموو ئاژەڵ و گیانداران لە رۆژی قیامەتدا دەسێنێتەوە، هەروەکو لە (صحیح مسلم)[1] دا لە فەرموودەی (أبو هريره)ەوە هاتوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لتؤدن الحقوق إلى أهلها يوم القيامة، حتى يقاد للشاة الجلحاء، من الشاة القرناء)) واته: دەبێت هەموو مافەکان بگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان لە رۆژی قیامەتدا تەنانەت مەڕی بێ شاخ مافی خۆی لە مەڕی شاخدار دەسێنێتەوە)).

دەبێت مەڕی بێ شاخ تۆڵەی خۆی لە مەڕی شاخدار بکاتەوە لەڕۆژی قیامەتدا و لە بەر چاوی هەموو خەڵکی.

لە (مسند أحمد) و (الطيالسي) دا هاتوە بە سەنەدێکی (صحيح) لە رێگای چەند (شواهد)[2] ێکەوە لە فەرموودەی (أبو ذر) ەوە کەوا خۆشەویست ﷺ دوو مەڕی بینی، شەڕە قۆچیان دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((يا أباذر أتدري فيما تنتطحان. قلت: لا، قال: لكن ربك يدري وسيقضي بينهما يوم القيامة)) واته: ئەی (أبو ذر) ئایا دەزانیت بۆ شەڕ دەکەن؟ گوتم:نەخێر، فەرمووی: بەڵام پەروەردگارت دەزانێت و لە رۆژی قیامەتدا لە نێوانیاندا داوەری دەکات)).

هەروەها (ابن جرير الطبري) بە سەنەدێکی(جيد)[3] ریوایەتی کردوە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی عمرو) ەوە دەڵێت: ((ئەگەر رۆژی قیامەت هات خوای

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٥٨٢) .

٢ ـ أخرجه أحمد (١٦٢/٥ , ١٧٣) والطيالسي (٤٨٠) وقال الهيثمي في (المجمع) (٦٣٨/١٠) وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٦١٠/٤) تحت حديث (١٩٦٧) وانظر رقم(١٥٨٨) .

٣ ـ أخرجه ابن جرير الطبري في التفسير وقال الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٦٠٧/٤) : إسناده جيد , رجاله ثقات رجال الشيخين غير أبي المغيرة)

گەورە زەوی رادەخات و فراوانی دەکاتەوە تا چاو بڕدەکات، هەموو ئاژەڵ و گیاندار و ولاخێك کۆ دەکرێتەوە، ئەمجار تۆڵەی گیانداران لە یەك دەکرێتەوە، مەڕی بێ شاخ تۆڵەی خۆی لە مەڕی شاخدار دەکاتەوە کە لێی دابێت، کاتێ لە تۆڵە سەندنەوەی گیانداران بوەوە خوای گەورە پێیان دەڵێت: ((کونی ترابا)) واتە: ببنە خۆڵ (گڵ) دەڵێت: لەو کاتەدا بێباوەڕان دەڵێن: (یا لیتنی کنت ترابا) واتە: بریا ئێمەش ببینە خۆڵ (گڵ)) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّآ أَنذَرْنَٰكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا يَوْمَ يَنظُرُ ٱلْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًۢا﴾النبأ: ٤٠، واتە: بە ڕاستی ئێمە هەر زوو ئێوەمان ئاگادار کردوە - ئەی بێ بڕوایان - کە سزایەکی نزیك بەرێوەیە بۆتان ئەو رۆژە رۆژێکە کە ئادەمیزاد سەیری دەسپێشکەری خۆی دەکات - لە چاك و لە خراپی - ئەو کاتە کافر و بێ بڕوایش دەڵێت: ئای خۆزگە هەر خاك و خۆڵ بوومایە نەك ئادەمی تا ئاوا زیندوو نەکرامایەتەوە و حیساب نەکرامایە)).

بیهێنە پێش چاوی خۆت ئەمە حاڵی ئەو درندە و ئاژەڵ و گیاندارانەیە، ئایا گومانت چۆنە بەرانبەر بە کەسی بەرپرسیار و پێسپێردراو! ؟؟ بۆیە دەبێت تۆڵە هەبێت، هەر دەبێت تەرازووی دادپەروەری دانرێت بۆ تۆڵەسەندنەوە.

أمـا والله إن الظلـم شـؤم ولا زال المسيئ هـو الظلـوم
سـتعلم يـا ظلـوم غـداً إذا التقينا عند المليك من الملوم
الى ديـان يـوم الـدين نمـضي وعنـد الله تجتمـع الخـصوم

بۆیە ئاگاداری ستەم بە برای شیرینم.

لا تظلمـن إذا مـا كنـت مقتـدراً فـالظلم ترجـع عقبـاه الى النـدم
تنـام عينـاك والمظلـوم منتبـهٌ يـدعوا عليـك و عـين الله لم تـنم

واتە: هەرگیز ستەم مەکە ئەگەر بوویتە کەسێکی بە توانا و دەسەڵاتدار، چونکە هەردەم ستەم پەشیمان بوونەوەی بە دواوەیە، تۆ دەخەوی و چاوەکانت لە یەك

دەنێت و ستەملێکراویش بە ئاگایە، دوعات لێ دەکات و چاوەکانی خوایش نەخەوتوە)).

کاتێ پێغەمبەری خواﷺ(معاذ ی کوڕی جبل) ڕەوانەی یەمەن کرد ــ فەرموودەکە لە هەردوو کتێبی (صحیح)[١]دا هاتوە ــ لە فەرموودەی (ابن عباس)ەوە، پێغەمبەری خواﷺ بە (معاذ) ی فەرموو: ((واتق دعوة المظلوم، فإنه ليس بينها وبين الله حجاب) واتە: خۆت لە نزا و پاڕانەوەی ستەملێکراو بپارێزە، چونکە لە نێوان ئەو و خوای گەورەدا هیچ پەردەیەك نییە)).

لە ڕیوایەتێکی تردا[٢] لە فەرموودەی (أبو هريرە)وە: ((و دعوة المظلوم يرفعها الله فوق الغمام يوم القيامة، وتفتح لها أبواب السماء، ويقول الرب وعزتي لأنصرنك ولو بعد حين)) واتە: نزا و پاڕانەوەی ستەملێکراو خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا بەرزی دەکاتەوە بە سەر هەورەکەدا، هەموو دەرگاکانی ئاسمانی بۆ دەکرێتەوە، خوای پەروەردگار: دەفەرموێت: سوێند بە عیززەتی خۆم دەبێت سەرت بخەم ئەگەر دوایش خرا بێت)).

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[٣] دا هاتوە لە فەرموودەی (أبو موسى الاشعرى) یەوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((إن الله تعالى ليملي للظالم حتى إذا أخذه لم يفلته)) وقرأ قوله تعالى: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِيَ ظَٰلِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾ هود: ١٠٢، واتە: بە ڕاستی خوای گەورە مۆڵەتی ستەمکار دەدات، هەر کاتێك گرتی چیتر بەری نادات پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە ئەمە ماناکەیەتی: ((ئا بەو شێوەیە تۆڵەسەندنی پەروەردگاری تۆ کاتێك تۆڵە دەسێنێت لە خەڵکی شار و دێهاتەکان لە حاڵێکدا کە یاخی و ستەم پیشەبوون، بە ڕاستی تۆڵەسەندنەکەی زۆر بە ئێش و سەختە)).

---

١ ـ أخرجه البخاري (٢٤٤٨) ومسلم (١٩) .

٢ ـ أخرجه الترمذي (٢٥٢٦) و(٣٥٩٨) وابن ماجه (١٧٥٢) وأحمد (٢/٣٠٤ , ٣٠٥ , ٤٤٥) وابن حبان (٨٧٤ ، ٧٣٨٧) وصححه لشواهده الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٢/٥٢٧ ، ٥٢٨ ) تحت حديث (٨٢٠) .

٣ ـ أخرجه البخاري (٤٦٨٦) ومسلم (٢٥٨٣).

له (سنن ابن ماجه) و (صحيح ابن حبان) و جگه لەوان[١] له فەرموودەی (جابر ی کوڕی عبدالله) وه هاتوه کەوا پێغەمبەری خواﷺ به کۆچەرانی فەرموو ـ ئەوانەی که له حەبەشه گەڕانەوه ـ : ((ألا تحدثوني بأعاجيب ما رأيتم بأرض الحبشة؟)).

قال فتية منهم: بلى يا رسول الله، بينا نحن جلوس مرت بنا عجوز من عجائزها رهابينهم تحمل على رأسها قلة من ماء، فمرت بفتى منهم فجعل إحدى يديه بين كتفيها، ثم دفعها فخرت على ركبتيها فانكسرت قلتها، فلما ارتفعت التفتت إليه، فقالت: سوف تعلم يا غدر إذا وضع الله الكرسي وجمع الأولين والآخرين وتكلمت الأيدي والأرجل بما كانوا يكسبون فسوف تعلم كيف أمري وأمرك عنده غدا، قال: يقول رسول الله ﷺ: ((صدقت صدقت! كيف يقدس الله أمة لا يؤخذ لضعيفهم من شديدهم )).

واته: ئایا باسی سەیرترین شتم بۆ ناکەن لە زەوی حەبەشەدا بینیبێتتان؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خواﷺ، له کاتێکدا ئێمه دانیشتبووین پیرەژنێك لە پیرەژنەکانی ئەوان به تەنیشتماندا تێپەڕی، گۆزەیەك ئاوی بە سەر هەڵگرتبوو، لاوێکی ئەوان به تەنیشتیدا تێپەڕی و دەستی خسته نێوان هەردوو شانی و پاڵی پێوەنا، ئەویش له سەر هەردوو ئەژنۆی کەوت و گۆزەکەی شکا، کاتێ هەستا رووی لێ کرد و گوتی: ئەی ستەمکار دەبێ حاڵی تۆ چۆن بێت کاتێ خوای گەورە کورسی دادەنێت و پێشینەکان و پاشینەکان کۆ دەکاتەوه و دەست و پێیەکان دێنێته قسه باسی هەموو ئەو کارانەی ئەنجامی دابێت دەکات، سبەینێ حاڵی من و حاڵی تۆ دەبینی لای خوای گەوره، دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: راستی گوت.. راستی گوت.. خوای گەوره چۆن ئوممەتێك پیرۆز دەکات لە کاتێکدا حەقی ستەملێکراو و لاوازەکانیان له بەهێز و ستەمکارەکانیان نەکەنەوه)).

ئوممەتی ستەمکار بەرەو نەمان دەڕوات هەرچەنده موسڵمان بێت و ئوممەتی دادپەروەری دەمێنێتەوه و بەردەوام دەبێت هەرچەنده بێباوەڕ بێت، هەروەکو (ابن

---

١ ــ أخرجه ابن ماجه (٤٠١٠) وابن حبان (٥٠٥٨) وأبو يعلى (٢٠٠٣) وروي عن بريدة عند البيهقي في (الكبرى) (٦/٩٥)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع ) (٤٥٩٧، ٤٥٩٨).

تیمیە)[1] دەڵێت: ((خوای گەورە دەوڵەتی دادپەروەری جێگیر و دامەزراوی دەکات هەرچەندە دەوڵەتێکی بێباوەڕ بێت و دەوڵەتی ستەم جێگیر و دامەزراوی ناکات هەرچەندە دەوڵەتێکی موسڵمان بێت)).

جا ستەمکردن تاریکستانە لە ڕۆژی قیامەتدا، چونکە لەوێ دەرهەم و دینار و ریال و دولار نییە، بەڵکو (حسنات)و (سیئات)ە!!

لە (صحیح البخاری)[2] دا هاتوە لە فەرموودەی (أبو هریرە)وە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((من كانت له مظلمة لأحد من عرضه أو شيء فليتحلله منه اليوم، قبل أن لا يكون دينار ولا درهم، إن كان له عمل صالح أخذ منه بقدر مظلمته، وإن لم تكن له حسنات أخذ من سيئات صاحبه فحمل عليه)) واتە: هەرکەسێك ستەمی لە کەسێك کردوە (حەقی کەسێك ها بە سەریەوە) لە هەر ڕوویەکەوە با گەردنی خۆی پێ ئازاد کات، پێش ئەوەی ڕۆژێك بێت کە نە دیناری تێدایە و نە دەرهەم، ئەگەر کردەوەی چاکی هەبێت ئەوا لێی دەسێنرێت و دەدرێت بە ستەملێکراوەکە، بەڵام ئەگەر چاکەی نەبوو ئەوا خراپەکانی ئەو دەدرێتە کۆڵی ستەمکارەکەدا)).

واتە: لە چاکەکانی ئەو دەدەن بە براکەی، ئەگەر چاکە و حەسەناتی نەما ئەوا لە خراپەکانی براکەی دەدرێتە کۆڵی ئەودا و ئەمجار فڕێ دەدرێتە دۆزەخەوە!!

لە (صحیح مسلم)[3] دا هاتوە لە فەرموودەی (أبو هریرە)وە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((أتدرون من المفلس؟ قالوا: المفلس فينا يا رسول الله من لا درهم له ولا متاع. فقال رسول الله ﷺ: إن المفلس من أمتي، يأتي يوم القيامة بصلاة وصيام وزكاة ويأتي وقد شتم هذا وقذف هذا وأكل مال هذا، وسفك دم هذا، وضرب هذا، فيعطى هذا من حسناته وهذا من حسناته، فان فنيت حسناته قبل أن يقضى ما عليه، أخذ من خطاياهم فطرحت عليه ثم طرح في النار)) واتە: ئایا دەزانن مایەپووچ کێیە؟ وتیان: مایەپووچ لە ناو ئێمەدا ئەی پێغەمبەری خواﷺ کە پارە و

---

١ ـ انظر: مجموع الفتاوى (٢٨/٦٣) و الأستقامة (٢/٢٤٧).
٢ ـ أخرجه البخاري (٢٤٤٩، ٦٥٣٤).
٣ ـ أخرجه مسلم (٢٥٨١).

پول و شت ومەکی نەبێت، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: مایەپووچ لە ئوممەتەکەی من کەسێکە کە لە ڕۆژی قیامەتدا دێت نوێژی کردوە و ڕۆژووی گرتوە و زەکاتیشی داوە بەڵام جوێنی بە ئەم داوە و بوختانی بۆ ئەو هەڵبەستوەو ماڵی ئەوی خواردوەو خوێنی ئەوی رشتوە و لە کەسێکی تری داوە، لە چاکەکانی دەدرێت بە ئەم و ئەو، کاتێك ئەگەر چاکەکانی تەواو بوو و هێشتا مافی خەڵکی بە سەرییەوە مابوو ئەوە لە تاوانەکانی ئەوان دەدرێت بە سەر ئەمدا، پاشان فڕێ دەدرێتە ناو ئاگرەوە)).

کەسی ستەمکار لە ڕۆژی قیامەتدا دێت لە گۆڕەپانی لێپرسینەوە و لە بەر دەستی پادشای پادشاکاندا، هەموو ئەوانەی ستەمی لێیان کردوە لە دونیادا دەورووبەری لێ گرتوون، لە هەموو لایەکەوە، هەر یەك لەوان حەق و مافەکەی خۆی دەوێت، ئەمجار لە چاکەکانی ئەو ستەمکارە دەدرێتە ستەملێکراوەکان تاکو چاکەکانی نامێنێت و تەواو دەبێت، ئەمجار لە خراپەکانی ستەملێکراوەکان دەدرێتە کابرای ستەمکار، تاکو لاپەرەی چاکەکان بە سپێتی دەمێنێتەوە! ئایا لە بیرت چوە براکەم ئەو ساتانەی کە لە بەر دەستی خوادا راوەستاویت!؟

سوێند بە خوا دەبێ حەقی هەموان بدەیتەوە بە بێ کەموکوڕی، هەرکە چاکەکانت تەواو بوو ئەوا لە خراپەی ئەوان دەدرێ بە کۆڵی تۆدا و دەگوێزرێتەوە لاپەرەکەی تۆ... بەڵێ... ئەمە خراپەکانی ئەو کەسانەیە تۆ ستەمت لێ کردبوو لە دونیادا، بۆیە بە ناچاری سەرت بڵند دەکەیتەوە، گەردنی تکا و پاڕانەوەت بەرز دەکەیتەوە بۆ لای پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکان بۆ ئەوەی رزگارت بکات لەوانە، بۆیە بە گوێیەکانی خۆت دەبیسی و دڵت دادەخورپێت بە بانگی خوای گەورە کاتێ دەفەرموێت: ﴿ٱلْيَوْمَ تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ۚ لَا ظُلْمَ ٱلْيَوْمَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾غافر: ١٧،واتە: لەو ڕۆژەدا هەرکەس هەرچی کردوە پاداشت و تۆڵەی کاری خۆی دەبینێ لەورۆژەدا هیچ جۆرە ستەم و غەدرێك نییە،بێ زیاد وکەم هەموو کەسێك پاداشت و تۆڵە ئەدرێتەوە بە راستی خوا زوو و پەلە حیساب و لێکۆڵینەوە دەکات)).

خـــــوای گـــــەورە دەفـــــەرموێت: ﴿وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعۡمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمۡ لِيَوۡمٍ تَشۡخَصُ فِيهِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴿٤٢﴾ مُهۡطِعِينَ مُقۡنِعِي رُءُوسِهِمۡ لَا يَرۡتَدُّ إِلَيۡهِمۡ طَرۡفُهُمۡۖ وَأَفۡـِٔدَتُهُمۡ هَوَآءٌ ﴿٤٣﴾﴾ (إبـراهيم)، واتـە: هـەرگیز تـۆ وا بـیر مەکەرەوە کە خوا لە کاروکردەوەی ستەمکاران خافڵ و بێ ئاگابێت، نەخێر، بەڵکو بە هەموو کارێکیان زانا و ئاگادارە، بەڵام بۆ ماوەیەك مۆڵەتیان دەدات، پاشان دەیانگرێ و تۆڵەیان لێ دەسێنێت وەکو دەفەرموێ: هەر بۆ ئەو ڕۆژە دوایان دەخا و دەیانهێڵێتەوە کە ئەوەندە سەختە گشت چاوێك لە ترسانا ئەبڵەق دەبن و لە بزووتن دەکەون (٤٢) لە ترسانا بە پەلە بەرەو جارچیّ خوا دەچن و بە سەر بەرەو ئاسمان هەڵبڕاوی ناتوانێ بیسوڕێنێ، پێڵووی چاویشیان وەستاوە و نایەتە خوارەوە واتە: لە بەر قورس و گرانی ئەو ڕۆژە چاویان ئەبڵەق بووەو نایترۆکێنن و دڵیشیان لە هەموو هەست و نەستێك بەتاڵ و حەتاڵە(٤٣)).

دڵت لە سنگت دێنە دەرەوە و دەگەنە گەردنت هەروەکو خوای گەورە دەفـــەرموێت: ﴿ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡۚ لَا ظُلۡمَ ٱلۡيَوۡمَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ﴾ ( غافر:٢٨) واتە: ئەوانە لە ڕۆژە نزیکەکەی قیامەت بترسێنە (آزفة) یەکێکە لە ناوەکانی ڕۆژی قیامەت، بۆیە دەوترێ (آزفة) چونکە نزیکە بێت، کاتێ لە ترس و هەیبەتا گیان و دڵەکان دەگەنە گەروو و ڕادەوەستن بە پیشخواردوویی دڵەکانیان پڕن لە خەم و خەفەت، ئەو کات ستەمکاران هیچ پشتیوان و دۆستێکیان نییە، بتوانێ کەڵکیان پێ بگەیەنێ و هیچ تکاکارێکیشیان نییە، تکای وەربگیردرێ، هەموو پەیوەندییەك دەبچڕێ)).

برا خۆشەویستەکەم لە فلسطین...برا بەڕێزەکەم لە عێراق... لە لوبنان... لە ئەفغانستان... لە شیشان... ئەی ئەو کەسەی ستەمت لێکراوە، ئەی ئەوانەی خوێنتان بە ناهەق ڕژاوە.. ئەی ئەوانەی جەستەیان پارچە پارچە کراوە، ئارام بگرە و دڵتەنگ مەبە ! !

أين الظالمون و أين التابعون لهم في الغي بـــل أيـــن فرعـــون وهامـــان؟

أين من دوَّخوا الدنيا بسطوتهم وذكرهم فى الورى ظلم و طغيان؟
هل أبقى الموت ذا عزّ لعزته أو هل نجا منه بالسلطان إنسان؟
لا والذي خلق الأكوان من عدم الكلُّ يفنى فلا إنس و لآ جان

واتە: کوان ستەمکاران و کوان شوێنکەوتووانیان لە گومڕاییدا؟ بەڵکو کوا فیرعەون و هامان؟ کوان ئەوانەی کە دونیایان قاڵ کردبوو بە دەسەڵاتیان و یادی ئەوان لە نێو دروستکراوەکاندا لە ستەم و سەرکەشی؟ ئایا مردن هیچ خاوەن عیززەتێکی هێشتوەتەوە بە هۆی عیززەتەکەیەوە؟ یان ئایا هیچ مرۆڤێك بە هۆی سوڵتانەکەیەوە رزگاری بوە؟نەخێر سوێند بەو کەسەی کە بوونەوەرەکانی لە نەبوونەوە دروستکردوە،هەموو نامێنن نە مرۆڤ و نە جنۆکە)).

ئەم بەشە بە پرسیارێکی گرنگ کۆتایی پێ دەهێنم، ئەویش بریتییە لەوەی: ئاخۆ یەکەم شتێك خوای گەورە حوکمی لە سەر بدات لە نێوان بەندەکاندا چییە؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێین: ئەو شتە خوێنە.. ئەمجار خوای گەورە حوکمی خۆی دەدات، خوێن یەکەم مافە لە مافی بەندەکان، کە خوای گەورە حوکمی لە سەر بدات لە رۆژی قیامەتدا، ئەوەش بزانە هیچ جیاوازی و دژایەتییەك نییە لە نێوان ئەم فەرموودە و ئەو فەرموودەی کە دەڵێت: ((إن أول ما يحاسب عليه العبد: الصلاة))[1] واتە: یەکەم شتێك کە لە رۆژی قیامەتدا بەندەکان لێپرسینەوەیان لەسەر بکرێت نوێژە)).جا ریوایەتەکەی ئیمامی (النسائي) ئەو دوو ریوایەتەی کۆ کردوەتەوە، پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((أول ما يحاسب عليه العبد: الصلاة،و أول ما يقضى بين الناس في الدماء))[2] واتە: یەکەم شتێك کە لە رۆژی قیامەتدا بەندەکان

---

١ ـ أخرجه الترمذي في أبواب الصلاة، باب ما جاء أن أول ما يحاسب به العبد يوم القيامة الصلاة (٤١٣) , والنسائي كتاب الصلاة، باب المحاسبة على الصلاة (١ / ٢٣٢)، وابن ماجه، كتاب إقامة الصلاة ، باب أول ما يحاسب به العبد الصلاة ( ١٤٢٥)، وأحمد (٢/ ٢٩٠ , ٤٢٥)، وصححه الألباني في ((الصحيحة)) ( ١٣٥٨) من حديث أبي هريرة (رحمه الله) .

٢ ـ أخرجه النسائي (٨٣/٧)، والطبراني في (الكبير) (١٠٤٢٥) , وحسن الألباني سنده في الشواهد كما في ((الصحيحة )) (١٧٤٨) وصححه لغيره في (صحيح الترغيب) (٢٤٣٥) و (صحيح الجامع) (٢٥٧٢). وانظر كذلك للجمع بين الحديثين (شرح مسلم) للنووي (١٦٧/١١) و فتح الباري لابن حجر (٤٠٤/١١).

لێپرسینەوەیان لەسەر بکرێت نوێژە و یەکەم شتێك لە ڕۆژی قیامەتدا لە نێوان خەڵکیدا حوکمی لەسەر بدرێت خوێنە)).

جا خوێن حورمەتێکی مەزنی هەیە، چونکە خوای گەورە خۆی ژیانی بەخشیوەتە خەڵکی، بۆ هیچ کەسێك نییە ئەو حەقە حەڵاڵ بکات، یان سنوورەکانی خوای گەورە ببەزێنێت و حەڵاڵی بکات تەنها لە ڕێگای شەرعەکەی خوای گەورەوە نەبێت، خوای گەورە تەنها خۆی خەڵکی باش دەناسێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾الملك:١٤، واتە: مەگەر خوا نازانێ کێی دروست کردوە و چۆنی دروست کردوە لە کاتێکدا زۆر وردبین و بە ئاگایە؟)).

جا هەروەکو باسمان کرد خوێن حورمەتێکی گەورە و مەزنی هەیە، بۆیە خوێن یەکەم شتێکە لە نێوان بەندەکاندا حوکمی لە سەر بدرێت لە ڕۆژی قیامەتدا، هەروەکو لە هەردوو کتێبی (الصحیح)[1]دا هاتوە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی مسعود) ەوە کەوا خۆشەویستی خواﷺ فەرموویەتی: ((أول ما يقضى بين الناس يوم القيامة في الدماء)) واتە: یەکەم شتێك لە ڕۆژی قیامەتدا لە نێوان خەڵکیدا حوکمی لەسەر بدرێت خوێنە)).

بە جوانی بیر لەو هەڕەشەیە بکەرەوە خوای گەورە باسی کردوە لە کتێبەکەیدا و دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا ﴾ (النساء: ٩٣) واتە: هەرکەسێك بە دەستی ئەنقەست مرۆڤێکی خاوەن باوەڕ بکوژێ سزا و تۆڵەی هەر دۆزەخە و بە هەتا هەتاییش تێیدا ئەمێنێتەوە غەزەب و تووڕەیی خوا لە سەرە و نفرینیشی لێ کردووە و سزایەکی گەورە و قورسیشی بۆ ئامادە کردوە))

با هیچ کەسێك وا تێنەگات ئەو خوێنەی کە دینەکەمان بە پیرۆزی زانیوە و حورمەتی ڕوون کردوەتەوە تەنها خوێنی موسڵمانانە، بەڵکو خوێنە بە شێوەیەکی گشتی لە سنووری ئەو شەریعەتەی خوای گەورە خۆی دایڕێژاوە.

---

١ ـ أخرجه البخاري (٦٥٣٣) ومسلم (١٦٧٨) .

دەڵێم: با هیچ کەسێك وا تێنەگات

جارێکی تر لێرەدا باسی ئەو فەرموودەیە دەکەم کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی هەروەکو ئیمامی (البخاری) ریوایەتی کردوە (التاریخ الکبیر)دا و (عبدالرزاق) لە (المصنف) دا و (الطبراني) لە (الکبیر) و (الأوسط) دا (ابن حبان) لە (الصحیح) دا و (البیهقی) لە (سنن)[1] ەکەیدا لە فەرموودەی (عمرو ی کوڕی الحمق الخزاعی)یەوە بە سەنەدێکی (صحیح) کەوا پێغەمبەری خوا(ρ) فەرموویەتی: ((من أمن)) واتە: هەرکەسێ ئەمانیدا بە کەسێکی تر ((من أمن رجلا علی دمه فقتله، فأنا بریئ من القاتل وإن کان المقتول کافرا)) واتە: هەرکەسێ ئەمانی دا بە کابرایەك لەسەر خوێنەکەی و ئەمجار کوشتی، ئەوا من لە بکوژەکە بەریم و هەرچەندە ئەگەر کابرای کوژراو کەسێکی بێ باوەڕ بوو)).

حەزم دەکرد و خۆشحاڵ دەبووم ئێستا (فاتیکان) و (ئەوروپا) و (ئەمریکا) گوێ بیستی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرﷺبوایەن! تکام وایە چەند خۆشەویست و برایەك ـ ئەوانەی دڵیان بۆ دینەکەی خوا دەسوتێت بە شێوەیەکی گشتی و بۆ پێغەمبەرەکەیانﷺبە تایبەتی ـ ئەم چەند وشانەم وەرگێڕنە سەر زمانەکان.

پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی (هەروەکو لە (صحیح البخاری)[2] دا هاتوە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی عومەر)ەوە: ((لن یزال المؤمن في فسحة من دینه، ما لم یصب دما حراما)) واتە: کەسی ئیماندار بەردەوام وا لە نێو فراوانی دینەکەیدایە، تاوەکو خوێنێکی قەدەغەکراو نەڕێژێ)).

جا بۆیە (عبدالله ی کوڕی عومەر) دەیفەرموو: ((إن من ورطات الأمور، التي لا مخرج لمن أوقع نفسه فیها: سفك الدم الحرام بغیر حله))[3] واتە: لە کارە گرفت و کارەساتەکان ئەوەیە هەرگیز رزگاربوونی نییە ئەگەر هاتوو کەسێك خۆی

---

١ ـ أخرجه البخاري –معلقاً – في ((التاریخ الکبیر)) (٣/ ٣٢٢)، وابن حبان (٦٠٨٢ )، والطیالسي (١٣٦٩)، وعبدالرزاق (٥/٣٠٠) , والطبراني في (الکبیر) (٢٠/ ٢٢٢،٢٢٧،٢٣٠) و (الأوسط( (١٤٠٣) والبیهقي في ((الکبری)) (٩/ ١٤٢)، وابن ابي عاصم في (الآحاد والمثاني) (٢٠٧٤) عن عمرو بن الحمق الخزاعي وله شواهد صححه بها الألباني في ((الصحیحة )) (٤٤٠) .

٢ ـ أخرجه البخاري، کتاب الدیات، باب قول الله تعالی : ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ ﴾ (النساء: ٩٣) (٦٨٦٢) .

٣ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو (٦٨٦٣ ) .

تێوەگلاند: ڕشتنی خوێنی حەرامە بە بێ حەڵاڵ کردنی)).

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا کە (أحمد و النسائی و الحاکم)[١] ریوایەتیان کردوە لە فەرموودەی (معاوية)ەوە، هەروەها (ابوداود و الحاکم) ریوایەتیان کردوە لە فەرموودەی (أبو الدرداء) ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺفەرموویەتی: ((کل ذنب عسى الله أن يغفره، إلا من مات مشركا، أو مؤمن قتل مؤمنا متعمدا)) واتە: هەموو تاوانێك ڕێی تێ دەچێت و ڕەنگە خوا لێی خۆش بێت تەنها کەسێك نەبێت کە بە موشریکی مردووە یان کەسێکی ئیماندار بە قەستی کەسێکی ئیمانداری کوشتووە)).

ئەم نامەیە پێشکەشی براکانمی دەکەم لە فلسطین و عێراق: واز لە خوێن ڕشتنی موسڵمان بهێنن.

برا بەڕێزەکەم لە فلسطین و لە عێراق: ئاگاداربە هەرگیز خوێنی برا موسڵمانەکەت نەڕێژی، چونکە بە ڕاستی گرفت و کێشەیەکە دەربازبوونی نییە نە لە دونیا و نە لە دوارۆژدا، باش بزانە خوێن ڕشتنی موسڵمان حەرام و قەدەغەیە، لە هەردوو کتێبی (الصحيح)[٢] دا هاتوە لە فەرموودەی (أبی بکره) وە کەوا پێغەمبەری خواﷺلە (حەجیماڵئاوایی)دا فەرمووی: ((فإن دماءكم وأموالكم و أعراضكم بينكم حرام كحرمة يومكم هذا في شهركم هذا في بلدكم هذا)) واتە: بزانن کەوا خوێن و سامان و ناموستان لە سەرتان حەرامە وەکو حورمەتی ئەمڕۆ لەم مانگەتاندا و لەم شارەتاندا)).

ئاخۆ دیمەنەکانی قیامەت کۆتایی پێهات؟ نەخێر.. لە پاش لێپرسینەوە تەرازوو دادەنرێت و دادەمەزرێت، لێپرسینەوە بۆ پێشکەشکردنی کردەوەکانە و تەرازوو بۆ دەرخستن و زانینی ئەندازەکەیەتی، بۆ ئەوەی پاداشت یان تۆڵە بە ئەندازەی کارەکە ببێت، ئەمەو چەند باسێکی تر لە بەشی داهاتوودا باس دەکەین انشاء الله، خوای باڵادەست و شکۆمەند تاوانەکانی من و ئێوە داپۆشێ لە دونیا و قیامەتدا.

---

١ ــ أخرجه ابو داود (٤٢٧٠) والحاكم عن ابي الدرداء، و أخرجه أحمد ( ٤ / ٩٩)، والنسائي كتاب تحريم الدم (٨١/٧)، والحاكم(٣٩١/٤) وقال: ((صحيح الإسناد))، ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني لشواهده في ((صحيح الجامع)) (٤٥٢٤) و ((الصحيحة )) ( ٥١١) .

٢ ــ أخرجه البخاري (٦٧) وانظر (٤٤٠٦) ومسلم (١٢١٨) .

# ( تەرازوو ) و ( سیرات )

## الميزان والصراط

خۆشەویستان... تەرزاوو كێشە و باسێكی زۆر گرنگ و ترسناك و بەشكۆیە.. ئێمەی ئیمانداری یەكتاپەرست باوەڕی بتەومان بە تەرازوو هەیە، هەروەها باوەڕێكی تەواومان هەیە كە هیچ كەسێك شێوە و گەورەییەكەی نازانێت تەنها خوای بەخشندە و میهرەبان نەبێت.

ئەوەش بزانە كە تەرازوو كردەوەكان یان بەندەكان یان نامەی كردەوەكانی پێ كێشانە و پێوانە دەكرێت، بە پێی سێ بۆچوونی زانایان[1]، لە پاشاندا باسی ئەوە دەكەین - انشاء الله - بەڵام لێرەدا بە جوانی بیر لەو فەرموودەیەی پێغەمبەری مژدەدەری ترسێنەر ﷺ بكەرەوە هەروەكو لە (مستدرك الحاكم)[2] هاتوە بە سەنەدێكی (صحيح) لە فەرموودەی (سلمان الفارسی)یەوە كەوا خۆشەویستی خوا ﷺ دەفەرمووێت: ((يوضع الميزان يوم القيامة، فلو وزن فيه السماوات و الأرض لوسعت، فتقول الملائكة: يا رب لمن يزن هذا؟ فيقول الله تعالى: لمن شئت من خلقي، فتقول الملائكة: سبحانك ما عبدناك حق عبادتك)) واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا تەرازوو دادەنرێت، ئەگەر زەوی و ئاسمانەكانی پێ كێشانە بكرێت جێی هەمووی دەبێتەوە، فریشتەكان دەڵێن: ئەی پەروەردگارا.. ئەمە بۆ كێ كێشانە دەكات؟ خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: بۆ هەر كەسێك ویستم لە سەری بێت لە دروستكراوەكانم،

---

١ - راجعها بالتفصيل في (شرح الطحاوية) (ص ٢٣٠ - ٢٣٢ ط أولي النهى ) و (معارج القبول ) ( ٢/٨٤٥ - ٨٤٩) ط ابن القيم وابن عفان .

٢ - أخرجه الحاكم (٤/٥٨٦) وقال : هذا حديث صحيح على شرط مسلم ووافقه الذهبي، قال الألباني: وفيه نظر، ثم قال: وقد رواه الآجري في (الشريعة) (٣٨٢)موقوفاً على سلمان وإسناده صحيح وله حكم المرفوع لأنه لا يقال من قبيل الرأي، وصححه الشيخ الألباني لغيره في (صحيح الترغيب ) (٣٦٢٦) وانظر (الصحيحة ) (٩٤١).

فریشتەکان دەڵێن: پاکی و بێگەردی بۆ تۆ، بە ڕاستی حەقی تۆمان نەداوە لە پەرستندا))

ئەمەش ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت کەوا تەرازوو هیچ کەسێك ئەندازەکەی نازانێت تەنها خوای بەخشندە و میهرەبان نەبێت، مانای (لوسعت) واتە: (لوسعت كَفّتاه أو كِفّتاه)) هەردوو مانەکە تەواوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَلَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗاۖ وَإِن كَانَ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٍ أَتَيۡنَا بِهَاۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴾ (الأنبياء: ٤٧) واتە: بێ گومان ڕۆژی قیامەت ئێمە ترازووی دادپەروەری دائەنێین و کردەوەکانیانی پێ ئەکێشین ئەوسا هیچ کەسێك کەمترین ستەمی لێ ناکرێ چ لە چاك کاران، چ لە خراپەکاران، تەنانەت ئەگەر کردەوەکانیانی بە ئەندازەی سەنگی دەنکە گەردیلەیەکیش بێت، ئێمە ئەیهێنین و ئامادەی ئەکەین وە ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە کە بە وردی ژمێریاری کردەوەکانیان بین)).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ ﴾(النساء: ٤٠) واتە: بێ گومان خوا بە سەنگی بچووکترین گەردیلە (زەڕە) ستەم لە هیچ کەس ناکا)).

لە فەرموودەیەکی قودسیدا هاتوە: ((یا عبادي، إني حرمت الظلم علی نفسي وجعلته بینکم محرماً فلا تظالموا))[1] واتە: ئەی بەندەکانم.. من ستەمم لە سەر خۆم حەرام کردوە و لە نێوان ئێوەشدا حەرامم کردوە، بۆیە هەرگیز ستەم مەکەن)).

بە جوانی بیر لەو ئایەتە بکەرەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ١٠١ فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٠٢ وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فِي جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ١٠٣ تَلۡفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمۡ فِيهَا كَٰلِحُونَ ١٠٤ ﴾(المؤمنون) واتە: ئینجا

١ ـ أخرجه مسلم (٢٥٧٧) .

کاتێ لە جاری دووەمدا فووکرا بە شەیپوردا (کەرەنادا) بۆ زیندووبوونەوە، ئیتر لە بەر قورسی و نارەحەتی ئەو ڕۆژەیە هیچ نەسەب و خزمایەتییەك لە نێوانیاندا ناخوێنرێتەوە، چونکە هەر کەسەی سەرقاڵ و سەرگەرمە بە کاری خۆیەوە و پەردەژی نییە، تا ئاوڕ بە لای خزمەکەیەوە بداتەوە تەنها کردەوەی چاك و بڕوای چاك کەڵکی دەبێ بۆی و لە یەکتریش ناپرسن چونکە هەر یەکە کاری خۆی هەیە (١٠١) ئینجا ئەو کەسەی تای تەرازووی کێشانەی کردەوەکانی قورس و سەنگین بێ ئەوە ئەوانەن سەرفراز و رزگار دەبن (١٠٢) هەر کەسێکیش تەرازووی چاکەی سووك بێ، واتە خراپەکانی لە چاکەکانی زیاتر بێت ئەمانە ئەو کەسانەن زیانیان بە خۆیان گەیاندوە و گومڕا و بەدبەختبوون و خۆیانیان لە کیس چوە بە هەتا هەتاییش لە دۆزەخدا ئەمێننەوە و هەرگیز رزگاریان نابێت (١٠٣) شۆڵە و بڵێسەی ئاگر چرۆچاویان دەبرژێنێ و لێوەکانیشیان هەڵدەقرچێ (١٠٤).

جا هەرکەسێك تای تەرازووەکەی قورستر بێت ئەگەر بە تەنها یەك حەسەنەش بێت ئەوا دەرباز دەبێت و بەختیار و کامەرانە، بۆیە هەرگیز هیچ چاکەیەکیش بە کەم مەزانە،چونکە تەنها حەسەنەیەك ڕەنگە ببێتەهۆی ئەوەی بچیتە بەهەشتەوە و خوای گەورە تەرازووەکەتی پێ قورس و سەنگین دەکاتەوە، هەروەها رەنگە تەنها خراپەیەك (سیئە) بە هەلاکەتدا بتبات و تەرازووەکەت سووك بکات.

خوای گەورە دەفەرموێت: ((فَأَمَّا مَنْ ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ (٦) فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَاضِيَةٍ (٧) وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ (٨) فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ (٩) وَمَا أَدْرَاكَ مَا هِيَهْ (١٠) نَارٌ حَامِيَةٌ (١١) القارعة) واتە: ئینجا ئەو کەسە کە لەو ڕۆژەدا تای کێشانەی کردەوەکانی قورس بوو (٦)ئەوە لە نێو گوزەران و خۆشییەکی وادا دەبێت خۆی پێی رازییە (٧) بەڵام ئەو کەسەش کە تای کێشانەی کردەوەکانی سووك بوو (٨) ئەوە دایکی ئەو دۆزەخەو باوەشی بۆ گرتۆتەوە (٩) تۆ چوزانیت (هاویە) چییە؟ (١٠) ئاگرێکی زۆر گەرمە (١١).

بۆیە هەرگیز هیچ کارێك بە کەم مەزانە، رەنگە کارێکی بچووك ببێتە هۆی ئەوەی خوای گەورە بە هۆیەوە رزگارت بکات لە ئاگر، هەروەکو لە فەرموودەیەکدا هاتوە:

((اتقوا النار ولو بشق تمرة)) واتە: خۆتان لە ئاگر بپارێزن ئەگەر بە لەتە خورمایەکیش بێت)).

بەڵام هەرکەسێك چاکەکان و خراپەکانی یەکسان بوون، ئەوا لە ئەهلی ئەعراف دەبن لە جێگایەکدا لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا - بە رای زۆربەی زانایان [1] - ، کەواتە ئەهلی ئەعراف کۆمەڵە کەسێکن چاکە و خراپەیان وەکو یەکە و یەکسانە، چاکەکانیان بە بەهەشتیان ناگەیەنێت و لەوە کەمترە بە هۆیەوە بچنە بەهەشتەوە، هەروەها بوونەتە هۆی ئەوەی لە ئاگر بیانپارێزێت، ئەوانە ئەهلی ئەعرافن، ئەهلی ئەعراف کاتێك تەماشای ئەهلی بەهەشت بکەن دەڵێن: سڵاوتان لێ بێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ وَعَلَى ٱلْأَعْرَافِ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلًّا بِسِيمَـٰهُمْ وَنَادَوْا۟ أَصْحَـٰبَ ٱلْجَنَّةِ أَن سَلَـٰمٌ عَلَيْكُمْ لَمْ يَدْخُلُوهَا وَهُمْ يَطْمَعُونَ ﴿٤٦﴾ وَإِذَا صُرِفَتْ أَبْصَـٰرُهُمْ تِلْقَآءَ أَصْحَـٰبِ ٱلنَّارِ قَالُوا۟ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾( الأعراف)، واتە: لە نێوان هەردوو دەستەکەدا بەهەشتی و دۆزەخی پەردە شوورەیەك هەیە و بە سەر شوورەکەی نێوان بەهەشت و دۆزەخەوە کۆمەڵێ ژن و پیاوی موسڵمان هەن، هەمووشیان بە سەروسیما دەناسن دۆزەخیەکان بە رووی رەش و بەهەشتییەکانیش بە رووی گەش و سپیانەوە و لە یارانی بەهەشت بانگ ئەکەن و ئەڵێن: سڵاوی خواتان لە سەر بێت یاخوا لە سزا و تۆڵە پارێزراو بن و هەر لە خۆشیدا بن، شیاوی باسە هێشتا هەر لە (ئەعراف) قەتیس ماون و نەچوونەتە بەهەشتەوە و بە تەمان تێی بچن، چونکە خوا تەماحی ناوەتە بەریان (٤٦) کاتێکیش چاویان لە بەهەشتییەکان وەردەگێڕدرێ بەرەو رووی دۆزەخییەکان دەڕوانن و بەو حاڵە زۆر خراپەیانەوە دەیان بینن دەڵێن: پەروەردگارمان! تکات لێ دەکەین مەمانخە ریزی ئەوانەی ستەمیان کردوە.(٤٧)

جارێکی تر دەگەڕێینەوە بۆ باسە گرنگەکە: ئەویش بریتییە لەوە ئایا چی شتێك دەکرێتە سەر تەرازوو؟

هەروەکو باسمان کرد زانایان سێ بۆچوونیان هەیە لەم بارەیەوە:

---

١ - راجع (تفسير ابن كثير) و (لسورة الأعراف : ٤٧) و (تفسير الطبري) كذلك (الأعراف :٤٦ , ٤٧) .

یەکەم: دەڵێن: کردەوەکانی دەخرێتە سەر،وەکو یەکتاپەرستی و نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەج و فەرمان کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە و بانگەواز بۆ دینی خوا ئامادە بوون لە کۆڕ و مەجلیسی زانستدا و گریان لە ترسی خوادا و تا کۆتایی ئەو هەموو کار و کردەوە چاکانە.

ڕەنگە کەسێك بڵێت: چۆن ئەو شتانە دەخرێتە سەر تەرازوو لە کاتێکدا ئەوانە بەر جەستە نین؟ چۆن یەکتاپەرستی دەخرێتە سەر تەرازوو؟ چۆن ترسی خوا و پەناگرتن بە خوا و تکاکردن و گەڕانەوە و پشت بەستن بە خوا دەخرێتە سەر تەرازوو؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێین خوای گەورە بە توانایە هەموو کارو کردەوەکان بگۆڕێتە بەرجەستە و ئەمجار لە سەر تەرازووی دانا، بۆ ئەوەی تەرازووەکە قورس و سەنگین بێت یان تەرازووەکە سووك بێت، بە پێی چاکە و خراپەکان، بەڵگەش لە سەر ئەوە لە فەرموودەی پێغەمبەری خوداوە ﷺ زۆرە، فەرموو براکەم هەندێ لەو بەڵگانە، یەکێك لەو بەڵگانە ئەو فەرموودەیە کە (البخاری و مسلم)[1] ریوایەتیان کردوە لە فەرموودەی (أبو هریرە)وە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((کلمتان، خفیفتان علی اللسان، ثقیلتان في المیزان حبیبتان الی الرحمن: سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظیم)) واتە: دوو وشە هەن، سووکن لەسەر زمان، قورس و سەنگینن لە سەر تەرازوو، خۆشەویستن لای خوای میهرەبان کە ئەوانیش بریتین لە:: سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظیم)).

خێراکە براکەم تەرازووەکەت قورس و سەنگین بکە، لەکاتێکدا تۆ ئێستا دانیشتویت، بزانە کەوا خوای گەورە ئەو دوو وشەی خۆش دەوێت، ئەمە بەرجەستە نییە و دەخرێتە سەر تەرازوو، خوای گەورە بەو دوو وشە جوان و خۆشەویستە تەرازووی بەندەی ئیمانداری پێ قورس و سەنگین دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا.

هەروەها لە بەڵگەیەکی تر بۆ ئەو بابەتە: ئەو فەرموودەیە کە (أبو داود و الترمذي و أحمد) و جگە لەوان ریوایەتیان کردوە لە فەرموودەی (أبو درداء)وە بە

---

١ ـ أخرجه البخاري (٦٤٠٦) و مسلم (٢٦٩٤) .

سەنەدێکی (صحیح)[1] کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ما من شيء أثقل في ميزان المؤمن يوم القيامة من حسن الخلق)) واتە: هیچ شتێك نییە قورس و سەنگین بێت لە تەرازووی کەسی ئیمانداردا لە ڕۆژی قیامەتدا وەکو ڕەوشت جوانی))

خێراکە براکەم ڕەوشتت جوان بکەرەوە لە گەڵ خواکەی خۆتدا، لە گەڵ پێغەمبەرەکەتدا ﷺ، لە گەڵ خێزانەکەتدا، لە گەڵ دایك و باوکتدا، لە گەڵ منداڵەکانتدا و لە گەڵ دەرهاوسێکانتدا، لە گەڵ فەرمانبەرەکانتدا، لە گەڵ بەرپرسیارەکەتدا لە سەر کارەکەت.

ڕەوشتت جوان و چاك بکەرەوە بە تەنها وشەیەکی جوان، بە بزەیەکی شیرین، ئەگەر ناتوانیت لە گەڵ خەڵکیدا بە وشەی ناسك و جوان مامەڵە بکەی، یان بە بزەیەکی شیرین، ئەوا واز بێنە لە ئازاردانی خەڵکی چونکە ئەوە خۆی لە خۆیدا ڕەوشت جوانییە.

ئەمە ئەگەر کەسێك خراپەی بۆ خەڵکی نەبێت! ئەی چۆنە ئەگەر خۆشی و شادی بخەیتە دڵی براکەتەوە؟ ئەی چۆنە ئەگەر بەزەییت بە کەسی لاواز و کەساسدا بێتەوە؟ ئەی چۆنە ئەگەر چارەسەری نەخۆشێك بگریتە ئەستۆی خۆت؟ ئەی چۆنە ئەگەر دەستی کەسێکی نابینا بگریت و لە ڕێگاکە بیپەڕێنیتەوە؟ ئەی چۆنە ئەگەر یارمەتی ماددی کەسێکی هەژار و نەدار بدەیت؟ ئەی چۆنە ئەگەر یارمەتی هەتیویك بدەیت تاکو دەچێتە ماڵ و خێزانی خۆی؟ بە ڕاستی ئەوە ڕەوشتێکی زۆر گەورە و مەزنە لە ڕەوشتەکانی بەندەی ئیماندار.

إنما الأمم الأخلاق ما بقيت     فإن هموا ذهبت أخلاقهم ذهبوا

واتە: مانەوەی هەر ئوممەتێك پەیوەستە بە ئاکار و ڕەوشتەوە ئەگەر ئاکارەکانیان ڕۆیشت ئەوا ئەوانیش لە ناو دەچن))..

سوێند بە خوا ئەم ئوممەتە هەرگیز ڕێز وپلە و پایە بە دەستناهێنێ تەنها لە ڕێگای ڕەوشت بەرزییەوە نەبێت ئایا دەزانی پوختەی هۆی ڕەوانە کردنی

---

١ ـ أخرجه أحمد (٤٤٢/٢ و ٤٤٦ و ٤٤٨) وابو داود (٢٧٩٩) والترمذي (٢٠٠٢ ، ٢٠٠٣) والبخاري في (الأدب المفرد) (٢٧٢) قال الترمذي : هذا حديث حسن صحيح , وصححه الألباني في (الصحيحة) (٨٧٦) .

پێغەمبەری خواﷺ تەنها لە بەر ئەم مەبەستە بوە؟ خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت: ((إنما بعثت لأتمم صالح الأخلاق))[١] بە راستی ئەوە کێشەی رەوشت و ئەخلاقە، ئەوەش بزانە خواپەرستی بە بێ رەوشت وئاکاری جوان سوودی بۆ خاوەنەکەی نییە، هەروەها زانست و زانیاری بە بێ رەوشتی جوان هیچ بەهایەکی نییە، چەندان کەس هەن وا دەزانن لە خواوە نزیکن بەلام دوورن لە خوای گەورەوە! چەندان کەس هەن گوایە لە خوا دەترسن بەلام بوێر و زیرەکن لە بەزاندنی سنوورەکانی خوادا!! چەندان کەس هەن قورئان دەخوێنن بەلام لە ئایەتەکانی خوا بێ بەشە!! کێشەکە کێشەی رەوشت و ئاکاری جوانە ((و إن الله يبغض الفاحش البذيء))[٢] واتە: خوای گەورە رقی لە هەموو خراپەکارێکی زمانپیسە))

لە فەرموودەیەکدا کە (ابو داود) و (أحمد) و (ابن حبان) بە سەنەدێکی (صحیح)[٣] لە فەرموودەی (عائیشە)ی دایکی ئیماندارانەوە ریوایەتیان کردوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إن المؤمن ليدرك بحسن خلقه درجة الصائم القائم)) واتە: کەسی ئیماندار بە رەوشت جوانی دەگاتە پلەی رۆژووانێك بەردەوام شەونوێژ بکات)) رەوشت بەرزی دەخرێتە سەر تەرازوو، خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا تەرازووی کەسی ئیمانداری پێ قورس دەکات، کردەوەکان هەرچەندە بەرجەستە نەبن ئەوا خوای گەورە دەیگۆڕێتە بەرجەستەو تەرازووی پێ قورس دەکات.

لە (صحیح مسلم)[٤] دا هاتوە لە فەرموودەی (النواس ی کوڕی سمعان)ەوە کەوا خۆشەویستﷺفەرموویەتی: ((يؤتى يوم القيامة بالقرآن وأهله الذين كانوا يعملون به تقدمه سورة البقرة وآل عمران، كأنهما غمامتان، أو ظلتان سوداوان، بينهما شرق

---

١ ــ أخرجه أحمد (٣٨١/٢) والبخاري في (الأدب المفرد) (٢٧٥) عن أبي هريرة وصححه الألباني في (الصحيحة) (٤٥).

٢ ــ وهو جزء من الحديث قبل المتقدم: ( ما من شيء أثقل .... ))

٣ ــ أخرجه ابو داود ,كتاب الأدب باب في حسن الخلق (٤٧٩٨)، وأحمد (٦٤/٦ ، ٩٠)، وابن حبان (٤٨١) ,والبيهقي في (الشعب) وصححه الشيخ الألباني في ((المشكاة)) (٥٠٨٢)،و صحيح أبو داود.

٤ ــ أخرجه مسلم (٨٠٥) والرواية الثانية عند مسلم برقم (٨٠٤).

أو كأنهما حزقان من طير صواف، تحاجان عن صاحبهما)) واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا قورئان و ئەوانەی کاریان بە قورئان دەکرد دەهێنن، سورەتی (البقره و ال عمران) پێشیان کەوتوون، لە سەر شێوەی دوو پەڵە هەور یان لە سەر شێوەی دوو کەپری ڕەش، یان لە سەر شێوەی دوو کۆمەڵە باڵندەی ڕیزکراو، دەبنە بەڵگە بۆ خاوەنەکانیان)).

لە ریوایەتی (أبو أمامە)ەوە کە هەر (صحيح مسلم) دا هاتوە دەفەرموێت: ((فإنهما تأتيان يوم القيامة كأنهما غمامتان أو كأنهما غيايتان أو كأنهما فرقان من طير صواف، تحاجان عن صاحبهما)).

بە ڕاستی فەرموودەیەکە لەوپەڕی ناسکی و جوانیدایە ! !

ئێستاش فەرموو گوێ لەو فەرموودە سەیرە بگرە کە ئیمامی (البخاری و مسلم)[1] لە فەرموودەی (أبو سعيد الخدری)یەوە ریوایەتیان کردوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((يؤتى بالموت كهيئة كبش أملح، فينادي مناد: يا أهل الجنة، فيشرئبون وينظرون، فيقول: هل تعرفون هذا؟ فيقولون: نعم، هذا الموت، وكلهم قد رآه. ثم ينادي: يا أهل النار، فيشرئبون وينظرون، فيقول: هل تعرفون هذا؟ فيقولون: نعم، هذا الموت، وكلهم قد رآه، فيذبح. ثم يقول: يا أهل الجنة خلود فلا موت، ويا أهل النار خلود فلا موت. ثم قرأ: ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِى غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ (مريم:٣٩) واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا مردن دەهێنرێت لە سەر شێوەی بەرانێکی ڕەش وسپی بانگدەرێك بانگ دەکات: ئەی خەڵکی بەهەشت، ئەوانیش هەموو سەر بەرزدەکەنەوە و تەماشا دەکەن، پێیان دەڵێ: ئایا ئەمە دەناسنەوە؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ، ئەوە مردنە، هەموویان بینیویانە، پاشان بانگ دەکات: ئەی خەڵکی ئاگر، ئەوانیش هەموو سەر بەرزدەکەنەوە و تەماشا دەکەن، پێیان دەڵێ: ئایا ئەمە دەناسنەوە؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ، ئەوە مردنە، هەموویان بینیویانە، پاشان بەرانەکە (مردن) سەردەبڕدرێ، پاشان دەڵێ: ئەی خەڵکی

---

١ ـ أخرجه البخاري (٤٧٣٠) ومسلم (٢٨٤٩) .

بەهەشت نەمری بۆ ئێوەیە و چیتر مردن نەما، ئەی خەڵکی ئاگر نەمری بۆ ئێوەیە و چیتر مردن نەما، ئەمجار ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە ئەمە ماناکەیەتی:

((لەڕۆژی ئاهوو ناڵەو خەم و خەفەت و پەشیمانی (یوم الحسره) ئاگاداریان بکەو بیانترسێنە ئەو کاتە لە لایەن خوای پەروردگارەوە بڕیار دەدرێ کە دەستەیەك بۆ بەهەشت و دەستەیەکیش بۆ دۆزەخ ڕەوانە بکرێن، کەچی ئەوانە هێشتا لە غەفڵەتدان و بە خۆیان نەزانیوە وخۆشیان بڕوا بواردووەو ددان بە زیندوو بوونەوەو پاداشت وتۆڵەشدا نانێن)).

جا یەکەم بۆچوون لە بۆچوونی زانایان ئەوەی کە دەخرێتە سەر تەرازوو: کار و کردەوەکانە.

بۆچوونی دووەم: ئەوەی کە دەخرێتە سەر تەرازوو: بەندەکە خۆیەتی، یان تەرازووەکە قورس دەکات یان سووکی دەکات، ئایا بە پێی قەڵەوی و کەتەیی یە؟! نەخێر هەرگیز شتی وا نییە... هەروەها بە پێی لەڕ و لاوازی و کەم گۆشتی نییە...بەڵکو بە پێی ئیمان و کرداری چاکەیە.. تەرازووەکانی دونیا جیاوازن لە تەرازووەکانی قیامەت..خەڵکیش لە دونیادا تەرازووی دیکەیان هەیە کەلە تەرازووی خوای گەورە جیاوازە.

ئیمامی (البخاري و مسلم)[1] لە فەرموودەی (أبو هريره)وە ریوایەتیان کردوە کەوا پێغەمبەری ئازیزﷺفەرموویەتی: ((إنه ليؤتى بالرجل العظيم السمين يوم القيامة فلا يزن عند الله جناح بعوضة)) وقال: أقرءوا: ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا﴾ (الكهف: ١٠٥) واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا پیاوێکی گەورە و قەڵەو دێنن، کەچی لای خوای گەورە کێشی باڵە مێشێکی نییە، فەرمووی: ئەو ئایەتە بخوێننەوە: کە ئەمە ماناکەیەتی:

(ئینجا ئێمەش لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ تەرازوو میزانێکی سەنگینیان بۆ دانانێین واتە: هیچ نرخ و بایەخێکیان نابێ).

---

١ ـ أخرجه البخاري (٤٧٢٩) ومسلم (٢٧٨٥) .

کەسێکی قەڵەو و گۆشتنە، کەسێکی گەورە و مەزنە، جێگەیەکی تایبەتی خۆی هەیە، کەسایەتی خۆی هەیە، ڕێز و شکۆی خۆی هەیە لە نێوان خەڵکیدا، پلەوپایەی تایبەتی هەیە، بەڵام ئیمان و تەقوای نییە، ئەو کەسە کێشی مێشێکی نییە لای خوای گەورە!! بۆ..؟ چونکە خوای گەورە خۆی فەرموویەتی: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ (الحجرات: ١٣) واتە: بێ گومان بەڕێزترینتان لای خوا، ئەوەتانە کە بە تەقواتر و خۆ پارێزتر بێت وە لە سنوورەکانی خوا نەترازێت))

لە (مسند أحمد)[١] دا بە سەنەدێکی (حسن) هاتوە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی مسعود)ەوە کەوا سیواکی لە دارەکەی دەکردەوە کە پێی دەڵێن (أراك)، (ابن مسعود) یش هەردوو لاقەکانی (پێیەکانی) باریك بوو، بە هۆی باکەوە پێیەکانی دەرکەوت، بۆیە خەڵکەکە پێی پێکەنین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مم تضحكون؟)) قالوا: يا نبي الله، من دقة ساقيه . فقال: ((والذي نفسي بيده، لهما أثقل في الميزان من أُحد)) واتە: بە چی پێدەکەنن؟ ئەوانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە باریکی هەردوو پێیەکانی، ئەویش فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، هەردوو پێیەکانی لە ڕۆژی قیامەتدا و لەسەر تەرازوو لە کێوی ئوحود قورسترن)).

الله أكبر!! خوا لە (ابن مسعود) ڕازی بێت، بە ڕاستی ئەوە شایەتییەکی سەیرە بۆ (ابن مسعود)! چونکە تەرازووەکانی دونیا بە پێی گەورەیی و کەتەیە! بەڵام تەرازووەکانی دوارۆژ وا نییە، بەڵکو بە پێی تەقوایە: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾

بە جوانی بیر لەو فەرموودە گرنگە بکەرەوە، لە (صحيح البخاري)[٢] دا هاتوە لە فەرموودەی (سهل ی کوڕی سعد الساعدي)یەوە دەڵێت: کابرایەك بە تەنیشت

---

١ ـ أخرجه أحمد (٤٢٠/١) والطيالسي (٣٥٥) عن ابن مسعود وله شاهد،أخرجه أحمد (١١٤/١)، والبخاري في (الأدب المفرد) ( ٢٣٨) عن علي، وصححه الألباني بطرقه في (الصحيحة) (٢٧٥٠) .

٢ ـ أخرجه البخاري (٥٠٩١) .

پێغەمبەری خواوە ﷺ ڕۆیشت ئەویش فەرمووی: ((ما تقولون في هذا؟). قالوا: حري إن خطب أن ينكح، وإن شفع أن يشفع، وإن قال أن يستمع. قال: ثم سكت، فمر رجل من فقراء المسلمين، فقال: (ما تقولون في هذا؟). قالوا: حري إن خطب أن لا ينكح، وإن شفع أن لا يشفع، وإن قال أن لا يستمع. فقال رسول الله ﷺ: (هذا خير من ملء الأرض مثل هذا)) واتە: ئایا دەربارەی ئەم پیاوە چی دەڵێن؟ وتیان: شایستەی ئەوەیە ئەگەر داوای ژن بکات پێی بدرێت، ئەگەر شەفاعەت بۆ کەسێك بکات شەفاعەتەکەی وەرگیرێ، ئەگەر قسەش بکات گوێ لە قەسەکانی بگیرێت. وتی: ئەمجار بێدەنگ بوو، کابرایەك موسڵمانی هەژار تێپەڕی، فەرمووی: ئایا دەربارەی ئەم پیاوە چی دەڵێن؟ وتیان: شایستەی ئەوەیە ئەگەر داوای ژن بکات پێی نەدرێت، ئەگەر شەفاعەت بۆ کەسێك بکات شەفاعەتەکەی وەرنەگیرێ، ئەگەر قسەش بکات گوێ لە قەسەکانی نەگیرێت. ئەوجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەمە باشترە لەو بە ئەندازەی هەموو زەوی)).

کەواتە: بەندەکە خۆی دەخرێتە سەر تەرازوو.

لێرەدا پرسیارێك هەیە لەوپەڕی گرنگیدایە، ئەویش ئەوەیە: ئایا کێشی من چەندە لای خوای گەورە؟ ئایا تاکو ئێستا ئەو پرسیارەمان لە خۆمان کردوە؟

بێگومان پێم دەڵێیت: چۆن کێشی خۆم لای خوای گەورە بزانم؟ من پێت دەڵێم: ئەوە دەزانیت لە ڕێگای مامەڵە کردنت لە گەڵ دایك و باوکتدا، لە گەڵ خێزان و منداڵەکانتدا، بە ڕاستگۆیی و وەفا و سپاردە و تەقواکەت، بە ڕاستی ترمۆمترێکی گرنگە دەتوانی خۆتی پێ بپێوی!! بۆیە براکەم لە خوا بترسە بۆ ئەوەی خوای گەورە تەرازووەکەت قورس بکات لەو ڕۆژەی کە هیچ شتێك تەرازوو قورس ناکات تەنها کاری چاکە نەبێت.

بۆچوونی سێیەم: ئەوەی کە دەکێشرێت: نامەی کار و کردەوەکانە.

ئەوانەی ئەم بۆچوونەیان هەیە ئەو فەرموودەیان کردوەتە بەڵگە کە (أحمد و

الترمذي و ابن ماجه) و جگە لەوان ریوایەتیان کردوە بە سەنەدێکی (صحیح)[١] لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی عمرو) ەوە کەوا خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: ((إن الله سيخلص رجلا من أمتي على رؤوس الخلائق يوم القيامة، فينشر عليه تسعة وتسعين سجلا، كل سجل مثل مد البصر، ثم يقول: أتنكر شيئا من هذا؟ أظلمك كتبتي الحافظون؟ فيقول: لا يا رب، فيقول: أفلك عذر؟ فيقول: لا يا رب، فيقول: بلى، إن لك عندنا حسنة، فإنه لا ظلم عليك اليوم، فيخرج بطاقة فيها: أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا عبده ورسوله، فيقول: أحضر وزنك، فيقول: يا رب، ما هذه البطاقة مع هذه السجلات؟ فيقول: فإنك لا تظلم، قال: فتوضع السجلات في كفة، والبطاقة في كفة، فطاشت السجلات، وثقلت البطاقة، فلا يثقل اسم الله شيء)) واتە: خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا پیاوێك لە ئوممەتەکەم دەهێنێت و لە پێش چاوی هەموو خەڵکی رایدەوەستێنێت، نەوەت و نۆ پەرتوکی بۆ بڵاو دەکاتەوە هەر پەرتوکێکی چەند چاو بڕ دەکات ئەوەندە درێژە، پاشان دەفەرموێت: ئایا نکۆڵی لە هیچ لەو تاوانانە دەکەیت؟ ئایا فریشتە نوسەرەکانم ستەمیان لێتکردوە؟ دەڵێت: نەخێر ئەی پەروەردگارم! ئەویش دەڵێت: ئایا هیچ پاساو و بیانویەکت هەیە؟ یان هیچ چاکەیەکت هەیە؟ ئەویش ماوەیەك بێدەنگ دەبێت و پاشان دەڵێت: نەخێر ئەی پەروەردگارم! خوای گەورە دەفەرموێت: بەڵێ تۆ یەك چاکەت لای ئێمە هەیە، ئەمڕۆ هیچ ستەمێکت لێ ناکرێت، ئەمجار پلیتێکی بۆ دەردەکرێت تێیدا نوسراوە ((أشهد أن لا اله الا الله و أشهد أن محمدا عبده ورسوله))، دەفەرموێت: بیهێنن بیکێشن، لەو کاتەدا ئەو دەڵێت: ئەی پەروەردگارم ئەم پلیتە چییە لە بەرانبەر ئەو هەموو پەرتووکانە، ئەویش دەفەرموێت: تۆ ئەمڕۆ هیچ ستەمێکت لێ ناکرێت، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: پەرتووکەکانی بۆ دەخرێتە تایەکی تەرازووەکە و

---

١ ـ أخرجه أحمد (٢/٢١٣) والترمذي (٢٦٣٩) وقال: هذا حديث حسن غريب، وابن ماجه (٤٣٠٠) وصححه الألباني في (الصحيحة) (١٣٥)، قال العلامة الألباني: (( وفي الحديث دليل على أن ميزان الأعمال له كفتان مشاهدتان وأن الأعمال وإن كانت أعراضاً فإنها توزن، والله على كل شيء قدير، وذلك من عقائد أهل السنة والأحاديث في ذلك متضافرة، وإن لم تكن متواترة ) انظر: ( شرح العقيدة الطحاوية ) ( ٣٥١ _ ٣٥٢) ط المكتب الإسلامي .

پلیتەكەش لەو تاكەی تریدا، فەرمووی: تای پەرتوكەكان بەرزبوویەوە و پلیتەكە لەو هەموو قورستر بوو، فەرمووی: بێگومان هیچ شتێك نییە لە بەرانبەر ناوی خوای گەورەدا قورس بێت)).

ئەی خودایە لە سەر یەكتاپەرستی بمانژێنە و لە سەر یەكتاپەرستی گیانمان بكێشە و لە گەڵ كۆمەڵی یەكتاپەرستاندا حەشرمان بكە لە ژێر ئاڵای پێشەوای یەكتاپەرستان و پێشەنگی پیاوچاكاندا، پێغەمبەری خۆشەویست و گەورەی هەموو پێغەمبەران ﷺ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾ (النساء: ٤٨).

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعْبُدْ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٦﴾﴾ (الزمر) واتە: سوێند ئەخۆم كە بێ گومان وەحی كراوە بۆ تۆ و بۆ ئەو پەیامبەرانەی بەر لە تۆ بوون: كە ئەگەر گریمان بە هاوبەش قایل ببێت بۆ خوا، ئەوە بێ گومان هەموو كردەوەكانت پووچەڵ دەبێ وە لە زیانمەندانیش دەبیت (٦٥) نەخێر، هەرگیز بە گوێیان نەكەیت بەڵكو تەنها هەر خوا بپەرستە و لە شوكرانە بژێران بە (٦٦).

لە هەردووكتێبی(صحیح)[1]دا هاتوە لە فەرموودەی (عبادە ی كوڕی الصامت) ەوە كەوا خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: ((من قال: أشهد أن لا الە الا الله وحدە لا شریك لە، وأن محمداً عبدە ورسولە، وأن عیسی عبدالله، وابن أمتە، وكلمتە ألقاها الی مریم، وروح منە، وأن الجنة حق وأن النار حق، أدخلە الله من أي أبواب الجنة الثمانیة شاء)).

باش بزانە كە یەكتاپەرستی ناوی ژیانە گەورەترین (إكسیر)ە، (الاكسیر: دەرمانێكە لە زیوی دەدەن و دەبێت بە ئاڵتون)[2] ئەو ئاوەی ئەگەر تەنها

١ ـ أخرجە البخاري (٣٤٣٥) ومسلم (٢٨) .

٢ ـ فەرهەنگی دەریا / رزگار كریم .

گەردیلەیەکی بخرێتە سەر چیای تاوان و گوناهەکان دەتوێتەوە و وردو خاشی دەکات، لە (صحیح مسلم)[١] دا هاتوە لە فەرموودەی (أبو ذر)ەوە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((یقول الله: ومن لقيني بقراب الأرض خطيئة لا يشرك بي شيئاً لقيته بمثلها مغفرة)) واتە: خوای گەورە دەفەرموێت: ئەگەر بە ئەندازەی هەموو زەوی بە تاوانەوە پێم بگات و بە من گەیشت هاوەڵی بۆ من بڕیار نەدابوو ئەوا بە ئەندازەی هەموو زەوی بە لێ خۆش بوونەوەوە پێت دەگەم)).

لە ڕیوایەتەکەی (الترمذي)[٢]دا هاتوە لە فەرموودەی (أنس)ەوە دەڵێت: گوێم لێبوو پێغەمبەری خواﷺفەرمووی: ((یا ابن آدم، إنك ما دعوتني ورجوتني غفرت لك على ما كان فيك ولا أبالي. یا ابن آدم، لو بلغت ذنوبك عنان السماء ثم استغفرتني غفرت لك ولا أبالي. یا ابن آدم، إنك لو أتيتني بقراب الأرض خطايا ثم لقيتني لا تشرك بي شيئا لأتيتك بقرابها مغفرة)) واتە: ئەی نەوەی ئادەم! تۆ هەر کاتێك هاوارم پێ بکەیت و داوام لێ بکەیت و تکام لێ بکەیت ئەوا لێت خۆش دەبم هەرچی شتێکت کردبێ هەرگیز باکم نییە. ئەی نەوەی ئادەم! ئەگەر تاوانەکانت گەیشتنە ئاسمانەکان ئەمجار داوای لێخۆشبوونت لێ کردم ئەوا لێت خۆش دەبم و هیچ باکم نییە، ئەی نەوەی ئادەم! ئەگەر بە ئەندازەی هەموو زەوی بە تاوانەوە پێم بگەی و بە من گەیشتی هاوەڵت بۆ من بڕیار نەدابوو ئەوا بە ئەندازەی هەموو زەوی بە لێ خۆش بوونەوەوە پێت دەگەم)).

جا ئیمان بریتییە لە گوتن بە زمان و باوەڕهێنان بە دڵ و کردار بە ئەندام و پەلەکان، ئیمان تەنها وشەیەك نییە لە سەر زارەکان دووبارە بکرێتەوە، یان دوکەڵێکە و بە هەوادا بفڕێت! بۆیە دەبێ ئەو ئیمانە بگوڕدرێتە کردەوە و کاری پێ بکرێت.

مەبەست لە هێنانەوەی ئەم فەرموودەیە ئەوەیە: هەندێ لە ئەهلی زانست و زانیاری دەڵێن: کردەوەکان کێشانە دەکرێن، هەندێکیان دەڵێن: بەندەکە خۆی

١ ـ أخرجه مسلم (٢٦٨٧) .

٢ ـ أخرجه الترمذي في (السنن) (٣٥٤٠) وقال: وهذا حديث غريب لا نعرفه الا من هذا الوجه ) ا . هـ وله شاهد عند أحمد (١٤٨/٥ ، ١٦٧) عن أبي ذر وحسنه بشواهده الألباني في (الصحيحة) (١٢٧) .

دەخرێتە سەر تەرازوو و کێشانە دەکرێتـە، هەنـدێکیان دەڵـێن: نامـەی کردەوەکـان دەخرێتە سەر تەرازوو، منیش دەڵێم: هەرگیز کێشە نییە ئەگەر ئـەو سـێ بۆچـوونە کۆ بکەینەوە و بڵێین بەندەکە بە کردەوە و نامەی کردەوەکانییەوە دەخرێنـە سـەر تەرازوو لە بەر دەستی خوای بەخشندە و میهرەباندا، نامـەوێ لـەوە زیـاتر لـە سـەر ئەو شتانە بڕۆم، ئەگـەر تـەرازوو دانـرا و جێگـر بـوو، لێپرسـینەوە کۆتـایی پێهـات، بڕیاری پاداشت و سزا درا لە پاش لێپرسینەوە و تـەرازوو، لێپرسینەوە بریتییـە لـە دەرخستن و دیاری کردنی کارەکـان و تـەرازوو روونکردنـەوەی ئەندازەکەیـەتی، بـۆ ئەوەی پاداشت و سزا بە گوێرەی کارەکە بێت.

دەڵێم: کاتێ خوای گەورە لە لێپرسینەوەی بەندەکان بوەوە و بڕیاری پاداشت و سزا درا، ئەمجار فەرمان دەکات بە دامەزراندنی سیرات (الـصراط) لـە سـەر دۆزەخ، ئـەی پـەروەردگارمان بمانپـارێزە!! ئایـا لـە پـاش لێپرسـینەوە و تـەرازوو سـیرات (الصراط) هەیە؟ بەڵێ، لە سەر پشتی دۆزەخ یان لە سەر دۆزەخ سـیرات (الـصراط) دادەنرێت، واتە دۆزەخ دەکەوێت ژێرەوەی سیرات (الـصراط) هـەمووان دەبێـت بـە سەریدا تێپەڕن!!

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا﴾(مریم) واتە: ئـەی خەڵکینـە! ئـیللا دەبـێ هـەموو نزیکـی ئاگری دۆزەخ ببنـەوە و بـە سـەر پردەکـەی سـیراتدا تێپـەڕن لـە تەفـسیرێکی تـردا دەڵێـت: دەبـێ هـەموو بـە سـەر دۆزەخـدا تێپـەڕن، ئەمـەش بڕیارێکـە لـە لایـەن پەروەردگارتـەوە بـۆ ئـەوە دراوە و بڕاوەتـەوە و شـتێکی حەتمییـە (٧١) پـاش تێپەڕبوونی هەموان بە سەر ئاگری دۆزەخدا ئەوجا ئەوانەی کە پارێزگـار و خوانـاس بوون لە ئاگرەکە رزگاریان ئەکەین..))

ئەی خودایە من و ئێوە لە تەقواکاران بگێڕێت.

ئـەمجار خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا﴾ (مـریم: ٧٢) واتە: ستەمکارانیش لە ناو دۆزەخدا دەستە ئەژنۆ دەهێڵێتەوە.))

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: سیرات (الصراط) چییە؟ سیرات (الصراط) لـە زمـانی عەرەبیدا واتە: رێگایەکی روون و رەوان، هەر بـەو مانایـە (جریـر) لـە شـیعرێکدا بـە

کاری هێناوە کاتێك ستایشی (هشام ی کوڕی عبدالملك) دەکات و دەڵێت:

أمير المؤمنين على صراط إذا اعوج الموارد مستقيم[١]

بەڵام مانای سیرات (الصراط) لە شەرعدا: ئەو پردەیە کە لە سەر دۆزەخ دادەمزرێت و هەموو خەڵکی بە سەریدا تێدەپەڕن.

زانایان لە مەبەستی (ورود النار) لەو ئایەتەدا چەند بۆچوونێکیان هەیە[٢]:

هەندێ لە زانایان دەڵێن: (الورود) مانای (الدخول) دەگرێتەوە واتە چوونە ژوورەوە، بە سەر سیرات (الصراط)دا تێدەپەڕن واتا هەموو کەسێك بە سەر دۆزەخدا تێدەپەڕێت، هەموو چاکەکار و خراپەکارێك، بەڵام خوای گەورە ئەو ئاگرە دەگۆڕێتە ساردی و سەلامەتی بۆ تەقواکاران، هەروەکو چۆن بۆ پێغەمبەر (ئیبراهیم) کردی.

بۆچوونی دووەم: کە ئەویش وتەی زۆربەی زانایانە (جمهور) و منیش هەمان بۆچوونم هەیە و باوەڕم پێیەتی، (الورود) مانای (المرور) دێت واتە پەڕینەوە، هیچ کێشەیەك نییە ئەگەر هەردوو بۆچوونەکە یەك بخەین و بڵێین الورود دوو مانای هەیە:

مانای یەکەم: (الورود) کە بە مانای (الدخول) دێت ئەوەشە بێباوەڕان دەگرێتەوە، هەروەکو خوای گەورە دەربارەی فیرعەون فەرموویەتی: ﴿يَقۡدُمُ قَوۡمَهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَأَوۡرَدَهُمُ ٱلنَّارَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡوِرۡدُ ٱلۡمَوۡرُودُ﴾ (هود: ٩٨) واتە: لە ڕۆژی قیامەتیشدا فیرعەون لەبەر ئەوە پاشا و گەورەیان بوو پێشیان دەکەوێ بۆ نێو دۆزەخ دەیانباتە ناو ئاگری دۆزەخەوە و چەند خراپ و نالەبارە ئاگر جێی ئاوخواردنەوە و حەوانەوەی گەلێکی تینووی خستە بێ)).

---

١ ـ تهذيب اللغة للأزهري (باب : سرط) ولسان العرب لابن منظور (مادة : سرط) و القاموس المحيط (٨٧١) (مادة : الصراط) .

٢ ـ راجع بحثاً متيناً في ذلك في (أضواء البيان ) للعلامة الشنقيطي (٣٧٦/٤ – ٣٨٢)، و شرح الطحاوية (ص ٢٣٠ ط أولي النهى ) وتفسير ابن كثير (١٢٦/٣ – ١٢٧ ط المكتبة القيمة ) .

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا﴾ (مريم: ٨٦) واتە: گوناهکاران و تاوانبارانیش بەپێ و بە تینوویەتی بەرەو دۆزەخ راو دەنێن و لێ ئەخوڕێن وەکو گاگەل بۆ ئاوەخۆرە مل دەنێن)).

ئەمە مانای یەکەمە...

مانای دووەم: (الورود) بە مانای (المرور)دێت هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا﴾(مريم: ٧١)

واتا: ئیللا دەبێ بە سەریدا تێپەڕن، ئەمجار خوای گەورە تەقواکاران رزگار دەکات، پاشان ئەوانەی کە لە سیرات (الصراط) ن لە بێباوەڕان و تاوانباران و ستەمکاران دەکەونە خوارەوە، ولا حول ولا قوة الا بالله.

بە جوانی بیر لەو فەرموودەیە بکەرەوە کەوا پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1]دا هاتوە لە فەرموودەی (أبو هريرە)ەوە کەوا هەندێ لە هاوەڵان پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد فەرموویان: ((يا رسول الله، هل نرى ربنا يوم القيامة؟

فقال: رسول الله: (هل تضارون في رؤية القمر ليلة البدر؟). قالوا: لا يا رسول الله، قال: (هل تضارون في الشمس ليس دونها سحاب؟). قالوا: لا يا رسول الله،

قال: (فإنكم ترونه كذلك، يجمع الله الناس يوم القيامة، فيقول: من كان يعبد شيئاً فليتَّبعه، فيتبع من كان يعبد الشمس الشمس، ويتبع من كان يعبد القمر القمر، ويتَّبع من كان يعبد الطواغيت الطواغيت، وتبقى هذه الأمة فيها منافقوها، فيأتيهم الله، تبارك وتعالى، في صورة غيرصورته التي يعرفون، فيقول: أنا ربكم، فيقولون: نعوذ بالله منك، هذا مكاننا حتى يأتينا ربنا، فإذا جاء ربنا عرفناه، فيأتيهم الله تعالى في صورته التي يعرفون، فيقول: أنا ربكم، فيقولون: أنت ربنا، فيتبعونه، ويضرب الصراط بين ظهري جهنم، فأكون أنا و أمتي أول من يجيز، ولا يتكلم يومئذ إلا الرسل، ودعوى الرسل يومئذ: اللهم سلم سلم. وفي جهنم كلاليب مثل شوك السعدان،

١ ـ أخرجه البخاري (٨٠٦) ومسلم (١٨٢).

هل رأيتم السعدان؟. قالوا: نعم يا رسول الله، قال: (فإنها مثل شوك السعدان، غير أنه لا يعلم قدر عظمها إلا الله، تخطف الناس بأعمالهم، فمنهم المؤمن بقي بعمله، ومنهم المجازي حتى ينجي، حتى إذا فرغ الله من القضاء بين العباد، وأراد أن يخرج برحمته من أراد من أهل النار، أمر الملائكة أن يخرجوا من النار من كان لا يشرك بالله شيئاً، ممن أراد الله تعالى أن يرحمه، ممن يقول: لا اله الا الله، فيعرفونهم في النار، يعرفونهم بأثر السجود، تأكل النار من ابن آدم إلا أثر السجود، حرم الله على النار أن تأكل أثر السجود، فيخرجون من النار وقد امتحشوا، فيصب عليهم ماء الحياة، فينبتون منه كما تنبت الحبة في حميل السيل، ثم يفرغ الله من القضاء بين العباد، ويبقى رجل مقبل بوجهه على النار،وهو آخر أهل الجنة دخولا الجنة، فيقول: اي رب! اصرف وجهي عن النار، فإنه قد قشبني ريحها، وأحرقني ذكاؤها، فيدعو الله ما شاء الله أن يدعوه، ثم يقول الله تبارك وتعالى: هل عسيت إن فعلت ذلك بك أن تسأل غيره! فيقول: لا أسألك غيره، ويعطي ربه من عهود و مواثيق ما شاء الله، فيصرف الله وجهه عن النار، فإذا أقبل على الجنة و رآها سكت ما شاء الله أن يسكت، ثم يقول: أي رب! قدمني إلى باب الجنة، فيقول الله له: أليس قد أعطيت عهودك و مواثيقك لا تسألني غير الذي أعطيتك، ويلك ابن آدم! ما أغدرك! فيقول: أي رب! ويدعوا الله حتى يقول له: فهل عسيت إن أعطيتك ذلك أن تسأل غيره! فيقول: لا وعزتك! فيعطي ربه ما شاء من عهود ومواثيق، فيقدمه إلى باب الجنة، فإذا قام على باب الجنة انفهقت له الجنة، فرأى ما فيها من الخير والسرور، فيسكت ما شاء الله أن يسكت، ثم يقول: أي رب! أدخلني الجنة، فيقول الله تبارك وتعالى له: أليس قد أعطيت عهودك ومواثيقك أن لا تسأل غير الذي أعطيت، ويلك يا ابن آدم! ما أغدرك! فيقول: أي رب، لا أكون أشقى خلقك، فلا يزال يدعو الله حتى يضحك الله تبارك وتعالى منه، فإذا ضحك الله منه، قال: ادخل الجنة، فإذا دخلها قال الله له: تمنه، فيسأل ربه ويتمنى، حتى إن الله ليذكره من كذا وكذا، حتى إذا انقطعت به الأماني، قال الله تعالى: ذلك لك ومثله معه).

قال عطاء بن يزيد، وابو سعيد الخدري مع أبي هريرة لا يرد عليه من حديثه شيئا، حتى إذا حدث أبو هريرة، أن الله قال لذلك الرجل: (ومثله معه)).

قال أبو سعيد: ((وعشرة أمثاله معه يا أبا هريرة!)) قال ابو هريرة: ما حفظت إلا قوله: ذلك لك ومثله معه)).

قال ابو سعيد: أشهد أني حفظت من رسول الله قوله: ((ذلك لك وعشرة أمثاله)).

قال أبو هريرة: وذلك الرجل آخر أهل الجنة دخولاً الجنة)).

واتە: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئایا لە ڕۆژی قیامەتدا پەروەردگارمان دەبینین؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئایا بۆ بینینی خۆر لە ڕۆژێکدا هەور بەری نەگرتبێت یەکتری سەغڵەت دەکەن؟ وتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خواﷺ، فەرمووی: ئایا لە بینینی مانگی چواردەدا یەکتر سەغڵەت دەکەن؟ وتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خواﷺ، فەرمووی: دە ئێوە ئاوا دەیبینن، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا خەڵکی کۆ دەکاتەوە و دەفەرموێت: هەرکەس شتێکی پەرستوە، با شوێنی بکەوێت، ئەوەی خۆری پەرستوە شوێن خۆر دەکەوێت، ئەوەی مانگی پەرستوە شوێن مانگ دەکەوێت، ئەوەی ملهوڕانی پەرستوە شوێن ملهوڕان دەکەوێت، ئەم ئوممەتە دەمێنێتەوە و دووڕووەکانیشی تێدایە، خوای گەورە لە شێوەیەکدا کە نایناسنەوە خۆیان نیشان دەدا، دەفەرموێت: من پەروەردگاری ئێوەم، دەڵێن: پەنا دەگرین بە خوا لە تۆ، ئەمە شوێنمانە هەتا پەروەردگارمان دێت ئەگەر پەروەردگارمان هات دەیناسینەوە، ئینجا خوای گەورە لەو شێوەدا کە دەیناسن دێت و دەفەرموێت: من پەروەردگارتانم، دەڵێن: تۆ پەروەردگاری ئێمەیت، شوێنی دەکەون، ئینجا پردی سیرات دەخرێتە سەر پشتی دۆزەخ، ئەو کاتە من و ئوممەتەکەم یەکەم کەسین کە دەپەڕینەوە، لەو ڕۆژەدا کەس قسە ناکات جگە لە پێغەمبەران، دۆعا و نزای پێغەمبرانیش لەو ڕۆژەدا: خوایە بە سەلامەتی بە سەلامەتی، لە دۆزەخیشدا قولاپ هەیە هەر دەڵێی درکی سەعدانە، ئایا سەعدانتان بینیوە؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خواﷺ، فەرمووی: لە ڕاستیدا وەکو دڕکی سەعدان وایە، بەڵام کەس ڕادەی گەورەیەکەی نازانێت تەنها خوا نەبێت، خەڵکی بە پێی کردەوەکانیان دەڕفێنێ (بۆ ناو دۆزەخ)، هەیانە تیادەچێت بە کردەوەکانی هەشیانە سزا دەدرێت تا ڕزگار دەکرێت، هەتا کاتێ خوا لە دادوەری نێوان بەندەکانی دەبێتەوە، دەیەوێ

بە بەزەیی خۆی کێی بوویت لە ئاگر دەری بهێنێ، فەرمان دەکات بە فریشتەکان ئەو کەسە دەربێنن لە ئاگر کە هیچ هاوەڵی بۆ خوا بریار نەداوە، کەسێك خوا بیەوێت رەحمی پێ بکات کە وتویەتی: ﴿ لا الـه الا الله ﴾ لە ئاگرەکەدا بە شوێنەواری سوجدەدا دەیناسنەوە، (ئاگر هەموو شوێنێکی ئادەمیزاد دەسوتێنێ جگە لە شوێنی سوجدە) خوا حەرامی کردوە لە سەر ئاگر کە شوێنی سوجدە بسوتێنێ، پاشان دەردەهێنرێن لە ئاگر دوای ئەوەی سوتاون و بوون بە خەڵوز، ئینجا ئاوی ژیان دەکرێت بە سەریاندا و سەوز دەبنەوە هەروەکو تۆوێك لە لیتەی لافاودا سەوز دەبێت، ئینجا خوای گەورە لە دادوەری نێوان بەندەکانی دەبێتەوە پیاوێك دەمێنێتەوە کە رووی لە ئاگری دۆزەخە، ئەوەش دواهەمین کەسە، کە دەچێتە بەهەشت، ئینجا دەڵێت: ئەی پەروەردگارم رووم وەرگێڕە لە ئاگر، چونکە تینەکەی ئازاری داوم و ژەهراوی کردووم، بڵێسەکانی سووتاندومی، ئینجا دەست دەکات بە پاڕانەوە لە خوا، چەند خوا ویستی لە سەر بێت کە لێی بپارێتەوە، ئینجا خوای گەورە دەفەرموێت: ئایا ئەگەر ئەوەت بدەمێ خۆزگە دەخوازی بۆ شتی تر؟ دەڵێ: داوای شتی ترت لێ ناکەم ئەوەندەی خوا ویستی لە سەر بێت بەڵێن دەدا بە خوا (کە داوای هیچی تر نەکات) خوای گەورەش دەیگەیەنێتە دەرگای بەهەشت کاتێ دەگاتە دەرگای بەهەشت، دەرگای بەهەشتی بۆ واڵا دەبێت، هەرچی جوانی و خۆشی تێدایە دەیبینێ، ئەوەندەی خوا ویستی لە سەر بێت بێ دەنگ دەبێت، ئینجا دەڵێ: ئەی پەروەردگارم بمخەرە ناو بەهەشتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: مەگەر پەیمان و بەڵێنت نەدا کە داوای هیچی تر نەکەیت جگە لەوەی پێم داویت؟ سەرگەردان خۆتی ئەی ئادەمیزاد چەند ستەمکاریت؟ دەڵێ: ئەی پەروەردگارم با نەبمە بەدبەختترین دروستکراوت، بەردەوام لە خوا دەپارێتەوە هەتا خوا دەست دەکات بە پێکەنین، کاتێ پێدەکەنێ دەفەرموێت: بچۆرە بەهەشتەوە، ئینجا کە چوە ناو بەهەشتەوە، خوا پێی دەفەرموێت: داوا بکە، ئینجا داوا لە خوا دەکات و خۆزگە دەخوازێت، هەتا خوا خۆی شتی بیردەخاتەوە، هەتا هیچ ئاواتێکی نامێنێ، ئینجا خوا دەفەرموێت: ئەوە بۆ تۆ و ئەوەندەی تریش لە گەڵدا بێت)).

(عطاء ی کوڕی یزید) دەڵێ: (ابو سعید الخدری) لە گەڵ (أبو هریرە) دا هیچی لەو فەرموودەی ئەو ڕەت نەکردەوە، هەتا (أبو هریرە) وتی: خوای گەورە بەو پیاوەی فەرموو: ئەوەندەی تریشی لە گەڵدا بێت، أبو سعید فەرمووی: دە ئەوەندەی تریشی لە گەڵدا بێت ئەی (ابو هریرە). ابو هریرە فەرمووی: من هەر ئەوەم لە بەر کردوە: ئەمە بۆ تۆ ئەوەندەی تریشی لە گەڵدا بێت. ابو سعید وتی: شایەتی دەدەم من لە پێغەمبەری خوام ﷺ وەرگرتوە فەرموویەتی: ئەوە بۆ تۆ دە ئەوەندەشی لە گەڵدا بێت).

ابو هریرە وتی: ئەو پیاوە دوایین بەهەشتییە کە دەچێتە بەهەشتەوە)).

لە فەرموودەیەکی جوان و ناسکی دیکەدا لە (صحیح مسلم)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (أبو سعید الخدری)یەوە تیایدا هاتوە کەوا پرسیار لە خۆشەویستی خوا ﷺ کرا دەربارەی سیرات (الصراط) ئایا سیرات (الصراط) چییە؟ خۆشەویست ﷺ فەرمووی: ((دحض مزَلّة) أو (مَزِلّة)) هەردوو زاراوەکە تەواوە، جێگایەکە پێیەکان لە سەری هەڵدەخلیسکێ، جێگر نابێت ئیللا بۆ کەسانێك نەبێت خوای گەورە پێی جێگیر کردبێت، فەرمووی: ((فیه خطاطیف و کلالیب و حسك، تکون بنجد فیها شویکة یقال لها: السعدان، فیمر المؤمنون، کطرف العین)) واتە: پردێکی لوسە و جێی پێخلیسکانی و تیاچوونە و قولاپ و شتی لە ناکاو فڕاندنی بە سەرەوەیە و تۆپی خڕی درکاوی بە سەرەوەیە لە جۆرە درکێك دەچێت لە ناوچەی نەجد کە پێی دەگوترێت سەعدان، ئیمانداران تێدەپەڕن وەکو چاوتروکان)) الله أکبر! کۆمەڵێك لە ئیمانداران بە چاوتروکانێك دەپەڕنەوە! (وکالبرق، وکالریح، وکالطیر، وکأجاوید الخیل والرکاب، فناج مُسَلَّمٌ،)) واتە: وەکو بروسکە (تریشقە)، وەکو با، وەکو باڵندە، وەکو چاکترین ئەسپ و وەکو وشتر، کەسی وا هەیە بە سەلامەتی ڕزگاری دەبێت)). ئەمە یەکەم کۆمەڵە لە گرووی ئیمانداران، ((ومخدوش مرسل، ومکدوس في نار جهنم)) واتە: کەسی واش هەیە بە زەحمەت و زامداری

---

١ ـ أخرجه مسلم (١٨٣).

رزگـاری دەبێـت و کەسـی واش هەیـە فـڕێ دەدرێتـە نـاو دۆزەخـەوە)) ئـەی پەروەردگارمان بمانپارێزە ! !

لە ڕیوایەتێکی تردا کە لە (صحیح مسلم)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (أبو هریـرە)و (حذیفة)وە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((وترسـل الأمانـة والـرحم فتقومـان جنبتي الصراط یمینا وشمالا)) واتـە: سپاردە و پەیوەنـدی خزمایـەتی دەنێردرێنـە ئەم دیو و ئەو دیوی پردی سیرات لە لای راست و چەپەوە))

بـەڵێ... سپاردە و پەیوەنـدی خزمایـەتی دەتگـرن، پرسـیارت لـێ دەکـەن ئایـا حەقی ئەو دوانەت داوە؟ یان خیانەتت لە سپاردە کـردوە و پەیوەنـدی خزمایـەتیت بچراندوە؟!! ئایا بە جوانی دەیهێنیتـە پـێش چـاوی خـۆت؟! سـپاردە لـە لایـەکی سیرات (الصراط) راوەستاوە و پەیوەندی خزمایەتی لە لایەکی ترەوە!

خۆشەویـستان... بـە راسـتی کـات و سـاتێکی گرانـە و دیمـەنێکی ترسـناکە — سوێند بە پەروەردگاری کەعبە – ئاگریش لـە ژێـرەوەی سـیرات (الـصراط) هـاوار دەکات و دەناڵێنێت!!

ئەم بەشە بە فەرموودەیەکی جوان تەواو دەکەم کە تیایدا باسی دووایـن کەسمان بـۆ دەکـات کـە بـە سـەر سـیرات (الـصراط) دا تێدەپـەڕێت و ئـەمجار دەچێـتە بەهەشتەوە، فەرموودەکەش لە (صحیح مسلم)[2] دا هاتوە لە فەرموودەی (عبـدالله ی کوڕی مسعود) کـەوا خۆشەویـستی خـوا ﷺ فەرموویـەتی: ((آخـر مـن یـدخل الجنـة رجل. فهو یمشي مرة ویكبو مرة. وتسفعه النار مرة[3]. فـإذا مـا جاوزهـا التفـت إلیهـا. فقال: تبارك الذي نجاني منـك. لقـد أعطـاني الله شـیئا مـا أعطـاه أحـدا مـن الأولـین والآخرین. فترفع له شجرة. فیقول: أي رب! أدنني من هذه الشجرة فلأسـتظل بظلـها وأشرب من مائها. فیقول الله عز وجل: یا ابن آدم! لعلي إن أعطیتكها سألتني غیرها. فیقول: لا. یا رب! ویعاهده أن لا یسأله غیرها. وربه یعذره. لأنه یرى ما لا صـبر لـه علیه. فیدنیه منها. فیستظل بظلها ویشرب من مائها. ثم ترفع له شـجرة هـي أحـسن

---

١ – أخرجه مسلم (١٩٥) .

٢ – أخرجه مسلم (١٨٧) وهو في الصحیحین (مختصراً البخاري ٦٥٧١ , ومسلم ١٨٦) .

٣ – عش بقلبك وعقلك وكیانك هذا الموقف، فمع هذا العناء الذي یكون هذا الرجل، ینجیه الله بعـد ذلـك، فیـا ترى ما هو حاله عند ذلك ؟!! (فمن زحزح عن النار وأدخل الجنة فقد فاز)

من الأولى. فيقـول: أي رب! أدنـني مـن هـذه لأشـرب مـن مائهـا وأسـتظل بظلـها. لا أسألك غيرها. فيقول: يا ابن آدم! ألم تعاهدني أن لا تسألني غيرها؟ فيقول: لعلي إن أدنيتك منها تسألني غيرها؟ فيعاهده أن لا يسأله غيرها. وربه يعذره. لأنه يرى ما لا صبر له عليه فيدنيه منها. فيستظل بظلها ويشرب من مائها. ثم ترفع له شجرة عند باب الجنة هي أحسن من الأوليين. فيقول: أي رب! أدنـني مـن هـذه لأسـتظل بظلـها وأشرب من مائها. لا أسألك غيرها. فيقـول: يـا ابـن آدم! ألم تعاهـدني أن لا تـسألني غيرها؟ قال: بلى. يا رب! هذه لا أسألك غيرها. وربه يعذره لأنه يرى مـا لا صـبر لـه عليها. فيدنيه منها. فإذا أدناه منها، فيـسمع أصـوات أهـل الجنـة، فيقـول: أي رب! أدخلنيها. فيقول: يا ابن آدم! ما يصريني منـك؟ أيرضـيك أن أعطيـك الـدنيا ومثلـها معها؟ قال: يا رب! أتستهزئ مني وأنت رب العالمين".

فضحك ابن مسعود فقال: ألا تسألوني مم أضحك؟ فقالوا: مم تضحك؟ قال: هكـذا ضحك رسول الله صلى الله عليه وسلم. فقالوا: مـم تـضحك يـا رسـول الله؟ قـال "مـن ضـحك رب العـالمين حـين قـال: أتـستهزئ مـني وأنـت رب العـالمين؟ فيقـول: إنـي لا أستهزئ منك، ولكني على ما أشاء قادر))

واتە: دوایین کەس کە دەچێتە بەهەشتەوە کابرایەکـە، جارێـك بـە پـێ دەڕوات و جارێك بە گاڵگۆڵکێ و جارێك ئـاگر پـەلاماری دەدا و ئەیـسوتێنێ، کاتێـك لـە دۆزەخ دەربازی دەبێت ئاوڕێك لە دۆزەخ دەداتەوە، دەڵێت: پاکی و پیرۆزی بۆ ئـەو زاتـەی کە لـە تـۆ ڕزگـاری کـردم، بـە ڕاسـتی شـتێکی بەخـشیوە بـە مـن بـە کەسـی تـری نەبەخشیوە لە پێشین و پاشینەکان، درەختێکی پێ نیشان دەدرێت، دەڵێـت: ئـەی پـەروەردگارا! نـزیکم بکـەرەوە لـەو درەختـە بـۆ ئـەوەی بچمە ژێـر سـێبەری و لـە ئاوەکەی بخۆمەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی نـەوەی ئـادەم لەوانەیـە ئەگـەر ئەمەت بۆ جێ بەجێ بکەم داوای جگە لەوەم لێ دەکەیت؟ ئـەویش دەڵێـت: نـەخێر ئـەی پـەروەردگار پـەیمان دەدات بـە خـوا چـی دی داوای شـتی تـر نـەکات، پەروەردگاری بەهانەکەی لێ وەردەگرێ، چونکە دەزانێت ئەم کابرایە ئارام ناگرێـت لە سەری، پاشان نزیکی دەکاتـەوە و ئـەویش دەچێتە ژێـر سـێبەری دارەکـە و لـە ئاوەکەی دەخواتەوە، پاشان درەختێکی جـوانتر و باشـتری پـێ نیـشان دەدرێـت و دەڵێـت: ئـەی پـەروەردگارا! نـزیکم بکـەرەوە لـەو درەختـە بـۆ ئـەوەی بچمە ژێـر

سێبەری و لە ئاوەکەی بخۆمەوە، داوای جگە لەوەت لێ ناکەم خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی نەوەی ئادەم پەیمانت نەدامێ کە داوای شتی تر نەکەیت؟ دەڵێت: ئەگەر لەوە نزیکت بکەمەوە لەوانەیە جگە لەوەم لێ داوا دەکەی؟ پەیمانی دەداتێ جگە لەوەی لێ داوا نەکات و پەروەردگاریش بەهانەکەی لێ وەردەگرێت. چونکە دەزانێت ئەم کابرایە ئارام ناگرێت لە سەری، پاشان لە درەختەکە نزیکی دەکاتەوە و ئەویش دەچێتە ژێر سێبەری دارەکە و لە ئاوەکەی دەخواتەوە، پاشان درەختێکی تری پێ نیشان دەدرێت لە بەر دەرگای بەهەشت کە لە دوو درەختەکەی پێشین جوانترە و دەڵێت: ئەی پەروەردگارا! نزیکم بکەرەوە لەو درەختە بۆ ئەوەی بچمە ژێر سێبەری و لە ئاوەکەی بخۆمەوە، داوای جگە لەوەت لێ ناکەم. خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی نەوەی ئادەم پەیمانت نەدامێ کە داوای شتی تر نەکەیت؟ دەڵێت: بەڵێ ئەی پەروەردگار، پەروەردگاریش بەهانەکەی لێ وەردەگرێت چونکە دەزانێت ئەو کابرایە ئارام ناگرێت لە سەری، پاشان لە درەختەکە نزیکی دەکاتەوە، کاتێ نزیکی درەختەکەی کردەوە، گوێی لە دەنگی بەهەشتییەکان دەبێت، دەڵێت: ئەی پەروەردگارا! بمخەرە ناو بەهەشتەوە، دەڵێت: ئەی نەوەی ئادەم چی رازیت دەکات و داوات ناهێڵێت؟ ئایا رازی دەبیت دونیا و هاوشێوەکەیت بدەمێ؟ دەڵێت: ئەی پەروەردگارا! گاڵتەم پێ دەکەی و تۆ پەروەردگاری جیهانی؟))

ابن مسعود لێرەدا پێکەنی و فەرمووی: پرسیارم لێ ناکەن بۆچی پێدەکەنم؟ وتیان: بۆچی پێدەکەنێت؟ وتی: ئاوا پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی پێدەکەنی؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە پێکەنینی پەروەردگاری جیهان کاتێك پیاوەکە دەڵێت:! گاڵتەم پێ دەکەی و تۆ پەروەردگاری جیهانی؟ ئینجا خوای گەورە دەڵێت: من گاڵتەت پێ ناکەم، بەڵام ویستم لە سەر چی بێت دەتوانم بیکەم))

ڕێزداران... ئایا لە پاش سیرات (الصراط) چی هەیە؟ دۆزەخ یان بەهەشت؟

ئەمە و چەند باسێکی تر لە بەشی داهاتوودا باس دەکەین ـ انشاء الله ـــ داوا لە خوا دەکەم من و ئێوە لە ئەهلی بەهەشت بگێڕێ، هەر خۆی پشت و پەنامانە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

# باسی بەهەشت و دۆزەخ

## وصف الجنة والنار

له بەشی رابوردوودا لـه باسـی ئـەو دیمەنـدا راوەسـتاین کـه دڵـەکانن دەهێنێتـه لـەرزە، کـاتێ پێغەمبـەری خـوا ﷺ باسـی سـیرات دەکـات، هـەروەکو لـه (صحیح البخاری و مسلم)[1] دا هاتوه له فەرموودەی (أبو سعید الخدری)یـەوە تیایـدا هـاتوه کـەوا پرسـیار لـه خۆشەویـستی خـوا ﷺ کـرا دەربـارەی سـیرات (الجـسر)؟ خۆشەویست ﷺ فەرمووی: ((دحض مَزِلَّة فیـه خطـاطیف و کلالیـب و حـسك، تکـون بنجد فیهـا شـویکة یقـال لهـا: الـسعدان، فیمـر المؤمنـون، کطـرف العـین، وکـالبرق، وکالریح، وکالطیر، وکأجاوید الخیل والرکاب، فناج مُسَلَّمٌ ومخدوش مرسـل، ومکـدوس في نار جهنم))، واته: پردێکی لوسه و جێی پێخلیسکانی و تیاچوونه و قولاپ و شتی له ناکاو فڕاندنی به سەرەوەیه و تۆپی خڕی درکـاوی بەسـەرەوە لـه جـۆرە درکێـك دەچێت له ناوچەی نەجد هەیه که پێی دەگوترێت سـەعدان، ئیمانـداران تێدەپـەڕن وەکو چاوتروکان، وەکو بروسکه (تریشقه)، وەکو با، وەکو باڵندە، وەکـو چـاکترین ئەسپ و وەکو وشتر، کەسـي وا هەیـه بـه سـەلامەتی رزگـاری دەبێـت، کەسـی واش هەیه به زەحمەت و زامداری رزگاری دەبێت و کەسی واش هەیـه فـڕێ دەدرێتـه نـاو دۆزەخەوە)).

گەردنم ئازا بکەن ئەگەر بڵێم: فەرموو با کەمێك له گـەڵ ئـەو کەسـەدا راوەسـتین که کەوته ناو ئاگرەوە، رەنگه هەندێ کەس پێی نـاخۆش بێـت کـاتێ باسـی ئـاگر و ترساندن بکەین، دەڵێت: بـۆ لای خۆتانـەوە باسـی دەرگـای تکـا و بـەزەیی و هیـوا ناکەیت؟ بۆ باسی ترس و ترساندن دەکەیت؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێین: بەرنامەی قورئانی پیرۆز بریتییه له پاکراگرتنی

---

١ ــ أخرجه البخاري (٧٤٣٩) ومسلم (١٨٣) .

ناخی مرۆڤایەتی و پەروەردە کردنی بە ترساندن و هاندان، ئەوەش باش بزانە کە بەرنامەی قورئان چاکترین و مەزنترین بەرنامەیە، بۆ نا؟ لە کاتێکدا ئەوە بەرنامەی دروستکەری مرۆڤە، هەر ئەویش باش دەزانێت کە چ شتێك باشە بۆ مرۆڤایەتی و چی شتێك خراپە بۆیان، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ﴾ (الملك: ١٤) واتە: مەگەر خوا نازانێ کێی دروست کردوە و چۆنی دروست کردوە لە کاتێکدا زۆر وردبین و بە ئاگایە؟ کەوابوو لە خوا بترسن پیلان بۆ موسڵمانان مەگێڕن نە بە نهێنی و نە بە ئاشکرا)).

جا ناخ و نەفسی مرۆڤایەتی چاکە و خراپەی تێدایە، بەدرەوشتی و تەقوا تێدایە، حەڵاڵ و حەرام، ڕووکردنە فەرمانەکان و پشت تێکردنی، گوێڕایەڵی و سەرپێچی.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾﴾ (الشمس) واتە: سوێند بە نەفس و دەروونی مرۆ و بەو زاتەی دروستی کردوە بە ڕێکوپێکی.(٧) ئینجا ئیلهامی بەدکاری و پارێزگاری بۆ کرد، واتە: خێر و شەڕی بۆ روون کردەوە وە نیشانی دا چی چاکە بیکا و چی خراپە نەیکا و خۆی لێ بپارێزێ (٨) سوێند بەوانە هەموو بێ شك رزگاری بوو ئەوکەسەی کە نەفسی خۆی لە هەرچی کاری بەدوو فەسادە پاك و پوختەی کردەوە.(٩) و بەراستی ئەو کەسەش کە نەفسی خۆی بە گوناه و تاوان ئالوودە کرد نائومێد و ناموراد بوو(١٠).

جا نەفسی وا هەیە ڕوو لە خوا ناکات تەنها لە ڕێگای هاندانەوە نەبێت، ئەو نەفسانە پاك و بێگەرد و ڕێزدارن، لە ڕێگا و دەرگای تکا و بەزەیی و هیوا و هاندانەوە دێت و ملکەچ دەبێت، لەولاشەوە نەفسی وا هەیە کە ڕوو لە خوا ناکەن تەنها لە ڕێگای ترساندن و هەڕەشەوە نەبێت.

کەواتە: باش بزانە کەوا نەفسی مرۆڤەکان پێویستیان بەو بەرنامەیە، هەروەکو چۆن لە زۆربەی ئایەتە پیرۆزەکاندا دەیبینی.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿٢﴾ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ ذِي ٱلطَّوۡلِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ إِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٣﴾﴾ (غافر) واتە: حا میم (١) دابەزاندنی ئەم کتێبە (قورئان) لە خوای بە دەسەڵاتی زاناوەیە (٢) تاوانپۆش وتەوبە وەرگری توندگرە، واتە: لێبووردەی گوناهانی ڕابوردوو و وەرگری پەشیمانی و تەوبە لە ئایندەدا، تۆڵە و ڕقی سەختە، خاوەن بەخشش و نیعمەتی زۆرە، هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نییە ئەو نەبێ گەڕانەوەی هەموان هەر دێتەوە لای ئەو، چارەنووس و پاداش هەر لای ئەوە.(٣)

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿نَبِّئۡ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ ﴿٥٠﴾﴾(الحجر: ٥٠) واتە: ئەی موحەممەد ﷺ تۆ بەندەکانم ئاگادار بکە کە بە ڕاستی هەر خۆمم زۆر لێبووردەو زۆریش میهرەبان و دلۆڤانم (٤٩) سزاشم سزای زۆر بەژان و ئێش پێکەیەنەرەو وێنەی نییە، بەڵام لێبووردنیشم پێش سزام کەوتوە (٥٠).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَأَسۡلِمُواْ لَهُۥ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَٱتَّبِعُوٓاْ أَحۡسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ بَغۡتَةً وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ﴿٥٥﴾ أَن تَقُولَ نَفۡسٞ يَٰحَسۡرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِي جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴿٥٦﴾ أَوۡ تَقُولَ لَوۡ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِي لَكُنتُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٥٧﴾ أَوۡ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلۡعَذَابَ لَوۡ أَنَّ لِي كَرَّةٗ فَأَكُونَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٥٨﴾ بَلَىٰ قَدۡ جَآءَتۡكَ ءَايَٰتِي فَكَذَّبۡتَ بِهَا وَٱسۡتَكۡبَرۡتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾(الزمر) واتە: ئەی موحەممەد ﷺ لە منەوە بڵێ: ئەی بەندەکانی من! ئەی ئەوانەی ستەم و زیادە ڕۆییتان لە خۆتان کردوە! ئێوە لە ڕەحمەت و میهرەبانی خوا بێ ئومێد مەبن. بە

ڕاستی خوا لە هەموو گوناحیٚ خۆش ئەبیٚ دیارە ئەم بانگەشەیە بۆ تەواوی تاوانبارانە کە بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئەگەرچی گوناهیشیان بە ئەندازەی کەفی سەر زەریاکان بیٚ. چونکە ئەوە لێبووردە و میهرەبان.(٥٣) بگەڕێنەوە و بۆ لای خواوەندتان و ملکەچی فەرمانی ئەوبن پێش ئەوە سزاکەتان بۆ بیٚ دواییش ئیتر لە لایەن هیچ کەسێکەوە یارمەتی نادرێن.(٥٤) لە باشترین نامە کە پەروەردگارتان دای بەزاندوە بۆتان، پەیرەوی بکەن، واتە: پەیڕەوی لە قورئان بکەن. پێش ئەوەی کتوپڕ سزاکەتان بۆ بێت، هەستیش بە خۆتان نەکەن، تا شتیٚ بکەن بۆ خۆتان(٥٥) نەوەك کەسیٚ بڵیٚ: ئەی داخ لەسەر کەمتەرخەمیم لەلای خواو لە گوێڕایەڵی خوا، بیٚ شك لە گاڵتەکەرانیش بووم بە ئایینی خوا و کتێبی خوا، واتە: جگە لە سەرپێچیم گاڵتەیشم بە موسڵمانان ئەکرد (٥٦) یان بڵیٚ: ئەگەر خوا ڕێنموونی بکردمایە، لە پارێزکاران ئەبووم (٥٧) یان کاتیٚ سزای خوا دەبینیٚ بڵیٚ، بریا جارێکی تر دەگەڕامەوە بۆ دونیا و لە گەڵ چاککاران ئەبووم (٥٨) خوا ئەفەرمویٚ: بەڵیٚ... خوا گەلیٚ ئایەت و نیشانەکانی منت بۆ هات، بە درۆت زانی و بڕوایشت نەهێنا بایی بوویت و بوویتە کافر و بێباوەڕ (٥٩).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ﴿١﴾ ٱلَّذِى جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُۥ ﴿٢﴾ يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ ﴿٣﴾ كَلَّا ۖ لَيُنۢبَذَنَّ فِى ٱلْحُطَمَةِ ﴿٤﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحُطَمَةُ ﴿٥﴾ نَارُ ٱللَّهِ ٱلْمُوقَدَةُ ﴿٦﴾ ٱلَّتِى تَطَّلِعُ عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ ﴿٧﴾ إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ ﴿٨﴾ فِى عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍۭ ﴿٩﴾﴾ (الهمزة) واتە: سزای سەخت بۆ هەموو توانج گرێکی عەیبگر، واتە: ئەو کەسەی ناوی خەڵك بە خراپە دەبا و بە شوێن کەم و کوڕی و نەنگدا دەگەڕیٚ (١) ئەو کەسەی کەماڵێکی زۆری کۆ کردەوە و هەر خەریکی ژماردنی بوو، ئیتر بیٚ لێکدانەوەی حەڵاڵ و حەرام، واتە: ئەوانە کە ناوی خەڵکی دەبەن ئەو دەوڵەمەندانەن بە هۆی سامانەکانیانەوە خۆ بە گەورە دەگرن و بەسووك سەیری خەڵکی دەکەن (٢) وا خەریکە بە دونیاوە پێی وایە کە ماڵ و سامانەکەی بە ئێجگاری لە دونیادا دەهێڵێتەوە و هەرگیز نامریٚ، بۆیە ڕەفتاری وا

دەکات (٣) با وانەزانێت سوێند بە خوا بە سووکی و ریسوایی فڕێ دەدرێتە ناو تێکشکێنەرە وە (الحطمة)(٤) تۆ چوزانیت ئەو تێشکێنەرەیە چییە، ئەگەر خوا بۆت باس نەکات.(٥) ئاگرێکی هەڵکراوی بڵێسەداری خوایە، واتە: بە فەرمانی ئەو و فریشتەی ئەوی لەسەرە (٦) ئەو ئاگرێکی وایە رووەدەکاتە بنۆکەی دڵەکان و پەڕەی دڵەکان دەسوتێنێ کە سەرچاوەی کوفر بوون (٧) بە راستی ئەو (ئاگرە) دەورەی داون و لە سەریان داخراوە و داپۆشیون، نە هەوای تێ دەچێ و نە هەوای لێ دەڕواتە دەرەوە (٨) ئەوان بەسراونەوە لە ناو چەند کۆڵەکەیەکی درێژکراوەدا، واتە: بە هیچ شێوەیەك رێگای دەرچوونیان نییە و قوتار نابن (٩).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ ﴿٢٧﴾ فِى سِدْرٍ مَّخْضُودٍ ﴿٢٨﴾ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ﴿٣٠﴾ وَمَآءٍ مَّسْكُوبٍ ﴿٣١﴾ وَفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ ﴿٣٢﴾ لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ ﴿٣٣﴾ وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً ﴿٣٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُنَّ أَبْكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾ لِّأَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٨﴾ ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْءَاخِرِينَ ﴿٤٠﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِى سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ ﴿٤٥﴾ وَكَانُوا۟ يُصِرُّونَ عَلَى ٱلْحِنثِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٤٦﴾ وَكَانُوا۟ يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٤٧﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٤٨﴾ قُلْ إِنَّ ٱلْأَوَّلِينَ وَٱلْءَاخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٥٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَءَاكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾ فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَٰرِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَٰرِبُونَ شُرْبَ ٱلْهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿٥٦﴾﴾ (الواقعة) واتە: یارانی لای راست، چین یارانی لای راست؟ واتە: چەند بەختەوەر و لە کامەرانی دان (٢٧) لە ژێر سێبەری داری مۆردی بێ دڕکدان لە جێگەی هەر دڕکێکدا بەرێکە (٢٨) لە بن سێبەری داری مۆزی بەر بەسەر یەککەوتوودان، لە بەر زۆری مۆزەکەی قەدی لاسکەکەی دیار نییە (٢٩) لە ژێر سێبەری بەردەوام و دوور و درێژدان کە هەرگیز خۆری نایسڕێتەوە و هەمیشە هەر سێبەرە (٣٠) لە نزیکی تافگە و ئاوێکدان

دەڕژێتە خوار (٣١) لە ناو میوەیەکی زۆردان (٣٢) نە دەبڕدرێ و نە قەدەغە دەکرێ (٣٣) لە سەر رایەخگەلێکی بە نرخن (٣٤) بە راستی ئێمە بەهەشتمان درووستکردوون بە دروستکردنێکی تازە، شۆخ و شەنگ و جوان، وەك ژنانی دونیا نین هەندێ گۆڕانیان بە سەردا بێت (٣٥) کردوومانن بە کچ، واتە: هەمیشە کچن و وەك کیژانی شوونەکردوون.(٣٦) مێرد خۆشەویستانێ هاوساڵ و هاوتەمەن (٣٧) ئەمانە هەموو بۆ یارانی لای راست و بەختەوەرن، ئەوانەی کە نامەی کردەوەیان بە دەستی راستیانەوە ئەدرێ (٣٨) کۆمەڵێکی زۆرن لە پێشینان (٣٩) کۆمەڵێکی زۆریش لە پاشینان. هەمووی واتە: پێشینان و پاشینان لە ئوممەتی پێغەمبەرن (٤٠) یارانی لای چەپ، چین یارانی لای چەپ؟ مەگەر خوا بزانێ حاڵیان چەند خراپە! ئەو کەسانەن کە نامەی کارەکانیان بە دەستی چەپیانەوە دەدرێت (٤١) لە ناو گەرمای ئاگرێکی دۆزەخ و ئاوێکی کوڵ بە کوڵدان (٤٢) لە ژێر سێبەری چڕە دووکەڵێکی زۆر رەشدان (٤٣) نە سێبەرێکی فێنکە لە گەرما کەم بکاتەوە، وەنە دیمەنێکی جوانیشی هەیە (٤٤) چونکە ئەوانە لە پێش ئەوەدا - واتە: لە دونیادا - لە ناو نیعمەتدا رایان دەبوارد گوێیان بەوە نەئەدا کە پەیامبەرەکەیان پێی رائەگەیاندن، بۆیە وا ئێستا دووچاری ئەو سزایە بوون (٤٥) ئەوان هەردەم سوور بوون لە تاوانە گەورەکە، واتە: لە سەر شیرك (٤٦) هەمیشە دەیانوت: ئایا کاتێ مردین و بووینە گڵ و ئێسك، ئایا بە تەئکیدی زیندوو ئەکرێینەوە؟! (٤٧) هەتا باوباپیرانی پێشینانیشمان؟!(٤٨) ئەی موحەممەد بڵێ: بێ گومان پێشینان و پاشینان و هەموو (٤٩) کۆ ئەکرێنەوە بۆ کاتی رۆژێکی دیاریکراو، ئەویش کاتی رۆژی قیامەتە.(٥٠) پاشان ئێوە ئەی لاڕێ و گومڕا و کافر و نکۆڵی کەران!(٥١) بێ گومان لە بەرو بوومی (زەققوم) درەختێکە لە ناوەراستی دۆزەخدا - ئەخۆن (٥٢) لە بەر زۆر برسێتی، ورگ و زگتانی لێ پڕ ئەکەن گوێ بە تام و چێژی زۆر ناخۆشیشی نادەن (٥٣) ئەوسا لەبەر تینوویەتی لە ئاوێکی زۆر گەرم بە کوڵیشی بە سەردا دەکەن (٥٤) ئێوەش هەروەکو وشتری تینوو کە دەردی (هویام) ی گرتبێ و هیچ کات تێر ئاو نەبێ دەخۆنەوە و تێر ئاویش نابن (٥٥) ئەمەیە خۆراك و ئاو و میوانداری خوانەناسان لە رۆژی پاداشت (٥٦).

خۆشەویستان.. ئەمە چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز بوو، ئەوەش بزانە ئەو ئایەتانەی کە هاندان و ترساندنی کۆ کردبێتەوە زۆر زۆرن، ناخ و نەفسەکان پاك نابنەوە ئیللا بەو دوانە نەبێت، کەواتە هاندان و ترساندن هەردوو پێویستە.

جا (ترس و تکا) دووباڵی یەك باڵندەن، ئەو باڵندەیە هەرگیز ناتوانێ بفرێت بە ئاسماندا بە بێ ئەو دوو باڵە پێکەوە ئەگەر بە تەنها باڵێك بفرێت بە ئاسماندا و بەرز بووەوە و بۆ ماوەیەك سەرکەوت هەرچەندە ئەو ماوەیە زۆر بێت، ئەوا دڵنیابە هەردەبێت بکەوێت و ئەو تەنها باڵەشی بشکێت.

بۆیە ئەگەر هەستت کرد ترس زاڵ بوە بە سەرتدا ئەوا هەوڵ بدە تکاکردنەکە زاڵ بکە، یان ئەگەر تکاکردنەکە زاڵ بوو بە سەرتدا هەوڵ بدە ترسەکە زاڵ بکە.

ابن القیم فەرموویەتی[1]: ((دڵەکان لە کاتی فرێنیدا بۆ لای خوا وەکو باڵندەیەکە، خۆشەویستی خوا سەری باڵندەکەیە، ترس و تکا هەردوو باڵەکەیەتی، هەرکاتێك ئەو دوو باڵەی لە دەست بدات ئەوا دەبێتە نێچیری هەموو راوچی و درندەیەك، بەلأم پێشینان (السلف) وایان بە باش زانیوە کەوا باڵی ترسەکە بەهێزتر بێت بە سەر باڵی تکاکردنەکەدا، بۆ ئەوەی لە کاتێ دەرچوون لەم دونیایەدا باڵی تکاکردن بە هێزدەبێت بە سەر باڵی ترسەکەدا.. ئەمەشە ڕێگا و بەرنامەی سلیمان و جگە لەو، دەڵێت: پێویستە دڵەکان ترسەکە زاڵ بێت بە سەریدا، چونکە ئەگەر تکاکردنەکە زاڵ بێت ئەوا خراپ دەبێت)).

هەروەها دەڵێت[2]: ((أبو علی الروذباري فەرموویەتی: ترس و تکا وەکو دوو باڵی باڵندەیەکن ئەگەرهاوسەنگ و هاوتا بوون ئەوا باڵندەکە هاوسەنگ دەبێت و بەرێك و پێکیی دەفرێت، بەلأم ئەگەر یەکێ لە باڵەکانی کەمی کرد ئەوا باڵندەکە کەمی تێدەکەوێت، ئەگەر باڵەکە رۆیشت ئەوە لە مردنەوە نزیکە)).

بە (حسن البصری)یان گوت[3]: ((ئەی باوکی سەعید، چی بکەین؟ لای هەندێ

١ ـ مدارج السالكين (٥١٧/١) .

٢ ـ المصدر السابق (٣٦/٢) .

٣ ـ أخرجه أبو نعيم في (الحلية) (١٥٠/٢) وابن أبي الدنيا في (الوجل والتوثق بالعمل) (٢٨) برقم ( ٣) والمزي في (تهذيب الكمال ) (١١٤/٦) وذكره الغزالي في (الإحياء ) (١٦٢/٤) .

کەس دادەنیشین ئەوانیش دەماترسێنن تا رادەیەك خەریکە دڵەکانمان دەفڕێت لە ترساندا. ئەویش فەرمووی: سوێندبە بە خوا ئەگەر تێکەڵی کەسانێك بێت بترسێنن لەم دونیایەدا تاکو لە دوارۆژدا لە ئەمان و ئاسایشیدا بیت، باشترە لەوەی هاوڕێتی کەسانێك بکەی لەم دونیایەدا ئارامی و ئەمانت پێ ببەخشن تا توشی ترس ببیت لە دوارۆژدا)).

لە فەرموودەیەکدا کە (ابو نعیم) لە (الحلیه) دا و (الطبراني) لە (مسند الشامیین) لە فەرموودەی (شداد ی کوڕی أوس) ەوە ریوایەتیان کردوە، هەروەها (ابن حبان)و (البیهقی) لە (الشعب)دا و(البزار) و (شیخ الالبانی) لە (الصحیحه)[1]دا لە فەرموودەی (ابو هریره)وە ریوایەتیان کردوە لە پێغەمبەری خوداوەﷺ دەفەرموێت: ـ ((قال الله تعالى: وعزتي! لا أجمع على عبدي خوفين و أمنين، إذا خافني في الدنيا أمنته يوم القيامة، و إذا أمنني في الدنيا أخفته يوم القيامة)) واتە: ((خوای گەورە دەفەرموێت: ـ سوێند بە عیززەتی خۆم! لە سەر هیچ بەندەیەکم دوو ترس و دوو دڵنیایی کۆ ناکەمەوە.. ئەگەر لە دونیادا لێم دڵنیا بوو ئەوا لە دوارۆژدا دەیترسێنم.. وە ئەگەر لە دونیادا لێم ترسا ئەوا لە دوارۆژدا دڵنیای دەکەم)).

پێغەمبەری خواﷺ باس و وەسفی ئاگری بە شێوەیەکی زۆر ورد و سەیر کردوە.

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت ـ هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)[2]دا لە فەرموودەی (ابو هریره)ەوە هاتوە ـ : ((ناركم هذه التي يوقد ابن آدم، جزء من سبعين جزءاً من حر جهنم) قالوا: والله، إن كانت لكافية، يا رسول الله! قال: ((فإنها فُضلت عليها بتسعة وستين جزءاً، كلها مثل حرها)) واتە: ئەم ئاگرەی کە ئادەمیزاد بۆ سوتاندن بە کاری دێنن بەشێکە لە حەفتا بەشی گەرمی دۆزەخ، فەرموویان: سوێند بە خوا، ئەگەر هەر ئەمەش بوایە بەس بوو ئەی پێغەمبەری خواﷺ، ئەویش

---

١ ـ أخرجه ابن حبان في (صحيحه) (٦٤٠) والبيهقي في (الشعب) (٧٧٧) ورواه البزار، كما في كشف الأستار (٧٤/٤) عن أبي هريرة ورواه البزار في المصدر نفسه عن الحسن مرسلا، ورواه ابن المبارك في (الزهد) (١٥٧) مرسلا وابو نعيم في (الحلية) (٢٧٠/١) و (٩٨/٦) والطبراني في (مسند الشاميين ) (٤٦٢ ، ٣٤٩٥) وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٧٤٢، ٢٦٦٦).

٢ ـ أخرجه البخاري (٣٢٦٥) ومسلم (٢٨٤٣) واللفظ له.

فەرمووی: لە ڕاستیدا ئاگری دۆزەخ شەست و نۆ پلەی زیاترە لەو، هەر بەشێکی بە وێنەی ئەو گەرمە)).

ئایا هیچ کەسێك دەتوانێت تەنها پەنجەیەکی لە سەر مۆمێك ڕابگریٚ؟ سوێند بە خوا هیچ کەسێك ناتوانێت.

ئایا دەیهێنیتە پێش چاوی خۆت بیرێك لە بیر نەوتەکان ئاگری تێچوە و گڕ دەگریٚ؟ ئایا ئەو دیمەنەت بینیوە؟ بزانە کە ئاگری دۆزەخ شەست و نۆ جار بە قەد ئەو ئاگرە مەزنەی دونیا بە گڕترە؟ بەڵکو پێغەمبەری خواﷺ دەربارەی ئەو ئاگرە فەرموویەتی: هەروەکو لە (صحیح مسلم)[1] دا لە فەرموودەی (ابن مسعود) ەوە هاتوە ((يُؤْتَى بِجَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لَهَا سَبْعُونَ أَلْفَ زِمَامٍ، مَعَ كُلِّ زِمَامٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ يَجُرُّونَهَا)) واتە: دۆزەخ دەهێنرێت حەفتا هەزار جڵەوی هەیە، لە گەڵ هەر جڵەوێکدا حەفتا هەزار فریشتە هەن ڕایدەکێشن)).

ئایا ئەو ئاگرە بە هەموو ئەو گڕ و تین و بڵێسەوە دێتە پێش چاوت؟ ئایا ئارام دەگریت لە سەر سزاکەی؟ ئایا ـ خوشکە بەڕێزەکەم ـ ئارام دەگریت لەسەر ئەو سزا سەختە، سزای ئاگری دۆزەخ؟

لە (صحیح مسلم)[2] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابو هريرە)وە دەڵێت: ((كنا مع رسول الله ﷺ إذ سمع وجبة، فقال النبي: ((تدرون ما هذا؟)) قال: قلنا: الله ورسوله أعلم. قال: هذا حجر رمي به في النار منذ سبعين خريفاً، فهو يهوي في النار الآن، حتى انتهى الى قعرها)) واتە: لە کاتێکدا ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا بووین ﷺ گوێی لە گرمەیەك بوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((دەزانن ئەوە چی بوو؟)) وتمان: خوا و پێغەمبەرکەی ﷺ زاناترن، فەرمووی: ئەوە بەردێك بوو فڕێدرایە ناو دۆزەخەوە، حەفتا پایز (ساڵ) ڕۆدەچێت ئێستا گەیشتە بنی دۆزەخ)).

سوێند بە خوا هیچ کەسێك لە ئێمە بەرگەی گەرمی هاوین ناگرێت ئەگەر زیاد بکات و توند بوو، ئەی ڕات چۆنە بەرامبەر ئاگر؟ ئەو گەرماییەی کە توشمان دەبێت

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٨٤٢) .

٢ ـ أخرجه مسلم (٢٨٤٤) .

لە هاویندا ئەوا هەناسەی دۆزەخە، لە هەردوو کتێبی (صحیح)[١] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابو هریره) ەوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((أشتكت النار الى ربها، فقالت: يا رب أكل بعضي بعضاً، فأذن لها بنفسين: نفس في الشتاء ونفس في الصيف، فهو أشد ما تجدون من الحر، وأشد ما تجدون من الزمهرير)) واتە: ئاگری دۆزەخ لە لای پەروەردگاری خۆی سکالای کرد و وتی: پەروەردگارا! من هەندێکم هەندێکی تری خواردم، خوای گەورە روخسەتی دوو هەناسەی پێدا: هەناسەیەك لە زستاندا و هەناسەیەك لە هاویندا،جا سەختترین گەرما و سەخترین سەرما کە دەیبینین لەوەوە هاتوە))

ئایا ئەو دیمەنەت دێتە پێش چاو؟

بەڵکو بیهێنە بە بیری خۆتدا سوکترین سزای دۆزەخ ئاخۆ لە چی حاڵێکدا بێت؟ سزاکە چییە؟

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[٢]دا هاتوە لە فەرموودەی (النعمان ی کوڕی بشیر)ەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((إن أهون أهل النار عذاباً يوم القيامة لرجل توضع في أخمص قدميه جمرتان، وفي لفظ: ((جمرة)) وفي لفظ: ((له نعلان و شراكان من نار، يغلي منهما دماغه، كما يغلي المرجل، ما يرى أن أحداً أشد منه عذاباً، وإنه لأهونهم عذاباً)) واتە: سووکترین سزای ئەهلی دۆزەخ سزای کەسێکە کە دوو سکڵ لە ژێر پێیدا دادەنێن، لە ریوایەتێکی تردا: سکڵێك، لە ریوایەتێکی تردا: جووتێ نەعلی ئاگرینی لە پێدایە، مێشکی سەری پێیانەوە دەکوڵێ وەك چۆن مەنجەڵی ئاو دەکوڵێ، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا وا نابینێت کە کەس لەو سزای سەختتر بێت، کەچی ئەو لە هەموویان سزای سووکترە)).

لە ئاگردا سزایەکی تر هەیە خوای گەورە سزای خاوەن تاوانە گەورەکانی پێدەدا، لە (مسند أحمد) و (مصنف ابن أبي شيبه) و (البخاري) لە (الأدب المفرد)و (الترمذي) هاتوە کە فەرموودەیەکی (حسن)[٣] ە لە ڕێگای (عمرو ی کوڕی شعیب)

---

١ ـ أخرجه البخاري (٥٣٧) وانظر (٣٢٦٠) ومسلم (٦١٧) .

٢ ـ أخرجه البخاري (٦٥٦١ ، ٦٥٦٢) ومسلم (٢١٣) .

٣ ـ أخرجه أحمد (١٧٩/٢) وابن أبي شيبة في (المصنف) (٩٠/٩) ونعيم بن حماد في زوائد (الزهد) لابن المبارك (١٩١) والبخاري في (الأدب المفرد) (٥٥٧) والحميدي (٥٩٨) والترمذي (٤٧) (٢٤٩٢) وقال: حسن صحيح وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٨٠٤٠) و (المشكاة) (٥١١٢) .

ەوە لە باوکییەوە ئەویش لە باپیرییەوە کەوا خۆشەویستی خوا ﷺ فەرموویەتی: ((يحشر المتكبرون يوم القيامة أمثال الذر، في صور الرجال، يغشاهم الذل من كل مكان، فيساقون الى سجن في جهنم يسمى بولس، تعلوهم نار الأنيار، يسقون من عصارة أهل النار، طينة الخبال)).

باش بزانە کە دۆزەخییەکان ئامادەن هەموو سەروەت و سامان و کەس و کاریان ببەخشەن و بیکەنە فیدیە لە پێناوی ئەوەی لەو ئاگرە ڕزگاریان بێت، بەڵکو ئامادەن هەموو دونیا ببەخشن بۆ ئەوەی لە سزای خوای گەورە ڕزگاریان بێت: بەڵام ئەوە زۆر زۆر دوورە ! !

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يُبَصَّرُونَهُمْ ۚ يَوَدُّ ٱلْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِى مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍۭ بِبَنِيهِ ﴿١١﴾ وَصَـٰحِبَتِهِۦ وَأَخِيهِ ﴿١٢﴾ وَفَصِيلَتِهِ ٱلَّتِى تُـْٔوِيهِ ﴿١٣﴾ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ ﴿١٤﴾ كَلَّآ ۖ إِنَّهَا لَظَىٰ ﴿١٥﴾ نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ ﴿١٦﴾ تَدْعُوا۟ مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٧﴾ ﴾(المعارج) واتە: بە یەکتر نیشان دەدرێن و یەکتریش دەناسن، تاوانبار حەز دەکات بۆ ڕزگار بوونی خۆی لە سزای ئەو ڕۆژە بریتی بدات بە کوڕەکانی (١١) هاوسەرەکەی و براکەی (١٢) وە بەو عێلەی لە خۆی دەگرت و پەنای دەدا (١٣) وە ئەوەی لە سەر زەوی هەیە گشتی بدا لە پاشا ڕزگاری بکات، خۆ ڕزگاری نابێ، ئەگەرچی ئەوانەیش بکاتە بریتی بۆ خۆی وەك ئەفەرموێ: (١٤) نەخێر، بریتیت لێ وەرناگرێ، دەسا دەست کۆتاکە بە ڕاستی ئەو ئاگرە ئاگرێکی بڵێسەداری وایە (١٥) داماڵێنەرە بۆپێستی سەر، واتە: پێستی سەر هەڵدەقرچێنێ و هەڵی دەکەنێ و دەیبا (١٦) ئەو ئاگرە ئەو کەسە بانگ دەکات لە دونیادا پشتی لە هەق و ڕاستی کردبێ و ڕووی لە فەرمانی خوا وەرچەرخاندبێ (١٧).

خوای پاك و بێگەرد دەفەرموێت: ﴿ وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا۟ يَحْتَسِبُونَ ﴾ (الزمر: ٤٧) واتە: ئەگەر بە ڕاستی هەرچی لەم زەویەدایە و ئەوەندەی تریشی لە گەڵدا بێت، هی ستەمکاران و کافران بێ لە بەر سزای توندی قیامەت

ئامادەن بیکەنە بارتەقاو فیدیەی خۆیان، تا رزگار بن)).

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لِيَفْتَدُواْ بِهِۦ مِنْ عَذَابِ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٣٦﴾ يُرِيدُونَ أَن يَخْرُجُواْ مِنَ ٱلنَّارِ وَمَا هُم بِخَـٰرِجِينَ مِنْهَا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٣٧﴾﴾(المائدة) واتە: ئەوانەی خوانەناس و بێباوەڕن ئەگەر هەرچی خێر و بێرێك لە زەویدایە هی ئەوان بێت و ئەوەندەی تریشی لە گەڵ بخەن، بۆ ئەوەی (فیدیە) و بریتی بێ بۆ خۆ رزگار کردنیان، لە سزای رۆژی قیامەت لێیان وەرناگیردرێ و سزایەکی ئێش پێکەیەنەریشیان بۆ هەیە (٣٦) هەمووکات هەوڵ دەدەن و دەیانەوێ لەو ئاگر و سزایە بێنە دەرێ و خۆ رزگار بکەن بەڵام هەرچی هەوڵ بدەن هەرگیز لێی نایەنە دەرێ و دەرباز نابن و سزایەکی نەبڕاوەشیان بۆ دەبێ (٣٧).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِم مِّلْءُ ٱلْأَرْضِ ذَهَبًا وَلَوِ ٱفْتَدَىٰ بِهِۦٓ ۗ أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ وَمَا لَهُم مِّن نَّـٰصِرِينَ﴾آل عمران: ٩١، واتە: بێ گومان ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون و هەر بە بێ باوەڕیش مردوون، بێ گومان هەر یەکەیان ئەگەر بڕی ئەم زەوییە زێڕیش بۆ کەفارەتی گوناهی خۆی بدا، هەرگیز لێی وەرناگیردرێ ئەوانە سزای ئێش پێکەیەنەریان بۆ دەبێ و هیچ یارمەتیدەرێکیش بە هانایانەوە نایە)).

خوای گەورە دەفەموێت: ﴿لِلَّذِينَ ٱسْتَجَابُواْ لِرَبِّهِمُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُواْ لَهُۥ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْاْ بِهِۦٓ ۚ أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْحِسَابِ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ﴾ (الرعد: ١٨) واتە: بۆ ئەوانەی وا وەڵامی بانگێشتەکەی پەروەردگاریان دایەوە، لە رۆژی قیامەتدا پاداشی چاکتر و بەهەشتیان بۆ هەیە و ئەوانەیش کە وەڵامی بانگهێشتەکەیان نەدایەوە و بڕوایان نەهێنا ئەگەر تەواوی ئەوەی لە زەویدایە هی ئەوان بێت و ئەوەندەی تریشی لە گەڵ بێ هەموو بدەن بۆ

ڕزگاربوونی خۆیان لە سزا و بیانەوێت خۆیان بکڕنەوە، دەیدەن و هێشتا لێیان وەرناگیرێ و ڕزگار نابن ئەوانە لە ڕۆژی دواییدا حیسابێکی سەختیان بۆ هەیە، واتە: کاری ورد و درشتیان دەهێنرێتە پێش چاو، ئەوسا چاکەکانیان لێ وەرناگیرێ، چونکە بۆ خوایان نەکردوە لە خراپەکانیشیان نابووردرێ و جێگایشیان دۆزەخە، ئای چ جێگایەکی خراپە دۆزەخ)).

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (أنس)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((يقول الله تبارك وتعالى لأهون أهل النـار عـذاباً، لـو كانـت لـك الدنيا وما فيها، أكنت مفتديا بها؟ فيقول: نعم، فيقول: قد أردت منك أهـون مـن هـذا وأنت في صلب آدم: أن لا تشرك ـ أحسبه قال: ولا أدخلك النار، فأبيت إلا الشرك)) واتە: خوای گەورە بەو کەسەی کە سووکترین سزای هەیە لە دۆزەخدا دەفەرموێت: ئەگەر هەموو دونیا و ئەوەی تیایدایە موڵکی تۆ بوایە ئایە دەتکرد بە فیدیە بۆ ئەوەی خۆت ڕزگار بکەیت؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ، خوای گەورە دەفەرموێت: من زۆر لەوە سووکترم لێت دەویست کاتێك تۆ لە پشتی ئادەمدا بوویت، کە هاوەڵم بۆ بڕیار نەدەیت ـ وابزانم گوتی: منیش ناتخەمە ئاگرەوە، کەچی تۆ ڕازی نەبوویت و هاوەڵت بۆ بڕیار دام)).

بەڵکو دۆزەخییەکان خۆزگە بە مردن دەخوازن، بۆ ئەوەی لە سزای ئاگر ڕزگاریان بێت، بەڵام خوای گەورە لە سەر ئەوان سزا و نەمری نوسیوە و تا ئەبەد دەمێننەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَادَوْا يَـٰمَـٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ ۖ قَالَ إِنَّكُم مَّـٰكِثُونَ﴾ (الزخرف: ٧٧) واتە: ئەوجا هانا دەبەن بۆ دەرگاوانی دۆزەخ و بانگ دەکەن.. ئەی مالیك! با پەروەردگارت بڕیار بدات بۆمان بە مردن، تا لەو سزایە ڕزگار ببین، مالیکیش پێیان ئەڵێ: هەر لێرە دەمێنن و ڕزگار بوونتان بۆ نییە)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا ﴿٢١﴾ لِّلطَّـٰغِينَ مَـَٔابًا ﴿٢٢﴾ لَّـٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا ﴿٢٣﴾ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴿٢٥﴾﴾(النبأ) واتە:

---

١ ـ أخرجه البخاري (٣٣٣٤) ومسلم (٢٨٠٥) واللفظ له .

بە راستی دۆزەخیش دەمێکە چاوەڕوانی بێ بڕوایان دەکات (٢١) بۆ یاخیبووان جێگا و مەنزڵگەیە (٢٢) هەزارەها ساڵی بێ سنوور و نەبڕاوە تیا دەبن، واتە: هەرگیز رزگاریان نابێ لێی (٢٣) هیچ فێنکییەك و شەرابێکی خۆشی تیا ناچێژن بۆ سووك بوونی گەرماکەی، بەڵکو هەر ئاوا لەو حاڵەتە زۆر تەنگ و ناخۆشەدا دەمێننەوە (٢٤) جگە لە ئاوێکی (زۆر گەرم و کوڵیو) کیم و چڵکی دۆزەخیان (٢٥) ئەویش پاداشتێکی پڕاوپڕە بەرامبەر بە کردەوەکانیان، واتە: لەو پاداشەدا ستەمیان لێ نەکراوە، چونکە بە راستی ئەوانە لە دونیادا بە تەمای لێپرسینەوەی ئەمرۆژە نەبوون (٢٦).

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُواْ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَاۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى كُلَّ كَفُورٍ ﴿٣٦﴾ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُۚ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُۖ فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴾(فاطر)

واتە: بۆ ئەو کەسانە کە کافر و بێ باوەڕن، ئاگری دۆزەخ هەیە بڕیاری مردنیان بۆ نادرێ تا بمرن و لەو سزایە رزگار ببن شتێکیش لە سزای دۆزەخیان لێ سووك ناکرێ هەر ئا بەو جۆرەیە - وەك ئەوانە - هەموو بێ بڕوایەك سزا ئەدەین (٣٦) لە دۆزەخدا بە زۆرە زۆر هاوار ئەکەن و ئەڵێن: پەروەردگارمان! لەم سزایە بمانهێنەدەرێ تا ئەمجارە کارێکی چاك ئەنجام بدەین، جگە ئەوەی پێشتر دەمانکرد، ئیتر ئەو دەمە بڕوا دێنین و گوێڕایەڵی ئەکەین پێیان ئەوترێ: ئەرێ ئێمە ئەوەندە تەمەنی درێژمان پێ نادەن کە هەرکەسێك ژیر و وریا بوایە لەو ماوەیەدا بیربکاتەوە، دەیتوانی پەند و کەڵکی لێ وەرگرێت؟ و لە هەمانکاتدا ترسێنەریشمان نەهاتە لاتان بتان ترسێنێ بە سزا؟ ئادەی چ سوودێکی بوو بۆتان؟ سزای ستەمەکەتان بچێژن، خۆ بۆ ستەمکارانیش هیچ یارمەتیدەرێك نییە، بە تایبەت ئەمرۆ (٣٧).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِهِمْۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِى وَخَافَ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ وَٱسْتَفْتَحُواْ وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿١٥﴾ ﴾

إبراهیم، واتە: پەیامبەرەکان داوایان لە خوا کرد کە بە سەر هۆزەکانیاندا سەریان بخات کاتێ نائومێد بوون لە ئیمان هێنانیان ئیتر خوایش سەری خستن و قازانجیان کرد و هەموو خەڵکێکی ملهوڕ و ستەمکار و نکوولی کەری هەق و ڕاستیەکان، نائومێد و زیانمەند بوون (١٥) لە بەر دەمیشیەوە ئاگری دۆزەخە و دەبێ لە زرینچکاو و زووخاوی دۆزەخییەکانیش بخواتەوە (١٦) لە بەر تاڵی و ناخۆشییەکەی، زۆر بە قێز و بێزەوە قوم قوم دەیخواتەوە و بە ئاسانیش بۆی قووت ناچێ لە هەموو لایەکیشەوە مەرگی بۆ دێت کەچی ناشمرێ تا لەوسزایە ڕزگاری ببێ و پاش ئەو هەموو تاڵی و تفتییەش، سزا و جەزرەبەیەکی زۆر بە ژانیش بە دوایەوە دێت (١٧).

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿قَدْ جِئْنَٰكَ بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكَ ۖ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلْهُدَىٰٓ﴾ (طه٤٧) واتە: بە ڕاستی هەر کەسێك بە تاوانباری لە ڕۆژی قیامەتدا بچێتەوە لای پەروەردگار بێگومان بەشی دۆزەخەو ئیتر نە ئەمرێ تیایدا تا لە سزا ڕزگاری ببێت و نە دەژی بە ئاسوودەیی)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِى ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٩﴾ قَالُوٓا۟ أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۚ قَالُوا۟ فَٱدْعُوا۟ ۗ وَمَا دُعَٰٓؤُا۟ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴿٥٠﴾﴾ (غافر) واتە: ئەوانەی لە نێو ئاگردان بە فریشتە دەرگاوانەکانی دۆزەخ ئەڵێن: لە پەروەردگارتان بخوازن، کە تەنها ڕۆژێك سزای دۆزەخمان لێ سووك بکات (٤٩) ئەوانیش لە وەڵامدا پێیان ئەڵێن: ئایا پەیامبەرەکانتان بە چەندین بەڵگەی ئاشکراوە نەهاتنە لاتان، کەچی ئێوە هەر بڕواتان پێ نەکردن لە وەڵامدا ئەڵێن: بەڵێ هاتنە لامان بە درۆزنمان کردن، فریشتەکان ئەڵێن: دە داوا بکەن و بپاڕێنەوە لە خوا بە ڕاستی ئێمە جورئەت ناکەین داواو پاڕانەوەی بێ بڕوایانیش، هیچ کەڵکێك نابەخشێ و هەر لە نابوودبووندایە (٥٠).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٠٥﴾ قَالُوا۟ رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ ﴿١٠٦﴾﴾المؤمنون،

واتە: بە کاساسێکەوە دەڵێن: پەروەردگارمان! نەگبەتی و بەدبەختی بە سەرماندا زاڵ بوو و گەلێکی گومڕا و سەرلێشێواو بووین (١٠٦) پەروەردگارمان! لەو ئاگرە دەرمان کەو بۆ دونیامان وەگێڕە ئەنجا ئەگەر ئەمجارەش گەڕاینەوە بۆ بێ بڕوایی، بەراستی ئێمە کەسانێکی ستەمکارین، لەوە ئەچێ پرسیارەکەی سەرەوە هەر بۆ خەم و خەفەت خواردن بێت، نەك بۆ وەڵام و وتووێژ (١٠٧).

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (أبو سعید الخدری)یەوە ریوایەتیان کردوە کەوا خۆشەویستﷺفەرموویەتی: ((یؤتی بالموت کهیئة کبش أملح، فینادي مناد: یا أهل الجنة، فیشرئبون وینظرون، فیقول: هل تعرفون هذا؟ فیقولون: نعم، هذا الموت، وکلهم قد رآه. ثم ینادي: یا أهل النار، فیشرئبون وینظرون، فیقول: هل تعرفون هذا؟ فیقولون: نعم، هذا الموت، وکلهم قد رآه، فیذبح. ثم یقول: یا أهل الجنة خلود فلا موت، ویا أهل النار خلود فلا موت. ثم قرأ: ﴿وَأَنذِرۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡحَسۡرَةِ إِذۡ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ وَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ (مریم:٣٩) واتە: لە رۆژی قیامەتدا مردن دەهێنرێت لە سەر شێوەی بەرانێکی رەش وسپی بانگدەرێك بانگ دەکات: ئەی خەڵکی بەهەشت، ئەوانیش هەموو سەر بەرزدەکەنەوە و تەماشا دەکەن، پێیان دەڵێ: ئایا ئەمە دەناسنەوە؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ، ئەوە مردنە، هەموویان بینیویانە، پاشان بانگ دەکات: ئەی خەڵکی ئاگر، ئەوانیش هەموو سەر بەرزدەکەنەوە و تەماشا دەکەن، پێیان دەڵێ: ئایا ئەمە دەناسنەوە؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ، ئەوە مردنە، هەموویان بینیویانە، پاشان بەرانەکە (مردن) سەردەبڕێ، پاشان دەڵێ: ئەی خەڵکی بەهەشت نەمری بۆ ئێوەیە و چیتر مردن نەما، ئەی خەڵکی ئاگر نەمری بۆ ئێوەیە و چیتر مردن نەما، ئەمجار ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە ئەمە ماناکەیەتی:

((لەڕۆژی ئاهوو ناڵەو خەم و خەفەت و پەشیمانی(یوم الحسرە) ئاگاداریان بکە و بیانترسێنە ئەو کاتە لە لایەن خوای پەروردگارەوە بڕیار دەدرێ کە دەستەیەك بۆ

١ ـ أخرجه البخاري (٤٧٣٠) ومسلم (٢٨٤٩) .

بەهەشت و دەستەیەکیش بۆ دۆزەخ رەوانە بکرێن، کەچی ئەوانە هێشتا لە غەفلەتدان و بە خۆیان نەزانیوە وخۆشیان بڕوا بواردووەو دوان بەزیندوو بوونەوە و پاداشت وتۆڵەشدا نانێن)).

هەر کەسێك تەنها جارێك بکرێتە ناو ئاگرەوە و دەربهێنرێت ئەوا هەموو تام و خۆشیەکانی دونیای لە بیر دەباتەوە کە چەشتویەتی لە بەر سەختی و توندی ئاگری دۆزەخ، هەروەکو لە (صحیح مسلم)[1] دا ریوایەت کراوە لە فەرموودەی (أنس)ەوە کەوا خۆشەویستی خوا ﷺ فەرموویەتی: ((یؤتی بأنعم أهل النار، من أهل النار، یوم القیامة، فیصبغ في النار صبغة، ثم یقال: یا ابن آدم! هل رأیت خیراً قط؟ هل مرَّ بك نعیم قط؟ فیقول: لا، والله! یا رب)) واتە: بەختەوەرترینی کەس لە دۆزەخییەکان لە رۆژی قیامەتدا دەهێنرێت، یەکجار هەڵدەژەنرێت لە ئاگر پاشان پێی دەگوترێت: ئەی نەوەی ئادەم ئایا هەرگیز خێر و خۆشیت بینیوە، ئایا هەرگیز نیعمەتی خوا بە سەرتا تێپەڕیوە؟ ئەویش دەڵێت: نەخێر سوێند بە خوا..ئەی پەروەردگار!)).

بەڵکو لە گەڵ ئەو چەند دیمەنەدا بژی و بیهێنە پێش چاوی خۆت، خواردنی ئەهلی ئاگر تەنها ئاگرە، خواردنەوەی دۆزەخییەکان تەنها ئاگرە، پۆشاك و جلوبەرگ لە ناو ئاگردا تەنها ئاگرە!!!!

خوای باڵا دەست و کارزان دەفەرموێت: ﴿فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ الْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ ﴿٢٠﴾ وَلَهُم مَّقَامِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴿٢١﴾ كُلَّمَا أَرَادُوا أَن يَخْرُجُوا مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا فِيهَا وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ ﴿٢٢﴾﴾الحج، واتە: ئەوانەی کافر و بێ بڕوابوون، جل و بەرگ و پۆشاکی ئاگریان بۆ بڕاوە، بە ئەندازەی قەد و باڵای خۆیان ئاوی کوڵ بە کوڵیشیان لە سەرەوە بە سەردا دەکرێ (١٩) هەر بەو ئاوە ناوسکیان و پێستیان ئەتوێنرێتەوە و دەبێتە ئاو و دێتە خوارەوە پێستەکەشیان هەموو لە ناو گەرمای ئەو ئاوەدا

---

١ ـ أخرجه مسلم (٢٨٠٧).

دەبلۆخێ (۲۰) بەر گورزی ئاسنیش دەدرێن (۲۱) هەر کاتێکیش ویستیان لێی دەرچن لە خەم و خەفەتاندا ئەگەڕێنرێنەوە بۆ ناوی و هەرگیز رزگاریان نابێ بۆ ئەوەی زیاتریش ئێشیان پێ بگات، پێیان ئەوترێ: دەی سزای سووتێنەر بچێژن، ئەمە پاداشت و تۆڵەی بێ بڕوایان بوو)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُّقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ ﴿٤٩﴾ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ ﴿٥٠﴾﴾(إبراهيم) واتە: ئیتر لەو ڕۆژەدا تاوانباران دەبینی لە گەڵ هاوکارەکانی خۆیاندا کۆت و زنجیرکراون (٤٩) جل و کراسی بەریان قەترانی رەشە (٥٠).

لە (صحیح مسلم)[1] دا لە فەرموودەی (أبو مالك الأشعري) هاتوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((النائحة إذا لم تتب قبل موتها تقام يوم القيامة وعليها سربال من قطران ودرع من جرب)) واتە: ئەو ژنەی دەلاوێتەوە ئەگەر پێش مەرگی تەوبە نەکات لە ڕۆژی قیامەتدا کە زیندوو دەکرێتەوە، کراسێکی قەتران و گەڕ لەشی دادەپۆشێت وەك زرێپۆشی لە بەردا بێت)).

مەبەست لە (النائحه) ئەو کەسەیە کە لە کاتی بەڵا و موصیبەتدا دەنگی بەرز دەکاتەوە و جلوبەرگی خۆی دادەڕێت.

ڕاخەر و فەرش و داپۆشەری دۆزەخییەکان ئاگرە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ﴾(الأعراف: ٤١) واتە: ڕایەخیان ئاگرە لە دۆزەخدا و لێفەی سەریشیان هالاوی ئاگرە، واتە: بەڕەی ژێریان و لێفەی سەریان هەردوو هەر ئاگرە، دیارە گشت ستەمکاران ئابە و شێوە سەختەیە تۆڵە ئەدەین))

جا مانای (المهاد) ڕاخەری ژێریانە و (الغواش) بریتییە لەوەی دەدرێت بە سەریاندا.

---

١ ـ أخرجه مسلم (٩٣٤) .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ النَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ﴾ ا(لزمر:١٦) واتە: لە پاشە ڕۆژیشدا لە ژوور سەریانەوە توێ لە سەر توێ کلّپەی ئاگر وەستاوە، لە ژێریشیانەوە بەو جۆرە، ئاگر پارچە پارچە ئەکەوێتە سەریەك و سێبەر ئەکات، ئەوانیش لە سێبەرەکەیدان؟!

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَغْشَاهُمُ الْعَذَابُ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ وَيَقُولُ ذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ (العنكبوت: ٥٥) واتە: ڕۆژی سزاکە دایان دەگرێت لە بانی سەریانەوە و لە ژێر پێیانەوە و لە هەموو لایەکەوە)).

هەروەها خواردنەوەی دۆزەخییەکان ئاگرە...

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاءٍ كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ بِئْسَ الشَّرَابُ وَسَاءَتْ مُرْتَفَقًا﴾(الكهف: ٢٩) واتە: خۆ ئەگەر زۆریان بۆ هات و هاواریان لێ بەرز بوویەوە و داوای ئاویان کرد، ئاوێکیان فریا دەخرێ وەك قورقوشمی تواوەیە و دەموچاویان لە بەر زۆر گەرمی خۆی هەڵدەکروزێنێ و دەیبرژێنی، ئای چ خواردنەوەیەکی نالەبار و خراپە ئەو ئاوە!! ئای ژینگە و جێیەکی نالەبار و خراپە ئەو دۆزەخە!!)).

مانای (المهل) بریتییە لە زەیتێکی کوڵاوی لیلّی زۆر گەرم، ئەگەر هەڵم و هەڵاوی ئەم زەیتە کوڵاوە دەمو چاو و روخساری بسوتێنێت، ئاخۆ گەرمی زەیتەکە خۆی لە خۆیدا چۆن بێت؟! ئەمەش بەڵگەیە لە سەر سەختی گەرمییەکەی!!

هەروەها (الحميم) و (الغساق) دەخواتەوە.

مانای (الحميم) بریتییە لە ئاوێکی زۆر گەرم کە پلەی گەرمییەکەی گەیشتوەتە ئەوپەڕی گەرمی.

مانای (الغساق) بریتییە لە ئاوێکی زۆر سارد کە پلەی ساردییەکەی گەیشتوەتە ئەو پەڕی ساردی.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَشَارِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ الْحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَارِبُونَ شُرْبَ الْهِيمِ ﴿٥٥﴾

﴿هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ الدِّينِ ﴿٥٦﴾﴾(الواقعة)) واتە: ئەوسا لەبەر تینوویەتی لە ئاوێکی زۆر گەرم بە کوڵیشی بە سەردا دەکەن (٥٤) ئێوەش هەروەکو وشتری تینوو کە دەردی (هویام) ی گرتبێ و هیچ کات تێر ئاو نەبێ دەخۆنەوە و تێر ئاویش نابن (٥٥) ئەمەیە خۆراك و ئاو و میوانداری خوانەناسان لە ڕۆژی پاداشت (٥٦).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ﴾ (ص:٥٧) واتە: ئەمە ئاوێکی کوڵبەکوڵ و کێمێکە لە جەستەی دۆزەخییەکان دەچۆڕێ، بیچێژن)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْفُرُونَ﴾یونس: ٤، واتە: ئەوانەش وا کافر و بێباوەڕ بوون خواردنەوەیەکی زۆر گەرم و سزایەکی ئێش پێگەیەنەریان بۆ هەیە لە بەر کافری و بێ باوەڕییان)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴿٢٥﴾ جَزَاءً وِفَاقًا ﴿٢٦﴾﴾(النبأ) واتە: جگە لە ئاوێکی (زۆر گەرم و کوڵیو) کیم و چڵکی دۆزەخیان (٢٥) ئەویش پاداشتێکی پڕاوپڕە بەرامبەر بە کردەوەکانیان، واتە: لەو پاداشەدا ستەمیان لێ نەکراوە، چونکە بە ڕاستی ئەوانە لە دونیادا بە تەمای لێپرسینەوەی ئەمڕۆژە نەبوون(٢٦).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَسُقُوا مَاءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ﴾ (محمد: ١٥) واتە: ئاوی کوڵ بە کوڵیان پێ دەخۆنەوە کاتێ تینوویان دەبێت، ریخۆڵەیان پارە پارە ئەکا!)).

هەروەها کێم و زوخاو دەخۆنەوە کە لە گۆشت و پێستی بێباوەڕانی دۆزەخ دێتە دەرەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مِّن وَرَائِهِ جَهَنَّمُ وَيُسْقَىٰ مِن مَّاءٍ صَدِيدٍ ﴿١٦﴾ يَتَجَرَّعُهُ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُ وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ وَمِن وَرَائِهِ عَذَابٌ غَلِيظٌ ﴿١٧﴾﴾إبراهیم، واتە: لە بەر دەمیشیەوە ئاگری

دۆزەخەو دەبێ لە زرینچکاو و زووخاوی دۆزەخییەکانیش بخواتەوە (١٦) لە بەر تاڵی و ناخۆشییەکەی، زۆر بە قێز و بێزەوە قوم قوم دەیخواتەوە و بە ئاسانیش بۆی قووت ناچێ لە هەموو لایەکیشەوە مەرگی بۆ دێت کەچی ناشمرێ تا لەوسزایە رزگاری ببێ و پاش ئەو هەموو تاڵی و تفتییەش، سزا و جەزرەبەیەکی زۆر بە ژانیش بە دوایەوە دێت(١٧).

بەڵام خواردنی دۆزەخییەکان بریتییە لە (الزقوم) و (الغسلین) و (الضریع)

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا الضَّالُّونَ الْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَآكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾ فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ ﴿٥٣﴾﴾ (الواقعة) واتە: پاشان ئێوە ئەی لارێ و گومڕا و کافر و نکۆڵی کەران! (٥١) بێ گومان لە بەرو بوومی (زەققوم) ـــ درەختێکە لە ناوەراستی دۆزەخدا ـ ئەخۆن (٥٢) لە بەر زۆر برسێتی، ورگ و سکتانی لێ پڕ ئەکەن گوێ بە تام و چێژی زۆر ناخۆشیشی نادەن.(٥٣).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا جَعَلْنَاهَا فِتْنَةً لِّلظَّالِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِي أَصْلِ الْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ ﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَآكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ ﴿٦٦﴾﴾(الصافات) واتە: ئایا ئەو ناز و نیعمەتەی بەهەشتە چاکترە بۆ میوانداری یان دارەکەی زەقنەموت، واتە: یان درەختە نەفرەت لێکراوەکەی زەقووم؟! زەقووم: درەختێکی بچووکی بۆگەنی بەروبەتاڵە، لە(تیهامە)دا دەڕوێ و خواردنی جەهەنەمییەکانە (٦٢) بە راستی ئێمە کردوومانە بە تاقیکردنەوە بۆ موشریکان، ئەوە بوو کاتێ باسی درەختی زەققوم کرابا، ئەیانوت: چۆن لە ناو ئاگردا درەخت شین دەبێ؟! (٦٣) بەڕاستی ئەوە درەختێکە لە بنی دۆزەخەوە دەرئەچێ (٦٤) بەرووبووم و خونچەی سەر لقەکانی هەر دەڵێی سەرو شێوەی شەیتانە (٦٥) بە راستی ئەو دۆزەخییانە ـ بە ناچاری ـ لێی ئەخۆن، ورگی خۆیانی لێ پڕ ئەکەن (٦٦).

خواردنی ئەوان هەروەکو وتمان (الضریع) کە جۆرە درکێکی سەختە و پێی دەڵێن: الشبرق.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ ۝٦ لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِن جُوعٍ ۝٧﴾ (الغاشية) واتە: هیچ خواردنێکیشیان نییە جگە لە دڕکێکی وشـك وتـاڵ وتفت (کە مەگـەر تـەنها وشـتر بیخـوات) (٦) ئـەویش نەئەوەیـە گۆشـتی پێبگـرن و قەڵەویان بکا، نەئەوەیشە برسییەتیان لا بباو پێی بـژین بـە پێـچەوانەوەی خـۆراکی دونیاوە(٧).

هەروەها خواردنی ئەوان (الغسلین)ە!

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيَهْ ۝٢٥ وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ ۝٢٦ يَا لَيْتَهَا كَانَتِ الْقَاضِيَةَ ۝٢٧ مَا أَغْنَىٰ عَنِّي مَالِيَهْ ۝٢٨ هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيَهْ ۝٢٩ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ۝٣٠ ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ ۝٣١ ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَاسْلُكُوهُ ۝٣٢ إِنَّهُ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ ۝٣٣ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ ۝٣٤ فَلَيْسَ لَهُ الْيَوْمَ هَاهُنَا حَمِيمٌ ۝٣٥ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ ۝٣٦ لَّا يَأْكُلُهُ إِلَّا الْخَاطِئُونَ ۝٣٧﴾ الحاقة، واتە: بەڵام ئەو کەسەی کارنامەکەی ئەدرێتە دەستی چەپی ـ کە ئەوەش نیشانەی بەدبەختییە ـ دەڵێ: خۆزگایە.. نامەکەمم پێ نەدرابا (٢٥) نەمزانیبا سەرئەنجامی حیساب و لێپرسینەوەم چییە؟(٢٦) خۆزگایە ئەم مردنەم برابایەوە بە یەکجاری و زیندووش نەکرامایەتەوە (٢٧) دارایی و ماڵەکەم هیچ کەڵکێکی پێ نەگەیاندم بۆ ئەم ڕۆژەم (٢٨) ئەو موڵك و دەسەڵاتەی بووم لە دەس چوو نە ڕشتەم نە پایەوپلەم، هیچیان نەیان توانی تۆزقاڵەیەك ئارامم بکەنەوە(٢٩) بیگرن، کەلەپچەی بکەن، واتە: کۆت و زنجیر لە دەس و قاچ و ملی بئاڵێنن (٣٠) پاشان بیخەنە ناو ئاگری دۆزەخ (٣١) ئینجا بیخەنە ناو زنجیرێکی حەفتا گەزیەوە و توندی بکەن، بۆ ئەوەی پتر ڕیسوا بێت، ئەگینە خۆ تەنها ئاگرەکەی بەسە، ئای ئەو ڕۆژە چەندە ڕۆژێکی گران و نارەحەتە! وەرە لە ناو ئاگریشدا هێشتا بەو شێوەیە زنجیر بکرێت!! (٣٢) چونکە ـ لە دونیادا ـ بڕوای بە خوا نەبوو کە ئەمەش گەورەترین ستەمە، بۆیە هەر دەبێ ئاوا سەر شۆڕو ڕیسوا بکرێ (٣٣) هانی خەڵکی نەدەدا لە سەر خواردن

دان بە هەژار، چەند ئاینێکی بەرز و پیرۆزە..! سەرەرای ئەوەی دەبێ لە ماڵ و منالی خۆیان بگرنەوە بەر بۆ هەژاران، دەبێ مەردومیش هان بدەن بۆ بووژاندنەوەیان (٣٤) ئەمرۆش لێرە - واتە: رۆژی قیامەت - هیچ دۆستێکی بۆ نییە تا تکایەکی بۆ بکا و تۆزێ ئەو بارەیەی لێ سووك بکات (٣٥) خواردن و خواردنەوەشی هەر کیم و زوخاوی داچۆراوی لاشەی دۆزەخییەکانە(٣٦) گوناهباران نەبێ کەسی دیکە لێی ناخوات، واتە: هەر ئەوانە دەیخۆن کە باوەڕیان بە خوا نەبوو(٣٧).

بەڵکو بە ناچاری خواردنی وا دەخۆنەوە کە لە قوورگیاندا دەمێنێتەوە و ناچێتە خوارەوە.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿إِنَّ لَدَيْنَآ أَنكَالًا وَجَحِيمًا ﴿١٢﴾ وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣﴾﴾ (المزمـل) واتـە: بـە راسـتی ئێمـە سـزای دونیاییمـان هەیـە و لـە پاشەرۆژیشدا کۆت و زنجیر سەنگین و ئـاگری هەڵگیرسـاوی دۆزەخمـان هەیـە (١٢) هەروەها خۆراکێك کە لە گـەر و دەگیرێـت لـە بـەری درەخـتی زەققـوم، کە زۆر بـە نائاسایی لە گەروویانەوە دەڕواتە خوارەوە، سەرەرای سـزای سـەخت و پـڕ ئـێش و ئازار (١٣).

بـەڵکو ئـازار و خـەم و خەفـەتیان زیـاتر دەبێـت کـاتێ جێگـە و ڕێگـەی خـۆی دەبینێت لـە بەهەشـتدا ئەگـەر بـاوەڕی بهێنابایـە و گوێڕایـەڵی فەرمانـەکانی خـوای گەورە بوایە.

ئیمـامی بوخـاری[1] لـە فـەرموودەی (ابـو هریـرە) وە ریوایـەتی کـردوە کـەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویـەتی: ((لا یـدخل النـار أحـد إلا أري مقعـده مـن الجنـة لـو أحسن، لیکون علیه حسرة)) واتە: هیچ کەسێك ناچێتە ئاگرەوە ئیللا جێگەی خـۆی لـە بەهەشـتدا دەبینێ ئەگـەر چاکەی بکردایـە، بـۆ ئـەوەی خەفـەتبار بـن و زیـاتر پـەشیمان ببنەوە)).

---

١ ـ أخرجه البخاري (٦٥٦٩) .

لە بەر توندی و سەختی سزاكەیان دۆزەخییەكان هاوار دەكەنە گەنجینەوان و خەزنەدارانی دۆزەخ بۆ ئەوەی لە خوای خۆیان تكا بكەن و بپاڕێنەوە ئەگەر بۆ تەنها ڕۆژێكیش بوە سزای ئاگری دۆزەخیان لە سەر سووك بكرێتەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٩﴾ قَالُوٓا۟ أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۚ قَالُوا۟ فَٱدْعُوا۟ ۗ وَمَا دُعَٰٓؤُا۟ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ ﴿٥٠﴾﴾ (غافر) واتە: ئەوانەی لە نێو ئاگردان بە فریشتە دەرگاوانەكانی دۆزەخ ئەڵێن: لە پەروەردگارتان بخوازن، كە تەنها ڕۆژێك سزای دۆزەخمان لێ سووك بكات (٤٩) ئەوانیش لە وەڵامدا پێیان ئەڵێن: ئایا پەیامبەرەكانتان بە چەندین بەڵگەی ئاشكراوە نەهاتنە لاتان، كەچی ئێوە هەر بڕواتان پێ نەكردن لە وەڵامدا ئەڵێن: بەڵێ هاتنە لامان بە درۆزنمان كردن، فریشتەكان ئەڵێن: دە داوا بكەن و بپاڕێنەوە لە خوا بە راستی ئێمە جورئەت ناكەین، داواو پاڕانەوەی بێ بڕوایانیش، هیچ كەڵكێك نابەخشێ و هەر لە نابوودبووندایە (٥٠).

لە پاش ئەوەی بێ ئومێد و بێ هیوا دەبن لە خەزنەداران و گەنجینەوانانی دۆزەخ، بانگ لە كێ دەكەن و هاوار بۆ كێ دەبەن؟ هاوار بۆ (مالیك) دەبەن كە خەزنەدار و بەرپرسی یەكەمی دۆزەخە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَادَوْا۟ يَٰمَٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ ۖ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ﴾ الزخرف: ٧٧، واتە: ئەوجا هانا دەبەن بۆ دەرگاوانی دۆزەخ و بانگ دەكەن.. ئەی مالیك! با پەروەردگارت بڕیار بدات بۆمان بە مردن، تا لەو سزایە ڕزگار ببین، مالیكیش پێیان ئەڵێ: هەر لێرە دەمێنن و ڕزگار بوونتان بۆ نییە)).

لێرەدا دۆزەخییەكانی ئیمانداران و یەكتاپەرستانیان دێتەوە یاد ئەوانەی كە هەردەم گاڵتە و سووكایەتیان پێ دەكردن لە دونیادا، بۆیە هاواریان پێدەكەن و پەنایان پێ دەگرن و داوای تەنها چۆڕێك ئاویان لێ دەكەن یان كەمێك لەو ڕزق و ڕۆزییەی خوای گەورە بەوانی بەخشیوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَادَىٰٓ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ أَنْ أَفِيضُوا۟ عَلَيْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ ۚ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَهُمْ لَهْوًا وَلَعِبًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ فَٱلْيَوْمَ نَنسَىٰهُمْ كَمَا نَسُوا۟ لِقَآءَ يَوْمِهِمْ هَٰذَا وَمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ﴾(الأعراف) واتە: ئینجا دۆزەخییەکانیش لە بەهەشتییەکان بانگ ئەکەن و پێیان دەڵێن: تکایە قومێ لەو ئاوە، یان کەمێك لەو ڕۆزییە خوا پێی داون بەشمان بدەن دەڵێن: بێ گومان خوا هەردووکیانی بۆ کافران حەرام کردوە (٥٠) ئەو کەسانەی کە ئایینەکەیانیان کردۆتە گاڵتەجاڕ و ژیانی ئەم دونیایە فریویداون، وا ئەمڕۆش ئێمە لە بیرمان کردن، چونکە ئەوان لە دونیادا گەیشتنی ئەم ڕۆژەیان لە بیر خۆیان بردبووەوە و ئایەت و نیشانەکانی ئێمەشیان ئینکار دەکرد (٥١).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ فَمِنْهُمْ شَقِىٌّ وَسَعِيدٌ ﴿١٠٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُوا۟ فَفِى ٱلنَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ ﴿١٠٦﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٠٧﴾ ۞ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُوا۟ فَفِى ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۖ عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ ﴿١٠٨﴾﴾(هود) واتە: ڕۆژێکیش کە دێت هیچ کەسێك بۆی نییە بە فەرمانی خوا نەبێت قسە بکات ئینجا ئەو خەڵکە دەبنە دوو کۆمەڵ، هەیانە بە هۆی لاساری و کلابونییەوە بەدبەختە و چارەڕەش، هەشیانە بە بۆنەی چاکیی و باشی خۆیەوەبەختیار و ڕوو سپییە (١٠٥) ئەوانەیان بەدبەخت و لار و لاسارن لە ئاگردان، هەر لەوێیش تووشی هەناسە کورتی و، تەنگە نەفەسی دەبن و، هەر هاوار هاواریانە (١٠٦) تا ئاسمانەکان و زەوی هەبن، ئەوانیش تێیدا ئەمێننەوە. عەرەب ئەگەر ویستبای بڵێ ئەو شتە بەردەوام و هەمیشەیە دەیگوت: ﴿مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ﴾ کەوابوو بە هەتا هەتایی لە دۆزەخدا دەمێننەوە و لێی دەرناچن، مەگەر

پەروەردگارت بیەوێ لە وەخت و کاتێکدا دەریان بهێنێ بۆ ئەوەی بە جۆرێکی تر لە سزا سزایان بدات، بە راستی پەروەردگاریشت زۆر بە دەسەڵاتە، بیەوێ هەر شتێ بکات دەیکات وە هیچ بەرگرێکی بۆ نابێت (١٠٧) ئەوانەیشیان کامەران و بەختەوەرن لە ئەوەڵ لەحزەوە لە بەهەشتن و بۆ هەمیشە لەوێ ئەمێننەوە تا ئاسمانەکان و زەوی ببن، مەگەر ئەوەندە پەروەردگارت مەیلی هەبێ (١٠٨))).

نامەوێ چیتر زۆر باسی ئاگر و دۆزەخییەکان بکەم، داوا لە خوا دەکەم من و ئێوە لە ئاگری دۆزەخ بپارێزێت، ئەی خودایە ئێمە لاوازی و بێ هێزین و بەرگەی سەختی دۆزەخ ناگرین بۆیە بەزەییت پێماندا بێتەوە هەر تۆ بەخشندە و دلۆڤانی.

ئەی خودایە.. لەو گومانەدا نیم لە ئاگردا سزامان بدەیت لە کاتێکدا یەکتاپەرستیت لە دڵماندا جێگر بوە؟ هەموو پەل و ئەندامەکانمان ملکەچی تۆن و لە سەر خاك و خۆڵ سوجدە دەبەن و کەساس و زەلیلن لە بەر دەستی تۆی مەزندا؟ لەو گومانەدا نیم سزامان بدەیت لە کاتێکدا خۆشەویستیت هەموو دڵ و بوون و ناخمانی پڕکردوەتەوە؟ خۆشەویستی خۆشەویستەکەت ﷺ لە دڵماندا جێگر بوە؟ خودایە ئێمە باش دەزانین کە زۆر کەم تەرخەمین لە کار و کردەوەکانمانداو زۆر جاریش توشی هەڵەدەبین، بەڵام خودایە بە رەحمەتە فراوان و زۆرەکەت بەزەییت بە ئێمەی هەژاردا بێتەوە...

# باس و وەسفی بەهەشت

فەرموون با بچینە بەهەشتەوە!!

جا كێ دەتوانێ باس و وەسفی بەهەشت بكات هەرچەندە لەوپەڕی زمانپاراوی و ڕەوانبێژی و بە توانا و قسەزان بێت؟ هیچ كەسێك ناتوانێ.

لە هەردوو كتێبی (صحيح)[1]دا لە فەرموودەی (ابو هريره)ەوە هاتوە كەوا پێغەمبەری ئازیز ﷺ فەرموویەتی: ((قال الله تعالى: ((أعددت لعبادي الصالحين: ما لا عين رأت، ولا أذن سمعت، ولا خطر على قلب بشر)) فاقرءوا إن شئتم: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ ﴾ السجدة: ١٧، واتە: بۆ بەندە پیاوچاكەكانم ئەوەم ئامادە كردوە كە نە چاو بینیویەتی و نە گوێ بیستویەتی و نە بە خەیاڵی هیچ كەسێكدا هاتوە)) ئەگەر دەتانەوێ ئەو ئایەتە بخوێننەوە كە دەفەرموێت: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ ﴾ واتە: ئیتر هیچ كەسێك نازانێ چ پاداشتێكی گرنگیان بۆ داشاراوە لە هۆیەكانی خۆش و شادی چاوان و دڵئارامی))

جا پێغەمبەری نازدار ﷺ باس و وەسفی بەهەشتمان بۆ دەكات چونكە ئەو بینیویەتی و چوەتە ناو بەهەشتەوە — هەر لە دونیادا و لە شەوی ئیسرا و میعراجدا — لە هەردوو كتێبی (صحيح)[2]دا هاتوە لە فەرموودەی (ابن عباس)ەوە _لە فەرموودەی صلاه الكسوف دا — كە تیایدا هاتوە: ((... قالوا: يا رسول الله! رأيناك تناولت شيئاً في مقامك هذا، ثم رأيناك كففت. قال: ((إني رأيت الجنة، فتناولت عنقوداً، ولو أخذته لأكلتم منه ما بقيت الدنيا))

ئایا شێوە و شێوازی بەهەشت چۆنە؟ ئایا بینا و خانوەكانی بەهەشت چۆنە؟

ئیمامی (أحمد و ابن حبان و الطيالسي و الترمذي و عبد بن حميد و جگە لەوان)[3]

---

١ ـ أخرجه البخاري (٣٢٤٤) ومسلم (٢٨٢٤) .

٢ ـ أخرجه البخاري (٧٤٨ ، ١٠٥٢) ومسلم (٩٠٧) .

٣ ـ أخرجه أحمد (٢/٣٠٥ ، ٤٤٥) وابن حبان في (صحيحه ) (٧٣٨٧) والدارمي (٢٨٢١) والطيالسي (٢٥٨٣) والترمذي (٢٥٢٦) وعبد بن حميد في (المنتخب) (١٤٢٠) والطبراني في (المعجم الأوسط) (٧١١١)

له (ابو هريره)ەوه ریایەتیان کردوه کەوا پرسیار کرا لە پێغەمبەری ﷺ خوا و فەرموویان: ((یا رسول الله حدثنا عن الجنة،ما بناؤها؟

قال: لبنة ذهب ولبنة فضة وملاطها المسك الأذفر وحصباؤها اللؤلؤ والياقوت وترابها الزعفران من يدخلها ينعم ولا ييأس ويخلد لا يموت لا تبلى ثيابه ولا يفنى شبابه)) واتە: ئەی پێغەمبەری خواﷺ باسی بەهەشتمان بۆ بکە، ئایا بیناسازییەکەی له چییه؟ فەرمووی: خشتێك لە ئاڵتون و خشتێکی لە زیو، نێوان دیوارکانی له میسکە، بەرد و چەوەکەی لە مرواری و یاقوتە و خاك و خۆڵەکەی لە زەعفەرانە، هەرکەسێك بچێتە ناوی خۆشحاڵ دەبێت و بێزار نابێت، بە نەمری دەمێنێتەوە و هەرگیز نامرێت، جل و پۆشاکەکەی کۆن نابێت و خۆیشی پیر نابێت)).

له هەردوو کتێبی (صحيح)[1] دا هاتوه لە فەرموودەی (أنس)ەوه دەڵێت: کەوا (ابو ذر) باسی فەرموودەیەکی دوور و درێژی کردوه لە پێغەمبەری خواوه ﷺ تیایدا هاتوه: ((ثم أدخلت الجنة ـ وهذا في الاسراء والمعراج ـ فإذا فيها جنادل الؤلؤ، وإذا ترابها المسك)) واته:چوومە بەهەشتەوه، جۆگەلەی مرواری تێدابوو، خاك و گڵەکەی میسك بوو)).

له (صحيح مسلم)[2] دا هاتوه له فەرموودەی (ابو سعيد الخدري)يەوه کەوا (ابن الصياد) پرسیاری له پێغەمبەری خواﷺ کرد دەربارەی خاك و خۆڵی بەهەشت؟ ئەویش فەرمووی: ((درمكة بيضاء، مسك خالص)) واتە: وەکو ئاردێکی سپی بێگەرد وایه، میسکێکی پوخت و خاوێنه)).

مانای الدرمكه: کۆی وشەی (درمك) ه، واتە: ئاردێکی زۆر پاك و پوخت و بێ خەڵت و خەوش و رەنگی زۆر سپییە، هەروەکو ابن منظور گوتویەتی.[3]

---

والحميدي (١١٥٠) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع )(٢١١٦) والمشكاة (٥٦٣٠) وصحيح الترغيب (٣٧١١).

١ ـ أخرجه البخاري (٣٤٩ , ٣٣٤٢) ومسلم (١٦٣) .

٢ ـ أخرجه مسلم (٢٩٢٨) .

٣ ـ لسان العرب (١٣٦٧) مادة : درمك .

هـەروەها بەهەشـتییەکان هـەرگیز نـەخۆش ناکـەون و نـامرن و پیرنـابن و میـز و پیسی ناکەن و چڵم و تفیان نییە.

ئیمامی (مسلم) لە (صحیح)[1] ەکەیدا لـە فـەرموودەی (ابـو سـعید الخـدری) و (ابـو هریرە) وە ریوایەتی کردوە کەوا خۆشەویستی خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ینـادي منـاد إن لكم أن تصحوا فلا تسقموا أبداً، وإن لكم أن تحيوا فلا تموتوا أبـداً، وإن لكـم أن تشبوا فلا تهرموا أبداً وإن لكم أن تنعموا فلا تبأسوا أبداً)) فـذلك قولـه جـل جلالـه: ﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾(الأعـراف: ٤٣) واتـە: بانگـەوازکارێك بـانگ دەکـات: تەندروسـتێکی هـەتا هـەتایی بـۆ ئێوەیـە و هـەرگیز نەخۆش ناکەون، ژیانێکی هەتاهەتایی و هەرگیز نامرن، گەنجێتییەکی هەتاهەتایی و هەرگیز پیرنابن، بە خۆشحاڵی دەمێننەوە و هەرگیز بێـزار نـابن)) ئـەوە مانـای ئـەو ئایەتەیـە کـە دەفـەرموێت: ﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾واتە: کە بەهەشت دەبینن لە لایەن فریشتەکانەوە " بانگ دەکرێن و پێیان دەگوترێ ئەم بەهەشتە ئەو بەهەشتەیە بوو بەڵێنتان پێ درابوو وا ئـەمڕۆ بـە هـۆی (ئەو کار و کردەوە چاکانەوە لـە دونیـادا ئـەنجامتان دان پێتانـدرا بوونـە خـاوەنی، واتە: بە هۆی ماندوو بوونی خۆتانەوە بوو)).

ئەمجار تەماشای شێوەو روخساری بەهەشتییەکان بکەو تەماشای شانە و قاپ و دەفرەکانیان بکە.

لـە هـەردوو کتـێبی (صـحیح)[2] دا هـاتوە لـە فـەرموودەی (ابـو هریـرە)ەوە کـەوا پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((إن أول زمرة يدخلون الجنة على صـورة القمر ليلة البدر، و الذين يلونهم على أشد كوكب دري في السماء إضـاءة لا يبولـون ولا يتغوطون ولا يمتخطون ولا يتفلون أمشاطهم الذهب ورشحهم المسك ومجـامرهم الألـوة و أزواجهم الحور العين أخلاقهم على خلق رجل واحد علـى صـورة أبـيهم آدم سـتون

---

١ ـ رواه مسلم (٢٨٣٧) .

٢ ـ أخرجه البخاري (٣٢٤٥ ، ٣٢٤٦ ، ٣٢٥٤ ، ٣٣٢٧) ومسلم (٢٨٣٤) .

ذراعاً في السماء)) واتە:یەکەمین کۆمەڵ لە ئوممەتم کە دەچنە بەهەشتەوە، لە سەر شێوەی مانگی شەوی چواردەن، لە پاشان ئەوانەی بە دوایانەوە دێن لە سەر شێوەی پرشنگدارترین ئەستێرەن لە ئاسمانا، نە میز دەکەن و نە پیسایی و نە چڵمیان هەیە و نە تفکردن، شانەیان لە زێڕە و ئارەقیان میسکە، بخوردانیان دارعودە، خێزانەکانیان (حور العین)ەو خووڕەوشتیان یەك خووڕەوشتە لە سەر باڵای باوکە ئادەمیان شەست گەز بەرزن)).

لە ریوایەتێکی تردا هاتوە: ((ولکل واحد منهم زوجتان، یری مخ ساقهما من وراء اللحم من الحسن، لا اختلاف بینهم ولا تباغض، قلوبهم قلب واحد، یسبحون الله بکرة وعشیاً))، واتە: هەر پیاوێك لە بەهەشتدا دوو ئافرەتی دەدرێتی، مۆخی ئێسقانی قاچەکانی لە پشتی گۆشتەکەیەوە لە بەر جوانی و شۆخ و شەنگی دەبینرێت، جیاوازی و رق و کینە لە نێوانیاندا نییە، دڵیان وەکو یەك دڵە، سبەینان و ئێواران تەسبیحاتی خوا دەکەن)).

لە ریوایەتێکی تردا هاتوە: ((وأزواجهم الحور العین)) واتە: خێزانەکانیان (حورالعین)ە.

پێش ئەوەی باسی (حور العین) بکەم، موژدە بە خوشکی بەڕێز و لە خواترسی ئیمانداری یەکتاپەرست دەدەم و پێی دەڵێم: ئەی خوشکی لە خواترس و ئیماندار.. جوانی و شۆخ و شەنگی تۆ هەرگیز هیچی کەم نییە لە جوانی و شۆخ و شەنگی (حور العین) لە بەهەشتدا، ئایا ئەم قسەیە هیچ بەڵگەیەکی لە سەر هەیە؟ بەڵێ.. چونکە من هیچ قسەیەك ناکەم بە بێ بەڵگە، تۆ هەستاویت بە گوێڕایەڵی خواکەت، خۆت لە شەهەوات و ئارەزووەکانت پاراستوە، خۆت لە گومان و دوودڵی پاراستوە، بەرگەی زۆر نارەحەتیت گرتوە، دڵنیابە هەموو ئەو کارە جوانانە بزر نابێت، لە بەهەشتدا خوای گەورە بۆ جارێکی تر و بە شێوەیەکی جوانتر و خانەدانتر و شۆخ و شەنگتر و ڕێکوپێکتر دروستت دەکاتەوە کە لە گەڵ بەهەشت و بەهەشتییەکاندا بگونجێت، لەگەڵ مندا ئەو ئایەتە پیرۆزە بخوێنەوە: ﴿إِنَّآ أَنشَأۡنَٰهُنَّ إِنشَآءٗ﴾الواقعة: ٣٥.

جا ئەو دروستکردنەوە تایبەتمەندی خۆی هەیە، ڕەنگە تۆ ــ برای بەڕێزم ــ خێزانەکەت ئافرەتێکی لە خواترس و ڕێزدار بێت بەڵام جوان و شۆخ و شەنگ نەبێت، ئەو خێزانەت ئەگەر لە دوارۆژدا بچێتە بەهەشتەوە، هەرچەندە لە تەمەنی شەست یان حەفتا ساڵیدا مردبێت، لە کاتێکدا مردوە پیرەژنێکی موو سپی بوە، ئەوا لە بەهەشتدا بە شێوەیەکی تازە و نوێ ئامادە دەکرێت و لە تەمەنی لاوێتیدا دەبێت، ئێستا ئەو جوانی و شۆخ و شەنگییە بهێنە پێش چاوی خۆت کە لە لایەن کەسێکەوە بۆت ئامادە کراوە کە جوانی و شۆخ و شەنگی بەخشیوەتە هەموو بوونەوەر.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّآ أَنشَأۡنَٰهُنَّ إِنشَآءٗ ﴿٣٥﴾ فَجَعَلۡنَٰهُنَّ أَبۡكَارًا ﴿٣٦﴾﴾(الواقعة)

هەرکاتێك پیاوێك بچێت بۆ لای خێزانەکەی لە سەر جێگە لە بەهەشتدا ئەوا هەموو جارێك دەبینێ هێشتا کچە عازەبە. ﴿فَجَعَلۡنَٰهُنَّ أَبۡكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتۡرَابٗا ﴿٣٧﴾﴾ (الواقعة).

عُرب: کۆی (عروب)ە، ئافرەتی (عروب) لە زماندا مانای: ئەو ئافرەتەیە کە جۆرەها وشەی خۆشەویستی و عەشق و جوانی و شەیدا و سەودا لە گەڵ مێردەکەیدا بە کار دەهێنێ.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّآ أَنشَأۡنَٰهُنَّ إِنشَآءٗ ﴿٣٥﴾ فَجَعَلۡنَٰهُنَّ أَبۡكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتۡرَابٗا ﴿٣٧﴾ لِّأَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴿٣٨﴾﴾(الواقعة)، واتە: بە ڕاستی ئێمە ژنانی بەهەشتمان درووستکردوون بە دروستکردنێکی تازە، شۆخ و شەنگ و جوان، وەك ژنانی دونیا نین هەندێ گۆڕانیان بە سەردا بێت (٣٥) کردوومانن بە کچ، واتە: هەمیشە کچن و وەك کیژانی شوونەکردوون (٣٦) مێرد خۆشەویستانێ هاوساڵ و هاوتەمەن (٣٧) ئەمانە هەموو بۆ یارانی لای ڕاست و بەختەوەرن، ئەوانەی کە نامەی کردەوەیان بە دەستی ڕاستیانەوە ئەدرێ (٣٨).

بەڵام (حور العین) خوای بەرز و باڵادەست دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿حُورٞ مَّقۡصُورَٰتٞ فِي ٱلۡخِيَامِ ﴿٧٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٣﴾ لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٞ قَبۡلَهُمۡ وَلَا

جَآنٌّ ﴿٧٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٥﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِيٍّ حِسَانٍ ﴿٧٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٧﴾ تَبَٰرَكَ ٱسْمُ رَبِّكَ ذِى ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٧٨﴾ ﴾(الرحمن) واتە: ژنانی سپی چاو ڕەشن، لە ناو خێوەت و چادرەکاندا دەرناچن (٧٢) بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟ (٧٣) بەر لە بەهەشتییەکان هیچ ئادەمی و هیچ جنۆکەیەك دەستی بۆ نەبردوون و کچێتی لا نەبردوون (٧٤) بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟(٧٥) لە سەر پشتی سەوز و قالّی نایاب ـ کە وێنەیان لە دونیادا نییە ـ شانیان داداوە.(٧٦) بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟ (٧٧) پڕ بەرەکەتە ناوی پەروەردگاری خاوەن گەورەیی و ئیحسانت (٧٨).

مانای وشەی (الحور): کۆی وشەی (الحوراء) ە، (حوراء) یش بە ئافرەتێکی گەنجی زۆر جوانی شۆخ و شەنگ دەگوترێت کە جەستەیەکی زۆر سپی و چاوێکی زۆر ڕەشی هەبێت.

لە (صحیح البخاری)[١]دا هاتوە لە فەرموودەی (أنس)ەوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((غدوة في سبيل الله أو روحةٌ خيرٌ من الدنيا وما فيها ولقاب قوس أحدكم أو موضع قدم من الجنة خيرٌ من الدنيا وما فيها ولو أن امرأة من نساء أهل الجنة اطلعت إلى الأرض لأضاءت ما بينهما ولملأت ما بينهما ريحا ولنصيفها خيرٌ من الدنيا وما فيها)).

براکەم هەموو ئەمانە بهێنە پێش چاوی خۆت لە بەهەشتێکدا کە پانتایەکەی بە قەد پانتایی زەوی و ئاسمانەکانە هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَسَارِعُوٓا۟ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴾(آل عمران: ١٣٣، واتە: پەلەو چەسپانی بکەن بۆ کردنی ئەو شتانە ئەبنە هۆی لیبووردنی پەروەردگارتان و چوونە بەهەشتێکی فراوانی واوە کە: هەر پانتییەکەی بە ئەندازەی ئاسمانەکان و زەوییە، ئامادە کراوە (ئەو بەهەشتە) بۆ پارێزکاران))

١ ـ أخرجه البخاري (٦٥٦٨) .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ﴾(الحديد: ٢١) واتە: ئەی خەڵکینە! پێشبڕکێ بکەن بۆ هۆیەکانی لێبووردن لە پەروەردگارتانەوە بە تەوبە و کردەوەی چاك وە بۆ گەیشتن بە بەهەشتێك کە پانایی و فراوانییەکەی، وەك پانتایی و ئاسمان و زەوییە، ئامادە کراوە بۆ ئەوکەسانەی بڕوایان هێناوە بە خواو بە پەیامبەرانی ئەوەش فەزڵی خوایە، دەیدات بەهەر کەسێك خۆی بیەوێ و شایستە بێت وەخوا خاوەنی فەزڵ و بەخششی گەورەیە)).

ئەمە پانتایی بەهەشتە! ئاخۆ درێژییەکەی چەندە؟؟

ژمارەی دەرگاکانی بەهەشت (هەشت) دەرگایە، هەروەکو لە (صحیح البخاری)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (سهل ی کوڕی سعد الساعدی) یەوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((في الجنة ثمانية أبواب)) واتە: لە بەهەشتدا هەشت دەرگا هەیە)).

هەروەها لە (صحیح مسلم)[2] دا لە فەرموودەی (عمر ی کوڕی الخطاب) ەوە هاتوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((ما منكم من أحد يتوضأ فيبلغ (أو: فيسبغ الوضوء) ثم يقول: أشهد أت لا اله الا الله وأن محمداً عبدالله ورسوله، إلا فتحت له أبواب الجنة الثمانية، يدخل من أيها شاء)) واتە: هەر یەکێك لە ئێوە دەستنوێژ بگرێت ـ بە باشی و بە تەواوی دەستنوێژەکەی بگرێت ـ ئینجا بڵێت: (أشهد أن لا اله الا الله و اشهد أن محمدا عبده ورسوله) ئەوە هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە، لە کامیانەوە بیەوێت دەچێتە ژوورەوە))

هەروەکو لە پێشدا باسمان کرد یەکەمین ئوممەتێك دەچێتە بەهەشتەوە ئوممەتی خۆشەویستەکەتە ﷺ و پێغەمبەرمان ﷺ یەکەم کەسە کە دەرگای بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە، هەروەکو لە (صحیح مسلم)[3] دا لە فەرموودەی (أنس)ەوە

---

١ ـ أخرجه البخاري (٣٢٥٧) .
٢ ـ أخرجه مسلم (٢٣٤) .
٣ ـ أخرجه مسلم (١٩٧) .

هاتوه کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((آتي باب الجنة يوم القيامة فأستفتح، فيقول الخازن: من أنت؟ فأقول: محمد، فيقول: بك أمرت لا أفتح لأحد قبلك)) واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا دێمە پێش دەرگای بەهەشت و داوا دەکەم دەرگاکەم بۆ بکرێتەوە، خەزنەداری بەهەشت پێم دەڵێت: تۆ کێیت؟ منیش دەڵێم: موحەممەدم، ئەویش دەڵێت: فەرمانم پێکراوە پێش تۆ دەرگا بۆ هیچ کەسێکی تر نەکەمەوە)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ جَنَّٰتِ عَدۡنٖ مُّفَتَّحَةٗ لَّهُمُ ٱلۡأَبۡوَٰبُ ﴿٥٠﴾ مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا يَدۡعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ وَشَرَابٖ ﴿٥١﴾﴾(ص) واتە: چەند بەهەشتێکی دەرگا والآ و لە سەر پشتە بۆیان، ئامادە و چاوەڕوانی هاتنیانە (٥٠) ئەمە حاڵیان کە لەو بەهەشتەدا لە سەر تەخت پاڵیان داوەتەوە و هەر جۆرە میوە و خواردنەوەیەك ئارەزوو بکەن لە بەردەستیاندایە و داوا دەکەن، واتە: هەر کات شتێکیان نیاز کرد، خێرا بێ زەحمەتکێشان بۆیان ئامادە نەبێ (٥١).

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ إِلَى ٱلۡجَنَّةِ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعۡدَهُۥ وَأَوۡرَثَنَا ٱلۡأَرۡضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلۡجَنَّةِ حَيۡثُ نَشَآءُۖ فَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴿٧٤﴾﴾ (الزمر)، واتە: ئەوانەش پارێزگارییان لە فەرمانەکانی خوای پەروەردگاریان کردوە، دەستە دەستە بەرەو بەهەشت ئەبرێن، تا کاتێ نزیك بەهەشت دەبنەوە و دەرگاکانی بۆیان کراوەتەوە، دەرگاوانانی بەهەشت پێیان دەڵێن: سڵاو و دروودتان لە سەر بێ، بە خێر هاتن خۆتان پاك ڕاگرت لە دونیادا هەوڵ و تێکۆشان و پاداشتیشتان لێرەدا پاك و خاوێنە یاخوا نۆشتان بێت، دە بچنە ناو بەهەشت بە هەتا هەتایی لەوێدا بن (٧٣) کاتێ چوونە ژوورەوە و نیشتەجێ بوون ئەڵێن: سوپاس و شوکرانە بۆ ئەو خوایەی بە بەڵێنەکەی ڕاستی کرد لە گەڵمان ئەم جێگا و زەویەشی لەو بەهەشتا بە ئێمەدا، کە هەر جێگایەکی ئارەزوو بکەین، لێی دەبین، ئای کە پاداشتی کارکەران لە ڕێگای خوادا چەندە باشە! دەبینی کە فریشتەکانیش بە دەوری عەرشدا ئەڵقەیان داوە و

لە گەڵ سوپاسدا تەسبیحاتی پەروەردگاری خۆیان ئەکەن، داوەری لە نێوان بەهەشتییەکان و دۆزەخیان و هەموو خەڵکان بە هەق و دادگەری تەواو بوە: چاکان ئەبرێن بۆ بەهەشت و خراپانیش بۆ دۆزەخ، لە لایەن بەهەشتییەکانەوە دەوترێ: هەموو سوپاس و شوکرانە، هەر بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان (٧٤).

زۆربەی بەهەشتییەکان لە هەژارانن، لە هەردوو کتێبی (صحیح)[١] دا هاتوە لە فەرموودەی (عمران ی کوڕی حصین) هوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((اطلعت في الجنة، فرأيت أكثر أهلها الفقراء، واطلعت في النار فرأيت أكثر أهلها النساء)) واتە: بەهەشتم بینی زۆربەی دانیشتوانەکەی لە هەژارانن و ئاگرم بینی زۆربەی دانیشتوانەکەی لە ئافرەتانن)).

هەروەها لە (صحيح مسلم)[٢] لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی عمرو ی کوڕی العاص) هوە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((إن فقراء المهاجرين يسبقون الأغنياء يوم القيامة الى الجنة بأربعين خريفاً)) واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا هەژارانی کۆچەران پێشی دەوڵەمەندان دەکەون بۆ چوونە بەهەشت بە چل ساڵ)).

بەهەشتیش بریتییە لە چەندەها پلە بە سەر یەکەوە، هەروەکو لە (صحيح البخاری)[٣] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابو هريرە) وە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((إن في الجنة مائة درجة، أعدها الله للمجاهدين في سبيل الله، ما بين الدرجتين كما بين السماء والأرض، فإذا سألتم الله فأسلوه الفردوس، فإنه أوسط الجنة، وأعلى الجنة ـ أراه ـ فوقه عرش الرحمن، ومنه تفجر أنهار الجنة)) واتە: لە بەهەشتدا سەد پلە هەیە، خوای گەورە ئامادەی کردوە بۆ تێکۆشەران کە لە پێناو ئەودا تێدەکۆشن، لە نێوان دوو پلەیدا هەروەکو نێوان ئاسمان و زەوییە، هەر کاتێك داواتان کرد ئەوا داوای فیردەوس بکەن، چونکە ئەوە ناوەراستی بەهەشتە و بەرزترین جێگەی بەهەشتە ـ وا دەبینم ـ عەرشی خودا لەسەرەوەی ئەوە،

١ ـ أخرجه البخاري (٣٢٤١) واللفظ له ومسلم (٢٧٣٨) .
٢ ـ أخرجه مسلم (٢٩٧٩) .
٣ ـ أخرجه البخاري (٢٧٩٠) .

هەر لەوێوە ڕووبارەکانی بەهەشت دەردەچێت)).

بەڵێ لە بەهەشتدا جۆگە و ڕووبار هەیە، ئایا خوای گەورە نەیفەرموە: ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾البقـــــرة: ٢٥، واتە: ئەی پێغەمبەرﷺ مژدە بدە بەوانەی کە بڕوایان بە خوا و پەیامبەر و بە ڕۆژی دوایی هەیە و ئاکارە چاك و پەسەندەکان ئەنجام دەدەن کە بێ گومان بەهەشت گەلێکیان بۆ هەیە کە چەندین کانیاو و ڕووبار لە ژێر دەرختەکانییدا دێن و دەچن )).

هەروەها دەفەرموێت:﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾ (یونس:٩) واتە: دەەشیانباتە چەند بەهەشتێکەوە کە لە بنکی دار و درەخت و لە ژێر کۆشکەکانیانەوە گەلێ ڕووبار و چەم دێن و دەچن)).

چەندەها ئایەت لەو بارەیەوە هاتوە ئەوە دەسەلمێنن کە لە بەهەشتدا ڕوبار هەیە، ئەو ڕوبارانەش ئاوی پاك و سازگارن، چەند ڕوبارێك لە شیر کە هەرگیز تامەکەی ناگۆڕێت، چەندەها ڕوبار لە مەی کە زۆر بە تام و چێژە بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە، چەند ڕوبارێك لە هەنگوینی پاڵفتە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ فِيهَآ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِى ٱلنَّارِ وَسُقُواْ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ﴾ (محمد: ١٥) واتە: نموونە و سیفەتی ئەو بەهەشتەی بە خۆپارێزان بەڵێن دراوە لە پاشەڕۆژدا پێیا بدرێت ئەم شێوەیە: ڕووباری زۆری لە ئاوی خاوێن و نەگۆڕاو و بێ بۆنی تێدایە، وە زۆر ڕووباری تێدایە، لە شیری سپی و جوان کە بە هۆی مانەوە - وەك شیری دونیا - تامی نەگۆڕاوە چونکە لە گوانی ئاژەڵ نایەتە دەرێ، چەندین چەم و ڕووباری تێدایە لە شەراب و عەرەقێك - کە بۆ ئەوانی ئەیخۆنەوە - زۆر خۆش و بە مەزەیە، واتە: دوورە لە هەر وەسفێکی عەرەقی دونیادا،چەندان چەم و ڕووباری تێدایە، لە هەنگوینی پاڵاوتە و بێگەرد، لە مۆم و لە هەر شتێکی تر، لە هەنگوینی دونیا هەیە، لەوێ جۆرا و جۆری میوەیان بۆ هەیە، لێبووردن و

لێخۆشبوونی پەروەردگاریانیان بۆ هەیە، کە ئەوە چاکترین شتە، ئایا ئەوانە کە ئەو هەموو ناز و نیعمەتەیان هەیە، وەك ئەو کەسە وایە کە هەمیشە لە ئاگری دۆزەخدا بێت؟ ئاوی کوڵ بە کوڵیان پێ دەخۆنەوە کاتێ تینوویان دەبێت، ریخۆڵەیان پارە پارە ئەکا، ئایا ئەو دوو دەستەیە وەك یەك نین؟!)).

ئیمامی (أحمد) و (الترمذي) و (ابن حبان) و جگە لەوان[1] ریوایەتیان کردوە لە فەرموودەی (معاویە ی کوڕی حیدە) وە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((إن في الجنة بحر الماء وبحر العسل وبحر اللبن وبحر الخمر، ثم تشقق الأنهار بعد)) واتە: لە بەهەشتدا دەریایەك ئاو و دەریایەك هەنگوین و دەریایەك شیر و دەریایەك مەی هەیە، پاشان روبارەکانی بەهەشت بڵاو دەبێتەوە)).

بەڵکو رەنگە سەرسام بیت کاتی بزانیت هەندێ لە روبارەکانی دونیا روباری بەهەشتن، هەروەکو لە (صحیح مسلم)[2] دا لە فەرموودەی (ابو هریرە)وە هاتوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((سیحان و جیحان والفرات والنیل، کل من أنهار الجنة)) واتە: سیحان و جیحان و فورات و نیل، هەموو لە روبارەکانی بەهەشتن)).

هەروەها لە بەهەشتدا حەوزی تایبەتی پێغەمبەری خواﷺ هەیە کە پێی دەڵێن: کەوسەر.

داوا لە خوا دەکەم کە بمانگێڕێتە سەر ئەو حەوزە، بە دەستە پیرۆزەکانی خۆشەویستی خواﷺ لەو ئاوەمان بە نسیب بکات هەرگیز لە پاش ئەوە تینوومان نەبێت.

لە (صحیح مسلم)[3] دا لە فەرموودەی (أنس)ەوە دەڵێت: ((بَيْنَا رَسُولُ اللّٰه ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ بَيْنَ أظْهُرِنَا، إِذْ أغْفَى إِغْفَاءَةً. ثُمّ رَفَعَ رَأْسَهُ مُتَبَسّماً. فَقُلْنَا: مَا أضْحَكَكَ يَا رَسُولَ اللّهِ؟ قَالَ: "أُنْزِلَتْ عَلَيّ آنِفاً سُورَةٌ". فَقَرَأ: ﴿بِسْمِ الله الرّحْمَنِ الرّحِيمِ. إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ ۝١ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنۡحَرۡ ۝٢ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلۡأَبۡتَرُ

---

١ ـ أخرجه الترمذي (٢٥٧١) وقال : حديث حسن صحيح وأحمد (٥/٥) وابن حبان في (صحيحه ) (٧٤٠٩) وعبد بن حميد (٤١٠) والطبراني في (الكبير) (١٩/٤٢٤) وابن ابي عاصم في ( الأحاد والمثاني ) (١٤٧٥) وصححه الألباني في (صحيح الجامع) (٢١٢٢) .

٢ ـ أخرجه مسلم (٢٨٣٩) .

٣ ـ أخرجه مسلم (٤٠٠) .

(٣)﴾ثُمَّ قَالَ: "أَتَدْرُونَ مَا الْكَوْثَرُ؟" فَقُلْنَا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: "فَإِنَّهُ نَهْرٌ وَعَدَنِيهِ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ.))

وفي رواية: ((في الجنة - عَلَيْهِ خَيْرٌ كَثِيرٌ. هُوَ حَوْضٌ تَرِدُ عَلَيْهِ أُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ. آنِيَتُهُ عَدَدُ النُّجُومِ. فَيُخْتَلَجُ الْعَبْدُ مِنْهُمْ. فَأَقُولُ: رَبِّ، إِنَّهُ مِنْ أُمَّتِي. فَيَقُولُ: مَا تَدْرِي مَا أَحْدَثَتْ بَعْدَكَ)) واتە: جارێکیان پێغەمبەری خواﷺ لە ناوماندا بوو، سووکە خەوێکی کردوو ئینجا سەری بە دەم زەردەخەنەوە بەرزکردەوە، ئێمەش وتمان: بۆچی پێدەکەنیت ئەی پێغەمبەری خواﷺ فەزمووی: (ئا ئێستا سوورەتێکم بۆ دابەزیوە، خوێندیەوە و فەرمووی: ((بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ. ﴿إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ (١) فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ (٢) إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ (٣)﴾ ئینجا فەرمووی: ئایا دەزانن کەوسەر چییە؟ وتمان: خوا و پێغەمبەرکەی ﷺ باشتر دەزانن، فەرمووی: ڕوبارێکە پەروەردگارم بەڵێنی پێداوم، خێری زۆری لە سەرە، حەوزێکە لە ڕۆژی قیامەتدا ئوممەتم دێنە سەری، جامەکانی بە ئەندازەی ژمارەی ئەستێرەکانە، خەڵکێك دادەبڕن لێیان، منیش دەڵێم: پەروەردگار ئەوە لە ئوممەتی منە، ئەویش دەفەرموێت: تۆ نازانی پاش تۆ چییان داهێناوە)).

بەڵکو بەرزایی هەیە، هەروەکو لە (مسند أحمد) (ابن ابی شیبە) لە (المصنف) و (النسائی) لە (الکبری) و جگە لەوان[١] لە فەرموودەی (ابو هریرە)وە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی:((إن منبري على ترعة من ترع الجنة، وما بين منبري و حجرتي روضة من رياض الجنة)) واتە: مینبەرەکەی من لە سەر بەرزییەکە لە بەرزییەکانی بەهەشت، لە نێوان مینبەر و ژوورەکەمدا باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت)).

هەروەها بەهەشت کانیاوی تێدایە:

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴾ (الحجر: ٤٥) واتە:

١ - أخرجه أحمد في (المسند) (٣٦٠/٢ ، ٤٠١ ، ٤١٢ ، ٤٥٠ ، ٥٣٤) وابن سعد في (الطبقات) (٢٥٣/١) وابن ابي شيبة في (مصنفه) (٣١٧/٦) والنسائي في (الكبرى) (٤٢٨٨) والطبراني في (الأوسط) (٩١١٧) والصغير (١١١٠) والبيهقي في (الكبرى) (٢٤٧/٥) وصححه الألباني في (صحيح الجامع) (٦٦٢١) و( الصحيحة) (٢٣٦٣) .

بە راستی لە ئاخیرەتدا پارێزکاران لە ناو چەندین باخـات و لـەلای چـەندین کانیـاوی (شەراب، شیر، هەنگوین) دان)).

لە نمونەی ئەو کانیاوانـەی خـوای گـەورە دەربـارەی فەرمووبـەتی: ﴿وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنْجَبِيلًا ﴿١٧﴾ عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا ﴿١٨﴾﴾ (الإنسان) واتە: پێکێکیان پێ دەنۆشرێ، تێکەڵەکەی زەنجەفیلە (١٧) لە ئاوی کانیاوێکیش تێکەڵ کراوە کە لـە بەر خۆشقووتی پێی دەڵێن: سەلسەبیل (١٨).

هــەروەها خــوای گــەورە فەرموویــەتی: ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ﴿٥﴾ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا ﴿٦﴾﴾(الإنـسان) واتـە: بـە راستی چاکانیش لە جامی پڕ لە شەرابی تایبەتی دەخۆنەوە کە تێکەڵەکـەی (واتـە: ئەوەی تێکەڵی دەکرێ) کافوورە. (کافوور: ماددەیەکی زۆر تامخۆش و بۆنخۆشە لە دارێکـی لـە وڵاتـی (هنـد) و (چـین) دا دەڕوێ) (٥) کانیاوێکـە بەنـدەکانی خـوا لێـی دەخۆنــەوە بــۆ هــەر شــوێنێك بیانــەوێ بیبــەن دەیبــەن بــە ئاسـانی، واتــە: بــە هەشـتییەکان لـە هـەر جێگایەکدا بـن و لـە هـەر ژوورێکدا بـن ئاوەکـەیان لـە گـەڵ دەبێ(٦).

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ ﴿٢٢﴾ عَلَى الْأَرَائِكِ يَنظُرُونَ ﴿٢٣﴾ تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ النَّعِيمِ ﴿٢٤﴾ يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ ﴿٢٥﴾ خِتَامُهُ مِسْكٌ وَفِي ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ ﴿٢٦﴾ وَمِزَاجُهُ مِن تَسْنِيمٍ ﴿٢٧﴾ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا الْمُقَرَّبُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ (المطففین) واتە: بە راستی چاکان لە ناو خۆشی و بەهرەییەکی ئێجگار زۆردان لە بەهەشتدا (٢٢) لە سەر کورسی و قەنەفە رازاوەکانی بەهەشتدا دانیشتوون و تەماشای ئەو هەموو ناز و نیعمەت و بەهرەی بەهەشتە ئەکەن کە بۆیان ئامادە کراوە (٢٣) لە روخسارياندا رووگەشی و خۆشی بەهەشت دەبینی و دەزانیت (٢٤) لە شەرابێکی پاك و سافو سەرمۆریان پێ دەنۆشێ، واتە: دەستی هیچ کەسێکی لێ نەکەوتوە و چاکان خۆیان سەرەکەی لادەبەن (٢٥) دوا قومی بۆنی میسکی لێ دێت، واتە:وەك شەرابی دونیا نییە تا بۆگەنی و سەرئێشە و دەردوداوێکی زۆری هەبێت، ئەوانەی کە پێشبرکێ و پێشدەستی دەکەن با لەوەدا

پێش دەستی و کێبەرکێ بکەن و هەوڵبدەن بۆ کار و کردەوەی چاك (٢٦) هەروەها ئەو شەرابە پاکە لە گەڵ ئاوی کانیاوێکی بەرز و پاك و خۆشدا تێکەڵکراوە، واتە: شەرابی بەهەشت لە ئاوی تەسنیم ی تێکەڵ ئەکرێ، ئەوجا ئەیاندرێتی بیخۆنەوە (٢٧) سەرچاوەیەکە نزیکانی خوا لێی ئەخۆنەوە (٢٨).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ﴾ (الرحمن: ٥٠) واتە: لە نێو دوو بەهەشتەکەدا دوو کانیاوی ڕەوان هەیە: تەسنیم و سەلسەبیل)).

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ﴾ (الرحمن: ٦٦) واتە: دوو کانیاوی هەڵقوڵاوییان تێدایە)).

لە بەهەشتدا دار و درەخت هەیە بەڵام وەکو ئەو دار و درەختەی دونیا نییە، بەڵکو سێبەرەکەی فراوانە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ﴾ (الواقعة: ٣٠) واتە: لە ژێر سێبەری بەردەوام و دوور و درێژدان کە هەرگیز خۆری نایسرێتەوە و هەمیشە هەر سێبەرە)).

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَنُدْخِلُهُمْ ظِلًّا ظَلِيلًا﴾ (النساء: ٧٥) واتە: دەشیان بەینە بن سێبەری چڕو پڕەوە ئیتر لەوێ نە سەرما و نە گەرما تینیان تێ ناکات)).

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابو هريرە)وە کەوا خۆشەویستی خواﷺ فەرموویەتی: ((إن في الجنة لشجرة يسير الراكب في ظلها مائة عام لا يقطعها)) واتە:درەختێك لە بەهەشتدا هەیە کە سوارچاکێك بە سێبەرەکەیدا بۆ ماوەی سەد ساڵ دەڕوات هێشتا تەواوی ناکات و نایبڕێت)).

لە (صحیح مسلم)[2] دا هاتوە لە فەرمودەی (ابو سعيد الخدري) یەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إن في الجنة شجرة يسير الراكب الجواد المضمر السريع مائة عام ما يقطعها))، واتە: لە بەهەشتدا درەختێك هەیە سوارچاکی ئەسپێکی خێرا بۆ ماوەی سەد ساڵ دەڕوات هێشتا تەواوی ناکات و نایبڕێت)).

---

١ ـ أخرجه البخاري (٣٢٥٢) ومسلم (٢٨٢٦) .
٢ ـ أخرجه مسلم (٢٨٢٨) .

بەڵكو فەرموو تەماشاى ميوەهات و بەروبوومى بەهەشت بكە.

خـواى گـەورە دەفـەرموێت: ﴿يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ﴾ (الـدخان: ٥٥) واتە: داوا دەكەن لەو بەهەشتانەدا هەر جۆرە ميوەيەك حەزى لێ بكەن بێ ترس لە مردن و لە هەر شتێكى تر)).

مەبەستى ئەوەيە دڵنيان لەوەى كە هەرگيز ئەو ميوەهاتە تەواو نابێت و زيانيان پێ ناگەيەنێت.

خـواى گـەورە دەفـەرموێت: ﴿مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا يَدْعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ وَشَرَابٍ﴾ (ص:٥١) واتە: ئەمە حاڵيانە كە لەو بەهەشتەدا لە سەر تەخت پاڵيان داوەتەوە و هەر جۆرە ميوە و خواردنەوەيەك ئارەزوو بكەن لە بەردەستياندايە و داوا دەكەن، واتە: هەر كات شتێكيان نياز كرد، خێرا بێ زەحمەتكێشان بۆيان ئامادە نەبێ)).

ئەوەش بزانە كە ميوەهاتى بەهەشت ئەوە نييە ماوەيەك هەبێت و ماوەيەك نەمێنێ و ببڕێتەوە! نەخێر، هەركەسێك هەركاتێك بيەوێ ئەوا دەيبينێتەوە و ئامادەيە، خـواى گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ ۝٣٢ لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ ۝٣٣﴾(الواقعة)، واتە: لە ناو ميوەيەكى زۆردان (٣٢) نە دەبڕدرێ و نە قەدەغە دەكرێ)).

زۆر نزيك و ئامادەيە بۆ هەر كەسێك بيەوێت و لە هەر كاتێكدا.

خـواى گـەورە دەفـەرموێت: ﴿قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ﴾ (الحاقـة: ٢٣) واتـە: ميوەجاتى درەختەكانى نزيكە لێيەوە. واتە: دەس رەسە، بە راوەستانەوە، بە دانيشتنەوە، دەستى ئەگاتێ، تەنانەت دەميشى ئەگاتێ، خواى كارزان بە هيچ شێوەيەك نايەڵێ بەهەشتى ئەزيەت بكێشێ، پاش ئازار و ئەزيەتەكەى دونياى)).

هـەروەها خـواى گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَٰلُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا﴾ (الإنسان: ١٤) واتە: سايە و سێبەرى درەختەكانى لێيانەوە نزيكە تا زياتر هەست بە خۆشى و رێز و حورمەت بكەن و لێكردنەوە و چنينى ميوەكەشيان ئاسان كراوە بۆيان)).

هەروەها خواى گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ﴾ (الـرحمن: ٥٤) واتـە:

لەو بەهەشتانەدا لەسەر رایەخگەلێ – کە ناوەخنەکەیان لە پارچە ئاوریشمی ئەستووری تایبەتە – پاڵیان داوەتەوە)).

مەبەستی ئەوەیە زۆر نزیکە و شۆڕ بوەتەوە، بەهەشتییەکان هەر کاتێك بیانەوێ لێی دەکەنەوە.

لە هەموو جۆرەکانی میوەهاتی تێدایە، لەوەی کە بەهەشتییەکان حەزی لێبکەن لە ترێ و هەنار و هەموو جۆرەکانی تر. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ﴾(محمد:١٥).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَنَّاتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَابِهٍ﴾ ( الأنعام: ٩٩) واتە: چەن باخێك لە رەز و لە داری زەیتوون و لە بنە هەناری هاو وێنە و لە یەکچوو لە گەڵادا جیاواز و لە یەك نەچوو لە تامدا بەرهەممان هێنا)).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فِيهِمَا مِن كُلِّ فَاكِهَةٍ زَوْجَانِ﴾ (الرحمن: ٥٢) واتە: جۆراو جۆر درەختی میوە و دارخورما و هەناریان تێدایە)).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فِيهِمَا مِن كُلِّ فَاكِهَةٍ زَوْجَانِ﴾ (الرحمن: ٥٢) واتە: لە نێویاندا لە هەموو جۆرە میوەیەك دوو جۆری تێدایە)).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ﴾ (الواقعة: ٢٩) واتە: لە بن سێبەری داری مۆزی بەر بەسەر یەککەوتوودان، لە بەر زۆری مۆزەکەی قەدی لاسکەکەی دیار نییە)).

زۆربەی (مفسر)ەکان رایان لە سەر ئەوەیە کە مەبەستی درەختی (مۆز)ە.

بەڵام ئەگەر پرسیار دەکەیت دەربارەی کۆشك و ژوور و جێنشین و خێوەت و خانوەکانی بەهەشت، ئەوا بزانە کە هیچ کەسێکی رەوانبێژ و زمانپاراو ناتوانی وەسف و باسی بکات.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَٰكِنِ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَفٌ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ مَّبْنِيَّةٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ۖ وَعْدَ اللَّهِ ۖ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ الْمِيعَادَ﴾ (الزمر: ٢٠) واتە: بەڵام ئەوانەی

کە خۆیان لە نافەرمانی پەروەردگاریان دەپارێزن چەندان کۆشك و تەلار و باڵەخانە لە سەر باڵەخانە یان لە بەهەشتدا بۆ هەیە لە یاقوت و زوبەرجەد رووبار و چەمە ئاوی زۆر بە پێشیدا دەڕوات، ئەمە بەڵێنی خوایە، خوایش هەر بەڵێنێ بدا، پێچەوانەکەی ڕەفتار ناکات)).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأُولَٰئِكَ لَهُمْ جَزَاءُ الضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا وَهُمْ فِي الْغُرُفَاتِ آمِنُونَ﴾(سبأ:٣٧) واتە: بۆ ئەم کەسانە لە بەرامبەر کردەوەکانیانەوە پاداشتی دووبەرامبەر هەیە، لە کۆشك و تەلارە بەرز و بڵندەکاندا بە ئاسوودەیی و خۆشی ژیان ئەبەنە سەر)).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أُولَٰئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَامًا﴾(الفرقان:٧٥) واتە: ئا ئەو بەندە بەڕێزانە کە ئەو هەموو سیفەتە قەشەنگانەیان هەیە لە پاداشی خۆڕاگرتنیان ژوورە رازاوەکانی بەهەشتیان پێدەدرێ هەر لەوێش پایەوپلەی بەرزوبڵندیان دەدرێتێ لە سەر خواپەرستی، وە لە لایەن فریشتەکانیشەوە بە سڵاو و درووود پێشوازییان لێ دەکرێ)).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ﴾(الصف: ١٢) واتە: لە ناو چەندان کۆشك و خانووی رازاوە و پاك و خاوێنشدا لە بەهەشتی هەتاهەتایی و نەبراوەدا نیشتەجێیان دەکات)).

هەروەها خوای گەورە باسی خێزانەکەی فیرعەون دەکات و دەفەرموێت: ﴿رَبِّ ابْنِ لِي عِندَكَ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرْعَوْنَ﴾ (التحريم:١١) واتە: پەروەردگارەکەم! لای خۆت لە بەهەشتدا ماڵێکم بۆ دروست بکە و لە دەست فیرعەون و کردەوەکانی رزگارم بکە و لە دەست ئەو هۆزە ستەمکارانەش رزگارم بکە)).

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابو سعید الخدری)یەوە

---

١ ـ أخرجه البخاري (٣٢٥٦) ومسلم (٢٨٣١) .

کەوا خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: ((إن أهل الجنة ليتراءون أهل الغرف من فوقهم، كما تتراءون الكوكب الدري الغابر من الأفق، من المشرق أو المغرب، لتفاضل ما بينهم). قالوا: يا رسول الله! تلك منازل الأنبياء، لا يبلغها غيرهم. قال: (بلى، والذي نفسي بيده، رجال آمنوا بالله وصدقوا المرسلين) واتە: بەهەشتییەکان باڵەخانە نشینەکانی سەرو خۆیان دەبینن هەروەك چۆن ئێوە ئەو ئەستێرە درەوشاوە دەبینن کە لە ئاسۆی خۆرهەڵات بەرەو ئاوابوون دەچێت، لە بەر بەرزوبڵندی پلەی ئەوان لەمانیتر، وتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەمە پلەوپایەی پێغەمبەرانە جگە لەوان کەس پێی ناگات؟ فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە پیاوانێکن باوەریان بەخوا هێناوە و پێغەمبەرانیان بە راست زانیوە (پێیان دەگەن).

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[1] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابو هريرە) وە کەوا خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: ((بينا أنا نائم رأيتني في الجنة، فإذا امرأة تتوضأ إلى جانب قصر، فقلت: لمن هذا القصر؟ فقالوا: لعمر بن الخطاب، فذكرت غيرته، فوليت مدبرا). فبكى عمر وقال: أعليك أغار يا رسول الله؟!)) واتە: لە کاتێکدا من خەوتبووم خۆم لە بەهەشتدا دی، ئافرەتێکم بینی لە پەنای کۆشکێکدا دەستنوێژی دەگرت، وتم: ئەم کۆشك و ئافرەتە هی کێیە؟ وتیان: هی (عمر) ی کوڕی (الخطاب)ە، منیش غیرەتی (عمر) م یادکەوتەوە بۆیە خێرا پشتم هەڵکرد)) بۆیە (عمر) دەستی بە گریان کرد و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ، بەرانبەر بە تۆ غیرەت دەمگری و بەدگومان دەبم))

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[2] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابو هريرە)وە دەڵێت: ((أتى جبريل النبي ﷺ فقال: يا رسول الله! هذه خديجة قد أتت. معها إناء فيه إدام أو طعام أو شراب. فإذا هي أتتك فاقرأ عليها السلام من ربها ومني. وبشرها ببيت في الجنة من قصب. لا صخب فيه ولا نصب)) واتە: جبریل هاتە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەوە (خەدیجە) هات بۆ لات قاپێکی

١ ـ أخرجه البخاري (٣٢٤٢) ومسلم (٢٣٩٥) .
٢ ـ أخرجه البخاري (٣٨٢٠) ومسلم (٢٤٣٢) .

پێیە پێخۆر یان خواردن یان خواردنەوەی تێدایە، هەر کات هاتە لات سەلامی پێ بگەیەنە لە پەروەردگاریەوە و لە منیشەوە، موژدەیشی پێبدە بە ماڵێك لە قامیشی (مرواری) لە بەهەشتدا کە دوورە لە دەنگە دەنگ و ماندووبوون)).

هەروەها خێوەت و جوان رازاوەیان هەیە کە تیایدا دەحەسێنەوە و لە خۆشیدا دەژین.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حُورٌ مَّقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ﴾ (الرحمن: ٧٢) واتە: ژنانی سپی چاو رەشن، لە ناو خێوەت و چادرەکاندا دەرناچن)).

لە هەردوو کتێبی (صحیح) [١]دا هاتوە لە فەرموودەی (ابو موسى الاشعری)یەوە کەوا خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: ((إن للمؤمن في الجنة لخيمة، من لؤلؤة واحدة مجوفة، طولها ستون ميلاً، للمؤمن فيها أهلون، يطوف عليهم المؤمن، فلا يرى بعضهم بعضاً)) واتە: لە بەهەشتدا بۆ کەسی ئیماندار خێوەتێك هەیە کە لە یەك مرواری ناو بۆش پێك هاتوە، درێژییەکەی شەست میلە، بۆ کەسی ئیماندار چەند ئەهلێکی تێدایە و بە سەریاندا دەسووڕێتەوە، یەکتری نابینن)).

ئەگەر پرسیاری رایەخ و نوێن و چەرپایەکەیان دەکەیت ئەوا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ﴾ (الغاشية: ١٣) واتەی: هەروەها چرپا و سیستەم و چەند تەختێکی بەرزی بە نرخی لێیەو کورسی لە هەموو لایەکەوە بە دەوری کانیاوەکەدا ریزکراوە و (حور العين) ی لە سەر دانیشتوە)).

هەمووی رێك خراوە و بە تەنیشت یەکەوەن و لە یەك دوور نین، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مُتَّكِئِينَ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّصْفُوفَةٍ وَزَوَّجْنَاهُم بِحُورٍ عِينٍ﴾ (الطور: ٢٠) واتە: لە سەر قەنەفەی ریزکراو پاڵیان داوەتەوە و روویان لە یەك کردوە، هاوسەرمان کردوون بە ژنانی سپی چاوگەورە (حور العين))).

هەمووی زۆر بە جوانی چنراوە و پڕە لە مرواری و گەوهەر و یاقوت، خوای بالادەست دەفەرموێت: ﴿عَلَىٰ سُرُرٍ مَّوْضُونَةٍ﴾ (الواقعة:١٥) واتە: لە سەر قەنەفە و تەختی چنرا و بە زێڕ دانیشتوون)).

---

١ ـ أخرجه البخاري (٣٢٤٣، ٤٨٧٩) ومسلم (٢٨٣٨) واللفظ له .

هەروەها بەهەشتییەکان لە بەهەشتدا چرپایە و نوێنی جۆراوجۆریان هەیە، کە بە هیچ شێوەیەك لەوەی دونیا ناچێت، هەروەکو باسمان کرد، ئەو بەهەشتە شتی وای تێدایە کە بە هیچ شێوەیەك چاوەکان نەیانبینیوە و گوێیەکان نەیانبیستوە و بە خەیاڵی هیچ کەسێکدا نەهاتوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ﴾(الكهف: ٣١) واتە: بە ئەوپەڕی خۆشی و شادییەوە لە سەر کورسی و قەنەفەی جوان و رازاوە شانیان داداوە)).

خوای بەخشندە دەربارەی سەرینی بەهەشتییەکان دەفەرموێت: ﴿وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ﴾ (الغاشية:١٥) واتە: پاڵە پشتی جوان و رازاوەی تیایە کە بە شێوەیەکی جوان و پەسەند ریز کراون)).

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِيٍّ حِسَانٍ﴾ (الرحمن:٧٦) واتە: لەو بەهەشتانەدا لەسەر رایەخگەلێ ـ کە ناوەخنەکەیان لە پارچە ئاورێشمی ئەستووری تایبەتە ـ پاڵیان داوەتەوە)).

هەروەها خوای دلۆڤان باسی فەرش ومافوری بەهەشتییەکان دەکات و دەفەرموێت: ﴿مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِيٍّ حِسَانٍ﴾ (الرحمن:٧٦) واتە: لە سەر پشتی سەوز و قاڵی نایاب ـ کە وێنەیان لە دونیادا نییە ـ شانیان داداوە))

ئەوەش بزانە کە قاپ و دەفری بەهەشتییەکان بریتییە لە ئاڵتون و زیو، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ﴾ (الزخرف: ٧١) واتە: کە نیشتەجێ بوون لە بەهەشتا، کاسەی زێڕینی پڕ لە خواردن و جامی پڕ لە شەراب بە سەریاندا ئەگەڕێنرێ)).

لە جێگایەکی تردا فەرموویەتی: ﴿يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿١٨﴾﴾ (الواقعة)) واتە: کۆمەڵە منداڵێکی ئێسك سووك و هەمیشە لاو خزمەتیان دەکەن و دەگەڕێن بە سەریاندا (١٧) بە گۆزە و سوراحی و پێکی پڕ لە شەرابی چەمە رەوانەکانی بەهەشتەوە (١٨).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِـَٔانِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا۠ ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَا۟ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴿١٦﴾﴾ (الإنسان)) واتە: لە سوراحی و کاسەی زیودا شەرابیان بە

سەردا دەگێڕدرێ بە قاپی زیوین، کە دەکرێتە ئەو کووپ و کاسانەوە لە زەرکی مینا و شوشەی تایبەتدا دروست کراون (١٥) هەموو کاسە و سوراحی خواردن و خواردنەوەیان لە شووشەی زیوە، کە بە ئەندازەیەکی جوان و پێویست و دڵرفێن (ساقییەکان) ئامادەیان کردوە بۆیان، واتە: نە پێویستیان بە هی تر هەیە و نە لێشیان ئەمێنێتەوە)).

جلوبەرگی بەهەشتییەکان ئاورێشم و حەریرە، پاکی و بێ گەردی بۆ ئەو کەسەی کە دەفەرموێت: ﴿وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ﴾ (الحج: ٢٣) واتە: جل و بەرگی ئەوێشیان هەورێشمە)).

لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَجَزَاهُم بِمَا صَبَرُوا جَنَّةً وَحَرِيرًا﴾ (الإنسان: ٢٣) واتە: پاداشیان دەداتەوە بە بەهەشتێك بە هەتا هەتایی تێیدا دەمێننەوە و بە ئاورێشمێك دەیپۆشن، بە هۆی ئارامگرتنیان لە سەر جێبەجێ کردنی تەکالیفی شەرعی دونیادا)).

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَلْبَسُونَ مِن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَقَابِلِينَ﴾ (الدخان:٥٣) واتە: لەبەر ئەکەن لە ئاورێشم و حەریری ناسك و ئەستوور هەموو بەرامبەری یەکن لە کۆڕی دانیشتنەکانیاندا)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿عَالِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ﴾ (الإنسان: ٢١) واتە: لە بەریاندایە پۆشاکێ لە ئاورێشمی قەشەنگ و نەرم و نۆڵ و جوان و سەوزی تەنك، کە بە سەر ئاورێشمی ئەستووردا لە بەریان کردوە (سندس) ئاورێشمێکی نەرم و نۆڵ، (استبرق)) ئاورێشمێکی ئەستوور و قایمە)).

خوای پەروەردگار دەفەرموێت﴿وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا﴾(الکهف: ٣١) واتە: جل و بەرگی بەنرخ و سەوزیش لە بەر دەکەن (چونکە ئەو ڕەنگە بۆ چاو زۆر لەبار و مایەی خۆشحاڵی و شادییە))).

خشڵ و بازنگ و دەستەوانەی ئەوان بریتییە لە ئاڵتون و مرواری، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا﴾ (الحج: ٢٣) واتە: خشڵدار دەکرێن لەوێدا بە بازنی زێڕ و مرواری)).

لـە جێگایـەکی تـردا دەفـەرموێت: ﴿وَحُلُّوٓاْ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ﴾ (الإنـسان: ٢١) واتـە رازێنراونەتەوە بە بازن و دەستبەندی زیو)).

خـواردنی بەهەشـتییەکان جۆرەهـا گۆشـت و گۆشـتی باڵندەیـە، خـوای گـەورە دەفـــەرموێت: ﴿وَأَمْدَدْنَٰهُم بِفَٰكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ﴾ (الطـــور: ٢٢) واتـــە: زیـــاد لەوەیش حەزیان لە هەر میوە و گۆشتێك بێت دەیاندەینێ )).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ﴾ (الواقعة: ٢١) واتە: دەگـەڕێن بە گۆشتی پەلەوەرەوە لە هەر جۆرێکی حەزی لێ بکەن )).

لەو خواردن و خواردنەوەی کە دەیخـۆن و دەیخۆنـەوە تـام و چـێژ وەردەگـرن و رزق و رۆزییان لە بەهەشتدا نەبڕاوەیە.

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿كُلُواْ وَٱشْرَبُواْ هَنِيٓـًٔا بِمَآ أَسْلَفْتُمْ فِى ٱلْأَيَّامِ ٱلْخَالِيَةِ﴾ (الحاقـة: ٢٤) واتـە: پێیـان ئـەوترێ: بخـۆن و بخۆنـەوە بـە خۆشـی بـە هـۆی ئـەو کـارەجوان و چـاکانەوە لـە رۆژگارەکـانی رابـوردوودا ئـەنجامتان دەدا بـە کـورتی: مرۆڤی بەهشتی لەوپەڕی خۆشیدا دەبێ)).

خوای کارزان بە توانـا دەفـەرموێت: ﴿لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا إِلَّا سَلَٰمًا ۖ وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ فِيهَا بُكْرَةً وَعَشِيًّا﴾(مريم: ٦٢) واتە: ئەوسا لەوێدا سەلام نەبێت هیچ وتەیەکی نابـەجێ و پڕوپـووچ نابیـسن لـە سـەرجەم بـەیانیان و ئێوارانـدا رزق و رۆزی فراوانیـان هەیـە، خۆراك و خواردن و خواردنەوە بێ بڕانەوە و کۆتـایی بێ ماندوو بوون و ئەرکێ دێتـە بەردەستیان)).

خوای پەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿لَهُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ﴾ (یـــس: ٥٧) واتـە: لـەوێش هـەموو جـۆرە میوەیـەکیان بـۆ هەیـە و داوای هـەر شـتێکیش بکـەن ئامادەیە بۆیان)).

بـە گـشتی بەهەشـتییەکان بـەو شـێوەیە دەژیـن کـە خـوای گـەورە دەربارەیـان دەفەرموێت: ﴿لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ﴾ (ق: ٣٥) واتە: حەزیشیان لە هەرچـی بێت بۆیان هەیە داوای بکەن و زیادەش لەوە کە بـە خـەیاڵی هـیچ کەسـێکدا نایـەت لامان هەیە)).

بەرزترین پلە وپایە لە بەهەشتدا جێگە و پلەی پێغەمبەری خوایە ﷺ کە ئەویش بریتییە لە (الوسیلە).

لە (صحیح مسلم)[١]دا هاتوە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی عمرو ی کوڕی العاص) ەوە کەوا پێغەمبەری ئازیزﷺ فەرموویەتی: ((إذا سمعتم المؤذن، فقولوا مثل ما يقول، ثم صلوا علي، فإنه من صلى علي صلاة صلى الله عليه بها عشرا. ثم سلوا الله لي الوسيلة. فإنها منزلة في الجنة لا تنبغي إلا لعبد من عباد الله. وأرجو أن أكون أنا هو. فمن سأل لي الوسيلة حلت له الشفاعة)) واتە: ئەگەر گوێتان لە بانگبێژبوو، ئەوچی دەڵێت ئێوەش وا بڵێن ئینجا سڵاوات لە سەر من بدەن، چونکە ئەوەی سڵاوات لە سەر من بدات خوای گەورە دەجار سڵاواتی لەسەر دەدات، ئینجا داوای پلەوپایەی بەرزم بۆ بکەن لە خوا (الوسیلە)، ئەو پلەبەرزە پلەیەکە لە بەهەشتا دەست کەس ناکەوێت یەك بەندە لە بەندەکانی خوا نەبێت، داواکارم ئەو کەسەش من بم، ئەوەی داوای وەسیلەم لە خوا بۆ بکات شیاوی شەفاعەتم دەبێت))

ئایا خوارترین پلە و پایەی بەهەشتییەکان کێیە و چۆنە لە بەهەشتدا، هەر ئەویشە دوایین کەسە دەچێتە بەهەشتەوە، لە (صحیح مسلم)[٢] دا هاتوە لە فەرموودەی (المغیرە ی کوڕی شعبە) وە کەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ((سأل موسى ربه: ما أدنى أهل الجنة منزلة؟ قال: هو رجل يجيء بعد ما أدخل أهل الجنة الجنة فيقال له: ادخل الجنة. فيقول أي رب! كيف؟ وقد نزل الناس منازلهم وأخذوا أخذاتهم؟ فيقال له: أترضى أن يكون لك مثل مُلك مَلك من ملوك الدنيا؟ فيقول: رضيت، رب! فيقول: لك ذلك ومثله ومثله ومثله ومثله. فقال في الخامسة: رضيت، رب! فيقول: هذا لك وعشرة أمثاله. ولك ما اشتهت نفسك ولذت عينك. فيقول: رضيت، رب! قال (أي: موسى): رب! فأعلاهم منزلة؟ قال: أولئك الذين أردت غرست كرامتهم بيدي. وختمت عليها. فلم تر عين ولم تسمع أذن ولم يخطر على قلب بشر)) قال: ومصداقه في كتاب الله عز وجل:

﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ السجدة: ١٧)

---

١ ـ أخرجه مسلم (٣٨٤) .

٢ ـ أخرجه مسلم (١٨٩) .

واتـە: موسـا پێغەمبـەر(علیـە الـصلاە والـسلام) پرسـیاری لـە پـەروەردگاری کـرد: نـزمترین پلـەی بەهەشـت کێیـە؟ فـەرمووی: پیاوێکـە دوای ئـەوەی بەهەشـتییەکان شوێنی خۆیان دەگرن لە بەهەشتدا دێت و پێی دەوترێت: بڕۆ بەهەشـتەوە، ئـەویش دەڵێت: ئەی پەروەردگارا! چۆن؟ لە کاتێکدا هەموو خەڵکی جێگەی خۆیان گرتوەو نیشتەجێی ماڵی خۆیان بوون؟ پێی دەوترێت: رازی دەبیت ئەوەندەی پاشـایەك لـە پاشاکانی دونیات هەبێت؟ ئەویش دەڵێت: رازی دەبم، ئـەی پـەروەردگارا! ئـەویش دەڵێت: ئەوەندە بۆ تۆ و هێندەی ئەوە و هێندەی ئـەوە و هێنـدەی ئـەوە و هێنـدە ئەوە، لە جاری پێنجەمدا دەڵێت: رازی دەبم ئەی پەروەردگارا! خوای گـەورە پێـی دەڵێت: ئەوە بۆ تۆ و دە هێندەی ئەوە و ئەوەی خۆت پێـت و خۆشـە و چـاوەکانت پێی گەش دەبێتەوە، ئەویش دەڵێت: رازی دەبم ئەی پـەروەردگارا! ئـەمجار موسـا فەرمووی: ئەی بەرزترین پلە کێیە؟ ئەویش وتی: ئەوانەن کە دەمەوێ و مەبەسـتمە رێز و کرامەتی ئەوانم بە دەسـتی خـۆم چـاندوە و مـۆرم داوە بـە سـەریدا، کـە هـیچ چاوێك نەیبینیوە و هیچ گوێیەك نەیبیستوە و بە خـەیاڵی هیچ کەسـێکدا نـەهاتوە)) بەڵگـەش لـە کتێبەکـەی خـوادا ئـەو ئایەتەیـە کـە دەفـەرموێت: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءً بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ واتـە: ئـیتر هـیچ کەسـێك نـازانێ چ پاداشتێکی گرنگیان بۆ داشاراوە لە هۆیەکانی خۆش و شادی چاوان و دڵئـارامی لـە پاداشی ئەو کارانەدا ئەنجامیان داون و خۆیانیان بۆ ماندوو کردوە)).

لە هەردوو کتـێبی (صـحیح)[١]دا هـاتوە لـە فـەرموودەی (ابـن مـسعود) ەوە کـەوا خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی:

((إني لأعلم آخر أهل النار خروجا منها، وآخر أهل الجنة دخـولا، رجـل يخـرج مـن النار حبوا. فيقول الله تبارك وتعالى له: اذهب فادخل الجنة. فيأتيها فيخيل إليـه أنهـا ملأى. فيرجع، فيقول: يـا رب! وجـدتها مـلأى. فيقـول الله تبـارك وتعـالى لـه: اذهـب فادخل الجنة، فيأتيها فيخيل إليه أنها ملأى. فيرجع فيقول: يا رب! وجـدتها مـلأى. فيقول الله له: اذهب فادخل الجنة. فإن لك مثل الدنيا وعشرة أمثالها. أو ((إن لك مثل عشرة أمثال الدنيا)) فيقول: أتسخر مني (أو أتضحك مني وأنت الملك؟))، فلقد رأيت

١ ـ أخرجه البخاري (٦٥٧١) ومسلم (١٨٦ , ١٨٧) .

رسول الله صلى الله عليه وسلم ضحك حتى بدت نواجذه.، و كان يقال: ذاك أدنى أهل الجنة منزلة..)) واتە: من دواین کەس لە دۆزەخییەکان دەناسم کە لە ئاگر دەردەچێت و دواین بەهەشتییەکان کە دەچنە بەهەشتەوە، کابرایەکە لە ئاگر بە گاڵۆڵکی دەردەچێت، خوای باڵادەست پێی دەفەرموێت: بڕۆ ژوورەوە بۆ بەهەشت، ئەویش دێت و وا دەزانێت بەهەشت پڕ بوە، بۆیە دەگەڕێتەوە و دەڵێت: پەروەردگارا! بەهەشت پڕ بوە، خوای گەورە پێی دەڵێت:: بڕۆ ژوورەوە بۆ بەهەشت، ئەویش دێت و وا دەزانێت بەهەشت پڕ بوە، بۆیە دەگەڕێتەوە و دەڵێت: پەروەردگارا! بەهەشت پڕ بوە، خوای گەورە پێی دەڵێت: بڕۆ ژوورەوە بۆ بەهەشت، بە ئەندازەی دونیا و دە ئەوەندەی دونیا بۆ تۆ (یان دە بە ئەندازەی دونیا بۆ تۆ)) ئەویش دەڵێت: ئەی خوایە گاڵتەم پێ دەکەیت؟ (یان: پێم پێدەکەنی لە کاتێکدا خۆت پادشای؟) پێغەمبەری خوام بینیﷺ پێکەنی تاوەك ددانەکانی دەرکەوت، ئەیفەرموو: ئەوە نزمترین پلەی بەهەشتییەکانە)).

برا خۆشەویستەکانم... خوشکە بەڕێزەکانم... لە بەهەشتدا خۆشییەکی زۆر و نیعمەتێکی گەورە هەیە نەك لە مەیەکەیدا و نەك لە شیر و زێر و زیو و کچە شۆخ و شەنگەکانی و کۆشکەکانیدا، بەڵکو بە نرخترین و خۆشترین نیعمەت و بەرزترین نیعمەت بریتییە لە بینینی روخساری خوای گەورەو میهرەبانە لە رۆژی قیامەتدا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾﴾ (القيامة) واتە: لە رۆژی قیامەتدا دەم و چاو و روخسارگەلێ (واتە: ڕوومەتی باوەڕداران) گەشاوە و پارا و پرشنگدارە و خۆشی و شادییان لێ دەبینرێ (٢٢) بۆ پەروەردگاری خۆیان دەڕوانن (٢٣) )).

بە ڕاستی ئەوە خۆشترین نیعمەتە، کە روخساری خوای گەورە ببینی، ئەو بینینە سەرقاڵت دەکات لە خۆشییەکانی بەهەشت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ أَكْبَرُ﴾ التوبة:٧٢، واتە: سەرەرای ئەوانە رەزامەندی خوا لە هەموو گەورەتر و خۆشترە )).

لە هەردوو کتێبی (صحیح)[١] دا هاتوە لە فەرموودەی (ابو سعيد الخدري)یەوە

١ ـ أخرجه البخاري (٦٥٤٩) ومسلم (٢٨٢٩) .

کەوا پێغەمبەری ئازیز ﷺ فەرموویەتی: ((ان الله تبارك وتعالى يقول لأهل الجنة: يا أهل الجنة، فيقولون: لبيك ربنا وسعديك والخير في يديك، فيقول: هل رضيتم؟ فيقولون: ما لنا لا نرضى يا رب وقد أعطيتنا ما لم تعط أحدا من خلقك، فيقول: ألا أعطيكم أفضل من ذلك؟ فيقولون: يا ربِ! وأي شيء أفضل من ذلك؟ فيقول: أحل عليكم رضواني فلا اسخط بعده ابداً)) واتە: خوای گەورە بە بەهەشتییەکان دەفەرموێت: ئەی بەهەشتییەکان! ئەوانیش دەڵێن: گوێڕایەڵین و لە خزمەتتاین چاکەیش هەر لە دەستی تۆدایە، ئەویش دەڵێت: ئایا ڕازی بوون بەوەی کە پێتان درا؟ ئەوانیش دەڵێن: ئەی بۆ ڕازی نابین لە کاتێکدا ئەوەت پێ داوین کە بە هیچ دروستکراوێکت نەتداوە، ئەویش دەڵێت: ئایا لەوە چاکتر و باشترتان پێ بدەم؟ ئەوانیش دەڵێن: ئەی پەروەردگارا! ئایا چی شتێك لەوە چاکتر و باشترە؟ خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ڕەزامەندی منتان بۆ حەڵاڵ بوو، چیتر لێتان تووڕە نابم تا هەتایە)).

هەروەها لە (صحیح مسلم)[١] هاتوە لە فەرموودەی (صهیب) ەوە کەوا خۆشەویستی خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إذا دخل أهل الجنة الجنة، ـ قال ـ يقول الله تبارك وتعالى: تريدون شيئا أزيدكم؟ فيقولون: ألم تبيض وجوهنا؟ ألم تدخلنا الجنة وتنجنا من النار؟ قال: فيكشف الحجاب. فما أعطوا شيئا أحب إليهم من النظر إلى ربهم عز وجل)) واتە: کاتێك بەهەشتییەکان دەچنە بەهەشتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: هیچ شتێکی دیکەتان دەوێ بۆتانی زیاد بکەم؟ ئەوانیش دەڵێن: ئایا دەموچاوی ئێمەت سپی نەکردوە؟ ئایا نەمانتخستوەتە بەهەشتەوە و لە ئاگر دەربازمانت نەکردوە؟ دەڵێ: ئەمجار پەردە لە سەر ڕوخساری خۆی لادەدات، بۆیە هیچ شتێك کە پێیان دراوە بە قەد تەماشا کردنی پەروەردگاریان لا خۆش نییە )).

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾ (یونس: ٢٦) واتە: بۆ ئەوانەش چاکە دەکەن، پاداشی زۆر چاك و بەهەشت هەیە و زیاد لەوەش، واتە: دیتنی ڕووی پیرۆزی خوای میهرەبان و تەماشا کردنی!)).

مەبەست لە (الحسنى) بەهەشتە، هەروەها مەبەست (الزیادە) خۆش لێبینینی تەماشای ڕوخساری خوای گەورە لە بەهەشتدا.

---

١ ـ أخرجه مسلم (١٨١) .

ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی کە فەرموویەتی:

| | |
|---|---|
| النفس تبكى على الدنيا وقد علمت | أن السلامة فيها ترك ما فيها |
| لا دار للمرء بعد الموت يسكنها | إلا التى كان قبل الموت يبنيها |
| فإن بناها بخير طاب مسكنها | وإن بناها بشر خاب بانيها |
| أموالنا لذوى الميراث تجمعها | ودورنا لخراب البوم نبنيها |
| وكم من مدائن فى الآفاق قد بنيت | أمست خراباً وأفنى الموت اهليها |
| أين الملوك؟ التى كانت مسلطنة | حتى سقاها بكأس الموت ساقيها |
| إن المكارم أخلاق مطهرة | الدين أولها والعقل ثانيها والعلم ثالثها |
| والحلم رابعها والجود | خامسها والفضل باقيها |
| لا تركنن إلى الدنيا | فالموت لاشك يفنينا ويفنيها |
| واعمل لدار غد رضوان خازنها | والجار أحمد والرحمن ناشيها |
| قصورها ذهب والمسك طينتها | والزعفران حشيش نابت فيها |
| أنهارها لبن مصفى ومن عسل | والخمر يجرى رحيقاً فى مجاريها |
| والطير تجرى على الأغصان عاكفة | تسبح الله جهراً فى مغانيها |
| فمن يشترى الدار فى الفردوس | يعمرها بركعة فى ظلام الليل يحييها |

واتە: نەفسەکەم بۆ دونیا دەگری و باش دەزانێ کە بێوەیی تیایدا واز هێنانە لەوەی کە تیایدایە، بۆ هیچ کەس لە پاش مردن هیچ خانویەك نییە تیایدا نیشتەجێ بێ تەنها ئەوە نەبێت کە لە پێش مردنی بنیاتی ناوە، ئەگەر بە چاکە دروستی کردوە ئەوا جێگایەکی خۆشە وە ئەگەر بە خراپە دروستی کرد ئەوە دروستکەرەکەی پەشیمان دەبێتەوە، سامانەکانمان بۆ کەس و کاری پاش خۆمان کۆی دەکەینەوە خانووەکانمان بۆ کاول کردنی ڕۆژگار دروستی دەکەین، چەندەها شار لەو ئاسۆیانەدا دروستیان کرد کەچی هەموو کاول بوون و مردنیش ئەهلەکەی فەوتاند، کوان ئەو پادشایانەی کە دەسەڵاتدار بوون تاکو بە دەستی ئاوگێر (بەرداخی مردنی) کردە نۆشی، ڕێگا و شتە جوانەکان پاك و تەمیز و دیارن ئاین یەکەمیانە و هۆش وبیر دووەم و زانست سێیەمە، هێمنی و لە سەرخۆیی چوارەمە و بەخشندەیی پێنجەمە و چاکەکاری پاشماوەکەیەتی، خۆت مەدە پاڵی دونیا چونکە

بێ گومان مردن ئێمه و ئەویش لە ناو دەبات، بۆیە کار بکە بۆ ماڵەکەی سبەینێ، کە (رضوان) گەنجینەوانییەتی وهاوسێکەت (أحمد)ە ﷺ و (الرحمن) دروستی کردوە، کۆشکەکانی ئاڵتونەو قوڕ و خاکەکەی میسکە وە گژ و گیاکەی زەعفەرانە و تیایدا سەوز بووە، ڕووبارەکانی شیری پاڵفتەن و هەنگوین و مەی وەکو شیلە بە ڕووبارەکانیدا تێدەپەڕێ، وەباڵندەکان لەسەر لقەکانی دێن و دەچن یاد و تەسبیحاتی خوا بە ئاشکرا دەکەن لە لانەکانیاندا، کێ دەیەوێ ماڵێك بکرێ لە فیردەوسدا ئاوەدانی بکاتەوە بە ڕکاتێك لە تاریکی شەودا)).

جا ئیمان و کرداری چاك و شوێن کەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ هۆکارن بۆ چوونە بەهەشت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتۡ لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلۡفِرۡدَوۡسِ نُزُلًا ﴿١٠٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يَبۡغُونَ عَنۡهَا حِوَلٗا ﴿١٠٨﴾﴾ (الكهف)) واتە: بێ گومان ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناو کردەوەی چاکیان ئەنجام دا هەر لە زووەوە باخەکانی فیردەوسمان کردۆتە جێی پەزیراییان (١٠٧) بە هەتا هەتاییش لەوێدا ئەمێننەوە و ژیانیان تێیدا نەبڕاوەیە، هەرگیز بێزار نابن و بۆ خۆشیان داوای جێ گۆرکێ ناکەن، هەرگیز پێیان خۆش نییە لێی دەرچن (١٠٨) )).

داوا لەخوا دەکەم من و ئێوە بخاتە بەهەشتەوە و کار و کردەوەکانی من و ئێوە وەربگرێت و کارەکانمان چاك بکات و تەنها لەپێناوی ئەودا ئەنجامیان بدەین و ئیخلاصمان پێ ببەخشێت و بەش و پشکی هیچ کەسێکی تری تیادا نەبێت هەر خۆی پشت و پەنامانە توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.

وصلی الله وسلم وبارك علی نبینا محمدوعلی آله وصحبه أجمعین، والحمد لله رب العالمین.

تم الكتاب و ربنا محمود ولە المكارم والعلا والجود

به پێنووسی
أبو أحمد محمدبن حسان

# ناوەڕۆك

Printed by
DAR EL-MAREFAH
Publishing & Distributing

التنفيذ الطباعي
دار المعرفة
للطباعة والنشر والتوزيع